میژووی مەردۆخ

# مێژووی کوردو کوردستان

شێخ محمد مەردۆخی کوردستانی
ئایەتوڵلا (مەردۆخ)

وەرگێڕانی: زانەر محەمەد

چاپی یەکەم

٢٠١١

# مێژووی کورد و کوردستان

شێخ محمد مەردۆخی کوردستانی

ئایەتوڵڵا (مەردۆخ)

وەرگێڕانی: زانەر محمد

چاپی یەکەم

٢٠١١

**پێناسی کتێب:**

ناوی کتێب: مێژووی کوردو کوردستان

نوسینی: محمد ( ئایەتوڵلا مەردۆخی کوردستانی)

وەرگێرانی: زانەر محمد

تایپ: وەرگێر

هەڵەچن: وریا فایەق

دیزانی ناوەوە: چوارچرا

دیزاینی بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٠٧٥٠٤٩٢٤٢٦٣

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات / هەولێر

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١١

نرخ: (١١) یازدە هەزار دینار

تیراژ : (٢٠٠٠) دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٤٨٠) ساڵی ٢٠١١ پێدراوە

لە بلاّوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر (( ٥٦ ))

## بەشی یەکەم:
## سەبارەت بەبارودۆخی گشتی، لەخۆگری پێنج بەند

پەیکەری مرۆڤ هاوشێوەی هەموو ئاژەڵەکانی دیکە لەگیان و جەستە پێکهاتووە. تا گیان میوانی جەستە بێت، پێنج سەرچاوەی هەستەوەرەکان، یانی بینین، بیستن، بۆنکردن، بەرکەوتن و تامکردن لەجموجۆڵدان و بەهۆی ئەوانەوە بەردەوام زانیاری لەخانەکانی مێشکی مرۆڤ شێوە دەگرێت و هزر و ئەندێشەکان دروست دەبن.

کاتێک گیان قەڵای جەستە بەجێبێڵێت، مێشکیش هاوشێوەی هەموو ئەندامەکانی دیکە، لەناو دەچێت و دەپووکێت. هزر و ئەندێشەکانیش دەپووکێن و سەرئەنجام لەناو دەچن و چیتر هیچ مرۆڤێک توانای دەسپێڕاگەیشتنی ئەو هزر و ئەندێشانەی نابێت.

بەمپێیە، تەنیا ڕێگەی هەڵگرتن و پاراستنی ئەو هزر و ئەندێشانە ئەوەیە، تا مەلی گیان لەقەفەسی جەستە هەڵنەفڕیوە و هزر و ئەندێشەکان لەناونەچوون، بەڕێکوپێکی بخرێنە سەر کاغەز و بەمشێوەیە هزر و زانیاری کەسەکان دەمێنێتەوە و کەسانی دیکەیش دەتوانن کەڵکی لێوەربگرن.

مەبەستی سەرەکی مرۆڤ لەداهێنانی نووسین جگە لەمە هیچیتر نییە جگە لەئەنجامدانی یەک مەبەست کەهزر و چالاکی و زانیارییە دیارەکانی کەسەکان بخرێتە سەر کاغەز و لەوێ بپارێزرێت و هەڵبگیرێت تا کەسانی دیکەیش بیخوێننەوە و سوودی لێ ببینن.

لەسەر ئەم بنەمایە، لەهەر باس و بابەتێک، چەندین نامەو کتێبم بەمەبەستی خزمەت کردنی کۆمەڵگا نووسیوە. ویستم لەهونەری مێژوونووسینیش، بابەتێکم وەک یادگاری بەجێهێشتبێت. مێژووی کوردستانم لەهەموو مێژووەکانی دیکە بەباشتر و لەپێشتر زانی کە سەرچاوە و نیشتمانی خۆمە و خۆشمدەوێت. هەرچەند مێژووی کورد و کوردستان لەقۆناغی منداڵیدایە، بەڵام هیوادارم بەهۆی چاودێری کردن و پەروەردە کردنی خوازیارانی ئەم بەشە، گەشە بکات و بگاتە ترۆپک.

## ئەم کتێب لەخۆگری چوار بەشە:

**بەشی یەکەم:** سەبارەت بەبارودۆخی گشتی، لەخۆگری پێنج بەند
**بەشی دووەم:** سەبارەت بەکورد و کوردستان، لەخۆگری سێ بەند
**بەشی سێیەم:** سەبارەت بەماد و سەرزەمینی ماد (مادستان) لەخۆگری پێنج بەند
**بەشی چوارەم:** سەبارەت بەبارودۆخی سنە(سنەدژ، سەنەندج) لەخۆگری سێبەند

## تێبینی:

چوونکە مەبەستی سەرەکی من دۆزینەوەی ڕاستییەکانی مێژووی کوردە، ئەگەر خوێنەران چ کورد و چ نەتەوەکانی دیکە، هەندێ بابەت بخوێننەوە کەخوازیاری بیستنی نەبن، نابێت دڵگیر بن چوونکە منیش دەمەوێت مێژوو بنووسم — نەك ئەوەی دڵنەوایی و وەسفی کەسەکان یا هۆزەکان بکەم— ئەگەر مێژوو لەسەر بنەمای بۆچوون و گریمانە بێت، شیاوی خوێندنەوە نییە، بەواتایەکی دی، مێژوو بەڕادەیەك دەبێت سەرنجراکێش و بەهێز بێت کەهەموو نەتەوەکان دەبێت لێی بترسن و دەبێت هیوایان بۆ دروست بکات. تا لەترسی مێژوو کارە خراپەکان ئەنجام نەدەن و بەهیوای مێژوو، بۆ هێشتنەوەی ناوی چاکە لەخۆیان، هەموو جۆرە هەوڵ و کۆششێك بدەن.

## بەندی یەك
## داوەری کردنی ئاوز لەسەر گێڕانەوە

یانی هەڵسەنگاندنی داوەری کردنی ئاوز. لەزانستی مێژوو – کەلەم بەشەدا بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە– گێڕانەوە کاتێك شیاوی سەرنجە لەلایەن ئاوزەوە پشتڕاست بکرێتەوە. هەڵبەتە ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کەزانستی مێژوو زانستێکە دەگێڕدرێتەوە و بناغە و بنەمای هەموو باس و خواسەکانی لەسەر گێڕانەوە پابەندە و ئاوز بەهیچ جۆرێك بەشداری تیا ناکات. بەڵام ئەوانەی شارەزای بواری مێژوو و گۆڕانی ڕۆژگارن، دەزانن لەگێڕانەوەکان و چۆنایەتی و ناسنامەی کەسەکان و ناوی سەرزەمینەکان و زەمانەکان و کەسەکان و پێگە و شوێنی ڕوودانی ناوچەکان و .... بەرادەیەك جیاوازی دەبینرێت کەئەو کەسەی بەدوای ڕاستییەکاندا دەگەڕێت بێ هەڵسەنگاندن و پشت بەستن بەئاوز، سەری لێدەشێوێت و ڕاستییەکان و چۆنایەتی و چەندایەتی ڕاستییەکان بەشاراوەی دەمێننەوە بەجۆرێك کەسەکە ناتوانێت ڕاست لەچەوتی و ڕاستی لەناڕاستی جیابکاتەوە– لێرەدا پێویستی بەشداری کردنی ئاوز دەردەکەوێت تا بەهۆی بەڵگە بینراو و بیسراوەکان، ڕاستییەکان بدۆزێتەوە و لەپەرێشانی و سەرگەردانی خۆی دەرباز بکات.

بۆ نمونە دەستەیەك لەمێژوونووسە بەناوبانگەکان، کەسێکی گەورەی وەك کەیقوباد بۆ فلاَنە تایەفە دەگێڕنەوە، (بۆ نمونە لەکوردەکان) و دەستەیەکی دیکە کەئەوانیش بڕواپێکراون، هەمان کەس بۆ تایەفەیەکی دیکە دەگێڕنەوە (بۆ نمونە پێشدادییەکان). لێرەدا ئاوز دەبێت فەرمان بدات لەوەی گەڕاندنەوەی کەیقوباد بۆ پێشدادییەکان، لەگەڵ کاتی ڕووخانی پێشدادییەکان کەهەموو مێژوونووسان لەسەری کۆکن، جیاوازی هەیە. پەمپێیە، ئاوز پێمان دەڵێت ئەو گێڕانەوەی کەیقوباد دەگەڕێنێتەوە بۆ پێشدادییەکان، جێی متمانە نییە.

هەروەها یەکێك لەمێژوونووسەکان نووسیویەتی بۆ نمونە ئیسفەندیار کوڕی گەشتاسپە و یەکی دیکە نووسیویەتی: کوڕی دارایە؟ دەستەیەکیش دارا بەکوڕی بەهمەن دەزانن و دەستەیەك بەکوڕی گەشتاسپ. دەستەیەك ئافڕاندنی جیهان بۆ ٤٠٠٤ ساڵ پ.ز دەگێڕنەوە، دەستەیەك بۆ ٥٥٨٤ پ.ز و دەستەیەك بۆ حەوت هەزار ساڵ پ.ز. هەندێ کەس دەرکەوتنی

زەردەشت بۆ ٢٥٨٢ ساڵ دوای ئافراندنی ئادەم دەگێڕنەوە و هەندێك بۆ ٤٩٣٧ ساڵ دوای ئافراندنی ئادەم و دەستەیەکی ئاماژە بەساڵێکی دیکە دەدەن... بەمپێیە کەسەکان لەگەڕان بەدوای ڕاستییەکان و بەدەستهێنانی ئەنجام سەرگەردان دەبێت. بەتایبەت لەڕووداوەکانی سەدە سەرەتاییەکان و پێشهاتەکانی پێش مێژوو و پێش نووسین. چوونکە داستان و بەسەرهاتەکان لەو زەمانەدا لەناو سنگ و لەسەر زاران بووە و ڕووداوەکان لەسەر زمانی کەسەکان گێڕدراونەتەوە و ڕەوتی سروشتی خۆیان بڕیوە. ئاشکرایە لەمشێوەدا جیاوازییەکان دێنە ئاراوە. بۆیە مێژوونووسان ناچارن پشت بەبەڵگە و شوێنەوارەکان ببەستن و هاوکاری لەئاوز و هەستەکانیان وەربگرن تا بتوانن لەناو ئۆقیانووسی جیاوازییەکان، خۆیان لەکەنارەکانی ڕاستی نزیك بکەنەوە چوونکە هەر مێژوویەك پشت ئەستور بەبەڵگە و شوێنەوار و نەخش و هەڵکەنراوەکان بێت، زیاتر لەمێژووەکانی دیکە سەرنجڕاکێش و بڕواپێکراوە. لەبەر ئەوەی بەڵگە و هەڵکەنراوە و ئاسەوارە مێژووییەکان و بینا و تەلارە کۆنەکان و شوێنەوارە سروشتییەکان وەك داب و نەریت و ئەخلاق و زمان و شێوە و قەڵافەت و هتد.... باشترین ڕێنیشاندەر و بڕواپێکراوترین ڕێنومای ئەم بوارەیە کە خێراتر کەسەکان لەمەبەست نزیك دەکەنەوە (کەهەمان تێگەیشتن لەڕاستییەکانە).

بەمپێیە مێژوونووس دەتوانێت بەهۆی ئەم بەڵگە و ڕێنیشاندەرانە لەسەر هەرباسێك داوەری و هەڵسەنگاندن بکات کەکێشە و ناکۆکی لەسەرە و لەجیاوازییەکان، ئەنجامێك بەدەست بێنێت کەزیاتر لەهەموو ئەنجامەکانی دیکە لەبەڵگە و شوێنەوارەکان نزیکە و لەڕاستییەکان نزیکی دەکاتەوە.

بۆ نموونە سەبارەت بەباسەکەی ئێمە کەپەیوەندی بەنەژادی کورد و گێڕانەوەی بارودۆخی ئەم نەژادەیە، دەستەیەك کەخولیای بەعەرەب کردن بەسەر ئاوزی ئەواندا فەرمانڕەوا بووە و پێدادەگرن لەوەی هەموو کەسێك و هەموو شتێك بۆ عەرەبەکان بگێڕنەوە، کوردەکان بەعەرەب و سامی نەژاد ناو دەبەن تەنانەت ڕەچەڵەك نامەیەکی عەرەبییان بۆ کورد داڕشتووە (دواتر ئاماژەی پێدەدرێت). بەڵام دەستەیەکی دیکە کوردەکان بە(ئاری) دەزانن و بۆ نەگەڕانەوەی کوردەکان بۆ سەر نەژادی عەرەب چەندین بەڵگە و بورهان ئاماژە پێدەدەن. هەڵبەت لێرەیشدا دووبارە دەبێت ئاوز و هەستەکان فەرمان بدەن و بەپێی بەڵگە و شوێنەوارە سروشتییەکان و شێوە و قەڵافەت و ئەخلاق و زمان ئەوە بسەلمێنێت کەکورد

عەرەبە یا ئاری؟

مێژوونووس کاتێك ڕووبەڕووی جیاوازی دەبێتەوە، سەرەتا دەبێت بۆ شوێنەوارە و بەڵگە مێژووییەکان بگەڕێتەوە کەوەك بەڵگە دڵنیاکەرەوەکان لەقەڵەم دەدرێن. ئەگەر ئەم بەڵگانە بوونی نەبێت، دەبێت پشت بەکتێبەکانی سەردەمی کۆن (عەهدی عەتیق) ببەستێت کە٣٧ سەدە پێش ئێستا نووسراون و کۆکراونەتەوە و لەڕووداوە سەرەتاییەکانەوە نزیکترن. تا هەنووکەیش کەس ڕەخنەی لەبەشی مێژوویی ئەم کتێبانە نەگرتووە و بەپێچەوانەوە دۆزینەوە تازەکان، هێدی هێدی، بەشە مێژووییەکانیانی پشتڕاست دەکاتەوە. جیاواز لەوە پێش توانایی مرۆڤ بۆ خوێندنەوە نووسراو و کەتیبەکانی میسر و بابل و ئاشور و ئێران، تاکە سەرچاوەی زانیارییە مێژوویی و جوغرافیاییەکان تەنیا و تەنیا کتێبەکانی عەهدی عەتیقە، ئەگەر بەڵگەیەکی دیکەش بوونی هەبێت لەبەر ئەوەی لەبەر چاوی رای گشتیدا نییە و نەبووە، گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادرێت.

مێژوونووس لەهەر کێشەیەك سەرەتا دەبێت بۆ ئەم دوو ڕێگەچارە بگەڕێتەوە: ئاسەوارە عەنتیکەکان، کتێبەکانی عەهدی عەتیق. ئەگەر بەپشتبەستن بەوان کێشەکە چارەسەر نەکرا، ناچارە بۆ کتێبەکانی ئەو نەتەوە و نەژادە یا ئەو سەرزەمینە بگەڕێتەوە چوونکە نووسەرە ناوخۆییەکان زیاتر و باشتر لەکەسانی دیکە شارەزایی بارودۆخی وڵاتەکەی خۆیانن تا بیانییەکان یا گەشتیار و ڕۆژهەڵاتناسانی ڕۆژئاوا. لەبەر ئەوەی گەشتیاران و ڕۆژهەڵاتناسان زانیارییەکانی خۆیان لەدانیشتووانی ئەو ناوچە بەدەست دێنن و گێڕانەوەی کەسەکان دەکەنە سەرچاوەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان لەکاتێکدا ئەگەری هەیە گێڕانەوەی ئەو کەسە لەلایەن کۆمەڵگاکەیەوە بڕواپێکراو نەبێت. هیرۆدۆت، مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنان، لەبەرهەمەکەی خۆی، مێژوو لەنۆ بەرگدا، دەڵێت: (( من ئەوەی بیستوومە، دەینووسم، بەڵام ناچار نیم بەوەی دەینووسم، باوەڕم هەبێت)).

زانیاری گەشتیاران یا ڕۆژهەڵاتناسەکان بەبەراوەرد بەزانیاری مێژوونووسە ناوخۆییەکان یا مێژوونووسانی دراوسێ کە لەڕووداوەکانەوە نزیکن و لەلایەن کۆمەڵگاوە بڕواپێکراون و لەسەرەتای نووسینەوە کەس ڕەخنەی لێ نەگرتوون، لەپلەی چوارەمی بەڵگە مێژووییەکان هەژمار دەکرێت، یانی یەکەم: ئاسەوارە کۆنەکان، دووەم، کتێبەکانی عەهدی عەتیق، سێیەم: مێژووە نێوخۆییەکان یا ئەو نەتەوانەی لەڕووداوەکان بەشدارن، چوارەم،

سەفەرنامەی گەشتیاران و ڕۆژهەڵاتناسە ڕووداوخوازەکان.

هەرچەند سنووری باسی ئەم کتێبە دەبەزێنێت، بەڵام بۆ سەلماندنی ڕاستی زانیاری مێژوونووسە ناوخۆییەکان لەزانیاری بیانییەکان، دەبێت ئاماژە بەم خاڵەی خوارەوە بدەم:

لەساڵی ١٣٣٨ کۆچی، ١٢٩٨ هەتاوی کەبەڕێز عەلی محەممەد بەنی ئادەم (شەریف ئەلدەولە) حوکمرانی کوردستان، وەك ئەرکی دەوڵەتەکەی سەرقاڵی سەرکوت کردنی تایەفەی گوڵباغی بوو، ڕۆژێك لێپرسراوێکی بیانی کە لەکوردستان بوو، بەحوکمرانی وت: دوێنێ بەتەیارە (فرۆکە) لەناوچەکانی گوڵباغی گوزەرم کرد، لەنزیك گوندی نازانوم کۆمەڵێك سوارم بینی، گومان دەکەم گوڵباغییەکان بوون.)) شەریف ئەلدەولە لەنووسەری (نووسەری ئەم کتێبە) پرسی: دووری گوندی نازانوم تاشار چەند فەرسەخە؟ هەرچەند بیرم کردەوە، گوندێکی لەوشێوەم لەو ناوچەیەدا پەیدا نەکرد. لێپرسراو لەبێدەنگی و گومانی نووسەر سەریسوڕما، کەسێکی نارد بۆماڵەوە و نەخشەیان هێنا. سەیری نەخشەکەمان کرد. بینیمان لێپرسراوەکە ڕاست دەکات. دواتر دوای بەراوەرد کردنی نەخشەی لێپرسراوی ئاماژە پێدراو و نەخشەی کوردستان کەخۆم(نووسەر) دامنابوو) ئەم گومانەمان لا دروست بوو کەئەندازیاری ئینگلیسی لەکاتی نەخشەبەرداری، لەو کەسەی کەهاوڕێیەتی کردووە، ناوی گوندەکەی پرسیوە، ئەویش لەوڵامدا بەکوردی وتوویەتی: نازانم. ئەندازیار گومانی کردووە، (نازانم) ناوی گوندەکەیە و لەجیاتی ناوی گوندەکە، نازانومی بەکار بردووە. لێپرسراو ناچار بوو نەخشەکەی خۆی بەپێی نەخشەی کوردستان چاك بکات. کاتێك سەیری گوندەکانی دیکەمان کرد بینیمان بەهەمان شێوە کە لەکتێبە مێژوویەکان ناوی کەیقوباد و کەیکاوس و توس و فەریبۆرز و ئازدیاك و بەهمەن و ئیسفەندیار ونبووە و لەجیاتی ئەوانە دەستەواژەی وەك ئارباس، کامبوز، دژزس، فەراهورت، ئیختویگوو، ئەحشویروش، گزرس دەرکەوتووە کەهیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ ناوە سەرەکییەکاندا نییە. زۆربەی گوندەکانیان بەمشێوەیە شێواندووە و لەجیاتی ناوی ڕەسەنی خۆیان، شتی سەیروسەرمەی دیکەیان نووسیوە. لێپرسراو ناچار نەخشەکەی خۆی چاك کرد.

زۆرترین هۆکاری گۆڕانی ناوی گوندەکان و خەڵکان، ئەو هەڵە و دەسکارییانەیە کەگەشتیار و ئەندازیارە بیانییەکان کردوویانە.

بەتایبەت شێواندنی یۆنانییەکان کەویستوویانە ناوەکان و وشەکانی هەر زمانێك لەگەڵ زار

و شێوەزاری خۆیاندا بگونجێنن بۆیە ناوی پاشاکانی جیهان و بەتایبەت پاشاکانی کورد و فارسیان شێواندووە و وشەیەکی سەیروسەمەرەی دیکەیان لێ دروست کردووە.

جیاواز لەوە دەتوانین جیاوازی و ناکۆکی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەسەر زۆر لەبابەتەکان ببینین. بۆنمونە کەسانێك وەك سەر – کینگ دەڵێن کەمیتانییەکان تایەفەیەك لەعەشیرەی کاسین و کەسانێك وەك پرۆفیسۆر سپایزار دەنووسن کەتیرەیەك لەعەشیرەی سۆبارییە و بەمپێیە و لەئەنجامی ئەم شێواندن و بەلاریدا بردنەدا بۆمان دەردەکەوێت کەبیانییەکان هەڵە و ناڕاستییەکانی خۆیان بەپێی زانیارییەکانی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەو سەرزەمینە ڕێکبخەن نەك ئەوەی دانیشتووانی ڕەسەن زانیارییە ڕاستەکانی خۆیان لەگەڵ هەڵەکانی ئەواندا بگونجێنن.

بەواتایەکی دیکە دەڵێم کەمێژوونووسەکانی ڕۆژئاوا دەبێت گەزرس و ئەحشویروش و کەسانی دیکە بەئیسفەندیار و بەهمەن بگۆڕن نەك ئەوەی ئێمە ئیسفەندیار و بەهمەنی خۆمان بۆ وشەکانی ئەوان بگۆڕین کەئاشنا نین پێیان. وەك ئامارەمان پێدا گەشتیار و ڕۆژهەڵاتناسەکان زانیارییەکانی خۆیان لەدانیشتووانی ناوچەکەوە بەدەستهێناوە، چۆن دەکرێت بەزانیاری دانیشتووانی ناوچەکە ڕازی نەبین کە: ((صاحب البيت ادرى البيت واتا: خاوەن ماڵ بەدەردی خۆی دەزانێت)).

لەم ڕوونکردنەوەی سەرەوە ئەو ئەنجامە بەدەست دێنین کە لەڕووداوەکان دوای دروست بوونی نووسین و کتێب، زانیارییەکانی دانیشتووانی هەر ناوچەیەك گرنگتر لەزانیاری بیانییەکانە. بەڵام لەڕووداوەکان پێش دەرکەوتنی نووسن و کتێب، تەنیا ئاسەوارە کۆنەکان و بەڵگە مێژووییەکان دەتوانن لەمێژوو و داستانی دانیشتووانی ناوچەکە لەپێشتر و بڕواپێکراوتر بن چوونکە مێژووە نووسراوەکان بڕواپێکراوتر لەو مێژووانەن کەسینە بەسینە دەگێردرێنەوە. جیاواز لەمە هیچ بەڵگەیەك لەئارادا نییە زانیاری بیانییەکان بەگرنگتر و بڕواپێکراوتر لەزانیاری دانیشتووانی ناوچەکە بزانین.

## بەندی دووەم

## سەبارەت بەئافراندنی مرۆڤ

مرۆڤ لەکوێوە دەرکەوت؟ هیچ گومانێك لەوەدا نییە کەهەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی لەخودی زەوی دروست بوون و لەشوێنێکی دیکە یا هەسارەیەکی دیکە بۆ سەر ئەم هەسارە نەهاتوون. ڕۆژگارێکی کۆن کەزەوی گەرم بووە و هێزی گەشەپێدان و گەشەپێکردنی زیاتر و بەرینتر بووە، ئاژەڵە گەورە و زەبەلاحەکانی بەرهەمهێناوە وەك مامووت، فیل، وشتر، ئەسپ، مانگا، کەرگەدەن، کەر و لەباڵندەکان: وشترمل، داڵەکەرخۆر ، داڵ و ....

دواتر کەزەوی سارد بوویەوە، گیانلەبەرە بچووکەکانی بەرهەمهێنا: وەك شێر، پڵەنگ، ورچ، مەیمون، مرۆڤ، مەڕ، بزن و لەباڵندەکان، کەو، مریشك، کۆتر، شاهین و ....

هەنووکە کەپلەی ساردی زەوی کەمێك بەرزبۆتەوە، یانی گەرمی کەمتر بووە، دەبینین گیانلەبەری بچووکتر دروست دەکات وەك مار، مشك، مارمێلك، بزنمژە، بۆق، کیسەڵ، دووپشك، زەردەواڵە، جارجاڵۆکە، مێشوولە و ...

سەبارەت بەمرۆڤ تەورات و قورئان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کەیەکەم شێوەی ئەم نەژادە کە بەئادەم ناودەبرێت، لەزەوی دروستکراوە چ ئەم دروستکردنە لەیەك کات و یەك شوێندا بووبێت (وەك ئەوەی دینەکان جەختی لێدەکەنەوە) یا ئەوەی جیاجیا و لەچەند ناوچەی جیاواز (وەك ئەوەی زاناکانی بواری گەشەسەندن و نەژادناسی جەختی لێدەکەنەوە). بەڵام بەکۆی دەنگ، مرۆڤ لەزەوی بەرهەم هاتووە و لەشوێنێکی دیکەوە نەهاتۆتە سەر زەوی.

بۆچوونی پارسە کۆنەکان و پێشینانی کورد کەدەڵێن، دیاریکردنی یەکەم مرۆڤ ئەگەری نییە، پشت ئەستور بەیەك لەدوای یەکی و بێ سەرەتا بوونی وەچە و نەژادە کەدەڵێن هەمیشە هێلکە لەمریشك و مریشك لەهێلکە، ناوك لەدار و دار لەناوك دروست دەبێت بەڵام ئێمە دەڵێین دروست بوونی مریشك لەهێلکە و دار لەناوك حاشا هەڵنەگرە بەڵام ناتوانین نکوڵی لەو ڕاستییەیش بکەین کە تۆوی هەموو گیانلەبەر و ڕووەکەکان لەناو زەویدا بوونیان هەیە و شاراوەیە. هەروەها دەزانین هەموو تۆوەکان چ ئاژەڵی و چ ڕووەکی هەمووان لەتوخمە جیاوازەکان پێکهاتوون. ناتوانین نکوڵی لەپێکهاتە بکەین چوونکە بەڵگەیە بۆ دروستبوونی

شتێکی نوی، چوونکه پێکهاته لەگەڵ پێشینه و بێ سەرەتایی لەدژایەتیدایه، لەبەر ئەوەی سادەبوون لەپێش پێکهاتەوەیه. بەمپێیه ئەو ئەنجامه بەدەست دێنین کەهەموو ئاژەڵەکان و ڕوەکەکان و بوونەکان ڕوویانداوه و لەزەوی سەریان دەرهێناوه و هەموویان سەرەتایان هەیه. بەواتایەکی دیکه بۆ بوونی هێلکه و ناوك، بوونی مریشك و دار پێویست نییه و زەوی خاکی بەسەندەیه.

بۆئەوەی بزانین گیانلەبەر یا ڕوەك چۆن لەزەوی دروست دەبن، پارچەیەك زەوی وشك و خاڵی لەهەر بوونەوەر و ڕوەکێك دەکێڵین، دواتر ئاوی دەدەین. دوای ماوەیەك دەبینین جۆرەها گژوگیا و گوڵ، چەندین جۆر ئاژەڵی وەك مار، مشك، جارجاڵۆکه، کیسەڵ و هتد...چ نێر چ مێ، لەو زەویەدا پەیدا دەبن لەکاتێکدا نەتۆوی ڕوەکێکمان لەزەوی چاندووه و نەتۆوی ئاژەڵێکمان لەوێ داناوه. تەنیا زەویمان کێڵا بۆ ئەوەی ڕووناکی و گەرمی هەتاو و هەوا و ئاو بتوانن بەئاسانی کاریگەری لەسەر گەردیلەکانی دابنێن و کردەیەکی کیمیایی بخەنەگەڕ. بەمپێیه تۆوەکان کەسروشت لەو پارچه زەوییەدا وەك ئەمانەت دایناوه، دەکەونه جمووجۆڵ و هێدی هێدی گەشه دەکەن و پلەکانی گەشه کردنی خۆیان دەبڕن.

یان ئەوەی جۆگەیەك لێدەدەین و لەبەردەم جۆگەدا، حەوزێکی بچوك دروست دەکەین. دوای ماوەیەك که تیشك و گەرمی هەتاوی پێبگات، دەبینین چەندین جۆر گیانلەبەری ئاوی نێر و مێ وەك قرپۆك، کیسەڵ، قرژاڵ، ماسی و ..... دەردەکەون و چەندین جۆر گژ و گیا تیایدا نەشه دەکەن. لەکاتێکدا تۆوی هیچکام لەو گیانلەبەر و ڕوەکانەمان لەوێ بڵاو نەکردۆتەوه و چەندین نمونەی دیکەی لەمشێوەیه.

چەندین نمونەی دیکەمان بەفراوانی لەبەردەستایه بەڵام بۆ ئەوەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبه درێژ نەبێتەوه و لەچوارچێوەی باسەکەمان لانەدەین تەنیا بەگێڕانەوەی ئەم دوو نمونه بەسەندە دەکەین.

لەم دوو نمونه ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەهەسارەی زەوی، هەسارەی تۆو و گیانه بەواتایەکیتر هەسارەیەکه لەناوکه جۆراوجۆرەکان پێکهاتووه. ناوکەکان کەبێجووڵه و ئارامن، کاتێك تیشك وگەرمی و شێ و هەوا بەئەندازەی پێویست بەهەموو بەشەکانی بگات، دەستبەجێ کردەی کیمیایی دەستپێدەکات وناوکەکان، جموجۆڵ و گەشه کردن دەستپێدەکەن و لەسیلسیلەی گەشه کردنی خۆیان، درێژه بەڕەوتی سروشتی دەدەن.

ناوك چییە؟ ناوك یانی مادەی زیندوو، بریتییە لەبڕێك گەردیلەی ڕاکێشەری گونجاو کەگیان بۆ دەرخستنی خۆی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك نەزمی پێدەبەخشێت. کاتێك کەرەستەکانی ژیان، یانی هۆکارەکانی دەرکەوتن، پەیوەندی لەگەڵ ئەو گەردیلانە دروست بکەن، گیان بەخێرایی جموجۆڵ دەستپێدەکات و ئەوەی بۆ ڕەوتی گەشە کردنی خۆی پێویستیەتی، فەراهەمی دەکات.

بۆ نمونمە ناوکی بادەم، یەکێکە لەکەرەستەکانی ژیان، تا ئەو کاتەی دوور لەکەرەستەکانی ژیان بێت، سارد و بێ جووڵەیە بەڵام کاتێك پەیوەندی لەگەڵ کەرەستەکانی ژیان دروست دەکات، یانی لەزەوی دەچێندرێت و تیشك و گەرمی و شێ و هۆکارەکانی دیکەی گەشە کردنی پێدەگات، بەخێرایی لەنەبزوتنەوە دەست بەبزاوتن دەکات و ئەوەی بۆ سەفەری گەشە کردنی خۆی پێویستی بێت وەك ڕەگ و لاسك و توێکڵ و لق و گەڵا و دەمارەکان و هتد...... بەپێی توانایی و سازگاری کەرەستەکانی ژیان، بۆ خۆی بەرهەم دێنێت تا ئەوەی دەگاتە قۆناغی بلۆق یانی دەگاتە قۆناغی تۆودانان و بەرهەمهێنان و بەمشێوەیە بەردەوامی بەژیان دەدات.

لقی داری بی کەبۆ نمومە خاوەنی کەرەستەکانی ژیانە، هەرئەوەندە لەزەوی بیچێنن و ئاوی بدەن، لەماوەیەکی کەم گەشە کردن دەستپێدەکات، ڕەگ دادەکوتێت، بەرز دەبێتەوە، لق و گەڵا دەردەکات، بەکورتی ئەوەی بۆ ڕەوتی گەشەکردنی خۆی پێویستی بێت، ئامادەی دەکات. سەرەکیترین هۆکارەکانی گەشەکردنی گیانلەبەران و ڕوەکان شەش شتە:

١- مادەی ژیان ٢- خاك یا پزدان ٣- شێ یا تەڕی ٤- گەرمی ٥- هەوا ٦- تیشك یا نور. ئەم شەش هۆکارە سەرەکییە لەهەر شوێنێك و هەر خاڵێك بەئەندازەی پێویست کۆببنەوە و یەکبگرن، بەدڵنیاییەوە، چالاکی ژیان و گەشە کردن دەستپێدەکات.

دوای ڕوونکردنەوەی سەرەوە کە تارادەیەك ئاشنای چۆنیەتی گەشە کردن و ئافراندنمان دەکات، یانی ئافراندنی گیانلەبەر و ئافراندنی ڕوەك، دوو پرسیاری سەرەکی دێتە گۆڕێ:

یەکەم ئەوەی کە: زەوی لەچەند هەزار ساڵ پێش ئێستا سەرقاڵی دروست کردنی مرۆڤ بووە؟

دووەم ئەوەی: ئایا پرۆسەی دروست کردنی مرۆڤ لەهەموو ناوچەکانی گۆی زەویدا بوونی بووە یا ئەوەی تەنیا لەچەند ناوچەیەکی تایبەت ئەم دیاردەیە بینراوە؟

وەڵامی پرسیاری یەکەم تارادەیەك نەزانراوە و لێڵە. چوونکە ئەو ئەنجامەی لەکتێبەکانی عەهدی عەتیق بەدەستی دێنین ئەوەیە کەگۆی زەوی شەش هەزار ساڵ پێش ئێستا ئافرێنراوە و ئەگەر بەم بۆچوونە ڕازی بین دەبێت بەوە ڕازی بین کەدروست کردنی مرۆڤ سەد ساڵ پێش ئێستا دەستی پێکردووە بەڵام بەڵگە و شوێنەوارە مێژووییەکان و بینا و تەلارەکانی ژێر زەوی، ئاماژە بەتەمەنێکی درێژتر بۆ ئافراندنی زەوی دەکەن بەتایبەت ئەو شوێنەوارانەی بەم تازەییانە لەئەورووپا دۆزراونەوە، تەمەنی مرۆڤ بۆ پێش پێنسەد هەزار ساڵ دەگێڕنەوە. بەمپێیە ناتوانین بەدڵنیاییەوە ئەو سەردەمە دیاری بکەین کەزەوی مرۆڤی ئافراندووە. تەنیا دەتوانین ئاماژە بەوە بدەین سەردەمی گەشە کردنی مرۆڤ و مەیمون چەندین هەزار ساڵ دوای سەردەمی ماموت و فیل و وشتر و مانگا بووە یانی چەندین هەزار ساڵ پێش ئەم سەردەمەی کەسەردەمی مشك و بۆقە.

لەبەڵگەکان و ئاسەوارەکان بەو ئەنجامە دەگەین کە مرۆڤە سەرەتاییەکان گەورەتر و بەهێزتر لەمرۆڤەکانی ئێستا بوون.

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەم دەبێت بڵێین: دیاردەی بەرهەمهێنانی مرۆڤ هاوشێوەی بەرهەمهێنانی ڕوەك لەهەموو ناوچەکانی زەوی بەدی ناکرێت. لەهەر ناوچەیەك کەشەش هۆکاری سەرەکی ژیان بەئەندازەی پێویست کۆبووبێتنەوە و یەکیانگرتبێت، لەو ناوچانە مرۆڤ یا ئاژەڵ بەرهەم هاتووە و ئەو ناوچانە بریتین لە کەنار دەریاکان و زۆنکاوەکان. چوونکە شەش هۆکارە سەرەکییەکەی ژیان بەزۆری لەکەنار دەریاکان و زۆنکاوەکان کۆدەبنەوە بەڵام لەناوچەکانی دیکە ئەم کۆبوونەوەیە بەئاسانی نابینرێت و لانی کەم هۆکارێك یا دوو هۆکار بوونی نابێت و لەئەگەری ئامادە نەبوونی یەکێك لەهۆکارەکان، زانستی گەشە کردن ئەگەری نابێت.

ئەو گێڕانەوەی دەڵێت ئادەم لەسەرئەندیب چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، بەڵگەیە بۆ ئەم وتەیە (مێژووی تەواو ل.١٣ بەرگی یەك) (مروج ئەلزهب، پەراوێزی مێژووی تەواو، ل.٤٠ بەرگی یەك) و زۆربەی مێژووە گشتییەکان. سەرئەندیب دوورگەیەکە لەباشووری هیند کە بەسەیلانیش بەناوبانگە: نزیك هێڵی کەمەرەی زەوییە بەڵام لەتەورات ئاماژە بەعەدەن دراوە.

لەجیاوازی نەژادەکان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەگەشە کردنی مرۆڤ تەنیا لەیەك شوێنی ئەم جیهانە نەبووە بەڵکو لەچەندین ناوچەی جیاجیا و لەنزیك کەنار دەریاکان، مرۆڤ گەشەی

کردووە چوونکە کەرەستە سەرەکییەکانی پێکهاتنی ئەوان جیاوازە.

لەبیرمان نەچێت هیچ جۆرە لەمپەرێکی مەزهەبی یا ئاییینی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم بۆچوونەی ئاماژەمان پێدا، لەبەردەستا نییە تا ئێمە لەبۆچوونی خۆمان سەبارەت بەجۆراجۆری بنەماکانی نەژادی مرۆڤ پاشگەز بکاتەوە. بەڵکو ئایەکان و دەقەکانیش جەخت لەجۆراوجۆری دەکەنەوە. لەقورئان و تەورات و حەدیسەکانیش ئاماژەی پێدراوە کە کەمرۆڤ لەگڵ یا خاك ئافرێنراوە و مرۆڤ لەیەك رەگەزە کەبەڵگەیە بۆ جۆراجۆری و هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەوەی ناچارمان بکات بڵێین سەرەتا یەك کەس بووە، بوونی نییە. ئەگەر ئەمەیش بۆ یەك کەس بگەرێتەوە، گەشە کردنی یەك مرۆڤ لەسەر زەوی رێگر نابێت لەگەشە کردنی چەند مرۆڤێکی دیکە. لەئەگەرێکدا کۆسپ و لەمپەری دینیش لەئارادا بێت ناچارین روونکردنەوە و رێگەچارە بۆ لەمپەر و کۆسپەکان بدۆزینەوە چوونکە لەمپەرەکان رێگەچارەیان بۆ دەدۆزرێتەوە بەلأم هەست و بەڵگەکان لەناوناچن.

جیاواز لەوە ئەگەر باوەڕ بەجۆراوجۆری نەژادەکان نەکەین، لەوەلأمی ئەم پرسیارەی خوارەوە رووبەرووی گرفت دەبینەوە کەئایا یەکەم مرۆڤ رەش بووە یا سپی؟ ئەگەر رەش بووە، نەژادی سپی لەکوێوە هاتووە و ئەگەر سپی بووە، رەشپێستەکان چۆن دەرکەوتوون؟ ئەگەر ئێمە لەجیاتی پشتبەستن بەبەڵگە عەقڵانی و هەستپێکراوەکان پشت بەباوەڕە سوونەتییەکان و کتێب ببەستین، بەدڵنیاییەوە ئاوێنەی ئایین بەبەردی نەزانین دەشکێنین و جگە لەزیان و زەرەر هیچ ئەنجامێکی دیکە بەدەست ناهێنین. چوونکە سەرەکیترین بنەمای دین و مەزهەب لەسەر ئاوز و هەستەکان بەندە. ئەگەر حاشا لەئاوز و هەست بکەین، چیتر ئایینێك لەئارادا نابێت.

## بەندی سێ

## سەبارەت بەنەژادی مرۆڤ و ئاماژەدان بە هۆزەکانی مرۆڤ

لەڕوونکردنەوەکانی سەرەوە و بەڵگە زانستییەکان ئەو ئەنجامە بەدەست دێنین کەرەگەزی مرۆڤ تەنیا بۆ یەك نەژاد ناگەڕێتەوە. بەمپێیە زاناکانی بواری ڕەگەزناسی، ڕەگەزی مرۆڤیان بۆ چەند ڕەگەزێکی سەرەکی و لاوەکی دابەش کردووە و ڕەگەزی سەرەکی مرۆڤ بەچوار دەزانن:

١- نەژادی سپی
٢- نەژادی ڕەش
٣- نەژادی سور
٤- نەژادی زەرد

گومان دەکرێت دوو نەژادی کۆتاییش لاوەکی بن نەك سەرەکی، یانی لەتێکەڵ بوونی دوو نەژادی یەکەم دروست بووبێتن. بەمپێیە دوو نەژادی سەرەکی ڕەش و سپییە چ لەیەك مرۆڤ دروست بووبێتن وەك مێژوونووسەکانی دینەکان ئاماژەی پێدەکەن یا لەدوو مرۆڤ یا زیاتر بەهەمان شێوە کەڕەگەزناسەکان جەختی لێدەکەنەوە.

لەتەورات لەسەفەری گەشەکردن بەشی نۆیەم ئایەی ٢٢ ئاماژەی پێدراوە: مناڵەکانی حام بەهۆی ئەنجامدانی گوناح، ڕەش بوون و مناڵەکانی سام و یافس سپی مانەوە. لە(سبايك الذهب) و زۆربەی مێژووەکان بەمشێوە ئاماژەیان بەحام داوە. بەمپێیە مناڵەکانی حام چ بەهۆی ئەنجامدانی گوناح یا بەهۆی کاریگەری کیمیایی توخمە پێکهاتەییەکان، ڕەشپێستن و لەبەر ئەمە پێیان دەڵێن سودان: بەواتایەکی دیکە ڕەشەکان.

مێژوونووسانی ئیسلام و جوولەکەیش، نەژادی مرۆڤ بەڕەش و سپی دەزانن تەنانەت ئەگەر ڕەشەکان سەرەتا سپی بووبێتن و بەهۆی ئەنجامدانی گوناحەوە ڕەنگیان گۆڕابێت یا بەهۆی کرداره کیمیاییەکان ڕەنگی ئەوان ڕەش بووبێت.

بەهەرحاڵ باسی سەرەکی ئێمە لەم کتێبەدا تەنیا نەژادی سپییە، کارمان بەڕەش و زەرد و سور نییە. تەورات و زۆربەی مێژوونووسانی ئیسلامی و جوولەکە بۆ دوو جۆری سەرەکی

دابەش دەکەن سامی و یافسی. دەستەیەك شامی یان نووسیوە کەمەبەست لێی هەمان سامی و دەگەڕێنەوە بۆ سامی کوڕی نوح چونکە (س) و (ش) لەزمانی عیبری و عەرەبی دەگۆڕدرێن وەك روس و روش، مەسیح و مەشیح، سەموئیل و شەموئیل، ولآتی شامیش کەبۆ منالّەکانی سام دەگەڕێتەوە، جەخت لەڕاستی وتەکانی ئێمە دەکاتەوە.

لەئەنجامی ئەم روونکردنەوە دەردەکەوێت کەنەژادی ئاری چ لەمنالّەکانی یافس کوڕی نوح بن یا لەنەژادێکی دیکە، لەسامی و حامی جیاوازن چوونکە دەستەیەك هەموو منالّەکانی ئادەم تەنیا بۆ سام و حام ناگێڕنەوە. یانی بەتۆفانەکەی نوح و گەڕانەوەی رەگەزی هەموو مرۆڤەکان بۆ منالّەکانی نوح نین و دۆزینەوەکانی ئامریك بەلّگەیە بۆ ڕاستی ئەم وتەیە.

سامییەکان کە بەسامیتیش بەناوبانگن، چەند بەشێکن بەمپێیە:

عەرەبەکان، جوولەکەکان، ئاشورییەکان، کلدانییەکان، دانیشتووانی بابل، دانیشتووانی شام، ئارامییەکان، فینیقییەکان یا دانیشتووانی کەنارەکانی ڕۆژهەلآتی دەریای مەغریبی (دەریای سپی ناوەڕاست) کەتەرابلوسی ئەمڕۆ ناوەندی ئەو ناوچەیە، لەتەوراتدا بەنەژادی حام لەقەلّەم دراون بەواتایەکی دیکە لەگەلّ قیبتییەکان و بەربەرەکان و حەبەشییەکان و سودانییەکان هاونەژادن بەلآم زاناکانی رەچەلّەکناس، ئەوان بۆ نەژادی سام دەگێڕنەوە. بەلآم دەبێت ڕەشپێستەکانی ئەو ناوچە لەمنالّەکانی حام بن و سپیپێستەکان لەمنالّەکانی سام. جیاوازییەکان زەق و بەرچاون.

هێلّی بلآوبوونەوە و جیابوونەوەی سامییەکان، لەچیاکانی ئارارات بۆ بابل و لەبابل بۆ کەنارەکانی فەلەستین ئاماژەی پێدراوە. لەبەر ئەوەی ئەم بەشە پەیوەندی بەبابەتەکەی ئێمەوە نییە، لەباس کردنی چاوپۆشی دەکەین. ئەوانەی خوازیاری زانیارین لەسەر ئەم بابەتە دەتوانن پشت بەتەورات یا کتێبە مێژووییەکانی دیکە ببەستن.

هێلّی بلآوبوونەوە و جیابوونەوە ئارییەکان بەمشێوەیە: بەلآم سەرەتا دەبێت بزانین ئارییەکان بۆ سێ بەش دابەش دەکرێن: یەکەم هیندووەکان، دووەم ئەوروپاییەکان یانی لاتینەکان و ژێرمەنەکان و ئیسلاڤەکان و سەلّتەکان، سێیەم: ئێرانییەکان یانی پارس و کوردەکان جیاواز لەمادەکان و ئاراراتییەکان.

لەبەلّگە و شوێنەوارە مێژووییەکان ئەو ئەنجامە بەدەست دێت کە ئەم سێ دەستە ئاماژەپێدراوە، یانی هیندووەکان و ئەوروپاییەکان و ئێرانییەکان کەنەتەوەی ئاریان

پێکدەهێنن، چوارهەزار ساڵ پێش زایینی مەسیح، یانی شەش هەزار ساڵ پێش نووسینی ئەم کتێبە، هەموویان پێکەوە و لەیەك ناوچە و بەشێوەی خێڵەکی و بیابان نشینی ژیانیان بەسەر بردووە. دەستەیەك دەڵێن لەئاسیای ناوەڕاست بوون، دەستەیەك دەڵێن لەکەنارەکانی باکوری دەریای باڵتیك و دەستەیەك دەڵێن لەکەنارەکانی باشوری ئەسکەندیناڤی. دەستەیەك دەڵێن لەکەنارەکانی باشوری دەریای باڵتیك بوون یانی باکوری بەشی ئەوروپایی رووسیا.

هەرچەند بۆچوونی یەکەم بڕواپێکراوترە بەڵام بۆچوونی سێیەم لەبەڵگەکانەوە نزیکترە.

ئێمە گرنگی بەبەشی هیندو و ئەوروپایی نادەین چوونکە بابەتی کتێبەکەی ئێمە نییە. بیر و پێنووسی ئێمە لەکەنارەکانی ئێران یانی ناوچەکانی کورد و پارس دەخولێتەوە. بەواتایەکی دیکە لەنەژادی ئارياییەکان کە لەدەشتی ئێرانی ئێستا و ڕۆژئاوا نیشتەجێن و خاوەنی دەوڵەت و دام و دامەزراوەکان، دەدوێین.

## بەندی چوار:

## سەبارەت بەنەژادی ئاری و تیرەکانی

ئاری وشەیەکە پێکهاتووە لە (ئار) و (ی). ئار لەزمانی کوردی کە لەگەڵ فارسی کۆن لەیەك چاوگەوە سەرچاوەیان گرتووە و نزیکن لەیەك، بەمانای ئاگرە. بەهەمان شێوە (ئایر) و (ئاور) و (ئاهیر) و ئاتر و ئاگر لەناو شێوەزارە کوردییەکاندا بەمانای ئاگر دێت و هەنووکەیش بۆ ئەو مانایە بەکار دەبرێت. لەزمانی فارسی کۆن ئاگر بە هار و هیر و ئازەر و ئاتەر و ئاکر ناوی براوە کەهارا و هاربود و هیربود و ئازەربود و نەوزەر و نەوئازەر و ئازەرئاباد و ئازەر ئابادیان و ئازەر ئابادگان و ئاگرداد و ئاگراداد و ئاتراب و ئاترۆپاتین و ئاترۆپاتکین و ئاوروپا و سەرئەنجام ئەخگەر و ئەستیر و ئەستارە و ئاهور و چەندین وشەی هاوشێوەی دیکە چاوگەکەیان بۆ ئار دەگەرێتەوە و لەخۆگری مانای ئاگرن.

ئاری کەوشەیەکی پێکهاتووە لە(ئار) و (ی)، یانی ئاگر و ئاگرپەرەست و کۆی ئەم وشە دەبێتە ئاریان یانی ئاگرپەرەستەکان بەهەمان شێوە کەئەم دەستە هەموویان ئاگر پەرەست بوون و لەگەڵ ئاگردا ژیانیان بەسەر بردووە وەك چۆن دەڵێن حامییەکان بتپەرەست و سامییەکان خواپەرەست بوون.

ئەفغانستان کە لەکۆندا پێیان دەوت ئاریا بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کەدانیشتووانی ئەو سەرزەمینە لەئاگرپەرەستەکان بوون تەنانەت هەرا (=هەرات) لێرەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەهیر دروست کراوە و بەمانای ئاگرە.

وشەی ئەهریمەن کە (ئەهەر) و (مەن) پێکهاتووە، لەم بنەماوە سەرچاوەی گرتووە یانی شەریکی خواوەند کەکارە باشەکان ئاهورا و کارە خراپەکان ئەهریمەن ئەنجامی دەدات بەواتایەکی دیکە یانی ئاهرئاسا یا هاوشێوەی ئاگر.

وشەی هاگریان کە لەکتێبی یەکەم تواریخ الایام، بەشی پێنج، ئایەی دە ئاماژەی پێدراوە بۆ ئەمە دەگەرێتەوە کەکۆمەڵێك بوون ئاگرپەرەست جیاواز لەنەژادی سامی و دژی جوولەکەکان. هاگر کەوشە بەعەرەب کراوەکەی هاجەرە، ئەم یاسای بەسەردا جێبەجێ

دەبێت.

بەم پێیە بەپێی بەڵگە بینراو و بیستراوەکان کەئاماژەدان پێیان لەبەر کورت نووسین ئەگەری نییە، ئەوەمان بۆ دەسەلمێت ئەم دەستەیە کە ئەحامین و ئەسامی، بۆیە پێیان وتراوە ئاریان چوونکە ئاگرپەرەست بوون و ئاگر و هەتاویان بەپیرۆز زانیوە.

بەبڕوای ئەوانەی باوەڕیان بەتۆفانی گشتی هەیە و هەموو رەگەزی مرۆڤ بۆ سێ کوڕەکەی نوح دەگێڕنەوە، نەژادی ئاری لقێکە لەمناڵەکانی یافس. بەمپێیە دابەش کردنی سێپێست بۆ ئاری و سامی، هەمان دابەش کردن بۆ یافسی و سامی دەبێت و هیچ جیاوازییەك لەئارادا نییە بەواتایەکی دیکە چ بڵێین ئاری و سامی و چ بڵێین یافسی و سامی، یەك مانایان هەیە بەڵام لەبەر ئەوەی وشەی ئاری ئاگرپەرەستی ئەوانمان بۆ روون دەکاتەوە ئەم وشەیە بەزۆری لەجیاتی یافسی بەکار دەبرێت یانی دابەش کردنی ڕەچەڵەك ناسەکان گرنگی پێدراوە و بڵاوبۆتەوە.

ئەوەی دەستەیەك نووسیویانە: تەنیا لەبەر ڕۆژهەڵاتی بوونیان بەم دەستەیە دەڵێن ئاریان بەواتایەکی دیکە ڕۆژهەڵاتییەکان و بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە کەهەنووکەیش لەزمانی فەرەنسی وشەی (ئارین) بەمانای ڕۆژهەڵاتە، لەگەڵ هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە عەقڵیەکاندا یەکناگرێتەوە چوونکە بۆچوونێکی گشتی نییە و تەنیا ئەگەری هەیە بۆ دانیشتووانی ئێران ڕاست بێت و بۆ ئارییەکانی دیکە کەروویان کردۆتەوە سەرزەمینەکانی هیند و روسیا و ژاپۆن، ڕاست نییە لەبەر ئەوەی ئەوان لەڕێگەی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ئەو سەرزەمینانە نەڕۆشتوون. بۆ ئەمە دەبێت ئەوان بەئاری لەقەڵەم نەدەین کەپێچەوانەی ڕاستییە چوونکە مێژوونووسان بەگشتی و زاناکانی ڕەچەڵەك ناس ئەوان بەئاری دەزانن.

بۆچوونی ڕاست ئەوەیە بڵێین: ڕۆوژهەڵات لەبەر ئەوەی خۆر لەڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت بەئارین ناو براوە و بۆچوونەکەی ئێمە پشتڕاست دەکاتەوە.

یا ئەوەی دەستەیەکی دیکە نووسیویانە: لەزمانی سانسکریت و ئاڤێستا، ئاری بەمانای نەجیب و کردار جوانە و بەڵگەی ئەوە دەهێننەوە بەوەی کە: لەکتێبی (مەنوشاستر) کەکتێبی پیرۆزی هیندووەکانە، هیندستان بە(ئاریاوەرت) ناو دەبەن یانی نشینگەی ئەشراف و پیاوماقوڵان. لەکاتێکدا ئەمەیش هەڵەیە، چوونکە ئەگەر هیندستان لەبەر ئەوەی نشینگەی ئاگرپەرەستەکانە بەئاریاوەرت ناو ببەن، چ کێشەیەکی هەیە.

بەپێچەوانەوە پێویستە جیاواز لەوان هەموو دانیشتووانی دیکەی هیندستان نانەجیب و بێ شەرەف بن یا دانیشتووانی ئاری هەموویان نانەجیب بن و ئەمە پێچەوانەی ڕاستییە. چوونکە کەس نالێت بۆ نموونە سامییەکان نانەجیبن، لەبەر ئەمە بۆچوونی یەکەم ڕاستە و بەبەڵگەکان پشتڕاست دەکرێتەوە.

نەتەوەی ئاریان کەئەمڕۆ گەورەترین نەتەوەی دنیایە، پێش جیابوونەوە و کۆچ،چ لەئاسیای ناوەڕاست بووبێتن یا لەکەنارەکانی باشور و یا باکوری دەریای باڵتیك، بەوشێوەی زاناکانی شوێنەوار نووسیویانە: ئەم نەتەوە نزیکەی ٣٤٠٠ ساڵ پ.ز، کە بەبڕوای باوەڕداران بەتۆفانی گشتی دەبێتە هاوڕۆژگاری نوح، لەئەنجامی چەندین هۆکار کەلای ئێمە ئاشکرا و زانراوە نییە، بەکۆچ و بڵاوبوونەوە ناچار بوون. بەڵگە و شوێنەوارەکان، بەمشێوەیە هێڵی ئەم جیابوونەوەیە نیشان دەدات کەدەستەیەکیان بەرەو دۆڵی پەنجاب سەرەوخوار بوونەتەوە و لەو ناوچانە بڵاوەیان لێکردووە. هیندووەکان لەم دەستەن.

دەستەیەکی دیکە روویان کردۆتە یۆنان و ڕۆم و مەقدۆنیە و لەو ناوچانە نیشتەجێ بوون. تایەفەکانی (گرگ و لاتین و ئارناووت) لەم دەستەن.

دەستەیەکی دیکە روویان کردۆتە ڕۆژئاوا. لێرە بوونەتە دوودەستە. دەستەیەك لەڕێگەی مەرو و خوراسان بەرەو مازەندەران و کەنارەکانی دەریای خەزەر و ناوچەی ئازەربایەجان و لوڕستان و ئەرمەنستان و سەرزەمینەکانی کوردستانی ئەمڕۆ و لیدی بەڕێکەوتوون و تا سەرزەمینی شامات و سوریە و کەنارەکانی دەریای مەغریب، یانی دەریای سپی ناوەڕاست بڵاو بوونەتەوە. تایەفەی (باختەرییەکان و مادەکان) یانی خەزەر وگیل و دەیلەم و کورد و لوڕ و چرك و ئەرمەن و ئابازە و ئاڵبانییەکان لەم دەستەدان.

دەستەیەکی دیکە لەوان بەرەو ئەفغانستان و گورجستان و سەرزەمینەکانی فارس کە لەکۆندا بەپێی گێرانەوەی هیرۆدۆت بە(سەفن) ناوی براوە، بەڕێکەوتوون و تا کەنارەکانی دەریای عەممان بڵاو بوونەتەوە. نەتەوەکانی ئەفغان و بەلوچ و گورج و کرمان و پارسەکان لەناو ئەم دەستەیەدا دەبینرێن.

دەستەیەکیش لەهەمان ناوچە و ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست ماونەتەوە کەسیت و ئیسلاڤەکان یانی سەقالبە و سەغدەکان و سەکاکان و تورانییەکان لەناو ئەم دەستەیەدا دەبینرێن.

ئەم دەستەیە تا ماوەیەك دواتر درێژەیان بەشێوە ژیانی بیابان گەڕی داوە و نەیانویستووە لەناوچەیەك ئارام بگرن و نیشتەجێ بن و دەوڵەتێك پێکبێنن و لەکۆتاییەکاندا مەبەستی ئەوەیان کرد رووبکەنە دەشتی ئێران. ئاریانییەکانی ئێران ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرتن. لەنێوان ئەوان و ئێرانییەکان چەندین جەنگ روویداوە کەبنەمای داستان و بەسەرهاتە سەرەتاییەکانی ئێران لەو جەنگانە پێکهاتووە.

**بەندی پێنج: سەبارەت بەهۆز و لقەکانی ئاریانی**

تیرە و هۆزەکانی نەتەوەی گەورەی ئاریان بەمشێوەی خوارەوەیە:

١. ئەندوان، ٢. لاتین، ٣. ژێرمەن، ٤. سلاڤ، ٥. سەڵت، ٦. های، ٧. بلاژ، ٨. چەغزی، ٩. ئابادیان، ١٠. ئەز ئادیان، ١١. ئاجامیان، ١٢. مادایان، ١٣. پارسیان.

١. ئەندوان، بریتین لە: هیندووەکان، دانیشتووانی سند و پەنجاب و سیك و کشمیر

٢. لاتین، بریتین لە: دانیشتووانی فەرەنسا و ئیسپانیا و پورتوغال و ئیتالیا و رۆمانیا

٣. ژێرمەن، بریتین لە: تایەفەکانی ئاڵمان و ئینگلیس ساکس و ئەسکەندینازیا و گرك، ژێرمەن بەمانای بوێر و جەنگاوەرە.

٤. سلاڤ، بریتیە لە: رووسەکانی لەهستان و سرب و چیك.

٥. سەڵت، بریتین لە: بومییەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا.

٦. های، بریتین لە: ئەرمەن کە بەئاراراتیش بەناوبانگن.

٧. بلاژ، بریتین لە: دانیشتووانی بەلجیك و بولغارستان

٨. چەغزی، بریتین لە: بەشێك لەرووسەکان و سەقالیبە کە لەناوچەی سەرمەقەندەوە بۆ ئەو سەرزەمینە کۆچیان کردووە و بەسەغدییەکانیش ناویان دەبەن.

٩. ئابادیان کە بەئابادانیش بەناوبانگن، بریتین لە: ئەو ئاریانەی بۆ ئابادی گەورە دەگەڕێنەوە (= مە ئاباد) و ئەو یەکەم پێغەمبەری ئاسیای ناوەڕاست بوو. کتێبی (دساتیر) بۆ ئەو دەگەڕێننەوە. پایتەختی ئەوان بۆ ماوەیەك لەناوچەی بەڵخ بووە و هەموان شوێنکەوتەی مە ئابادن. لەم دەستەیە تەنیا چەرکەسەکانی قەوقاز ماوەتەوە یانی ئابازە و ئەنجاز لەزمانی کەلدە. ئابادیان بەئاپاتیان ناو دەبەن کەدواتر بۆتە ئاپتین و یافس بەعەرەب کراوی ئاپتە و مەبەست لەوشەی ئاپتین کە کلدانییەکان بەباوکی فەرەیدونی دەڵێن، هەمان

یافسییەکان بووە کەویستوویانە تەنیا ڕەچەڵەکی باس بکەن نەك ناو و نیشانی خۆی چوونکە ناوی ئەو ئانووش بووە و مەبەست لەناوبردنی ئاپتیان گەڕاندنەوەی ئەو بۆ نەژادی ئابادیانە.

دووایین پاشای ئەم سیلسیلە ناوی ئاباد ئازاد بووە کەبەدەستی نەماردە، یانی نەتەوەی منداڵەکانی کوش کوژراوە.[1]

١٠. ئادیان، کە بەئەزئادان ناویان بردوون. ئەم هۆزە بریتین لە: ئەو ئارییاییانەی بۆ ئازاد ئاباد دەگەڕێنەوە، لەمنداڵەکانی ئازادی گەورە، یانی مە ئاباد کەئاماژەمان پێدا بەدەستی منداڵەکانی کوش نەماردە کوژرا.

١١. ئاجامیان کە بەئاجامانیش ناویان بردوون. ئەم هۆزەیش بریتین لە: ئەو ئاری یانەی بۆ یاسان ئاجام دەگەڕێنەوە. لەوەچەی شای مەهبول، لەسیلسیلەی یاسانیان.[2] عەرەب ئاجامیان عەرەباندووە و بەعەجەم ناوی دەبەن. ئەم تایەفە بەگولشائییەکان یا گولشاهییەکان ناو دەبەن بەهۆی گەڕاندنەوەی ئەوان بۆ گەلیوشای یا گەلیوشا. گەورە باوەگەورێی ئەوان، شای یا شاە لەزمانی فارسی بەمانای سەروەر و خواوەند و پارێزەری جیهانە.

لەبەر ئەوەی سیلسیلەی پێشدادییەکان کەسیلسیلەی کیومەرسە، لەوەچەی یاسان ئاجامە، لەبەر ئەوە پێشدادییەکان بەئاجامییەکانیش ناو دەبەن. دوای مردنی یاسان ئاجام، چوونکە

---

[1] لەتەورات، سەفەری تەکوین، بەشی دەیەم ئاماژەی پێدراوە کەنەمرود کوڕی کوش، کوڕی حام کوڕی نوحە. نەماردە لەسەرزەمینی شەنعار یانی بابل و دوورگەی عەرەب بوون و تا کەنارەکانی ئەفریقا بڵاوە بوونەتەوە. نەماردە بەردەوام سەرقاڵی کوشت و کوشتار و تاڵان کردن بوون و لەبەر ئەمەیە بەجەباران ناویان دەرکردووە. لەجیاتی گورز، دارێکی جەنگەڵییان لەدەستا بووە و لەجیاتی خودە کەلەسەری گایان کردۆتە سەر و لەجیاتی زرێ، پێست پڵنگیان پۆشیوە و بەمپێیە قیافەیەکی مەترسیداریان بۆ خۆیان دروست کردووە و بەدێو ناویان بردوون و گەورەی ئەوانیان بەخەدیو (پاشا) کورتکراوەی (خوادیو) ناو بردووە.

[2] – مێژوونووسانی ئێران، سیلسیلەی پاشاکانی ئێران تا یەزدگێرد کوڕی شەهریان بەمشێوەیە پۆلێن دەکەن: ١. ئابادیەکان کە لەئابادی گەورە دەستپێدەکات. ٢. جیان، لەجی ئەفرام دەست پێدەکات. ٣. شائیان یا گولشائیان کە لەگیو پاشا دەست پێدەکات. ٤. یاسانیەکان کە لەیاسان دەست پێدەکات٥. پیشدادیان کە لەگیومەرس دەست پێدەکات٦. کیان کە لەکەیقوبادی کورد دەست پێدەکات.٧ ئەشکانیان کە لەئەسکەندەری رۆمییەوە دەست پێدەکات. ٨. ساسانیەکان کە لەئەردەشێری بابەکان دەست پێدەکات بەڵام مێژوونووسانی یۆنانی و ئەورووپی بەمشێوە پۆلێنیان کردووە: ١. ئابادیان٢ پێشدادیەکان.٣. ماردوشیەکان، ٤. ئاپتیان، ٥. شای شاکان،٦. کیان،٧. هەخامەنشیەکان،٨. پارسەکان،٩. سلوکییەکان،١٠ ئەشکانییەکان، ١١. ساسانییەکان

جێگرێکـی شـیاو کەشـیاوی پاشـایەتی و بـەڕێوەبردنی کاروبارەکـان بـوونی نـەبوو، بـۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، وڵاتی پێشدادی گیرۆدەی پشێوی بووە، خەڵکان لەلوتکەی چیاکان نیشتەجێ بوون و دەورانی پاشایەتی تیرەکان دەستیپێکردووە تا لەوەچەی ئەو گیومەرس لەساڵی ۲۲۱۸ دوای هاتنەخواری ئادەم، دەرکەوتووە و بەهۆی هەست و تێگەیشتنی خۆی، توانیویـەتی خـەڵکان لەلوتکـەی چـیاکان بێنێتـەخوار و لـەدەوری خـۆی کۆیـان بکاتـەوە و لەسـاڵی ۲۲٤٤ هاتنـەخوارەوەی ئادەم، یـانی سـاڵی ۳۳٤۱پ.ز، پاشـایەتی دامەزرانـدووە و یاسـاکانی دادپـەروەری و دادگـەری کەمـەئاباد لـەکتێبی دسـاتیر ئامـاژەی پێـداوە، زینـدوو کردۆتـەوە و لەبـەر ئەمـە پاشـایەتی ئـەو بەپاشـایەتی پێشدادی بەناوبانگـە. یـانی شـێوە و نەریت و دادپەروەری ئەو، هەمان شێوە و دادپەروەری پێشە و داهێنراو نەبووە.

(نخستین خدیوی که کشور گشود

یەکەم پاشا کەدەستی بەسەر سەرزەمینەکاندا گرت

سر تاج داران گیومرس بود

شای شاکان گیومەرس بوو

چو بنشست بر تخت و بنهاد تاج

کاتێك لەسەر تەخت دانیشت و تاجی کردەسەر

بینداخت از مرد دهگان خراج

باج و خەراجی لەسەر جوتیارەکان هەڵگرت. (فیردەوسی)

پایتەختەکەی شاری دەماوەندە کەخۆی بناغەی شارەکەی داڕشتووە. دواتر هێرشی کردۆتە سەر تورکستان و بناغەی شاری بەڵخی داڕشتووە.

قازی ناسر ئەلدینی بەیزاوی ئاماژە بەوە دەکات کەشاری ئیستەخریش لەسەر دەستی ئەو بناغەی دارێژراوە.

نووسـەری کتـێبی (غنیـە) دەنووسـێت: گیومـەرس هـەمان گـومر کـوڕی یـافس کـوڕی نوحـە کەعەرەبەکان بەعامر ناوی دەبەن. ئیبن خەلدون لەبەرگی دووەم، ل. ۱۵۵ کتێبەکەی، ئامـاژە بەبابەتێکی لەمشێوە دەدات.

یەکگرتنـەوەی مێـژووی لـەدایکبوونی گـومر و گیومـەرس کەمێژوونووسـان بەسـاڵی۲۲۱۸

دوای دابەزینی ئادەمی دەزانن وو لێکچوون و لێك نزیکی هەردوو ناوەکە کە(س) یۆنانی بەناوی دووەم لێکنراوە، ئەم بابەتە پشتڕاست دەکاتەوە.

دوای ئەوەی بەم بۆچوونە ڕازی بووین دەبێت بزانین کەگومر کوڕی خودی یافس نییە بەڵکو چەندین وەچە لەنێوان ئەواندا هاتووە و بەمپێیە جیاوازی لەگێڕانەوەکاندا نامێنێت.

١٢. مادایان، بریتین لە:ئەو ئاری یانەی بۆ مادا کوڕی یافس کوڕی نوح دەگەڕێنەوە. هۆزەکانی کورد و ئەلوار و گیلان و دەیلەمییەکان و خەزەران لەم هۆزەن. وشەی مادا لەم دواییانە و لەسەدەی نۆی پ.ز دەرکەوتووە و وشەی کورد پێش ئەم وشەیە بەکار براوە. هیرۆدۆت دەڵێت: مادەکان لەنەژادی ئارین بەڵام دواتر خۆیان بەماد ناو بردووە (مێژووی پیرنیا ل. ٤٩)، نووسەری (نخبە الازهریە) لە ل ٢١٣٦ دەڵێت مادەکان بریتین لەباوەگەوڕێکانی پارس کەعەرەبەکان بەئاجام ناوی دەبەن.

ئەگەر ئەم گێڕانەوەیە ڕاست بێت، دەبێت مادایان لەوەچەی خودی گومر بن بەڵام وشەی ماد سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کەمادایان لەوەچەی مادا، برای گومرن. بەیهەقی دەڵێت کورد و فارس و خەزەرە و نەبت و دەیلەم و جەرامقە (دانیشتووانی ڕەسەنی موسڵ کە لەدێرزەمانەوە لەو ناوچەدا ژیاون) لەمناڵەکانی ئاشور کوڕی سامن و ئەوان بەسامی دەزانێت لەکاتێکدا هیچ گومانێك لەسەر ئاری بوونی ئەوان لەئارادا نییە (دواتر ئاماژەی پێدەدەین).

١٣. پارسیان، کەبریتین لەو ئارییانەی لەوڵاتی سەفن یانی پارسی ئێستا و کەنارەکانی دەریای عەممان و ڕووباری ئەهواز نیشتەجێن. ئیبن خەلدون لەبەرگی دووی مێژووەکەی خۆی ل ١٥٥ دەنوسێت: بڕوای مێژوو نووسانی فارس لەسەر ئەوەیە کەپارس لەمناڵەکانی مادای کوڕی یافس کوڕی نوحە و لەگەڵ گێڕانەوەکەی بەیهەقی سەبارەت بەبرایەتی پارسەکان و کوردەکان و هۆزەکانی دیکەی ماد، یەکدەگرێتەوە. تەنیا لەیەك خاڵدا جیازان کەبەیهەقی ئاماژەی بەهیچ بەڵگەیەك بۆ گەڕاندنەوەی ئەوان بۆ ئاشور نەداوە. ئەگەر ئامارەی بەبەڵگەیەکیش دەدا، ئەمرۆکە لەبەر ئەوەی ماد بوونی کورد و پارس سەلمێنراوە، ڕەد دەکرایەوە. بەمپێیە گێڕانەوەکەی ئیبن خەلدون کە لەگەڵ مێژووی کوردان و بۆچوونی زاناکانی ئاسەوار، گونجاوە، زیاتر گرنگی پێدەدرێت.

لە(بورهاني قاطع) بەرگی یەك، ل ٤ دەنووسێت: دەستەیەك دەڵێن پارس بۆ پارس کوڕی

عامور کوڕی یافس کوڕی نوح دەگەڕێتەوە (عامر هەمان گومر کەئاماژەی پێدرا). بەڵام ئاری بوونی پارسەکان زیاتر لەهەموو گێڕانەوەکانی دیکە بەبەڵگەکان پشتڕاست دەکرێتەوە.

## سەبارەت بەکورد و کوردستان، لەخۆگری چوار بەند

### بەندی یەک، سەبارەت بەڕەگ و ڕیشەی کورد

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەبورهان و بەڵگە مێژوویەکان و بینا کۆن و شوێنەوارە دۆزراوەکان سەلمێنراوە کەکوردان، خەڵکانێکن ئاری نەژاد، لەڕەگەزی هیندوئەوروپایی، کە لەسەردەمێکی نائاسیی یانی چەند هەزار ساڵ پ.ز هاتوونەتە ناوچەکانی ئێستا کە لەباشوری ئەرمەنستان جێگیرە و بەکوردستان ناسراوە.[1] بەرەو ڕۆژهەلأت لەگەڵ ڕەوتی ڕووباری دیجلە و لقەکان بەدرێژایی زنجیرە چیای زاگرۆس تا کەنداوی فارس و کەنارەکانی دەریای عەممان ڕۆشتوون و بەرەو ڕۆژئاوا بەدرێژایی ڕووباری فورات و زنجیرە چیای تۆرۆس تا سوریە و سەرزەمینەکانی شام و کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بلأو بوونەتەوە. هەروەها سەلمێنراوە کەئەم کۆچە، لەسەرخۆ و بەدوای یەکدا بووە نەك ئەوەی بەیەکجار و لەیەك کاتدا (سەرچاوەی هاتنی ئەوان دیار نییە)

دەستەیەك لەمێژوونووسان وتوویانە کوردەکان لەکەنارەکانی باشور یا باکوری دەریای باڵتیك بەرەو قەوقاز و ئەرمەنستان هاتوون و لەوێوە بەزنجیرە چیای جودی (=ئارارات) هاتوون و بەرەو ڕۆژهەلأت تا کەنارەکانی دەریای عەمان و بەرەو ڕۆژئاوا تا کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بلأوبوونەتەوە.

دەستەیەکی دیکە دەڵێن کوردان لەڕۆژهەلأتەوە، یانی ئاسیای ناوەڕاست بەرەو کەنارەکانی دەریای مازەندەران (=دەریای خەزەر) هاتوون و بەدرێژایی زنجیرە چیای زاگرۆس و کەنارەکانی دیجلە بلأوبوونەتەوە و تا کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست ڕۆشتوون. بەشێکیان لەکەناری دەریاچەی وان نیشتەجێ بوون و چەندین شوێنەواری مێژوویی گرنگیان لەخۆیان وەك یادگار بەجێهێشتووە و دەسلأت و حکومەتێکی بەهێزیان پێکهێناوە.

پرۆفیسۆر فۆن مینۆرسکی دەڵێت: شێمانەی ئەوە دەکرێت کوردان لەڕۆژهەلأت، یانی ئێرانی ئەمڕۆیی بەرەو ڕۆژئاوا یانی کوردستانی ئەمرۆیی هاتبێتن و نیشتەجێ بووبێتن.

---

[1] . ڕاستییەکەی ئەوەیە کوردان دانیشتووانی ڕەسەنی ناوچەکەن و لەشوێنێکی دیکەوە نەهاتوون.

لەگەڵ ئەوەیشدا هاتنی ئەم دەستە لەکوردان لەمپەر نییە لەوەی لەکاتی هاتنی ئەوان دەستەیەکی دیکە لەکوردان یا چەند تیرەیەکی تێکەڵاو بەناوی کاردۆ، بۆ نمونە لەکوردستانی ناوەڕاست ژیانیان بەسەر بردبێت و دواتر تێکەڵ بەکوردە تازەهاتووەکان بووبێتن.

بەپێی ئەم گێڕانەوانە، هێڵی کۆچ و بڵاْبوونەوەی کوردان بەهۆی لەمپەرە سروشتییەکان سنورداربووە و نەیانتوانی لەشوێنەکانی خۆیان زیاتر پێشڕەوی بکەن یانی باکوری دەریای خەزەر و چیاکانی ئارارات و لەباشور دەریای عەممان و حکومەتی عیلام و لەڕۆژئاوا حکومەتی شومیر و ئەکەد و سەرئەنجام دەریای سپی ناوەڕاست، ڕێگری لەهێرش و دەستدرێژی کردنی کوردان گرتووە.

ئەوەی وتمان حکومەتی شومیر و ئەکەد لەبەر ئەوەیە مێژووی کوردان بەپێی شوێنەوارە مێژووییەکان زۆر کۆنتر لەمێژوویی کەلدە و ئاشور و پێشدادییەکانە چوونکە ئەو بەڵگە و ئاسەوارانە نیشانی دەدەن چەندین هۆز لەهۆزە ڕەسەنەکانی کورد کەبریتین لە لۆلۆ، کاسی، گوتی و هوری، لەگەڵ هۆزەکانی شومیر و ئەکەد و عیلام هاوسەدە بوون و چەندین جەنگ لەنێوان ئەوان روویداوە بەڵاْم تا ئەو سەردەمە ناوی کەلدە و ئاشور لەئارادا نییە و گیومەرس یەکەم پاشای پێشدادیش کەزەردەشتییەکان بەباوکی مرۆڤەکان ناوی دەبەن، هێشتا چاوی بەدنیا هەڵنەهێناوە. وەك دواتر ئامارەی پێدەدرێت، لەبەر ئەم هۆکارەیە ناتوانین بڵێین مێژووی کۆچ و بڵاْوبوونەوەی کوردان لەناوچەکانی ئێستا کۆنتر و لەپێشتر لەمێژووی کۆچی پێشدادییەکان بۆ ناوچەکانی پارسە.

بەهەرحاڵ لەشوێنەوارە سروشتی و نیشانە سیاسییەکان ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەگێڕانەوە ئامارەپێدراوەکان، هەرچەند بەڕواڵەت لەیەك جیاوازن بەڵاْم لەڕاستیدا، دەڵێی هیچ جیاوازییەکیان نییە یانی هاتنی کوردان لەباکور یا ڕۆژهەڵاْت ڕاستە، بەمپێیە کەدەستەیەك لەڕێگەی زنجیرە چیای ئاراراتەوە هاتبێتن و لەوێ بووبێتن بەدوو دەستەی دیکە. دەستەیەکیان لەکەنارەکانی فورات وبەدرێژایی زنجیرە چیای تۆرۆس تا کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و سوریە و سەرزەمینەکانی شام بڵاْوبووبێتنەوە و دەستەیەکی دیکە بەدرێژایی زنجیرە چیای زاگرۆس و کەنارەکانی دیجلە تا کەنداوی پارس و کەنارەکانی دەریای عەممان پێشڕەوییان کردبێت.

دەستەیەکی دیکە لەڕۆژهەلاَت، یانی ئاسیای ناوەڕاست بەرەو ڕۆژئاوا و باشوری دەریای مازەنـدەران و کـەنارەکانی ئازەربایـەجان و ناوچـەی ئیـسپەهان و هەمـەدان و کرمانـشا و لوڕستان هـاتوون. دەسـتەی یەکـەم بـەگودی یـا گـوتی نـاو دەبـەن کـەبۆ چیای جودی کـە بەعەرەب کراوی گودی یە، (ئارارات) دەگەڕێنەوە.

دەستەی دووەم بەکورتی ناو دەبەن یانی کوردی و تایبەت بەکورد کە (د) و (ت) دەبنە یەك و دواتر پارسەکان ئەوانیان بەسیرتی ناو بردووە[1] و لەم دواییانە یا لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆی پ.ز وەك هیرۆدۆت ئامارەی پێدەدات خۆیان بەماد ناو بردووە: مادی گەورە و مادی بچووك (=سەردەمی کەیقوباد) کەسەلمانازاری دووەم پاشای ئاشور، لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆی پ.ز ڕووبەڕوویان بۆتەوە. وەك دواتر بەمێژووی سێ دەوڵەتەکە ئامارەی پێدەدەرێت و دەڵێی لەڕاستییەوە نزیکە و زۆربەی مێژوونووسانیش، کوردانی یەکەم بەکوردانی ڕۆژئاوا یـا کـوردە ئاراراتییـەکان و کـوردانی دووەم بـە کـوردانی ڕۆژهـەلاَت یـا مادەکـان نـاو دەبـەن، ئێمـەیش لـەم کتێبـەدا هاوشێوەی ئـەوان کـوردانی یەکـەم بـەکوردانی ڕۆژئـاوا یـا ئـارارات و دەستەی دووەم بەکوردانی ڕۆژهەلاَت یا مادییەکان ناو دەبەن. کەواتە جیاوازی لەنێوان دوو گێڕانەوەی باکوری و ڕۆژهـەلاَتی بوونی کوردان نامێنێتـەوە و هـەردووکیان ڕاستن بەهـەمان شێوە کەپرۆفیسۆر مینۆرسکیش ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە.

کـام لـەم دوو دەسـتە زووتـر هـاتوون؟ هێـشتا بەڵگەیـەکی تـەواو لەبەردەسـتا نییـە بـەلاَم لەمێژووی شومیر و ئەکەد، دەستەی یەکەم بەزۆری ناوی هاتووە. دەستەیەك لەڕۆژهـەلاَت ئاسەکانیش، هـاتنی بەشـی دووەم بۆ ناوچەکە بۆ کۆتاییـەکانی سەدەی نۆ و سەرەتاکانی سـەدەی دەی پ.ز دەگێڕنـەوە. ئەگـەر ئـەم گریمانەیـە ڕاست بێـت، ئاشـکرایە کەگوتییـەکان (ئاراراتییـەکان) پـێش کورتییـەکانن (مادەکـانن) بـەلاَم بەدڵنیاییـەوە هـاتنی دەسـتەی دووەم پێش سەدەی ٢١ پ.ز بووە وەك دواتر ئامارەی پێدەدەین.

---

[1] - سیرت و سرت، لەشێوەزاری هەورامی کەسرەچاوەی هەورامی و فارسی یەکێکە، بەمانای دڕکە. (سرتی لوان ترتمرە یورە مونیم دەردە کەرو) یانی دڕکێك لەپەنجەم چەقیوە و نینۆکم ئازاری هەیە. لەبەر توند و تیژی و شەڕئەنگێزی بەم ناوە ناویان بردوون.

## بەندی دووەم
## سەبارەت بەپێشینەی کورد (بەشێوەیەکی گشتی)

بەپێی بەڵگە و شوێنەوارەکان، پێنج قۆناغ بۆ کوردان سەلمێنراوە:
یەکەم: قۆناغی پێش مێژوو: لەچەند هەزار ساڵ پێش زایین تا ساڵی ٣٦٠٠ پ.ز کەدەسەڵاتی نارامسین کوڕی سارگۆن لەسەر دەستی هۆزەکانی گوتی، یانی کوردە ئاراراتییەکان لەناودەچێت و سیلسیلەی پاشاکانی گوتی دەستپێدەکات و بۆ ماوەی زیاتر لەدوو سەدە فەرمانڕەوایەتی شومیر و ئەکەد دەکەن. ئەم قۆناغە لەبەر ئەوەی نادیارە و تا ئێستایش زانیارییەکی ئەوتۆی لێ بەدەست نەهاتووە، گرنگی زۆری پێنادەین.
دووەم: لەساڵی ٣٦٠٠-٨٥٣ پ.ز، یانی قۆناغی پەیوەندی کوردان لەگەڵ شومیر و ئەکەد و کەلدە و ئاشور و عیلام، لەسەردەمی پاشایەتی نارامسین تا دەرکەوتنی کەیقوبادی کورد، یانی ڕۆژگاری پێکهێنانی دەوڵەتی ماد کەپارس لەم قۆناغەدا بەشێکە لەدەوڵەتی ماد.
سێیەم: لەساڵی ٨٥٣-٥٥٠ پ.ز یانی قۆناغی دەسەڵاتی مادەکان تا دەرکەوتنی کەیخوسرەوی گەورە (= سیروسی مەزن) کەدەوڵەتی ئێران لەسیروسەوە دەست پێدەکات و مادەکان لەم کاتەدا دەبنە بەشێك لەئێران.
چوارەم: لەساڵی ٥٥٠ پ.ز تا قۆناغی ئیسلام، یانی لەسەردەمی کەیخوسرەوی مەزن تا کاتی جیابوونەوەی کوردەکانی ڕۆژئاوا لەئێران کەکوردان لەم ڕۆژگارەدا جارناجار دەبنە حاکم بەڵام زۆربەی کات مەحکومن و ئەم قۆناغە، بابەتی سەرەکی بەرگی دووەمی ئەم کتێبە دەبێت.

### ١-کورد لە ٣٦٠٠-٨٥٣ پ.ز

لەسەردەمی پاشایەتی سارگۆنی یەکەم، پاشای ئەکەد کە بەساراگینیش ناوی دەبەن، سەبارەت بەهۆزە کوردەکان شتێکی ئەوتۆ لەئارادا نییە بەڵام نارامسین کوڕی ئەو پاشایە، ڕووبەڕووی کوردان دەبێتەوە. لەسەرەتای سەدەی ٣٦پ.ز نارامسین، هۆزی لۆلۆ تێکدەشکێنێت (لۆلۆم). دواتر بەماوەیەکی کەم ئەم پاشایە، لەهۆزی گوتی، هاونەژادی

لۆلۆییەکان شکست دەخوات و پاشایەتی بابل یانی شومێر و ئەکەد دەکەوێتە دەست کوردە گوتییەکان. دواتر لەسەردەمی پاشایەتی گوت ئا، پێنجەم پاشای گوتی، دەوڵەتی عیلام باجی بەکوردەکان داوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەکوردەکان لەرۆژگاری سارگۆنی یەکەم و پێش ئەویش لەناوچەکەدا بوونیان بووە بەڵام چوونکە هیچ ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەنێوان ئەوان و ئەکەد و شومێر لەئارادا نەبووە، لەناو مێژووی شومێر و ئەکەد تا پێش نارامسین ناوی ئەوان نەبراوە.

وەك لەکتێبی (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك، ل ١٨٦) ئامارەی پێدراوە، لۆلۆییەکان لەسەردەمی سارگۆنی یەکەم، پاشایەتیان بووە و پاشاکەیان لاسیربا بووە. پرۆفیسۆر سپایزار لەکتێبی (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا ل ٩٩) (=نێوان دوو ڕووبار) ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە.

لەساڵی ٢٨٠٠ پ.ز، سارگۆنی دووەم دەرکەوتووە و کۆتایی بەدەسەڵاتی گوتییەکان هێناوە و ئەوانی لەسەرزەمینی بابل بەرەو زاگرۆس، شوێنی سەرەکی خۆیان گەڕاندۆتەوە و تا سەرزەمینی مادەکان پێشڕەوی کردووە. بەم شێوەیە هەموو ناوچەی مادستان و کوردستان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی بابل و بۆ ماوەی سێ سەدە ماد و کورد، یانی ڕۆژهەڵاتییەکان و ئاراراتییەکان باجیان بەدەوڵەتی بابل داوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت مادەکان لەسەدەی ٢٨ پ.ز لەناوچەی مادستان ژیانیان بەسەر بردووە. لەساڵی ٢٥٠٠ پ.ز یانی ڕۆژگاری فەرمانڕەوای زوحاکی عەرەب، وڵاتی پارسیش (=پێشدادییەکان) وەك ماد و کوردان باجیان بەدەوڵەتی کەلدە داوە و زوحاکییەکان فەرمانڕەوایەتی هەر سێ دەوڵەتەکەیان کردووە.

لەساڵی ٢٤٥٠ پ.ز دونگی، پاشای شومێر، ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە، هێرشی کردۆتە سەر عیلام و عیلامییەکان و لۆلۆی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی شومێر. لەساڵی ٢٣٥٨ پ.ز کەدەوڵەتی ئاشور دامەزراوە، تا ساڵی ٢١٩٢ پ.ز چیتر ئامارە بەناوی کورد نادرێت، نە ڕۆژهەڵاتی، نە ئاراراتی بەڵام گیومەرسی پێشدادی لەدەوروبەری ساڵی ٣٣٤١ پ.ز ٢٢٤٤ دابەزینی ئادەم، دەوڵەتی پێشدادی دادەمەزرێنێت و دەماوەند دەکاتە پایتەختی خۆی. لەدەوروبەری ساڵی ٢٦٠٠ پ.ز زوحاکی عەرەب لەبابلەوە هێرش دەکاتە سەر دەوڵەتی

پێشدادی و لەشاری ئیستەخری پارس لەگەڵ جەمشید پاشای پێشدادی جەنگاوە. سەرئەنجام جەمشید پاشا شکستی خواردووە و دەوڵەتی پێشدادی رووخاوە.

دواتر لەساڵی ٢١٩٢ پ.ز (٣٤٠١ دابەزنی ئادەم)، فەرەیدون پێشەوای پێشدادی بەهاوکاری کاوەی مادی و مادەکانی ئیسپەهان، دژی زوحاکییەکان شۆڕشیان کردووە و ولاتی پێشدادییەکان لەکۆیلایەتی و ژێردەستی کەلدە و زوحاکییەکان ڕزگار کردووە. لەم بگرە و بێنەدا کوردانیش لەو کۆیلایەتی و ژێردەستییە ڕزگاریان بووە. ئەم شۆڕشە هاوکاتە لەگەڵ پاشایەتی کوتورناخونتای یەکەم، پاشای عیلام کەشکستی بەدەوڵەتی بابل هێنا و دەرفەتی بۆ پێشدادییەکان و مادەکان رەخساند تا دژی زوحاکییەکان شۆڕش بکەن.

لەساڵی ٢٠١٨ پ.ز نینە پاشای ئاشور و کەلدە، هێرشی کردە سەر ولاتی ماد، پاشای مادی قۆڵبەست کردووە و لەداری داوە. ئەم پاشایە تا سەرزەمینی بەڵخ پێشڕەوی کردووە بەڵام نەیتوانی دەست بەسەر قەلای بەڵخدا بگرێت.

لەسەدەی ١٩ و ١٨ پ.ز لەنێوانە نەتەوەکانی ئاسیای بچووك و کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای ڕەش چەندین ڕووداو روویانداوە کەپەیوەندی بەمێژووی کوردەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتەوە هەیە (= گوتییەکان و مادەکان). لەم کاتەدا دەستەیەکی بچووك لەنەژادی ئاریان، هیندوئێرانی لەباکورەوە دەرکەوتوون و تا ڕۆژئاوای کوردستانی ئەمڕۆیی هاتوون و نیشتەجێ بوون. یەکێك لەبنەماڵەکانی ئەوان بەناوی میتانی، حکومەتێکی دامەزراندووە و ناوەندەکەی لەسەر ئاوی خابور بووە. ڕۆژهەلاتناسەکان ئەم دەستە تازەیە بەیەکێك لەتایەفەکانی کورد دەزانن کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین.

دواتر لەدەوروبەری ساڵی ١٧٦٠ پ.ز کوردەکانی کاسی لەگەڵ عەشیرە هاونەژادەکەی خۆیان، گوتی و لۆلۆ، بەفەرماندەیی خاندیژ، سەرۆکی کاسییەکان، هێرشیان کردۆتە سەر ولاتی کەلدە و دەستیان بەسەردا گرتووە و حکومەتێکی بەهێزیان لەلاگاش دامەزراندووە کە بەحکومەتی کاردۆنیا بەناوبانگە، یانی دەوڵەتی کوردان کە بۆماوەی شەش سەدە بەردەوام بووە.

لەم کاتەدا ولاتی مادا باجی بەدەوڵەتی ئاشور داوە. تەنیا دەسەلاتێکی بچوك لەبەڵخ و سەرزەمینەکانی دەوروبەری بەناوی توس، ماوەتەوە و باجی بەئاشورییەکان نەداوە. یۆنانییەکان توسە بەدیۆکس ناو دەبەن.

توس، جیاوازە لەتوس کوڕی فەریبورزی مادی کەدوای کەیقوباد، پاشایەتی ولاتی ماد دەگرێتە دەست. چوونکە ئەو هەزار ساڵ دواتر چاو بەدنیا هەڵدێنێت. هەروەها جیاوازە لەتوس کوڕی نەوزەر چوونکە ئەویش هێشتا بەدنیا نەهاتووە و ئەو یەکێکە لەبنەماڵەی پێشدادی نەك لەبنەماڵەکانی ماد. دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

لەسەدەی ١٦ پ.ز دەستەیەك ماتیانی یا مایتانی یا میتانی وەك ئاماژەمان پێدا، فەرمانڕەوایەتی هەموو کوردستان تا ئارابخا یانی کەرکوکی ئەمڕۆیی و ناوچەکانی ئاشور و دەشتی ئەربیل (هەولێریان) کردووە. بەشێك لەبەڵگە یاسایی و بازرگانییەکان کە لەکەرکوك دەستکەوتوون و مێژووەکەیان بۆ سەدەی ١٥ و ١٦ پ.ز دەگەرێتەوە، ئەوە نیشان دەدات کەدانیشتووانی کوردستانی ڕۆژهەلات، لەو ڕۆژگارەدا باجیان بەدەوڵەتی ئاشور و کەلدە داوە و گرفتاری کێشەنێوخۆییەکانیان بوون.

تەنیا لەدین و یاساکانی ولات و داب و نەریتی کۆمەلایەتی کۆك و هاودەنگ بوون.

حکومەتی میتانی لەسەرەتاکانی سەدەی ١٤ پ.ز لەگەڵ هیتەکان، لەسەر سەرزەمینی سوریا، جەنگیان دەستپێکردووە. لەم کاتەدا کاریگەری و دەسەلاتی ئاشورەکان بەردەوام روو لەزیادبوون بووە.

ئەدادنیرانی پاشای ئاشور (١٣١٠-١٢٨١ پ.ز) لەیەکێك لەبەرهەمەکانی خۆی، دەنووسێت (ئوردووەکانی کاسای، گوتی، لۆلۆم، سوباریم تێکشکاند))

سەلمانازاری یەکەم، فەرمانڕەوای یەکەمی ئاشور لەساڵی ١٢٨٠ پ.ز شەڕی لەگەڵ هۆزەکانی گوتی کردووە، وەك خۆی دەڵێت: ((چەندین بەلای قورسی بەسەر ئەواندا هێناوە.

دواتر لەئەنجامی هێرشە بەردەوامەکانی عیلام بۆ سەرزەمینی بابل و فراوان بوون و بەهێزبوونی ئاشور، کەم کەم دەسەلاتی کاردۆنیای (=کوردی) لاواز بووە. لەساڵی ١١٧١ پ.ز لەسەردەمی پاشایەتی تگلاسی نین، پاشای ئاشور، دەوڵەتی چەند سەد ساڵەی کاردۆنیا لەئەنجامی چەندین ڕووداوی نەزانراو، کۆتایی پێهاتووە و کوردەکانی کاسی بۆ شوێنەکانی خۆیان، یانی چیاکانی زاگرۆس کەدەکاتە لورستانی ئەمڕۆیی، گەڕاونەتەوە. ماد و لۆلۆ دەبنە ژێردەستەی بابل.

دواتر لەساڵی ١١٠٠ پ.ز تگلات پالازار پاشای بەهێزی ئاشور، لەگەڵ دانیشتووانی پارس و ماد و لۆلۆییەکان کەژێردەستەی بابل بوون، چەند جارێك جەنگاوە و کوردەکان و

پارسەکانی بەدانی باج ناچار کردووە. لەلای باشور تا کەنداوی پارسی گرتووە بەلاّم لەنێوان ١٠٩٨-١٠٦٨ پ.ز لەگەلْ کوردەکانی چیای ئازو[1] جەنگاوە بەلاّم شکستی خواردووە.

لەکۆتایی سەدەی نۆی پ.ز کەئاسور نازیربالْ پاشایەتی ئاشوری گرتۆتەدەست، کوردەکانی چیای زاگرۆس ملکەچی فەرمانەکانی نەبوون و خوازیار پەیوەست بوون بەبابل بوون. ئاسورنازیربال چوار جار دژی کوردەکان جەنگاوە، یەکەم جەنگ لەسالّی ٨٨٤ پ.ز روویداوە، جەنگ لەخاکی لۆلۆ روویداوە و ئاسورنازیربال بێ هیچ ئەنجام و دەسکەوتێك گەڕاوەتەوە. دووایین جەنگ کەبەفەرمانـدەیی جێگرەکەی یانی سەلمانازاری کوڕی، سوپایەکی بۆ سەرزەمینی لۆلۆ ناردووە، دەستی بەسەر چەندین شاردا گرتووە. فەرمانڕەوایی لۆلۆییەکان بەناوی ئامیخا، لەگەلْ دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی پەنای بردۆتە بەرکوێستان، سوپای ئاشور ناتەوان و سەرئەنجام بەئاشتی کۆتاییان بەکێشەکە هێناوە. سەلمانازار لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی خۆی، یانی کۆتاییەکانی سەدەی نۆیەمی پ.ز بەمەبەستی جەنگ رووی کردۆتە کوردستان و ڕووبەڕووی پارسەکان و مادەکان بۆتەوە و بەناوی پارسوا و ئامادا، ئاماژەی پێداون. لەسالّی ٨٥٩ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر ویلایەتی زاموا و تا چیای تاسلوجە و گلّەزەردەی داگیر کردووە. لەسالّی ٨٤٤ پ.ز سوپایەکی بۆ پشدەر و سەردەشت (نامری) ناردووە. پاشای نامری هەلاّتووە.

## ٢- کورد لە ٨٥٣-٥٥٠ پ.ز

لەسالّی ٨٥٣ پ.ز کەیقوبادی کورد کەیۆنانییەکان بەئاراباس ناوی دەبەن، دەرکەوتووە و دەولّەتی مادی دامەزراندووە.

ئەم پاشایە، پارس و کوردی لەکۆیلایەتی ئاشورییەکان ڕزگار کردووە و (هەنگمەدان=) هەمەدانی ئەمرۆیی کردۆتە پایتەختی خۆی و فراوان و ئاوەدانی کردووە. یۆنانییەکان ئەم پاشایە بەرووخێنەری دەولّەتی ئاشور و داگیرکەری نەینەوا دەزانن. (نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلاّت، ل ١٥٩-١٦٣، ئایینەی ئەسکەندەری، ل١٤٥)

لەشوێنەوار و بەلّگە بەدەستهاتووەکان، وەك بۆمان دەرەکەوێت کەکواکسار (=کیاکسار) کەناوی ڕاستینی ئەو هوواکساتار (=هووەخشتەر)ە، رووخێنەری دەولّەتی ئاشوورە (دواتر

---

[1] – درایواری رۆژهەلاّتناس دەلّێت: چیای ئازو بریتیە لە چیای هازو یانی چیای ساسونی ئێستا.

ئاماژەی پێدەدەین). (مێژووی پیرنیا، ل ٥٣، مێژووی گشتی ڕەزا ئەخەوی، ل ٨٢، نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات ، ل ١٥٨-١٦٤، مێژووی گشتی ئەحمەد رفیق، بەرگی یەکەم ل ٣٦٦-٣٦٩ و مێژووی ئەمین زەکی و هتد)

لەساڵی ٧٤٤ پ.ز تکلاس پالازاری دووەم، پاشای تازەی ئاشوور لەگەڵ مادەکان جەنگاوە و شەست هەزار ئەسیر و تالآنییەکی زۆری بۆ پایتەختەکەی خۆی بردووە. سارگۆنی سێیەم، پاشای تازەی ئاشور، دووبارە لەگەڵ کوردانی مادی جەنگاوە. یەکەم جەنگ ساڵی ٧١٥ پ.ز روویداوە. دەخو کەیۆنانییەکان بەدیائاکۆ ناوی دەبەن، سەرۆکی مادەکان بووە (فیردەوستی بەدەغو ناوی دەبات). سارگۆن قۆلبەستی دەکات و ڕەوانەی سەرزەمینەکانی شامی دەکات. جگە لەوە چوار هەزار و هەشتسەد و بیست کەس لەپیاوماقوڵان و ناودارانی کوردی بۆ سوریا کۆچ پێکردووە.

لەدووەم جاری هێرش بۆ سەر کوردستان، کوردەکانی ملکەچی فەرمانەکانی کردووە. چل و پێنج کەس لەسەرکردە کوردەکان ڕۆشتوونەتە دەرباری ئاشور و سارگۆنیان وەك پاشای خۆیان ناو بردووە و بەڵێنیان داوە دواتر باج بەدەوڵەتی ئاشور بدەن.

لەسەدەی حەوتەم یانی ٨٠٠ پ.ز، یەکێك لەپاشاکانی کاردۆنیا، دەستی بەسەر کەلدەدا گرتووە. سەنحەریب کوڕی سارگۆنی ئاماژە پێدراو ڕووبەڕووی بۆتەوە، ئەوی بەزاندووە و بەهەڵاتن ناچاری کردووە، دواتر دەستی بەسەر بابلدا گرتووە و ئەسیرەکانی لەگەڵ خۆی بردووە.

لەڕۆژگاری ئاسارهادون کوری سەنحاریب (سەنحەریب) (٦٨١ پ.ز) دەوڵەتی ئاشور گەیشتۆتە ترۆپکی هێز و جارێکی دیکە دەوڵەتی ماد و پارس بوونەتە ژێردەستەی ئاشور. دوای ئاسارهادون، ئاسوربانیپاڵی کوڕی جێگەی گرتۆتەوە. لەکاتی مردنی ئاسوربانپیاڵ کەساراکوسی کوڕی پاشای ئاشور بووە، دەستەیەك سواری شەڕکەر لەدەستەی سەکاکان (=سیت) لەسەرزەمینەکانی باکور هێرشیان کردۆتە سەر ئاشور و ئاسیای بچوك و چەند سەد ساڵێك لەو ناوچەیە سەرقاڵی تالآنی بوون. لەم کاتەدا توس پاشای ماد، کۆچی دوایی کردووە و فەریبورزی کوڕی (=فەراهورت) لەسەر تەختی پاشایەتی ماد دانیشتووە (٦٥٥پ.ز). لەم ڕۆژگارەدا پارس شوێنکەوتە و ژێردەستی دەوڵەت ماد بووە. (مێژووی پیرنیا ل ٥٢)

لەساڵی ٦٢٥ پ.ز فەریبورزی ئاماژە پێدراو لەجەنگ دژی ئاشور شکست دەخوات و دەکوژرێت. دوای ئەو کواکسار (=هوواکساتار) پاشایەتی مادی گرتۆتەدەست و بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی هێرشی کردۆتە سەر دەوڵەتی ئاشور. ئەم پاشایە دەتوانێت سوپای ئاشور تێکبشکێنێت و گەمارۆ بخاتە سەر شاری نەینەوا. بەڵام لەبەر هێرش و پەلاماری سەکاکان لەسنوری دەوڵەتی ماد دەستی لەگەمارۆکە هەڵگرتووە و هێرشی کردۆتە سەر سەرکاکان. بەرێکەوت لەسەر دەستی سەکاکان رووبەرووی شکست دەبێتەوە و وڵاتی ماد دەبێتە شوێنی تەراتێنی سەکاکان. سەکاکان بۆ ماوەی ٢٨ ساڵ لەناو دەوڵەتی ماد دەمێننەوە تا ئەوەی لەساڵی ٦١٥ پ.ز کواکسار لەئێوارێ خوانێکدا کۆتایی بەژیانی سەرکردەکانی سەکا دێنێت و لەوڵاتی ماد دەریان دەپەرێنێت. دواتر کواکسار جارێکی دیکە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی روودەکاتە دەوڵەتی ئاشور و لەگەڵ نابوپولاسار فەرمانڕەوای بابل کە بەنوێنەرایەتی دەوڵەتی ئاشور فەرمانڕەوایەتی ئەو سەرزەمینەی دەکرد، پەیمانی بەستووە و کچەکەی خۆی کردۆتە هاوسەری بەختنەسر (نابوکودنزر) کوڕی فەرمانڕەوای بابل. بەمشێوەیە سوپای ماد و پارس و عیلام و بابل و عەرەب هێرش دەکەنە سەر دەوڵەتی ئاشور و نەینەوا داگیر دەکەن.

ساراکوس، کوڕی ئاسوربانیپاڵ کەتازە باوکی مردووە و جێگەی باوکی گرتۆتەوە، دوای بینینی بارودۆخ، لەژیان هیوابڕوا دەبێت و لەگەڵ بنەماڵەی سەڵتەنەتی خۆیان دەکەنە پارووی ئاگر. بەمشێوەیە وڵاتی ئاشور لەنێوان پاشای ماد و بابل دابەش دەکرێت (٦٠٦ پ.ن) (تاریخی پیرنیا ل ٥٣، مێژووی گشتی ڕەزا ئەخەوی، ل ٨٢، نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەڵات، ل ١٥٨-١٦٤، مێژووی گشتی ئەحمەد رەفیق، بەرگی یەکەم ل، ٣٣٦-٣٦٩، مێژووی ئەمین زەکی و هتد)

مستر هول لەکتێبی نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەڵات، ل ٥١١ دەنوسێت: ئاسوربانیپاڵ دوایین پاشای بەهێزی ئاشور، چۆکی بەفەرمانڕەوای (مانی)[1] داداوە بەڵام نەیتوانیوە لەگەڵ کوردە بوێرەکان هیچ بکات.

لەم کاتەدا دەوڵەتی ماد زۆر بەئاسانی دەست بەسەر ئەرمەنستان و کاپادوکیە لەرۆژهەڵاتی ئاسیای ناوەڕاست دەگرێت و دواتر هێرشی کردۆتە سەر لیدی. جەنگ دژی لیدی شەش

---

[1] ، مانی: خەڵکانێك بوون لەنازەربایەجان و کەنارەکانی دەریاچەی ورمێ کەهاونژادی کوردانن. (مێژووی پیرنیا ل ٤٩)

ساڵ درێژەی کێشاوە. دواتر بەهۆی ڕوودانی مانگ گیران، ئەم جەنگە بەئاشتی کۆتایی پێهاتووە و ئالیات، پاشای لیدی کچەکەی خۆی، (ئارتی نیس) دەکات هاوسەری ئازدیاك کوری کواکسار. کواکسار لەساڵی ٥٨٤ پ.ز دەمرێت. بەختنەسر لەساڵی ٥٦١ پ.ز دەمرێت.

### ٣- کورد لە ٥٥٠ تا ڕۆژگاری ئیسلام

کەیخوسرەوی دووەم (=سیروسی مەزن) کەبەکوروش بەناوبانگە، لەساڵی ٥٥٨ پ.ز دەبێتە پاشای پارس. دواتر ئانزان (=عیلامی) ملکەچی فەرمانەکانی خۆی کردووە و لەساڵی ٥٥٠ پ.ز لەئەنجامی ڕق و بێزاری مادەکان لەپاشایەتی ئازدیاك (=ئیختویگۆ- کەیخوسرەو) هێرشی کردۆتە سەر دەوڵەتی ماد. لەیەکەم هێرش ڕووبەڕووی شکست بۆتەوە بەڵام لەهێرشی دووەم شکستی بەسوپای ماد هێناوە و سەرئەنجام دەست بەسەر هەمەدان دەگرێت و دەوڵەتی مادی ڕووخاندووە و خۆی پاشایەتی پارس و مادی گرتۆتەدەست. لەم بەرواره بەدواوە مێژووی دەوڵەتی ئێران دەست پێدەکات، یانی سەرئەنجام وشەی ئێران بەسەر سنوری دەوڵەتی ماد و پارس دەسەپێت.

لەگەڵ ئەمەیشدا تا یەك سەدە دوای ڕووخانی دەوڵەتی ماد، وشەی ماد لەجیاتی وشەی ئێران بەکار دەبرا. تەنانەت جەنگەکانی ئێران لەگەڵ یۆنان بەجەنگە مادییەکان بەناوبانگە (مێژووی پیرنیا ل ٥٨)

سنوری ئێران لەم ڕۆژگارەدا، لەڕۆژئاوا تا قەزەل ئیرماق و لەدەریای خەزەر تا دەریای عەممان درێژ ببوویەوە. کورشی مەزن جارێکی دیکە دەستی بەسەر ئەرمەنستاندا گرتووە و خستویەتیە ناو سنوری دەوڵەتی ئێران. هیرۆدۆت، لەکاتی ڕۆشتنی بۆ لای پاشای ماد کوروشی بەپاشای پارس ناو بردووە بەڵام نابونائید، پاشای بابل، ئەوی بەپاشای ئەنزان (=عیلام) ناو بردووە. (مێژووی پیرنیا ل٦٠)

گومان دەکرێت هەر دوو گێڕانەوەکە ڕاست بێت چوونکە کوروش پێش هێرشکردنە سەر ماد، دەستی بەسەر عیلامدا گرتووە و بەمشێوەیە هەم پاشای پارس بووە هەم پاشای ئەنزان. لەکاتی هێرشی بۆ سەر دەوڵەتی ماد، بەشێکی سوپاکەی لەئەنزانییەکان پێکهاتووە. (عەشق و سەڵتەنەت، باسی هێرشەکانی کوروش بۆ ماد و مێژووی پیرنیا ل ٦١)

کوروش لەساڵی ٥٤٦ پ.ز دەستی بەسەر وڵاتی لیدیدا گرتووە و تا ساڵی ٥٤٥ پ.ز هەموو

ئاسیای بچوك کەوتۆتە ژێر فەرمانی کوروش. لەهەموو ئەم سەرکەوتنانە و گەشتەکانی کوروش بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکور، لەهەموو شوێنەکان سوپای ماد واتە کوردان، شان بەشانی سوپای پارس و عیلام، بەشداری جەنگەکانیان کردووە.

لەساڵی ٥٣٨ پ.ز کوروش هێرشی کردۆتە سەر بابل، نابونائید، پاشای بابلی ئەسیر کردووە و سەرزەمینی بابلی پەیوەستی سنووری دەسەڵاتەکەی کردووە. دەستی بەسەر فەلەستین و فینیقیەدا گرتووە و لەساڵی ٥٢٩ پ.ز کۆچی دوایی کردووە. هەموو کوردەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، یانی ماد و گوتی تا دەرکەوتنی ئەسکەندەر بۆ ماوەی دوو سەدە ژێردەستەی ئێرانییەکان بوون.

کاتێك کەیخوسرەوی بچووك (= کوروشی بچوك) فەرمانڕەوای کاپادوکیە بووە، مەبەستی ئەوەی کردووە تەختی پاشایەتی لەبراکەی، ئەردەشێری دووەم، زەوت بکات و پاشایەتی ئێران بگرێتەدەست. بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی لەیۆنانییەکان بەکرێ گرتووە. لەساڵی٤٠١ پ.ز سوپای ئامادەپێدراو کە لەسیانزە هەزار کەس پێکهاتبوون، لەژێر فەرمانـدەیی کلارخوس بۆ هاوکاری کردنی کەیخوسرەو هاتوون. کەیخوسرەو لەگەڵ ئەم سوپا بەکرێگیراوە و سوپای کاپادوکیە، ڕێگەی بابلی گرتۆتەبەر و لەباکوری بابل و نزیك خانی ئەسکەندەرییەی ئەمرۆیی، ڕوبەرووی سوپاکەی ئەردەشێر بۆتەوە. هەرچەند سوپای کەیخوسرەو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خودی کەیخوسرەو و هەشت هەزار کەس لەسوپاکەی کوژراون، سەرکەوتن بەئەردەشێر دەبڕێت. سوپای یۆنان دوای ئەوەی سەرکردەکانیان بەهۆی پیلانی تیسافرین دەکوژرێن و تەنیا دەهەزار کەسیان دەمێنێتەوە، لەناوخۆیان گەزنەفۆن وەك سەرکردە هەڵدەبژێرن و لەناو خاکی کوردستان تا ترابزون ئەسپیان غارداوە و لەوێوە ڕێگەی کەنارەکانی ئیسلامبۆلیان گرتۆتەبەر و لەدەریا گوزەریان کردووە و گەڕاونەتەوە بۆ خاکی یۆنان. ئەم سوپایە لەکاتی گەڕانەوە لەدەربەندی زاخۆ، ڕووبەڕووی کوردان بۆتەوە و شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان ڕوویداوە. کوردان تا نزیك ترابزون شوێنیان کەوتوون و زیان و زەرەری زۆریان لێ داون.

ئەم گەڕانەوەیە لەمێژوو بەگەڕانەوەی دەهەزارکەسەکە بەناوبانگە و گەزنەفۆن سەبارەت بەوان کتێبێکی نووسیوە بەناوی (ئانابازیس). لەو کتێبەدا دەستەی ئامادە پێدراو بەکاردوشوی ناودەبات کە تا ئەو زەمانە کەس ئەم ناوەی نەبیستووە.

گەزنەفۆن لەو کتێبەدا، سەبارەت بەم دەستەیە روونکردنەوە دەدات و دەڵێت: ئەم دەستەیە، کاردوشوی، بەهیچ جۆرێك ملکەچ و ژێردەستەی دەسەڵاتی ئێران نەبوون، تەنانەت جارێك یەکێك لەپاشاکانی ئێران لەگەڵ سوپایەکی سەد و بیست هەزار کەسی هێرشی کردۆتە سەریان، بەڵام هەموو سوپاکەی لەناوچوون.

بەباوەڕی گەزنەفۆن، دەستەی کاردۆك، ملکەچی ئەردەشێر (=ئەرتەخشسرا) و کەسانی دوای ئەو و ئەرمەنەکان نەبوون.

گەزنەفۆن لەکتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەدات: وڵاتی کاردۆك تا بۆهتان (=بۆتانی ئەمڕۆیی) درێژ بۆتەوە. لەو مێژووە بەدوواوە لەکەنار ڕووباری دیجلە و چیای گودی (=جودی) ئەم ناوە بیستراوە و ئاماژەی پێدراوە.

نوسەرە بەناوبانگەکان ئەو سەرزەمینەیان بەکوردوان ناو بردوە. بەزمانی ئارامیش بەسەرزەمینی کاردۆ ئاماژەیان پێداوە.

دارای سێیەم (کودمان) کەپێش فەرمانڕەوایەتی ئێران، فەرمانڕەوای ئەرمەنییە و ویلایەتی کوردوان بووە، تا ساڵی ۳۳۸ پ.ز یانی بەدەست هێنانی فەرمانی فەرمانڕەوایەتی، وەك والی ئەو سەرزەمینە ماوەتەوە.

سنووری کوردوان لەم ڕۆژگارەدا لەسەرەتای زابی گەورە تا سەرچاوەی دیجلە درێژ ببوویەوە.

لەکاتی رووخانی دەوڵەتی هەخامەنشی کەئێران کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەسکەندەری مەقدۆنی، ناوچەی کوردانیش، ماد و کردوان (= کورتی و گوتی) کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتی ئەسکەندەر. دوای مردنی ئەسکەندەر لەبابل، ئەم ویلایەتانە لەژێر فەرمانی سلۆکۆس یەکێك لەسەردارەکانی ئەسکەندەر بووە (۳۲۳ پ.ز) کە بۆماوەی نزیکەی سەدەیەك فەرمانڕەوایەتی کردووە. بەڵام شۆڕش و نائارامی بەبەردەوامی لەو ناوچەیەدا لەئارادا بووە.

لەسەرەتاکانی سەدەی دووی پ.ز، بەشی سەرەوەی کوردستان بەهاوکاری مێهرداد، یەکەم فەرمانڕەوای ئەشکانی، کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەرمەنییەکان، بەشی خوارەوەیش تا سەرەتاکانی سەدەی یەکەمی پ.ز کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە یانی ئەرمەنستان و پایتەختەکەی دیاربەکری ئەمڕۆیی بووە. ئێسترابۆن مێژوونووسی ناودار لەلێکۆڵینەوەکەی سەبارەت بەدەوڵەتی ئەرمەنی دەڵێت کوردان پیشەگەر و لەهەموو کاروبارە ئەندازیارییەکان

شارەزا بوون. تیگران، فەرمانڕەوای ئەرمەن لەم بارودۆخە بەردەوام کەڵکی لەهێز و توانای کوردان بردووە.

لەساڵی ٣٦ پ.ز کوردوستان کەوتە ژێر فەرمانڕەوایەتی ئانتوان، سەرداری ڕۆمی کەسەرقاڵی جەنگ لەگەڵ سوپای پارت (=ئەشکانی) بوو. لەئەنجامی ئەم جەنگە سوپای ڕۆمەکان شکستی خوارد و تالآنییەکی زۆر دەست سوپای پارت کەوت. فەرمانڕەوای مادی بچوك، یانی ئازەربایەجانی ئەمڕۆیی، لەم جەنگەدا هاوکاری سوپای پارتی دەکرد بەلآم لەسەر دابەش کردنی تالآنییەکان دڵ سارد و تورە و ئانتوانی سەرداری ڕۆمی بۆ دەستپێکردنەوەی جەنگ هاندا. سەرداری ئاماژە پێدراو بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە، لەساڵی ٣٤ پ.ز لەگەڵ سوپایەك بەرەو ئەرمەنستانی ژێردەستەی پارت بەڕێکەوت و دەستی بەسەردا گرت. دوای ماوەیەك فەرهادی چوارەم فەرمانڕەوای پارت، لەگەڵ سوپایەکی گەورە هێرشی کردۆتە سەر مادی بچوك و دوای جەنگ، فەرمانڕەوای مادی بچوکی ئەسیر و دەستی بەسەر ئەرمەنستاندا گرتووە و یەکێك لەکەسەکانی خۆی وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچە دیاریکردووە.

ساڵێك دوای زایینی مەسیح، دەوڵەتی پارت (=ئەشکانی) کەفەرهادی پێنجەم بووە، لەگەڵ دەوڵەتی ڕۆم پەیمانی بەستووە. لەم ڕێکەوتنەدا دەوڵەتی ئەشکانی، ئەرمەنستان و کوردستانی بەحکومەتی ڕۆما داوە.

لەکۆتاییەکانی سەدەی یەکی زایین، وڵاتی ئەرمەنستان و کوردستان و ویلایەتی مادی بچوك گرفتاری دەستدرێژی هۆزی ئالان[1] و گورجی بوون و زەرەر و زیانی زۆریان لێ کەوتووە بەلآم دەوڵەتی ئەشکانی بەرگری لێ نەکردوون.

لەساڵی ١٦١ زایین، بلاشی سێیەم، فەرمانڕەوای ئەشکانی، دەستی بەسەر ئەرمەنستاندا گرتووە بەلآم دواتر لەبەرابەر کاسیۆس، سەرداری ڕۆمی شکستی خوارد و بەشی ڕۆژئاوایی ویلایەتەکانی کورد و ئەرمەن دووبارە کەوتە ژێر دەسەلآتی ڕۆما. لەساڵی ٢٤٤ زایین، کوردان بۆ هاوکاری کردنی ئێران، ڕووبەڕووی سوپای والرین، ئیمپراتۆری ڕۆما بوونەوە و

---

[1] - ئالانەکان، ئاری ئێرانی بوون. پێشتر لەنزیکی دەربەندی داریال نیشتەجێ بوون. دواتر تا نزیکی قۆڵگا بلآبوونەوە. لەسەدەی حەوتی کۆچی، تایەفەی مەغۆل دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت و ئالانەکان بەرەو ویلایەتی ڕۆژئاوا بەڕێکەوتن.

سەرداری رۆمیان کوشت. دواتر جێگرەکەی ئەو لەگەڵ دەوڵەتی ئێران ئاشتی کرد.
لەساڵی ۲۹۷ زایین، سوپای نێرسی حەوتەم، پاشای ساسانی، لەسوپای سەرداری رۆم، کالاریوس، شکستی خوارد. نێرسی بریندار بوو. دووبارە ناوچەی کاردۆ (کوردوستانی رۆژئاوا لەگەڵ چوار ویلایەتی دیکە: ئەرزون، موك، زابدە، رەجیمە لەگەڵ قەرزەکانی ئێران لەرۆما و بەبەستنی پەیمانی ئاشتی، پێشکەش بەدەوڵەتی رۆما کراون.
دەوروبەری ساڵی ۳۳۸ زایین، تیردادی کورد، فەرمانڕەوای کوردستان، لەبەر بەرژەوەندی سیاسی، باوەڕی بەئایینی مەسیحی هێنا بەڵام کوردەکانی کوێستان بەم ئایینە ڕازی نەبوون و لەسەر دینی زەردەشتی مانەوە. لەم مێژووە بەدواوە، ئایینی مەسیح و زەردەشتی ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە. لەم قۆناغە تا ساڵی ٥٦٢ زایین، کوردستان چەندین شەڕ و پێکدادانی بەخۆوە بینیوە.
لەساڵی ٥٦٢ زایین، خوسرەو ئەنەوشیروانی دادپەروەر، لەڕێگەی کوردستانەوە بەرەو لازیکا ڕۆشتووە. دوای ئەوەی بۆ سەرکوت کردنی تایەفەی خەزەر بەڕێکەوتووە، دووبارە بەخاکی کوردستان و ئەرمەنییە گوزەری کردووە. لەهەر دوو گەشتەکەدا کوردەکان بەتەواوی خزمەتیان کردووە و ئالیکی فراوانیان خستۆتە بەردەست.
لەساڵی ٦٢٤ زایینی سوپای کوردان بۆ پشتیوانی کردنی دەوڵەتی ئێران، ڕووبەڕووی سوپای قەیسەری رۆم، هێرقل (=هێراقلیوس) بوونەتەوە بەڵام لەسوپای قەیسەر شکستیان خواردووە و بڵاوەیان لێکردووە. دواتر لەساڵی ٦٢٧ زایین جارێکیتر قەیسەری رۆم، جیاواز لەخوسرەو پەرویزی پاشای ئێران، هێرشی کردۆتە سەر شارەزوور و ئەردەڵان (=سنە) و هەموو گوند و ئاوەدانییەکانی ئەو ناوچەی وێران و کاول کردووە. (ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، بەرگی دووەم ل ۱۰۳٤)
لەساڵی ٦٣٨ و ٦٤٠ و ٦٤٣ زایین، (ساڵەکانی ۱٦،۱۸،۲۱ کۆچ) لەئەنجامی جەنگی عەرەبەکان و ئێرانییەکان، سەرزەمینی کوردوستان بۆتە گۆڕەپانی جەنگ و هێرشی عەرەبەکان و بەم شێوەیە حیلوان و تکریت کەوتە ژێر دەستی عەرەبەکان. کوردەکانی شارەزوور و پاوە، زەرەر و زیانی زۆریان لێکەوت و سەرئەنجام تەسلیمی ئیسلام و عەرەبەکان بوون. (مێژووی تەواو و مێژووی کوردستان و حەدیقەی ناسری و زۆربەی مێژووەکانیتر).

لەساڵی ۳۲۰ کۆچی، حکومەتی دیالمە (=ئالی بویە) لەشیراز و بەغداد دامەزرا و تا ساڵی ٧٤٤ کۆچی بەردەوام بوو.

لەساڵی ۳۲۳ کۆچی، دەوڵەتی ئەخشیدیە لەشام دامەزرا و دوو سەدە بەردەوام بوو.

لەساڵی ۳۵۸ کۆچی، دەوڵەتی حەسنەوییە لەدینەوەر دەستی پێکرد. شکستی سوپای رۆم لەسوپای میسر لەسوریا لەساڵی ۳۸۱ کۆچی، لەسەر دەستی ئەحمەد کوڕی زوهاکی کورد بوو کە لەناو سوپای میسر لەژێر فەرماندەیی کوڕی سەمسامدا بووە. ئەم پاڵەوانە کوردە سوارە، هێرشی کردۆتە سەر سەرداری رۆم و کوشتوویەتی و ئەم کردەوە بوێرانە بۆتە هۆی زاڵبوونی سوپای میسر. (تجارب الامم، کوڕی مسکویە).

لەساڵی ٤٤٤ کۆچی، دەوڵەتی شوانکارە (= شەبانکارە) لەفارس دامەزرا و تا ساڵی ٦٨٨ کۆچی بەردەوام بووە. (نزیکەی دوو سەدە و نیو)

لەساڵی ٤٩٥ کۆچی، دەوڵەتی ئەتابەکانی کورد دامەزراوە کەپێنج حکومەت بوون:

١. دەوڵەتی ئەرتەکیە: لەحەسن کیف و ماردین دامەزراوە و دەوڵەتی ماردین تا سێ سەدە بەردەوام بوو. سەرئەنجام هەر دوو دەوڵەتەکە لەسەر دەستی حکومەتی قەرەقوینلو لەناوچوون.

٢. دەوڵەتی شا ئەرمەن: لەئیخلات دامەزراوە و دوای بیست ساڵ لەسەر دەستی دەوڵەتی ئەیوبیە لەناوچووە.

٣. دەوڵەتی زەنگیە: لەموسڵ و سوریا و جەزیرە و سنجار و ئەربیل دامەزراوە. لقی موسڵ لەسەر دەستی مەغۆلەکان و چوار لقەکەی دیکە لەسەر دەستی حکومەتی ئالی بویە لەناوچوون.

٤. دەوڵەتی ئەتابەکانی ئازەربایەجان: لەساڵی ٥٤٠ کۆچی لەئازەربایەجان دامەزراوە و تا ساڵی ٦٢٢ کۆچی بەردەوام بووە بەڵام لەسەر دەستی خوارەزمییەکان لەناو چووە.

٥. دەوڵەتی ئەتابەکانی لوڕستان: لەساڵی ٥٤٥ کۆچی لەلوڕستان دامەزراوە و بۆ ماوەی سێ سەدە بەردەوام بووە. دواتر لەسەر دەستی تەیموری لەنگ کۆتایی بەم دەوڵەتە هاتووە. (مێژووی الامم الاسلامیە، بەرگی دووەم)

دواتر دەوڵەتی ئەیوبییە کەدامەزرێنەرەکەی یەکێك لەکەسە ناودارەکانی کوردە، لەدەوروبەری ساڵی ٥٢٨ کۆچی دامەزراوە و لەساڵی ٥٦٩ کۆچی لەمیسر شێوەی ڕەسمی

بـەخۆوە گرتـووە. هـەموو سـەرزەمینەکانی کوردسـتان و میـسر و سـوریە و ئەلجـەزیرە و ئەرمەنستان لەسنوری ئەم دەوڵەتەدا بوون. (الفتح القسی، فی الفتحی القدسی، ل ٣٠٢ و سیرە صلاح الدین، کوڕی شەداد و کوڕی خەلەکان و تقویم التواریخ و هتد...)

لەساڵی ٥٠٨ کۆچی، دەوڵەتی ئالی خورشید (بنەماڵەی خورشید) لە لوڕی بچوك دامەزراوە و تا ساڵی ٦٩٥ کۆچی بەردەوام بوو. (نزیکەی ١١٦ ساڵ)

لەساڵی ٣٢١ کۆچی، حکومەتی ئەتابەکی بچوك لە لوڕی بچوك دامەزراوە و تا ساڵی ٦٩٣ کۆچی بەردەوام بوو.

جیاواز لەدەوڵەتە ئاماژە پێدراوەکان، کوردان، ٤٦ میرنشینی سەرەکیان بووە کەخاوەنی تەپڵ و ئاڵا بوون.[1] لەبەرگی دووەمی کتێبەکە روونکردنەوەی زیاتر لەسەر ئەم بابەتە دەدەین.

ئەولیای چەلەبی، جیاواز لەم دەوڵەتانە ئاماژەی بەپێنج دەوڵەتی دیکە داوە کە لەسنوری تەبرێزدا بوون:

١. قوتور ٢. پیرە دوزی ٣. جولانی. ٤. دەمدەمی ٥. دەنبەلی. (بەرگی چوارەم ل ١٧٨)

### هاوخەمی کورد و پارس

لەپێشنەی کوردان ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەکورد و پارس هەمیشە لەبارودۆخی سیاسی و مەزهەبی، هاوشان و هاوخەم و هاودەنگ بوون و لەشادی و شینی یەك بەشدارییان کردووە و وەك دوو پارچەی لێك دانەبڕاو لەقەڵەم دەدرێن. هەرکات کوردان هێزیان بووە، پارسەکان لەژێر دەستی ئەواندا بوون (=حکومەتی گوتی، کاسی، کیان، ماد) هەرکات پارسەکان بەهێز بوون، کوردەکان لەژێردەستی ئەواندا بوون (حکومەتی پێشدادی، هەخامەنشی و ساسانی) و هەرکات ئەم دوو دەستە لەیەك جیابوونەتەوە، یانی یەکیان کەوتۆتە ژێر دەستی دەوڵەت یا نەتەوەیەکی دیکە، هەوڵیان داوە، دووبارە یەکبگرنەوە (= دەورانی زاڵبوونی کەلدە و ئاشور و عەمالیقە)

سەبارەت بەڕازی بوون بەمەزهەب، کورد و پارس پێکەوە هاودەنگ و تەبا بوون. پێکەوە بەئایینی زەردەشت و هورموزدپەرەستی ڕازی بوون. لەجەنگ دژی ئیسلام کوردەکان سەرەتا

---

[1] – هێمای ئاڵای کوردەکانی ماد، تیر و شمشێر بووە.

پێشەنگ بوون. دواتر لەڕازی بوون بەئیسلام، کورد و پارس پێکەوە باوەڕیان هێناوە.

تەنانەت لەباوەڕهێنان بەمەزهەبی شیعە، بەشێك لەکوردەکان شان بەشانی پارسەکان باوەڕیان بەو مەزهەبە هێنا وەك هۆزەکانی: لوڕ، کەلهوڕ، شادرلی، بادەلی، کەرەشەلی، بەختیاری، کلیایی، سینامینلی، بەهیرماز، بەلیکان، ئەشمیشارت، لەك و هتد... کەزیاتر لەسەد هۆزن و هەموویان شیعەن و عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەخەلیفەی ڕاستین دەزانن. هەندێ لەشیعەکان تەنانەت زێدەڕۆیی دەکەن و عەلی بەخواوەند دەزانن. وەك هۆزەکانی ئانەکەلی و دێرسەملی کە لەناوچەکانی دێرسیمن و هەموویان عەلیوللەیین.[1]

لەکتێبی عەهدی عەتیق، لەهەموو شوێنەکان پێکەوە ئامارژە بەناوی ماد و پارس دراوە. (کتێبی ئەستیر بەشی یەك، ئایەی١٩،١٨،٣) و کتێبی (دانیال بەشی ٦ ئایەی ١٢،٨، ١٥ و بەشی ٨، ئایەی ٢٠) و کتێبی (ئەشعیا بەشی ٢١ ئایەی ٢) و هتد کەبەم دواییانە لەسەدەی پێنجی پ.ز ناوی ئێران لەجیاتی پارس و ماد بەکار براوە.

جەنگی کوردان لەگەڵ ڤالریان لەساڵی ٢٤٤ زایینی کەئامارژەمان پێدا، بۆ پشتیوانی کردنی ئێران بووە.

مێژوونووسان دەڵێن: دوای ڕووخانی دەوڵەتی ماد، لەئەنجامی کاریگەرییە مادی و مەعنەوییەکانی پارس، بەشێکی گەورەی مادەکان تێکەڵ بەپارسەکان بوون. بەشێکی دیکەیان پەیوەستی کوردانی زاگرۆس بوون بەڵام سەرکردەکانیان لەناو پایتەختی پارس ماونەتەوە و خاوەنی پۆستە باڵا دەوڵەتییەکان بوون.

کواکساری دووەم کوڕی ئازدیاك، لەسوپاکەی کوروش سەردار بووە. لەکاتی پێویست بەهۆی ئەم سەرکردانەوە سوپای کوردان کۆکراوەتەوە.

دووبارە مێژوونووسان دەنووسن: دەستەی پارتیش (=ئەشکانی) بەم شێوەیە لەناو پارسەکاندا تواونەتەوە.

لەکتێبی کورد لەبەرابەر تورك، ل ٢١ هاتووە: هۆکاری سەرەکی پەیوەندی نێوان پارس و

[1] - ئەم تایەفە دەڵێن خواوەند عەلی بۆ پێغەمبەرایەتی ئافراند. محەممەد پێگەی پێغەمبەری لێ زەوت کرد. خەلیفەکانیش خەلافەتیان بەو نەدا. عایشە و خەواریج و معاویە ڕێگەیان نەدا ئاوێکی ڕاحەت لەقوڕگی بڕواتە خوار و ئائومێدانە دنیای بەجێهێشت. بەناچاری خواوەند بۆ دڵنەوایی کردنی ئەو، پێگەی خواوەندی خۆی بەو داوە و خۆی لەسوچی عەرش دانیشتووە.

کوردی ئەمرۆیی لەم بنەماوە (کەوتمان ماد و پارت تێکەڵ بەپارسەکان بوون) سەرچاوەی گرتووە.

دوکتۆر فریچ لەکتێبی (کورد لوڕ) دەنووسێت: جەژنی کوردی کەساڵانە کوردان لە ٢١ ئۆگۆست بەبۆنەی ڕزگاری ئێران لەدەست زوحاکی ستەمگەر (=بیوراسب) ڕێکیدەخەن و بەجەژنی دەماوەندیش بەناوبانگە، هۆکاری یەکێتی و هاوخەمی کورد و پارسە. خاوەنی (مروج الذهب) ئەم جەژنە بەجەژنی مێهرەجان ناو دەبات و دەڵێت: جەژنی مێهرەجان و دەماوەند و جەژنی کوردی یەك جەژنە.

بەداخەوە لەبەر تۆکمە بوونی پەیوەندی پارس و کورد و لەئەنجامی هەڵەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی کە لەساڵی ٩٠٧ کۆچی لەلوتکەی ئیسلامیەتەوە بۆ هەڵدێری شیعەگەری و سوونیگەری دابەزی و بۆ پاراستنی دەسەلاْتی خۆی، مەزهەبی شیعەی وەك مەزهەبی فەرمی ئێران ناساند، دەرفەتی بۆ سوڵتان سەلیمی پاشای تورکیا ڕەخساند و بەهۆی مەلا ئیدریس و هاندانەکان و ڕێکەوتننامە بێ بنەما و فریودەرەکان، بەشێکی گەورەی کوردان لەگەڵ هەبوونی هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ پارس، لەئێران جیابوونەوە و پەیوەستی دەوڵەتی تورکیا بوون.

لەئەنجامی ئەم هەڵە گەورە بوو کەسوپای سەفەوی لەشەڕی چاڵدیران ڕووبەڕووی شکستێکی مێژوویی بوویەوە (٩٢٠ کۆچی).

مێژوونووسانی تورك ئەم شکستە مێژووییە بۆ کاریگەری عوسمانییەکان لەئاسیای بچوك دەگێڕنەوە. پەیماننامەی سوڵتان سەلیم بۆ کوردان، بۆ هەمووان ئاشکرایە. دەقی ئەو پەیماننامە لەبەرگی دووی ئەم کتێبە ئامارەی پێدەدرێت.

بەم دواییانە کەدەوڵەتی تورك، کوردانی وەك لەمپەرێکی گەورە لەبەرابەر بۆچوون و مەبەستەکانی خۆی سەبارەت بەئێران هەست پێکرد، هەموو هەوڵەکانی بۆ نەهێشتنی ئەم لەمپەرە خستەگەڕ و لەئەنجامدا لەنێوان تورکان و کوردان جەنگ و پێکدادان روویدا. (مێژووی ئەولیای چەلەبی). لەڕۆژگاری کەیخوسرەوی مەزن (سیروسی مەزن) تا ئەم مێژووە، یانی ڕۆژگاری پاشایەتی شا ئیسماعیلی سەفەوی، کوردان بەشێك بوون لەئێران و لەژێر فەرمانڕەوایەتی پاشای ئێراندا بوون و بەهیچ جۆرێك خوازیاری پەیوەست بوون بەدەوڵەتی تورکیا و ژێردەستەیی تورکان ڕازی نەبوون. (فتوحاتی ئیسلامی، بەرگی دووەم ل ١٢٢)

کوروشی مەزن بەپشتبەستن بەم دوو دەستە بوێر و جەنگاوەرە، ماد و پارس کەهاوشێوەی دووباڵی بەهێز بوون، درێژەی بەخولیای خۆی بۆ گرتنی سەرزەمینەکان داوە. لەرۆژئاوا تا ڕووباری هالیس (=قەزەل ئیرماق) و لەرۆژهەڵاتەوە تا ئەوپەری ڕووباری سەیحونی بەهێزی ئەم دوو نەتەوە، یانی سوپای ماد و پارس خستە ژێر دەسەڵاتی بەجێماوی باو و باپیرانی (سنوری نێوان دەریای خەزەر و کەنداوی پارس).

لەهەموو ئەو سەرکەوتن و وڵات گرتنانە، لەهەموو شوێنێك و هەموو کاتێك ئەم دوو بازووە هاوڕێیەتی کوروشیان کردووە و لەرێی ئەودا گیانیان بەخشیوە. (نخبە الازهریە ل ٥٢٠)

بەکورتی دەتوانین بڵێین: بەهەمان شێوە کەوشەی ئاو مانای دیکەی نییە جگە لەو ڕاستییەی کەپێکهاتووە لەدوو توخمی ئۆکسیژن و هایدرۆجین، بەم پێیە وشەی ئێران مانایەکی دیکەی نییە جگە لەوەی پێکهاتووە لەدوو توخمی ئاری نەژاد یانی کورد و پارس کەبوونی هەردووکیان مەرجی ڕاستەقینەی بەدیهاتنی ئێرانییەتە، بەواتایەکی دیکە ئەگەر کورد نەبێت، پارس هەمان پارسە و وشەی ئێران تەنیا بەپارس ناوترێت. بەهەمان شێوە ئەگەر پارس نەبێت، دانانی وشەی ئێران بۆ وڵاتی کوردان هەڵەیە، بەڵام ئەگەر یەکبگرن، دانانی ئەم وشەیە ڕاست و هیچ لەمپەرێکی نییە.

## بەندی سێیەم

## سەبارەت بەنووسین، زمان، مەزهەب و داب و نەریتی کورد

### نووسین

کوردان خاوەنی نووسینێکی تایبەت نەبوون. لەکاتی دروستبوونی نووسینی بزماری، کورد و پارس، پێکەوە نووسینەکانی خۆیان بەنووسینی بزماری نووسیوە. نولدکە دەڵێت: ئەگەر کەتیبەی کوردان بدۆزرێتەوە، گومان دەکرێت لەروانگەی نووسین و زمانەوە هاوشێوەی کەتیبەی پاشاکانی هەخامەنشی بێت (تتبعات تاریخی راجع به ایران قدیم)

لەکتێبی (شوق المستهام فی معرفه رموز الاقلام) نووسینی ئەحمەد کوڕی ئەبی بەکر کوڕی وەحشیەی نبتی کلدانی، ئاماژەی پێدراوە: دەوروبەری سەدەی دەی پ.ز کەسێکی ماسی بەناوی سورات، چەند پیتێکی بەپێی نووسینی ئەبجەدی داهێناوە و بیرۆکەکانی خۆی پێ تۆمار کردووە. دواتر کوردان بەو پیتانە نووسینەکانی خۆیان نووسیوە. پیتە ئاماژە پێدراوەکان کە بەپیتی ماسی سوراتی ناسراوە، هاوشێوەی ئەو پیتانەیە کە لەسەدەی شەشی زایینی داهێنران و بەپیتە ئاڤێستاییەکان بەناوبانگن.

تانزیکییەکانی دەرکەوتنی ئیسلام، پیتی کوردی ماسی سوراتی لەناو کوردان باو بووە و لەهەمان کات نووسینی یۆنانی و نووسینی ئارامی سریانیش لەلایەن کوردانەوە بەکار براوە. بۆ نمونە سێ بەڵگەنامەی بەکرێدان کە لەساڵی ١٣٢٨ کۆچی قەمەری، لەلایەن کەسێك بەناوی شێخ حسەین لەوەچەکانی شێخ عەلائەلدین لەناوچەی هەورامان لەناو گۆزەیەکی پڕ لەهەرزن دۆزرایەوە و سەرئەنجام بەهۆی پرۆفیسۆر براون گەیشتە دەستی پرۆفیسۆر مێنس، پسپۆری نووسین و زمانی یۆنانی. یەکێك لەوان بەزمانی پەهلەوی و نووسینی سریانی ئارامی بوو. (٨٨پ.ز)

دوانەکەی دیکە یۆنانییە و ناوەرۆکی هەردووکیان یەك شتە. هەردوو نوسخەکە لەڕۆژگاری فەرهادی چوارەم (لەپاشاکانی پارت= ئەشکانییەکان) نووسراون (٢٢-٢١پ.ز) ئەم دوو بەڵگەنامە ئەوە روون دەکەنەوە کە لەو ڕۆژگارەدا ناوچەی هەورامان لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئارتاکسیس یا ئارتاکسیاس بووە.

فەرمانڕەوای هەورامان بەهمەنی سێیەم بووە. وەچەی هەژدەیەمی بەهمەنی یەکەم کوڕی ئەسفەندیار باوەگەورێی سیلسیلەی پاشاکانی هەورامان.

**ئەو شکلانەی لەژێر پیتە ئاماژە پێدراوەکانی ماسی سوراتی نووسراوە، دیار نییە چ پیتێکن. بەئەگەری زۆر دەبێت ئەم پیتانە بێت.**

پ.چ.گ.ژ.و.ل.ت.د.ر

لای قەڵەو، تای زەعیف، دالی زەعیف، ڕای قورس

دوای زاڵبوون و فراوان بوونی ئیسلام، پیتە کوردییەکان، بزماری، ئارامی و یۆنانی بەتەواوی لەناوچوون و پیتە کوفییەکان جێگەی ئەوانی گرتۆتەوە. ئەو قورئانەی لەگوندی (نێگڵ) شوێنی کەلاترەزانی سنە لەبەردەستایە و مێژووەکەی بۆ سەدەی دووی کۆچی دەگەڕێتەوە، بەنووسینی کوفی نووسراوە. دواتر نووسینی نەستەعلیق برەوی پێدراوە. کوردان وپارس لەنووسینیشدا شان بەشانی یەك ڕۆشتوونەتە پێش.

**زمان**، بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دوکتۆر سپایزار، چوار تایەفەکەی زاگرۆس، یانی کوردانی بەشی ئارارات کەبریتین لەکوردی لۆلۆ و گوتی و کاسۆ و شوبارۆ، هەرکام زمانی تایبەت بەخۆیان بووە بەڵام لێك نزیك بوون هاوشێوەی تایەفەکانی کوردی ئەمڕۆیی کەهەرچەند لق و وشەی جیاوازیان هەیە، بەڵام سەرچاوەی وشەکان لەزمانی هەموویان یەکێکە و لەیەك نزیکن.

دەستەیەك لەڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێن: زمانی چوار تایەفەکەی زاگرۆس ئاری بووە بەڵام زمانی ئاری تا هەنووکە نەزانراوە چ جۆرێك بووە چوونکە هێشتا بەڵگەیەك بەزمانی ئاری نەدۆزراوەتەوە مەگەر ئەوەی لەداهاتوودا شتێك بدۆزرێتەوە و چارەسەری ئەم کێشەیە بکات. بەمپێیە ئێمە دەبێت لەزمانی کوردانی بەشی ئارارات چاوپۆشی بکەین و سەبارەت بەزمانی دەستەی دووەمی کوردان، یانی کوردانی ڕۆژهەڵات زەمین (=مادەکان) بدوێین. دارمیس تتر، نووسەری کتێبی (تتبعاتی ئێران) دەڵێت: زمانی مادەکان، زمانی ئاڤێستا بووە بەڵام تا ئەمڕۆ بەڵگەیەك بەزمانی مادی دەستنەکەوتووە تا لەگەڵ ئاڤێستا بەراوەرد بکرێت.

ئێسترابۆن (جوگرافیزانی یۆنانی) کە لەسەرەتاکانی سەدەی یەکەمی زایینی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، لەکتێبی (ئێرانی کۆن) دەڵێت: پارس و ماد بەباشی لەزمانی یەك تێگەیشتوون. کەواتە دەردەکەوێت کەزمانی پارس و ماد لەیەك نزیك بووە هاوشێوەی زمانی پارسی و

کوردی ئەمڕۆیی، ئەتنۆگراف (=زانستی نەتەوەناسی) و (خشتەی زمانی چواری کەدواتر ئاماژەی پێدەدرێت) و زۆربەی مێژووەکان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کەزمانی مادەکان زمانی کوردی موکری بووە چوونکە زەند وئاڤێستا کە بەزمانی مادی نووسراوە، زۆر نزیک لەشێوەزاری موکری یا زمانی موکریە.

ئەم بیرۆکەیە لەلایەن هوارت و درمستتر و زۆر لەشارەزایانی دیکە پشتڕاست کراوەتەوە و ئەنجامەکەی ئەوەیە کەزمانی ئاڤێستای زەردەشت، زمانی کوردی مادییە. زمانی پارسی لەو ڕۆژگارەدا ئەو زمانەیە کە لەبەرهەمەکانی پێرس پۆلیس (ئێستەخری پارس) بەکار براوە. ئەو جیاوازییانەی لەدۆزینەوەکانی ئەم دواییە بەدەست هاتووە، سەلمێنەری ئەوەیە کوردان وشەی زۆری عەرەبییان لەناو زمانەکەی خۆیاندا بەکار نەبردووە و شێوەی سەرەکی فرمانەکانی خۆیان پاراستووە بەڵام بەپێچەوانەوە زمانی پارسی لەم بەشەدا زێدەڕۆیی کردووە و پەیوەندی خۆی لەگەڵ زمانی پارسی کۆن لێڵ و نادیار کردووە بەهەمان شێوە کەنووسینی کاغەز بەزمانی کوردی سادە، زۆر سانایە بەڵام بەزمانی فارسی سادە دژوارە.[1]

بەهەرحاڵ کوردانی ئەمڕۆ لەڕوانگەی زمانییەوە بۆ چوار لق پۆلێن دەکرێن:

١. کرمانج، ٢. گۆران، ٣. لوڕ، ٤. کەلهوڕ. هەرکام لەم چوار لقە چەندین لقی دیکەیان لێ دەبێتەوە و زمانەکەیان گۆڕیوە.

لەسەرچاوەکانی دیجلە و فورات تا کەنداوی فارس، سنوری زمانی کوردی بووە و پایتەختی ئەم زمانە سەرەتا ئارارات، دواتر زاگرۆس، دواتر ئیسپەهان، دواتر نەهاوەند و دواتر هەمەدان بووە و هەندێ کات تیسفون (=مەداین). بەمپێیە دەتوانین بڵێین وشەی کوردی لەهەموو ویلایەتەکانی ئێرانی کۆن کەئەسکەندەری مەزن فەرمانڕەوایەتی کردووە، کاری پێکراوە و بەکار براوە.

بەهەرحاڵ، سەرچاوەی زمانی کوردی ڕۆژهەڵات بەدڵنیاییەوە هەمان زمانی مادی

---

[1] – تەنانەت لەکوردی هەورامی کە لەکوێستانەکان نیشتەجێن و توانیویانە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ زمانی کوردی ڕەسەن بپارێزن، بۆ ژن و پیاو فرمانەکان جیاوازن، دەڵێن: فەرهاد ئاما، شیرین ئامایێنی، یانی فەرهاد هات، لوا شیرین لوایێنی یانی ڕۆشت و بەم پێیە هەموو فرمانەکان هاوشێوەی عەرەبیە بەڵام زمانی فارسی ئەم ئیمتیازەی نییە.

ئاڤێستاییە کەڕەگ و ریشەی هەمان زمانی ئاریانی کۆنە و بەزمانی ئەنزانیش[1] ناویان بردووە و باوکی هەموو زمانەکانی مادی، هیندی، پارسی و عیلامیە و نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش ئاریانەکان بەو زمانە ئاخاوتن و دواتر چەندین لقی لێ بۆتەوە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

زمانی پارسی کۆنیش حەوت لقی لێ دەبێتەوە:

١. پەهلەوی، ٢. دەری، ٣. سەگزی، ٤. هیرەوی، ٥. سەغدی، ٦. پەشتوی (پاشتوی)، ٧. زاولی پەهلە لەپارسی کۆن بەمانای شارە و لەکوردیش پێی دەڵێن (پاڵە). لەکۆنیشدا کەهەموو پایتەختەکانی وەك ئیسپەهان و نەهاوەند و هەمەدان و... بەپەهلە ناوبردووە، ئەم مانایە پشتڕاست دەکاتەوە. کەسانی بەهێز و زۆرانبازەکان بە(پەهلەوان) ناو دەبەن چوونکە ئەوان لەکۆندا پارێزەری شارەکان بوون چوونکە پەهلەوان بەمانای (پەهلەبان)ە. هاوشێوەی پاسەوان و باخەوان و دەرگاوان.

پێڵاو (کەوش) لەزمانی کوردی بەپاڵی ناوی براوە لەبەر ئەوەی خەڵکی شار لەپێیان کردووە.

لەم روونکردنەوەی سەرەوە ئەوەمان دەستدەکەوێت کەزمانی پەهلەوی بەمانای زمانی شارییە و دانیشتووانی شار و دەربار پێی ئاخاوتون. بەپێچەوانەی زمانی (دەری) کەتایبەتە بەزمانی دانیشتووانی دەرودەشت و دۆڵەکان. کەوی دەریش لەبەر ئەمە پێی دەوترێت (دەری) چوونکە لەگەڵ کەوی کوێستانەکان جیاوازە.

ئیسترابۆن لە(مێژووی ئێرانی کۆن) دەڵێت: لەکەتیبەکانی دەورەی هەخامەنشی و زمانی فارسی کۆن دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەفارسی کۆن بۆ نووسین و خوێندن و فەرمانە دەوڵەتییەکان بەکار براوە بەڵام لەگفتوگۆی ڕۆژانە زمانی پەهلەوی باو بووە. فارسی کۆن و زمانی ئاڤێستایی و سانسکریت هەرسێك لەزمانی هاوبەشی ئاری دروست بوون.

بەهەمان شێوە کەدەستەیەك لەڕۆژهەڵاتناسەکان دەڵێن: دیار نییە زمانی ئاری چ جۆرە زمانێك بووە. زمانی پەهلەوی لەکۆتاییەکانی دەورەی هەخامەنشی کاری پێکراوە هەروەها

---

[1] - ئینسان هەمان بەعەرەب کراوی ئەنزانە کەعەرەبەکان( ز)یان بۆ (س ) گۆڕیەوە. هەنووکەیش لەناوچەی هەورامان لەجیاتی ئینسان دەڵێن ئەنزان هاوشێوەی ئەزەد و ئەسەد کە بەمپێیە گۆڕانیان بەسەردا هێناوە. (بۆ زانیاری زیاتر کتێبی ئیبن خەلەکان)

لەدەورەی پارس و ساسانیش. جگە لەبەڵگەنامەکانی ئەورامان کەئاماژەی پێدرا، بەڵگەیەکی زۆر کۆنتر کە لەفیوم یەکێك لەناوچەکانی میسر بەدەست هاتووە، بۆ زمانی پەهلەوی دەگەڕێتەوە. میستر ویست دەڵێت: ئەم بەڵگەیە بۆ سەدەی دووی کۆچی دەگەڕێتەوە. دووبارە ئەم پسپۆرە دەڵێت: جگە لەئاڤێستا هەموو ئەو کتێبانەی بەزمانی پەهلەوی نووسراون، دوای دەورانی ساسانییە (ئەوەی کەتەنیا ئاڤێستای لێ بەدەر دەکات، جێگەی پرسیارە و ئەگەر بڵێین شتی شاز روودەدات، دووبارە ئەو بەڵگەنامانەی لەئەورامان دۆزرانەوە، ناڕاستی ئەم بیرۆکە دەردەخەن مەگەر ئەوەی بڵێین مەبەستی ویست تەنیا کتێبە نەك بەڵگەنامەکان).

نزیکترین شێوەزارەکانی زمانی کوردی بەشێوەزاری پەهلەوی، یەکەم لوڕییە. چوونکە ناوچەی لوڕەکان لەناوەندی پەهلەوی کۆن نزیك بووە و لەتێکەڵ بوون لەگەڵ بیانییەکانیش پارێزراو بون. تەنیا کاریگەری نەتەوەکانی کەلدە و ئاشوریان بەسەرەوە نییە.

دوای لوڕی، زمانی کەلهوڕ لەزمانی پەهلەوی نزیکە و دواتر گۆران. دوای ئەوان هەورامی، گیلەکی و دواتر کرمانجی. بەڵام زمانی گۆران و کرمانجی بەهۆی نزیکبوونیان لە لەکەلدە و ئاشور، تا ڕادەیەك وشەکانیان تێکەڵ بووە و وشەکانی ئەوان هاوشێوەی کەلدە و ئاشورە.

دەستەیەك گومانیان کردووە زمانی کوردی شێوەزارێکی زمانی پارسی یا شێوەزارێکی شێوێندراوی زمانی فارسییە. سێر سیدنی سمیت، نووسەری کتێبی (مێژووی کۆنی ئاشور) دەڵێت: ئەم گومانە هەڵەیە چوونکە زمانی کوردی هەڵگری پێشکەوتنە ڕاستین و کۆنەکانە و لەوحەی داریوش لەزمانی فارسی کۆنترە. لەبەر ئەمە زاناکانی مێژوو دەتوانن بڵێن زمانی کوردی لەسەدەی شەشی پ.ز زمانێکی سەربەخۆ بووە و هێشتا زمانی پەهلەوی لەئارادا نەبووە.

زمانی فارسی ئەمڕۆیی دوای فراوان بوون و کاریگەری ساسانییەکان، هێدی هێدی لەولاتی ئێراندا بلاوبوویەوە، تەنانەت زانا و شاعیرە کوردەکانیش بەو زمانە دەیاننووسی و دەئاخاوتن مەگەر ژمارەیەکی کەم لەنەژاد پەرەستەکان و لایەنگرانی هۆنراوە نیشتمانییەکان کەزمانی نەتەوەیی خۆیان لەدەست نەدا و لەشێوەی هۆنراوە و پەخشان چەندین نووسینیان لەخۆیان بەجێهێشتووە.

مەزهەب و داب و نەریت

ئایین و داب و نەریتی کوردان لەسەدە سەرەتاییەکان، یانی پێش جیابوونەوە و کۆچ کردن بۆ ناوچەکانی ئەمڕۆیی، لێڵ و نادیارە. بەڵام دوای هاتنیا بۆ ئەم ناوچانە، لەبەڵگە و شوێنەوارەکان دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەئاهوراپەرەست بوون. یانی رووناکی پەرەست، رووناکییان خۆش ویستووە و بەتاریکی دڵتەنگ و لێی بێزار بوون چوونکە ئاهورا و ئەهیر وەك لەبەندی ٤ بەشی یەکەم ئامارەمان پێدا، بەمانای ئاگرە و ئاهورا وشەیەکە پێکهاتوو لەئاهور بەمانای ئاگر و (ئا) بەمانای (هاتوو) یانی ئەو ڕاستیەی لەئاگرەوە هاتووە هاوشێوەی وشەی خودا (=خۆد ئا) کەپێکهاتووە لەوشەی خود (=خۆد) و (ئا) بەمانای هاتوو. مەبەست لەو ڕاستیەی لەئاگرەوە هاتووە، رووناکییە. ئەو رووناکییەیان بەشید و سەرئەنجام بەشیدی شیدان ناو بردووە و بەعەرەبی دەبێتە (نور الانوار) کە بەبەخێوکەر وپەروەردەکەری بوونەوەرکانیان زانیوە (الله نور السموات و الارض)، هێدی هێدی پێگەی بەتواناییان پێبەخشیوە و بەئاهورامەزد ناویان بردووە، یانی پەروەدەکەری بەتوانا. مەزد بەمانای توانا و بەهێزە. ئەمڕۆ بەهورمەزد یا هورموز ناوی دەبەن. ئەگەری هەیە وشەی مەست، هەمان وشەی مەزد بێت بەڵام شێوێندرابێت.

بەکورتی کوردان ئاگر کەهێمای ڕاستییە (=رووناکی) بەپیرۆز زانیوە و پەرەستوویانە. بەهەمان شێوە کەوتەی هیرۆدۆت: موغەکان هۆزێك لەشەش هۆزەکەی ماد بوون، بەڵگەیە بۆ ئاگرپەرەستی کوردان. (مێژووی پیرنیا، ل٥٧)

هەتاو کە بەهور و هورەخش و خۆر و خۆرشید ناویان بردووە و لەبەر ئەوەی سەرچاوەی رووناکی و ڕاستییە، بەپیرۆزیان زانیوە و پەرەستوویانە. لەبەر ئەمە کوردان بەخۆرپەرەستیش ناویان دەرکردووە. (مێژووی کەنیسەی کۆن،ل ٣٠١)

ئەهور کە بەمانای مەعشوق (خۆشەویست) و ئەهورا بەمانای عاشقە، ڕەگی هەردووکیان بۆ ئاهور، بەمانای ئاگر دەگەڕێتەوە کە زۆربەی شاعیرانیش بەکاریان هێناوە (آتش عشق است کاندر نی افتاد).

نەك کوردەکان بەڵکو پارسەکانیش کە لەرێ و ڕەسمی ڕۆشتن بۆ شوێنە گشتییەکان بەئاگر و هەتاو و مانگ و ئەستێرە و ئاو و با و سەوزە و یەزدان و ئەهریمەن، سەرقاڵ بوون و تاریکییان بەهێمای ئەهریمەن زانیوە و مردن کەهۆکاری پچڕاندنی سیلسیلەکانە،

بەکردەوەی ئەهریمەن داناوە. سەرەتا مردووەکانیان دفن نەدەکرد، بەڵکو لەشوێنێکی بەرز یا لەسەر بەردەکان دایان دەنان تا مەل و ئاژەڵەکان بیانخۆن تا دووبارە ببێتە بەشێك لەجەستەی گیانلەبەران. دواتر ئەم نەریتەیان پشتگوێ خست. مردووەکانیان دەخستە ناو خومرە و لەچیاکاندا دەیانشاردەوە.

مارەیی و مارەبڕین لەناو ئەواندا نەبووە، تەنیا ڕازی بوونی ژن و پیاو و پەسەند کردنی باوك یا سەرۆکی بنەماڵەکان بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری بەسەندە بووە. فرەژنی لەناو کوردەکان ڕێگە پێدراو بەڵام زینا و نێربازی بەهەموو شێوەیەك یاساغ بووە. کچ و خوشك و دایکیان نەکردۆتە هاوسەری خۆیان. خەتێنەیان نەکردووە، کچان تا تەمەنی بلۆق هیچیان لەپێ نەکردووە، تەنیا بەکراسێکی درێژ شەرمی خۆیان داپۆشیوە. کوڕانیش تا تەمەنی بلۆق پشتێنیان نەبەستووە.

کوردان بەگشتی کۆچەری و شوان بوون. مەڕومالاتی زۆریان بووە. لەناو عارەبانەکاندا ڕۆشتوون. گەرمێن وکوێستانیان کردووە و ئارەزوومەندی مانەوە لەیەك ناوچە نەبوون. ژیان و بژێوی خۆیان بەهۆی شوانی و میوە جەنگەڵییەکان و خواردنە سروشتییەکان دابین کردووە. سامانی ئەوان تەنیا بریتی بووە لە گا و مەڕ و ئەسپ و چوارپێ و مەل و.... و بەتەواوی لایەنگری ژیانی سروشتی بوون. بەم دواییانە کەژیانی شارنشینیان هەڵبژارد، سەرقاڵی وەرزێری و بەخێو کردنی مێو و دار میوەکان بوون.

فەرمانڕەوای هەر بنەماڵەیەك لەئەستۆی باوك یا گەورەی بنەماڵەکە بووە. دواتر سەرۆکی هۆزەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشە گرنگەکان پرس و ڕاوێژیان پێکراوە. هەرچەند هەندێ کات ملکەچی فەرمانەکانی پاشایەك بوون، بەڵام تەنیا سەرکردەی هۆزەکان پەیوەندییان لەگەڵ پاشادا بووە بەتایبەت بۆ بەشداری کردن لەکاروباری سیاسی و دەوڵەتی وەك جەنگ و ئاشتی و خەراج و سوپا و هتد. لەکێشەکانی ناوهۆز هەموو دەسەڵاتەکان لەدەست سەرکردەی هۆزەکان و ریش سپییەکاندا بووە. ریش سپییەکان بەبەردەوامی لەلایەن سەرکردەکانەوە پرس ورایان پێکراوە و خاوەن بڕیار بوون.

ئاشنای دراو نەبوون. مامڵەی مڵك و زەوی بەهیچ جۆرێك لەئارادا نەبووە. نیازەکانی خۆیان لەرێگەی گۆڕینەوەی کالا بەکالا دابین کردووە. بەهۆی میوانی و بانگێشت کردنی یەکتر، بەشی کەسانی دیکەیان لەخواردنەکانی خۆیان داوە و لەبەر ئەمە میوانداری و ڕێز گرتن

لـەمیوان لـەناو کـوردان گرنگـی پێـدراو و پێـدەدەرێت و شـوێنەوارەکەی تـا هەنووکـە لەکوردستان ماوە و دەبینرێت.

جل و بەرگ وپێڵاوی ئەوان لەخوری و پێستی ئاژەڵە ماڵی و جەنگەڵییەکان بەشێوەیەکی زۆر سادە دروست کراوە. ژنان لەژیاندا هاوبەشی پیاوان بوون. سیلاحی ئەوان تیر و کەوان، گورز وتەور و شمشێر، خەنجەر و کەمەند و قۆچەقانی بووە.

پەرەستنی هەورمەزد تایبەت بووە بەگەورەی بنەماڵەکان و بەپیر ناویان بردون. کەسانی دیکە لەئەرکی پەرەستن و پاڕانەوە بەخشرابوون. کەم کەم پیرەکان هورموزد پەرەستییان تێکەڵ بەسیحر و جادوو و خورافیات و درۆ کرد تا ئەوەی لەسەدەی حەوتی پ.ز (٦٦٠)، زەردەشـت کەیـەکێك لەبیرمەنـدانی کـورد بـوو، لـەورمێ، بەمەبەسـتی چاکـسازی و ڕاستکردنەوەی هەڵە و کارە ناڕاستەکانی ئەوان، ئاڵای شۆرش و چاکخوازی بەرز کردەوە. پیرەکان بەوتەکانی ئەو ڕازی نەبوون و دژی ئەو ڕاپەڕین. زەردەشت بەناچاری ڕوویکردە بەڵخ و لەوێ بانگەوازەکەی خۆی دەستپێکرد.

دواتر لەسیستان پێگەی خۆی بەهێز کرد و بۆ ورمێ گەڕاوەتەوە وبانگەوازەکەی خۆی دەست پێکردۆتەوە بێ ئەوەی کەس ببێتە ئەرك بۆی یا ڕێگری لێ بکات.

زۆربەی زاناکان، ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کەزەردەشت کەسێکی مادی (لەدانیشتووانی ماد) و لەکوردەکانی میدیا بووە. یانی وڵاتی ماد و کتێبی ئاڤێستای بەزمانی نەتەوەیی خۆی، یانی زمانی مادی نووسیوە. مێژوونووسان سەبارەت بەزەردەشت و ساڵی دەرکەوتنی ئەو بۆچوونەکانیان جیاوازە. ئەوەی هەموان لەسەری کۆکن ئەوەیە چەندین زەردەشت بوونیان بووە. یەکەم زەردەشت لەبەڵخ دەرکەوتووە، کوڕی پورشەسپ بووە و هوشەنگ باوەڕی پێی هێناوە[1]. دەستەیەك دەڵێن ئەو خودی هوشەنگە و بەئازەر هوشەنگیش ناویان بردووە. هۆنراوەکەی خوسرەو پەرویز کە لەشانامەدا ئامـاژەی پێـدراوە، ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە:

(( کە ما را ز دین کهن ننگ نیست

بە گیتی بە از دین هوشنگ نیست

[1] – زەردەشتی یەکەم زیاتر لە ١٤ هەزار ساڵ پێش لەئێران ویج (کوردستانی گەورە) چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.

همه راه داد است و ئایین مهر
نظر کردن اندر شمار سپهر (فیردەوسی)
کتێبی زەند بۆ ئەم زەردەشتە دەگەڕێننەوە کە بەزەردەشتی یەکەم بەناوبانگە. تەنیا بەشێکی کەم لەزەند ماوەتەوە.
مێژووی دەرکەوتنی ئەم زەردەشتە بۆ سێ هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. نوحی پێغەمبەر لەڕۆژگاری ئەو مردووە.
زەردەشتی دووەم بەفەرەیدون ناو دەبەن کەشۆڕشی دژی زوحاکی عەرەبی کرد. لەساڵی ٣٣٩٣ی دوای دەرکەوتنی ئادەم، نزیکەی دوو هەزار و دووسەد ساڵ پێش زایین، دەستەیەك ئاماژەیان بە ١٣٧٨ پ.ز داوە.
زۆربەی ڕۆژهەلاّتناسەکان نەك ڕووداوی شۆڕشی کاوە و فەرەیدون دژی زوحاك، بەڵکو بوونی کاوە و فەرەیدون و زوحاك بەئەفسانە دەزانن لەکاتێکدا گومان لەوەدا نییە کەئالاّی کاویان کەوتە دەست موسوڵمانەکان و هەموو مێژوونووسانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاّت ئەم بابەتە پشتڕاست دەکەنەوە.
دووایین زەردەشت هەمان زەردەشتی کوردە کە لەڕۆژگاری گەشتاسپ لەورمێ دەرکەوت.
نۆیەم پشتی زەردەشت بۆ مە ئابادی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە.
لەکاتێکدا کوردی مادی و سیلسیلەی مە ئابادی هیچ پەیوەندییەکان نییە. جیاواز لەوە لەمە ئاباد تا ڕۆژگاری گەشتاسپ چەندین هەزار ساڵە، یانی چەندین هەزار پشت پێویستە تا بەزەردەشتی پێغەمبەر بگات. (بۆ زانیاری زیاتر/ ل ٥، دەبستان المذهب)
هۆکاری جیاوازی بیروبۆچوونی مێژوونووسان بەدڵنیاییەوە بوونی چەند زەردەشتێکە کەئودوکسوس و ئەرەستۆ، ڕۆژگاری دەرکەوتنی ئەو بۆ شەش هەزار ساڵ پێش ڕۆژگاری ئەفلاتون دەگێڕنەوە یانی ٨٣٦٥ ساڵ پێش ئەمە. گزانتوس مێژوونووسی یۆنانی، دەرکەوتنی ئەو بۆ ١٠٨٠ پ.ز دەگێڕێتەوە یانی ٣٠١٧ ساڵ پێش ئێستا. زەردەشتییەکان دەرکەوتنی ئەو بۆ ساڵی ٦٦٠ پ.ز دەگێڕنەوە.
میسترژاکسن کە شارەزایی لێکۆڵینەوەکان لەسەر مەزهەبی زەردەشتە، دەڵێت زەردەشت لەنیوەی دووەمی سەدەی حەوتی پ.ز چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەنیوەی یەکەمی سەدەی شەشەم کۆچی دووایی کردووە کە لەگێڕانەوەی زەردەشتییەکانەوە نزیکە. لەزبدە الصحایف، ساڵی ٤٧٨ پ.ز وەك ساڵی دەرکەوتنی زەردەشت ئاماژەی پێدراوە.
بەهەرحاڵ دوایین زەردەشت یانی زەردەشتی کورد، بەپێی مێژووی سەرجان مەلکم، ل ٢٧ و

مێژووی مەسعودی و حەمزەی ئیسفەهانی و یاقوت و قەزوینی و ئەبوئەلفیدا و بیلادەری و خوردابە و هتد.... لەورمێ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. کوڕی پورشەسب کوڕی تیپرسپ کوڕی کیدار کوڕی ئاریاك کوری ئاگەند کوڕی ئاگیر کوڕی مامیر کوڕی هزریان کوڕی ئیسپیتمانە. لەزەمانی گەشتاسپ لەساڵی ٦٦٠ پ.ز دەرکەوتووە. گەشتاسپ باوەڕی پێی هێناوە و مەزهەبەکەی بڵاو کردۆتەوە. ئەم کارەی گشتاسپ بووە هۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی وەگەرنە ئەو زیاتر لەفەرمانداریکی بەڵخ نەبوو. ئەگەری هەیە کردەوەکانی توسی کیانی بۆ بڵاوە پێکردنی ئایینی زەردەشتی یەکەم لەهەمەدان بۆ بەرپەرچدانەوەی کردەوەکانی گەشتاسپ، بڵاو کردنەوەی ئایینی ئەم زەردەشتە بووبێت. دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

گەشتاسپ لەنەژادی کیانە، کوڕی کەی لەهراسب کوڕی کەی ئەرجان (=ئەروەندشا) کوڕی کەی مانوش کورشی کەی ئایو کوڕی کەی قوبادی کورد یەکەم پاشای سیلسیلەی کیانە. بەو شێوەی فیردەوسی ئاماژەی پێدەدات، ٣٨ کوڕی بووە :گەشتاسپ سی و هەشت کوڕی بووە و هەموویان سوارکارە بوێرەکانی دەر و دەشت بوون. لەناوەڕاستەکانی سەدەی حەوتەم (٦٦٨ پ.ز) فەرمانداری بەڵخ بووە. ناوی ڕاستی ئەو هیشتاسپە بەزیاد کردنی وشەی (کەی) یانی گەورە کەتایبەتە بەکیانییەکان. ناوی کەی هیشتاسپە بەڵام بەهۆی زۆری بەکار بردنی ناوەکەی بۆ گشتاسپ گۆڕاوە.

دەستەیەك لەمێژوونووسان ئەم گەشتاسپە بەگرشاسپی دووایین پاشای پێشدادی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی دەی پ.ز مردووە، بەیەك دەزانن. دەستەیەك لەگەڵ ویشتاسپ یا هیشتاسپ باوکی داریوشی هەخامەنشی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی شەشی پ.ز مردووە، بەیەکی دەزانن.

جاماسپ وەزیر و ڕاوێژکاری گشتاسپ، کچی زەردەشتی کردۆتە هاوسەری خۆی بەناوی (پورچیست (=برجیس) و برازاکەی خۆی بەناوی (ئاهوونام) کردۆتە هاوسەری زەردەشت. ئەم ژن بەژنە بۆتە هۆی ئەوەی جاماسب هاوکاری بکات. مێژوونووسان سەریانسوڕماوە لەوەی هیرۆدۆت کەسەد ساڵ دوای ئەم زەردەشتە چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، چۆن ئاماژەی بەزەردەشت نەداوە.

بەم دواییانە پێستەیەك لەسلێمانی بەزمانی پەهلەوی دۆزراوەتەوە کەچەند هۆنراوەیەکی پرسەگێرانی تیانووسرابوو. ئەو هۆنراوانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کوردان لەسەرەتاکانی بڵابوونەوەی ئیسلام لەناو خاکی کوردستان، باوەڕیان بەئایینی زەردەشتی بوە و هورموزدیان پەرەستوە. ئەو هۆنراوانە هێرشی عەرەبەکان بۆ سەر کوردستان باس دەکات کەگوند و ناحییەکانی تا ناوچەی شارەزوور وێران کردووە. هۆنراوەکان بریتین لە:

((هورمزگان رمان، آتران گژان
ویشان شارده وه گوره گورەكان
زور كار ارب كرد نه خاپور
گنای پاله ی، هەتا شارەزور
شنو كنيكان و ديل بشينا
میرد ازاتلی ژوری هوینا
روشت زردشتره مانوه بی کس
بزیکا نیکا هورمز وهویچکس

واتاکەی: هورموزگان یانی هورموزدگان (=مزگەوتەکان) وێران بوون. ئاگرەکان کوژانەوە. گەورەی گەورەکان خۆیان شاردەوە. عەرەبە ستەمکارەکان گوندەکانیان تا شارەزوور وێران کرد. ژنان و کچان دیل کران. جەنگاوەران لەخوێنی خۆیاندا تلان. ئایینی زەردەشت بێ کەس مایەوە. هورموز بەزەیی بەکەسدا نەهاتەوە.[1]

شوێنەواری ئاتەشکەدەکان کە لەناوچە کوردنشینەکان ماونەتەوە، بەڵگەن بۆ ئەوەی کوردەکان ئاگر پەرەست بوون. بەشێوەیەکی گشتی لەبەڵگە و شوێنەوارەکان و ئەفسانە کوردییەکان دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کەکوردان سەرەتا دروشم پەرەست بوون دواتر بوونە ئاگرپەرەست. بەم دواییانە دەستەیەکیان بوونە مەسیحی. دواتر کورد و پارس پێکەوە باوەڕیان بەئیسلام هێنا و ئەمڕۆ مەزهەبی ڕەسمی کوردان شافعییە و زۆربەیان شوێنکەوتەی بیروباوەڕەکانی ئیمام محەممەدی شافعین کە لەساڵی ١٥٠ کۆچی لەدایك بوو و لەساڵی ٢٠٤ کۆچی دوایی کردووە. (لەمیسر و لەگۆڕستانی قەرافە بەخاك سپێردراوە). لە (سیر و سلوك) زۆربەیان شوێنکەوتەی تەریقەی قادریە یا نەقشبەندین کەباوەڕێکی زێدرۆیانەیان بەشێخ و مورشیدەکانی خۆیان هەیە و بەپیری تەریقەت ناویان دەبەن.

[1] - مسجد بەعەرەب کراوی مزگەد کە لەوشەی مزدگە هاتووە یانی هورموزدگە یا گد بەمانای گەدایە (سواڵکەر) کەمەبەست شوێنی سواڵکەرانی هورموزە (نیازمەندان بەهورموزد)

## بەندی چوارەم:

## سەبارەت بەکوردستان و ژمارەی دانیشتووان و تایەفەکانی کورد

کوردستان بریتییە لەو ناوچانەی کوردان لەڕۆژگاری پێش مێژوو هاتوونەتە ئەو سەرزەمینانە و لەوێ بلاوبوونەتەوە و نیشتەجێ بوون و ئەو ناوچانە بەناوی ئەوانەوە، ناسراوە: ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا.

سنوری کوردستان: یانی سنووری نشینگەی تایەفەی کوردان، کەهەنووکەیش لەو ناوچانەیشدا نیشتەجێن: بریتین لە: لەباکورەوە: ئەرمەنستان، لەڕۆژهەلاتەوە: ئازەربایەجان و عێراقی ئێران (=عێراقی عەجەم و خوزستان) کە زنجیرە چیای زاگرۆس لەم بەشەدا جێگیرە. لەباشورەوە: عێراقی عەرەب (=بابلستان)، لەڕۆژئاوا: ڕووباری فورات و ویلایەتەکانی ئاسیای بچوک.

دەستەیەك لەمێژوونووسان بەمشێوەیە سنووری کوردستان دیاری دەکەن:

لەباکور: چیاکانی ئارارت (=ئاگری داغ)، لەڕۆژئاوا ڕووباری فورات تا سنوورەکانی بەغداد، لەباشورەوە: سنوری باکوری بەغداد (=عێراقی عەرەب)، لەڕۆژهەلاتەوە: سنوری خوزستان و پارس و زەنجان و ورمێ و خوی و ماکو کە بەپێی ئەم دیاریکردنە بەشێك لەزەوی ڕۆم و بەشێك لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتی ئاسیای بچوك و بەشێك لەباشوری ئازەربایەجان دەکەوێتە سنوری هەرێمی کوردستان بەلام کوردان هەنووکە لەو ناوچانە تەنیا وەك هاوولاتی حسێبیان بۆ دەکرێت.

حمدالله مستەوفی لەکتێبی (نزهە القلوب) ئاماژەی پێداوە کە: ناوەندی کوردستان لەکۆندا شاری بەهار بووە، نزیکەی هەشت مایل لەدووری شاری هەمەدان، دواتر ناوەند بۆ سولتان ئابادی چەمچەمال نزیك چیای بەهێستان (بێستون) گوازرایەوە و ویلایەتەکانی ئەرمەن و جەزیرە لەسنوری کوردستاندا بوون و هەولێر و ئامەد لەناو ئەم ویلایەتانەدا بوون. بەپێی ئەم گێڕانەوەیە لەسەدەی هەشتی کۆچی کوردستان بریتی بووە لەم شانزە ویلایەتە:

١. ئالانی، ٢. ئەلشتر، ٣. بەهار، ٤. خەفتیان، ٥. دەربەندی تاج خاتوون، ٦. دەربەندی

زەنگی،٧. داربیل و یەزبیل،٨. دینەوەر، ٩. سولتان ئاباد چەم چەمالّ، ١٠. شارەزوور، ١١. کرمانشا، ١٢. کەرەند و خوشان، ١٣. کەنگاوەر، ١٤. ماهی دەشت، ١٥. تاق وەستان، ١٦. بێستون.

لەئینسیکلۆپیدیای ئیسلامی ئاماژەی پێدراوە کەکوردستان بریتییە لەو ناوچانەی کوردان تیایدا دەژین بەلاّم سنوورەکەی بچوك دەکاتەوە و دەلێت: کوردستان ناوچەیەکی لاێکیشەییە کەلەباشوری ڕۆژهەلاّتی لوڕستان بەرەو باکوری ڕۆژئاوای مەلاّتیە درێژ بۆتەوە، درێژییەکەی نزیکەی ٦٠٠ مایل و پانی ناوەندی ١٢٠-١٥٠ مایل و زۆرترین ڕێژەی پانی کە لەنێوان موسلّ و ئاراراتە، نزیکەی ٢٥٠ مایل. لەم دیاریکردنە بەشی ڕۆژهەلاّتی ماد پشتگوێ خراوە.

ئەولیای چەلەبی کە لەسالّی ١٠٦٥ گەشتێکی بۆ ناوچەکانی کوردستان کردووە، دەنووسێت:

سنووری کوردستان لەباکورەوە، دیاری ئەرزەرۆومە (= ئەرزی ڕۆم) و لەوێوە بەرەو وان و حەکاری (هەکاری) و جەزیرە و عەمادیە و موسلّ و شارەزوور و ئەردەلاّن و دڕنە و درتەنگ تا بەسرە درێژ دەبێتەوە. درێژییەکەی حەفتا فەرسەنگ و پانییەکەی کەمترە. (بەرگی چوارەم، ل ٧٥). بەهەرحالّ لەنێوان ڕۆژهەلاّتناسەکان سەبارەت بەسنووری کوردستان جیاوازی و ناکۆکییەکی زۆر لەئارادایە کەهەمووی لەباروذۆخی نەتەوەی کورد سەرچاوە گرتووە. سێرمارك سایکس، کوردوان یانی ولاّتی کوردان تەنیا بەسنووری نێوان سەرچاوەی زێی گەورە و دیجلە و دەریاچەی وان، دەزانێت.

تۆرۆ دانژینی ڕۆژهەلاّتناس لەئانۆریۆلۆژی، سەبارەت بەدوو هەزار سالّ پێش زایین دوو لەوحەی بینیوە. لەو دوو لەوحەدا، ئاماژە بەویلایەتی کارداکا دراوە کەدراوسێی سوی بووە کەدەکەوێتە ناوچەکانی باشوری دەریاچەی وان. لەشەرەفنامەیش ئاماژەی پێدراوە کە لەناوچەی بەدلیس قەلاّیەکی زۆر کۆن بەناوی سوی بوونی هەیە. بەزمانی ئارامی، ئەم ناوچەیان بەسەرزەمینی کاردۆ ناو بردووە. جیاواز لەوان، لەزمانی نووسەرە بەناوبانگەکانەوە ئەو ناوچەیە بەولاّتی کوردوان ئاماژەی پێدراوە. جەزیرەی کوڕی عومەری (بۆتان) ئێستایان بە کازارتای کاردۆ ناو بردووە. لەناو ئەرمەنییەکان کوردۆخ و لەناو عەرەبەکان وەك بەلازەری و تەبەری ئاماژەی پێدەدەن، بە باکاردا یا کاردای بەناوبانگ بووە.

یاقوتی حەمەوی کە لەکوڕی ئەسیر دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ویلایەتی باکاردا بەشێك لەویلایەتی جەزیرەی کوڕی عومەر بووە و دووسەد گوندی بەدەورەوە بووە. شارەکانی ئەلسەمانین، جودی، فیروز، شاپور لای چەپی دیجلە ڕووبەڕووی بازابدا لای ڕاستی دیجلە بووە.

دوای ئەوە، ئەم ناوە (یانی باکاردا)، لەکتێبە ئیسلامییەکان پشتگوێ خراوە و لەجیاتی ئەوە، جەزیرەی کوڕی عومەر (ابن عمر) و بوهتان هاتۆتە ئاراوە. ئەگەری هەیە بوهتان چاککراوی وشەی بوختان بێت کە بەپێی وتەی نولدکە و کیپارت و م. هارتمان بریتییە لەهەمان بوختە ویج کەهیرۆدۆت لەبیرەوەرییەکانی سەدەی پێنجی پ.ز ئامارەی پێداوە بەوەی سیانزەهەمین ویلایەتی ئامفامەنی بووە و دواتر بۆتە بەشێك لەئەرمەنستان.

گەزنەفۆن سەبارەت بەگەڕانەوەی دەهەزار یۆنانییەکە بەڕاشکاوی دەنووسێت: سنووری ولاّتی کاردۆك تا بوهتان درێژ بۆتەوە. بەپێی وتەی ڕۆژهەلاّتناسی بەناوبانگ ئێسترابۆن، کوردوا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەچیاکانی دیاربەکر و موشی ئەمرۆیی وتراوە. گومان لەوەدا نییە کاردۆك یا کاردۆخ یا کاردۆ یا کاردۆشوی یا کارداکا یا کاردای یا کوردو یا کوردان و ناوەکانی هاوشێوە، بەناوەندی سەرەکی کوردان وتراوە.

ریسکی ڕۆژهەلاّتناس دەڵێت: کورد و کوردی و کوردیا یەك شتن و ناوەکان هاوبەشن. تەنانەت ئەدۆنسی ڕۆژهەلاّتناس سەبارەت بەلەوحەیەکی نامۆ کە لەسەدەی حەوت لەسنوری ئەرمەنستان دۆزرایەوە و تیایدا ئامارەی بەکورچخ دراوە، دەڵێت: وشەی کورچخ لەوشەی کورتیچ ئەخ وەرگیراوە. کورتیچ بەمانای کوردە. لەزەمانی فۆستیوس بیزانسیوس یانی سەدەی چوارەم، کورچخ ناوچەیەك بووە لەنزیکی سەڵماس، دواتر بۆتە ویلایەتێك کە لەجۆڵەمێرگەوە تا جەزیرەی کوڕی عومەر درێژ بۆتەوە.

هەروەها سن مارتن و نۆرمان لەکتێبی ڕۆژهەلاّتی کۆن و سێر ملکەم و لۆریە و هاسل و براون و دوکتۆر رسو و.... هەرکام سەبارەت بەولاّتی کوردان ئامارەیان بەشتێك داوە کەجیاواز لەجیاواز بوونیان لەگەڵ یەك، لەڕاستییەوە دوورن. یانی هەموویان سنووری کوردستانیان زۆر بەبچوکتر لەوەی هەیە، دیاریکردووە. ئەگەری هەیە مەبەستی ئەوان ناوچەی یەکەم و زادگای کوردان بێت کە لەوشێوەدا زۆر بچووکتر لەکوردستانی ئەمرۆ دەبێت.

بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوە ڕاستەکان، ناوچەی لوڕستان و کرمانشا و سنە (=ئەردەڵان) و بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئازەربایەجان و خوی و سەلماس و ورمێ و ماکۆ و موکری لەسنووری کوردستاندان. مەبەستی ئێمە لەکوردستان لێرەدا جیاوازە لەسەرزەمینی ماد کە لەبەشی سێیەمدا ئاماژەی پێدەدەین.

عەشیرە و تایەفەکانی کورد لەزۆربەی ناوچەکاندا بڵاوبوونەتەوە. لەتاران عەشیرەی پازوکی، لەخوراسان عەشیرەی پچناوەند و باوەنور و زەفرانلی و لەهەمەدان، عەشیرەی جوزکان، لەمازەندەران، عەشیرەی مودانلو و لەفارس عەشیرەی شەبانکارە (شوانکارە) و لەعێراقی عەجەم، ئەسبارلو و چەند تایەفەیەك لەعەشیرەی لەك و لەقەزوێن و باکوری ڕۆژئاوای ئەو شارە و گیلان، عەشیرەی عومەرلو کەقوبە قرانلو، شمکانلو، بەهادۆرلو، شاە کلانلو، بەشانلو لەتایفەکانی ئەو عەشیرەن، هەموویان کوردن. لەخوزستان و قەهستانیش کورد بوونی هەیە (کوردلەر، نووسینی دوکتۆر فریج ل ٣٢)

لەبەلوچستان و ئەفغانستان و هیندوستان و ئانکارا، عەشیرەکانی براخوی و زەنگەنە و هتد نیشتەجێن.

کوردستان لەداوێنی باشوری هەزبەی ئەرمەنستان جێگیرە کەبەرزییەکەی هێدی هێدی کەم دەبێتەوە تا ئەوەی لەدەشتی بەین ئەلنەهرەین بەرزایی نامێنێت.

بەم پێیە بەرزایی چیاکانی کوردستان، بەشێوەی گشتی لەبەرزایی چیاکانی ئەرمەنستان زۆر کەمترە بۆ نمونە چیای چل چەمە (=چل چەشمە)، کوردستانی ڕۆژهەڵات یانی سنە کەڕووباری قەزەل وەزان لەوێوە سەرچاوە دەگرێت، بەرزترین پلەی بەرزاییەکەی دەگاتە ٤٠٠٠ مەتر و بەرزایی گەردنەکانی کەلی خان لەنێوان سەقز و بانە دەکاتە ٢٢٢٥ مەتر. بەرزایی چیای ماردین لەنێوان دیجلە و فورات لەکوردستانی ڕۆژئاوا ١١٠٠ مەترە لەکاتێکدا بەرزایی ئارارات زیاتر لە ٥٠٠٠ مەترە. چیای عەبدولعەزیز و چیای سنجار لەچیاکانی کوردستانن. لەباشوری ئەم چیایانە، سارا و دەشتە بەرینەکان درێژ بونەتەوە و بەسنوورەکانی جەزیرە کۆتایی دێن.

## ڕووبەری کوردستان

ڕووبەری کوردستانی (لاکێشە) لەڕۆژهەڵاتی لوڕستان تا ڕۆژئاوای دیاربەکر درێژ بۆتەوە،

لەنێوان بازنەی پانی ٣٩-٣٢ باکوری هێڵی یەکسان و هێڵی درێژی ٥٠-٣٩ ڕۆژهەڵاتی هێڵی گرینویچ کەئەندازەی پانی ٧ پلە وئەندازەی درێژەی ١١ پلەیە. هەر پلەیەك یەکسانە بە١٥ میل. کەواتە لێکدانی پانی و درێژی لە ١٥ (=١٧٣٢٥) میلی چوارگۆشە کەئەندازەی رووبەری کوردستانە. ئەگەر ئەم بڕە لێکدانی ١٠ بکەین، دەبێتە کیلۆمەتر. بەم پێیە ١٧٣٢٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە. بەڵام لەبەر ئەوەی وتمان رووبەری کوردستان لاکێشەیە و چوارگۆشەی تەواو نییە، لەهەر دوولایەوە دوو سێ گۆشە کە نزیکەی یەك لەسەر سێی رووبەرەکەی دەبێت، لێی کەم دەکرێتەوە. بەم پێیە ئەو یەك لەسەر سێیەی لێ دەردەکەین و ١٣٠،٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەی دەمێنێتەوە کەدەکاتە رووبەری کوردستان.

## ویلایات و شارەکانی کوردستان

کوردستان دابەش کراوە بۆ شەش ویلایەت، بەم بەمپێیە:

یەکەم: دیاربەکر، شارە گرنگەکانی بریتیە لە:

١. شاری دیاربەکر کەناوەندی ویلایەتەکەیە، لەسەر ڕووباری دیجلەیە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ٣٥ هەزار کەسە.

٢. مەیافارقین، شارێکە کە ئاو و باخی زۆری هەیە.

٣. ماردین، شارێکی گەورەیە لەداوێنی چیای ماردین، ماری زۆری هەیە.

٤. نەسیبین، شارێکی خۆشە، باخی زۆری هەیە.

٥. ئەرغەنی، شارێکی پیشەسازییە، کانی مس و ئاسن و رووی زۆری هەیە.

٦. سوەرەك

٧. ئامەد.

ئەم حەوت شارە لەڕۆژئاوای دیجلە جێگیرن.

٨. جەزیرەی کوڕی عومەر، ناسراوە بەجەزیرە کە لەسەر ڕووباری دیجلەیە.

٩. نەیشابور

١٠. سەعرەد

١١.ئەرجەکی

١٢.بوتان.

دووەم- ویلایەتی موسڵ، شارە گرنگەکانی بریتین لە:

١. موسڵ کەناوەندی ویلایەتەکەیە و لەلای ڕاستی دیجلە جێگیرە. لەبەرابەر موسڵ بەدووری بیست کیلۆمەتر وێرانەکانی نەینەوایە کە لەکۆندا پایتەختی ئاشورییەکان بووە و کێشەکانی دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمە لەوێ ڕێگەچارەیان بۆ دۆزراوەتەوە. لەکۆتاییەکانی سەدەی حەوتی پ.ز یانی ساڵی ٦٠٦ پ.ز، کوردەکانی ورمێ و کوردەکانی مادی گەورە (عێراقی عەجەم) پەیمانی هاوکارییان بەست و لەژێر سەرکردایەتی کواکسار، نەینەوایان داگیر و بۆ هەمیشە وێرانیان کرد و بنج و بنەمای پاشایەتی ستەمکاری ئاشوریان لەسەر زەوی نەهێشت. (دواتر ڕوونکردنەوەی زیاتری لەسەر دەدەین).

٢. ئەربیل کە لەزمانی کوردیدا بەهەولێر ناسراوە. بەهۆی شکستی دارا لەئەسکەندەی مەقدۆنی، بەناوبانگە.

٣. سلێمانی، لەکۆندا کوردان پێیان وتووە شارباژێر: یانی شاری بازاڕ. بەم دواییانە ئیبراهیم پاشا بەناوی باوەگەورێی بناغەی ئەو شارەی داڕشت.

٤. بوستان.

٥. کەرکوك، لەکۆندا بەئارابخا بەناوبانگ بووە. زادگەی سەلاح ئەلدینی ئەیوبییە. یوسف کوڕی ئەیوبی کورد کەپێگەی ئەو لەناو مێژووەکانی جیهان بەناوبانگە.

٦. سنجار.

٧. عەفار.

٨. عەمادیە

٩. ڕەواندز، کەدروست کردنی قەڵا گەڕۆکە جەنگییەکان لەسەر عارەبانەکان بۆ ئەم شارە دەگەڕێتەوە و وشەی ڕەواندز بەمانای قەڵای گەڕۆکە. ڕەوان بەمانای گەڕۆك و دز یا دژ یانی قەڵا. هەنووکە شێوەی دەبابەی (تانك) بەخۆوە گرتووە.

١٠. کفری.

١١. سەلاحییە.

١٢. گوڵ عەنبەر، بەکوردی خەلماری پێ دەڵێن. لەکەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی دەشتی شارەزوورە. لەداوێنی چیاکانی هەورامان و سنوری کوردستانی ڕۆژهەڵات، دەوڵەتی تورکیا لەسەردەمی سوڵتان سەلیم لەئەنجامی جەنگی نێوان کوردان و نەستورییەکان، دەستی

بەسەر ئەم دوو ویلایەتەدا گرت. (فتوحاتی ئیسلامی. بەرگی دووەم، ل ١٢٢)

سێیەم، ویلایەتی سنە، کە بەئەردەڵانیش ناوی دەبەن. لەبەر ئەوەی بەم دواییانە شوێنی فەرمانڕەوای ئەردەڵان بووە. ئەردەڵان کۆی ئەردەڵە کەناوی گەورەترین باوکی ئەم تایەفەیە و بە بابا ئەردەڵ[1] ناویان بردووە. ناوی فیروز کوڕی خوسرەوە.

ئەردەڵی ئاماژە پێدراو لەساڵی ١٣٧ کۆچی، لەزەمانی خوێنرێژ (سەفاح) باوکی عەباس عەبدوالله عەباسی، بەهاوکاری ئەبو موسلیمی خوراسانی، دەستی بەسەر ناوچەکانی موسڵ و دیاربەکردا گرت. دواتر لەگەڵ دەستەیەك لەدەست و پێوەندەکانی خۆی بەرەو شارەزوور کۆچیان کرد و تا ساڵی ٥٦٤ کۆچی، منداڵەکانی ئەردەڵ لەناوچەکانی شارەزوور فەرمانڕەوایەتییان دەکرد. دواتر دەستیان بەسەر ناوچەکانی سنەدا گرت.

شارە گرنگەکانی سنە بریتین لە:

١. شاری سنە، کە بەسنەدژ (سەنەندج) بەناوبانگە، ناوەندی ویلایەتەکەیە. لەداوێنی باکوری چیای ئاویەر جێگیرە. ئاو و هەوایەکی پاکی هەیە. عەرەبەکان سنەدژ یان عەرەباندووە و کردوویانە بەسەنەندج. دەستەیەك بەهۆی بوونی دوو (ن) لەوشە عەرەبییە گومان دەکەن سەرچاوەی وشەکە سانان دژ بووە، یانی قەڵای سوڵتانەکان چوونکە لەکوردی سوڵتان بەسان ناو دەبەن. ئەم گومانە هەڵەیە چوونکە نازناوی سان، تەنیا تایبەتە بەسەرۆکەکانی هەورامان کە لەسەردەمی شا ئیسماعیلی سەفەوی، دەوڵەتی عوسمانی نازناوی پاشای بەسەرۆکە کوردەکانی سەر سنوور بەخشی و شا ئیسماعیل بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم کارە، نازناوی سانی بەسەرکردە کوردەکان لەهەورامان بەخشی یانی سوڵتان بەڵام لەسنە نازناوی خانی پێ بەخشین.[2] هەردوو وشەی سان و خان تایبەتە بەسوڵتانەکانی عوسمانی. لەو بەروارە بەدوواوە وشەی سان تەنیا بەسەرکردەکانی هەورامان وتراوە و فەرمانڕەواکانی ئەردەڵانیان بەخان ناو بردووە و هیچ کات سەرکردەکانی هەورامان لەسنە فەرمانڕەوایەتییان نەکردووە تا ئەم بۆچوونە ڕاست بێت.

لەسەرەتای بناغەدانانی سنەدژ، کە سلێمان خانی ئەردەڵان، کوڕی میرعەلەم ئەلدین لەساڵی ١٠٤٦ کۆچی بناغەی دارشت، تا زەمانی رووخانی فەرمانڕەوای ئەردەڵانییەکان، هەمان

---

[1] – ئەرد بەزمانی پەهلەوی یانی زەوی و عەرەب کراوەکەی (ارض)ە.

[2] – پێشتر سەرکردەکانی هەورامان و فەرمانڕەواکانی ئەردەڵان نازناوی (بەیگ)یان بوو.

سیلسیلەی ئەردەڵان فەرمانڕەوایەتی-سنەیان کردووە. کەواتە گومانی سانانڕ، دوور لە ڕاستییە.

٢. لەشارەکانی ویلایەتی سنە، شاری بیجارە کەناوەندی گەروسییەکانە.

٣. سەقز، قەزایەکی بازرگانییە و پێگەکەی زیاتر لەسنەدژ جێی بایەخە.

٤. بانە، قەزایەکە کەش و هەوای پاکی هەیە و دانیشتووانەکەی بەبوێری بەناوبانگن.

٥. هەورامانی تەخت کەبەشاری هەورامان بەناوبانگە و لەئێستادا بەتەواوی وێران بووە. تەنیا گوندێك لەجێگەی ئەم شارە ماوەتەوە و بەم ناوە، ناو دەبرێت، شاری هەورامان.

چوارەم- ویلایەتی ساوجبلاغ (=مەهاباد) و سەردەشت و ناوچەکانی دەوروبەری کەناوەندەکەی قەزای سابڵاغە.

پێنجەم- ویلایتی کرماشان کە بەکرماشاهانیش ناوی دەبەن. شارە گرنگەکانی بریتییە لە:

١. شاری کرماشان کەناوەندی ویلایەتەکەیە و لەباشوری ڕووباری قەرەسو جێگیرە. یانی ڕووباری ڕەش. هەڵکەندنەکانی تاق وەسان و بێستون لەئاسەوارە گرنگە مێژووییەکانی ئەو شارەیە.

٢. سەنقوڕ کەناوەندی فەرمانڕەواکانی کولیاییە.

٣. کەنگاوەر. لەبینا کۆنەکان و ناوی لەناو مێژوودا ناسراوە.

٤. کەرەند، لەسەر حیلوان جێگیرە.

٥. هارون ئاباد، دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ ناوی هارون ئەلڕەشید.

٦. زەهاو و قەسری شیرین. ئاوی حیلوان بەزەهاودا تێدەپەڕێت.

٧. هەرسین.

شەشەم ویلایەتی لوڕستان. شارە گرنگەکانی بریتین لە:

١. بروجێرد، ناوە سەرەکییەکەی وەریگەردە. عەرەبەکان کردوویانە بەبروجێرد. ناوەندی ویلایەتەکەیە. شارێکی پاکە و کەش و هەوایەکی دڵگیری هەیە.

٢. خورەم ئاباد. شارێکی دڵگیرە.

٣. سەیمەرە. بەسەیید مەرەیش ناوی دەبەن.

٤. مەلائیرە. بەدەوڵەت ئابادیش ناوی دەبەن. (مەلایر).

٥. نەهاوەند، لەکۆندا پایتەختی کوردان بووە. موسوڵمانەکان سەرکەوتنەکانی خۆیان

لەوێوە دەستپێکرد.

٦. تویسرکان. ئەم شارە بەویلایەتی سولاس (ثلاث) ناو دەبەن.

سەرزەمینی کوردستان لەهەموو لاکانەوە بەچیا بڵند و بە بەرهەمەکان دەورەدراوە. بەشی باشوری ڕۆژئاوا لەگەڵ باشوری ڕۆژهەڵات کە لەسنوری نێوان دیجلە و فورات جێگیرە، دەشت و سەرچاوەی کانی و زەوییە بەبەرەکەتەکانە کەڕووبار و سەرچاوە سروشتییەکان تێراوی دەکەن.

چیا بەرزەکانی کوردستان، چیاکانی باکوری ڕۆژهەڵاتە کەزنجیرە چیای زاگرۆس بەوان کۆتایی دێت. زۆربەی چیاکان بەدارستانە سروشتییەکان داپۆشراوە و لەهەموو لایەکەوە زەوییە سەرسەوزەکان دەورەی گرتوون. لەبەر ئەم هۆکارە لەوەرزی زستان و پاییز ئاوەدانە و گوند و قەزای زۆری هەیە. بەپێچەوانەی زنجیرە چیاکان، سنور لەنێوان ئێران و تورکیا زەوییەکی ڕەق و بەردەڵان و بێ دارە و گوزەر کردن بۆ بەهێزترین سوپاکانی دونیا لەو ناوچەیە دژوارە لەکاتێکدا زۆربەی ئاو و ڕووبارەکان لەوێوە سەرچاوە دەگرن وەك ڕووباری فورات و دیجلە و لقەکانیان وەك زێی بچوك و زێی گەورە و ڕووباری خابور و شوێنەکانی دیکە. هەموو ڕووبارەکان لەباکورەوە بەرەو باشور دەڕۆن جگە لەڕووباری قیزەڵ ئەوزەن (ڕووباری سپی)، کە بەرەو باکور دەڕوات و دەرژێتە ناو دەریاچەی خەزەر.

سروشت بۆ بەخشینی بەرهەمە سروشتییەکان و مادە ژیارییەکان لەکوردستان کەمتەرخەمی نەکردووە و بنەما سەرەکییەکانی ژیان بەئەندازەی پێویست بۆ دانیشتووانەکەی لەبەردەستایە. جگە لەکەش و هەوای دڵگیر و دەشتە سەرسوڕهێنەرەکان، گەرمێن و کوێستانی هەیە. کان و گەنجە سروشتییە دەستلێنەدراوەکان لەکوردستان فراوانە.

### ژمارەی دانیشتووانی کوردستان

سەبارەت بەژمارەی دانیشتووانی کوردستان لەبەر نەبوونی دامەزراوەیەکی سەرژمێری، بۆچوونەکان جیاوازن. بەمپێیە ناتوانین بەدڵنیاییەوە ژمارەی دانیشتووانی کوردستان دیاریبکەین بەڵام لەکتێبی (زەردی فەرەنسا) لەبەرواری ١٨٩٢ زایینی نووسراوە: ژمارەی کوردانی تورکیا٣،٠١٢،٨٧٩ کەسە. ئەگەر کوردانی ئێرانیشی پێ زیاد بکرێت دەکاتە پێنج

ملیۆن و چەند سەدهەزارێك.

لەراپۆرتی کۆمسیۆنی کە بەسەرۆکایەتی کەنت تەلگی، سەرۆك وەزیرانی هەنگاری، لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەخواست و داوای کوردان و دیاریکردنی ژمارەی ئەوان ئەنجامدرا و لە ساڵی ١٩٢٥ بڵاو کرایەوە، ژمارەی کوردانی لەسەراسەری جیهان بەمشێوەیە خەمڵاندبوو:

لەتورکیا ١،٥٠٠،٠٠٠ کەس، لەئێران ٧٠٠،٠٠٠ کەس، لەعێراق ٥٠٠،٠٠٠ کەس، لەسوریا و سەرزەمینەکانیتر ٣٠٠،٠٠٠ کەس کەکۆی گشتی دەکاتە ٣،٠٠٠،٠٠٠ کەس.

ئەلێکساندەر یابا لەکتێبەکەی کە سەبارەت بەچیرۆك و بەسەرهاتە کوردییەکان نووسیویەتی و لەساڵی ١٨٦٠ زایینی لەپێتێرزبۆرگ بڵاوی کردۆتەوە، دەنووسێت: ئەگەر بمانەوێت ژمارەی کوردان لەرووی خێوەت و ڕەشماڵەوە دیاریبکەین، دەبینین لەهەر خێوەت یا مەنزڵێك ٥ تا ٢٠ کەس دەژیت. بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی ڕاست ژمارەی نێوەند لەبەرچاو دەگرین کە ١٠ کەس بێت. ئەم ژمارە لێکدانی ژمارەی خێوەت و ڕەشماڵەکان دەکەین و ئەنجامەکەی دەبێتە:

لەتورکیا ٣،٩٨٧،٩٦٠ کەس، لەعێراق ٧٤٩،٣٨٠ کەس، لەئێران ٣،٣٠٠،٠٠٠ کەس، لەسوریا ٢٨٩،٩٤٠ کەس، لەئەرمەنستان ٦٠،٠٠٠ کەس و کۆی گشتی دەکاتە ٨،٣٨٧،٢٨٠ کەس. کوردانی بەلوچستان و ئەفغانستان و هیندستان لەم خەمڵاندنەدا لەبەرچاو نەگیراون. بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەم خەمڵاندنانە لەڕاستییەوە نزیك نییە. بەهێزترین گومان ئەوەیە کەژمارەی کوردان لە ١٠ ملیۆن کەس کەمتر نییە چوونکە کوردستان بەم پان و بەرینییە، بچووکتر لەئاسیای بچوك نییە کەژمارەی دانیشتووانەکەی بە ١٦ ملیۆن کەس دەخەملێنن.

### تایەفە سەرەکییەکانی کورد

بەپێی بەڵگەنامە مێژوویی و ئاسەوارەکان، کوردان بۆ دوو دەستە دابەش دەکرێن: دەستەیەکیان ئەو کوردانەی چەند هەزار ساڵ پێش زایینی مەسیح تا ئێستا، خۆیان بەکورد ناساندوە و مێژوونووسە بیانی و نێوخۆییەکان ناوی ئەوانیان بەکورد بردووە و دەستەیەکی دیکە ئەو کوردانەی لەسەدەی نۆی پ.ز خۆیان بەکوردە مادییەکان ناساندووە و

مێژوونووسان ئەوانیان بەناوی ماد، ناو بردووە.

بەشی یەکەم: ئەو کوردانەن لەلای ئارارات یانی چیای گودی (=جودی) هاتوون و بەدرێژایی دیجلە و فورات لەڕۆژئاوا تا سوریە و شامات و کەنارەکانی مەغریب (دەریای سپی ناوەڕاست) و لەڕۆژهەلاّت تا کەنداوی فارس و کەنارەکانی دەریای عەمان بلاّو بوونەتەوە و دانیشتووانی زاگرۆس لەمانە پێکهاتوون.

دەستەی دووەم: ئەو کوردانەن لەلای ئاسیای ناوەڕاست بەرەو ڕۆژئاوا (ئێرانی ئەمڕۆیی ڕۆژهەلاّت) هاتوون و لەوێوە بەرەو دەریاچەی مازەندەران (=دەریای خەزەر) و ناوچەی ئازەربایەجان و ناوچەکانی ئیسپەهان و ئێکباتان و لوڕستان هاتوون و ئەم ولاّتە پان و بەرینەیان بەناوی ئەوانەوە، بەولاّتی مادای یا میدی یا میدیا، ناو بردووە. دیواری مەدی لەنێوان بابل و بەین ئەلنەهرین کە لەو پەڕی مەزنی و تۆکمەیی بەخشت و قیر دروست کراوە، بۆ ئەم دەستەیە دەگێڕنەوە.[1]

تایەفە سەرەکییەکانی دەستەی یەکەمی کوردان، یانی کوردانی ڕۆژئاوا کەبەکوردانی زاگرۆس ناسراون، بریتین لە: لۆلۆ، گوتی، کاسویا (کاسی)، سوبارو (سوباری، یا شورباری یا هوری).

تایەفە سەرەکییەکانی کوردانی دەستەی دووەم بریتین لە: ماد، نایری، کاردۆخ. ئەم حەوت تایەفە، تایەفە سەرەکییەکانی کوردن کەدواتر تایەفە لاوەکییەکان لەوان دروست بووە و هەر تایەفەیەك بۆ چەند تیرەیەك دابەش بووە.

### تایەفەکانی کوردانی ئارارات

١. تایفەی لۆلۆ: ئەم تایەفە یەکێك لەتایەفەکانی کوردانی ئاراراتن کە لەسەدەی ٣٧ پ.ز، یانی ڕۆژگارێك پێش دروست بوونی دەولەتی جەمشیدی لەناوچەی کرماشانی ئەمڕۆیی، لەنێوان کرماشان و بەغداد (لەو زەمانەدا بە لۆلۆبوم (=سەرزەمینی لۆلۆ) ناوبراوە، فەرمانڕەوایەتیان کردووە. دەستەیەك پێیان وایە لەویلایەتی سلێمانی ئەمڕۆیی و ناوچەکانی شارەزوور و زەهاو و هالمان (حیلوان) ژیاون. بەهەرحالّ ئەم تایەفە لەسالّی

[1] – دەستەیەك لەمێژوونووسان بەدیواری بەختنەسری ناو دەبەن. ئەگەر ئەمە راست بێت دەبێت بەدیواری بەختنەسر ناوی ببرێت نەك دیواری مەدی.

۲۷۰۰ پ.ز لەگەڵ نارامسین کوڕی سارگۆنی یەکەم، پاشای ئەکەد، جەنگاون و شکستیان خواردووە. پاشای ئەوان لەم جەنگەدا شاتون (ساتون) بووە و لەسەردەمی سارگۆن باوکی نارامسین، لاسیراب، پاشای لۆلۆییەکان بووە. (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك، ل ۱۸٦).

بەمشێوەیە ناونیشانی مێژوونووسانی ئێران، بەتایبەت شانامە کەدەنووسێت: دەستەی کوردان لەهەڵاتووان لەدەستی زوحاك دروستبوون، بەڵگەیە بۆ نەزانینی ئەوان.

لەلەوحەکەی زەهاو، کەسەبارەت بەئانۆبانینی، پاشای گوتی و لۆلۆیە و لەسەدەی ۲۸ پ.ز نووسراوە، هاتووە کەناوچەی زەهاوی ئەمڕۆیی لەدەست لۆلۆییەکاندا بووە. بەپێی لێکۆڵینەوەکانی دوکتۆر سپایزار، دەستەیەك لەفەرمانڕەوکانی ئاشور لەسەدەی ۱۹ و ۱۸ پ.ز لەلۆلۆییەکان بوون و ئەگەری هەیە لقێك لەوان لەسوریا ژیابێتن. (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا).

بەپێی بەڵگەکانی ڕۆژگاری ئاسورنازیربالی پاشای ئاشور، وڵاتی لۆلۆ ئاوەدان بووە و دانیشتووانەکەی کەسانێکی شارستانی و پیشەگەر بوون تا ئەو جێگەی ئاسورنازیربال ژمارەیەکی زۆری پیشەگەرانی ئەو شارەی بۆ ئاشور بردووە. (ئولمسنید)

تگلاس پالازاری دووەم بەشێك لەئارامییەکانی میزۆپۆتامیای (=بەین ئەلنەهرەین) بۆ وڵاتی لۆلۆ، یانی لۆلۆبوم گواستۆتەوە. (فۆرژ، ل ٤۳)

پرۆفیسۆر سپایزار لۆلۆییەکان بەباوەگەورێکانی لوڕەکان دەزانێت، لەکاتێکدا پاشماوەکانی لۆلۆ هەنووکە لەزەنگار و ناوچەکانی عێراق بوونیان هەیە و هیچ لێکچوونێکیان لەزمان وئاداب لەگەڵ لوڕەکان نییە.

زۆربەی پاشاکانی ئاشور وەك: تگلاس پالازار و ئەداد نیراری و توکولتی نینورتا، بەبەردەوامی لەگەڵ پاشاکانی لۆلۆ جەنگاون.

ئاسورنازیربال چوار جار هێرشی کردۆتە سەر سەرزەمینی لۆلۆ.

لەسەدەی نۆی پ.ز پایتەختی دەوڵەتی لۆلۆ شاری زیمری بووە کەئاسورنازیربال دەستی بەسەردا گرتووە. دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئاشور و دەرکەوتنی دەوڵەتی ماد، وڵاتی لۆلۆ، کەوتۆتە ناو سنوری ئیمپراتۆری ماد. سنوری وڵاتی لۆلۆ بەتەواوی زانراو نییە. بەڵام بەپێی نەخشەکانی کۆن و بەڵگەنامە بەدەست هاتووەکان، لەلای باکوری زاموئا، ناوچەی نامری

(=پشدەر و سەردەشت) و لەڕۆژهەلاّتەوە، ناوچەکانی سومی و هاشمار و هارهار[1] و هالمان (=حیلوان سەردەمی ئیسلام) و لەباشورەوە ویلایەتەکانی باراهسی و توکریس عیلامی دراوسێ بووە، لەڕۆژئاواوە پەیوەستی ئارابخا (کەرکوك) بووە. لەناوەوە ناوچەکانی لارا و سیماش و کیماش بووە.

ویلایەتە ناسراوەکانی دەوڵەتی لۆلۆ، بابیت یانی بازیانی ئەمڕۆ و داگارا و کاکری و بارا و زیمری و هودون و مسو و ئارزیرو و قلاّی ئوزی و کینبا (پیرەمەگرون) بووە.

چیا بەناوبانگەکانی: لیسیر و یا کینبا (یانی چیای ڕزگاری[2]) و نیکیدیم و نیکیدی ئیرا و سیماکی و ئازیروی یانی ئەزمەڕ و کولار و لارلار و سوانی و نیسپی بووە. چیای نیسپی ئەگەری هەیە لەچیاکانی هەورامان بێت.

ڕووباری رادنو و ئەدیر لەولاّتی لۆلۆیە. (سپایزار).

٢. تایەفەی گوتی یا گودی: ئەم تایەفە بەشێك لەکوردانی زاگرۆسن یانی کوردانی ئارارات. بەپێی بۆچوونی دەستەیەك لەڕۆژهەلاّتناسەکان، یەکەم دەستەی کوردان ئەوانن کە لەچیاکانی زاگرۆس و ناوچەکانی کەرکوك فەرمانڕەوایەتیان کردووە و لەمێژووی شومیر و ئەکەد چالاکی سیاسییان بووە.

ئەم تایەفە لەنزیکەی ٢٧٠٠ پ.ز هێرشیان کردۆتە سەر بابل. نارامسین کوڕی سارگۆنی یەکەمی پاشای ئەکەدیان تێکشکاندووە و دەستیان بەسەر شومیر و ئەکەد، گرتووە. دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

لەیەکێك لەدوو لەوحە بەدەستهاتووەکەی زەمانی توکولتی نینورتا، پاشای ئاشور، ئاماژە بەناوی گوتی دراوە و لەلەوحەکەی دیکە ناوی کورتی نووسراوە.

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەم دوو وشەیە هەردووك بەیەکێك لەتایەفەی کوردان وتراوە و یا ئەوەی گوتی بەشێك لەکورتییە کەناوچەکانی ئەوان، یانی گوتییەکان، چیاکانی ئارارات بووە. چوونکە گوتی، لەبنچینەدا گودییە کە (د) بۆ (ت) گۆڕاوە و وگودی ناوی کۆنی

---

[1] – شاری هارهار لەسەدەی ٢٨ گرفتاری هێرشی سارگۆن بووە. سارگۆن ناوەکەی گۆڕیوە و بەکارشارۆگین ناوی بردووە. یانی شاری سارگۆن. ئەگەری هەیە ئەلبەحەی ئەمڕۆیی یا نزیك ئەوێ بێت . (مێژووی ئەمین زەکی بەگ)

[2] – ئاسورنازیربالْ پاشای ئاشور دەڵێت: ئەم چیایە لەڕۆژهەلاّتی ئاشورە. چیایەکی تاقانەیە، لووتکەی وەك نووکی ڕم تیژە. (مستر (م . سیرك) (لەئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، بەرگی یەکەم ل ١٠٦) دەڵێت. مێژوونووسانی جوولەکە چیای جودیان بەچیای کوردوان ناو بردووە. چیای نیسیر لەویلایەتی کوردوانە.

ئاراراتە کە لەڕۆژگاری ئیسلامیشدا بەکار براوە و (استوت علی الجودی) لەگەڵ گودی پاتسی فەرمانڕەوای لاکاش لەسەردەمی پاشایەتی گودیدا بووە. (۲۵۰۰ پ.ز). لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی گودی و گوتی یەکێکە و دەستکاری وشەکە کراوە. بەمپێیە کورت، هەمان کوردە و دووبارە لێرەدا (د) بۆ (ت) گۆڕاوە. بەپێی مێژوو و بەڵگەنامە کۆنەکان، گوتی ناوی یەکێك لەهۆزەکانی ئارارات بووە و بەهۆی چیای گودی، بەو ناوە ناوبراون. دواتر تێکەڵ بەکوردەکانی دیکەی ئارارات بوون و هاتوونەتە کەرکوك. لەڕۆژگاری ئاشور، ویلایەتی بوتان و ئاشوریان بە (گوتیوم) ناو بردووە یانی ویلایەتی دەستەی گوتی. ڕۆژهەلاتناس درایوار، بیر و هزری خۆی لەم بابەتەدا کورت کردۆتەوە و دەڵێت: کاردۆ و کاردۆخی و کارتۆخی و کاردۆشی و کاردا و کارداك و کاردایە و کارتاویە و کوردی و. کورتوی و کورتوخی و کوردوانی و کوردویا و گوتی و .....، هەرچەند لەوشە و دەربڕیندا جیاوازن، بەڵام لەڕاستیدا یەك شتن و ناوێکی هاوبەشن کە بەدەستەیەکی تایبەت وتراوە. تەنانەت ئەم ڕۆژهەلاتناسە، وشەی سیرتی بەوشەی کورتی دەزانێت و لەریزی ئەو ناوانەدا ئاماژەی پێداوە.

بەمپێیە ئەم ڕۆژهەلاتناسە، کوردانی ئەمڕۆ بەهەمان کاردۆشۆ یا کاردۆخوی گەزنەفۆن یا کاردای شومیر دەزانێت و بەپێی نووسینەکانی ئەو لەوحەیە، سەبارەت بەفەرمانڕەوایەتی سێیەمی ئەلێکساندەری سێیەم(ئور) ناوی ئەم دەستە لەکوردان بووە. نووسراوی سەر لەوحەکە سەبارەت بەئەرادنانار، پاشای لاکاشە کە لەناوەڕاستەکانی سەدەی ۲٤ پ.ز پاشایەتی کردووە و ئەو وشەی بەکاردا خوێندویانەتەوە، بەکارداکایش دەخوێندرێتەوە. لەم ئەنجامانەوە دەگەینە ئەوەی هەموو ناوە ئاماژە پێدراوەکانی سەرەوە، یەك ناوی هاوبەشن و دەستەیەك لەمێژوونووسان لەپشتڕاست کردنەوەی ئەم بۆچوونە گومانیان نییە تەنانەت دوکتۆر سپایزار، جەختی لێدەکاتەوە (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا، ل ۱۱۷).

سەلمانازاری یەکەم، پاشای ئاشور، زیاتر لەباو و باوەگەورێکانی خۆی شەڕی لەگەڵ گوتییەکان کردووە. سەلمانازار دەڵێت: دیاری گوتی لە(ئوراتری) (=ئارارات) تا (کموخی) (=توری عابدین) درێژ بۆتەوە.

۳. تایەفەی کاسۆ یا کاسی: ئەم دەستەیە، لقێك لەدانیشتووانی زاگرۆسن. یانی بەشی کوردانی ئارارات کەیەکەم جار لەناوچەی کرمانشا بینراون و لەوێ نیشتەجێ بوون.

ئەکەدییەکان ئەوانیان بەکاسۆ یا کاشۆ ناو بردووە. یانی وشەی کاسۆ، وشەیەکی ئەکاد و ئاشورییە بەڵام لەزمانی کوردی کاکو یا کاکە و لەزمانی فارسی پێی دەڵێن کاکا. وشەی کاکەوەند (= کاکاوەند) لێرەوە هاتۆتە ئاراوە. لەناوچەکانی سنە چەند گوندێك بەناوی کاکو بوونی هەیە. ئەگەری هەیە دانیشتووانی ڕەسەنی ئەم گوندانە لەو دەستەیە بووبێتن.

دەستەی کاسۆ یا کاسی، بەکوردە هەتاوپەرەستەکان ناسراون. لەسەردەمی حکومەتی هەخامەنشی ئەم دەستەیە (کاسییەکان) لەبری هاتوچۆ لەڕێگەی بابل بۆ ئەکباتان، ساڵانە باجیان لەدەوڵەتی ئێران وەرگرتووە. ئەسکەندەری مەزن لەگەڵیان جەنگاوە، سەرداری رۆمی ئەنتیفۆنوس لەنێو عەشیرەکانی کاسا لەدەربەندی (پول تەنگی گەلو)، گوزەری کردووە.

کاسییەکان کەم کەم ڕۆژهەڵاتی بابلیان داگیر کردووە و زۆربەی کاتەکان سەرزەمینی بابلیان تاڵان کردووە. ئامی زادوگا، پاشای بابل کەچوارەم نەوەی حامورابی بووە، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٧-١٩٥٦ پ.ز بۆ ڕێگرتن لەهێرش و تاڵانی کاسیەکان، لەگەڵ عیلام پەیماننامەی هاوکاری بەستووە. (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك، ل١٩٨. پیرنیا، ل١٩٨)

هۆزەکانی کاسی لەسەردەمی پاشایەتی شمشوایلونا ١٩٦٠ پ.ز هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی بابل بەڵام نەیانتوانی دەستی بەسەردا بگرن. دوای دوو سەدە، ١٧٦٠ پ.ز، دووبارە دەستەیەکی دیکە لەکاسییەکان بەهاوکاری دەستەیەك لەعەشیرەکانی هاونەژادی خۆیان (گوتی و لۆلۆ لەژێر فەرماندەیی گاندیش، فەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵات و بەتوانای کاسی) هێرشیان کردە سەر بابل و دەستیان بەسەردا گرت. (دواتر ئاماژەی پێدەدەین).

لەسەردەمی حکومەتی ئاگامێل، حکومەتی شومێر رووخا (١٧١٠ پ.ز) . ئەم پاشایە ویستی دەسە بەسەر سەرزەمینی عیلامدا بگرێت بەڵام نەیتوانی پێشکەوتن بەدەست بێنێت و تێکشکاو گەڕایەوە. لەم کاتەدا یەکێك لەسەرکردەکانی کاسی بەناوی ئولام بوریاش، دژی ئاگامێل جەنگاوە و توانیویەتی شکستی پێبێنێت و دەست بەسەر وڵاتەکەیدا بگرێت. دوای چەند ساڵێك پاشای کاسی بابلستان ئاگومی سێیەم کەبرازای ئولام بوریاش بووە، دەستی بەسەر دوایین قەڵای ویلایەتە کەنارییەکان، یانی ویلایەتی شومێر بەناوی دورائا گرتووە. دوای گرتنی ئەم ویلایەتە، پاشای کاسی ناوی کاردۆنیای بۆ دوو ویلایەتی ئاکاد و شومێر دیاریکردووە و بەم ناوە تازە نزیکەی شەش سەدە، ئەم حکومەتە مەزنە درێژەی کێشاوە کەیەکێکە لەچوار حکومەتە بەهێزەکەی جیهان (میسر، هیتیت، کاردۆنیا، میتانی). فراوانی

سنووری ئەم دەوڵەتە کوردییە لەفراوانی سنووری دەوڵەتی حامورابی زۆر زیاتر بووە.

کاسییەکان دوای ئەوەی ئەم پاشایەتییان لەدەستداوە، بۆ شوێنی سەرەکی خۆیان یانی زاگرۆس گەڕاونەتەوە. تا لەدایك بوونی مەسیح ئەم دەستەیە (کاسی) بەم ناوە، لەناوچەکانی لورستان بوون و هێدی هێدی ئەم ناوە لەو سەرزەمینەدا نەماوە و وشەی لوڕ جێگەی گرتۆتەوە. لەبەر ئەوەیە مێژوونووسان کاسییەکان بەباوەگەورێکانی لوڕەکانی ئەمڕۆ دەزانن. وشەی کاسی، کاسا، کاسای، کاشۆ، کاکو هیچ پەیوەندی و نزیکییەکان لەگەڵ وشەی لوڕ نییە بەڵام ئەگەری هەیە لوڕەکان تیرەیەك لەکاسییەکان بووبێتن کەدواتر بەسەر کاسییەکانی دیکەدا زاڵبوون و کاسییەکانیان لەناو خۆیاندا تواندبێتەوە و وشەی لور جێگەی وشەی کاسی گرتبێتەوە.

زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان لەئاری بوونی کاسییەکان گومانیان نییە و بەپێی بۆچوونی مێستر هوڵ، زمانی کاسی، زمانی ئاری بووە. دەرئەنجام نزیکی و و پەیوەندی زمانی کاسی لەگەڵ زمانی دانیشتووانی زاگرۆس جێگەی گومان نییە. (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا)

٤. تایەفەی شوباری یا سوباری و یا سوبارو (=هوری) ئەم ناوە یەکەم جار لە لەوحەیەکی سەردەمی حکومەتی لوگال ئانی موند، پاشای سەدەی سێیەمی پ.ز بەشێوەی (سوبیر) بینراوە. لەشوێنەوارەکانی نارامسین ئامـاژە بەوشەی سوبارتیم دراوە. کوردە شوبارییەکان یا شوبری دەڵێن ئەم ناوە لەسەردەمی حکومەتی ئەکاد، ناوی دەوڵەتێکی زۆر گەورە بووە. سنوورەکەی لەباکوری ڕۆژئاوای عیلام تا چیاکانی ئامانوس[1] درێژ بۆتەوە. دواتر ئەم ناوە بەکار براوە بۆ چەند عەشیرەیەکی سەرەکی کوردستان کەجیاوازن لەکوردەکانی زاگرۆس بەڵام لەدەستەی یەکەمی کوردانن (=کوردانی ئارارات)

حامورابی، ئەم ناوەی بۆ ویلایەتێك بەکار بردووە کەدەستەیەکی سەربەخۆ لەوێ ژیاون. لەبەڵگەنامەکانی ئاشوری ئەم دەستەیە بەسوبارو ناویان براوە. بەکورتی لەبەڵگەنامە و شوێنەوارەکان دەگەینە ئەو ئەنجامەی دەستەیەك لەژێر ناوی سوبارو لەمیزۆپۆتامیا (= بەین ئەلنەهرەین) و سوریە و ئاناتۆلی ژیاون. (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا، سپایزار).

سوبارییەکان چەندین جار لەگەڵ سوپای ئاشور جەنگاون. تگلات پالازاری یەکەم لەسەدەی یانزەی (١١٠٠ پ.ز) یەکێك لەشارە ناودارەکانی سوباری بەناوی شەریش، گەمارۆداوە. لەم

---

[1] – چیای ئامانوس: چیایەکی زۆر گەورەیە، لەویلایەتی ئاتنە، کەمێڵی ئاسنی ئاتنە بۆ حەلەب لەژێر چیاکەدایە.

جەنگەدا، هۆزەکانی سوباری و کارتی و موشکی پێکەوە بەرگرییان کردووە و بوێرانە جەنگاون (مێژووی کۆنی ئاشور)

سوبارییەکان لەناوەڕاستەکانی سەدەی دەی پ.ز، حکومەتێکی بەهێزیان بووە بەڵام لەکۆتاییەکانی حکومەتی ئاشور، ناوی سوباری سڕاوەتەوە و ناوی (نایری) جێگەی گرتۆتەوە. بەهەمان شێوە کە لەگێڕانەوەکان سەبارەت بەکاسییەکان ئاماژەمان پێدا، ئەگەری هەیە ئەم دەستە تازەیە (نایری) یەکێك لەهۆزە گەورەکانی تایەفەی سوباری بووبێتن و هەموو سوبارییەکانیان لەناو خۆیاندا تواندبێتەوە. بەڵگە و شوێنەوارەکانی نایرییەکان لەناوچەکانی شەمدینان تا ئێستایش ماوە.

نووسەری کتێبی بابلستان، سێر کینگ، و دەستەیەکی دیکەی لەڕۆژهەلاتناسەکان، میتانییەکان بەیەکێك لەهۆزەکانی کاسی ناو دەبەن بەڵام لەکتیبی (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا ل ١٢٨ و ١٣٥) پێچەوانەکەی ئامارژەی پێدراوە و سپایزار دەڵێت: میتانییەکان هۆزێکی گەورە لەسوبارتو (=سوبارو)ن. ئەم دەستەیە لەناوەڕاستی فورات (لەنێوان موسڵ و تەرابلوس) نیشتەجێ بوون بەڵام لەسدەی ١٦ پ.ز، حکومەتێکی بەهێزیان دامەزراندووە. بەهەمان شێوە کەسەبارەت بەکاسییەکان ئاماژەمان پێدا، حکومەتی میتانی یەکێك لەچوار حکومەتە گەورەکەی دنیا بووە : (میسر، هیتیت، کاردۆنیا، میتانی). پایتەختی دەوڵەتی میتانی، شاری واشوکانی بووە. لەبەڵگەنامەکانی ئامارنا، پەیوەندییەکانی میتانی و حکومەتی میسر، ئامارژەی پێدراوە. کاغەزی توشراتا، پاشای میتانی، کە بەم دواییانە دۆزرایەوە، بەزمانی میتانی نووسراوە و شەش سەد دێرە. لەکاتێکدا زمانی ڕەسمی ئەو ڕۆژگارە، زمانی ئەکەدی بووە.

بورکی ڕۆژهەلاتناس دەڵێت: زمانی ئەم کاغەزە، تێکەڵەیەکە لەخۆگری چوار توخمی زمانی قەوقازی: (یانی کوردەکانی قەوقان)

ویلایەتی میتانی نزیکە لە ناوی سوبارو. لەناوچەی کەرکوك، چەند هەزار بەڵگەنامە سەبارەت بەسوبارییەکان و میتانییەکان دۆزراوەتەوە. لەبوغازکوی، چەندین بەڵگەنامە و شوێنەوار دۆزرایەوە. جنسنی ڕۆژهەلاتناس دەڵێت: ناوی میتانی بۆ بنەماڵەی پاشایەتی بەکار براوە و لەبنەمادا، کۆمەڵەی سوباری و ناوی ویلایەتەکەیان هانی گاڵبات بووە. ئەم گێڕانەوەیە لەگەڵ لەوحە دۆزراوەکانی کەرکوك یەکدەگرێتەوە. حکومەتی میتانی لەزەمانی

پاشایەتی ئاسورنازیربالی پاشای ئاشور، هێندی هێندی دەسەڵاتی خۆی لەدەستداوە و ویلایەتەکەیان لەلایەن ئاشورییەکانەوە دەستی بەسەردا گیراوە و سەرئەنجام لەناو چووە. (مێژووی گشتی مێژوونووسان).

حکومەتی میتانییەکان وەك ئاماژەمان پێدا لەسەدەی ١٦ پ.ز حکومەتێکی بەهێز بووە. هەموو ناوچەکانی سوریا، ویلایەتی عامور، بەشێك لەکوردستانی ڕۆژئاوا تا ئارافا و ویلایەتی ئاشور، لەژێر فەرمانڕەوایەتی میتانییەکاندا بووە. دانیشتووانی کۆنی میسر، میتانییەکان بەناهاری ناو دەبەن. ئەم ناوە بەهۆی نزیکی میتانییەکانە لەڕووباری دیجلە کە لەتەوراتیش بە(ئەرمی ناهاریم) ناوی هاتووە. (مێژووی گشتی مێژوونووسان، بەرگی دووەم، ل ٣٨١). ئەگەری هەیە وشەی نایری کورتکراوەی ناهاری بێت.

سێر سیدنی سمیت دەڵێت: بەشی ڕۆژئاوای دیجلە، سوباری بەناوی هوری ناسراوە. سپایزار دەڵێت: ئەگەری هەیە لقی میزۆپۆتامیایی هوری لەژێر ناوی سوباریدا ناسرا بێت. لەڕاستیدا لەمێژووی عەشیرەکانی کورد، ئاماژە بەچەندین ناوی جیاواز دراوە و کەسانی ناشارەزا گومان دەکەن ئەو ناوانە بۆ تایەفە و عەشیرە زۆر و جیاوازەکان دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا ئەم گومانە هیچ بنەمایەکی زانستی نییە چوونکە دروست بوونی ئەو وشە و ناوانە بەپێی پێویستی و عادەتی خەڵکانی ئەو سەردەمە شتێکی باو بووە.

پرۆفیسۆر سپایزار لەکتێبی (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا، ل١١٦) ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە. لەباسی تایبەت بەهورییەکان، ئامارەی بەنۆ ناوی جیاواز داوە: هوری، هوریت، هورلو، هورلیلی، هورلاش، هوروهە، کوردهوروهە، هاری، موری.

لەکاتی ئامارەدان بەناوی میتانییەکان، ئامارەی بەناوی میتانی، میتلانی داوە. نەتەوەی لۆلۆی، بەلۆلۆ، لۆلوم، لۆلومی، لۆلۆبوم، نولو، ناو بردووە. هەروەها هۆزەکانی مادی بەمادا، مادای، ئامادا، ئامادی، مەد، مید، میدی، میدیا ناو بردووە.

کاسییەکان بەکاسی، کاسی، کاسای، کاسا، کاسو، کاشۆ ناوبراون. بەمپێیە ناوی کوردیش لێرەوە وەرگیراوە کە لەلایەن نەتەوە جیاوازەکانەوە بەپێی پێویستییەکان گۆڕانکاری سەیر و سەمەرەی بەسەردا هاتووە.

بەپێی بۆچوونی زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکان، ئەو گۆڕانکارییانە هیچ کاریگەریەکی نەرێنیان لەسەر کورد نییە و هەموو ئەو وشە و دەربڕینانە بۆ وشەی کورد لەقەڵەم دەدەن و یا دەڵێن:

هەموو ئەو ناوە جیاوازانە، بەو شێوەی کەئێستایش باوە، بۆ تایەفە جیاوازەکانی کوردان بەکار براوە و یا هەر نەتەوەیەك، کوردانی بەناوێکی جیاواز ناو بردووە. بۆ نمونە شومێر و ئاکاد، کوردەکانیان بەناوی گوتی یا کودی ناو بردووە. لەبەر ئەوەی کوردان لەلایەن چیای گودییەوە هاتوون و ئاشور وئارامییەکان کورد بە: گوتی، کوتی، کورتی، کارتی، کاردۆ، کاردان، کاردا، کارداك، کارداکا، کارکتان ناو بردووە.

ئێرانییەکان بە: کورتو، کورتوی، کورداها، کودراها، کوردراها و سیرتی ناویان بردووە.

رۆم و رۆمانییەکان بە: کاردۆسوی، کاردۆشوی، کاردۆخوی، کاردۆك، کاردۆکیا، کاردویکا، کوردوکی و کاردۆخی ناویان بردوون.

ئەرمەنییەکان بە: کوردوانی، کورخی، کارخی، کورتیخ، کورچخ ناویان بردوون.

عەرەب بە: کرد، کورد، کردی، کوردی، جورد، جوردی، جودی، کاردۆی، باکاردا و کارتاویە ناویان بردوون.

روسەکان بە: قورت، قورد، قرت ناویان دەبەن و ....

ئەم بۆچوونە تەنیا لەلایەن سپایزارەوە پشتڕاست نەکراوەتەوە. زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسە بەناوبانگەکان وەك مستر درایوار و نولدکە و هاوفمان و.... جەخت لەڕاستی ئەم بۆچوونە دەکەنەوە. تەنانەت گۆڕانکارییەکانی وشەی خالدی کە خالدی، کالدی، خالدوی، کالدوی، خالدیوی، کالدیوی، لەناو هاوبەشەکانی کورد دەزانن

ڕەوتی گۆڕانکاری ناو و وشەکان، تەنیا تایبەت بەسەدەکانی پێشوو نییە. ئێستایش لەلایەن نەتەوە جیاوازەکانی ئەم سەردەمەوە، شێواندنی ناوەکان بەردەوامە چوونکە هەر دەستەیەك ناو یا دەربڕینێك بەپێی شێوەزاری خۆیان گومان دەکەن و دەریدەبڕن. بۆ نمونە لەکۆندا بەئێرانیان وتووە (سفن). دواتر ئاریا، دواتر پێشدادی، ئاجام، ئاریان و سەرئەنجام ئێران و پارس. سەلمانازار پارسوا دەڵێت: ئەوروپاییەکان ئێران بە: پێرس، روس، پرسیا و عەرەبەکان بەفارس یا عەجەم ناویان دەبەن کەمەبەست لەهەموو ئەو ناو و وشە جیاوازانە تەنیا ناوی ئێرانە. هاوشێوەی حکایەتی (عەنەب و ئەوزەم و ترێی مەسنەوی مەولەوی) کەهەمووی یەك شتە.

## تایەفە کوردەکانی ڕۆژهەلات زەمین

١. تایەفەی ماد: هێرەوی ڕۆبنسنی مێژوونووس و هێنری بربستید، لەمێژووی گشتی ئەوروپا، بستون (١٩٢٤) دەڵێن: لەدەوروبەری ساڵی ٢٥٠٠ پ.ز دەستەیەك لەتایەفەکانی هاوسیٚ و هاونەژاد کەسەردەمانێك بەئاری ناویان بردوون و لەرەگەزی هیندو-ئەوروپایین، لەڕۆژهەلاٚت و باکوری ڕۆژهەلاٚتی دەریای خەزەر نیشتەجیٚ بوون. بەشێك لەوان سەرقاڵی وەرزێری بوون بەلاٚم هێشتا لەقۆناغی بەردیندا دەژیان. تەنیا بەشێکی بچوك بەوان کانەکانیان بەکار دەبرد. ئاژەڵە ماڵییەکان و ئەسپ و مەریان بەخێو کردووە. خاوەنی نووسین نەبوون. دەستەیەك لەم تایەفانە بەرەو هیندستان کۆچیان کردووە. لەکتێبی (ویداس) یانی کتێبی پیرۆزی هیندییەکان کە بەزمانی سانسکریت نووسراوە، سەبارەت بە سەدە سەرەتاییەکان و ژیانی ئاشارستانی ئەم دەستەیە، هەندیٚ زانیاری لەبەردەستایە.

پاشماوەی ئەو دەستەیە بەرەو ویلایەتەکانی باشور و (وادی ئەلرافیدەین) کۆچیان کردووە. لەناو ئەوان دوو دەستەی بەهێز و بەتوانا بینراوە: ماد و پارس.

هاتنی مادەکان لەڕۆژهەلاٚتی دەریای خەزەر، لەبەڵگەنامەکانی سەدەی نۆ و هەشتی پ.ز ئاشورییەکان ئاماژەی پێدراوە. ئاشورییەکان ئەم دەستەیەیان بەماد و ئامادا ناو بردووە. ئەم دەستەیە لەناوەڕاستەکانی سەدەی نۆیەمی پ.ز لەژێر فەرمانڕەوایی کەیقوبادی کورد، پاشایەتییەکی بەهێزیان دامەزراندووە و دەستەی دراوسیٚ و هاونەژادی خۆیان یانی پارسەکانیان خستۆتە ژێر رکێفی فەرمانڕەوایەتی خۆیان. کۆشك و دیوارە رەنگینەکانی ئەکباتان (=هەمەدان) و فراوان کردن و ئاوەدان کردنەوەی ئەم شارە لەشوێنەوارە بەجێماوەکانی ئەم دەستەیە کەئەو شارەیان کردۆتە پایتەختی خۆیان.

یەکەم بەرکەوتن و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئاشورییەکان و ئەم دەستەیە لەدەورانی سەلمانازاری دووەم، پاشای ئاشور روویداوە (٨٥٣ پ.ز)

دەوڵەتی ئاشور تا ڕۆژگاری رووخانی، بەردەوام سەرقاڵی جەنگ و پێکدادان لەگەڵ مادەکان بووە. پرۆفیسۆر سایکس دەڵێت: مادا عەشیرەکانی کورد بوون و لەئاشور نیشتەجیٚ بوون. ویلایەتەکانی ئەوان تا باشوری دەریای خەزەر درێژ ببوویەوە. بەشی سەرەکی ئەوان لەروانگەی زمان، هیندو- ئەوروپایی و لەروانگەی نەژاد، ئاری نەژاد بوون. (مێژووی گشتی

مێژوونووسان، بەرگی دووەم).

ئەم گێرانەوەیە لەگەڵ مێژووی کورد و یۆنان یەکدەگرێتەوە جگە لەوەی کەدەڵێت: مادەکان لەئاشور نیشتەجێ بوون. لەکاتێکدا مادەکان دراوسێی ئاشورییەکانن بەڵام ئەو کاتەی وڵاتی ئاشوریان رووخاند، دەستیان بەسەر دەوڵەتی ئاشوردا گرت.

دەستەیەك لەرۆژهەڵاتناسەکان گومانیان کردووە سەلمانازار مادەکانی بەماد ناو بردووە. لەکاتێکدا سەلمانازار لەگێرانەوەی گەشتەکەی خۆی بەرەو رۆژهەڵات و باشور تەنیا دەڵێت لەگەڵ دوو دەستە لەپارسوا و ئامادا رووبەڕوو بۆتەوە نەك ئەوەی خۆی ناوی بۆ ئەوان دیاری کردبێت. کەواتە پێش گەشتەکەی سەلمانازار، پارس و مادەکان بوونیان بووە و بەم ناوە ناو براون و بەپێی وتەکانی هیرۆدۆتی یۆنانی، مادەکان خۆیان ناوی مادیان لەخۆیان ناوە نەك کەسیتر.

هۆزەکانی ماد: بەپێی مێژووە کۆنەکان، مادەکان لەدوو هەزار ساڵ پ.ز، بریتی بوون لەحەوت هۆز کەبریتین لە:

ئەلف- هۆزی پارتاسنی کە لەناوچەکانی وەرامین و ڕەی (=تارانی ئەمڕۆ) و کەنارەکانی دەریای خەزەر نیشتەجێ بوون.

ب – هۆزی بوس یا بوز کەسەرەتا لەمازەندەران بوون. دواتر بەرەو هەمەدان و ناوچەکانی عێراق هاتن و لەو سەرزەمینە بڵاوبوونەوە.

ج – هۆزی ئەستروشات، لەناوچەکانی سەمەرقەند و خوارەزم سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون.

د – هۆزی ئاریزانت، لەنزیك ئازەربایەجان و روباری ئاراکس (=ئەرەس) نیشتەجێ بوون.

ه – هۆزی بودی کەبەرەو باشور ڕۆشتوون. لەرێرەوی ئاوەکانی هیندستان نیشتەجێ بوون.

و- هۆزی ماژ (=ماگ) یا موغ کە بەماگوشیش ناویان براوە و عەرەبەکان عەرەباندوویانە و دەڵێن مەجوس. دینی زەردەشتی کەبریتییە لەئازەرهوشەنگ، لەلایەن ئەم دەستەوە بڵاو کراوەتەوە.

ز- ناوی هۆزی حەوتەم دیار نییە. لەبەڵگەکان وادەردەکەوێت کەناویان دیلام بووە. ئەم دەستە لەناوچەکانی تەبەرستان (=مازەندەران) و گیلان بڵاو بوونتەوە و ناوەندی ئەوان دیلمان بووە و هەنووکەیش ئەو ناوچانە بەدەیلەمستان ناو دەبەن.

هیرۆدۆت هۆزەکانی ماد بەهەمان شەش هۆزی سەرەتایی دادەنێت و ئامارەی بەهۆزی حەوتەم نەداوە. (مێژووی پیرنیا ل ٤٩).

هۆزەکانی ئامارە پێدراو هەرچەند لەیەك جیا و بەربلاو بون بەلام لەکاتی پێویستی و تەنگانە، هاوکاری یەکیان کردووە. لەرۆژگاری سەلمانازاری دووەم، لەمێژووی ٨٥٣ پ.ز سوپای ئاشور لەسنوری رۆژهەلاتی ولاتەکەی خۆی، رووبەرووی هۆزەکانی ماد بۆتەوە. ئەم هۆزانە دیاری و پێشکەشی زۆریان بۆ بردوون. پاشای ئاشور، ئەم کارەی ئەوانی بۆ بەهێزی خۆی و وەرگرتنی سەرانە لەکوردان گەراندۆتەوە لەکاتێکدا ئەم عادەتێکی باو لەناو کوردەکانە.

ئەدادنیراری سێیەمیش (٨١٢-٧٨٣ پ.ز) چەند جارێك رووبەرووی هۆزەکانی ماد بۆتەوە. تەگلاس پالازاری دووەمیش (٧٤٥-٧٢٠ پ.ز) لەژێر ناوی هاوکاری بۆ حکومەتی ئورارتو (=ئارارات) هێرشی کردۆتە سەر ولاتی ماد. بەپێی گێرانەوەی خۆی، تا داوێنی چیای دەماوەند پێشرەوی کردووە. (مێژووی کۆنی رۆژهەلاتی نزیك، ل ٤٤٦)

لەرۆژگاری ئاسارهادون (٦٨١-٦٦٩ پ.ز) دەولەتی ماد مەبەستی ئەوەی کردووە لەگەل هاوپەیمانەکانی خۆی: مانی، سیت، کاسکاشی و هۆزەکانی کوردستانی رۆژئاوا، گورزێکی کوشەندە لەئاشورییەکان بدات بەلام پاشای ئاشور بێ بەفیرۆدانی کات، دەستەی سیتی لەم هاوپەیمانێتییە هێناوەتەدەر و پەیوەستی خۆی کردووە و بەهۆی ئەم سیاسەت و چارەئەندێشییەوە، خۆی لەم مەترسییە رزگار کردووە بەلام دەولەتی ماد لەویست و مەبەستەکەی خۆی پەشیمان نەبۆتەوە و چاوەروانی دەرفەتی گونجاو بووە.

لەسالی ٦٣٤ پ.ز پەریوەرز (فەریبۆرز) چوارەم پاشای ماد، (یۆنانییەکان بەفەراوەرس یا فەراوەتیس) ناوی دەبەن)، هێرشی کردۆتە سەر ئاشور بەلام نەیتوانیوە سەرکەوتن بەدەست بێنێت و لەو جەنگەدا کوژراوە. تا ئەوەی هووەخشتەر، یانی کواکساری یۆنانییەکان، ئارەزووەکەی باوکی هێنایەدی و دەولەتی ئاشوری بۆ هەمیشە لەناو بردووە. (دواتر ئامارەی پێدەدەین).

٢. تایەفەی نایری (نائیری). ئەم دەستە بوێرە پێش دوواین کۆچ، یانی کۆچی پارس و ماد بۆ خاکی ئێرانی ئەمرۆ، لەکوردستانی رۆژئاوا بوون. لەبەلگەنامە کۆنەکان ئامارە بەناوی ئەم دەستەیە نەدراوە بەلام لەرۆژگاری ئاشورییەکان ئامارە بەناوی ئەوان دراوە.

ئەگەری هەیە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەم دەستەیە بەشێك لەهۆزی سوبارییەکان بن و دواتر زاڵ بوون و وشەی ئایری جێگەی وشەی سوباری گرتبێتەوە. یا بەهۆی نزیکی ئەوان لەڕووباری دیجلە ئەوانیان بەناهاری ناو بردووە و دواتر ئەم ناوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بۆتە ئایری. گوند و هۆزەکانی نەری شەمزینان و نەدری ناوچەکانی سنە، ئەگەری هەیە پاشماوەکانی ئەم دەستەیە بن.

میجرسۆن دەڵێت: ئەگەر لەسەدەی پانزە و دوانزەی پێش زایین سەیرێکی کوردستان بکەین، دەبینین باوەگەورێکانی ماد، ئایرییەکان بوون. ئەگەر ئەم بۆچوونەی میجرسۆن ڕاست بێت، مادەکانیش لەکوردەکانی ئاراراتن کە بەم دواییانە هاوشێوەی گودی بەرەو ڕۆژهەلات زەمین هاتن بەلام ئەمە لەگەڵ بەڵگەنامەکانی سەدەی نۆیەم و هەشتەمی ئاشوری جیاوازە.

ناوبانگ، دەسەلات و بوێری ئایرییەکان، لەڕۆژگارێك کەبەخت هاوڕێیەتی کردوون، بۆتە هۆی تۆقاندن و ترساندنی دراوسێکانیان و دواتر لەژێر ناوی کورد درێژەیان بەدەسەلاتی خۆیان داوە. ولاتی ئایری لەقۆناغی فەرمانڕەوایەتی خۆیان، زێی گەورە بووە و تا سەرچاوەی زێی گەورە درێژ بۆتەوە. هۆزی ماد دوای ڕووخانی حکومەتی ئایری، ڕوویان لەو ناوچانە کردووە.

جەنگی تەکلاس پالازاری یەکەم لەگەڵ بیست و سێ فەرمانڕەوای ئایری لەدەشتی مەلازگەرد، لەمێژوودا بەناوبانگە و لەسەرچاوەی دیجلە، ستوونێکی سەرکەوتنی بۆ ئەم جەنگە مێژووییە دروست کردووە و لەسەر ستوونەکە چۆنیەتی ڕوودانی جەنگەکە ئاماژەی پێدراوە (ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام).

چۆنیەتی هەڵکردن و سازانی تگلاس پالازاری یەکەم لەگەڵ فەرمانڕەوا ئایرییەکان بۆتە هۆی سەرسورمانی مێژوونووسان کەدەڵێن: ئەو لەم کارەی تەنیا چاوەڕوانی دەرفەت بووە نەهیچیتر. لەساڵی ٩١٠ پ.ز سوپای ئاشور هێرشی کردۆتەوە سەر ویلایەتی کوتموخ بەلام لەنێوان جودی و دیجلە ڕووبەڕووی ئایرییەکان بۆتەوە و شکستی پێهێناون.

توکولتی نینیبی دووەم لەنێوان ساڵی ٨٩٠-٨٨٤ پ.ز سەرقاڵی جەنگ لەگەڵ ئایرییەکان بووە. بەکورتی زۆربەی پاشاکانی ئاشور لەگەڵ دەستەی بوێر و جەنگاوەری ئایرییەکان سەرقاڵی جەنگ و پێکدادان بوون. لەساڵی ٧٤٣ پ.ز ئەم دەستەیە لەباکوری ڕۆژهەلاتەوە

هێرشیان کردۆتە سەر وڵاتی ئاشور و تا ناوخۆی سەرزەمینەکەیان پێشڕەوییان کردووە بەڵام تەگلاس پالازاری دووەم بەزەحمەتی زۆر، ئەوانی لەسەرزەمینی ئاشور دوورخستۆتەوە و تا پشت چیای جودی بەهەڵاتن ناچاری کردوون. (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک، ل ٤٦٢). سەنحەریب (سەنحاریب) پاشای ئاشور (٨٠٥-٦٨٢ پ.ز) لەساڵی ٦٦٩ پ.ز لەدەوروبەری چیای جودی، جەنگێکی دوورودرێژی دژی نایرییەکان ئەنجامداوە و ئەم سەفەرەی بەسەفەری پێنجم ناو بردووە.

ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ، میجرسۆن سەبارەت بەنایرییەکان دەڵێت: ویلایەتی نایری تەنیا بەشی سەرەوەی زێی گەورە نەبووە. تگلاس پالازار و نەوەکانی، هەموو ئەو هۆزانەی لەسەرچاوەکانی دیجلە و فورات و لەباکوری نیفانسن (= ویلایەتی دیاربەکر)، خەرپوت، دەرسیمی ئەمڕۆ و لەچیای بەتلیس و توروس نیشتەجێ بوون، بەگشتی بەنایری ناو براون. ئەم ویلایەتانە ئەو وڵاتەیە کەدوای رووخانی وڵاتی ماد لەناوەڕاستی قۆناغی فەرمانڕەوای هەخامەنشی (٤٠١پ.ز) دەستەی کوردانی بوێر لەوێ بوون و ئەم دەستەیە، باوەگەورێی کوردانی ئەمڕ و نەوەکانی مادی دوێنێن.

٣. تایەفەی کاردۆخی: سەبارەت بەتایەفەی کاردۆخی یا کاردۆخوی یا کاردۆشی یا کاردۆشوی کەگەزنەفۆن لە(گەڕانەوەی دەهەزارەکە) ڕووبەڕوویان بۆتەوە، لەنێوان ڕۆژهەڵاتناسەکان دوو بۆچوون لەئارادایە:

بۆچوونی یەکەم: ئەم ناوە، لەبنچینەدا وشەی گوتی کۆنە و گۆڕانی بەسەردا هاتووە کە لەتایەفەکانی بەشەی یەکەم یانی کوردەکانی ئاراراتن و بەپێی تێپەڕینیی سەدەکان، ناوەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و کوتی بەکاف عەرەبی و دواتر بۆتە کورتی و کوردی و سەرئەنجام بۆتە کاردۆخی.

بەپێی لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ، مستر درایوار چ وشەی کورتی ڕۆژگاری توکولتی نیراری پاشای ئاشور و چ وشەی کاردای ڕۆژگاری ئاراد ناناری پاشای لاکاش و چ وشەی کاردۆخوی یا کاردۆشوی گەزنەفۆن و چ وشە هاوشێوەکانی دیکە، هەموویان یەک ناون و بەکوردەکان وتراوە بەهەمان شێوە کەدوکتۆر سپایزار ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە (پێشتر ئاماژەمان پێدا).

کەواتە بەپێی ئەم بۆچوونە، دەستەی کاردۆخی دەبێت پاشماوەی گوتییەکانی کۆن بن

کەدەستیان بەسەر شومیر و ئاکاد گرت و لەکوردانی زاگرۆسن.

بۆچوونی دووەم: ئەوەی دەستەی کاردۆشوی ئەگەری هەیە لەکاتی هاتنی ماد و پارسەکان بۆ ئێرانی ئەمڕۆیی یا دوای ئەوە، یانی لەناوەڕاستەکانی سەدەی حەوتی پ.ز هاتوونە کوردستان و نیشتەجێ بوون و دواتر هۆزەکانی دیکەی کوردیان تێکەڵ بەخۆیان کردووە.

بۆچوونی سێر سیدنی سمیت هاوڕای ئەم بۆچوونەیە و دەڵێت: دەستەی کاردۆشوی زمانێکی جیاواز و سەربەخۆیان بووە و هیچ پەیوەندییەکان لەگەڵ پارسەکان نییە و لەپارسەکان کۆنترن.

جیاواز لەوە لەنێوان ئەم تایەفە و هۆزە گەورە و بەناوبانگانەی کورد، زۆر لق و هۆزی دیکەی نەناسراو بوونیان بووە کە لەبەڵگەنامە مێژووییەکان جارناجار ئاماژە بەناوی ئەوان دەدرێت. بۆنمونە سێر ئەلموستید دەڵێت: عەشیرەی موسری کەباوەگەورێکانی عەشیرەی مسوری یا مزوری ئەمڕۆن، لەڕۆژگاری سەنحاریبیش (٧٠٥-٦٨٢ پ.ن) وەك ئێستا لەنێوان دوو لقی ئاوی خازر نیشتەجێ بوون. (مێژووی کۆنی ئاشور، ل ٣٣٢).

سیرتەکانی ڕۆژگاری ئاشور ئەگەری هەیە عەشیرەی سیرد بن کەسێر مارك سایکس لەباکوری زاخۆ ڕووبەڕوویان بۆتەوە و (ت) بەپێی یاسایەکی باو بۆ (د) گۆڕاوە. بەکورتی بەپێی مێژوو و بەڵگەنامە بڕواپێکراوەکان، لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە یانی لەو کاتەوەی لافاوی کۆچی کوردانی ئارارات و ڕۆژهەڵات زەمین دەستی پێکردووە و ماد و پارس بۆ سەرزەمینەکانی ئەمڕۆیی خۆیان هاتوون، ناوچەی کوردستانی ئەمڕۆ، نیشتمانی ئەو خەڵکانە بووە کە بەگوتی یا گودی، یانی ئاراراتی ناویان براوە و بەکورتی یا کوردوانیش ناویان هاتووە. ئەم وشانە تەنیا بەدەستی گەورەی کوردان وتراوە کە لەخۆگری تیرە جیاوازەکان بووە و زمانێکی زۆر کۆنی پاکیان بووە و لەناو هەموو ڕووداوەکانی مێژوو و پێشکەوتنەکانی ڕۆژگار، زمان و خوێن و دروشم و داب و نەریتە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی خۆیان لەتێکەڵ بوون بەبیانییەکان پاراستووە.

دوای ئەوەی ماد و پارس پاشایەتی دێرینەی خۆیان لەدەست داوە، پارسەکان، بوونەتە فەرمانبەری فەرمانڕەوایی پارتەکان (=ئەشکانی) بەڵام مادەکان خۆیان بەدوور گرتووە و لەناو چیاکان و شوێنە تۆکمە و بەهێزەکانی سروشت ژیانیان بەسەر بردووە و لەبەر ئەمە مێژووەکەیان لەژێر ناوی کوردوان، یانی کوردەکان بەردەوامی بەخۆیەوە بینیوە. گەزنەفۆن

ڕووبەڕوویان بۆتەوە و ئەوانی بەکاردۆخییەکان ناو بردووە و سەبارەت بەوان، کتێبی بەناوبانگی گەڕانەوەی دەهەزار کەسەکەی نووسیوە.

هەرکەس ئەو کتێبە بخوێنێتەوە، دەزانێت ئەم سەرداره یۆنانییە یانی گەزنەفۆن لەگەڵ سوپاکەی، چەندە بەلاّ و زەحمەت و دژواری بەدەستی کوردەکان لەئانتی تورۆس چێشتووە. ئەو ناوچانە ئەمڕۆ بەهەکاری (=کوردستانی ناوەند) بەناوبانگە.

میجرسۆن دەڵێت: ئەم دەشت و چیاکانی سەرەوەی ڕێگەی ئورفە بۆ موسڵ کە لەسەرچاوەکانی مێژوودا بەناوبانگن، لەنێوان ویلایەتەکانی باکور و باشوری جەزیرە (=میزۆپۆتامیا) سنورێکی سروشتی و سیاسی ڕێك بووە و ئەو چیا بڵند و تاریکانە توری عابدین کە لەکۆندا بەنیفات ناوی براوە و هەنووکە لەبیر کراوە، سەرچاوەی ڕووباری دیجلەن. لەکۆندا بەڕووباری دیجلەیان وتووە تیگریس.

لەڕۆژگاری تگلاس پالازاری یەکەم، پاشای ئاشور (١١٠٠ پ.ز) سنوری باکوری ئاشور یانی لای سەرەوە، هەمان چیاکانی نیفات بووە و لەپشتیەوە ولاّتی نایری. ئەم پاشا گەورە بەردەوام هەوڵیداوە دەست بەسەر ئەو ناوچەدا بگرێت. دواتر سەرزەمینی نایری بۆ کوردوان گۆڕاوە کەکۆی وشەی کردۆیە یانی کوردان.

لەم ڕوون کردنانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەم دەستەی کوردە زۆر کۆنن و کۆنتر لەقۆناغی زوحاکی عەرەبین کەدەستەیەك لەمێژوونووسان ئاشارەزایانە نووسیویانە کوردەکان لەنەوەکانی زوحاکی هەلاّتوون.

بەشێوەیەکی ڕوونتر بڵێیم کوردان لەسەرەتاکانی کۆچی ئاری نەژادەکان بۆ ناوچەکانی ئێستا یا پێش ئەوە، هاتوونەتە ئەم سەرزەمینەی کەناوی کوردستانە و تیایدا بلاّوبوونەتەوە.

## تایەفە لاوەکییەکانی کورد

تایەفە لاوەکییەکانی کورد نزیکەی پێنسەد لقیان لێ دەبێتەوە کە لەکوردستان و ناوچەکانی دراوسێ بلاّوبوونەتەوە. دەستەیەك لەمێژوونووسان، کەم تا زۆر ئاماژەیان بەتایەفەکانی کورد داوە بەلاّم تا ئێستا هیچکام بەتەواوی ئاماژەیان بەهەموو هۆزەکانی کورد نەداوە. بۆ نمونە مەسعودی لەکتێبی (مروج الذهب) ئاماژەی بەزیاتر لەچەند هۆز

نەداوە. لەکتێبی (التنبیه)یش تەنیا عەشیرەی بازینجانی پێ زیاد کردووە.
ئیستەخری لە لاپەڕەی ۱۱٥، ئاماژەی بەسێ هۆز داوە. نشینگە و شوێنی نیشتەجێبونی هۆزە کوردییەکان بەپێی خشتەیەك نیشان دەدات. دووبارە ئیستەخری لەلاپەڕەی ۹۸، ئاماژە بەڕموم دەدات. دوای رمومیش سی و سێ هۆزی کورد بەفارس ناو دەبات. کوڕی حوقل و موقەدەسیش وتەکانی پشتڕاست دەکەنەوە و ژمارەی خێوەتەکانی ئەوان بە ٥۰۰،۰۰۰ دەخەملێنێت.

لە(فارس نامە، مسالك الابصار، معجم البلدان، صبح الاعشی، و التثقیف)، ئاماژە بەبەشێك لەهۆزە کوردییەکان دراوە. بەتایبەت لە(مسالك الابصار) ئاماژە بەبیست ویلایەت دەکات کەشوێنی عەشیرە کوردەکان بوون. دواتر ئاماژە بەدەستەیەکی دیکە لەعەشیرەکانی کورد دەدات. بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین هیچکام لەمێژوونووسان ئاماژەیان بەهەموو هۆز و عەشیرە کوردییەکان نەداوە. هەروەها دهۆست و خانیکۆف و دۆکتۆر دانیلۆ و کەسانی دیکەیش نەیانتوانیوە لەرووی بنەمایەکی زانستی، بارودۆخی هۆز و عەشیرە کوردییەکان روون بکەنەوە. ئەو کەسانەی دەیانەوێت سەبارەت بەبارودۆخی هۆز و عەشیرە کوردەکان زانیاری تەواو بەدەست بێنن، دەتوانن کتێبی (مسیۆ ئەلکساندریابا، کۆمەڵێك تێبینی و گێڕانەوەکان سەبارەت بەکوردستان، ۱۸٦۰) و کتێبی (مسیۆ نیکیتین) و بەرگی بیست و یەکی (ئەنسیکلۆپیدیای گەورە) و کتێبی هانری و کاپیتان های و میجرسۆن و سێر مارك سایکس (دووایین میراتی خەلیفە) و پرۆفیسۆر ئەکیازاروو و دوکتۆر ریچ و ئەراکلیان و مورگان و (شەرفنامە) و ... بخوێننەوە چوونکە زانیارییەکانی ئەم کتێبانە تارادەیەك زیاتر وباشترە. ئێمەیش بۆ ئەوەی لەم بەشەدا کەمتەرخەمیمان نیشان نەدابێت، ناوی عەشیرە سەرەکییەکانی کورد کە لەبوونی ئەوان دڵنیایین، ئاماژە پێدەدەین، لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەی دانیشتووان یا بنەماڵە و شوێنی ئەوان و کورتەیەك لەبارودۆخیان دەخەینە روو.

ئەلف:

١. ئاتمانیکان: نزیکەی پێنج هەزار بنەماڵەی کۆچەرین. لەدەربەندی بەتلیس و بۆتان و موش و ئانکارا بڵاو بوونەتەوە.

٢. ئاخە سوری: نزیکەی پەنجا بنەماڵەن. بەشێك لەتایەفەی مەندەمین. لەگەرمەسێرەکانی کوردستان نیشتەجێن.

٣. ئاخ چەشمی (ئاق چەشمی): نزیکەی سێسەد بنەماڵەن لەڕۆژئاوای سیواس نیشتەجێن.

٤. ئازەرکانی: کوڕی حەوقل لە (دیوان الصداقە، ل ١٨٧-١٨٥ ئامارەی پێداون. مەقدەسیش وتەکەی پشتڕاست کردۆتەوە. ئیستەخری، فارس بەنشینگەی ئەوان دەزانێت.

٥. ئادمانلی: نزیکەی سەد و هەشتا بنەماڵەن و لەنزیك بایەزید نیشتەجێن.

٦. ئارتوسی: چەندین تیرەن: عزئەلدینی، مەرزەکی، مامەڕەش، مامەند، ئالان، بەروز، جەریکی، شەیدان، مامخوڕ، خاویستان، شەرفان، مامەدان، گاودان، زەفکی، زیدەك، هافیجان. هەموویان لەسەریەك نزیکەی چوارهەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی موسڵ (=دەروبەری قوش و زاخۆ و دهۆك) و تورکیا (بەیت ئەلشەباب و خوشاب و شەتاخ) نیشتەجێن.

٧. ئازادبەختی: لەخوڕەم ئاباد و دولفان و خاوە و تورهان بڵاوبوونەتەوە.

٨. ئازاد دۆختی: کوڕی حەوقل لەدیوان الصداقە ئامارەی پێداون و ئیستەخریش شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان بەفارس دەزانێت.

٩. ئاشمیشارت: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەدەوروبەری خەرپوت دەژین و هەموویان شیعە مەزهەبن.

١٠. ئاکۆ: نزیکەی هەزار بنەماڵەن، لەباکوری رانیە، پارێزگای ئەربیل.

١١. ئالاك، لەفارس نامە ئامارەی پێدراوە کە لەکوردەکانی فارسن.

١٢. ئالیکانلی: سەد و پەنجا بنەماڵەن و بڵاو بوونەتەوە.

١٣. ئامرزان: چەند بنەماڵەیەك لەدەوروبەری سیورك.

١٤. ئایرۆ: سەد بنەماڵەن، کۆچەرین و لەباکوری بالیانی پارێزگای موسڵن.

١٥. ئەبو تاهیر: چەند بنەماڵەیەکن لەدەوروبەری سیورك

١٦. ئەجاخی: چەند بنەماڵەیەکن لەوەزنە و کوی (=ئەجاخ کاخدەری) لەناوچەکانی موکری و سابلاخ (=مهاباد).

١٧. ئەحمەد زەینەڵ: لەناوچەکانی سنەن.

١٨. ئەحمەد وەند: لەهەمەوەند دەژین.

١٩. ئیختیار ئەلدینی: مناڵەکانی ئەمیر ئیختیار ئەلدین لەفەرمانڕەواکانی بانە.

٢٠. ئەردەلأن: لەشاری سنە و گوندەکانی دەوروبەری و تاران و هتد بلأو بوونەتەوە. فەرمانڕەواکانی سنە لەم هۆزەن. سەرەتا لەشارەزوور فەرمانڕەوایەتییان کردووە. دواتر دەستیان بەسەر سنەدا گرتووە. هەندێ کات ملکەچی فەرمانەکانی دەوڵەتی ئێران بوون و هەندێ کات ملکەچی فەرمانەکانی دەوڵەتی عوسمانی (=تورکیا) و هەندێ کاتیش سەربەخۆ. ڕووداوەکانی تایبەت بەوان لەبەرگی دووەمی ئەم کتێبە ئاماژەی پێدەدرێت.

٢١. ئەروك: یا یوروك: (=ئەروکی چیلی) چوارسەد بنەماڵەن لەنێوان ئاماسیە و تەوقات.

٢٢. ئەزەلی: چەند بنەماڵەیەکن لەدەوروبەری موش.

٢٣. ئیسحاقی: کوری حەوقل لەدیوان ئەلصداقە، ئاماژەی پێداون. نشینگەی ئەوان فارسە.

٢٤. ئیسماعیل عەزیزی: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن. گەڕۆکن. زستان لەخاکی ئێران بەسەر دەبەن و هاوێن لەنێوان دوکان و چیای توقمان و سورداش نیشتەجێن. ئەم دەستەیە جیاوازە لەئیسماعیل عەزیزی کە سەر بەجافەکانن.

٢٥. ئەشتمهاری: کوری حەوقل ئاماژەی پێداون. مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە. ئیستەخری شوێنی نیشتەجێبوونی ئەوان بەفارس دەزانێت.

٢٦. ئەشنویە: لەدەوروبەری شنۆ و لاهیجان دەژین.

٢٧. ئەلخاص: بەئەلخاس یا ئەلقاسیش ناویان دەبەن. نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەباشوری ڕۆژهەلأتی حەلەب چیاییەك بەم ناوە بوونی هەیە. ئەم عەشیرە لەنێوان بەهسەنی و فورات نیشتەجێن.

٢٨. ئەلیا: عەشیرەیەکی کۆچەرین. نشینگەی ئەوان خەرپوتە.

٢٩. ئیمامی: نزیکەی حەفتا بنەماڵەن لەناوچەکانی جوانڕۆ. لەریزی جافەکانن.

٣٠. ئەمبارلو: ئەنبار لو (=هەمارلو). لەعێراقی عەجەم بلأو بوونەتەوە. لقێك لەلوڕەکانیش بەم ناوە بەناوبانگە.

٣١. ئەورامی یا هەورامی: هۆزێکن کەخۆیان بەمناڵەکانی بەهمەن دەزانن. لەناوچەکانی هەورامانی سنە نیشتەجێن. زیاتر لەدوو هەزار بنەماڵەن.

٣٢. ئیلە رووتی: لەعەشیرەی ئیناخین. زستان لای ڕووباری سیروان و هاوین لەنێوان جوانڕۆ و هەورامان نیشتەجێن.

٣٣. ئیناخی: نزیکەی پەنجا بنەماڵەن لەناوچەکانی جوانڕۆ. هاوینان دەڕۆنە چیای شاهۆ لەزنجیرە چیای زاگرۆس. ئەوان لقێك لە لقەکانی جافن و ناوی گەورە باوەگەورێی ئەوان ئیناق بووە.

٣٤. ئەیوبییان: ئەوان بەمناڵەکانی ئەیوب و سوڵتانەکانی میسر و شامیش دەزانن. سەلاح ئەلدینی ئەیوبی لەوانە. لەناوچەکانی کەرکوك و شوێنەکانی دیکە بڵاو بوونەتەوە.

٣٥. ئەیوتوند: بەئیتی وەندیش ناسراون. هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی دولفان و تورهان و پیشکو نیشتەجێن.

ب-:

١. باباجانی: لەگەڵ قوبادییەکان، نزیکەی هەشتسەد بنەماڵەن. لەعەشیرەی جافەکانی جوانڕۆن کەئەمیر تەیمور ئەوانی لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی (= بەین ئەلنەهرەینی ئەمڕۆ) بۆ خاکی ئێران کۆچ پێکرد و لەتەختەقاپو نیشتەجێی کردن. دەستەیەك لەوان لەکەرەند نیشتەجێن.

٢. بابان: ئەوان بەمیرەکانی بەبەیش ناو دەبەن. لەناوچەکانی سلێمانی و سنە بڵاو بوونەتەوە. لقێك لەعەشیرەی کرمانجن و خالید کوڕی وەلیدیان خۆش دەوێت و بەڕێزەوە ناوی دەبەن (؟) بەپێی گێرانەوەی خۆیان لەسەر دەستی خالید کوڕی وەلید باوەڕیان بەئیسلام هێناوە. (بەپێچەوانەوەی ئێرانییەکان کە لەسەر دەستی عومەر کوڕی خەتاب باوەڕیان هێنا و ئێرانییەکان خراپەی ئەو دەڵێن.)

٣. باجەلان: دوو تیرەن: جمور و قازانلو. لقێك لەعەشیرەی لەکن کەجیاوازە لەعەشیرەی لوڕ. نزیکەی هەزار و سێسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی قورەتو و هۆرێن و شێخان و قەسری شیرین و قازانیەی مەندەلی نیشتەجێن. لەناوچەکانی دەرگەزێن و ڕوودباری قەزوێن نزیکەی حەفتا بنەماڵە دەبن.

٤. بادەلی: نزیکەی هەزار بنەماڵە لەوان لە لەشگەر و یوزغادان. حەوتسەد بنەماڵەیان لەزازان. هەموویان شیعە مەزهەبن.

٥.بادینان: بەبەهادینان و فەرمانڕەواکانی عیمادیەیش ناویان دەبەن. باوەگەورێی ئەوان ناوی بەهائەلدین بووە. ئیبن خەلدون لەمێژووی بەربەر، ئاماژەی بەعەشیرەی بادینی کورد

داوە و جەزیرە بەشوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان دەزانێت.

٦. باران: هۆزێکن لەسیورك.

٧. بارزان: دووهەزار و حەوتسەد و پەنجا بنەماڵەن. لەباکوری زێی گەورە و شاری زێباردانی پارێزگای موسڵ نیشتەجێن.

٨. باریسان: مەسعودوی لە (مروج الذهب) ناوی ئەوانی لەگەڵ عەشیرەکانی چیاکان هێناوە.[1]

٩. بازوکی: لەناوچەکانی قەزوێن وتاران بلاو بوونەتەوە. دوکتۆر فەریج دەڵێت: نزیکەی پێنج هەزار بنەماڵە لەعەشیرەی پازوکی لەنزیك یەریڤان دەژین (کوردلەر، ل ٣٥).

١٠. بازیکلی: نزیکەی حەفتا بنەماڵەن. لەباکوری مەلازگرد نیشتەجێن.

١١. بازینجان: مەسعودی لە(التبینە) و یەعقوبی و ئیستەخری لەمێژووەکەی خۆیان ئاماژەیان پێداون و ئیسفەهان بەشوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان دەزانن.

١٢. باسیر یا باسری یا باسریە: لەشارەزوور بوون. دواتر روویان کردۆتە میسر و شام. لەئنسیکلۆپیدیای ئیسلام، لەجیاتی ئەوان ئاماژەی بەناوی مابیر داوە.

١٣. باشمانلی: لەنێوان مەلازگەرد و ئەلشەگەردن.؟

١٤. باشناوی: لەناوچەکانی زۆزان بوون ك (معجم البلدان) دەنووسێت: ناوچەی نێوان موسڵ و خێلات و سەڵماسە و بەقەلا و حەسارەکان دەورە دراوە.

١٥. باشوکی: لەناوچەکانی ڕەوانسەری سنە نیشتەجێن.

١٦. باکیلی: ئیستەخری و کوڕی حوقل ئاماژەیان پێداون بەلام مەقدەسی ئاماژەی بەناوی سالایی داوە. لەفارس نیشتەجێ بوون.

١٧. بالابرانلی: پێنسەد و شەست بنەماڵەن. لەکەنارەکانی ڕۆژئاوای فورات و لەکەنارەکانی ئەگین و باشوری ئەرزەنجان نیشتەجێن.

١٨. بالاوەند: سێسەد بنەماڵەن، لەناوچەکانی هەلیلان و زەردەلان.

١٩. بالاگریوە: لقێك لەلقەکانی لوڕن. لەناوچەکانی کرماشان نیشتەجێن.

٢٠: باڵك: هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەسەرەوەی ڕووباری ڕەواندز (= ناوچەکانی هەولێر)،

---

[1] – مەبەست لەچیاکان (چیاکانی کوردە) کەولاتی عەجەم لەسەرزەمینی عەرەب جیادەکاتەوە. لەچیاکانی هەمەدان و شارەزوور دەستپێدەکات تا نزیك ویلایەتی تەکفور کەولاتی سیس و سنوورەکانیەیتی، درێژ دەبێتەوە.

خاوەنی شەست گوندن.

٢١. باڵکان: نزیکەی سێسەد بنەماڵەن. لەعەشیرەی زەرزارن. ناوەکەیان لەناوی گوندەکەیان (باڵکان) وەرگرتووە.

٢٢. باڵیان: نزیکەی حەفتا بنەماڵەن لەنزیك خۆی.

٢٣. باڵیلوەند: یا بەڵیلوەند یا باڵیوەند.

٢٤. بانە: نزیکەی سێ هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی بانە نیشتەجێن. خاوەنی ١٤٥ گوندن. لەخودی شاری بانە نزیکەی هەشتسەد بنەماڵە دەژین.

٢٥. باوەنور: لەخوراسان نیشتەجێن.

٢٦. بەختی: (=بەختیان= بۆتان): چوار تیرەن: سەندی، محەممەدی، راسنی، دەنیکی. زۆزان بەشوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان دەزانن. ئەم هۆزە نزیکەی سێ هەزار بنەماڵە بوون. هەزار بنەماڵەیان لەموسڵ، پێنسەد بنەماڵەیان لەعەقەر نیشتەجێ بوون. لەئێستادا لەناو تایەفەکانی دیکەی کورد بڵاو بوونەتەوە.

٢٧. بەختیاری: لەتایەفەی لوڕی گەورەن. دوو لقن: چوار لەنگ، حەوت لەنگ. حەوت لەنگییەکان لەبروجێرد و گوڵپایەکان و چوار لەنگییەکان لەکرماشان و ئیسفەهان و شوشتەر و چیای زەرد و چیای سەوز نیشتەجێن. نزیکەی شەست هەزار بنەماڵەن. هەردوو لقەکە ٣٥ تیرەن. (بۆ زانیاری زیاتر، جوگرافیای سیاسی ئێران، ل ٧٣). دوکتۆر فەریج لەکتێبی (کوردلەر)، کورد بوونی بەختیارییەکان پشتڕاست دەکاتەوە. ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ کەرزن، ژمارەی دانیشتووانی بەختیاری لەساڵی ١٩١٨ زایینی بە ١٧٠،٠٠٠ کەس دەخەملێنێت. ڕەچەڵەکی ئەوان بۆ گەشتاسپی کوردکیانی دەگەڕێتەوە کە هەندێك لەگەڵ گەشتاسپی پێشدادی بەیەکی دەزانن. (ئەمە هەڵەیە).

٢٨. بەدری: لەئێستادا بڵاوبوونەتەوە.

٢٩. بەدلیسان: ئەوان بەفەرمانڕەواکانی بەدلیسیش ناو دەبەن.

٣٠. براخوی: نزیکەی سێسەد هەزار کەسن. لەکەنارەکانی کەلات، کەسنووری نیشتەجێ بوونی ئەوان نزیکەی دووسەد و بیست میل درێژ دەبێتەوە، نیشتەجێن. حکومەتی ناوەندی بەلوچستان کەکەلاتە، لەژێر سەرۆکایەتی ئەم عەشیرەدایە کە لەتیرەی کامبرانییە. بەشێك لەم عەشیرە لەویلایەتی سندی هیندوستان نیشتەجێن.ژمارەیان ٤٨،١٨٠ کەسە. ئەم عەشیرە

سووونی مەزهەبن. (ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام).

٣١. برادۆست: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەهوباتو و قەرەتۆرە و مەریوان و ناوچەکانی نزیك سنە نیشتەجێن. ئەم تایەفە بۆ کەهیا ساڵح دەگەڕێتەوە کەئەمیر تەیموری گورکانی ئەوی لەگەڵ دوو هەزار بنەماڵە لەعەشیرەکەی لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی بۆ کوردستانی ئێران کۆچ پێکردووە.

٣٢. بەرازدۆختی: ئیستەخری و کوڕی حوقل و مەقدەسی، ئاماژەیان بەناوی ئەوان داوە و شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان بەفارس دەزانن.

٣٣. بەڕازییە: نزیکەی نۆ هەزار بنەماڵەن. لەعەشیرەی بەریزانلی کە لەدەوروبەری سەروج نیشتەجێن: دوانزە تیرەن کەبریتین لە: کیتکان، شێخان، ئوکیان، شەدادان، مەلی دینلی، مەعافان، زۆران، پیجان، قەرەکیچان، دنیان، میردیدان.

٣٤. بەرزنجی: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن و لەناوچەکانی کەرکوك و سنە و خانەقین نیشتەجێن. شێخەکانی بەرزنجە لەوانن.

٣٥. بەرکیلی: هەزار بنەماڵەن و لەباشوری قەرەشەهر، لەکەنار ڕووباری قەزەل ئیرماق نیشتەجێن.

٣٦. بەرواری: هەزار و حەوتسەد بنەماڵەن، لەباکوری ڕووباری کارە کەدەرژێتە نێو زێی گەورە لەپارێزگای موسڵ، نیشتەجێن. ئەم هۆزە دوو تیرەن: بەرواری سەرو کەحەوتسەد بنەماڵەن، بەرواری خواروو کەهەزار بنەماڵەن.

٣٧. بەریزانلی: نۆسەد بنەماڵەن. لەنزیکی دەریاچەی وان نیشتەجێن و لقێکن لەعەشیرەی حەسانلی.

٣٨. بوشری: لەنێوان سەعرەد و مەیافارقین و دیاربەکر نیشتەجێن. لەناوچەکانی کرماشان و شیرازیش دەبینرێن.

٣٩. بەکران: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن لەعەشیرەی بەکراتونیانی کۆن. زستان لەنزیك دیاربەکر و هاوین لەنزیك سەعرەد بەسەر دەبەن.

٤٠. بەڵباس: هۆزێکی گەورەن لەناوچەکانی موکری و سابلاخ.

٤١. بەلیکار: نزیکەی سەد و هەشتا بنەماڵەن لەباکوری جۆڵەمێرگ.

٤٢. بەلیکان: شەش هەزار بنەماڵەن، لەناوچەکانی موش نیشتەجێن. هەموویان زازا و شیعە

مەزهەبن.

٤٣. بەلیکانلی: دووسەد و پەنجا بنەماڵەن. ژمارەی دانیشتووانەکەیان نزیکەی دەهەزار کەسە. لەنزیك مەرعەش نیشتەجێن.

٤٤. بەلێلوەند: بەباڵیلوەند و باڵیوەندیش ناویان دەبەن. نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەهەنگوژان و ناوچەکانی گاوەردی سنە نیشتەجێن. لەنێوان سلێمانی وکەرکوك و ناوچەکانی کرماشانیش دەبینرێن.

٤٥. بەنداد مەهدی: ئیستەخری وکوری حوقل و مەقدەسی ئاماژەیان پێداون و دەڵێن لەناوچەکانی فارس نیشتەجێن.

٤٦. بەندەداکی: ئیستەخری و کوری حوقل و مەقدەسی ئەم عەشیرەیان بەیەکێك لەعەشیرەکانی کورد فارس ئامارژە پێداوە.

٤٧. بۆرەکەیی: نزیکەی چوارسەد و پەنجا بنەماڵەن. لەزەهاو و عێراقی عەرەب و لەیلاق و ئیسفەند ئاباد و ناوچەکانی حسین ئاوای سنە، نیشتەجێن. لەهۆزی مەندەمین. باوەگەورێی ئەوان ناوی بۆرەکە بووە.

٤٨. بوزیکان: نزیکەی سەد و هەشتا بنەماڵەن. لەناوچە جیاجیاکان بلاْوبوونەتەوە.

٤٩. بۆڵی: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەناوچەکانی هەولێر نیشتەجێن. هاوین لەباشوری باڵەکەن و زستان روودەکەنە شاری کۆی.

٥٠. بەهادینان: هەمان بادینانە کەپێشتر ئامارژەمان پێدا.

٥١. بەهاروەند: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەکیالان لەباکوری دزفول نیشتەجێن. لەتایەفەی دێرکوەندن.

٥٢. بەهتویی: یا بی تویی، نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەباکوری رۆژئاوای کرماشان نیشتەجێن. میرئەجمەدوەند و دەم سەفاوەند لەلقەکانی ئەم هۆزەن.

٥٣. بەهیرماز: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن., لەکەنارەکانی خەرپوت نیشتەجێن. زازان و هەموویان شیعە مەزهەبن.

٥٤. بیبانی: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن. لەشاری خانەقین و باکوری کەرکوك و سلێمانی نیشتەجێن.

٥٥. بیتیاوەند: چەند بنەماڵەیەکن لەباکوری رۆژئاوای مەندەلی.

٥٦. بیتیارەوەند: چەند بنەماڵەیەکن لەباکوری سنە. یانی باکوری ڕۆژئاوای کرماشان.

٥٧. بیرانوەنـد: بەبیرانوەنـدەیش بـەناوبانگن. نزیکـەی دە هـەزار بنەماڵـەن. ژمـارەی دانیشتووانەکەیان زیاتر لەشەست هەزار کەسە. دوو لقی سەرەکییان هەیە: بیرانوەندیار ئەحمەد و بیرانوەند مال ئەسەد. هەر لقە و بیست و شەش تیرەن. لەدۆڵی چینی، هەرو، بوزهەل، گەروی عەزیز و گەروی دینار نیشتەجێن. لەتایفەکانی سەرەوەی گەریوەندن لەلقەکانی لوڕ. (بۆ زانیاری زیاتر: جوگرافیای سیاسی ئێران، ل ٦٦ و ٦٧).

پ:-

١. پاپی: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەسیزار و چیاکانی هەشتا پالو و قیراب و باکوری دزفول نیشتەجێن. لەتایفەکانی سەگوەندن.

٢. پاتاقی: لەناوچەکانی کرماشان، بەشی ڕۆژئاوای کەرەند نیشتەجێن.

٣. پازوکی: لەناوچەکانی ڕەوانسەر و چیای شاهۆ نیشتەجێن. بەشێکیان لەناوچەکانی لەیلاخ نیشتەجێن.

٤. پالآنی: نزیکەی سێسەد و پەنجا بنەماڵەن. لەنێوان زەنگ ئاباد و قەرەتەپە و ڕۆژهەلآتی سیروان و دەگاگا نیشتەجێن.

٥. پایرەوەند: نزیکەی هەشتسەد بنەماڵەن. لەچیای پەراو، باکوری ڕۆژهەلآتی کرماشان و باشوری ڕۆژئاوای دینەوەر نیشتەجێن.

٦. پەچناوەند: ئەم هۆزە لەناوچەکانی خوراسان نیشتەجێن.

٧. پەریشەیی: نزیکـەی هـەزار بنەماڵـەن. لەناوچـەکانی ئیسپەندئاوا و گـاورودی سـنە نیشتەجێن.

٨. پسانی: ئەولیای چەلەبی، ئەم هۆزە بەیەکێك لەعەشیرە کوردییەکان دەزانێت (بەرگی چوارەم، ل ٧٥).

٩. پـشدەری: نزیکـەی دوو هـەزار بنەماڵـەن لەناوچـەکانی پـشدەر (پارێزگـای سـلێمانی) نیشتەجێن. (ماوەت، مەرگە، قەلآدزێ، شاربازێر). بـەمیراودەلیش ناویان دەبەن. واتا میر عەبدولعەلی. ئەم هۆزە سێ تیرەن: بابەکرئاغا، مەحمود ئاغا، عەباس.

١٠. پنجینان: نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن. لەباکوری سەعرەد و ناوچەکانی موش نیشتەجێن.

١١. پنیانیشلی: ئەم هۆزە نۆ تیرەن: زیدان، بارکشان، کەنار بەروش، سورە تاوان، بەلیجان، گوجی، بەلی، شویلان، موسانان، نزیکەی هەزار و دووسەد بنەماڵەن لەڕۆژهەڵاتی ورمێ.

١٢. پنیجاری: نزیکەی چوارسەد و پەنجا بنەماڵەن لەڕۆژئاوای موش.

١٣. پوران: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن، لەنێوان دیاربەکر و موش.

١٤. پیران: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن. لەباکوری رانیە و ناوچەکانی سابلاخ، موکری مەهاباد نیشتەجێن. لەبەڵباسییەکانن.

١٥. پیزان: سێ بنەماڵەن لەلاهیجانی کۆن (ناوچەکانی موکری، سابلاخ) نیشتەجێن.

١٦. پیزیانلی: نزیکەی حەوتسەد بنەماڵەن. لەڕۆژئاوی ئەرزەروم.

ت:-

١. تاپیان: نزیکەی سێسەد بنەماڵەن، گەرۆکن و لەباشوری دەریاچەی وانن.

٢. تارابی: لەتایەفەی پشتکوهن.

٣. تاریموڕادی: نزیکەی سەد بنەماڵەن لەنەقارەخان و کانی درێژ، لەتایەفەی مەندەلین و لەناوچەکانی سنە نیشتەجێن.

٤. تاکولی: نزیکەی چوارسەد و پەنجا بنەماڵەن لەڕۆژهەڵاتی دەریاچەی وان. گومان دەکرێت لەتایەفەی زەیلانی بن.

٥. تاڵەبانی: نزیکەی هەزار و پەنجا بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین بلاو بوونەتەوە.

٦. تامادانی: یا تاهمادانی. لەتایەفەی کوردەکانی فارسن. ئیستەخری و کوڕی حوقل و مەقدەسی ئاماژەیان پێداوان.

٧. تایگوزی: یا تایجوزی، نزیکەی پەنجا بنەماڵەن و لەناوچەکانی سنە و جوانڕۆ نیشتەجێن و زستانان بۆ بی بی ناز و شێخ ئیسماعیل دەڕۆن.

٨. تایشەیی: لەعەشیرەی جافەکانی جوانڕۆن. لەناوچەکانی جوانڕۆ و ڕەوانسەر نیشتەجێن.

٩. تەبتەکی: هۆزێکن بچووك، بەڵام بوێر و جەنگاوەر. لەکەهفی داوود و قەمرانییە نیشتەجێن. ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام لەجیاتی تەبتەکی، بەستیکی نووسیوە.

١٠. تەرخانی: لەعەشیرە جاف مورادین. لەکەنارەکانی ڕەواندز نیشتەجێن.

١١. تورهانی: یا تورخانی: دوانزە تیرە: لەلقەکانی لەك، سەر بەعەشیرەی لوڕن. نزیکەی حەوت هەزار بنەماڵەن و ژمارەیان چل هەزار کەسە. لەناوچەکانی سایمەرە و خاوە و تورهان نیشتەجێن.

١٢. تەلیە: لقێك لەهۆزی حەسنانلون. لەویلایەتی کەرکار نیشتەجێن.

١٣. تەمر توزەیی: نزیکەی سێسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی لەیلاخ و باکوری سنە بڵاو بوونەتەوە.

١٤. تەهویی: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی ڕووباری قەزوێن نیشتەجێن.

١٥. تیریکان: نزیکەی شەشسەد و پەنجا بنەماڵەن. لەباکوری دیاربەکر نیشتەجێن. نزیکەی چوارسەد بنەماڵە لەبیست و چوار میلی ڕۆژئاوای ئەنکارا نیشتەجێن.

١٦. تیلەشانی: نزیکەی پەنجا بنەماڵەن. لەناوچەکانی کفری و زەرداو نیشتەجێن. (پارێزگای کەرکوك و خانەقین).

١٧. تیلەکۆیی: یا تیلە کوهی. سەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی هوباتو، تیلەکۆ نیشتەجێن. هاوینان هەندێ کات ڕوودەکەنە باشماق (=باشماخ).

ج-: جاف

١. نزیکەی دوانزە هەزار بنەماڵەن. شوێنی هەمیشەیی ئەوان پارێزگای سلێمانییە. زستانان لەبانی خێلان تا سنوری قەزەڵ ڕەبات دەڕۆن. لەبەهاریش روو دەکەنە شارەزوور و ناوچەکانی سنە. ئەم تایەفە دوو لقن: جاف مورادی و جاف جوانڕۆ (=جاف کوردستانی عێراق، جاف کوردستانی ئێران). لقی یەکەم یانی جاف کوردستانی عێراق ٣٢ تیرەن کەبریتین لە: ڕەخزادی، گەلاڵی، تورخانی، شاتری، هارونی، کەماڵە، عەمەلەیی، بەداقی، سەگانی (=سەیدانی)، مەکایلی، ئیسماعیل عەزیزی، شێخ ئیسماعیلی، سۆفی وەند، نەوروڵی، شوان، شێخ بەزینی، تەلانی (=جافە ڕەشکە)، غەوارە، بێسەری، قەویلە، پرخی، چوچانی، حەسەنی، ڕەشوبۆری، باشکی، مورادی، یوسوجانی، یەزدان بەخشی، پشت ماڵە، یاروەیسی، عیسایی، شەرەف بەیانی.

لقی دووەم یانی جافەکانی کوردستانی ئێران ١٥ تیرەن: قوبادی، باوەجانی، وەلەدبەیگی، ئیناخی، ئیمامی، دەتوویی، تایشەیی، تاوەگۆزی، کلاشی، نامدار بەگی، قادر مەریوەیسی،

نێرپەزی، میرەبەگی، دەڵە تازەیی، دارواشی. بەزۆری سوونی مەزهەبن.

٢. جاکیە: یەکێك لەلقەکانی حەسنانلوە.

٣. جەباری: پێنسەد بنەماڵەن. لەنێوان چەمچەماڵ و کەرکوك و شوان خاسە نیشتەجێن.

٤. جەبارەکی: مەسعودی لە(مروج الذهب) ئاماژەی پێداوە و شوێنی ئەوانی بەچیاکانی کوردستان دیاریکردووە.

٥. جوبرانلی: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەنێوان بەدلیس و موش نیشتەجێن. هەشت تیرەن: تورێنی، ئەلیکی، ئەزوینی، موخەلی، شادرلی، شێخەکان، مامەعان، عەرەب ئاغا.

٦. جەزیریان: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن لەناوچەکانی جەزیر. سێ لقن: عەزیزیان، کورکیل، فەنیك.

٧. جەلاوەند: لەناوچەکانی کرماشان نیشتەجێن.

٨. جەلالی: سەد بنەماڵەن. لەچیاکانی ئارارات و ناوچەکانی ئازەربایەجان نیشتەجێن.

٩. جەلیکانلی: دەستەیەکیان لەناوچەی وان، دەستەیەکیان لەمەرعەش نیشتەجێن.

١٠. جەلیلی: ئیستەخری وکوڕی حوقل ئاماژەیان پێداوە. مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە و شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان بەفارس دەزانن.

١١. جەلیلوەند: لەناوچەکانی دینەوەر نیشتەجێن. نزیکەی سێسەد بنەماڵەیان لەناوچەکانی قەزوێن بڵاو بوونەتەوە. هەموویان شیعەن و سەر بەعەشیرەی لوڕن.

١٢. جەمور: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن و لەزەهاو و چیاکانی ئالمە پەلاق، ناوچەی ئەسەد ئابادی هەمەدان نیشتەجێن. تیرەیەك لەتایەفەی باجەلانن.

١٣. جوانی: مەسعودی لە(مروج الذهب) ئاماژەی پێداون. شوێنی ئەوانی بەچیاکانی کوردستان دیاریکدرووە. کەعێراقی عەرەب لەعێراقی عەجەم جیادەکاتەوە. بەڵام گومان دەکرێت جەولانی بن بەهەمان شێوە کەئەولیای چەلەبی لەبەرگی چوارەم لاپەڕەی ١٧٨ ئاماژەی پێداوە.

١٤. جودەکی: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن. لەباشوری خوڕەم ئاباد نیشتەجێن (=ئاوی سارد)

١٥. جودیکانلی: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن، لەباکوری قوچ حەسار نیشتەجێن.

١٦. جوزەکان: لەناوچەی موسڵ و چیای گودی (=جودی) نیشتەجێن. مەسعودی

لە(مروج الذهب) ئاماژەی پێداوە. گومان دەکرێت لەپاشماوەی گوتییەکان بن.

١٧. جوزیکان: لەناوچەکانی هەمەدان نیشتەجێن.

١٨. جۆڵەمێرگ: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵە بوون لەویلایەتی جۆڵەمێرگ. لەسەرەتای قۆناغی تاتار، ئەسعەد کوڕی مەکلاّن فەرمانڕەوای ئەوان بووە، دوای ئەو عیمادئەلدینی کوڕی جێگەی گرتۆتەوە، دواتر ئەسەدئەلدینی کوڕی عیماد ئەلدین فەرمانڕەوایی ئەوانی گرتۆتە دەست. ئێستا بلاّو بوونەتەوە.

١٩.جەهان بەگلی: نزیکەی پێنج هەزار بنەماڵەن. لەنێوان ئافیونی قەرە حسار و ئاق شەهر نیشتەجێن.

٢٠. جیگان: عەشیرەیەکی گەورەن. لەگورجستان دەژین (ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، بەرگی دووەم، عەشیرە کوردەکانی ڕۆژهەلاّتی ئێران).

چ-:

١. چاپوکسان: هۆزێکن لەسیورك نیشتەجێن.

٢. چاردولی: یا چرداوەری، نزیکەی دووسەد بنەماڵەن، لەناوچەی ئیسپەنبەد ئاوا (ئیسفەند ئاباد)ی سنە نیشتەجێن کە بەناوچەی چرداوەریش بەناوبانگە.

٣. چەکوانی: ئەولیای چەلەبی لەبەرگی چوارەم لاپەڕەی ٧٥، لەریزی عەشیرە کوردەکان ئاماژەی پێداوە.

٤. چەشمگەزەك: سێ لقن: پەرتەك، سەقمان، مەجنکەرد. لەویلایەتی خوراسان نیشتەجێن.

٥: چەگنی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەسپی روود و دۆڵی گاوشمار و ڕووباری کەشکان و ڕووباری خوڕەم ئاباد و چیای مڵە شوانان نیشتەجێن.

هەزار و پێنسەد بنەماڵەیان لەکەنارەکانی قەزوێن دەژین. سێسەد بنەماڵەیان لەپارێزگای کەرکوك و سلێمانی گەرۆکن. سێسەد بنەماڵەیان تێکەڵ بەقەشقاییەکان بوون و لەناوچەکانی سەیمەرەم نیشتەجێن. ئەم هۆزە جگە لەچەگنی، هەموویان سەر بەوەندادن.

٦: چی چییە: بەکیکییەیش بەناوبانگن. لەکەنارەکانی قەراجەداغ نیشتەجێن.

٧: چیلی: بەئورەکی چیلیش ناویان دەبەن. لەخاکی عێراق (=بەین ئەلنەهرەین) بلاّو بوونەتەوە.

ح -:

١. حاجی بانلی: ئەگەری هەیە حاجی مانلی بێت. نزیکەی سێسەد بنەماڵەن. لەعەشیرەی میللی، لەرۆژئاوای قەیسەری و کەنارەکانی قەزەل ئیرماق لەباکوری ئاوانوس نیشتەجێن.

٢. حەریری: لەویلایەتی حەریری سەر بەپارێزگای هەولێر نیشتەجێن. ئەولیای چەلەبی ئاماژەی بەناوی ئەوان داوە.

٣. حەسنانلو: بەحەسنانیەیش ناویان دەبەن. نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەسنورەکانی تورکیا و عێراق و ئێران و چیاکانی نزیك بەبەدلیس و ویلایەتی کەرکار نیشتەجێن. هەشت تیرەن: تەلییە، جاکیە، حەیدەرانلو، خوراسانلو، سەپیکانلو، جبرانلوزیلانلو و ئەدمانلو. ئەم سێ تیرەی دوای لەسەر سنورن.

٤. حەسنانلی: نزیکەی چوار هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەناوچەی خنس و مەلازگرد و دارەتو نیشتەجێن. خاوەنی سەد و دە گوندن. عەشیرەی بەریزانلی لقێك لەم هۆزەن لەنزیك دەریاچەی وان.

٥. حەسەوەند: نزیکەی پێنج هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی ئەلشەتری پیشکوە نیشتەجێن لەکەنار رووباری کاکەرەزا، دۆڵی رەبات، دۆڵی حەسەن. ئەم هۆزە پینج تیرەن: بەستام، نەدیر، ساکی، دەوڵەت شا و کاکاوەند.

٦. حەسنەوییە: بەفەرمانرەواکانی دینەوەر ناویان دەبەن. ئێستا بڵاو بوونەتەوە.

٧. حسەینی: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن لەنزیك دوورگەی کوری عومەر نیشتەجێن.

٨. حەساران: یا هەمساران: تایەفەیەکی گەورە بوون بەڵام ئێستا بڵاوبوونەتەوە.

٩. حەفتیان: یا هەفتیان: عەشیرەیەکی گەورەن لەویلایەتی هەفتیان، نزیك رەواندز کە بەشاریش ناویان دەبەن. لەئەسیکلۆپیدیا لەجیاتی شاری، سوری نووسراوە.

١٠. حەکاری یا هەکاری: دوانزە تیرەن: جەلو، میسوریان، هاویریان، بارچیلان، سیوالان، لایی، هونان، ئادرامان، شامدینان (شەمەدینان یا شەمزینان)، شیروانان. ئەم تایەفە بەفەرمانرەواکانی شەنبویش ناو دەبەن. لەبەدلیس و دوورگەی کوری عومەر و عەمادیە و قەڵای هارون لەنزیك جۆڵەمێرگ و سلێمانی نیشتەجێن. نزیکەی چوار هەزار بنەماڵەن. هەمیشە دەهەزار تفەنگچی ئامادەیان بووە.

١١. حەمدیکان: هۆزێکن لەنێوان مەلازگەرد و ئەلشەگەرد.

١٢. حەمیدی: ئەم هۆزە دراوسێی عەشیرەی بەختی بوون بەلاّم ئێستا بلاّو بوونەتەوە.

١٣. حوتان: سێسەد بنەماڵەن. لەشاری بۆتان نیشتەجێن.

١٤. حوسەیی: لە (مسالك الابصار) ئاماژەیان پێدراوە. دەڵێن لەشارەزوور نیشتەجێن.

١٥. حەیدەرانلی: دوو هەزار بنەماڵەن لەنێوان موش و ورمێ نیشتەجێن. لەشوێنەکانی دیکەش دەژین.

١٦. حەیدەری: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەکەنارەکانی سابلاّخ نیشتەجێن. گومان دەکرێت سەر بەهەمان تایەفەی حەیدەرانلی بن کەئامارژەمان پێدا.

خ-:

١. خاتون ئۆغلی: چوارسەد بنەماڵەن. لەباشوری یوزغاد نیشتەجێن. تیرەیەك لەعەشیرەی میللین.

٢. خازاڵی: پەنجا بنەماڵەن. لەنێوان بەدلیس و دیاربەکر نیشتەجێن.

٣. خاڵتی: ئەگەری هەیە خالدی بێت و وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتبێت. بەئورارتو یا ئوراشتویش ناویان دەبەن. لەکەنارەکانی ئارارات و کوردستانی ناوەند نیشتەجێ بوون. لەکەنارەکانی دەریاچەی وان حکومەتێکی بەهێزیان بووە و تا سەرەتاکانی سەدەی شەشی پ.ز درێژەیان بەفەرمانڕەوایی داوە. دواتر حکومەتەکەیان ڕووخاوە و خۆیان بلاّو بوونەتەوە.

٤. خاڵۆوەندی: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەقەهرار و گاکەژان، یانی گاوکێشان و کەنارەکانی فەراهان نیشتەجێن.

٥. خاڵکانی: یا خەلەکانی: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن. لەکەنارەکانی دەریاچەی قوچ حەسار نیشتەجێن.

٦. خاڵی: مەسعودی لە (مروج الذهب) ئامارژەی پێداوە. گومان دەکرێت خانی یا جەلالی بن و بەهەڵە نووسیبێتیان.

٧. خانی: نزیکەی سەد و هەشتا بنەماڵەن. لەنزیك خوشاب نیشتەجێن.

٨. خانیان: هۆزێکن لەبایەزید و کەنارەکانی نیشتەجێن.

٩. خەڕات: عەشیرەیەکن لەناوچەکانی سنە بلاّو بوونەتەوە.

١٠. خوسـرەوی: ئیـستەخری دوای (رام)کـان لەلاپـەڕەی ٩٨ لـەئامارژەدان بەعەشـیرە کوردەکانی فارس ناوی ئەوانی بردووە. مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە.

١١. خزرانلو: لەکەنارەکانی کالینی، ناوچەکانی ئازەربایەجان نیشتەجێن. گومان دەکرێت وشەکە لەبنەمادا خەزەرانلو بێت: یانی خەزەران کەکۆی خەزەرە.

١٢. خەفتیان: شێمانە دەکرێت مەبەست هەمان عەشیرەی شاری بێت کە لەهەفتیان ڕەواندز نیشتەجیٚ بوون.

١٣: خۆشناو: نزیکـەی دوو هـەزار بنەماڵـەن. لەناوچـەی چـەقلاوە (شـەقلاوە) نیشتەجێن. خـاوەنی سـەد گونـدن. نزیکـەی دەهـەزار کـەس دانیـشتوویان هەیـە. لەناوچـەکانی کۆیـە و رانیـەیش دەبینرێـت. بـەپێی ئەنـسیکلۆپیدیای ئیـسلام لقێکیـان لەکارتاویـە لەدەربەنـدی قەرەبۆلی بوون. ئەم دەربەندە بەپێی وتەکانی هافمان دەکەوێتە چیایەك لەنزیك زێی بچوك.

١٣.خـەیزان: هـۆزێکی گـەورەن لەبـەین ئەلنـەهرەین دەژیـن. سـی تیرەن: خـەیزان، مەکسی و ئەسبایەردی.

١٤.خـەیلانلی: نزیکـەی دووسـەد بنەماڵـەن. لەناوچـەکانی هـەولێر نیـشتەجێن. لەچـیای باکوری باڵکیش دەبینرێن. ژمارەیان لەهەزار کەس زیاترە.

د:-

١. داخوری: لەنزیك شرناق و توری عابدین نیشتەجێن.

٢. داسنی: لەناوچـەکانی بـەین ئەلنـەهرەینن. هـەموویان شـەیتان پەرەسـتن (؟؟). دەڵێن: خواوەند بەشێوەیەکی فەرمی جڵەوی هەموو کاروبارەکانی بەشەیتان داوە و خۆی بیٚ لایەن دانیشتووە. بەمپێیە پەرەستینی کەسی بیٚ لایەن سوودی نییە. دەبێت بەڕێوبەری کارەکان پەرەستش بکرێت (مەبەست شەیتانە) تا زیانت لیٚ نەدات.

٣. داڵوەنـد: لقێـك لەعەشـیرەی لـەکن سـەر بەتایەفـەی لـوڕ. لەناوچـەکانی پیـشکوە نیشتەجێن.

٤. داوودە: یـا داوودی. نزیکـەی هـەزار بنەماڵـەن. لـەپارێزگای کـەرکوك و خانـەقین (= لەکەنارەکانی تاوق و کفری) نیشتەجێن. سەر بەعەشیرەی زەنگەنەن.

٥. دایـابیلان: دیـابیلان لەناوچـەکانی سـوریەن. مەسـعودی لـە مـروج الـذهب ئامـاژەی پێداون.

٦. دەڕاجی: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی گاوروودی سنە و لەکانی گوڵزاری لەیلاخ نیشتەجێن. بەشێکیان لەگەڕوس و کولیایی دەژین.

٧. دەشتی: لەتایەفەکانی پشتکوهن و لەوێ دەژین.

٨. دوڵفان: لەعەشیرەی لەکن سەر بەعەشیرەی لوڕ. لەخاوە و ئەلشتەر نیشتەجێن.

٩. دەلوویی: شەشسەد بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین و ناوچەکانی کفری نیشتەجێن. شەش تیرەن: کاش، جامریزی، پەنجانکەشتی، کارێزی، تارکەوەند، سەلیم وەیس.

١٠. دەلیکانلی: دووسەد بنەماڵەن: کۆچەرین. لەدەشتی مەرعەش و تۆرۆس و کلیسدار نیشتەجێن.

١١. دەنبەلی: لەعەشیرەکانی کوردی عێراقن (=بەین ئەلنەهرەین). بەعیسابەگی بەناوبانگن.

١٢. دەنیکی: لەمسالك الابصار ئاماژەیان پێدراوە: هەزار بنەماڵە بوون و دواتر بەناوچەکانی دیکەدا بڵاو بوونەتەوە.

١٣. دوودایی: لەباشور و باشوری ڕۆژئاوای کۆیە و باکوری کفری نیشتەجێن.

١٤. دودەری: چوارسەد بنەماڵەن. هاوینان لەنزیك دەریاچەی وان نیشتەجێن.

١٥. دووڕوویی: سەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی جوانڕۆ و ڕەوانسەری سەر بەپارێزگای سنە نیشتەجێن.

١٦. دۆسکی: هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەشاری دهۆك نیشتەجێن.

١٧. دۆغانلی: دووسەد و پەنجا بنەماڵەن. کۆچەرین و لەڕۆژهەڵاتی مەرعەش دەژین.

١٨. دۆم: بەکلاش چن ناویان دەبەن. نزیکەی دووسەد بنەماڵەن و لەناوچەکانی سنە دەژین. دەستەیەکیان گەڕۆك و دەستەیەکیان نیشتەجێی تەختە قاپۆن.

١٩. دەلۆیی: یا دەلۆ: هەمان دەلوویيە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٢٠. دهۆك: یا دهۆکی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەکەنارەکانی سابلاخ نیشتەجێن.

٢١. دیاربەکری: بەمەروانییەکانیش ناویان دەبەن. نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن لەناوچەکانی دیاربەکر نیشتەجێن.

٢٢. دێرسەملی: نزیکەی چوار هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی دێرسیم و دیاربەکر و

جەزیره و قەراجەداغ و هتد نیشتەجێن. زۆربەیان عەلیوللاهین. دەڵێن: خواوەند عەلی بۆ پێغەمبەری ڕەوانە کرد بەلام محەممەد پێگەی پێغەمبەری لێ زەوت کرد. خەلیفەکانیش پێگەی خەلافەتیان لێسەند. کاتێکیش خەلافەتی گرتەدەست، عایشە و معاویە و خەواریج ڕێگەیان نەدا بەئاسانی خەلافەت بکات. نائومێدانە چاوی لەدنیا بەست. بەناچاری خواوەند بۆ دڵنەوایی کردنی ئەو، پێگەی خواوەندی خۆی پێداوە و خۆی لەسووچێکی عەرش پاڵی لێداوەتەوە. لەبەر ئەمە بەشیعە دەمارگیرەکان ناویان دەبەن.

دەستەیەك لەم تایەفە یەزیدین. یانی یەزید بەکەسێکی باش دەزانن و بەڕێزەوە ناوی دەبەن و دەڵێن: کاتێك عەلی خەلافەتی گرتەدەست، جگە لەشەڕ لەگەڵ موسوڵمانان و کوشتنی ئەوان، هیچی دیکەی نەکرد و ئیسلام لەسەردەمی ئەو، لەجووڵە کەوت. حسەین دەیویست درێژە بەڕێگەی باوکی بدات بەلام یەزید بەکوشتنی حسەین کۆتایی بەشەڕی نێوخۆیی موسوڵمانان هێنا و دووبارە وڵات گرتنەکانی موسوڵمانان دەستی پێکردەوە و ئیسلام بڵاو بوویەوە. ئەمانیش بەسوونییە دەمارگیرەکان ناو دەبەن. هەر دوو دەستەکە دوانزە تیرەن:

میلان، شواك، کەچەڵ، گیوران، فەرهاد ئوجاغی، بەختیارلی، کرابانلی، میرزانلی، عەباسانلی، بالاشاخی، کوزلیچان، لاچین ئوجاغی.

٢٣. دەیرەکوەند: دوو لقن: بەهاروەند و قولابوەند. نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی دزفول و کیالان و چیای تاف و چیای هەشتاپالو نیشتەجێن. لەتایفەی بالاگریوەی سەر بەعەشیرەی لوڕن.

٢٤. دزەیی: دزەیی کەعەرەبەکان کردوویان بەدزجی، نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن لەناوچەکانی هەولێر و شاری مەخمور. دەستەیەکیان لەکەنارەکانی چیای قەرەچەق و کەنیدناوە نیشتەجێن. سێ تیرەن: پیران، مامان، گۆنتۆلان.

٢٥. دەیلەمی: یا دەیلەمییەکان، کۆی دەیلەم: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن لەناوچەکانی تەبەرستان (مازەندەرانی ئەمڕۆ) تا کرکاروەند نیشتەجێن. ناوەندی ئەوان دەیلەمانە لەناوچەکانی گیلان. گیلانییەکان و دەیلەمییەکان و خەزەرەکان وەك پێشتر ئاماژەیان پێدرا، لەتایەفە کۆنەکانی مادن یانی کوردەکانی ڕۆژهەلات زەمین. زمانی کۆنی دەیلەمییەکان، لەگەڵ زمانی زازا و هەورامی یەکێکە.

یۆنانییەکان ناوچەی گیلانیان بەکادۆشیان ناو بردووە. ئەگەری هەیە ئەم وشەیە لەبنەمادا

هـەمان کاردۆشـیانی گەزنـەفۆن بێـت کـەئاماژەمان پێـدا مەبەسـت لێـی کوردەکانـە و ڕۆژهەڵاتناسەکان پشتڕاستیان کردۆتەوە.

٢٦. دینـاری: نزیکـەی پێنـسەد بنەماڵـەن. لەویلایـەتی دینـار و ناوچـەکانی دەوروبـەری لـەنزیك جۆڵـەمێرگ نیـشتەجێن. ئـەم هـۆزە دوو لقـن: مـیر ئیبراهیمـی و مـیر شـەهابی. لەزێبارییەکانن.

٢٧. دیناروەند: لەتایەفەکانی پشتکوهن و لـەو ناوچە دەژیـن. ئەگەری هەیە لەویلایـەتی دینارەوە روویان کردبێتە ئەو ناوچەیە.

ر-:

١. راسـنی: نزیکـەی سـێ هـەزار بنەماڵـەن، لەعەقـەر نیـشتەجێ بـوون و سـەرۆکیان مـیر عەلائەلدینی گورەك بووە. هەزار بنەماڵە لەوان لەناوچەکانی موسڵ نیشتەجێ بوون. ئـەوانیتر لەعەقـەر و لـەناو تایەفـەکانی دیکـە بڵاو بوونەتـەوە. لەمسالك الابصار ئامـاژە بـەم عەشیرە دراوە.

٢. رامانی: هۆزێکن لەفارس. ئیستەخری لەلاپەڕەی ٩٨ کە ئاماژە بەڕامەکانی فارس دەدات، دوای ئـەوان نـاوی رامـانی دەنووسێت. بەهـەرحاڵ ئـەم هـۆزە بـۆ رامـانی فـارس دەگـەڕێنـەوە. کوڕی حوقل لە (دیوان الصداقە) ئاماژەی پێداون و مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە.

٣. ڕەحمـان بـەیگی: سـەر بـەعێلی ئینـاخین. لەناوچـەکانی ڕەوانـسەر و ماهیدەشـت نیشتەجێن.

٤. ڕەشـکوتانلی: بەڕوشـدینانیش ناویـان دەبـەن. نزیکـەی پێنـسەد بنەماڵـەی کۆچـەرین لەڕۆژهەڵاتی دیاربەکر.

٥. ڕەشوان: حەفتا بنەماڵەن. کۆچەرین و لەباشوری ئەرزەروم دەژین.

٦. ڕەشوەند: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن و لەکەنارەکانی قەزوێن نیشتەجێن.

٧. ڕەشـەوەند: چـەند بنەماڵەیـەکن و لەکـەنارەکانی ئازەربایـەجان نیـشتەجێن. شـێمانە دەکرێت لەگەڵ ڕەشوەند یەکێك بن کە بۆ دوو ناوچەی جیاواز کۆچیان کردووە.

٨. رۆزیکی: ئەولیای چەلەبی، لەبەرگی چوارەم لاپەڕەی ٧٥ ئاماژەی پێدوان.

ز-:

١. زاڕاڕی: سێسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی هەولێر نیشتەجێن. لەباکوری باستۆرەچای دوانزە گوندیان هەیە.

٢. زازا: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەڕۆژهەلاتی خەرپوت و شاری سیورك نیشتەجێن. هەموویان گوندنشینن.

٣. زافرانلی: یا زەفرانلو، زەعفەرانلو: تیرەیەك لەهۆزی حەسنانلون کەشا عەباسی سەفەوی ئەوانی بۆ خوراسان کۆچ پێکردووە. لەمەشهەد و بوجنورد نیشتەجێن.

٤. زایادی: بەهەڵە بەزیادیش ناویان دەبەن. لەعەشیرە کوردەکانی فارسن. ئیستەخری و کوڕی حوقل و مەقدەسی ئاماژەیان پێداوە.

٥. زایخی: ئیستەخری و کوڕی حوقل و مەقدەسی ئاماژەیان بەم عەشیرەداوە بەلاّم لەئێستادا هیچ شوێنەوارێکیان نییە.

٦. زەردوویی: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی جوانڕۆ و ڕووباری سیروان نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەکرماشان دەژین.

٧. زەڕزا: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن. لەکەنارەکانی ورمێ دەژین. بەزەڕزانیش ناویان دەبەن.

٨. زەڕزاڕ: نزیکەی پێنج هەزار بنەماڵە بوون. لەناوچەکانی مازگەرد و ڕەستاق[1] و مەرت و چیای جەنجەرین کەدەڕوانێتە سەر شنۆ، نیشتەجێ بوون. فەرمانڕەواکەیان نەجم ئەلدین باشاك بووە. عەشیرەی باڵکان سەر بەم تایەفەن.

٩. زەڕقی: لەتایەفە کوردەکانی عێراقن. چوار تیرەن: دەرزینی، تەرجیلی، عەتاقی، کوردەکانی.

١٠. زەکرەمی: ئەم تایەفەیش لەعەشیرەکانی عێراقن.

١١. زەند: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن سەر بەعەشیرەی لەکی سەر بەعەشیرەی لوڕن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین، لەسەر ڕێگەی کفری و سیروان نیشتەجێن. پێنج تیرەن: تاهیرخان، عەلییان، محەممەد ساڵح ئاغا، غەنی. کەریم خانی زەند پاشای ئێران لەتیرەی عەلییان بووە.

---

[1] – ڕەستاق: لەباشوری شەمزینانە (ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام)

١٢. زەنگەنە: نزیکەی چوارسەد و پەنجا بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین نیشتەجێن. لەکەنارەکانی کفری و ئیبراهیم خانجی و ناوچەکانی سوماك دەژین. دەستەیەکیان لەکرماشان و هەلیلانن. سەر بەعەشیرەی لوڕن. خێڵی زەنگەنە دوو تیرەن: فارس ئاغا و ڕۆستەم ئاغا. لەشەرەفنامەدا هاتووە: عەشیرەی زەنگەنە لەئەفغانستانیش بوونیان هەیە. شێمانە دەکرێت لەبەلوچستانەوە روویان لەو سەرزەمینە کردبێت.

١٣. زێباری: نزیکەی هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەپارێزگای موسڵ لەنێوان عەقەر و زێی گەورە و کەنارەکانی بیرەی گەورە نیشتەجێن.

١٤. زیریکانلی. زیریکانلی نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن. لەباکوری خنس دەژین. لەئەنکارا پێنسەد بنەماڵە لەزیریکانلییەکان بوونیان هەیە.

١٥. زەیلانی: عەشیرەیەکن لەئەلشەگەرد.

١٦. زەینەڵوەند: لەتایەفەکانی پشتکوهن و لەو ناوچە نیشتەجێن.

س-:

١. سابولی: ئەم هۆزە ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام ئاماژەی پێدراوە. شێمانە دەکرێت وشەکە لەبنەمادا سولی بێت. (دواتر ئاماژەی پێدەدەین).

٢. ساتیاری: نزیکەی شەست بنەماڵەن. لەناوچەکانی ڕەوانسەر و جوانرۆ و ئاوی سیروان نیشتەجێن.

٣. ساراتی: بەساراتیش ناویان دەبەن. لەناوچەکانی ئازەربایەجان نیشتەجێن.

٤. سارمی: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن. لەخاکی عێراقدا بڵاو بوونەتەوە.

٥. ساسۆنی: بەساسۆنییەکانیش ناویان دەبەن. لەخاکی کوردستانی عێراق بڵاو بوونەتەوە. فەرمانڕەواکانی حزۆو سەر بەم عەشیرەن.

٦. ساکور: سێسەد بنەماڵەی کۆچەرین و لەکوردستانی عێراق دەژین.

٧. سالانی: مەقدەسی ئاماژەی پێداوە بەڵام ئیستەخری و کوڕی حوقل باکیلیان نووسیوە. لەفارس نیشتەجێن.

٨. سالمونی: ئیستەخری و کوڕی حوقل و مەقدەسی ئاماژەیان پێداوە. لەفارس نیشتەجێن.

٩. سەبایی: یا سەباهی و بەزۆری بەسەباحی ناویان دەبەن. لەعەشیرە کوردەکانی فارسن.

١٠. سپرەتی: حەفتا بنەماڵەی کۆچەرین و لەباکوری زاخۆ دەژین.

١١: سەپیکانلی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەباکوری دەریاچەی وان نیشتەجێن.

١٣. سەفاری: لەعەشیرە کوردەکانی فارسن و لەو ناوچە نیشتەجێن.

١٤. سەگوەڕ: لەناوچەکانی سنە بڵاو بوونەتەوە.

١٥. سەگوەند: چوار تیرەن: سەگوەندی حاجی عەلی خانی، سەگوەندی رەحیم خانی، پاپی، جودەکی. نزیکەی چوار هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی باڵاگریوە و هەرو نیشتەجێن. سەر بەتایفەکانی پشتکوە و عەشیرەی لوڕن.

١٦. سەلدوز: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی ئازەربایەجان لەنێوان زازا و مامش و موکری نیشتەجێن.

١٧. سەلسەلە: سەر بەعەشیرەی لەکن کەخۆی سەر بەعەشیرەی لوڕە. لەخاوە و ئەلشەتر نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەرۆژهەلاتی سنە لەنزیك کلیایی نیشتەجێن. گوندێکیان هەیە بەناوی سەلسەلە.

١٨. سلێمانی: ئەم تایەفە دوو لقن: فەرمانڕەواکانی قەلب و باتمان و فەرمانڕەواکانی مەیافارقین.

١٩. سەلیوان: شێمانە دەکرێت سەر بەعەشیرەی زازا بن. لەرۆژئاوای موش، لەزۆنکاوی موراد نیشتەجێن.

٢٠. سەنجاوی: سەنجابی: نزیکەی دوو هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەماهیدەشت، ناوچەکانی کرماشان و جوانڕۆ و سنە، نیشتەجێن. دوانزە تیرەن: چاڵاوی (چالابی)، داڵیان، گوازی، بەڕازی، سیمەوەند، سورەوەند (سورخەوەند)، تەکەوەند، تفەنگچی، حەق نەزەرخانی، سێ تیرەی دیکەی ئەوان بریتین لە: لوڕ، جاف، گۆران کە بە ئیمامسوەند، دارخۆڕ، بێوەحشتییان، ناویان دەبەن.

٢١. سەنجار: هەشت تیرەن: میرەکان، ساموگان، حوبابە، کیران، بێکەران، بەڵەد، مەندیکان، بەیت ئەلخولتا. هەموویان یەزیدین و لەسەنجار نیشتەجێن.

٢٢. سەندی و گڵی: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەپارێزگای موسڵ لەنێوان هیزڵ و خابور نیشتەجێن.

٢٣. سۆرانی: ئەولیای چەلەبی لەبەرگی چوارەم لاپەڕەی ٧٥ ئاماژەی بەم عەشیرەداوە. قۆڵی درێژی کوردی کە بەقۆچکە سۆرانی بەناوبانگە، بۆ ئەم تایەفە دەگێڕنەوە.

٢٤. سورچی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن لەپارێزگای هەولێر لەکەنارەکانی باکوری زێی بچوك تا ڕەواندز بڵاو بوونەتەوە. خاوەنی پەنجا گوندن. تیرەیەك لەعەشیرەی سورکیشلین.

٢٥. سورسوری: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن. لەباشوری سنە، لەناوچەکانی گاورووود تا بیلوار نیشتەجێن. ئەو ناوچەیە بەسورسور ناو دەبەن.

٢٦. سورکیشلی: نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن. لەڕۆژهەلاتی دیاربەکر نیشتەجێن. سورچییەکان تیرەیەك لەم تایەفەن.

٢٧. سورەمێری: پێنج تیرەن: توتك، ئەنتەری، ئاینە، مامەجان، کەلهوڕ. نزیکەی دووهەزار و بیست و پێنج بنەماڵەن. لەکەنارەکانی خانەقین، تیرە ئانتاری، لەنێوان شارەبان و ئەبو جەسرەن.

٢٨. سوری: لەئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، ناوی ئەم عەشیرە لەجیاتی عەشیرەی شاری هاتووە.

٢٩. سەوسەنی: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەکەنارەکانی سابلاغ نیشتەجێن.

٣٠. سەولی: یا سەولیە: عەشیرەیەکی بویر و ئازان. لەنێوان شارەزوور و شنۆی ئازەربایەجان نیشتەجێن. بۆ جەنگاوەری بەناوبانگن. نزیکەی دوو هەزار پیاوی شەرکەریان هەیە. لەئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام ناویان هاتووە.

٣١. سوەیدی: تایەفەیەکی کورد زمانن لەخاکی کوردستانی عێراق. شێمانە دەکرێت بگەنەوە بە ئالی بەرمەك.

٣٢. سوهرانیان: ئەمانیش تایەفەیکن لەخاکی کوردستانی عێراق. لەوەچەی کەلۆس (کەولۆس). کە بەسارانییەکان یا سارانیش بەناوبانگن.

٣٣. سیری. لەتایەفە کوردەکانی فارسن. ئیستەخری و کوڕی حوقل ئاماژەیان پێداوە. مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە.

٣٤. سەندی: ئەم هۆزە لەمسالك الابصار ئاماژەی پێدراوە. لەو کتێبەدا هاتووە: سێ هەزار پیاوی جەنگاوەریان بووە و بەم دواییانە لەناو عەشیرە کوردەکانی دیکەدا بڵاو بوونەتەوە.

٣٥. سێفەکانی یا سەیفکانی: پێنسەد بنەماڵەن لەلای سەرەوەی خاڵکانی نیشتەجێن.

٣٦. سینان: لقێکن لەتایەفەی زازا. لەرۆژئاوا خەرپوت نیشتەجێن.

٣٧. سینامینلی: دوو هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەنزیك مەلاتییە نیشتەجێن و هەموویان شیعە مەزهەبن.

٣٨. سیلۆکان: نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن. کۆچەرین و هاوینان لەدەشتی موش خێوەت هەڵدەدەن.

ش-:

١: شادانجان: مەسعودی لە مروج الذهب ئامارەی پێداون و دەڵێت لەچیاکان نیشتەجێن یانی چیای کوردان.

٢. شادلو: نزیکەی هەژدە هەزار بنەماڵەن. لەکەنارەکانی بوجنورد نیشتەجێن. دوو هەزاریان خێوەت نیشینن.

٣. شادڕلی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەئەلشەگەرد و ئازەربایەجان نیشتەجێن. سەر بەعەشیرەی کورەشەلین و هەموویان شیعە مەزهەبن.

٤. شاری: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. بوێر و جەنگاوەر. لەچیاکان و دەربەندەکانی زێی گەورە نیشتەجێن لەویلایەتەکانی شەعلاباد تا خەفتیان. لەئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، لەجیاتی ئەم عەشیرە(شاری) سوری نووسراوە.

٥. شاهجان: یا شاهیجان. هۆزێك بوون لەناوچەی دینەوەر و هەمەدان. نزیکەی پێنج هەزار پیاوی جەنگییان بووە. ئێستا لەناو عەشیرەکانی دیکەی کورد بڵاو بوونتەوە. مەسعودی ئامارەی پێدوان.

٦. شاقوبادی: چەند بنەماڵەیەکن. لەناوچەکانی جوانڕۆ نیشتەجێن.

٧. شاهکانی: هۆزێکن لەفارس. ئێستا بڵاو بوونەتەوە. ئیستەخری و کوڕی حوقل ئامارەیان بەم هۆزە داوە.

٨. شامە سوری: بەشا مەنسوریش ناویان دەبەن. نزیکەی سەد بنەماڵەن کە هاوینان لەناوچەکانی گرد میرانی لەیلاخ، ڕۆژهەلاتی سنە و زستان لەزەهاو بەسەر دەبەن. دەستەیەکیان کۆچەری و دەستەیەکیان گوند نشینن.

٩. شاهۆنی: هۆزێکن و لەفارس نیشتەجێن.

١٠. شاهیاری: ئەم هۆزەیش لەفارسن. ئیستەخری و کوڕی حوقل ئاماژەیان پێداون.

١١. شەبان یا شوان: لەپشتکوە نیشتەجێن. ئەگەری هەیە لەهۆزی گەورەی شوانی ناوچەی کەرکوك و خانەقین بن.

١٢. شەرەفبەیانی: نزیکەی حەوتسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی کەرکوك و خانەقین لەنێوان چیای شواڵدەڕ و سیروان نیشتەجێن. لەناوچەکانی قۆڕەتو و هۆرێن و شێخانیش دەژین. هاوینان روو دەکەنە چیای بەمۆ.

١٣. شکاك: وشەکە لەبنەمادا شاە کاك یا شە کاکە. نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن. لەباکوری سلێمانی و ڕۆژئاوای دەریاچەی وان دەژین. سێ مانگ هاوشێوەی کۆچەرییەکان لەخێوەتدا بەسەر دەبەن. نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵە لەکەنارەکانی سەلماسن. پێنج تیرەن: شکاك، شکفتی، موکری، شاولی (شاوەلی)، بۆتان.

١٤. شەکەرلی: ئەم هۆزە لەکەنارەکانی موش نیشتەجێن.

١٥. شەمسیکی: نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن لەناوچەکانی دزە (دیزە).

١٦. شوان: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین. لەنێوان ڕووباری خاسە و زێی بچوك نیشتەجێن. دراوسێی شێخ بەزینی و بیبانییەکانن. ئەم هۆزە دوو تیرەن: شوان خاسە و شوانی بازیان.

١٧. شوانکارە یا شەبانکارە: یەکێك لەلقەکانی رامانی فارسن. ئیستەخری ئەوانی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ناو بردووە. عەشیرەیەکی زۆر گەورەن. پێنج تیرەن: مەسعودی، شاکانی، ڕامانی، کارزونی، ئیسمەعیلی.

١٨. شوهان: سەر بەعەشیرەی لەکن. لەباشوری پشتکوە نیشتەجێن.

١٩. شەهراکی: شاراکی: هۆزێکی گەورە بوون لەفارس بەڵام لەئێستادا بڵاو بوونەتەوە.

٢٠. شەهراوی: شاراوی: ئەم هۆزە لەعەشیرە کوردەکانی ناوچەی فارسە. ئیستەخری ئاماژەی پێدوان.

٢١. شێخ ئیسمەعیلی: نزیکەی سەد و شەست بنەماڵەن. لەناوچەی ئیسپەندئاوای سنە نیشتەجێن. ئەم خێڵە لەسەردەمی فەتح عەلی شای قاجار ڕوویان کردۆتە ئەم ناوچە.

٢٢. شێخ بەزینی: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین، لەکەنارەکانی باشوری زێی بچوك نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەئەرزەروم و دەستەیەکیان

لەبوی ئاوا نیشتەجێن.

۲۳. شێخ دودانلی: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن لەرۆژهەڵاتی دیاربەکر.

۲٤.شیربەیگی: تیرەیەکن لەعەشیرەی زیریکانلی. نزیکەی دووسەد بنەماڵەن.

۲٥. شیروان: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن لەپارێزگای هەولێر. لەکۆتایی باکوری شاری ڕەواندز نیشتەجێن.

۲٦. شیروانی: ئەم هۆزە لەهۆزە کوردەکانی کوردستانی عێراقە. شێمانە دەکرێت لقێکی سەر بەعەشیرەی شیروان بێت. دوو تیرەن: کرنی و ئیروانی.

۲۷. شیوەڵی: شێمانە دەکرێت سەر بەعەشیرەی شکاك بێت. لەرۆژئاوای کفری نیشتەجێن.

# ص-:

١. صالْحی (سالْحی): نزیکەی دووسەد بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین، لەقەرەحەسەن و گولْ نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەشام دەژین.

٢. صەباحی (سەباحی): یا سەباهی. هەمان سەباییە کەپێشتر ئامارژەمان پێدا.

٣. صۆفی وەند (سۆفی وەند): نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەماهیدەشت و ناوچەکانی جوانڕۆ نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەکەلیایی دەژین.

## ط -:

طابور ئۆغلی (تابور ئۆغلی): نزیکەی سێسەد بنەماڵەن. لەباکوری قەرەشەهر نیشتەجێن.

٢. طالە بانی (تاڵەبانی): هەمان تاڵەبانییە کەپێشتر ئامارژەمان پێدا.

٣. طورعابدین (توری عابدین): نزیکەی حەوت هەزار بنەماڵەن. لەتوری عابدین نیشتەجێن و چوارده تیرەن: مومان، دورکان، دومانە، عولیان، هارونە، سەلاحان، میریزاخ، میزیداخ، دەلمامیکان، گەرگەڕی، هاوارکا، داسیکان، محەلەمی (ئەمەی دواتر لەخوێندنەوەی وشەکەی دڵنیا نیم)

## ع -:

١. عەبدولرەحمان: ئەورەحمان: چەند بنەماڵەیەکن لەناوچەکانی ڕەوانسەری سنە.

٢. عوسمانوەند: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەفیروزئابادی هەلیلیان نیشتەجێن.

٣. عەشایری سەبعە (حەوت): نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن لەناوچەکانی موسڵ. لەبنچینەدا حەوت عەشیرەی گەورە بوون. دواتر بچووك بوونەوە و تێکەڵ بەیەك بوون و بوونە یەك عەشیرە بەناوی (عەشایری سەبعە)

٤. عەمارلو: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن لەباشوری گیلان، یانی لەنێوان ڕووباری قەزوێن و ڕەحمەت ئاباد و دەیلەمان نیشتەجێن. ئەم ناوچە تا ئێستایش بەعەمارلو بەناوبانگە. لەکۆندا پێیان وتووە خەرگام. دوای ئەوەی نادرشا هۆزەکانی عەمارلووی بۆ ئەو ناوچە کۆچ پێکرد بەعەمارلو ناوی دەرکرد. چەند تایەفەیکن: قوبە قەرانلو، شاملو، شاە کەلانلو (کوردلەر، دوکتۆر فەریج،ل ٣٢).

٥.عومرانلی: نزیکەی هەشتسەد بنەماڵەن. لەڕۆژئاوای قەرەشەهر نیشتەجێن.

٦. عومەرلو: هەمان تایەفەی عەمارلون. ئەو دەستەی لەخوراسانن، بەعومەرلو بەناوبانگن.

٧. عومەرمەل: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك و خانەقین، لەنێوان کۆلآنی چیان و ناڵەشکێنان و سەرکەڵە نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەدەربەندی کرماشان دەژین.

٨. عەلوش: یا ئەلوش: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن. لەڕۆژهەڵاتی حەڕان نیشتەجێن و بەعەرەبی قسە دەکەن.

٩. عەونیکی: ئەولیای چەلەبی لەبەرگی چوارەم، ل ٧٥ ئاماژەی بەم هۆزە داوە بەڵام ژمارە و شوێنی ئەوانی دیارینەکردووە.

١٠. عیسایی: بەعیسەویش ناویان دەبەن. لقێك لەعەشیرەی حەسنانلون. بۆ عیسا کوڕی شەهاب ئەلدین دەگەڕێنەوە. لەنزیك دەریاچەی وان نیشتەجێن.

## غ -:

١. غەدیری: لەناوچەکانی ئیسفەندئاباد، لەیلاخ، هوباتوو بڵاو بوونەتەوە. لەبەغدادەوە ڕوویان کردۆتە ئەو ناوچە.

ف-:

١. فوراتی: لەعەشیرە کوردەکانی فارسن کە لەناوچەی فوراتەوە روویان کردۆتە ئەو ناوچە. ئیستەخری ئاماژەی پێداون (ل ٩٨).

٢. فەلەك ئەلدین یا فەلەك دینی: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن. لەخاوە (لەنێوان نەهاوەند و ئەلشەتر) نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەسەیمەرە دەژین. لەتایەفەکانی پشتکوهن.

٣. فەیزوللەبەیگی: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەکەنارەکانی سابلاخ نیشتەجێن.

٤. فێڵەکەری: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی سەنقوڕ و کەلیایی نیشتەجێن.

ق-:

١. قادرمەریوەیسی: لەتایەفەکانی سەر بەعەشیرەی جافن. لەناوچەکانی سنە دەژین.

٢. قادری: لەکەنارەکانی سلێمانی نیشتەجێن. ئەم تایەفە جیاوازە لەقادرییەکانی شاری سنە کە بۆ قادرخانی درگەزێنی دەگەڕێنەوە. میرزا عەلی ئەکبەر سادق ئەلمولك، نوسەری مێژووی کوردستان و حەدیقەی ناسری، لەقادرییەکانی دەرگەزێنییە.

٣. قازانلو: سەر بەعەشیرەی باجەلانن.

٤. قاڵقاڵی: زستان لەشێخ حەیدەر و گڵەسور و دەباغ و کەنارەکانی دیواندەرە بەسەر دەبەن، هاوین روو دەکەنە چیاکانی رۆژئاوا و باشوری گڵەباغی.

٥. قوبادی، سەر بەتایەفەکانی جاف جوانڕۆن. قوبادی لەگەڵ باباجانی (=باباجانی) نزیکەی هەشتسەد بنەماڵەن و لەجوانڕۆ دەژین. زستان روو دەکەنە گەرمەسێر (پشت چیای شێخان و زەهاو) و هاوینان لەبازان و بەنیگز ژیان بەسەر دەبەن. ئەمیر تەیموری گورکانی، ئەوانی لەخاکی دەوڵەتی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) بۆ ئێران گواستەوە. تایەفەی مەنوچێهری و مستەفابەیگی سەر بەم عەشیرەن.

٦. قەرە ئەلوس: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی خانەقین و مەندەلی نیشتەجێن. شەش تیرەن: گەش، کاتیون، نەفتچی، کاکوەند، چارماوەندی، گاسواری. ئەم تایەفانە و تایەفەی عەلوس لەیەك ڕەچەڵەکن.

٧. قەرەچورلو: یا قەرەچول لو. ئەم هۆزە لەکۆچکەران بۆ خوراسانن.

٨. قەرەحەسەن: نزیکەی سێسەد بنەماڵەن لەرۆژئاوای بەهسەنی.

٩. قریاویە: ئەم هۆزە لەویلایەتی بەسقاد و دەربەندی قەرایر نیشتەجێ بوون. بەشێك لەناوچەکانی ئوزبەگی ئازەربایەجانیان لەژێر دەسەڵاتدا بووە. سەرۆکی بەشی دەربەندی قەرایر، سەیف ئەلدین کوڕی شێر حەسنانی بووە کەپەیوەندی لەگەڵ سوڵتانی میسردا بووە. بەشی بەسقاد، چوار هەزار پیاوی جەنگییان بووە.

١٠. قەشەیی: چەند بنەماڵەیەکن و لەناوچەکانی سیروان و جوانرۆ دەژین.

١١. قولابوەند: نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەچیای تاف و هەشتا پاللو دەژین. سەر بەعەشیرەی دەیرەکوەندن.

١٢. قەلایی: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەکاکەڕەزای پیشکوە نیشتەجێن.

١٣. قەڵخانی: لەماهیدەشتی کرماشان نیشتەجێن. بەشێکیان لەناوچەکانی سنە دەژین.

١٤. قەیتوڵی: یا قەتولی، سەر بەتایەفەکانی پشتکوهن.

ك-:

١. کاجتی: لەعەشیرە کوردەکانی فارسن. ئیستەخری ئاماژەی پێداون.

٢. کارتاوی: لەنێوان شارەزوور و شنۆی ئازەربایەجان نیشتەجێ بوون. میستر هاوفمان، دەڵێت لەناوچەکانی سەر بەزێی بچوک نیشتەجێ بوون. ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام ئاماژەی بەم هۆزە داوە.

٣. کاك: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی مازنجان و بیروە و سەمحە نیشتەجێن. ئەم هۆزە بۆ ئەمیر موبارزئەلدین دەگەڕێنەوە کە یەکێك لەئەمیرەکانی دەوڵەتی عەباسی بووە و نازناوی موبارەزئەلدینی لەلایەن خەلیفەوە پێبەخشراوە و ناوی خۆی کاك بووە. لەبەر ئەمە، ئەم هۆزە بەکاك بەناوبانگە.

٤. کاکو: تایەفەیێکن لەنێوان کەلیایی و سنە نیشتەجێن. چەند گوندێکیان بەناوەوەیە. گومان دەکرێت ئەم تایەفە لەپاشماوەی کاسییەکان بن: یانی کاسوی ئاکاد کەپێشتر ئامارژەمان پێدا.

٥. کاکەیی: یا کاکوانلو، بەکاکانلو و کاغانلویش ناویان دەبەن. نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەپارێزگای کەرکوك نیشتەجێن. لەنێوان حەویجە و زێی بچووك و لەناوچەکانی قورەتوو و خانەقینیش کاکەییەکان بوونیان هەیە. ئەمانیش دەبێت بەپاشماوەی کاسۆییەکان بن.

٦. کاکەوەنــد: یــا کاکاوەنــد یــا کاکووەنــد: ئــەم تایەفــە بەدڵنیاییــەوە لــەپاشماوەی کاسییەکانن، یانی کاسۆی ئەکاد کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٧. کامبەرانی: لقێکن سەر بەعەشیرەی براخۆی کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٨. کەداك: نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن و لەچیای وەشین نیشتەجێن. زازان.

٩. کرداوەری: نزیکەی هەزار بنەماڵەن و لەناوچەکانی ئازەربایەجان نیشتەجێن. فەتح عەلی شای قاجار ئەوانی بۆ شیراز کۆچ پێکردووە.

١٠. کوردگـەڵی: هـۆزێکی گـەورەن لەبەلوچستان و هیندسـتان کـە لەبنـچینەدا عەشـیرەی براخۆی لەمان پێکهاتووە. لەڕۆژئاوای ئێرانەوە روویان کردۆتە ئەو ناوچانە.

١١. کرمـاج: یـا کرمـانج: عەشـیرەیەکی زۆر گـەورەن. لەناوچـەکانی کـەرکوك، سـلێمانی، شارەزوور، سنجاق کوی، حەریر، سابلاخ، بانە و مەریوان نیشتەجێن. زمانی تایبەتی ئەم عەشیرە بەکرمانجی بەناوبانگە.

١٢. کرمانی: ئەم هۆزە لەفارس نیشتەجێن. ئەگەری هەیە لەکرمانەوە روویان کردبێتە ئەو ناوچە. ئیستەخری لەلاپەڕەی ٩٨ و کوڕی حوقل لەدیوان الصداقە ل ١٨٧-١٨٥ ئاماژەیان پێداوە.

١٣. کەرەمعــەلی: نزیکــەی سێــسەد بنەماڵــەن و لــەخاوە، سەربەناوچــەکانی پــشتکوە نیشتەجێن.

١٤. کەرەندی: نزیکەی شـەش هـەزار بنەماڵـەن. لـەڕۆژئاوای کرماشان لەناوچەکانی کەرەند نیـشتەجێن. لـەپاتاق و بەشـیوە و سەرچـاوەی سـپی (چـشمە سـفید) نیـشتەجێن. هـۆزی کەرەندی چوارده تیرەن: کەرەندی، بێوەنجی، رەشیدعەلی، جەلالوەند، پاتاقی، باباجانی، ئایینەیی،جۆزگەلـەیی، سـەرمیلی، هەڵتـەیی، یـەری، چشمە سفیدی، خوسـرەو بەهمـەنی و نەسرئابادی.

١٥. کەرەجەك. یەکێك لەهۆزە کۆنەکانی کوردن کەبڵاو بوونەتەوە. ژمـارە و نشینگەی ئـەوان دیاریکراو نییە.

١٦. کەرەشـەلی: نزیکـەی شـەش هـەزار و دووسـەد بنەماڵـەن. لەناوچـەکانی ئـەرزەنجان و کەنارەکانی ڕووباری فورات نیشتەجێن. هەموویان شیعە مەزهەبن.

١٧. کزەیــی: نزیکــەی سێــسەد بنەماڵــەن. لەســەیدەلاّن و کفـری و ناوچـەکانی خانـەقین

نیشتەجێن. سێ لقن: سەرکالاَ، سەعدوللە بەگ، قەیخا بارام (کوێخا بارام)

١٨: کەوش زێڕین: تایەفەیکن کەدەگەڕێنەوە بۆ توسی کیانی. دانیشتووانی ڕەسەنی شاری سنە سەر بەم تایەفەن.

١٩. کلاَشی: ئەم تایەفە لەجوانڕۆ و تەرخان ئاوا و ماکوان و ناوچەکانی زەهاو و کرماشان بلاَو بوونەتەوە. دەستەیەکیان لەشارەزوور دەژین.

٢٠. کلاَوکەڕ: ئەم هۆزە لەسنە و کرماشان بلاَ بوونەتەوە.

٢١. کلاَکۆگ: ئەم هۆزە لەناوچەکانی ڕەوانسەر و ماهیدەشت نیشتەجێن.

٢٢: کەڵهوڕ: نزیکەی دە هەزار بنەماڵەن. لەماهیدەشت و هارون ئاباد و قەلاَشاینی و ناوچەکانی قەسری شیرین و کەرەند نیشتەجێن. ناوەندەکەیان گیلانە. نزیکەی دووسەد بنەماڵەیەکیان لەڕۆستەمانی خورخورە و ناوچەکانی سەقز نیشتەجێن.

ئەم عەشیرە نزیکەی بیست تیرەن: خالدی، شەیانی، سیاسیا، کازم خانی، خەمان، قەڵەش، گرگا، کەلەپا، کەلەجۆ، شوان، قۆچمی، مەنسوری، ئەڵوەندی، ماهیدەشتی، هارون ئابادی، شاهینی، موشگیر (مشك گر)، بوداق بەگی، زەینەڵخانی و کەمەرە.

٢٣. کەلیایی: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی سەنگەری کرماشان (=سەنقوڕ) خاوەنی ١٦٥ گوندن. کەلیاییەکان چەند تیرەن کەبریتین لە: سۆڤ وەند، موسیوەند، پەشموەند، شیرازی، فێڵەکەری و هتد...

٢٤. کلێسی.: ئەم تایەفە بەمەندیانیش ناویان دەبەن و فەرمانڕەواکانیان، بەمیرەکانی مەند بەناوبانگن. هەموویان لەڕەچەڵەکی مەندن و سەر بەعەشیرەکانی عێراقن، یانی کوردستانی ڕۆژئاوا. (باشووری کوردستان)

٢٥. کەمانگەر: چەند بنەماڵەیەکن، لەشاری سنە و ناوچەی پڵنگان و ناوچەکانی سلێمانی نیشتەجێن.

٢٦. کنۆڵەیی: یا کەندۆڵەیی: نزیکەی چوارسەد بنەماڵەن و لەباکوری کرماشان (لەچیای پەراو) نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەشاری کرماشان دەژین.

٢٧. کۆچەری: نزیکەی دەهەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی سیواس و زازا نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەئەرزەنجانن. چوار تیرەن: ئینولەڕ، بارلولەڕ، سارولەڕ، گارولەڕ.

٢٨. کواردات: نزیکەی سێ هەزار بنەماڵەن. لەویلایەتی کواردات نیشتەجێن کەدەکەوێتە

ناوچەی ڕۆژئاوایی جۆلەمێرگ. لەئەنسیکلۆپیدیایی ئیسلام لەجیاتی کواردات، گوڕ نووسراوە.

٢٩. کورا: هۆزێکن لەڕۆژئاوایی شەقلاوە نیشتەجێن. خاوەنی چەند گوندێکن.

٣٠. کورتی: هۆزێکن لەناوچەکانی کەرکوك بلاو بوونەتەوە. دەستەیەکیان لەکەنارەکانی بۆتان دەژین. ئەم دەستەیە بەرادەیەك کۆنن کەدەبێت ئەوان بەیەکێك لەتایەفە سەرەکییەکانی کورد بزانین و لەکاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی گوتییەکان ئاماژەمان پێدان. ئەم هۆزە لەڕۆژگاری توکولتی نیراری، پاشای ئاشور ناویان بووە و لەچیای زاگرۆس نیشتەجێ بوون. دەستەیەك لەڕۆژهەلاتناسان وەك مستر درایوار، ئەم دەستەیە بەئاراراتی و لەنەوەکانی داگیرکەری شومیر و ئاکاد یانی گودی کۆن دەزانن کەئاماژەمان پێدان و دواتر ڕوویان کردۆتە چیای زاگرۆس بەلام بەباوەڕی سیدنی سمیت و دەستەیەکی دیکە: ئەم دەستە لەکۆچکەرانی ڕۆژهەلات زەمینن (مادەکان) و ڕوویان کردۆتە چیای زاگرۆس. بەهەرحال ئەم دەستە لەریزی کوردەکانی چیای زاگرۆس لەقەلەم دەدرێن.

٣١. کورەشەلی: شێمانە دەکرێت هەمان هۆزی کەرەشەلی بێت.

٣٢. کوریان: نزیکەی سەد و هەشتا بنەماڵەن و لەخاکی عێراق نیشتەجێن.

٣٣. کوزلیچیان: سەر بەتایەفەکانی دێرسەملین کەئاماژەمان پێدا.

٣٤. کوساد: ئەم هۆزە لەئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام ئاماژەی پێدراوە بەلام شێمانە دەکرێت لوسە بێت.

٣٥. کوسەیی: نزیکەی چل بنەماڵەن و لەناوچەکانی سەقز و سیاکێو نیشتەجێن.

٣٦. کوکوین: نزیکەی سی بنەماڵەن. لەناوچەکانی جوانرۆ نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەعێراق دەژین.

٣٧. کوگلۆیی: : سەر بەتایەفەی لوڕن. لەناوچەکانی کرماشان و لوڕستان نیشتەجێن. سێ تیرەن: باوی، جەکی، ئاغەجەری. تیرەی ئاغەجەری لەناوچەکانی سنە دەژین و گوندێکیان هەیە.

٣٨. کولبەبن: لقێکی سەر بەعەشیرەی زازان. لەباشوری خەرپوت نیشتەجێن.

٣٩. کۆلی وەند: نزیکەی سێسەد و پەنجا بنەماڵەن و لەناوچەکانی ئەلشەتر و کەنار ڕووباری سەیمەرە نیشتەجێن. سەر بەتایەفەکانی پشتکوهن.

٤٠. کۆماسی: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی کەروەزی سەر بەشاری سنە نیشتەجێن.

٤١. کویان: نزیکەی دوو هەزار و سەد بنەماڵەن و لەناوچەکانی شرناق دەژین.

٤٢: کویك: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەناوچەکانی ژاوەڕۆی سنە نیشتەجێن.

٤٣: کەکا: چەندین بنەماڵەن و لەنزیك جۆڵەمێرگ نیشتەجێن.

٤٤. کیچیان: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەکوردستانی ڕۆژئاوا بڵاو بوونەتەوە.

٤٥. کەیکان: هۆزێکن و لەمەرعەش نیشتەجێن. ئیستەخری لەلاپەڕەی ١١٥ ئاماژەی پێداون.

٤٦. کەیکیە: هەمان عەشیرەی چیچیەیە.

٤٧. کەیوانلو: سەر بەو عەشیرانەن کەشا عەباسی سەفەوی ئەوانی بۆ خوراسان کۆچ پێکردووە. سەر بەعەشیرەی حەسنانلون.

٤٨. کەیوەران: هۆزێکن لەناوچەی گوڕ.

## گ-:

١.گاوخۆر، گاخۆر: نزیکەی دووسەد بنەماڵەن و لەناوچەکانی قەرەتەپە نیشتەجێن. (پارێزگای کەرکوك و خانەقین).

٢. گاوری: هۆزێکن سەر بەتایەفەکانی پشتکوهی لوڕستان و لەوێ نیشتەجێن.

٣. گەردی: نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن لەباکوری هەولێر نیشتەجێن.

٤. گرگەیی: چەند بنەماڵەیەکن لەناوچەکانی کەلیایی و ڕۆژهەڵاتی سنە نیشتەجێن.

٥. گەشگی: نزیکەی پەنجا بنەماڵەن لەناوچەکانی بیلوار. دەستەیەکیان لەناوچەی زەهاو و خاجومان دەژین.

٦. گەڵاڵی: تیرەیەکی سەر بەجافەکانی عێراقن. دەستەیەکیان لەنەهاوەند دەژین کەمەزهەب و ئەخلاقیان گۆڕیوە. لەکۆندا لەدانتراك و نەهاوەندەوە تا سنوورەکانی شارەزوور، شوێنی نیشتەجێ بوونی گەڵاڵییەکان بووە.

٧. گوڵباغی: دوو هەزار بنەماڵەن و لەهوباتو و سارال و قەرتۆڕە نیشتەجێن. لەڕۆژگاری شا تەهماسب لەشیرازەوە بۆ کوردستان هاتوون (کۆچیان پێکراوە). لەقۆناغی پەهلەوی بۆ هەمەدان و سیادون و تاران دوور خراونەتەوە. گوڵباغییەکان هەشت تیرەن: قەمەری، گاملی،

کاکسوەندی، موراد گۆرانی، چۆخەڕەشی، پەستوەسەری، هەمزەیی کەڵکەنی.

٨. گولْ فەڕووخی: لەنێوان دهۆك و زاخۆ نیشتەجێن.

٩. گۆران: نزیکەی شەش هەزار بنەماڵەن. لەڕۆژئاوای کرماشان نیشتەجێن. شەش تیرەن: قەڵخانی، بێ بەیانی، نێریـژی، گەهوارە، کانی، زنجیری، ڕێزەهوو. ناوەندی هۆزەکە، گەهوارەیە. لەگەڵ شەرەف بەیانی و باجەلاّن و سەنجاوییەکان دراوسێن. نزیکەی دوو هەزار بنەماڵە لەشاری سنە و هەورامان و ژاوەڕۆ و پلَنگان نیشتەجێن. هەموویان بەشێوەزاری گۆرانی قسە دەکەن. بەپێچەوانەی زۆربەی عەشیرەکانی کورد کەکۆچەری و شوان بوون، ئەمان سەرقاڵی مسکێنی و وەرزێرین.

١٠. گورك: نزیکەی دوو هەزار بنەماڵەن. لەناوچەکانی سەردەشت و سابلاّخ نیشتەجێن.

١١. گەورووس: یا گەڕووسی: هۆزێکن لەدراوسێی کولەبەین کە لەنزیکی خەرپوت نیشتەجێن.

١٢. گوگریشانلی: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن لەباکوری مەرعەش.

١٣. گێژ. هۆزێکن لەناوچەکانی کفری.

١٤. گیل: یا گیلان: هۆزێکی زۆر کۆنن لە هۆزەکانی ماد. یانی لەمناڵەکانی مادا کوڕی یافت کوڕی نوح. بەمپێیە گیلانییەکان لەکوردەکانی ڕۆژهەلاّت زەمینن کەیۆنانییەکان بەکادوسی یا کادوشی ناویان بردوون. ئەگەر ئەم وشەیە هەمان وشەی کاردۆشی گەزنەفۆن بێت، بەپێی بۆچوونی مستر درایوار و دوکتۆر سپایزار، بەکوردەکانی ئارارات وتراوە.

بەلاّم بۆچوونی مستر سیدنی سمیت کەدەڵێت: لەکاتی هاتنی ماد و پارس بۆ ناوچەکانی ئەمڕۆیی، هۆزی کاردۆشی ڕوویان کردۆتە ناوچەکانی ڕۆژئاوا و کەنارەکانی خەزەر و لەوێ نیشتەجێ بوون، بۆچوونی یەکەم پشتڕاست دەکاتەوە کە لەکوردەکانی ڕۆژهەلاّت زەمین بن. ئەم ڕۆژهەلاّتناسە دووبارە دەڵێت: کاردۆشییەکان لەپارسەکان کۆنترن و زمانێکی سەربەخۆ و جیاوازیان لەزمانی پارسی بووە.

نشینگەی ئەم هۆزە لەسنوری مازەندەران، لەڕۆژهەلاّتەوە دەست پێدەکات و لەباکوری دەریای خەزەر تا سنوری ئازەربایەجان و خەمسە و قەزوێن درێژ دەبێتەوە نزیکەی ٢٢٥ کیلۆمەتر. تەواوی ئەم ناوچیە بەناوی ئەم هۆزە بەناوبانگە (واتە گیلان). لەکۆندا ناوی وارنا بوو و لەئاڤێستادا ئاماژەی پێدراوە.

بەهەرحاڵ گیل و خەزەر و دەیلەم وەك پێشتر ئامازەمان پێدا، سەر بەتایەفەکانی ماد و کوردەکانی ڕۆژهەڵات زەمینن.

١٥.گیوەران: هۆزێکن لەسیورکی سەر بەناوچەی دەرسیم.

١٦. گوەکەش: هەمان هۆزی دووەمن کەئامازەمان پێدا.

## ل -:

١. لازیا: مەسعودی لە مروج الذهب، ئامارەی پێدوان و شوێنی ئەوانی بەچیاکان دیاریکردووە. واتە چیاکانی کوردان کە لەنێوان عێراقەکاندایە (عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم) واتە کوردستانی ڕۆژئاوا و کوردستانی ڕۆژهەڵات.

٢. لاوین یا لاوینیان: هۆزێکن و لەکۆندا لەشارەزوور نیشتەجێ بوون. ئیبن خەلدون لەمێژووی بەربەردا دەنووسێت: لەجەزایر نیشتەجێن. ئەگەری هەیە لەکاتی داگیرکاری مەغۆلەکان لەشارەزوورەوە بۆ جەزایر کۆچیان کردبێت.

٣. لالەیی: نزیکەی شەست بنەماڵەن و لەلەیلاخی سنە نیشتەجێن. سەر بەعەشیرەی لەکن.

٤. لوڕ: عەشیرەیەکی گەورەن. دوو لقن: فێلّی و مامەسەنی. فێلّی بەلوڕی بچوك یا فەزلەوییەیش بەناوبانگە. مامەسەنی یانی مام حەسەنی و بەلوڕی گەورە بەناوبانگە.

دەستەیەك لوڕ بۆ دوو لقی پشتکوە و پێشکوە دابەش دەکەن. لوڕەکان بیست و هەشت تیرەن: فێلّی، گەلۆیی، لەك، بەختیاری، ماهەکی، ئەنبارلو، بەیات، بیرانوەند، مامەسەنی، ساهی، ئارسان، ئارکی، بەهی، دێرەکوەند، سەگوەند، بالاگرێوە، ئودلاوەند= (عەبدوللەوەند)، شێخەوەند، کاکووەند، کیسەوەند، زاراوەند، بالاوەند، جەلیلوەند، باجلۆند، مافی، سەعدوند، قەرەزەنجیر، زەنگەنە. لوڕەکان زیاتر لەهەشتا هەزار بنەماڵەن. زۆربەیان شیعەن. یاقوتی حەمودی لە (معجم البلدان) و جەودەت پاشا لەمێژووەکەی خۆی، بەرگی یەکەم لای ٣٤٢ و دوکتۆر فەریچ لە (کوردلەڕ) و سێر مەلکەم و لوریە و هاسل و براون و ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام، سەبارەت بەتایەفەی لوڕ و بەختیاری و کوردبوونی ئەوان ڕوونکردنەوەی پێویستیان داوە.

٥: لەك: تیرەیەکی سەر بەعەشیرەی لوڕن کەژمارەی دانیشتووانەکەی سەد هەزار کەس بووە و لەبەر ئەمە پێیان وتووە لەك واتا سەد هەزار. ئەم تیرە پێنج لقی هەیە: لالەیی، دولفان، تورهان، داڵوەند و زۆربەیان شیعەن. لەخانەقین و خوڕەم ئاباد و ئەلشەتر و ناوچەکانی

لوڕستان نیشتەجێن. لەکەلیایی، هەمەدان، ئیسفەهان، لەنێوان دەوڵەت ئاباد، سوڵتان ئاباد و کەنارەکانی سنە و لەیلاخیش دەبینرێن. دەستەیەکیان لەسەلماس دەژین. شێمانە دەکرێت لەشیرازەوە هاتبێتن.

٦: لەکی کوردی: ئەمانیش شێمانە دەکرێت سەر بەعەشیرەی لەك بن. لەنزیك ئاتنە نیشتەجێن.

٥. لوسەیی: پێشتر لەشارەزوور بوون. دواتر روویان کردۆتە میسر و شام. لەئەنسیکلۆپیدیایی ئیسلام، لوسەیی بەکوساد ناوی هاتووە.

٦. لەولانلی: نزیکەی چوارسەد و هەشتا بنەماڵەن. لەباکوری ڕۆژئاوای موش نیشتەجێن. هەموویان شیعە مەزهەبن.

٧. لولەرزی: سەر بەعەشیرەی مەندەمین. لەناوچەکانی حسێن ئابادی سنە نیشتەجێن.

٨. لۆلۆ: ئاشورییەکان بەلۆلۆم ناویان بردوون. لەتایەفە سەرەکییەکانی کوردن. لەئێستادا لەزەنگار و ناوچەکانی عێراق نیشتەجێن. لەپاشماوەی ئەو کوردانەن لەسەر دەستی نارامسینی کوڕی سارگۆنی یەکەم، شکستیان خوارد.

٩. لەیلانی: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن لەکەنارەکانی لەیلان، ناوچەکانی کەرکوك و خانەقین نیشتەجێن.

م —:

١: مابیر: ئەم دەستەیە لە ئەنسیکلۆپیدیای ئیسلام ئاماژەی پێدراوە. شێمانە دەکرێت باسیر یا باسیری بێت کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٢. ماحوردان: ماگردان، هۆزێکی بوێر بوون کە لەکەنگاوەر نیشتەجێ بوون. مەسعودی لەمروج الذهب ئاماژەی پێداون.

٣. ماحالی، مەحالی: سەر بەعەشیرە کوردەکانی فارسن کەئیستەخری دوای رمومی فارس لەپێرسیتی عەشیرە کوردەکان ئاماژەی پێداوە. کوڕی حوقل لەدیوان الصداقە ئاماژەی پێداوە.

٤. ماخانی: نزیکەی سێسەد بنەماڵەن و لەباشوری یوزغاد نیشتەجێن. سەر بەعەشیرەی میللین.

٥. مادنجان: مەسعودی لەمروج الذهب ئاماژەی پێدوان و شوێنی ئەوانی بەچیاکان

دیاریکردووە.

٦. مازنجان یا مازنجانی: نزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەویلایەتی مازنجان (کاك یا موبارز کاك) نیشتەجێن.

٧. ماڤ: لقێکن سەر بەعەشیرەی لەك کە لەکوێستانی ڕەواندز و سابلاّخ بوون. دواتر شا عەباس ئەوانی بۆ ڕەی و شەهریار و ناوچەکانی قەزوێن و کاشان کۆچ پێکردووە.

٨. ماگردان: هەمان هۆزی ماجوردانە کەئاماژەمان پێدا.

٩. مامش: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەکەنارەکانی سابلاّخ نیشتەجێن. چەند بنەماڵەیەکیان لەلاهیجانی نویّ دەژین. ناوەندەکەیان سوە. لەسەڵدوز و شنۆیش دەبینرین.

١٠. مامەسنی: یا مام حەسەنی، سەر بەعەشیرەی لوڕن. بەلوڕی گەورەیش ناویان دەبەن. لەئەنسیکلۆپیدیا ئاماژەیان پێدراوە کە لەنێوان عەشیرەکانی بەلوچ، دوو عەشیرەی دیکەی کورد بەناوی ماماسەنی بوونیان هەیە و ئەوان جیاواز لەم عەشیرەن.

١١. مامە کانلی: هۆزێکن لەباکوری مەلازگەرد نیشتەجێن.

١٢. مانیان یا مانیان: لەکوردەکانی ڕۆژهەلاّتی زەمینن بەلاّم ئێستا هیچ شوێنەوارێکیان لیّ نەماوەتەوە. مەگەر ئەوەی لەلێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەمادەکان بارودۆخی ئەم هۆزە روون ببێتەوە. ئەگەری هەیە مانای ئاشوری ئەم دەستەیە بن.

١٣. مانورانلی: هۆزێکن لەنێوان مەلازگەرد و ئەلشەکرد.

١٤. ماهەکی، یا مەهەکی: هۆزێکن سەر بەتایەفەکانی پشتکوە سەر بەعەشیرەی لەکن. لەحەلیلان و ناوچەی کرماشان نیشتەجێن.

١٥. موبارزکاك: هەمان هۆزی مازنجانین کە لەکاك ئاماژەیان پێدرا.

١٦. موبارەکی یا موارەکی: ئیستەخری و کوڕی حوقل ئاماژەیان بەم هۆزە داوە. مەقدەسی پشتڕاستی کردۆتەوە و شوێنی ئەوانی بەفارس دەستنیشان کردووە.

١٧. محەممەد ئیسحاق: ئیستەخری ئەوانی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ئاماژە پێداوە.

١٨. محەممەد باشار: ئیستەخری ئەم هۆزەیشی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ناو بردووە.

١٩. محەممەی: نزیکەی سێسەد بنەماڵە بوون. دراوسێی مازنجانی و حەمیدییە. لەمسالك

الابصار ناوی ئەم هۆزە ئاماژەی پێدراوە کەشەشسەد پیاوی جەنگیان بووە. گومانی دەکرێت لقێکی بەختییەکان بن.

٢٠. مەحمود جبرائیلی: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەلەیلاخ و سنە نیشتەجێن.

٢١. مەحمودی: عەشیرەیەکی زۆر گەورە بوون لەڕۆژهەلاَتی وان. سەد و بیست تایەفە بوون و حکومەتێکی سەربەخۆیان بووە. بەردەوام شەش هەزار پیاوی جەنگییان بووە. لەئێستادا بلاَوبوونەتەوە.

٢٢. مودەسیر: ئیستەخری ئەم هۆزەی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ناو بردووە. مەقدەسی و کوری حوقل پشتڕاستیان کردۆتوە.

٢٣. مێرداس: سەر بەعەشیرە کوردەکانی ڕۆژئاوان. سێ تیرەن: پالو، چەرموك، ئەکیل (بەلَدوقانی).

٢٤. مەریوانی: نزیکەی هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەناوچەی مەریوان یانی لەکەنار دەریاچەی زرێبار و ناوچەکانی نیشتەجێن. ئەم عەشیرە سەر بەعەشیرەی گەورەی کرمانجن. بەهۆی نزیکیان لەهەورامان، شێوەزارەکەیان تا رادەیەك گۆڕانی بەسەر هاتووە. پێشتر سەر بەپارێزگای کەرکوك بوون. بەلاَم دواتر پەیوەستی حکومەتی ئەردەلاَن بوون.

٢٥. مەزدابەکان: مەسعودی لەمروج الذهب ئاماژەی پێدوان. شوێنی ئەوانی بەچیاکان دەستنیشان کردووە، واتە چیای کوردان.

٢٦. مەزوری یا مەسوری یا مەیسوری: نزیکەی هەزار و حەوتسەد بنەماڵەن. لەدهۆك و پارێزگای موسڵ نیشتەجێن.

٢٧. مستەفابەگی: نزیکەی سی بنەماڵەن. لەزەلاَن و چەمەنزار نیشتەجێن. سەر بەهۆزی قوبادین.

٢٨. موتەلیبی: ئیستەخری ئەم هۆزەی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ناو بردووە.

٢٩. موکری یا موکریان: ئەم هۆزە سێ تیرەن: مەنگوڕ، مامش، پشدەر. لەپاشماوەکانی دەستەی مادن. لەناوچەکانی موکریان و سابلاَخ نیشتەجێن. زمانیان لەزمانی ئاڤێستا نزیکە.

٣٠. موکری گۆڕك: بیست و چوار گوندن. لەناوچەکانی موکری و سابلاَخ دەژین.

٣١. موکری و بولاق: دوو عەشیرەن. لەدووسەد و نەوەد و حەوت گوند نیشتەجێن.

٣٢. مەلاشیگۆ: ئەم هۆزە لەعەشیرە کوردەکانی ڕۆژئاوان.

٣٣. مەلەکانیان: سەر بەعەشیرە کوردەکانی ڕۆژئاوان. بەفەرمانڕەواکانی حەسن کێف ناویان دەبەن.

٣٤. مەلەکشاهی: سەر بەتایەفەکانی پشتکوهن. نزیکەی شانزە تیرەن. تایەفەی کەچی، بوڵی و خەزەڵ سەر بەم عەشیرەن.

٣٥. مەندەمی: نزیکەی هەزار و دووسەد بنەماڵەن. لەشارەزوور و زەهاو و ناوچەکانی حسێن ئاوای سنە نیشتەجێن. دەستەیەکیان لەبازان و سەرخاری سەر بەناوچەکانی سلێمانی دەژین. ئەم هۆزە پێنج تیرەن: محەممەد موورادی (لەشارەزوور و زەهاو)، تاری موورادی (لەقرخلەر و کانی درێژ)، ئاخە سوری (لەگەرمەسێری کوردستان= سنە)، عەلی مورادی، لولەرزی (لەناوچەکانی حسێن ئاوا).

٣٦. مەنگوڕ: نزیکەی هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی سابلاخ دەژین. سەد و چل و هەشت گوندیان هەیە.

٣٧. مەنوچێهری: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەزەهاو و چەمچەماڵ و جوانڕۆ نیشتەجێن. سەر بەتایەفەی قوبادین.

٣٨. مودانلی: هۆزێکن کە لەمازەندەران نیشتەجێن.

٣٩. مودەکی یا موتەکی یا موتەگیان: حەوت تیرەن: سێ تیرەی ئەوان مودەکی ڕەسەنن: زێدان، ئەریکلی، پیرموسا. چوار تیرەیان زازان بەڵام ئێستا لەناو مودەکییەکاندان. بوبانلی، روچابە، کوسون، کیبوران. ئەمانە هەموو لەچیای مودەکی لەپشت بەدلیس نیشتەجێن.

٤٠. موستاکان: مەسعودی لەمروج الذهب ئاماژەی پێدوان. دەڵێت لەچیاکان دەژین.

٤١. موسا یا موسیان: لەعەشیرە کوردەکانی ڕۆژئاوان. شوێنی ئەوان دیاریکراو نییە.

٤٢. موسیوەند: نزیکەی دوو هەزار و پێنسەد بنەماڵەن. لەکۆتاییەکانی خاوە دەژین.

٤٣. موشەك: هۆزێکن لەنێوان سەعرەد و دیاربەکر لەکەنار دیجلە، نیشتەجێن.

٤٤. کۆچکەرانی خوراسان: حەوت عەشیرەن کەشا عەباس ئەوانی بۆ خوراسان کۆچ پێکردووە: زافرانلو، ئادامانلو، کەیوانلو، عەمارلو، شادللو، پچناوەند، باوەنور کەهەموویان سەر بەتایەفەی گەورەی حەسنانلون. دەستەیەك عەشیرەی یەکەم و چوارەم بە زەعفەرانلو و عومەرلو ناو دەبەن.

٤٥. مەهراکی: ئیستەخری ئەم عەشیرەی لەریزی عەشیرە کوردەکانی فارس ناو بردووە.

٤٦. مەهرانی: ئەم هۆزە لە (الفتح القسی، فی الفتح القسی ۳۰۲.) ئاماژەی پێدراوە کەهاوڕێیەتی سەلاح ئەلدینی ئەیوبییان کردووە. شوێنی ئەوان دیاریکراو نییە.

٤٧. میر: نزیکەی پەنجا بنەماڵەن لەخاکی ئەلشەتر، سەر بەتایەفەکانی پشتکوهن. ئەم دەستەیە جیاوازن لەتایەفەی میری بابان.

٤٨. میران: نزیکەی هەشت هەزار بنەماڵەی کۆچەرین. زستان لەناوچەکانی جەزیرەی عومەر و هاوینان لەدەوروبەری سەعرەدن.

٤٩. میر سەنان: سەر بەعەشیرەکانی کوردی ڕۆژئاوان (بەین ئەلنەهرەین)

٥٠. مەیلان: هۆزێکن لەناوچەکانی ئازەربایەجان لەنێوان ئاراس و چیای سۆکاری ماکۆ.

٥١. میللی: نزیکەی بیست هەزار بنەماڵەن. لەناوچەی دێرسیم و قەراجە داغ و عوسمانجەچ. چل و چوار تیرەن بەم پێیە: دانان، سەیدان، کیران، دودیکانلی، خەلەجان، کەلیش، مەندان، گۆمەڕەش، شەرکیان، عەلکەوات، داشی، مشکانلی، کاڵندەلان، حاجی بایرام، حەسنەکان، خەلەجاری، عولیا، ئیسیادات، تورکان، ناسریان، چوان، سارتان، نوسباخان، ماتەمییە، چەمیکان، حەسولیە، بارگەوان، چەپارەش، زەبروفەکان، بوجاق، تاغباشی، هوشیان، بەسکی، جاجیمانلی، کاسیایی، چەقایی، مەردیس، عەتەرکیش، جان بەگ، بەگلیان، دەرەجان،، کائو، مولیکان، قەرەکیج. ئەم تیرەی ئەخیر لەبنەمادا تورك بوون بەلام بەتێپەڕینی کات بوونە کورد و لەناو کوردان تواونەوە.

تێبینی: بەشێکی زۆر لەکوردان لەناو نەتەوەکانی دیکەدا تواونەتەوە و چەندین نەتەوەی دیکە لەناو کوردا تواونەتەوە. بەم پێیە بەشێکی زۆری کوردانی ئەمڕۆ ناتوانین وەك کوردی ڕەسەن لەقەڵەم بدەین.

ن -:

١. ناشاویرا: هۆزێکن لەنزیك مەرعەش. ئیستەخری لەلاپەڕەی ١١٥ ئاماژەی پێدوان.

٢. ناسرلی: نزیکەی شەشسەد بنەماڵەن لەباشوری ئانکارا نزیك قەرەعەلی نیشتەجێن.

٣. نامی وەند: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەرەحیم ئاوای ماهیدەشت و زەهاو نیشتەجێن.

٤. نانەکەلی: نزیکەی سەد و پەنجا بنەماڵەن. لەدەینەوەر و ناوچەکانی بیلوار نیشتەجێن. عەلیوللەهین.

٥. ئەدرەلی: هۆزێکن کە لەڕۆژئاوای مەرعەش نیشتەجێن.

٦. ئەدری: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەمێرگەسار و ئەودالآن و جوانڕۆ و ناوچەکانی سنە و ماهیدەشت و دەوروبەری کرماشان نیشتەجێن. شێمانە دەکرێت پاشماوەی ئاریییەکان بن کەوشەکە بۆ ئەدری گۆڕابێت.

٧. ئەری: هۆزێکن لەناوچەکانی شەمزینان. لەبەڵگە و شوێنەوارەکان دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەئەم تایەفەیش لەپاشماوەکانی عەشیرەی ئایری بێت کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

٨. ئەوراڵی: (نورعەلی): نزیکەی هەزار بنەماڵەن. لەباکوری تورهان و خاوە نیشتەجێن.

٩. ئەورۆلی: تیرەیەکی سەر بەعەشیرەی جافن. لەخاکی شارەزوور نیشتەجێن.

١٠. ئێرکارین: شوێنی ئەم عەشیرە لەئەنسیکلۆپیدیا، لەنێوان کەرکوك و تاوق ئامازەی پێدراوە.

١١. ئەیرێژی: لەناوچەکانی کرماشان دەژین. سەر بەعەشیرەی گۆران.

و -:

١. وان یا وانیان: هۆزێکن کە لەوان نیشتەجێن.

٢. وەرمەزیار: شێمانە دەکرێت تیرەیەك بن سەر بەعەشیرەی گوڵباغی. بەڵام وەرمەزیارییەکان خۆیان بەجیاواز لەوان دەزانن. ئەوان دوو لقن: وەرمەزیاری زەرپینە، وەرمەزیاری مەڕەدەڕ. هەردووك لەناوچەکانی دیواندەرە نیشتەجێن.

٣. وەلەدبەگی: نزیکەی سەد بنەماڵەن. لەناوچەکانی جوانڕۆ و زەهاو نیشتەجێن و بەئازایەتی بەناوبانگن. تیرەیەکی سەر بەعەشیرەی جافی جوانڕۆن.

٤. وەلیانی یا وەلیانلی: هۆزێکی کۆچەرین لەنزیك مەرعەش.

هـ -:

١. هازبەنی: هۆزێکن لەناوچەکانی ئازەربایەجان. مەسعودی لەکتێبەکەی ئاماژەی پێداوە.

٢. هەرکەیی: نزیکەی بیست هەزار بنەماڵەن. لەڕەواندز و کەنارەکانی عەقەر و وان و ئەرزەرووم نیشتەجێن.

٣. هەفتیان: هەمان عەشیرەی شارین کە لەهەفتیان نیشتەجێن.

٤. هەکاری: هەمان عەشیرەی حەکارییە.

٥. هەلاج: نزیکەی نۆسەد بنەماڵەن. لەباشوری دەریاچەی وان نیشتەجێن. دەستەیەکیان

لەناوچەی سنە دەژین.

٦. هایلان: یا حەلیلان. هۆزێکن بەم ناوە و سەر بەتایەفەی پشتکوهن.

٧. هەمارلو: لەئەمبارلودا ئاماژەی پێدرا.

٨. هەماوەنـدی: هـۆزێکن لـەباکوری ڕۆژئـاوای خانـەقین نیـشتەجێن. ئـەم هـۆزە لـەناو شەرەفنامە و لەجوگرافیای سیاسی ئێران، بەمشێوەیە نووسراوە. شێمانە دەکرێت مەبەست هەمەوەندییەکان بێت.

٩. هەمەوەند یا حەمەوەند کە بەئەحمەدوەندیش ناویان دەبەن. هۆزێکی گەورە و بوێرن. لەناوچـەکانی بازیـان و پارێزگـای سـلێمانی و خانـەقین و باشـوری ڕووبـاری گـیلان و چەمـچەماڵ و ناوچـەکانی کرماشـان دەژیـن. بەشـێکیان لەشـیراز بەسـەر دەبـەن و بەهەمەوەندەکانی شیراز بەناوبانگن. هەموویان نۆ تیرەن کەبریتین لە: چەلەبی، چەنگەنی، پیرپایی، کافرۆشی، ڕەشەوەند، ڕەمەوەند، صفرەوەند، سۆفیەوەند و سینەبەسەر.

١٠. هەورامی: هەمان هۆزی هەورامییە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

ی -:

١. یەزیدی یا یەزدی: هۆزێکن لەباکوری وان و سنجار و جەزیرەی کوڕی عومەر نیشتەجێن. بەیەزدانپەرەستیش ناویـان دەبـەن. یـەزدان کـۆی یـەزدە و بـەمانای خواوەنـد دێـت. بەهەڵـە یەزیدییـەکانی دێـری سـەملی و سـنجار بەیەزیـدی نـاو دەبـەن چـوونکە بـەپێی بەڵگەنامـە و شوێنەوارەکان ئەوان نەك پێش یەزید بەڵکو پێش ئیسلامیش بەناوی یەزیدی لەم ناوچەیەدا بوونیـان بـووە. ئـەم یەزیدییانـە جگـە لـەوەی بـەزاراوەی کـوردی قـسە دەکـەن، بـەکوردیش پاڕانەوە و پەرەستنی خۆیان ئەنجام دەدەن. تەنانەت باوەڕیان وایە خواوەند بەکوردی قسە دەکات.[1]

سێرمارك سایکسیش ئاماژەی بەم دەستەیە داوە. (دوای میرات هـەڵگرانی خەلیفە، لاپەڕەی ٥٣٣-٥٨٨)

٢: یـەعقوبی: ئـەم هـۆزە لەناوچـەی موسڵ و چیای جودی نیـشتەجێن. شـێمانە دەکرێـت لەپاشماوەی گوتییەکان بن. مەسعودی لەمروج الذهب ئاماژەی پێداون.

٣: یوسوووەند یا یوسف وەند کەنزیکەی پێنسەد بنەماڵەن. لەئەلشەتر نیشتەجێن و سەر بەچوار عەشیرەکەی پشتکوهن.

[1] – ئیزەدییەکان: زەردەشتییە کوردەکانن و دوو کتێبی پیرۆزیان هەیە بەناوی جەلوە و مەسحەفڕەش هەیە.

٤. یوسویارئەحمەدی: یا یوسف یار ئەحمەدی: ئەم هۆزە لەناوچەکانی کرماشان دەژین.
بەپێی لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵەی گەلان، تایەفەکانی سارلی، باجوران و شاباکیش کوردن (لاپەڕەی ٦٠).
لەئەفغانستان، بەلوچستان، سیستان، سیندی هیند، بەغداد، دیالە، کوت، قەزەل ڕەبات، شەهرەبان، سوریە، شامات، فەلەستین و ئاسیای بچوکیش، ژمارەیەکی زۆر لەکوردان دەژین.

## تێبینی:

ئەگەر بمانەوێت بارودۆخ و مێژووی کوردان بەتەواوی بنووسین، کتێبەکەمان سنووری کورت نووسین دەبەزێنێت. تا ئەم رادەیە دەنووسین کەکوردان، لەپێشکەوتن و گەشە کردنی ئێران و بنەماکانی ئیسلام، یەکێك لەهێزە سەرەکییەکان بوون بەتایبەت زانا و میرە کوردەکان لەبلاو کردنەوەی زانستی ئایینی و ئیسلامییەکان و فراوان کردنی هێز و کاریگەری دەوڵەتی ئێران، دەورێکی سەرنجڕاکێشیان هەیە.
لەسەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتی عەباسی، کوردان بۆ پێشکەوتنی ئیسلام، یەکێك لەهێزە کاریگەرەکان لەعێراق و ئێران بوون. سەرکردەی گەورە و دامەزرێنەری دەوڵەتی عەباسی، ئەبوموسلیمی خوراسانی، یەکێك لەپیاوە کوردە بەناوبانگەکانی کورد لەخوراسان بووە و لەمەرو، لەناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچی دەرکەوتووە بەلاّم مەنسور ئەبو جەعفەر فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.
ئەبو دولامە کۆیلەی حەبەشی مەنسور، لەکاتی کوشتنی ئەو وتوویەتی:

ابا مجرم ما غیر الله نعمتا
علی عبده حتی یغیرها العبد
أفی دوله المنصورها و حلت غدرتا
الا ان اهل الغدر آباءك الكرد
أبا مجرم خوفتنی القتل فانتحی
علیك بما خوفتنی الاسد الورد.

دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی، بارودۆخی ئێرانی بەتەواوی گۆڕی و ئێرانی لەخنکان و رووخان ڕزگار کرد و مەزنی و شکۆی کۆنی بۆ ئێرانییەکان گەڕاندەوە و لەکەنار زێی گەورە، تۆڵەی شکستەکانی قادسییە و نەهاوەند وەرگیرایەوە.
ویلیام مویری ئینگلیسی و دوزی، مێژووی نووسی ناودار دەنووسێت: لەسەردەمی

خەلیفەکانی عەباسی، ئێران دووبارە شکۆ و مەزنی لەدەستچووی خۆی بەدەست هێنایەوە و پێگە بەرزەکانی دەرباریيان گرتەدەست. جەژنی نەورۆز دووبارە لەم سەردەمەدا بووژایەوە.

کوردان، لەهەموو زانستە ڕەسمی و بیرکاری و زانستەکانی دیکە وەك سەرف و نحو، زمان، مێژوو، حکمەت، کەلام، مەنتیق، تەفسیر، حەدیس، فقە، اصول، حساب، ئەندازیاری، ئەستێرەناسی، وهتد چەندین نووسراوی گرانبایيان هەیە کە لەناو قوتابخانە ئیسلامییەکاندا دەخوێندرێن.

جیاواز لەوە مێژوو نیشان دەدات بەردەوام تاج و تەختی زۆربەی پاشاکانی ئێران، بەهۆی گورز و شمشێری کوردەوە پارێزگاری لێکراوە و کەسانی وەك گیو و گودەرز و گورگین و بەهرامی چوبین و فەرهاد و شیرین، ڕکەبەری خوسرەوپەرویز، حسەین کورد و هتد کەسەردارە بەناوبانگەکانی کورد بوون، بوونە هۆی مەزنی و شکۆ و پێشکەوتنی سوڵتانە کورد و پارسەکان.

چالاکی بەهێزانەی ئەحمەد کوڕی مەروانی کورد (=نصرئەلدەولە) دامەزرێنەری میرنشینی کوردی مەروانییە و سەرکەوتنە بەرچاوەکانی سەلاحەدینی ئەیوبی، دامەزرێنەری دەوڵەتی کوردی ئەیووبی و بوێرییەکانی وەکیل ئەلرعایا (کەریم خانی زەند)، دامەزرێنەری دەوڵەتی کوردی زەندییە و کردەوەکانی کوردە ئەخشیدییەکان لەشام و بوێرییەکانی بنەماڵەی خۆرشید لەلوڕستانی بچوك و داستانی دەیلەمییەکان لەشیراز و بەغداد کەلاپەڕەکانی مێژوو تۆماری کردوون، ڕێگەمان پێدەدات بڵێین کوردان لەپەرەپێدانی بنەماکانی ئیسلام و زانستە ئیسلامییەکان و گەڕاندنەوەی شکۆ و مەزنی بۆ ئێران، دەورێکی کاریگەر و بەهێزیان بووە. ئەگەر سەردانی ناوچە کوردییەکان بکرێت، دەبینرێت سەرانسەری ناوچەکانی کوردستان، لێوانلێوە لەقەڵا و حەسار و سەنگەر و بورج و دیوارە جەنگییەکان کە لەسەر لووتکەی چیاکان بۆ بەرگری کردن لەبەرابەر دوژمنان دروست کراون و شوێنەوارەکەیان تا ئێستا ماوەتەوە. قەڵای کەرەفتو نمونەیەکی بەرچاوە.

# بەشی سێیەم
# سەبارەت بەماد و سەرزەمینی ماد،
# لەخۆگری سێ بەند

## بەندی یەکەم: پەیوەندی نێوان کورد و ماد

دەمانەوێت بزانین وشەی کورد و وشەی ماد چ پەیوەندییەکیان هەیە. ئایا ئەم پەیوەندییە لەنێوان ئەم دوو وشەدا هاومانابییە، واتە کورد و ماد، یەك مانایان هەیە و بەیەك دەستە دەوترێن یانی هەر کات بڵێین کورد یانی ماد و هەرکات بڵێین ماد یانی کورد؟ بەهەمان شێوە کەدەستەیەك ئەم بۆچوونەیان هەیە؟ یا ئەوەی لەنێوان ئەم دوو وشەیە تایبەتی و گشتی هەیە: ماد گشتیترە لەکورد یا کورد گشتیترە لەماد. لەبەر ئەمە پێویستە سەرەتا نەژادی کورد روونبکەینەوە. دواتر پەیوەندی لەگەڵ ماد باس دەکەین.

کوردان، وەك لەبەندی یەکەمی بەشی دووەم روونمان کردەوە، بەشێکن لەنەژادی ئاری (=هیندوئەوروپایی)، لەبەر چەند هۆکارێك: یەکەم: رواڵەت و روخسار، دووەم: زار و شێوەزار، سێیەم: ئەخلاق و داب و نەریت، چوارەم: ناو و نیشان یانی ناوی کەسەکە و ناوی سیانی.

کوردان لەکۆنەوە، کوڕ و کچەکانی خۆیان بەناوی ئاری ناوناوە و ناو دەنێن. لەئێستایشدا لەگەڵ ئەوەی ئارەزوویەکی زێدەرۆیانەیان بۆ ناوی ئیسلامی (=عەرەبی) هەیە، بەلأم ناو ئارییەکان بەباشتر دەزانن، وەك: فەرهاد، گودەرز، فەرڕۆخ، شاپور، هوشەنگ، جەمشید، فەرەیدون، بەهمەن، پەرویز، بەهرام، سام، ئەردەشێر، فیروز، کەیخوسرەو، شەهریار، شاهیار و هتد.

ناوی کچانیش وەك: شیرین، نوشافەرین، ماەرۆخسار، ماهچێهر، گوڵ چێهرە، ئازەر، ماهتابان، مێهرەئەنگێز، فەرەنگیس، نازەنین، خۆرشید، ئافتاب، ناهید، گوڵناز و هتد.

ناوی دووەم یا سیانی وەك: زازا، کرماج، لۆلۆ، بابان، گۆران، کەڵهوڕ، بەراز، کویك، کۆماسی، تەرخانی، گوڵ فەرڕۆخی، قوبادی، گودەرزی، مەنوچێهری، کاکەوەند، بیرانوەند،

ئازاد بەخت و هتد...

ئایین و مەزهەب: کوردان وەك ئارياييەکان بەگشتی، ئار پەرەست (ئاگرپەرەست) و شوێنکەوتەی ئایینی زەردەشتی بوون کەئایینی ڕەسمی زۆربەی نەتەوە و تایەفە ئارییەکان بووە. پێشتر باسمان کرد کەسامییەکان خواپەرەست و حامییەکان بتپەرەست و یافسییەکان ئاگرپەرەست بوون. تا ئێستایش شوێنەواری ئاتەشکەدە و نیشانەکانی ئاگرپەرەستی لەسەرزەمینی کوردان ماوەتەوە.

چۆنیەتی نشینگە و ماڵ و تەلارەکان: لەتەواوی کوردستان، ژووری دانیشتن لەئەندازیاری کۆندا، یانی ئەو ژوورەی شەوانە لەویٚ دەخەوتن، بەرەو ڕۆژهەڵات بووە لەبەر ئەوەی کاتی هەڵاتنی هەتاو، بیٚ هیچ لەمپەرێك تیشکی هەتاویان بەرکەوێت و ریٚ و ڕەسمی پەرەستینی خۆیان ئەنجام بدەن.

هیرۆدۆتی مێژوونووس، بەڕاشکاوی وشەی ئێرانی بۆ هەموو سەرزەمینەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لەنێوان سند و دەشتی دیجلە و فورات ناو بردووە بەڵام کوردەکانی لەدەرەوەی سنوورەکانی ئێران و بەئاريايى نەزانيوە.

پێستەیەکی دۆزراو لەسلێمانی (ئاماژەمان پێدا) ئاری بوون و ئاگرپەرەستی کوردان روون دەکاتەوە: هەروەها پێمان دەڵێت کەکوردان لەعەرەبەکان بێزارو وەڕز بوون.

بەڵگەنەمەکان و شوێنەوارەکانی زانستی ئاسار و ئەنتۆگرافی، ئاری بوونی کوردان پشتڕاست دەکاتەوە.

لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان و کەسانێتر وسەرئەنجام بەڵگە زانستییەکان و یاساکانی زانستی (ئەنترۆپۆلۆچی و ئەسنۆلۆژی - خەڵك ناسی و نەژادناسی) ئەوەمان بۆ دەردەخات کەکوردان ئاری بوون و ئاگرپەرەست و ئاگر و هەتاویان پەرەستیوە.

لەمێژووەکاندا ئاماژەی پێدراوە: لەکاتی هاتنی سوپای ئەسکەندەر کوڕی فەیلەقوسی ڕۆمی بۆ ناوچەی شارەزوور _ نزیکەی سیٚ سەدە و نیو پ.ز_ کەخەڵکیان بۆ ئایینی بتپەرەستی هاندەدا، ڕۆژئاوای کوردستانی ئەردەڵان کە لەدوو لاوە پەیوەستە بەخاکی شارەزوور، بەفەرمانی سوپای ئەسکەندەر، دەستیان بەپەرەستینی بتەکان کردووە بەڵام دانیشتووانی ڕۆژهەڵات و باکوری کوردستانی ئەردەڵان، لەسەر ئایینی ئاگرپەرەستی و زەردەشتی خۆیان ماونەتەوە و هیچ گۆرانێك لەئایینی ئەواندا دروست نەبووە. بەڵام باشور بۆ ماوەیەك بتیان

پەرەستیوە. دواتر لەکۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی پێش زایین، باوەڕیان بەئایینی مەسیحی هێناوە. (بۆ زانیاری زیاتر- مێژووی کەنیسەی کۆن لاپەڕەی ۳۰۰).

دواتر زۆری نەخایاندووە بەهەوڵ و ماندووبوونی سوپاسالاری ئێران بەناوی (پاو)، دووبارە باوەڕیان بەئایینی ئاگرپەرەستی هێناوە. ڕوونکردنەوەی زیاتر ئەوەی کە لەڕۆژگاری خەلیفەی دووەم (عومەر کوڕی خەتاب) کاتێك عێراق دەستی بەسەردا گیرا و شوێنی مانەوە بۆ پاشای ئێران (یەزدگێرد) نەمایەوە، سوپاسالارەکەی خۆی بەناوی پاو کوڕی شاپور کوڕی کەیوس برای ئەنەوشیروانی دادپەروەر کوڕی قوبادی پاشای ئێران لەگەڵ دوو هەزار سوار و بڕێك کەرەستەی پێویست و خواردن ڕەوانەی شارەزوور دەکات تا کوردانی ئەو ناوچەیە بۆ هاوکاری کردنی پاشای ئێران هان بدات. کوردان بەهاوکاری کردنی پاشا ڕازی دەبەن و بۆ بەرێکەوتن خۆیان ئامادە دەکەن کە لەناکاو هەواڵی گرنگیدانی یەزدگێرد بەخوراسان بلاو دەبێتەوە. پاو لەبیستنی ئەم هەواڵە خەمبار و بێ هیوا دەبێت و بەناچاری نامەیەك بۆ کوردانی شارەزوور دەنووسێت:

کورتەی نامەکەی پاو:

لەبەر ئەوەی پاشای ئێران بەپشتگەرمی هاوڕێیەتی خاقانی چین و نۆکەری سنوورداری خوراسان (ماهوی سوری) بەرەو ڕۆژهەلات بەرێکەوتووە، ئێوە لەشوێنەکانی خۆتان بمێننەوە تا ئەو کاتەی پاشای ئێران لەو دیارە دەگەڕێنەوە. ئەوسا ئێوە لەفەرمانی پاشا ئاگادار دەکەمەوە. (پاو شەهرزاد)

لەبەر ئەوەی زێدەڕۆییمان نەکردبێت، کورتەیەکی نامەکەمان نووسی. دوای ناردنی نامەکە، پاو لەکەنارەکانی سیروان، مەنزڵگەیەك پاشەکشێ دەکات و لەکەنار ئاوەدانییەکی گەورە لەنێوان دارستان بەقەد پاڵی چیاکەوە، خێوەت هەڵدەدات.

دانیشتووانی ئەو گوندە نەریتی ڕێزگرتن لەمیوان بەجێدێنن. پاو لەم دەرفەتە کەڵك وەردەگرێت و ئەوان بۆ بەستنی پەیمان لەگەڵ پاشای ئێران و پەشیمان بوونەوە لەئایینی مەسیحی و گەڕانەوە بۆ سەر دینی زەردەشتی هان دەدات و ئاتەشکەدەیەکیان بۆ دروست دەکات. هەروەها لەسەر بەرزایی چیاکە پەرسگایەکیش بنیات دەنێت و تا ئێستایش ئەو چیا، بەئاتەشگا بەناوبانگە. ئەو گوندەیان لەبەر پاو، بەپاوە ناو بردووە. عەرەبەکان دەڵێن فاوج.

پاو دوای دوو مانگ وەستان لەپاوە، لەڕێگەی هەمەدانەوە بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت و لەهەموو ناوچەکان خەڵك بۆ هاندانی پاشای ئێران و سەقامگیر کردن و بڵاو کردنەوەی ئاینی زەردەشتی و دژێو کردنی ئەخلاق و ڕێسا عەرەبییەکان هان دەدات و سەرئەنجام لەئیسفەهان دەگاتە لای یەزدگێرد و ڕێگەی ڕۆشتن بۆ خوراسانی لێ دەگرێت بەپێی ئەو کێشانەی لەنێوان پاو و ماهوی سووری بووە، یەزدگێرد، گرنگی زۆر بەوتەکانی نادات.

زۆری پێناچێت هەواڵی هێز و دەسەلاتی ئیسلام بەخوزستان و کوردستان و عێراقی عەجەم دەگات. یەزدگێرد توانای مانەوە لەئیسفەهانی نامێنێت و بەرەو خوراسان بەڕێدەکەوێت.

پاو سەرپێچی فەرمانی پاشا دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ زادگای سەرەکی خۆی لەمازەندەران و لەوێ دروشمی هیربودی بەرز دەکاتەوە. بەو شێوەی لەمێژووی ئێران و شانامە ئامارەی پێدراوە، یەزدگێرد لەخوراسان دەکوژرێت و ولآتی ئێران بێ پاشا و سەرپەرەست دەمێنێتەوە. لەساڵی١٨ کۆچی بەفەرمانی خەلیفەی دووەم و لەژێر سەرکردایەتی ئیمام حەسەن و عەبدوالله کوری عومەر و باوکی عوبەیدەی ئەنساری و چەند کەسێکی دیکە لەسەردارانی ئیسلام، سوپای عەرەب بەرەو ئێران بەڕێدەکەوێت. لەعێراقی عەرەب گوزەر دەکەن، لەناوچەی کرماشان، ئیمام حەسەن و حوزەیفەی یەمانی و قیسەم کوری عەباس کوری عەبدولموتەلیب لەگەڵ سوپایەکی چەند هەزار کەسی پێکهاتوو لەسوار و پیادە، بۆ گرتنی هەمەدان، ڕەی و مازەندەران، هەوڵەکانیان دەست پێدەکەن.

عەبدوللە کوری عومەر و باوکی عوبەیدەی ئەنساریش لەگەڵ پێنج هەزار سوار، بەرەو شارەزوور بەڕێدەکەون. شەوانە لەڕووباری سیروان دەپەڕنەوە و بەرەبەیان لەبەرابەر سوپای کوردان کە بۆ بەرگری کردن ریزیان بەستووە، ریز دەبەستن. لەهێرشی یەکەم باوکی عوبەیدەی ئەنساری دەکوژرێت. لەهێرشی دووەم و سێیەم _ جەنگەکە سێ ڕۆژ درێژەی کێشاوە_ سوپای ئیسلام سەرکەوتن بەدەست دێنێت و دەشتەکە بەخوێنی کوردەکان ڕەنگین دەکەن و گوندەکان وێران و ئاتەشکەدەکان دەرووخێنن. ژنان و کچان ئەسیر و تالآنییەکان کۆدەکەنەوە و دەیبەن. پاشماوەی دانیشتووان بەباوەڕ هێنان بەئیسلام ڕزگاریان دەبێت.

گۆڕی باوکی عوبەیدە، لەداوێنی چیایەك لەکەنار دەشتی شارەزوورە وهەنووکە بە ناوچەی ئەباعوبەیدە بەناوبانگە.

عەبدوللە کوڕی عومەر چەند مانگێك لەو ناوچەیە دەمێنێتەوە، لەجیاتی ئاتەشکەدەکان، مزگەوت و پەرەستگا ئیسلامییەکان دروست دەکات و یاسا و ڕێساکانی ئیسلام لەو ناوچەیە بڵاو دەکاتەوە، دواتر ڕێگەی پاوە دەگرێتە بەر. لەوێ کوشتاری بەکۆمەڵی کوردان دەست پێدەکات، ژن و کچەکان ئەسیر و تالانییەکان بەسەربازەکانی ئیسلام دەبڕێت.
عەبدوللە کوڕی عومەر، سوپاسالاری ئیسلام، لەو ناوچەیە مزگەوتێکی گەورە دروست دەکات و یەکێك لەکوڕەکانی مەعاز کوڕی جەبەل لەگەڵ دەستەیەك لەعەرەبەکان لەو ناوچەیە بەجێدێڵێت. مەعازی کوڕی جەبەل و عەرەبەکانی هاوڕێی دەست بەسەر ژن و کچی کوردە کوژراوەکاندا دەگرن و دەیانکەنە هاوسەر و کەنیزی خۆیان و چەندین منالیان لەوان دەبێت. لەئێستادا دانیشتووانی پاوە و گوندەکانی دەوروبەری، ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ مەعاز کوڕی جەبەل و عەرەبەکانی هاوڕێی دەگەڕێننەوە.
عەبدوللە کوڕی عومەر، لەماوەیەکی کەم، دەست بەسەر کوردستاندا دەگرێت. هەموو ئاتەشکەدەکان وێران و مزگەوتەکان بنیات دەنێت و یاسا و ڕێساکانی ئیسلام بڵاو دەکاتەوە.
هەرچەندە کوردان لەڕێگەی گۆڕینی دینەکەیان، گرفتاری چەندین جەنگی وەحشیانە و ماڵوێرانکەر بوون، بەڵام بەهۆی ئەو حەز و مەیلە زۆرەی بۆ دینی سەرەکی خۆیان بوویانە، لەناخەوە خۆشەویستی خۆیان بۆ دینەکەیان پاراستووە.
شەڕەکانی سەردەمی خەلیفەکانی عەباسی، شەڕی مەزهەبی بوون. ئەو شەڕە خوێناوییانەی لەساڵی ٣٠٧ و ٣٢٤ کۆچی لەباکوری کوردستان روویاندا، جەنگی مەزهەبی و بۆ پاراستنی مەزهەب بوو.
دانیشتووانی هەورامان هەرچەند بەڕواڵەت باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو و نوێژیان دەخوێند و ڕۆژوویان دەگرت، بەڵام تا ساڵی ٨٢٤ کۆچی، باوەڕدار بەئایینی زەردەشتی بوون تەنانەت کاتێك مەولانا گوشایش، گەورە باوەگەورێی شێخەکانی مەردۆخ، دەستی بەفێر کردنی قورئان و بڵاو کردنەوەی ڕێسا و یاسا ئیسلامییەکان لەهەورامان کردووە، لەگەڵ تێپەڕینی هەشت سەدە و نیو لەدەسەڵاتی ئیسلام، نەیانویستووە بەئیسلام ڕازی بىن و لەمۆجیارییەکانی پیری شەهریار لابدەن کەیەکێك لەگەورەترینی مۆغەکان و هیربودانی بووە. ئێستایش بۆتە پەند کەدانیشتووانی هەورامان لەریشسپییەکان و زاناکانی خۆیان پرسیوە

کە: (قەرونی قەدیما یام مارفەتو پیرشالیاری) واتا (قورئان قەدیمە یا مەعریفەی پیری شەهریار).

ریشسپی و زاناکان لەوەلامدا وتوویانە: (مارفەتو پیر شالیاری قەدیما، قەرونی هیزیگە گشایشە کوری ئاوەردەنش) واتا (مەعریفەی پیری شالیار کۆنە، گوشایشە کوێر دوێنێکە قورئانی هێناوە)).

مەولانا گوشایش چاوی موژان یانی خێل بووە. لەبەر ئەمە لەهەورامان بەگوشایشە کوێر ناسراوە. فێرکاریی و پڕوپاگەندەی ئەو بۆ ئیسلام بۆتە هۆی ئەوەی خەڵك زیاتر ڕقیان لێی بێت.

مارفەتی پیری شالیار، بریتییە لەکتێبێکی چڕوپڕ و لەخۆگری چەندین بەند و لێوانلێو لەقسەی مانادار. لەکۆتایی هەر بەندێك شێعرێکی لەم شێوەیە دووبارە بۆتەوە.

(( گوشت چوانەی پیرشالیار بوو، هوشت چ کیاستەی زانای سیمیار بوو) واتە ( گوێت لەوتەکانی پیری شالیار و بیرت لای نێردراوی دانای ڕەمزبێژ بێت).[1]

دانیشتووانی ئەمڕۆی هەورامان، زانای ڕەمزبێژ بەحەزەرتی ڕەسولْ دەزانن لەکاتێکدا ئەو ڕەمزبێژ نەبووە و بەڕاشکاوی پەیامەکەی خۆی گەیاندووە. دانای ڕەمزبێژ هەمان زەردەشتی پێغەمبەرە کەناسراوە بەوەخشوری سیمیاری : یانی پێغەمبەری ڕەمزبێژ (بۆ زانیاری زیاتر، کتێبی دبستان المذاهب، ل، ١٠)

ئەم کتێبە لەهەورامان و بەپێی وەسیەتی خودی پیری شالیار نایدەنە دەست بێگانەکان. سەرانسەری کتێبەکە حیکمەت و مۆجیارییە و پێگە و گەورەیی پیری شالیار نیشان دەدات. لەیەکێك لەبەندەکان دەڵێت:

وەروەیوە واروو وەروە وەرینە

وەریسە بڕیو چوار سەرینە

کەرگی سیاوە و هێڵیش چەرمینە

گوشلی مەمیریو دوی بەرینە

واتاکەی: بەفر دەبارێت، بەفر خۆرەیە، تەناف کەدەپچڕێت، چوار سەری لێ دەبێتەوە،

[1] – ئەم کتێبە، وەرگێرانێکە لەگاتاکانی ئاشو، زەردەشتی کورد.

مریشك ڕەش و هێلکەکەی سپییە، دیگ (قازان) کەکون دەبێت، دوو دەرگای لێ دەبێتەوە کەمەبەستی بەرگری کردنە لەسوپای بێگانە و تۆکمە کردنی یەکێتی نیشتمانی و خۆڕاگری لەبەدبەختی و پاراستنی وڵات لەدەست بیانییەکان. لەبەندێکی دیکەدا دەڵێت:

داران گیاندارەن، جەر گودەل پرگەن
گایی پڕ بەرگەن، گایی بی بەرگەن
کەرگ چ هێڵین جە وەکەرگەن
ڕەواس چ ڕەواس و ڕەگی جەوەرگەن.

واتاکەی: دارەکان گیانیان هەیە، جەرگ و دڵیان، ڕەگ و ریشەیە، هەندێ کات گەڵایان هەیە و هەندێ کات نا، مریشك لەهێلکەیە و هێلکە لەمریشك، ڕێوی لەڕێوی و گورگ لەگورگ. مەبەستی ئەوەیە روەکەکان گیانیان هەیە و دەرکەوتنی نیشانەکانی ژیان لەوان کەگەڵای تازە دەردەکەن و روونکردنەوەی بەدوای یەکدا هاتنی نەژادەکان و دیاری کردن و نەگۆڕانی جۆرەکان کەهەر ئاژەڵە و ئاژەڵێکی وەك خۆی لێ دەکەوێتەوە.

دەردەکەوێت کە زانا ئاگرپەرستەکان، شوێنکەوتەی بۆچوون و باوەڕەی فەیلەسوفانی یۆنان بوون کەدەڵێن: مرۆڤ سەرەتای نییە و هیچ جۆر و ڕەگەزێکی دیکە نابێتە مرۆڤ (کتێبی دبستان المذاهب، ل ١٣)

پیری شالیار نووسەری کتێبە ئاماژە پێدراوەکە، وەك لەناوەکەی دەردەکەوێت، گومانی تێدا نییە ئاگر پەرەست بووە. باوەگەورێی پیری شەهریاری دووەمە کەموسوڵمان بووە.. پیری شەهریاری دووەم لەئەنجامی خەوێك کەبینیویەتی و حەزەرەتی ڕەسوڵ لەو خەوەدا ئەوی بەکوڕی خۆی ناو بردووە، ناوی خۆی بۆ مستەفا گۆڕیوە و خۆی وەك سەیید لەقەڵەم داوە!! لەئێستادا دانیشتووانی هەورامان بەسەیید مستەفا ناوی دەبەن. پیری شەهریاری دووەم هاوچەرخی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە و چەندین نامە و نووسراویان گۆڕیوەتەوە.

لەدەورووبەری ساڵی ٤٨٠ کۆچی، پیری شەهریاری دووەم، کتێبی مەعریفەتی گۆڕیوە و ئەو بەشانەی لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام یەکیان نەگرتۆتەوە، لەناو بردووە. لەئێستادا نوسخە چاککراوەکەی لای هەورامییەکانە.

مەولانا گوشاش، کوڕی بابا مەردۆخە. گەورە باوەگەورێی نوسەر (نووسەری ئەم کتێبە) کە لەساڵی٧٧٥ کۆچی رووی کردۆتە هەورامان.. لەساڵی ٧٧٨ کۆچی، کچی شێخ شەهاب

ئەلدینی دزئاوەری[1] وەك هاوسەر هەڵبژاردووە و لەوێ نیشتەجێ بووە. لەساڵی ٨٤٢ کۆچی، بەهاوکاری شێخ شەهاب ئەلدین سەرقاڵی بڵاو کردنەوەی یاسا و ڕێسا ئیسلامییەکان و فێرکردنی قورئان بووە بەڵام پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە و دوای مەرگی ئەو، مەولانا گوشایشی کوڕی، ئەرکەکانی ئەوی بەجێهێناوە.

لەم ڕوونکردنەوەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەکوردەکان ئاری و ئاری پەرەست بوون یانی لەگەڵ پارس و نەژادەکانی دیکەی ئاری، هاونەژادن و ئەم بابەتە بەهیچ شێوەیەك جێگەی گومان و دوودڵی نییە. تەنیا شتێك کەدەمێنێتەوە و ئێمە قسەی لەسەر دەکەین ئەوەیە بزانین سیلسیلەی کورد بەکوێ و لەکوێ کۆتایی دێت. ئایا کورد هاومانای مادە و هەمان دەستەی دوانزەیەم لەسیانزە دەستەکەی ئارییە، یا کورد بەشێکە لەماد یا بەپێچەوانەوە، ماد بەشێکە لەکورد.

لەزۆربەی مێژووەکان، وشەی کورد وەك مانای ماد لێکدراوەتەوە و هەر دوو وشەکە بەیەك دەستە دەوترێن. بەهەمان شێوە لەشیکردنەوەی کتێبەکانی عەهدی عەتیق و عەهدی نوێ، لەهەموو شوێنێك لەدوای وشەی مادا یا مەدی، وشەی کوردستان لەناو دوو قەوسدا نووسراوە کەمەبەست لێی وەرگێرانی وشەی مادا یا مەدییە. لەکتێبی عەشق و سەڵتەنەت کەرۆمانێکی مێژووییە، لەهەموو شوێنێك کورد و مادی بەیەك مانا ئامارژە پێداوە.

لەمێژووی کەنیسەی کۆن لەلاپەڕەی ٢٦٨، بەمشێوەیە ڕوونکردنەوەی بۆ پارت و عیلام و مەدی کردووە: پارتیا (=خوراسانی ئەمڕۆیی)، مەدی (=کوردستان)، عیلام (خوزستان)

ئەگەر ئەم ڕوونکردنەوەیە ڕاست بێت، کورد و ماد دوو وشەی جیاوازن، یانی کاتێك دەڵێن دەوڵەتی ماد، هیچ لەمپەرێك نابێت لەوەی بڵێین: یانی دەوڵەتی کورد و نەتەوەی ماد، یانی نەتەوەی کورد.

دەستەیەك لەمێژوونووسان و ڕۆژهەڵاتناسەکان، وەك پرۆفیسۆر سایس و نووسەری (آیینە سکندری و تاریخ منطقی) و هتد، مادیان وەك یەکێك لەعەشیرە کوردەکان ناو بردووە و نووسیویانە ماد یەکێکە لەتایەفە کوردەکان. وەك دەیلەمییەکان کەهاوشێوەی یەکێك لەتایەفە کوردەکان لەقەڵەم دراون (آیینە سکندری ل ٣١ و تاریخ منطقی ل، ١٥).

سەلمانازاری پاشای ئاشور، وشەی مادی بۆ دەستەیەك لەکوردەکان بەکار هێناوە نەك بۆ

[1] -- دزئاوەر گوندێکە لەسەر سنووری ئێران

هەموو تایەفەکانی ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوای کورد. (بۆ زانیاری زیاتر، کورتەیەکی مێژوویی سیٚ نەتەوەکە)

پێکهاتەی هۆزەکانی مادیش لەحەوت هۆز بەڵگەیە بۆ ئەوەی ماد، یەکێك لەتایەفەکانی کوردە کە لەحەوت تایەفە پێکدێت (بابەتی تایەفە سەرەکییەکانی کورد). بەلأم بۆچوونی مێژوونووسە کوردەکان ئەوەیە کەکورد بەشێك لەماد یانی دەستەی کورد بەشێك لەتایەفەی مادەکانە و دەڵێن: ڕەچەڵەکی کورد بەکردە یا کردۆ کۆتایی دێت. مێژوونووسانی یۆنانی و فەرەنگیش کورد و کاردۆ و دەستەیەك کاردۆك و کارداکیان نووسیوە.

مێژووی کۆنی هەورامان لاپەڕەی ١٦ باس لەوە دەکات کەکردە و دەیلام (دەیلەم)، گیل، خەزەر، نەبت، گرموك (=جەرموق، جەرامقە) هەموویان منالّەکانی مادا کوڕی یاپس کوڕی نوحن. لەتەوراتیش لەبەشی دەیەم و زۆربەی مێژ وە گشتییەکان ئاماژە بەوە دراوە کەمادا کوڕی یاپس کوڕی نوحە.

بەپێیە کوردان بەشێك لەنەوەی مادەکان. یانی ماد گشتیتر لەکوردە. دەوڵەتی کوردی کەیقوبادیش کە بەدەوڵەتی ماد ناو براوە لەبەر ئەوەیە کەزۆربەی تایەفەکانی ماد، یانی کورد، لوڕ، گیل، خەزەر و دەیلەم لەدامەزراندنی ئەو دەولّەتەدا بەشدار بوون و تەنیا تاییەت نەبووە بە دەستەی کوردان. بەلأم دەولّەتی گوتی، کاسی، لۆلۆ، میتانی، زەندییە، ئەخشیدی، حەسنەوییە، دەیلەمییەکان، لوڕی بچوك (بنەماڵەی خۆرشید) و ... بەدەولّەتی کورد ناو دەبەن. لەبەر ئەوەی دامەزرێنەری ئەوان تەنیا دەستەی کوردان بووە و لقە و تایەفەکانی دیکەی ماد لەدامەزراندنی بەشدارییان نەکردووە.

لەم ڕوونکردنەوەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوشەی ماد، گشتیتر لەوشەی کوردە و جیاواز لەکورد، بەدەیلەم، خەزەر، گیلەکان وهتد دەوترێت. بەلأم گومانی تێدا نییە بەشێك لەکوردەکان بەهەمان شێوە کەهیرۆدۆت ئاماژەی پێدەدات، خۆیان بەماد ناو بردووە و ئەم ناوەیان تاییەت کردووە بەخۆیان کە بریتین لەکوردانی ڕۆژهەلأت زەمین.

بەپێیە وشەی ماد لەڕاستیدا زۆر گەورەتر و گشتیتر لەوشەی کوردە و بۆ کوردان و نەتەوەکانی دیکەی جیاواز لەکورد (=منالّەکانی دیکەی مادا) بەکار دەبرێت بەلأم بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی دەستەیەك لەکوردەکان ئەم ناوەیان لەخۆیان ناوە، وشەی ماد زۆر بچوکتر لەوشەی کورد دەبێت بەهەمان شێوە کەبەشی ڕۆژهەلأت زەمین بەسەرزەمینی ماد یا ولأتی

ماد ناو دەبەن بەڵام بەشی زاگرۆس و ئارارات و ناوچەکانی دیکە بەکوردستان ناو دەبەن. کەواتە جیاوازی مێژوونووسان جیاوازی بۆچوون و لێکدانەوەکانە و بەپێی بۆچوونی یەکەم، ماد گەورەتر و گشتیتر لەکوردە و بەپێی بۆچوونی دووەم، کورد گەورەتر و گشتگیرترە بەڵام لەڕاستیدا ماد گەورەترە و بۆ هەموو نەتەوەکانی مادا بەکار دەبرێت.

لەکەتیبە بزمارییەکان و نووسراوە دۆزراوەکان لەناوچەکانی کوردستان، کوردەکانیان بەکودراها نووسیوە. ئیسترابۆن، جوگرافیازانی یۆنانی لەساڵی ٦٠ پ.ز نەخشەیەکی کێشاوە و لەو نەخشەدا ناوی کارداکی نووسیوە. دوای ئەوە بۆ ڕوونکردنەوەی وشەی کارداك دەنووسێت: دەستەیەك لەسەرەتاکانی مێژوو، لەچیاکانی سووریە نیشتەجێ بوون و بەگۆتۆ ناویان بردوون یانی پاڵەوان و بەهێز یا جەنگاوەر کەمانای وشەکە بەزمانی ئاشوری کاردۆ یا کارداك و یا گوردۆیە. ئەگەر ئەم لێکدانەوە ڕاست بێت ئەگەری هەیە ئەوەی بەتیغ دەڵێن کارد، ڕاست بێت چوونکە لەبەر بڕەری و بەهێزی پێیان وتووە کارد. بەمپێیە وشەی کورد بە (ك) فارسی ئەمە ماناکەیەتی و لەهەر جێگەیەك چ شانامە یا هەر جێگەیەکی دیکە، وشەی کورد ئاماژەی پێدرابێت، چ بە (ك) فارسی یا (ك) عەرەبی، جیاوازی نابێت لەبەر ئەوەی هەردووکی بەمانای بوێر و پاڵەوان دێت.

هۆزی کەڵهوڕیش کەخۆیان بەمناڵەکانی گودەرز دەزانن، بەڵگەی لەم شێوەیە بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشەی خۆیان دەهێننەوە کەوشەی گودەرز لەوشەی گوتۆ یا گودۆ سەرچاوەی گرتووە.

بەڵام بەهەمان شێوە کە لەباسی تایەفە سەرەکییەکانی کورد ئاماژەمان پێدا و مێژووی هەورامانیش پشتڕاستی دەکاتەوە، گوتۆ یا ژوتۆ یا گودۆ و سەرئەنجام گودی و گوتی، ناوی یەکێك لەهۆزەکانی کوردە کە لەچیای جودی یانی ئارارات نیشتەجێ بوون و بۆ ئەو ناوچەیە دەگەڕێنەوە. ئەو دەستەی توانییان کۆتایی بەحکومەتی نارامسین کوڕی سارگۆنی یەکەم بێنن.

لەکفایە الجغراق، لاپەڕەی ٦٠ ئاماژەی پێدراوە: کوردەکان لەنەژادی کاردۆکی کۆنن و لەڕۆژگاری کۆن بلاوەیان لێکردووە و لەچیاکانی جەزیرە و ئەرمەنستان و باکوری ئاسیری (=ئاشور) نیشتەجێن.

گەزنەفۆن مێژوونووسی یۆنانی وەك ئاماژەمان پێدا، ئەم دەستەیە بەمناڵەکانی کاردۆشیا

ناو دەبات کەڕووبەڕووی ئەو دەهەزار یۆنانییە بوونەتەوە و بەو پەڕی توندییەوە شەڕیان لەگەڵ کردوون. ناوچەی وان و بەدلیسیان بەکاردۆکیا و کاردۆشیا ناو بردووە. لەبەر ئەمەیە بەشێك لەمناڵەکانی کاردۆك لەوێ نیشتەجێن.

دەرئەنجام لەم روونکردنەوانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەکوردان، چ بەشێك لەمناڵەکانی یافس کوڕی نوح بن چ ماد، بەشێك لەتایەفەی کوردانن (=یانی کوردانی ڕۆژهەلات زەمین) کەبەم دوواییانە لەکاتی دامەزراندنی دەولەتی کیان، ناوی مادیان لەخۆیان نا و ئەگەری هەیە لەبەر بوێر و ئازایەتی ئەوانیان بەکورد ناو بردبێت. بەهەرحاڵ ئەم دەستەیە، دەستەیەکی ئاری نەژادی زۆر کۆنن کەزیاتر لەپێنج هەزار ساڵ پ.ز لەناوچەکانی خۆیان نیشتەجێ بوون و بوێرانە و ئازایانە و بەئەنجامدانی چالاکییە سیاسییەکان، ژیانیان بردۆتەسەر.

دەستەیەك لەزاناکانی ڕەچەڵەکناس، کوردەکان بەمناڵەکانی کورد کوڕی عومەری مەزیقیا دەزانن کەپاشای یەمەن بووە. عومەر کوری مەزیقیا کوڕی عامر مائەلسەما کوڕی حارسە کوڕی ئەمر قەیس کوڕی سەعلەبە کوڕی مازن کوڕی ئەزد (=ئەسەد) کوڕی غەوس کوڕی نەبت، کوڕی مالك کوڕی زەید کوڕی کەهلان کوڕی سەبا کوڕی یەشجب کوڕی یەعرب کوڕی قەحتان (=یەقتان) کوڕی عابر (=کوری هود) کوڕی شالَخ کوڕی ئەرفەخشز کوڕی سام کوڕی نوحە.

بەپێی ئەم گێڕانەوەیە، کوردەکان دەبێت عەرەب و لەمناڵەکانی سام بن. هەروەها دەڵێن کەعومەر کوڕی مەزیقیا پاشای یەمەن بۆ شام کۆچی کردووە و مناڵەکانی لەوێ بەناوچەکانی عەجەمدا بڵاو بوونەتەوە و لەوێ بەناوی باوەگەورێی خۆیان کورد کوڕی مەزیقیا، ناوبانگیان دەرکردووە. ئەم هۆنراوەیش وەك بەڵگە بۆ وتەکانی خۆیان دەهێننەوە:

((لعمرك مالاكراد ابنا فارس

و لكنهم كرد بن عمر ابن عامر))

لە (تاريخ كامل)ی ئیبن ئەسیر لاپەڕەی ٣٤ ئاماژەی پێدراوە کەعەبدوللە کوڕی عومەر وتوویەتی: پیاوێك لەعەرەبەکانی پارس، ئاماژە بەسووتاندنی ئیبراهیمی خەلیل داوە و پێی وتووە: مەگەر پارسەکان عەرەبیان هەیە، وتی بەڵێ، کوردەکان عەرەبی پارسەکانن.

باوکی عومەر، کوڕی عەبدولبەر لەکتێبی (قصد الامم، فی انساب العرب و العجم) و

فیروزئابادی لەکتێبی (قاموس) و ابوالفضل شەهاب ئەلدینی ئالۆسی بەغدادی لە (تفسیر روح المعانی) لەژێر ئایەی (ستدعون ایی قوم اولی بأس شدید) و قازی ئیبن خەلەکان لەوەرگێرانی (مهلب بن ابی صفره) و مۆئەییدی بەغدادی لەکتێبی (سبائك الذهب فی نعرفه قبایل العرب) و مەسعودی لە مروج الذهب لە تەفسیری (سیل العرم) بەپێی ئەو گێڕانەوەی سەرەوە، دەڵێن کەکوردەکان لەوەچەی مەزیقیان.

ئەوانەی باوەڕیان بەم گێڕانەوە هەیە، ئەنساری ئەوس و خەزرەجیش بەکورد دەزانن چوونکە ئەوانیش مناڵەکانی عومەری مەزیقیان.

دەستەیەکی دیکە هەرچەند کوردەکان بەمناڵەکانی مەزیقیا دەزانن، بەلاّم ڕەچەڵەکی عومەری مەزیقیا بۆ ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خەلیل دەگێڕنەوە. دەستەیەکی دیکە دەڵێن کەکورد کوڕی ئێران کوڕی ئاشور کوڕی سام کوڕی نوحە (سبائك الذهب، لاپەڕەی ١١). لەکاتێکدا تەورات هەموو سیلسیلەکانی مناڵەکانی سامی تۆمار کردووە و بەهیچ جۆرێك کورد و ئێرانی بۆ ئاشور نەگەڕاندۆتەوە جیاواز لەوە بەهیچ جۆرێك وشەی کورد و ئێران لەتەوراتدا بوونی نییە. لەهەموو شوێنێك لەجیاتی کورد، مادا و لەجیاتی ئێران، پارس ئاماژەی پێدراوە چوونکە لەو کاتەدا ئێران (کە لەماد و پارس پێکهاتبوو) هێشتا دانەمەزرا بوو. دوای کوروشی گەورە، وشەی ئێران کەم کەم هاتۆتە ئاراوە (دواتر ئاماژەی پێدەدەین).

جیاواز لەوە وەك ئاماژەمان پێدا: شێوە و قەلاّفەت، زمان و شێوەزار، ئەخلاق و ئایین و هەموو نیشانەکان و شوێنەوارە زانستی و سروشتییەکان نیشانی دەدات کەکورد، عەرەب نییە و ئاری نەژادە و لەناو تایەفەکانی ئاری، لەهەموو ڕوانگەکانەوە لەپارس نزیکترە وەك بڵێی دوو لقی یەك دار و دوو لقی یەك نەژاد بن. بەشێوەیەك هەر کەسێك خشتەی خوارەوە ببینێت، بێ گومان ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کەکورد عەرەب نییە بەڵکو لەگەڵ پارس، هاونەژاد و هاوزمان و هاو ئایینە.

| کورد | فارس | عەرەب | تورک | کورد | فارس | عەرەب | تورک |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاو | آب | ماء | سو | ساڵ | سال | عام | ئیل |
| نان | نان | خبز | چورك | تەور | تبر | سهم | اوق |
| گۆشت | گوشت | لحم | ات | کەوان | کمان | قوس | یای |
| زەوین | زمین | ارض | یر | شمشێر | شمشیر | سیف | قلیچ |
| ئاسمان | آسمان | فلك | کوگ | خەنجێر | خنجر | مشمل | دشنه |
| ئاسیاو | آسیاب | طاحونه | دگرمان | سپەر | سپر | ترس | قلخان |
| باران | باران | مطر | یغمور | گەنم | گندم | قمح | بغده |
| با | باد | ریح | یل | جۆ | جو | شعیر | اریه |
| سەرما | سرما | برد | ساووق | شیر | شیر | لبن | سود |
| گەرما | گرما | حر | سحاق | ماست | ماست | قری | یوغورت |
| تاوسان | تابستان | صیف | یاز | رۆن | روغن | دهن | یاغ |
| زمسان | زمستان | شتاء | قیش | دۆ | دوغ | مخیض | ایران |
| شەو | شب | لیل | گیجه | سەر | سر | راس | باش |
| ڕۆژ | روز | یوم | گون | دەست | دست | ید | ال |
| مانگ | ماه | شهر،قمر | ای | پا | پا | رجل | اياق |

هەر بەمشێوە، پێرستی ژمارەکان، کەلوپەل، جۆرەکان، ڕۆژەکان، ئاژەڵەکان و هتد کەکورد و فارس بەجیاوازیەکی کەم دەریدەبڕن بەلاّم عەرەب یا تورك یا هەر نەتەوەیەکی دیکە، ئەو وشانە دێننە سەرزمان کەهیچ نزیکییەکی لەگەڵ وشە کوردییەکان نییە. بەمشێوەیە فرمان لەرستەی کوردی و فارسی لەدوای بکەر و بەرکار دێت بەلاّم لەزمانی عەرەبی، فرمان لەپێشەوە دێت.

ئەگەر کەسێك سەیرێکی فەرهەنگی مەردۆخ بکات کە لەخۆگری وشەی کوردی، فارسی و عەرەبییە، نزیکی و پەیوەندی وشە کوردی و فارسییەکان و دوورییان لەوشە عەرەبی و تورکی و زمانەکانی دیکە روون دەکاتەوە.

لەم روونکردنەوانەی سەرەوە، سێ یاسای سەلمێنراو بەدەست دێت کە بەهیچ شێوەیەك

جێگەی گومان و دوودڵی نییە. یەکەم ئەوەی کورد ئاری نەژادە و لەگەڵ پارس هاوزمان، هاودین، هاونەژاد و هاودەدرە و بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی لەگەڵ عەرەب، تورك یا هەر تایەفەیەکی دیکەی ئاری و نەتەوە سامییەکان نییە.

خاڵی دووەم ئەوەی کەکوردەکان، لەچەند هەزار ساڵ پێش، لەناوچەکانی ئێستای خۆیان نیشتەجێ بوون و بەدرێژایی ئەم ماوەیە، نەتەنیا ژیان و ئەخلاق و زمان و هەموو دروشمە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی خۆیان لەولاّتان و نەتەوەکانی دراوسێ وەك کەلدە و ئاشور و عیلام پاراستووە، بەڵکو زۆربەی کاتەکان بەوپەری بوێری و ئازایانە، بەرپرچی یەك لەدوای یەکی هێرش و پەلامارەکانی نەتەوەکانی دیکەیان داوەتەوە و بەپاشەکشێ ناچاریان کردوون. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەدەوروبەری سەدەی ٢٧ پ.ز کوردەکانی گوتی لەگەڵ نارامسین کوڕی سارگۆنی یەکەم جەنگاون و شکستیان پێهێناوە و بۆ زیاتر لەدوو سەدە، کوردەکان فەرمانڕەوایەتی کەلدەیان کردووە. دواتر لەناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەی پ.ز کوردەکان دژی جێگرەکانی حامورابی، پاشای بابل، جەنگاون و دووبارە دەستیان بەسەر کەلدەدا گرتۆتەوە و لەگەڵ دانیشتووانی ئەو ناوچەیە تێکەڵ بوون و لەئەنجامی ئەم تێکەڵ بوونە، دەوڵەتی کەلدە پێگە و گرنگی خۆی لەدەست داوە. (نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلاّت، وەرگێرانی فروغی، لاپەڕەی ١٢٥)

هەروەها لەسەدەی نۆیەم و هەشتەمی پ.ز، پاشاکانی ئاشور، بەردەوام هێرشیان کردۆتە سەر ولاّتی کوردان بەلاّم ڕووبەڕووی بەرگری بوێرانەی ئەوان بوونەتەوە. لەساڵی ٧٤٤ پ.ز جەنگێکی قورس و سەخت لەنێوان کوردان و ئاشورییەکان ڕوویداوە و هەردوولا دوای زەرەر و زیانێکی زۆر، پاشەکشێیان کردووە بێ ئەوەی جەنگەکە ئەنجامێکی بێت.

دواتر لەساڵی ٧٢٧ پ.ز دووبارە کوردەکان دژی ئاشورییەکان ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە بەلاّم بەهۆی دوو بەرەکی ناو سوپای کورد، بلاّوەیان لێکردووە و مادی بچوك ( یانی ناوچە ئازەربایەجان)، بووبە گۆڕەپانی هێرشی ئاشورییەکان.

تا ئەوەی سەرەئەنجام لەکۆتاییەکانی سەدەی حەوتی پ.ز (٦٠٦) کوردەکانی ورمێ (مادی بچوك) لەگەڵ کوردەکانی مادی گەورە (لوڕستان و عێراقی عەجەم) پەیمانیان بەستووە و لەگەڵ فەرمانڕەوای بابل، لەهێرشێکی گەورە و هەمەلایەنە، دەستیان بەسەر نەینەوای پایتەختی ئاشوور گرتووە و دەسەلاّتی ئاشوورییەکانیان بەتەواوی لەناو بردووە و بۆ

هەمیشیە ئەو دەوڵەتەیان لەجیهاندا سڕییەوە. (دواتر بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەی پێدەدەین).

بەم دواییانە لەکاتی زاڵبوونی ئەسکەندەری رۆمی لەئێران، کوردەکان هەرچەندە ژێر دەستە بوون، بەڵام ناوچەکانی خۆیان لەدەستدرێژی کردن و تالاّن کردن بەدەست سەردارەکانی ئەسکەندەر پاراست. ئەو ماوە کەمەی سوپای ئەسکەندەر لەکوردستاندا بوون، تەنیا فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچانەیان کردووە کە سوپاکەیان تیایدا جێگیر بووە.

خاڵی سێیەم ئەوەی کورد و ماد لەیەك جیا نین چ کورد بەشێك بێت لەماد (یانی مادا) نەتەوەکانی دیکەی وەك (دەیلەمییەکان، خەزەر، نەبت، گرموك، کورد) بگرێتەوە بەهەمان شێوە کەئیبن خەلدون وزۆربەی مێژوونووسانی کورد جەختی لێ دەکەنەوە، یا کورد و ماد یەك مانایان هەبێت یانی مادا نەتەوەکانی دیکە نەگرێتەوە و تەنیا تایبەت بێت بەکوردان. بەهەرحاڵ، کورد لەماد جیاواز نییە و لەدانانی وشەی ماد بۆ کورد، هیچ لەمپەرێك لەئارادا نییە.

لەکتێبی (عەشق و سەڵتەنەت) ئاماژەی پێدراوە: زمانی مادەکان، زمانی کوردی بووە. زۆربەی رۆژهەڵاتناسەکانیش ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکەنەوە. بەڵام پارسەکان ئەگەر بەپێی بۆچوونەکەی ئیبن خەلدون و مێژوونووسانی کورد، نەوەکانی مادا بن، لەمشێوەدا دەبنە برای کوردان و ئەگەر کوڕی گومر بن (گیومەرس)، پارسەکان دەبنە برازاکانی مادا (یانی کورد و پارس دەبنە ئامۆزای یەکتر) و ئەگەر پارس کوڕی خودی یاپس بێت، بەهەمان شێوە کەدەستەیەك لەمێژوونووسان ئاماژەی پێدەدەن کەپارس، خەزەر، سەقلاب، سەدسان، خەڵخ، غەز، تورك، چین، کەباری (=بولغاری) و برتاس، هەموویان مناڵەکانی یاپس کوڕی نوحن. لەم شێوەدا پارس دەبێتە برای ماد و گومر یانی مامی کوردان. بەڵام ئەم بۆچوونە زۆر لاواز و بەهیچ بەڵگەیەك پشتڕاست نەکراوەتەوە و بۆچوونی یەکەم لەڕاستییەوە نزیکترە کەپارس لەمناڵەکانی گومر (گیومەرس) بێت کەعەرەبەکان بەعامر یا عامور ناوی دەبەن.

بەهەرحاڵ لەروونکردنەوەکانی سەرەوە و بەڵگە و شوێنەوارەکان کە ئاماژەدان پێیان لەگەڵ بۆچوونی نووسەر کەمێك جیاوازە، بەتەواوی بۆمان روون دەبێتەوە کەکورد و پارس لەنەژادی ئارین و بەڵگەیەك کەبتوانێت ئەوان وەك یەکێك لەنەتەوە سامییەکان بناسێنێت، لەبەردەستا نییە. (بۆ زانیاری زیاتر: ئەنسیکلۆپیدیای ئینگلیسی و مێژووی میرە کوردەکان،

نووسینی شێخ سوڵتان مەمدوح و دایرە ئەلمەعارفی ئاڵمانی و دایرە ئەلمەعارفی گەورەی فەرەنسی و کتێبی نەتەوەی نەناسراوی نووسینی جیامل لەمێژووی ۱۹۰۰ زایینی و نووسینەکانی مسیۆ ژۆزێف گرنیك لە سەرچاوەی کوردان لەبەرواری ۱۸٦٦ زایینی و جاماسنامە، نووسینی پیرجاماسبی هەورامی باوکی پیر شالیاری یەکەم و مێژووی کۆنی هەورامان، نووسینی مەلا شەریفی یەکەم کوڕی مەلا سەعدی قازی)

## بەندی دووەم: سەبارەت بەسەرزەمینی ماد

ماد، وەك پێشتر لەبەندی پێنجی بەشی یەکەم ئاماژەی پێدرا، بریتییە لەدەستەی دوانزەیەم لەسیانزە دەستەکەی نەژادی ئاری کە لەکاتی بڵاوبوونەوە و کۆچ کردن روویان کردۆتە ناوچەکانی رەی و ئازەربایەجان و لەوێ نیشتەجێ بوون و شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان بەمادستان ناو دەبەن.

لەچۆنیەتی نووسی ماد جیاوازی هەیە. لەکەتیبەکانی داریوش و کتێبەکانی عەهدی عەتیق، وشەی مادا یا مادی نووسراوە. ئامی یانی یۆنانی و موسا خورنی، مەدییان نووسیوە، ئیسترابۆن، مدیای نووسیوە، سەلمانازاری دووەمی پاشای ئاشور، لەناوەڕاستی سەدەی نۆی پ.ز ئامادای نووسیوە. هیرۆدۆتی یۆنانی، مەدری نووسیوە. لەئاڤێستا ئاماژە بەڕەگە دراوە (=رەی)، بەهەرحاڵ وشەی ڕەسەن هەمان مادایە کە لەتەورات و کەتیبەکاندا ئاماژەی پێدراوە.

هیرۆدۆت دەڵێت: مادەکان لەعەهدی قەدیم، بەئاریان ناسراو بوون، دواتر خۆیان ناونا ماد.

مسیۆ برس، مێژوونووسی کەلدانی، لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لەڕۆژگاری کۆن، مادەکان دەستیان بەسەر بابلدا گرتووە و بۆ ماوەی ۲۲٤ ساڵ لەو سەرزەمینە پاشا بوون. ئەم مێژوونووسە لەسەدەی سێی پێش زایین ژیاوە. ئەگەری هەیە مەبەستی فەرمانڕەوایەتی گوتییەکان بێت کەئارامسینیان شکستدا.

### سنوری مادستان

بەهەمان شێوە کە نەجم ئەلدەولە لە (کفایە الجغرافی) ئاماژەی پێداوە، کۆتایی سنووری ماد بەم شێوەیە: لەباکور: دەریای خەزەر، لەڕۆژئاوا: ئەرمەنستان، لەباشور: سەرزەمینی پارس و سوزیان (خوزستان)، لەڕۆژهەڵاتەوە: ئاری (ئەفغانستان) کەپێشتر بەئاریا ناو براوە.

ناوەندی دەوڵەتی مادی بەئیکباتان ناساندووە کەسەرەتا تەنیا قەڵایەك بووە و دژوزس

(=توس) لەساڵی ۱۲۸۰ پێش ئیسلام، بنیاتی ناوە و دواتر سوڵتانەکانی پارس بۆ فراوان کردنی هەوڵیان داوە و کەم کەم گەورە بووە. دواتر دەنووسێت: شێمانە دەکرێت هەمەدانی ئەمڕۆیی لەجێگەی ئەو قەڵایە دروست کرابێت. بەڵام هیرۆدۆت و فیردەوسی سنووری دەوڵەتی ماد بەمشێوەیە دەستنیشان دەکەن: لەڕۆژهەڵاتەوە: ڕووباری جەیحون کە بەڕووباری ئامویە ناوی دەبەن و لەسنوری تورکستان تێدەپەڕێت و دەڕژێتە ناو دەریاچەی ئۆراڵ. لەکۆندا دەڕژایە دەریای خەزەر.

لەڕۆژئاوا: ڕووباری هالیس لەسەر سنوری ئاسیای بچوک کە بەڕووباری قەزەل ئیرماقیش بەناوبانگە و دەڕژێتە ناو دەریای ڕەش.

لەباکورەوە: دەریاچەی خەزەر و ڕووباری ئاراس و چیای ئارارات کە بەدەریای ڕەش کۆتایی دێت.

لەباشورەوە: سنوری پارس و خوزستان. لەم دیاریکردنەدا کوردستان بەشێکە لەدەوڵەتی ماد.

دەستەیەکی دیکە سنووری دەوڵەتی ماد بەمشێوەیە دەستنیشان دەکەن:

لەباکورەوە: ئەرمەنستان و دەریای خەزەر و تورکستان.

لەباشورەوە: پارس و عیلام، خوزستانی ئەمڕۆی و عێراقی عەرەب.

لەڕۆژئاوا: ڕووباری هالیسی قەزەل ئیرماق، یانی سنووری دەوڵەتی لیدی لەئاسیای بچوک و سنوری بابلستان.

لەڕۆژهەڵاتەوە: سنوری ئەفغانستان. لەم دیاریکردنەدا دووبارە کوردستان بەشێکە لەدەوڵەتی ماد. ئەگەر بمانەوێت کوردستان لەدەوڵەتی ماد جیابکەینەوە، سنوری ڕاستەقینەی دەوڵەتی ماد دەبێتە:

لەڕۆژئاوا: ئەرمەنستان و کوردستان، لەباشورەوە: خوزستان و پارس.

لەڕۆژهەڵاتەوە: ئەفغانستان. لەباکورەوە: تورکستان و دەریاچەی خەزەر و چیاکانی ئارارات.

ئەمە سنووری ڕاستینەی سەرزەمینی مادە کە بۆ دوو بەش دابەش دەکرێت: یەکەم مادی گەورە کەبریتی بووە لەعێراقی عەجەم: یانی کرماشان، هەمەدان، قەزوین، ڕەی، عێراق، نەهاوەند، ئیسفەهان و هتد، لوڕستان و مازەندەران و خوراسانیش لەم دەستەیەدایە.

دووەم مادی بچوك کەبریتی بووە لەئازەربایەجان.

ناوەندی پاشایەتی مادەکان، پێش کەیقوباد، تیسفون بووە (بیست و پێنج فەرسەخ لەدووری بەغداد لەکەناری ڕۆژهەلاتی دیجلە کە بەمادایان ناویان بردووە) دواتر ئەم ناوە گۆڕانی بەسەر هاتووە و بۆتە مەداین.

لەڕۆژگاری کەیقوباد کەدەولەتی مادی دامەزراندووە، پایتەختی دەولەتەکە بۆ ئیکباتان گوازرایەوە یانی هەمەدانی ئەمڕۆیی کە بەشاری سەوز ناوی دەبەن و تا سەردەمی رووخانی پاشایەتی ئازدیاك، باوەگەورێی کوروشی مەزن، وەك پایتەختی ماد ماوەتەوە. لەزەمانی کوروش ماوەیەك هەمەدان و دواتر (ئەحمسا) کەئیسفەهانی ئەمڕۆییە، پایتەختی ولاتی ماد بووە. فەرمانی کوروش سەبارەت بەئاوەدان کردنەوەی بەیت ئەلموقەدەس لەو شارە دۆزرایەوە بەهەمان شێوە کە لەتەورات کتێبی عەزرا (عەزیز) بەشی شەشەم ئاماژەی پێدراوە. ئەم بابەتە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کەپاشایەتی کوروشیان بەپاشایەتی ماد ناو بردووە نەك پاشایەتی هەخامەنشی. دواتر ئامارەی پێدەدەین.

ناوەندی حکومەتی مادی بچوك، شاری ورمێ بووە کەشاری دەرکەوتنی زەردەشت وەخشوری کوردە.

ولاتی ماد، بۆماوەیەکی زۆر ژێردەستی دەولتی ئاشور و باجیان بەو دەولەتە داوە، بەهەمان شێوە کەشەمشی ئەداد، چوارەمین پاشای دەولەتی ئاشور لەسالی ٨٢٤ تا سالی ٨١٢ پ.ز دەولەتی مادی لەناو ریزی دەولەتە ژێردەست و ملکەچەکانی خۆی ناو بردووە.

تگلاس پالازاری دووەم، پاشای ئاشوریش لەسالی ٧٤٤ پ.ز لەگەلْ مادیان جەنگاون و هەموو تایەفەکانی مادیان ملکەچی خۆیان کردووە.

لەناوەڕۆکی بەشی ١٧ و ١٨ کتێبی (ملوك) ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەولاتی ماد یا بەشێکی لەژێر دەستی سەلمانازار بووە.

لەکتێبی (نخبە الازهریە) چاپی میسر لەبەرواری ١٩٠٣ زایینی، لەلاپەڕەی ٥٢٠ ئامارەی پێدراوە: بەشی باکوری فارس، ژێردەستی دەولەتی ئاشور بوون، دواتر سەربەخۆیی بەدەست هێناوە و دەولەتی مادیان پێکهێناوە. دواتر دەولەتی فارس و ماد بەفەرماندەیی کوروشی مەزن، سەربەخۆیی خۆیان تا دەرکەوتنی ئەسکەندەری یۆنانی پاراستووە.

سەبارەت بەماوەی ژێردەستەیی ماد، بۆچوونی مێژوونووسان جیاوازە. هیرۆدۆت ئەو

ماوەیە بەپێنسەد ساڵ دەزانێت. بەڵام کەتیبەکانی ئاشوری بە دوو سەدەی دەخەمڵێنن کەسەرئەنجام لە لەساڵی ٦٠٦ پ.ز کۆتایی پێدێت و دەوڵەتی ئاشور بۆ هەمیشە لەناو دەچێت.

**بەندی سێیەم: سەبارەت بە دامەزراندنی دەولەتی ماد**

لەبەر ئەوەی لەسەرەتاکانی مێژوو تا زەمانی دامەزراندنی دەوڵەتی ماد، بەردەوام تایەفەکانی کورد و ماد (یانی کوردەکانی ئارارات و کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی زەمین) لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئاشور و کەلدە و عیلام ڕووبەڕوو بوونەتەوە، پێویستە بەشێوەیەکی کورت لەگەڵ مێژووی ئەو سێ دەوڵەتە ئاشنا ببین.

**خوێندەوەیەکی کورت بۆ مێژووی سێ دەولەتەکە کەلدە، ئاشور، عیلام**

لەشوێنەوارە دۆزراوەکانی بەغداد و کەنداوی فارس، ئەوە ڕوون بۆتەوە کە لەدەوروبەری پێنج هەزار ساڵ پ.ز (حەوت هەزار ساڵ پێش نووسینی ئەم کتێبە) دەشتێکی فراوان کەلەوێ دوو ڕووباری دیجلە و فورات بەیەک دەگەن و شەت ئەلعەرەب پێکدێنن، لەو ڕۆژگارەدا بەشەنعار ناسراو بووە (سەفەری تەکوینی تەورات، بەشی دەیەم) و لەئێستادا ئەو دەشتە بەدەشتی عێراقی عەرەب ناو دەبەن.

لەو ڕۆژگارەدا کە بەسەرەتاکانی مێژوو نووسراوە، دوو دەستە لەو دەشتەدا بوون بەناوەکانی شومێری (=سوماری) و ئاکادی. هەردووک سەربەخۆ و جیاواز ژیانیان بەسەر بردووە. خاوەنی نووسین و شارستانیەت بوون. کانزاکان و زێڕ و زیو و هەڵکۆڵین لەسەر بەرد و ئەندازیاری شارەزا بوون. ئەم دەستەیە، ئەوانەی لەوڵاتی شومێر نیشتەجێ و لەباکوری بابل بوون، بەفومێر ناسراون. نووسینی بزماری لەیادگارییەکانی ئەم دەستەیە. ئەوانەی لەوڵاتی ئەکاد و لەباشوری بابل نیشتەجێ بوون، بەئاکادی ناسراون. ناوی هەر دوو وڵاتەکە یانی شومێر و ئاکاد لەکتێبەکانی عەهدی عەتیق ئاماژەی پێدراوە و دانیشتووانەکانیان زۆر لەکەلدانییەکان کۆنترن چوونکە مێژووی کەلدانییەکان کە لەمناڵەکانی سامن و ماوەیەک زۆر دوای ئەوان ڕوویان کردۆتە ئەو ناوچە، لەدەوروبەری سەدەی نۆی پ.ز دەست پێدەکات بەڵام مێژووی شومێر و ئاکاد چەند هەزار ساڵ پ.ز تێدەپەڕێنێت. لەبەر ئەمە ناتوانین مێژووی ئەوان بەمێژووی کەلدە ناو ببەین بەڵکو دەبێت ناوی مێژووی شومێر و ئاکادیان لێ بنێین.

ئاشورییەکان ناوی کەلدەیان داوە بەبابل کە لەکەتیبەکانی ئەوان، لەسەدەی نۆی پ.ز دەبینرێت.

لەنێوان زاناکان و لێکۆڵەوەران جیاوازی هەیە لەوەی کام یەك لەم دوو دەستەیە (شومیر و ئاکاد) پێشتر دەستیان بەسەر شەنعاردا گرتووە. بەم دواییانە ئەوە ڕوون بویەوە کەپێش هاتنی مناڵەکانی سام بۆ ئەو ناوچانە، سەرەتا شومیرییەکان دەستیان بەسەر کەنارەکانی کەنداوی فارسدا گرتووە. کینگ ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە. (مێژووی پیرنیا، لاپەڕەی ٢٤).

تا دۆزینەوەی شوێنەوارەکان (=یانی ساڵی ١٨٤٢ زایینی) زانیارییەکی ئەوتۆ لەسەر بارودۆخی ژیانی ئەو دوو دەستەیە لەبەردەستت نەبوو بەڵام لەئێستادا ڕوونکردنەوەی بارودۆخی ژیانی ئەوان بەهۆی دۆزینەوەکانی بابل و عیلام، کەم کەم روون دەبێتەوە.

وڵاتی شومیر بریتی بووە لەویلایەتەکانی ئور و ئەریدو و ئەروخ و لارسام و لاگاش و ناوچەکانی دەوروبەر و سەرزەمینە پەیوەستەکانی دیکە لەکەنارەکانی کەنداوی فارس.

وڵاتی ئەکاد پێکهاتووە لەویلایەتەکانی نیپور، سیپار و ئاگادە و بابیلۆ (=بابل) کەپایتەختی وڵاتی ئاکاد بووە و سەرزەمینە پەیوەستەکانی دیکە لەبابلستان.

ئەم دوو دەستە بەردەوام سەرقاڵی جەنگ و پەلاماردانی یەکتر بوون و لەژێر فەرمانڕەوایی سەرۆکی پەرەستگاکان کە بە(پاتسی) ناویان بردوون، ژیانیان بەسەر بردووە. هەرکام لە پاتسیەکانی ئەم دوو دەستە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت، خۆی وەك پاشای هەردوو وڵاتەکە ناو بردووە (پاشای شومیر و ئاکاد).

یەکێك لەکۆنترین پاشا ئاماژە پێدراوەکان، پاشای ئورە بەناوی ئورا کەئاکادی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی. لەبەر ئەمە بەپاشای شومیر و ئاکاد ناویان بردووە. بەپێی شوێنەوارە دۆزراوەکانی ئەو ڕۆژگارە، چەندین هۆز لەهۆزە ڕەسەنەکانی کورد کەبریتی بوون لەلۆلۆ، گوتی، کاسی و هوری (سوباری) و دەستەیەکی گەورە کەدانیشتووانی ناوچەی زاگرۆسیان پێکهێناوە، لەباکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاکاد و شومیر، یانی کوردستانی ئەمڕۆ، نیشتەجێ بوون و لەکۆتاییەکانی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەم دەستە (کوردان) عیلامییەکان سنوری وڵاتی عیلامییەکان دەستی پێکردووە.

عیلامییەکان هەرچەند بەشێك لەدانیشتووانی زاگرۆسن، بەڵام لەبەر ئەوەی هێشتا ڕوون

نەبۆتەوە پەیوەندییان لەگەڵ نەژادی کوردا هەبێت، ناتوانین ئەوان بەکورد بزانین.
دانیشتووانی شومێر و ئاکاد هەندێ کات پێکەوە و هەندێ کات جیاجیا پەلاماری دەوڵەتی عیلامیان داوە. سەرئەنجام لەدەوروبەری ساڵی ۲۱٤۰ پ.ز هەردوو دەستەکە یەکیان گرتووە و دەوڵەتی کەلدەیان دامەزراندووە (=یانی دەوڵەتی بابل). هەموو ویلایەتەکان و شارەکانی شومێر و ئاکاد بەکەلدە ناو براوە. هەر شارێك خواوەندێکی تایبەت بەخۆی بووە کەدانیشتووانەکەی پەرەستشیان کردووە وپەرەستگایەکیان بۆ دروست کردووە. کاهینی پەرەستگا وەك ئاماژەمان پێدا، پاشای ئەو شارە بووە. هەرکات هەموو فەرمانڕەوای شارەکان کەوتبێتنە ژێر دەستی یەك فەرمانڕەوا (پاشا) ئەویان بەشای شاکان ناو بردووە.
پاشاکانی کەلدە زیاتر لەدوو هەزار ساڵ بەوپەڕی هێز و دەسەڵاتەوە، پاشایەتیان کردووە. لەم ماوەدا تەنیا سێ جار لەبەرابەر نەتەوەکانی دیکە شکستیان خواردووە، یەکەم: لەسەدەی بیست و شەشەمی پ.ز کە لەسەر دەستی کوردانی گوتی، شکستیان خوارد.
دووەم: لەسەدەی بیست و دووەمی پ.ز کە لەعیلامییەکان شکستیان خوارد لەڕۆژگاری پاشایەتی کودور ناخونتای یەکەم، پاشای عیلام.
سێیەم: لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەی پ.ز (۱۷٦۰) کەدووبارە لەسەر دەستی تایەفە کوردەکان ڕووبەڕووی شکست بوونەوە. (دواتر ئاماژەی پێدەدەین)
بەناوبانگترین پاشای کەلدە، یانی دەوڵەتی ئاکاد، سارگینا (=سارگۆنی یەکەم) بووە کە لەدەوروبەری ۳۸۰۰ پ.ز لە ئاغادە (=ئاگادە) لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە، لەدەوربەری پێنج سەدە پێش گیومەرس، یەکەم پاشای سیلسیلەی پێشدادی کەزەردەشتییەکان ئەو بەئادەم یا باوکی مرۆڤەکان دەزانن.
سارگۆنی ئاماژە پێدراو، پاشایەکی جیهانگیر بووە، وڵاتی شومێری خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی، دەوڵەتی کەلدەی گەیاندۆتە ترۆپکی هێز و دەسەڵات و چەندین جار عیلامییەکانی شکستداوە و تا سوریە و شێوەدوورگەی سینا پێشڕەوی کردووە.
بەفەرمانی ئەم پاشایە، هەموو نوسراوەکان سەبارەت بەیاساکانی بەڕێوەبردنی وڵات و مەزهەب، جادو، داب و نەریتەکان، ئەستێرەناسی، صرف و نەحو بۆ زمانی سامی وەرگێردراوە و لەپەرەستگای ئەروخ تۆمار کراوە. شاری ئەروخ بەشاری کتێب بەناوبانگە. لەتەورات وشەی (عەرك) تۆمار کراوە. (سەفەری تەکوین، بەشی دەیەم).

لەسەر نەژادی دەستەی شومێر و ئاکاد، مێژوونووسان و لێکۆڵەرەوان بۆچوونەکانیان جیاوازە. دەستەیەك ئەوان بەمناڵەکانی حام کوڕی نوح دەزانن، دەستەیەکی دیکە ئەوان بەمناڵەکانی سام کوڕی نوح بەڵام بەداخەوە ئەگەر ئێمە باوەڕمان بەمێژووی یەهود، مەسیحی و ئیسلام هەبێت، لەم مێژووە کە دەوڵەتی کەلدە (شومێر و ئاکاد) سەرقاڵی فراوان کردنی سنووری دەوڵەتەکەی خۆیانن، یانی ٣٨٠٠ پ.ز کەسارگۆنی یەکەم پاشایەتی کەلدە دەکات، هێشتا سام و حام لەدایك نەبوون چوونکە مێژوونووسەکانی ئەو سێ دینە سەرەکییە، مێژووی ئادەم بۆ ٤٠٠٤ پ.ز دەگێڕنەوە.

دەستەیەکی دیکە ٥٥٧٥ پ.ز و دەستەیەکی دیکە ٥٥٠٨ پ.ز. لەئافراندنی ئادەم تا لەدایك بوونی سام بەپێی وتەکانی تەورات و مێژووی نەتەوەکان، ٢١٥٢ ساڵە.

ئەم ژمارەیە لە ٤٠٠٤ کەم دەکەین، ١٨٥٢ دەمێنێتەوە کەدەبێت لە ٣٨٠٠ مێژووی سارگۆنی یەکەمی کەم بکەین تا سام لەدایك ببێت یانی ١٧٥٨ ساڵ دوای پاشایەتی سارگۆن، سام چاو بەدنیا هەڵدێنێت کەمێژوونووسان سارگۆن و نەتەوەکەی بەمناڵەکانی ئەو یا حامی برای دەزانن!!!

ئەم لێکدانەوانە بۆمان ڕوون دەکاتەووە کەدیاریکردنی مێژووی ئافراندنی ئادەم یا جیهان، بەم ئەندازە و بگرە چەندین هەزار بەرابەریش، بەدوور لەهەڵە نابێت.

دەستەیەك لەمێژوونووسان، نەتەوەی عیلام بەمناڵەکانی عیلام کوڕی سام کوڕی نوح دەزانن بەڵام بۆچوونی دیۆلافوا و دیمۆرگان، دوو سەرۆکی وەفدی لێکۆڵینەوەکانی فەرەنسا، لەسەر ئەوەیە کەعیلامییەکان حەبەشی بوون (یانی لەمناڵەکانی حام).

بەرەچاو کردنی ئەو کێشەی سەرەوە کەئاماژەمان پێدا، لەو ڕۆژگارەدا هێشتا سام یا حام چاویان بەدنیا هەڵنەهێناوە. حەبەشی بوونی عیلامییەکان لەگەڵ نووسینەکانی تەورات و هەموو مێژووەکانی جیهان، جیاوازی هەیە چوونکە بەهەمان شێوە کە کتێبەکانی عەهدی عەتیق و مێژووی نەتەوەکان ئاماژەیان پێداوە، عیلام کوڕی سام کوڕی نوحە و حەبەشییەکان لەمناڵەکانی حام کوڕی نوح و ڕەشپێستن.

شێمانە دەکرێت ئەو بەڵگە و بورهانانەی ئەم دوو زانایەی بۆ دەربڕینی ئەو بۆچوونە هانداوە، سەبارەت بەنەژادی عیلام نەبێت، یانی کەسانێکی دیکە لەنەژادی حام لەوڵاتی عیلام بووبێتن کەسەرچاوەی شوێنەوار و هەڵکەندنەکان بن و بەهۆی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ

مێژووی عیلام، ئەوانیان بەعیلامییەکان زانیبێت.

یا ئەوەی ئەگەری هەیە ئەو بەرهەمانە لەحەبەشەوە بۆ عیلام هێنرابێتن و یا لەکاتی پاشایەتی عیلامییەکان، دەستەیەك لەحەبەشییەکان دەستیان بەسەر وڵاتی عیلامدا گرتبێت و عیلامییەکانیان لەوڵاتەکەیان دوور خستبێتەوە و یا لەژێر کاریگەری هێز و دەسەڵاتی خۆیان ئەوانیان کپ کردبێت و دووبارە عیلامییەکان دەسەڵاتیان گرتبێتەدەست و ژیانێکی نوێ و دەوڵەتێکی سەربەخۆیان دامەزراندبێت بەهەمان شێوە کەبۆچوونی خودی دیمۆرگان سەبارەت بەزمانی عیلام، ئەم بۆچونەی دوایی پشتراست دەکاتەوە کەدەڵێت: زمانی ڕەسەنی عیلام، ئەنزانی بووە کە لەسێ هەزار ساڵ پ.ز پشتگوێ خراوە. دوای ئەوە زمانی شومیری و زمانی سامی لەو ناوچەیە بڵاو بۆتەوە و جارێکیتر لەساڵی ۱۵۰۰ پ.ز دووبارە زمانی ئەنزانی سەری هەڵداوەتەوە.

ژیانەوە و زیندوو بوونەوەی زمان، لەکاتێکدا ئەگەری دەبێت کەقسەکەرانی زمانەکە لەدەرئەنجامی کۆمەڵێك ڕووداو بەپشتگوێ خستنی زمانەکەیان ناچار کرابێتن و دوای نەمانی کۆسپ و تەگەرەکان، سەر لەنوێ زمان و دروشمە نەتەوەییەکانی خۆیان زیندوو بکەنەوە، جیاواز لەوە ئەگەر زمان بەشێوەیەکی تەواو بمرێت، یانی قسەکەرانی بەتەواوی لەناوبچن، چیتر زیندووبوونەوەی بەشتێکی نەکران دێتەبەرچاو.

سنوری دەوڵەتی عیلام بەهۆی هەڵکەندن و شوێنەوارە دۆزراوەکان، بەمشێوەیە دیاریکراوە: لەڕۆژهەڵاتەوە: بەشێك لەپارس، لەباکورەوە: ئەو ڕێگەی لەهەمەدانەوە بەرەو بابل ڕۆشتووە، لەڕۆژئاوا: ڕووباری دیجلە، لەباشور: کەنداوی فارس تا بوشێهر(=لەکۆندا بە ڕەشر ناوی براوە.).

بەم پێیە وڵاتی عیلام بریتی بووە لە خوزستان و لوڕستان و پشتکوە و چیاکانی بەختیاری. شوش کەپایتەختی ئەم دەوڵەتە بووە، وەك یەکێك لەشارە کۆنەکانی جیهان لەقەڵەم دەدرێت کە تا سەردەمی ئەسکەندەری مەزن ئاوەدان بووە. لەکتێبی عەهدی عەتیق، ئاماژە بەوشەی شوشەن دراوە (=سوسەن گوڵ، گوڵی سوێسنە).

بەهۆی شوێنەوار و هەڵکەندراوەکان، سێ قۆناغ بۆ دەوڵەتی عیلام دیاریکراوە: یەکەم: قۆناغی پێش مێژوو، لەهەشت هەزار ساڵ پ.ز تا ساڵی ۲۲۲۵ پ.ز

قۆناغی دووەم: قۆناغی پەیوەندی عیلام لەگەڵ دەوڵەتی بابل، لەساڵی ۲۲۲۵ پ.ز تا ساڵی

٢١٠، ئاناتۆمی وەك پاشای گوتییەکان ناساندووە کە ئەم پاشایە لەدەوروبەری ٣١٠٠ پ.ز یانی هاوکات لەگەڵ پاشایەتی هوشەنگی پێشدادی، دژی عیلامییەکان جەنگاوە. خودی ئاناتۆم دەڵێت: بەسەختی عیلامییەکانی تێکشکاندووە. لەشوێنەوارەکان ئەو ئەنجامە بەدەست دێت کەعیلامییەکان هێرشیان کردۆتە سەر لاگاش، بەلاّم ئاناتۆم ڕووبەڕوویان بۆتەوە و بەپاشەکشێ ناچاری کردوون. ئەم جەنگە کەم کەم بەردەوام بووە تا ئەوەی ئاکادییەکان جێگەی شومێرییەکان دەگرنەوە و سەرئەنجام دەتوانن عیلامییەکان بەدانی باج ناچار بکەن. (مێژووی گشتی، ڕەزا ئەخەوی لاپەڕەی ١٩٥).

پایتەختی ئاناتۆم شاری لاکاش بووە. چوونکە مێژووی ئەم پاشایە پێنج سەدە دوای شکستی نارامسینە، ناتوانین ئەو بەیەکەم پاشای گوتی بزانین.

لەدەوروبەری ٣٠٠٠ پ.ز، ئاناتۆمی دووەم جارێکی دیکە عیلامییەکانی شکستداوە کەهێرشیان کردۆتە سەر لاکاش. نووسراوێك کەکاهین (نین مار) بۆ یەکێك لەهاوڕێکانی خۆی نووسیوە و لەخۆگری ئەم ڕووداوەیە، زیاد لەرادە سەرنجڕاکێشە (پیرنیا، لاپەڕەی ٦٢).

لەمێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك، لەخشتەی پاشاکان، دووبارە ئاماژە دراوە کە لەساڵی ٢٩٠٠ پ.ز، لۆگاڵ زاکیسی گوتی، پاشای ئەروخ و شومێر بووە و دەستی بەسەر هەموو بەشەکانی کەلدەی سەروودا گرتووە.

لەدەوروبەری ٢٨٥٠ پ.ز بەپێی ئەو کەتیبانەی لەناوچەی لۆلۆبوم (یانی ولاّتی لۆلۆ، لەنێوان سلێمانی و بەغداد) دۆزراونەتەوە، ئانۆبانینی پاشای گوتی، کەخۆی لەنەژادی گوتییەکانە، پاشای ولاّتی گوتی (شومێر و ئاکاد) بووە. پایتەختی دەسەلاّتەکەی لاکاشە. ئەو تاشەبەردە نەخشێنراوەی لەزەهاو دۆزراوەتەوە، سەبارەت بەم پاشایە.

دوای ئەوەی عیلامییەکان لەڕۆژگاری ئەم پاشایە، لەهێرش کردنە سەر شومێر بێ هیوا بوون، بڕیاری خۆیان گۆڕیوە و هێرشیان کردۆتە سەر ئاکاد.

مانیشتو، پاشای ڕۆحانی ئاغادە، کەسەرۆکی هۆزی کیش بووە، لەگەڵ عیلامییەکان جەنگاوە و پاشای عیلامی وەك ئەسیر بردۆتە ئاغادە و ولاّتی عیلامی بەدانی باج بەئاکاد ناچار کردووە. ئینجانەیەك کە لەنیپ پور دۆزرایەوە، لەسەری نووسراوە: لەتالاّنییەکانی عیلامە.

٧٤٥ پ.ز.

**قۆناغی سێیەم: قۆناغی ڕووبەڕوو بوونەوەی دەوڵەتی عیلام و ئاشور. لەساڵی ٧٤٥ پ.ز تا ساڵی ٦٤٥ پ.ز کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین.**

دوای سارگۆنی یەکەم، نارامسینی کوڕی لەدەوروبەری ٣٧٠٠ پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی کەلدە (شومیر و بابل) دانیشتووە. پاشایەکی بەتوانا و خاوەن دەسەڵات بووە. بەرهەم و تەلارەکانی ئەم پاشایە بەڵگەن بۆ هێز و توانایی و دوورئەندێشی ئەو. بەپێی لەوحە دۆزراوەکانی سەردەمی ئەم پاشایە کە لەدەربەندی گاور لەچیای قەرەداغ لەلایەن میجر ئیدمۆنس دۆزرایەوە و تاشەبەردێکی دیکە کەدیمۆرگان دۆزییەوە، ئەم پاشایە هێرشی کردۆتە سەر وڵاتی لۆلۆ و شاتون (ساسون) پاشای لۆلۆییەکانی شکستداوە و دەستی بەسەر وڵاتەکەیدا گرتووە. دواتر گوتییەکان کەهاونەژادی لۆلۆییەکان و لەناوچەی کەرکوک نیشتەجێ بوون (لەبنەمادا نیشتەجێی چیاکانی زاگرۆس بوون)، هێرشیان کردۆتە سەر وڵاتە کەلدە. نارامسین لەبەرابەر هێرشی گوتییەکان نەیتوانیوە خۆڕاگری بکات، تێکشکاوە و دەسەڵاتی لەدەستداوە. لەئەنجامی ئەم شکستە، وڵاتی لۆلۆیش ڕزگار بووە و جارێکی دیکە سەربەخۆیی خۆی بەدەست هێناوە.

دوای شکستی نارامسین، ویلایەتی ئاکاد کەوتۆتە ژێردەستی ئەریخ (=ئەروخ). پێنج پاشای ئەریخ، بۆ ماوەی بیست ساڵ لەو ویلایەتە پاشایەتیان کردووە. دوای ئەو گوتییەکان، دەستیان بەسەر ئەکادیش گرتووە (مێژووی ڕۆژهەڵاتی نزیک، ل ١٨٩). زیاتر لەدوو سەدە، وڵاتی کەلدە (شومیر و ئەکاد) لەژێر دەستی پاشاکانی گوتی بووە، تەنانەت پاشا بەتواناکانی لاگاش ژێردەستە و باجیان بەدەوڵەتی گوتی داوە بەڵام چۆنیەتی پاشایەتی گوتییەکان و ئەوەی لەکاتی پاشایەتی خۆیان چۆنیان هەڵسوکەوت کردووە و چەند کەسیان پاشایەتی کردووە و ناویان چی بووە، هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

پرۆفیسۆر سپایزار لەکتێبەکەیدا دەنووسێت: دوایین پاشای گوتی لەوڵاتی ئاکاد، تیریگان بووە و هەروەها دەنووسێت بەپێی ناوە هاوبەشەکان، دەبێت لەڕۆژگاری زۆر کۆن، گوتییەکان ڕۆشتبێتنە ناو وڵاتی شومیر و دوای گرتنە دەستی دەسەڵات بەتەواوی، دەستیان بەسەر ئەکادیشدا گرتبێت (نەتەوەکانی میزۆپۆتامیا، لاپەڕەی ١٩).

نووسەری مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک، میستر هۆڵ، لەخشتەی پاشاکانی کۆن، لاپەڕەی

لەم ڕۆژگارەدا، بەو شێوەی مێژووەکان باسی لێوەدەکەن، جەمشیدی پیشدادی، تازە لەسەگستان، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە و سەرقاڵی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەی بووە.دوای ئانۆبانینی پاشای گوتی، پاشایەکی گەورەی دیکەی دەرکەوتووە بەناوی گوت ئا یا گودئا. لەشاری لاکاش لەسەر تەختی پاشایەتی کەلدە (شومێر و ئاکاد) دانیشتووە و پێنجەم پاشای گوتییەکانە. ئەم پاشایە چەندین جەنگی ئەنجامداوە، ئەنزانییەکانی (عیلامییەکان) خستۆتە ژێر دەستی خۆی. لەوێرانەکانی لاکاش، کەمسیۆ دوسارزکی فەرەنسەوی دۆزییەوە، شوێنەواری کۆشکی ئەم پاشا کوردە دەرکەوتووە کە لەسەر خشتەکان ناوەکەی نووسراوە. دواتر لەساڵی ٢٨٠٠ پ.ز سارگۆنی دووەمی ئاکادی دەرکەوتووە و لەجەنگێکی سەخت، شارلاکی پاشای گوتی تێکشکاندووە و کۆتایی بەپاشایەتی گوتییەکان هێناوە (مێژووی کۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیك، لاپەڕەی ١٦٨).

سارگۆن دوای ئەم سەرکەوتنە گەورە، گوتییەکانی لەسەرزەمینی بابل بەرەو زاگرۆس، شوێنی سەرەکی خۆیان دوور خستۆتەوە (لوڕستانی ئەمڕۆ). دەستەیەك نووسیویانە: پاشایەتی گوتی لەسەردەستی ئوتوهگالی پاشای ئور (=ئوروك) کۆتایی پێهاتووە.

ئەم سارگۆنە کەم کەم وڵاتەکەی خۆی فراوان کردووە، لەڕۆژئاوا تا سەرزەمینی شام و لەباکورەوە تا پشت چیاکانی زاگرۆس یانی کرماشانی ئەمڕۆیی، سنوری دەسەڵاتی خۆی درێژی کردۆتەوە و سەرئەنجام تا وڵاتی مادپێشرەوی کردووە.

تەواوی ناوچەی کوردستان، لەسنوری ئەم پاشایە بووە. بۆ ماوەی سێ سەدە کوردەکان باجیان بەدەوڵەتی بابل داوە.

دوای سارگۆنی ئامارە پێدراو، چیتر ڕووداوێکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە تا لەسەرەتاکانی سەدەی بیست و پێنج (٢٦٠٠ پ.ز) بەرابەر لەگەڵ ساڵی (٢٩٠٠ ئافراندنی ئادەم) کەدەبێتە نزیکەی چوار هەزار و شەشسەد ساڵ پێش ئێستا، زوحاکی عەرەب، لەزەمانی دەوڵەتی بابل، هێرشی کردۆتە سەر وڵاتی پێشدادیان (پارس و ماد) و دەوڵەتی جەمشیدی لەناو بردووە و پارس و مادەکانی خستۆتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆی. لەساڵی ٢١٩٢ پ.ز فەرەیدونی پێشدادی، بەهاوکاری کاوەی ئاسنگەری ئیسفەهانی کە لەنەژادی ماد بووە، دەرکەوتووە و وڵاتی پێشدادی لەژێردەستەیی کەلدانییەکان ڕزگار کردووە.

دوای ئەم ڕۆژگارە، شکۆ و مەزنی سەر لەنوێ بۆ شومێرییەکان گەڕاوەتەوە و لەساڵی ٢٤٥٠

پ.ز دونگی پاشای سومەر، پایتەختی شومیری لەلاکاشەوە بۆ شاری ئور گواستۆتەوە. لەم ڕۆژگارەدا، عیلام لەگەڵ لۆلۆییەکان یانی وڵاتی لۆلۆ، لەسنوری شومیردا بوون.

## دامەرزاندنی دەولەتی ئاشور

لەساڵی ۲۳۵۸ پ.ز ئاشور ناوێك لەمناڵەکانی ئاشور، کوڕی سام کوری نوح دەرکەوتووە و لەکەناری دیجلە، کەمێك لەخوارەوەی نەینەوا (یانی لەکەنارەکانی بەرابەر شاری موسڵی ئەمڕۆیی) شارێکی بنیات ناوە. و بەهۆی ناوی دامەزرێنەری ئەم شارە، بەئاشور ناوی دەرکردووە و دواتر نینە کوڕی بلوز گۆڕیویەتی و بناغەی شاری نەینەوای داڕشتووە. لەمێژووی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلأت، چاپی دووەم، لاپەڕەی ۱۲۵ و مێژووی پیرنیا لاپەڕەی ۳۵ ئاماژەی پێدراوە کە: ئاشور یا ئالاشار ناوی خواوەندی ئەو شارە بووە و لەبەر ناوی ئەم بتە، شاری ئاماژە پێدراویان بەئاشور ناو بردووە.

بەهەرحاڵ ئاشوری ئاماژە پێدراو، دەولەتی ئاشوری دامەزراندووە و لەناوچەکانی باکوری کەلدە تا کوێستانەکانی باکور و ڕۆژهەلأتی گرتووە. دامەزراندنی ئەم دەولەتە بۆتە هۆی لاواز بوونی دەولەتی کەلدە و عیلامییەکان مەبەستی ئەوەیان کردووە لەژێردەستەیی کەلدە خۆیان ڕزگار بکەن.

حکومەتی ئاشور بۆ دوو قۆناغ دابەش دەکرێت: قۆناغی یەکەم: لەساڵی ۲۳۵۸ تا ساڵی ۷٤٥ پ.ز کە ۱۵۹۳ ساڵ بەردەوام بووە و دامەزرێنەرەکەی هەمان ئاشوری ئاماژە پێدراوە و دوایین پاشای ئەم قۆناغە ساردانایال کوڕی سەلمانازارە. لەم قۆناغەدا سی پاشا، پاشایەتییان کردووە.

قۆناغی دووەم: لەساڵی ۷٤٥ تا ساڵی ٦٦۰ پ.ز کە ۸٥ ساڵ بەردەوام بووە، حەوت پاشا فەرمانڕەوایەتییان کردووە. یەکەمیان تکلاس پالازاری دووەمە و دواهەمینیان، ئاسوربانیپاڵە کەدوایین پاشای هەردوو قۆناغەکە، خۆیان کردە پارووی ئاگر (دواتر ئاماژەی پێدەدەین).

لەساڵی ۲۲۸۰ پ.ز کودورناخونتای یەکەم، پاشای شوش (پایتەختی عیلام) دژی شومیرییەکان جەنگاوە و دەولەتی بابلی بەزاندووە و شاری ئوری تالأن کردووە و پەیکەری نینەی لەپەرەستگای ئەروخ بۆ وڵاتەکەی خۆی گواستۆتەوە و نزیکەی شەست ساڵ، شومیرییەکان ژێر دەستەی عیلامییەکان بوون.

دواتر لەساڵی ٢٢٢٠ پ.ز شومیرییەکان دەسەڵاتیان فراوان بووە و خۆیان لەژێردەستەیی عیلامییەکان ڕزگار و سیلسیلەیەکی نوێیان دامەزراندووە بەناوی نی سین کەناوی شانزە کەس لەپاشاکانی سیلسیلەی ئامارژە پێدراو بەدەست هاتووە و زیاتر لەسەد ساڵ درێژەی کێشاوە.

لەم ڕۆژگارەدا یانی ساڵی ٢١٩٢ پ.ز بەرابەر لەگەڵ ٣٣٩٣ی هاتنە خواری ئادەم، فەرەیدونی پێشدادی نەژاد کە لەدانیشتووانی وڵاتی ماد بووە، بەهاوکاری کاوەی ئاسنگەری مادی نەژادی دانیشتووی ئیسفەهان، دەرکەوتووە و وڵاتی پێشدادی لەژێر دەستەیی کەلدانییەکان ڕزگار کردووە و دەوڵەتی ئاجامی بوژاندۆتەوە.

دەستەیەك دەرکەوتنی فەرەیدون بەهەڵە بۆ ساڵی ١٣٧٨ پ.ز دەگێرنەوە. یۆنانییەکان فەرەیدون بەئاباس ناو دەبەن.

لەم دوواییانەدا شومیر و ئەکاد بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی عیلامییەکان، پەیمانیان بەستووە. ریمیسینی پاشای عیلام، هەستی بەپەیمانەکەی ئەوان کردووە و لەساڵی ٢١١٥ پ.ز هێرشی کردۆتە سەریان و بۆ هەمیشە شومیر و ئەکادی لەناوبردووە و چیتر نەیانتوانی دەسەڵات بگرنەدەست و لەناو نەتەوەکانی دیکەدا توانەوە.

دوای ئەوە حامورابی، پاشای بابل کە لەساڵی ٢١٢٣-٢٠٨٠ پ.ز پاشایەتی کردووە، دژی عیلامییەکان ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە و لەیەکەمین جەنگ، ریمیسینی پاشای عیلامی شکستداوە و قەرەبووی شکستەکەی بابلی (شومیر و ئاکاد) کردۆتەوە. ئەم پاشایە، بابلی وەك پایتەختی خۆی دیاری ودەستی بەئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەی کردووە. حامورابی یەکێك لەپاشا گەورەکانی جیهانە کە (یاساکانی حامورابی) بەڵگەی مەزنی و گەورەیی ئەوە. ئەم یاسایانە، کۆنترین تۆمارێکە تا ئێستا لەژێر وێرانەکانی شوش دۆزراوەتەوە[1] و هەنووکە لەمۆزەخانە لوڤەری پاریس دەپارێزرێت.

لەساڵی ٢٠٩٣پ.ز ریسیمینی پاشای عیلام هێزەکانی خۆی کۆکردۆتەوە و دژی حامورابی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردۆتەوە. حامورابی ئەوی لەشاری لارسام دەرکردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا عیلام سەربەخۆیی خۆی لەدەست نەداوە. خونبان نومیان دەرکەوتووە و دووبارە بنەماکانی دەوڵەتی عیلامی سەقامگیر کردۆتەوە.

[1] - کۆنترین تۆمارێکە لەشوش دۆزرابێتەوە وەگەرنە یاساکانی سارگۆنی یەکەم کە لەئەروخ دۆزرایەوە، کۆنترە.

شەمشوایەلونا، کوڕی حامورابی لەگەڵ عیلامییەکان جەنگاوە، کەدورمابوکی پاشای عیلامی تێکشکاندووە بەڵام دوای ئەو جێگرەکانی، کەم کەم کەمتەرخەمییان لەخۆیان نیشانداوە و دەوڵەتی بابل لاواز بووە و سەرئەنجام لەساڵی ۲۰۲۸ بەپێی گێڕانەوەکان، کورد و ئاشور و یۆنان، بەلوزی ئاشوری (=بەلعوز) پاشای ئاشور، کەلدەی خستۆتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی و پاشایەتی هەردوو وڵاتی کەلدە و ئاشوری گرتۆتە دەست.

دوای مەرگی ئەو، کوڕەکەی نین یا نینە کەیۆنانییەکان بەنینوس ناوی دەبەن، هاوسەری شمارمی شاژنی بابل (=سەمیرامیس) لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە و کەلدە و ئاشوری بۆ ماوەیەك لەژێر دەستا بووە و توانیویەتی سنووری دەسەلاتەکەی لەدوورگەی عەرەب تا هیند و لەسنورەکانی بەسرە تا چیاکانی قەوقاز فراوان بکات. ئەم پاشایە ڕووبەڕووی دەوڵەتی ماد بۆتەوە و پاشای مادی گرتووە و لەخاچی داوە (مێژووی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلات، ل ۱۳۰) و (مێژووی کۆنی ئەورامان ل ۹٦) و (جاماسنامە، ل ۱۱۵) و (ایینەی سکەندەری ل ۱۰۵).

ئەم پاشایە، بۆ ماوەیەك گەمارۆی خستۆتە سەر شاری بەلْخ. هەرچەند سوپایەکی گەورەی لەگەڵدا بووە بەڵامە نەیتوانییوە ئەو قەلایە بگرێت تا ئەوەی شەمارمی، کەهاوسەری یەکێك لەسەردارەکانی نینە بووە، لەگەڵ چەند کەسێك لەسوپاییەکان، لەڕێگەیەکی دژوارەوە ڕۆشتۆتە ناو شار و سوپاکەی بردۆتە ناو شار. ئەم بوێرییە، دڵی نینەی بۆ لای شمارمی ڕاکێشاوە و ئەوی لەهاوسەرەکەی سەندووە. هاوسەری شمارمی بەدوای ئەم پێشهاتە خۆی کوشتووە.

نینە، شاری ئاشوری گۆڕیوە، کەمێك لەسەرووی ئەو شارە، شارێکی دیکەی دروست کردووە و لەبەر ناوی ئەو، کوردەکان بەنین ئاوا ناوی دەبەن: یانی نین ئاباد و بەهۆی تێپەڕینیی زەمەن و زۆری بەکار بردن بۆ نەینەوا گۆڕاوە.

دوای مردنی نینە،[1] لەبەر ئەوەی کورەکەی نینیا (نین نیا) کە یۆنانییەکان بەنیناس ناوی دەبن، منالْ بووە، شمارمی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی کەلدەی گرتۆتەدەست و بۆ ئەوەی بەتەواوی کەلدانییەکان ملچکەی فەرمانەکانی بکات، لەکەنارەکانی خوارەوەی فورات، پایتەختێکی گەورەتر لەشاری نەینەوای دروست کردووە کەشاری بابلە و حەسارێکی

[1] – جەنازەی نینە لە نەینەوا لەژێر ستوونێك کەهەزار زەرع بەرزە، بەخاك سپێردراوە.

بەدەوری شارەکەدا کێشاوە کەدەوراندەوری حەسارەکە حەفتا هەزار مەتر و پانییەکەی بەئەندازەیەك شەش عارەبانە بتووانن بەئاسانی لەتەنیشت یەکەوە بڕۆن، فراوان بووە. لەسەر ڕووباری فورات کە بەناو شارەکەدا ڕۆشتووە، پردێکی گەورەی هەڵبەستووە و لەسەر پردەکە کۆشك و باخێکی دڵگیری بنیات ناوە. ئەم شاژنە بەوڵاتە پان و بەرینەکەی خۆیدا گەڕاوە، بناغەی شارەکان و ڕێگەکانی داڕشتووە و لەکوێستانەکان جادەی لێداوە. زۆربەی بینا مێژووییەکانی ئاسیا بۆ ئەم شاژنە دەگێڕنەوە وەك باخە هەڵواسراوەکانی بابل، کەیەکێك لەحەوت شتە سەرسوڕهێنەرەکەی جیهانی کۆن بووە.

کەتیبەی شمارمی لەسارای دەریاچەی ئۆراڵ بەناوبانگە. لەو کەتیبەدا، کردەوەکانی خۆی باس کردووە و دەنووسێت: سروشت جەستەی ژنی پێدام، بەڵام کار و کردەوەکانم، منی کردۆتە هاوسەری گەورەترینی پیاوەکانی دنیا.

ئەم شاژنە، هێرشی کردۆتە سەر هیندستان و لەڕووباری سند گوزەری کردووە بەڵام پاشای هیند بەهۆی فیلە جەنگییەکان توانیویەتی شکستی پێبێنێت (مێژووی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات ل ١٣٠)، (ایینەی سکەندەری ل ١٠٣ و ١٠٥ و ١٢٥)/ (نخبە الازهریە ل ٥٢٥/٥٣٠)، (مێژووی کۆنی ئەورامان ل ١١٢ و ١١٧) و (جاماسنامە ل١٢٨).

دوای گەڕانەوە لەم شکستە، گرفتاری جەنگی زابولییەکان بووە و لەئەنجامی شەڕەکە بریندار دەبێت و بەبرینداری دەگەڕێتەوە بۆ بابل و دەستی لەپاشایەتی هەڵگرتووە.

کوڕەکەی نینیا لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە و دوای سی ساڵ پاشایەتی، لەبەر نەزانی و زێدەڕۆیی، لەسەر دەستی رامسسی دووەم، فیرعەونی میسر، شکستی خواردووە. بەمپێیە وڵاتی کەلدە و ئاشور بۆ ماوەیەك باجیان بەدەوڵەتی میسر داوە.

لەدەوروبەری سەدەی بیستی پ.ز، حکومەتی ئاشوری بریتی بووە لە حکومەتە بچوك و لاوازەکان کە بەزۆری لەژێر کاریگەری چیانشینەکان بوون یانی عەشیرە کوردەکان. ماوەیەکی کەوتوونەتە ژێر رکێفی دەوڵەتی میتانی. یەکەم فەرمانڕەوای ئاشوری ئەم قۆناغە کەشێمانە دەکرێت لەسەدەی ٢٣ پ.ز بێت، کوڕی ئەیاکولابا بووە کەناوەکەی هاوشێوەی ناوە گوتییەکانە. ئوشپیا و کیکیا، فەرمانڕەوا کۆنەکانی ئاشور کە لەم قۆناغەدا بوون، شێمانە دەکرێت، میتانی بن. یەکێك لەپاشاکانی ئاشور لەسەدەی ١٩ بەناوی ئاداسی، شێمانە دەکرێت زاگرۆسی بێت. دوای ئەوە پاشایەك بەناوی لۆلۆلای، پاشایەتی ئاشوری

گرتۆتە دەست کە لەناوەکەیەوە دەردەکەوێت سەر بەلۆلۆییەکانە.
دوای لاوازی فیرعەونەکان، دەوروبەری ساڵی ١٧٦٠ پ.ز یا بەپێی گێڕانەوەی پرۆفیسۆر سپایزار ١٧٤٦ پ.ز، کوردە کاسییەکان یا بەوتەی ئاکادییەکان: کاسۆ کە لەچیاکانی زاگرۆس نزیک کرماشان نیشتەجێ بوون و بەکوردە هەتاو پەرەستەکان بەناوبانگ بوون، لەگەڵ عەشیرە هاونەژادەکانی خۆیان، گوتی، لۆلۆیی، لەژێر فەرماندەیی خاندیژ (=کاندیش) سەرۆکی کاسییەکان، دەستیان بەسەر کەلدەدا گرتووە و لەگەڵ دانیشتووانی ئەو سەرزەمینە تێکەڵ بوون و دەوڵەتێکی بەهێزیان لەکەلدە (شومێر) و ئاکاد دامەزراندووە کە بەحکومەتی کاردۆنیا یا کردۆنیاش بەناوبانگە. ئەم حکومەتە نزیکەی شەش سەدە درێژەی کێشاوە، لەساڵی ١٧٤٦-١١٧١ پ.ز کەهیچ دەسەڵاتێك نەیتوانیوە بەم ئەندازەیە لەبابل بەردەوام بێت.
دوای ئەوە دەسەڵاتی ئاشور دووبارە سەربەخۆیی خۆی بەدەست هیناوەتەوە. بلوزی دووەم کە لەنەژادی شمارمییە (=سەمیرامیس)، لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە و بەبەشداری کچەکەی ئاتوسا، کاروباری ولآتیان بەڕێوە بردووە. دوای مردنی بلوز، ئاتوسای کچی بەتەنیا کاروباری ولآتی بەڕێوە بردووە. دوای ئاتوسا، بەلچتور ناوێك (=بەعلتور) لەبنەماڵەی ئاتوسا، لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە و تا ساڵی ١٢٨٠ پ.ز پاشایەتی ئاشور لەدەست نەژاد و بنەماڵەی بەڵتور بووە.
ئەداد نیراری پاشای ئاشور، لەسەدەی ١٣ پ.ز لەیەکێك لەبەرهەمە دۆزراوەکان نووسیویەتی:
سوپای کاسی و گۆتی و سوباریم تێکشاند. ئەم گوتییە، هەمان گوتی هاوچەرخی شومێر و ئەکادە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.
دواتر لەساڵی ١٢٨٠ پ.ز سەلمانازاری یەکەم لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە، بازنەی هێرش و و پەلامارەکانی بۆ گرتنی ولآتانی دراوسێ تا ئورارتو (ئارارات) و خانی گاڵبات (=لەناوچەکانی نەسیبین) فراوان کردووە و چەندین شەڕی قورسی لەگەڵ عەشیرەکانی گوتی ئەنجامداوە. خۆی دەڵێت: گوتییەکان، کە لەئاسمانی ئەم قۆناغەدا وەك ئەستێرە دەدرەوشانەوە و نەتەنیا بەهێز و زۆر بەڵکو بۆ بوێری و ئازایەتی و کاولکاری بەناوبانگ بوون، لەبەرابەر من ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و درێژەیان بەدوژمنایەتی

خۆیاندا. هەروەها لەکۆتاییەکانی گێڕانەوەی ئەم جەنگە کەسوپای ئاشور دوژمنەکەی خۆی شکستداوە و چەندین بەلاَ و کارەساتیان بەسەردا هێناون، سەلمانازار دەنووسێت: لەسنوری ئورارتی تا کموخی، لەم سەرزەمینە پان و بەرینەدا، خوێنی گوتییەکان وەك ئاو رژا. لەم رستەوە بۆمان دەردەکەوێت کەناوچەی شۆڕشی گوتییەکان لەئەرمەنییە تا چیای توری عابدین بووە.

لەسالّی ۱۲۷۸ پ.ز تەگلاسی نینی (=تەگلاس ئینین) پاشای ئاشور جارێکی دیکە دەستی بەسەر بابلدا گرتووە و دووبارە دەولّەتی ئاشور شکۆ و مەزنی خۆی بەدەست هێناوەتەوە بەلاّم حکومەتی کاسی، یانی دەولّەتی کاردۆنیا، هێشتا سەربەخۆیی خۆی لەدەست نەداوە و لەلاکاش درێژەیان بەفەرمانڕەوایی خۆیان داوە.

ولاّتی پارس (=زابول و کرمان) کەفەرەیدون ئەوانی لەدەستی عەمالیقەکان ڕزگار[1] و سەربەخۆییان بەدەست هێنابوو، باجیان بەئاشورییەکان نەدەدا بەلاّم ولاّتی ماد لەبەر ئەوەی هێشتا لەژێر رکێف و دەسەلاّتی پاشاکانی ئاشوردا بوون، باجیان بەئاشورییەکان دەدا. تەنیا حکومەتێکی بچوك لەبەلّخ، لەژێر فەرمانڕەوایەتی توسەی (=دیۆکس) پاشای ماد مابوویەوە و باجی بەدەولّەتی ئاشور نەدەدا. تایەفەکانی دیکەی ماد و پارس و هتد باجیان بەئاشورییەکان دەدا.

لەسالّی ۱۱۹۰ پ.ز شوترۆك ناخونتای پاشای عیلام، دەست بەسەر بابلدا دەگرێت و تالاّنی دەکات و هەموو کەلوپەلە گرانباییەکان بۆ شوش دەگوازێتەوە. پەیکەری مرودخ لەناو تالاّنییەکان بۆ شوش براوە کەدوای حەفتا سالّ، دووبارە دەیگەڕێننەوە بۆ بابل. (لەمێژووی پیرنیا ئاماژەی بەسی سالّ دراوە، لاپەڕەی ۳۳).

شیل خاخین شوشناخی پاشای عیلام، لەپاشا بەناوبانگەکانی ئەم قۆناغەیە. لەڕۆژگاری ئەو ئەدەبیات، ئەندازیاری، هەڵکۆڵین لەسەر بەرد و پیشەسازی عیلام پێشکەوتنی بەخۆیەوە

---

[1] - مەبەست لەعەمالیقە، عەرەبەکانی کەلدەیە کە بەزوحاکییەکان ناویان دەبەن. پاشاکانی میسر لەوانن و لەنەوەکانی عەملاق یا عەملیق کوڕی لاود کوڕی سام کوڕی نوحن کە لەکۆتایی پاشایەتی جەمشید، لەرێگەی بابل و رووباری فورات هێرشیان کردە سەر ئێران و دەستیان بەسەر ئێراندا گرت. لەلای سویسەوە هێرشیان کردە سەر میسر و دەستیان بەسەر ئەو سەرزەمینەیشدا گرت و نزیکەی پێنسەد و پەنجا سالّ فەرمانڕەوایەتی میسریان کرد. میسرییەکان لەبەر بیابان نشینی و مەڕومالاّت و ئاژەڵداری، ئەوانیان بەهیکسس ناو بردووە یانی پاشا شوانەکان چوونکە لەوشە میسرییەکاندا هیك بەمانای سوڵتانە.

بینیوە، بینا کۆنەکانی سەر لەنوێ نۆژەن کردۆتەوە و بۆ هەر بینایەك کەتیبەیەکی تایبەتی نووسیوە و ئاماژەی داوە بەوەی ئەم بینایە هی کام پاشا و بۆ چ قۆناغێك دەگەڕێتەوە و ئەگەر خودی بیناکە کەتیبەی لەسەر بووبێت، نووسراوەکەی بۆ زمانی ئەنزانی وەرگێڕاوە. بەم شێوەیە هاوکارییەکی گەورەی لێکۆڵەرەوانی ئەمڕۆیی کردووە. سیلسیلەی یاپاش لەرۆژگاری ئەم پاشایە لەبابل دەرکەوتن. (١١٨٤ پ.ن).

لەساڵی ١١٧١ پ.ز لەرۆژگاری تەکلاسی نین، پاشای بابل و ئاشور، کوردەکانی کاسی لەدەرئەنجامی چەندین رووداو کەلای ئێمە زانراو نییە، پاشایەتی شەشسەد ساڵەی کاردۆنیایان لەدەستداوە و بۆ شوێنی سەرەکی خۆیان، زاگرۆس، یانی لورستانی ئەمڕۆیی گەراونەتەوە.

دوای نزیکەی سەد و پەنجا ساڵ لەپاشایەتی تەگلاسی نینی پاشای ئاشور و بابل، دەوڵەتی ئاشور وەك پاشاکەی خۆی گرفتاری لاوازی و سستی بووە. لەساڵی ١١٢٨ پ.ز پالازاری یەکەم (تگلاس پالازار) دەرکەوتووە و جارێکی دیکە شکۆ و مەزنی بۆ دەوڵەتی ئاشور گەراندۆتەوە و سنووری ولاتی ئاشوری لەهەموو لاکانەوە فراوان کردووە و لەگەڵ دانیشتووانی بابل و ماد و لۆلۆییەکان چەند جارێك جەنگاوە و پایتەختەکەی لەشاری نەینەوا بۆ کالاخ گواستۆتەوە.

تگلاس پالازار یەکێك لەپاشا ناودارەکانی ئاشورە کە بانگەوازی شای شاکانی بەهەموو سەرزەمینەکانی دنیای ئەو رۆژە داوە. لەرۆژئاواوە، دەستی بەسەر کوماژندا گرتووە کەیەکێك لەویلایەتەکانی رۆژهەلاتە و تا سەرچاوەکانی دیجلە پێشرەوی کردووە. ئەرمەنستانی هیناوەتە ژێر رکێفی خۆی و تا دەریای سپی ناوەراست درێژەی بەپێشرەوییەکانی خۆیداوە و لەباشورەوە تاکەنداوی فارسی پەیوەستی سنوورەکەی کردووە. ئاشکرایە کوردەکانی رۆژئاوا لەریزی ئەو تایەفانەدا بوون کەباجیان بەدەوڵەتی ئاشور داوە بەلام بەشێوەیەکی گونجاو هەڵسوکەوتی لەگەڵ عەشیرەی نایری کردووە. راگوزین دەڵێت: لەراستیدا سازان و گونجانی تگلاسا پالازاری پاشای ئاشور لەگەڵ پاشاکانی نایری، جێی تێرامانە و ئەم سازان و هەڵکردنە بەپێچەوانەی نەریتی پێشووی پاشاکانی ئاشور بووە بۆیە گومانی تێدا نییە مەبەستی لەم کارانە تەنیا بەدەست هێنانی دەرفەتی گونجاو بووە نەهیچیتر.

ئەم پاشا گەورە، هەموو سەرکەوتنەکانی خۆی لەکەتیبەکاندا باس کردووە و لەیەکێك لەو لەوحانەدا نووسیویەتی: منم تگلاس پالازار، پاشای بەتوانا و سولْتانی نەبەزیو و شەهریاری چوار سوچی دنیا و میری میرەکان و خواوەندی خواوەندەکان و پاشای پاشاکان و سولْتانی گەورە و سەرکەوتووی مەزن. منم هاوشێوەی لافاو دوژمنەکانم دەگرمەوە. بەهۆی بەرەکەتی خواوەندی ئاشور، ڕکەبەرم نییە و هەموو دوژمنەکانی ئاشور ملکەچ دەکەم.

لەساڵی ١١١٨ پ.ز بەختنەسری یەکەم (=نابودکودنەزر) پاشای کەلدە، لەسیلسیلەی پاشەکانی بابل دەرکەوتووە. دەستەیەك لەمێژوونووسان ئەویان لەجیاتی (ئاسور دانیل) ناوبردووە.

ئەم پاشایە، سنوری بابلی تا کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست فراوان کردووە و پەیکەری مردۆخی گەراندەوە کەعیلامییەکان حەفتا ساڵ پێش بردبوویان بۆ شوش. بەلاّم زۆری نەخایاند دووبارە عیلامییەکان لەبابل زاڵبوون و لەلای باکوری ڕۆژهەلاّتی عەرەبستانیشەوە، کلدانییەکان هێرشیان کردە سەر بابل و زۆربەی شارەکانیان وێران و تالاّن کرد و بەمشێوەیە بابل سەرەنجام لاواز و ناتەوان بوو. ئەم لاوازی و ناتەوانییە دەوڵەتی ئاشوریشی گرتەوە تا ئەوەی لەسەدەی نۆی پ.ز (=٩٠٠ پ.ز) ئاسورنازیربال (=ئاشور نەسر بەعل) دەرکەوتووە و بەوپەڕی هێزەوە دووبارە مەزنی و شکۆی بۆ دەوڵەتی ئاشور گەڕاندۆتەوە و فراوانی کردووە. لەساڵی ٨٨٥ پ.ز ئەرمەنستانی تالاّن کردووە و دانیشتووانەکەی کوشتار و پاشای ئەرمەنستانی بەزنجیر بەستۆتەوە و ئەوی بۆ ئەربیل هێناوە و لەوێ پێستی داماڵیوە وبەدیواری قەلاّکەی هەڵیواسیوە. چوار جار لەگەلْ کوردەکانی زاگرۆس جەنگاوە. یەکەم جار لەساڵی ٨٨٤ پ.ز کەهێرشی کردۆتە سەر خاکی لۆلۆ، نورئادادی بابلی لەوێ فەرمانڕەوا بووە. لەمەوە دەردەکەوێت کە لەمکاتەدا ولاّتی لۆلۆ ژێردەستەی حکومەتی بابل بووە.

جارێکی دیکە لەدەربەندی بازیانەوە، هاتۆتە ناو خاکی لۆلۆ، دەستی بەسەر چەندین شاردا گرتووە. زیمری کە لەو ڕۆژگارەدا ناوەندی دەوڵەتی لۆلۆ بووە، لەلایەن سوپای ئاشورەوە دەستی بەسەردا گیراوە. فەرمانڕەوای لۆلۆ بەناوی ئامیخا، لەو کاتەدا پەنای بۆ کوێستان بردووە و بەپێی بۆچوونی سراولمستید، مێژووی ئاشور، لاپەڕەی ٨٨و٨٩، لەگەلْ

دەستەیەك لەسەرکردەکان و سوپاییەکان لەقەڵای نیسیر (=کینبا=پیرەمەگرون)، سەنگەریان گرتووە. سوپای ئاشور بەفەرماندەیی جێگری پاشا، یانی سەلمانازار کوڕی ئاسور نازیربال هێرشیان کردوونەتەسەر بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە و سەرئەنجام ئاشتی لەنێوان ئەواندا سەقامگیر بووە.

ئاسورنازیربال، ئەم سەرکەوتنەی وەك شانازییەك بۆخۆی لەقەڵەمداوە و لەنزیك ستونی سەرکەوتنی تگلاس پالازار و توکولتی نینورتا، پاشاکانی ئاشور، ستونێکی بۆخۆی بەرز کردۆتەوە.

بەسەرهاتی توندوتیژی و دڵڕەقی ئەم پاشایە لەمێژوودا بەناوبانگە. ئەم پاشایە پایتەختی ئاشوری لەنەینەواوە بۆ کالاَخ گواستۆتەوە و بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ پاشایەتی کردووە.

دوای ئاسورنازیربال، لەدەوروبەری ٨٦٠ پ.ز کوڕە گەورەکەی سەلمانازاری دووەم، لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە و کەلدە و بابلی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی. یونسی پێغەمبەر لەڕۆژگاری ئەم پاشایە لەنەینەوا دەرکەوتووە. جوولەکەکانی میسر دژی ئەم پاشایە ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. پاشا بۆ سەرکوت کردنی ئەوان هێرشی کردۆتە سەر فەلەستین بەڵام لەکاتی گەمارۆدانی بەیت ئەلموقەدەس (=ئورشەلیم) نەخۆش کەوتووە و مردووە. (٧٨٢پ.ز)

سەلمانازار جارێکیش بەمەبەستی جەنگ رووی کردۆتە کوردستان. ناوی ئەم دوو دەستەی بردووە: پارسوا، ئامادا، دەنووسێت: دەستەی یەکەم لەکوێستانەکانی نێوان ڕووباری زەهاو و دەیالەمە و دووەمی لەدەشتەکانی ئەو دەڤەرە نیشتەجێن. ئەم پاشایە لەساڵی ٨٩٥ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر ویلایەتی زاموئا و تا بەرزاییەکانی چیای نیکیدم و نیکیدی ئیرای گرتووە. ئەم دوو چیایە ئەگەری هەیە تاسلۆجە و گڵەزەردە بن. هەروەها لەساڵی ٨٤٤ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر ویلایەتی نامری، یانی پشدەر و سەردەشتی ئەمڕۆیی. پاشای نامری بەناوی مردوخ مودامیخ هەڵاتووە و پەنای بۆ چیا بردووە.

دەوربەری سەدەی هەشتی پ.ز، سەلمانازار لەبەرابەر سوپای ساردوریسی یەکەم، پاشای ئارارات شکستی خواردووە و ویلایەتی لۆلۆ بۆ ماوەیەك کەوتۆتە ژێر دەستی ساردوریس. لەناوەڕاستی سەدەی هەشتی پ.ز، ویلایەتی زاموئا کەوتۆتە ژێر فەرمانی ئاپلیا،

فەرمانڕەوای سەرکەشی ئاشور و لەکۆتایی ئەم سەدە، ئەم ویلایەتە لەلایەن دەوڵەتی ئاشورەوە پەیوەستی وڵاتی لۆلۆم کراوە. (مێژووی ئاشور، ئولمستیدا لاپەڕەی ٢٤٥)

دوای سەلمانازاری دووەم لەساڵی ٧٨٢ پ.ز، سەلمانازاری سێیەم لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی ئاشور دانیشتووە و ئەمە دوایین پاشا لەسیلسیلەی یەکەم پاشاکانی ئاشورە. بەڵام بەپێی مێژووی یۆنان، ئاشور، سارداناپالی کوڕی دوایین پاشای سیلسیلەی یەکەمی پاشاکانی ئاشورە کە لەجەنگ دژی کەیقوبادی کورد خۆی دەسووتێنێت.

کەیقوبادی کورد کەیۆنانییەکان بەئارباس ناوی دەبەن، لەساڵی ٨٥٣پ.ز لەئیسفەهان دەرکەوتووە. بەو شێوەی لەمێژووی یۆنان، کەلدە و ئاشور ئاماژەی پێدراوە، دەوڵەتی ئاشور لەسەر دەستی ئەو ڕووخاوە بەڵام وەك پێشتر ئامارژەمان پێدا، کەیقوباد ئەو کەسەیە دەستی بەسەر نەینەوادا گرت و کواکسای پاشای ماد کوڕی فەریوەرز (=فەراهورس) دەوڵەتی ئاشوری ڕووخاند.

### ئاشوری نوێ

لەساڵی ٧٤٥پ.ز، یەکەم پاشای سیلسیلەی دووەمی پاشاکانی ئاشور، تگلاس پالازاری دووەم، سەر لەنوێ هێز و شکۆی بۆ دەوڵەتی ئاشور گەڕاندۆتەوە و بۆ ماوەی پانزە ساڵ سەرقاڵی جەنگ و کوشت وکوشتار بووە و توانیویەتی دەست بەسەر بابل و کەلدەدا بگرێت. دیمەشق و سوریەی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆی، دژی دەوڵەتی ماد جەنگیوە و شەست هەزار ئەسیر و تاڵانییەکی فراوانی بردۆتە پایتەختەکەی و بەشێك لەشارەکانی مادی گرتووە. یەکێك لەسەردارەکانی تا چیای دەماوەند پێشڕەوی کردووە و گومانی کردووە ئەم دوایین چیای دنیایە. تگلاس پالازار، کوری گەورەی بلەزیسی کەلدانیە کە لەگرتنی نەینەوا هاوکاری کەیقوبادی کرد.

لەساڵی ٧٣٠ پ.ز کوڕی ئەم پاشا ناودارە، سەلمانازاری چوارەم لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە. لەپێنجەم ساڵی پاشایەتی خۆی ٧٢٥ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر شومرون (=سوماری) پایتەختی نەتەوەی ئیسرائیل و گەمارۆی خستۆتە سەر بەڵام لەکاتی گەمارۆکە مردووە. سوپاکەی ئەو، سارگۆنی سێیەمیان وەك پاشا هەڵبژاردووە کەسەرداری هەموو سوپاییەکان بووە. ئەم سارگۆنە کوڕی دووەمی بلەزیس، مامی سەلمانازاری کۆچ کردووە

کەدەستەیەك لەمێژوونووسان بەهەڵە ئەویان بەسارگۆنی دووەم زانیوە.

سەرئەنجام ئەم پاشا نوێیە دوای سێ ساڵ گەمارۆ، دەست بەسەر شومروندا دەگرێت و هوشیعی پاشای ئیسرائیل قۆلبەست دەکات و منداڵەکانی ئیسرائیلی وەك ئەسیر بۆ کالاخ و ناوچەکانی خابور و شارەکانی ماد کۆچ پێکردووە و لەوێ نیشتەجێی کردوون. (۷۲۲ پ.ز) (کتێبی دووەمی ملوك، بەشی ۱۷ و ۱۸)، (پیرنیا، ئێرانی کۆن) (مێژووی نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەلات).

سارگۆن دوو جار لەگەڵ مادەکانی باکوری رۆژهەلاتی ئاشور، یانی کوردە ئاراراتییەکان جەنگاوە. جاری یەکەم پاشای کوردانی بەناوی دەخو (=دیاکۆ) (فیردەوسی بە دەغۆ ناوی دەبات) قۆلبەست و رەوانەی شامی کردووە، جیاواز لەوە چوار هەزار و هەشتسەد و بیست کەس لەپیاوماقولانی کوردی بۆ سوریە دوور خستۆتەوە (۷۱۵پ.ز)

جاری دووەم دووبارە هێرشی کردۆتە سەر کوردستان و کوردەکانی بەژێردەستەیی ناچار کردووە، چل و پێنج کەس لەسەرکردە کوردەکان رۆشتوونەتە دەرباری ئاشور و سارگۆنیان وەك پاشای خۆیان لەقەڵەمداوە و بەڵێنیانداوە باج بەئاشور بدەن و گوێرایەڵی فەرمانەکانی پاشای ماد نەبن (۷۱۱پ.ز). ئەم سارگۆنە بەرپەرچی هێرشی هەمبانیگاسی پاشای شوشی داوەتەوە کەدژی ئەو ئالای شۆرشی بەرز کردبوو. سەرکەوتنەکانی ئەو لەسەرزەمینەکانی دراوسێ بەناوبانگە. لەپانزە کیلۆمەتری نەینەوا لەکەنار رووبارێکی بچوك قەلایەکی بەناوی خۆی بنیات ناوە (دورساریوگن). لەساڵی ۷۰٦پ.ز لەگەڵ هەموو دەربارییەکان و خەزێنە و خواوەندە بتەکانی لەو قەلا تازەیەدا نیشتەجێ بوون بەلام دوای یەك ساڵ مانەوە لەو قەلایە، کوژراوە.

دوای سارگۆن لەساڵی ۷۰۵پ.ز، سەنحاریبی کوری کە بەنوێنەرایەتی باوکی، فەرمانرەوایەتی بابلی کردووە، بۆ ئاشور گەراوەتەوە و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە. ئەم پاشایە نەینەوای زیاتر رازاندۆتەوە و گۆرەپانێکی تازەی دروست کردووە و خەندەکی بەدەوردا کێشاوە. مێژوونووسان دەوری گۆرەپانەکە بەبیست فەرسەنگ دەزانن، لەخۆگری چەندین بینا و کێڵگەیە. لەجیاتی کۆشکە کۆنەکە کە لەسەر لێواری رووبارەکە بووە، کۆشکێکی تازەی بنیات ناوە کەزیاتر لەبیست هەزار زەرعی چوارگۆشەی گرتۆتەوە.

لەمێژووی نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەلات، لاپەرەی ۱۵۳، چاپی دووەم، ئامارژەی پێدراوە:

سەنحاریب لەگەڵ پاشای کاردۆنیا کەفەرمانڕەوایەتی کەلدەی کردووە، شەڕێکی قورسیان ئەنجامــداوە. لەئــەنجامی شــەڕەکە پاشــای کاردۆنیــا شکــستی خــواردووە و هــەڵاتووە، سەنحاریب بابلی تالاّن و دانیشتووانەکەی لەگەڵ خۆی بردووە.

پێشتر ئاماژەمان پێدا دەوڵەتی کاردۆنیا لەرۆژگاری تەگلاسی نین، پاشای بابل و ئاشور لەناوچووە و کوردەکانی کاسی بۆ زاگرۆس گەڕاونەتەوە. لەم گێڕانەوەی سەرەوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەکوردەکان جارێکی دیکە دەوڵەتی کاردۆنیایان بوژاندۆتەوە.

دوای گەڕانەوەی سەنحاریب لەبابل بۆ ئاشور، دەوڵەتی کاردۆنیا جارێکی دیکە دەستی بەسەر بابلدا گرتووە. بەسەرهاتی سەنحاریب لەبەشی ۱۸ و ۱۹ کتێبی دووەمی (ملوك) و بەشی ۳۲ کتێبی دوومی مێژووی رۆژگاران و مێژووی نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەلاّت، چاپی دووەم، لاپــەڕەی٤٤ و ١٣٦ و ١٥٣و ٢٩٠ و ٣١٣ ئامــاژەی پێــدراوە. ســەرکەوتنەکانی ئــەم پاشایە لەمیسری سەرو، سوریە، بابل و عیلام بەناوبانگە. لەکاتی هێرشی سەنحاریب بۆ شــوش، بــەپێی هەڵبــژاردنی ســەرۆکەکانی عــیلام، کــدورناخونتای دووەم، لەســەر تــەختی پاشایەتی عیلام دانیشتووە بەلاّم نەیتوانییوە رێگە لەهێرشی ئاشورییەکان بگرێت. لەبەر ئەمــە پــەنای بــۆ کوێــستان بــردووە و ماوەتــەوە. خــەڵکی عــیلام بــەهۆی کەمتەرخــەمی و گوێپێنەدانــەکانی ئــەو، لەساڵی ٦٩٢پ.ز گرتوویانە و کوشتوویانە و لــەجیاتی ئــەو، ئومان میناتویــان وەك پاشــا هەڵبــژاردووە. ئــەم پاشــایە، بەرادەیــەك هێــزی بــۆ ســوپای عــیلام گەڕاندۆتەوە کەبابل لەگەڵ عیلام دژی ئاشورییەکان پەیمانی بەستووە.

دوای ســەنحاریب لەســاڵی ٦٨١پ.ز، کــوڕە بــچوکەکەی (ئاســارهادون) یــا (ئاســورهیدون) لەســەر تــەختی پاشــایەتی ئاشور دانیــشتووە. لــەم کاتــەدا میسرییەکان دژی ئاشور ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و عیلامییەکان ئەم هەلە دەقۆزنەوە.

خومبان کالداشی دووەمی پاشای شوش، لەساڵی ٦٧٤ پ.ز هێرشی کردۆتە سەر وڵاتی بابل و تا شاری سیپ باری تالاّن کردووە و لەگەڵ تالاّنییەکی زۆر بۆ شوش گەڕاوەتەوە. خومبان کالداش دوای ماوەیەك مردووە و ئورتاگو جێگەی ئەوی گرتۆتەوە.

ئاسارهادون لەسـاڵی ٦٧١ پ.ز دەسـتی بەسـەر وڵاتـی میسردا گرتـووە و لـەنێوان بیست پاشادا دابەشی کردووە و خۆی وەك پاشای پاشاکانی میسر ناساندووە. ئەم پاشایە وڵاتی ئاشوری گەیاندۆتە ترۆپکی هێز، جگە لەدەوڵەتی غیلام، هیچ دەوڵەتێك لەئاسیای رۆژئاوادا

نەبووە باج بەدەوڵەتی ئاشور نەدات.

لەڕۆژگاری ئاسارهادون، هەموو پاشاکانی پارس، لەلایەن ئاشورییەکانەوە دەستنیشان دەکران. دوای ئەوەی لەژێر ڕکێفی ئاشورییەکان هاتنەدەر، بوونە ژێردەستەی دەوڵەتی ماد. یانی میرەکانی هەخامەنشی کەفەرمانڕەواکانی پارس بوون، لەلایەن دەوڵەتی مادەوە دەستنیشان دەکران (مێژووی پیرنیا، لاپەڕەی ٦٠).

ئورتاگوی پاشای عیلام، بەناچاری پلانی پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئاشوری داڕشتووە بەڵام زۆری نەخایاندووە، کۆچی دوایی کردووە و براکەی، تیومان، جێگەی گرتۆتەوە. ئەویش لەساڵی ٦٥٩ پ.ز لەجەنگی ناسراو بە (تولیز) دژی ئاشورییەکان بریندار دەبێت و ئەسیر دەکرێت. ئاشورییەکان سەری دەبڕن و دەیبەنە نەینەوا و بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر یەکێك لەدەروازەکانی شارەکە هەڵیدەواسن. (مێژووی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات، ل، ١٥٥)، چاپی دووەم (مێژووی پیرنیا ل،٤٠)

دوای کوژرانی ئورتاگو، کوڕە گەورەکەی خومبان نیگاش، لەلایەن پاشای ئاشورەوە، وەك پاشای عیلام دەستنیشان کراوە. ئاسارهادون لەبەر ئەوەی پیر بووە، ڕۆشتۆتە بابل و تەختی پاشایەتی لەساڵی ٦٦٨پ.ز بۆ کوڕەکەی ئاسوربانیپاڵ بەجێهێشتووە. ئەم پاشا گەنجە دووایین پاشای بەتوانای ئاشورە. لەساڵی ٦٤٥٣پ.ز هێرشی کردۆتە سەر عیلام و شکستی بەسوپای عیلامییەکان هێناوە. خومبان نیگاشی پاشای عیلامی قۆڵبەست کردووە. باتام ماریتۆ، برای پاشای عیلام کەپێشتر لەلایەن پاشای ئاشورەوە وەك پاشای عیلام هەڵبژێردرابوو بەڵام سەرپێچی ئاشورییەکانی کرد، ئەویش ئەسیر دەکرێت. ئاسوربانیپاڵ ، ئەم دوو پاشایەی بەعارەبانەکەی خۆیەوە بەستووە. دەوڵەتی عیلام لەئەنجامی ئەم شکستە، بەتەواوی لەناوچووە. لەنەخشەکانی کۆشکەکەی ئاسوربانیپاڵ، وێنەی سەرکەوتنەکەی شوش نەخشێنراوە کەپێستی دیلەکان بەزیندووی هەڵدەماڵن و چاو و نینۆکیان دەردەهێنن و گوێ و ڕیشیان دەبڕن. ئاسوربانیپاڵ جیاواز لەکۆتایی هێنان و لەناو بردنی دەوڵەتی عیلام، چەندین سەرکەوتنی دیکەی بەدەست هێناوە و هەروەها لەرازاندنەوە و گەورە کردنی نەینەوا، دەورێکی بەرچاوی بووە. کۆشکەکەی سەنحاریبی نۆژەن کردۆتەوە و چەندین تالاری تازەی تیا دروست کردووە.

ئەم پاشا بەهێزە، لەو نووسراوانەی سارگۆنی یەکەم لەپەرەستگای ئەروخ، تۆماری کردوون،

لەسەر وەرقەی خشت، روونووسی کردووە و لەگەڵ چەندین لەوحەی دیکە، لەئاشور تۆماری کردووە. کتێبخانەکەی ئەو لەکۆشکی سەنحاریب بەناوبانگە کەفراوانییەکەی زیاتر لەسەد مەتری چوارگۆشەیە. خەملاندوویانە کەهەموو رستە نەخشێنراوەکانی سەر خشتەکان، بەرابەرە لەگەڵ پێنسەد بەرگ کتێبی ئەمڕۆیی کەهەر بەرگێك پێنسەد لاپەڕە بێت.
دوای ئاسوربانیپاڵ شاراکۆی (ساراکوس) کوڕی جێگەی گرتۆتەوە. هێشتا چاو و گوێی نەکراوەتەوە کەدەکەوێتە بەر هێرشی پاشای ماد یانی (کواکسار).

## پاشایەتی تازەی کەلدە

لەساڵی ٦٢٦پ.ز نابوپولاسار، فەرمانڕەوای بابل، کە بەنوێنەرایەتی دەوڵەتی ئاشور، فەرمانڕەوایی دەکرد، شۆڕش دەکات و دەست بەسەر تاج و تەختی دەوڵەتی کەلدەدا دەگرێت.
لەساڵی ٣٢٤پ.ز کواکسار (هوواخشتار) پاشای ماد، کە لەو ڕۆژگارەدا پاشایەکی بەتوانا و خاوەن دەسەڵات بووە و هێز و توانای دەوڵەتەکەی گەیاندۆتە ترۆپك، لەگەڵ نابوپولاساری فەرمانڕەوای کەلدە پەیمان دەبەستێت و کچەکەی خۆی دەکاتە هاوسەری نابوکودنەزەر (بەختنەسر) کوڕە گەورەی نابوپولاسار. لەساڵی ٦٠٩پ.ز سوپای ماد و کەلدە پێکەوە، هێرش دەکەنە سەر ئاشور. دوای سێ ساڵ بەردەوام بوونی جەنگ، سەرئەنجام سوپای هاوپەیمان لەساڵی ٦٠٦ دەڕۆنە ناو نەینەوا. ئاسوربانیپاڵ (ساراکوس) دوای ئەوەی دەبینێت سوپای دوژمن هاتۆتە ناو پایتەختەکەی و سەرقاڵی تالآن کردن و وێران کردن و کوشتارن، لەژیان بێ هیوا دەبێت و خۆی و کەسانی بنەماڵەکەی لەناو کۆشکی پاشایەتیدا دەسوتێنێت. لەکۆتایی جەنگ، سەرکەوتووانی جەنگەکە، ئاشور لەنێوان خۆیان دابەش دەکەن. ڕۆژهەلآت و باکوری دیجلە پەیوەستی دەوڵەتی ماد دەبێت و ناوچەکانی دیکە بەپاشای کەلدە دەبڕێت.
نابوپولاسار، لەبەین ئەلنەهرەین و هەموو ویلایەتەکانی ناوچەی فورات سەرکەوتن بەدەست دێنێت، سوڵتانەکانی فینیقییە و سوریە ملکەچی خۆی دەکات و کوڕەکەی لەگەڵ ژمارەیەك لەسوپاییەکان بۆ ملکەچ کردن و کۆکردنەوەی باج دەنێرێت و خۆی سەرقاڵی ئاوەدان کردنەوەی بابل، پایتەختەکەی، و کاروبارە پێویستەکانی دیکە دەبێت. بەلآم لەبەر ئەوەی

تەمەنێکی بەسەر بردووە، ڕۆژگاری لەبەدی هێنانی ئارەزووەکانی هاوکاری ناکات و لەساڵی ٦٠٤پ.ز ماڵئاوایی لەدنیا دەکات.

نابودکودنەزەر (بەختنەسری دووەم) کەزاوای پاشای مادە و پێش مردنی باوکی، نازناوی پاشایەتی هەڵگرتووە، لەگەڵ مردنی باوکی، نەخو یا نەخائوی پاشای میسری لەکەنارەکانی فورات تێکشکاندووە و بەخێرایی بۆ بابل گەڕاوەتەوە و جڵەوی کاروباری کەلدەی گرتۆتەدەست.

کردەوە و کارە سەرکەوتووەکانی بەختنەسر، لەگرتنی وڵاتەکان و سەرکوت کردنی تایەفەکان و وێران کردنی بەیت ئەلموقەدەس و کۆچ پێکردنی جوولەکەکان لەساڵی ٥٩٧پ.ز لەمێژوودا بەناوبانگە. دانیالی پێغەمبەر، هاوڕۆژگاری ئەم پاشایە. ئەم پاشایە لەئاسیا بەغازی بەناوبانگە، یۆنانییەکان سەبارەت بەو دەڵێن: نابودکودنەزەر، لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەی ئەورووپای گرتۆتەبەر، تا ستوونەکانی هێرکول(=جەبل تارق) پێشڕەوی کردووە.

ئیبن خەلدون لە (العبر) و مەسعودی لە(مروج الذهب) ئیبن ئەسیر لە (تاریخی کامل) و مێژووی سیستان لەلاپەڕەی ٣٤ و هتد.. بەختنەسریان وەك سوپاسالاری (لەهراسب)، نەوەی کەیقوبادی پاشای ماد ناساندووە. دەستەیەك ئەو بەسوپاسالاری بەهمەن دەزانن. شێمانە دەکرێت کودنەزەریان بەگودەرز زانیبێت بەهەمان شێوە کەمێژووی تەبەری، بەرگی دووەم، لاپەڕەی ٦٤٩ و سێرجان مەلکەم، بەرگی یەکەم لاپەڕەی٢٥و٢٦و١٠٥، ڕەهام گودەرزیان بەنابودکودنەزەر نووسیوە یانی کوڕی کودنەزەر.

بەسەرهاتی بەختنەسر لەکتێبی دووەمی (ملوك) بەشی ٢٤ و ٢٥ ئاماژەی پێدراوە.

بەختنەسر سەرقاڵی بەهێز کردن و تۆکمە کردنی سەرزەمینی کەلدە بووە، بابلی کردۆتە گەورەترین شاری جیهان. بابل لەهەردوو لای فورات جێگیر بووە، دیوارێکی چوارگۆشەی بەدرێژایی شەست کیلۆمەتر کەدرێژەی هەر لایەکی ١٥ کیلۆمەتر بووە، دەوری شارەکەی داوە. خەندەکێکی قووڵ و پانیش دەوری ئەم دیوارەی گرتووە کەڕێگەی نەداوە کەس بگاتە بن دیوارەکە. لەو گڵەی لەخەندەکە بەدەست هاتووە؛ خشتیان دروست کردووە، دیوارەکەی لەخشت و قیری کوڵاو بەرز کردۆتەوە. قیریان لەجیاتی قوڕ بەکار بردووە. بەرزایی ئەم دیوارە ٩٥ مەتر و پانییەکەی ٢٥ مەتر بووە کەدوو عارەبانە لەتەنیشت یەك بەئاسانی

توانیوویانە بڕۆن. ئەم دیوارە دووسەد و پەنجا بورجی بووە و جووت جووت دایاننـاون. شـاری بابل سـەد دەروازەی بـووە کەلـە برنج (جۆرە کانزایەکـە) دروست کـراون. ڕووبـاری فورات بەناوەڕاستی شارەکەدا تێپەڕیوە. لەکەنار ڕووبارەکە بەخشت سەدی زۆر گەورەیان دروست کردووە. پردێکی بەردینیان لەسەر ڕووبارەکە هەڵبەستووە، سەقفی پردەکە لەداری زۆر گـەورە دروسـت کـراوە و شـەوانە لایـانبردووە و بـەیانیان دووبـارە دایاننـاوەتـەوە. بەشێوەیەکی گشتی شەوانە ڕووباری فورات پردی نەبووە.

باخ و کێڵگەی زۆریش لەناو شارەکەدا بینراوە کە لەکاتی گەمارۆخرانەسەر شارەکە، بەشی پێویسیتەکانی خەڵکی دەکرد. کۆشکی سەڵتەنەتی لەلای ڕاستی فورات دروست کراوە. بەختنەسر لەکەتیبەیەکدا نووسیویەتی: لەگەڵ ئەوەی مردوخ (خواوەندی بت) منی وەك پاشا هەڵبژارد، بەهەوڵ و کۆششی زۆر دەستم بەدروست کردنی شارەکە کرد، کۆشکێکم بنیاتنا کەبووە هۆی سەرسوڕمانی خەڵك، بنکەی پاشایەتیم لەوێ جێگیر کرد. کۆشکەکەی لەسەر چەندین سەکۆی بەرز جێگیر کرابوو و سەکۆکان لەکەناری فورات تا کەناری شار.

باوکم، نابوپولاسار، ئەم کۆشکەی لەخشت دروست کرد و تیایدا نیشتەجێ بوو، بەڵام بناغەکەی بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاو وێران بووە، من وێرانیەکانم پاك کردەوە تا گەیشتمە ئاوەکە، دواتر سەدێکم لەخشت و قیر بەرز کردەوە و ئەو سەدە بەئەندازەی چیایەك بەرز بوویـەوە. دواتـر تالارەکـانم دروسـت کـرد بەشـاتیری گـەورەی ئـەرز (جـۆرە دارێکـە)، دەرگاکانیشم لەم دارە دروست کرد.

نزیك کۆشکەکە لای ڕووبارەکە، باخە هەڵواسراوەکان بووە. دەستەیەك دەڵێن بەختنەسر ئەو باخانـەی بـۆ شـاژن یـانی کـچی پاشـای مـاد دروسـت کـردووە تـا نموونەیـەك لەجەنگـەڵ و گوڵستانی چیاکانی وڵاتەکەی بێت.

لەکاتێکدا پێشتر ئاماژەمان پێدا، شەمارمی، شاژنی پێشووی بابل، ئەم باخانەی دروست کـرد. ئەگـەری هەیـە بەختنەسـر لـەکاتی نـۆژەن کردنـەوە، ئەوانیـشی نـۆژەن کردبێتـەوە. بەختنەسر لەساڵی ٥٦١پ.ز مردووە. پەرەستگای مردوخ، کەگەورەترین پەرەستگای بابلە، لەتەلارەکانی بەختنەسرە.

## ڕووخانی دەولەتی بابل

دوای بەختنەسـر جێگرەکـانی کـارێکی ئـەوتۆیان ئـەنجام نـەدا. چـوارەمینی ئـەوان کـە

لەبنەماڵەی بەختنەسر نەبووە، کەسێکی بازرگان بوو بەناوی ناونائید (نابوناهید) و لەساڵی ٥٥٥پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی کەلدە دانیشتووە. چەندین پەرەستگای لەپەرەستگا کۆنەکانی بابل نۆژەن کردۆتەوە و پەرەستینی خواوەندەکانی سەرزەمینەکانی دووبارە بلاو کردۆتەوە و خۆی لەدەرەوەی شاری بابل، لەشارێکی بچوك گۆشەگیر بووە تا ئەوەی سیروسی دووەم (کوروشی مەزن) پاشای ئێران، دوای گرتنی لیدی لەساڵی ٥٣٨پ.ز هێرشی کردۆتە سەر بابل و نابوناهیدی ئەسیر و شکستداوە و بابلی هاوشێوەی نەینەوا وێران کردووە و وڵاتی کەلدە پەیوەستی سنوری ئێران کراوە.

ئەمە بوو کورتەیەك لەمێژووی کەلدە، ئاشور و عیلام کەبەهۆی پەیوەندی و بەرکەوتنیان لەگەڵ مێژووی کورد، ماد و پارس، ئاماژەی پێدرا.

## دامەزراندنی دەولەتی ماد

مێژوونووسان سەبارەت بەدامەزراندنی دەوڵەتی ماد بۆچوونیان جیاوازە.، دەستەیەك کەیقوباد (ئاریاس) بەدامەزرێنەری دەوڵەتی ماد دەزانن. دەستەیەکی دیکە کواکسار (کواکشتار=خواخشتەر) بەدامەزرێنەر دەزانن. دەستەیەك دەخو (دیاکۆ) و دەستەیەکی دیکە توس (تیوس= دیۆکس) بەدامەزرێنەری ئەم ئیمپراتۆرییە دەزانن.

بەڵام لەئەنجامی لێکۆڵینەوە و شوێنەوارە دۆزراوەکان، دەگەینە ئەو ڕاستیەی دەوڵەتی ماد لەسەدەی بیست و یەکی پ.ز بوونی بووە چوونکە مێژووی نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەلات و مێژووی کۆنی ئەورمان و جاماسنامە و زۆربەی مێژووەکانی کورد، ئاشور، یۆنان وەك پیشتر ئامازەمان پێدا دەڵێن کەنینەی پاشای کەلدە و ئاشور لەسەدەی بیست و یەکی پ.ز لەگەڵ دەوڵەتی ماد جەنگاوە و پاشای مادی شکست و لەخاچیداوە. لەم گێڕانەوە کەهەمووان لەسەری کۆکن، دەردەکەوێت کەدەوڵەتی ماد، پێش توس و دەخو و کواکسار و کەقوبادیش بوونی بووە و خاوەنی پاشا و دامەزراوەکان بوون. بەمپێیە دەبێت دەوڵەتی ماد زۆر پێشتر لەسەدەی ٢١پ.ز دامەزرابێت بەڵام ئەوەی دامەزرێنەرەکەی چ کەسێك بووە و لەچ ڕۆژگارێك دامەزراوە، هێشتا بۆ ئێمە ڕوون نەبۆتەوە تەنانەت ئەگەر بەوردی خوێندنەوە بۆ مێژووی سارگۆنی دووەم بکەین، دەبینین مادەکان لەڕۆژگاری ئەویش (٢٨٠٠پ.ز) بوونیان بووە.

بەمپێیـە دەتـوانین بڵـێین مادەکـان، لەپێـشتر لـەڕۆژگاری سـارگۆن، یـانی سـەدەی ٢٨پ.ز و لەسەرزەمینی ماد، نیشتەجێ بوون. شێمانە دەکرێت ئەو پاشایانەی ئاماژەمان پێدا، یەکیان دووبارە دەوڵەتی مادی دامەزراندبێتەوە و دەبێت ئەو بەپاشای تازەی ماد ناو ببەین نەك دامەزرێنـەری ئـەو دەوڵەتـە. بەواتایـەکی دیکە جیاوازی مێژوونووسان سەبارەت بەزیندوو کردنـەوە و بووژاندنـەوەی دەوڵـەتی مـاد دەبێـت نـەك دامەزرانـدنی و ئێمـە پێویـستە بزانین دەوڵەتی تازەی ماد لەسەر دەستی کام یەك لەو پاشایانە بووە.

توس (توسە) کەیۆنانییەکان بە (دیۆکس) ناوی دەبەن، لەزەمانی تگلاسی نین، پاشای ئاشـور (١٢٧٨پ.ز) تـەنیا لەبـەڵخ فـەرمانڕەوای دەسـتەیەك لەتایەفـەکانی مـاد بـووە و حکومەتەکەی تایبەت بووە بەناوچەکانی بەڵخ. تایەفەکانی دیکەی ماد و ویلایەتەکانی مادا، باجیـان بەدەوڵـەتی ئاشـور دەدا. تەنانـەت بەشـێك لـەپارس و سەرانسەری وڵاتـی عـیلام و کوردەکانی زاگرۆس و ئاراراتیش لـەژێر فـەرمانڕەوایی ئاشورییەکاندا بوون و باجیـان بـەو دەوڵەتە داوە. بەمپێیە ناتوانین توس بەزیندووکەرەوەی دووبارەی دەوڵەتی ماد بزانین.

دخو (دیاکۆ) لەڕۆژگاری سارگۆنی سێیەم، سەرۆکی بەشێك لـەکوردەکانی زاگرۆس بووە، لەساڵی ٧١٥پ.ز دووبارە لەگەڵ سارگۆنی ئاماژە پێدراو، پاشای ئاشور جەنگاوە و شکستی خواردووە و بۆ سەرزەمینی شام دوورخراوەتەوە. دوای دوورخستنەوە، هیچ شوێنەوارێك لەگرتنەدەستی دووبارەی دەسەڵات لەلایەن دیاکۆ بوونی نییە. بەمشێوەیە ناتوانین ئەویش بەزیندووکەرەوەی دووبارەی دەوڵەتی ماد بزانین.

دەمێنێتەوە کواکسار و کەیقوباد کەیەکێك لەم دووکەسە دەبێت زیندووکـەرەوەی دووبـارەی دەوڵـەتی مـاد بێـت. کواکسار لەگـەڵ ئـەوەی بـەهاوکاری نابوپولاسـاری فـەرمانڕەوای بابل، کۆتـایی بەدەوڵـەتی ئاشـور هێنـا، لەگـەڵ ئەوەیـشدا نـاتوانین ڕووخـانی دەوڵـەتی ئاشـور بەدامەزرانـدنی دووبـارەی دەوڵـەتی مـاد بـزانین چـوونکە دەەوڵـەتی مـاد پـێش ئـەم ڕووداوە دەبێـت خـاوەنی هێـز و دەسـەڵات و دامـەزراوەکان بووبێـت تـا بتوانێـت لەگـەڵ نابوپولاسـار پەیمان ببەستێت و هێرش بکاتە سەر ئاشور. جیاواز لـەوە، پێش کواکسار، فەریوەرزیس (=فراوەرس) باوکی پاشای ماد بووە و پاشایەتی بەشێوەیەکی بۆماوەیی، بۆ ئەو ماوەتـەوە. ئەویش دامەزرێنەری دووبارەی دەوڵەتی ماد نییە.

دەمێنێتـەوە کـەیقوباد کـە لـەناو گێڕانـەوە جیاوازەکـان دەبیـنین، گێڕانـەوەکانی تایبـەت بـەو

لەڕاستییەوە نزیکترە، لەبەر ئەمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی دەوڵەتی تازەی ماد، بەهەمان شێوە کە لەمێژووی کورد، یۆنان و هتد ئاماژەی پێدراوە، لەسەر دەستی کەیقوباد دامەزراوە. هیرۆدۆت ئەو بەدامەزرێنەی دەوڵەتی کیان دەزانێت.[1]

دوای ئەوەی مادەکان لەڕۆژهەڵات، یانی ڕۆژهەڵات زەمین بەرەو باکور و باکوری ڕۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆیی هاتن و لەوێ نیشتەجێ بوون، سەرەتا، تا دەوروبەری ٢١پ.ز ئەم خەڵکە دەستە دەستە بوون و هەر دەستەیەك سەرۆکێکی بووە. پیشەی ئەوان ئاژەڵداری و لەناو عارەبانەکان سەفەریان کردووە و تا سەدەی ٢١پ.ز هیچ چالاکییەکی سیاسی کەنیشاندەری بوونی دەسەڵات و پاشایەتی بێت، لەوان بەدی نەکراوە. (چ پێش قۆناغی پیشدادییەکان ٣٣٤١پ.ز و چ دوای ئەوە تا ڕۆژگاری پاشایەتی نینە، پاشای کەلدە و ئاشور یانی سەدەی ٢١پ.ز) لەکاتێکدا کوردەکانی ئارارات لەسی و حەوت سەدە پێش زایین، ناوەندی چالاکییە سیاسیەکان بوون و پەیوەندی و بەرکەوتنیان لەگەڵ شومیر و ئاکاد و عیلام بووە.

دەردەکەوێت پێش ئەم مێژووە، مادەکان یا هێشتا بەرەو ڕۆژئاوا (ڕۆژهەڵات زەمینی ئێمە) نەهاتوون و یا ئەگەر هاتوون، خاوەنی پاشایەتی و دەسەڵات نەبوون. بەواتایەکی دیکە یا شوێنکەوتەی دەوڵەتی هاونەژادی خۆیان پیشدادی بوون و یا بەشێوەی تایەفە تایەفە و جیاجیا ژیانیان بەسەر بردووە کە ئەم بۆچوونەی دووایی لەڕاستییەوە نزیکترە.

یەکەمجار لەسەدەی ٢١پ.ز ناوی ماد دەردەکەوێت. دواتر لە سەدەی ١٣پ.ز دەبینین توسە لەبەلخ، حکومەتێکی بچوکی بەناو حکومەتی ماد دامەزراندووە و باجی بەئاشورییەکان نەداوە.

دواتر لەسەدەی نۆیەمی پ.ز، جارێکی دیکە ماد لەناو بەڵگەنامەکانی ئاشور بڵاو دەبێتەوە و سەرئەنجام بەهۆی مردنی گرشاسب، دوایین پاشای پیشدادی ٩٠٢پ.ز هێرشی پاشاکانی ئاشور بۆ وڵاتی ماد و پارس دەست پێدەکات و هەر دوو دەستەکە ناچار بوون بۆ پاراستنی وڵاتەکەی خۆیان، دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەبەرابەر دەوڵەتی داگیرکەری ئاشور دابمەزرێنن.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، هۆزەکانی ماد و پارس لەو ڕۆژگارەدا جیاجیا و تایەفە تایەفە بوون و هەرکام لەبەشێکی ئەم سەرزەمینە نیشتەجێ و هەر هۆزێك لەژێر سەرۆکایەتی

---

[1] – یەکێك لەمێژوونووسە یۆنانییەکان لەکتێبەکەی خۆیدا ئاماژەی بەوە داوە مادەکان ٦٥٠٠ ساڵ پ.ز لەئێران ویچ حکومەتیان بووە.

سەرۆك هۆزێك، ژیانی بەسەر بردووە.

مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی (ئەکتزیاس) ناوی فەرمانڕەوکانی مادی بەمشێوەیە ناو بردووە:

١. ئارباس (کەیقوباد)، ٢. ئاستی باراس، ٣. هەشتی بورش، ٤. ماندوس (ماندوشی)، (پیرنیا لەلاپەڕەی ٥٠ کتێبی ئێرانی کۆن، مانوداکسی نووسیوە)، ٥. مەنجیك، ٦. سوزارموس (پیرنیا سوسارموسی نووسیوە)، ٧. ئسپادا (ئسپاداس) (پیرنیا ئسپنداسی نووسیوە)، ٨. ئارتیکا (ئارتیکاس)، ٩. ئاشکیش (پیرنیا ئەستیاکسی نووسیوە)، ١٠. ئاربیان (ئاربیانس)، ١١. ئارمی (ئارمیس)، ١٢. ئارتوز (ئارتوس) (پیرنیا ئارتایوسی نووسیوە)، ١٣. پارسوند (پارسونداس)، ١٤. ئارتینی (ئارتینیس)، ١٥. ئارژەنگ. ئەم فەرمانڕەوایانە زیاتر لە٥٠ ساڵ بەمشێوەیە فەرمانڕەوایەتیان کردووە. تایەفەکانی فارس بەپێی وتەی هیرۆدۆت بریتین لە: ١. پاسارگادی، ٢. مەرفی (مارافی) ٣. ماسپیانی، ٤. پانالی، ٥. دەروەزی، ٦. ژێرمەن، ٧. ساگارتی، ٨. مەردی (ماروی)، ٩. دروپیك، ١٠. داران.

شەش تایەفەی یەکەم یەکەم شارنشین و گوند نشین و چوار تایەفەکەی دیکە، کۆچەری و خێوەت نشین بوون.

گرشاسبی ئامارژە پێدراو، دووایین پاشای سیلسیلەی پیشدادی، کوڕی ویشتاسب کوڕی تەهماسب کوڕی مەنوچێهر کوڕی ئیرەج کوڕی فەرەیدون کوڕی ئاپتین کوڕی جەمشید بووە.

دوای مەرگی ئەو، پارس و ماد بێ سەرەپەرەست و پاشا مانەتەوە چوونکە لەسیلسیلەی پیشدادی کەسێکی شیاو بۆ پاشایەتی نەماوە. ئەفراسیاب کە لەتوران زەمین بووە، بەهۆی کردەوەکانی و توندوتیژی، سەرۆکەکانی زابولستان و کابولستان بەپاشایەتی ئەو ڕازی نەبوون. لەبەر ئەمە هەموو سەرکردەکانی ماد و پارس کۆبوونەتەوە و بۆ کۆتایی هێنان بەو قۆناغە و پاراستنی وڵاتی ماد و پارس لەهێرش و پەلامارەکانی ئاشور، کەیقوبادی کوردیان وەك پاشا هەڵبژاردووە لەبەر ئەوەی کەسێکی بیرمەند و بەتوانا بووە. لەئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە، پاشایەتی لەسیلسیلەی پیشدادی بۆ سیلسیلەی کیانی گوازراوەتەوە. مێژوونووسان لەبەر پەیوەند و یەکگرتوویی ماد و پارس، سیلسیلەی کیانی بەچینی دووەمی پاشاکانی ئێران ناو دەبەن کە لەڕاستیدا کیان، پاشاکانی مادن. (ئامارژەی پێدەدەین.)

## بەندی چوارەم، سەبارەت بەپاشاکانی ماد

### ١- پاشایەتی کەیقوباد

دوای ئەوەی گرشاسب، پاشای پیشدادی، مرد (٩٠٢ پ.ز) وەك پێشتر روونمان کردەوە، ولاتی ماد و پارس گرفتاری پشێوی و نائارامی هاتووە. هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی سەلمانازاری دووەمی پاشای ئاشور، زیاتر بۆتە هۆی ترس و دلەراوکێی سەرۆك هۆزەکانی ماد و پارس. هەموو سەرکردەکان و سەرداران و ڕیشسپییەکانی هەردوو ماد (مادی گەورە و مادی بچوك) و سەرۆك هۆزەکانی پارس، گیل، دەیلەم و خەزەر کۆبوونەتەوە و دوای ڕاوێژی بەردەوام و گۆڕینەوەی بیروڕاکان، سەرئەنجام کەیقوبادی کوردیان کەیۆنانییەکان بەئارباس یا ئارباکسی کورد ناوی دەبەن، و سەرۆکی یەکێك لەتایەفەکانی ماد و بەبیرمەندی و بەتوانایی و شارەزایی لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکان بەناوبانگ بووە، وەك پاشا هەڵدەبژێرن. بەمشێوەیە کەیقوباد لەساڵی ٨٥٣ پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی ماد و پارس دانیشتووە.

لەو کۆبوونەوەدا، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، ئەفراسیاب ئامادە نەبووە و ئالای نارەزایەتی و نەیاری خۆی بەرز کردۆتەوە لەبەر ئەوەی پاشایەتی بەملکی خۆی زانیوە چوونکە یەکێك بووە لەنەوەکانی تور و ڕەچەڵەکی تورانییەکان بەپیشدادییەکان کۆتایی دێت. بەمشێوەیە ئەفراسیاب، کوڕی پشەنگ کوڕی زادشەم کوڕی تور کوڕی فەرەیدون کوڕی ئاپتین کوڕی جەمشیدی پیشدادی، نەیویستووە بەپاشایەتی ماد ڕازی ببێت بەلام لەبەر ئەوەی کەسێکی نەزان و خراپەکار و توندوتیژ و نەشیاو بۆ پێگەی پاشایەتی بووە و جیاواز لەوە توری باوەگەورێی لەدایکەوە چۆتەوەسەر زوحاکی تازی[1]، زۆربەی تایەفەکانی مادستان، زابولستان و کابولستان ئەویان بەشیاوی پاشایەتی نەزانیوە و بەیعەت و پەیمانیان لەگەڵ کەیقوباد بەستووە. لەئەنجامی ئەم نارەزایەتییە، جەنگی توران و ئێران دەستپێدەکات.

مەبەست لەئێران لێرەدا، مادستان، زابولستان و کابولستانە و ئەم جەنگە، یەکەم جەنگێکە ناوی رۆستەم دەخاتە سەر زاران (مێژووی سەرجان مەلکەم لا،١٦).

---

[1] – تور، باوەگەورێی ئەفراسیاب لەگەڵ سەلمی برای، هەردووك لەکچی زوحاکی عەرەب چاویان بەدنیا هەڵهێناوە بەلام ئیرەج لەئێراندوخت کە لەنەژادی تەهمورسە، چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.

دەستەیەك بەهەڵە پاشایەتی کەیقوباد بۆ ساڵی ٧٦٠پ.ز دەگێڕنەوە. کەیقوباد دوای دانیشتن لەسەر تەختی پاشایەتی، سەرەتا ڕووبەڕووی ئەفراسیاب بۆتەوە. ڕۆستەم سەرداری زابولستان و مەهراب سەرداری کابولستانی لەگەڵ قارون و کشواد، دوو سەرداری مادستان، بۆ بەرەی پێشەوەی جەنگ ناردووە. سەرئەنجام دوای ڕووبەڕوو بوونەوە کێشەکە بەئاشتی چارەسەر دەکرێت و کەیقوباد لەڕێگەی بەڵخەوە بەرەو ئیسپەهان[1] بەڕێدەکەوێت.

ئەم پاشایە زۆر بەخێرایی هەموو تایەفەکانی ماد و پارس ملکەچی فەرمانەکانی خۆی دەکات و بۆ ڕێگرتن لەهێرشی ئاشوورییەکان، سوپایەکی گەورەی پێکهاتوو لەپیادە و سوار دادەمەزرێنێت و هاوشێوەی پاشاکانی ئاشور، دەربار و گاردی پارێزەری تایبەت بەخۆی دروست دەکات و لەماوەیەکی زۆر کەم، دەسەڵاتەکانی فراوان دەکات. کەیقوباد شاری ئیکباتان (هەمەدان) دەکاتە پایتەختی خۆی.

سەبارەت بەبیناى هەمەدان، بۆچوونی مێژوونووسان جیاوازە. دەستەیەك دەڵێن: ئەم بینایە دەگەڕێتەوە بۆ شمارمی شاژنی کەلدە (سەمیرامیس) و کەیقوباد نۆژەنی کردۆتەوە. دەستەیەکی دیکە دەڵێن: کەیقوباد خۆی بناغەی بۆ دارشتووە.

پایتەختی کەیقوباد سەرەتا شاری ئیسپاهان بووە، دواتر هەمەدانی ئاوەدان کردۆتەوە و پایتەختەکەی بۆ ئەو شارە گواستۆتەوە.

ئەم بۆچوونەی دوایی، بەڵگەیەکی زۆری لەپشتەوە نییە، بەڵکو بۆچوونی یەکەم لەڕاستییەوە نزیکترە چوونکە پێش کەیقوباد ئەم شارە بوونی بووە و پاشاکانی ئاشور لەسەدەی ١٢پ.ز ئاماژەیان بەو شارە داوە. لێرەوە دەردەکەوێت ئەو شارە لەکۆندا، شوێنی نیشتەجێ بوونی دەستەیەك لەمادەکان بووە و لەبەر ئەمە بەهەنگمادان ناویان بردووە یانی دەستەی مادەکان چوونکە هەنگ بەمانی دەستەیە بەهەمان شێوە کەسەرهەنگ ئەم مانای هەیە و هەروەها (هەنگە، هەنگامە، هەنگۆفت و هتد..) بەڵام بەتێپەڕینیی زەمان هەنگمادان گۆڕانی بەسەر هاتووە و بۆتە هەمەدان. بەڵام وشەی ئیکباتان، لەلایەن هەخامەنشییەکانەوە گۆڕاوە چوونکە هەخامەنشییەکان بەزۆری (د) بە (ت) دەخوێننەوە یانی هەنگمادانیان بەهەنگماتان خوێندۆتەوە. لەکەتیبەکانی هەخامەنشی هەنگمەتان نووسراوە و ئەم وشەیش بەتێپەڕینیی کات و زەمان گۆڕانی بەسەر هاتووە و بۆ تە ئیکباتان.

---

[1] – وشەی ئیسپەهان کۆی وشەی ئیسپاهە بەمانای سوپا، بەڵام بەتێپەڕینی کات بۆتە ئیسفەهان.

ئەحمەد رەفیق لە(مێژووی گشتی) یەکەی، بەرگی یەکەم، باسی ئێران و مەد، سەبارەت بەوشەی مادا، هاوشێوەی هەخامەنشییەکان نووسیویەتی و لەجیاتی وشەی مادای و ئامادای، وشەی ماتای و ئاماتای بەکار بردووە.

بەمپێیە هەمەدان وشەی گۆڕان بەسەر هاتووی وشەی هەنگمادانی ئاشوورییە و ئیکباتان وشەی گۆڕان بەسەر هاتووی هەخامەنشی.

بەهەرحاڵ کەیقوباد بۆ ڕێگرتن لەهێرشی ئاشوورییەکان ئەو شارەی کردۆتە پایتەختی خۆی و نۆژەن و ئاوەدانی کرووە. هەمەدان کەئەمڕۆ پایتەختی کەیقوبادی یەکەم پاشای مادە، لەداهاتوودا، دەبێتە پایتەختی ئازدیاکی (ئاژیدهاکی) دوواپین پاشای ماد کەسیروسی مەزن (کوروش) دەستی بەسەردا دەگرێت. (ئاماژەی پێدەدەین.)

وشەی کەیقوباد پێکهاتووە لەکەی بەمانای گەورە و قوباد کەناوی خودی پاشاکەیە. بەزمانی کوردی دەبێتە کەیکواد. لەهەموو جێگەیەك وشەی کەی بۆ ڕێزگرتن لەپێشەوەی ناوی پاشا و سوڵتانەکانی ماد دادەنرێت.

کەیقوباد، کەیئاپو، کەی پەشین، کەی ئارمین، کەی ئارەش، کەی نیا، کەیکاووس، کەی ئارجان، کەی لەهراسب، کەی هەشتاسب (گەشتاسب)، کەی واکسار (کواکسار) و ...لەبەر ئەمە بەسیلسیلەی کیان ناویان دەبەن یانی گەورەکان. فیردەوسی شاعیر لەهەموو جێگەیەك وشەی کەی بەم مانایە بەکار بردووە: بۆ نموونە سەبارەت بەئاپتین، باوکی فەرەیدونی پیشدادی دەڵێت:

((تۆ بشناس کز مرز ایران زمین

یکی مرد بود ناو او آبتین

زتخم کیان بود و بیدار بود

خردمند و گرد و بی آزار بود))

لەکاتێکدا وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا فەرەیدون و ئاپتین لەپیشدادییەکانن نەك لەکیانییەکان. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کیان بەمانای گەورەکان و پاشاکانە. ئەم ڕێزگرتنە سەرەتا بۆ پاشاکانی ماد بەکار براوە و دواتر بۆ هەندێ لەپاشا هەخامەنشییەکانیش بەکاریان بردووە. بەڵام پاشاکانی پیشدادی و پارسیان بەناوی خۆیان ناو بردووە.

کەیقوباد جیاواز لەوەی ولأتی مادی لەدەستی بیانییەکان پاراست، ولأتی پارسیشی لەهێرش و پەلاماری ئاشورییەکان ڕزگار کرد و هەر دوو ولأتەکەی خستە ژێر سەرپەرەستی و دەسەلأتی خۆی.

گێرانەوەی هیرۆدۆت سەبارەت بەکەیقوباد، لەگەڵ گێرانەوەی شانامە و مێژووەکانی کورد، پارس و تورك، یەکدەگرێتەوە جگە لەوەی هیرۆدۆت دەنووسێت: کەیقوباد چوونکە ویستی لەهێرش و پەلاماری ئاشورییەکان بۆ سەر ولأتی پارس و ماد ڕێگری بکات، لەگەڵ بلەزیسی کەلدانی، فەرمانڕەوای شاری بابل کەئەویش لەهێرش و دەستدرێژییەکانی ئاشور بێزار ببوو، پەیمانی بەست و لەساڵی ٧٦٥پ.ز دەوڵەتی تازەی ماد، لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەخەڵکانی ماد، پارس، عیلام، کەلدە و عەرەب کەزیاتر لەچوارسەد هەزار کەس دەبوون، ڕێگەی نەینەوایان گرتەبەر. سارداناپالی پاشای ئاشور کوڕی سەلمانازاری سێیەم، کاتێك لەم هێرشە ئاگادار دەبێتەوە، بەوپەڕی هێزەوە لەدەرەوەی شاری نەینەوا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. سێ جار ئاگری جەنگ خۆش دەبێت و هەرسێ جارەکە هێرشبەران شکست دەخۆن.

بلەزیس، فەرمانڕەوای بابل، کە لەزانستی ئەستێرەناسی شارەزا بووە، دەڵێت: ئەستێرەکان پێمان دەڵێن ئەگەر سوپاکەی کەیقوباد تا پێنج ڕۆژی دیکە خۆڕاگری بکات، ڕۆژی پێنجەم سەرکەوتن بەدەست دێنن. سوپاییەکان لەبەر ئەوەی بەتەواوی باوەڕیان بەزانستەکەی بلەزیس بووە، لەدەرئەنجامی کاریگەری وتەکانی ئەو، خۆڕاگری دەکەنە پیشە و بەوپەڕی هێزەوە بەرپەرچی ئاشوورییەکان دەدەنەوە. ڕۆژی چوارەم هەواڵ دەگات کەسوپایەکی سەدهەزار کەسی لەبەڵخ و سیستان بۆ هاوکاری کەیقوباد هاتووە.[1] ئێوارێی هەمان ڕۆژ، سوپای ڕۆژئاوا پەیوەستی سوپاکەی کەیقوباد دەبێت. ڕۆژی پێنجەم سوپاکەی کەیقوباد، هێرشێکی سەرانسەری دەکەنە سەر نەینەوا و سوپای ئاشور تێکدەشکێنن. ساردانا پال لەشارەکەدا سەنگەر دەگرێت. سوپای تێکەلأوی کەیقوباد، گەمارۆ دەخاتە سەر چوار دەوری شارەکە و ڕێگە نادەن خواردەمەنی و بژێوی پێویست بەشارەکە بگات بەلأم لەبەر ئەوەی کەرەستەکانی ژیان و جەنگ بەئەندازەی پێویست و کێڵگەی فراوان بۆ کشتوکاڵ لەناو

[1] - لەجاماسنامە هاتووە، ئەم سوپایە بەفەرماندەیی رۆستەمی زابولی و میهرابی کابولی بۆ هاوکاری کەیقوباد هاتوون و بلەزیس بەوتەکانی ورەی بەسوپاییەکان بەخشیوە.

شارەکەدا بووە، گەمارۆکە دووساڵ درێژە دەکێشێت. سەرئەنجام لەساڵی سێیەم، وەرزی بەهار، لەبەر ئەوەی ئاوی دیجلە و لافاوەکان بەشێکی دیواری شارەکەیان وێران کردووە، سوپاکەی کەیقوباد دەڕۆنە ناو شارەکە. کاتێك سارداناپال ئەم بارودۆخە دەبینێت، لەژیان هیوابڕاو دەبێت و هەموو کەسان و ئەندامانی خێزانەکەی و زێڕ و زیو و خشڵەکانی سەڵتەنەتی کۆدەکاتەوە و گڕ بەردەداتەماڵەکەی و خۆی و کەسانی خێزانەکەی و کەلوپەلەکانی دەکاتە خۆراکی ئاگر. جگە لەمشتێك خۆڵەمێش هیچیان لێ نامێنێتەوە. کەیقوباد دووای کۆتایی هێنان بەپاشایەی ساردانپال، دووایین پاشای چینی یەکەم لەپاشاکانی ئاشور، بۆ وڵاتەکەی دەگەڕێتەوە و ئاسودە، سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵاتەکەی دەبێت و هێز و توانا و سنوری دەوڵەتی ماد فراوان دەکات.

لێکۆڵەرەوان، ئەم ڕووداوە بەمشێوەیە کەیۆنانییەکان و کوردەکان باسی دەکەن، وەك ئەفسانە لەقەڵەم دەدەن و دەڵێن: سەلمانازار بێ ئەوەی منالی بۆ بێتە دنیا مردووە، جیاواز لەوە، هێشتا هیچ بەڵگە و شوێنەوارێك کەڕاستی ئەم گێڕانەوەیە پشتڕاست بکاتەوە، نەدۆزراوەتەوە و یۆنانییەکان بەهەڵە بەسەرهاتەکەی کواکساری پاشای ماد، بۆ کەیقوباد دەگێڕنەوە (مێژوی کواکسار کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین). بەلاّم ئێمە دەڵێین: یەکەم ئەوەی ئەو سەلمانازاری مێژوونووسان دەڵێن بێ ئەوەی منالی بۆ بێتە دنیا، مردووە، سەلمانازاری دووەمە و باوکی ساردانپال، سەلمانازاری سێیەمە لەکاتێکدا بەم دواییانە لەشوێنەوارە دۆزراوەکانی نەینەوا ئەوە روون بۆتەوە کەسەلمانازار نەزۆك نەبووە. شەمشی رامانی سێیەم کوڕی ئەوە کە لەساڵی ٨٥٥پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی ئاشور دانیشتووە و دەستی بەسەر شاری هەمەداندا گرتووە و چەندین جەنگی لەئێران (ماد و پارس) ئەنجامداوە. ئەگەری هەیە گومانی نەزۆکی سەلمانازاری سێیەم، هاوشێوەی سەلمانازاری دووەم بێت کەسەرئەنجام ڕاستییەکان روون ببێتەوە یا ئەوەی ساردانپال کوڕی سەلمانازاری نەبێت و کەسێکی دیکە پاشایەتی ئاشوری کردبێت. جیاواز لەوە، پشتڕاست نەکرانەوەی ڕووداوێك بەبەڵگە و شوێنەوارەکان، نیشانی ڕوونەدان یا ناڕاستی ئەو ڕووداوە نییە. لێکچوونی ڕووداوە مێژووییەکان، پێویستی بەدووبارە نەبوونەوەی ئەوان نابێت. چ کێشەیەك دەبێت ئەگەر ساردانپال و ساراکوس هەردووك لەیەك بارودۆخدا مردبێتن چوونکە دوور نییە دووکەس گرفتاری یەك چارەنوس بن.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە پێداگری لەسەر ڕاستی ئەم بابەتە ناکەین و چاوەڕوانین شوێنەوارەکانی ئەینەوا بدۆزرێنەوە و ڕاستییەکان دەرکەون.

دەستەیەك لەمێژوونووسان بەمشێوەیە سیلسیلەی ڕەچەڵەکی کەیقوبادیان نووسیوە کەهاوشێوەی مێژووی کۆنی ئەورامانە: کەیقوباد کوڕی زاد (زاوگ) کوڕی نورگان کوڕی سوسان یا توسان کوڕی ئارمین[1] کوڕی ئارەش (ئاڕەش کوڕی ئاروین یا ئەردبن کوڕی ئارجان کوڕی مانیشار، دەستەیەك مالیسویان نووسیوە) کوڕی توزگان یا توسگان کوڕی نورگان کوڕی سوسار (سوسارمەن) کوڕی کوردو کوڕی مادای کوڕی یاپس کوڕی نوحە.

منداڵەکانی کەیقوباد پێنج کەس بوون:

١. کەیکاوس، ٢. کەی ئاپو، (عەرەب دەڵێن کیافو)، ٣. کەی ئارەش (کەیارشین)، ٤. کەیارمین، ٥. کەی پەشین.

سەبارەت بەماوەی پاشایەتی کەیقوباد بۆچوونەکان جیاوازە، بەڵام ئەوەی لەڕاستییەوە نزیك بێت، ٩٤ ساڵە چوونکە مێژووی کۆنی ئەورامان مردنی ئەو لەدەوروبەری ساڵی ٧٥٩پ.ز نووسیوە و بەپێی وتەکانی ئەکتزیاس، پێش پاشایەتی بۆ ماوەی ٢٦ ساڵ سەرۆك هۆزی بوز بووە. کەواتە ئەوەی دەڵێن ماوەی پاشایەتی کەیقوباد سەد و بیست ساڵ بوو، ئەگەری هەیە بەزیاد کردنی ئەو ماوە بێت کەسەرۆك هۆز بووە و بەمشێوەیە دەبێتە ١٢٠ ساڵ. بەمپێیە تەمەنی ئەو لەسەد و بیست تێپەڕی کردووە. کەیقوباد بۆ بیرمەندی و چارەئەندێشی بەناوبانگە و لەتەمەنی پیریدا هەست و ئەستی خۆی لەدەست نەداوە.

## ٢- پاشایەتی کەیکاوس

دوای کەیقوباد، بۆچوون و گێڕانەوەی مێژوونووسان زیاد لەرادە ئاڵۆز و جیاوازە و شیاوی ئاماژە پێدان نییە. تەنیا ئەنجامێك لەو جیاوازییە بەدەست دێت ئەوەیە کەدوای مردنی کەیقوباد، کاووسی کوڕی (یا کامبوز) لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە.

نووسەری (مجمع التواریخ) کەیکاوسی وەك ئەوەی کەیقوباد نووسیوە کەکوڕی ئەفراد کوڕی کەیقوبادە. دەستەیەکی دیکە ئەو بەمنداڵی منداڵەکەی کەیقوباد دەزانن کەکوڕی سەر کەی

[1] - ئارمین برای قوبادە کەگرشاسب کوڕی ئەتراب کوڕی جەمشیدی پیشدادی لەجەنگ دژی چین، بەبیانوی سەرپێچی کردن لەفەرمانەکان کوشتوویەتی. (جاماسنامە ل، ١٢٨: تاریخ منطقی ل، ٥٦)

نییە یا کەی نیا یا کەی نوو بووە و بەکەی وەش و کەیمانوشیش ناویان بردووە، کوڕی کەی ئاپو کوڕی کەیقوباد.

ئەم گێڕانەوەیە لەڕاستییەوە نزیکە چوونکە کەیقوباد کوڕی نەبووە بەناوی ئەفراد، شێمانە دەکرێت ئەفوا بێت و هەڵەیان کردبێت و ئەفرا یا ئەفراد یان نووسیبێت لەبەر ئەوەی ئەفوا وشەی بەعەرەب کراوی ئەپوایە و بەزیاد کردنی وشەی کەی دەبێت کەی ئەپوا کە هەمان کەی ئاپووە.

ئەم پاشایە بوێر و دلێر بووە، دوای گرتنی هیندستان، ڕێگەی هاماوەرانی (یەمەن) گرتۆتەبەر، لەگەڵ زولئەزعار، پاشای یەمەن پەیمانی ئاشتی بەستووە و کچەکەی ئەوی بەناوی سەودابە کردۆتە هاوسەری خۆی. لەشەوی پەردەی کەیکاوس، دوو کوڕەکەی نەوزەری پیشدادیە(توس و گەستهەم) و سەرکردەکانی دیکەی سوپا گرفتار دەبن و سوپاییەکان ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. کاتێک ئەم هەواڵە بەڕۆستەم دەگات، لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕێگەی یەمەن دەگرێتەبەر. پاشای یەمەن بەناچاری ڕێگەی ئاشتی دەگرێتەبەر و ئەسیرەکان ڕزگاریان دەبێت. کەیکاوس لەگەڵ سەودایە و کەرەستە شایانەکان دەگەڕێتەوە. ڕۆستەم لەئەنجامی ئەم خزمەتە گەورە، نازناوی جیهان پاڵەوانی و حکومەتی سەربەخۆیی سیستانی و کابولستانی پێدەدرێت.

کاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی گرفتار بوونی کەیکاوس و سەردارەکانی دیکە لەتوران زەمین، ئەفراسیاب لەگەڵ هێزی پێویست بەخێرایی ڕێگەی ئێران دەگرێتەبەر. دوای گەیشتنی کەیکاوس بۆ بنکەی پاشایەتی، بێ لەدەستدانی کات، سیاوەشی کوڕی کە یۆنانییەکان بەتیاش پش یا تایش پش، ناوی دەبن، لەگەڵ ڕۆستەم بۆ جەنگی ئەفراسیاب دەنێرێت.

ئەمجارەیش جەنگی نێوان توران و ئێران بەئاشتی کۆتایی پێدێت. کەیکاوس بەم پەیماننامە ڕازی نابێت و توس و نەوزەر بۆ جەنگی ئەفراسیاب دەنێرێت. ڕۆستەم لەم کارە خەمبار و بۆ سیستان دەگەڕێتەوە. سیاوەش کە بەهۆی بوختانی سەودابە، لای باوکی دەستبەسەر کراوە، بەهۆی پیراوی وەیسە، کەیەکێك لەدەستوپێوەندەکانی ئەفراسیاب بووە، دەڕواتە لای ئەفراسیاب. ئەفراسیاب فەرەنگیسی کچی دەکاتە هاوسەری سیاوەش بەڵام سەرئەنجام بەپیلانی گەرسیوەزی برای فەرەنگیش دەکوژرێت. دەستەیەك نووسیویانە: کەیکاوس مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئاسمانی کردووە و لەبەر ئەمە بەنەمرود ناوی دەبەن.

لەکاتێکدا نەمرود، بەپێی دەقی ڕاشکاوی تەورات، بەشی دەیەمی (سەفەری تەکوین)، کوڕی کوش کوڕی حامە و سیلسیلەی کەیکاوس وەك ئاماژەمان پێدا، بەمادا کوڕی یاپس کۆتایی دێت. ڕەچەڵەکی ئەوان جیاواز و جیاواز لەوە کەیکاوس هەزار ساڵ دوای نەمرود چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. شێمانە دەکرێت لەبەر ئەوەی مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئاسمانی کردووە، ئەویش بەنەمرود ناو ببەن. کەیکاوس لەساڵی ٧١٥پ.ز بێ ئەوەی منالێك لەدوای خۆی بەجێبێڵێت، مردووە. دەستەیەك فەریوەرس باوکی توس بەزر کوری کەیکاوس دەزانن. (یۆنانییەکان بەفەراوەرس یا فەراهورس یا فەراهورت ناوی دەبەن، بەڵام بەپێی مێژووی کۆنی ئەورمان و مێژووەکانی دیکە، فەریبۆرز باوکی توس، ئەوەی قوباد کوڕی ئارجانە کەپێنجەم باوکی کەیقوبادە و گرشاسپی پیشدادی کوڕی ئاتراب کوڕی جەمشید لەجەنگی ئێران دژی چین، کە لەلایەن فەرەیدون، پاشای ئێران (ماد و پارس) سوپاسالار بووە، بەبیانوی سەرپێچی کردن لەفەرمانەکان قوباد دەکوژێت.

### ٣. پاشایەتی توس

دوای مردنی کەیکاوس (بێ ئەوەی منالی لەدوای خۆی بەجێهێشتبێت)، بۆ هەڵبژاردنی پاشای ئێران لەنێوان تایەفەکانی ماد، کێشە و ناکۆکی هاتۆتە ئاراوە. دوو دەستەی ئارمینی و قوبادی بۆ وەرگرتنی پۆستی پاشایەتی، پێداگرییان کردووە. سەر سیلسیلەی ئارمینییەکان کە لەهراسب کوڕی کەی ئەرجان (ئەروەند شا) کوڕی کەی مانوش (کەی نیا) کوڕی کەی ئاپو کوڕی کەیقوبادی پاشای ماد بووە و ڕەچەڵەکی ئەو بەئارمین کوڕی ئارجان کۆتایی دێت، لەبەر نەبوونی ئەزمون و شیاوی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، لەلایەن کۆمەڵگای مادەوە پێی ڕازی نەبوون. بەڵام سەر سیلسیلەی قوبادییەکان کەتوس کوڕی فەریبۆرز (فەراهورت)ە، لەگەڵ ئەوەی گۆشەگیر و گوند نشین بووە، بەڵام بەهۆی بەتوانایی و بیرمەندی و شارەزایی لەبەڕێوەبردنی کاروبارەکان ناووناوبانگی پەیدا کردووە و لەلایەن کۆمەڵگای ماد و خەڵکان بەگشتی پەسەند کراوە و پێگەی پاشایەتییان بەو بەخشیوە (٧٠٨پ.ز)

لەهراسب، کەپاشایەتی بەمافی خۆی زانیوە و جیاواز لەوە زاوای کەیکاوس بووە، بەپاشایەتی توس ڕازی نابێت و دەستەیەك شوێنی کەوتوون. توس بەبینینی ئەم بارودۆخە، دەست لەپاشایەتی هەڵدەگرێت و بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕێتەوە و سەرقاڵی

کاروباری وەرزێری دەبێت. بەڵام تایەفەکانی ماد کۆڵ نادەن و لەنێوان ئەو و لەهراسب ئاشتی سەقامگیر و دووبارە دەیگەڕێننەوە بۆ سەر تەختی پاشایەتی (٧٠٧پ.ن).

بارودۆخیان بەمشێوەیە سەقامگیر کرد کەکاروباری پاشایەتی تایبەت بەتوس بێت، خوراسانیش پەیوەستی سنوری دەسەڵاتی توس کراوە. فەرمانڕەوایی ڕۆژهەڵات زەمین یانی ڕۆژئاوا و کابولستان و ناوچەکانی، لەدەستی لەهراسبدا بێت و لەکاتی پێویست هاوکاری یەکتر بکەن. بەمشێوەیە کێشەی نێوان توس و لەهراسب چارەسەر کراوە. لەهراسب بەڵخی کردۆتە ناوەندی فەرمانڕەوایەتی خۆی و توس ئیکباتان کەپایتەختی ڕەسمی دەوڵەتی ماد بووە.

ئیکباتان وەك پێشتر ئامارژەمان پێدا یەکێکە لەو شارانەی شمارمی، شاژنی بابل، بناغەی بۆ دارشتووە و کەیقوباد نۆژەن و ئاوەدانی کردۆتەوە. حەوت دیواری وەك هێمایەك بۆ حەوت تایەفەکەی ماد کەشوێنکەوتە و لایەنگری ئەو بوون، بەدەوری شارەکەدا کێشاوە و هەر دیوارێك بەرزتر لەدیواری بەردەم خۆی بووە و دوایین دیوار لەهەموویان بەرزتر. کۆشکی پاشایەتی لەناو دیواری حەوتەم و لەسەر تەپۆلکەیەك دروست کراوە. بورجی هەموو دیوارەکان بەڕەنگی جۆراوجۆر، وەك هێمای حەوت ئەستێرەکە، ڕەنگ کراوە. سەرۆکی حەوت تایەفەکەی ماد هەرکام لەیەکێك لەو حەوت کۆشکە ژیانیان بەسەر بردووە.

ڕێکخستنی ڕەنگی بورجەکان بەمشێوە بوو: دیواری یەکەم، سپی، دیواری دووەم: ڕەش، سێیەم: سور، چوارەم، شین، پێنجەم: پرتەقاڵی، شەشەم، زیوی، حەوت: کەشوێنی پاشا بووە، ئاڵتونی. (مێژووی پیرنیا ل، ٥١، نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات، ل ٣٧٨، ایینەی سکەندەری، ١٥٠، مێژووی کۆنی ئەورامان ل ١١٨).

توس دوای ئەوەی لەسەر تەختی پاشایەتی لەئیکباتان دانیشتووە، ڕێوڕەسمی تایبەت بەخۆی داناوە کە لەمسکێنەکان کەس نابێت پاشا ببینێت. کاروباری وڵاتی لەنێوان حەوت سەرۆك هۆزەکەی ماد دابەش کردووە و فەرمانی داوە، هەرکەس کارێکی هەیە، سەردانی سەرۆکی تایەفەکان بکات و ئەوان ئەگەر بەپێویستیان زانی، پاشای لێ ئاگادار بکەنەوە. سەرۆکە ئامارژە پێدراوەکان کەڕاوێژکاری کاروبارەکان بوون، فەرمانی ئەنجامدان یا ئەنجامنەدانی کارەکان لەدەست ئەواندا بووە. پێکەنین و تف ڕۆکردن و چڵم فرێدان لەبەردەم پاشا و هەروەها ڕوانین لەروخساری پاشا، یاساغ بووە.

بەردەوام کەوشی بەزێڕچنراو (پێڵاو) لەپێ کردووە و لەسەر تەختی پاشایەتی ئامادە بووە.
لنۆرمانی مێژوونووس دەنووسێت: یەکەم کەس کە لەوڵاتەکەی خۆی، دادگای یاسایی دامەزراندووە، ئەم پاشایە کەیاساکانی ئایینی زەردەشتی یەکەمی (ئازەرهوشەنگ) بەناوی زەند کۆکردۆتەوە و زەردەشتی دووەم (فەرەیدون) کە بەئوخستانرتا ناوی دەبەن، چاکسازی تیا کردووە. ئەم پاشایە، فەرمان و یاساکانی بەهۆی ئەنجومەنی موبدان شرۆڤە و شیکردۆتەوە و لەکاتی خۆیدا خستوویەتیە بواری جێبەجێ کردنەوە کەکتێبی زێڕین ناوی دەبەن (پازەند). داوەری کردنی بەدەستەی موغەکان سپاردووە بەپێی بنەمای دادپەروەری سەرەتایی و چۆنیەتی دادوەری کردنی کۆمەڵایەتی. لەناو موغەکان یەکیانی وەك داوەری تاقانە یا داوەری تایبەت بۆ ویلایەتەکان و ناوچەکانی وڵات ناردووە تا لەهەموو ناوچەکان بەپێی یاسا و ڕێساکانی کتێبی زێڕین، کاروباری دادوەری ڕاپەڕێنن. گەورەیی و مەزنی ئەم پاشایە لەهزر و بەرهەمەکانی ئەو دەردەکەوێت. شێمانە دەکرێت مەبەستی ئەو لەکردەوە مەزهەبییەکان، ڕێگرتن لەبڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نوێی دوایین زەردەشت بووبێت گەگەشتاسب باوەڕی پێی هێنا و لەناوچەکانی بەڵخ و ڕۆژهەڵات بڵاوی کردەوە و بووە هۆی بەناوبانگ بوونی گەشتاسب.

هەمو ئەو فەرمان و ڕێسایانەی توس ئامادەی کرد، تا ڕۆژگاری کوروشی مەزن بەردەوام بوو و لەوە بەدوا، کاروباری داوەری تایبەت بوو بەلێپرسراوان و کاربەدەستانی دەوڵەت و لەزەمانی داریوشی هەخامەنشی بۆ کۆمەڵەی داوەران، یانی چەندین داوەر یا قازی گۆڕا.

توس بۆ ماوەی ٥٣ ساڵ، بەوپەڕی هێز و مەزنییەوە پاشایەتی کرد و شکۆی وڵاتی ماد لەڕۆژگاری ئەو، گەیشتە ترۆپك. شاری توس(خوراسان) یەکێکە لەیادگارییەکانی ئەو.

ناوی توس، توسارمەنە کەکورتیان کردۆتەوە و بەتوس یا توسە یا توسان ناوی دەبەن. یەکێك لەمێژوونووسە یۆنانییەکان دەڵێت ناوی توس، ئارتوس یا ئارتیوسە. ئەم بۆچوونە لەگەڵ نووسراوی مێژووی ئەورامان یەکدەگرێتەوە. یۆنانییەکان توس بەدژەس یا دیۆکس ناو دەبەن کەوشەی گۆڕان بەسەرهاتووی تیوسە یانی (س) یۆنانی پێ زیاد کراوە و بۆتە نیۆسس، دواتر بۆتە دیۆسس یا دژەس و سەرئەنجام دیۆکس.

دەستەیەك گومان دەکەن دژەس کەیقوبادە. لەکاتێکدا خودی هیرۆدۆت کەئەم گومانە تایبەتە بەو، دەڵێت: دژەس کوڕێکی بوو بەناوی فەراوورت لەکاتێکدا کەیقوباد کوڕی

بەناوی فەراوورت نەبووە بەڵکو فەراوورت کوڕی توسە کەدواتر ئاماژەی پێدەدەین.
دەستەیەك گومان دەکەن توس، هەمان توس کوڕی نەوزەرە لەکاتێکدا توس کوڕی نەوزەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەسیلسیلەی پیشدادییەکانە بەمپێیە: توس کوڕی نەوزەر کوڕی مەنوچێهر کوڕی ئیرەج کوڕی فەرەیدون کوڕی ئاپتین کوڕی جەمشید کوڕی نەوینجەهان کوڕی تەهمورس کورشی هوشەنگ کوڕی فەراوەك کوڕی سیامەك کوڕی میشی کوڕی گومەرس کوڕی یاپس کوڕی نوح.
بەڵام ئەم توسە لەسیلسیلەی کیان و لەپاشاکانی مادە. توس کوڕی فەریبۆرز (فەراوەرس) کوڕی شاهرۆخ (ساروخ) کوڕی زادئاز کوڕی ئەروەند کوری قوباد کوڕی ئەرجان باوەگەورەیی پێنجەمی کەیقوباد.
توس لەساڵی ٦٥٥ پ.ز کۆچی دوایی کردووە.

## گەڕانەوە بۆ ڕەچەڵەکی کەیقوباد

منداڵەکانی توسی قوبادی (یانی توسی مادی) وەچە لەدوای وەچە، لەماد و پارس و سەرزەمینە پەیوەستەکانی ئەم دەوڵەتە تا ڕۆژگاری سەرکەوتنی کوروشی مەزن بەسەر ئاژیدهاك، پاشایەتییان کردووە بەڵام منداڵەکانی لەهراسبی کەیقوبادی، لەڕۆژهەڵات زەمین پاشایەتییان دەکرد دواتر لەدەوڵەتی ماد و پارس تا زاڵبوونی ئەسکەندەری مەزن، پاشایەتی ئەوان درێژەی کێشا و لەکاتی زاڵبوونی کوروش لەوڵاتی ماد و پارس، منداڵەکانی لەهراسب لایەنگر و پشتیوانی کوروش بوون. کوروشیش بەوپەڕی ڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەوان کردووە.
لەلەهراسب هیچ شوێنەوارێك لەمێژوودا نابینرێت جگە لەوەی دەستەیەك دەنووسن کەدەستی بەسەر هینددا گرتووە بەڵام گرتنی هیند بێ هاوکاری پاشای ماد و پارس بۆ لەهراسب ئاسان نەبووە. شێمانە دەکرێت لەهێرشی فەریبۆرز بۆ هیندستان، لەهراسب بەشداری کردبێت یا سەرۆکی سوپاکە بووبێت کەمێژوونووسان بەهەڵە گرتنی هیند بۆ ئەو دەگەڕێننەوە.
بەڵام بەرهەمەکانی گەشتاسب کوڕی لەهراسب فراوانە. قەڵای سەمەرقەند و دیواری ڕۆژهەڵات لەڕۆژهەڵات و شاری بەیزای پارس لەشوێنەوارە بەجێماوەکانی ئەوە. گۆڕەکەی

لەشیرازە. گەشتاسب لەسەردەمی ژیانی باوکی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت (٦٦٨پ.ز) لەهراسب لەساڵی ٦٥٠پ.ز مردووە.

پایتەختی گەشتاسپی یەکەم، شاری بەڵخ بووە و دواتر پایتەختی بۆ ئیستەخری پارس گواستۆتەوە. هۆکاری ناوبانگی گەشتاسپ، زیاتر بڵاو کردنەوەی ئایینی زەردەشتی بوو کەتوس ڕێگری لێدەکرد. گەشتاسب لەساڵی ٦٠٢پ.ز مردووە.

فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵات زەمین، لەڕۆژگاری کوروشی مەزن، بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار کوڕی گەشتاسپ کوڕی لەهراسب بووە (٦٠٢-٥٢٣پ.ز). بەهمەن لەکتێبەکانی عەهدی عەتیق بەناوی ئەحشویەروش ناوی هاتووە و یۆنانییەکان ئەو بەئارتاگزرەسس ناو دەبەن. ئەردەشێری درێژدەستیش ئەوە و ئیسفەندیاری باوکی لای یۆنانییەکان بەگزرەسس یا گزرەسز بەناوبانگە کەگەشتاسب ئەوی بۆ جەنگی بنەماڵەی ڕۆستەم نارد و لەوێ کوژرا.

بەهمەن سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی لەهیندەوە تا حەبەشە فراوان کردووە و شوشی کردۆتە پایتەختی خۆی. (٤٦٤-٤٢٤پ.ز) ئەم پاشایە یانی بەهمەنی مادی (ئەحشویەروش) بەپێی مێژووەکانی کورد و وتەکانی کتێبەکانی عەهدی عەتیق (کتێبی ئەستیر بەشی یەکەم) پاشایەتی سەد و بیست و حەوت وڵاتی کردووە. بەدادپەروەری و زانایی و یاساکانی ئەو بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، بەناوبانگە. دەڵێن بەهمەن بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی باوکی، جەنگی لەگەڵ بنەماڵەی ڕۆستەم کرد و فەرامەرز کوڕی ڕۆستەمی کوشت.

لەڕۆژگاری بەهمەن، منداڵەکانی ئیسرائیل، بەختەوەر و بەئاسوودەیی ژیانیان بەسەر دەبرد. بەلشەسەری کوڕی بەختنەسر کە بەنوێنەرایەتی ئەو فەرمانڕەوایی بابلی دەکرد، لەبەر ئاسوودەیی جوولەکەکان لەسەر کار لایبردووە و لەجێگەی ئەو کەسێك بەناوی کوروش کە لەمناڵەکانی جاماسپ کوڕی لەهراسب و دایکی بەمناڵەکانی ئیسرائیل بووە (خوشکی دانیالی پێغەمبەر) وەك فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە دیاریکردووە. (مروج الذهب، بەرگی دووەم لاپەڕەی ٨٢و٨٣)و (سەرجان مەلکەم، بەرگی یەکەم ل ٣١) (روضة الصفا، ل ٢٢٨)

ئیبن خەلدون لەلاپەڕەی ١٦٢ و مەسعودی لە مروج الذهب، لاپەڕەی ٦٤ سەبارەت بەکوروشی ئاماژە پێدراو دەنووسن: لەپاشاکانی بابل بووە. بەهەرحاڵ ئەم کوروشە، جیاوازە لەکوروشی هەخامەنشی کە لەکتێبی عەهدی عەتیق بەکوروشی پارسی یا کوروشی پاشای پارس بەناوبانگە. (کتێبی دووەم مێژووی ڕۆژگارەکان، لاپەڕەی ٣٦ ئایەی ٢٢و٢٣)، کتێبی

عەزرا، بەشی یەکەم و بەشی سێیەم، ئایەی ٧ و بەشی چوارەم ئایەی ٥. کتێبی دانیاڵ، بەشی شەش ئایەی ب٢٨ و و بەشی دەیەم ئایەی یەك.

کەواتە جیاوازی مێژوونووسان سەبارەت بەکوروش بێ هۆیە و ئەم کوروشە جیاوازە لەکوروشی هەخامەنشی. دوای بەهمەن، هومای کچی کەیۆنانییەکان بەپەریزاد ناوی دەبەن، ماوەی چل ساڵ پاشایەتی کردووە (٥٣٣-٤٩٤پ.ز)

پایتەختی ئەو لەعێراق، لەناوچەکانی تیسفون بووە. شێمانە دەکرێت وەك پەچەکردارێك لەبەرابەر کردەوەکانی باوکی رووی کردبێتە ئەو ناوچە. لەرۆژگاری پاشایەتی هوما، دوای مردنی کاووسی هەخامەنشی، کوڕی کوروشی مەزن کە یۆنانییەکان بەکامبوز ناوی دەبەن، داریوشی هەخامەنشی لەسەر تەختی پاشایەتی ماد و پارس دانیشتووە (٥٢١-٤٦٨ پ.ز)

داریوش کوڕی ویشتاسپ کوڕی ئارسام کوڕی ئاریارام کوڕی سیاوەش (تایش پش) کوڕی کوروشی یەکەم کوڕی کاووس (کامبوز) کوڕی سیاوەش (تایش پەش) کوڕی هەخامەنش فەرمانڕەوای پارس و عیلامە کە لەکەتیبەکانی خۆی، خۆی بەهەخامەنشی ناساندووە. لەکتێبی عەهدی عەتیق بەداریوشی پارسی یا داریوش پاشای پارس بەناوبانگە (کتێبی نەحمیاء بەشی دوانزەیەم، ئایەی ٢٢) کتێبی عەزرا، بەشی ٤ ئایەی ٥ و ٢٤ و بەشی ٥ ئایەی٦و٧) داریوش بەیت ئەلموقەدەسی ئاوەدان و نۆژەن کردۆتەوە.

دواتر لەساڵی ٤٢٤ پ.ز، داریوش کوڕی بەهمەن کەلەهومای چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت و لەژێر کاریگەرییەکانی دایکی پاشایەتی کردووە. بەدارایش بەناوبانگە.

داریوش دەستی بەسەرهەموو وڵاتی ماد و پارسدا گرتووە و تا فەلەستین پەیوەستی سنووری دەسەڵاتی ئەو بووە و ماوەی پاشایەتی ئەو، بیست ساڵ درێژەی کێشاوە. داریوش لەکتێبی عەهدی عەتیق بەداریوشی مادی ناسراوە (کتێبی دانیاڵ، بەشی پێنجەم ئایەی ٣١). بەشی ١١، ئایەی یەکەم و بەشی ٩ ئایە یەك ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەداریوش کوڕی ئەحشویەروش لەمناڵەکانی مادە. بەپێی ئەم پێرستە، لەسیلسیلەی کیان یانزە کەس پاشایەتیان کردووە:

١. کەیقوباد، ٢. کەیکاووس، ٣. توس، ٤. فەریبۆرز، ٥. کواکسار، ٦. ئازدیاك، ٧. لەهراسب، ٨. گەشتاسب، ٩. بەهمەن کوڕی ئیسفەندیار، ١٠. هوما، ١١. داریوش (دارا).

لەڕۆژگاری سەڵتەنەتی داریوشی مادی، لەساڵی ۳۳۰پ.ز ئەسکەندەری مەقدۆنی هێرشی کردۆتە سەر ئێران (ماد و پارس). دوای جەنگێکی دژوار و قورس لەناوچەکانی هەولێر، داریوش بەدەستی دوو خیانەتکاری هەمەدانی (جانوسیار و ماهیار) دەکوژرێت و دەوڵەتی ماد کۆتایی پێدێت و هەموو وڵاتی ماد و پارس پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایی ئەسکەندەری مەزن دەبێت. فەرمانڕەوایی ئەسکەندەر تا ساڵی ۳۲۳پ.ز لەئێران درێژەی کێشاوە.

## ٤: پاشایەتی فەریبۆرز

دوای مردنی توس، پەروێوەرزی کوڕی کەناوی هاوشێوەی باوکیەتی (یانی پەریفەر کە وەرز و بەرز بەمانای شکۆ و مەزنین) وعەرەب بەفەریوەرز و یۆنانییەکان بەفەراوەرس یا فەراوەرت یا فەراوەرتیس یا فەروەرتیش ناوی دەبەن، لەساڵی ٦٥٥پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە.
ئەم پاشایە سنووری دەسەڵاتی خۆی لەلایەك تا ڕووباری جەیحون و لەلایەکی دیکە تا هیند و لەڕۆژئاوا تا میزۆپۆتامیا فراوان کردووە. دانیشتووانی فینیقیە و تەرسوس و سیلیسی (کیلکیە) و ئیج ئیل, باجیان پێداوە. عیبرییەکان و میسرییەکان پەیمانیان لەگەڵ بەستووە و لەژێر ئاڵای پشتیوانی ئەودا بوون. شاری ئیکباتان لەڕۆژگاری ئەو بۆتە پایتەختێکی گەورە و ناوەندی ئایینی زەردەشت کە تا ئەو ڕۆژگارە لەشاری بەڵخ بووە، بەفەرمانی ئەم پاشایە بۆ شاری هەمەدان گوازراوەتەوە. لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەمۆزە جیاوازەکان دژی ئاشورییەکان جەنگاوە بەڵام لەکاتی جەنگەکەدا کوژراوە. (٦٢٥پ.ن) پیرنیا دەڵێت لەساڵی ٦٣٣پ.ز کوژراوە.
پارسەکان لەڕۆژگاری ئەم پاشایە ژێردەستەی مادەکان بوون.
ئەحمەد رەفیق لەمێژووی گشتیدا، لەوەرگێرانی فەراوەرت بەهەڵە دەنووسێت فەرهاد لەکاتێکدا فەرهاد ناو بەهیچ جۆرێك لەناو سیلسیلەی پاشاکانی کیان و سیلسیلەی پاشاکانی پیشدادی بوونی نەبووە.

## ٥-پاشایەتی کواکسار (هووخشتەر)

دوای کوژرانی فەریبۆرز، سوپای ماد تێکدەشکێت و ئەوەندەی نامێنێت دووبارە وڵاتی ماد و پارس بکەوێتە ژێر دەستی ئاشوورییەکان، بەناچاری جارێکی دیکە سەرۆك تایەفەکان دەکەونە جموجۆڵ و کوڕەکەی ئەو، بەناوی هووەخشتەر کە یۆنانییەکان بەکواکساتارا و کواکسار و ئێرانییەکان بەسیاکزار ناوی دەبەن، لەساڵی ٦٢٤پ.ز وەك پاشا هەڵدەبژێرن.

میراتێك کە لەباوکەوە بۆ ئەم پاشا مابوویەوە، هەست و ڕقی تۆڵەسەندنەوە لەئاشور بوو. لەبەر ئەمە، ئەم پاشا، سەرقاڵی ڕێکخستن و بەهێز کردنی سوپا دەبێت و هێزی پیادە و سوارەی ڕێك و بەهێز لەجەنگاوەرانی ماد و پارس پێکدێنێت (پیادەکان تیروکەوان و شمشێریان پێبووە).

هێزی سوارەی ماد لەهەموو ڕووەکانەوە لەهێزی سوارەی ئاشور بەهێزتر و باشتر بوون چوونکە سوارەکانی ماد، لەکاتی هێرش بردن، شارەزایانە تیریان دەهاویشت جیاواز لەوە ئەسپی مادەکان، لەرووی چالاکی و تیژپێی و هتد، بەناوبانگ بوون.

هووەخشتەر، دوای ئامادە کردنی ئەم سوپایە، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی، هێرش دەکاتە سەر وڵاتی ئاشور. هەرچەندە ئاشوورییەکان سەرسەختانە بەرگری دەکەن، بەڵام شکست دەهێنن. هووەخشتەر گەمارۆ دەخاتە سەر شاری نەینەوا. لەم کاتەدا هەواڵی هێرش و پەلاماری سەکاکان، یانی سیتەکان کەیۆنانییەکان بەسکولت ناویان دەبەن، بەهووەخشتەر دەگات کە لەقەوقازەوە گەیشتبوونە باکوری سنوری ماد. هووەخشتەر بەناچاری دەست لەگەمارۆی سەر نەینەوا هەڵدەگرێت و بۆ پاراستنی وڵاتەکەی دەگەڕێتەوە. لەباکوری دەریاچەی ورمێ، جەنگێکی قورسی لەگەڵ سەکاکان ئەنجامداوە بەڵام ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان بەرگری بکات و بەناچاری ڕێگەی ئاشتی دەگرێتەبەر و بەمەرجەکانی ئەوان ڕازی دەبێت.

دوای ئەم پەیمانە، وڵاتی ماد و دراوسێکانی، تا دەریای سپی ناوەڕاست دەبێتە گۆڕەپانی هێرش و تالانی سەکاکان. بۆماوەی بیست ساڵ وڵاتی ماد لەژێر دەستی ئەواندا بووە تا ئەوەی هووەخشتەر، لەمیوانییەکی ڕەسمی، سەرخۆشیان دەکات و هەموو سەرکردەکانیان دەکوژێت و پاشماوەی سەکاکان لەوڵاتی ماد دەردەپەڕێنێت (٦١٥پ.ز)

لەم کاتەدا، نابوپولاسار، فەرمانڕەوای ئاشور، لەبابل بانگەشەی پاشایەتی دەکات، پەیمان لەگەڵ هووەخشتەر دەبەستێت و جارێکی دیکە گەمارۆ دەخەنە سەر نەینەوا. پاشای ئاشور بەناوی شاراکۆ (ساراکوس) کوڕی ئاسور بانیپاڵ، لەبەر ئەوەی دڵنیاییە ناتوانێت بەرگەی ئەم سوپا گەورەیە بگرێت، لەکۆشکی پاشایەتی، ئاگر دەکاتەوە و خۆی و بنەماڵەکەی دەکاتە خۆراکی ئاگر. (٦٠٦ پ.ز).

هێرشبەران بەشێوەیەك نەینەوا وێران دەکەن کەدوو سەدە دواتر، لەزەمانی ئەردەشێری دووەمی هەخامەنشی کەگەزنەفۆن لەوێ گوزەری کردووە، نەیتوانیوە ئەو شارە بدۆزێتەوە کەسەردەمانێك یەکێك لەگەورەترین شارەکانی جیهان بووە.

لەبەر ئەوەی ئەم ڕووداوە هاوشێوەی ڕووداوەکەی کەیقوبادە، بۆیە مێژوونووسە بیانییەکان هەردوو ناوەکە بەیەك دەزانن و ڕووداوی یەکەم بەئەفسانە لەقەڵەم دەدەن.

دوای گرتن و وێران کردنی نەینەوا، هاوپەیمانان، ویلایەتەکانی ئاشور لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. ئەو ویلایەتانەی لەکەنارەکانی باکوری دیجلە بووە و هەموو سەرزەمینەکانی ئاشور لەئاسیای بچوك، دەخرێتە سەر سنوری دەوڵەتی ماد. سەرزەمینی شام و فەلەستین دەخرێتە سەر سنوری بابل.

ڕووخانی دەوڵەتی ئاشور، بەو هەموو هێز و توانایەی ئاسوربانیپاڵی باوکی شاراکۆ نیشانیدابوو، جێگەی سەرسوڕمانە چوونکە چل ساڵ پێش ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتی عیلامی لەناو برد. دەستی تۆڵە لەم ڕۆژگارەدا ئەوی بۆ هەمیشە لەسەر نەخشەی ڕۆژگار سڕییەوە.

دوای ڕووخانی دەوڵەتی ئاشور، دەوڵەتی ماد و بابل، ڕێز لەپەیمانەکەیان دەگرن و بۆ بەهێزکردنی پەیمانەکە، پاشای ماد، کچەکەی خۆی دەکاتە هاوسەری پاشای بابل یانی بەختنەسر.

دەڵێن بەختنەسەر لەکەنار ڕووباری دیجلە باخە هەڵواسرەکانی بابلی (کەیەکێك لەو حەوت سەرسوڕهێنەرەکەی دنیای کۆن بووە)، بۆکچی پاشای ماد دروست کردووە.

پاشای ماد دوای ئەم سەرکەوتنە مێژووییە دەسەڵاتەکانی فراوان و بەئاسانی ئەرمەنستان و کاپادوکیەی لەڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچووك داگیر کردووە کەبەهۆی هێرش و پەلاماری سەکاکان بەتەواوی هێز و توانای خۆیان لەدەستداوە. پاشای ماد تا کەنارەکانی ڕووباری هالیس پێشڕەوی دەکات.

کاتێك هووەخشتەر بەسەر سەکاکان زاڵدەبێت و شوێنپێیان هەڵدەگرێت، چەند کەسێك لەوان پەنایان بۆ ئالیاتی پاشای لیدی بردووە. هووەخشتەر داوای ئەو کەسانە لەپاشای ئاماژە پێدراو دەکاتەوە. پاشای لیدی لەتەسلیم کردنەوەی ئەوان خۆی بەدوور دەگرێت. جەنگ لەنێوان دەوڵەتی مادی و لیدی روودەدات.[1] ئەم جەنگە بۆ ماوەی شەش ساڵ لەنێوان هەردوو دەوڵەتەکە بەردەوام دەبێت بیٚ ئەوەی هیچ کام سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەست بێنن. لەساڵی حەوتەم (لەڕۆژی ۲۸ مانگی مەی ٥٨٥پ.ز) خۆر دەگیرێت. هەتاو بەتەواوی ڕەش دەبێت و تاریکییەکی کوشندە باڵ بەسەر هەردوو سوپاکەدا دەکێشێت.

ئەم خۆرگیرانە کاریگەریەکی بەرچاو لەسەر سوپاییەکان بەجێدێڵێت و ئەمەیان وەك هیمای توڕەبوونی خواوەند لەقەڵەم داوە. بەختنەسەری پاشای بابل بۆتە نێوەنجیگەر و کێشەکە بەئاشتی چارەسەر کراوە و ڕووباری هالیس وەك سنووری نێوان ئەو دوو دەوڵەتە دیاری دەکرێت. بۆ بەهێزی کردنی پەیمانی ئاشتی، پاشای لیدی کچەکەی خۆی بەناوی (ئارتی نیس) دەکاتە هاوسەری ئازدیاك کوڕی پاشای ماد.[2]

دەڵێت ئەم خۆرگیرانە لەلایەن، تالیسی مەلیتیەوە دیاریکراوە.

هووەخشتەر یەکساڵ دوای ئەم جەنگە کۆچی دوایی کردووە (٥٨٤ق.ز). دەوڵەتی ماد لەبەر کار و کردەوەکانی و بڕیارە بەبڕشتەکانی ئەم پاشایە، بەهێزترین دەوڵەتی ئەو ڕۆژگارە بووە. سنووری دەوڵەتی ماد لەکاتی مەرگی ئەم پاشایە، بەپێی وتەکانی هیرۆدۆت بریتییە لە:

لەڕۆژهەڵاتەوە: ڕووباری جەیحون کە لەو ڕۆژگارەدا دەڕژایە ناو دەریای خەزەر.

لەڕۆژئاوا: ڕووباری هالیس. لەباکورەوە: دەریای خەزەر و ڕووباری ئاراس و چیاکانی ئارارات تا کەنارەکانی دەریای ڕەش. لەباشورەوە: کەنارەکانی دەریای عەمان و کەنداوی فارس.

پارسەکان لەم ڕۆژگارەدا ژێردەستەی مادەکان بوون.

---

[1] – لیدی ناوی یەکێك لەتایەفەکانی ئاریانە کە لەبەشێکی سەرزەمینی ئاناتولی نیشتەجیٚ بوون. ڕەچەڵەکی ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ لیدیوسی فەرمانڕەوایان.

[2] - هیردۆت ناوی کچەکەی بەئاریە نیس نووسیوە، جیاوازە لەوە دەنووسێت: پاشای مادیش ئامی تیسی کچی خۆی کردۆتەوە هاوسەری کرزوسی کوڕی ئالیاتی پاشای لیدی.

## ٦- پاشایەتی ئازدیاک:

دوای مەرگی کواکسار (هووەخشتەر)، ئازدیاکی کوڕی (ئازیدهاک، ئاژیدهاک)، لەساڵی ٥٨٤ پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت. یۆنانییەکان بە ئاستیاگ یا ئاستیاژ ناوی دەبەن. ناوی ئەو ئیختۆویگۆیە. ئەم پاشایە کەسێکی نەشیاو بووە، نەیتوانیوە کاروباری ئەو دەوڵەتەی کەباوکی بۆی بەجێهێشتووە، بەڕێوەببات. بنەماکانی ژیانی ئەو بەرابواردن و خۆشگوزەرانی و کۆڕوکۆبونەوەکان لەجیاتی جەنگ و فراوان کردنی سنووری دەوڵەتەکەی و ئازاردانی خەڵکان بۆتە یەکێك لەسەرگەرمییەکانی. لەبەر ئەمە خەڵکان لێی ناڕازی و بێزار بوون و لەگەڵ دەرکەوتنی کورووش، بەخێرایی مادەکان پشتی بەردەدەن و پەیوەستی کورووش دەبن.[1]

وڵات بەهۆی هەوڵ و کۆششەکانی کواکسار گەشتبووە ترۆپکی هێز و دەسەڵاتی خۆی، لەرووی سوپا و ڕێکخستنی سوپاییەکان، دەگمەن و بێ وێنە بووە، هەرچەند پاشایەتی ماد، پاشایەتییەکی ڕەها بووە، بەڵام کاروبارەکانی بەڕاوێژکردن بەسەرۆك تایەفەکان ئەنجامداوە.

مادەکان لەڕووانگەی شارستانییەت، پێگەیەکی بەرزیان هەیە. شێرە بەردینەکەی هەمەدان، یەکێك لەکارە جوانەکانی کوردە مادەکانە. هەروەها دووکانی داوود کە لەنێوان کرماشان و قەسری شیرینە و دەخمەکەی (گۆڕ) میاندوئاو و تاقەکەی فەرهاد، لەدویرانی لوڕستان، لەنزیك سەرپول و دەخمەی دێهنەو لەناوچەکانی ئیسحاق وەند و دەخمەی سیرتار لەپڵنگان و قەڵای کەرەفتو و قەڵای زەڵم و دەخمەی ڕەوانسەر و زۆری دیکە لەشوێنەوارە بەجێماوەکان، لەیادگارییەکانی دەورەی مادن.

## پاشایەتی لەمادەوە بۆ پارس

پارسەکان لەوڵاتی خۆیان، یانی کەنارەکانی کەنداوی پارس، لەسەرەتاکانی هاتنیان بۆ ئەو ناوچە بەپێی گێڕانەوەی هیرۆدۆت، سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون. هەندێ کات سەربەخۆ ژیانیان کردووە بەڵام زۆربەی کاتەکان یا ژێردەستی پیشدادییەکان بوون یا

---

[1] – دووایین پاشای ماد لەبەر ئەوەی منداڵەکانی کچ بوون، کوڕوشی کچەزای دەکاتە جێگری خۆی. ئەوەی کورووش دژی پاشای ماد شۆڕشی کردووە، لەراستییەوە دوورە.

باجدەری دەوڵەتی ماد یا کەلدە و ئاشور. هیچ کات لەسنورەکانی خۆیان تێپەڕیان نەکردووە مەگەر هەخامەنش، یەکەم پاشای هەخامەنشی کەپاشایەتی پارس و عیلامی دەکرد و سنووری دەسەڵاتەکەی خۆی تافەلەستین فراوان کرد. بەڵام پاشاکانی دیکەی هەخامەنشی لەگەڵ ئەوەی فەرمانڕەوای عیلام بوون، بەڵام زۆربەی کات لەژێر فەرمانی بەختنەسرەکانی بابل یا پاشاکانی ئاشور و ماد بوون. دوایین پاشای سیلسیلەی هەخامەنشی کە فەرمانڕەوایەتی عیلام و پارسی کردووە، کامبوزیا باوکی کوروشە (ایینەی سکەندەری لاپەڕەی ۳و۱۷٤). هۆکاری ئەوەی هەندێ کات کوروشی مەزن لەکاتی گرتنە دەستی دەسەڵات بەپاشای پارس ناو دەبەن و هەندێ کات پاشای عیلام، ئەوەیە کەفەرمانڕەوایەتی هەر دوو وڵاتەکەی (پارس و عیلام) کردووە. (لاپەڕەی ٦٠ ئێرانی کۆن، پیرنیا).
بەهەرحاڵ حکومەتی پارسەکان لەکوروشی مەزنەوە دەستپێدەکات بەهەمان شێوە کە لەکتێبی مێژووی ڕۆژگاران، بەشی ۳٦، ئایەی بیستەم، ئاماژەی پێدراوە.

## پاشایەتی کوروشی مەزن

دوای ئەوەی دەوڵەتی ماد، بەهۆی چالاکییەکانی کواکسار، گەیشتە ترۆپکی هێز و دەسەڵات، چیتر لەپاشایەتی ئازدیاك کەس نەبوو، دەوڵەتی ماد ببزوێنێت. حکومەتی پارس و ماد نوێنەر و دەستنیشاندەی مادەکان بوون. گەورەکان و پیاوماقوڵانی مادیش، سامانێکی بەرچاویان پێکەوەنا بوو و سەرقاڵی بەزم و خۆشگوزەرانی بوون. ئاسوودەیی و نەترسی خەڵك بۆتە هۆکاری تورە بوونی پاشا و هێدی هێدی ستەم و ئازاری پاشا زیادی کردووە و پەیوەندی نێوان دەوڵەت و خەڵك ڕۆژ بەڕۆژ ئاڵۆزتر و ساردتر بووە. بەمپێیە سەرکردەکانی سوپا بەگشتی دڵسارد و سوپاییەکان بێکار و تەمەڵ بوون. لەم ناوەدا، ئارپاکی وەزیری ئازدیاك کەیۆنانییەکان بەئارباکس یا هارباکس ناوی دەبەن و لەپاشا دڵسارد و بێزارە، خۆی لەوانە نزیك دەکاتەوە کە بەپاشایەتی ئازدیاك ڕازی نین و لەدانیشتنێکی گشتی پەیمانی لەسەر کارلابردنی ئازدیاك دەبەستن. لەگەڵ ئەوانەی پەیماننامەکەیان واژۆ کردووە، بەنهێنی نامە بۆ کوروشی کوڕی کامبوزی فەرمانڕەوای

پـارس و عـیلام دەنووسـێت کەکـچەزای خـودی ئازدیاکـە. نامەکـە بـەگیۆ (گئـۆبرۆ)[1] بـۆ پاسارگادی پایتـەختی پارسـەکان دەنێرێـت و پێـشنیاری پێـدەکات لەگـەڵ سـوپایەکی کـەم رووبکاتە کەنارەکانی ئیکباتان و لەوێ سوپای ماد پەیوەستی دەبێت.

کورش کەیۆناییەکان بەسیروس ناوی دەبەن و لەئاڤێستا گوهرسرو (کەیخوسرەو)، دوای خوێندنەوەی نامەکە لەگەڵ سەرکردە و سەرۆکەکانی پارس و عیلام ڕاوێژ دەکات و لەگەڵ سوپای پارس و عیلام ڕێگەی ئیکباتان دەگرێتەبەر. ئازدیاك لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی ئارپاك، (کەبەڵێنی گرتنی کوروشی داوە) بۆ ڕووبەڕوو بوونـەوەی کوروش دەنێرێت. ئارپاك لەدووەمین هێرش، شکست بەخۆی و سوپاکەی ماد دێنێت و لەگەڵ سوپاکەی ماد، پەیوەستی کوروش دەبێت. ئازدیاك لەم پێشهاتە چاوەڕوان نـەکراوە تـوڕە و خـۆی لەگـەڵ سـوپایەکی دیکـە بـۆ ڕووبـەڕوو بوونـەوەی کـوروش دەڕوات. لەسـەرەتای جەنگەکـە شکست دەخـوات و بەناچاری بـۆ ئیکباتـان دەگەڕێتـەوە و سـەنگەر دەگرێـت. سـەرئەنجام سـوپای کـوروش دەڕۆنـە نـاو شـارەکە، ئازدیـاك ئەسـیر دەکرێـت و بەمشێوەیە دەوڵـەتی مـاد دەڕووخێت. کـوروش هـەموو زێـڕ و زیوەکـانی دەرباری پاشـا بـۆ عیلام دەبات. کوروش لەساڵی ٥٦٠پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی پارس و عیلام دادەنیشێت و لەساڵی ٥٥٠پ.ز دەستی بەسەر هەمەداندا (ئیکباتان) گرتووە.

کـوروش دوای گـرتنی هەمـەدان، کواکـساری دووەم، کـوڕی ئازدیـاك کـەخاڵی کـوروش خۆیەتی، دەکاتـە سـەرداری سوپاکەی و ئەسپەنوی کچی ئارتیماری زاوای ئازدیاك کەکچە پـووری خۆیـەتی وەك هاوسـەر هەڵدەبـژێرێت (یۆنانییـەکان بـەئارتیمبارس نـاوی دەبـەن). کوروش هەموو دامەزراوەکانی ماد وەك خۆی دەهێڵێتەوە تا گومانی جیاوازی نەکرێت، ڕێز لەسـەرکردە و سـەردارەکان دەگرێـت و پلـە و پێگـەی زۆربـەیان بـەرز دەکاتـەوە. کـوروش لەهـەموو ڕووەکانـەوە هۆکارەکـانی ڕەزامەنـدی سـەرکردەکانی مـاد و پـارس دابـین دەکـات کەهاوشێوەی دوو بازووی توانای کوروش بوون. تا زاڵبوونی ئەسکەندەر، ئەم یـەکگرتوویی و ڕەزامەندییە بەردەوام بووە. (نخبە الازهریە، لاپەڕەی ٥٢٠).

---

[1] – گیو، دوای گرتنی ئیکباتان، لەلایەن کوروشەوە، پێگەی سەرداری پێدەبڕێت و بەپێشەنگی ئەو، بابل دەستی بەسەردا دەگیرێت. پێلاوی گیو بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. گیو کوڕی گودەرز کوڕی گشواد کوڕی کەیکاووس کوڕی کەیقوبادە. برای ئاکیر و ڕەهام

کوروش دەوڵەتە تازەکەی خۆی ناونا دەوڵەتی ماد و پارس. (ئایینەی سکەندەری لاپەڕەی ۱۸۲). لەکتێبەکانی عەهدی عەتیق لەجیاتی وشەی ئێران (وشەی ماد و پارس بەکار براوە (کتێبی ئەستیر بەشی یەکەم، ئایەی ۱۹،۱۸،٤،۳ بەشی دەیەم، ئایەی ۲)، (کتێبی دانیاڵ، بەشی ٥ ئایەی ۲۸، بەشی ٦ ئایەی ۱٥،۱۲،۷، بەشی ۸ ئایەی ۲۰)

لەگەڵ ئەمەیشدا تا دوای سەدەیەك لەڕووخانی دەوڵەتی ماد، دووبارە وشەی ماد لەجیاتی پارس بەکار براوە (مێژووی پیرنیا، لاپەڕەی ٥۸). بەواتایەکی دیکە مادەکان ڕازی نەبوون بەوەی وشەی پارس یا ماد و پارس لەجیاتی دەوڵەتی ماد بەکار ببرێت.

هەموو مێژووەکان گواستنەوەی پاشایەتی لەمادەوە بۆ پارس، بەکێشەیەکی نێوخۆیی دەزانن کە لەسەر دەستی خودی مادەکان ئەنجامدراوە و لەجیاتی مناڵی خودی پاشا، کچەزاکەی لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە. تەنانەت ئەم گۆڕانکارییە بەڕووخانی دەوڵەتی ماد نازانن چوونکە ئەگەر بەڕووخانی ماد لەقەڵەمی بدەن، چیتر وشەی ماد بەکار نابەن. تەنانەت لەزەمانی داریوش، دەوڵەتی کوروشیان بەدەوڵەتی ماد ناو بردووە. بەهەمان شێوە لەتەورات کتێبی عەزرا، بەشی شەشەم ئاماژەی پێدراوە کەپایتەختی کوروش وەك پایتەختی ماد ناو دەبات نەك وڵاتی پارس یا وڵاتی ماد و پارس.

ئەحمەد ڕەفیق لەکتێبەکەی خۆی (مێژووی گشتی) دەنووسێت: بەبەشداری هەر دوودەستەی ماد و پارس، دەوڵەتی ئێران دامەزرا. سەرئەنجام دوای ماوەیەکی دوورودرێژ، ئەدیبەکانی پارس، بیریان لەوە کردەوە بەکار بردنی دەوڵەتی ماد بۆ وڵاتێك کەپارسەکان پاشایەتی دەکەن، بێهۆیە. لەلایەکی دیکە لەبەر مادەکان، نەدەکرا وشەی پارس لەجیاتی ماد بەکار ببەن یانی وشەی ماد پشتگوێ بخرێت و وشەی پارس جێگەی بگرێتەوە. جیاواز لەوە بەکار بردنی وشەی پارس بۆ وڵاتێك کەبەشی سەرەکی لەدانیشتووانی ماد پێکدەهات، کارێکی هەڵە بوو. بەناچاری و بەمەبەستی کورتکردنەوە و نەهێشتنی گومان و دوو ناوی کە لەوشەی ماد و پارس بەرهەم دەهات، وشەی ئاریان لەجیاتی وشەی پارس و ماد بەکار برا کەبۆ هەر دوو نەژادەکە دەگەڕایەوە. لەبەر ئەمە لەجیاتی دەوڵەتی ماد و پارس، دەوڵەتی ئاریانیان بەکار برد کەدواتر بەتێپەڕینی کات گۆڕانی بەسەر هاتووە و بۆتە ئێران (مێژووی گشتی، ئەحمەد ڕەفیق، لاپەڕەی ۳٦۳).

بەکورتی وشەی ئێران، وەك مێژووەکانی دنیا پشتڕاستی دەکەنەوە، یەکێکە لەو وشانەی

لەسەدەی چواری پ.ز بەکار براوە کەبۆ ماد و پارس و سەرزەمینەکانی ئەوان بەکار براوە و پێش ئەو مێژووە، پێشتر بەکار نەبراوە.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، بوونی ماد و پارس، مەرجی سەرەکی بەدیهاتنی وشەی ئێرانە، یانی ئێران بەهەردوو دەستەکە دەوترێت.

کوروشی هەخامەنشی، لەهۆزی پاسارگادە کەیەکێکە لەتایەفەکانی پارس. بەپێی بۆچوونی هیرۆدۆت، ناوی شاری پاسارگاد لەناوی ئەم هۆزە وەرگیراوە کەلەوێ نیشتەجێ بوون.

کوروش یەکێکە لەگەورە پیاوانی جیهان کە لەتەورات نازناوی مەسیحی پێدراوە (کتێبی ئەشعیا، بەشی ٤٥). ئەم کوروشە جیاوازە لەکوروشی نەوەی جاماسب. (لاپەڕەی ١٧٣).

کوروش جیاواز لەسەرکەوتنەکانی لەڕۆژهەڵات زەمین، دوو دەوڵەتی بەهێزی لیدی و بابلی ڕووخاند و لەناو برد. ناوی کوروش (ئاگراداد= ئاتەش داد)ە لەهۆزی خوداداد. وشەی کوروش کورتکراوی وشەی کەی خوشرووە کە بەمانای ڕەوشت بەرز و کردار جوان و ڕووخۆشە. کەم کەم ئەم وشەیە بۆ ئەو بەکار براوە و ناوە سەرەکییەکەی لەبیر کراوە.

گۆڕی ئەو لەیەکێك لەقەزاکانی مورغابە کە بەمەشهەدی دایکی سلێمان بەناوبانگە. کەتیبەیەك لەکوروش بەنووسینی بزماریێ لەوێ نەخشێنراوە. کوروش بۆ ماوەی سی ساڵ پاشایەتی کردووە.

## بەندی پێنجەم، زانا و ئەدیبەکانی کوردستان

لەبەر ئەوەی لەشاری سنە کتێبی پیاوماقوڵان و نەژادیان بەئەندازەی پێویست لەبەر دەستا نییە، نەمانتوانی ئاروداخی زانا و ئەدیبەکانی پێش ئیسلام بەدەست بێنین. لەکۆتاییەکانی سەدەی سێی کۆچی بەملاوە، ئەوەی دەستمان کەوت، بەشێوەی کورت و بەپێی بەراوری کۆچ کردنیان، ئاماژەمان پێدا. (زاناکانی سنە و ناوچەکانی لەم پێرستەدا نین و لەبەشی چوارەم لەپێرستی زاناکانی سنە ئاماژەیان پێدەدرێت.).

١. ئەبو محەممەد عەبدوڵلە کوڕی موسلیمی دەینەوەری ناسراو بە ئیبن قوتەیبە، قازی دەینەوەر، نووسەری کتێبی (المعارف و ادب الکاتب و غەریب القران و غەریب الحدیث و عیون الاخبار و مشکل القران و مشکل الحدیث و طبقات الشعراء و الاشربە و اصلاح الغط و تفقیە و الخیل و اعراب القرائات و الانوار و المسائل و الجوابات و میسر و قداح و هتد). ئەم

بەرهەم و کتێبانە، پیشاندەری پێگەی زانست و فراوانی زانیارییەکانی ئەوە. ئەگەر بمانەوێت سەبارەت بەپێگە و شکۆی ئەو شتێك بنووسین، لەبەر ئەوە نییە بمانەوێت پەردە لەسەر ڕاستییەك هەڵبگرین. ئەم زانایە لەساڵی ٢١٣ کۆچی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەزیقەعدەی ٢٧٦ کۆچی کۆچی دوایی کردووە.

٢. ئەبوحەنیفەی دەینەوەری لەکەسە نزیکەکانی جاحزی زانایە، لەزاستە عەقڵییەکان و زانستەکانی کەلام، لەڕۆژگارەکەی خۆیدا بێ وێنە بووە. لەساڵی ٢٨١ کۆچیماڵئاوایی لەجیهان کردووە.

٣. ئەبو عەبدولله محەممەد کوڕی جابری ئەستێرەناس حەرانی کوڕی سەنانی ڕەقی، نووسەری (زیج صابی و مطالع البروج و رسالەی اتصالات و روونکردنەوەی چوار بابەتی بطلیموس و هتد) لەزانستی ئەستێرەناسی شارەزا بووە. لەناو زاناکانی بیرکاری ئیسلام، لەئەوروپا گرنگی زیاتر بەم دەدرێت. لەساڵی ٢٦٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٣١٧ کۆچی دوایی کردووە.

٤. ئەبوجەعفەر ئەحمەدی دەینەوەری کوری ئیبن قوتەیبەیە. کەسێکی زانا و شارەزا بووە. لەساڵی ٣٢١ کۆچی وەك قازی میسر دەستنیشان کراوە و لەساڵی ٣٢٢ چاوی لەجیهان بەستووە.

٥. ئەبوبەکر محەممەد نەقاشی موسڵی: کوری حەسەن کوڕی محەممەد کوری زیاد کوڕی هارون کوڕی جەعفەر کوڕی سەندی موقرییە. جیاواز لەپیشەی نەقاشی، لەزانستی تەفسیر و زۆربەی زانستە دینییەکان، زانیاری تەواوی بووە. کتێبەکانی خوارەوە لەبەرهەمەکانی ئەوە: (شفاء الصدور لەتەفسیر، الاشارە لەغەریبی قورئان، الموضح لەمانای ئایەتە هاوشێوەکان، الابواب لەتەفسیر و ارم ذات العماد و ضد العقل و المناسك و فهم المناسك و اخبار القصاص و ذم الحسد و دلایل النبوە و المعجم الکبیر و المعجم الصغیر و المجم الاوسط، و السبعەی کبیر و السبعەی صغیر و السبعەی اوسط. لەگێڕانەوەی حەدیسەکان هەوڵی زۆری نەداوە و زۆربەی ئەو حەدیسانەی لەتەفسیرەکەی خۆی ئاماژەی پێداون، صحیح (ڕاست) نین. لەساڵی ٢٦٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٣٥١، سێی شەوال کۆچی دوایی کردووە.

٦. سەری رفای موسڵی: ئەبولحەسەن کوڕی ئەحمەد سەری کەندی، یەکێك

لەئەدیبەکانی موسڵ بووە، لەشێعردا شارەزا و لەئەدەبیات، خاوەنی چەندین بەرهەمە. یەکێك لەکتێبەکانی، محب و محبوب و کتێبی دیره یە.لەم دوو دێڕەدا ڕەخنەی لەپیشەکەی خۆی گرتووە.

(و كانت الابرة فی مامضی

صائنة وجهی و اشعاری

فاصبح الرزض بها ضیقا

كانه من ثقبها جاری.

لەساڵی ٣٦٦ کۆچی ماڵئاوایی لەجیهان کردووە.

٧. شێخ عەبدوڵلە رودباری: یەکێکە لەشێخە گەورەکانی تەریقەت، لەناوچەکاندا ناسراوە. لەساڵی ٣٦٩ کۆچی دوایی کردووە.

٨. ئیبن جەنی نەحوی موسڵی: ناوی عوسمان و نازناوەکەی ئەبولفەتحە. لەزانستی عەرەبیە و ئەدەبیات شارەزایی تەواوی بووە و بەناوبانگە. کتێبەکانی خوارەوە لەبەرهەمەکانی ئەوە: (الخصایص، صر الصناعه و تلقین لەنەحو و المصنف و التعاقب و الكافی و المنهج و تذكره اصفهانیه و مختار تذكره ابن علی و المقتضب و معتل العین و اللمع و التنبیه و المهذب و تبصره و کورتەیەك لەعروز و کورتەیەکی دیکە لەقەواف و شرۆڤە کردنی ئیبن جەنی لەسەر دیوانی موبتەنی بەناوبانگە). پێش ساڵی ٣٣٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لە ٢٨ سەفەری ٣٩٢ چاوی لەجیهان بەستووە.

٩. ئیبن کەجی دەینەوەری: قازی یوسف کوڕی ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی کەج یەکێك لەئیمامەکانی شافعیە کە لە (فن خلاف) شارەزا و لەمەزهەبی شافعی پشت بەقسە و بۆچوونەکانی دەبەسترێت. لەدەینەوەر کاروباری داوەری کردووە و چەندین بەرهەمی هەیە. جیاواز لەزانست، کەسێکی دەوڵەمەندیش بووە. لەشەوی ڕەمەزانی ٤٠٥ کۆچی، دەستەیەك دز دەڕۆنە ماڵەکەی و لەناو جێگەکەی دەیکوژن و سامان و کەلوپەلەکانی دەدزن.

١٠. شێخ ئەبولحەسەنی هەکاری: شێخولئیسلام عەلی کوری ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی جەعفەر کوری غورفە، کەسێکی زانا و خۆپارێز بووە، مناڵەکانیشی بەهەمان شێوە کەسانی زانا و خۆپارێز بوون. لەساڵی ٤٠٩ چاوی بەدنیا دەپشکوێت و لەساڵی ٤٨٦ ماڵئاوایی لەجیهان دەکات.

١١. ئەبو ئەحمەدی شارەزووری: قاسم کوڕی موزەفەر کوری عەلی کوڕی قاسم، باوکی ئەبوبەکر محەممەدە. ناسراوە بە(قازی الخافقین). ئەبو ئەحمەد باوەگەورێی قازییەکانی شارەزوور، موسڵ و شام و جەزیرەیە. منالەکانی هەموویان قازی و مامۆستا و فەقیە بوون. کەمال ئەلدین محەممەد و محیٚ ئەلدینی کوڕی، لەوەچەکانی ئەون. لەساڵی ٤٨٩ لەموسڵ کۆچی دوایی کردووە.

١٢. قازی ئەبوئەلحەسینی خەلەعی موسڵی: عەلی کوڕی حەسەن کوڕی حسەین کوڕی محەممەدی شافعی، چەندین بەهرەی تایبەتی بووە. لەخۆپارێزی و خواپەرەستیدا بەناوبانگە. لەساڵی ٤٠٥ لەدایک دەبێت و لەساڵی ٤٩٢ لەمانگی زیحەججە، دەمرێت.

١٣. ئەبومحەممەد عەبدوللە ناسراو بە قازی موڕتەزا، کوڕی ئەبوئەحمەدی شارەزووری، برای قازی الخافقین. لەزانست و کەماڵات و لەڕاشکاوی و پاراوی زمان، بەناوبانگ بووە. لەساڵی ٤٦٥ لەدایك دەبێت و لەرەبیع الاوەلی ساڵی ٥١١ لەموسڵ کۆچی دوایی دەکات.

١٤. حەریری: شێخ ئەبو محەممەد قاسم کوڕی عەلی کوڕی محەممەد کوڕی عوسمان، خاوەنی (مقامات و درة الغواص و ملحة الاعراب و چەندین نامەی دیکەیە). کتێبی مقاماتی بۆ عەمید ئەلدەولە، وەزیری لەسەر کار لابراو نووسی و شێخ زەمەخشەری، لەوەسفی کتێبی مقامات دەڵێت:

اقسم بالله و آیاتة
ومشعەر الحج و میقاته
ان الحریري حري بان
نکتب بالتبر مقاماته

لەساڵی ٤٤٦ لەناوچەی حەریری پارێزگای موسڵ لەدایك دەبێت و لەساڵی ٥١٦ لەهەمان ناوچە دەمرێت.

١٥. ئیبن خازنی دەینەوەری: ئەبوئەلفەزڵ ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی فەزڵ کوڕی عەبدولخالەقی دەینەوەری ناسراو بە (کاتب) لەنووسین و داڕشتن بەناوبانگە. لەساڵی ٤٧١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥١٨ کۆچی دوایی کردووە.

١٦. قازی الخافقین: ئەبی بەکر محەممەد کوڕی ئەبو ئەحمەدی قاسمی شارەزوورییە. پێگەی زانستی و شارەزایی ئەدەبیاتی قازی الخافقین لەمێژوودا بەناوبانگە. ئەگەر

کورتنووسین ڕێگەی ئاماژەدان بەتواناییەکانی ئەوی دەدا، دەبوا ئاماژە بەشتی زۆری دیکە بدەین. لەساڵی ٤٥٣ لەدایك دەبێت و لەساڵی ٥٣٨ لەبەغداد دەمرێت.

١٧. موهەزەب ئەلدینی موسڵی: ئەبوئەلحەسەن عەلی کوڕی ئەبی ئەلوەفا سەعد کوڕی ئەبی ئەلحەسەن عەلی کوڕی عەبدولواحید کوڕی عەبدقەهار کوڕی ئەحمەد کوڕی مەسهەر، یەکێکە لەشاعیرە بەناوبانگەکان. لەئەدەبیات شارەزا بووە. دیوانی شێعرەکانی لەدوو بەرگدا کۆکراوەتەوە. لەساڵی ٤٥٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٤٣ کۆچی دوایی کردووە.

١٨. ئیبن دەری موسڵی: یوسف کوڕی دەرە، شاعیرێکی بەناوبانگە. گەنجێکی وشیار بووە. لەساڵی ٥٤٥ لەسەفەری حیجاز لەگەڵ دەستەیەك لەحاجییەکان مردووە.

١٩. ئەبو ئەلکەرەمی شارەزووری: خاوەن زانست و توانایی زۆر بووە. لەساڵی ٥٥٠ کۆچی دوایی کردووە.

٢٠. شێخ عودەی هەکاری: کوڕی موسافیر کوڕی ئیسماعیل کوڕی موسا کوڕی مەروان کوڕی حەسەن کوڕی مەروانە. ناوبانگی پاکی و خۆپارێزی (شێخ عودەی) لەهەموو ناوچەکان بڵاو بۆتەوە و خەڵکان بەگشتی باوەڕیان پێی بووە تا ئەو جێگەی ژیان و بژێوی خۆیان بەهی ئەو زانیوە. گۆڕەکەی لەهەکاری بۆتە زیارەتگای سەردانکەران و خەڵکان داوای بەدیهێنانی نیازەکانیان لەو دەکەن. لەساڵی ٤٦٧چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٥٧ مردووە.

٢١. ئیبن بەرزی جەزری: ئەبوئەلقاسم عومەر کوڕی محەممەد کوڕی عەکرەمە کە لەجەزیرەی کوڕی عومەر، ئیمام و پێشەوا و موفتی بووە و زۆربەی کاتەکانی بەهاودەمی لەگەڵ حوجەتولئیسلام ئەبو حامید، محەممەدی غەزالی و براکەی، ئەحمەدی غەزالی بەسەر بردووە. کورتەیەکی بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەکانی (مهذب) لەنووسینی شێخ ئەبی ئیسحاقی شیرازی نووسیوە و ناوینـاوە (الاسـالامی و العلـل). لەفیقە و دین کەسێکی بەناوبانگی سەردەمەکەی خۆی بووە.

٢٢. ئەبو نەجیب زیائەلدینی سۆهرەوەردی: عەبدولقاهیر کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللە مامی ئیبن سەعد کوڕی حسەین کوڕی قاسم کوڕی نەزر کوڕی قاسم کوڕی نەزر کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی قاسم کوڕی محەممەد کوڕی ئەبی بەکری سدیق، خەلیفەی یەکەم. شێخ ئەبو نەجیب، جیاواز لەهەموو پێگەکان و بەهرە زانستی وئەدەبییەکان، یەکێك

لە بەناوبانگترین ئەولیاکانی تەریقەت بووە. لەکەنارەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری بەغداد، شوێنێکی بۆ شوێنکەوتەکانی خۆی دروست کردووە و خۆی بۆ ماوەیەکی زۆر لەقوتابخانەی نیزامی وانەی وتۆتەوە و ئەویان بە (مفتی العراقیین) ناو بردووە. ئەم کەسانە هەرچەندە رەچەڵەکی ئەوان بەعەرەبەکان دەگات، بەڵام لەبەر ئەوەی باوك لەدوای باوك لەناو کوردانادا ژیاون و لەکوردستان گەورە بوون و گەشەیان کردووە، بۆیە لەڕوانگەی ئەخلاق و داب و نەریت.... وەك کورد لەقەڵەم دەدرێن. سۆهرەوەرد بەعەرەب کراوی سوری (برد)ە و گوندێکە لەناوچەکانی زاگرۆس لەنزیك زەنگان. لەساڵی ٤٩٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٦٣ لەبەغداد کۆچی دوایی کردووە. مامی شێخ شەهاب ئەلدینی سۆهرەوەردییە کەئاماژەی پێدەدەین.

٢٣. مەلا خزری ئەربیلی: ئەبو ئەلعەباس خزر کوڕی نەسر کوڕی عوقەیل کوڕی نەسری ئەربیلی. یەکەم کەسە لەهەولێر وانەی وتۆتەوە. لەزانستی فیقە و خلاف و تفسیر چەندین بەرهەمی هەیە. ٢٦ خوتبەی پێغەمبەری لەکتێبێکدا کۆکردۆتەوە و خەتیبەکان کەڵکی لێوەردەگرن. لەساڵی ٤٧٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەجومادی ئەلثانی ساڵی ٥٦٧ کۆچی دوایی کردووە و لەقوتابخانەکەی خۆی لەهەولێر بەخاك سپێردراوە.

٢٤. قازی کەمال ئەلدینی شارەزووری: ئەبو ئەلفەزڵ محەممەد کوڕی ئەبی محەممەد عەبدواللە کوڕی ئەبی ئەحمەد قاسمی شارەزوورییە. قازی کەمال خاوەن بەهرەی زانستی بووە. لەپاراوی و ڕاشکاوی زمان، کەسێکی بەناوبانگی ڕۆژگارەکەیەتی، شارەزای بەڕێوەبردنی وڵات بووە. لەموسڵ قازی و مامۆستا بووە و خۆی بینای قوتابخانەیەکی دروست کردووە. لەموسڵ و نەسیبین و دیمەشقیش، چەندین شوێنەواری لێ بەجێماوە. لەساڵی ٤٩٢ لەدایك و لەموحەرەمی ٥٧٢ کۆچی دوایی کردووە.

٢٥. رەزی ئەلدینی ئەربیلی: ئەبو ئەلفەزڵ یونس کوڕی محەممەد کوڕی مونعە کوڕی مالك کوڕی محەممەد کوڕی کەمال ئەلدین کەسێکی شارەزا و فەقیە بووە. لەقوتابخانەی ئەمیر زەین ئەلدینی کەمالیە سەرقاڵی وتنەی وانە و زانستە دینییەکان بووە. لەساڵی ٥٠٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٧٦ لەموسڵ کۆچی دوایی کردووە.

٢٦. شێخ ئەحمەدی جەزیری: ناسراو بەمەلای جەزیری، لەدانیشتووانی بۆتانە. چەندین قەسیدە و غەزەڵ و پەخشانی جوانی هەیە. لە(تجوید و تصوف و زانستە دنییەکان)

دەستیکی باڵای بووە. لەساڵی ٥٧٩ لەجەزیرەی بۆتان کە بەجەزیری ئیبن عومەریش بەناوبانگە، کۆچی دوایی کردووە و لەویّ بەخاك سپێردراوە.

٢٧. ئەبو ئەلفەرەج ئیبن دەهانی موسڵی: عەبدوللە کوڕی ئەسعەد کوڕی عەلی کوڕی عیسا، کەسێکی ئەدیب و فەقیە بووە. لەحمس وانەی وتۆتەوە، لەبەر زێدەرۆیی کردن لەشێعر، زانستەکانی دیکەی لەبیر کراوە. تەنیا وەك شاعیریك ناوبانگی دەرکردووە. لەساڵی ٥٢٣ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٨١ کۆچی دوایی کردووە.

٢٨. موەفەق ئەلدین شاعیری ئەربیلی: ئەبو عەبدوللە محەممەد کوڕی یوسف کوڕی محەممەد کوڕی فائید لەئەدەبیات و صرف و نەحو و (عروز قوافی) و هونەرەکانی شێعر شارەزایی تەواوی بووە. بەردەوام کتێبی (ئەقلیدسی) فێری خەڵکان کردووە.دیوانێکی شێعری هەیە. لەساڵی ٥٣٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٨٥ کۆچی دوایی کردووە.

٢٩. شێخ محیّ ئەلدینی شارەزووری: ئەبو حامید محەممەد کوڕی قازی کەمال ئەلدین لەکاتی ژیانی باوکی بۆتە قازی دیمەشق، دوای مەرگی باوکی وەك قازی موسڵ دەستنیشان کراوە. لەقوتابخانەی نیزامییە و قوتابخانەی کەمالیەی باوکی، (هەردووکیان لەموسڵ بوون) وانەی وتۆتەوە. لەبەخشندەیی و چاکەکاری بەناوبانگ بووە. لەساڵی ٥١٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەجومادی الاوەلی ساڵی ٥٨١ کۆچی دوایی کردووە.

٣٠. شەهاب ئەلدینی سۆهرەوەردی: حەکیمی شەهید ئەبو ئەلفتەح یەحیا کوڕی حەبەش کوڕی ئەمیرە، خوشکەزاری شەهاب ئەلدین باوکی حەفس عومەرە (دواتر ئاماژەی پێدەدرێت). لەکتێبی (طبقات الاطباء) بەهەڵە ناوی ئەویان بەعومەر نووسیوە و لەگەڵ شەهاب ئەلدینی خاڵی کەئەویش سۆهروەردییە، تێکەڵیان کردووە. (زانستی حکمەت و اصول الفقه) لەمەراغەی ئازەربایەجان لای شێخ مەجدئەلیدنی جەیلی، مامۆستای ئیمام فەخر ئەلدینی ڕازی خوێندووە، لەحکمەت و فەلسەفە، کەسێکی بیّ وێنەی ڕۆژگاری خۆی و لەزانستەکانی دیکەیشدا بەتەواوی شارەزا بووە. لەلێکدانەوە و شیکردنەوەدا بەناوبانگە. کتێبەکانی خوارەوە لەبەرهەمەکانی ئەوە: تنقیحات فی اصول الفقه، تلویحات، هیا کل نوریە، حکمە الاشراق، رسالەی غربە الغریبە، مطارحات، رمز الوحی، مبدا و معادی فارسی، بستان القلوب، طوارق الانوار، نفحات، بارقات الهیە، نغمات سماویە، لوامع الانوار، کتاب البصر، رساله العشق، رساله المعراج، شرح اشارات.

ئەم رستەی خوارەوە لەوشەکانی ئەوە: لو کان فی الوجود شمسان، لا نطعست الارکان فابی النظام ان یکون غیر ماکان.

ئەم چوارینەی خوارەوەیش هی ئەوە:

((هان تا سر رشتەی خرد گم نکنی

خود را برای نیك و بد گم نکنی

رهرو تویی و راه تویی، منزل تو

هشدار که راه خود گم نکنی))

ئەم زانا گەنجە، لەبەر بوێری و چاونەترسی بۆ دەربرین و نیشاندانی زانستەکەی، لەلایەن زاناکانی دیکەی ئەو رۆژگارەوە رژدی پێبراوە و داوایان لەسوڵتان سەلاح ئەلدین کردووە، بیکوژێت. سوڵتان لەحەلەب زیندانی کردووە و لەزینداندا خنکاندیان. ئەم رووداوە مێژووییە، ناوبانگی سەلاح ئەلدینی ناشیرین کرد. لەساڵی ٥٤٩ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٨٧ لەزیندان خنکێندراوە.

٣١. ئەبولفەرەج: شمس ئەلدین موحەدسی حەرانی، کەسێکی وشیار و بیرمەند بووە. پیشەی ئەو بازرگان و لەزانستی حەدیس هاوتای نەبووە و لەناوچەکانی دەورووبەر بۆ راست کردنەوەی حەدیسەکان و زانیاری لەسەر بەسەرهاتی کەسە گەورەکان، سەردانیان کردووە. لەساڵی ٥٠٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٥٨٧ کۆچی دوایی کردووە.

٣٢. ئەبوعەلی شاتانی: عەلەم ئەلدین حەسەن کوڕی سەعد کوڕی عەبدوللە کوڕی بەندار کوڕی ئیبراهیم، شاعیرێکی بەناوبانگ بووە، جیاواز لەوە لەزانستی فقە و اصول شارەزایی تەواوی بووە. لەساڵی٥١٠ هاتۆتەدنیا و لەشەعبانی ٥٩٩ کۆچی دوایی کردووە. شاتان گوندێکە لەناوچەکانی دیاربەکر..

٣٣. زەریری موقری: ئەبولحەزم کوری رەیان کوری شەبە کوڕی ساڵح. باوکی بەهەژاری سەری ناوەتەوە. زەریر هەتیو و بێ بژێوی ماوەتەوە و بەپارە و خێر و هاوکاری خەڵکان ژیانی بردۆتەسەر. لەموسڵ سەرقاڵی خوێندنی زانستی صەرف و نەحو و ئەدەبیات و قورئان و حەدیس بووە و دواتر لەتاو هەژاری و پەرێشانی روویکردۆتە بەغداد و لەوێ پەرەی بەزانست و زانیارییەکانی خۆیداوە و دواتر بۆ مەکسین گەڕاوەتەوە. دانیشتووانی مەکسین، خۆشحاڵ بوون لەوەی کەسێکی دانیشتووی زانای ناوچەکەیان گەڕاوەتەوە.

بەیانی ڕۆژی گەڕانەوەی، بەهۆی تانە و تەشەری پیریژنێك دووبارە زادگاکەی بەجێهێشتووە و ڕێگەی موسڵی گرتۆتەبەر. لەشێعردا زانیاری و شارەزایی تەواوی بەدەست هێناوە. دوو بەیتی خوارەوە نمونەیەکە لەشێعرەکانی:

((علی الباب عبدیسال الاذن طالبا

له اد بالا ان نعماك تحجب

فان کان اذن فهو کالخیر داخل

علیك و الا فهو کالشر یذهب))

لەساڵی ٦٠٣ لەموسڵ کۆچی دوایی کردووە.

٣٤. ئیبن ئەسیر: مەجدئەلدینی جەزری ئەبو ئەلسەعادات موبارەك کوڕی ئەبی ئەلکەرەم محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولکەریم کوڕی عەبدولواحیدی شەیبانی، برای عێزەئەلدین و زیائەلدینی جەزرییە. (دواتر ئاماژەیان پێدەدرێت). کەسێکی زانا و بێ وێنەی ڕۆژگاری خۆی بووە، لەنەحو و فقه و حەدیس و زۆربەی زانیاری دینییەکان شارەزایی و ناوبانگی تەواوی دەرکردووە و چەندین بەرهەمی هەیە. وەك کتێبی (جامع الاصول فی احادیث الرسول و النهایه فی غریب الحدیث لەدوو توێی پێنج بەرگدا و کتێبی الانصاف فی الجمع بین الکشف و الکشاف لەتەفسیر کە لەسەعلەبی و زەمەخشەری وەرگرتووە و کتێبی المصطفی و المختار و کتێبی البدیع، الفصول ابن دهان لەنەحو و کتێبی شافی تایبەت بەژیانی ئیمام شافعی و لە (صنعت)یش کتێبێکی نووسیوە. دیوانی نامەکان و پەخشانەکانی ئەو بەناوبانگە.)) لەساڵەکانی کۆتایی تەمەنی و لەماڵەکەی خۆی گۆشەگیر بووە، لەساڵی ٥٤٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

٣٥. ئەبو حامید کوڕی یونس: عیمادئەلدین محەممەد کوڕی یونس کوڕی محەممەد کوڕی مەنعە کوڕی مالك کوڕی محەممەد، برای کەمال ئەلدینی عەلامەیە (دواتر ئاماژەی پێدەدرێت). لەفقه و اصول و خلاف، شارەزا بووە. لەقوتابخانەی نوریە و عزییە و زەینییە و نەفیسیە و عەلائیە وانەی وتۆتەوە. هەروەها ئیمام و وتارخوێنیش بووە. کتێبی (المحیط فی الجمع بین المهذب و الوسیط و شرح وجیز امام غزالی) لەبەرهەمەکانی ئەوە. چەندین ڕەسالەی بەناوبانگیشی هەیە. لەڕەمەزانی ٥٩٢ وەك قازی موسڵ دەستنیشان کراوە، لەخۆپارێزیدا کەسێکی بەناوبانگە. لەساڵی ٥٣٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لە جومادی ئەلثانی ٦٠٨

لەموسڵ کۆچی دوایی کردووە.

بنەماڵەی بەنی یونس بەناوبانگن. بنەماڵەیەکی گەورەی ڕێزدار بوون. چەندین زانا و کەسی بەناوبانگیان تیا هەڵکەوتووە. زۆربەیان خاوەنی بەرهەم و کتێبن. التعجیر لەنووسینی محەممەد کوڕی عیماد ئەلدینە. (وەجیز)ی ئیمام غەزالیشی کورت کردۆتەوە. هەروەها کتێبی محصولی لە (اصول فقه) کورت کردۆتەوە.

٣٦. ئەبوئەلفەزایڵی ئامەدی: عەلی کوڕی ئەبی ئەلموزەفەر یوسف کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی عوبەیدالله کوڕی حسەین کوڕی ئەحمەد کوڕی جەعفەر، یەکێك لەئەدەیبە بەناوبانگەکانی سلێمانییە، دواتر وەك قازی واست دەستنیشان کراوە. لەفقە و حەدیس و نەحو و لوغەت، زانیاری تەواوی بووە و دیوانە شێعرێکیشی هەیە. لەساڵی ٥٥٩ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٠٨ کۆچی دوایی کردووە. (ئامەد= دیاربەکر).

٣٧. یاقوتی موسڵی: ئەبو ئەلبەدر کوڕی عەبدوللەی موسڵی کەئەمین ئەلدین نازناوەکەیەتی، ناوی سیانی مەلەکی بووە، دەگەڕێتەوە بۆ سوڵتان مەلەکشا، ئەبوئەلفەتح کوڕی سەلجوق کوڕی محەممەد کوڕی مەلەکشای گەورە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، یاقوت لەتورکەکانە نەك کوردەکان. بەڵام چوونکە لەناو کوردەکان گەورە بووە و ژیاوە، بەکورد لەقەڵەم دەدرێت. بەهەرحاڵ کەسێکە لەمادەکان چوونکە نەژادی تورکە خەزەرەکانیش بەمادا کوڕی یاپس کۆتایی دێت. یاقوت جگە لەزانست و زانیارییەکان، لەخۆشنوسیندا کەسێکی ناودار بووە و لەبەر ئەمە بەکاتب ناوی دەرکردووە. لەساڵی ٥٣٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦١٨ کۆچی دوایی کردووە.

٣٨. عێزئەلدین: ئەبولقاسم نەسر کوڕی عەقیل کوڕی نەسر، مامۆستای ئەربیل، برازای مەلاخزر، زانایەکی بەناوبانگ بووە. ڕژدیبەران، لای سوڵتان خراپەی ئەویان هێناوەتە سەرزمان و سوڵتان ئەوی بۆ موسڵ دوورخستۆتەوە. یاقوت (یاقوتی موسڵی) ئەم سێ دێرەی بۆ ئەو نووسیوە:

((ایا ابن عقیل لا تخف سطوة من عنادها

و ان ظهرت ما اضمرت من عنادها

و اقصتك یوما عن بلادك فتیة

رأت فیك فضلا لم یكن فی بلادها

كذا عادة الغربان تكره ان ترى

بياض البزاة الشهب دون سوادها))

لەساڵی ٥٣٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەجومادی الثانی ٦١٩ کۆچی دوایی کردووە.

٣٩. بەهائی سەنجاری: ئەبوئەلسەعادات ئەسعەد کوڕی یەحیا کوڕی موسا کوڕی مەنسور کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی وەهب کوڕی هەبان کوڕی سەوار کوڕی عەبدوللە کوڕی رەفیع کوڕی رەبیعە کوڕی هەبانی سەلەمی، لە(فقە)ی شافعی کەسێکی شارەزا و ڕێز لەبۆچوونەکانی گیراوە. لەزانستی خلاف کەسێکی زانا و لەئەدەبیات بێ هاوتا بووە. دیوانی شێعرەکانی بەناوبانگە. یەکێك لەهاوڕێکانی بۆ ماوەیەك لێی دابڕاوە و ئەو، وەك سکاڵا ئەم پەیامەی بۆ ناردووە. ئەو هاوڕێیەی دوو دێری خوارەوە کەهۆنراوەی حەریریییە، لەوەڵامدا بۆ ناردۆتەوە:

((لا تزر من تحب فی كل شهر

غیر یوم و لا تزده علیه

احتلاء الهلال فی الشهر یوم

ثم لا تنظر العیون الیه)

بەها ئەم دێڕانەی خوارەوەی لەوەڵامدا نووسیوەتەوە:

((اذا حققت من خل و دادا

فزره و لا تخف منه ملالا

و كن كالشمس تطلع كل یوم

ولا انك فی زیارته و هلالا)

لەساڵی ٥٣٣ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٢٢ لەسەنجار کۆچی دوایی کردووە.

٤٠. شەرەف ئەلدین ئەحمەد: ئەبوئەلفەزل کوڕی عەلامە کەمال ئەلدین ئەبی ئەلفەتح موسا کوڕی شێخ رەزی ئەلدین ئەبی ئەلفەزل یونس کوڕی محەممەد کوڕی مەنعە کوڕی مالك کوڕی محەممەد کوڕی سەعد کوڕی سەعید کوڕی عاسم کوڕی عابد ئەبی کەعب کوڕی قەیس کوڕی ئیبراهیم، کەمال ئەلدین (باوکی دواتر ئاماژەی پێدەدرێت)، لەزانستەکانی عەقل و گێڕانەوە و حەدیس، هاوشانی باوکی و لەخۆپارێزی و خواپەرەستی کەسێکی بەناوبانگ بووە و لەقوتابخانەی مەلەك موزەفەرئەلدین کوڕی زەین ئەلدین وانەی وتۆتەوە. لەفقە،

کتێبی (تنبیە)ی نووسیوە. دووجار کتێبی (ئەحیا العلومی) کورت کردۆتەوە. مختصر کبیر و مختصر صغیر. جگە لەبژێوی گرنگی ئەوتۆی بەژیان و سامانی دنیا نەداوە. هەموو داهاتی خۆی بەسەر هەژاراندا دابەش کردووە. ئەمە یەکێك لەرستەکانی ئەوە: کەسێك کە لەزانستەکان بێ بەش و سامانێکی فراوانی بێت، هاوشێوەی کەرێکە کۆپان و شتەکەی لەزیو بێت. لەساڵی ٥٧٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵ ٦٢٢ کۆچی دوایی کردووە.

٤١. شەرەف ئەلدین زیائەلدین: محەممەد کوڕی ئەبوئەلفتوح زیا ئەلدین نەسراللە (دواتر ئاماژە بەباوکی دەدرێت) لەزانست و کەمالات هاوتای باوکی خۆی بووە، لەشێعر و پەخشان دەست ڕەنگین و شارەزا بووە. لەساڵی ٥٨٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٢٢ کۆچی دوایی کردووە.

٤٢. نەجم ئەلدینی شاعیر، ناسراو بەکوڕی سابری مەنجەنەیقی: ئەبو یوسف یەعقوب کوڕی سابر کوڕی بەرەکات کوڕی عەمار کوڕی عەمان کوڕی عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی حەوسەرەی حەرانی، یەکێك لەئەدەیبە بەناوبانگەکانە. جیاواز لەزانست و شێعر، لەدروست کردنی مەنجەنیق دەستێکی بەتوانای بووە. کتێبی (عمده السالك فی سیاسته الممالك) لەنووسینەکانی ئەوە. سەبارەت بەجەنگ و چالاکییە جەنگییەکان و فڕت وفێڵەکانی جەنگ و چۆنیەتی وەرزش کردن و باسکردنی تایبەتمەندی ئەسپ و هونەرەکانی سەنگەر گرتن لەقەڵا و دیواربەندی و..... چەندین نووسراوی هەیە. دیوانە شێعرێکی هەیە بەناوی مغنی المعانی. ئەم هۆنراوەی خوارەوەی بۆ کوڕێك نووسیوە کە مەشکەی بەخۆیەوە هەڵواسیەوە و پانتۆڵێکی شینی لەبەردا بووە و لەڕووباری بەغداد مەلەی کردووە.

((یا للرجال شکایتی من شکوة
اضحت تعانق من احب و اعشق
جمعت هوی کهوای الا انها
تطفو و یثقلنی الغرام فاغرق
و یغیرنی التبان عند عناقة
ار دافة فهو العدو الازرق)

شاعیرەکانی عەرەب لەمشێوە شێعرەدا پێشینەیان نییە. لەساڵی ٥٤٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٢٦ کۆچی دوایی کردووە.

٤٣. ئیبن ئەسیر: عێزئەلدینی جەزری، ئەبوئەلحەسەن، عەلی کوڕی ئەبی ئەلکەرەم، محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولکەریم کوڕی عەبدولواحیدی شەیبانی. لەزانستی مێژوو و ڕەچەڵەك وحەدیس کەسێکی شارەزا و بەناوبانگە. کتێبی (الکامل فی التاریخ) یەکێکە لەبەرهەمەکانی کە لەسەرەتایی مێژوو تا کۆتاییەکانی ساڵی ٦٢٨ کۆچی ئاماژە پێداوە. سەبارەت بەڕەچەڵەك چەند کتێبێکی نووسیوە لەسێ بەرگدا. کتێبی (اخبار الصحابە) لەشەش بەرگی گەورەدا یەکێکی دیکە لەبەرهەمەکانی ئەوە. لەساڵی ٥٥٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣٠ کۆچی دوایی کردووە.

٤٤. ئەبو ئەلحەسەنی ئامەدی: ناسراو بەسەیف ئەلدین عەلی کوڕی ئەبی عەلی محەممەد کوڕی سالمی تەغلەبی، کەسێك بووە فەقیە، سەرەتا شوێنکەوتەی مەزهەبی حەنبەلی بووە و دواتر مەزهەبی شافعی هەڵبژاردووە. لەزانستە عەقڵییەکان پێگەیەکی بەرزی هەیە. لەبەر ئەمە زاناکانی سەردەمی خۆی، بۆچوون و باوەڕەکانی ئەویان خستۆتە ژێر پرسیارەوە. سەبارەت بەم بابەتە وتوویەتی:

(حسدوا الفتی اذلم ینالو اسعیە

فالقوم اعداء لە و خصوم))

لەقوتابخانەی عەزیزیە لەدیمەشق وانەی وتۆتەوە، لەفقە، اصولی دین، مەنتق، حکمەت و خلاف، چەندین بەرهەمی هەیە. وەك: کتێبی (ابکار الافکار، لەزانستی کەلام و منایح القرایح و رموز الکنوز و دقایق الحقایق و لباب الالباب و منتهی السول لەزانستی اصول و هتد) لەساڵی ٥٥١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣١ کۆچی دوایی کردووە.

٤٥.سەلاّح ئەلدینی ئەربیلی: ئەبوئەلعەباس ئەحمەد کوڕی عەبدولسەعید کوڕی شەعبان کوڕی محەممەد کوڕی جابر کوڕی قەحتان، جیاواز لەشارەزایی لەزانستەکان، شاعیرێکی بەتوانایش بووە و لەبەر ئەمە وەك شاعیر ناوی دەرکردووە. دیوانەکەی بەناوبانگە. لەخۆگری غەزەڵ و چوارینە و قەسیدەیە. لەساڵی ٥٧١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣١ کۆچی دوایی کردووە.

٤٦. شێخ شەهاب ئەلدینی سۆهرەوەردی: ئەبو حەفس عومەر کوڕی محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی محەممەد کوڕی عەمویە، برازای ئەبونەجیب، کەسێکی پیرۆز و موبارەك بووە. لەفقەی شافعی زانستە دینییەکان سەرناس و لەڕیازییات (بیرکاری)و خۆپارێزی و

گۆشەگیری بێ هاوتا بووە. بیروبۆچوونەکانی لەلایەن خەڵکانەوە بەگشتی پەسەند کراوە. لەکۆتاییەکانی تەمەنی سەرقاڵی مۆجیاری کردنی خەڵکان بووە. کتێبی (عوارف النعارف و رشف النصایح و اعلام التقی و اعلام الهدی) لەبەرهەمەکانی ئەوە. ئەمە یەکێکە لەچوارینەکانی ئەو:

ای دوست وجود و عدم ات اوست همه

سرمایەی شادی و غم ات اوست همه

تو دیده نداری که ببینی او را

ورنه زسرت تا قدم ات اوست همه))

شێخ سەعدی شیرازی یەکێك لەقوتابییەکانی ئەو بووە کەخۆی لەبوستاندا دەڵێت:

مرا شیخ دانای مرشد شهاب

دو اندرز فرمود بر روی آب

یکی آن که در نفس خودبین مباش

دیگر آن که در خلق بدبین مباش.

لەساڵی ٥٣٩ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣٢ کۆچی دوایی کردووە. لەبەغداد بەخاك سپێردراوە.

٤٧. شێخ شەهاب ئەلدین عومەری شارەزووری: شێخی ڕێنیشاندەر بووە. لەفقە و اصول زانیاری تەواوی بووە. یەکێکە لەئەولیاکان. لەساڵی ٦٣٣ لەشارەزوور کۆچی دوایی کردووە.

٤٨. ئیبن ئەسیر زیائەلدینی جەزری: ئەبوئەلفەتح نەصرالله کوڕی ئەبی ئەلکەرەم محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی عەبدولکەریم کوڕی عەبدولواحیدی شەیبانی، برای عێزئەلدینە. قورئانی بەتەواوی لەبەر بووە، هەروەها زیاتر لەپێنج هەزار حەدیسی لەبەر کردووە. جیاواز لەسێ دیوانی ئەبی تەمام حەبیب کوڕی ئەوس و ئەبی عوبادەی بوحتەری، و ئەبی تەییبی موتەنبی، قەسیدە و هۆنراوەی زۆری دیکەی لەبەر کردووە. لەنەحو و زمان و... شارەزا و بەتوانا بووە. لەزەمانی مەلەك ئەفزەڵ، نورئەلدین عەلی کوڕی سوڵتان سەلاح ئەلدین وەك وەزیر دەستنیشان کراوە. بەهۆی ڕژدی ڕژدیبەران، خەڵکی دژی ئەو ڕاپەڕیون و مەبەستی کوشتنیان کردووە، شەوانە هەڵاتووە و چۆنیەتی هەڵاتنی خۆی لەنامەیەکی

گەورەدا تۆمار کردووە. کتێبی (المثل السایر فی ادب الکاتب و الشاعر و کتێبی الوشی المرقوم فی حل المنظوم و کتێبی المعانی المخترعە فی صناعە الانشاء) لەبەرهەمەکانی ئەوە. لەساڵی ٥٥٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣٧ کۆچی دوایی کردووە.

٤٩. ئیبن مستەوفی، شەرەف ئەلدینی ئەربیلی: ئەبوئەلبەرەکات موبارەك کوڕی ئەبی ئەلفەتح ئەحمەدی مستەوفی کوڕی موبارەك کوڕی مەوهوب کوڕی غەنیمە کورشی غالبی لەخمی، یەکێك لەپیاوە ناودارەکانی ئەربیل، زیاد لەرادە ڕێزدار و خۆپارێز بووە، حەزی بەهاودەمی لەگەڵ زانا و ئەدیبەکان کردووە. هەرکەس لەزاناکان سەردانی ئەربیلی کردبێت، سەردانی کردووە و پیرۆزبایی بۆ ماڵەکەی ناردووە. لەزانستی مێژوو و ڕەچەڵەك و ناوی ئەسحابەکان، زانیاری تەواوی بووە.

لەزانستی صرف و نحو و زمان و عروز و قەوافی و بەیان و بەدیع و حساب، شارەزایی تەواوی بووە. ئارەزوومەندی شێعری عەرەب و پەندەکانیان بووە. مێژوویەکی گشتی بۆ ئەربیل نووسیوە لەچوار بەرگدا. کتێبی (النظام فی شرح شعر المبتنی و ابی تمام) لەبەرهەمەکانی ئەوە لەدووتوێی دە بەرگدا. کتێبی (اثبات المحصل فی نسبة ابیات المفصل) یەکێکی دیکە لەبەرهەمەکانیەتی لەدوو بەرگدا. کتێبی (سر الصنیعە و ابو قماش) یەکێکی دیکە لەبەرهەمەکانی ئەوە. دیوانە شێعرێکی بەناوبانگی هەیە. سەرەتا مستەوفی دیوان بووە، بەڵام لەساڵی ٦٢٩ پێگەی وەزارەتی پێبڕاوە. لەساڵی ٥٦٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٣٧ کۆچی دوایی کردووە. لەبنەماڵەی ئیبن مستەوفی، کەسانی بەناوبانگی زۆر دەرکەوتن. سەفی ئەلدین ئەبوئەلحەسەن عەلی کوڕی موبارەك کەمامی کوڕی مستەوفی بووە، کەسێکی زانا و بەناوبانگ بووە. نصیحە الملوك)ی ئیمام ئەبی حامیدی غەزالی لەفارسییەوە بۆ سەرزەمانی عەرەبی وەرگێڕاوە.

٥٠. کەمال ئەلدین عەلامە: ئەبوئەلفەتح موسا کوڕی ئەبی ئەلفەزڵ یونس کوڕی محەممەد کوڕی مەنعە کوڕی مالك کوڕی محەممەد، لەموسڵ و لای باوکی، زانستی فقهی خوێندووە، دواتر roوویکردۆتە بەغداد و لەقوتابخانەی نیزامییە لەهەموو زانستەکان، خۆی بەهرەوەر کردووە و لەوێ بەیونس ناوبانگی پەیا کردووە. دواتر گەڕاوەتەوە بۆ موسڵ و لەقوتابخانەی کەمالیە، یانی قوتابخانەی ئەمیر زەین ئەلدین؛ سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە. لەهەمان قوتابخانە، مەنتیق و حکمەت و تەبیعیات و الهیات و پزیشکی و حساب و

ئەندازیاری و جەبر و موسیقی و زیج و زانستەکانی دیکەی وتۆتەوە و لەناو خەڵکدا بڵاوی کردوونەتەوە. عیسەوییەکان و جوولەکەکان، تەورات و ئینجیلیان لای ئەو خوێندووە. و بەزانستەکەی ئەو ڕازی بوون. بەکورتی (لەهەموو زانستەکاندا) شارەزا بووە. سەبارەت بەگەورەیی ئەو هەرچی بنووسین، ئەگەری هەیە وەك زێدەڕۆیی لەقەڵەم بدەن. لەکاتی وانە وتنەوە پێویستی بەکتێب نەبووە. قوتابییەکان رستەکانی ناو کتێبەکەیان خوێندۆتەوە و ئەو ڕوونکردنەوەی لەسەر داوە و کێشەکانی بۆ چارەسەر کردوون. عیمادی نەحوی بۆ وەسف کردنی ئەو دەڵێت:

کمال کمال الدین للعلم و العلی

فهیهات ساع فی مساعیك یطمع

اذا جتمع النظار فی کل موطن

فغایه کل ان تقول و یسمعوا

فلا تحسبوهم من عناد تطیلسوا

و لکن حیا اعترافاً تقنعوا))

ڕژدیبەران، یانی ئەو زانایانەی زانستێکی ئەوتۆیان نەبووە، ڕژدییان بەپێگەی ئەو بردووە و بۆ ئەوەی لەبەر چاوی خەڵکان بەگشتی، پەردەیەك بەسەر نەزانی خۆیاندانا بکێشن، دژی بۆچوون و باوەڕەکانی ئەو وەستاونەتەوە. لەپێنجی سەفەری ساڵی ٥٥١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لە ١٤ شەعبانی ساڵی ٦٣٩ زایینی کۆچی دوایی کردووە.

٥١. ئەبو ئەلبەقائی نەحوی: ناسراو بەئیبن صایغی موسڵی: موفەق ئەلدین یەعیش کوڕی عەلی کوڕی یەعیش کوڕی ئەبی ئەلسەرایا کوڕی محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی حەیانی قازی کوڕی بیشر کوڕی حەیانی ئەسەدی، لەنحو، صرف و حەدیس و زانستە عەرەبییەکان، شارەزایی تەواوی بووە.

لەسەر کتێبی (مفصل)ی ئەبی ئەلقاسمی زەمەخشەری، ڕوونکردنەوەیەکی نووسیوە کەجێگەی ڕێزە. لەسەر (تصریفی) مەلوکی ئەیبن جەنیش ڕوونکردنەوەیەکی نووسیوە. لەساڵی ٥٥٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٤٣ کۆچی دوایی کردووە. لەحەلەب بەخاك سپێردراوە.

٥٢. عەلەم ئەلدینی سەنجاری لەزانستە عەقڵییەکان و نەقڵییەکان، تاقانەی ڕۆژگاری

خۆی بووە و لەزۆربەی زانستەکان نووسراو و بەرهەمی لەخۆی بەجێهێشتووە. لەساڵی ٦٤٣ کۆچی دوایی کردووە.

٥٣. ئیبن سەلاحی نەسری شارەزووری: ئەبو عەمرۆ، تەقی ئەلدین عوسمان کوری سەلاح عەبدولرەحمان کوڕی عوسمان کوڕی موسا کوڕی ئەبی نەسری کوردی شافعی، یەکێك لەزاناکانی سەردەمی خۆی بووە، لەتفسیر و حەدیس و فقە و ناوی گەورە پیاوان و زمان، شارەزایی تەواوی بووە.

سەرەتا لەقوتابخانەی ناسریە، لەقودس وانەی وتۆتەوە، دواتر روویکردۆتە دیمەشق و لەقۆتابخانەی ڕەواحییە وانەی وتۆتەوە. لەزانستی حەدیس و ریێ و رەسمەکانی حەج، خاوەنی بەرهەمە. فتواکانی ئەو کۆکراوەتەوە و زاناکانی ئەم بەشە، پشتی پێدەبەستن. ئەمە یەکێك لەوتەکانی ئەوە: پێداگرتن لەسەر بابەتەکان، ڕێز لەناو دەبات. داوا کردنی مەبەستەکان پێش کاتی خۆی، وەك داوا کردنی فەواکەیە (میوە) پێش کاتی خۆی. لەساڵی ٥٧٧ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٤٣ لەدیمەشق کۆچی دوایی کردووە. (فازڵی دیمەشقی مەبەست لەوە).

٥٤. ئیبن حاجب: ئەبو عەمرۆ عوسمان کوڕی عومەر کوڕی ئەبی بەکر کوڕی یونس کە نازناوەکەی جەمال ئەلدینە و شوێنکەوتەی مەزهەبی مالکییە، لەزانستە ئیسلامییەکان سەرناس بووە، بەڵام زیاتر سەرقاڵی زانستە عەرەبییەکان بووە. کورتەیەکی لەسەر فقهی شافعی نووسیوە، لەاصول الفقه خاوەنی بەرهەمە و نووسینە. کتێبی کافیە، لەنحو و شافیە لەصرف، لەبەرهەمەکانی ئەون. لەساڵی ٥٧٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٤٦ کۆچی دوایی کردووە.

٥٥. ئیبن ئەلحاجی ئەشبیلی: خاوەنی چەندین کتێب و نووسینە. پێشەکی و ڕوونکردنەوەی بۆ چەند کتێبێکیش نووسیوە و لەساڵی ٦٥١ کۆچی دوایی کردووە.

٥٦. قازی ئیبن خەلەکانی ئەربیلی: شەمس ئەلدین ئەبو ئەلعەباس ئەحمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی بەکر کوڕی خەلەکان، قازی قازییەکانی ئەربیل بوو و شافعی مەزهەب بووە. زانای ڕۆژگار و لەچەندین قوتابخانەدا وانەی وتۆتەوە. دواتر لەقوتابخەی نەجیبییە وانەی وتۆتەوە، کتێبی (وفیات الاعیان) لەدوو بەرگدا لەنووسینەکانی ئەوە. لەساڵی ٦٠٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٦٨١ کۆچی دوایی کردووە..

٥٧. فەخرئەلدین ئەحمەد کوڕی حسەینی چارپردی: لەزانا بەناوبانگەکانە و بەرهەم و ڕوونکردنەوەکانی ناسراوە. لەساڵی ٧٤٧ کۆچی دوایی کردووە.

٥٨. فەقێی تەیران: مەلا مەحمود، لەدانیشتووانی بەلدەیە. کەسێکی زانا و ئەدیب بووە، دوو مەنزومەی لەخۆی بەجێهێشتووە بەناوی (شێخی سەنایی و حکایاتی برسیسا)، مەنزومەیەکی دیکەی هەیە بەناوی (کلمات الحصان الاسود) یانی ئەسپەکەی پێغەمبەر ناسراو بە بوراق، مەنزومەیەکی دیکەی لەتصوف و وحدەالوجود هەیە. لەساڵی ٧٢١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٧٩٥ کۆچی دوایی کردووە.

٥٩. قازی ئەحمەد ئەرزەنجانی بورهان ئەلدین: کەسێکی خۆپارێز و خواپەرەست بووە. کتێبی (ترجیح) ڕوونکردنەوەی (تلویح) لەبەرهەمەکانی ئەوە. لەسەرەتای سەدەی هەشتەم (٨٠٠) لەجەنگی ئەرزەنجان کوژراوە.

٦٠. ئیمام محەممەدی کوردی: حافز ئەلدین کوڕی محەممەدی کوردی، ئیمامی ڕۆژگار و لەزانستی دادوەری، بێ هاوتا بووە. لەساڵی ٨٢٠ کۆچی دوایی کردووە.

٦١. مەلای بەتای (بەتێ): مەلا ئەحمەد، دانیشتووی گوندی بات، لەقورئان خوێنەکانی هەکارییە. کەسێکی ئەدیب و زانا بووە. سەبارەت بەلەدایك بوونی پێغەمبەر، چەندین هۆنراوەی نووسیوە. دیوانێکی لەقەسیدە و غەزەڵ هەیە. لەساڵی ٨٣٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٩١١ کۆچی دوایی کردووە.

٦٢. مەلا عەلی تەرموکی: یەکێك لەزانا دیارەکانی کوردە. لەزانستەکان و بیرکاری شارەزایی تەواوی بووە. زۆربەی تەمەنی بەوانە وتنەوە بەسەر بردووە، لەساڵی ١٠٠٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٠٦٥ کۆچی دوایی کردووە. لەگوندەکەی خۆی، تەرموك، لەنێوان هەکاری و مەکس، بەخاك سپێردراوە.

٦٣. ئەحمەدی خانی: یەکێك لەشاعیرە بەناوبانگەکانی کوردە. شاعیرێکی گەورە و ئەدەبییێکی خۆشەویستی کوردانە. کتێبەکانی بەعەرەبی و تورکی بەناوبانگە. دیوانی مەم و زین کە لەکوردستاندا بەناوبانگە، لەبەرهەمە نایابەکانی ئەوە. سەر بە عەشیرەی خانیانە. لەساڵی ١٠٧١ کۆچی دوایی کردووە. لەبایەزید بەخاك سپێردراوە.

٦٤. ئیسماعیل مەعروف: لەدانیشتووانی بایەزیدە، لەشێعر و پەخشان و غەزەڵ کەسێکی شارەزا و بەناوبانگە و بەفیردەوسی کورد ناوی دەبەن. شێعر و قەسیدەی زۆری هەیە. زیاتر بەکرمانجی هۆنراوەی هۆنیوەتەوە. لەساڵی ١٠٧٣ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١١٢٨ کۆچی دوایی کردووە. لەبایەزید بەخاك سپێردراوە.

٦٥. ئەمیر شەرەفخان: لەمیرەکانی هەکارییە، لەئەدەبیات و صرف و نحو و زمان،

پێگەیەکی بەرزی هەیە. شێعر و پەخشان و غەزەلی زۆری لێ بەجێماوە. دیوانێکی تایبەتی هەیە. لەساڵی ١١٠٨ لەشاری جۆلەمێرگ، ناوەندی هەکاری چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١١٦٧ کۆچی دوایی کردووە.

٦٦. مەولانا خالیدی شارەزووری: جیاواز لەپێگە زانستییەکان، لەهونەری ڕێنووێنی کردن و بڵاو کردنەوەی تەریقەت، بلیمەتی ڕۆژگاری خۆی بووە. مامۆستای شێخ سراج ئەلدین عوسمانی تەوێڵەیە. باوەگەورێی شێخ حیسام ئەلدین. لەساڵی ١١٩٣ لەشام کۆچی دوایی کردووە. گۆڕی ئەیوبی کوردیش لەشامە کەیەکێکە لەئەولیا بەناوبانگەکانی کورد. خەڵکان زیارەتی دەکەن.

٦٧. ئیبن ئەلحاج: خاوەنی (رفع الخفا و ڕوونکردنەوەی لەسەر (حەواشی) هەیە. کەسێکی زانا و بەتوانا بووە. مامۆستای شێخی بەناوبانگ، باوکی کاك ئەحمەدی شێخ، باوکی شێخ محەممەد سەعید، باوکی شێخ مەحمودی حەفیدە. و لەسەدەی دوانزەی کۆچی ماڵئاوایی لەجیهان کردووە.

٦٨. مەلا یونسی هەلکاتینی: نووسەری سێ نامەی بەناوبانگ لە(صرف و ظرف و ترکیبە). لەگوندی هەلکاتین چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەهەمان شوێن و لەسەدەی دوانزەیەم کۆچی دووایی کردووە.

٦٩. مورادخانی بایەزیدی: دانیشتووی بایەزید بووە، لەعشق و تصوف خاوەنی چەندین بەرهەم و نامەی بەناوبانگە. شێعری زۆری هەیە. لەساڵی ١١٥٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٠٣ کۆچی دوایی کردووە.

٧٠. مەستورەی کورد (ماه شەرەف خانم) کچی ئەبو ئەلحەسەن بەگ، خەلەف محەممەد ئاغا، باوەگەورێی (لەدایکەوە) نووسەری (مەردۆخ) لەبنەماڵەی قادری، کەهاوسەری خوسرەوخانی ناکام، فەرمانڕەوای کوردستان بووە و لەشێعر و پەخشاندا بەناوبانگە. مێژوویەکی بۆ سیلسیلەی ئەردەلان نووسیوە. دیوانەکەی کە لەخۆگری قەسیدە و غەزەل و چوارینە و...... بەناوبانگە و بەم دواییانە لەچاپ دراوە. هۆنراوەی خوارەوە، نیشانەی توانایی ئەوە:

((خورشید وش و به نام ماه شرفم

مستوره و خسرو زمان را طرفم))

جیاواز لەمەستورە، چەندین زانا و بلیمەتی دیکە لەناو کورد بوون بەلام چوونکە بەسەرهاتی ئەوانمان بەڕاستی و تەواوی دەستنەکەوت، لەئاماژەدان بەوان چاومان پۆشی.

ئەبوئەلقاسم حیماد الرواه و ئەبو ئیسحاق ظهیر الدین و قازی ئیبراهیمی موسڵی و شێخ

عەبـدولقادری شـارەزووری و محـیّ ئەلـدینی شـارەزووری و شـێخ تـاج ئەلـدینی کـوردی کەوەزیری سوڵتان ئەورخان، دووەمین سوڵتانی تورکیا بووە، لەریزی زانا کوردەکانن. بەڵام چوونکە مێژووی مردن و بەسەرهاتی ئەوانمان دەستنەکەوت، ئاماژەمان پێنەدان.

زاناکانی خوارەوە، لەزانا بلیمەتەکانی سەدەی سیانزەن:

١. ملامحەممەدی بانگبێژ: مامۆستای سەیید حەسەنی چۆڕی، لەزاناکانی سابڵاخە.

٢. مەلا محەممەد ئیبن ئادەم، خەڵکی باڵکانی سەر بەناوچەی ڕەواندزە.

٣. مەلا یەحیای مەزوری: خەڵکی ئاگری، سەر بەناوچەی ڕەواندز بووە.

٤. مەلای خەتیّ: دانیشتووی خۆشناوەتی، سەر بەڕەواندز بووە. شێخ محەممەد جەسیم حوجەئەلئیسلامی سنە و مەلا ئەحمەدی نەودەشتی، قوتابی ئەو بوون و لای ئەو ئیجازەیان وەرگرتووە.

٥. مەلا محەممەدی کوانە دۆڵ: مەلا محەممەد دانیشتووی زەهاو بووە و بەناوبانگە.

٦. مـەلا خـدر: ناسـراو بـەنالی، شـاعیری بـەناوبانگی کـورد، بـەکوردی و فارسـی و عـەرەبی شێعری هەیە. دیوانەکەی بەکوردی چاپ کراوە.

٧. مەلا ڕەحیمی تاوەگۆزی: ناسراو بەمەولەوی، نازناوەکەی مەعدوم، بۆچوونە کوردی و فارسییەکانی بەناوبانگە. و بەم دواییانە چاپ کراوە و نیشانەی توانا و زانستی ئەوە.

٨. شێخ ڕەزای کـەرکوکی تاڵـەبانی: کـوڕی شـێخ عەبـدولڕەحمان ناسـراو بەسـالم کـەباوکی یەکێکـە لەشـێخەکانی تاڵـەبان. بەسـەر شـێعری کـوردی و فارسـی و عەرەبیـدا زاڵ بـووە و بەتایبەت لەشێعری هەجو. دیوانەکەی بەناوبانگە.

٩. ئیبن ئەلخەیات: مەلا عەبدولرەحمان، خەڵکی قەرەداغ بووە و لەزانا بەناوبانگەکانە. مەلا عەبدولمەجید لای ئەو ئیجازەی وەرگرتووە.

١٠.عومەر ئەفەندی: خەڵکی هەولێرە و لەزاناکانی ڕۆژگاری خۆی بووە.

١١. عومەر ئەفەندی ڕەواندز: زانایەکی بەناوبانگە.

١٢. عەلی ئەفەندی: برای عومەر ئەفەندی ڕەواندزە. کەسێکی زانستی بەناوبانگە.

١٣.ئەسـعەد ئەفەنـدی: کـوڕی عومـەر ئەفەنـدی ڕەواندزییـە، کەسـێکی زانـا و خۆپـارێزێکی ڕاستکردار بووە.

١٤.مەلا گچکە: مەلا ئەبوبەکر، کوڕی عومەر ئەفەندی هەولێری، کەسێکی بەناوبانگە.

١٥. موفتی زەهاو: مەلا محەممەد، دانیشتووی زەهاوە و بەناوبانگە.

١٦. حاج مـەلا عەبدوللـەی کۆیی: دانیـشتووی کۆیـە و کەسـێکی بیّ هاوتـای سـەردەمی خۆی بووە. ئەم چوارینەیان بۆ ئەو هۆنیوەتەوە:

حاجی عەبدوولله لەئادەم فیل ترە
با وجوودی روتبەی پێغەمبەری
ئەو بەیەك شەیتان لەکۆیە دەرنەچوو
ئەو بەیەك شەیتان لەجەننەت دەرپەڕی

١٧. مەلا نەبی ڕەواندزی: لەزاناکانی ڕەواندزە، لەزانستەکان شارەزایی تەواوی بووە.

١٨. حاج شێخ عەلیس کەرکوکی: برای شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولرەحمان سالمە، لەفقە و حەدیس و تفسیر بەناوبانگە و لەتەریقەت و ڕێنوێنی کردنی خەڵکان کەسێکی سەرناس و پەسەندی خەڵکان بەگشتی بووە.

١٩. مەلا عەبدوللەی بەیتوشی: نووسەری کتێبی کفایە یە.

٢٠. مەلا محەممەدی بەیتوشی: مامۆستایەکی بەناوبانگە.

٢١. مەلا یوسفی ئەسەم (کەڕ) کە لەبریسوە لەبەرابەر سەردەشت بەخاك سپێردراوە.

٢٢. مەلا ڕەسوڵی زەکی: دانیشتووی موکرییە و لەزانا بەناوبانگەکانە.

٢٣. ئیبن ڕەسوڵ: کوڕی مەلا ڕەسوڵە (ئاماژەمان پێدا) و ناوی محەممەدە. نووسینی لەسەر عەبدولحەکیم هەیە. مامۆستای موفتی زەهاوە.

٢٤. مەلا محەممەدی یای: خەڵکی سابلاخ بووە و زانا و مامۆستایەکی بەناوبانگە.

٢٥. مەلا محەممەد: کوڕی مەلا موستەفا، مامۆستای مزگەوتی سور بووە لەسابلاخ کە بوداق سوڵتان بونیاتی ناوە.

٢٦. مەلا سلێمانی گردی: ڕوونکردنەوەی لەسەر کتێبی (انوار) لەفقە شافعی نووسیوە و خەڵکی گەردیانە.

٢٧. مەلا عەبدوللەی پیرەباب: خەڵکی گوندی بەکری بووە. لەئەتیمش و سابلاخ وانەی وتۆتەوە. ڕوونکردنەوە و پەراوێزی بۆ (جواد شرح خلاصە الحساب) نووسیوە.

٢٨. مەلا عەلی تەرجان: مامۆستای تەرجان بووە، لەزۆربەی زانستەکان نووسین و ڕوونکردنەوەی هەیە.

٢٩. مەلا عەبدولقادری بیارە: لەخانەقای بیارە، مامۆستا بووە، لەفقەو حەدیس و تەفسیر زانیاری تەواوی بووە.

٣٠. مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی: یەکێکە لەزانا بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی. لەفقە و حەدیس و ریازیات، بەناوبانگە.

٣١. شێخ عومەری قەرەداغی مەردۆخی: لەسیلسیلەی نووسەرە. لەسلێمانی سەرقاڵی وانە وتنەوە و لەزانستدا کەسێکی بەناوبانگە.. پەراوێزی بۆ کتێبی (تهذیب الکلام) نووسیوە.

ئەمانە لەزاناکانی سەدەکانی دووایین کە لەسەدەی دوانزەیەم تا کۆتایی سەدەی سیانزەیەم ژیان و کۆچی دواییان کردووە.

شێخەکانی تەریقەت لەناوچە کوردنشینەکان فراوانن. بەم دواییانە شێخ سیراج ئەلدینی تەوێڵەیی کە کەسێکی بەناوبانگە، لەگوندی تەوێڵەی سەر بەناوچەی شارەزوور، سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە. لەساڵی ١٢٨٣کۆچی لە سیانزەی شەوال، کۆچی دوایی کردووە و گۆڕەکەی لەخانەقای تەوێڵەیە.

دوای ئەو شێخ بەها ئەلدینی کوڕی محەممەد، جێگەی باوکی گرتۆتەوە. شەوی هەینی، چوارەمی رەبیع الاوەلی ساڵی ١٢٨٩ کۆچی دوایی کردووە و لەخانەقای تەوێڵە بەخاك سپێردراوە.

شێخ زیا ئەلدین عومەر، برای شێخ بەها ئەلدین، لەخانەقای بیارە سەرقاڵی وانە وتنەوە بووە و لەساڵۆ ١٣١٨ کۆچی دوایی کردووە.

حاج شێخ ئەحمەد و شێخ عەبدولڕەحمان (ئەبو ئەلوەفا)، براکانی شێخ بەها ئەلدین و شێخ زیائەلدین بوون. ئەوانیش پیشەی براکانیان گرتۆتەبەر.

شێخ حیسام ئەلدین عەلی، کوڕی شێخ شەهاب ئەلدین، لەتەوێڵە و باغە کۆن و خەڵمار، سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی تەریقەتی نەقشبەندین و خانەقای ئەو سێ شوێنە بەڕێوە دەبات.

زانا و ئەدیبەکانی کورد فراوانن. ناوی ئەو کەسانەی بەردەستمان کەوت و لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێدا، لەگەڵ کورت نویسی ئێمە یەکی دەگرتەوە.

## سەبارەت بەتەمەنی پاشاکانی رابردوو

خەڵکانی سەرەتاکانی مێژوو، پاشاکانیان بەخوا یا بەهێمای خوا لەسەر زەوی زانیوە و لەبەر ئەمە ڕۆژی و بەختەوەری و ژیان و بژێوی خۆیان بەهی پاشا زانیوە و فەرمانەکانی ئەویان بێ کەموکوڕی ئەنجامداوە و سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانیان بەگوناحێکی نەشیاو بۆ بەخشین و هۆکاری بەدبەختی لەقەڵەمداوە. رستەی (چ فەرمانی یەزدان، چ فەرمانی شا) لەیادگارییەکانی ئەو دەورەیە کە تا دەرکەوتنی ئیسلامیش بەکار براوە. لەئەنجامی ئەم بۆچوون و باوەڕەیە زۆربەی پاشاکانی وەك جەمشید و کەیکاوس و ... گومرا بوون و بەڕاشکاوی بانگەشەی خوایەتییان کردووە.

پاشایەتی لەو ڕۆژگارانەدا، هەرچەند لەباوکەوە بۆ کوڕ ماوەتەوە بەڵام وەرگرتنی ئەو پۆستە و دانیشتن لەسەر تەختی پاشایەتی بەند بووە لەسەر توانایی کەسەکە و زیرەکی و بیرمەندی ئەو و لەمناڵەکانی پاشا هەرکام توانیبێتی توانایەکانی خۆی بسەلمێنێت، پاشایەتی گرتۆتەدەست و لەئەگەری زۆری مناڵەکانی پاشا، وڵات لەنێوان ئەواندا دابەش کراوە، ناوی

پاشای گەورە وەك پاشای کۆچ کردوو ماوەتەوە و سیلاح و تاج و تەختی پاشایەتی لای سەرداران و سەرکردە و پاڵەوانەکان، لەشوێنێکی تایبەت پارێزراوە، تا ئەوەی یەکێکیان لەبنەماڵەی پاشایەتی، تەنانەت ئەگەر مناڵی کچەکانی پاشا، بووبێت، دۆزیبێتەوە.

پاشای نوێ هەرچەند لەگەڵ پاشای کۆچکردوو، چەندین کەسیان لەنێواندا بووە، بەڵام بەهۆی توانایی و لێهاتوویی، ئەویان بەکوڕی پاشای کۆچکردوو ناو بردووە و بەهەمان شێوە مناڵە نەشیاوەکانی پاشایان، بەمناڵی ڕاستینەی ئەو یا شیاو بۆ وەرگرتنی تەختی پاشایەتی نەزانیوە.

(( پسر کو ندارد نشان از پدر

تو بیگانه خوانش مخوانش پسر

واتاکەی: کوڕ ئەگەر نیشانەکانی باوکی تیا بەدی نەکرێت، تۆ بەبێگانەی بزانە نەك بەکوڕی باوك.

پیشدادییەکان باوەڕیان وابوو ئەگەر پاشا بمرێت بێ ئەوەی کوڕێکی شیاو لەدوای خۆی بەجێبێڵێت، لەم جیهانە بەکەمکوڕی کۆچی دوایی کردووە. بۆیە ڕۆحی ئەو لەجیهانی ئەرواح، و لەناو وڵاتەکەی و بەتایبەت لەنزیك کۆشکەکەی دەمێنێتەوە و چاوەڕوان دەبێت تا ئەوەی کەسێکی شیاو لەپشتی خۆی بۆ پاشایەتی هەڵدەکەوێت و ڕۆحی پاشا دەچێتە ناو گیانی ئەو کەسە و ئارام دەگرێت و ئەو مناڵە دوای گەشە کردن و باڵغ بوون، دەبێتە کەسێکی شیاو و لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت.

دوای ئەم پێشەکییە، دەڵێین: بەهەمان شێوە کەپێغەمبەری یەکەم کۆچی دوایی کردووە و تا دەرکەوتنی پێغەمبەری دوای خۆی، هەموو ڕووداوە مەزهەبییەکان بەناوی پێغەمبەری یەکەم ئەنجامدراوە، پاشایەتیش بەمشێوەیە، تا دەرکەوتنی پاشای نوێ،، هەموو کاروبارەکانی وڵات، جەنگ، ئاشتی، شادی، و هەموو کێشە و بابەتەکانی پەیوەست بەپاشایەتی، بۆ پاشای کۆچ کردوو گەڕاوەتەوە و بەناوی ئەو ئەنجامدراوە چوونکە ڕۆحی ئەویان لەهەموو شوێنێك بەبینەری کارەکان زانیوە.

شێمانەی ئەوە دەکرێت سەرچاوەی هەڵەی مێژوونووسان سەبارەت بەتەمەن یا ماوەی پاشایەتی، پاشاکانی رابردوو، ئەم باوەڕ و بۆچوونە بێت کەمێژوونووسان گرنگی ئەوتۆیان پێنەداوە و ڕەچاوی ئەم خاڵەیان نەکردووە و تەمەن یا ماوەی پاشایەتی پاشاکانیان زۆر زیاتر لەتەمەنی ئاسایی نووسیوە. بۆ نمونە پاشایەتی گیومەرس کە لەساڵی ۳۳٤١ پێش زایین دەرکەوتووە، دەستەیەك بەسی ساڵ و دەستەیەك بە چل ساڵ ئاماژەیان پێداوە و تەمەنی ئەویان بە سێ سەدە و نیو خەمڵاندووە. ئەم ماوە نائاساییە، بەڕواڵەت لای ئەو

کەسانەی لەو ڕێ و ڕەسمە و یاسای سەرەوە ئاگادار نەبن، نەك دوور، بەڵکو وەك درۆ دێتە بەرچاو بەلاّم دوای لەبەر چاو گرتنی ئەوەی باسمان کرد، چیتر گومان نامێنێتەوە و بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کەگیومەرس سی ساڵ پاشایەتی کردووە و مردووە. بەمپێیە ماوەی پاشایەتی ئەو سێ سەدە و نیوە و کاتێك ئەم ماوەیە لەگەڵ دەرکەوتنی هوشەنگ کە لەپشتی سیامەکە، بەراوەرد بکەین، ڕاست دەبێت چوونکە هوشەنگ لەساڵی ٢٩٩٣پ.ز لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و ماوەی نێوان ئەم دوو پاشایە (گیومەرس و هوشەنگ) سێ سەدە و نیوە یانی ٣٤٨ (دوو ساڵ کەمتر لەسێ سەدە و نیو). بەلاّم دوو ساڵ لەم جۆرە بابەتانەدا گرنگییەکی ئەوتۆی نییە.

هەروەها مێژوونووسان نووسیویانە هوشەنگ ٤٠ ساڵ پاشایەتی کردووە. ئەگەر مێژووی دەسپێکردنی پاشایەتی هوشەنگ کەساڵی ٢٩٩٣پ.ز بووە و لەگەڵ پاشایەتی تەهمورس کە لەساڵی ٢٩٥٣ پ.ز بووە، بەراوەرد بکەین، دەبێتە چل ساڵ.

بەمپێیە پاشایەتی تەهمورسیان بەسی ساڵ لەقەڵەمداوە و تەمەنی ئەویان بەدووسەد ساڵ خەملاّندووە. کاتێك سەیری دەسپێکی پاشایەتی ئەو دەکەین (ساڵی ٢٩٥٣پ.ز) و لەگەڵ دەرکەوتنی جەمشید کە لەساڵی ٢٧٩٥پ.ز، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە، دەبێتە ١٩٨ ساڵ و دووبارە دوو ساڵ کەمتر لەدووسەدە و گرنگی ئەوتۆی پێنادرێت.

دەستەیەك پاشایەتی جەمشید بە٧٠٠ ساڵ و دەستەیەك بە٦٠٠ ساڵیان زانیوە. ئەگەر مێژووی دەسپێکردنی پاشایەتی ئەو لەساڵی ٢٧٩٥پ.ز لەگەڵ مێژووی دەسپێکردنی فەرەیدون لەساڵی ٢٢١٧پ.ز بەراوەرد بکەین دەبێتە ٥٧٨ ساڵ کە لەبۆچوونی دووەم نزیکترە (٦٠٠ ساڵ). پاشایەتی زوحاك لەبەر ئەوەی عەرەب و لەنەژادی ئاریان نییە، گرنگی پێنادرێت.

پاشایەتی فەرەیدونیان بە٥٠٠ ساڵ لەقەڵەمداوە. لەساڵی ٢٢١٧پ.ز کەمێژووی دەسپێکردنی پاشایەتی ئەوە تا ساڵی ١٧١٧پ.ز کەمێژووی دەسپێکردنی پاشایەتی مەنوچێهرە و دەبێتە ٥٠٠ ساڵ.

پاشایەتی مەنوچێهریان بە ١٢٠ ساڵ لەقەڵەمداوە. لەدەسپێکردنی پاشایەتی ئەو لەساڵی ١٧١٧ پ.ز تا پاشایەتی نەوزەر لەساڵی ١٦٣٧ دەبێتە هەمان ١٢٠ ساڵ؟

پاشایەتی نەوزەریان بە ٧ ساڵ نووسیوە. دوای حەوت ساڵ پاشایەتی، لەتورانییەکان شکست دەخوات و بۆ ماوەی سێ سەدە و نیو، لەلایەك ئاریانی ئێران لەگەڵ ئاریانی توران و لەلایەکی دیکە لەگەڵ کەلدە و ئاشور، سەرقاڵی جەنگ بوون. ماوەیەکیش کەوتوونەتە ژێر دەسەلاّتی کەلدە و ئاشور تا ئەوەی لەساڵی ١٢٥٢پ.ز ئەفراسیاب نەبیرەی پشەنگ،

لەمناڵەکانی تور، لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دانیشت. دواتر زاب (زو) کوڕی تەهماسب لەنەژادی مەنوچێهر لەساڵی ۱۲۰۰پ.ز دەرکەوتووە و لەساڵی ۱۱۹٦پ.ز گرشاسپی برازای زاب، لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتووە. ئەویش ۹ ساڵ پاشایەتی دەکات و دەمرێت تا ئەوەی لەساڵی ۸٥۳پ.ز، سیلسیلەی کیان دەردەکەێت.

ماوەی پاشایەتی پیشدادییەکان، لەدەرکەوتنی گیومەرس تا دەرکەوتنی کەیقوبادی کورد کەیەکەم پاشای سیلسیلەی کیانە، نزیکەی ۲٤ سەدە و نیو درێژەی کێشاوە. بەمشێوە چیتر جیاوازی و کێشە لەسەر ماوەی پاشایەتی پاشاکان، نامێنێت و جگە لەم ڕێگە چارە هیچ ڕێگەیەکی دیکە بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشە مێژوویە لەئارادا نییە.

# سەبارەت بەبارودۆخی گشتی سنە (ئەردەڵان) لەخۆگری پێشەکییەك و سێ بەند

## پێشەکی

دوای ئەوەی کوردان لەئەنجامی بانگێشت کردنی کوروشی مەزن بۆ ئیکباتان، بەوشێوەی لەکۆتاییەکانی بەرگی یەکەم ئاماژەمان پێدا، تاروپۆ و شەرافەت و سەربەخۆیی خۆیان لەدەستدا و دەوڵەتی ئێران دامەزرا، هێدی هێدی، نەتەوەی کورد لەناو وشەی ئێراندا توایەوە و هەموو کردەوە و چالاکییەکانی کورد لەژێر ناوی ئێران و ئێرانی بوون، شاراوە مایەوە. ڕووداوێکی شیاوی ئاماژە پێدان بەناوی کورد، لەمێژوودا تۆمار نەکراوە، یانی ئەوەی کردوویانە بۆ ئێران و بەناوی ئێران بووە.

تا ئەوەی لەناوەڕاستەکانی سەدەی چواری کۆچی، یانی ساڵی ٣٥٨ کۆچی، ئارەزووی پاشایەتی و دەسەڵات دووبارە لەمێشکی حەسنەوییە کوڕی حسەینی دەینەوەری ژیاوە و دژی روکن ئەلدەولە حەسەن کوڕی بویە کەدووەمین پاشای بنەماڵە بویەیە، ئاڵای شۆرشی بەرز کردەوە.

روکن ئەلدەولە لەساڵی ٣٥٩ کۆچی، سوپایەکی گەورەی بەفەرماندەیی یەکێك لەسەرکردەکانی بەناوی ئیبن عەمید، وەزیری خۆی، بۆ سەرکوت کردنی کوردان راسپارد. حەسنەوییە چەند کەسێکی بەنوێنەرایەتی خۆی، ناردۆتە لای کوڕی عەمید و کێشەکە بەئاشتی چارەسەر کراوە. دوای مردنی حەسنەویەی (باوك) کوڕەکەی لەساڵی ٣٦٩ کۆچی، جێگەی باوکی گرتۆتەوە و بەڕاپەڕاندنی کاروباری حکومەتەکەی سەرقاڵ دەبێت. لەساڵی ٣٨٨ وەك کەسێکی شکۆدار دەردەکەوێت و لەلایەن دیوانی بەغداد، نازناوی ناسرئەلدەولەی پێبرا و هەموو دیاری دەینەوەر تا ئەهواز و ناوچەکانی خوزستان و بروجێرد و نەهاوەند و ئەسەد ئابادی خستۆتە ژێر دەسەڵاتەوە و دووبارە نەمامی سەربەخۆیی لەناو دڵی کوردان جارێکی دیکە گەشە دەکات و سەرۆکە کوردەکان لەهەموو ناوچەکانەوە دەکەونە جموجۆڵ.

دواتر لەناوەڕاستی سەدەی شەشەمیش، سوڵتانەکانی بنەماڵەی بویە دەردەکەون و ئاڵای سەربەخۆیی بەرز دەکەنەوە و شەرافەتی تاڵانکراوی کورد و مێژووە پڕ بەهاکەیان،

کەلاپەڕەکانی مێژوو شایەتییەتی، بۆ نەتەوەی کورد ئامادە دەکەنەوە بەشێوەیەك دەتوانین بڵێین قۆناغی سوڵتان سەلاح ئەلدینی ئەیوبی، بەقۆناغی ژیانەوەی نەتەوەی کورد بزانین کە لەباشوری قەوقاز تا سەنعا (یەمەن) لەباکور بۆ باشور و لەدیجلە تا (تەرابلوس) ڕۆژئاوا، بەشێوەیەکی سەربەخۆ و بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی ئەو سوڵتانەدا بووە.

حاج شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەوەسفی ئەودا دەڵێت:

(ئەی عەرەب ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم، ئەفزەڵن ئەمما

سەلاّح ئەلدین کەقودسی گرت، لەزەمرەی کوردی بابان بوو

عموومی شەهریاران و سەلاّتینی فەرەنگستان

لەڕەغب و ستوەتی ئەوشێرەدا گشت هەراسان بوو)).

سەڵتەنەتی بنەماڵەی بویە لەساڵی ٥٥٥ تا ٨٦٠ کۆچی درێژەی کێشاوە.

کاتی هێرش و تالاّنکاری مەغۆل و تاتار، کەسەرزەمینی ئیسلامیان لەڕۆژهەلاّت تا ڕۆژئاوا وێران و تالاّنکرد و بنەماکانی شارستانییەتیان لەناو برد، سەرزەمینە کوردەکانیش وەك ناوچە ئیسلامییەکانی دیکە، گرفتاری تالاّن و کاولکاری مەغۆلەکان بوون و جارێکی دیکە ویستی سەربەخۆیی کوردان لەناوچووە. تەنیا ئەوە بۆ کورد ماوەتەوە کە لەناخەوە هەستی سەربەخۆیی خۆیان لەدەست نەداوە.

بەم دواییانە کەدەوڵەتی ئێران زاڵبوو، شا ئیسماعیلی سەفەوی لەساڵی ٩١٢ کۆچی، لەکاتی گەڕانەوە لەگرتنی دیاربەکر، بەشێکی کرماشان و سنە و ناوچەکانی دیکەی داگیر کردووە و پەیوەستی ولاّتەکەی خۆی کردووە بەلاّم بەشێکی گەورە لەخاکی کوردستان لەژێر دەستی میرەکوردەکاندا ماوەتەوە. دەستەیەکیان هاوشێوەی نەتەوە و خێڵ لەگەڵ ژێردەستەکانی خۆیان هەڵسوکەوتی کردووە و ڕێگەی سازانیان گرتۆتەبەر. دەستەیەکی دیکە بەپێی پێویستییەکانی ڕۆژگار و سەرزەمینەکەیان، مەبەستی پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان کردووە و بەردەوام ئامادەی بەرگری کردن لەولاّتەکەیان بوون و ڕێگەیان بەدەستدرێژی کەران نەداوە.

ئەم بارودۆخە تا سەرەتاکانی سەدەی دەی کۆچی بەردەوام بووە تا ئەو کاتەی سوڵتان سەلیمی تورك، دژی شا ئیسماعیلی سەفەوی، ئاگری جەنگ هەڵدەگیرسێنێت. لەم جەنگەدا میر و سەرۆك کوردەکان ڕق و کینەی دێرینەیان لەدەستبەسەردا گرتنی کرماشان و سنە و

ناوچەکانی دیکە بەدەستی پاشای ئێران، لەدڵدا بوو. حەکیم ئیدریسی بەدلیسی بەنوێنەرایەتی سوڵتان سەلیم بەڵێنی گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی داوە. ئەم دوو هۆکارە بۆتە هۆی ئەوەی میرە کوردەکان بەزۆری پەیوەستی سوڵتان سەلیم بن بەڵام لەئەنجامی ئەم رووداوە، کوردەکان فریویان خواردووە و کەم کەم، بەها نیشتمانییەکان و سەربەخۆیی نێوخۆیی کوردان، لاواز بووە.

لەگەڵ ئەوەی کورد و پارس، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، هەردوو هاودەرد و هاونەژادن و دەگەنەوە بەیەك پشت. لەمەزهەب و ئایینیش پێش ئیسلام، هەردووك شوێنکەوتەی ئایینی زەردەشتی بوون. دوای ئیسلامیش هەردووك برایانە لەژێر ئاڵای ئیسلامدا ژیانیان بەسەر بردووە، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەم پەیوەندییە نزیکەدا، بەدبەختییەکی دیکە داوێنی ئەم دوو نەتەوە هاونژاد و هاو ئایینەی گرت و لەساڵی ٩٠٧ کۆچی، لەئازەربایجان، کێشە نێوخۆییەکان یەخەی بەم دوو نەتەوە گرت و بوار بۆ خۆتێهەڵقورتاندن و دەستێوەردانی بیانییەکان ئامادە بوو و سەرئەنجام توانییان ئاگری شەڕی مەزهەبی لەنێوان ئەم دوو نەتەوەدا هەڵگیرسێنن بەوەی ئێران مەزهەبی شیعەی هەڵبژارد و بەشێکی زۆر لەکوردەکان لەسەر مەزهەبی سوونی مانەوە. تا ئەوەی گلەیی و گازندەکان کەشیاوی چارەسەر کردن بوو، بەتەواوی لەبیرکرا و ناکۆکییەماڵوێرانەکەران جێگەیان گرتەوە.

ئاشکرایە دوای ئەوەی دەوڵەتی ئێران لەترۆپکی کۆمەڵگای ئیسلامی هاتەخوار، هەنگاوی بەرەوهەڵدێری شیعەگەری و سوونیگەری هەڵگرت. لەگەڵ ئەوەدا دەستەیەکی بوێری کورد کەزیاتر لەدە ملیۆن کەس دەبن، لەگەڵ هەموو پەیوەندییەکان و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ پارسەکان کەشان بەشانی پارسەکان، لەسەرکەوتنەکانی کوروشی مەزن بەشدار بوون و بەرەو پێش دەڕۆشتن، لەناکاو لەوڵاتی ئێران دابڕان و پەیوەستی دەوڵەتی تورکیا بوون. ئایا سەرکردە و سەرۆکەکانی کورد و پارس بیری لەوە ناکەنەوە کەپێغەمبەری ئیسلام دوو مەزهەبی نەبووە؟ ئەگەر شیعە بووە، سوونی چی دەڵێت، ئەگەر سوونی بووە، شیعە چی دەوێت؟ بۆ لەخەویی بێ ئاگایی خەبەریان نابێتەوە و بڕیارێکی بەبڕشت ناگرن و دەمارگیری کوێرکوێرانەی خۆیان پشتگوێ ناخەن و ڕاستی ئیسلام بەو شێوەی لەسەردەمی خەلیفەکان باو بووە و لەڕووی قورئان و حەدیسە ڕاستەکان کەوەك ئەمانەتی خوایین و خاوەنی شەریعەتن، فێری خەڵکان ناکەن و ڕۆحی شای شاکانی ئێران نادرشا، بەڵکو پاکی هێنەری

ئاینی ئیسلام، لەم کردەوە خواپەسەندانە شادمان ناکەن.

دەگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی خۆمان. دوای ئەوەی سوڵتان سەلیم هەستی بەئەنجامە کاریگەرەکانی جیاوازی مەزهەبی کرد و بینی ئەم پێشهاتە گرانبایییە، لەبەرژەوەندی ئەودایە، بێ دوودڵی، لەئوردووگای ئاماسیە، حەکیم ئیدریسی بەدلیسی کەرازداری نهێنییەکانی ئەوبوو، و لای کوردەکان بەهۆی پێگەی زانستی بەرزی و بەهۆی هاوزمانی و هاونەژادی لەگەڵ کوردەکان پێگەیەکی بەرزی پێبڕابوو، بۆ لای میر وسەرکردە کوردەکان نارد. حەکیم ئیدریس، بەپشت بەستن بەڕاشکاوی وپاراوی زمان و بەڵێنی دیاری و پاداشتەکان و ناردنی دیاری بۆ میر و سەرۆکەکان، هاوکاری کوردانی بۆ سوڵتان سەلیم بەدەست هێنا و لەجەنگی ناسراوی چاڵدیران،ساڵی ٩٢٠ کۆچی، شکستێکی شەرمێنەریان بەسەر سوپای سەفەویدا سەپاند کە لەمێژووەکاندا ئاماژەی پێدراوە.

مێژووی تورکان، ئەم ڕووداوەیان وەك کلیلی کاریگەری عوسمانییەکان لەئاسیای ناوەڕاست لەقەڵەمداوە و نازناوی خەلافەتی ئیسلامی لەکاتی گرتنی میسر، لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنەوە بەدەستهات. دوای ئەم سەرکەوتنە بوو کەدەوڵەتی عوسمانی تورکیا، شکۆ و مەزنی و دەسەڵاتی فراوان بوو.

سوڵتان سەلیم بەهۆی حەکیم ئیدریس، لەگەڵ میرە کوردەکان، بەپێی ئەم مەرجانەی خوارەوە، پەیمانی بەست:

یەکەم ئەوەی کە: میرە کوردەکان وەك هەمیشە میرنشینەکانی خۆیان بەڕێوەببەن و مافی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان نەبێت.

دووەم ئەوەی کە: هەرکات دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ یەکێك لەدەوڵەتە زلهێزەکان گرفتاری جەنگ ببێت، میرە کوردەکان دەبێت بەکەرەستە جەنگییەکانی خۆیان، سوپایەکی سەربەخۆ بۆ هاوکاری دەوڵەتی تورکیا بنێرن.

سێیەم ئەوەی کە: هەرکام لەمیرە کوردەکان ساڵانە بڕێك پارە وەك دیاری بەخەزێنەی دەوڵەت پێشکەش بکەن.

لەئەنجامی ئەم بەڵێننامە کەهاوشێوەی پەیماننامەیەك بوو، سەرۆکایەتی تورکان بەسەر کورد سەپێنرا و سەلمێنرا و سوڵتان سەلیم بۆ بەهێز کردن و سەقامگیر کردنی ئەم پەیماننامە، دیاری و پێشکەشی و خەڵاتی گرانبایی بۆ میر و زانا کوردەکان ڕەوانە کرد.

خودی حەکیم ئیدریسی بەدلیسی کەهۆکاری سەرەکی بەستنی ئەم پەیماننامە بوو، شمشێرێکی جەواهیر نیشان و دوانزە هەزار دوقەی زێڕ و فەرمانی وەرگرتنی بڕە پارەیەکی مانگانەی پێبڕا.

ئەم پەیماننامە، بەکلیلی پێشکەوتنی تورکەکان لەئاسیا و سەرچاوەی کاریگەری و دەسەلاّتی تورکیا لەجیهانی ئیسلامی لەقەڵەم دەدرێت کەبەپێچەوانەوە بووە هۆکاری نەمانی شەرافەتی کورد و هۆکاری بەدبەختی کوردان. لێرە بەدواوە دەرگای بەدبەختی و ڕیسوایی لەسەر ژیانی ئەم دەستەیە (کورد) ئاوەلاّ بوو.

لەساڵی ١٣٢٥ کۆچی، ئامارژەی پێدەدەین، عەبدولڕەحمان پاشای بابان، لەسلێمانی دەرکەوت و و سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری خستە جموجۆڵ و لەگەڵ تورکەکان و سنورنشینانی دەوروبەر، چەندین جەنگ و پێکدادانی ئەنجامدا و بەردەوام سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا تا ئەوەی دوای دوو ساڵ فەرمانڕەوایی، لەیەکێك لەجەنگەکان دەکوژرێت و ناوبانگ و مەبەستەکانی بوونە خۆڵەمێشی دوای ئاگر.

دواتر لەساڵی ١٢٣١، ئەحمەد پاشای بابان، برازای عەبدولڕەحمان پاشای بابان، دەردەکەوێت و لەگەڵ تورکەکان ئاگری جەنگ هەڵدەگیرسێنێت و تا ناوچەکانی بەغداد پەیوەستی سنووری خۆی دەکات. ئەوەندەی نامێنێت شکست بەسوپای تورکەکان بێنێت کەچارەنووس یەخەی دەگرێت و پەیوەستی مامی دەبێت.

دووبارە لەساڵی ١٢٣٩ کۆچی، میر بەدرخان، کەهەژدە بەهار لەساڵەکانی تەمەنی تێپەڕی کردبوو، فەرمانڕەوایی جەزیرە و بۆتانی گرتەدەست. بڕیاری ئەوەیدا سەربەخۆیی بەمیرنشینەکەی خۆی بدات و لەژێر دەسەلاّتی تورکان بێتەدەر. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە نوقمی دەریای بیرکردنەوە دەبێت و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کەهۆکاری شکستی کوردان لەتورکان، لەبەر کەمی ژمارە نییە بەڵکو دوو هۆکاری دیکەی هەیە:

یەکەم: نەبوونی یەکێتی لەنێوان هێزە کوردەکان.

دووەم: نەبوونی کارخانە و کارگە بۆ دروستکردنی تەقەمەنی و کەرەستەکانی جەنگ.

بۆ ئەم مەبەستە، میری ئاماژە پێدراو، لەژێر ناوی ڕزگار کردنی گەلی کورد، نوێنەرەکانی بەناوچە کوردنشینەکاندا بلاّو دەکاتەوە و سەرۆك و میر کوردەکان بۆ یەکگرتنێکی گشتی بانگێشت دەکات. سەرۆکە کوردەکان لەبەر ئەوەی لەسیاسەتە فریودەرەکانی تورکیا وەڕەز و

بێزار بوون، وەڵامی بانگێشتەکەی دەدەنەوە و بۆ ئەم مەبەستە ئامادە دەبن.
لەو سەرکردانەی ئەم پەیماننامەیان واژۆ کرد، دەتوانین ناوی ئەم کەسانە ببەین:
لەسەرۆکەکانی وان: مستەفا بەگ، دەروێش بەگ، مەحمود بەگ.
لەسەرۆکەکانی هەکاری: نورئەللە بەگ، فەتاح بەگ
لەسەرۆکەکانی خیزان: خالید بەگ.
لەسەرۆکەکانی موش: شەریف بەگ.
سەرۆکی عەشیرەکانی قارس و ئاجریش، حسەین بەگ، یەکێك بوو لەئەندامەکانی ئەم پەیماننامە. لەزاناکانی موسڵیش، شێخ محەممەد، لەزاناکانی زاخۆ، شێخ یوسف بەبانگێشت کردن و ئاگادار کردنەوەی خەڵکان هەستاون و بەهەموو ناوچە کوردییەکاندا گەڕاون. لەهەموو شوێنێك بەوتارە هەستبزوێنەکانی خۆیان، خەڵکیان بۆ بەشداری کردن لەم پەیمانە پیرۆزە هانداوە. زۆربەی سەرۆکەکان بێ مەرج بۆ بەستنی ئەم پەیماننامە ڕازی بوون. ئەمیر ئەردەلان، خوسرەوخانی ناکام، کوڕی ئەمان ئەللە خانی فەرمانڕەوای سنە، وەڵامی ئەم پەیمانە پیرۆزەی داوەتەوە و دوای ئاسوودە بوون لەبەستنی پەیماننامەکە، ئەم ئەمیرە سەرقاڵی ئامادە کردنی چەك و تەقەمەنی پێویست بووە و لەقەزای جەزیرە، دوو کارگە، یەکیان بۆ دروست کردنی باروت و یەکی دیکە بۆ دروست کردنی تفەنگ، دادەمەزرێنێت. جیاواز لەوە دەستەیەك لەخوێندکارەکان لەسەر خەرجی خۆی، ڕەوانەی ئەورووپا دەکات تا زانستی دروست کردنی چەك و تەقەمەنی و چالاکییە جەنگییەکان فێر ببەن. دواتر دەستەیەك ڕادەسپێرێت هونەری کەشتی ئاژوتن بۆ دەریاچەی وان فێر ببن.
لەم کاتەدا، نەستورییەکانی ئاونە، لەدانیماڵیات بۆ خەزێنەی ئەمیر، خۆیان بەدوور دەگرن. ئەمیر دە هەزار چەکدار بۆ سەرکوت کردنی ئەوان ڕەوانە دەکات و بەتەواوی سەرکوتیان دەکەن. لەم ناوەدا، یانی لەساڵی ١٢٤٨ تا ساڵی ١٢٥٨ کۆچی، لەناوچەکانی هەکاری، ڕەواندز و توری عابدین، چەندین جەنگی دیکە لەنێوان هێزە کوردییەکان و تورکەکان روویدا. شۆڕشی محەممەد پاشای کۆرە لەم ڕۆژگارەدا بوو. هەروەها شۆڕشی شەریف خان، ئەمیر بەدلیس، دژی تورکەکان لەساڵی ١٢٤٩ روویدا.
هەواڵی ئەم ڕووداوانە بەدەوڵەت و دیوانی تورکان دەگات. بەتایبەت ناوبانگی دەسەڵاتی بەدرخان بەگ لەسەرزەمین و ناوچەکانی دەوروبەر بڵاو دەبێتەوە و دەوڵەتی تورك ترس و

نیگەرانی لێ دەنیشێت. سەرەتا مەبەستی ئەوەیان کردووە، ئەندازە و ئاستی هێز و دەسەڵاتی میر بەدرخان بزانن و دواتر بۆ نەهێشتنی ئەم مەترسییە سوپا ڕەوانە بکەن. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا دوو کەسی بەکرێگیراو لەئاستانە و دیاربەکر، بۆ لای ئەمیر بەدرخان دەنێرن تا بەپەند و ئامۆژگاری ناچاری بکەن واز لەخەیاڵی یەکگرتووی کورد بێنێت و بەپاداشت و ئەو بەرژەوەندییانەی لای تورکان دەستی دەکەوێت، هیواداری بکەن و بەهەر جۆرێك بووە بۆ ڕۆشتن بۆ بابی عالی ناچاری بکەن.

پێشنیار و وتەکانی ئەو دوو کەسە کاریگەری لەسەر میر دانانێت و ڕازی نابێت بەوەی بەحەز و ویستی خۆی میرنشینەکەی بەجێ بێڵێت و بەدەستی خۆی چرای بنەماڵەکەی بکوژێنێتەوە. دوای یەکساڵ پێداگری ئەو دوو کەسە و پەیوەندی و ناردنی چەندین نامە و بێ ئەنجامی هەڕەشە و گوڕەشەکان، سەرئەنجام میر وەڵامی نە، بەبانگێشتەکەیان دەداتەوە و پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تورك دەپچڕێنێت وسەرقاڵی ئامادە کردنی سوپا و چەك و تەقەمەنی دەبێت و ئاڵای سەربەخۆیی هەڵدەکات و بەناوی خۆیەوە سکە لێدەدات. لەڕوویەکی سکەکە، میری بۆتان بەدرخان و لەڕووەکەی دیکە، ساڵی ١٢٥٨ کۆچی، نەخش دەبستێت و سەرکەوتنەکانی خۆی لەلای ڕەواندز و موسڵ تا شاری وان درێژە پێدەدات و قەڵای سنجار و شاری سەعرەد وێران و شاری سیورك تا ناوچەکانی دیاربەکر پەیوەستی سنووری میرنشینەکەی دەکات.

لەم ناوەدا شۆڕشێك لەموسڵ ڕوودەدات. بەخێرایی سوپاکەی خۆی لەسنوری سیورك و دیاربەکر بەجێدێڵێت و ڕێگەی موسڵ دەگرێتەبەر و دووبارە ئەمنیەت و ئارامی بۆ ئەو شارە دەگێڕێتەوە و لەوێوە ڕێگەی ناوەندی دەسەڵاتەکەی خۆی لەجەزیرە دەگرێتەبەر. لەم گەشتەدا، دەست بەسەر ورمێیش دەگرێت. هەموو ئەم ڕووداوانە بەدەرباری تورکان دەگات و ئاگری تووڕەیی سوڵتان بڵێسە دەسەنێت. لەبەر ئەمە سوپایەکی گەورە لەتورکەکان بەفەرماندەیی عوسمان پاشا بۆ سەرکوت کردنی ئەمیر بەدرخان ڕەوانە دەبێت. فەرماندەی پێشەنگی ئەم سوپایە، عومەر پاشا و فەرماندەی پاشکۆی سوپاکە، سەبری پاشا بووە. لەنزیك ورمێ، جەنگ لەنێوان دوو دەستەکە ڕوودەدات و دوای جەنگێکی قورس، میر بەدرخان سەرکەوتن بەدەست دێنێت. لەم کاتەدا میر هەواڵی پێدەگات کەفەرماندەی پاشکۆی سوپاکەی بەناوی عێزەئەلدین شێر کەیەکێکە لەخزمەکانی خۆی، پەیوەستی

تورکان دەبێت و بەهاوکاری هێزە تورکەکان دەڕواتە ناو جەزیرە کەناوەندی دەسەڵاتەکەی میر بەدرخانە.

بیستنی ئەم هەواڵە و مەترسییە چاوەڕوان نەکراوەکان، میر پەرێشان دەکات و هێزەکانی خۆی دەکاتە دوو دەستە. یەکێك لەناوچەکانی ورمێ و لەبەرابەر سوپای تورك جێگیر دەکات کەپاشەکشێیان کردبوو و دەستەکەی دیکە هەڵدەگرێت ورێگەی جەزیرە دەگرێتەبەر. دوای جەنگێکی قورس دووبارە میر سەرکەوتن بەدەست دێنێت و هێزەکانی تورك و عێزەئەلدین شێر ڕیسوایانە شکست دەخۆن و لەگەڵ زەرەر و زیانی زۆر، ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. بەڵام بەداخەوە عێزئەلدین شێر لەکاتی هەڵاتن لەگەڵ تورکەکان پەیوەستی سوپای تورك لەنزیك ورمێ دەبێت و بەخێرایی پەیام بۆ کەسانی بنەماڵەکەی بەناو سوپاکەی میر دەنێرێت کەمیر بەدرخان کوژراوە و تورکەکانیش دەستیان بەسەر جەزیرەدا گرتووە و ئەگەر بەخێرایی پەیوەستی سوپای تورك نەبن، هەموویان سزا دەدرێن. ئەم هەواڵە دەست و پێی سوپای ئەمیر سست و لاواز دەکات و شەوانە بڵاوەی لێدەکەن.

دوای بڵاوبوونەوەی سوپا لەبەرەی ورمێ، عێزئەلدین شێر لەگەڵ هێزەکانی تورك، بەخێرایی بۆ جەنگی میر دەگەڕێنەوە. میر کە لەڕووداوەکە ئاگادار دەبێتەوە، بەناچاری جەزیرە بەجێدێڵێت و لەقەڵای ئەروخ سەنگەر دەگرێت. هێزەکانی تورك و عێزئەلدین شێر بۆ ماوەی نۆ مانگ بەشەڕ و جەنگ و گەمارۆی قەڵاکە سەرقاڵ دەبن.

سەرەئەنجام خواردن و تەقەمەنی ڕوو لەکەمی دەکات. میر بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەکاتە سەر تورکان بەڵام چارەنوس ئەمجارە هاوکاری ناکات و شکست دەخوات.

دواتر لەساڵی ١٢٩٨، حسەین کەنعان پاشا و عوسمان پاشا، لەمناڵەکانی میر بەدرخان، مەبەستی بەدیهێنانی ئاواتە بەدینەهاتووەکانی باوکیان دەکەون و لەناکاو دەڕۆنە ناو جەزیرە و دەست بەسەر هەموو دامەزراوە حکومییەکاندا دەگرن و دروشمی سەربەخۆیی بەرز دەکەنەوە و چەندین جەنگیان لەگەڵ هێزەکانی تورك ئەنجامداوە. زۆربەی ناوچەکان دەکەونە ژێر دەستی ئەم دوو میرە تا ئەوەی سنووری سەرکەوتن و دەسەڵاتەکەیان دەگاتە ناوچەکانی جۆڵەمێرگ، ناوەندی هەکاری، زاخۆ و عەمادییە و ماردین و مدیات و نەسیبین. برا گەورەکەیان، میر عوسمان، دامەزراندنی میرنشینەکەی رادەگەیەنێت و وتار بەناوی ئەو دەخوێندرێتەوە. سەرئەنجام شکستە یەك لەدوای یەکەکانی سوپای تورك و کاریگەری و

فراوان بوونی هێز و دەسەلاتی میر عوسمان لەناوچەکە و دەوروبەر، سولتانی تورکیا، سولتان عەبدولحەمید نیگەران دەکات و بۆ ئەم مەبەستە لەجەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کوردەکان پەشیمان و بڕیار دەدات سیاسەتی خۆی لەگەڵ کوردەکان و بەتایبەت لەگەڵ بنەماڵەی بەدر بگۆڕێت.

یەکەم کاری ئەم سولتانە، ئازاد کردنی زیندانییەکانی بنەماڵەی بەدرخان بوو و بەهەموو شێوەیەك ڕێگەکانی ئاشتی لەگەڵ میرەکاندا گرتەبەر و بەڵێنی پێدان فەرمانڕەوایی هەموو ناوچە کوردییەکان بەوان بسپێرێت و ڕێگە بدات ئەوان بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، لەگەڵ نوێنەرانی تورکی ناو ئەنجومەن گفتوگۆ بکەن. لەیەکێك لەدانیشتنەکان کەژمارەی تورکەکان لەو دانیشتنەدا لەکوردەکان زیاتر بوو، هەردوو میرەکە قۆڵبەست دەکرێن و بۆ ماوەیەك لەزیندانی ئاستانە دەمێننەوە تا ئەوەی دواتر بەنێونجیگەری خەڵکان و پیاوماقولآن لەئاستانە مانەوە و خرانە ژێر چاودێرییەوە.

دواتر لەساڵی ۱۳۰۰ کۆچی، شێخ عوبەیدالله لەقەزای شەمزینان شۆڕش دەکات و بەهەموو هێز و توانایی خۆیەوە، مەبەستی سەربەخۆیی دەگرێتەبەر. زۆری پێناچێت هێزەکانی شێخ و سوپای ئێران ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە و لەهەمان جەنگ، حەمزە ئاغا دەکوژرێت و شێخ قۆڵبەست و بۆ مەدینە دووردەخرێتەوە و لەوێ کۆچی دوایی دەکات.

دواتر لەساڵی ۱۳۰۸، ئەمین عالی بەگ و میدحەت بەگ لەنەوەکانی میر بەدرخان کە لەئاستانە لەژێر چاودێریدا بوون، هەڵدێن و خۆیان دەگەیێنە تەرابۆزان و لەوێ بەڕێنوێنی مستەفا نوری ئەفەندی شاملی، نامە بۆ سەرۆکە کوردەکان دەنێرن و سەرئەنجام سوپایەکی گەورە لەهێزە کوردەکان کۆدەکەنەوە و بەفەرماندەیی خۆیان دەگەنە گوێزلەك لەنێوان ڕێگەی ئەرزرووم و تەرابۆزان. هەردوو میرەکە لەتەرابۆزان بەشێوەیەکی نهێنی پەیوەستی ئەو سوپایە دەبن بەلآم لەگەڵ ئەوەیشدا، مستەفا نوری ئەفەندی کەخۆی ڕێنیشاندەری میرەکان بووە، سولتانی لەهەموو کار و چالاکی میرەکان ئاگادار کردۆتەوە و بەفەرمانی سولتان، دوو هێزی گەورە لەهەردوو لاوە و لەیەك ڕۆژ ڕێگە لەمیرەکان و سوپای کوردان دەگرن. دوای جەنگێکی قورس، سەرئەنجام سوپای کوردان شکست دەخوات و پەنا بۆ چیاکانی ئەرغەنی و مەعدەن دەبەن و بۆ ماوەیەك لەو چیایە، سەرکەوتن و شکست لەنێوان کورد و تورکدا ئالوگۆڕ کراوە تا ئەوەی سەرئەنجام هەردوو میر ناچار دەبن خۆیان ڕادەستی سوپای

سوڵتان بکەنەوە.

دواتر، مەلا سەلیم و شەهاب ئەلدین و عەلی ئامان لەویلایەتی بەدلیس، ئالآی شۆڕش بەرز دەکەنەوە. ئاگری ئاژاوە لەکۆڵانەکانی بەدلیس خۆش دەبێت بەلآم لەماوەیەکی کەمدا سوپای تورکەکان دەگەن و شۆڕشییەکان سەرکوت دەکەن. مەلا سەلیم پەنا بۆ قونسولخانەی دەولەتی ڕووسیا لەبەدلیس دەبات و لەویٚ مایەوە تا جەنگی جیهانی دەستی پێکرد. هێزەکانی تورك ئەم هەلەیان قۆستەوە و هێرشیان کردە سەر قونسولخانە و مەلا سەلیمیان لەداردا.

## بەندی یەکەم، سەبارەت بەتایەفەکانی سنە

### شێخەکانی مەردۆخ

سیلسیلەی شێخەکانی مەردۆخ، کەئابا و ئەژدادی نووسەرن (نووسەری ئەم کتێبە)، زۆربەیان پیاوانی زانا و خاوەنی بەهرە و کەماڵ بوون.. کەسێکی ئاسایی لەناو سیلسیلەی شێخەکانی مەردۆخ بەدەگمەن دەبینرێت، ئەگەر کەسانێکی نەخوێندەوار لەناو ئەواندا دەرکەوتبێت، یا ئەوەی سەرقاڵی خواپەرەستی و تەریقەت بوون، یا ئەوەی سەرقاڵی پیشە و بازرگانی بوون و لەپیشەکەی خۆیان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. بەلآم ئێمە دەمانەوێت لەئاماژەدان بەئاستی زانست و پێگە و پلەی ئەوان لەم کتێبەدا کەئەرکی هەر مێژوونووسێکە، خۆمان بەدوور بگرین لەبەر دوو هۆ:

یەکەم ئەوەی کتێبەکە درێژدادڕی تیا نەکرێت و لەو سنوورەی بۆمان دیاریکردووە، تێنەپەڕێت.

دووەم ئەوەی بەپێنووسی نووسەر، ئاماژە بەبەهرە و پێگەی ئەوان نەدرێت چوونکە ئەگەر ڕاستییەکان بنووسم، ئەگەری هەیە گومانی دیکە بێتە ئاراوە و ئەگەر کەمتەرخەمی بکەم، ڕێز لەیاساکانی مێژوونووسین ناگرم. بۆیە ئەو کارە بەمێژوونووسانی داهاتوو دەسپێرم:

(شبپرە گر وسف کند افتاب

می کشد از جهل بە روی اش حجاب (نوسەر)

واتا: ئەگەر شەوپەرە، وەسفی هەتاو بکات، بەنەزانی خۆی پەردەیەکی بەسەردا دەکێشێت.

## مانای مەردۆخ

مەرۆدخ کە فەرەنسەوییەکان بە (کاف)ی عەرەبی مەردۆك دەینوسن و لەکتێبەکانی عەهدی عەتیق، مەروداخ نووسراوە، وشەیەکی ئاسورییە کە بەواتای کوڕی الله یا وشەی الله یا هێمای الله یا ئایەتی الله یە[1] (ئامارژەی پێدەدەین) بەلاّم لەئێستادا وشەی مەردۆخ ناوی گوندێکە لەگوندەکانی شام لەنزیك قەلاّی بەهێزی سوێدا، پایتەختی چیاکانی دەروز، لەشانزە فەرسەخی باکوری شام.

ڕەچەڵەکی شێخەکانی مەردۆخ بۆ ئەم گوندە دەگەڕێتەوە کە باوەگەورێیان لەوێوە بۆ خاکی هەورامان کۆچی کردووە (ئامارژەی پێدەدەین) بەلاّم لەڕۆژگاری نەزانی دانیشتووانی بابل، بەشێوەیەکی خراپ وشەی مەردۆخیان بەکار هێنا و بتەکانیان بەمەرۆدخ ناو بردووە. بەهەمان شێوە کە لەکتێبی (یرمیاه، پاسوقی ٥٠، سیمانی ٢) هاتووە:

((لەناو تایەفەکاندا بلاّوی بکەنەوە و هەمووان ئاگادار بکەنەوە، ئالاّ هەڵکەن و مەیشارنەوە، بڵێن بابل دەستی بەسەردا گیرا، بیل شەرمەزار و مەردۆخەکان شکێنران، بتەکانی شەرمەزار و لەت و پەت کران.))

مەبەست لەبیل، ئەو بتەیە دانیشتووانی بابل دەیانپەرەست و عەرەبەکان پێی دەڵێن بەعل. وەك لەکتێبی ئەشعیا، پاسوقی ٤٦ سیمانی یەکەم و کتێبی یرمیاه، پاسوقی ٥١، سیمانی ٤٤ ئامارژەی پێدراوە.

دواتر لەڕۆژگاری داریوش و بەختنەسر و کوروشی مەزن، دانیشتووانی بابل، وشەی مەردۆخیان بۆ بتەکان بەکار دەبرد. (خودا یا پاشا). لەدکسیۆنێر گراند لاروس، بەرگی یەکەم.ا.ر لاپەڕەی ٩٢٤ هاتووە:

نووسەرانی عیبری مەردۆخ بەمەروداخ ناو دەبەن. ناوی خواوەندێکە لەبابل کەپەرەستشیان کردووە هاوەشێوەی خواوەند. لەبەر ئەوەی نازناوەکەی (بل) بەمانای گەورە، سەیید، ڕەب-گەورەی زەوی، خواوەندی زەوی لەگەڵ خواوەندی کۆنی ئانلیل تێکەڵ دەکەن و بەهۆی ئەم لێکچواندنەوە، بەزۆری شێوەی بل مەردۆخ بەکار براوە. بل (بەل) مەردۆخ یانی گەورەی زەوی، خواوەندی زەوی. ناوی گەورەترین بتی بابلە کەشوتروك ناخونتا یا کوترو ناخونتای پاشای عیلام لەکاتی گرتنی بابل، پەیکەری ئەو بتەی بۆ شوشی پایتەختی عیلام برد و

---

[1] - مەردۆخ وشەیەکی ئێرانییە و چاوگی وشەکە ماردوشە کە سیلسیلەیەکی پاشایەتی لەئێران بووە.

دواتر لەجەنگ دژی یاپاشەکان، دووبارە بابلییەکان بتەکەیان گەڕاندەوە.

سەرەتا گومانیان دەکرد مەرۆدخ، هێمای هەسارەی مشتەرییە بەڵام دواتر پێگەی خۆریان پێدا و دواتر پێگەیان بەرزتر کردەوە هاوشێوەی هەتاوی جوان، هەتاوی بەرەبەیان و هەتاوی بەهار.

مەردۆخ، دەورێکی کاریگەری لەجیهانی هەستیدا گێڕابوو. ئەوە کەبەهۆی خواوەندەکان یانی پاشاکانی بابل هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی لەجەنگەکان دژی جنۆکە هاتووەکان لەکاووس یانی هاویە، ڕێنوێنیان بکات.

دوای کوشتنی تیمات، یانی خواوەندی گیان، لەشەڕێکی دەستەویەخە، مەردۆخ، ئاسمان و زەوی بەپارچە کەرەستەی بێ رۆحی بتەکان، پەیوەندیدا. ئەو دەبووە نێوەنجیگەر لەنێوان خەڵك و باوکیان (ع-ئا) خواوەندی ڕاستەقینە. کەم کەم ئەرکەکانی سروشت و خواوەندەکانی دیکەیشی گرتەئەستۆ.

مەردۆخ، سەرەتا لەگەڵ نەبونابو پەیمانی بەست و لەگەڵ ئەم خودایە گوزەری کرد لەپەرەستگای بابیلۆنیان، یانی بابل و بۆ پەرەستگای ئاسورییەکان، یانی نەینەوا، دوای رووخانی پاشایەتی ئاسورییەکان لەساڵی ٦٠٨ پ.ز، ئەو لەگەڵ نابوپولاسار، پاشای ئاسور و ناکودونەسر، بەختنەسری دووەم، پاشای بابل کوڕی نابوپولاسار، بوو بەبەهێزترین خواوەندەکانی کەلدە و کەمێك دوای ئەم ماوە، نابونائید، پاشای سەربەخۆی کەلدە لەساڵی ٥٥٥ پ.ز، رۆحانییەکان ئەویان لەپشت مێزی بازرگانی دەرهێنا و لەسەر تەخت دایاننیشاند و هەوڵیدا خۆی بکاتە تاکە خواوەندی وڵاتەکەی بەهەمان شێوە کەئاسور لەئاسور بووە. ئاسوری هەم ناوی خواوەندێکە و هەم ناوی پاشای ئاسور. ئەم کردەوە هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتەوە و رۆحانییەکانی مەردۆخ، نەتەوەکەی خۆیان دژی نابونائید هاندا. ئەو کاتە مەردۆخ وەك تاکە خواوەندی بابلییەکان، مایەوە. (ئەگەر ناوەرۆکەکەی کەمێك ئاڵۆزە، هۆکارەکەی بۆ وەرگێڕانی وشە بەوشە دەگەڕێتەوە). دواتر مەرۆدخ وەك نازناوێك بۆ پاشاکانی بابل بەکاربرا. هەرکەس لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشت، ئەویان بەمەرۆدخ ناو دەبرد. وەك لەکتێبی دووەمی (ملوك)، پاسوقی ٢٥، سیمانی ٢٧، فازڵ خان دەنووسێت: ((یەهویاهقین لەساڵی سی و حەوتەم ئەسیر کرا، یەهودا لەمانگی دوانزەیەم و لەرۆژی بیست و حەوتەمی مانگ کەسەرەتای مەرۆدخی پاشای بابل لەو ساڵەی پاشایەتی خۆی

دەستپێکرد.))

سێریەهویاهقین، یەهودا لەزیندان دەهێنێتەدەر. (٢٨) وشەی خێرخوازی هێنایە سەرزمان و پێگەی ئەو لەپێگەی ئەو پاشایانەی لەبابل هاوڕێی بوو، بەرزتر کردەوە (٢٩) جل و بەرگی زیندانی گۆڕی و لەهەموو ڕۆژەکانی تەمەنی لای ئەو نانی دەخوارد. (٣٠) و ئازووقەی هەمیشەیی کە لەلایەن پاشا مەردۆخەوە بۆی دیاریکرابوو، لەهەموو ڕۆژەکانی تەمەنی، حسێبی ڕۆژانەی پێدەدرا.))

لەکتێبی یرمیاه لەپاسوقی ٥٢، سیمانی ٣١ بەمشێوەیە ئاماژەی پێدراوە. لەکتێبی ئەشعیا، پاسوقی ٣٩، سیمانی یەك و لەکتێبی دووەمی ملوك، پاسوقی ٢٠، سیمانی ١٢ ئاماژەی پێدراوە کەپاشاکانی بابل بەمەردۆخ ناوبراون. مەسعودی لەکتێبی مروج الذهب، لەپەراویزی (تاریخی کامل) لاپەڕەی ٦٥ دەنووسێت: مەردۆخ ناوی یەکێك لەپاشاکانی بابل بووە کەپێش سەنحاریب پاشایەتی کردووە.

لەکتێبی بتپەرەستی و مەسحییەتی ئەمڕۆیی، وەرگێرانی (العقائید الوثنیە) کەحاجی میرزای شەریعەتمەداری دامغانی لەزمانی عەرەبی بۆ فارسی وەرگێراوە، لەلاپەڕەی ٥٥ دەنووسێت: تیایدا نووسراوە کەئاشوورییەکان مەردۆخ بەوشە ناو دەبەن و هەروەها وشە بەکوڕی خواوەند بەکر دەزانن و بەهۆی ئەم دۆعا، پشتیان بەمەرۆدخ بەستووە:

تۆی بەتوانا و ڕێنیشاندەر و ژیانبەخش، تۆی مێهرەبان لەنێوان خواوەندەکان، تۆی کوڕی خواوەندی بەکر، ئافرێنەری ئاسمان و زەوی و خاوەنەکەیان، کەس هاوتای تۆ نییە، تۆ مێهرەبانیت و زیندووکەرەوەی مردووانیت. وشەیان بەئافرێنەری و فەرمانڕەوای هەموو بونەوەرەکان دەزانی و جگە لەخوا هیچیان بەگەورەتر لەو نەدەزانی.

لەم ڕوونکردنەوەی سەرەوە دەردەکەوێت وشەی مەردۆخ نازناوە، سەرەتا بۆ بت بەکار براوە و دواتر بۆ خواوەندەکانی بابل و ئەوانەی بانگەشەی خواوەندییان کردووە. دواتر بۆ پاشا و سوڵتانەکانی بابل. بۆ هەر کەسێکی تایبەت کە لەم جیهانەدا پێگەیەکی بەرز و ڕێزداری هەبووبێت، نازناوی مەردۆخ بەکار براوە.

سەرئەنجام وەرگێرانی وشەکە کوڕی الله-هێمای الله- کلمە الله (وشەی الله)- ئایەت الله یە کەهاوشێوەی (قطب -غەوس-وەتد) و هاوشێوەکانی کە لای شوێنکەوتەکانی تەریقەت بۆ ئەولیا و شێخە پێگە بەرزەکان بەکار براوە.

دەروێش ئەمیر محەممەدی مەردۆخ، ناسراو بە بابا مەرۆدخە، گەورەترین شێخ و باوەگەورێی شێخەکانی مەرۆدخی کوردستانە. دانیشتووی گوندی مەردۆخ، یەکێك لەگوندەکانی شامە کەپێشتر ئاماژەمان پێدا. لەساڵی ٧٣٧ کۆچی لەکاتی زاڵبوونی ئەمیر شێخ حەسەنی جەلایری لەئازەربایەجان و بەغداد کەدەوڵەتی ئالیخانی لەعێراق دامەزرا، بابا مەردۆخ لەگەڵ دەستەیەك لەکەس و کار و خزمەکانی، لەشامەوە بەرەو خاکی هەورامان کۆچی کرد. بۆ ماوەیەك لەدەشتی شامیان کەبەم ناوە بەناوبانگە، خێوەتیان هەڵداوە و نیشتەجێ بوون. دانیشتووانی هەورامان و دەوروبەری، خۆپارێزی و ڕاستکرداری و خواپەرەستی بابامەرۆدخیان بینیوە و بەتەواوی باوەڕیان پێی کردووە و بوونەتە موریدی ئەو و لەدڵەوە ڕێزیان گرتووە. بابا مەردۆخ هاوشێوەی غەوسێکی ئەو ناوچەیە دەرکەوتووە. سەرەتا بەبابا مەردۆخ ودوای مردنی، بەپیر محەممەد ئەورامی ناویان بردووە.

دەستەیەك گومان دەکەن پیر محەممەد هەورامی، گەورە باوەگەورێی میر محەممەد مەردۆخە و بەم شێوەیە، بەهەڵە لەدوو شوێندا ناوی ئەویان لەریزی شێخەکانی مەردۆخ، ناو بردووە. لەجێگەیەك بەناوی دەروێش ئەمیر محەممەد مەردۆخ و دواتر پیر محەممەد ئەورامیان وەك گەورە باوەگەورێی ئەو ناساندووە لەکاتێکدا هەردووکیان، یەك کەسن. لەهەورامان بەپیر محەممەد مەرۆدخ بەناوبانگ بووە و لەدەوروبەر بەمحەممەد هەورامی.

لەکتێبی (سوڵتانەکانی هەورامان) لەبەشی چوارەم ئاماژەی پێدراوە: ((دەروێش میر محەممەدی مەردۆخ، ناسراو بەبابە مەردۆخ، لەریزی نەوەد ونۆ پیری گەورەی هەورامانە. ئارامگای ئەو لەشاری هەورامانە. زۆربەی شێخی مەردۆخ ڕەچەڵەکیان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. وشەی بابە نیشانەی ئەوەیە کەدەروێش میر محەممەدی مەردۆخ، سەیید بووە چوونکە دانیشتووانی هەورامان وشەی بابا تەنیا بۆ سەیید بەکار دەبەن.))

روونکردنەوە ئەوەی لەسەرەتاکان بۆ نەوەکانی پێغەمبەر، وشەی ئیمام بەکار براوە، ئیمام حەسەن، ئیمام حسەین و هتد، دواتر سوڵتان ئیسحاق، سوڵتان ئیسماعیل، دواتر لەناو عەجەم و کورد، بابا هاتۆتە ئاراوە، بابا تاهیر، بابا ڕەسوڵ، دواتر شێخیان بەکار بردووە وەك شێخەکانی بەرزنجە.

لەسەرزەمین ئێران، لەسەدەی یانزەیەم، وشەی سەیید یا میر بەکار براوە و بەپیاو چاکەکان و خۆپارێزان، پیر وتراوە. یەکەم کەس لەناو کوردان کە بەپیر ناوبراوە، پیر خزری شاهۆ

بووە کەدواتر ئاماژەی پێ دەدرێت.

دووبارە لەکتێبی هەورامان هاتووە: بابا مەردۆخ، لەساڵی ٦٨٠ کۆچی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەتەمەنی نەوەد و هەشت ساڵی ژنی هێناوە و لەساڵی ٧٩٠ کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. بەم پێیە سەد و دە ساڵ تەمەنی درێژ بۆتەوە.

لەساڵی ٧٨٨، لەرۆژگاری ئەمیر ئەسعەد ناسراو بەئەمیر جیاشا، یانی لەکاتی سەڵتەنتی سوڵتان مورادخانی یەکەم، لەولاّتی عوسمانی، لەسەر داوای پیر شەهریار، ئەورامی، کچی شێخ شەهاب ئەلدینی دز ئاوەری مارە کردووە، دوای دوانزە ساڵ ئەوی گواستۆتەوە ولەشەوی بووکێنی، مردووە. کورێکی بۆ هاتۆتە دنیا و ناوی ناوە گوشایش، دوای تەمەنی بلۆق لای شێخ حەسەنی مەولان ئاباد، کوڕی شێخ عەبدولکەریم کوڕی شێخ شەمس ئەلدین کوڕی شێخ مستەفا کوڕی شێخ حەسەنی یەکەم کوڕی شێخ زەکەریای موهاجیر، زانستی کۆکردۆتەوە و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ ئەورامان و بەمەولانا گوشایش ناوبانگی دەرکردووە.

مەولانا گوشایش لەساڵی ٨٤٢، دەستی بەبڵاو کردنەوەی یاسا و رێسا ئیسلامییەکان کردووە و لەساڵی ٨٧٣ کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی بەناوەکانی عەباس و عەبدولغەفار لەدوای خۆی بەجێهێشتووە. عەباس باوەگەورێی قازییەکانی هەورامانە و عەبدولغەفار، باوەگەورێی شێخەکانی دەرگاشێخان (دەگا شێخان) و تەختە و باقل ئاوا و قەزەل بەلاق و هەزار کانیان و مێرگەسار و دژن و تەنگەسیر و کاشتەر و ناوچەکانی قەرەداغ و سلێمانی و سنە و شێخەکانی دیکەی مەردۆخە کە لەبەغداد و بەیروت و میسر و ئەزمیر و ولاّتانی دیکەدا بلاّو بوونەتەوە.

پیری شالیاری ئاماژە پێدراو، ئەوەی پیرشالیاری یەکەمە کەدەڵێن ناوی سەیید مستەفا و هاوڕۆژگاری غەوسی گەورە بووە. ئەو بەیەکێك لەمناڵی مناڵەکانی عەلی عەریزی کوڕی ئیمام جەعفەری سادق دەزانن. لەساڵی ٥٦٧ کۆچی دوایی کردووە و ئارامگاکەی لەهەورامانە.

عەبدولغەفار، بەشێخ عەبدولغەفاری هەورامی ناسراوە. باوکی شێخ شەمس ئەلدینی یەکەم، باوکی شێخ عەبدولغەفاری دووەم ناسراو بەشێخ عەبدولغەفاری ئەردەلاّن، باوکی شێخ شەمس ئەلدینی دووەم، پێشنوێژ و وتارخوێنی سنە، باوکی شێخ عەبدولموئمینی یەکەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ جەمال ئەلدین، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ

عەبدولموئمینی دووەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی حاج شێخ جەمال ئەلدین، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ عەبدولموئمینی سێیەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی نوسەر شێخ محەممەدی مەردۆخ ناسراو بەجەمال ئەلدین و ئایەت الله.

دانیشتووانی هەورامان هورموزدپەرەست (زەردەشتی) بوون و خۆیان بەمناڵی مناڵەکانی ئەردەشێری دەست درێژ دەزانن ناسراو بەبەهمەن کوڕی ئیسفەندیار. هەورامییەکان تا ڕۆژگاری پیری شالیاری یەکەم، لەسەر باوەڕی زەردەشتی خۆیان مابوونەوە و بەهۆی ئەو زەرەر و زیانانەی لەسەر دەستی عەرەبەکان لێیان کەوتبوو، لەئیسلام و ئیسلامییەت بێزار بوون. پیری شاریاری دووەم، کە لەناخەوە باوەڕمەند بەئیسلام بووە، بەشێوەیەکی ئاشکرا نەیتوانیوە باسی ئیسلامیان بۆ بکات بەڵام لەناخەوە و ناڕاستەوخۆ، یاسا و ڕێساکانی ئیسلامی بۆ باس کردوون و کتێبێك کەلەخۆگری مۆجیاری و نهێنی و هێماکانە، بۆ ئەوان نووسیوە کە بە مەعریفەتی پیرشالیار ناسراوە و پێشتر ئاماژەمان بەکورتەیەکیدا. بابا مەردۆخ و موریدەکانی هەرچەندە شوێنکەوتە و باوەڕدار بەئیسلام بوون و شێمانە دەکرێت بۆ پڕوپاگەندەی ئیسلامی ڕوویان کردبێتە ئەو ناوچەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەبەر سەختی و دژواری ناوچەکە و توندوتیژی و وەحشیگەری دانیشتووانی ناوچەکە نەیانتوانیوە ڕاشکاوانە، بیروبۆچوونی ئیسلامی بۆ خەڵکان ڕوون بکەنەوە. ئەوانیش وەك پیری شالیار تەنیا سەرقاڵی ئامادە کردنی بارودۆخ و نزیك کردنەوەی دڵی دانیشتووان بوون تا ئەوەی مەولانا گوشایش لەساڵی ٨٤٢ کۆچی، دەرفەتی گونجاوی دەستکەوتووە و بەشێوەیەکی ئاشکرا، پڕوپاگەندەی بۆ ئیسلام و یاسا و ڕێسا ئیسلامییەکان کردووە. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.[1]

عەبدولغەفار دوای ئەوەی گەیشتە تەمەنی بلۆق، ئارەزووی خۆپارێزی و خواپەرەستی لەودا گەشەی کرد و بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر تەریقەت، ڕۆشتە لای شێخ شەمس

[1] - نووسەر لێرەدا تەنیا لەبەر ئەوەی دانیشتووانی هەورامان شوێنکەوتەی ئایینی باوك و باوکانیان بوون، بەوەحشی لەقەڵەمیان دەدات کەهێمایە بۆ دەمارگیری نووسەر. حاشا هەڵنەگرە کەهەر دین و ڕێبازێکی نوێ کە لەناوچەیەك بڵاو ببێتەوە یا بەزۆر دەستەیەك لەخەڵکاندا بسەپێنرێت، سەرەتا ڕووبەڕووی هەموو جۆرە دژایەتی و بەرەنگارییەك دەبێتەوە چوونکە دانیشتووانی هەورامان لەو کاتەدا نەعەرەبییان زانیوە و نەتوانای تێگەیشتنیان هەبووە لەو ئایینە تازەی لەنیمچە دوورگەی عەرەبییەوە هاتبووە ناوچەکەیان. بەرەنگار بوونەوەی ئەوان یا دانیشتووانی هەرناوچەیەکی دیکە، هێما نییە بۆ وەحشیگەری ئەوان. (وەرگێر)

ئەلدینی شوشی و دوای بڕینی قۆناغەکانی تەریقەت و گەیشتن بەحەقیقەت، بۆ ئەورامان گەڕاوەتەوە و بەوەرگرتنی مۆڵەت لەسوڵتان و میرەکانی هەورامان، ناوچەکانی دەگاشێخانی ئاوەدان کردۆتەوە و لەگەڵ موریدەکانی خۆی لەوێ نیشتەجێ بووە و بەڕێنوێنی کردنی خەڵکان سەرقاڵ بووە. لەبەر ئەمە ئەو گوندە بەدەگا شێخان ناوی دەرکردووە، یانی گوندی شێخەکان چوونکە دەگا بەمانای گوند و شێخەکان کۆی شێخە.

یەکەم کەس کەنوێژی هەینی لەهەورامان خوێندووە، شێخ عەبدولغەفارە. دوای ماوەیەك خواوەند کوڕێکی پێبەخشیوە و بەناوی مامۆستاکەی خۆی، ناوی ناوە شەمس ئەلدین.

سەبارەت بەسیلسلەی شێخەکانی مەردۆخ، جیاوازی هەیە، دەستەیەك ئەوان بەمناڵەکانی مەخزوم دەزانن لەنەوەی خالید کوڕی وەلید کە لەمورە دەگەنەوە بەپێغەمبەری ئیسلام. دەستەیەکی دیکە ئەوان بەنەوەی مناڵەکانی ئومەییە دەزانن کەدەگەڕێنەوە سەر معاویە کوڕی ئەبی سوفیان و لەعەبد مەناف بەپێغەمبەر دەگەنەوە. بەلاّم گومانی ڕاست ئەوەیە کەسیلسیلەی شێخەکانی مەردۆخ، بەنی موجتەبان (مناڵەکانی موجتەبان) یانی دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئیمام حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

ئەو شەجەرەنامەی لای شێخەکانی مەردۆخی سلێمانی و قەرەداخ پارێزراوە وکەسانی بروابێکراوی وەك زیائەلدین شێخ عومەر و حسام ئەلدین شێخ عەلی و کاك ئەحمەدی شێخ و موفتی زەهاو و چەند کەسێکی دیکە لەگەورە پیاوانی سلێمانی واژۆ و پشتڕاستیان کردۆتەوە، لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا یەکدەگرێتەوە. مێژووی هەورامانیش وەك ئامارەی پێدراوە، جەخت لەسەر ئەم شەجەرە نامەیە دەکاتەوە.

## ڕەچەڵەکی نووسەر

محەممەدی مەردۆخ کوڕی عەبدولموئمینی سێیەم کوڕی جەمال ئەلدینی دووەم کوڕی عەبدولموئمینی دووەم کوڕی جەمال ئەلدینی یەکەم کوڕی عەبدولموئمینی یەکەم کوڕی شەمس ئەلدینی دووەم کوڕی عەبدولغەفاری ئەردەلآن کوڕی شەمس ئەلدینی یەکەم کوڕی عەبدولغەفاری هەورامی کوڕی مەولانا گوشایش کوڕی دەروێش میر محەممەدی مەردۆخ ناسراو بەبابا مەردۆخ یا پیر محەممەدی ئەورامی کوڕی یوسف کوڕی سلێمان کوڕی محەممەد قەسیم کوڕی عەبدولکەریم کوڕی شەهاب ئەلدین ئەحمەد کوڕی عەبدوالله کوڕی

قاسم کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی عوبەیدالله کوڕی عیسا کوڕی حسەین کوڕی محەممەد عەلی کوڕی حەسەنی تەبەرستانی کوڕی زەید کوڕی محەممەد قایم بالحەق کوڕی زەید کوڕی محەممەد کوڕی ئەبو محەممەدی ئیسماعیل (پاشای تەبەرستان) کوڕی ئەبو محەممەد حەسەن کوڕی ئەبوئەلحەسەن زەید ئەلجەواد ئەلابلەج کوڕی ئیمام حەسەنی موجتەبا کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوری عەبدولموتەلیبی باوەگەورێی پێغەمبەر (د.خ)

هەموو لقەکانی شەجەرەی شێخەکانی مەردۆخ بەشێخ شەمس ئەلدین کوڕی شێخ عەبدولغەفاری ئەردەلآن دەگاتەوە.

١. کەسە دیارەکانی شێخەکانی مەردۆخ

کەسە دیارەکانی شێخەکانی مەردۆخ بریتین لە:

١. شێخ عەبدولموئمینی سێیەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی نوسەر. لەهەموو زانستەکان شارەزا و لەزمان پاراوی و داڕشتن، ناسراو و بەناوبانگی ڕۆژگار بووە. کەسێکی خۆشنووس بووە. بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ، پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی دارولئیحسان بووە بێ هیچ کرێ و چاوەڕوانییەك، وتارخوێندنی جەژنە ڕەسمیەکانی دەوڵەتیش لەئەستۆی ئەودا بووە، بەپێی یاسا و فەرمانەکانی دەوڵەت، پیشەی داوەری و کاروباری مەحزەری پێسپێردراوە. لەساڵی ١٢٤١ کۆچی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەبەیانی هەینی، ١٩ ڕەجەبی ١٣١٤ کۆچی دوایی کردووە. ئەم پارچە هۆنراوەی خوارەوە، میرزا ئەبولباقی شەیدا، نەوەی خوالێخۆشبوو، میرزا محەممەد حسەین، نەوەی میرزا عەبدوللە، وەزیری کوردستان لەڕۆژی لەدایك بوونی ئەو وتوویەتی:

((هزار شکر که از فضل ایزد وهاب

نهال مطلب و آمال سبز و ریان شد

شکفت خاطر مخدومیم جمال الدین

از این کرم که ز اشفاق فیض یزدان شد

چه شیخ قدوەی ارباب فضل و فهم و زکاء

ز فکر صائب او مشکلات آسان شد

چه شیخ سالك آداب حضرت نبوی

به وعظ قايد اركان دين و ايمان شد
چه شيخ از خرد و از فصاحت و ادراك
به فضل و عقل و زكاء رشك روح سبحان شد
ز فرط لطف خداى لطيف كرد الطاف
به او نكو خلقى روح بخش نيكان شد
نخست كاتب ديوان لم يزل ناميد
بەمؤمن آن خلف و فيض او نمايان شد
الهى از سر اشفاق طول عمر و خرد
كرم كنى تو به اين دل پاك دل كه احسان شد
نوشت خامەى شيدا ز بهر تاريخ اش
گلى ز گلشن اقبال سبز و ريان شد (١٢٤١)

لەساڵی ١٣٠٥ کۆچی، دەستەیەك لەبانگەشەکەرانی ئایینی مەسیحی، بەدوو بار تەورات و ئینجیل و کتێبە مەزهەبی و دینییەکان، روودەکەنە کوردستان و خوازیاری گفتوگۆ کردن لەگەڵ زانا ئایینییەکان دەبن تا ناڕاستی ئیسلام و حەقیقەت بوونی ئایینی مەسیحی بسەلمێنن. زانا ئایینیەکانی کوردستان گفتوگۆیان لەگەڵ دەکەن و ناتوانن قەناعەتیان پێبکەن. سەرئەنجام بەکۆی دەنگ بڕیاردرا باوکی من گفتوگۆیان لەگەڵ بکات. نزیکەی یەك مانگ ئەم گفتوگۆیە بەردەوام بووە. هەموو ڕۆژێك ئێوارێ لەکاژێر چوار تا ئێوارێ، بەئامادە بوونی زاناکان و پیاو ماقوڵان و خەڵکانی بازاڕ، دانیشتنەکانی گفتوگۆ و ڕەخنە گرتن وبەردەوام بووە و زۆربەی کاتەکان تا چواری شەو درێژ بۆتەوە. ڕۆژانە چەندین کیلۆ شەکر دەکرا بەشەربەت. ڕۆژانی هەینی دوو کاژێر پێش دەسپێکردنی نوێژ، لەناوەڕاستی مزگەوتەکە، خوالێخۆشبوی باوکم، لەسەر کورسی دانیشتووە و ناوەرۆکی هەموو گفتوگۆکان و پرسیار و وەڵامەکانی بۆ خەڵکان روونکردۆتەوە و داوای هاوکاری لەزاناکان کردووە تا ئەگەر گرفتاری هەڵەیەك بوویێت، ئاگاداری بکەنەوە و ئەگەر بابەتێکی نەوتراو بەبیری کەسێکدا بێت، ئەوی لێ ئاگادار بکەنەوە. هەمووان توانایی و زانایی ئەویان پشتڕاست کردۆتەوە و گفتوگۆکانی ئەویان بەسوودمەند لەقەڵەمداوە. سەرئەنجام بانگەشەکەرانی مەسیحی، کۆڵ دەدەن و شەوانە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. لەم بوارەدا

کتێبێکی نووسیوە کە هەموو بەڵگە و بورهانەکان دەگرێتەخۆ. ناوی ناوە (رد النصاری- بەرپەرچدانەوەی مەسحییەکان) بەلاّم هێشتا چاپ نەکراوە. فەقیهی بەختەوەر، کوڕی مەلا رەسوڵی مەریوانی کەبەهۆی پەیوەندی باوکی، بەردەوام هاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەکرد، پەیوەندی لەگەڵ مەسحییەکاندا دەبەستێت و لەکاتی هەلاّتن لەترس و نیگەرانی و فریودانی گەورەکەی، کوڕی قەشە یوسف ناسراو بەشەیتان، لەگەڵ ئەواندا دەڕوات و دوای چەند ساڵێك فێری پزیشکی بووە و بەگۆڕینی دینەکەی و هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی مەسیحی، بۆ ئێران گەڕایەوە بەلاّم نەیوێرا روو بکاتە کوردستان.

ماوەیەك لەهەمەدان ماوەتەوە و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ تاران. لەوێ بەناوی دۆکتۆر سەعید خانی کوردستانی بەناوبانگە و یەکێکە لەپزیشکە دیارەکانی ئێران. لەگەڵ کوردستانییەکان زیاد لەرادە میهرەبان و چاکەکارە. بەم دواییانە کتێبێکی بەناوی (نەزانی)بەزمانی کوردی بۆ پڕوپاگەندە بۆ ئایینی مەسیحی چاپ و بلاّو کردۆتەوە. بەشی یەکەمی کتێبەکەی بۆ من نارد و بەڵێنیدا بوو بەشەکانی دیکەیش بنێرێت.

منیش ئەم هۆنراوەی خوارەوەم بەزمانی کوردی و لەوەلاّمی ئەودا نووسی، چیتر بەشەکانی دیکەی بۆ نەناردم. هەموو نووسراوەکانی نێوان من و ئەو بەزمانی کوردییە، هەرچەندە مەزهەبەکەی لەدەستداوە، بەلاّم هێشتا هەستی نەتەوەپەرەستی تیا ماوە و بگرە زیاتریش بووە. هۆنراوەکەی من ئەمەیە:

ئارم دڵەی پڕ جەخارەکەم
دەرمان دەروون پڕ ئازارەکەم
نامەی نەزانیت وەلای من یاوا
بەوسام و نەرووی دیدەم ساوا
یاوا وە سەردم کەشتەکەی تیرت
مڵهەم دا نەزارم خەسەی زەنجیرت
یاسای دڵداریت بەجێ ئاوەردەن
بووچك نەزایت پاوەجێ کەردەن
ویرەی گوڵ شیرین شەکەر رێژەکەت
واژەی گوڵ قەشەنگ عەبیر بێژەکەت

نەدڵێ سەد دڵ فریفتەش مەبوو
هەزاری وەك من شیفتەش مەبو
کەڵەی دڵەکەت جۆش ئاوە ڕەدبی
کزەی دووریە قسەت کەردەبی
من خۆ کەم زووخار چەپگەردم وەردەن
ئەم جار ئەم کزە سامانساش کەردەن
دیوناتە و دوودەی کوورەی دەروونم
کەڵناتو زامان دڵەی پڕ هوونم
من جە دووری تۆ دڵم پڕ دەردەن
ویرەی و ژارەم جەهەردوو دەردەن
هەر سادیم وەچەم نەوهاڵ و باڵآت
کارەبام یاوا وەڵآل ئاڵآت
دیسان دیمەوە گۆنا زەردەکەت
بوسام دوردانە قەتران وەردەکەت
ئانە ڕۆژ جەژن شادمانیمەن
ئانە نەووەهار زندگانیمەن
وەرنە ئیسە من هوون دڵ وەردە
گیانم سەنگین بار نەن خەزان کەردە
جەرگم وەمەودای زانا بین ریش
بێ دەردو ئازیز نەزانیم بی چیش
من وەیادی تۆ هەمیشە شادم
سارا و سەرزەوی نەمەیو یادم

٢. حاجی شێخ جەمال ئەلدینی دووەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ عەبدولموئمینی باوکی نوسەر، لەخۆپارێزی و خواپەرەستی و چاکەکاری بەناوبانگ بووە، لەفیقە و اصول و زانستە عەرەبیەکانیش شارەزایی تەواوی بووە.

لەساڵی ١١٧٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٥٦ کۆچی دوایی کردووە. چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

یەکەم: شێخ عەبدولموئمین (ئامازەمان پێدا)

دووەم: شێخ عەبدولوەهاب، باوکی شێخ شەکروڵلەی ئیمام کەکەسێکی خواپەرەست و خۆپارێز و قەناعەت پیشە بووە. لەساڵی ١٢٤٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٣١٦ کۆچی دوایی کردووە.

سێیەم: شێخ عەبدولمەجید کە لەتەفسیر و حەدیس شارەزا و لەقسەخۆشیش بێ هاوتا بووە. لەساڵی ١٢٤٥ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٣٢٢ کۆچی دوایی کردووە.

چوارەم: شێخ عەبدولرەحمان کە زانایەکی بەتوانا، زمان پاراو و شیرین گوتار بووە. لەزۆربەی زانستەکان و بیرکاری شارەزا و لەهونەری گفتوگۆ و زمان شیرینی کەسێکی دەگمەن بووە. لەهەر دانیشتنێك ئامادە بووبێت، قسەکەر و زمانپاراوی دانیشتنەکە بووە. کەسانی دیکە بۆ چێژ وەرگرتن لەوتەکانی تەنیا گوێیان گرتووە و حەزیان نەکردووە وتەکانی بپچڕێنن. لەگەڵ ئەوەی قازی بووە، بەڵام زیاتر ئارەزوومەندی خواپەرەستی و گۆشەگیری بووە. توانایەکی شیاوی بۆ هۆنراوە هۆنینەوە بووە. هۆنراوەکانی زیاتر وەسف کردن و هەجو کردنە. دەخوازم هەموویان کۆبکەمەوە و چاپی بکەن. لەساڵی ١٢٤٧ کۆچی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٣١٢ بێ ئەوەی منالێك لەدوای خۆی بەجێبێڵێت، مردووە. شێخ شوکرالڵەی ئیمام لە٧ شەوالی ساڵی ١٢٨٤ لەدایك بووە و لەشەوی ٢١ شەعبانی ١٣٥١ کۆچی دوایی کردووە. چوار کوڕی هەیە: شێخ حەبیب الله، پێشنوێژ و وتارخوێن، شێخ عەبدوللە، شێخ شەمس ئەلدین، شێخ فەخرئەلدین کەهەموویان سەرقاڵی خوێندن و نوسینن.

٣. شێخ عەبدولموئمینی دووەم، پێشنوێژ و وتارخوێن باوکی شێخ جەمال ئەلدینی دووەم، کەسێکی پیرۆز و خواپەرەست بووە. لەهەموو زانستەکان شارەزا و زانیاری فروانی بووە. کتێبی (دارالنظیم) لەبەرهەمەکانی ئەوە. لەساڵی ١١٥٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢١١ کۆچی دوایی کردووە. ئەم شێعرانەم لەپشتی بەرگی کتێبەکەی بینی کەبۆ مردنی ئەو وتراوە:

شیخ مؤمن کرد ختم این کتاب

ختم عمرش نیز شد پس بالصواب
در صفر کردش سفر سوی بهشت
مزرع دنیای فانی را بهشت
چند روزی ماند باد درد و الم
کرد رحلت زاین جهان پر زغم
چون به خود می زد ندای اخرتی
اخرتی تاریخ فوت اش ای فتی (١٢١١)
لەشێخ عەبدولموئمین دوو کوڕ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ جەمال ئەلدین کەئاماژەمان پێدا.
دووەم: شێخ حەسەن، کەسێکی شارەزا لەزانستەکان بووە بەتایبەت لەحساب و ئەندازیاری و لۆجیك بەتوانا بووە. کەسێکی خۆشنووس بووە. کەتیبەکانی مزگەوتی دارئەلئیحسان و دارئەلحکومە، چ بەفارسی و چ بەعەرەبی، بەدەستی ئەو نووسراوە.. لەوێنەکێشانیش بەتوانا بووە. لەشێخ حەسەن دوو کوڕ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ عسام ئەلدین کەبێ ئەوەی منالی ببێت، مردووە.
دووەم: شێخ عەلائەلدین کە لەنەقاشی و هونەری هەڵکۆڵین دەستڕەنگین بووە. لەشێخ عەلائەلدین یەك کوڕ بەجێماوە:
شێخ بەها ئەلدین کەئەویش لەنەقاشی و هەڵکۆڵین و چەند هونەرێکی دیکە دەستڕەنگین بووە و جێگەی باوکی پڕ کردۆتەوە.
٤. شێخ جەمال ئەلدینی دووەم، پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ عەبدولمۆمینی دووەم، کەسێکی خۆپارێز و گۆشەگیر بووە، لەفیقە و حەدیس و ئەدەبیاتی پێگەیەکی بەرزی هەیە.
لەساڵی ١١٠٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١١٦٩ کۆچی دوایی کردووە. چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:
یەکەم: شێخ عەبدولموئمین کەئاماژەمان پێدا.
دووەم: شێخ شەمس ئەلدین، باوکی شێخ عەلی، باوکی شێخ ئەبولفەزڵ باوکی شێخ محەممەد کەریم و شێخ عەبدولسەمەدی مالکین لەبەندە.

سێیەم: شێخ عەبدوللە، باوکی شێخ مەحمود و شێخ محەممەد ئیمام هاجەری خاتون، باوکی شێخ عەبدوللە، باوکی شێخ لوتف الله حیکمەت.

چوارەم: شێخ محەممەد ساڵح باوکی شێخ عەبدوللە و شێخ عەلی، باوکی شێخ عەبدولعەزیز، باوکی شێخ عەبدولعەلی. لەشێخ عەبدوللە یەك کوڕ بەجێماوە: شێخ جەلال ئەلدین. لەشێخ جەلال ئەلدین دوو کوڕ بەناوەکانی:

یەك: شێخ عەبدوللە باوکی شێخ نەجم ئەلدین.

دووەم: شێخ عەبدولحەمید باوکی شێخ یەحیا مەعریفەت، سەرۆکی مەعاریفی کوردستان. لەمیش دوو کوڕ بەجێماوە: عەبدولمەجید خانی مەعریفەت باوکی داریوشی دووەم، ئەحەدخانی مەعریفەت. هەردووکیان کەسانێکی بەهرەدار و بەتوانا بوون.

٥. شێخ عەبدولمونمینی یەکەم: پێشنوێژ و وتارخوێن، باوکی شێخ جەمال ئەلدینی یەکەم، کەسێکی زانا و شارەزا بووە. هەر کتێبێکی لای مامۆستاکانی خوێندبێت، بەخەتی خۆی نووسیویەتییەوە. دەقی زانستە ڕەسمییەکان کە ١٨ دەقە، بەخەتی خۆی و لەبەرگێکی بچووکی گیرفانیدا نووسیویەتییەوە و هەمووی لەبەر کردووە. بەسەر دارشتنی عەرەبی و فارسیدا زاڵ بووە. لەساڵی ١٠٦٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١١٢٨ کۆچی دوایی کردووە.

٦. شێخ شەمس ئەلدینی دووەم: باوکی شێخ عەبدولمونمینی یەکەم، کەسێکی زانا و زمان پاراو و خۆشنوس بووە. لەزانستی (تجوید) بەتەواوی شارەزا بووە. زۆربەی دەقەکانی بەخەتی خۆی نووسیوە و هەنووکە لای من پارێزراوە. دوو کوڕی لێ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ عەبدولمونمینی یەکەم کەئاماژەمان پێدا.

دووەم: شێخ حەسەن باوکی شێخ ئیبراهیم باوکی شێخ شەهاب ئەلدین باوکی شێخ نیعمەت الله باوکی شێخ عەبدولڕەحمان. شێخەکانی باقڵ ئاوا لەمناڵەکانی شێخ حەسەنن.

شێخ شەمس ئەلدین لەساڵی ١٠٢٣ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١١١٤ کۆچی دوایی کردووە.

٧. شێخ عەبدولغەفاری دووەمی ئەردەڵان: باوکی شێخ شەمس ئەلدینی دووەم. زانای ڕۆژگاری خۆی بووە. لەزانستی پزیشکی و ئەستێرەناسی و بیرکاری شارەزاییەکی تەواوی بووە. باسی کردنی تواناکانی ئەو کاتی زۆری دەوێت:

((اگر هر موی من گردد زبانی
شود هر یك بر او تمجید خوانی
هنوز از بی زبانی خفته باشم
ز صد مدح اش یەکی ناگفته باشم.))

لەساڵی ٩٦٩ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٠٢٦ کۆچی دوایی کردووە.

٨. شێخ شەمس ئەلدینی یەکەم، باوکی شێخ عەبدولغەفاری دووەم، کەسێکی خوپارێز و خواپەرەست بووە. لەزانستی کەلام و بیرکاری مامۆستایەکی بەتوانا بووە. سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

یەکەم: شێخ عەبدولغەفاری دووەم کەئاماژەمان پێدا.

دووەم: حاج شێخ مستەفا تەختە.

سێیەم: شێخ محەممەد حەسەن، باوکی شێخ عەبدول لەتیف باوکی شێخ محەممەدی مەعروف و شێخ زەهیرئەلدین باوکی شێخ نیعمەت الله.

لەشێخ محەممەدی مەعروف دوو کوڕ بەجێماوە.:

یەکەم: شێخ عەبدول لەتیف، باوکی شێخ عوسمان باوکی شێخ عەبدولله قوتب باوکی شێخ عەبدول لەتیفی سێیەم، باوکی شێخ محەممەدی نەجیب و شێخ محەممەد باوکی شێخ عومەر.

دووەم: شێخ محەممەدی سەمیع، باوکی شێخ محەممەدی نەسیم، باوکی شێخ مەحمود و شێخ محەممەدی سەعید، باوکی شێخ محەممەدی وەسیم، باوکی شێخ عەبدواللەی بەزاز و شێخ عەبدولقادر و حاج شێخ محەممەد سەعید و شێخ محەممەد صادق و شێخ ئەسەدالله.

لەشێخ عەبدوللەی بەزاز شەش کوڕ بەجێماوە.

شێخ عەبدولحەکیم، شێخ محەممەد، شێخ محەممەد وەسیم، شێخ محی ئەلدین، شێخ عەبدولحەمید، شێخ محەممەد باقر.

لەشێخ عەبدولقادر دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ تەقی و شێخ حەسەن.

لەحاج شێخ محەممەدی سەعید دوو کوڕ بەجێماوە: ئیبراهیم و ئیسماعیل کە لەئەزمیر ژیان بەسەر دەبەن. لەشێخ محەممەد سادق دوو کوڕ بەجێماوە: ئیبراهیم و ئیسماعیل. لەشێخ ئەسەد الله یەك کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدلغەفور. لەشێخ مەحمود کوڕی شێخ محەممەدی

نەسیم دوو کوڕ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ محەممەدی سەمیع و شێخ محەممەدی نەسیم باوکی شێخ محەممەدی مەهدی و شێخ یوسف باوکی شێخ محەممەد.

دووەم: شێخ عەبدولڕەحیم، باوکی شێخ ئەحمەد و شێخ مەحمود و شێخ محەممەد حەسەن. لەشێخ ئەحمەد دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ موسا و شێخ ئەسعەد باوکی شێخ مەسعود. لەشێخ مەحمود سێ کوڕ بەجێماوە: شێخ جەعفەر و شێخ محەممەد تەقی و شێخ حسەین. لەشێخ نیعمەت الله کوڕی شێخ زەهیر ئەلدین دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدوللە و شێخ محەممەدی عارف. لەشێخ عەبدوللە دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم شێخ ئیسماعیل باوکی شێخ محی ئەلدین و شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد و شێخ عەبدولڕەحمان. دووەم: شێخ یەحیا باوکی شێخ نیعمەت الله و شێخ محەممەدی سادق و شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد و شێخ حامید و شێخ حەیدەر و شێخ مەعروف، باوکی شێخ عەبدوالله و شێخ محەممەد حەسەن باوکی شێخ محەممەد. لەشێخ محەممەد عارف کوڕی شێخ نیعمەت الله دوو کوڕ بەجێماوە:

یەکەم: شێخ محەممەد باوکی شێخ عەلی باوکی شێخ سالْحی تفەنگچی و شێخ عەبدولقادر و شێخ محەممەد ئەمین و شێخ عەبدولکەریم و شێخ محەممەدی سادق و شێخ محەممەدی شەریف و شێخ محەممەد حسەین و شێخ حەسەن.

دووەم: شێخ حەسەن، باوکی حاجی شێخ حسەین باوکی شێخ عەبدوللە و شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد و شێخ عوبەیدالله و شێخ محەممەد ئەمین و شێخ محەممەدی سدیق. لەشێخ عەبدوللە، شێخ عەبدولحەمید چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، لەشێح ئەحمەدیش، شێخ محەممەد سادق نەسیر ئەلشراف چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.

شێخ شەمس ئەلیدینی یەکەم لەساڵی ۹۱۲ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ۹۸۵ کۆچی دوایی ردووە و لەگوندی دەرە هەرد بەخاك سپێردراوە.

۹. شێخ عەبدولغەفاری یەکەمی هەورامی: باوکی شێخ شەمس ئەلدینی یەکەم، لەزانست و زانیاری بەناوبانگ و لەتەریقەت و ڕێنوێنی کردنی خەڵکان، باوەڕپێکراوی کەسانی دوور و نزیك بووە. فریشتەیەك بووە لەروخساری مرۆڤدا. لەساڵی ۸٤۷ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ۹۳٤ کۆچی دوایی کردووە. لەگوندی دەگاشێخان بەخاك سپێردراوە.

١٠. مەولانا گوشایش، باوکی شێخ عەبدولغەفاری یەکەم، بڵاوکەرەوەی ئیسلام و رێسا و یاساکانی، پاریزەری هەژاران و نەداران بووە. دانیشتووانی هەورامان و سنە نازناوی (شەرەف ئیسلامیان) پێبەخشیوە. لەساڵی ٧٩٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٨٧٣ کۆچی دوایی کردووە.

١١. بابا مەردۆخە، باوەگەورێی مەردۆخییەکانی کوردستان، باوکی مەولانا گوشایش کۆچکەر لەرێگەی خوا و شەرکەر لەرێگەی خوا. لەشامەوە رووی کردۆتە هەورامان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام بەلآم لەبەر خراپی دانیشتووانی ئەو ناوچە، نەیتوانیوە بەمەبەستەکەی خۆی بگات. تەنیا لەرێگەی مۆجیاری کردن و وانە ئەخلاقییەکان، زەین و بیروباوەری خەڵکانی بۆ ئەو کارە ئامادە کردووە و مەولانا گوشایش دەرفەتی گونجاوی دەستکەوت و یاسا و رێسا ئیسلامییەکانی بڵاو کردەوە. بابا مەردۆخ لەساڵی ٦٨٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ٧٩٠ کۆچی دوایی کردووە. یەکێك لە ٩٩ پیرەگەورەکانی ئەورامانە. گێرانەوە و بەسەرهاتی زۆری لێدەگێرنەوە وەك سوار بوونی لەسەر بەردێکی خڕ و جەنگ لەگەڵ جنۆکەکان، رۆشتن لەسەر دەریا و زیندوو کردنەوەی مردووەکان و سەوز کردنی داری وشکبوو، فەرمان کردن بەهەتاو و مانگ و و چەندین بەسەرهاتیتر و سەرسورهێنەر کەزیاتر لەئەفسانە و شتی پڕوپوچ دەچێت لەبەر ئەوە لەئامارژەدان پێی چاومان پۆشی.

١٢. حاج شێخ مستەفا تەختە، کوری شێخ شەمس ئەلدینی یەکەم، قوتابی شێخ ئیبن حەجەر، لەزانست و کەماڵ بێ وێنە و لەتەریقەت و رێنوێنی کردنی خەڵکان، کەسێکی سەرناسی رۆژگاری خۆی بووە. لەساڵی ١٩٥١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٠٤٧ کۆچی دوایی کردووە. لەگوندی تەختە بەخاك سپێردراوە. خەڵکان سەردانی گۆرەکەی دەکەن. دوو کوری لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: شێخ ئەحمەدی عەلامە و شێخ ئەبی بەکر، باوکی شێخ مەجئەلدین، باوکی شێخ موعین ئەلدین، باوکی شێخ عەبدولغەفوری کاشتەر کە لەساڵی ١٢٧٠ کۆچی دوایی کردووە. لەشێخ عەبدولغەفور دوو کور بەجێماوە: یەکەم: شێخ محەممەدی دووەم، شێخ ئەحمەد باوکی شێخ محەممەدی وەسیم. لەشێخ محەممەدیش دوو کور بەجێماوە: حاج شێخ ئیسماعیل، باوکی شێخ حەبیب اللەی مودەریس باوکی شێخ ئیسماعیل بابا شێخ و شێخ محەممەدی موسلیم. دووەم: شێخ ئیبراهیم باوکی شێخ

ئەحمەدی رۆحانی.

١٣. شێخ ئەحمەدی عەلامە، زانیاری لەسەر هەموو زانستەکانی ڕۆژگاری خۆی بووە. لەساڵی ١٠١٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی١١١٤ کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: یەکیان شێخ محەممەدی وەسیم، زانای بەناوبانگ بەزانای قەڵاچوالان، نووسەری ریسالەی (سنن الصلوه) کەبەشێوەیەکی سەرنجراکێش هەموو سونەتەکانی نوێژی چواررەکعەتی کە١٦٦٨ سوونەتە، کۆکردۆتەوە. دووەم: شێخ مەحمود باوکی شێخ محەممەدی کەریم و شێخ محەممەدی جەسیم. لەشێخ محەممەدی جەسیم، شێخ محەممەد چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەو، شێخ ئیمام ئەلدین و لەو شێخ محەممەد فخر العلما و شێخ ئیسماعیل و شێخ ئیبراهیم. شێخ محەممەدی فەخر العلما لەساڵی ١٢٩٩ بێ ئەوەی منالّی ببێت، کۆچی دوایی کردووە. لەشێخ ئیسماعیل، شێخ مەسعود و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد و شێخ حەبیب الله، باوکی شێخ محەممەدی جەمیل و شێخ محەممەدی نەزیر، چاویان بەدنیا هەڵهێناوە. شێخ ئیبراهیم پێنج کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: شێخ محەممەد سەعید، شێخ محی ئەلدین و شێخ سەلام و شێخ نیزام ئەلدین باوکی شێخ ئیبراهیمی نیزامزادە و شێخ ئەسعەد، باوکی شێخ موعین ئەلدین.

لەشێخ محەممەد کەریم، شێخ عەبدولغەفار و لەشێخ عەبدولغەفار، چوار کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدولرەحیم و شێخ محەممەد ئەمین و شێخ ئیبراهیم. لەشێخ محەممەد ئەمین، شێخ شەهاب ئەلدین باوکی حاج شێخ ئیسماعیلی مەجزوب چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. لەشێخ عەبدولڕەحیم، شێخ زیائی مەجنون بەجێماوە. شێخ عەبدولکەریم پێنج کوڕی بۆ هاتۆتە دنیا:

یەکەم: شێخ مەحمود، باوکی شێخ عەبدولغەفار، باوکی شێخ محممەد ساڵح باوکی شێخ عوبەیدالله و شێخ عەلائەلدین و شێخ قەوام ئەلدین و شێخ سەلاح ئەلدین و شێخ نیزام ئەلدین.

دووەم: شێخ محەممەد باوکی شێخ عەزیز، باوکی شێخ محەممەدی قەسیم.

سێیەم: شێخ حامید.

چوارەم: شێخ مەولان.

پێنجەم: شێخ ئەحمەد. لەشێخ ئەحمەد دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم: شێخ محەممەد سەلیمی

مامۆستا لەمزگەوتی دار ئەلئیسحان دیاریکردووە و وانە وتنەوەی لەو مزگەوتەدا بۆ خۆی و منالەکانی تەرخان کردووە. لەساڵی ١١٥٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٣٦ کۆچی دوایی کردووو. چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

یەکەم: شێخ عەبدولقادری موهاجیر، نووسەری کتێبی تقریب المرام، شرۆڤە کردنی (تهذیب الکلام) کە لەساڵی ١٢٧١ دوای جەنگی کاروانسەرا لەکوردستانەوە بۆ سلێمانی کۆچیکرد و لەساڵی ١٣٠٥ لەوێ کۆچی دوایی کرد. چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت: شێخ محەممەدی سەعید، شێخ عەبدولکەریم و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی حوجەت ئەلعولەما.

لەشێخ مەحمود چوار کوڕ بەجێماوە: شێخ موحسین، شێخ محەممەدی سادق، شێخ مەسعود لەمیسر و شێخ عەبدولغەنی.

لەحوجەت ئەلعولەما دوو کوڕ بەجێماوە. شێخ محەممەدی قازی و شێخ عەبدولمەجید موعتەمید ئەلشەریعە.

دووەم: لەکوڕەکانی حاج شێخ محەممەد سەعیدی مودەڕیس، یەکیان شێخ وەسیمە کە لەحیکمەت و کەلام شارەزایی تەواوی بووە، چەندین نامەی جۆراوجۆری بۆ سەلماندنی (واجب و نبوت و معاد و هتد) نووسیوە. پەراوێزی وەسیمییە بۆ شەرحی (تهذیب الکلام) بەناوبانگە و نیشانەی هێز و توانای ئەوە. لەساڵی ١٢١٩ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٧٥ کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

یەکەم: شێخ محەممەد ڕەزای حوجەتولئیسلام کە لەساڵی ١٢٥١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٨٥ کۆچی دوایی کردووە. ئەویش شەش کوڕی هەیە: شێخ ئەسعەدی شێخ مەعالی، شێخ نەجم ئەلدینی حوجەتولئیسلام، شێخ محەممەدی وەسیم شێخی شێخەکان و شێخ محەممەد جەعفەری ئەمینی شەرع، شێخ عەبدولسەمەدی شەرع. لەشێخ نەجم ئەلدین کوڕێك بەجێماوە: شێخ محەممەدی سەعید.

شێخ محەممەدی جەعفەر کوڕێکی دوای خۆی بەجێهێشتووە: شێخ محەممەدی باقر باوکی شێخ سەلام و شێخ عەلا ئەلدین.

شێخ عەبدولسەمەدیش دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: شێخ وەف و شێخ ئەحمەد.

سێیەم: یەکێك لەکوڕەکانی حاج شێخ محەممەدی مودەڕیس، شێخ محەممەدی نەسیمە.

مودەڕیس باوکی شێخ محەممەدی شەریف و شێخ ئەحمەد و شێخ عەلی.
دووەم: شێخ محی ئەلدین باوکی شێخ کەمال ئەلدین و شێخ جەمال ئەلدین.
١٤. شـێخ ئەحمـەدی دووەم: کەسـێکی خواپەرەسـت و خۆپـارێز بـووە، خـۆی لـەدنیا و کەرەستە مادییەکان بەدوور گرتووە. لەساڵی ١١٠٦ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی١١٨١ کۆچی دوایی کردووە. دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:
یەکەم: شێخ محەممەدی قەسیمی ئوستاد، مەولانا خالیدی شارەزووری.
دووەم: حـاج شـێخ محەممـەدی سـەعید، مامۆسـتای مزگـەوتی دارئەلئیحـسان. لەشـێخ محەممەدی قەسیم سێ کوڕ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ ئەحمەد، باوکی شێخ عەبدولفەتاح و شێخ محەممەدی جەعفەر و شێخ تاها لەبەغداد.
دوووەم: شێخ محەممەد حسەین، باوکی شێخ مەحمود و شێخ عیسا و شێخ موسا باوکی شێخ یەحیا.
سێیەم: شێخ محەممەد حەسەن، باوکی شێخ یوسف و شێخ عەبدوللە و شێخ عەلی. لەشێخ یوسف پێنج کوڕ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ ئەبولحەسەن، باوکی شێخ عەبدولعەلی یەمین ئیسلام و شێخ محەممەد ئەمین.
دووەم: شێخ محەممەدی کازم، رەئیس ئەلعولەما.
سێەم: شێخ عەبدولخالیق باوکی شێخ جەلال ئەلدین.
چوارەم: شێخ عەبدولکەریم باوکی شێخ محەممەدی قەسیم.
پێنجەم: شێخ عەبدولحەمید باوکی شێخ ئیسماعیل. لەشێخ عەبدولعەلی یەمین ئیسلام سێ کوڕ چاویان بەدنیا هەڵهێناوە: شێخ ئەحمەد، شێخ حەسەن، شێخ یەحیا. لەشێخ عەبدوللەی برای شێخ یوسف سێ کوڕ بەجێماوە:
یەکەم: شێخ عەبدولکەریمی مەجدولئیسلام باوکی شێخ عەبدولوەهاب.
دووەم: شێخ عەبدولغەفار.
سێیەم: شێخ عەبدولغەفور باوکی شێخ محەممەد.
١٥. حـاج شـێخ محەممـەد سـەعید، کـوڕی شـێخ ئەحمـەدی دووەم، لەهـەموو زانستەکانی ڕۆژگاری خۆی مامۆستا بووە. ئەمان الله خانی گەورە بەو پەڕی حەزەوە لەساڵی ١٢٢٨ وەك

لەمەلا عەباسی مودەڕیس، مەلا ئەمین چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەو، مەلا حەسەنی قازی کە لەساڵی ١١٦٣ وەك قازی هەڵبـژێردراوە و چـوار کـوڕی لـەدوای خـۆی بەجێهێـشتووە بەناوەکانی: مەلا محەممەد ئەمین، و مەلا ئەحمەد و مەلا محەممەد ئیبراهیم و مەلا مەحمود. لەمەلا ئەحمەد، مەلا حەسەن و لەمەلا حەسەن چوار کوڕ بەناوەکانی مەلا محەممەد سەعید و مەلا محەممەدی مەهدی شێخولئیسلام و مەلا سەعد و مەلا محەممەدی شەفیع ماوەنەتەوە. لەمەلا محەممەد سەعید، مەلا حەسەن و مەلا حسەین ماونەتەوە. لەمەلا حەسەن، مەلا عەبدولرەحیمی سەدرولئیسلام بەجێماوە، باوکی مەلا ئەبولحەسەنی سەدرولئیسلام. لەمەلا حسەین، سێ کوڕ بەجێماوە: قازی عەبدولکەریم، میرزا مەسعود و میرزا کازم. لەمەلا محەممەدی مەهدی شێخولئیسلام چوار کوڕ بەجێماوە:

١. مەلا ئەحمەدی شێخولئیسلام کە لەساڵی ١٢٨٩ کۆچی دوایی کردووە و سێ کوڕی لـەدوای خـۆی بەجێهێـشتووە: یەکـەم: مـەلا محەممـەد مەهـدی ناسـراو بـەئاغا بـەهائی شیخولئیسسلام و لەمیش دوو کوڕ ماوەتەوە: مەلا حەسەنی یەمین ئەلئیسلام، حاجی مەلا نەقی سوڵتان ئەلعولەما، باوکی مەلا بەهائەلدین.

دووەم: مەلا عەبدولڕەزاقی شێخولئیسلام، باوکی ئاغا عەبدولله و ئاغا ئیبراهیم.

سێیەم: حاجی مەلا باقری شێخولئیسلام باوکی مەلا ئەحمەدی فەخرولئیسلام و ئاغا جەعفەر.

٢. مەلا محەممەد ئەمین، ئەمین ئەلئیسلام کە لەساڵی ١٣٠٣ کۆچی دوایی کردووە، باوکی مەلا عەبدولمەجیدی ئەمین ئەلئیسلام باوکی مەلا عینایەت الله مۆئەیید ئەلئیسلام و مەلا عەبدولله شەرەف ئەلئیسلام و مەلا موحسین.

٣. مەلا عەبدولعەزیز ناسراو بەئاغە ئەولی، باوکی مەلا یەحیا و مەلا عەبدولخالەقی سدیق ئەلئیسلام باوکی ئاغا عەبدولوەهاب و ئاغا عەبدولحەمید و ئاغا عەبدولواسع.

٤. مەلا محەممەد ساڵحی فەخرولعولەما، باوکی مەلا عەبدولجەوادی شێخولئیسلام و مەلا محەممەدی فەخرولعولەما و مەلا عەلی ئیفتحار ئەلعولەما، لەمەلا محەممەدی فەخرولعولەما، مەلا محەممەد سەعید و مەلا محەممەد ساڵح ناسراو بەئاغە بەجێماوە.

لەمەلا سەعدئەلدین، کوڕی مەلا حەسەن، مەلا عەبدولوەهاب، مەلا عەبدوللە، باوکی مەلا محەممەد و مەلا مەحمودی هیند یەمەن، باوکی مەلا ئەبولقاسم بەجێماوە. لەمەلا محەممەد

ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ مەلا عەباسی کوڕی مەولانا گوشایش و مەلا عەباس ڕێگەی تەریقەتی نەبڕیوە، ئەوان بەموالییەکانی مەردۆخی ناو دەبەن. بەڵام سیلسیلەی شێخەکانی مەردۆخ لەبەر ئەوەی وتمان بەشێخ عەبدولغەفاری کوڕی مەولانا گوشایش کۆتایی دێت و شێخ عەبدولغەفار وەك ئاماژەمان پێدا، بۆتە شێخی ڕێنیشاندەر و قۆناغەکانی تەریقەتی بڕیوە، بەشێخەکانی مەردۆخی ناویان دەبەن.

ڕیزبەندی سیلسیلەی مەردۆخی بەمشێوەیە: لەمەولانا گوشایش دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدولغەفار ومەلا عەباس. لەمەلا عەباس، مەلا ئیسماعیلی قازی ئەورامان ماوەتەوە و لەمەلا ئیسماعیل، مەلا سەعدی قازی. لەمەلا سەعدی قازی، مەلا یەعقوبی قازی و لەو، مەلا شەریفی قازی. لەمەلا شەریفی قازی، مەلا محەممەدی قازی ماوەتەوە و لەمەلا محەممەد، مەلا حسەینی قازی و لەمەلا حسەین، مەلا عەبدولعەزیزی قازی بەجێماوە و لەو، مەلا عەبدوللەی نووسەری کتێبی مێژووی ئەورامان بەجێماوە.

خوالێخۆشبوو حاج مەلا عەبدولکەرمی مودەڕیس، باوکی مەلا عەلی مودەڕیس و مەلا حەسەنی شەکیبا لەم سیلسیلەن هەروەها مەلا قاسم کوڕی مەلا عەبدوللە موعێز ئەلسەلام و مەلا حەبیب الله فەخر ئەلشەریعە، باوکی مەلا حەسەنی فەخرزادە و مەلا محەممەدی یەمین ئەلعولەما باوکی فەخرئەلدین و ناسری مەردۆخی کەگەنجێکی هونەرمەندە، لەموالییەکانی مەردۆخن. لەبەر ئەوەی شەجەرەنامەی ئەوانم بەتەواوی دەستنەکەوت، بەم کورتەیە بەسەندەم کرد.

## ٣- سیلسیلەی موالییەکانی ئەردەلان

موالییەکانی ئەردەلآن یانی بنەماڵەی قازییەکانی و شێخولئیسلامەکانی سنە، لەمەلا حسەینی گەورە باوەگەورێیانەوە دەستپێدەکات: باوکی مەلا عەبدول لەتیفی قازی. ئەمە هۆنراوەی ئەوە:

((کی بود شاهد پی اثبات دین

چون خط عبداللطیف ابن حسین))

لەمەلا عەبدوللەتیف، مەلا یەعقوبی قازی حەسەن ئاوا بەجێماوە. لەدەیەی سێیەمی سەدەی یانزەیەمی کۆچی، کۆچی دواییکردووە و لەگوندی حەسەن ئاوا بەخاك سپێردراوە. سێ

کوڕی لێ بەجێماوە: مەلا موستەفای قازی و مەلا عەباسی مودەڕیس کەکەسێکی زانا و خۆشنوس بووە و مەلا خەلیل. لەمەلا مستەفا، مەلا عەبدولکەریمی قازی و لەمەلا مستەفا شێخولئیسلام بەجێماوە کە لەساڵی ١١٦٠ نازناوی شێخولئیسلامی پێبڕا. خوالێخۆشبوو مەلا هادی سەبارەت بەشێخولئسلامی ئەو وتوویەتی:

((گشت چون شرع شریف از مصطفا

بازوی بطلان شد از حکم اش ضعیف

دل رحیم و دور مهدی شد به عدل

کرد بار ظلم از مردم خفیف

ز این مناسب تر چه افتد در جهان

قاضی و تاریخ او شرع شریف)) (١١٦٠)

دوای سێ ساڵ داوەری کردن، شێخولئیسلامی لەساڵی ١١٦٣ شەهید کراوە. لەو، مەلا شەریفی قازی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. کەسێکی زانا و ئەدیبێکی خۆشنوس بووە. لەئەستێرەناسی و مێژوو زانیاری تەواوی بووە. لەساڵی ١١٥٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. خواجە سادق لەمێژووی لەدایکبوونی ئەو وتوویەتی:

((ثنا و بها لایق خالقی است

که بر بندگان هست دایم لطیف

ز بحر کرم مصطفا را بداد

دری همچو روح مجسم نظیف

محمد شریف اش از آن نام شد

که اشرف بود بر وضیع و شریف

بگفتا به تاریخ او هاتفی

شد از جنس آدم محمد شریف)) (١١٥٢)

باسکردنی ئەم بابەتانە لەبابەتێکی مێژووی، زیاد لەرادە ناپەسەند نییە. دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: مەلا عەبدولکەریم کە لەساڵی ١١٨٢ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و مەلا مستەفا کە لەساڵی ١١٩١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، باوکی مەلا محەممەدی عەلی.

باوکی شێخ عەبدول لەتیف و شێخ یەحیای دارئەلبەهجە.

چوارەم: شێخ محەممەد جەسیمی حوجەتولئیسلامە کە لەساڵی ١٣٠٦ کۆچی دوایی کردووە و سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

یەکەم: شێخ عەبدوللە سەدرلعولەما، باوکی شێخ عەبدول لەتیف و شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد.

دووەم: شێخ ئەبولخەیر باوکی شێخ عەلائەلدین، سێیەم: شێخ ئەبولحەسەنی سەدرئەلعولەما، باوکی شێخ ئەبوئەلبەهای سەدر ئەلعولەما، باوکی شێخ قوتب ئەلدین و شێخ فەخر ئەلدین و شێخ تاها.

لەسنە هەر بنەماڵەیەك بەناز‌ناوێك (شۆرەت) بەناوبانگە، بەمشێوەیە:

بنەماڵەی مەلا فەتحوللەی شێخولئیسلام (کەرەشەل)

مەلا حسیەنی قازی( گونینە)

شێخ یوسفی مودەریس (بزن)

ئەسەد الله خانی وەکیل (سەگەڕەش)

حاجی عەبدولڕەحیمی تاجر (کەرەکوڵ)

حاج شەعبان (وشتر)

ئاغا رەحیم (شیلەزەرد) کەپردی نێوان شارەکەی دروست کردووە.

مەمنجان (قولیە) (دۆڵمەکوڵ)(جیجاو)و....

دوای ئەوەی مەلا ئیبراهیم نەوەی مەلا فەتحوللای شێخولئیسلام، نازناوی شێخولئیسلامی پێبەخشرا، دەیویست پێش من بکەوێتەوە. ئەم هۆنراوەی خوارەوەم بۆ نووسی:

((ولست حرما ان تکون مقدما

و ما انت الا نصف ضد المقدم

ئەویش نەك تەندروست، بەڵکو شەل. بەناچاری پەشیمان بوویەوە.

## ٢- سیلسیلەی قازییەکانی ئەورامان

سیلسیلەی قازییەکانی ئەورامان لەڕەچەڵەکی مەولانا گوشایشن بەڵام چوونکە ڕەچەڵەکی

ئیبراهیم دوو کوڕ بەجێماوە:

١. مەلا فەتحوللەی قازی کە لەساڵی ١٢٨٢ کۆچی دوایی کردووە. باوکی مەلا لوتفوللە شیخولئیسلام، باوکی مەلا فەتحولله و مەلا عەبدولکەریم و مەلا مستەفا. لەمەلا مستەفا سێ کوڕ بەجێماوە: مەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلام، مەلا حەسەنی عیمادولئیسلامی وێنەگر و مەلا خەلیل. لەمەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلام دوو کوڕ بەجێماوە: مەلا فەتحوللە و مەلا لوتفولله ناسراو بەئاغە باوکی مەلا ئیبراهیم.

٢. مەلا عەباسی شێخولئیسلام، باوکی مەلا هیدایەت الله شێخولئیسلام و مەلا نەسروللە و مەلا هادی و مەلا محەممەدی ئیبراهیم، مەلا هیدایەت الله ی شێخولئیسلام، کەسێکی زانا و مێژوونووس بووە. لەساڵی ١٣٠٤ کۆچی دوایی کردووە.. بۆ مەلا نەسروللە سێ کوڕ هاتۆتە دنیا:

یەکەم: مەلا محەممەد سادقی موعین ئەلئیسلام باوکی مەلا عەبدولباقی مەحمود و مەلا نەسروالله ناسراو بەئاغە.

دووەم: مەلا مەسیح، باوکی مەلا عەبدولسەمەدی ئەمین ئەلسەلام کە لەساڵی ١٢٩٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. کەسێکی زانا و خۆشنووس بووە. چوار کوڕی هەیە: مەلا ئەحمەد، مەلا نەجم ئەلدین، مەلا عەباس، مەلا محەممەدی مەهدی.

سێیەم: مەلا فەزڵولله موعین ئەلئیسلام، باوکی مەلا عیماد ئەلدین و مەلا خەلیل کەهەردووك بێ ئەوەی منداڵیان بێت، مردوون. چوار کوڕ بۆ مەلا هادی هاتۆتە دنیا:

١. مەلا عەبدولغەفار، باوکی ئاغا وەفا و موحسین و حسەین و عەبدولله.

٢. مەلا عەبدولفەتاحی شێخولئیسلام کە لەساڵی ١٢٨٤ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە. کەسێکی زانا و دڵپاکە. شەش کوڕی بۆ هاتۆتە دنیا بەناوەکانی: مەلا عەباسی ئاغڵە، مەلا مەسعود، مەلا عەتا الله، مەلا موحیب الله، مەلا مەحمود، مەلا ئەحمەد.

٣. مەلا محەممەد ئەمیری ئەلئیسلام، باوکی ئەمیرزادە، کەسێ ڕاستکردارە.

٤. مەلا موسای موعین ئەلئیسلام، باوکی مەلا عاریف. لەمەلا مەحمود کوڕی مەلا حسەینی قازی، مەلا ئیسماعیلی قازی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە کە لەئەستێرەناسیدا کەسێکی شارەزا بووە. لەویش دوو کوڕ چاویان بەدنیا هەڵهێناوە: یەکیان مەلا محەممەدی کەریم باوکی مەلا عەبدوللەی ناسراو بەکاکەوەلی و ئەوی دیکە، مەلا عەلی قازی کەکەسێکی زانا و

لەئەستێرەناسی و چەند زانستێکی دیکە شارەزا بووە. سێ کوڕیش لەم بەجێماوە:

١. مەلا محەممەدی غایب

٢. مەلا محەممەد جەعفەری متەوەلی باشی

٣. مەلا ئیسماعیلی قازی. مەلا محەممەد جەعفەر دوو کوڕی هەیە: یەکەم مەلا موسا باوکی ئاغا ساڵح و ئاغا باقر. دووەم: مەلا محەممەد سەعید، باوکی ئاغا شەریف و ئاغا ڕەشید و ئاغا سدیق و ئاغا تەیمور و ئاغا فاتح و ئاغا تۆفیق.

لەمەلا ئیسماعیلی قازی چوار کوڕ بەجێماوە: مەلا ئیبراهیم، مەلا عەبدولحەمیدی قازی، ئاغا ئەسدالله، ئاغا حەسەن.

## ٤: سیلسیلەی شێخەکانی کانی مشکانی

سیلسیلەی شێخەکانی کانی مشکانی بەحاج شێخ محەممەدی قەسیرانی کۆتایی دێت. قەسیران گوندێکە لەگوندەکانی شام. لەوێ کۆچی کردووە و ڕوویکردۆتە گوندی کانی مشکانی و بەخۆپارێزی و ڕێنوێنی کردنی خەڵکان سەرقاڵ بووە. سیلسیلەی ڕەچەڵەکی حاجی شێخ محەممەدی قەسیرانی، بەو شێوەی خۆیان باسی دەکەن، بەمشێوەیە: حاج شێخ محەممەدی قەسیرانی کوڕی شێخ خودابەخش کوڕی شێخ بەهائەلدین کوڕی شێخ فەخرئەلدین کوڕی یوسف کوڕی فەخرئەلدین کوڕی قاسم کوڕی سایم کوڕی حاجی وەلی ئەلدین کوڕی قاسم کوڕی مەحمود کوڕی حاج عیسا کوڕی یونس کوڕی حاج ئەلیاس کوڕی ئەحمەد کوڕی حاج موسا کوڕی حاج حسەین کوڕی حاج موزەفەرئەلدین کوڕی خوداد کوڕی الله بەخش کوڕی حەسەن کوڕی خەلیل کوڕی محەممەد کوڕی حاجی وەلی ئەلدین کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیسرائیل کوڕی عەبدولمەدرەك کوڕی قوسەی کوڕی کەلاب کوڕی مورە کوڕی کەعب کوڕی لۆئەی کوڕی غالب کوڕی فەهر کوڕی مالك کوڕی نەسر کوڕی کەنانە کوڕی خوزەیمە کوڕی مەدرەك کوڕی ئەلیاس کوڕی موزێر کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان باوەگەورێی پێغەمبەر. عەرەب بوونی حاجی شێخ محەممەد و هاتنی ئەو لەقەسیرانەوە بۆشام لەگەڵ وشەی وەك خواداد و الله بەخش لەباوەگەورێکانی ئەو یەکناگرێتەوە. بەهەرحاڵ لەحاجی شێخ محەممەدی قەسیرانی، شێخ شەمس ئەلدینی یەکەم هاتۆتە دنیا و لەو، شێخ محەممەد و لەو، شێخ شەمس ئەلدینی دووەم، باوکی شێخ مستەفا

و شێخ قاسم ماوەتەوە. لەشێخ مستەفا، شێخ شەمس ئەلدین، باوکی شێخ نەسیمی نۆڕەیی، باوکی شێخ نەعیم و شێخ قەسیمی بانگبێژ ماوەتەوە.

بۆ شێخ نەعیم پێنج کوڕ هاتۆتە دنیا: ١. شێخ حەسەن، ٢. شێخ حسەین، ٣. شێخ محی ئەلدینی سەبری، ٤. شێخ نەجم ئەلدین، ٥. شێخ بەها ئەلدین. لەشێخ قەسیمی بانگبێژ، شێخ محەممەدی بانگبێژ بەجێماوە (شێخ شەکور و شێخ سەبور باوکی شێخ عەبدولحەمید لەگەڵ شێخ نەسیمی نۆڕە، ئامۆزان.).

لەشێخ قاسم سێ کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ زیائەلدین، ٢. شێخ شەمس ئەلدین، ٣. شێخ ئەحمەد.

لەشێخ زیائەئەلدین دوو کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ عەبدولقادر، ٢. شێخ عەبدولرەحیم.

لەشێخ عەبدولقادر دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ جەسیم، باوکی شێخ عەبدولقادر و شێخ قەسیم باوکی شێخ بابا. بۆ شێخ عەبدولڕەحیم دوو کوڕ هاتۆتە دنیا: شێخ عەبدوللە و شێخ لوتفوللە، باوکی شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد. لەشێخ شەمس ئەلدین چوار کوڕ بەجێماوە:

١. شێخ محەممەد حسەین، ٢. شێخ عەبدوللە، ٣. شێخ محەممەد، ٤. شێخ مۆئمین.

لەشێخ محەممەد حسەین، شێخ ئەسعەد بەجێماوە، باوکی حاج شێخ محەممەدی سادق باوکی شێخ بەها ئەلدین و شێخ محەممەدی باقر.

لەشێخ عەبدوللە دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ عەبدولڕەحیم، حاج شێخ عەبدولمەجید.

لەشێخ عەبدولڕەحیم سێ کوڕ بەجێماوە: شێخ ئەحمەد، شێخ محەممەد، شێخ عەبدولحەمید، باوکی شێخ عوبەیداللە و شێخ شەمس ئەلدین.

لەحاجی شێخ عەبدولمەجید پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ محەممەد ئەمین باوکی بەهائەلدین، ٢. شێخ عەبدولڕەحمان باوکی عەبدوللە و عەلا ئەلدین، ٣. شێخ لوتفوللە، باوکی حەبیب الله، ٤. شێخ محەممەد، ٥. شێخ عەبدولسەمەد. بۆ شێخ محەممەد چوار کوڕ هاتۆتە دنیا: ١. شێخ محەممەد سەعید باوکی شێخ محەممەد باوکی شێخ عەلا ئەلدین، ٢. حاجی شێخ محەممەدی وەسیم، باوکی شێخ عەبدوللە، ٣. شێخ ئیسماعیل، باوکی شێخ محەممەدی باقر و شێخ حەسەن باوکی شێخ عەبدولکەریم و شێخ عەبدولسەمەد، ٤. شێخ ئیبراهیم.

بۆ شێخ ئەحمەد حەوت کوڕ هاتۆتە دنیا: ١. شێخ حسەین، ٢. شێخ عەبدولکەریم، ٣. شێخ

عەبدولغەفار، ٤. شێخ عەبدولغەفور، ٥. شێخ حەسەن، ٦. شێخ محەممەدی سەعید، ٧. شێخ محەممەدی شەریفی غایب.

پێنج کوڕ بۆ شێخ حسەین هاتۆتە دنیا: ١. شێخ ئەحمەد ڕئیس ئەلعولەما، ٢. شێخ محیّ ئەلدین، ئەمین ئەلعولەما، ٣. شێخ عەلی سیقەت ئەلعولەما، ٤. شێخ سەعد ئەلدین، ٥. شێخ نەجم ئەلدین.

١. شێخ ئەحمەدی رەئیس بێ ئەوەی کوڕ بێت، مردووە، ٢. لەشێخ عەلی، شێخ ئیسماعیل بەجێماوە، ٣. لەشێخ محیّ ئەلدین چوار کوڕ بەم ناوانە بەجێماوە: یەکەم: میرزا محەممەد، باوکی عێزەت، حەسەن و محەممەد سەعید، دووەم: میرزا جەعفەر، باوکی سەیفوللە، شوکروللە، و محەممەد شەریف، سێیەم: میرزا باقر باوکی سالّح، چوارەم، شێخ حەیدەر. لەشێخ سەعد ئەلدین، حسەین بەجێماوە.

بۆ شێخ نەجم ئەلدین سێ کوڕ هاتۆتە دنیا: محەممەد سدیق، محەممەد هادی، و شێخ عەبدوللە باوکی مەهدی.

لەشێخ عەبدولکەریم سێ کوڕ بەجێماوە: ١. حاج شێخ محەممەدی موعەتەمید ئەلئیسلام، ٢. شێخ مەحمود موعتەمید ئەلشەریعە، ٣. حاج شێخ عەبدولحەمیدی مودەڕیس باوکی شێخ عارف عەرشی و شێخ بورهانی حەمدی و شێخ نەعمان.

لەحاجی موعتەمید ئەلئیسلام شەش کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ عەبدولسەمەد باوکی شێخ محەممەدی سادق، ٢. شێخ ئەبولبەقامی مەزهەرولئیسلام باوکی میرزا سەعید، باوکی بیژەن و ئەرژەنگ و میرزا جەواد و میرزا ڕەزا، ٣. شێخ عەتا اللە، باوکی عێزەت و نیعمەت و کیومەرس و فەرەیدون، ٤. ئاغا وەفا باوکی فەرهەنگ و فەرزین و فەڕوخ و مەنوچێهر، ٥. سەلاح ئەلدین باوکی جەلال و سیروس، ٦. سەلام باوکی هوشەنگ.

لەشێخ عەبدولغەفار چوار کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ سەعداللە ئیعتیماد ئەلئیسلام، باوکی شێخ محەممەدی تەبیب، ٢. شێخ حەبیب اللە ئیعتیماد ئەلئیسلام، باوکی میرزا مەسعود خانی قەسیری و میرزا موحسین، ٣. شێخ شوکرواللە، باوکی عەبدوللە و نەسروللە و یەدوللە، ٤. شێخ عەبدولخالەقی غایب.

لەشێخ عەبدولغەفور، شێخ ئیبراهیمی بانگبێژ بەجێماوە، باوکی شەمس ئەلدین و فەخر ئەلدین.

لەشێخ حەسەن دوو کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ عەبدولرەحمان، باوکی شێخ عوبەیدالله و شێخ عەلا ئەلدین باوکی عەبدوللە، ٢. شێخ عەبدولمەجید باوکی شێخ محەممەد و شێخ ئەبولقاسم.

## ٥: سیلسیلەی سەییدەکانی ئەردەلان

چەندین لق لەسەییدەکانی حسەینی و حەسەنی لەکوردستانی ئەردەلآن دەژین کەسیلسیله و ڕەچەڵەکیان بۆ خۆیان دروستکردووە و بەناوچەکاندا بلآو بوونەتەوە کەبریتین لە:

١: سەییدەکانی شێخولئیسلامی، بەسەیید مەحمود و سەیید زەکی ئەلئیسلام کۆتایی دێن.

زنجیرەی ڕەچەڵەکی ئەوان حسەینییە و بەمشێوەیە: سەیید زەکی شێخولئیسلام کوڕی حاج مەحمودی شێخولئیسلام کوڕی سەیید زەکی یەکەمی شێخولئیسلام کوڕی سەیید ئەحمەدی شێخولئیسلام کوڕی سەیید خزری شێخولئیسلام کوڕی سەیید یەعقوبی شێخولئیسلام کوڕی سەیید خزری شێخولئیسلام کوڕی سەیید ئیسحاقی شێخولئیسلام کوڕی سەیید ئەحمەد شێخولئیسلام کوڕی سەیید ئیسماعیل کوڕی سەیید خزر کوڕی سەیید میکائیل کوڕی سەیید ئیسحاق کوڕی سەیید شەهاب ئەلدین کوڕی سەیید جەعفەر کوڕی سەیید عەرەب شا کوڕی سەیید جەعفەر کوڕی سەیید محەممەد کوڕی سەیید جەعفەر کوڕی سەیید حسەین کوڕی سەیید تالیب کوڕی سەیید حسەین کوڕی سەیید جەعفەر کوڕی سەیید محەممەد کوڕی سەیید ئیسماعیل کوڕی سەیید محەممەد کوڕی سەیید شەمس ئەلدین کوڕی سەیید ئەحمەد کوڕی سەیید محەممەدی ئەعرابی کوڕی سەیید قاسم کوڕی سەیید حەمزە کوڕی ئیمام موسای ڕەزا. لەناوەڕاستی سەدەی دوانزەیەم ڕوویان کردۆتە کوردستان. لەڕۆژگاری سوڵتان سەنجەر یانی ساڵی ٥٤٢ تا ڕۆژگاری فەتح عەلی شا، هەڵگری ناوی شێخولئیسلامی بوون. لەساڵی ١٢٣٠ بەوشێوەی دواتر ئاماژەی پێدەدەین، بەفەرمانی ئەمان الله خان، هەردووکیان کوژران.

٢: سەییدەکانی سەڵوەتاوا کە بەسەییدەکانی نەمان بەناوبانگن. لەبنەڕەتدا گوندی سەڵوەتاوا ناوی نەمان بووە و بەم دواییانە بۆتە سەڵوەتاوا. سیلسیلەی ڕەچەڵەکی ئەم سەییدانە بەمەلا ئیبراهیم کۆتایی دێت کە لەو گوندەدا بەخاك سپێردراوە. مەلا ئیبراهیم و شێخ ئەحمەدی خوشکەزای کە بەشێخە ڕەش ناسراوە و لەگوندی نایسەر بەخاك

سپێردراوە، لەمناڵەکانی بابا عەلی هەمەدانین. کوڕی بابا یوسفی هەمەدانی کوڕی سوڵتان مەنسور کوڕی سوڵتان عەبدولعەزیز کوڕی سوڵتان عەبدوللە کوڕی سوڵتان ئیسماعیل کوڕی ئیمام موسای کازم. مەلا میرزای چوری کەباوەگەورێی دەستەیەك لەسەییدەکانی چورە، یەکێکە لەمناڵەکانی بابا عەلی هەمەدانی. ئەم سێ لقە، یانی سەییدەکانی نەمان و نایسەر و چور، لەگەڵ سەییدەکانی بەرزنجە دەگەنەوە یەك ڕەچەڵەك و هەر چواریان دەبنە مناڵەکانی باباعەلی. سەییدەکانی پەنجە کە مناڵەکانی شای زەڕین کەمەرن( پشتێن زێڕین)ـ لەسیلسیلەی سەییدەکانی بەرزنجەن و هەموویان حسەینین.

٣: سەییدەکانی کەلجی بەشێخ ساڵح کۆتایی دێن کە لەگوندی کەلجی بەخاك سپێردراوە. سیلسیلەی ڕەچەڵەکی ئەوان بەسەیید سەجاد ئیمام زەین ئەلعابدین کۆتایی دێت. ئەوانیش لەریزی سەییدەکانی حسەینین.

٤: سەییدەکانی پیری خزران، لەمناڵەکانی سەیید محەممەد زەهیر ئەلدین، پیر خزری شاهۆن کە لەگوندی قەتڵەق ئاوا بەخاك سپێردراوە. سەییدەکانی گوندی مەرقومە، هەموویان مناڵەکانی پیر خزرن. لەبەر ئەمە گوندی مەرقومە کەم کەم ناوەکەیی بۆ پیری خزران گۆڕاوە. ئەلف و نونەکەی ، ئەلف و نونی کۆیە. ڕەچەڵەکی پیر خزر بەئیمام عەلی نەقی کۆتایی دێت. ئەویش یەکێکە لەسەییدەکانی حسەینی بەمشێوەیە:

سەیید محەممەد زەهیر ئەلدین کوڕی سەیید مەحمودی مەدەنی، کوڕی سەیید جەعفەر کوڕی سەیید حەسەن کوڕی سەیید مەحمود کوڕی سەیید ڕەحمەت الله ی شەهید کوڕی سەیید موسا کوڕی سەیید حسەین کوڕی سەیید محەممەدی شەهید کوڕی سەیید منهاڵ کوڕی سەیید ماجید کوڕی سەیید عەبدولڕەحیم کوڕی سەیید قاسم کوڕی سەیید ئیدریس کوڕی سوڵتان جەعفەر کوڕی ئیمام عەلی نەقی کوڕی ئیمام محەممەدی تەقی کوڕی ئیمام عەلی ڕەزا کوڕی ئیمام موسای کازم کوڕی ئیمام جەعفەری سادق کوڕی ئیمام محەممەدی باقر کوڕی ئیمام عەلی (زەین ئەلعابدینی سەجاد) کوڕی ئیمام حسەین کوڕی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب.

٥: سەییدەکانی باینچوب، بەشێخ ئەحمەدی باینچوب کوڕی ئەمیر مەحمودی سەبزەواری کۆتایی دێن. ئەوانیش لەمناڵەکانی پیرخزرن و شێخ ئەحمەد لەگوندی باینچوب بەخاك سپێرداوە.

٦: سەییدەکانی پاوە و دەشە و شمشێر. سەیید عەبدولسەمەدی تودار لەکتێبی نورالانوار نووسیویەتی ئەوان کاتورانین. کاتوران (حسەین) لەچاوڵکانی عەبدوللە بەخاك سپێردراوە. بەمپێیە لەمناڵەکانی پیر یونس کوڕی پیر ئەلیاس کوڕی پیرخزری شاهۆن. بەڵام سەییدەکانی پاوە و دەشە دەڵێن لەڕەچەڵەکی سەیید مەحمودی ئیسفەهانین و ڕەچەڵەکی خۆیان لەسەیید مەحمود تا ئیمام جەعفەری سادق دەبەنەوە و زۆربەی وتەکانی سەیید عەبدولسەمەد بەدرۆ و بەبێ بنەما دەزانن.

٧: سیلسیلەی سەییدەکانی شاڵی شەل، مناڵەکانی قازی خان و سەییدەکانی پارسانیان مناڵەکانی سەیید شوکروللە ناسراو بەکوڵەزەرد و سەییدەکانی قاراوا و تاوە گۆزییەکان هەموو دەگەڕێنەوە بۆ سەر ڕەچەڵەکی پیرخزر و بەگشتی حسەینین. سەییدەکانی خوڕخوڕە و دەرشێخان لەمناڵەکانی سەیید شوکرەن کە لەگوندی پارسانیان بەخاك سپێردراوە. سوڵتان ئیسحاقی کوڕی عیسا مەوتەم ئەلئشبال کوڕی ئیمام زەین ئەلعابدین لەچیایەك کە بەم ناوە بەناوبانگە، لەبەرچاو دیار نەماوە و چیتر هیچ شوێنەوارێکیان لەو نەدۆزیوەتەوە.

٨: سیلسیلەی سەییدەکانی سەفاخانە لەمناڵی پیرخزری حەفید پیرخزری شاهۆن

٩: سەییدەکانی چوڕ، لقی مەلا ئەبوبەکری موسنیفی سەیید حەسەن کوڕی سەیید هیدایەت کوڕی سەیید بدایەت کوڕی مەلا یوسف جان لەمناڵەکانی پیر خزرن. ئەمانە جیاوازن لەنەمانییەکان.

١٠: سیلسیلەی سەییدەکانی خانەقای پاوە و سوڵتان ئیسحاق و حەمزەی نەجاڕ، مناڵەکانی ئیمام جەعفەرن. ڕەچەڵەکی ئەوان دەگاتەوە عەلی عەریزی کوڕی ئیمام جەعفەر.

١١: سیلسیلەی سەییدەکانی تودار، خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ سوڵتان جەعفەری کوڕی ئیمام عەلی نەقی. یانی سەیید عەبدولسەمەدی توداری کەلەوانە، سیلسیلەی خۆیانی بەمشێوەیە نووسیوە: سەیید عەبدولسەمەد کوڕی شێخ ساڵح کوڕی سەیید موراد ناسراو بەعەلامەی نەیشابوری کوڕی شێخ محەممەد ناسراو بەسەلاح ئەلدین کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی ئەمیر شەریف کوڕی ئەمیر کامل کوڕی شێخ عەبدوللە کوڕی ئەمیر عەلی کوڕی ئەمیر محەممەد کوڕی ئەمیر شەریفی عەلامنە کوڕی ئەمیر محەممەد کوڕی ئەمیر حەمزە کوڕی ئەمیر کەلال کوڕی ئەمیر حەمزە کوڕی خواجە شاە ئەحمەد کوڕی ئەمیر داوود کوڕی سەیید وەلی ئەلدین کوڕی عەبدولحەق کوڕی سەیید عەبدوللە کوڕی سوڵتان ڕەزا کوڕی سوڵتان حەیدەر کوڕی

سوڵتان جەعفەر کوڕی ئیمام محەممەدی نەقی کوڕی ئیمام محەممەدی تەقی کوڕی ئیمام ڕەزا کوڕی ئیمام موسای کازم کوڕی ئیمام جەعفەری سادق کوڕی ئیمام محەممەدی باقی کوڕی ئیمام زەین ئەلعابدین کوڕی ئیمام حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

لەساڵی ١٠٤٦ کۆچی، سوپای قەزەلباش هێرش دەکەنە سەر گوندی تودار و تاڵانی دەکەن. سەیید عەبدولحەمید، برای سەیید عەبدولسەمەد و شێخ ساڵحی باوکی دەکوژن. سەیید عەبدولسەمەد بریندار دەبێت و بەبریندای بۆ کاکو زەکەریا و بۆ لای شێخ شەهاب ئەلدینی کاکو زەکەریایی کوڕی شێخ ڕەزی ئەلدین هەڵدێت و لەوێ سەرقاڵی بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر لەسەر تەریقەت و زانستەکان دەبێت. لەساڵی ١٠٩٩ کتێبێکی نووسیوە و ناوی ناوە نورالانوار. هەرچەند ئەم کتێبەی سەبارەت بەمێژوو و ڕەچەڵەکەکانە، بەڵام زیاتر هاوشێوەی ئەفسانەیە تا ڕاستی.

وەك سەییدەکانی پاوە و دەشە دەڵێن، لێوانلێوە لەدرۆ و گێڕانەوەی بێ بنەما کەلای زاناکان پەسەند نییە و نەشیاوە بۆ ڕازی بوون.

١٢: سیلسیلەی شێخەکانی کاکوزەکەریا: یەکەم کەسی ئەوان شێخ شەهاب ئەلدین کاکو زەکەریایە و لەسەییدەکانی حەسەنین. سیلسیلەی شێخ شەهاب ئەلدین بەمشێوەیە:

شێخ شەهاب ئەلدین کوڕی شێخ ڕەزی ئەلدین کوڕی شێخ ڕەزای موعین ئەلدین کوڕی شێخ موسا کوڕی شێخ مەحمود کوڕی شێخ یوسف کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی جامی (ڕوکن ئەلدین) کوڕی شێخ ئەحمەد شێخولئیسلامی جام کوڕی شێخ عەبدوڵلەی سامت کوڕی شێخ محەممەد سادقی فازڵ کوڕی شا نیعمەت الله کوڕی شێخ زەکەریا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ حەسەن کوڕی شێخ سلێمان کوڕی شێخ خالید کوڕی شێخ حەسەن کوڕی شێخ تەقی ئەلدین (ئەبولحەسەنی شازەلی) کوڕی شێخ عەبدوللە کوڕی شێخ عەبدولجەبار کوڕی شێخ هورموز کوڕی شێخ حاتەم (ئەحمەد) کوڕی شێخ قوسەی (یونس) کوڕی شێخ یوسف کوڕی شێخ ئازەر (داوود) کوڕی یوشەع کوڕی وەرد عەبدوللەتیف کوڕی شێخ محەممەد کوڕی سوڵتان ئەحمەد کوڕی سوڵتان محەممەد کوڕی سوڵتان حسەین کوڕی سوڵتان محەممەد (حەسەنی موسەلەس) کوڕی سوڵتان حەسەنی موسەنا کوڕی ئیمام حەسەنی موجتەبا کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

١. شێخ شەهاب ئەلدینی کاکو زەکەریا، کەسێکی زانا و خواپەرەست بووە. لەساڵی

۱۰۰۳ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ۱۰۷۲ کۆچی دوایی کردووە.

۲. شێخ ڕەزی ئەلدین، لەڕۆژگاری شا عەباس سەرقاڵی ڕێنیشاندانی خەڵکان بووە.

۳. شێخ ڕەزا موعین ئەلدین، قوتابی شێخ ئیبن حەجەری مەککی بووە، کتێبی (مسللك السالك) سەبارەت بەداب و نەریتەکانی نەقشیە و قادرییە و شازەلیە ڕەفاعیە و کەبرویە و خەڵوەتییە و لەواییە و چەشنییە، لەبەرهەمەکانی ئەوە.

٤. شێخ عەبدولڕەحمانی جامی، ناسراو بەروکن ئەلدین، زانای ڕۆژگاری خۆی بووە. کتێبی ناوداری ئەو (فرض و سنت)ە. لەساڵی ۸۹۸ کۆچی دوایی کردووە. ئەم کەسە جیاوازە لەشێخ عەبدولڕەحمانی جامی ناسراو بەنور ئەلدین، نووسەری کتێبی جامی لەنحو و بەرهەمە بەناوبانگەکانی دیکەیە.

٥. شێخ ئەحمەد، شێخولئیسلامی جامی بووە.

٦. شێخ محەممەدی سادق، کەسێکی زانا بووە. لەزۆربەی زانستەکان شارەزا و کتێبی (قاموس الانساب) لەبەرهەمەکانی ئەوە.

۷. شاه نیعمەت الله وەلی، لەشێخە گەورەکانی تەریقەتە. لەهەموو زانستەکان زانا و لەساڵی ۸۲۷ کۆچی دوایی کردووە. سێ کوڕی لێ بەجیماوە: شێخ محەممەدی سادق (ئاماژەمان پێدا) و شێخ عەبدولڕەئوف و شێخ عەبدولحەفیز.

۸. شێخ زەکەریا ناسراو بەکەمال ئەلدین لەکەسە بەناوبانگەکانی تەریقەتە. لەساڵی ٦۰۷ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ۷٤۲ شەهید کراوە. ساڵەکانی تەمەنی بۆ ۱۳٥ درێژ بۆتەوە. دوانزە کوڕی لێبەجێماوە: ۱. شاه نیعمەت الله وەلی (ئاماژەمان پێدا)، ۲. بابا عەلی کە لەگوندی کاکو زەکەریا بەخاك سپێردراوە، ۳. شێخ حەسەن لەگوندی سورەکەل بەخاك سپێردراوە، باوکی بابا موراد، باوکی شێخ ئەبوبەکر، شێخ ئیبراهیم، ٤. شێخ محەممەد شەریف ناسراو بەشێخ شەربەتی، ٥. پیر یونس کە لەئەنجیران بەخاك سپێردراوە، باوکی شێخ موسا و شێخ عیسا و شێخ ئیسماعیل، باوکی شێخ ئیبراهیم باوەگەورێی شێخەکانی ئەنجیران، ٦. ئەمیر تاهیری کەلان، ۷. بابا شێخ بێساران، ۸. ئەمیر تەوەکول ناسراو بەپیری تەوەکولی گاران، ۹. شێخ عەتار ناسراو بەبابا زوئەلنون لەگوندی وەنینە بەخاك سپێردراوە، ۱۰. شێخ یوسف ئەعرەج، لەسورەکەڵ بەخاك سپێردراوە ناسراو بەسەوزە بۆش، ۱۲. پیر محەممەدی ئەمین، لەگوندی نەیزەڵ بەخاك سپێردراوە، ۱۳. پیر محەممەد کە لەگوندی

کاکوزەکەریا بەخاك سپێردراوە.

٩. شێخ عەبدولڕەحمان ناسراو بەئەهدەل لەزانستی (ظاهر و باطن) شارەزا بووە، لەساڵی ٦١٨ شەهید کراوە.

١٠. شێخ سلێمان، کەسێکی خۆپارێز بووە و بەشێخ سلێمانی خۆپارێز بەناوبانگە. کەسێك بەناوی بەداق لەمناڵەکانی مەزدەکی ئەنەوشیروان ئەوی شەهید کردووە. لەخوار گۆڕی باوکی، شێخ خالید، بەخاك سپێردراوە لەنزیك دەرەکە کە لەدۆڵی ویانەوە دێت.

١١. شێخ خالید، کەسێکی خۆپارێز بووە و لەکەشف و کەرامات بەناوبانگە. ماوەیەك لەمەریوان نیشتەجێ بووە. میرزا ئەحمەد ناوی کوڕی میرزا محەممەدی هەمەدانی، تووشی نەخۆشی گولی بووە و هاتۆتە لای ئەو و چاك بۆتەوە. گوندی هەزار گرێی کڕیوە و بەشێخی بەخشیوە و ئەم گوندە بەخالدییە ناوی دەرکردووە. بەم دواییانە ناوەکەی بۆ کاکو زەکەریا گۆڕاوە.

١٢. شێخ حەسەنی مودەڕیس، بیست و دوو کوڕی بووە. هەموویان لەماوەی حەفتەیەك بەنەخۆشی تاعون مردوون و تەنیا سێ کوڕی لێ بەجێماوە، شێخ عەبدوللە و شێخ خالید (ئاماژەمان پێدا) و شێخ تاها. شێخ عەبدوللە ڕۆشتۆتە دیمەشق و لەوێ سەرقاڵی ڕێنوێنی کردنی خەڵکان بووە، شێخ خالید هاتۆتە کوردستان و لەوێ بەبڵاو کردنەوەی ئایینەکانی تەریقەت سەرقاڵ بووە.

١٣. شێخ تەقی ئەلدین، ناسراو بەشێخ ئەبولحەسەنی شازەلی، لەکەسە بەناوبانگەکانی ئەولیای تەریقەتە و لەساڵی ٦٥٧ کۆچی دوایی کردووە.

تێبینی: لەهەر شوێنێك عەرەبەکان زاڵ بوون و دەسەڵاتیان پەیا کردووە، دانیشتووانی ناوچەکە بۆ ئەوەی خۆیان لەوان نزیك بکەنەوە، هەوڵیانداوە خۆیان بەسەیید یا لەنەژادی عەرەبەکان بناسێنن. تەنانەت ناوی مردووەکانی خۆیان گۆڕیوە و ئەوانیان بەسەیید یا عەرەب لەقەڵەمداوە.

بۆنموونە پیر شەهریاری هەورامیان بەسەیید مستەفا ناو بردووە و ئەویان بەیەکێك لەمناڵەکانی ئیمام جەعفەری سادق زانیوە. لەکاتێکدا شەهریار یەکێکە لەناوە فارسییەکانی سەردەمی زەردەشتی و لەکاتێکدا هێشتا هیچ هەواڵ و نیشانەیەك لەئیسلام لەو ناوچانەدا نەبینراوە، خاوەنی ئاتەشکەدە بووە. بەمپێیە، زۆربەی سەییدەکانی ئێران و تورکیا لەم جۆرە سەییدانەن.

### ٦. بنەماڵەی وەزیری:

ئەم بنەماڵەیە بەنزیکی لەدووسەد ساڵ پێش، سیلسیلەیان پێکهێناوە و بوونەتە یەکێك لەبنەماڵەکانی کوردستان. گەورە باوەگەورێی ئەوان، خواجە ئیبراهیم کوڕی خواجە یوسفی بەزازی ئیسفەهانییە کەهەڵۆ خانی ئەردەڵان لەساڵی ١٠٢٢ کۆچی، خواجە ئیبراهیمی لەئیسفەهانەوە لەگەڵ خۆی بۆ حەسەن ئاوا هێناوە. ئەو باوکی خواجە یوسفی دووەم، باوکی میرزا ئەحمەد باوکی ئاغا لوتفوللە و میرزا عەبدوللە ناسراو بەکوڵەڕەق (سورخە دزەجی)یە.

لوتفوللە بێ ئەوەی منالّی بێت، مردووە، بەلام میرزا عەبدوللە حەوت کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. حاج میرزا ئەحمەدی وەزیر، ٢: میرزا عەلی باوکی میرزا فەزلوللە، ٣. میرزا حسەین باوکی میرزا عەبدولباقی شەیدا، ٤. میرزا مەهدی، ٥. میرزا لوتفوللە، باوکی میرزا عەبدولحەمید، باوکی میرزا محەممەدی نەڕانی باوکی عەبدولمەجیدخان و یەحیا خان و خەلیل خان و ئەسعەد خان و سەنجورخان و یەدوللە خان و ئەحمەد خان، ٦. میرزا فەتحوللە، ٧. میرزا یوسف.

میرزا عەبدوللە لەڕۆژگاری ئەحمەدخانی ئەردەڵان باوکی خوسرەوخانی گەورە، بەهۆی خوێندەواری وخۆشنووسین و منالّە بەتواناکانی چۆتە ریزی دیوانییەکان و لەڕۆژگاری خوسرەو، پێگەی وەزارەتی بەدەستهێناوە. (لەو ڕۆژگارەدا بەبەرکاری ئەردەڵانییەکانیان وتووە، وەزیر). لەحاج ئەحمەدی وەزیر چوار کور بەجێماوە: ١. میرزا عەبدوللەی دووەمی وەزیر، ٢. میرزا هیدایەت الله ئەمین الایاە، ٣. میرزا فەرەج اللەی وەزیر. لەمیرزا هیدایەت الله دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم میرزا جەعفەری وەزیر، باوکی میرزا کازم، دووەم، شێخ محەممەدی سادق باوکی حاج شێخ عەلی باوکی ئەحمەد خان.

لەمیرزا عینایەت، میرزا الله قولی دارۆغا بەجێماوە. لەمیرزا فەرەج الله دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم میرزا فەتاح، باوکی حەبیب الله ی تفنگدار باشی، دووەم میرزا ڕەحمان باوکی غولام حسەین. لەمیرزا یوسف سێ کوڕ بەجێماوە: یەکەم میرزا عەبدولڕەحیم، دووەم، میرزا عەبدولکەریمی موعتەمید، باوکی عەلی و میرزا محەممەد ڕەزای وەزیر و میرزا عەبدولغەفاری موعتەمید میرزا مورتەزای قولی و میرزا موسا و میرزا ڕەحمان و خەلیل سولتان، سێیەم، میرزا ئیسماعیلی دارۆغا باوکی الله وێردی سولتان باوکی میرزا ئیسماعیل ناسراو بەئاغە،

خۆشنووسی ناسراو بە(صدر الکتاب). لەمیرزا محەممەد ڕەزای وەزیر سێ کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا یوسف موشیری دیوان، ٢. میرزا محەممەد سادقی ئەعزاز ئەلمەلەك، ٣. میرزا عەلی نەقی ئاسفی ئەعزەم.

لەمیرزا یوسفی موشیر دیوان، شەش کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا موحسینی خان نەواب خانی ئەمجەد ئەلمەلەك باوکی میرزا خەلیل خانی ئەمجەد ئەلمەلەك، ٢. میرزا حەسەن خانی نازم الایالە، ٣. عەبدولعەلی خانی ئاسفی دەفتەر، ٤. ئەسغەر خانی بێ گوێ و زمان، ٥. میرزا ئیبراهیم خانی سەرداری ئەعزەم، ٦. عەلی ئەشرەف خان ئەشرەف ئەلمەلەك، جەوادخان. کوڕی حەوتەم لەمناڵیدا مردووە. لەمیرزا حەسەن خان ناز الایالە سێ کوڕ بەجێماوە: ١. حاج غولام حسەینی موشیر دیوان، باوکی سەیف الله و زەبیح الله خان و عەزیز اللهخان و ئەمین الله خان، ٢. غولام عەلی خان باوکی حەسەن خان و ناسرخان، ٣. فەزڵ الله خان.

لەمیرزا محەممەد سادق ئەعزازئەلمەلەك، حەوت کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا عەلی ئەکبەر خان ئەعزاز ئەلسەڵتەنە ناسراو بەئاغاخان، باوکی عەبدولحەمیدخان ئەعزاز ئەلسەڵتەنە و عەبدولمەجید خان، ٢. میرزا مەهدی خان باوکی عەبدوللە خان و نەبی خان، ٣. محەممەد خان باوکی باقر خان و کازم خان، ٤. مەحمودخان، باوکی یەدوللە خان و ناسرخان و یەحیا خان و هادی خان و سارم ئەلدین خان و سەیف ئەلدین خان، ٥. میرزا عەلی خان باوکی ئەبولقاسم خان، ٦. ئەسەدالله خان ئەعزاز ئەلمەلەك باوکی حەبیب اللە خان و عەزیز الله خان و عابدین خان و محەممەد خان و ئەحمەد خان، ٧. نوسرەت الله خان ئەعزاز ئەلمەمالیك باوکی مەسعود خان و محەممەد سەعید خان.

لەمیرزا عەلی نەقی ئاسف سێ کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا فەرەج الله خان سەرداری گەورە باوکی میرزا ڕەزا خان باوکی ئەمیر خان و جەواد خان و فوئاد خان، ٢. شوکرالله خان ساعید سوڵتان، باوکی عەتا الله خان و نیعمەت الله خان و ئەسعەد خان و ئەرسەلان خان و ئەبو ئەلفەتح خان، ٣. یاوەر جەعفەر خان ساعدی ئەلمالیك باوکی محەممەد حەسەن خان و عەبدولعەلی خان و محەممەد سەعد خان و فەرهاد خان و جەمشید خان.

لەمیرزا عەبدولغەفاری موعتەمید چوار کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا ئەحمەد خانی ئیلخانی، ٢. حاج محەممەد تەقی خانی موعتەمید، ٣. میرزا محەممەد عەلی خانی مەفاخیر ئەلمولك، ٤. میرزا هیدایەت.

لەمیرزا ئەحمەد خانی ئیلخانی دوو کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا محەممەد خانی شوجاع ئەلمەمالیك، ٢. میرزا مەسعود خانی مەسعود ئەلسەڵتەنە باوکی نوسرەت الله خان و عەزیز الله خان و موزەفەر خان.

لەحاجی موعتەمید پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا عەبدولله خان، باوکی مەحمود خان و هادی خان و ئەبوئەلقاسم خان، ٢. حاجی میرزا ئەسەدالله خان، باوکی هاشم خان، ٣. میرزا ئیسماعیل خان باوکی سلێمان خان و یەحیا خان و عەبدولوەهاب خان، ٤. میرزا مەهدی خان، باوکی تەیمورخان و هومایون خان و فەرەیدون خان و شاپورخان و مەنوچێهر خان، ٥. میرزا نەسرولله خان.

لەمەفاخیر ئەلمەلەك شەش کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا فەتحولله خان، باوکی عابدین خان و محەممەد کازم خان و ئیقابل خان و محەممەد کەریم خان، ٢. وەجیە اللهخان باوکی سەیف ئەلدین خان و ناسر ئەلدین خان و ئەسعەد خان و فیروزخان، ٣. حەبیب الله خان موئەدەب ئەلمەمالیك، ٤. موحیب الله خان باوکی عەباسخان، ٥. یەدولله خان، ٦. عێزەت الله خان.

لەمیرزا مورتەزای قولی، کوڕی میرزا عەبدولکەریمی موعتەمید، میرزا عەبدولکەریم بەجێماوە باوکی میرزا عەلی ئەمین دیوان باوکی خان بابا خان و مستەفا قولی خان.

لەمیرزا موسایش، میرزا عەبدولعەزیزی سدیقی دیوان بەجێماوە، باوکی میرزا موسا خان ئەمین ئەلعداله و میرزا موحسن خانی موعین دیوان و میرزا مەسعود خان و میرزا حسەین خان و میرزا مەهدی خان.

## ٧- بنەماڵەی وەکیلی

ئەم بنەماڵەیە لەچوارسەد ساڵ پێشەوە سلسیلەیان پێکهێناوە. یانی سەدەیەك پێش ئاوەدان کردنەوەی سنە. بنەماڵەیەك بوون کەپیشەی پارێزەری سنەیان لەئەستۆدا بوو. سەرسیلسیلەی ئەم بنەماڵەیە خوسرەو بەگ کوڕی حسەین بەگ کوڕی خالید بەگ ناسراو بە(میری خۆشناو)ە. خوسرەو بەگ پێنج کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. مامۆ بەگ، ٢. ئیبراهیم بەگی وەکیل، ٣. محەممەد عەلی سوڵتان، ٤. یوسف بەگ باوکی نەسرولله بەگ، ٥. حسەین بەگ.

لەمامۆ بەگ، سێ کوڕ بەجێماوە: یەکەم: نەزەر عەلی بەگی وەکیل، دووەم: مێهرعەلی

سوڵتان باوکی محەممەد عەلی بەگ و محەممەد ڕەحیم بەگی وەکیل باوکی لوتف عەلی بەگ، سێیەم: خوسرەو بەگ.

لەئیبراهیم بەگی وەکیل سێ کوڕ بەجێماوە: ١. حاج محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل، ٢. محەممەد ساڵح بەگ، ٣. جەمشید بەگ باوکی محەممەد ئەمین بەگ باوکی الله یار بەگ و ئاغا حاجی.

لەحاج محەممەد ڕەشید بەگ چوار کوڕ بەجێماوە: ١. فەتح عەلی بەگی وەکیل، ٢. محەممەد ساڵح بەگ، ٣. ئەحمەد بەگ، ٤. نەسروللە بەگ. لەئەحمەد بەگ، عەلی محەممەد بەگ بەجێماوە، باوکی ئەحمەد بەگ ناسراو بەئاغا بوچکڵە (بچکۆلە) باوکی عەتاالله خان باوکی ئەوسەت خان و ئەسغەر خان. لەمحەممەد زەمان بەگ سێ کوڕ بەجێماوە: یوسف بەگ، ڕەزا قولی بەگ و ئەکبەر بەگ، باوکی پاشا بەگ باوکی دەروێش بەگی سارم نیزام باوکی بیوك خانی سارم نیزام.

لەفەتح عەلی بەگی وەکیل، سێ کوڕ بەجێماوە: ١. محەممەد بەگ باوکی فەتح عەلی بەگ، ٢. مستەفا بەگ، ٣. ئەمان الله بەگ باوکی ئەسەد الله بەگ باوکی ئەمان الله خانی وەکیل ئەلموڵك.

لەئەمان الله خانی وەکیل ئەلموڵك سێ کوڕ بەجێماوە: یەکەم، محەممەد خانی وەکیل ئەلموڵك باوکی محەممەد ساڵح خان و محەممەد باقر خان و خەلیل خان و حەسەن خان. دووەم، حسەین خانی وەکیل سوڵتان باوکی هاشم خان و کازم خان و ئەمین خان و ڕەشید خان. سێیەم، عەبدوللە خان وەکیل ئەلمەمالیك باوکی ئیبراهیم خان و ئەحمەد خان و مەحمود خان.

ئەم بنەماڵەیە لەئەنجامی دوژمنایەتی وەزیرییەکان کە بەفەرمانڕەوایەتیکردنی ئەوان ڕازی نەبوون، بەزۆری یاکوژراون و یا دووڕ خرانەوە و لەئاوارەییدا سەریان ناوەتەوە. دەستەیەکی کەمیان بەمەرگی ئاسایی مردوون.

میرزا محەممەد ڕەزای وەزیر، ساحیبە خاتوونی کچی خۆی وەك خوێنبەست بەئەمان الله خانی کوڕی ئەسەد الله بەگ داوە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ڕق و کینەی باوککوژی هێشتا بەتەواوی شوێنەواری نەسڕاوەتەوە و هەندێ کات وەك خۆڵەمێشی ژێر ئاگر بووژاوەتەوە:

(پدر کشتی و تخم کین کاشتی

پدر کشته را کی بود آشتی)).

## ٨- تایەفەی بابان

بابانییەکان لەسنە سێ تیرەن: پاشاکانی بابان، بەگەکانی بابان، ئاغاکانی بابان. لەپاشاکانی بابان لەسنە کەس نەماوەتەوە، جگە لەئیبراهیم بەگ میر باوکی عەبدوللە خان و حەسەن بەگ.

سەرسیلسیلەی ئەم تایەفە سلێمان پاشای بەبەیە کە لەکۆتاییەکانی سەدەی یانزەیەمی کۆچی لەناوچەکانی شارباژێر و شارەزوور و ناوچەکانی پەیوەست بەم شوێنانە، فەرمانڕەوایەتی کردووە و بەزۆری ڕووبەڕووی فەرمانڕەواکانی ئەردەڵان بۆتەوە.

لەسلێمان پاشا دوو کوڕ بەجێماوە: یەکیان محەممەد پاشا باوکی خانە پاشا، باوکی عەلی خان کە لەساڵی ١١٣٢ تا ساڵی ١١٤٢ باوك و کوڕ لەسنە فەرمانڕەوایەتییان کردووە. دووەم خالید پاشا کە لەمەندەلیج کوژرا. لەخالید پاشا سێ کوڕ ماوەتەوە: ١. ئەحمەد پاشا، ٢. محەممەد پاشا، ٣. سلێمان پاشای دروستکەری سلێمانی کە لەساڵی ١١٩٩ ئەو ناوچەی ئاوەدان کردەوە و بەنای خۆیەوە ناوینا. لەسلێمان پاشا دوو کوڕ بەجێماوە: عەبدولڕەحمان پاشا و عەلی خان. عەبدولڕەحمان پاشا پێنج کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت: ١. سلێمان پاشا، ٢. ئەحمەد پاشا، ٣. عەبدوللە پاشا، ٤. عومەر بەگك، ٥. مەحمود پاشا باوکی عەلی پاشا باوکی حەسەن بەگی میر باوکی ئیبراهیم بەگی میر.

تایەفەی (کارگوزاری) لەئاغاکانی بابانن. سەرسیلسیلەی ئەوان یەعقوب ئاغایە باوکی ئەلیاس ئاغا باوکی سلێمان ئاغا باوکی عەبدوللە خانی موجەریب ئەلدەولە و عەلی خانی ئیعتیزاد ئەلدەولە، کارگوزاری ئێران، باوکی ناسر خان و موزەفەر خان و ئەبوئەلفەتح خان. لەعەبدوللە خانی موجەریب ئەلدەولە دوو کوڕ بەجێماوە: یەکەم محەممەد خانی موجەریب ئەلدەولە باوکی مەحمود خان، دووەم: مەنسور خان. لقی حاج داوود خان، برای ڕۆستەم خان (ئاخاڵو) لەبەگەکانی بابانن. سەر سیلسیلەی ئەوان ئەحمەد بەگە باوکی مەحمود بەگ و ڕۆستەم بەگ، خەزێنەدارەکانی پاشاکانی بابان باوکی سلێمان بەگ باوکی ڕۆستەم خان و حاجی داوود خان.

## ٩- تایەفەی شاهوەیسیان

ئەم تایەفە بەئیبراهیم بەگیش ناودەبەن. سەر سیلسیلەی ئەوان ئیبراهیم بەگی وەزیرە کە لەسەرەتاکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی لەدەرباری ئەمیر حەسەنی ئەردەڵان، دامەزرێنەری قەڵای حەسەن ئاوا، پێگەی وەزارەتی بووە. نەوەی خواجە شاهوەیسە لەدانیشتووانی شارباژێر (سلێمانی ئەمڕۆ). ئیسماعیل بەگی وەزیر کە لەساڵی ١٠٣٩ لەدەرباری خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان پێگەی وەزارەتی بووە، باوکی عەبدوللە بەگ باوکی عینایەت الله بەگی وەکیل، نەوەی ئیبراهیم بەگی ئاماژە پێدراوە. لەعینایەت الله بەگ دوو کوڕ بەجێماوە: ١. فەتح الله بەگی وەزیر، باوکی ئیبراهیم بەگی دووەم باوکی عینایەت الله بەگ و عەلی بەگ و محەممەد خان. ٢. عەبدوللە بەگ، دروستکەری مزگەوتێك لای ماڵەکەی خۆیان، باوکی هیدایەت بەگ باوکی فەزڵ الله خانی دەبیر ئەلمەمالیك.

## ١٠- بنەماڵەی کەلب عەلی بەگ

ئەم بنەماڵەیە یەکێك لەلقەکانی ئەردەڵانن. سەرسیلسیلەی ئەوان کەلب عەلی خان باوکی سلێمان خانی والییە کەشاری سنە لەسەر دەستی ئەو ئاوەدان کراوەتەوە. لوتف عەلی بەگ یاوەر، کەسەردەستەی فەوجی سەرکەوتنی کوردستان بوو، کورشی فەتحعەلی بەگ نەوەی کەلب عەلی بەگی ئامارە پێدراوە کە بەچوار پشت دەگاتەوە بەو. خانەکان و بەگزادەکانی ڕەمشت و زەرین چوب و باتمان، سەر بەم بنەماڵەیەن. بەزۆری لەناو نیزامدا خزمەتیان کردووە و هەمیشە لێپرسراوی کاروبارە دەوڵەتییەکان بوون.

## ١١- تایەفەی کەمانگەر

ئەم تایەفە لەمناڵەکانی پیر میکایلن. مەولانا ئەحمەدی کۆڵە سارە کوڕی مەلا عەبدولڕەحیم کوڕی مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا سەلیم کوڕی مەلا سلێمان کوڕی مەلا عەبدولغەفور لەم تایەفەیە. لەمەولانا ئەحمەد چوار کوڕ بەجێماوە: حاجی شێخ عەبدوللە، حاجی شێخ مەحمود، شێخ عەبدولڕەحیم و شێخ محەممەد. حاجی شێخ عەبدوللە لەساڵی ١٣١٨ کۆچی مردووە. نۆ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. حاجی شێخ عەبدولقادری ماسان باوکی شێخ بایەزید، ٢. حاجی شێخ ئەحمەد، ٣. شێخ مستەفا، ٤. شێخ عەبدولباقی، ٥. شێخ

محەممەدی سادق، ٦. شێخ ئیبراهیم، ٧. شێخ محەممەد ئەمین، ٨. شێخ محەممەد، ٩. شێخ فەتحوللە.

میرزا کەریم کوڕی محەممەد ئاغا کوڕی ڕۆستەم ئاغای دەرەشیشی شارەزووری لەم تایەفەیە. لەمیرزا کەریم خان سێ کوڕ بەجێماوە: ١. حاجی میرزا مستەفای ئیحتیشامی دیوان، ٢. میرزا محەممەد عەلی ئەشرەف ئەلمەمالیك، ٣. میرزا محەممەد. لەحاجی ئیحتیشامی دیوان سێ کوڕ بەجێماوە: یەکەم ئاغا مەحمودی ئیحتیشام دیوان باوکی فەرەج الله خان و محەممەد ئەمین خان و عیزەت خان و سەیف الله خان، دووەم: ئاغا محەممەد سەعید باوکی سلێمان خانی سورچی، سێیەم میرزا کەرمی سالاری همایون ناسراو بەئاغە.

لەئەشرەف ئەلمەمالیك پێنج کوڕ بەجێماوە: یەکەم: میرزا حسەین خانی ئیقبال نیزام، باوکی حەبیب الله خان و ئەسەد الله خان، دووەم، ئەحمەد خانی سالار ئەرشەد، باوکی خەلیل خان و عەبدولڕەسولْ خان و عەباس خان و هادی خان و فەرەیدون خان و مەحمود خان. سێیەم میرزا عەبدولعەزیزی ئەشرەف نیزام، باوکی هوشەنگ و تەیمور. چوارەم: مەجید خان. پێنجەم، جەعفەر خان. ئاغا مەحمود ناسراو بەئاغە کوڕی بەهرام ئاغا کوڕی مەحمود ئاغا کوڕی ئیبراهیم ئاغا ناسراو بەبلە کەمانگەر، لەم تایەفەیە. عەلی بەگی شوجات ئەلمەمالیك و مستەفا خان و مەجید خان و بەهرام بەگ، لەکوڕەکانی مەحمود ئاغا (ئاغە)ن.

٥. تایەفەی بەراز بەکەهیا سالْح دەگات کەئەمیر تەیموری گورکانی ئەوی لەگەلْ دوو هەزار بنەماڵەی تایەفەکەی لەخاکی دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ کوردستان (سنە) کۆچ پێکردووە و لەناوچەکانی هوباتو، قەرەتۆرە و مەریوان ئەوانی نیشتەجێ کردووە.

محەممەد باقر بەگی ناسراو، لەم تایەفەیە کە لەسەر حەسەن خانی ئەردەلاْن، فەرمانڕەوای کوردستان ڕووبەڕووی کەریم خانی زەند بۆتەوە. حاجی شێخ محەممەدی باقر، نەوەی ئەم محەممەد باقرەیە. سیلسیلەی ڕەچەڵەکی ئەو بەم شێوەیە: حاجی شێخ محەممەدی باقر کوڕی محەممەد یوسف بەگ کوڕی محەممەد شەریف بەگ کوڕی محەممەد باقر بەگ کوڕی خزر بەگ کوڕی کەهیا سالْح.

حاجی یەعقوب بەگی ناسراویش، کەچەند جارێك لەگەلْ ئازادخانی ئەفغان جەنگاوە و سەرئەنجام کەوتۆتە دەست ئازاد خان و کوژراوە، کوڕی کەهیا سالْحە. چوار کوڕی لێبەجێماوە:١. عەبدووللە سوڵتان کە بەدەستی کەریم خانی زەند کوژراوە، ٢. عەباس بەگ،

٣. عیسا بەگ، ٤. جەعفەر بەگ.

لەعەبدولله سوڵتان، عەبدولغەفار بەگ بەجێماوە. لەعەبدولغەفار بەگ چوار کوڕ بەجێماوە: یەکەم عەبدولله بەگ، دووەم فەتحولله بەگ، سێیەم محەممەد خان بەگ و چوارەم عەبدولڕەحمان بەگ.

حاجی شێخ محەممەدی باقر چوار برای بووە: ١. محەممەد ئەمین بەگ، ٢. نورالله بەگ، ٣. محەممەد حەسەن بەگ، ٤. عەلی شا بەگ. لەحاجی محەممەد شێخ باقر پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ عەبدولئەحەد باوکی شێخ بەها ئەلدین، ٢ شێخ حەسەن، باوکی شێخ عەلا ئەلدین و شێخ نیزام ئەلدین، ٣. شێخ ئەحمەدی غیاسی، ٤. شێخ محەممەد، ٥. شێخ نەجم ئەلدین.

تایەفەی جەواهیری سەر بەم عەشیرەن. سەر سیلسیلەی ئەوان محەممەد ئاغا سەلیمی جەواهرییە کوڕی مەولان کوڕی عەبدولڕەحمان بەگ. لەمحەممەد سەلیم چوار کوڕ بەجێماوە: ١. محەممەد حەسەن ئاغا، ٢. میرزا حسەین خانی سنوقدار، ٣. میرزا ئیسماعیل خان ئیفتخار دەفتەر، ٤. میرزا ئیبراهیم خانی سدیق هومایون.

لەمحەممەد حەسەن ئاغا شەش کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا محەممەد ئەمین فەرید ئەلمەمالیك باوکی ئەسەد الله و فەتح الله و حاجی و موزەفەر، ٢. میرزا حەبیب الله، باوکی عیزەت الله و ئەحمەد و باقر. ٣. میرزا عەبدولله، ٤. میرزا فەزڵ الله، ٥. میرزا نەسرولله، ٦. میرزا خەلیل الله.

لەمیرزا حسەین خان سێ کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا محەممەد خانی سەعیدی دیوان، ٢. میرزا محەممەد عەلی، ٣. میرزا محەممەد کازم کەمردووە. لەمیرزا ئیسماعیل خان سێ کوڕ بەجێماوە: سلێمان، مەهدی و ئیقباڵ.

لەسدیقی هومایون سێ کوڕ بەجێماوە: محەممەد سدیق، محەممەد ئەشرەف و محەممەد ئەسعەد. پاشماوەی تایەفەی بەراز لەگوندی کەپەك و عەباس جوب و گامێشان و قەراتۆرە و هوباتۆ بڵاو بوونەتەوە. کەسێك بەناوی کوێخا جەوانمەرد کە لەم تایەفە بووە، سەد تومانی بەئەمان الله خانی والی پێشکەش کردووە تا ئەو بەرازەی ویستوویەتی بیکوژێت، بەرەڵای بکات. لەبەر ئەمە ناوەکەیان بەرازییە.

## ١٢- تایەفەی قادری

ئەم تایەفە دەگەنەوە بەقادرخانی دەرگەزێنی هەمەدانی کە لەساڵی ١١٢٠ کۆچی هاتۆتە سنە. میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلموڵکی ڕووداونووس، کوڕی میرزا عەبدوڵڵەی مونشی (سکرتێر) کوڕی محەممەد ئاغا، برای ئیبراهیم ئاغا و ئیسماعیل ئاغا کە لەڕۆژگاری خوسرەوخانی گەورە، لێپرسراوی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بوون، سەر بەم تایەفەن.

خوردە خاتوون، کچی محەممەد ئاغا، هاوسەری ئەمان الله خانی گەورە بووە کەحسەین قولی خان باوەگەورێی خانی خانان، لەو لەدایك بووە.

میرزا عەبدوڵڵە مونشی سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلموڵك کەئاماژەی پێدرا، ٢. میرزا عینایەت باوکی میرزا ئیبراهیمی سەرهەنگ و ئاغا عەمو و شێخ لوتف اللەی دێری مەولا و میرزا بابا، ٣. میرزا عەبدولوەهابی ئابدار (چایچی) باوکی میرزا محەممەدی ئابدار و نائیب عەلی نەقی.

میرزا عەبدوڵڵەی مونشی لەساڵی ١٢١٨ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٨١ کۆچی دوایی کردووە.

ماه شەرەف خانم، شاعیری کورد کە بەمەستورە ناسراوە، کچی ئەبوئەلحەسەن بەگ کوڕی محەممەد ئاغا کچە مامی سادق ئەلموڵك سەر بەم تایەفەیە.

لەساڵی ١٢٢٠ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٢٦٤ کۆچ ی دوایی کردووە. هاوسەری خوسرەوخانی ناکام (سەرنەکەوتوو) بووە. ئەمە یەکێك لەهۆنراوەکانی ئەوە:

خورشید وش و به نام ماه شرفم

مستوره و خسرو جهان را طرفم.

## ١٣- بنەماڵەی میرزا شەفیع

ئەم بنەماڵەیە لەدانیشتووانی نوری مازەندەرانن. سەرسیلسیلەی ئەوان میرزا محەممەدی شەفیع، کوڕی میرزا مەهدی کوڕی میرزا محەممەد حسەین لەشکرنووس باشی دیوانی نادر بووە.

لەمیرزا محەممەدی شەفیع پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا الله وێردی مستەوفی باشی، ٢. میرزا

محەممەد ڕەفیع، ٣. میرزا نەسروڵلە، ٤. میرزا مەهدی، ٥. میرزا حسەین. لەمیرزا الله وێردی چوار کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا محەممەد سادق، باوکی میرزا شەفیق و میرزا نەسروڵلە، ٢. میرزا عەموی فەڕاش باشی باوکی میرزا مەسعود و میرزا ئاقا، ٣. میرزا حەبیب الله مونشی حکومەتی، ٤. ئاغا میرزای خۆشنووسی بەناوبانگ، باوکی میرزا ئەسەدالله.

لەمیرزا محەممەدی رەفیع پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا ئیسماعیلی موشریف، کە لەساڵی ١٣٠٦ کۆچی دوایی کردووە، باوکی میرزا محەممەد رەفیعی یەمین لەشکەر و میرزا ئەحمەد خان مۆئەیید نیزام و میرزا مەحمود خانی سەر ریشتەدار، ٢. ئاغا پاشا، باکوی ئاغا محەممەد تەقی و ئاغا محەممەد ڕەشید، ٣. ئاغا محەممەد قاسم باوکی ئاغا حەمی، ٤. میرزا ئیبراهیم، ٥. میرزا عەبدوڵلە.

لەمیرزا محەممەد رەفیعی یەمین لەشکەر حەوت کوڕ بەجێماوە: ١. ئاغا عەبدولعەزیزی یەمین لەشکەر باوکی عەبدولحەمید خان و محەممەد رەفیع خان و عەبدولعەلی خان و محەممەد ڕەزا و بورهان، ٢. محەممەد باقرخان باوکی محەممەد خان و ناسرخان و بەهائەلدین و مەنسور خان و عەتا الله خان، ٣. هادی خان، ٤. میرزا بابا، ٥. جەواد خان، ٦. عێزەت الله خان، ٧. سەیف الله خان.

لەمۆئەیید نیزام دوو کوڕ بەجێماوە: ئسماعیل خان ناسراو بەئاغە باوکی خەلیل خان و سیروس خان، دووەم عەزیز الله خان.

لەمیرزا مەحمود خانی سەرریشتەدار چوار کوڕ بەجێماوە: ١. میرزا موسا سەرۆکی دابینکردنی پێداویستییەکانی ئیستراوا، ٢. میرزا ئیبراهیم، جێگری یەکەمی فەوجی زەفەر، ٣. یوسف خان، ٤. غولاْم ڕەزا.

## ١٤- تایەفەی ئاغا ڕۆستەم

سەرسیلسیلەی ئەم تایەفە ئاغا ڕۆستەمی میراخوروالییە کوڕی بەهرام میرزا بەگ کوڕی حاج محەممەد ئاغای ئەمیر ئەخوری خوسرەوخانی گەورە (باوەگەوریێ نوسەر، لەدایکەوە). ئاغا ڕۆستەم پێنج کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشت: ١. ئاغا مەحمود، ٢. مەنوچێهر ئاغا، ٣. حەمە ڕەشی بەگ ناسراو بەڕەشە ئاغا، باوکی رۆستەم ئاغا، ٤. حاجی شێخ محەممەدی سەمرانی، ٥. فەتاح ئاغای میراخۆڕ.

لەحاجی شێخ سەمرانی هەشت کوڕ بەجێماوە: ١. شێخ محەممەد ئەمینی شەریعەتمەدار باوکی شێخ عەبدوللە و شێخ عەتا و شێخ بەهائەلدین، ٢. شێخ محەممەد ڕەزا باوکی سەیف اللە و نەسروللە، ٣. شێخ محەممەد عەلی، باوکی شێخ عەبدولحەمید، ٤. میرزا محەممەد سەعید باوکی میرزا عەبدوللە و میرزا محەممەد، ٥. شێخ محەممەد تەقی، ٦. شێخ ئەحمەد باوکی لوتف اللە و حەبیب اللە، ٧. شێخ مەعروف باوکی شێخ محەممەد و محەممەد عارف، ٨. شێخ عەبدولڕەحیم باوکی شێخ عەبدولڕەحمان.

لە فەتاح ئاغا پێنج کوڕ بەجێماوە: ١. فەیز اللە بەگ، ٢. فەرەج ئاغا باوکی وەکیل برا و نەسروللە ئاغای میراخوڕ و عەبدوللە ئاغا فەتح اللە خان، ٣. ئەبولمحەممەد خانی موعیزئەلمەمالیك، ٤. محەممەد ئەمین بەگ باوکی فەتاح خان باوکی ئیسماعیل خان، ٥. حەبیب اللە ئاغا باوکی خانکە.

## ١٥- تایەفەی تەیموری

ئەم تایەفە دەگاتەوە بە تەیمور بەگی ئەفغانی. باوەگەورێی تەیمور بەگی دووەم، باوکی ڕەسولْ بەگ باوکی اللە وێردی بەگ باوکی سەفی قولی بەگ باوکی محەممەد بەگ باوکی فەیز اللە بەگ و ئاغا بابا بەگ باوکی محەممەد ئەمین بەگ باوکی محەممەد ڕەشی بەگ. لەفەیز اللە بەگ، باقر سوڵتان و عەلی ئەکبەر سوڵتان بەجێماون. ئەم تایەفە لەئەفغانستان ڕوویان کردۆتە کوردستان و شارەزوور. تایەفەی گەورەن کە لەئێستایشدا پاشماوەکانیان لەئەفغانستان دەژین.

## ١٦- تایەفەی زەڕین کەفش (زێڕین کەوش)

ئەم تایەفە بەکوردی دەبێتە کەوش زێڕین. ڕەچەڵەکی ئەوان دەگاتە توسی نەوزەر. دانیشتووانی سەرەکی سنە پێش ئەردەڵانییەکان، ئەم تایەفە بوون. تەپۆڵکەی خوارەوەی شارەکە، کە لەنێوان ڕووباری شار و ڕووباری قشلاقە، شوێنی حەوانەوەی توسی نەوزەری بەناوبانگە کە لەوشوێنەدا خێوەتیان بۆ هەڵداوە و شەرابی خواردۆتەوە. ژنەکانی ئەم تایەفە کڵوت و شەلایی بەسەرەوە بوو. پیاوەکانیان جۆرە پێڵاوێکی شازیان لەپێ کردووە کەنیشانەی شازادەکانە. کڵوت جۆرە کڵاوێکە لەتەختە دروستکراوە. شەلایی جۆرەقوماشێکی هەوریشمی ڕەشە کە بەشێوەیەکی تایبەت لەدەوری کلوتەکەوە پێچاویانە.

تایەفەی حاج محەممەد ڕەشیدی بەنا و ئاغا محەممەد حەسەنی ئیقبال و الله محەممەد و محەممەد ڕەشیدی یەك باش، ئەوەی خوالێخۆشبوو میرزا محەممەد شەریف، سەر بەم بنەماڵەن. بنەماڵەی میرزا زەمان دروستکەری چیمەنی داوێنەکانی ئاویەر کە بەچیمەنی میرزا زەمان ناسراوە، سەر بەم تایەفەن.

چەند کەسێك لەمناڵەکانی میرزا زەمان، لەئێستادا لەتاران دەژین کەئاغا میرزا عەلی ئەکبەرخانی زێڕین کەوش، بریکاری وەزارەتی ناوخۆ و میرزا عەلی ئەسغەر خانی برای، سەر بەوانن.

## ١٧- تایەفەی کەهزادی

ئەم تایەفەیە کوتاڵفرۆش بوون و دەسەڵاتیان فراوان بووە. لەڕیزی بازرگانە بەناوبانگەکان بوون. سەرسیلسیلەی ئەوان کەهزادی کوتاڵفرۆشە کوڕی بەهرامی بافکار کوڕی خودادادە کەدانیشتووی گوندی کیلانە بووە. کەهزاد برایەکی بووە بەناوی بێهزاد و بێ ئەوەی مناڵی بێت مردووە. کەهزاد دوو کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: عەبدوللە ئاغا و ئیمام قولی ئاغا. لەعەبدوللە ئاغا سێ کوڕ بەجێماوە: حەبیب الله ئاغای تاجر و مەجید ئاغا. هەر سێکیان لەژێر سەرپەرەشتی خاڵی خۆیان حاجی عەلی تاجر کوڕی ڕەزا عەلی ئاغای تاجری بەناوبانگ. ڕەزا عەلی ئاغا شەش کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. حاجی عەلی دروستکەری مزگەوتی بازاڕ لەخوارەوەی مزگەوتی دارنەلئەمان، باوکی عەلی محەممەد ئاغا باوکی میرزا بابا، ٢. حاجی مەلەك محەممەد باوکی محەممەد حەسەن ئاغا، ٣. حاجی فەرەج الله باوکی عەبدولکەریم ئاغا و عەبدولعەزیم ئاغا و عەزیز اللەی تاجر و ئەبولمحەممەد ئاغا، ٤. محەممەد ئاغا، ٥. محەممەد سادق ئاغا، باوکی محەممەد سەعید ئاغا، ٦. ڕەزا قولی ئاغا.

حەبیب الله و بابا خان ئاغا کەم کەم لەژێر دەستی حاجی فەرەج اللە، سامانیان پێکەوە ناوە و سەرئەنجام خۆیان سەربەخۆ سەرقاڵی کاروباری بازرگانی بوون. حەبیب الله ئاغا سێ کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: حاجی میرزا بابای قەوام تجار،ئاغا خان محەممەد سالار فاتح و محەممەد باقری سالار باوکی عەتا الله خان.

لەباباخان ئاغا سێ کوڕ بەجێماوە: ١. حاجی ئاغا عەزیز وەکیل ئەلدەولە باوکی

عەبدولحەمید خانی سالاری سەعید و عەبدولعەلی خان و سوڵتان حسەین خان و سوڵتان عەلی کەمردووە، ٢. ئیبراهیم ئاغا ناسراو بەحاجی خان باوکی میرزا مەهدی خان و ئەشرەف خان و عەلی ڕەزا خان و نوسرەت الله خان و سەیف الله خان، ٣. ئیسماعیل ئاغا ناسراو بەئاغا خان باوکی هادی خان و میرزا ئاغا.

جیاواز لەم تایەفە و بنەماڵانەی ئاماژەمان پێدا، چەندین تایەفەی دیکە لەکوردستانی ئەردەڵان ژیاون کە لەناچوون و نەماون.

## زانا و ئەدەیبەکانی سنە

چەندین کەسی دیکە لەزانا و ئەدیبەکان لەکوردستانی ئەردەڵان دەرکەوتوون کەئاماژە بەچەند کەسێکیان دەدەین:

١. شێخ حەسەنی مەولان ئاوا، ٢. سەیید ئیبراهیمی چوڕی، ٣. سەیید جامی چوڕی، ٤. سەیید عەبدوڵلەی چوڕی، ٥. سەیید حەسەنی چوڕی، ٦. حاجی سەیید مستەفای باینچوبی، ٧. مەلا خزری روودباری، ٨. حاجی مەلا قاسمی پایگوڵانی، ٩. مەلا ئەبوبەکری موسنیف (سەیید حەسەن)، خاوەنی (وضوح، سراج الطریق، و ریاض الخلود) کە لەچور بەخاک سپێردراوە. ئەم چوارینەی بۆ مەرگی خۆی هۆنیوەتەوە:

(( چنان بر روی جانم پر گشادند
به جانان مژدەی وصلم بدادند
ملك تشریف حاضر شد ده آن دم
رقم زد در فغانم خیر مقدم)) (٩٩٤)

١٠. سەیید عەبدولکەریم، کوڕی مەلا ئەبوبەکر نووسەری (واضح و اوضح و متوسط) لەتەفسیری (انذارالاخوان).

١١. مەلا ئەحمەد نەودشی، ١٢. مەلا عەبدولمەجیدی نەییری، ١٣. مەلا عەبدوڵلەی موفتی دەشی، ١٤. مەلا محەممەد ڕەشیدی مەریوانی.

ئەوانەی تا ئێستایش لەژیاندان (ڕۆژگاری نووسەر): ١. مەلا عەبدولعەزیمی مودەڕیس، کوڕی مەلا عەبدولمەجید کوڕی مەلا حەمزەی حەکاکی مەریوانی، ٢. شێخ حەبیب الله ی کاشتەر کوڕی حاجی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ محەممەد کوڕی شێخ عەبدولغەفوری کاشتەر.

ئەدیبەکان

١. میرزا فەتح الله ی خورەم، ٢. میرزا عەبدولباقی شەیدا، میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلمولْکی ئەفسەر، ٤. میرزا ئیسماعیل ناسراو بەئاغە صدر الکتاب، ٥. میرزا حەبیب الله نەوەی میرزا فەزڵ الله، ٦. محەممەد سەلیم خانی ئەردەڵان، ٧. ئەحمەد بەگی کۆماسی، ٨. خانای قوبادی، ٩. میرزا مستەفای جوانڕۆیی، ١٠، میرزا عەبدولقادری پاوەیی، ١١. سەیدی ئەورامی، ١٢. مستەفای کەوش زێڕین، ١٣، فەرج اللە بەگی کوڵ، ١٤. شێخ محەممەد سەلیمی مەردۆخی، ١٥. شێخ عەبدولڕەحمان (مامی نووسەر)، ١٦. شێخ محەممەد فەڕوخ ئەلعولەما، ١٧. شێخ یوسفی مودەڕیس، ١٨. خوسرەوخانی ئیفتخار ئەلوەڵات، ١٩. میرزا عەبدولمەجیدی مەجدی مەلەك ئەلکەلام.

ئەو ئەدیبانەی هێشتا لەجیهاندا ماون (ڕۆژگاری نوسەر): ١. میرزا عەبدولمەجیدی مەجد ئەلمەمالیك٢. سەیید محەممەدی باقری روکن ئیسلام، ٣. میرزا محەممەد خانی جەوهەری سەعیدی دیوان، ٤. حاجی ئەبو سەعید ئەمیری کتێب، ٥. میرزا ئەبوئەلبەها سالاری مۆئەیید، ٦. شێخ عارفی عەرەشی، ٧. میرزا عەبدولحەمید بەدیع کتێبی مەهی، ٨. میرزا عەبدولله فیکری سەلمانی، ٩. میرزا خەلیلی سەبری، ١٠. ئەدیبی سەقزی.

بۆ ئەوەی خۆم وەك یەکێك لەئەدیبەکان بناسێنم، یەکێك لەقەسیدە بەناوبانگەکانی خۆم بەناوی (جبریە) لێرەدا ئاماژە پێ دەدەم:

((گر که به اختیار من، خلق شدەست کار من
بهر چه واژگون شده، گردش روزگار من
از چه غم و الم شده، بار گران به دوش من
از که شدەست ناتوان، این تن بردبار من
طرەای شاهد از چه شد، پر زشکن چو حال من
از که شدەست زرد گون، گونەی گلعذار من
چشم من از چه گشته چون، ابر بهار پر گهر
از چه چو لاله پر ز خون، این دل داغدار من
از چه شدەست چون خزف، فضل و هنر به بخت من
از که شدست بی بها، گوهر، آبدار من

از چه اشاره می کند، چهره و زلف مه رخان
چهره به روز روشن و زلف به شام تار من
برق قضا چو می جهد، ز ابر قدر به حکم من
کیست که حفظ می کند، خرمن و کشتزار من
از که شده‌ست اهرمن، مظهر کفر و گمرهی
از چه ملك شده زدل، بنده‌ی کردگار من
شرع به من همی زند، تهمت اختیار وهان
بی می و مطرب و صنم، می گذرد بهار من
حاصل اختیار من نیست جز آن که گفته‌اند
(جبر شده‌ست در ازل علت اختیار من)
موج خمار می زند، چشم ملنگ گل رخان
جبر کرشمه‌شان نگر، قائد اختیار من
هیچ نمی توان گذشت از لب و چهره‌ی بتان
زان که ز تار زلف شان، رشته شده مهار من
قصه‌ی اختیار اگر، بهر کن و مکن نبود
جام الست کرده حل، عقده‌ی کاروبار من
من که به‌جبر آمده ام، باز به جبر می روم
بین دو جبر اختیار؟ ای بت هشیار من
شهرت اختیار تو، نیست مگر ز جبر من
جبر تو را خبر دهد، قول به اختیار من
شرك جلی ست دلبرا، در بر اهل معرفت
فرض دو اختیار ضد، در من و کردگار من
من به فساد قایلم، تو به نظام مایلی
گر به من است کام دل، باش در انتظار من
آن چه دانی آن بود، هر چه تو خواهی آن شود

من چه کنم، گناه من، چیست بگو نگار من
دیوم اگر فرشته ام، بەدست تو سرشتەام
میوەی باغ جبر توست، خفیه و آشکار من
هیچ به هم نمی خورد، گردش چرخ، واعظا
از ره عقل اگر شوی، یکدله همشعار من
در پس پرده لحظه ای، آیت اگر نظر کند
جمله بر او عیان شود، بازی پردەدار من))

## بەندی دووەم

## جوگرافیای سنە

ویلایەتی سنە، بریتییە لەبەشێك لەوڵاتی كوردستان، كە لەڕۆژهەڵاتەوە پەیوەستە بەخاكی هەمەدان و لەباشورەوە بەكرماشان و لەڕۆژئاوا بە سلێمانییە (شارەزوور) و لەباكورەوە بەخاكی گەڕوس و ئەفشار و سائین قەڵای ئازەربایەجان. ئەم بەشەی پێی دەڵێن سنە، بەئەردەڵانیش بەناوبانگە. لەبەر ئەوەی ماوەیەكی زۆر ناوەندی فەرمانڕەوایی ئەردەڵانییەكان بووە.

پایتەختی ئەم ویلایەتە شاری سنەدژە و عەرەبەكان پێی دەڵێن سەنەندج. دژ یا دز لەكوردی و فارسی كۆن بەمانای قەڵایە. سنەدژ یانی قەڵای سنە یا پایتەختی سنە. شاری سنەدژ لەداوێنی باكوری چیای ئاویەرە. سلێمان خانی ئەردەڵان لەبەرواری ١٠٤٦ ئەو ناوچەی ئاوەدان كردۆتەوە و وشەی غەمەكانیان كردۆتە بنەمای مێژووی ئەو شارە. لەكاتێكدا دانانی ئەم جۆرە وشانە، بۆ مێژووی دامەزراندن یا لەدایكبوون یا كاروباری خێرخوازی، لەدەرەوەی سنوورەكانی عەقڵ و عیرفانە.

قەڵای حكومەتی لەناوەڕاستی شار، لەسەر تەپۆڵكەیەكی سروشتی جێگیرە كە بەسەر هەموو شارەكەدا دەڕوانێت. خودی شارەكەیش لەدەشتێكدایە و لەچوارلاوە بەچیاكان دەورەدراوە. كەسانی دیكە لەهەر ناوچەیەكەوە بیانەوێت بڕۆنە ناو شارەكە دەبێت، ڕێگەی تەپۆڵكەكان بگرنەبەر جگە لەڕێگەی ڕووبار.

ڕووباری مەبابەروان یا مەیا مەروان بەواتای نێوان ئەمرودان، كە لەڕۆژئاوای باكوری شار بەرەو ڕۆژهەڵاتی شارەكە دەڕوات، دوو گەڕەكی شارەكە یانی گەڕەكی قەتارچییان (لەئێستادا پێی دەڵێن جەننەت) و گەڕەكی گوڵ باغییەكان لەشارەكە جیادەكاتەوە و لەباغەكانی گریاشان دەگوزەرێت و دەرژێتە ناو ڕووباری قشلاق.

چیای ئاویەر بەمانای ئاوی دۆڵە، چیاییەكی بێوێنەی پڕ گژ و گیای ئاودارە كەبۆ هەموو شتێك بەسوودە. تاشەبەرد و بەردی بیناكان لەو چیایە دەبەن. جۆرەها گوڵ و گیای بۆنخۆش لەو چیایە دەڕوێت، چەندین سەرچاوەی سروشتی لەچیایەكە دەڕژێتێ خوار و لەبەردەم ئەو سەرچاوانە چەندین كانی و ئاشی فراوان و سەیرانگای خۆش و چیمەنی

دڵڕفێن دروستکراوه و بێ ئیراده سەرنجی هەر بینەرێك بۆ لای خۆی رادەکێشێت.
لەشوێنە دڵگیر و دڵرفێنەکانی چیای ئاویەر دەتوانین ئاماژه بە(خزری زیندوو، کانی شەفا، کان سەفا، سەر تەخت، زەفەرییە، ئەمانییە، کاوه ساڵ (ناسریە))، موبارەك ئاوا، نەقدی، تەکیەی شێخ عەلی، چیمەنی شەرف ئەلمولك، وێڵە و هتد) بدەین کەئەگەر کوردستان پەیوەست بەکۆمەڵگای وڵات بکرێت، وڵاتیش پەیوەست بەکۆمەڵگای دنیا دەکرێت و ئەم ناوچانە دەبنە جێگەی هەڵدانی خێوەت و بارەگای ئەوروپاییەکان و ساڵانە بۆ گەشتوگوزار رووده‌کەنە ئەو ناوچەیە.
ئاوی ئاویەر بۆ باغ و زەوییە کشتوکاڵییەکانی داوێنی چیاکە بەکار دەبرێت و ئەگەر بخوازن دەتوانن لەئاوی چیاکە، کارەبای هەموو شارەکە دابین بکەن.

## پێگەی جوگرافیایی سنە

شاری سنە دەکەوێتە سەر بازنەی پانی ٣٦ لەباکوری هێڵی یەکسان. بەپلەی ٢/٥ دەکەوێتە ڕۆژئاوای هێڵی درێژی تاران کەناوەندی وڵاتی ئێرانە. بەمپێیە جیاوازی نیوەڕۆی کوردستان و نیوەڕۆی تاران ٩ خولەکە یانی ٩ خولەك لەنیوەڕۆی تاران. نزیکەی سێ کاژێر لەبەین ئەلنەهرەین جیاوازە. لەبەر ئەوەی هێڵی یەکسانی ٢٤ کاژێرە و بۆ ٣٦٠ پلە دابەش کراوە، هەر کاژێرێك ١٥ پلە و هەر پلەیەك ١٥ میلی جوگرافیە و هەموو هێڵی یەکسانی دەبێتە ٥٤٠٠ میل. بەم پێیە دووری کوردستان لەتاران ٣٧/٥ میلە و بەهێڵی ڕاست دەبێتە نزیکەی ٦٢ فەرسەنگ، شەش هەزار زەرع.

## تەوەرەی لاری زەوی

هێڵی قیبلەی سنە، بەلاری ١٨ پلە بەڕۆژئاوای هێڵی تەوەری زەوی کەباشور و باکور، بەیەك دەگەینێت، تێپەڕ دەبێت

## خێرایی جوولەی ڕۆژانە لەسنە

خێرایی جووڵەی ڕۆژانەی سنە بەدەوری چەقی زەوی، لەهەر خولەکێك نزیکەی ١٦/٥ کیلۆمەترە. چوونکە خێرایی جووڵەی ڕۆژانەی زەوی لەهەموو هێڵەکانی یەکسان لەهەر

خولەکێك ٢٧ کیلۆمەترە و لەجەمسەرەکان سفرە، هەر ١- پلە دوا هێڵی یەکسان، نزیکەی سیٚ کیلۆمەتر خاو دەبێتەوە. بەمپێیە شاری سنە کە٣٦ پلە لەهێڵی یەکسان دوورە، لەهەر خولەکێك٩/٥ کیلۆمەتر خاوتر لەهێڵەکانی دیکەی هێڵی یەکسان، خێرایی جووڵەی هەیە و ئەگەر ئەم برِە لە ٢٧ کەم بکەین دەبێتە ١٦/٥ کیلۆمەتر کەبڕی خێرایی جووڵەی شاری سنە بەدەوری چەقی زەوی دەردەکەوێت.

## بەرزی

بەرزیی شاری سنە لەئاستی دەریا ١٥٧٠ مەترە. یانی لەگەڕەکی جەننەت، ئاستی دەریای مازەندەران کەمێك چاڵتر لەزەریای ئەتڵەسە.

## ژمارەی دانیشتووان

ژمارەی دانیشتووانی سنە پێش وشکەساڵی و قاتوقڕی، یانی ١٣٣٧ کۆچی، زیاتر لەسی و پێنج هەزار کەس بووە بەڵام لەئێستادا ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی ٢٥ هەزار کەسە و نزیکەی دە هەزار کەس لەژمارەی دانیشتووانەکەی لەناوچوون.

## فراوانی خاک

فراوانی خاکی سنە، یانی رووبەری کوردستانی ئەردەڵان نزیکەی ٢٢٥٠ فەرسەنگی چوارگۆشەیە. لەبەر ئەوەی درێژی کوردستان لەبۆکانی موکری تا سنوری گەرمەسێری زەهاو ٥٠ فەرسەنگە. لەباکور بۆ باشور و پانییەکەی لەگرێوەی چەقان، پەیوەست بەخاکی شارەزوور تا چیای ئاڵمە پەلاٚغ ٤٥ فەرسەنگە، لەڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلاٚت، یەك لەسەر سێی خاکی کوردستان لەجەنگەڵ و چیاکان پێکهاتووە، ئەوەی دیکەی دەشتە. لەم ناوچەدا نزیکەی ١٥٠٠ گوند و شارێك و دوو قەزا بوونیان هەیە.

## رەگەزی خاکەکەی

زۆربەی زەوییەکانی سنە، خاکی ڕۆس یا ڕۆسی زیخاوییە. هەر دانەیەك گەنم و جۆ، دە دانە بەرهەم دێنێت و گەنمەشامی و تۆوەکانیتر بیست تا سی دانە. بەداخەوە ئەمڕۆ بەهۆی شۆرش و کارەساتەکانی ڕۆژگار و هەژاری و پەرێشانی مسکێنەکان و داماوی هۆزەکان و

دەستدرێژی ئاغا و دەرەبەگەکان و چەندین هۆکار و لەمپەری دیکە، نیوەی ئەم بەرهەمەیش دەستناکەوێت و زۆربەی زەوییەکان بایەرە.

## شاری سنە

ویلایەتی سنە، یانی کوردستانی ئەردەڵان، پێکهاتووە لە٢٨ ناوچە کەبریتین لە:

١. کەلاترەزان (کەرەوەن)، ٢. مەریوان، ٣. کەمەرە، ٤. قڵنگان، ٥. هەورامانی تەخت، ٦. لهۆن لەلای رۆژئاوا، ٧.پاوە، ٨. جوانرۆ، ٩. رەوانسەر، ١٠. شادی ئاباد، ١١، بیلوار، ١٢. سورسور، ١٣. کاورەوود، ١٤. ژاوەرۆ، ١٥. حەسەن ئاوا لەباشور، ١٦. ئەمیر ئاباد، ١٧. لەیلاق، ١٨. ئیسفەند ئاوا، ١٩. چاردۆلی لەرۆژهەلات، ٢٠. حسەین ئاوا، ٢١. ساراڵ، ٢٢. هوباتۆ، ٢٣. قەرەتۆرە، ٢٤. خورخورە، ٢٥. تیلەکۆ (سیاکێو)، ٢٦. کەرەفتو، ٢٧. سەقز، ٢٨. بانە لەباکور.

لەسەردەمی فەرمانرەوای ئەردەڵان، بۆ ئاسانکاری کاروباری حکومەتی، ئەم بیست وهەشت ناوچیە دابەش کراوە بۆ ناوەندێك و ١٨ ناوچە بەمپێیە:

ناوەند: حەسەن ئاوا، ژاوەرۆ، کاورەوود، ئەمیر ئاوا

هەژدە ناوچەکە: ١. سەقز، ٢. بانە، ٣. مەریوان، ٤. ئەورامان، کەمەرە، پڵنگان، ٥. لهۆن، ٦. جوانرۆ، پاوە، ٧. شادی ئاوا، رەوانسەر، ٨.بیلوار، سورسور، ٩. ئیسفەند ئاوا، چاردۆلی، ١٠. لەیلاق، ١١. حسەین ئاوا، ١٢. ساراڵ، ١٣. قەرەتۆرە، ١٤. هوباتو، ١٥. حورخورە، ١٦. تیلەکۆ، ١٧. کرەفتو، ١٨. کلاّترەزان.

بەمدواییانە ویلایەتی سنە بۆ ناوەندێك و دە حاکم نیشن دابەش کراوە و تا ئێستایش ئەم دابەشکردنە بەردەوامە، بەمپێیە:

ناوەند: حەسەن ئاوا، ژاوەرۆ، کاورەوود، ئەمیرئاوا، سورسور، بیلوار.

ناوچە حاکم نشینەکان: ١. سەقز، ٢. بانە، ٣. مەریوان، ٤. هەورامان، کەمەرە، پڵنگان، ٥. لهۆن، ٦. جوانرۆ، پاوە، رەوانسەر، شادی ئاباد، ٧. ئیسفەند ئاوا، چاردۆلی،/ لەیلاق، ٨. حسەین ئاوا، ساراڵ، هوباتۆ، قەرەتۆرە، ٩. تیلەکۆ، خورخورە، کەرەفتو، ١٠. کەلاّترەزان، کوماسی.

**عەشیرە و خێلەکانی سنە**

کوردستانی ئەردەلان، چەندین خێڵ و عەشیرەی تێدایە و بەهەموویان دەڵێن کورد و مسکێنەکان بەگۆران ناو دەبەن. بەگشتی بوێر و جەنگاوەر، خاوەنی تفەنگی کانزای، ئەسپ و مایینی عەرەبین، وەك: ١. باباجانی، ٢. قوبادی، ٣. ئیمامی، ٤. ئیناخی، ٥. وەلەدبەیگی، ٦. ئایشەیی، ٧. تای جوزی، ٨. قادر مەریوەیسی، ٩. ئیلەڕووتی، ١٠. ساتیاری، ١١. کلاَوکوگ، ١٢. زەردویی، ١٣. بیتیارموەند، ١٤. کەمانگەر، ١٥. باشوکی، ١٦. چاردۆلی، ١٧. شێخ ئیسماعیلی، ١٨. زەند، ١٩. گیوەکەش، ٢٠. شامەنسوری، ٢١. مەحمود جبرائیلی، ٢٢. گەرگە، ٢٣. دەراجی، ٢٤. پەرپیشەیی، ٢٥. تەمرتوزەیی، ٢٦. سوڕسوڕی، ٢٧. لەك، ٢٨. گەشکی، ٢٩. کۆیك، ٣٠. بەلیلوەند، ٣١. ئەحمەد زەینەڵ، ٣٢. کوماسی، ٣٣. وەرمەزیار، ٣٤. گوڵباغی، ٣٥. مەندەمی، ٣٦. بۆرەکەیی، ٣٧. قاڵ قاڵی، ٣٨. سەگوەڕ، ٣٩. عەبدولرەحمان، ٤٠. لوڕ و کلاَوکەڕ، ٤١. لالەیی.

خێڵی گوڵباغی هەشت تیرەن: موراد گۆرانی، قوەمری، گاملی، کاکسوەندی، چۆخەڕەشی، پیتاوەسەری، هەمزە، کەڵکەنی.

مەندەمییەکان چوارتیرەن: تاری مورادی، عەلی مورادی، لولەرزی و ئاخەسوری.

وەرمەزیار دوو لقن: وەرمەزیاری زەڕیینە و وەرمەزیاری مەڕەدەر. لەناو عەشیرە و خێڵەکانی کوردستان تەنیا خێڵی شێخ ئیسماعیلی، خێوەتنشین و گەڕۆك بوون کەهاوشێوەی نەریتی کۆن کۆچ یانی گەرمێن و کوێستانیان دەکرد. ئەویش لەساڵی ١٣٣٨ لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایی میرزا عەلی محەممەد خانی شەریف ئەلدەولە، وەك هۆز و عەشیرەکانی دیکەی کوردستان نیشتەجێ بوونیان هەڵبژارد. خێڵ و عەشیرەکانی دیکەی کوردستان هەرچەند نیشتەجێ بوون بەلاَم گەرمێن و کوێستانیان هەیەو وەرزی هاوین بەهەوار ناو دەبەن. یانی یەیلاق و لەکاتی زستان بۆ گوند و ناوچەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. لەهەوار، دەستەیەکیان خێوەت نشینن. ڕەشماڵ وکەپر دروست دەکەن. داربەستێك کە بەعەرەبی عەریشە یا سابات و بەفارسی کازەی پێدەڵێن.

خێڵی قوبادی و باباجانی کە لەجوانرۆ دەژین، هاوشێوەی کۆن کۆچەرین. زستان روودەکەنە سەرپولی زەهاو و هاوین دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی جوانرۆ.

### ژمارەی دانیشتووانی سنە

لەگەڵ ئەوەی یاسای ئیستاتیستیك یانی سەرژمێری لەسنوری کوردستانی ئەردەڵان باو نییە، بەڵام لەبەر رووناکی ئەو زانیاریی و گەشتە بەردەوامانەی بۆ ناوچەکانی کوردستان ئەنجامم داوە و لەکەسانی زانا پرسیارم کردووە، دەتوانین ژمارەی دانیشتووانی کوردستانی ئەردەڵان بەدڵنیاییەوە بەزیاتر لەدووسەد و پەنجا هەزار کەس بزانین. بیست و پێنج هەزار کەسیان دانیشتووی سنە و ئەوانەی دیکە لەقەزا و ناحییەکانی دەوروبەر نیشتەجێن. بەزۆری سوونی مەزهەب و شوێنکەوتەی مەزهەبی ئیمام شافعین و شێوازی ئەوان پەیڕەوی لەتەریقەتی نەقشبەندی و قادرییە و باوەڕێکی زێدەڕۆیانەیان بەشێخەکانی خۆیان هەیە. یانی بەختەوەری و بەدبەختی و هەژاری و ژیان و بژێوی و بەگشتی هەموو شتێکی خۆیان بەهی پیر دەزانن کەهەمان شێخی تەریقەتە.

### سوار و تفەنگچی

لەکورد و گۆرانی ویلایەتی کوردستانی ئەردەڵان، لەئێستادا شێمانە دەکرێت بیست هەزار سوار و تفەنگچی بۆ گۆرەپانی جەنگ ئامادە بکرێت بەڵام لەکاتی پێویست، لەئەگەری ئامادە کردنی تفەنگ و جبەخانە، زیاتر لەشەست هەزار سوار و تفەنگچی، لەکوردستانی ئەردەڵان ئامادە دەبێت.

### ڕووبارەکان

ڕووبارەکانی ئەردەڵان فراوانە وەك بڵێی ئایەی (جنات تجری من تحتها الانهار) سەبارەت بەکوردستانی ئەردەڵان هاتۆتە خوار. ڕووبارەکان بریتین لە:

١. ڕووباری قشلاقکە لەنیو فەرسەخی ڕۆژهەڵاتی سنە جێگیرە و لەباکورەوە بەرەو باشور دەڕوات.٢. ڕووباری کاوەڕوود، ٣. ڕووباری پڵنگان، ٤. ڕووباری گاران، ٥. ڕووباری سورکوڵ، ٦. ڕووباری مەریوان، ٧. ڕووباری زەلان، ٨. ڕووباری بانە.

ئەم هەشت ڕووبارە بەرەو باشوری ڕۆژئاوای سنە دەڕۆن و دەرژێنە ناو ڕووباری بەغداد. شەش ڕووباری یەکەم جگە لەڕووباری بانە، ڕووباری سیروان پێکدێنن. ٩. ڕووباری جقەتو، ١٠. ڕووباری سەقز، ١١. ڕووباری خوڕخوڕە، ئەم سێ ڕووبارە دەڕژێنە دەریاچەی ورمێ کە بەدەریاچەی شورتسوجیش بەناوبانگە.، ١٢. ڕووباری قەزەل وزان یا قەزەل ئەوزەن، ١٣. ڕووباری کوڵە، ١٤. ڕووباری تەرواڵ، ١٥. ڕووباری حاجی چا یانی ئەجی چا. ئەم چوار

ڕووبارە دەرژێنە دریای مازەندەران، دەریای خەزەر. ١٦. ڕووباری ڕەوانسەری قەرەسو، ١٧. ڕووباری زەڕین جوب. ئەم دوو ڕووبارە دەڕژێنە قەرەسوی کرماشان.

زۆربەی ڕووبارەکانی سنە بەناو زەوی و دەشتە فراوانەکاندا گوزەر دەکەن. بەداخەوە بەهۆی نەبوونی سەدی پێوست، بەگشتی ئەم ئاوانە کەڵکێکی ئەوتۆیان بۆ دانیشتووانی ناوچەکە نییە.

## سەرچاوە و جۆگە

سەرچاوە سروشتییەکان و جۆگە لێدراوەکان لەکوردستانی ئەردەڵان بەڕادەیەکە ژماردنیان لەتوانای ئێمەدا نییە. بەداخەوە بەهۆی نەبوونی زانست و زانیاری تەواو زۆربەی ئەو ئاوانە بەفیرۆ دەڕوات و یەك لەهەزاری بۆ زەوییە کشتوکاڵییەکان بەکار نابرێت.

## چیا سەرەکییەکانی سنە

چیا گرنگ و سەرەکییەکانی سنە بریتین لە:

١. چیای ئاویەر: کە بەمانای ئاوی دۆڵە چوونکە هەموو دۆڵەکانی سەرچاوەی ئاوی فراوانن. ئەم چیایە لەنێوان ڕۆژئاوا و باشوری سنە جێگیرە.

٢. چیای شاهۆ: لەباشوری شاری سنە بەدووری دوانزە فەرسەنگ جێگیرە. ناوی ئەم چیایە لەبنەمادا شا کێوە کەخەڵك گۆڕانیان بەسەردا هێناوە و بۆتە شاهۆ. چیایەکی درێژە و لەهەر ناوچەیەك ناوێکی هەیە. لەگوندی داریانی هەورامان تا نێوان دەربەندی کرماشان بەشاهۆ ناسراوە. لەکرماشان پێی دەڵێن پەراو و لەناوچەکانی دیکە ناوی دیکەی هەیە. چیای شاهۆ هەمیشە بەفری پێوەیە و لەزۆربەی شوێنەکانی چاڵی زۆر قووڵ، بەقووڵایی چل تا پەنجا زەرعەی عەیە و لێوانلێوە لەبەفر. ئەو چاڵانە بەچاڵی نور بەناوبانگن. چیای شاهۆ لەهاوێن بەگوڵ و ڕێحانە و چەندین جۆر ڕوەکی پزیشکی سەوز دەبێت. هەموو جۆرە ئاژەڵە کێوییەکان لەم چیایەدا دەبینرێت. لەزۆربەی بەشەکانی شوێنەواری بورکان دەبینرێت. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت نورەکان (چاڵە قووڵەکان) لەکۆندا شوێنی بورکان بوون و سەرئەنجام سارد بوونەتەوە. خێڵەکانی ئەو ناوچە لەهاویندا بارگە و بنە هەڵدەدەن. داری بەڕو و بادەم و ئەرجەن و زۆربەی دار جەنگەڵییەکان لەم چیایەدا دەستدەکەوێت.

٣. چیای کۆسالان کە لەبنەمادا کۆسارانە. لەپشت گوندی ڕزاو جێگیرە، لەباشوری ناوچەکانی کەمەرەی هەوارگە، زۆربەی گوندەکانی لەدەوری ئەو چیایە.

٤. چیای پیر رۆسەم: یانی پیر رۆستەم، لەهەورامانی تەختە و بەزەردەڵەیش بەناوبانگە. لەشارەزوور کۆتایی پێدێت.

٥. چیای میانە: میانە ناوی گوندێکە لەهەشت فەرسەنگی شاری سنە. ئەم چیایە پەیوەستە بەو گوندە. گوندەکانی نەسڵ و گۆشخانی لەداوێنی باشوری چیاکە جێگیرن. ئەگەر تۆپخانەی لێ بێت، دەتوانێت گوندی زڕاو بەئاسانی لەناو ببات..

٦. چیای ئەبدالآن: چیایەکە لەحەوت فەرسەنگی باشوری سنە جێگیرە، نزیک لەسەرچی و دۆلآب. چیایەکی پاك و دڵگیرە. لەلوتکەکەی گۆڕی حەوت کەس دەبینرێت کە بەئەبدالآن بەناوبانگن. یانی دەروێشە گۆشەگیرەکان. ئەم چیایە بەناوی ئەوان، بەناوبانگە. جۆرێکی پیاز لەم چیایەدا دەبینرێت کەئەگەر لەوێ بخورێت، تامی پیاز دەدات و ئەگەر بیانەوێت بۆ شوێنێکی دیکەی ببەن، وشك دەبێت و دەبێتە گیایەکی ناخۆش. لەبەر ئەم هۆیە، ئەو پیازە بۆتە پەند و دەڵێن: ((فلآنە شت وەك پیازی ئەبدالآنە، دەخورێت، بەلآم نابرێت)).

٧. چیای سوڵتان سەراج ئەلدین: لەباشوری ڕۆژهەلآتی شارەکە جێگیرە، بەدووری پێنج فەرسەنگ، لەنێوان نەڕان و موچش. لەسەر لوتکەکەی گۆڕێك دەبینرێت کەدەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ سولتان سەراج ئەلدین. کەمێك لەخوار لوتکەی چیاکە، سەرابێکە کە بەسەراوی سەراندەر بەناوبانگە و شوێنێکی دڵگیرە.

٨. چیای سوڵتان شوشەرێ: چیایەکە بەدووری سێ فەرسەنگ لەڕۆژهەلآتی شارەکە جێگیرە. لەسەر لوتکەکەی چاڵێك بەقووڵی چل زەرع دەبینرێت کەنیشانەیە بۆ ئەوەی سەردەمانێك ئەم چیایە بورکان بووە و دواتر سارد بۆتەوە ومادە بورکانییەکان کە لەچیاکە هاتوونەتەدەر لەبەر ئەوەی هاوشێوەی شووشە بوون، ڕێگەکەی بەشووشەرێ ناوبانگی دەرکردووە یانی ڕێگەی شووشە.

٩. چیای مەیهەمین: مەیهەمین ناوی دوو گوندە کەپێیان دەڵێن مەیهەم. ئەم چیایە لەوپەڕی بەرزی و دژواری لەو ناوچەیە جێگیرە. شوێنی دڵگیری زۆرە ولەداوێنی چیاکە، کانییەك دەبینرێت کە بەشاپەسەند ناسراوە. کاتێك ناسرئەلدین شا هاتۆتە سنە، خێوەتی سەڵتەنەتییان لای ئەو کانییە هەڵداوە. ناسرئەلدین شا وەسفی شوێنەکە و ناوچەکەی کردووە و لەوە بەدوا، ئەو کانییە بەشاپەسەند ناوی دەرکردووە. لەڕۆژهەلآتی چیاکە،

چارۆدڵی و لەباکوری ئیسفەندئاباد و لەڕۆژئاوای لەیلاق و شاری سنە و لەباشوری، ناوچەکانی کەلیایی جێگیرە.

١٠. چیای شەیدا: بەدوروی هەشت فەرسەنگ لەباکوری ڕۆژهەلاّتی شارەکە جێگیرە. لەلوتکەکەی گومەزێك دەبینرێت بەناوی شەیدا ناسراو بەشەیدای نازدار کەلەوێ بەخاك سپێردراوە. سوبحان وەردی خانی فەرمانڕەوای کوردستان کەباوەگەورێی ئەمان ئەللە خانە، بەپێی وەسیەتی خۆی لەسەر لوتکەی ئەو چیایە بەخاك سپێردراوە. جۆرەکانی ڕوەك و ئاژەڵەکان بۆ ڕاو، لەم چیایەدا دەبینرێت.

١١. چیای تورێز خاتون: چیایەکە بەدووری دوانزە فەرسەنگ لەنێوان سارالّ و هوباتو، لەباکوری ڕۆژئاوای شارەکە جێگرە و ئارامگای کەسێك لەوێ دەبینرێت کەبۆتە سەیرانگای خەڵکان. لەناوەکەی دەردەکەوێت ئەو کەسە ژنە و لەدانیشتووانی تەورێزە و شێمانە دەکرێت ناوی تورێز بێت.

١٢. چیای خوسرەوخان: چیایەکی بەرزە لەناوچەی خوڕخوڕە کەخوسرەوخان، مامی خان ئەحمەد خانی ئەردەلاّن، لەزەمانی شا عەباس لەلایەن سلێمان خانی باوکی فەرمانڕەوایەتی خوڕخوڕەی کردووە، زۆربەی کاتەکانی لەو چیایە بەسەر بردووە و چیاکە ناوی ئەوی بەسەرەوە ماوە.

١٣. چیای چیە چەرمەك: لەنێوان هوباتو و تیلەکۆ جێگیرە. لەخوارەوە تا لوتکەی چیاکە فەرسەخێکە و زستان هاتوچۆ لەو ناوچەیە دژوارە بەلاّم هاوینان شوێنێکی دڵگیرە.

١٤. چیای چل چەمە: لەناوچەی خوڕخوڕە جێگیرە. بەفارسی پێی دەڵێن چهل چشمە. چیایەکی بەرزە و ڕووباری جقەتو و ڕووباری خوڕخوڕە لەم چیایەوە سەرچاوە دەگرن. بەدرێژایی سالّ بەفری پێوەیە و چل سەرچاوەی گەورەی هەیە و لەبەر بوونی سەرچاوەکان، بەو ناوە ناسراوە.

١٥. چیای گاڕان: چیایەکە بەرزە بەدووری دوانزە فەرسەنگ لەڕۆژئاوای شارەکە کەڕێگەی شاری مەریوان بەوێدا تێدەپەڕێت. گەردەنەی گاران بەناوبانگە. ئەم چیایە جگە لەداری وەن و ماز و بەڕ، ڕێواسی زۆری لێ بەرهەم دێت.

١٦. چیای کەلی خان: چیایەکە لەنێوان سەقز و بانە. لەڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەلاّت درێژ بۆتەوە. بەردەوام سەرسەوزە. ڕووباری سەقز و ڕووباری بانە، لەم چیایەوە دەست پێدەکەن.

١٧. چیای نەکەرۆز: لەباشوری ڕۆژئاوای شاری سەقز جێگیره و پەیوەستە بەسنوری خاکی بانە. لەروانگەی ئاو و گیا، چیایەکی بێ وێنەیە.

## مزگەوتەکانی سنە

لەشار و گوندەکانی دەوروبەر و قەزاکانی سەر بەسنە، زیاتر لەهەزار و پێنسەد مزگەوتمان هەیە و نوێژی تیا دەخوێندرێت. ژمارەی مزگەوتەکانی شار بریتین لە:

١. مزگەوتی حاجی شێخ محەممەد باقر، ٢. مزگەوتی نەدر محەممەد بەگ، ٣. مزگەوتی نایب شوکروڵڵە، ٤. مزگەوتی قوڵە، ٥. مزگەوتی سارم نیزام، ٦. مزگەوتی حەبیب الله مەلا وەیسی، ٧. مزگەوتی شێخ بابا، ٨. مزگەوتی دایکی وەزیر، ٩. مزگەوتی شەریعەتمەدار، ١٠. ئیمام زادە پیر عومەر، ١١. مزگەوتی مەلا جەلال (دوودەرگا)، ١٢. مزگەوتی والی، ١٣. مزگەوتی حاجی عەلی، ١٤. مزگەوتی شاتر ئەبولحەسەن، ١٥. مزگەوتی عەبدوللە کۆهزاد، ١٦. مزگەوتی مەلا شەمسهو، ١٧. مزگەوتی ڕەشید قەلعە بەگی، ١٨. مزگەوتی محەممەد کەریم داداش، ١٩. مزگەوتی دارۆغە، ٢٠. مزگەوتی حاجی عەبدولکەریم، ٢١. مزگەوتی میرزا کەریم، ٢٢. مزگەوتی کەریم ئاغا، ٢٣. مزگەوتی حاجی ئیسماعیل، ٢٤. مزگەوتی مەلا سەلیم، ٢٥. مزگەوتی حاجی ئەولی، ٢٦. مزگەوتی حاجی محەممەد (چوارباغ)، ٢٧. مزگەوتی شێخ محەممەدی نەسیم، ٢٨. مزگەوتی مەلا محەممەدی شەفیع، ٢٩. مزگەوتی نەسیری دیوان، ٣٠. مزگەوتی شەمس ئەلحاجییە، ٣١. مزگەوتی هاجەر خاتون، ٣٢. مزگەوتی میرزا زەین ئەلعابدین، ٣٣. مزگەوتی پەری نەسا خاتوون، ٣٤. مزگەوتی حاجی ئەحمەد بەگ، ٣٥. مزگەوتی خورشید لەق خاتوون، ٣٦. مزگەوتی عەبدوللە بەگ، ٣٧، مزگەوتی فاروقییە، ٣٨. مزگەوتی تاقە گەورە، ٣٩. مزگەوتی وەزیر، ٤٠. مزگەوتی موعتەمید، ٤١. خانەقای حاجی سەیید ئیبراهیم، ٤٢. مزگەوتی دارئەلسەلام، ٤٣. مزگەوتی شێخ سەلیم، ٤٤. مزگەوتی میرزا فەرەج الله، ٤٥. مزگەوتی ئەمین، ٤٦. مزگەوتی مەلا قاسم، ٤٧. مزگەوتی بابای نەقشبەند، ٤٨. مزگەوتی حاجی ئەبولحەسەن، ٤٩. مزگەوتی حاجی فەتحوڵڵە، ٥٠. مزگەوتی حاجی سەیید مستەفا، ٥١. مزگەوتی میرزا عەبدوللە، ٥٢. مزگەوتی دارئەلئیحسان.

## مزگەوتی دارئەلئیسحان

مزگەوتی دارئەلئیحسان کە بەمزگەوتی جامیع (گەورە) ناسراوە، لەبیناکانی خوالێخۆشبوو ئەمان الله خانی گەورەیە. مزگەوتێکی رازاوە و پتەوە. دەرگا و دیوارەکانی کاشیکارییە. لەسەر بیست و چوار ستونی بەردین بنیاتنراوە و سی و پێنج گومەزی هەیە. دوو ئەیوانی زۆر گەورەی هەیە. یەکیان لای قیبلە و ئەوی دیکەیان لەرۆژهەڵاتی مزگەوتەکەیە. دوو بەشی قورئان لەسەر کەتیبەکانی دەوری مزگەوتەکە و ئەیوانەکە و دەوری ستونەکان بەخەتێکی جوان نووسراوەتەوە. میرزا محەممەد سادقی ئیسفەهانی، قەسیدەیەکی بۆ تەواو بوونی مزگەوتەکە هۆنیوەتەوە کەهەردێرێکی، مێژووی تەواو بوونی بینای مزگەوتەکەیە و لەسەر بەردی مەرمەڕی ئەیوان، ڕوەو قیبلە، بەخەتی نەستەعلیق نووسراوەتەوە و خوالێخۆشبوو میرزا فەتح الله خورەمی کوردستانی، قەسیدەیەکی لەبەرابەر ئەوەدا وتووە و دێری یەکەمی هەر بەیتێکی، مێژووی دەسپێکردنی بینای مزگەوتەکە و دێری دووەمی مێژووی کۆتایی هاتنی بینای مزگەوتەکەیە. ئەم قەسیدەیش لەسەر کەتیبەی بەردی مەرمەڕی ئەیوانی ڕۆژهەڵات نووسراوە. خورەم کوردستانی هەموو هونەرەکانی شێعری بەکار بردووە. خەتی نەستەعلیق و نوسخی ئەم کەتیبانە یادگاری خوالێخۆشبوو شێخ حەسەن، ئەوەی خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولمۆئمینی دووەمە کەمامی شێخ عەبدولمۆئمینی باوکی نووسەری ئەم کتێبەیە. حەوشی ئێستای مزگەوتە، حەوشی قوتابخانەیەکە کەدوانزە حوجرە و دوو باڵەخانەی هەیە. خوالێخۆشبو ویسوویەتی حەوشی ئەیوانەکە ڕوەو قیبلە بنیات بنێت بەڵام بەئاواتەکەی نەگەیشتووە. هەموو بەردە مەرمەڕەکانی ئەم مزگەوتە و قەڵای حکومەتی و گەرماوەکانی شار و زۆربەی بیناکانی دیکە، لەگوندی قەسڵانەوە هاتووە و کانەکە لەوێیە بەڵام ئێستا خۆڵیان بەسەردا کردووە و دایانپۆشیوە. ئەو حەوزەی لەناو حەوشی قوتابخانەکەدایە، لەهەشت تاشەبەرد دروستکراوە، پانییەکەی دوو تیکە، درێژییەکەی دوو تیکە و تا قووڵای حەوزەکە ڕۆشتۆتە خوار. گوندی ئاخلیچیان کە لەیەک فەرسەخی باکوری شارەکە جێگیرە، لەگەڵ چەند باخێك وەقفی ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکە و بژێوی فەقێکان و مامۆستاکان و مێجێوری مزگەوتەکە کراوە بەڵام بەداخەوە داهاتی ئەو گوند و باخانە، بۆ خۆشگوزەرانی کەسانی دیکە بەکار دەبرێت و گرنگی بەباردۆخی مزگەوتەکە و مامۆستا و

فـەقێکان نادرێـت و دەرگـا و دیـواری مزگەوتەکـە وردە وردە خـراپ دەبێـت و دەڕوخێـت.
گوڵدەستەکانی ئەم مزگەوتـە کـەخراپ ببوو، لـەزەمانی حکومـەتی موزەفـەرخان، سـەرداری فـەرمانڕەوا، بەهـەوڵ و مانـدوو بـوونی ئـەو و مـن (نووسـەر) و دەسـتەیەکی دیکـە لەدانیـشتووانی شـارەکە، لـەجیاتی دوو گوڵدەسـتەی پێـشوو، دوو گوڵدەسـتەی دیکـەمان دروستکرد و ئەم پارچە شێعرەم وەك یادگاری ئەو کاتە نووسی:

(( چو شد بنیاد این مسجد،ز جور چرخ آشفته
دل مجموع ملت شد گرفتار پریشانی
مظفرخان سردار انتصار، آن مظهر رافت
رسید از بهر تعمیرش ز تأییدات ربانی
ز یمن همت نیکان و اقدامات این والی
اساس دار الاحسان یافت رونق، نوبت ثانی
مثال سرو برجسته، بر این مسجد دو گلدسته
که از رفعت همی سایند، سر بر عرش رحمانی
برای حفظ این مسجد، نمایند این دو گلدسته
به جای شه پر طاووس، روز و شب مگس رانی
بر این گلدستەها بهر ندای مسلمین هر دم
بلال آسا موذن گشته سرگرم خوش الحانی
بگفتا آیت اله از برای سال تاریخ اش
دلا بنیوش زین گلدسته گلبانگ مسلمانی )) (١٣٤٣)

داهاتی زەوییە وەقفەکانی ئەم مزگەوتە، ساڵانە دەبێتە زیاتر لەهەزار تمەنی ئەمڕۆیی بەڵام یەك لەسەر سێی بۆ مزگەوتەکە تەرخان ناکرێت و بێ ویژدانانە خەرجی خۆشگوزەرانی خۆیانی دەکەن و گرنگی بەڕووخانی مزگەوتەکە نادەن.

ئەمان الله خانی فەرمانڕەوا، بۆ بینای ئەم مزگەوتە و قەڵای حکومەتی و بیناکانی دیکەی خۆی، لەئیسفەهانەوە ئەندازیاری و وەستای کاشی و بەردتاش و دارتاشی هێناوە.

تەنانـەت شـاعیری لەئیـسفەهانەوە بانگێـشت کـردووە و دوای ئـەوەی بینـای مزگەوتەکـە کۆتایی هاتووە، قەسیدەی ناتقی ئیسفەهانی لەئەیوانی مزگەوتەکە دەنووسرێت.

میرزا فەتحوللەی خورەمی کوردستانیش لەناو دەستەی بیسەران بۆ بیستنی قەسیدەکەی ناتیقی ئیسفەهانی دەڕوات. دوای گەڕانەوە بۆ ماڵە هەژارانەکەی خۆی، قەسیدەیەك دەنووسێت و بۆ فەرمانڕەوای دەنێرێت. والی قەسیدەکەی نیشانی ناتیقی ئیسفەهانی دەدات. کاتێك ئەم شاعیرە سەیری قەسیدەکە دەکات، هەست بەزمان پاراوی و هونەرەکانی شێعری خورەمی کوردستانی دەکات و بەفەرمانڕەوا دەڵێت: لەگەڵ بوونی شاعیرێکی بەتوانای وەك خورەمی کوردستانی، بانگێشتکردنی من بیّ هۆ بووە. بەڕاستی هونەری شێعری ئەو زۆر جوانتر و باشتر لەهونەری شێعری منە و شیاوە قەسیدەکەی ئەو لەسەر دیواری ئەم مزگەوتە بنوسرێت. فەرمانڕەوا فەرمان دەدات، قەسیدەی خورەمی کوردستانی لەسەر دیواری مزگەوتەکە بنوسن و چیتر ناتیق هیچی نەوتووە و دوای دوو سیّ ڕۆژ مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدەدرێت و فەرمانڕەوا گرنگی بەخورەمی کوردستانی دەدات.

هەرکەس سەیری ئەو دوو قەسیدەیە بکات، دەستبەجیّ پێگە و جێگە و هۆشی و توانایی کورد لە خەڵکانی دیکەی بۆ دەردەکەوێت بەڵام بەداخەوە پشتیوانیان نییە و بەپێچەوانەوە دەستی هونەرکوژی، بەردەوام زەرەر و زیانیان لێدەدات.

ئەم هۆنراوەی خوارەوە لەخوالێخۆشبوو شێخی بەناوبانگ، باوکی کاك ئەحمەد، باوکی شێخ سەعید باوکی شێخ مەحمود (مەلیکی کوردستان)ە کە لەئەیوانی قیبلە نووسراوە:

((تعالوا و انظر و ایا قوم هذا الجامع العالی

به للبال تفریح و تفریج لبلبال

مقام طیب ذو نزهه یزهو بتزئین

و احکام و ترصیص علی الاف امثال

فصلوا فیه و اتلوا فیه قرآنا و ازکارا

جماعات و افذ اذا بأبکار و آصال

بناه الخان عالی الجاه قرم ضیغم الهیجا

امان الله وهاب العطایا باذل المال

محب الساده الاشراف و الاجبار مولیهم

من الخیرات ما فیه لهم اصلاح احوال

الافاد عواله طرا باقبال و اجلال

و افلاح و اصلاح و انجاح لامال

و لما قيل ارخ عام تكميل البنا قلنا

لجدا فلح الوالی بهذا الجامع العالی )) (١٢٢٩)

ئیمامزادە پیرعومەر

سەبارەت بەرەچەڵەکی ئەم ئیمامزادە بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك دەڵێن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە و دەستەیەك دەڵێن: عومەر کوڕی یەحیا کوڕی زی ئەلدەمعە (حسەین) کوڕی زەیدی شەهید کوڕی سەیید سەجاد عەلی ناوەڕاست ناسراو بەزەین ئەلعابدین کوڕی ئیمام حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

ئەم گێڕانەوەیە لەڕاستییەوە نزیکترە. دەڵێن: پیرمحەممەد کەلای ڕۆژهەڵاتی شارەکە بەخاك سپێردراوە کوڕی ئەم پیر عومەرەیە. لەساڵی ١٠٤٠ کۆچی، سلێمان خانی ئەردەڵان کوڕی میر عەلەم ئەلدین لەسەر گۆڕی پیرعومەر گومەزێکی دروستکردووە، لەساڵی ١١١٦ حەسن عەلی خان کوڕی ئیعتیماد ئەلدەولە کەفەرمانڕەوای کوردستان بووە، ئەو گومەزەی وێران کردووە و دواتر خانە پاشای بابان، گومەز و حەوشێکی بچووکی بۆ دروستکردووە و غولام شا خان فراوانی کردووە. لەساڵی ١٢٩٧ کۆچی، میرزا سادق خانی مستەوفی باشی کوردستان، نەوەی میرزا محەممەد ڕەزای وەزیر، ئاوەدانی کردۆتەوە و حەوشەکەی کەبچووك و شەش حوجرەی هەبووە، گەورە کردووە و دە حوجرەی تیا دروستکردووە. لەساڵی ١٣٠٦ کۆچی، ئیبراهیم خانی نیزام ئەلدەولە، فەرمانڕەوای کوردستان، جارێکی دیکە نۆژەنی کردۆتەوە و ئاوێنەی لەناو گومەزەکە داناوە.

## مزگەوتی والی

یەکێکی دیکە لەمزگەوتەکانی سنە مزگەوتی والییە کە بەدارنەلئەمان ناسراوە. خوالێخۆشبوو ئەمان الله خانی دووەم (غولام شا خان) ناسراو بەزیائەلمەلەك لەساڵی ١٢٦٨ بنیاتیناوە، هەیوانێکی گەورەی هەیە کەرووی کردۆتە ڕۆژهەڵات، سێ باڵەخانە و دوانزە حوجرەی هەیە. گوندی خەلیفەی تەرخان، مزگەوتی حاجی ئاوا و باخێك لەمەیابروانی وەقفی ئەم مزگەوتە کردووە. جۆگەیەکی تایبەتی بۆ لێداوە. خوالێخۆشبوو ئەم مزگەوتەی بۆ میرزا کەریم خان، سەرسیلسیلەی شێخەکان بنیاتناوە تا ئەو بێنێتە شاری سنە و لەم

شارەدا سەرقاڵی ڕێنوێنی کردنی خەڵکان بێت. دانیشتووانی شار لەساڵی ١٢٧١ دژی فەرمانڕەوا شۆڕشیان کردووە و جەنگی کاروانسەرا ڕوویداوە. لەو مێژووە بەدواوە فەرمانڕەوا لەتەواو کردنی مزگەوتەکە دڵسارد بۆتەوە و بەوشێوە بەجێی هێشتووە. لەساڵی ١٣٤٧ کۆچی، بەفەرمانی ئەمیر عەبدوللە خانی تەهماسبی، شەقامی شارەکە لەباکورەوە بۆ باشور دەستی پێکردووە و حەوش و حەوزی مزگەوتەکە کەوتۆتە سەر ڕێگەی شەقامەکە و بەشێکی سەرەکی بۆتە شەقام. لەبەرابەر ئەوە، محەممەد باقر خان، کەسەرۆکی شارەوانی ئەو سەردەمە بووە، هەیوان و مزگەوتەکەی نۆژەن کردۆتەوە و حەوزێکی بچووکی لەبەردەم هەیوانەکەدا دروست کردووە. دوو سێ حوجرەی بۆ فەقێکان دروستکردووە و بەڕووی شەقامەکەدا دیوارێکی بەرز کردۆتەوە.

## مزگەوتی هاجەرخاتون

هاجەرخاتوون خوشکی ئیمامی دووەم عەلی ڕەزا، کوڕی ئیمام موسای کازم کوڕی ئیمام جەعفەری سادق کوڕی ئیمام محەممەد باقر کوڕی سەیید سەجاد ئیمام زەین ئەلعابدین کوڕی ئیمام حسەینە کە لەم ناوچەیە بەخاك سپێردراوە. لای گۆڕەکەی ئەو، یەعقوب ناوێك مزگەوتێکی بنیاتناوە و بەناوی هاجەرخاتوون ناوی دەرکردووە. خوالێخۆشبوو حاجی شێخ شوکروڵڵە باوکی حاجی شێخ عەبدوللە مزگەوتەکەی بەتەواوی نۆژەن کردۆتەوە. ئەم مزگەوتە بەهۆی نزیکی لەگۆڕی ئەو خاتوونە تا دەرکەوتنی پەهلەوییەکان جێگەی نەزر و پاڕانەوەی خەڵکان بووە و خەڵکان لەدەستدرێژی و ستەمی فەرمانڕەواکان پەنایان بۆ بردووە. گوندی ساتیلە کە لەنزیك ڕووباری شارەکەیە، شەرەف ئەمولك (عەلی ئەکبەر)خان بەخوالێخۆشبوو حاجی شوکروڵلەی بەخشیوە تا داهاتەکەی بۆ دابین کردنی نیازەکانی مزگەوتەکە و بژێوی حاجی شێخ تەرخان بکرێت. چەندین پارچە زەوی و باخیش لەناوچە جیاوازەکان وەقفی ئەو مزگەوتە کراوە و داهاتەکەی بەتەواوی بۆ مزگەوتەکە خەرج دەکرێت.

## قوتابخانە

لەشاری سنەدا تەنیا دوو قوتابخانە بوونی بووە. ئەحمەدییە و ئیتیحاد، ئەویش قوتابخانە نەبوو بەڵکو شوێنی سیاسەتی دیمۆکرات و سۆشیالەکان بووە کە لەکاتی جەنگی ئەم حیزبانە، ئەم دوو قوتابخانە دژی یەکدی، دروشمیان بەرز کردۆتەوە و دەستەبەندی حیزبەکان لەم دوو قوتابخانەوە دەستیپێکردووە و گەندەڵی بەسەر ئەم دوو قوتابخانەدا

زاڵبووه. تا سەرەتاکانی دەرکەوتنی دەوڵەتی پەهلەوی، ئەم دوو قوتابخانە کەمێك بارودۆخیان باشتر بووه، قوتابخانەی ئەحمەدییە ناوەکەی بۆ شاپور گۆڕا و چەندین قوتابخانەی دیکەی لەشاری سنە و ناوچەکانی سەر بەسنە دروستکران. هەنووکە لەشاری سنە و شارەکانی نزیکەی بیست قوتابخانەی دەوڵەتی کراوەتەوە. لەشاری چواریاب، قوتابخانەی ئیتیحاد لەناوچەی نێوان قەلاّ، قوتابخانەی شاپور لەناوچەی ریزەخار، قوتابخانەی مومتازییە لەگەڕەکی جەننەت، قوتابخانەی نەسوان لەناوەڕاستی شار و لەچەند شوێنێکی دیکە قوتابخانە بۆ منداڵی دانیشتووانی شارەکە و مسکێنەکانی گوندەکان، دامەزراوە کەبریتین لە: قوتابخانەی تای، قوتابخانەی ڕەمشت، قوتابخانەی سەرا بەقحەت، قوتابخانەی دێهگولان، قوتابخانەی دیواندەرە، قوتابخانەی سەقز، قوتابخانەی بانە، قوتابخانەی مەریوان، قوتابخانەی ڕەزاو، قوتابخانەی بێساران، قوتابخانەی کامیاران، قوتابخانەی جوانرۆ کەبڕیارە دوو قوتابخانەی دیکەی لەپاوە و نەوسو دروست بکرێت. قوتابخانەیەکی ناوەندی لەشارەکەدا هەیە بەڵام بەرەو نەمان دەڕوات. مەسیحییەکانیش قوتابخانەیەکیان هەیە کە بەقوتابخانەی پەهلەوی ناسراوە. قوتابخانەی ئالیانسیش لەگەڕەکی کەلیمییەکانە کەلەژێر دەسەلاّتی دەوڵەتی ئێران بەڕێوە دەبرێت.

بارودۆخی مەعریفە و کەسانی مەعریفی کوردستان تا رادەیەك سەرنجڕاکێشە چوونکە کەسانی چینی یەکەم کە لەترۆپکی کۆمەڵگادان و دەسەلاّتی کوردستان لەدەستی ئەواندایە، نەخوێندەوار و هیچ بەهرەیەکی زانستی و ئەدەبییان نییە. بەمپێیە دژی مەعریفە و پێشکەوتنن و ناخوازن کوڕەکانی کۆمەڵگا پێش خۆیان بکەونەوە. لەبەر ئەمە بەردەوام زانست بەدژی دین و ئیسلامییەت دەناسێنن و بەچەندین بیانووی جۆراوجۆر، لەمپەر لەڕێگەی خوێندن و پێشکەوتن دروست دەکەن بێ ئاگا لەوەی ڕۆژگار دژی بۆچوون و بیرکردنەوەی ئەوانە و مێژووی کردار و ئاکاری ئەوان تۆمار دەکات تا لەکاتی خۆیدا تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە.

### سەقز

سەقز یەکێك لەشارە گرنگەکانی کوردستانە. بەدووری ٢٤ فەرسەنگ لەباکوری ڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. قەزایەك و پێنج ناحیە و ٣٦٠ گوندی هەیە. ناوی ناحییەکان بریتییە لە: ١. میرەدێ،٢. سەرشیو، ٣. کەندەلاّن، ٤. کەڵ تەپە، ٥. ئەزن سەقڵ

سنورەکەی لەباکورەوە بەسابلاخ کۆتایی دێت و لەڕۆژئاوا دەگاتە بانە و شلێر، لەباشورەوە بەتیلەکۆ و لەڕۆژهەلاتەوە بەخاکی ئەفشار. ژمارەی دانیشتووانی قەزاکە زیاتر لەپێنج هەزار کەسە. هەموویان سوونی و شافعی مەزهەبن. هەزار و پێنسەد بنەماڵەی تیا دەژیت. ڕووبارێکی گەورە لەبیست هەنگاوی قەزاکە بەرەو باکور دەڕوات. لەکەلی خانەوە سەرچاوە دەگرێت و بەرەو میرەدێ دەڕوات و لەوێوە دەرژێتە ناو ڕووباری جقەتو. لەسەر ئەم ڕووبارە پردێك لەدار هەڵبەستراوە. سێ گەرماوی تێدایە. یەکێك لەگەرماوەکان لەسەر دەستی وەستا سالح لەدانیشتووانی سەقز بەم دواییانە دروستکراوە و لەدوو گەرماوەکەی دیکە باشترە. دە مزگەوتی هەیە و یەکیان مزگەوتی گەورەیە کەبیناکەی کۆنە. مەجید خانی فەرمانڕەوای ئەو شارە، بەم دواییانە نوژەنی کردۆتەوە. بازاڕ و کاروانسەرایەکی گەورەی هەیە. بینای حکومەتی گەورە و مەزنە. ڕووباری جقەتو بەناوەڕاستی خاکی سەقز تێدەپەڕێت. زەوییەکانی سەقز بەزۆری لەسەرچاوە یا ڕووبارەکان تێراو دەبن. باخی فراوان لەسەقزدا دەبینرێت. چاندنی توتون لەو شارەدا بەزۆری دەبینرێت و بەرهەمی هەناردەی ئەو شارە توتن و کشمیشە. جۆرەکانی دانەوێڵە و میوەکان و بەرهەمە هاوینییەکان و زستانییەکان لەو شارە بەرهەم دێت. هەموو جۆرەکانی ئاژەڵی کێوی و ماڵی کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، لەو ناوچەیەدا دەبینرێت. هەرچی نازناو لەسنەدا هەیە وەك حوجەتئەلئیسلام، شێخولئیسلام، مەزهەرئەلئیسلام، ئەمین ئەلئیسلام، شێخولمەشایخ، سەدرولعولەما، فەخرولعولەما و هتد... لەسەقزیشدا هەیە. ماڵیاتی سەقز ٦٣٠٥ تمەنە.

**بانە**

یەکێکی دیکە لەشارە گرنگەکانی کوردستان، شاری بانەیە. بەدووری ٢٤ فەرسەنگ لەڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. نۆ ناحیەی هەیە کەبریتین لە: ١. کیوەڕۆ، ٢. دەشتەتاڵ، ٣. نمەشیر، ٤. شوێ و ساوان، ٥. بەلوە و بنەخوێ، ٦. بۆین و بژی، ٧. نەنۆر، ٨. پشت ئاربەبا، ٩. تاژان. دەسەلاتی ئەم ناحیانە لەدەستی سەرۆکی ناحییەکاندایە. درێژییەکەی لەهەنگەژاڵ، سنوری شلێر تا هوازە و عەمرە کە بەسەردەشت کۆتایی دێت، دە فەرسەنگە. پانییەکەی لەکەلیخان تا چیای سوری شیوەکەڵ، ٨ فەرسەنگە.

سنوری بانە لەڕۆژهەلاتەوە: خوڕخوڕە، لەباکورەوە: سەقز و موکری، لەڕۆژئاوا، سەردەشت، لەباشورەوە، بەشلێر و قزلجە کۆتایی دێت. ڕووباری شار لەکەلیخانەوە سەرچاوە دەگرێت و

دەڕژێتە ناو ڕووباری کەلات لەسنوری تورکیا، زەوییەکانی بانە بەزۆری لەجەنگەڵ و چیا و بەردەڵان پێکهاتووە، دەشتی و زەوی پان و بەرینی کەمە. کشتوکاڵ لەوشارە بەزۆری بەئاوی سەرچاوە سروشتییەکانە. توتنی بانە یەکێك لەهەناردە گرنگەکانی کوردستانە کەساڵانە لانی کەم ٥ هەزار بار توتن بۆ دەرەوە هەناردە دەکرێت.

هەنار، تری، جۆ، گەنم، گەنمەشامی، هەرزن، ماشی بەئەندازەی دابین کردنی نیازی دانیشتووانەکەی هەیە. جۆرەکانی دانەوێڵەی کێوی و دەشتییەکان لەو شارەدا دەبینرێت.

فەرمانڕەواکانی ئەو شارە بەسوڵتان ناو دەبەن لەبەر ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی نازناوی پاشای بەفەرمانڕەوای سنوورییەکانی بەخشیوە.

نادریش وەك پەچەکردارێك فەرمانڕەوا سنوورییەکانی خۆی لەبانە و هەورامان بەسان ناو بردووە کەکورتکراوەی سوڵتانە. لەژمارە و بەڵگەنامەکان هەمان سوڵتان دەنووسرێت. ڕۆژانە لەکاتی ئاوا بوونی هەتاو بەفەرمانی ئەو پاشایە، شەیپور لێدەدەن.

بانە قەزایەك و دووسەد ئاوەدانی هەیە. دانیشتووانی قەزاکە زیاتر لەسێ هەزار کەسە. کۆی ژمارەی دانیشتووانی سەر بەو شارە دەگاتە چل هەزار کەس. هەموویان سوونی و شافعی مەزهەبن. دانیشتووانی شارەکە لەبەرهەمە جیاوازە جەنگەلییەکان سوود دەبینن. لەقەزای بانە گەرماوێك و هەشت مزگەوت دەبینرێت. مزگەوتی جامیعی شارەکە گەورەیە و ڕۆژانی هەینی خەڵك بەگشتی لەو مزگەوتەدا نوێژ دەخوێنن.ماڵیاتی ئەو شارە ٥٦٠٠ تمەنە.

سێ کاروانسەرا لەقەزای بانەدا هەیە کە لەکاتی گەیشتنی مازو لەهەر لایەك، بازرگانە گەورەکان بۆ بازرگانی کردن بەمازوو ڕوودەکەنە ئەو شارە.

یەکێك لەنیعمەتە سروشتییەکانی کوردستان، جەنگەڵەکان و دارستانەکانە کە لەگەردەنەی کەلیخانەوە دەستپێدەکات. بەدرێژایی چوار فەرسەنگ تا ناوچەکانی باشوری کوردستان و سنوری کرماشان. چیاکانی قەزای بانە، مەریوان، هەورامان، لهۆن، جوانڕۆ، ڕەوانسەر، سورسور، کاوڕوود، ژاوەڕۆ، هەمووی بەجەنگەڵ و دارەکانی وەك مازوو، بەڕو، وەن (چاتلانقوش) داپۆشراوە. بەداخەوە لەبەر نەزانی دانیشتووان و گرنگی پێنەدانی وەزارەتە پەیوەندیدارەکان، ناوچەکانی ئەم بەرهەمە سروشتییە بۆتە شوێنی بەدبەختی و نەزانی و بەردەوام لەلایەن تەور و تەشوێ و داسی دانیشتووانەوە هەڕەشەی لێدەکرێت کەبۆ دابین کردنی دار و سووتەمەنی یا ئامادە کردنی زەوی کشتوکاڵی، بەبڕینەوەیان سەرقاڵن. دارە

گەنج و پیرەکان دەبڕنەوە و لەم ڕوانگەوە ساڵانە زەرەر و زیانێکی زۆر لەسامانی نیشتمانی دەدرێت چوونکە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و زانستی کەڵکی لێوەربگیرێت، ساڵانە داهاتێکی زۆر بەدەوڵەت دەبڕێت وماڵیاتی دانیشتووان زیاد دەکات و سووتەمەنی و خەڵوز و داریش بەشێوەیەکی ئاسانتر دەستدەکەوێت.

زەوییەکان و چیاکانی ڕۆژئاوا و باشوری کوردستان هەموویان شیاوی جەنگەڵ و کردن بەدارستانێکی چڕوپڕن کە لەوشوێنانەی دارەکانیان بڕیوەتەوە دەتوانرێت دووبارە داری لێ بنێژن یا تۆوی لێ بچێنن.

میوە و بەرهەمی ئەم جەنگەڵانە، بەڕووی شیرین و تاڵ، مازوو، کشمیش و قەزوان و هەرمێ کێویلە و گوێژ و بادەمی تاڵ و هاڵەبلاڵوك و .... کە لەکاتی گرانی و وشکەساڵی دانیشتووانی ئەو ناوچە بەهۆیانەوە خۆیان لەچنگی برسیەتی ڕزگار دەکەن.

داری مازوو بێ ئەوەی دەستی مرۆۃ لەچاندنی دەورێکی هەبێت، پانزە جۆرە بەرهەمی هەیە:

١. مازوو، ٢. برا مازوو، ٣. بەڕو، ٤. دەنوکە (کشمیشی کاولیان)، ٥. سیچکە، ٦. خڕنوك، ٧. کەڵکاف، ٨. کەلە شینکە، ٩. هەمزە بەگی، ١٠. تسقل، ١١. کوڵ، ١٢. پانکە، ١٣. قڕگە، ١٤. پۆزە خوگە، ١٥. قرژاڵە. دەستەیەك قسکەیش بەم پێرستە زیاد دەکەن و دەڵێن جیاوازە لەتسقل.

گەزۆیش کەیەکێك لەهەناردە سەرکییەکانی کوردستانە، شیرەییەکە ساڵانە لەهەوا هاوشێوەی شەونم لەسەر گەڵا و بەرگی دارەکانی ئەم جەنگەڵە کۆدەبێتەوە. دەڵێی ئایەی (وانزلنا علیکم المن و السلوی) بۆ دانیشتووانی ئەم شارە هاتۆتە خوار. هەر ساڵ کەبەهارەکەی خۆش بێت، گەزۆی زیاتر بەرهەم دێت و هەرساڵ کەهەوا وشك بێت، گەزۆ کەمترە.

سەقز (بنێشت) کەئەمڕۆ لەدنیای پیشەسازی جێگەیەکی بۆخۆی کردۆتەوە، شیرەی داری وەنە. چاتلانقوش (قەزوان) کە لەجەنگەڵەکانی بانە، مەریوان، هەورامان و جوانڕۆ فراوانە، ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی بەرهەمی بێنن، ساڵانە بڕە پارەیەکی زۆر دەست دانیشتووان دەکەوێت. جۆرەکانی ڕوەك و گیا بۆنخۆشەکان و پزیشکییەکان لەم ناوچەیەدا فراوانە. خانەکانی بانە لەمناڵەکانی ئیختیار ئەلدینن کەجگە لەپۆستی فەرمانڕەوایی، پێگەی

خواپەرەستیشی پێبڕاوە. یەکەم کەس کەلەو سیلسیلە ئالآی بەرز کردۆتەوە و فەرمانڕەوایی سەربەخۆی شارەکەی کردووە، میرزا بەگ کوڕی میر محەممەد بووە کەکچی بەگە بەگ کوڕی مەئمونی ئەردەلانی کردۆتە هاوسەری خۆی و سەرئەنجام لەسەر ئەم پەیوەندی هاوسەرگیرییە پەیوەندی ئەو لەگەڵ سوڵتان عەلی بەگ، گرژی و ئاڵۆزی بەخۆیەوە بینیوە و دوای جەنگێکی دژوار، سوڵتان عەلی بەگ، قایتەمەش بەگی برای لەبانە جێگیر کردووە و میرزا بەگی لەشارەکە دەرپەڕاندووە.. میرزا بەگ داوای هاوکاری لەبەگە میرزا بەگ کردووە و بەهاوکاری ئەو، سوپای ئەردەلان هاتۆتە بانە و قایتەمەش بەگ هەڵاتووە و دووبارە میرزا بەگ، پاڵ بەکورسی فەرمانڕەوایەتی شارەکەوە دەدات. دوای ماوەیەك دەمرێت و پێنج کوڕ لەدوای خۆی بەجێدێڵێت: بەداق بەگ، سلێمان بەگ، غازی خان، میر محەممەد، ئەغورلوبەگ. بەداق بەگ دوای مردنی باوکی، جێگەی دەگرێتەوە، میر محەممەد و ئوغورلو کە لەدایکێکی دیکە بوون، دژی ئەو شۆڕش دەکەن و لەبانە دووری دەخەنەوە. بەداق بەگ هانا بۆ دەرباری شا تەهماسب بەرز دەکاتەوە تا بەهاوکاری ئەو بتوانێت دووبارە دەسەڵاتی شارەکە بگرێتەدەست. بەرێکەوت لەقەزوێن نەخۆش دەکەوێت و دەمرێت. سلێمان بەگی برای، خۆی دەگەیێنێتە دەرباری شا تەهماسب و فەرمانی حکومەتی بانە، بۆ ئەو دەردەچێت. بوئەلقولی بەگ کوڕی ئامادین ئاغای زولقەدر، فەرمانڕەوای مەراغە، فەرمانی پێدەدرێت سلێمان بەگ بباتە بانە و فەرمانڕەوایەتی شارەکەی پێ بسپێرێت. سلێمان بەگ نزیکەی بیست ساڵ دادپەروەرانە فەرمانڕەوایەتی شارەکەی کردووە و لەبەر خواپەرەستی و خۆپارێزی، دەسەڵاتی بەجێهێشتووە و کچەکەی خۆی لەبرازاکەی، بەدر بەگی کوڕی بەداق بەگ مارە کردووە و حکومەتی بانەی پێدەبەخشێت و خۆی ڕێگەی حیجاز دەگرێتەبەر و لەوێ دەمێنێتەوە. دوای حەوت ساڵ و نیو، حەوت حەج وعەمرە دەکات و دەگەڕێتەوە و لەبانە دەمرێت. ئارامگاکەی لەنیو فەرسەنگی شارەکەیە و بۆتە زیارەتگای دانیشتووانی شارەکە. کەس ناوێرێت دارەکانی ئەو ناوچەیە ببڕێتەوە و لەبەر ئەمە دارستانێکی چڕوپڕە.

لەساڵی ۱۳۰۸ کۆچی، ڕۆژی شەممە ۱۸ زیئەلحەججە، کەڕۆژی جەژنی غەدیرە، یوسن خانی فەرمانڕەوای شارەکە، کەرەستەکانی کوشتنی مستەفابەگی برای بەهاوکاری کوڕەکانی ئامادە دەکات و ئەوان بۆ میوانی بانگێشت دەکات. کوڕەکەی یونس خان بەئیشارەی باوکی، جەنگ دەستپێدەکات و بەدەمانچە کۆتایی بەژیانی مستەفا بەگی مامی

دێنێت. دوو کوڕەکەی حاجی مستەفا کەلەو میوانییەدا ئامادە دەبن، یەکیان دەکوژرێت. کوڕەکەیتری کە لەوکاتەدا ١٥ ساڵی تەمەن بووە، لەبەر ئەوەی دڵنیایە ڕێگەی هەڵاتن نەماوە، دوای ئەوەی هەشت برینی جەرگبڕی بەر دەکەوێت، خەنجەر بەدەست هێرش دەکاتە سەر یونس خان و دەیکوژێت. شەش کەسی دیکەیش بریندار دەکات. دواتر کەسانی یونس خان پەلاماری دەدەن و دەیکوژن.

### مەریوان

مەریوان بەدووری هەژدە فەرسەنگ لەڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە و پەیوەستە بەخاکی دەوڵەتی عوسمانی. لەدەشتی مەریوان دەریاچەیەك بەناوی زرێبار دەبینرێت کەدرێژییەکەی فەرسەنگ و نیوێك و پانییەکەی نیو فەرسەنگە. زرێبار لەسەرچاوە سروشتییەکان پێکهاتووە و لەگەڵ ئەوەی دەڕوانێتە سەر دەشتێکی پان و بەرین، بەهۆی نەبوونی سەد، ئاوەکەی بەفیڕۆ دەڕوات. لەزستاندا سەرەوەی ئاوەکە دەیبەستێت و بەفری لەسەر دەبارێت. لەهەر شوێنێکەوە ڕێوی بڕوات، ڕاوچییەکان بەو شوێنەدا دەڕۆن. گوندی کانی سانان کەبنکەی خانەکانی ئەو ناوچەیە، لەڕۆژئاوای دەریاچەکە جێگیرە. لەڕۆژهەڵاتی دەریاچەکە، قەڵایەك بۆ هێزەکان دروستکراوە. قەڵایەکی بەهێز و تۆکمەیە و لەساڵی ١٢٨٢ کۆچی مانگی بەفەرمانی ناسرەلدین شا دروستکراوە و چل هەزار تمەنی بۆ دابینکراوە. لەساڵی ١٢٨٦، حاجی فەرهادی میرزای موعتەمید ئەلدەولە، کەمێك لەفراوانییەکەی گرتووە و زیاتر گرنگی بەتۆکمەیی و بەهێزی قەڵاکەداوە و ناوینا وە قەڵای شائاباد. ئەم قەڵایە بەم دواییانە لەکاتی پشێوی و ئاڵۆزی هۆزەکان، وێران بوو. لەڕۆژئاوای قەڵای شا ئاباد، ئاوەدانییەکی گەورە دروستکراوە و بەقەڵا ناوی دەرکردووە. نزیکەی سەد بنەماڵە لەوێ نیشتەجێن. گەرماو و مزگەوتێکی گەورەی تیا دروستکراوە. فەرهاد میرزا بۆ ئەم ئاوەدانییە جۆگەیەکی لێداوە و ئاوی بۆ ناو قەڵاکەیش بردووە. لەوێ هەمارێکی گەورەی ئاوی بۆ کاتی پێویست دروستکردووە کە لەو ئاوە پڕ دەبێتەوە. لەناو قەڵاکە حەوزێکی گەورە دەبینرێت.

حاجی محەممەد عەلی خان زەفەر ئەلمولك سەرداری بەڕێز، لەکاتێکدا فەرمانڕەوای ناوچەکە بووە، ئاوەدانی قەڵای شائاباد و دەوروبەری فراوان کردووە. چەند ژوورێك و گەرماوێکی لەناو قەڵاکەدا دروست کردووە. لەگوندی قەڵایش کاروانسەرایەکی بۆ بازرگانەکانی دەرەوە و ناوەوەی ناوچەکە و شوێنی بارخستن و بار کردن، بنیاتناوە، جۆگەیەکی دیکەی لێداوە و

لەبەردەم جۆگەکە ئاشێك و باخێکی گەورەی دروستکردووە بەڵام بەتێپەڕبوونی کات هەموویان وێران بوون. تا لەسەرەتاکانی سەڵتەنەتی پەهلەوی بەفەرمانی میر عەبدوللە خانی تەهماسبی، قەڵای ئامازە پێدراو سەر لەنوێ نۆژەن کراوەتەوە و سەرباز و تۆپ و جبەخانە و تۆپخانەی پێویستی بۆ ئەو ناوچەیە ناردووە و لەئێستادا بۆتە ناوەندی سوپاییەکان. هەوای قەڵاکە بەهۆی نزیکی لەدەریاچەکە گەرم و ناپەسەندە. مەریوان جەنگەڵ و دارستانە. بەرهەمی جەنگەڵی زۆری هەیە. گەزۆ و بنێشت بۆ دەرەوە هەناردە دەکرێت. برنج و توتنی زۆر لەو شارە بەرهەم دێت.

دەشتی مەریوان بەردەوام گۆڕەپانی بوێران و جەنگاوەران بووە و زۆربەی کاتەکان دەوڵەتەکانی ئێران و ڕۆم ئەو ناوچەیان کردۆتە شوێنی جەنگ و ململانێکانی خۆیان. دانیشتووانی ئەو ناوچە بوێر و جەنگاوەرن. هەموویان سوونی و شافعی مەزهەبن. مەریوان دووسەد گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی بیست و شەش هەزار کەسە ولەکاتی پێویست بەردەوام دوو هەزار و پێنسەد تفەنگچی بۆ گۆڕەپانی جەنگ ئامادە دەبێت. مەلا ئەبوبەکری موسنیف کەپێشتر ئامازەمان پێدا، خەڵکی گوندی چورە کەیەکێکە لەگوندەکانی مەریوان. حاجی سەیید حەسەنی شێخولئیسلامی چوریش، باوکی سەیید عەبدولقادری شێخولئیسلام، خەڵکی هەمان گوندە و یەکێکە لەزاناکانی مەریوان. سەیید عەبدوللە چوری، لەزانا بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە.

قەڵای کۆنی وڵاتی ئەردەڵان کەسورخاب بەگ بنیاتی ناوە، لەسەر بەرزایی چیایەك جێگیرە و لەچوار هەزار هەنگاوی قەڵای شائابادە. لەباکوری ڕۆژهەڵات زۆر دژوار و بەهێز بووە و لەئێستادا تەنیا شوێنەواری ماوەتەوە. ماڵیاتی ساڵانەی مەریوان ١٦٥٠ تمەنە. مەحمود خانی کانی سانان کوڕی عەلی بەگ کوڕی حاجی حەیدەر بەگە. کەیخوسرەوخانی وەڵەژێر کوڕی محەممەد عەلی بەگ کوڕی سلێمان بەگ کوڕی مامی حاجی حەیدەر بەگە. خاجی کەیخوسرەخانی زەهیر ئەلسەڵتەنە کوڕی حسەین قولی بەگە کەکوڕی مامی فەتح عەلی بەگی وەکیلی مەریوان بووە. هەرسێکیان کوڕی پوری یەکترن.

## هەورامانی تەخت

هەورامانی تەخت، بەدووری شانزە فەرسەنگ لەباشوری ڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. ناوچەیەکی سەخت و دژوارە، لەڕۆژئاوا پەیوەستە بەخاکی شارەزوور و لەباشورەوە

پەیوەستە بەهەورامانی لهۆن. لەکوردستانەوە تەنیا دوو ڕێگە بۆ ئەو ناوچەیە هەیە. ناوچەیەکی دژوارە کە لەبەر دژواری بردنی سوپا و تۆپخانە لەو دوو ڕێگەیە، کارێکی ئەستەمە و لەبەر ئەمە دانیشتووانی ئەو ناوچە بەردەوام دژی دەوڵەت شۆڕش دەکەن و گرنگییان بەفەرمانەکانی دەوڵەتی ئێران نەداوە. لەساڵی ١٣٤٩ کۆچی سەرهەنگ مەحمود خانی ئەمینی، کەفەرماندەی تیپی سەربەخۆی کوردستان بووە، بەشێوەیەکی لەناکاو هێرشی کردۆتە سەر دەربەندی دزڵی و دەربەندی کەڵوێ و گوندی دزڵی داگیر کردووە کەبنکەی مەحمود خان بووە. مەحمود خان و دەستەیەك لەدەست و پێوەندەکانی ڕێگەی هەڵاتنیان گرتۆتەبەر. لەساڵی ١٣٥٠، هەورامانی تەخت و لهۆن بەهۆی هەوڵی سەرتیپ عەلی خانی ڕەحیمی ناسراو بەعەلی شا کەفەرماندەی تیپی کوردستان بووە و کردەوەکانی سەرهەنگ حاجی عەلی خان، دەوڵەت توانیویەتی دەست بەسەر ئەم دوو ناوچەیەدا بگرێت. جەعفەر سوڵتان کوڕی محەممەد سەعید سوڵتان کەفەرمانڕەوای ناوچەکە بووە، لەگەڵ کوڕ و کەسەکانی ئاوارەی بەین ئەلنەهرەین بووە. نزیکەی چوارسەد کەس لەسوڵتان و خان و سەرۆك و کوێخاکان و پیاوماقوڵانی هەورامان و لهۆن و مەریوان و جوانڕۆ و قوبادی وباباجانی و خانەکانی ڕەزاو لەسەرمای زستاندا ڕێگەی تارانیان گرتۆتەبەر و لەوێوە بەشارەکانی سمنان، دامەغان و ئیسفەهان و ویلایەتەکانی دیکەدا بڵاو بوونەتەوە.

هەورامانی تەخت سی و دوو گوندی هەیە. بەرهەمی ئەو ناوچەیە هەنار و ئەنجیر و ترێ و میوە جەنگەڵییەکانە. ژمارەی دانیشتووانەکەی زیاتر لەچوار هەزار کەسە.ماڵیاتەکەی ٧٠٠ تمەنە. نادر سوڵتان، فەرمانڕەوای هەورامانی تەخت، کوڕی ڕۆستەم سوڵتان برای بورزو بەگ کوڕی حەسەن سوڵتانن. مەحمود خانی دزڵی کوڕی عەزیز خان کوڕی بەهرام بەگ برای مستەفا سوڵتان کوڕی عەباس قولی سوڵتانی ڕەزاو و فەرەج الله سوڵتانی ئاڵمانە و ڕەزا قولی بەگە. حسەین خان و مەجید خان و محەممەد عەلی بەگی چولاغ کوڕەکانی ڕەزا قولی بەگن. حسەین خان دوو کوڕی هێناوەتە دنیا، محەممەد ڕەشی بەگ، باوکی عەبدوللە بەگ و حەسەن بەگ.. لەمحەممەد عەلی بەگ چوار کوڕ بەجێماوە: محەممەد بەگ، ئەحمەد بەگ، مەحمود بەگ و محەممەد ئەمین بەگ. مەجیدخان کوڕێکی هەیە: محەممەد بەگ. حەسەن سوڵتان و مستەفا سوڵتان و بەهرام بەگ، هەر سێك کوڕەکانی محەممەد سوڵتان کوڕی یوسف سوڵتان کوڕی پیری بەگن. بەهرام بەگ شەش کوڕی بووە: ١. سەردار بەگ، ٢. قارد

بەگ باوکی محەممەد سالّح سولّتان و ئەسکەندەر بەگ باوکی عەبدوللە بەگی سەرهەنگ، ٣. عەزیز بەگ، باوکی مەحمود خانی دزلّی، ٤. شێخ جان الله بەگ، باوکی عەلی محەممەد بەگ و محەممەد ڕەشی بەگ، ٥. حەیدەر بەگ، ٦. حەبیب الله بەگ تفلّی باوکی محەممەد بەگ.

### هەورامانی لهۆن

هەورامانی لهۆن بەدووری هەژدە فەرسەنگ لەنێوان ڕۆژئاوا و باشوری کوردستان جێگیرە. ناوەندەکەی گوندی نەوسودە. لەڕۆژئاوا و باشور پەیوەستە بەخاکی دەولّەتی عوسمانی. هەمیشە ئەم دوو هەورامانە، لەبەرابەر سوپای دەولّەت یەکگرتوون. ڕێگەی هەورامانی لهۆن لەبەر ڕووباری سیروان، دژوارە و بەبێ توانای پێویست تێپەڕینی لەو ڕێگەیە ئاسان نییە. لهۆن بیست و دوو گوندی هەیە و هەموو شوێنێکی چیایە و جەنگەلّ. زەوی تەخت و شیاوی کشتوکالّ لەو ناوچەیە بوونی نییە. بەرهەمی ئەو ناوچە، هەنجیر و هەنار و ترێ و میوە جەنگەلّییەکانە. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی چوار هەزار کەسە. مالّیاتەکەی سێسەد تمەنە. فەرمانڕەواکانی هەورامان وەك لەباسی بانەدا ئامارژەمان پێدا، بەهۆی نزیکی لەدەولّەتی عوسمانی، بەسان ناو دەبەن کەکورتکراوەی سولّتانە. لەنزیك ڕووباری سیروان لای پردی کەران، کەسێك بەخاك سپێردراوە کە بەسولّتان ئیسحاق ناوی دەبەن. برازای حەمزەی نەجارە (دارتاش) کەهەردووك لەمنالّەکانی ئیمام جەعفەری سادقن. لەعەلی عەریزی کوڕی ئیمام جەعفەر چاویان بەدنیا هەلّهێناوە. حەمزەی نەجار لەگوندی نەجار بەخاك سپێردراوە. لای چەپی ڕووبارەکە، سولّتان عوبەیدالله برای ئیمام عەلی ڕەزا کوڕی موسای کازم لەگوندی هەجیج بەخاك سپێردراوە و بەکۆسەی هەجیج بەناوبانگە. دانیشتووانی ئەم گوندە، جل و بەرگ و جامانە و کلّاوی تایبەت بەخۆیان هەیە و لەهەموو دنیا بەهۆیەوە دەناسرێنەوە. لەبەردەم ئاوای هەجیج، لەسەر ڕووباری سیروان، پردێك لەموو (گوریس) دروستکراوە و بە(وەنن) بەناوبانگە. جگە لەدانیشتووانی ئەو ناوچە کەسی دیکە بوێری پەڕینەوە لەو پردەی نییە چوونکە گوریس شیاوی بڕوا پێکردن نییە. جیاواز لەوە، هاوشێوەی تۆڕ دروستیان کردووە و هەر ئەوەندەی پێی گەشتیارێك بلەغزێت، دەکەوێتە ناو ڕووبارەکە. خراپتر لەهەموو شتێك ئەم پردە بەردەوام لەجوولّەدایە و لەکاتی پەڕینەوەی هەر کەس، بەرەو لای ڕاست و چەپ هاوشێوەی جۆلانێ دەجوولّێتەوە. بەلّام دانیشتووانی ناوچەکە، دەست و پێی ولاّغ دەبەستنەوە و لەپردەکە دەپەڕنەوە.

جەعفەر سوڵتان فەرمانڕەوای لهۆن کوڕی محەممەد سەعید سوڵتانە کەعەلی ئەکبر خانی شەرفە ئەلمولك، شازادە موعتەمید ئەلدەولە ئەوی لەگەڵ عەبدولڕەحمان بەگی کوڕی، لەقەڵای جوانڕ کوشت. دوای ئەو ڕۆستەم سولتانی کوڕی، فەرمانڕەوای لهۆن دەگرێتە دەست. دوای ماوەیەك جەعفەر سوڵتان، حسەین بەگ کوڕی مستەفا سوڵتان برای فەتحوللە بەگ، نەوەی ئەحمەد سوڵتان کەکورە پووری یەکتر بوون، بۆ کوشتنی ڕۆستەم سوڵتان ناچار دەکات تا خۆی فەرمانڕەوایەتی لهۆن بگرێتەدەست. دوای کوشتنی ڕۆستەم سوڵتان، محەممەد ساڵح سوڵتان کوڕە گەورەی ڕۆستەم سوڵتان، فەرمانڕەوای لهۆن دەگرێتەدەست. جەعفەر سوڵتان، حسەین بەگ تەسلیم بەحاجی زەفەرئەلمولك دەکات و لەتۆڵەی ڕۆستەم سوڵتان دەیکوژێت. دواتر جەعفەر سوڵتان، مەحمود بەگی کوری عوسمان بەگ ناچار بەکوشتنی محەممەد ساڵح سوڵتان دەکات. دوای کوشتنی ئەو، جەعفەر سوڵتان فەرمانڕەوایی لهۆن دەگرێتە دەست. ئەحمەد سوڵتان و محەممەد سەعید سوڵتان، کوڕەکانی عوسمان سوڵتانن. محەممەد سەعید سوڵتان شەش کوڕی هەیە: ١. عەبدولڕەحمان بەگ، ٢. عوسمان بەگ، ٣. ڕۆستەم سوڵتان، ٤. فەتاح بەگ، ٥. جەعفەر سوڵتان، ٦. محەممەد بەگ ناسراو بەحەمیتە. لەعەبدولڕەحمان بەگ، عەباس بەگ و فەرەیدون بەگ و کەیخوسرەو بەگ، چاویان بەدنیا هەڵهێناوە. لەڕۆستەم سوڵتان، محەممەد ساڵح سوڵتان و ئەفراسیاب بەگ و تۆفیق بەگ و حسەین بەگ چاویان بەدنیا هەڵهێناوە. جەعفەر سوڵتان، هەژدە کوڕی هەیە کەبریتین لە: ١. ئەحمەد بەگ، ٢. کەریم بەگ، ٣. غەفار بەگ، ٤. محەممەد ڕەشید بەگ، ٥. قادر بەگ، ٦. مستەفا بەگ، ٧. حەسەن بەگ، ٨. عەبدولغەفور بەگ، ٩. مەحمود بەگ، ١٠. محەممەد ئەمین بەگ، ١١. محەممەد تەقی بەگ، ١٢. محەممەد ڕەزا بەگ، ١٣. عەلی بەگ ناسراو بەپاشای کۆرە، ١٤. عەلی محەممەد بەگ، ١٥. فەتحوللە بەگ، ١٦. محەممەد سەعید بەگ، ١٧. مەنسورخان، ١٨. سەیفوللە بەگ. نزیکەی سەد کەس لەکوڕ و منداڵەکانی لەپشت سەری سوار دەبن و لەگۆڕەپانی جەنگ ئامادە دەبن. جەعفەر سوڵتان و پێنج لەکوڕەکانی، لەدەوری پەهلەوی مانگانەیان وەردەگرت. لەکاتی ڕاگەیاندنی داماڵینی چەك، گرنگییان بەبەندەکانی ڕاگەیندراوەکە نەدا. گەورەکانی دەوڵەت منیان کردە نێوەنجیگەر بەڵکو گوێ لەمۆجیارییەکان بگرێت بەڵام سوودی نەبوو. سەرئەنجام کار بەهێرش کردنی سوپا کۆتایی هات و لەڕەجەبی ١٣٥٠ کۆچی، سەرهەنگ غولام حسەین، لەگەڵ دەستەیەك لەهێزەکانی

کوردستان، ڕێگەی هەورامانی تەختیان گرتەبەر و دوای ئەو سەرهەنگ مستەفا خانی مەنسور، لەگەڵ دەستەیەکی دیکە، لە ٤ ی ڕەجەب سەرهەنگ حاجی عەلی خان، لەگەڵ هێزەکانی کرماشان لەڕێگەی پاوەوە، بەڕێکەوتن. دواتر لە ٧ ڕەجەب، فەرماندەی تیپی سەربەخۆی کوردستان، عەلی خانی ڕەحیمی، ناسراو بەعەلی شا، لەگەڵ پاشماوەی هێزەکانی کوردستان، ڕێگەی ڕەزاویان گرتەبەر و لەپشت سەری هەموویانەوە ئەمیر ئەحمەد خان سوپاسالاری گەورە، لە ٨ی شەعبان هاتە ناو سنە و ڕۆژی نۆیەم لەڕێگەی ڕەزاو بەرەو نەوسود بەڕێکەوتن. ئێوارێی ڕۆژی چوارشەممە، بەهۆی تەلەفۆن لەگرتنی نەوسود ئاگادار بوومەوە و دوای دوو ڕووبەڕوو بوونەوە هێزەکانی جەعفەر سوڵتان شکستیان خوارد و جەعفەر سوڵتان و کەسەکانی ڕێگەی خاکی بەین ئەلنەهرەینیان گرتەبەر. بەیانی ١٥ شەعبان، کەجەژنی بەرات و لەدایکبونی ئیمام مەهدی (ئیمامی شیعەکان) بوو، لەبەڕێوبەرایەتی حکومەتی، نیزام ئەلدین خانی حیکمەت، پیرۆزبایی هەردوو جەژنەکەی لەئامادەبووانی دانیشتنەکە کرد. منیش لەوەڵامی پیرۆزباییەکەی ئەو، لەهەواڵی سەرکەوتنەکەی نەوسود (کەتەنیا من لێی ئاگادار بووم) ئاگادارم کردەوە. لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، بارودۆخی دانیشتنەکە گۆڕا. دەستەیەك کەخوازیاری پێشکەوتنی مەبەستەکانی دەوڵەت بوون، بەبیستنی ئەم هەواڵە شادمان و دەستەیەك کەخوازیار و شوێنکەوتەی سیاسەتی عەشایری بوون، خەمبار بوون.[1]

ئەمە دەقی ئەو نامەیە کە لەسەر داوای فەرمانبەرانی دەوڵەت بۆ جەعفەر سوڵتانم نووسی:

بەڕێز ئەمیر ئەلئومەرا، ئاغای جەعفەر سوڵتان، سەرداری گەورە و فەرمانڕەوای لهۆن و ناوچەکانی پەیوەست، چەندین جار بۆ ئێوەم نووسی، ئەم دوا جارەیش دەنووسم کەسەردەمی عەشیرەگەری و پاشایەتی کۆتایی هاتووە. هەموو سەرۆك عەشیرەکانی ئێران و میری تایەفەکان، سەری تەسلیمیان بۆ بارەگای شای شاکانی پەهلەوی دانەواندووە و هەمووان ملکەچ و فەرمانبردارن. چی ڕوویداوە لەگەڵ ئەوەی پێشینەی خزمەتی زۆرتان

[1] - هەرچەند لەبەشەکانی پێشوودا دەبینین نووسەر بەشێوەیەکی دیکە سەبارەت بەکورد و وڵاتی کوردستان دەدوێت بەڵام لێرەدا خۆشحاڵی خۆی لەسەرکەوتنی سوپای پەهلەوی بەسەر کوردان دەردەبڕێت و بەشانازییەوە باسی دەکات. ئەگەری هەیە هۆکارەکەی ئەوە بێت کەنووسەر زیاد لەرادە لەژێر کاریگەری ئاییندا بێت و لەبەرژەوەندی خۆیدا بنووسێت و بیر بکاتەوە.

هەیە، خۆتان لەهەڵدێری بەدبەختی نزیك دەکەنەوە. هەرچی زووترە ملکەچی و گوێرایەڵی خۆتان نیشان بدەن و فەرمانەکانی دەوڵەت جێبەجێ بکەن و خۆتان لەقورسایی هەڵگرتنی سیلاح و چەك ڕزگار و ئاسوودە بکەن. سەرپێچی و نافەرمانی فەرمانە باوك ئاساکانی دەوڵەت، جگە لەبەدبەختی و ڕیسوایی هیچی دیکەی لێ ناکەوێتەوە. دانیشتووان و هێزە عەشایرییەکان، کاتێك شکۆ و مەزنییان هەیە کە لەژێر فەرمانی دەوڵەتا بن و گەرنە هاوشێوەی سەهۆڵە لەبەردەم تیشکی هەتاودوا کە لەماوەیەکی زەمەنی کەم دەتوێتەوە و لەناو دەچێت. دامەزراوە عەشایرییەکان بێ بنەما و نەشیاوە بۆ باوەڕ پێکردن بەڵام بەپێچەوانەوە، دەسەڵاتەکانی دەوڵەت فراوان و نەشیاوە بۆ کۆتایی هاتن. کەواتە وەك کەسێکی چاکەخوازی ئێوە بۆتان دەنووسم کەهەرچی زووتر بەئامێزی کراوە پێشوازی لەمیهرەبانی دەوڵەت بکەن و سیلاح و چەکەکانی خۆتان بەهۆی نوێنەرەکەتانەوە بۆ شار بنێرن. منیش بەنوێنەرایەتی حەزرەتی فەرماندەی تیپ بەڵێنتان پێدەدەم تا لەژیاندا ماون، بەو پەڕی ڕێز و ئیحترام، فەرمانڕەوایی ناوچەکەی خۆتان لەدەستتا دەبێت و بەشێوەیەکی ئاسوودە ژیان بەسەر دەبەن. ئەو مانگانەی پێشتر بەخۆتان و کەسانی خۆتان دەدرا، لەداهاتویش لەژێر ناوی حکومەت و دابین کردنی ئاسایشی ناوچەکە بەئێوە دەدرێت. دەوڵەت ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوانەی پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی نەجووڵێتەوە، نامیهرەبانی نیشان نادات و دەخوازێت مسکێنەکان کەهاوشێوەی منداڵەکانی ئەون، لەڕێگەی مۆجیاری کردنەوە، بۆ ڕێگەی بەختەوەری و شادمانی ڕێنوێنی بکات. ئەم سوپایەی سەرانسەری ئێرانی گرتۆتەوە، بۆ پاراستنی ئارامی و دابین کردنی ئاسایش ئامادە کراوە، تفەنگیان بەدەستەوەیە و شەو و ڕۆژ پاسەوانی کۆمەڵگان، یانی ئەوان لەزەحمەتان تا من و تۆ لەئارامیدا بژین، لەئارامیدا بخەوین. هەڵگرتنی سیلاح لەدەورانی پەهلەوی بۆ کەسانی نا نیزامی، پێویست نییە و دەبێتە هۆکاری بەدبەختی بۆ هەڵگرەکەی. ئەمڕۆ مسکێنەکان دەبێت تفەنگەکان بدەنە دەست سەربازەکان و بەدڵنیایی و ئاسوودەیی، خاکەناز بەدەستەوە بگرن و سەرقاڵی کشتوکاڵ و وەرزێری بن، ماڵئاوایی لەجەنگ و کێشەی عەشایری بکەن و هێزی خۆتان بۆ چاندن و کێڵانی زەوی بەکار ببەن تا وڵات بەهۆی ڕەنج و ماندوو بوونی ئەوان، ئاوەدان ببێتەوە. من ئەوەی پێویستە بەتۆی دەڵێم، گەر دەخوازی گوێ بگرە و گەر ناخوازیت گوێ مەگرە. لەکۆتاییدا، جەخت لەوە دەکەمەوە خۆشبەختی و بەدبەختی ئێوە

لەوەڵامی ئەم نامەدایە ئەگەر ملکەچی خۆتان نیشان بدەن یا ڕێگەی سەرپێچی کردن بگرنەبەر. چیتر خۆتان دەزانن. ((خواوەند کەشتی بۆ ئەو شوێنە دەبات کەخۆی دەخوازێت، تەنانەت ئەگەر کەشتیوان، هەموو جلەکانی خۆی بدرێت)) (محەممەدی مەردۆخ).

ئەمە وەڵامەکەی جەعفەر سوڵتانە: بۆ حوجەتولئیسلام بەرێز ئایەت الله مەردوخ، سڵاوی خواتان لێ بێت! دەستخەتی پیرۆزی ئێوە کەسەرانسەر بوو لەمۆجیاری و ئامۆژگاری باوکانە، بەدەستمان گەیشت. بەرێزتان ئاگادارن یەکەم کەس کە بۆخزمەتگوزاری دەوڵەت وسەرکوت کردنی عەشایرەکان ئامادە بوو، بەندەی خزمەتگوزار بوو کە لەئەنجامی خزمەتەکانم، خەڵات و ئیمتیازم پێبەخشرا. ئێستا چی ڕوویداوە وەك یەکێك لەخیانەتکارەکان هەژمار دەکرێم و داوای دانانی سیلاحم لێدەکەن. خۆتان باش دەزانن عەشیرەکانی ئەم سنورە، لەدەرەوە و ناوەوە دوژمنی منن. ئەگەر دەوڵەت سیلاح لەعەشیرەکانی دەوروبەر وەربگرێتەوە، ئامادەم تفەنگەکانم بەبار پێشکەش بەدەوڵەت بکەم. ئەگەر دوژمنەکانی من هەموویان خاوەنی سیلاح و تفەنگ بن، منی بێ سیلاح چۆن دەتوانم سیلاحەکەم تەسلیم بکەم. من تەنیا لەدوو شێوەدا دەتوانم سیلاح دابنێم: یەکەم ئەوەی هەموو عەشیرەکانی ئەم سنوورە لەچەك داماڵن، ئەوسا منیش بێ گفتوگۆ، هەرچی سیلاحم هەبێت، پێشکەش بەدەوڵەتی دەکەم یا ئەوەی کەسێکی وەك ئاسفی ئەعزەم، بەڵێن بدات و دڵنیام بکاتەوە، ئەوسا خۆم و بنەماڵە ڕوودەکەمە شار و سیلاحەکەم تەسلیم دەکەم. بەڵێن و وادەی سەرۆکی سوپاکان لای من گرنگ نییە. ئەمڕۆ سەرۆکێك بەڵێنم پێ دەدات و بەیانی دەڕوات ویەکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە و گرنگی بەبەڵێن و وتەکانی سەرۆکی پێش خۆی نادات و من بەهەموو کارێکی نەشیاو و دژوار ناچار دەکات. جیاواز لەم دوو شێوە ئەگەر دەزانن دەوڵەت هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەی نییە، چیتر جگە لەکۆچ کردن بۆ وڵاتێکی دیکە هیچ ڕێگە چارەیەکی دیکەم نییە. وەك خۆم نیگەرانی دەسەڵاتی شای شاکان، (ڕۆحم بەفیدای بێت) نیم و بەرەحم و بەزەیی بەرێزیان هیوادارم بەڵام لەلێپرسراوان دڵنیا نیم و لەهەڵس و کەوت و کردەوەکانی ئەوان دەترسم و بەهیچ شتێکی ئەوان ناتوانم باوەڕم هەبێت چوونکە بەچاوی خۆم دەبینم هەرکەس گوێڕایەڵی خۆی نیشان بدات، لێپرسراوان بۆ بەرزکردنەوەی پلە و پێگەی خۆیان بەدبەخت و ڕیسوای دەکەن بەهەمان شێوە کەڕەزاوییەکان بەحەز و خواستی خۆیان هاتن و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا، بەڵام

لێپرسراوان بۆ بەرز کردنەوەی پێگە و پایەی خۆیان ئەوانیان وەك یاخی و ئاژاوەچی لەقەڵەمدا و زیندانییان کردن و دوای گەیشتنی نیشان و بەرزبوونەوەی پلەی ئەوان، ئازادیان کردن. بۆ مەحمودخانی دزڵی سوێندیان بەقورئان خوارد و بەڵێنیان پێدا. کوڕەکەیان برد تا نیشان و پێگەی پێ ببەخشن. لەناکاو شەوانە هێرشیان کردەسەر و دەربەدەر و ئاوارەیان کرد. دوای قورئان ئیتر من باوەڕ بەچی بکەم. بەسەری بەڕێزتان تا بەتەواوی دڵنیا نەبم، ناوێرم سیلاح لەخۆم دوور بکەمەوە، ئیتر خۆتان خاوەن دەسەڵاتن. ئەگەر دەوڵەت، منی بۆ نۆکەری و خزمەتگوزاری پێویستە، دەبێت هۆکارەکانی دڵنیایی من ئامادە بکات و کەسێکی وەك ئاسفی ئەعزەم دڵنیایم پێببەخشێت تا سیلاح دابنێم. زیاد لەمە، هیوای ژیانێکی بەختەوەرتان بۆ دەخوازم (یا ئیمام جەعفەری سادق).

## جوانرۆ

ئەم شارە لەباشوری ڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. بەواتایەکی دیکە لەنێوان قیبلە و باشور، بەدووری شانزە فەرسەنگ لەشار، قەڵای جوانرۆ کەناوەندی میرنشینی ناوچەکەیە، لەهەر لایەکەوە شەش فەرسەنگ لەسنوری ناوچەکە دوورە. قەڵای ئەو ناوچە لەسەر دەستی ئەمان الله خان لەساڵی ١٢٢٤ کۆچی بنیاتنراوە. قەڵایەکی بەهێز و تۆکمەیە. قەڵاکە لەشوێنێکی بەرز جێگیرە کەنزیکەی بیست زەرع بەرزتر لەئاستی گوندەکەیە. لەم قەڵایەدا بینایەکی بەرز دروستکراوە، ئاویان لەکوێستانی ڕۆژهەڵاتەوە هێناوەتە سەد هەنگاوی قەڵاکە و لەو شوێنەدا، ئیستەخرێکی گەورەیان دروستکردووە، لێرەوە ئاویان بردۆتە ناو قەڵاکە، باخێکی دروستکردووە کەداری فراوانی تیایە بەتایبەت داری بەهێ. تەنانەت دار بەهێکانی ئیسفەهانیش هاوشێوەی ئەو دارانە نییە. قەڵای ئامارژە پێدراو لەبەر کەمتەرخەمی فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچەیە بەرەو وێرانی دەڕوات. لەزەمانی ناسرئەلدین شا، میرزا نەسرولله خانی سەرتیپی ئەندازیار راسپێردرا قەڵایەکی دیکە لەنزیکی ئەو قەڵایە دروست بکات بەڵام پێش ئەوەی کۆتایی پێ بێنێت، دەگەڕێتەوە.

کەش و هەوای جوانرۆ باش نییە، جۆگەلەیەکی ئاو لەناوەڕاستی ئاوەدانییەکەوە بەرەو باشور دەڕوات. لای قەلا کۆنەکە کانییەك دەبینرێت و لەبەردەم کانییەکە گەرماوێك کەدانیشتووانی ئەو ناوچەیە کەڵکی لێوەردەگرن. چوار مزگەوت و دوو خانەقای تیایە. دانیشتووانەکەی سوونی و شافعی مەزهەب و شوێنکەوتەی تەریقەتی نەقشبەندین.

دەستەیەك لەزاناکان لەم ناوچەیە دەژین کە بەسدیقی بەناوبانگن یانی رەچەڵەکی خۆیان بۆ ئەبوبەکر سدیق دەگەڕیننەوە. خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی مەلا باشی (نصیر الاسلام) لەوانە.

جوانرۆ لەرۆژئاواوە پەیوەستی بەخاکی شارەزوور، لەباشورەوە بەزەهاوی کرماشان، لەرۆژهەلاتەوە بەگوندەکانی ڕەوانسەر و لەباکورەوە بەهەورامانی لهۆن. زیاتر لەسەد گوند لەم ناوچەیەدا هەیە و زۆربەی گوندەکانی جەنگەڵی هەیە. یەکێك لەگوندە بەناوبانگەکانی جوانرۆ، پاوەیە کەعەرەبەکان پێی دەڵێن فاوج. پێنج مزگەوتی هەیە کەدەستەیەکیان قەدیمی و بەمزگەوتی عەبدوللە کوڕی عومەر ناسراون. چەندین زانا و بیرمەندی گەورە لەپاوە سەریان هەڵداوە. لەنزیك پاوە سەرچاوەیەکی ئاو هەیە ناسراو بەسەراوهوڵی. شوێنێکی دڵگیرە. ئاوایی پاوە و دەوروبەری، لەئاوی ئەو سەرچاوە و ڕووبارەکەی کەڵك وەردەگرن. سەرچاوەی ڕووباری ئەو ناوچەیە، کوێستانی ئەم ناوچەیەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی زیاتر لە١٥ هەزار کەسە.

جۆرەکانی بەرهەمی هاوینە و زستانە وەك گەنم، جۆ، گەنمەشامی، هەرزەن، نۆك، نیسك، کاڵەك، شوتی، توتن و هتد لەم ناوچەیە بەرهەم دێت. هەنار، هەنجیر و بلاَلوکی ئەو ناوچەیە بەناوبانگە.. گەزۆ و هەنگوین و بنێشت و کەتیرەی زۆر لەو ناوچەیە بەرهەم دێت و ساڵانە هەناردەی دەرەوە دەکرێت. شتێك کەتایبەت بەم ناوچەیە و ناوچەکانی سەردەشتە، هەنگوینی شای بەدرەمە کە لەئێران جگە لەم دوو شوێنە، لەهیچ شوێنێکی دیکە دەستناکەوێت.، هەنگی ئەم هەنگوینە لاوازتر و باریکتر لەهەنگەکانی دیکەیە و هیچ کات ماڵی نابێت. لەبیابانی کەم ئاو و لەزەوی ڕەق هێلانە دەکات. کونەکەیان نزیکەی نیو زەرع قووڵە. ئەم هەنگە لەویٚ شانەی هەنگی بچوك بەئەندازەی بەری دەستێك بەجێدێڵێت. هەنگوینی شا بەدرەم هاوشێوەی هەنگوینی ئاسایی ناشیرین نییە. دانیشتووانی پاوە چەقۆ و قامچی باش دروست دەکەن. ماڵیاتی پاوە ٤٠٩٨ تمەنە.

ئەشکەوتی کاوات لەشوێنەوارەکانی ناوچەی جوانرۆیە. ئەم ئەشکەوتە بەڕواڵەت وا دەردەکەوێت وەستایەکی کارامە دروستی کردبێت. شێوەکەی هیلالییە، تاقێکی گەورە بەرەو باشور دەبینرێت کەزارەکەی گەورەیە و هەرکەس دەتوانێت بەئاسانی بڕواتە ناو تاقەکە. لەکاتی ڕۆشتن بۆ تاقەکە خل دەبنەوە بەشێوەیەك گومان دەکرێت لەبنەمادا

پلیکانەیە و بەتێپەڕینی کات پلیکانەکان خراپ بوون بەڵام لەئێستادا بەدژواری کەسێك دەتوانێت بڕواتە خوار. کاتێك دەگەنە ناوەڕاستی ئەشکەوتەکە، لەسەقفەکەی هێمای دوو باڵەخانە دیارە کە لەبەرد دروستیان کردووە. کاتێك دەگەنە کۆتایی ئەشکەوتەکە، دوو هەنگاو دوور لەدیوارەکە، جۆگە ئاوێکی گەورە بەپانی دوو بەرد، لەزەوی ئەشکەوتەکە گوزەر دەکات. زەوی ئەشکەوتەکە لەبەرابەر باشورە. ئاو لەکونێکەوە هاوشێوەی دەمی کانی دێتەدەر و دەرژێتە ناو کونێکی دیکە. ئەم دوو کونە یەکیان لەڕۆژئاوا و ئەوی دیکەیان لەڕۆژهەڵاتە. ئاو کەلەوێ دێتەدەر، لەناو تاقەکەدا ون دەبێت. کەمێك لەخوارەوەی تاقەکە، ڕووبارێکی بچووك لەکونێکەوە دێتەدەر. هەرچەندە گەشتیارەکان هەوڵیانداوە بڕۆنە ناو ئەو کونە، دوای ئەوەی ماوەیەك ڕۆشتوونەتە پێش، بەڵام ترساون و گەڕاونەتەوە.

ڕەوانسەریش سەر بەم شارەیە. گوندی ڕەوانسەر کەناوەندی ناوچەکەیە، لەداوێنی چیایەکی سروشتی جێگیرە کە یەکێکە لەلقەکانی شاهۆ. لەژێر ئەم لووتکە، لەڕۆژهەڵاتەوە، تاقێکی بچوك هەیە هاوشێوەی تاق وەك بڵێی لەچیاکە داتاشرابێت کە بەتاقی فەرهاد ناسراوە. دەڵێن فەرهاد دوای دروستکردنی تاقی بۆستان لەکرماشان، هاتۆتە ئەو ناوچە و ویستوویەتی تاق و شوێنەوارێکی هاوشێوە لەوێ وەك یادگار بەجێبێڵێت بەڵام لەئەنجامی ئەو لەمپەرانەی ڕووبەڕوویان بۆتەوە بەمەبەستەکەی نەگەیشتووە. لەڕۆژئاوایی ڕەوانسەر، نزیك گوندی گەرمەخانی، کانیاوێك هەڵدەقوڵێت کەسەرچاوەی ڕووباری قەراسوی کرماشانە. تاشەبەردێکی گەورە و تەختی لێیە کە بەتەختی زەنگی بەناوبانگە. ئەو داستان و حکایەتانەی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە دەیگێڕنەوە، ئەفسانەیە و شیاوی باس کردن نییە. بەمدواییانە گوندی ڕەوانسەر بۆتە شوێنی نیشتەجێ بوونی حسەین خان و عەباس خان (سەرداری ڕەشید) کوڕەکانی عەلی خانی حاکم، نەوەی عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك. لەکاتی هاتنی ئەبولفەتح میرزای سالار ئەلدەولە بۆ کوردستان، پەیوەستی بووە و کەم کەم دەسەڵاتیان زیادی کردووە. پێشتر حسەین خان، حەمیدە خان کچی سلێمان خان مامی خۆی کەدەزگیرانی عەباس خان بووە، مارە کردووە و پێگەی سەرۆکایەتی ناوچەکەیشی بەدەستهێناوە. ئەم کارانە کاریگەری لەسەر عەباس خان داناوە و بەردەوام چاوەڕوانی دەرفەت بووە تا تۆڵە بستێنێتەوە. تا ئەوەی لەکاتی هاتنی سالار ئەلدەولە و بەڕێکەوتنی ئەو بۆ تاران، هەردوو براکە هاوشێوەی پێشەنگی جەنگ، هێرشیان کردۆتە

سەر سوڵتان ئاوای عێراق و دەستی بەسەردا دەگرن. عەباس خان بەشێوەیەکی نهێنی لەدەرمان خانەی ئەو ناوچەیە بڕێك ژەهر وەردەگرێت و لای خۆی هەڵیدەگرێت. لەکاتی شکستی سالار ئەلدەولە لەباغی شا، لەڕێگە ژەهرەکە دەکاتە ناو قاوەی حسەین خان و دوای دوو سێ کاژێر حاڵی حسەین خان خراپ دەبێت و دەست بەڕشانەوە دەکات. دوای گەیشتن بۆ ڕەوانسەر، دوو ڕۆژ لەجێگەدا دەکەوێت و دواتر دەمرێت. سەرئەنجام سەرداری ڕەشید سەرۆکایەتی ناوچەکە بەدەست دێنێت و حەمیدە خان، دەزگیرانی پێشووی خۆی کەحسەین خان مارەی کردبوو، دووبارە دەکاتە هاوسەری خۆی. ماوەی دە ساڵ بەخت و شانس هاوڕێیەتی دەکات بەڵام دواتر بەدبەختی باوەشی بۆ دەکاتەوە و پەردە لەسەر نەزانی ئەو هەڵدەگرێت و شەریف ئەلدەولەی فەرمانڕەوای کوردستان، قۆڵبەست کراو، ڕەوانەی تارانی دەکات.

## کلاترەزان

یەکێکی دیکە لەناوچەکانی کوردستان، ناوچەی کلاترەزانە. لەڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. بەدووری فەرسەنگێگ تا هەشت فەرسەنگ درێژی خاکی ئەم سنوورەیە. ٦٤ گوندی هەیە و زۆربەی گوندەکانی بەجەنگەڵی سروشتی و دار و ڕەز داپۆشراوە و شوێنێکی تایبەت بۆ لێپرسراوی دەوڵەت دیاری ناکرێت. لەبەر ئەمە لێپرسراو بەگوندەکاندا دەگەڕێت. بەرهەمی ئەو ناوچەیە گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، ترێ، هەنار و جۆرەکانیتری میوەی دارەکانە. کەتیرا لەم ناوچەیە بەفراوانی دەستدەکەوێت.

ژمارەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە زیاتر لەدەهەزار کەسە. گوندەکانی پشت بەناوی ڕووبار و سەرچاوەکان دەبەستێت. ماڵیاتەکەی ٢٨٦٢ تمەنە. دانیشتووانەکەی هەموویان سوونی و شافعی مەزهەبن. زۆربەی گوندەکانی مزگەوتی هەیە. یەکێك لەگوندە بەناوبانگەکانی نێگڵە. لەم گوندەدا مزگەوتێکی قەدیمی دەبینرێت کە بەمزگەوتی عەبدوڵڵەی عومەر یا عەبدوڵڵەی عیمران بەناوبانگە. قورئانێك لەم مزگەوتەدا هەیە. قورئانێکی گەورەیە و وەرەقەکانی ئەستورە و بەخەتی کوفی نووسراوە. دووایین وەرەقەی قورئانەکە دیار نییە و کەس نازانێت کێ نووسیویەتی. هاوشێوەی ئەم قورئانە دوو قورئانی دیکە لەمزگەوتی ئەیا سوفیەی ئەستانبۆل دەبینرێت. دەڵێن یەکیان خەتی عوسمان کوڕی عەفانی خەلیفەی سێیەم و ئەوی دیکەیان خەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

## کەرەوز

ئەم شارە بەدووری دە فەرسەنگ لەڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە. دانیشتووانی ئەم ناوچەیە سەر بەتایەفەی کۆماسین. هەموویان بوێر و جەنگاوەرن.
ئەم بەشە بیست گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی ٢٥٠٠ کەس و ماڵیاتەکەی ٢٥٠ تمەنە. ئەم ناوچەیە بەرهەمێکی زۆری نییە. تەنیا بەئەندازەی پێویستی دانیشتووان گەنم، جۆ و گەنمە شامی بەرهەم دێنن. بەم دواییانە دەستیان بەبەرهەم هێنانی توتن و لۆکە کردووە.

## ژاوەرۆ

ژاوەرۆ لەباشوری شار، بەدووری چوار فەرسەنگ جێگیرە و ٨٥ گوندی هەیە. دانیشتووانی ئەم ناوچە خەڵکانێکی زەحمەتکێشن. هەموویان سەرقاڵی خواپەرەستین. لەهەر گوندێك، مزگەوتێك و ماڵێك بۆ نوێژ و غوسڵ بوونی هەیە. لەژێر سێبەری هەر دارێك و لێواری هەر سەرچاوەیەك، بەردە نوێـژێك روەو قیبلە دانراوە. مزگەوتەکانی ئەم ناوچەیە کۆن و بۆ عەبدوللە کوڕی عومەر دەگەڕێنەوە (دەستەیەك عەبدوللە کوڕی عیمران ناو دەبەن). ئەم ناوچەیە، ناوچەی دارستانی چنار و باخی ترێ و داری قەیسییە. جۆرەکانی دار وەك گوێز، بەهێ، سێو، بلاڵوك و هتد لەم ناوچەیە بەرهەم دێت. گەنم، جۆ، هەرزن، گەنمەشامی و هەموو بەرهەمەکانی هاوینە و زستانە لەم ناوچەیە بەردەوام بەرهەمدێت. زەوییەکانی ئەم ناوچەیە بەسەرچاوە و کارێزەکان تێراو دەبن. دانیشتووانی ئەم ناوچەیە زیاترە لەدە هەزار کەس. ماڵیاتەکەی ١٣١٤ تمەنە. گوندی بێساران یەکێکە لەگوندەکانی ئەم ناوچەیە. لەوێ کەسێك بەخاك سپێردراوە ناسراو بەبابا شێخ. ناوی شێخ عەلییە. برای شێخ نیعمەت اللەی وەلی کە بەشا نیعمەت الله ناوی دەبەن. کوڕی شێخ زەکەریایە. بەمپێیە بابا شێخ بێساران لەسەییدەکانی حەسەنییە بەڵام خوالێخۆشبوو سادق ئەلمولك لە (حدیقەی ناسری) ڕەچەڵەکی ئەو بۆ ئیمام حسەین دەگەڕێنێتەوە. بەمپێیە: سەیید عەلی کوڕی حاجی سەیید عیسا کوڕی سەیید عەبدولعەزیز کوڕی سەیید ئیسحاق کوڕی سەیید مەنسور کوڕی سەیید یوسف کوڕی سەیید عەلی کوڕی سەیید ئیسماعیل کوڕی ئیمام موسای کازم کوری ئیمام جەعفەری سادق کوڕی ئیمام محەممەدی باقر کوڕی ئیمام زەین ئەلعابدین کوڕی ئیمام حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە.

### پلنگانی، بیلوار، ئەمیرئاوا

ئەم سێ ناوچەیە بەهۆی نزیکی لەیەک، وەك یەك ناوچە لەقەڵەم دەدرێن. بەدووری هەشت فەرسەنگ تا دوانزە فەرسەنگ لەباشوری ڕۆژئاوا تا باشوری ڕۆژهەڵات جێگیرە. سی و پێنج گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی ٤٥٠٠ کەسە. ماڵیاتەکەی ١٢٣٦ تمەنە. زەوییەکانی لەسەرچاوە و ڕووبارەکان تێراو دەبن. هەموو جۆرە میوە و بەرهەمێکی هاوینە لەم ناوچەیە بەرهەم دێت.

### حەسەن ئاوا

گوندی حەسەن ئاوا کەناوەندی ناوچەکەیە، لەیەك فەرسەخی شارەکە جێگیرە. لەساڵی ٧٤٦ کۆچی، میر حەسەنی ئەردەڵان بناغەی داڕشتووە. لەسەر چیایەکی بەرز کە لەباشوری گوندەکەیە، قەڵایەکی بەهێزی وەك ناوەندی حکومەتەکەی خۆی دروست کردووە کە بەتێپەڕبوونی کات وێران و لەناو چووە. هەڵۆخانی ئەردەڵان، فەرمانڕەوای کوردستان، لەسەرەتای سەدەی دەی کۆچی نۆژەنی کردۆتەوە و ئەو قەڵای کردۆتەوە ماڵی هاوینەی خۆی. بەمدواییانە سلێمان خانی ئەردەڵان، فەرمانڕەوای کوردستان، لەناوەڕاستی سەدەی یانزەیەمی کۆچی ١٠٤٨، وێرانی کردووە و ئەو ماڵەی بۆ شاری سنە گواستۆتەوە و لەئێستادا بەسنەدژ بەناوبانگە. ئەم ناحیە لەکەنار شارەوە حەوت فەرسەنگ درێژە. دوو لقی ڕووبار لەم ناحیەدا هەیە. یەکیان ڕووباری قشلاق و ئەوی دیکەیان ڕووباری گاوەڕوود. ئەم ناحیە ٣٢ گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی ٥٥٠٠ کەسە. ماڵیاتەکەی ٢٤٠٠ تمەنە. هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك و میوەکانی هاوینە لەم ناحیە بەرهەم دێت. باخی فراوانی هەیە. زەوییەکانی لەکانی و ڕووبارەکان تێراو دەبێت. یەکێك لەگوندەکانی ئەم ناحیە گوندی پیرمقدادە. مزگەوتێکی کۆن لەم گوندەدا هەیە. کەسێك لەدەرەوەی مزگەوتەکە و لەڕۆژهەڵاتی بەخاك سپێردراوە کەدەڵێن میقداد کوڕی ئەسوەدە. گۆڕەکەی بۆتە زیارەتگای سەردانکەران.

### لەیلاخ

لەیلاخ یا لەیلاغ یا ئیلاق لەڕۆژهەڵاتی شار جێگیرە. لەدوو فەرسەخی شار تا هەشت فەرسەنگی شار، درێژی خاکی ئەم ناحیەیە. هەشتا گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی زیاترە لەدوانزە هەزار کەس. ماڵیاتەکەی ٣٦١٤ تمەنە. زەوییەکانی لەکارێز و ڕووبارەکان

تێراو دەبن. باخ و دارستان لەم ناوچەیە کەمە. بەرهەمەکانی زیاتر گەنم، جۆ، نۆك، نیسك و لۆکەیە. ئەم ناحیە ساردە. زۆربەی گوندەکانی ئەو ناوچەیە لەماوەی نۆ مانگدا ناتوانن بێ ئاگر شەوەکانیان بەسەر ببەن.

**ئیسفەندئاوا**

ئیسفەندئاوا کە لەکۆندا بەسنوری عەلی شەکەر ناو براوە، لەکۆتایی ناحیەی لەیلاق و بەدووری دوانزە فەرسەنگ لەرۆژهەلاتی شارەکە جێگیرە. ناوەندی حکومەتەکەی لەکۆندا گوندی قسلأنە کەئەمان الله خانی گەورە، فەرمانڕەوای کوردستان، قەلاً، بینا، مزگەوت، گەرماو و باخ و جەنگەڵێکی گەورەی لەو ناوچەدا دروستکردووە. بەمدواییانە خاوەنەکەی بێ رەچاو کردنی هیچ شتێك، قەلاً و بیناکەی وێران کردوە. لەگەرماوەکەیش تەنیا شوێنەوارێك بەجێماوە. کانی بەردی مەرمەڕی کوردستان لەو ناوچەیە کەهەموو بەردە مەرمەڕەکانی قەلأی حکومەتی شارەکە و مزگەوتی دارئەلئیحسان و زۆربەی بینا و گەرماوەکانی شار لەوێوە هاتووە. خاوەنەکەی خۆڵی بەسەرا کردووە و داپۆشیوە تا کەس کەڵکی لێوەرنەگرێت. ئەم ناحیەیە ٩٤ گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی چواردە هەزار کەسە. هەموو جۆرە بەرهەمەکانی هاوینە و زستانە لەو ناوچەیە بەرهەم دێت. یەکێك لەگوندەکانی ئەو ناوچەیە گوندی باوەگرگڕ (باوە گورگوڕە). شوێنەواری سروشتی زۆر لەو ناوچەیە دەبینرێت. لەسەر تەپۆڵکەیەك ڕووبەڕووی گوندەکە، تەنورێکی گەورەی قووڵ دروستبووە، لێورێژە لەئاوی کانی، دەورەکەی نزیکەی دووسەد پێ دەبێت. بەردەوام ئاوەکەی قوڵت دەدات. ڕەنگی ئاوەکەی زەردی لیمۆییە هاوشێوەی ئاوی قوڕاوی. دانیشتووانی ئەو ناوچەیە و دەوروبەرەکەی لەبەر ئەوەی تورکن، ئەو حەوزە بەدەنگز ناو دەبەن یانی دەریا. گومان دەکەن لەژێر ئەو تەپۆڵکەیە دەریایەکی قووڵە و بەردەوام هەڵدەقوڵێت. لەخوارەوەی ئەو دەنگزە، کاتێك بەرەو ڕۆژهەلات دەڕۆن، دوو تەنوورەی دیکە هاوشێوەی تەنوورەی یەکەم دەبینرێت بەلأم وشك و بێ ئاو. لەبەڵگەکان دەردەکەوێت لەکۆندا ئەو دوانەیش ئاویان تیا بووە و بەتێپەڕینی کات وشکبوون. لەڕۆژهەلاتی دەنگزەکان، شوێنێك بەرچاو دەکەوێت کەلای باکوری کونێك و بەردەوام بای لێوە دێت. ئەگەر پارەیەکی ئاسن بخەنە ناو ئەو کونە، دوای چەند خولەك، بایەکی توند فڕیدەداتەدەر. لەباشوریشی، کونێکی هەیە کە لەناو کونەکەدا ئەشکەوتێکی پڕ ئاو دەبینرێت و هاوشێوەی

مەشکە دەنگی لێوە دێت و بۆنی گوگردی لێ هەڵدەستێت. (هەموو ئاوەکانی ئەم تەپۆڵکەیە بۆنی گۆگردیان لێدێت) ئەم کونە بەکونی مەشکە ناو دەبەن و سەرچاوەی ناونانی ئەم ناوچەیە بەباوە گرگر ئەم کونەیە چوونکە بەردەوام با و دەنگی گرگری لێوە دێت کە لەکوردیدا بەمانای بایە. حکایەتی مار و دوو لەت کردنی و شەڕی قۆچە بەردینەکان لەشەوانی هەینی ودروست کردنی قوربانی و ئارامگا و دورستکردنی سەیید جەمال ئەلدین ناوێك و شتەکانی دیکە.... ئەفسانە و دوورن لەڕاستی جگە لەتێکەڵ بوونی ئاو و مادە سوێرەکان و دروستبوونی هەڵم، هیچی دیکە لەوێ نییە و ئەم حکایەتانە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکان دروستکراون. بەتایبەت ئەگەر بەوردی سەرنج بدرێت، دروستکردنی ئارامگای سەیید جەمال ئەلدین کە لەسەر تاشەبەردێك دروستکراوە و لەسەر کونی ئەشکەوتەکە جێگیرە و بەردەوام شەپۆل دەدات لەکاتێکدا ئەو تاشەبەردە قەبارەیەکی ئەوتۆی نییە بتوانێت جێگەی گۆڕ و دفن کردنی مردووێکی تیا ببێتەوە.

لەدەوروبەری ئەم ناوچەیە و لەچەند شوێنێکی دیکە، چەند سەرچاوەیەکی دیکە بوونیان هەیە کەئاوەکەیان سوێر و بۆنی گۆگردی لێدێت و ئاوی ئەم سەرچاوانە بەهەر شوێنێکدا بڕوات، جۆگەیەکی باریك دروست دەکات کەحکایەتی مار و دوو لەت بوونی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. ئاوی ئەوێ بۆ چەندین نەخۆشی وەك خووڕانی لەش و هتد سوودی هەیە.

### حسەین ئاوا

ناحیەی حسەین ئاوا لەباکوری شارەکە جێگیرە و ناوەندەکەی گوندی حسەین ئاوایە کە لەپێنج فەرسەخی شارەکە جێگیرە. ئەم ناحیە ٣٤ گوندی هەیە و ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی پێنج هەزار کەسە وماڵیاتەکەی ١٢٩٦ تمەنە. بەشی زۆری ئەم ناحیە سەر بەقەرەتۆرە و ساراڵ و هوباتووە و لێپرسراوی دەوڵەتی تایبەتی بۆ دانانێن.

### ساراڵ، هوباتوو، قەرەتۆرە

ئەم سێ ناوچەیان بەیەك ناحیە هەژمار کردووە، لەباکوری شار جێگیرە بەدووری دە فەرسەنگ تا دوانزە فەرسەنگ. ٨٢ گوندی هەیە. هوباتوو کەیەکێکە لەسێ ناوچەکە، کەش و هەوایەکی ساردی هەیە و بەزۆری لەبەر بەفر و سەرما، چوار مانگ ڕێگەکەی دەبەسترێت. ئەم ناوچەیە لەبەهار و هاوین، بەجۆرەکانی گوڵ و ڕێحانە دادەپۆشرێت و لەباشترین

شوێنەکانی کوردستانە. ناوچەیەکی بەرزە و زەوییەکانی تەختە. سەرچاوەی ئاوی شیرین لەم سەرزەمینە فراوانە. دانیشتووانی تیلەکۆ بەهۆی نزیکی، بەردەوام هاوینان و بەهاران لەو ناوچەیە بەسەر دەبەن. پانی و درێژییەکەی دە فەرسەنگە. ژمارەی دانیشتووانەکەی دەگاتە دوانزە هەزار کەس. تایەفەکانی مەندەمی و گوڵ باغی لەم سێ ناوچە دەژین. هەموو جۆرە بەرهەمێکی هاوینە و زستانە لەم ناوچەیە بەرهەم دێت. دار و جەنگەڵ لەم سەرزەمینە نابینرێت. زەوییەکانی لەکانی و ڕووبارەکان تێراو دەبن. ڕووباری قزل ئەوزەن (ناوێکی تورکییە) بەم ناوچەیە تێدەپەڕێت. ماڵیاتەکەی ٢٨٢٢ تمەنە. شێخ عەبدوللە کوڕی خوالێخۆشبوو حسەینی مەردۆخی لەم ناوچەیە دەژین. کەسێکی زانا و خۆشنووس و کردار جوانە.

### کەرەفتوو

ناحیەی کەرەفتو، بەدووری هەژدە فەرسەنگ لەباکوری شاری سنە جێگیرە و ١٥ گوندی هەیە. لەکۆندا سەر بەسەقز بووە. بەم دواییانە دەرکەوتووە جگە لەگەنم و جۆ هیچ بەرهەمێکی دیکەی نییە. ژمارەی دانیشتووانەکەی نزیکەی ١٦٠٠ کەسە., لەم ناوچەیەدا ئەشکەوتێکی نامۆ هەیە ڕوەو باشور کە لەبەرد داتاشراو و هێز و توانای مرۆڤ نیشان دەدات. ئاشکرا نییە کێ دروستی کردووە و لەچ مێژوویەکدا دروستکراوە. شوێنەواری سەرنجڕاکێش لەم ئەشکەوتەدا فراوانە و کەس تا ئەمڕۆ نەگەشتۆتە کۆتایی قەڵاکە. سەرەتا کاتێك کەسێك بەرەو باکور دەڕواتە ناو ئەم ئەشکەوتە، وەك هێڵێکی ڕاست بەرچاو دەکەوێت. چەند کونێکی لەملاولادا هەیە، لای ڕاست بەچرا دەڕواتە ناو کونێك و دەگاتە ژوورێکی بچوك کەستوونێکی بەردین لەناوەڕاستەکەیدا دەبینرێت. ئێستا ئەو ستوونەیان شکاندووە. تەنیا کەمێك لەبەشی خوارەوە و سەرەوەی ستوونەکە ماوەتەوە، لەوێوە دەگاتە ژوورێکی دیکە و لەوێ دەڕواتە ناو ژوورێکی پان و بەرین کە لەڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و باشورەوە، لەکون و دەلاقەکان ڕووناکی دێتەژوور، لەوێ دەگەڕێتەوە و ڕوودەکاتە ڕۆژهەڵات، بەچەند پلیکانەیەك سەردەکەوێت و دەگاتە ژوورێك، دەرگایەك و دوو دەلاقەی بەرەو باشور هەیە، لەوێوە دەگاتە ژوورێکی دیکە و لەو ژورەیشەوە دەگاتە ژووری سێیەم کە بەشی باشورەکەی وێران بووە و ڕووناکی بێ هیچ لەمپەرێك دەگاتە ئەم ژوورە. هەموو ئەم ژوورانە لەبەرد داتاشراون و شارەزایی و کارامەیی زۆری تیا بەکار براوە، هەموویان

رووناکن. لێرەوە دەگەڕێتەوە دووبارە لەهەمان کونی یەکەم کەئامازەمان پێدا، لەلای ڕاستەوە گەشتەکەی دەستپێدەکات، کەمێك بەرەو ڕۆژهەلأت و دواتر ڕوو دەکەنە باکور. لای ڕاست گۆڕێك دەبینرێت ناسراوە بەگۆڕی ساری بابا، چەند هەنگاو دوورتر، دەگەنە گۆڕەپانێکی تەڕ، نزیکەی بیست زەرع. لەبیستەمین زەرع، داردەستی زۆر لەسەر زەوی کەوتووە. دەڵێن هەرکەس لەکاتی گەڕانەوە کەدەگاتە ئەم شوێنە، ئەگەر داردەستی بەدەستەوە بێت، دەبێت فڕێبدات. لەم شوێنەدا سنوقێك هاوشێوەی تابووت دروستکراوە، کەلەی مرۆڤێك و ئێسك و پروسکەکانی لەناو ئەو سنوقەدایە. تا ئێرە دەتوانرێت بەئاسانی ببینرێت. ئەگەر بیانەوێت لێرە بەدواوە بڕۆنە پێش، لەدەرگایەکی زۆر بچوکەوە دەڕۆنە ناو ژوورێك کەئەویش لەبەرد داتاشراوە. لەم ژوورەدا چەند دەرگایەك بەرچاو دەکەوێت و کەسە لەهەر دەرگایەکەوە بخوازێت، چرا بەدەست دەڕوات و دەگاتە ژوورەکانی دیکە. لەو ژوورانەیشدا شتی دیکە دەبینێت. کەسەکان ئەگەر وردە کا یا شتێکیان پێ نەبێت تا وەك نیشانە لەسەر زەوی بیڕێژن، لەکاتی گەڕانەوە، ڕێگە ون دەکەن و سەرگەردان دەبن. بۆ ئەم گەشتە ژێرزەمینییە، جگە لەچرا و کا، توێشوو و خواردنی زۆریش پێویستە چوونکە دەبێت چەند ڕۆژێك بمێنیتەوە تا بتوانێت هەموو بەشەکانی ببینیت.

خوالێخۆشبوو ڕەزا قولی خان، فەرمانڕەوای کوردستان، جارێك لەگەڵ دەستەیەك و خواردنی پێویست مەبەستی ئەم گەشتە دەکەن و کەمێك دەڕۆنە پێش و کاتێك دەزانن ناگەنە کۆتایی ئەم شوێنە، ناچار لەترسی ون کردنی ڕێگە و کۆتایی هاتنی خواردەمەنی، دەگەڕێنەوە. ئەوەی زیاتر لەهەر شتێك سەرنجی کەسەکان رادەکێشێت، یەکێك لەو دەرگایانەیە کەدوای ماوەیەك ڕۆشتنە پێش، بەبازارێك کۆتایی دێت هاوشێوەی بازاڕی ئاسنگەران. شیشەکانی ئاسن (چارەکێك پانی و زەرعێك درێژی) لەوێ کەتووە و ڕزاون. هەروەها چەندین بازاڕی دیکەیش دەبینرێت هاوشێوەی بازاڕی بەزازەکان کە لەحوجرەکانیدا (دوکانەکان) قوماش و کەل و پەلیان داناوە. کاتێك دەستی لێدەدەن، لەبەر ئەوەی ڕزاوە، هەڵدەوەرێت و دەبێتە تۆز. لەهەندێ شوێن حەوز دەبینرێت. لەشوێنەکانی دیکە شتی سەرنجڕاکێشی دیکە دەبینرێت کەمرۆڤ سەرسام دەکات. بۆ هەر کەسێك خاوەن هەست و زەوق، گەشتێك بەم شوێنەدا بەسە تا هێز و توانایی مرۆڤ ببینێت و بزانێت مرۆڤ چەندە کاری سەرسوڕهێنەر دەتوانێت ئەنجام بدات. لەچیای بەرابەر ئەم بینایە، سێ

پەیکەری دوورنما لەبەرد دروستکراوە، دوو پەیکەری لای چەپ ماونەتەوە، یەکیان شێوەی پیاوێکی سەر ڕووتە و ئەوی دیکەیان پەیکەری ژنێك کە لەتەنیشت یەکەوە دانراون.

**خوڕخوڕە**

ئەم ناحیە لەهەژدە فەرسەنگی شاری سنە جێگیرە لەنێوان باکور و ڕۆژئاوا. ۳۸ گوندی هەیە. لەکۆندا زیاتر لە ۹۰ گوند سەر بەم ناحیە بوون کە لەئەنجامی شۆڕشی عەشیرەکان و بارودۆخی پاشایەتی تایەفەکان، وێران و چۆڵ کراون. یەکێك لەگوندەکانی ئەم ناحیە، گوندی بستە کەهەشتا بنەماڵەی مسکێنی تیا دەژی. نزیکەی چوارسەد و بیست ساڵ پێش ئێستا بناغەی بۆ دارێژراوە.

کەسێك بەناوی شێخ ئیبراهیم لەو ناوچەیە بەخاك سپێردراوە کەگۆڕەکەی بۆتە زیارەتگای سەردانکەران. شێخ قادری بستی و شێخ حسەینی برای، لەمناڵەکانی ئەم شێخ ئیبراهیمەن. شێخ قادر لەگوندی بست نیشتەجێ بووە و شێخ حسەین لەئاوبارە. لەشێخ حسەین، شێخ شەمس ئەلدین بەجێماوە. لەشێخ شەمس ئەلدین، شێخ ئەحمەد و شێخ عەبدوللە چاویان بەدنیا هەڵهێناوە.

شێخ قادر شەش کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە:

۱. شێخ محەممەد، ۲. شێخ ئەحمەد، ۳. شێخ عەزیز، ٤. شێخ ئیسماعیل، ٥. شێخ سەعدی، ٦. شێخ محەممەد ئەمین.

لەشێخ محەممەد، شێخ عەلی بەجێماوە، خاوەنی ئیسحاق ئاوا.

لەشێخ ئەحمەد، شێخ مەحمود چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، خاوەنی توکلان، لەشێخ مەحمود، دوو کوڕ بەناوەکانی شێخ سدیق و شێخ نەجم ئەلدین چاویان بەدنیا هەڵهێناوە.

لەشێخ عەزیز، خاوەنی شەش دانگی شا قەلا و وەزمان و قاوڵ بەگ، سێ کوڕ بەجێماوە: شێخ حەسەن، شێخ شەهاب ئەلدین و شێخ عەبدوللە. لەشێخ حەسەن دوو کوڕ بەجێماوە: شێخ محەممەد و شێخ عەلی. لەشێخ شەهاب ئەلدین چوار کوڕ بەجێماوە: شێخ ئیبراهیم، شێخ عارف، شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ مستەفا. لەشێخ عەبدوللە، خاوەنی دۆڵی هەوان، کوڕێك بەجێماوە بەناوی شێخ محەممەد.

لەشێخ ئیسماعیل دوو کوڕ بەجێماوە بەناوەکانی: شێخ محەممەد ناسراو بەکاکە حەمە و شێخ قادر کە لەئێستادا لەبست دەژین و ژنێك بەناوی خاتوو ئامین هاوسەری شێخ شەهابی

ئاماژە پێدراوە.

لەشێخ سەعدی خاوەنی کەکە وەسان و وەرگێران کوڕێك بەناوی شێخ مەحمود چاوی بەدنیا هەڵهێناوە.

شێخ محەممەد ئەمین بێ ئەوەی منالّی بێت، مردووە.

یەکێکی دیکە لەگوندەکانی ناحیەی خوڕخوڕە، مەولان ئاوایە کە بەدووری شانزە فەرسەنگ لەباکوری ڕۆژئاوای سنە جێگیرە. گوندێکی بەناوبانگە و لەئێستادا پەنجا بنەماڵەی تیادەژی. شێخەکانی ئەو گوندە بەشێخەکانی مەولان ئاوا بانگ دەکەن کە لەمنالّەکانی حەسەنی مەولان ئاوایین کەکەسێکی خۆپارێز و خواپەرەست بووە. مەولانا گوشایش، گەورە باوەگەورێی مەردۆخییەکان، لای ئەو زانستە دینییەکان فێر بووە و لەساڵی ٨٢٣ کۆچی بۆ هەورامان گەڕاوەتەوە. گۆڕی شێخ حەسەن لەهەمان گوندە. گومەزێك لەسەر ئارامگاکەی دروستکراوە و زیارەتگای کەسانی دوور و نزیکە. دایکی، خاتوونێکی خواپەرەست و خۆپارێز بووە. بەوشێوەی دەڵێن: بێ دەستنوێژ مەمکی نەخستۆتە دەمی منالّەکانی و لەخواپەرەستی بەناوبانگ بووە.

لەبەر ئەمە زیارەتکەران، سەرەتا زیارەتی دایکی دەکەن و دواتر دەڕۆنە سەر گۆڕی شێخ حەسەن. گۆڕی دایکی لەدەرەوەی گومەزەکەیە.

ژمارەی دانیشتووانی خوڕخوڕە زیاتر لەهەشت هەزار کەسە. ماڵیاتەکەی ٣٩٠ تمەنە. ڕووبارێك کە لەم ناحیەوە بەرەو باکور دەڕوات، بەڕووباری خوڕخوڕە بەناوبانگە. بەرهەمەکانی ئەم ناحیە، گەنم، جۆ، هەرزن، گەنمەشامی، لۆکە و توتنە.

## تیلەکۆ

ئەم ناحیە بەدووری هەژدە فەرسەنگ لەنێوان باکور و ڕۆژئاوای شاری سنە جێگیرە و ٢٤ گوندی هەیە. ژمارەی دانیشتووانەکەی زیاترە لەچوار هەزار کەس. ماڵیاتەکەی ١٥٠٦ تمەنە.

زەوییەکانی ئەم ناحیە بەشێوەیەکی گشتی لەسەرچاوەکان تێراو دەبن و هەموو جۆرە بەرهەمێکی هاوینە و زستانەی وەك گەنم، جۆ، هەزرن، لۆکە، توتن، نیسك، نۆك، کاڵەك، شوتی و هتدی تیا بەرهەم دێت.

## بەندی سێیەم
## سەبارەت بەفەرمانڕەواکانی سنە، ئەردەڵانییەکان و ئەوانەی ئەردەڵانی نەبوون

### فەرمانڕەوا ئەردەلانییەکان

ئەردەڵان کۆی ئەردەڵە. تایەفەی وەلاتی کوردستان کە لەڕەچەڵەکی قوبادی ئەردەڵن، بەئەردەڵان لەقەڵەم دەدەن. ئەم قوبادەیان بەبابا ئەردەڵ ناو بردووە. گێڕانەوەی مێژوونووسان سەبارەت بەقوبادی ئەردەڵ جیاوازە. دەستەیەك نووسیویانە قوبادی ئەردەڵ، نەوەی ئاشەوانێکە بەناوی خوسرەو لەمەرو کەیەزدگێرد پاشای ئێران کاتێك لەساڵی ٣١ کۆچی لەسوپای عەرەبەکان شکستی خوارد، بەرەو مەرو هەڵات و ئەو خوسرەوەی ناسی. خوسرەو، یەزدگێردی لەناو ئاشەکەدا کوشت و لەزێڕ و سامانی ئەو پاشایە، دەسەڵاتی بۆ خۆی پێکەوەنا و بەهرامی کوڕی بەبازرگانی ناچار کردووە. دوای مردنی خوسرەو، بەهرامی کوڕی لەساڵی ٦٥ کۆچی، لەجەنگی موهەلیب کوڕی ئەبی سەفرە، فەرمانڕەوای خوراسان، لەگەڵ ئەزاریقە دەکوژرێت. قوبادی کوڕی لەساڵی ٨٦ دەبێتە یەکێك لەخزمەتگوزارە تایبەتەکانی قوتەیبەی فەرمانڕەوای خوراسان. کاتێك دەرکەوتنی ئەبوموسلیمی خوراسانی لەمەرو، یانی سەردەمی سەفاح ئەبولعەباس عەبدوللەی عەباسی، قوبادی لەساڵی ١٣٢ کۆچی لەگەڵ کەسەکانی خۆی لەمەروی خوراسانەوە بەرەو موسڵ کۆچاندووە. دوای ماوەیەك لەوێ دەسەڵاتی فراوان دەبێت و دەبێتە فەرمانڕەوای موسڵ و دیاربەکر. سەرئەنجام نەوەکانی هەموو ناوچەکانی شارەزوور دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و شەهری بازاڕ (شاربازێڕ) کەئێستا بەسلێمانییە ناسراوە، دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و دەست بەسەر عەمادیەیشدا دەگرن. تا ساڵی ٥٦٤ کۆچی، ئەردەڵانییەکان لەناوچەکانی شارەزوور فەرمانڕەوایەتییان کردووە و قەڵای زەڵمیان بۆ ناوەندی فەرمانڕەوایەتی خۆیان بنیاتناوە. بەم دواییانە پڵنگان کەناوچەی نیشتەجێبوونی تایەفەی کەڵهوڕ و گۆران بووە، کەوتۆتە دەستی ئەردەڵانییەکان و لەوێش قەڵایەکیان وەك ناوەندی فەرمانڕەوایەتی خۆیان دروستکردووە کەشوێنەوارەکەی لەگەڵ یەك تای دەروازە، کە لەتاشەبەردێکی گەورە دروستکراوە، هێشتا دەبینرێت. ئەردەڵانییەکان بۆ ماوەی ٤٢ ساڵ لەناوچەکانی پڵنگان

فەرمانڕەوایەتییان کردووە تا ئەوەی فەرمانڕەوایەتی کلۆڵ بەگ دەستپێدەکات.

دەستەیەکی دیکە لەمێژوونووسان، سەبارەت بەقوباد، سەرزنجیرەی ئەردەڵانییەکان نووسیویانە: لەساڵی ٥٩٨ کۆچی، شا مەنسور، فەرمانڕەوای دوشیک بەدەستی تورکمانەکان کوژرا، لەو چوار کوڕ بەجێماوە، کوڕە گەورەکەیان ناوی فیروزە کەدوای کوژرانی باوکی ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ قوبادی ساسان و پەنا بۆ سورخاب، کوڕی بەدری حەسنەوی دەبات کە لەوکاتەدا فەرمانڕەوای شارەزوور و دەینەوەر بووە. ماوەی چەند ساڵێك قوباد لەناو عەشیرەی گۆران بەو پەڕی ڕێزەوە ژیانی بەسەر بردووە و دوای رووخانی فەرمانڕەوای حەسنەوییە، قوباد لەساڵی ٦٣٠ کۆچی، لەناوچەکانی گوڵ عەنبەر و ئەلبەجە، دەستەیەك لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و بەمەبەستی گرتنی ئازەربایەگان (ئازەربایەجان) و لەڕاستیدا بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی، بەرەو ئەو دیارە بەڕێدەکەوێت. موزەفەرئەلدین فەرمانڕەوای ئەردەبیل، ئاگاداری ئەم هێرشەی ئەو دەبێت و سوپایەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو ڕەوانە دەکات. لەنزیك قەڵای (نوی)، قوباد شکست بەسوپای ئەردەبیل دەهێنێت. لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، ژمارەی کەسانی دەوروبەری زیاد دەکات. لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی شارەزوور دەست بەسەر چەند قەڵایەکدا دەگرێت و دەسەڵاتەکانی بەتەواوی فراوان دەبێت. سەرئەنجام لەگەڵ تورکمانەکانی ئازەربایەجان ڕێگەی ئاشتی دەگرێتەبەر و لەساڵی ٦٣٦ کۆچی لەگەڵ ئەمیر شەرەف ئەلدینی جەلالی فەرمانڕەوای ئەردەبیل جەنگ دەستپێدەکات و شکست دەخوات. بەناچاری دووبارە پەنا بۆ عەشیرەی گۆران دباتەوە تا ئەوەی لەساڵی ٦٥٦ هۆلاکۆ خان دێتە ناو خاکی عێراق. قوباد پەیوەستی یەشموت میرزا کوڕی هۆلاکو دەبێت کە لەکرماشانەوە ڕێگەی عێراقی گرتۆتەبەر و دەبێتە ئەردەڵی تایبەتی یەشموت میرزا. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی قوباد کەسێکی زیرەك و بەتوانا بووە، یەشموت بەبابا بانگی دەگات. سەرئەنجام قوباد بەناوی بابا ئەردەڵ بەناوبانگ دەبێت و یەشموت فەرمانڕەوایەتی شارەزووری پێدەسپێرێت و لەساڵی ٦٧٥ کۆچی دەمرێت کلۆڵ بەگ، کوڕە گەورەکەی جێگەی دەگرێتەوە.

بەپێی ئەم گێڕانەوەیە، ئەردەڵانییەکان دەبێت لەمناڵەکانی شامەنسوری فەرمانڕەوای دوشتیك بن نەك لەمناڵەکانی خوسرەوی ئاشەوان، بکوژی یەزدگێرد. بەڵام زۆربەی کتێبە مێژووییەکانی کورد ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کەئەردەڵانییەکان پێش شا مەنسوری ئاماژە

پێدراو، لەناوچەکانی شارەزوور و دەوربەری فەرمانڕەوایەتییان کردووە و چەندین شوێنەواری مێژوویيان لەخۆيان بەجێهێشتووە.

## حکومەتی کلۆڵ بەگی ئەردەلان

لەساڵی ٦٠٦ کۆچی، کلۆڵ بەگی ئەردەڵان کوڕی پیر بوداق کوڕی میر ئەبداڵ کە بەپێی گێڕانەوەی یەکەم لەرەچەڵەکی قوبادی نەوەی خوسرەوە و بەپێی گێڕانەوەی دووەم کوڕی چوباد کوڕی شا مەنسورە، فەرمانڕەوایەتی دەگرێتەدەست و بوێرانە و بەهێزانە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەردەڵانییەکان فراوان دەکات و شارەکانی سەقز، سیاکێو، زەڕین کەمەری گەڕوس و ناوچەی عەلی شەکەر (=ئیسفەند ئاوای ئەمڕۆیی) پەیوەستی سنووری ئەردەڵانییەکان دەکات. لەڕۆژهەڵات هەمەدان و لەڕۆژئاوا هەولێر تا موسڵ، لەباکور زەنجان، لەباشور کرماشان و سەقز سنوری فەرمانڕەوایەتی ئەم میرە پێکدێنێت. سلێمانی کە لەو کاتەدا شارباژێر بووە، لەگەڵ کۆیە و عەمادییە و حەریر و ڕەواندز، لەناو سنوری فەرمانڕەوایەتی کلۆڵ بەگ بووە.

بۆ ماوەی بیست و سێ ساڵ، هاوشێوەی پاشایەکی بەهێز، فەرمانڕەوایەتی کردووە و دار ئەلمولکی (ماڵی فەرمانڕەوایەتی) کوردستانی لەقەڵای زەڵمەوە بۆ قەڵای پلنگان گواستۆتەوە و سەرئەنجام کۆچی دوایی کردووە.

## حکومەتی خزربەگی ئەردەلان

دوای مردنی کلۆڵ بەگ، خزربەگی کوڕی یا خدر بەگ، لەساڵی ٦٢٩ کۆچی جێگەی باوکی دەگرێتەوە و بۆ ماوەی ٣٤ ساڵ، وەك کەسێکی دادپەروەر و میرێکی بەهێز، کاروباری سنووری وڵاتەکەی باوکی بەڕێوە دەبات و لەساڵی ٦٦٣ کۆچی، تەمەنی کۆتایی دێت.

## حکومەتی ئەلیاس بەگی ئەردەلان

دوای مردنی خزر بەگ، ئەلیاس بەگی کوڕی لەساڵی ٦٦٣ کۆچی جێگەی باوکی دەگرێتەوە و دادپەروەرانە بۆ ماوەی ٤٧ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات و لەبەر بەخشندەیی و بوێر، لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە بەگشتی ڕێزی دەگێریت. ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو، ئارامی و ئاسایش باڵی بەسەر ناوچەی ژێر دەسەڵاتیدا کێشاوە و لەساڵی ٧١٠ کۆچی دوایی کردووە.

## حکومەتی خزربەگی دووەمی ئەردەلان

دوای مردنی ئەلیاس بەگ، کوڕەکەی خزربەگی دووەم لەساڵی ٧١٠ کۆچی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت. کەسایەتییەکی ڕووخۆش و نییەت پاک بووە. زۆربەی کاتەکانی لەهاودەمی لەگەڵ زانا و ئەدیبەکان بەسەر بردووە و لەنوێژ و ڕۆژوو و خواپەرەستی هاوتای نەبینراوە. بەهیچ جۆرێك خوازیاری ئازاردانی خەڵکان نەبووە و لەستەم کردن خۆی بەدوور گرتووە. تەنانەت بەوەرگرتنیماڵیاتی دیوان ڕازی نەبووە و لەژێر ناوی جۆراجۆر ماڵیاتی بەمسکێنەکان بەخشیوە. تەنیا بەوە ڕازی بووە لەسنووری ژێر دەسەڵاتی پشێوی ونائارامی ڕوو نەدات. دەوڵەتی عوسمانی ناوبانگی چاکەکاری و خواپەرەستی ئەوی بیستووە و سوپایەکی بۆ سنووری ژێر دەسەڵاتی ڕەوانە کردووە و فەرمانی دەستدرێژی کردن و وێرانکاری بەسوپاکەی داوە. خزر بەگ بۆ ئەوەی کوشت و کوشتار ڕوو نەدات، بەشێك لەولاتەکەی خۆی کەبریتی بووە لەسلێمانی، هەولێر، کۆیە، حەریر و عەمادیە و ڕەواندز و سنوری ڕۆژئاوای کوردستان، پێشکەش بەدەوڵەتی عوسمانی کردووە و تەنیا بەسنوورەکانی ڕۆژهەلأت قەناعەتی کردووە. دوای ٣٦ ساڵ فەرمانڕەوایەتی نەنگین و شەرمێنەر مردووە.

## حکومەتی ئەمیر حەسەنی ئەردەلان

ئەمیر حەسەن کوڕی خزربەگ لەساڵی ٧٤٦ کۆچی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشتووە، فەرمانڕەوایەکی چاکەکار و میرێکی خواپەرەست بووە. بۆ بوێری و ئازایەتی و مێهرەبانی و دادپەروەری ناسراوی کەسانی دوور و نزیك بووە. بۆ سوپا و بەڕێوەبردنی وڵات، یاسایەکی ڕێکخستووە تا هەرکەس ئەرك و سنووری خۆی بزانێت و سوپایەکی لەگەنجانی بوێر، پێکهاتوو لەسێ هەزار کەس بۆ پاراستنی سنووری دەسەڵاتەکەی ئامادە کردووە و هەموو کەرەستە پێویستەکانی ئەم سوپایە وەك نان و جلوبەرگ و سیلاح و هتد.. لەخەزێنەی خۆیداوە. ڕۆژانە ئەوانی بەئەنجامدانی چالاکییە نیزامییەکان و تیر هاویشتن و ئەسپ سواری ناچار کردووە. دوو سێ جار لەگەڵ سوپای عوسمانییەکان جەنگاوە و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. ئەم میرە لەترسی ئەوەی نەکا دەوڵەتی عوسمانی مەبەستی تۆڵەسەندنەوە بکات، لەیەك فەرسەخی شاری سنە، لەسەر چیایەکی بەرز بۆ ناوەندی حکومەتەکەی خۆی، قەلایەکی بەهێز و تۆکمە بنیات دەنێت و لەداوێنی باکوری قەلاکە،

بناغەی گوندێك بەناوی خۆیەوە دادەرێژێت کە ئێستایش بەگوندی حەسەن ئاوا بەناوبانگە. بۆ ماوەی ۳۸ سالْ وەك میرێکی خاوەن دەسەلآت فەرمانڕەوایەتی کردووە و لەرەبیع الاوەلی ۷٤۸، مالْئاوایی لەجیهان کردووە.

### حکومەتی بابلو بەگی ئەردەلان

دوای مردنی ئەمیر حەسەنی ئەردەلآن، بابلو بەگی کوڕی لەسالْی ۷۸٤ کۆچی، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت. ئەم میرزادە، کەسێکی خۆسەر و دەستبلآو بووە. ئارەزوومەندی کوشت و کوشتار و خوێنرێژی بووە. لەبەرابەر هەڵەیەکی بچووك، فەرمانی کوشتن و سەر بڕین و خەساندنی دەرکردووە. لەبەر ئەمە ولآت و سوپا لێی بێهیوا و بێ ئومێد بوون. دووسێ جار مسکێنەکان دژی ئەو ئالآی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. ئیبراهیم بەگی وەزیر کەکەسێکی بیرمەند و زانا و خاوەن ئەزمون و لەدەرباری ئەمیر حەسەن پێگەی وەزارەتی لەدەستا بووە و وەك سەرپەرەستی بابلوبەگ لەقەڵەمدراوە، شۆڕشییەکانیی بێدەنگ و هێور کردۆتەوە. دوای ٤٤ سالْ فەرمانڕەوایەتی، مردووە.

### حکومەتی مونزەر بەگی ئەردەلان

دوای مردنی بابلوبەگ، مونزەر بەگی کوڕی لەسالْی ۸۲۸ کۆچی، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دانیشتووە و لەجیاتی باوکی بەڕێوەبردنی ولآتی گرتۆتە ئەستۆ. کەموکوڕییەکانی باوکی قەرەبوو کردۆتەوە و هیوای بۆ ژیانی خەڵکان گەڕاندۆتەوە. سەرۆکەکانی سەر سنور، بەناردنی دیاری و خەلآت، ملکەچی و گوێرایەڵی خۆیان نیشانداوە و خەڵکان بەگشتی فەرمانبرداری فەرمانەکانی بوون. لەخەت و نووسین و زانست، کەسێکی زانا و لەتیرهاویشتن کەسێکی دەگمەن بووە. دوای ۳٤ سالْ فەرمانڕەوایەتی، لەجێگەدا کەوتووە. مەئمون بەگی کوڕی کە بەمامۆبەگ ناسراوە، وەك جێگری خۆی ناساندووە و لەسالْی ۸٦۲ کۆچی دوایی کردووە.

### حکومەتی مەئمون بەگی ئەردەلان

دوای مردنی مونزەر بەگ، مەئمون بەگی جێگری، بەپێی وەسیەتی باوکی لەسالْی ۸٦۲ لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی کوردستان دانیشتووە. ئەم میرە، دوای چەندین کار بۆ ئاوەدان کردنەوەی ولآت و تەخت کردنی ڕێگەکان و هتد... دەستی بەئامادە کردن و کۆکردنەوەی سوپا کردووە و بەمەبەستی قەرەبووی نەشیاوی و ناکارامەیی خزربەگی

دووەم، بوێرانە هێرشی کردۆتە سەر خاکی دەوڵەتی عوسمانی و دوای دوو ساڵ شەڕ و پێکدادان، هەموو ئەو ناوچانەی خزربەگی دووەم، لەدەستیدابوو، دووبارە هێناوەتە ناو سنووری کوردستان و دەسەڵاتی خۆی و ڕاوێژکار و لێپرسراوی بۆ دیاریکردوون. ئەو ناوچانە بریتین لە: شارباژێر، هەولێر، کۆیە، حەریر، عەمادییە، ڕەواندز. دەستەیەك لەسوپاکەی خۆی لەقەڵای ڕەواندز بەجێهێشتووە تا ئارامی و هێمنی ئەو سنورە بپارێزن. بۆ ماوەی ۳۸ ساڵ بوێرانە و بەهێزانە کاروباری وڵاتی بەڕێوە بردووە و کەس نەیتوانیوە لەهیچ شوێنێکی وڵاتەکەیەوە کەلێنێك دروست بکات. دواتر لەسەرەتایی سەدەی نۆیەمی کۆچی، یانی ۹۰۰، هەموو سەرکردە و سەرۆکەکانی بۆ دەرباری خۆی بانگێشت کردووە و کوردستانی لەنێوان سێ کوڕەکەی خۆی بەمشێوەی خوارەوە دابەش کردووە:

بەشی بەگە بەگی کوڕە گەورە: زەڵم، گوڵ عەنبەر، شەمیران، هاوار، هەورامان، نەوسود، بەشی سورخاب بەگ: ناوچەکانی هەشلی، مەریوان، تەنورە، نەشکاش، پلنگان، کەلاش (جوانڕۆ)، سنە، ناوچەکانی عەلی شەکەر، مێهرەبان. بەشی محەممەد بەگ: سروچەك، قەرەداغ، شارباژێر، ئالان، هەولێر، کۆیە، حەریر، عەمادییە و ڕەواندز.

دوای دابەشکردنی وڵات، پێشنیاری یەکگرتوویی و یەکێتی بەکوڕەکانی دەکات و خۆی گۆشەگیری هەڵدەبژێرێت. دوای یەکساڵ دەمرێت. کوڕەکانی هەرکام لەسنوری دیاریکراوی خۆیان، فەرمانڕەوایەتی دەستپێدەکەن. سورخاب بەگ و محەممەد بەگ، ڕێزێکی زۆریان لەبرا گەورەکەیان گرتووە. ماوەی ٤٢ ساڵ بەگە بەگ، ڕۆژگاری لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی و سەرپەرەستی براکانی بەسەر بردووە و لەساڵی ٩٤٢ کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

## حکومەتی مەئمون بەگی دووەمی ئەردەلان

دوای مردنی بەگە بەگ، مەئمون بەگی دووەم، لەساڵی ٩٤٢ کۆچی، جێگەی باوکی دەگرێتەوە و دوای دوو ساڵ فەرمانڕەوایەتی، لەلایەن سوڵتان سلێمان خان، سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی، سوپایەکی گەورەی پێکهاتوو لە بیست هەزار سوار و پیادە بەسەرداری حسەین پاشای فەرمانڕەوای عەمادیە، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی کردەوەکانی مەئمون بەگی یەکەم لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ لەناوبردن و سەرکوت کردنی کوردەکان و وێران کردنی کوردستان ڕەوانە دەکرێت. مەئمون بەگ لەگەڵ چوار هەزار کەس ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و لەناوچەی شارەزوور، دوو سوپا لەبەرابەر یەك ریزیان بەستووە و بەیانی

دووشـەممە هەشـتی زی قەعـدەی سـاڵی ٩٤٤، جـەنگ دەسـتپێکردووە. ئـەم ژمـارە کەمـە لەبەرابەر ئەو سوپا گەورەیە، تا ئێوارێی ئەو ڕۆژانە، بوێرانە دەجەنگن و بەرگری و خۆڕاگری دەکەنە پیشە. زیان و زەرەری هەردوو لا فراوان دەبێت. کاتێك هەتاو ئاوا دەبێت، دوو سوپا دەست لەجەنگ هەڵدەگرن. مەئمون بەگ و پاشماوەی سوپاکەی پەنا بۆ قەڵای زەڵم دەبەن و لەوێ سەنگەر دەگرن. دوو نامە بۆ مامەکانی سورخاب بەگ و محەممەد بەگ دەنووسێت تا بەسوپا و جەنگاوەران هاوکاری بکەن. بۆ ماوەی یەك مانگ لەدەوروبەری قەڵاکە بەرگری دەکات و چاوەڕوانی هاتنی سوپای هاوکارییە. هەموو ڕۆژێك لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو، سوپای عوسمانییەکان بەهیوای گرتنی قەڵاکە، هێرش دەبەن و ئێوارێ بێهێوا و بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکیان دەستکەوێت، دەگەڕێنەوە. مەئمون بەگ دوای بێ هیوا بوون لەگەیشتنی هێزی پشتیوان و کەمبوونەوەی خواردەمەنی و توێشوو، ناچار شەوانەلەگەڵ چەند کەسێك لەنزیکەکانی خۆی، لەقەڵاکە دێتەدەر و ڕاستەوخۆ پەنا بۆ ماڵی حسەین پاشای سەرداری عوسمانی دەبات. حسەین پاشا کەسێك لەبرواپێکراوەکانی خۆی بەنامەیەك کەداوای بەخشینی بۆ مەئمون بەگ کردووە، لەگەڵ مەئمون بەگ بۆ ئیستانبوڵ دەنێرێت. لەکاتی گەیشتن بەئیستانبوڵ، مەئمون بەگ زیندانی دەکەن. سوپاییەکان بەیانی ئەو شەوە، ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی مەئمون بەگ تاڵان دەکەن و دەگەڕێنەوە.

### حکومەتی سورخاب بەگی ئەردەلان

سورخاب بەگ کوڕی مەئمون بەگی یەکەم، مامی مەئمونی دووەم کاتێك لەچەند و چۆنی ڕووداوەکە ئاگادار دەبێتەوە، هێزەکانی خۆی کۆدەکاتەوە و لەساڵی ٩٤٥ کۆچی دەست بەسەر هەموو سەرزەمینەکانی ژێر دەستی برازاکەیدا دەگرێت و هەروەها ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی محەممەد بەگی برا بچووکی دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و بەگشتی کوردستان دەخاتە ژێر رکێفی فەرمانەکانی خۆی. لەگەڵ شا تەهماسبی سەفەوی پەیوەندی دادەمەزرێنێت و خەڵات و دیاری بۆ دەرباری ئەو پاشایە ڕەوانە دەکات و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی نیشان دەدات. لەناوچەی مەریوان و لەسەر بەرزایی چیایەکی بەرز لەباکوری ئەو دەشتەدا، قەڵایەکی بەهێز بۆ ڕۆژی تەنگانە بنیات دەنێت و تا ئەمڕۆیش شوێنەوارەکەی ماوە.

محەممەد بەگ کەشکستی خواردووە و سورخاب بەگ دەستی بەسەر سنووری

دەسەڵاتەکەیدا گرتووە، پەنا بۆ دەرباری عوسمانی و سوڵتان سلێمان دەبات. سوڵتان سلێمان ڕێز لەمحەممەد بەگ دەگرێت و دەستبەجێ فەرمان دەدات مەئمون بەگ لەزیندان بێننەدەر. سوڵتان، ناوچەی حیللەی سەر بەبەغداد وەك ناوچەی دابینکەری بژێوی خۆیان و ماڵ و مناڵیان دیاریدەکات و هەروەها ڕۆستەم پاشای سەرداری ئەکرەم لەگەڵ سێ هەزار سوپایی و بەهاوڕێیەتی محەممەد بەگ و مەئمون بەگ، بۆ لەناو بردن و سەرکوت کردنی سورخاب بەگ ڕەوانە دەکات. لەساڵی ٩٤٧ کۆچی، ڕۆستەم پاشا دەگاتە ناوچەکانی شارەزوور، سورخاب بەگ لەم هێرشە ئاگادار دەبێتەوە و بەخێرایی بەسوپاییەکی هەشت هەزار کەسی لەکوردەکان ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. لەڕۆژی پێنجشەممەی ٢٤ ڕەجەبی ساڵی ٩٤٧ کۆچی، هەردوو سوپا لەدەستی شارەزوور ڕیز دەبەستن و ئاگری جەنگ بەخێرایی لەنێوان کورد و ڕۆمییەکان بڵێسە دەسەنێت. سوارەکانی کورد لەم جەنگەدا بوێری و جەنگاوەری خۆیان دەسەلمێنن و بۆ سێ جاری یەك لەدوای یەك شکست بەپێشەنگەکانی سوپای عوسمانی دەهێنن کەزیاتر لەدە هەزار کەس بوون. تا ئاوابوونی هەتاو، جەنگ بەردەوام بووە. تاریکی شەو جیایی لەنێوان دوو سوپا دروست دەکات و هەرکام بۆ ئوردووگاکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. ماوەی هەشت ڕۆژ بەمشێوەیە جەنگ درێژەی کێشاوە و نزیکەی حەوت هەزار کەس لەسوپای عوسمانییەکان و سێ هەزار کەس لەکوردان دەکوژرێن. سەرئەنجام سورخاب بەگ سەنگەر گرتن بەباشترین ڕێگە چارە دەبینێت و لەقەڵای زەڵم سەنگەر دەگرێت. لەگەڵ ئەمەیشدا شا تەهماسب لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە و داوای هاوکاری دەکات. هێزەکانی عوسمانی بۆ ماوەی دوو ساڵ گەمارۆ دەخەنە سەر قەڵای زەڵم و ناوچەکانی شارەزوور تاڵان دەکەن. لەم ماوەدا هەموو هێرشەکانیان بۆ سەر قەڵاکە ناکام و بێ ئەنجام دەبێت. لەیەکێك لەهێرشەکان ڕۆستەم پاشای سەردار، بریندار و لەجێگەدا دەکەوێت. لەناکاو هەواڵ بەسورخاب بەگ دەگات پانزە هەزار کەس لەهێزەکانی شا تەهماسبی ئێران بەسەرکردایەتی حسەین بەگ ناوێك بۆ هاوکاری کردنی گەیشتوونەتە دوو فەرسەخی قەڵای زەڵم. بەو ئەندازەی سورخاب بەگ لەبیستنی ئەم هەواڵە شادمان دەبێت، سوپای ڕۆم خەمبار و ورەیان دەڕووخێت. بەڕێکەوت ڕۆستەم پاشا بەهۆی برینەکەیەوە دەمرێت. بەکورتی مەرگی ئەم سەردارە و هاتنی سوپای هاوکاری ئێرانییەکان، دەبێتە هۆی ئەهێشتنی ورەی سوپای عوسمانی و پەرێشان بوونیان. سورخاب لەگەڵ

بیستنی هەواڵی مردنی رۆستەم پاشا، دەستبەجێ لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەقەڵای زەڵم هێرشیان دەکاتەسەر و حسەین بەگی سەرداری سوپای ئێران ئاگادار دەکاتەوە و بوێرانە بۆ ناو جەرگەی سوپای دوژمن ئەسپ غاردەدات. کاتێك سوپای ئێران دەگات، تەنیا شوێن سوپای تێکشکاوی عوسمانییەکان دەکەون. دەستەیەکیان ئەسیر و دەستەیەکیان دەکەنە خۆراکی شمشێر. ئەوانی دیکەیان لەژێر فەرماندەیی محەممەد پاشا، یەکێك لەپلە بەرزەکانی عوسمانی، پەنا بۆ قەڵای زەڵم دەبەن و ماڵ و منداڵی سورخاب بەگ دەکەنە تکاکار. حسەین بەگی سەرداری ئێران بەتکای ژنەکان ڕازی دەبێت و محەممەد پاشا و شەشسەد کەسی هاوڕێی بێ ئەوەی چەکیان بکات، ڕەوانەی دەرباری عوسمانی دەکاتەوە. حسەین بەگ و سوپای ئێرانیش بەو پەڕی شادومانی بۆ وڵاتی ئێران دەگەڕێنەوە. سورخاب بەگیش هاوشێوەی میرێکی سەرکەوتوو، لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی کوردستان دادەنیشێت و سەربەخۆ، فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات. دواتر سورخاب بەگ، ناوەندی دەسەڵاتەکەی لەقەڵای زەڵم بۆ قەڵای مەریوان دەگوازێتەوە و ئەوێ دەکاتە دار ئەلمولکی کوردستان.

دوای ئەم ڕووداوانە، لەساڵی ٩٥٦ ئەلقاس میرزا، برای شا تەهماسب کەماوەیەك لەدەوڵەتی ئێران یاخی ببوو، ڕوو دەکاتە ناوچەکانی شارەزوور. بەهرام میرزا و شا قولی خانی موهردار و ئیبراهیم خان بەنوێنەرایەتی شا تەهماسب لەگەڵ بیست هەزار سواری جەنگی، بەشوێنیەوە بوون و لەناوچەکانی مەریوان و شارەزوور پێی دەگەن و بڵاوە بەشوێنکەوتووەکانی دەکەن, ئەلقاس میرزا لەگەڵ بیست و یەك کەس لەدەستوپێوەندەکانی پەنا بۆ قەڵای مەریوان و سورخاب بەگ دەبەن. سورخاب بەگ لای شا تەهماسب تکای بۆ دەکات و ئەلقاس میرزا و هاوڕێکانی لەگەڵ شا نیعمەت اللەی قەهێستانی ڕەوانەی دەرباری شا تەهماسب دەکات. شا تەهماسب بەتکاکەی سورخاب بەگ ڕازی دەبێت و لەپاداشتی ئەم خزمەتەی، چەندین ڕێزی شایانەی لێ دەگرێت و ساڵانە بڕە پارەیەك (هەزار تمەن) لەخەزێنەی دەوڵەت بۆ سورخاب بەگ دیاریدەکرێت.

سورخاب بەگ یانزە کوڕی بووە: ١. حسەین بەگ، ٢. ئەسکەندەر بەگ، ٣. سوڵتان عەلی بەگ، ٤. یەعقوب بەگ، ٥. بەهرام بەگ، ٦. زولفەقار بەگ، ٧. ئەسمەش بەگ، ٨. شاسوار بەگ، ٩. سارۆخان بەگ، ١٠. قاسم بەگ، ١١. بەسات بەگ

سورخاب بەگ، سێیەم کوڕی خۆی (سوڵتان عەلی بەگ) لەبەر بوێری و ئازایەتی و

لێهاتوویی وەك جێگری خۆی دیاریدەکات، بەهرام بەگ، پێنجەم کوڕی خۆی دەکاتە فەرمانڕەوای ڕەوندار و عەمادییە و تا ساڵی ١٢٤٩، منداڵەکانی ئەم بەهرام بەگە، فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە بوون. محەممەد بەگ کە بەمیری ڕەواندز بەناوبانگە، نەوەی ئەم بەهرام بەگەیە کەچەندین ساڵ لەگەڵ عوسمانییەکان جەنگاوە.

سەرئەنجام سورخاب بەگ، دوای سی ساڵ دەسەڵات و فەرمانڕەوایی، دەمرێت و سوڵتان عەلی جێگری، زۆری پێناچێت، پەیوەستی باوکی دەبێت. لەسوڵتان عەلی بەگ دوو منداڵ بەناوەکانی تەیمورخان و هەڵۆ خان بەجێماون. بەسات بەگ (پانزەهەمین کوڕی سورخاب بەگ) کە کەسێکی زانا و بوێر بووە، لەساڵی ٩٧٥ کۆچی، فەرمانڕەوایەتی دەگرێتە دەست.

## حکومەتی بەسات بەگی ئەردەلان

دوای مردنی سورخاب بەگ و سوڵتان عەلی بەگ، کوڕی سێیەم کەجێگرەوەی بووە، لەساڵی ٩٧٥، کوڕی پانزەیەمی، بەسات بەگ، فەرمانڕەوایەتی دەگرێتە دەست. ئەم میرزادەیە، لەزانست جێگەی شانازی ئەردەڵانییەکان و لەبەخشش و بەخشندەیی کەسێکی کەم وێنەی ڕۆژگاری خۆی بووە. زۆربەی کاتەکانی خۆی بەهاودەمی زاناکان بەسەر بردووە و خوازیار و تامەزرۆی دادپەروەری بووە.

نزیکەی دەساڵی فەرمانڕەوایەتی خۆی بەئارامی و ئاسایش بەسەر بردووە و لەساڵی ٩٨٥ تەیمورخان و هەڵۆخان کوڕەکانی سوڵتان عەلی بەگ کەکچەزاکانی مەنشا سوڵتانی ئیستاجلو بوون، دژی ئەو شۆڕش دەکەن و قەڵای پڵنگان دەکەنە پەناگەی خۆیان. بەسات بەگ دەستەیەك بەسەرکردایەتی سوهراب بەگی ژن برای بۆ تەمێ کردن و سەرکوت کردنی برازاکانی دەنێرێت. هێشتا ئەم سوپایە ناگاتە پڵنگان کەتەیمورخان و هەڵۆخان هەڵدێن و پەنا بۆ دەرباری شا ئیسماعیلی دووەم دەبەن. نزیکەی ساڵێك لەقەزوێن سەرگەردان دەبن و سەرئەنجام شا ئیسماعیل لەساڵی ٩٨٦ کۆچی دەمرێت. تەیمورخان و هەڵۆخان بۆ کوردستان دەگەڕێنەوە. دەستەیەك لەسەرکردە و خانەکان لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوە و دەست بەپەلاماردانی ناوچەکان دەکەن و بەشێك لەسنووری بەسات بەگ دەخەنە ژێر دەستی خۆیان. بەرێکەوت، مەرگ دەرفەتی بەرگری کردن بەبەسات بەگ نادات و لەم کاتەدا کۆچی دوایی دەکات و تەیمورخان بێ هیچ کێشەیەك، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت.

## حکومەتی تەیمورخانی ئەردەلان

دوای مردنی بەسات بەگ، تەیمورخانی برازای، کوڕی سوڵتان عەلی بەگ لەساڵی ٩٦٨ کۆچی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی بەجێماوی باوکی دادەنیشێت و ژیانێکی تازە و سەرنجڕاکێش بەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دەبەخشێت. لەبەر ئەوەی هێشتا پاشایەتی ئێران جێگیر نەبوو و پاشایەکی خاوەن دەسەڵات و بەهێز پاشایەتی نەدەکرد، تەیمورخان لەگەڵ سوڵتان موراد خان، سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی، پەیوەندی دەبەستێت و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ ئەو دەوڵەتە نیشاندەدات. سوڵتان موراد لەم پێشهاتە شادومان و ساڵانە زیاتر لەسەد هەزار ئاقچەی زێڕ کە ماڵیاتی شارەزوور بووە، بۆ دەرباری تەیمورخان دیاریدەکات و نازناوی میری میرەکانی پێدەبەخشێت.

تەیمورخان چوار کوڕی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە: ١. سوڵتان عەلی بەگ، ٢. بەداق بەگ، ٣. موراد بەگ، ٤. ئەمیر عەلەم ئەلدین. سنووری وڵاتەکەی لەنێوان چوار کورەکەی دابەش دەکات:

سنوری سوڵتان عەلی بەگ:، شارەزوور، قەزەڵجە، زەڵم، سنە، حەسەن ئاوا.

سنوری بەداق بەگ: قەرەداخ، کۆیە، حەریر.

سنوری موراد بەگ: سەقز، سیاکێو، تیلەکۆ، خوڕخوڕە.

سنوری ئەمیر عەلەم ئەلدین: شارباژێر (ناوچەکانی سلێمانی ئەمڕۆیی).

تەیمورخان لەگەڵ سوپایەکی تەیار سەرقاڵی گرتنی ناوچەکانی دەوروبەر دەبێت و کرماشان و دەینەوەر و زەڕین کەمەر (گەڕوس یا بیجار) دەهێنێتە ناو سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی.

بێ گرنگیدان بەدەوڵەتی ئێران، ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردووە. دوو سێ جار هێرشی کردۆتە سەر خێڵی کەلهوڕ و تالآنی کردوون. لەساڵی ٩٩٣ لەگەڵ هەزار سوار، دووبارە هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی عومەر بەگی کەلهوڕ. عومەر بەگ بەناچاری پەنای بۆ شا وێردی خانی فەرمانڕەوای لوڕستان بردووە. شا وێردی خان لەگەڵ سوپای لوڕستان و کەلهوڕ ڕێگە لەتەیمورخان دەگرن. تەیمورخان کەکەلهوڕی تالآن و بەنیازی گەڕانەوە بوو و چاوەڕوانی پێشهاتێکی لەو شێوەی نەکردووە، بەناچاری لەگەڵ هەمان هەزار سوار، ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. لەگۆڕەپانی جەنگ، ئەسپەکەی تەیمورخان دەکەوێتە سەرزەوی.

سوپای لورستان هێرشی دەکەنەسەر و قۆڵبەستی دەکەن. شاوێردی خان کەکەسێکی بەئەزمون و دوورئەندێش بووە، بەوپەڕی ڕێزەوە تەیمورخانی بردۆتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.
دوای ماوەیەك تەیمورخان لەگەڵ سوارە و سوپاکەی دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان. دوای سێ ساڵ لەلایەن دەرباری ئێرانەوە، دەوڵەتیاری سوڵتان سیای مەنسوری، بۆ ناوچەکانی زەڕین کەمەر دەستنیشان دەکرێت و دەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا دەگرێت تەیمورخان لەگەڵ دوو هەزار سوار بەمەبەستی دەرپەڕاندنی دەوڵەتیار و سەرکوت کردنی دانیشتووانی ئەو ناوچە بەڕێدەکەوێت. دەوڵەتیار لەگەڵ سێ هەزار سواری قزڵباش لەئێرانییەکان، ڕێگە لەتەیمورخان دەگرێت و دوای شەڕ و پێکدادانێکی کەم، دەوڵتیار ڕیسوایانە شکست دەخوات و لەقەڵای زەڕین کەمەر سەنگەر دەگرێت. تەیمورخان و سوپاکەی گەمارۆی قەڵاکە دەدەن و دوای دوو سێ هێرش دەست بەسەر قەڵاکەدا دەگرن. لەکاتی هێرش بۆ سەر قەڵاکە تەیمورخان تیرێکی بەردەکەوێت و دەکوژرێت. سوپاکەی ورەیان ناڕووخێت و هەڵۆخانی برا بچووکی تەیمورخان مەبەستی تۆڵەسەندنەوەی خوێنی براکەی دەکات و زیاتر لەدووسەد کەس لەدانیشتووانی زەڕین کەمەر دەکوژێت. سەرئەنجام دەوڵتیاریش دەگرێت و لەتۆڵەی تەیمورخان، دەیکوژن و ناوچەکە تالآن و جەنازەی تەیمورخان بۆ قەڵای مەریوان دەگێڕنەوە.

## حکومەتی هەڵۆخانی ئەردەڵان

دوای کوژرانی تەیمورخان، هەڵۆخانی برا بچوکی لەساڵی ٩٩٦ کۆچی، دەست بەسەر فەرمانڕەوایەتی تەیمورخاندا دەگرێت و فەرمانڕەوایەتی کوردستانی سەربەخۆ دەگرێتە ئەستۆ. هەڵۆخان هاوشێوەی تەیمورخانی برای، بۆ ماوەی دوو ساڵ پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و سوڵتان موڕادی سێیەم دەپارێزێت بەڵام دواتر پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران دەبەستێت و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ پاشای ئێران نیشان دەدات و ناوەندی فەرمانڕەوایەتی کوردستان لەقەڵای زەڵم و قەڵای مەریوان بۆ پلنگان دەگوازێتەوە. قەڵای پلنگان لەناوچەیەکی سەخت و دژوار و بەردەڵانە و لەو ڕۆژگارەدا وەك یەکێك لەقەڵا تۆکمەکان لەقەڵەمدەدرا کەهیچ پاشایەك نەیتوانیوە بەزۆر و جەنگ دەستی بەسەردا بگرێت. شوێنەوارەکانی دەروازەی بەردینی ئەو قەڵایە، وەك ئاماژەمان پێدا، هێشتا ماوەتەوە. لەڕۆژگاری کۆن، ناوەندی تایەفەکانی کەلهوڕ و گۆران بووە کە لەتایەفەکانی کوردستانن و لەوێ نیشتەجێ بوون. دواتر لەئەنجامی پێشهاتەکانی ڕۆژگار وێران و خاپور بووە.

هەڵۆخان سەرلەنوێ نۆژەنی کردۆتەوە و تۆکمەتری کردووە. چەندین گوندی لەدەوری قەڵاکە بنیاتناوە و لەهەر گوندێك، مزگەوتێکی تۆکمەی بۆ پەناگرتنی دانیشتووانی گوندەکان لەکاتی تەنگانە، دروستکردووە. گوندی پڵنگان لەدوانزە فەرسەخی شاری سنە جێگیرە. لەباشوری ڕۆژئاوای ئەم قەڵایە، قەڵای زەڵم، مەریوان و حەسەن ئاوای نۆژەن و ئاوەدان کردۆتەوە.

هەڵۆخان کەسێکی بوێر و بەهێز و دادپەروەر بووە. لەگەڵ ژێردەستان و مسکێنەکان، دادپەروەرانە هەڵسوکەوتی کردووە و لەگەڵ فەرمانڕەواکانی دەوروبەر، پەیوەندی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی بەستووە. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی هەڵۆخان، هەموو ناوچەکانی ژێردەستی ئاوەدان، ڕێگەکان ئەمن و خەزێنەی دەوڵەتی لەزێڕ و زیو لێوانلێو بووە. لەهەرکام لەوەرزەکانی ساڵ، لەیەکێك لەقەڵاکان نیشتەجێ بووە، زستان لەزەڵم، بەهار لەپڵنگان، هاوین لەحەسەن ئاوا و پاییزی لەقەڵای مەریوان بەسەر بردووە. بۆ زیادکردنی ژمارەی سوپاییەکانی و تەیاری کردنیان، هەموو هەوڵەکانی خۆی خستۆتە گەڕ و دڵنیایی تەواوی بۆ پارێزگاری کردن لەوڵاتەکەی بەدەست هێناوە و کوردستانی وەك ناوچەیەکی سەربەخۆ و ئازاد ناساندووە.

بۆ فێرکاری زانستەکان و بڵاوکردنەوەی ئایین و پێشنوێژی نوێژی هەینی، شێخ عەبدولغەفاری دووەمی مەردۆخی کوڕی شێخ شەمس ئەلدینی هێناوەتەوە حەسەن ئاوای کەپایتەختی سنە بووە. شێخ عەبدولغەفار لەگوندی دەگاشێخانی هەورامان نیشتەجێ بووە.

بۆ پەروەردە کردن و وانە وتنەوە بەخان ئەحمەد خان، مەلا یەعقوب، گەورە باوەگەورێی مسکێنەکانی سنەی هێناوەتە حەسەن ئاوا و هەموو کەرەستەکانی ژیانی بۆ دابین کردوون. مەلا یەعقوب لەگوندی سورەکوڵ ژیاوە.

لەساڵی ١٠١٩ کۆچی، حسەین خانی فەرمانڕەوای لوڕستان، بەفەرمانی پاشای ئێران، شا عەباس، لەگەڵ دەهەزار سوپایی، هێرشی کردۆتە سەر کوردستان و لەقەڵای حەسەن ئاوا، ڕووبەڕووی هەڵۆخان بۆتەوە. لەسێ ڕووبەڕوو بوونەوەدا، حسەین خان شکستی خواردووە. لەچوارەم جار، کەگۆڕەپانی جەنگ لەسوار و پیادەی هەردوو سوپا لێوانلێو بووە، حسەین خان بەتەواوی شکستی خواردووە و سوپای کوردستان تا چوار فەرسەنگ شوێن سوپای

تێکشکاوی حسەین خان کەوتوون و زیاتر لەدەهەزار کەس لەسوپای لورستان کوژراوە.[1]

هەواڵی ئەم شکستە بەدەرباری ئیسفەهان دەگات. شا عەباسی تورە، سوپایەك بۆ ڕێگرتن لەکردەوە خۆسەرانەکانی هەڵۆخان ڕەوانەی کوردستان دەکات. ئەم سوپایە لەنزیك حەسەن ئاوا، ڕووبەڕووی سوپای هەڵۆخان دەبێتەوە و لەیەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا شکست دەخۆن. دووبارە شا عەباس سوپایەکی گەورە ئامادە و فەرمانی سەرکوت کردنی هەڵۆخانیان پێ دەدات. ئەم سوپایش لەبەرابەر سوارە جەنگاوەرەکانی کورد، توانای خۆڕاگری نامێنێت و دوای زەرەر و زیانێکی زۆر پاشەکشێ دەکەن. شا عەباس لەم چالاکییە بوێرانەی هەڵۆخان و شکستە یەك لەدوای یەکەکانی سوپای ئێران تورە و خۆی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەمەبەستی داگیرکردن و سەرکوت کردنی کوردستان و هەڵۆخان بەڕێدەکەوێت. کاتێك دەگاتە گوندی مەیهەم لەگوندەکانی ئیسفەند ئاوا، ئالی بالی ناوێك کەپێشتر پێشەنگی تایبەتی شا عەباس بووە، لەو گوندە دەردەکەوێت و ڕاستییەکان و بارودۆخی هەڵۆخان و چۆنیەتی بەهێزی قەڵاکان و گرتنیان بەشا عەباس دەڵێت و لەم جەنگە پەشیمانی دەکاتەوە و ئالی بالی بەڵێن دەدات لەڕێگەی ئاشتییەوە، هەڵۆخان بەملکەچی و گوێرایەڵی ناچار بکات. شا عەباس، ئالی لەگەڵ دیاری و فەرمان بۆ لای هەڵۆخان دەنێرێت و خۆی بۆ دەرباری پاشایەتی دەگەڕێتەوە. ئالی بالی لەقەڵای مەریوان چاوی بەهەڵۆخان دەکەوێت و دیارییەکانی پێشکەش و لەفەرمانەکان ئاگاداری دەکاتەوە. هەڵۆخان ملکەچی و گوێرایەڵی خۆی نیشان دەدات و خان ئەحمەد خانی کوڕی لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی بۆ دەرباری پاشای ئێران ڕەوانە دەکات. شا عەباس بەهاتنی خان ئەحمەد خان شادومان و بەهەموو شێوەیەك ڕێزی دەگرێت. شا عەباش خوشکەکەی خۆی بەناوی (زەرین کلان) ( کڵاو یا تاج زێڕین) لەخان ئەحمەد خان مارە دەکات و لەئیسفەهان ڕێوڕەسمێکی شایانە بەم بۆنەوە دەگێڕێت و دوای ماوەیەك مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدەدات. لەکاتی گەڕانەوە پەیمانی لێدەستێنێت هەڵۆخانی باوکی بەوەرگرتنی دیارییە شاهانەکان و ڕۆشتن بۆ ئیسفەهان ناچار بکات. خان ئەحمەد خان دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان، لەبەر بەڵێنەکەی بەشا عەباس، هەڵۆخان بۆ ڕۆشتن بۆ ئیسفەهان هان دەدات. هەڵۆخان هەست بەمەبەست و داوای کوڕەکەی

---

[1] - لەچەند دێڕی سەرووتر ئاماژە بەوە دراوە کەژمارەی سوپاکە دە هەزار کەس بووە و لێرەدا دەڵێت زیاتر لەدەهەزار کەسیان لێ کوژراوە. ئەگەر نووسەر بەهەڵەدا نەچووبێت ئەگەری هەیە سوپایەکی دیکە بۆ هاوکاری سوپاکەی حسەین خان هاتبێت.

دەکات و ڕازی نابێت. لەبەر ئەوەی خان ئەحمەد خان بەڵێنیداوە، نەیتوانییوە لەبەرابەر ڕازی نەبوونی باوکی بێدەنگ بێت و لەهەر جێگە و شوێنێکدا ئەم بابەتەی وروژاندووە و مەلا یەعقوبی مامۆستای خۆی ڕازی دەکات تا بەهەر شێوەیەك بووە، هەڵۆخان بۆ ئەم سەفەرە ڕازی بکەن. پێداگرتنی کوڕ و مەلا یەعقوب، هەڵۆخان پەرێشان دەکات و کورەکەی زیندانی و ڕێگەی ئاخاوتن و قسە کردن لەمەلا یەعقوب دەگرێت. دوای دوو سێ ڕۆژ شێخ عەبدولغەفاری پێشنوێژ و میر و سەرکردەکانی هەڵۆخان کە لەبابەتەکە ئاگادار بوونەوە، بۆ زیندانی کردنی کوڕەکەی کەزاوای شای ئێرانە، سەرکۆنەی دەکەن و دڵنیای دەکەنەوە و دەڵێن ئەگەر پاشای ئێران نییەتێکی خراپی لەسەردا بێت، خان ئەحمەد خانی بەشێوەیەکی ڕەسمی نەدەکردە زاوای خۆی. سەرئەنجام هەڵۆ خان ڕازی و فەرمانی ئازاد کردنی کوڕەکەی دەدات و بەزەیی و خۆشەویستی باوکانەی پێدەبەخشێت و بەڵێنی پێدەدات بەمزووانە داواکارییەکەی بەدیدێنێت. دوای چەند ڕۆژێك هەڵۆخان خۆی بۆ گەشتەکە ئامادە دەکات و لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی و شایانە، بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت و دەگاتە دەرباری شای ئێران. شا عەباس لەهاتنی شادومان و ڕێزێکی شایانەی لێدەگرێت. دوای شەش مانگ ڕێز گرتن و میوانداری کردن، لەگەڵ پێدانی هەر جۆرە ئیمتیازێك، مۆڵەتی گەڕانەوە بۆ کوردستانی پێدەدات و لەسەر داوای خودی هەڵۆخان، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان لەهەمەدان تا عەمادییە و کۆیە و حەریر، بەناوی خان ئەحمەد خان، دەردەکرێت. لەساڵی ١٠٢٣، هەورامان یاخی دەبێت و خان ئەحمەد خان بەفەرمانی هەڵۆخانی باوکی، ئەو ناوچەیە دەسووتێنێت و دوای دوو ڕۆژ جەنگ و پێکدادان، دەست بەسەر هەوراماندا دەگرێت و هەژدە کەس لەخان و بەگەکانی ئەو ناوچەیە دەکوژێت. دوای ئەم ڕووداوە، تا مردنی هەڵۆخان، ڕووداوێکی ئەوتۆ کەشیاوی ئاماژەدان بێت، ڕوویننەداوە.

## حکومەتی خان ئەحمەد خانی ئەردەلان

دوای مردنی هەڵۆخان، خان ئەحمەد خانی کوڕی لەساڵی ١٠٢٥ بەپێی فەرمانی شا عەباس، پاشای ئێران، بەشێوەیەکی ڕەسمی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان دەکرێت و ئاڵای فەرمانڕەوایی هەڵدەکات و بەهێزانە و بەدڵنیاییەوە، سەرقاڵی بەڕێوەبردنی وڵات دەبێت. پێش هەر کارێك، سوپایەکی بیست هەزار کەسی سوار و پیادە لەگەنجە بوێرە کوردەکان بەناوی سوپای ئەردەلان بۆ پارێزگاری کردن لەوڵات ئامادە و بەئەندازەی

پێویست بژێوی و مانگانە و کەرەستەکانی ژیانیان بۆ دابین دەکات. دوای چەند مانگ لەلایەن شا عەباسەوە فەرمانێکی پێدەگات کەدانیشتووانی موکری و بەڵباس ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. دەستبەجێ خان ئەحمەد خان لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ سەرکوت کردنی ئەوان بەڕێدەکەوێت. دانیشتووانی موکری و بەڵباس کاتێك لەهاتنی خان ئەحمەد خان ئاگادار دەبنەوە، لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە ڕوودەکەنە گۆڕەپانی جەنگ. لەگەڵ ئەوەی سوپای ئەردەڵان بەژمارە لەسوپای ئەوان کەمتر بووە، بەڵام چوونکە جەنگاوەر و خاوەن ئەزموون بوون و بۆ ئەو مەبەستە پەروەردە کرابوون، هێرشێکی یەکلاییکەرەوە دەکەنە سەر ئوردووی سوپای موکری و بەڵباس و بەهەوڵ و ماندوو بوونێکی کەم، شکستیان پێدێنن. ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر و دەکوژرێت. ئەوانی دیکە ڕێگەی چیا و بیابان دەگرنەبەر و سوپای ئەردەڵان شوێنپێیان هەڵدەگرن تا دەگەنە قەڵای ڕەواندز. هەڵاتووان پەنا بۆ قەڵاکە دەبەن و لەوێ سەنگەر دەگرن. خان ئەحمەد خان گەمارۆ دەخاتە سەر قەڵاکە کە لەسەر چیایەکی بەرزە و بۆ دابین کردنی خواردەمەنی سوپاکەی، سەرقاڵی تاڵان کردنی گوندەکانی دەوروبەر دەبێت و مسکێنەکانی ئەو دیارە لەنشینگەکانی خۆیان دوور دەخاتەوە و مەڕومالآت و دانەوێڵەی ئەوان بۆ سوپاکەی کۆدەکاتەوە بەلآم دژواری و سەختی چیاکانی ئەو ناوچەیە زیاتر لەوە بوو ئەو خواردەمەنییانە بەشی گەمارۆی قەڵاکە بکات. خان ئەحمەد خان لەکۆتایی هاتنی خواردەمەنییەکان و نەگرتنی قەڵاکە خەمبار دەبێت و لەگەڵ دەستەیەك لەکەسە نزیکەکانی خۆی بەمەبەستی گەڕان و خۆشگوزەرانی ڕوودەکەنە ئاوێکی ئەو ناوچەیە. بەڕێکەوت پیرێژنێکی قسەخۆش دەبینن. پیرێژن لەخان ئەحمەد خان دەپرسێت، چی لەمپەرە لەوەی ناتوانن دەست بەسەر ئەو قەڵایەدا بگرن؟ خان دەڵێت: ڕێگەی چوونە ژوورەوەمان نییە و لەبەر ئەوە لێرە چاوەڕوانین. پیرێژن دەڵێت: لەشەوی بووکێنی، ڕێگەی منیش داخراو بوو، بەلآم چوونکە بەرامبەرەکەم پیاو بوو، بەهێرشێك دەستی بەسەر قەڵاکەدا گرت و بۆ هەمیشە ڕێگەی تەخت کرد. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر خان ئەحمەد خان دادەنێت و بۆ ناو سوپاکەی دەگەڕێتەوە و بەسەرهاتەکەیان بۆ باس دەکات. سوپاییەکان لەتانەی پیرێژنەکە خوێنیان دێتە کوڵ و هێرش دەکەنە سەر قەڵاکە و لەگەڵ زەرەر و زیانێکی کەم دەست بەسەر قەڵاکەدا دەگرن. دوای کوشت و کوشتاری فراوان، خان ئەحمەد خان، ئەمان بەپاشماوەی دانیشتووانی

قەڵاکە دەبەخشێت و ڕەواندز پەیوەستی سنووری فەرمانڕەوایەتی خۆی دەکات. منداڵەکانی بەهرام بەگ، کوڕە مامەکانی، نەوەکانی سورخاب بەگ کە لەو ناوچەیە بەدژواری ژیانیان دەگوزەراند، کۆدەکاتەوە و ڕێزیان دەگرێت و قەراحەسەن بەگ کەکوڕە گەورەی بەهرام بەگ بووە، وەك فەرمانڕەوای ڕەواندز دەستنیشان دەکات و خالید بەگی خۆشناوی دەکاتە فەرمانڕەوای خۆشناو و عەمادییە بەعوسمان بەگ کوڕی یەعقوب بەگ دەسپێرێت و یەکێك لەکەسە نزیکەکانی خۆی بۆ کۆیە و حەریر دەستنیشان دەکات. فەرمانڕەوەکانی ڕەواندز لەمناڵەکانی قەراحەسەن بوون. تایەفەی محەممەد رەشی بەگی وەکیل بەخالید بەگ دەگەنەوە کەناسراو بەمیری خۆشناو بووە.

دواتر خان ئەحمەد خان بەمەبەستی گرتنی موسڵ، درێژە بەڕێگەکەی دەدات و کاتێك دەگاتە شەش فەرسنگی موسڵ، فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە هەڵدێت و ڕێگەی دیاربەکر و حەلەب دەگرێتەبەر. خان ئەحمەد خان بێ جەنگ دەست بەسەر موسڵدا دەگرێت. کارگوزاران و ئەفەندییەکانی موسڵ، بەپێشکەش کردنی دیاری شایانە دەگەنە خزمەتی و ریزیان لێدەگیرێت. ماوەی چل ڕۆژ لەموسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری بۆ حەواندنەوەی سوپاییەکانی دەمێنێتەوە و سەردانی گۆڕی یونسی پێغەمبەر دەکات

لەموسڵەوە، مژدەی سەرکەوتنەکانی خۆی بۆ شا عەباس دەنێرێت. شا عەباس خەنجەری گەوهەرنیشانی کەمەری خۆی لەگەڵ ئەسپێکی تایبەت و دوانزە هەزار تمەن پارەی زێڕ بۆ خان ئەحمەد خان دەنێرێت و فەرمانی پێدەدات هێرش بکاتە سەر کەرکوك و بەغداد و دەست بەسەر ئەو ناوچانەیشدا بگرێت. خان ئەحمەد خان دوای چل ڕۆژ مانەوە لەموسڵ، ملی ڕێگە دەگرێتەبەر و دەست بەسەر کەرکوکدا دەگرێت و کارگوزارێکی بۆ دەستنیشان دەکات و لەوێوە سەرنجی بۆ لای بەغداد رادەکێشرێت. شا عەباس کاتێك لەبەڕێکەوتنی خان ئەحمەد خان بەرەو بەغداد ئاگادار دەبێتەوە، خۆی لەگەڵ سوپایەکی گەورە ڕێگەی ئەو شارە دەگرێتەبەر. خان ئەحمەد خان دەگاتە دەوروبەری بەغداد. پاشا و سەرۆکەکانی ئەو شارە، بەرژەوەندی لەخۆبەدەستەوەداندا دەبینن و بەدیاری و پێشکەشی شایانە پێشوازی لەخان ئەحمەد خان دەکەن. خان ئەحمەد خان ڕێزیان دەگرێت. خان ئەحمەد خان لەناو خۆشی دانیشتووان، دەڕواتە ناو شاری بەغداد و کاروبارەکانی ئەو شارە ڕێکدەخات. بەماوەی دوو ڕۆژ، سوپای شا عەباس دەگاتە دەوروبەری بەغداد. خان ئەحمەد خان لەگەڵ

دەستەیەك لەگەورە پیاوانی ئەو شارە بۆ پێشوازی کردنی دەڕۆن و لەلایەن شا عەباسەوە ڕێزیان لێدەگیرێت. خان ئەحمەد خان دوای ئەم سەرکەوتنانە، لەساڵی ١٠٣٥ کۆچی داوای مۆڵەت دەکات و بۆ کوردستان دەگەرێتەوە. ماوەی گەشتەکەی خان ئەحمەد خان لەکاتی بەرێکەوتنی تا ڕۆژی گەرانەوەی (حەوت ساڵ و سێ مانگ) درێژەی کێشاوە. دوای سێ ساڵی دیکە، شا عەباس دەمرێت و لەجومادی الاخری ساڵی ١٠٣٨ کۆچی، شا سەفی، لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دادەنیشێت. وشەی (ظل حق) مێژووی دەستپێکردنی پاشایەتی ئەوە. شا سەفی هاوشێوەی شا عەباس هەڵسوکەوت لەگەڵ خان ئەحمەد خان دەکات و بەهەموو شێوەیەك ڕێزی دەگرێت. خان ئەحمەد خان لەزەرین کلاهی (کلاو زێڕین) هاوسەری کورێکی هەیە بەناوی سورخاب. لەهەرەتی گەنجی، شا عەباس ئەو دەباتە دەرباری خۆی و چەند کەسێك بۆ پەروەردە کردنی ڕادەسپێرێت و لەئەنجامی ئەم کارە، سورخاب بەگ، بەجوانی زانست و بوێری دەرازێتەوە. سلێمان خانی ئەردەلان کەئامارژەی پێدەدەین، شا لەو گەنجە پاکە، دڵگرمیێ دەکات کەنیازی گرتنە دەستی پاشایەتی لەسەردایە. شا سەفی بۆ پاراستنی تاج و تەختی خۆی، بێ لێکۆڵینەوە و ئەندێشە کردن لەساڵی ١٠٣٩ فەرمان دەدات چاوی ئەو گەنجە ئەردەلانییە کوێر بکەن. خان ئەحمەد خان لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، ئاوزی لەسەردا نامێنێت و شێت دەبێت و ئەم هۆنراوەی دێتە سەر زار:

( بی تو ای جان جهان با دل خونین چه کنم
بهر بی حشمتت ای چشم جهان بین چه کنم
بی گنه دیدهات از حدقه برون آوردند
چشم من کور، بگو پس من مسکین چه کنم)

ڕۆژ بەڕۆژ نەخۆشی مالیخۆلیایی لەناخیدا پەرەدەستێنێت و کردەوەی شێتانە و مەترسیداری لێ دەبینرێت. سەرئەنجام بەڕەزامەندی و بڕیاری سەرۆك و میرەکانی کوردستان ئەو شێرە بوێرە زنجیر دەکرێت و ئیسماعیل بەگ، گەورە باوەگەورێی عینایەت الله بەگ، کەلەو کاتەدا وەزیر بووە، بۆ ماوەی ساڵێك و بەڕاوێژ وڵات بەڕێوە دەبات و ڕێگەی نەداوە، هیچ کەلێن و ڕەخنەیەك لەحکومەتی کوردستان دروست ببێت. دوای یەکساڵ لەنەخۆشیەکەی خان ئەحمەد خان، چاکبۆتەوە و دووبارە جڵەوی کاروبارەکانی گرتۆتە دەست. خوالێخۆشبوو مەلا یەعقوبی قازی، بۆ ئەم کارەساتە دەنووسێت:

(احمد از این خبر کەدوش آمد
غرق در ناله و خروش آمد
در غلط گشت ابله و مجنون
دل اش از داغ شه بەجوش آمد
باز در غم برای فرزندش
دل اش از بی هشی به هوش آمد)

خان ئەحمەد خان دوای باشبوونەوەی لەنەخۆشی، دەستبەجێ گوێرایەڵی و فەرمانبەری خۆی بۆ سوڵتان موراد خان، سوڵتانی عوسمانی نیشان دەدات و دەست بەکۆکردنەوەی سوپا لەناوچەکانی دەوروبەر دەکات و لەساڵی ١٠٤١ هێرش دەکاتە سەر خاکی ئێران. لەماوەیەکی کەمدا کرماشان، سەنقور، هەمەدان، گەڕوس، خۆی و ورمێ دەخاتە ژێر دەستی خۆی و کارگوزارەکانی خۆی لەو ناوچانە دادەنێت. بەناوی خۆیەوە سکە لێدەدات و لەمینبەر و مزگەوتەکان بەناوی خان ئەحمەد خان وتار دەخوێندرێتەوە و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەڕەسمی پاشایەتی کردووە.

ئەو وتارەی لەڕۆژی دانیشتنی ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی و لەقەڵای حەسەن ئاوا خوێندرایەوە، وتاری خوارەوەیە کەخوالێخۆشبوو عەبدولغەفاری مەردۆخی (گەورە باوەگەورێی نوسەر) خوێندوویەتییەوە و ئەمە یەکەم وتارە لەکوردستانی ئەردەڵان خوێندرابێتەوە:

((الحمداللة الذي اصطفى لرسالتة على البرية احمد المختار، و ايده بالتاج و المعراج و علمه انواع الرموز و الاسرار. ارسلة و رحمة للعالمين فى ذلك لعبرة لا ولى الابصار و سلطة على كافة البشر ان الانسان لظلوم كفار شرف آبانا آدم بشريفة انى جاعل فى الارض خليفة و بجله تبجيلا و كرمه بكريمة و لقد كرمنا بنى آدم و فضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلا و الصلوة و السلام على سيدنا احمد المبعوث على الاسود و الاحمر، و على آله و اصحابه ما ازهر شجر و اثمر الذى خضعت جباه الجبابرة لدى عتبته العليه بالعشى و الاشراق و توجهت وجوه الاكاسرة الى سدته السنية من جميع الاقطار و الافلق خصوصا سلطاننا الذى ابصر آمالنا بنور حدقة جلاله و جماله والافهام و تفرحت من كمال شمس سيرته النفوس و الاوهام. نظم امور مما لكنا بسهمه الثاقب و اصلح مصالح امالنا براية الصائب. خليفة ملك الافاق سطوته و الحق كان مداه اية سلكا. يحوم حول ذراه العالمون

كما، ترى الحجيج ببيت الله معتركا. يحيى نسيم رضى منه الزمان و كم. مكافح بلظى من سخطه هلكا. اطار صاعقة من نصله فبها. الى السلمك لواء الشرع فدسكما و صادف الرشد منها كل معتسف، قد كان فى ظلمات الغى منهمكا. فالدين صار قرير العين مبتسما و الملك اقبل بالاقبال ممتسكا. علا فاصبح يدعوه الورى. ملكا وريثما فتحوا عينا غدا ملكا، باسط بساط العل و الانصاف و قامع اساس الجور والاعتساف، منبع الجود و السخاء و معدن الحلم و الحياء و الى لواء الولاية فى الافاق و مالك سرير السلطنة بالاستحقاق. الوالى ابن الوالى والى و الاشان خان احمد خان اردلان پادشاه بالاستقلال ممالك كردستان صانه الله تعالى عن طوارق الحدثان و متعنا بدوام دولته و قوام شوكته الى مديد الزمان، بحق محمد وآله الطاهره و بشرف سورة المباركه الفاتحه))

کاتێك شا سەفی لەم بارودۆخە ئاگادار دەبێتەوە، سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی زاڵ خان و سیاوەش خان، بۆ سەرکوت کردنی خان ئەحمەد خان ڕەوانە دەکات. خان ئەحمەد خان، سوڵتان موراد لەم پێشهاتە ئاگادار دەکاتەوە. بەنوێنەرایەتی سوڵتانی ڕۆم، مەنوچێهر پاشا لەگەڵ دوو هەزار سوار بۆ هاوکاری کردنی خان ئەحمەد خان بەڕێدەکەوێت. لە ٢٧ ڕەبیع الاوەلی ١٠٤٦ کۆچی، سوپای ڕۆم و قزڵباش لەکەنار دەریاچەی مەریوان ڕووبەڕوو بوونەوە و لە ٦ ڕەبیع ئەلثانی، سوپای ڕۆم و خان ئەحمەد خان، ڕووبەڕووی شکست دەبنەوە و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. خان ئەحمەد خان و دەستەیەك لەمیر و سەرکردەکان ڕێگەی موسڵ دەگرنەبەر و ناوەندی فەرمانڕەوایەتی خۆیان بۆ موسڵ و کەرکوك دەگوازنەوە. سلێمانی و شارەزوور لەم کاتەدا لەژێر دەسەڵاتی خان ئەحمەد خان بووە.

سوڵتان موراد لەتۆڵەی ئەم شکستە، لە ٣ ڕەمەزانی ساڵی ١٠٤٦، سوپایەکی پێکهاتوو لەشەش فەوج پیادە نیزام و چوار هەزار سوارە، جیاواز لەسوپاکەی خان ئەحمەد خان، بەفەرماندەیی خوسرەو پاشای عەسکەر، بۆ گرتنی عێراق و کوردستان ڕادەسپێرێت. شا سەفی کاتێك لەم هێرشە ئاگادار دەبێتەوە، زەینەڵ خانی سوپاسالاری شاملویی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ کوردستان ڕەوانە دەکات. شای سەفی خۆی لەپشتی ئەم سوپایە، لەگەڵ سوپایەکی گەورە، ڕێگەی هەمەدان دەگرێتەبەر. زەینەڵ خان و سوپاکەی بەخێرایی دەگەنە مەریوان، خوسرەو پاشا کاتێك هەواڵی گەیشتنی سوپای ئێران بۆ مەریوان دەبیستێت، سوپاکەی خۆی بەرەو ئەو شارە دەبات و جارێکی دیکە جەنگ لەدەشتی مەریوان بڵێسە دەسێنێت. دوای کوشت و کوشتاری فراوان و زەرەر و زیانی زۆر، سوپای قزڵباشی ئێران

شکست دەخوات و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. کاتێك سوپای تێکشکاوی ئێران دەگاتە هەمەدان، شا سەفی، زەینەڵ خان دەخاتە ناو دەمی تۆپێك و خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکات. خوسرەو پاشای سەرکردە، شوێنی سوپای تێکشکاوی ئێران دەکەوێت و دەگاتە سنە. دوای شەوێك وەستان لەو شارە، ڕێگەی هەمەدان دەگرێتەبەر و دەگاتە ناوچەی ئیسفەند ئاوا و سنوری عەلی لەشکەر. لەوێ دەبینێت دانیشتووان بەفەرمانی شا سەفی ناوچەکەیان بەجێهێشتووە و هیچ گوندێك بۆ دابین کردنی نیازی سوپاکەی نابینرێت. بەناچاری ڕێگەی بۆ ناوچەکانی دەرگەزین دەگۆڕێت و لەوێ دووبارە ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت. سوپای خوسرەو پاشا لەبەر کەمی خواردەمەنی و توێشوو و کەرەستەکانی جەنگ، شکست دەخوات و ڕێگەی گەڕانەوە بۆ بەغداد دەگرنەبەر.

شا سەفی دوای لەناوبردنی خوسرەو پاشا، سلێمان خان کوڕی میر عەلەم ئەلدین، نەوەی تەیمورخانی ئەردەڵان وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاری دەکات کە لەو کاتەدا یەکێك لەخزمەتگوزارانی شا سەفی و یەکێك لەکەسە باوەڕپێکراوەکانی بوو. شاسەفی، سلێمان خان لەگەڵ ژمارەیەکی کەم ڕەوانەی سنە و شارەزوور دەکات.

### حکومەتی سلێمان خانی ئەردەڵان

سلێمان خانی ئەردەڵان، کوڕی عەلەم ئەلدین لە ٤ شەوالی ساڵی١٠٤٦ کۆچی بەفەرمانی شا سەفی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا. شا سەفی هەمان سام میرزا کوڕی سەفی میرزا کوڕی شا عەباسە و شا عەباس نازناوی شا سەفی پێبەخشیوە. سلێمان خان پێشنیاری کردبوو ناوەندی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بۆ شاری سنە بگوازرێتەوە. لەبەر ئەمە لەگەڵ هاتنی بۆ کوردستان لە زیقەعدەی ١٠٤٦، گوندی سنە کە لەو ڕۆژەدا یەکێك لەگوندە بچووکەکانی کوردستان بوو و تایەفەی کەوش زێڕینە لەوێ نیشتەجێ بوون، گەورە و فراوان دەکات. تایەفەی کەوش زێڕین یا زێڕین کەوش، ئەو تایەفەن کەپێشتر ئاماژەمان پێدا و ڕەچەڵەکی ئەوان بۆ توسی نەوزەر دەگەڕێتەوە.

قەڵای حکومەتی کە لەناوەڕاستی شارەکە و لەسەر تەپۆڵکەیەك جێگیرە و قەڵایەکی بەهێزە و بەسنەدژ ناویان بردووە. یانی قەڵای سنە (دژ بەمانای قەڵایە). دواتر عەرەبەکان گۆڕانیان بەسەر ئەو وشەدا هێناوە و بۆتە سنەدج و سەرئەنجام لەئەنجامی گۆڕانکارییەکان بۆتە سەنەندج. ئەم قەڵا، هەمان قەڵای حکومەتییە کە تا ساڵی ١٣٤٧ کۆچی، ناوەندی

فەرمانڕەواکان بووە. لەساڵی ١٣٤٧ بۆتە شوێنێك بۆ هێزە دەوڵەتییەکان.
سلێمان خان جیاواز لەقەڵای حکومەتی، چەندین بینا و بازاڕ و مزگەوتی لای ئەو قەڵایە دروستکردووە. جۆگەیەکی لێداوە کە لەناوچەکانی سەرنودی و لەڕۆژئاوای شارەکە جێگیرە و ئاوی جۆگەکەی بردۆتە ناو قەڵاکە. بەم دواییانە حەسەن عەلی خانیش لەساڵی ١٢١٠ لەکاتی فەرمانڕەوایەتی خۆی، ئەو جۆگەب نۆژەن کردەوە و چەندین ڕێڕەوی بۆ دروستکردووە. لەساڵی ١٣٤٩ کۆچی بەهەوڵ و ماندووبوونی سەرهەنگ مەحمود خانی ئەمینی، سەرۆکی تیپی سەربەخۆی کوردستان، لەبەغدادەوە بۆری ئاسنیان هێناوە و لەقەڵای حکومەتی تا دەرەوەی شارەکە، بۆریان بۆ ئاو داناوە.
سلێمان خان دوای دروستکردنی قەڵای حکومەتی لەسنە، قەڵای زەڵم، پڵنگان، مەریوان و حەسەن ئاوای وێران کردووە. خان ئەحمەد خان کەهەواڵی حکومەتی سلێمان خان و کردەوەکانی ئەو دەبیستێت، لەساڵی ١٠٤٧ کۆچی لەگەڵ دوانزە هەزار سوار و پیادە لەموسڵەوە بەمەبەستی دووبارە دەستگرتنەوە بەسەر کوردستان و سەرکوت کردنی سلێمان خان، بەڕێدەکەوێت و دەربەندی چەقان تێدەپەڕێنێت و دێتە ناو سنوری فەرمانڕەوایەتی سلێمان خان. سلێمان خان کەپێشتر شا سەفی لەهێرشی خان ئەحمەد خان ئاگادار کردبوویەوە، بەخێرایی لەلایەن دەرباری شاری ئەڤی، ئالی بالی زەنگەنە، سەرۆکی ئاخوڕی پاشا (پێشتر ئاماژەمان بە ئالی بالیدا) لەگەڵ سێسەد سوار، بۆ پاراستنی قەڵای حکومەتی ڕادەسپێرێت. دواتر سیاوەش بەگی قوولەر ئاغاسی و شا وێردی خان، فەرمانڕەوای لوڕستان و ئاقاخانی مقەدەمی جوانشیری، هەرکام لەگەڵ سوپاکەی خۆیان، فەرمانی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خان ئەحمەد خانیان پێدەدرێت. لەدەشتی مەریوان جارێکی دیکە ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت و شەڕێکی دژوار و مەترسیدار ڕوودەدات. دوای کۆشش و هەوڵی زۆر، چەند کەس لەپاشاکانی عوسمانی ناو سوپای خان ئەحمەد خان دەکوژرێن.
خان ئەحمەد خان کاتێك دەبینێت لاوازی و بێهێزی تەنگی بەسوپاکەی هەڵچنیوە، شەوی ئەو ڕۆژە دووبارە ڕێگەی موسڵ دەگرێتەبەر. دوای شەش مانگ لەساڵی ١٠٤٨ کۆچی لەموسڵ کۆچی دوایی دەکات. سەرۆکەکانی کوردستان جەنازەی ئەو لای گۆڕی یونسی پێغەمبەر بەخاك دەسپێرن. ماوەی فەرمانڕەوایی خان ئەحمەد خان لەکوردستان دوای باوکی ٢٣ ساڵ درێژەی کێشاوە کەپێنج ساڵی وەك پاشا و ناوی خۆی لەسەر سکەکان

هەڵکەندووە و بەناوی خۆی وتاری خوێندۆتەوە. دوای مردنی خان ئەحمەد خان، سلێمان خان ئاسوودە دەبێت و بێ نیگەرانی، فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات.

سلێمان خان سەرەتا لای خان ئەحمەد خانی کوڕە مامی بووە و چوونکە بەردەوام لەجەنگ و شەڕەکان، بوێری و ئازایەتی ئەوی بینیوە، لەناخەوە حەزی کردووە بەجۆرێك لەناوی ببات. سلێمان خان لەمەبەستی خان ئەحمەد خان ئاگادار بۆتەوە و بێ ئاگادار کردنەوەی کەس هەڵاتووە و خۆی گەیاندۆتە دەرباری شا سەفی. ماوەیەك لەوێ ژیان بەسەر دەبات و بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لەخان ئەحمەد خان، دڵی شا سەفی لەسورخاب بەگی کوڕی خان ئەحمەد خان کرمێ دەکات و دەبێتە هۆی کوێر کردنی ئەو. (پێشتر ئاماژەمان پێدا.)

لەجەنگی هەمەدان کاتێك سوپای شای سەفی، لەگەڵ خوسرەو پاشای فەرماندەی سوپای رۆم ڕووبەڕوو دەبنەوە، سلێمان خان بوێری زۆری لەخۆی نیشانداوە و چەندین کەس لەجەنگاوەرانی ڕۆمی کوشتووە و لەئەنجامی ئەم کارەی ڕێزی شایانەی لێگیراوە و دەرئەنجام فەرمانڕەوایەتی کوردستانی پێبەخشراوە.

دوای شا سەفی، شا عەباسی دووەمیش، ڕێزی لەسلێمان خان گرتووە. سلێمان خان ماوەی بیست ساڵ فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە و لەساڵی ١٠٦٦ مردووە.

## حکومەتی کەلب عەلی خانی ئەردەلان

دوای مردنی سلێمان خان، شا عەباسی دووەم، بەپێی پێشنیاری مەریدویس، سوڵتانی کەلهوڕ کەیەکێك لەخزمەکانی سلێمان خان بووە، کوردستان بۆ شەش ناوچە دابەش کردووە و هەر بەشێکی بەیەکێك لەکەسەکانی سلێمان خان سپاردووە.

١. ویلایەتی سنە و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی بەکەلب عەلی خان کوڕە گەورەی سلێمان خان سپاردووە. ٢. فەرمانڕەوایی مەریوانی بەخوسرەو خان، یەکێکی دیکە لەکوڕەکانی سلێمان خان سپاردووە، ٣. سەقز و سیاکێوی بەسوهراب سوڵتان کوڕە بچووکەی سپاردووە، ٤. ناوچەکانی پڵنگانی بەمەریدوس سوڵتان سپاردووە، ٥. ناوچەکانی شارەزوور و شاربازێری بەمحەممەد خانی گورجی سپاردووە، ٦. فەرمانڕەوایەتی جوانڕۆی بەسەفی خانی سوڵتان سپاردووە و فەرمانی بەهەموویانداوە ملکەچ و فەرمانبرداری کەلب عەلی خان بن و محەممەد سوڵتانی گوڵباغی و میر وسەرکردەکانی دیکەی لەخزمەتی کەلب عەلی خان بۆ یەکێك لەپیشەکانی دیوان راسپاردووە. لەساڵی ١٠٦٧ کۆچی، کەلب عەلی خان لەویلایەتی سنە

جێگیر بووە. فەرمانڕەواکانی دیکەیش بەرەو ناوچەکانی فەرمانڕەوایەتی خۆیان ڕۆشتوون. کەلب عەلی خان بەنیشاندانی توانایی و لێهاتوویی خۆی توانیویەتی سەرنجی شا عەباسی دووەم رابکێشێت و ڕێز و خەڵاتی شایانە بەدەست بێنێت. لەو ڕۆژگارەدا دانیشتووانی خوزستان ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە. بەفەرمانی دەرباری ئێران، کەلب عەلی خان لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بۆ سەرکوت کردنی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە رادەسپێردرێت. کەلب عەلی خان بەپێی فەرمانی شایانە، بۆ سەرکوت کردنیان ملی ڕێگە دەگرێتەبەر و بوێرانە و بەخێرایی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە تەمێ و سەرکوت دەکات و ئارامی و ئاسایش بۆ ناوچەی خوزستان دەگێڕێتەوە و لەئەنجامی ئەم خزمەتە زیاتر لەلایەن پاشای ئێرانەوە ڕێزی لێدەگیرێت. کەلب عەلی خان لەکۆکردنەوەی زێڕ و زیو و کۆکردنەوەی مەروماڵات و ولاغ، زێدەڕۆیی کردووە و کەسێکی بەخشندە و بەخشەر بووە. دوای ١٥ ساڵ فەرمانڕەوایەتی لەساڵی ١٠٨٢ کۆچی، دەمرێت.

## حکومەتی خان ئەحمەد خانی دووەمی ئەردەلان

خان ئەحمەد خان کوڕە گەورەی کەلب عەلی خان دوای مردنی باوکی، لەساڵی ١٠٨٢ کۆچی، بەپێی فەرمانی شا سلێمانی سەفەوی کوڕی شاعەباسی دووەم، جێگەی باوکی گرتۆتەوە بەڵام لەجیاتی سەرقاڵ بوون بەکاروباری بەڕێوەبردنی وڵات سەرقاڵی رابواردن و مەی خواردنەوە بووە و لەبەخشین و دەستبڵاوی، زێدەڕۆیی کردووە. لەماوەیەکی کەمدا، هەموو پارەی خەزێنەکانی باوکی بەفیڕۆ داوە. لەبەر ئەوەی زێڕ و زیوی زۆری لەناو خەڵکدا دابەش کردووە، خەڵك ماڵەکەی ئەویان بەخانەی زێڕینە ناو بردووە. جگە لەخۆشگوزەرانی، هیچ کارێکی دیکەی ئەنجام نەداوە و جگە لەکەمتەرخەمی و بەفیڕۆدانی کات، ئارەزوومەندی هیچ کارێکی دیکە نەبووە. لەئەنجامی کەمتەرخەمییەکانی، بێنەزمی و پشێوی و ستەم و نائەمنی باڵ بەسەر وڵاتدا دەکێشێت. خوسرەوخانی مامی، هەرچەند سەرکۆنەی کردووە بەڵام بێ ئەنجام بووە و سەرئەنجام، شا سلێمانی سەفەوی لەبارودۆخ ئاگادار کردۆتەوە. شا سلێمان لەزیقەعدەی ١٠٩٠ حکومەتی کوردستانی بەخوسرەوخان سپاردووە و خان ئەحمەد خانی دووەم، بەهۆی نەزانی تەختی فەرمانڕەوایەتی لەدەست دەدات.

## حکومەتی خوسرەوخانی ئەردەلان

دوای لەسەر کار لابردنی خان ئەحمەد خان، خوسرەو خانی مامی لەساڵی ١٠٩١ فەرمانڕەوایەتی کوردستانی پێدەسپێردرێت، ئەسپی خوسرەوخان لەقەڵای مەریوانەوە بەرەو سنەدژ، غاریداوە و بەشێوەیەکی لەناکاو ڕۆشتۆتە ناو سنە و بەخێرایی خان ئەحمەد خان، قۆڵبەست و ڕەوانەی ئیسفەهانی دەکات و خۆی جڵەوی کاروباری فەرمانڕەوایەتی دەگرێتە دەست بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، بەشێوەیەکی نەشیاو و ستەمکردن و جوێندان و دەستدرێژی، هەڵسوکەوت لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکە دەکات. ئاگری توڕەیی و ڕق و کینەی خەڵکان دەگاتە مانگ و ئاسمان. خەڵکان لەستەم و کارە نەشیاوەکانی بێزار و چەند کەسێك شەوانە ملی ڕێگە بەرەو ئیسفەهان دەگرنەبەر. شا سلێمان ڕێزیان دەگرێت و ئەوان بۆ لای خوسرەوخان دەگەڕێنێتەوە تا دڵنەواییان بکات. خوسرەوخان لەم کارەی پاشا بەشێوەیەکی خراپ کەڵك وەردەگرێت و بەپێچەوانەی فەرمانی شا، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکات و بەهەر بیانوێك سەرکوت و لەناویان دەبات و تەنانەت دەستەیەکیان دەکوژێت. کاتێك شا لەڕووداوەکان ئاگادار دەبێتەوە، بەخێرایی فەرمان بەتەیمور خانی ئاجورلو دەدات. تەیمورخان لەساڵی ١٩٠٣ دێتە ناو کوردستان و خوسرەو خان دەگرێت و ڕەوانەی ئیسفەهانی دەکات و خۆی فەرمانڕەوایەتی ئەردەڵان دەگرێتەدەست و خوسرەوخان لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئیسفەهان، لەناو گۆڕەپانی شایی، ئیعدام دەکرێت.

## حکومەتی تەیمورخانی ئاجورلویی

دوای خوسرەو خانی ئەردەڵان، تەیمورخانی ئاجورلویی، بەفەرمانی شا سلێمانی سەفەوی لەساڵی ١٩٠٣، لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی ئەردەڵان دادەنیشێت و ئەمە یەکەم فەرمانڕەوایە لەتایەفەیەکی جیاواز لەئەردەڵانییەکان بەهۆی خراپەکاری فەرمانڕەواکانی ئەردەڵان، لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت. ئەمە کەسە چوونکە لەدانیشتووانی ناوچەکە نەبوو و نەدوژمنی کەس بووە نەدۆست، زیاد لەڕادە چاکەی لەگەڵ دانیشتووان کردووە و هاوشێوەی برا هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردوون و هەموویانی شەیدای خۆی کردووە. ماوەی شەش ساڵ بەمشێوەیە فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە و لەساڵی ١٠٩٩ کۆچی لەسەر کار لابراوە.

## حکومەتی خان ئەحمەد خانی ئەردەلان، بۆ دووەم جار

دوای لابردنی تەیمورخانی ئاجورلو، دووبارە خان ئەحمەد خانی دووەم، کوڕی کەلب عەلی خان لەساڵی ١٠٩٩ بەپێی فەرمانی شا سلێمانی سەفەوی، بۆ حکومەتی کوردستان و شارەزوور دەگەڕێتەوە. خان ئەحمەد خان لەم گەڕانەوەیدا لەجیاتی ئەوەی قەرەبووی رابردوو بکاتەوە و هیوا بەدانیشتووان و دڵنەواییان بکات، پێش هەر شتێك بەرابواردن و خۆشگوزەرانی و ئازاردان و ستەمکردن لەخەڵکان سەرقاڵ دەبێت و خەڵك جارێکی دیکە بێ هیوا و وڵات گرفتاری پەرێشانی و پشێوی و بارودۆخ بۆ شۆڕش ئامادە دەبێت. سلێمان پاشای بابان کاتێك لەبارودۆخی خان ئەحمەد خان و کوردستان ئاگادار دەبێتەوە، لەگەڵ دەستەیەك لەکورد و عەرەبەکان لەساڵی ١١٠٠ کۆچی، هێرش دەکاتە سەر کوردستان و دەست بەسەر مەریوان و سەقز و هەوراماندا دەگرێت و سوهراب سوڵتانی فەرمانڕەوای سەقز کوڕی کەلب عەلی خان و ئیبراهیم بەگی میرئەسکەندەری، فەرمانڕەوای مەریوان دەگرێت و دەیانکوژێت. خان ئەحمەد، شا سلێمان لەم بارودۆخە ئاگادار دەکاتەوە و خۆی بۆ بەرگری کردن ئامادە دەکات. لەلایەن شا سلێمانەوە، رۆستەم خانی سوپاسالار و عەباس قولی خانی زیاد ئۆغلی ناسراو بەعەباس خانی قاجار، لەگەڵ سوپایەکی تەیار بۆ هاوکاری خان ئەحمەد خان ڕوودەکەنە کوردستان. سوپای پاشا و سوپای ئەحمەد خان بەگشتی ڕوودەکەنە مەریوان و لەدەشتی مەریوان ڕووبەڕوو بوونەوە ڕوودەدات. دوای دوو ڕۆژ جەنگ سلێمان پاشا شکست دەخوات و زیاتر لەچوار هەزار کەس لەسوپاکەی دەکوژرێن و خێوەت و بارەگاکانیان لەلایەن قزڵباشەکانەوە تاڵان دەکرێت.

عەباس خانی زیاد ئۆغلی، دوای ئەم سەرکەوتنە مێژووییە بەهۆی دووزمانی قاسم سوڵتانی هەورامی، سەرچاوەی خراپەکاری و هۆکاری هێرشی سلێمان پاشای بابان، تۆمەتی ناڕەوا بۆ دانیشتووانی کوردستان هەڵدەبەستێت و دەستبەگرتن و قۆڵبەست کردنی خەڵکان دەکات. دەستەیەك شەوانە بەرەو وڵاتی عوسمان هەڵدێن و دەستەیەك گرفتار دەبن. لەناو گرفتاران چەند کەسێك لەگەورە پیاوان و پیاو ماقووڵانی کوردستان لەگەڵ هەزار و دووسەد کەس لەمسکێنەکان دەبینرێت و دوای زەوتکردنی سامانی هەموویان، بەشێوازی جۆراوجۆر دەیانکوژن و تەپۆڵکەیەکی گەورە لەجەنازەکانی ئەوان لەدەشتی مەریوان پێکدەهێنن. قاسم سوڵتانی هەورامی کەسەرچاوەی هەموو ئەم کوشت و کوشتارە بووە، دەکوژێت و سەری ئەو

دەکات بەدارێکەوە و وەك ئالآ هەڵیدەکات. هێشتا ئەو تەپۆڵکەیە هاوشێوەی چیایەکە لەکەلەی سەر. شا سلێمان لەم کردەوە وەحشیانەی عەباس خان خەمبار و بەخێرایی فەرمانی گەڕانەوەی بۆ دەنێرێت و لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئیسفەهان لەگۆڕەپانی شایی ئیعدامی دەکات. ڕۆژی پێنجشەممە ٦ زیحەججەی ١١٠٥ شا سلێمان دەمرێت، ڕۆژی سێشەممە ١٤ زیحەججەی هەمان ساڵ، سوڵتان حسەین لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دادەنیشێت و لەساڵی ١١٠٧، خان ئەحمەد خان بەفەرمانی شا سوڵتان حسەینی سەفەوی لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دووردەخرێتەوە و محەممەد خان کوڕی خوسرەو خانی کوژراو، بۆ ئەم پۆستە دەستنیشان دەکرێت. ماوەی فەرمانڕەوایەتی خان ئەحمەد خان لەجاری دووەم، هەشت ساڵ و چەند مانگێك درێژەی کێشاوە.

## حکومەتی محەممەد خانی ئەردەلان

دوای لابردنی ئەحمەد خانی دووەم لەجاری دووەم، محەممەد خانی ئەردەلآنی، کوڕی خوسرەوخانی کوژراو، لەساڵی ١١٠٧ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی کوردستان دادەنیشێت و دەست بەفراوان کردن و ئاوادن کردنەوەی کوردستان دەکات. شا سوڵتان حسەینی سەفەوی بۆ گەڕاندنەوەی نەزم و کۆکردنەوەی سەرۆك و ئەو میرانەی لەئەنجامی کردەوە وەحشیانەکەی عەباس قولی خان، بۆ ناوچەکانی دەوروبەر هەلآتبوون، حسەین خانی سەرداری لوڕ، بۆ کوردستان و ئازەربایەجان و شارەزوور ڕەوانە دەکات تا خراپەکاران سەرکوت و چاکەخوازان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە و تا رادەیەك لەم کارەیدا سەرکەوتن بەدەست دێنێت و دەگەڕێتەوە. دواتر جەهانگیر سوڵتان، کوڕی کەلب عەلی خانی ئەردەلآن کەخوازیاری بەدەستهێنانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بووە، لەگەڵ دەستەیەك لەدانیشتووان پەیمان دەبەستێت و لەساڵی ١١١٣ کۆچی دژی محەممەد خانی ئەردەلآن ئالآی شۆڕش بەرز دەکاتەوە و سکالآی بۆ دەرباری شا سوڵتان حسەینی سەفەوی بەرز دەکاتەوە. لەئەنجامی ئەم شۆڕشە و ستەمکاری، محەممەد خانی ئەردەلآن لەسەر کار لادەبرێت و محەممەد خانی گورجی بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەستنیشان دەکرێت. ماوەی فەرمانڕەوایەتی محەممەد خانی ئەردەلآن شەش ساڵ درێژەی کێشاوە.

## حکومەتی محەممەد خانی گورجی

دوای لابردنی محەممەد خانی ئەردەلآن، لەرەبیع الاوەلی ساڵی ١١١٣، محەممەد خانی

گورجی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت. ئەم محەممەد خانە دوای هاتنی بۆ کوردستان خۆی بەشافعی مەزهەب و سوونی لەقەڵەم دەدات و پێنج نوێژەکەی لەگەڵ خەڵکان خوێندووە و بۆ فراوان کردنی سنە هەوڵی زۆری بەخەرجداوە، مزگەوت و قوتابخانەکانی نۆژەن کردۆتەوە و لەتەنیش بازاڕ، لەزەوییەك کەمەلا عەبدولکەریمی قازی وەك میرات بۆی مابوویەوە، کاروانسەرایەك دروست دەکات کەپێکهاتبوو لەشەست و شەش حوجرە. دوای تەواو کردنی ئەم کاروانسەرایە، داهاتەکەی بۆ کاری خێرخوازی تەرخان کردووە و سەرپەرەستی کردنی بەمەلا عەبدولکەریمی قازی سپاردووە تا ساڵانە ١٠٪ داهاتەکەی بۆ خۆی هەڵبگرێت (چوونکە خاوەنی زەوییەکە بووە). محەممەد خان دوای سێ ساڵ فەرمانڕەوایەتی، خراپەکاران، پاشا لەمەزهەبەکەی ئەو (سوونی مەزهەب) ئاگادار دەکەنەوە و لەساڵی ١١١٦ محەممەد خانی ئاماژە پێدراو، لەسەر کار لادەبرێت و حەسەن عەلی خان جێگەی دەگرێتەوە.

## حکومەتی حەسەن عەلی خان

دوای لابردنی محەممەد خانی گورجی لەساڵی ١١١٦ بەپێی فەرمانی شا سوڵتان حسەین، حەسەن عەلی خان کوڕی محەممەد خانی ئیعتیماد ئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت. ئەم فەرمانڕەوایە بەپێچەوانەی محەممەد خانی گورجی، کەسێکی دەمارگیر لەمەزهەبی شیعە و بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو مەزهەبە هەموو هەوڵەکانی خۆی خستۆتە گەڕ. بەرادەیەك لەمەبەستەیدا زێدەڕۆیی کردووە کەبۆتە دوژمنی دانیشتووان و گیان و سامانی سوونی مەزهەبەکان بەڕەوا دەزانێت. وەك دەڵێن ڕۆژێك بەمەبەستی ڕاو کردن لەقەڵای حکومەتی دێتەدەر و بەسواری ئەسپ لای بارەگای پیر عومەر، تێپەڕ دەبێت لەکەسانی دەوروبەری دەپرسێت ئێرە شوێنی کێیە؟ پێی دەڵێن: پیر عومەر. ئەم کەسە وەحشییە، بەهۆی دەمارگیری و بیستنی ناوی عومەر، تووڕە دەبێت و فەرمان دەدات تا گەڕانەوەی ئەو ئارامگاکە لەگەڵ خاك یەکسان بکەن. بەرێکەوت تا گەڕانەوەی ئەو هیچ شوێنەوارێك لەئارامگاکە نامێنێت و کاتی گەڕانەوە، گرفتاری دڵ ئێشە دەبێت و لەکاژێری چواری شەو، دەمرێت. لەکاتی مردن بەماڵ و منالەکەی خۆی دەڵێت: من نەخۆش نەبووم، پیرعومەر، تۆڵەی خۆی وەرگرتەوە.

پێشتر ئاماژەمان بەڕەچەڵەکی پیر عومەردا. ماوەی فەرمانڕەوایەتی حسەین خان کەمتر

لەدوو ساڵ بووە.

## حکومەتی حسەین عەلی خان برای حەسەن عەلی خان

دوای مردنی حەسەن عەلی خان، لەساڵی ١١١٨ کۆچی، حسەین عەلی خانی برای کوڕی مۆئمین خانی ئیعتیماد ئەلدەولە، بەفەرمانی شا سوڵتان حسەین، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە. ئەم فەرمانڕەوایە لەبراکەی دەمارگیرتر بووە بەتایبەت دوای مردنی براکەی و بیستنی ئەو قسە و قسەلۆکانەی سەبارەت بەمردنی ئەو وتراوە، زیاتر ئەوی تورە کردووە و بەهەر بیانوو و هۆکارێك، ئازاری دانیشتووانی کوردستانی داوە و ستەمی لێکردون. سەرئەنجام خەڵك چیتر بەکارەکانی ڕازی نەبوون و لەساڵی ١١١٩ دژی ئەو ئاڵای شۆرششیان بەرز کردۆتەوە و گەورە پیاوانی کوردستان ڕێگەی ئیسفەهان دەگرنەبەر و فەرمانی لەسەر کار لابردنی ئەو دەردەکەن و کەیخوسرەو بەگی یەساول جێگەی ئەو دەگرێتەوە. ماوەی حکومەتی حسەین عەلی خان، ساڵێك و چوار مانگ درێژەی کێشاوە.

## فەرمانڕەوایەتی کەیخوسرەو بەگی یەساول

دوای لابردنی حسەین عەلی خان لەساڵی ١١٢٠، کەیخوسرەو بەگ، یەساول شا جێگەی دەگرێتەوە. ئەم فەرمانڕەوایە دوای گەیشتنی بۆ کوردستان، دانیشتووان لەکار و کردەوەکانی ئەو ئاگادار دەبنەوە کەکەسێکی نەفس نزم و نانەجیب بووە. (یەساوڵ-قەراوڵ)

لەبەرئەمە چیتر خەڵکان تێکەڵی نابن و سەری کوڕنوشی بۆ دانانەوێنن و هیچ کام لەفەرمانەکانی جێبەجێ ناکرێت. سەرئەنجام پەیوەندی لەگەڵ دانیشتووان دەپچڕێت و خەڵك ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و تۆمارێك بۆ پاشا دەنووسن کەدانیشتووانی کوردستان سوونی مەزهەب و گۆڕینی مەزهەب لای دانیشتووان ڕێگەپێدراو نییە. کەواتە دیاریکردنی کەسێکی شیعەمەزهەب بەتایبەت ئەگەر دەمارگیر و نانەجیب و کەسێکی سووك بێت، دەرئەنجامەکەی ئاژاوە و پشێوی نێوان خەڵك و دەوڵەتە. ئەگەر مسکێنەکان ببینن پاشا ڕێز لەمەزهەبەکەیان ناگرێت، بەناچاری ئاوارەی وڵاتانی دیکە دەبن و پەنا بۆ دەوڵەتێکی دیکە دەبەن تا مەزهەب و ناموس و گیانیان پارێزراو بێت.

شا سوڵتان حسەین دوای خوێندنەوەی تۆماری، بەباشی دەزانێت فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەکوردستانییەکان یانی بنەماڵەی ئەردەڵان بسپێرێت. لەبەر ئەمە بەڕەزامەندی

دانیشتووان، حكومەتی كوردستان بەعەباس قولی خان كە لەخزمەكانی خان ئەحمەد خانی كوڕی هەڵۆ خان بووە، دەسپێرێت و خەلات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ دەنێرێت. عەباس قولی خان لەناكاو پێگەیەكی بەرز بەدەست دێنێت وفەرمانڕەوایەتی كوردستان دەگرێتەدەست.

ماوەی فەرمانڕەوایەتی كەیخوسرەو بەگی یەساول، ساڵێك كەمتر بووە.

## حكومەتی عەباس قولی خانی ئەردەلان

دوای لابردنی كەیخوسرەو بەگی یەساول، بەپێی ڕەزامەندی و پێشنیاری دانیشتووانی كوردستان، لەساڵی ١١٢١ كۆچی، عەباس قولی خانی ئەردەلان، نەوەی محەممەد خان، نەبیرەی خان ئەحمەد خان كوڕی هەڵۆخان، لەهەژاری ڕزگاری دەبێت و ڕاستەوخۆ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی كوردستان دادەنیشێت. دانیشتووان ئارەزوومەندانە قۆڵ بۆ ئەنجامدانی فەرمانەكانی هەڵدەكەن. شازادە و گەورە پیاوان شەو و ڕۆژ لەكۆڕ و دانیشتنەكانی ئامادە دەبن و خوازیارانە چاوەڕوانی فەرمان و وتەكانی دەبن. ئەویش هاوشێوەی كەسێكی خاوەن ئەزمون فەرمانڕەوایەتی دەكات.

لەساڵی ١١٢٨ فەرمان لەپاشاوە دێت كەعەباس قولی خان لەگەڵ سوپای كوردستان بۆ لەناوبردن و سەركوت كردنی فیتنە و ئاژاوەی مەریدوسی ئەفغانی، لەڕێگەی ڕەی، بەرەو قەندەهار و هەرات بەڕێبكەوێت. عەباس قولی خان لەگەڵ هەشت هەزار سواری شارەزا و بەئەزمون بەرەو شوێنی مەبەست ڕێدەكەوێت. كاتێك دەگەنە تاران، عەلی قولی بەگی ئەردەلان، كوڕی جەهانگیر سوڵتان نەبیرەی كەلب عەلی خان كەیەكێك لەسوارەكانی سوپا بووە، بەشێوەیەكی نهێنی سەركردەكان ئاگادار دەكاتەوە كەجەنگ لەئەفغانستان بۆ سوپای كوردستان جگە لەكوژران و لەبرسا مردن، هیچ دەرئەنجامێكی دیكەی نابێت. باشترە بگەڕێینەوە.

ئەم پیلانە كاریگەری لەسەر سوپاییەكان دادەنێت و شەوانە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. تەنیا خودی عەباس قولی خان و دووان لەكەسە نزیكەكانی لەتاران دەمێننەوە. عەباس قولی خان بەناچاری لەوێوە، پاشای ئێران لەڕووداوەكە ئاگادار دەكاتەوە. شا لەبێ ئەزموونی و نەشیاوی عەباس قولی خان توڕە دەبێت و فەرمانی زیندانی كردنی دەردەكات. لەگەڵ ئەوەیشدا فەرمانی فەرمانڕەوایەتی كوردستان لەگەڵ نازناوی خانی بەعەلی خانی فەڕاش

خەڵوەت بۆ عەلی قولی بەگی ئەردەڵان ڕەوانە دەکات. عەباس قولی خان بۆ ماوەی هەشت ساڵ فەرمانڕەوایەتی کردووە.

### حکومەتی عەلی قولی خانی ئەردەڵان

دوای لابردن و زینداني کردنی عەباس قولی خان لەساڵی ١٢١٩ کۆچی، عەلی قولی بەگ کوڕی جەهانگیر سوڵتان نەبیرەی کەلب عەلی خان، پێگەی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەدەستدێنێت. بەسەرهاتەکەی بەمشێوەیە کەعەلی قولی بەگی ئاماژە پێدراو، لەئەنجامی پشت تێکردنی ڕۆژگار، گرفتاری هەژاری و نەداری دەبێت و لەگوندی شەخڵە، یەکێك لەگوندەکانی خوڕخوڕەی کوردستان، نیشتەجێ دەبێت. دانیشتووانی ئەو گوندە لەدابین کردنی بژێوی ژیانی هاوکاری دەکەن. بەردەوام هاوڕێیان وکەسانی نزیك پێیان وتووە: تۆ یەکێك لەئەردەڵانییەکانیت و شیاو نییە نیشتەجێی گوند بیت، ئەگەر لەشاردا بیت، لەئێستادا یەکێك لەکەسەکانی ناو دامەزراوەی حکومەت دەبوویت. ئەو لەوەڵامدا وتوویەتی: ئەگەر خوا بیەوێت، لەشەخڵەیش ئەو پێگەم پێدەبەخشێت.

بەرێکەوت کاتی ڕەوانە بوونی عەباس قولی خان بەرەو هەرات و قەندهار، لێپرسراوی کۆکردنەوەی سوپا، عەلی قولی بەگ لەناو پێرستی سوارەکان دەنووسێت. دوای گەیشتنی سوپا بەتاران و هەڵاتنیان، عەلی قولی بەگ کەسەرچاوەی ئەم هەڵاتنە بووە، بۆ گوندی شەخڵە دەگەڕێتەوە.

عەباس قولی خان، لەنامەکەی خۆی بۆ پاشا، هۆکاری هەڵاتنی سوپاکەی بۆ پیلانەکەی عەلی قولی بەگ دەگێڕێتەوە. شا سوڵتان حسەین بێ ئاگا لەباروودۆخی عەلی قولی بەگ، گومان دەکات یەکێکە لەکەسە خاوەن دەسەڵات و کاریگەرەکانی ئەردەڵان و کوردستان کەدانیشتووان شوێنکەوتەی فەرمانەکانی ئەون و عەباس قولی خان بەبەراورد بەو، پێگەیەکی ئەوتۆی لای دانیشتووانی کوردستان نییە. ئەم گومانە، پاشا ناچار دەکات، فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی لەگەڵ نازناوی خانی بە عەلی خانی فەڕاش خەڵوەت بۆ قولی بەگ ڕەوانە بکات. عەلی خان لەگەڵ فەرمان و خەڵات دەگاتە کوردستان و بەدوای عەلی قولی بەگدا دەگەڕێت. دەڵێن لەگوندی شەخڵەیە. عەلی خان بەرەو گوندەکە بەڕێدەکەوێت. لەنزیك گوندی شەخڵە دەگاتە جۆگەیەکی گەورە کەلەوبەر جۆگەکە، عەلی قولی بەگ و سیان لەدانیشتووانی گوندە دانیشتبوون. عەلی خان دەپرسێت، قولی بەگ

لەکوێیە؟ عەل قولی بەگ بەسەیر کردنی قیافە و قەڵافەتی سوارەکە تێدەگات کەیەکێکە لەسوارە دەوڵەتییەکان و لەبەر ئەوەی بۆتە هۆکاری هەڵاتنی سوپاکەی عەباس قولی خان، گومانی لا دروست دەبێت و دەترسێت و دەڵێت: بۆچیتە؟ عەلی خان دەڵێت: فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتیم بۆ هێناوە. عەلی قولی خان، نیگەران و دەشڵەژێت، بۆ ئەوەی ڕاستی بابەتەکەی بۆ دەرکەوێت، یەکێك لەمسکێنەکان ڕادەسپێرێت تا عەلی خان بۆ ماوەی نیو کاژێر دوور بخاتەوە و خۆی بەخێرایی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ. دوای نیوکاژێر عەلی خان دەگاتە ناو گوندەکە و خەڵك بەسەرسوڕمانەوە لەدەوری کۆدەبنەوە. عەلی قولی بەگ سەرەتا خۆی نیشان نادات و دوای دڵنیابوون لەڕاستی ڕووداوەکە، خۆی نیشان دەدات. عەلی خان ڕێزی دەگرێت، جل و بەرگی پاشایەتی لەبەر و فەرمانی پاشایەتی تەسلیم دەکات. لەکۆتایی خوێندنەوەی فەرمانەکە، لەناکاو عەلی قولی بەگ دەبێتە فەرمانڕەوای کوردستان و بەدانیشتووانی گوندەکە دەڵێت: ((ئەموت ئەگەر خوا بیبەخشێت، لەشەڵخەیش دەیبەخشێت.))

ئەم ڕستەیە ئێستا لەکوردستان بۆتە پەند.

دوای دوو سێ ڕۆژ میر وسەرکردەکانی کوردستان ئاگادار دەبنەوە و بێ درەنگ ڕوو دەکەنە ماڵەکەی عەلی قولی خان. دوای ئامادەکاری ڕێوڕەسمی حکومەتی، بەرەو سنەدژ بەڕێدەکەون و لە ١٩ شەوالی ١١٢٩، لەقەڵای حکومەتی دادەبەزن. هاوکات لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە، دانیشتووانی لوڕستان و بەختیاری ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و شۆڕش دەستپێدەکەن. شا سوڵتان حسەین، فەرمانی سەرکوت کردنی ئەم شۆڕشە بەعەلی قولی خان و سوپای کوردستان دەدات. لەکاتی ڕووبەڕووی بوونەوەی کوردستان و شۆڕشگێران، عەلی قولی خان هاوشێوەی نیزامی دەوڵەتی سوپاکەی خۆی بۆ باڵی ڕاست و چەپ دابەش دەکات و خۆی لەناوەڕاستی سوپاکەی جێگیر دەبێت. ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت. سەرەتا سوارەکانی بەختیاری کەمێك خۆڕاگری دەکەن بەڵام دواتر بەخت پشتیان تێدەکات ودوای زەرەر و زیانێکی زۆر ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. شەششەد کەسیان لێ دیل دەکرێت و فەرمانڕەوای لوڕستان بەناچاری پەنا بۆ ئاخوری فەرمانڕەوای کوردستان دەبات. فەرمانڕەوا، ئەو و چەند کەس لەسەرۆك خێڵەکانی بەختیاری کەئەسیر کرابوون، بۆ دەرباری پاشا ڕەوانە و داوای بەخشینیان بۆ دەکات. شا سوڵتان لەئازایەتی و بوێری سوپای

کوردستان و شا عەلی قولی خان شادومان و بەداواکەی ڕازی دەبێت و ڕێز لەسەرۆکەکانی لوڕستان دەگرێت و مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێ دەدات. عەلی قولی خان دوای بەدەست هێنانی ئەم شانازییە بۆ سنەدژ دەگەڕێتەوە.

لەساڵی دووەمی فەرمانڕەوایەتی عەلی قولی خان، نەخۆشی تاعوون لەکوردستان بڵاو دەبێتەوە و نزیکەی هەشتا هەزار کەس لەدانیشتووانی شار و ناوچەکانی دەوروبەر بەهۆی ئەو پەتا کوشندەوە دەمرن و لەساڵی ١١٣٢ کۆچی کەلاوازی و ناتەوانی لەحکومەتی شا سوڵتان حسەین دەردەکەوێت، ئەفغانی و ئوزبەکەکان ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و شۆڕشێکی گشتی لەئێران دروست دەکەن. حسەین بەگ و دەروێش بەگی مەئمونی لەگەڵ دەستەیەك لەزاناکانی ئەردەڵان، دژی عەلی قولی خان پەیمان دەبەستن و خانە پاشا کوڕی محەممەد پاشای بابان کە لەکوڕە مامەکانی سلێمان پاشا و لەو کاتەدا فەرمانڕەوای سلێمانی و بابان بووە، بۆ گرتنی سنوری عەلی قولی خان بانگێشت دەکەن. خانە پاشا بەم بانگێشتە ڕازی دەبێت و لەگەڵ سوپایەکی ئامادە و تەیار ملی ڕێگە دەگرێتەبەر و دوای گرتنی مەریوان دەگاتە پێنج فەرسەخی سنەدژ. عەلی قولی خان کەتوانای خۆڕاگری لەخۆیدا نابینێت، هەڵتن هەڵدەبژێرێت و ڕێگەی ئیسفەهان دەگرێتەبەر.

زانا و سەیید و ئەشراف زادەکانی کوردستان، بۆ پارێزگاری کردن لەماڵ و گیانی خۆیان، بۆ پێشوازی کردنی خانە پاشا دەڕۆن و دەیهێننە ناو شارەکە. ماوەی فەرمانڕەوایەتی عەلی قولی خان سێ ساڵ درێژەی کێشاوە.

### حکومەتی خانە پاشای بابان

دوای هەڵاتنی عەلی قولی خانی ئەردەڵان لەساڵی ١١٣٢ کۆچی، خانە پاشای بابان دەست بەسەر کوردستانی ئەردەڵاندا دەگرێت ولەکەرکوك تا هەمەدان دەهێنێتە ناو سنووری دەسەلاتی فەرمانڕەوایەتی خۆی و هاوشێوەی کەسێکی دادپەروەر مامڵە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دانیشتووان کردووە. لەبەر ئەمە دانیشتووان لەکاتی فەرمانڕەوایەتی ئەو، بەئارامی و ئاسایش ژیانیان بەسەر بردووە. قوتابخانەیەك و مزگەوتێکی گەورەی لای قەڵای حکومەتی دروست کردووە و منارەیەکی گەورەی بۆ بانگدان بنیاتناوە. ئەم مزگەوت و منارە بۆ ماوەی سەد ساڵ لەکوردستان ماوەتەوە، دواتر ئەمان اللە خان، فەرمانڕەوای کوردستان، لەبەر دەمارگیری خێڵایەتی مزگەوتەکەی ڕووخاندووە و منارەکەی لەگەڵ خاك یەکسان کردووە و

لەشوێنی مزگەوت و قوتابخانەکە، باغی فیردەوسی بنیاتناوە. لەئێستادا باخەکەیش بەتەواوی وێران بووە و بۆتە شوێنی راهێنانی سوپاییەکان. خانە پاشا بۆ ماوەی چوارساڵ فەرمانڕەوایەتی کردووە و لەسەفەری ١١٣٦ کۆچی، عەلی خانی کوڕی وەك فەرمانڕەوای سنەدژ دیاریدەکات وخۆی بۆ سەرزەمینی بابان دەگەڕێتەوە. لەم ساڵەدا ئاژاوە سەرانسەری ئێرانی گرتۆتەوە، بەتایبەت ناوچەی باکور و ڕۆژئاوا، بۆتە گۆڕەپانی هێرش و پەلاماری عوسمانییەکان. لەلایەکی دیکە ئەحمەد پاشای بابان هێرش دەکاتە سەر کرماشان و هەمەدان و بروجێرد و نەهاوەند و دەست بەسەر ئەو ناوچانەدا دەگرێت و لەلای ئەرزەروومیشەوە، ناوچەکانی وان و باش قەلعە و ئازەربایەجان و هتد تا خەمسە پەیوەستی سنووری دەسەلاتی خۆی دەکات. زۆربەی ناوچەکانی دیکە کەوتۆتە دەست رووس و ئەفغانەکان.

## حکومەتی عەلی خانی بابان

دوای گەڕانەوەی خانە پاشا بەرەو بابان، لەسەفەری ١١٣٦ کۆچی، عەلی خانی کوڕی لەسەر کورسی فەرمانڕەوایەتی ئەردەڵان دادەنیشێت. ئەم گەنجە تازە پێگەیشتووە، لەگەڵ ئەوەی گەنج و لەهەڕەتی لاویدا بووە، کردارەکانی لەسەر خۆ و وتارەکانی شیرین و دڵگیر بووە. زۆربەی کاتەکانی خۆی بەهاودەمی زاناکان بەسەر بردووە. ماوەی شەش ساڵ هاوشێوەی میرێکی دادپەروەر فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە. لەساڵی ١١٤٢ کۆچی، ناوبانگی هێز و شکۆی نادرشای ئەفشار کە لەو کاتەدا سوپاسالاری شا تەهماسبی دووەمی سەفەوی کوڕی شا سوڵتان حسەین بووە و بەتەهماسب قولی خان ناویان بردووە، لەسەرزەمینی ئێران بڵاو دەبێتەوە و رایدەگەیێنن کەبەرەو کرماشان و هەمەدان و کوردستان بەڕێکەوتووە. عەلی خانی بابان کەهەست بەئارەزوومەندی کوردەکان بۆ پەیوەست بوون بەدەوڵەتی ئێران دەکات، بێ جەنگ و ئاژاوە، کوردوستانی ئەردەڵان بەجێدێڵێت و بۆ سەرزەمینی بابان دەگەڕێتەوە. دانیشتووان بەخێرایی شا تەهماسبی سەفەوی لەم رووداوە ئاگادار دەکەنەوە و بەفەرمانی تەهماسب قولی خان (نادرشا) عەباس قولی خانی ئەردەلان (پێشتر ئاماژەمان پێدا) وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و چرای سەروەری ئەردەڵانییەکان جارێکی دیکە رۆشن دەبێتەوە.

### حکومەتی عەباس قولی خان، جاری دووەم

دوای گەڕانەوەی عەلی خانی بابان، بەرەو کەرکوك لەڕەمەزانی ١١٢٤ کۆچی، عەباس قولی خانی ئەردەڵان، بەفەرمانی شا تەهماسبی سەفەوی و ڕەزامەندی تەهماسب قولی خانی سوپاسالار (نادرشا) وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت بەڵام زۆری پێناچێت کۆچی دوایی دەکات و کورەکەی، سوبحان وێردی خان جێگەی دەگرێتەوە.

### حکومەتی سوبحان وێردی خانی ئەردەڵان

دوای مردنی عەباس قولی خانی ئەردەڵان، لەزیقعدەی ١١٤٣ کۆچی، سوبحان وێردی خانی کوڕی جێگەی دەگرێتەوە. سوبحان وێردی کەسێکی خۆپارێز و دادپەروەر و لەگەڵ دانیشتووانی کوردستان هاوشێوەی سەرۆك خێڵ و سەرۆك عەشیرەت هەڵسوکەوتی کردووە. زۆربەی کاتەکانی بەهاودەمی خوالێخۆشبوو جەمال ئەلدینی یەکەم، کوڕی شێخ عەبدولمۆئمینی یەکەم (باوەگەورێی نووسەر) کەوتارخوێن و پێشنوێژی مزگەوتی خانە پاشا بووە، بەسەر بردووە و لای ئەو بەخوێندنەوەی زانستەکان سەرقاڵ بووە. لەئاوەدان کردنەوە و نۆژەن کردنەوەی وڵاتەکەی هەوڵ و کۆششی زۆریداوە. لە ٢٨ موحەڕەمی ١١٤٤، سوبحان وێردی خان لەگەڵ خێڵی ئەردەڵان بەرەو تاران بەڕێکەوتووە و لەڕەمەزانی ئەو ساڵەدا گەڕاوەتەوە. دواتر لەمێژووی ١١٤٧ کۆچی، نادرشا بەمەبەستی گرتنی شیروان، لەئیسفەهانەوە بەڕێکەوتووە.

لە١٨ سەفەری هەمان ساڵ، هاتۆتە ناو سنە. لەتالاری ڕوو بەتەپۆڵکەکە، یانی تالاری ڕوو لەباکوری بینای حکومەتی دادەبەزێت. ئەم تالارە بیست زەرع درێژ و دە زەرع پان بوو. لەسەرەوەی تالارەکە نادرشا دانیشتووە و میوانییەکی گشتی ڕێکخستووە و سوبحان وێردی خانی فەرمانڕەوای کوردستان لەخوارەوەی تالارەکە بووە. نادرشا دەڵێت: سوبحان وێردی خان ئێمە نەهاتووین شوێنی تۆ بگرین، تالارەکە گەورەیە، ئێمە لەم بەشەدا فەرمانڕەوایەتی دەکەین تۆ لەو بەشەدا. سوبحان وێردی خان بۆ سوپاسکردنی ئەم ڕێزگرتنە، چواردە هەزار مەن ڕۆن و هەزار تمەنی پێشکەش دەکات.

نادرشا لەکوردستانەوە بەرەو خوراسان و هەرات بەڕێدەکەوێت. ئەحمەد خان کوڕی سوبحان وێردی خان و دەستەیەك لەڕیشسپی و پیاو ماقووڵانی کوردستان کە الله وێردی بەگ و حەسەن بەگی میر ئەسکەندەری لەناویاندا بوون، لەگەڵیدا دەڕۆن. نادرشا دوای

لەسەر کردنی تاج، لەدەشتی موغان لەشەوالی ١١٤٨، لەئەنجامی گازندە و سکاڵای دانیشتووان، سوبحان وێردی خان لەسەر کار لادەبات و براکەی سوبحان وێردی خان بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان ڕادەسپێرێت. ماوەی فەرمانڕەوایەتی سوبحان وێردی خان، لەجاری یەکەم، پێنج ساڵ و هەشت مانگ درێژەی کێشاوە.

## حکومەتی مستەفا خانی ئەردەلان

دوای لابردنی سوبحان وێردی خان، مستەفا خانی برای کوڕی عەباس قولی خان لەساڵی ١١٤٨ وەك فەرمانڕەوای کوردستان و نەزەر عەلی بەگ بەوەکالەتی ئەو دیاریدەکرێت و لەم ساڵەدا، مەحمود سارایی دەرجەزینی، بەخۆی و سێسەد سوارەوە هێرش دەکاتە سەر کوردستانی ئەردەلان و تالآنییەکی زۆر کۆدەکاتەوە. لەموحەڕەمی ١١٤٩، مستەفا خانی ئەردەلان دەگاتە ناوەندی حکومەت و دوای سێ چوار مانگ فەرمانڕەوایەتی، بەهۆی نەشیاوی و ناتەوانی، دانیشتووان ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و دەریدەپەڕێنن. مستەفا خان لەئیسفەهان نەخۆش دەکەوێت و دەمرێت. دووبارە سوبحان وێردی خان لەهەمان ساڵ و بەفەرمانی نادرشا وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان دەکرێتەوە و بەرەو کوردستان بەڕێدەکەوێت.

## حکومەتی سوبحان وێردی خانی ئەردەلان، جاری دووەم

دوای ڕۆشتن و مردنی مستەفا خانی ئەردەلان لەئیسفەهان، دووبارە سوبحان وێردی خان لەساڵی ١١٤٩ وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت. ماوەی چوار ساڵ و حەوت مانگ فەرمانڕەوایی کوردستان دەکات و لەساڵی ١١٥٣ نادرشا دوای گەڕانەوەی لەسەفەری هیندستان و بەڕێکەوتنی بۆ گرتنی خوارەزم و سەرکوت کردنی ئیلیاریسی فەرمانڕەوای ئەو سەرزەمینە، سوبحان وێردی خان بۆ بارەگای خۆی بانگێشت دەکات. ئەحمەد سوڵتانی کوڕی سوبحان وێردی خان کە لەهەموو سەفەرەکان هاوشانی نادرشا بووە و گیانبازی و فیداکاری لەخۆی نیشانداوە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکات و نازناوی خانی پێدەبەخشێت.

## حکومەتی ئەحمەد خانی ئەردەلان

دوای بانگکردنەوەی سوبحان وێردی خان، ئەحمەد خانی کوڕی لەجومادی الاوەلی ١١٥٣ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت و پێش هەرکارێك، سەرزەمینی موسڵ تا کۆتایی

خاکی هەمەدان پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی خۆی دەکات و هاوشێوەی میرێکی مەزن و خاوەن دەسەلآت، بەڕاپەڕاندنی کاروباری فەرمانڕەوایەتییەکەی سەرقاڵ دەبێت. لەساڵی ١١٥٤ کۆچی کەنادر شا ڕوودەکاتە سەرزەمینی داغستان، لەبەر ئەوەی بوێری و ئازایەتی ئەحمەدخانی لەسەفەری هیندستان بینیبوو، لەم سەفەرەیشدا بوونی ئەو بەپێویست دەزانێت. بۆ ئەم مەبەستە ئەحمەد خان بانگێشت دەکاتەوە و بۆ جاری سێیەم سوبحان وێردی خانی باوکی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکاتەوە. ساڵێك و سێ مانگ سوبحان وێردی خان فەرمانڕەوایەتی دەکات. دووبارە لەرەبیع الاوەلی ١١٥ بەفەرمانی نادرشا لەسەر کار لادەبرێت و ئەحمەد خانی کوڕی وەك فەرمانڕەوا دیاریدەکرێتەوە و ئیبراهیم بەگ بەوەکالەت فەرمانڕەوایەتی دەگرێتەدەست. لەرەبیع ئەلثانی ئەم ساڵە، ئەحمەد خان دەگاتە ناوەندی حکومەتەکەی. بەرێکەوت وشکەساڵی و قاتوقڕی لەم ساڵەدا لەکوردستان بلآو دەبێتەوە و نان یەکسان دەبێت بەگیان. ئەحمەد خان بۆ پاراستنی گیانی دانیشتووان، دەرگاکانی چاکەکاری بەسەر هەمووواندا دەکاتەوە و هەموو ئەو دانەوێڵەی بۆ سوپاکەی پاشەکەوت کرابوو، بەسەر هەژار و نەدارەکاندا دابەش دەکات. زۆری پێناچێت، لەم کاتەدا نادرشا لێپرسراوەکەی خۆی دەنێرێت تا ئەنبارە دەوڵەتییەکان بۆ ئازوخەی سوپاکەی بۆ ئازەربایەجان ببەن. کاتێك لێپرسراوەکە دەگات، دەبینن هەموو ئەنبارەکان خاڵی و یەك دانە گەنمیش نەماوەتەوە. لێپرسراو ئەم بارودۆخە بۆ نادرشا دەنووسێت. نادرشا لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکە، تورە دەبێت و فەرمانی ئیعدام کردنی ئەحمەدخان دەردەکات.

هاوڕێکانی ئەحمەدخان، پێش گەیشتنی فەرمانەکە، ئەحمەد خان ئاگادار دەکەنەوە. ناچار ئەحمەدخان لەگەڵ دوو هەزار کەس لەخزم و کەس و کارەکانی خۆی، بەرەو خاکی عوسمانی بەڕێدەکەوێت و کاتێك دەگاتە شارەزوور، زاهیربەگی ئیل بەگی جاف، ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەحمەد خان دەیگرێت و ئیعدامی دەکات و لەوێوە ڕوودەکاتە سلێمانی. خالید پاشای بابان، لەگەڵ دیاری و پێشکەشی فراوان پێشوازی لێدەکات و بۆ خزمەتکردنی قۆڵ هەڵدەکات. ئەحمەد خان فەرمانڕەوایەتی ئەو لەسەرزەمینی بابان پشتڕاست دەکاتەوە و ڕێگەی موسڵ دەگرێتەبەر. فەرمانڕەوای موسڵ، ڕێگەی دوژمنایەتی دەگرێتەبەر و دەرگاکانی قەڵاکەی دەبەستێت و جەنگ دەستپێدەکات. ئەحمەدخان دوای جەنگێکی کەم،

دەستبەسەر قەڵاکەدا دەگرێت و فەرمانڕەواکە قۆڵبەست و ئیعدامی دەکات و دواتر کەسێك بەناوی محەممەد چەلەبی وەك فەرمانڕەوای موسڵ دەستنیشان و بەرەو دیاربەکر و حەلەب بەڕێدەکەوێت. دوای یەك مانگ و چوار ڕۆژ دەکاتە ئیستانبوڵ. لەڕۆژی گەیشتنی بۆ ئەو شارە، بەپێی فەرمانی سوڵتانی عوسمانی (سوڵتان مەحمود)، ژمارەیەك لەپاشاکان و ئەفەندییەکان و شێخولئیسلامەکان پێشوازی لێدەکەن و بەوپەڕی ڕێزەوە لەماڵێك کەلەلایەن دەوڵەتەوە بۆی ئامادە کراوە، دەبەن. دوای چەند ڕۆژ بەپێی فەرمانی سوڵتان، فەرمانڕەوایەتی ئەدرنەی پێدەدرێت و بەرەو ئەو دیارە بەڕێدەکەوێت. لەلایەکی دیکە هەواڵی هەڵاتنی ئەحمەدخان بەنادرشای ئەفشار دەگات. سوبحان وێردی خانی باوکی ئەحمەدخان لەتاران دەهێڵێتەوە و لەساڵی ١١٥٦ حاجی مەولا وێردی خانی قاجاری قەزوێنی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت.

حاجی مەولا وێردی خان کاتێك دێتە کوردستان، بەهۆی جیاوازی بیروبۆچوون و جیاوازی مەزهەب و نەبوونی ئاوز و شیاوی و لێهاتوویی، زیاتر لەیەك ساڵ ناتوانێت فەرمانڕەوایەتی کوردستان بکات و لەسەر کار لادەبرێت و سوبحان وێردی خان بۆ جاری چوارەم فەرمانڕەوایەتی کوردستانی پێدەسپێرێت و نزیکەی هەزار سواری ئەفغانی و خوراسانی بەسەرکردایەتی محەممەد ڕەزا بەگی گورجی، کوڕی پیاوێك بەناوی بابا کەریم، لەگەڵ سوبحان وێردی خان بەڕێدەکەون و بەپێی فەرمانی نادرشا، وەك قەرەبووی ئەنبارە دەوڵەتییەکان، نزیکەی دەهەزار تمەن لەئیبراهیم بەگ کە لەو زەمانەدا بەوەکالەت فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە، وەربگرێت.

محەممەد ڕەزا بەگی سەرداری سواری ئەفغانی کەسێکی توندوتیژ و ئەخلاق ناشیرین بووە. دانیشتووان لەقسە و وتەکانی ئەو بێزار و مەبەستی بەرز کردنەوەی ئاڵای شۆڕشیان بووە بۆ ئەوەی لەکوردستان دەریبەرێنن. بەڕێکەوت لە ١٦ جومادی الاخر ١١٦١ کۆچی، هەواڵی کوشتنی نادرشا دەگاتە کوردستان. سوبحان وێردی خان بەخێرایی محەممەد ڕەزا بەگ و چەند کەسێکی دیکە لەسەرکردەکانی ئەفغان و خوراسان بەنهێنی کۆدەبنەوە و لەمەرگی نادرشا ئاگاداریان دەکاتەوە و دەڵێت هێشتا دانیشتووان کوردستان بەم ڕووداوەیان نەزانیوە. سوبحان وێردی خان بەم بیانوە یەکی هەزار تمەن پارە و خەڵاتیان پێدەدات و شەوانە لەکوردستانەوە بەڕێیان دەکات. بۆ بەیانی کاتێك دانیشتووانی لەکوژرانی نادرشا و

هەڵاتنی محەممەد ڕەزا بەگ ئاگادار دەبنەوە، بەمەبەستی تۆڵەکردنەوەی خۆیان شوێنی دەکەون بەڵام سوبحان وێردی خان ڕێگەی ئەو کارەیان لێدەگرێت. دوای حەوت مانگ لەم رووداوە، لەلایەن ئیبراهیم خان، برازای نادرشا کەبانگەشەی پاشایەتی کردووە و خۆی بەعادل پاشا ناساندووە، حکومەتی کوردستان بەحەسەن عەلی خانی ئەردەڵان دەسپێرێت. سوبحان وێردی خان لەساڵی ١١٦١ لەهەمەدان ماڵئاوایی لەجیهان دەکات و جەنازەکەی دەبەنە چیای شەیدای کوردستان و لەگومەزی شەیدا، لەسەر چیایەکی بەرز، بەخاکی دەسپێرن. ماوەی حکومەتی سوبحان وێردی خان لەکوردستان هەژدە ساڵ درێژەی کێشاوە و لەم ماوەدا هەشت جار لەسەر کار لابراوە و دووبارە فەرمانڕەوایەتی کوردستانی پێسپێردراوە.

## حکومەتی حەسەن خانی ئەردەلان

لەساڵی ١١٦١ کۆچی، حەسەن خانی ئەردەڵان برازای سوبحان وێردی خان، بەپێی فەرمانی عادل شا، فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەگرێتەدەست و دەست بەئاوەدان کردنەوەی وڵات و پاراستنی سنووری فەرمانڕەوایەتییەکەی دەکات.

لە ١٢ زیحەججەی ساڵی ١١٦٢ کەنیزامی ئێران خان خانی و پاشایەتی تیرەکان بووە، ئیمام قولی خانی زەنگەنە لەکرماشان دەستەیەك لەتایەفەکانی کەلهوڕ و گۆران و زەنگەنە و عەشیرە و خێڵەکانی دیکەی کرماشانی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە و دەست بەهێرش و پەلامار بۆ سەر سنوری کوردستانی ئەردەڵان دەکات.. حەسەن عەلی خان بەم کارە ڕازی نابێت و لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بۆ بەرگری کردن لەشار دەڕۆنەدەر. لەناوچەی بیلوار دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە. سوپای ئەردەڵان لەگەڵ ئەوەی ژمارەیان کەمە، لەهێرشی یەکەم شکست بەسوپای ئیمام قولی خان دەهێنن، دەستەیەکیان دەکوژرێن و دەستەیەکیان بریندار و ئەوانی دیکە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. تۆپخانە و خێوەت و سیلاحی سوپاکەی ئیمام قولی خان بەسوپای ئەردەڵانییەکان دەبرێت. خودی ئیمام قولی خان، بەدژواری خۆی لەگۆڕەپانی جەنگ دەرباز دەکات و پەیوەستی هەڵاتووان دەبێت. حەسەن عەلی خانی فەرمانڕەوای ئەردەڵان، دوای دابەش کردنی تالانییەکان، کارگوزار بۆ کرماشان و سەنقور و کەلیایی و کەنگاوەر و مەلایر و بروجێرد و ئەو ناوچانە دیاریدەکات و خۆی لەگەڵ دنیایەك شانازی بۆ سنە دەگەڕێتەوە. دواتر لە ١٣ موحەرەمی ١١٦٣، مێهر عەلی خانی بروجێردی

لەدەستدرێژی زەندییەکانی دراوسێی، سکالاّ بۆ لای حەسەن عەلی خان بەرز دەکاتەوە. حەسەن عەلی خانیش لەگەڵ سوپای ئەردەلآن، بۆ سەرکوت کردنی زەندییەکان بەرێدەکەوێت. لەولایش توشمال کەریم (کەریم خانی زەند) و شێخ عەلی خان و ئەسکەندەر خان لەگەڵ سوپایەکی گەورە پێشرەوی دەکەن و هەر دوو سوپا لەمەلایر ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە و ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت. دوای هەوڵ و کۆششی زۆر، سوپای زەندییە شکست دەخوات. ٣٦ کەس لەکەسە ناودارەکانی زەندییە و ١٨٠ کەسیان دەکوژرێن و ئەوانی دیکە ڕێگەی هەلآتن دەگرنەبەر. دوای ئەم سەرکەوتنە، حەسەن عەلی خان، دەڕواتە ماڵی مێهر عەلی خان و ئەو دەکاتە فەرمانڕەوای ویلایەتی بروجێرد و ناوچەکانی پەیوەست و خۆی بۆ سنە دەگەڕێتەوە.

دواتر لەکۆتایی ئەم ساڵەدا، سەلیم پاشا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینی بابان دیاریدەکرێت. سلێمان پاشا، کوڕە مامی ئەو کەلەسەر کار لابرابوو، پەنا بۆ حەسەن عەلی خان دەبات و ماوەیەك لەکوردستانی ئەردەلآن دەمێنێتەوە. سەلیم پاشا بۆ گرتنی سلێمان پاشا، نامەیەك بۆ حەسەن عەلی خان دەنووسێت تا سلێمان پاشایان تەسلیم بکاتەوە. حەسەن عەلی خان وەلآمی نا دەداتەوە. بەناچاری سەلیم پاشا، ئەم بابەتە بۆ وەزیری بەغداد بەرز دەکاتەوە و وەزیر، نامەیەك بۆ حەسەن عەلی خان دەنووسێت و لەکۆتایی نامەکەدا ئاگاداری دەکاتەوە ئەگەر بەتەسلیم کردنەوەی سلێمان پاشا ڕازی نەبێت، پەیوەندییەکان دەپچڕێت و ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت. حەسەن عەلی خان گرنگی بەنامە و هەڕەشەکە نادات و نائومێدانە نێردراوەکە دەگەڕێنێتەوە و چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە بۆ گۆڕەپانی جەنگ بەجێدێڵێت. وەزیر لەم کارەی زویر و بابی عالی لێ ئاگادار دەکاتەوە. بەپێی فەرمان، کەهیا لەگەڵ عەشیرە عەرەبەکان و یەنگی چەزی و حەشەم ئاقاسی، فەرمانڕەوای موسڵ و عوسمان پاشای فەرمانڕەوای کۆیە و قوچ پاشای فەرمانڕەوای حەریر، کەزیاتر لەبیست هەزار کەس بوون، بۆ هاوکاری کردنی سەلیم پاشا بەرەو کوردستانی بەرێدەکەون و لەنزیك سنور، دووبارە، پێش ئەوەی ئاگری جەنگ بڵێسە بسێنێت، سەلیم پاشا، فەرهاد خانی کوڕی بۆ لای حەسەن عەلی خان دەنێرێت. حەسەن عەلی خان کە لەگەڵ دە هەزار سوار و پیادە ڕووی کردۆتە گۆڕەپانی جەنگ، دوای هاتنی فەرهاد خان، لەگەڵ سەرکردە و سەرۆکەکان کۆدەبێتەوە. شێخ وەسیمی مەرۆدخی کوڕی

شێخ ئەحمەدی عەلامە و مەلا مستەفای شێخولئیسلام و شێخ جەمال ئەلدینی وتاربێژ، باوەگەورەی نووسەر، و ئیبراهیم بەگی وەکیل و خوسرەوخان نەوەی ئەحمەد خان و جەعفەر سوڵتان و پیاوماقووڵانی دیکەی کوردستان، بەهۆی زۆری ژمارەی سوپاکەی سەلیم پاشا و عوسمانییەکان، بەباشی دەزانن ڕێگەی ئاشتی دەگرنەبەر. مەلا حسەین، باوەگەورێی مەلا عەباسی شێخولئیسلام و عەبدولله سوڵتانی بەراز، زاوای حەسەن عەلی خان، بڕیاری جەنگ دەدەن و ئاشتی بەنەنگی خێلایەتی لەقەڵەم دەدەن کە (النار و لاالعار). حەسەن عەلی خانیش لەبەر ئەوەی سلێمان پاشا پەنای بۆ بردووە، بڕیاری کەمینە پەسەند دەکات و بڕیاری جەنگ دەدات و بەپێی ئەم بۆچوونە فەرهاد خان دەگەڕێنێتەوە. سەلیم پاشا دوای گەڕانەوەی فەرهاد خان و بێ هیوایی لەڕێگە چارەی ئاشتی، لەگەڵ سەرکردە و پاشاکان بەرێدەکەوێت. حەسەن عەلی خانیش لەگەڵ محەممەد ئەمین خانی گەرووسی بەرێدەکەوێت و هەردوو سوپا لەدەشتی مەریوان ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە و ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت. دوای شەش کاتژمێر کوشت و کوشتار، ئاڵای ئەردەڵانییەکان دەکەوێتە خوار و سوپاکەیان شکست دەخوات. حەسەن عەلی خان بەرەو سنە دەگەڕێتەوە. سلێمان پاشا کەسەرچاوەی سەرەکی ئەم کێشەیە، لەگەڵ کەسانی بنەماڵەکەی ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. لەگەڵ گەیشتنی حەسەن عەلی خان بۆ سنە، هەواڵی پێدەگات کەکەهیا و سوپاکەی ڕێگەی شاری سنەیان گرتۆتەبەر. حەسەن عەلی خان بەناچاری بەرەو یەیلاق هەڵدێت، سوپای کەهیا و پاشاکان دێنە ناو شاری سنە و لەماوەی سیانزە ڕۆژ مانەوەیان لەکوردستانی ئەردەڵان، هەموو سامان و دارایی دانیشتووانەکەی تاڵان و پەردەی نامووسی یەهودی و مەسیحیەکان دەدڕێنن. زۆربەی بنەماڵە دەوڵەمەندەکانیش بۆ سلێمانی و کۆیە و حەریر دەنێرن. دوای گەڕانەوەی سوپای ڕۆم بۆ سەرزەمینی خۆیان، حەسەن عەلی خان بۆ شار دەگەڕێتەوە و دەست بەئاوەدان کردنەوە و نۆژەن کردنەوەی وێرانییەکانی شار دەکات.

ئیبراهیم بەگی وەکیلیش، لەبەر ئەوەی لەگەرمەی جەنگەکە، لەگەڵ دەستوپێوەندەکانی خۆی، پەیوەستی سوپاکەی سەلیم پاشا و یەکێك لەهۆکارەکانی شکستی سوپای ئەردەڵان بوو، لەکاتی هاتنی سوپای عوسمانییەکان بۆ ناو شارەکە، بەشداری لەتاوانەکانی ئەوان کرد. لەکاتی گەڕانەوەی سوپای ڕۆم، ئەویش لەگەڵ کەسەکانی خۆی ڕووی کردە ناوچەی ڕەوانسەر و لەگوندی ئەلەك، قەڵایەکی بەهێز دروست دەکەن و دەست بەسەر ناوچەکانی

پڵنگان، بیلوار و ڕەوانسەر دەگرن و بیر لەسەربەخۆیی دەکاتەوە. لەوێوە نامەیەك بۆ توشمال کەریم (کەریم خانی زەند) و شێخ عەلی خانی زەند دەنووسێت: حەسەن عەلی خان لەئێستادا لاواز و بێ هێزە، ئەگەر دەتانەوێت تۆڵە بکەنەوە، دەرفەتێکی گونجاوە. کەریم خان و شێخ عەلی خان ئەم دەرفەتە دەقۆزنەوە و لە ١٣ ڕەمەزانی ١١٦٤ لەگەڵ بیست هەزار سواری عەشیرەکانی کرماشان و زەنگەنە، بەمەبەستی تۆڵەی شکستی ساڵەکانی پێش، بەرەو کوردستان ئەسپ غار دەدەن. حەسەن عەلی خان کاتێك ئەم بارودۆخە پەرێشانە دەبینێت و دەزانێت لەم کاتەدا ناتوانێت بەرگری بکات، کەسە لاواز و هەژارەکانی شارەکە لەگەڵ شێخ محەممەد وەسیمی مەردۆخی کوڕی شێخ ئەحمەدی عەلامە بەرەو هەورامان دەنێرێت. مەلا مستەفای شێخولئیسلام و نەجەف قولی بەگ بۆ ناو سوپای کەریم خان دەنێرێت تا بەهەر شێوەیەك بووە، ئەم کێشەیە بەئاشتی چارەسەر بکرێت. بەو واتایە کە خوشکی حەسەن عەلی خان لەکەریم خان و خوشکی کەریم خان لەحەسەن عەلی خان مارە بکەن و جەنگ بەئاشتی کۆتایی بێت. کەریم خان گرنگی بەوتەکانی ئەو دوو کەسە نادات و ڕێگەی شارەکە دەگرێتەبەر. حەسەن عەلی خان بەناچاری لەگەڵ کەسان و سوپاکەی خۆی بەرەو قەڵای قەراتۆرە دەڕوات و لەوێ سەنگەر دەگرێت.

کەریم خان لەگەڵ گەیشتنی بۆ شارەکە و لەماوەی ١٢ ڕۆژ بەکوشت و کوشتار و تاڵان کردنی سامانی خەڵکان سەرقاڵ دەبێت. شێخ عەلی خانیش بۆ چەند ڕۆژێك لەقەڵای قەراتۆرە گەمارۆ دەخاتە سەر حەسەن عەلی خان بەڵام بەهۆی بەهێزی قەڵاکە و فراوانی خواردەمەنی، سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە و بەناچاری بۆ سنە گەڕاوەتەوە. سلێمان پاشای بابان کە لەبەردەڵانەکانی شەقان ئاوارە و سەرگەردان بووە، کاتێك هەواڵی هاتنی کەریم خان بۆ سنە دەبیستێت، بێ درەنگ پەیوەستی دەبێت. دوای گەڕانەوەی شێخ عەلی خان، سوپای کەریم خان دوای تاڵان کردن، ئاگر بەردەدەنە شاری سنە و مزگەوت و قوتابخانەکان و ڕێگەی گەڕوس دەگرنەبەر. لەگەڵ گەیشتنیان بۆ گەڕوس، خانەی محەممەد ئەمین خانی فەرمانڕەوای گەڕوس دەگرن و خۆرشید خانمی خوشکی ئەو وەك ئەسیر دەبە[illegible] و گەڕوس لەگەڵ خاك یەکسان دەکەن.

حەسەن عەلی خان دوای ڕۆشتنی کەریم خان بۆ شارەکە دەگەڕێتەوە و کاتێك [illegible] کورستان و کوردستانییەکان بەمشێوەیە دەبینێت، بەناچاری گوێڕایەڵی و [illegible]

ئازادخانی ئەفغان نیشان دەدات کە لەوکاتەدا لەئازەربایەجان و قەڵاکانی دیکەی ئەفشار، بانگەشەی پاشایەتی دەکرد. دواتر بەخێرایی دەست بەکۆکردنەوەی هەڵتوان و گەڕاندنەوەی ئەوان و ئاوەدان کردنەوەی بیناکان و نۆژەن کردنەوەی شارەکە دەکات و ژیانێکی تازە بەکوردستان دەبەخشێت. دوای دوو ساڵ زەحمەت و ماندووبوون، لەساڵی ۱۱٦٦ کۆچی، عەلی موراد خانی بەختیاری، سوپایەك کۆدەکاتەوە و دەست بەسەر کرماشاندا دەگرێت. لەو کاتەدا کەسێك کەرەچەڵەکی زانراوە نەبووە، لەبەغداد دەردەکەوێت و خۆی بەکوڕی شا سوڵتان حسەین دەناسێنێت و خۆی بەشا سوڵتان حسەینی دووەم ناو دەبات و لەژێر ئەم ناوە ئاڵای شۆڕش بەرز کردۆتەوە و بانگەشەی پاشایەتی ئێرانی کردووە. میرزا مەهدی خانی شەقاقی، سکرتێری نادرشا، وتەکانی ئەوی پشتڕاست کردۆتەوە و لەگەڵ خۆی دەیهێنێتە کرماشان.

عەلی موراد خان ئەم پێشهاتە بەهەل دەزانێت و سوڵتان حسەینی دووەم دەکاتە ئامێری دەستی خۆی و بەمەبەستی گرتنی کوردستان بەڕێدەکەوێت. حەسەن عەلی خانی فەرمانڕەوای کوردستان ئاگادار دەبێتەوە و لەگەڵ سوپا لاواز و بێ هێزەکەی ئەردەڵان، بۆ بەرگریکردن دەڕۆنە دەرەوەی شارەکە. کەریم خانی زەند کاتێك لەم روداوە ئاگادار دەبێتەوە، بەهەلی دەزانێت، بۆ تۆڵەسەندنەوەی خۆی لەعەلی موراد خان و قەرەبووی خراپەکارییەکانی لەگەڵ دانیشتووانی ئەردەڵان، پەیوەستی سوپاکەی حەسەن عەلی خان دەبێت. هەردوو سوپای کورد و زەند (زەندییەکانیش یەکێك لەتایەفە گەورەکانی کوردن)، لەدەشتی بیلواری کوردستان، ڕووبەڕووی سوپاکەی عەلی موراد خانی بەختیاری دەبنەوە و ئاگری جەنگ بڵێسە دەستێنێت. لەهەمان هێرشی یەکەم سوپاکەی عەلی موراد خان شکست دەخوات و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. شا سوڵتان حسەینی دووەم لەو جەنگەدا دەگیرێت و دەکوژرێت و هەموو خێوەت و بارەگاکان وسیلاحەکانی عەلی موراد خان کەبۆ گرتنە دەستی دەسەڵاتی پاشایەتی کۆی کردبوویەوە، دەکەوێتە دەست سوپای ئەردەڵانییەکان و زەندییەکان. دوای ئەم سەرکەوتنە، حەسەن عەلی خان بەشانازی بۆ سنە دەگەڕێتەوە و کەریم خان هێرش دەکاتە سەر کرماشان.

دواتر لەساڵی ۱۱٦۷، ئازاد خان لەئیسفەهان ئاڵای سەڵتەنەت هەڵدەکات و حەسەن عەلی خان بانگ دەکات. حەسەن عەلی خان کە لەهۆکاری بانگکردنەکە ئاگادار نەبووە، لەگەڵ

چەند کەس لەکەسە نزیکەکانی خۆی وەك مەلا مستەفای شێخولئیسلام و عەبدوللە سوڵتان و هتد بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت.

سەلیم پاشای بابان کە لەئازەربایەجان، هەموو خزمەتێکی پێشکەش بەئازاد خان کردووە و پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ ئەو دامەزراندووە، لەگەڵ هەزار سوار لەئیسفەهان ئامادەی خزمەت کردن بووە و لەگەڵ ئەوەیشدا بڕی چوار هەزار تمەنی بەناوی کوردستانەوە پێشکەش کردووە. کاتێك حەسەن عەلی خان دەگاتە ئیسفەهان، ئازاد خان دەیگرێت و تەسلیم بەسەلیم پاشای دەکات و مەلا مستەفای شێخولئیسلام و عەبدوڵڵە سوڵتان دەخنکێنێت و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بۆ سەلیم پاشای بابان دەنووسێت و ڕەوانەی کوردستانی دەکات.

## حکومەتی سەلیم پاشای بەبە

سەلیم پاشای بابان، بەپێی فەرمانی ئازاد خان لەڕەجەبی ١١٦٧ بەمەبەستی فەرمانڕەوایەتی کردنی کوردستان بەڕێدەکەوێت و حەسەن عەلی خان بۆ قەڵاچوالان دەنێرێت و خۆی دەڕواتە ناو شارەکە و فەرمانڕەوایەتی دەستپێدەکات. دوای حەوت مانگ فەرمانێك بۆ قەڵاچوالان دەنێرێت و لەگوندی ئەلەك، حەسەن عەلی خان دەکوژن. سەرئەنجام دوای چەند مانگ، دانیشتووان دژی سەلیم پاشا ڕادەپەڕن و لەشارەکە دەریدەکەن. ئەم جارە سەلیم پاشا، پەنا بۆ نەواب والا محەممەد حەسەنی خانی قاجار دەبات کە لەناوچەکانی دەوروبەر ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکردبوو تا بەهۆیەوە جارێکی دیکە فەرمانڕەوایی کوردستان بگرێتەدەست. خوسرەوخان کوڕی ئەحمەد خانی ئەردەڵان کەساڵیانی ساڵ، خزمەتی بەمحەممەد خانی قاجار کردبوو و تەمەنی خۆی لەگەڵ ئەودا بەسەر بردبوو، لەناجوامێریی و خیانەتەکانی سەلیم پاشا ئاگاداری دەکاتەوە. نەواب والا لەوەڵامی خوسرەوخان دەڵێت: تۆ مەگەر تا ئێستا محەممەد حەسەنت نەناسیوە، چۆن دەتوانم خزمەتەکانی تۆ لەبیر بکەم و ویلایەتەکەت بەدوژمنەکەی تۆ بفرۆشم، دڵنیابە فەرمانڕەوایەتی کوردستان عابایێکە و بۆ باڵای تۆ دووراوە و تۆ دەبیتە فەرمانڕەوای کوردستان. دوای چەند ڕۆژ، محەممەد حەسەن خان، سەلیم پاشا لەفەرمانڕەوایەتی کوردستانی ئەردەڵان پەشیمان دەکاتەوە و خەڵات و فەرمانی پاشایەتی بۆ خوسرەو خان دەنێرێت و بۆ سەرزەمینی بەجێماو لەباوکی ڕەوانەی دەکات.

## حکومەتی خوسرەوخانی ئەردەلان

دوای ئەوەی خوسرەوخانی گەورە کوڕی ئەحمەد خانی موهاجیر، نەوەی سوبحان وێردی خانی ئەردەلان، فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی کوردستان لەنەواب والا محەممەد حەسەن خانی قاجار وەردەگرێت، لەموحەڕەمی ١١٦٨ دێتە ناو کوردستان. عەباس خانی شاهسەوەن لەگەڵ دووسەد سوار لەلایەن محەممەد حەسەن خانەوە، بۆ هاوکاری کردن هاوڕێیەتیان کردووە. خوسرەوخان کەسێکی زانا و بەتوانا بووە و لەبوێری و ئازایەتیشدا بەناوبانگە.

مەستورەی کوردستانی لەوەسفی ئەودا دەڵێت:

(چنین خسروی در جهان کس ندید

به دوران اش با میش و گرگ آرمید

به دورش زبس تازه شد عدل و داد

کس از داد کسری نشان نداد.)

لەخان ئەحمەد خان دوو کوڕ بەجێماوە: یەکیان خوسرەوخان و ئەوی دیکەیان ڕەزا قولی خان. دوای ئەوەی خوسرەوخان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت، بەدوورئەندێشی و زۆری شمشێر، کوردستان لەبەدبەختی و گێژاوی هەژاری دەرباز دەکات، دانیشتووانی کوردستان بەگشتی جگە لەمحەممەد ڕەشید بەگ، نەوەی ئیبراهیم بەگی وەکیل کەپێشتر ئاماژەمان پێدا، لەفەرمانڕەوایەتی ئەو شادومان و خۆشحاڵ بوون. ئاوارەکان و هەڵاتووان لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەو بۆ وڵات گەڕاونەتەوە. لەبەر ئەوەی شاری سنە لەئەنجامی هێرش و پەلاماری دراوسێ و بیانییەکان، وێران و کاول ببوو، ناچار قەڵای حەسەن ئاوای نۆژەن کردۆتەوە و ماوەیەك لەو قەڵایە وەك ناوەندی فەرمانڕەوایەتی خۆی کەڵکی وەرگرتووە. خوسرەوبەگ و مێهر عەلی سوڵتان کە لەگەڵ محەممەد ڕەشید بەگ نەوەی ئیبراهیم بەگی وەکیل ئامۆزا بوون، لەفەرمانڕەوایەتی خوسرەوخان ڕازی نەبوون و لەناخەوە کۆسپ و تەگەرەیان لەڕێگەی کارەکانی ئەودا دروست کردووە و دانیشتووانی قەڵای حەسەن ئاوا ناچار بەسەرپێچی کردن لەفەرمانەکان دەکەن و بەهەر هۆکارێك هەوڵ دەدەن فەرمان و دەستوورەکانی خوسرەوخان ئەنجام نەدرێت. خوسرەوخان فەرمانی گرتنی ئەو دوو کەسە دەردەکات. مێهر عەلی سوڵتان قۆڵبەست دەکرێت بەڵام خوسرەوبەگ تەسلیم

نابێت و بەخەنجەر دوو سێ کەس لەکەسەکانی خوسرەوخان برینداردەکات. سەرئەنجام ژمارەی راسپێردراوان زیاد دەکات و سەری بەشمشێر جیا دەکەنەوە و دوای کوژرانی ئەو، فەرمانی کوشتنی مێهر عەلی سوڵتانیش دەردەچێت و خوسرەوخان دەست بەسەر سامانی هەردووکیاندا دەگرێت. دووای ئەم ڕووداوە، خوسرەوخان بەسەر دانیشتووانی قەڵای حەسەن ئاوا زاڵ دەبێت و بۆ سنەدژ کۆچیان پێدەکات و سەرقاڵی نۆژەن کردنەوەی تەلار و بیناکانی شار دەبێت. لەساڵی ١١٦٨، ئازاد خانی ئەفغان، لەترسی کەریم خانی وەکیل و هەڕەشەکانی محەممەد حەسەن خانی قاجار، ئیسفەهان چۆڵ دەکات و لەڕێگەی هەمەدانەوە ڕوودەکاتە ئازەربایەجان. لەڕێگە بەهۆی پیلانی سلێمان پاشای بابان، لەگەڵ دوو هەزار سوار بەمەبەستی گرتنی کوردستانی ئەردەڵان بەڕێدەکەوێت. خوسرەوخان لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، بەخێرایی بۆ قەڵای حەسەن ئاوا دەگەڕێتەوە و لەوێ سەنگەر دەگرێت و کەسەکانی بۆ کۆکردنەوەی هێز و خواردەمەنی بۆ ناوچەکانی دەوروبەر دەنێرێت. ئازاد خان لەگەڵ سوپاکەی دەگات و گەمارۆ دەخاتە سەر قەڵاکە. محەممەد ڕەشید بەگ و محەممەد سالح بەگ بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی خوسرەو بەگ و مێهر عەلی سوڵتان، پەیوەستی سوپاکەی ئازاد خان دەبن. گەمارۆکە بۆ ماوەی دوانزە ڕۆژ بەردەوام دەبێت و هیچ کام لەسوپاکان سەرکەوتن بەدەست ناهێنن. یەکێك لەسوارە ئەفغانییەکان، هەموو ڕۆژێك دێتە گۆڕەپانی جەنگ و داوای شەڕی دەستەویەخە دەکات، دوو سێ کەس ڕووبەڕووی دەبنەوە بەڵام دەکوژرێن. چیتر کەس ناوێرێت بۆ جەنگی ئەو ڕوو بکاتە گۆڕەپانی جەنگ بەڵام ئەو پێداگری لەسەر کارەکەی دەکات و هەموو ڕۆژێك دێتە گۆڕەپانی جەنگ. تا ئەوەی ڕۆژێك حاجی محەممەدی پێشەنگ، باوەگەورێی ڕۆستەم بەگی ئەمیر ئاخور، خوێنی دێتە کوڵ و لەقەڵاکە دێتەدەر و ڕووبەڕووی دەبێتەوە و دەنگ و هاواری کەسانی ناو قەڵاکە بەرز دەبێتەوە. لەیەکەم هێرش پاڵەوانی ئەفغانی دەکوژێت و سەری دەبڕێت و دەیهێنێتە بەردەم فەرمانڕەوا و پێگە و نازناوی میراخوڕی پێدەبەخشرێت. هاوکات لەگەڵ ئەم ڕووداوە، سوپای ئەردەڵان لەناوچەکانی دیکەوە دەگەن، شێخ عەلی خانی زەندیش کە لەهەمەدان بووە، لەم ڕووداوە ئاگادار دەبێتەوە و بەخێرایی لەگەڵ سوپاکەی بەرەو کوردستان بەڕێدەکەوێت. ئازادخان بەبینینی هاتنی سوپاییەکان لەهەموو ناوچەکانەوە و بیستنی هەواڵی بەڕێکەوتنی شێخ عەلی خانی زەند، پەرێشان دەبێت و بەناچار دەست لەگەمارۆی

سەر قەلاکە هەڵدەگرێت و ڕێگەی ئازەربایەجان دەگرێتەبەر. خوسرەوخانیش بەبیستنی کۆبوونەوەی ئەردەڵانییەکان و هاتنی شێخ عەلی خان دڵگەرم دەبێت و لەقەلاکە دێتەدەر و شوێن ئازاد خان دەکەوێت. شێخ عەلی خان لەناوچەی ئیسفەندئاوا دەگات و هەردوو سوپا تا سنووری گەڕوس شوێن ئازادخان دەکەون. سوپای ئازاد خان هەموو شت و بارە قورسەکانی خۆیان بەجێدێڵن و بەخێرایی ناوچەکە بەجێدێڵن و کەلوپەلەکانیان بۆ ئەردەڵان و زەندییەکان دەمێنێتەوە. ئازادخان دەرباز دەبێت. خوسرەوخان لەگەڕوسەوە بەرەو سنە دەگەڕێتەوە بەڵام شێخ عەلی خان، مەبەستی گرتنی مەڕومالاتی سلێمان پاشا دەکات و دوای ئەوەی زەوتیان دەکات، لەڕێگەی مەراغەوە بەرەو هەمەدان دەگەڕێتەوە.

خوسرەوخان ئەم ڕووداوە بۆ نەواب والا محەممەد حەسەن خانی قاجار دەنووسێت. محەممەد حەسەن خان نزیکەی سێ هەزار تمەن و ئەسپ و خەلات بۆ خوسرەوخان دەنێرێت. شێخ عەلی خان، دوای گەڕانەوە بۆ هەمەدان دەست بەنۆژەن کردنەوە و ئاوەدان کردنەوە دەکات و لەپاداشتی ئەو هاوکارییە، بەردەوام دانەوێڵە و شت ڕەوانەی کوردستان دەکات. خوسرەوخان کەبۆ دڵنەوایی کردنی خەڵك و دڵگەرم کردنی ئەوان و مسکێنەکان، بەناوچەکاندا سەفەر دەکات، نەزم و ئارامی سنەدژ و قەلای حەسەن ئاوا بەخوالێخۆشبوو میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر و یوسف بەگ دەسپێرێت. میرزا عەبدوڵڵە و یوسف بەگ لەکار و کردەوەکانی شێخ عەلی بێزار دەبن و شەوانە لەگەڵ ماڵ و منالی خۆیان بەرەو شارەزوور دەڕۆن و بنەماڵە و خێزانی خوسرەوخان و ڕەزا قولی خان لەقەلای حەسەن ئاوا بەجێدێڵن. خوسرەوخان بەبیستنی ئەم هەواڵە دەگەڕێتەوە و بنەماڵە و کەسەکانی خۆی بۆ شار دەبات و فەرمانی وێران کردنی قەلای حەسەن ئاوا دەردەکات بۆ ئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان نەبێتە پەناگەی دوژمنان. دوای ئەوەی محەممەد حەسەن خان، لەجەنگ دژی شێخ عەلی خان کە نوێنەری کەریم خان بوو، لە ١١ جومادی الاوەلی ١١٧٢ کۆچی بەدەستی سەبزعەلی ناوێکی کوردی ئێستەرئابادی و محەممەد عەلی ئاغای دەلۆ، برای حسەین خانی دەلۆ، دەکوژرێت و کەریم خان دەبێتە فەرمانڕەوای سەرانسەری ئێران. خوسرەوخان لەترسی کەریم خان، سوپاکەی خۆی کۆدەکاتەوە و سەرقاڵی ئامادە کردنی سوپا و بەهێز کردنی قەلاکانی دەبێت. لەبەر ئەوەی هەواڵی ترسانی خوسرەوخان بەکەریم خان دەگات، خەلات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەیەکێك لەکەسەکانی خۆی بۆ خوسرەوخان دەنێرێت و هیوا و

دڵگەرمی پێدەبەخشێت. لەساڵی ١١٧٣ کەکاروانی کەریم خانی وەکیل الرعایا لەتارانەوە بەرەو چەمەنی سوڵتانیە بەرێدەکەوێت، خوسرەوخان، ئەحمەدخانی کوڕی لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی بۆ پێشوازی کردنی ڕەوانە دەکات.

لەساڵی ١١٧٦، سلێمان پاشای بابان بەمەبەستی گرتنی کوردستانی ئەردەڵان، هێرش دەکاتە سەر مەریوان. خوسرەوخان لەگەڵ سوپایەکی کەم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕوو دەکاتە ئەو ناوچە و جەنگ لەدەشتی مەریوان دەست پێدەکات. سلێمان پاشا شکست دەخوات و ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر و بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە پەنا بۆ دەرباری کەریم خان دەبات. سلێمان پاشا بەدانی سی هەزار تمەن پێشکەشی و تۆمەت هەڵبەستن بۆ خوسرەوخان، سەرئەنجام فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستانی ئەردەڵان وەردەگرێت و خوسرەوخان بانگێشی شیراز دەکرێت.

## حکومەتی سلیمان پاشای بەبە

دوای هاتنی سلێمان پاشای بەبە بۆ کوردستان لەساڵی ١١٧٧ کۆچی، بۆ ماوەی شەش مانگ فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات. دواتر لەگەڵ سوپای ئەردەڵان و بابان هێرش دەکاتە سەر شارەزوور و ئەحمەد پاشای بابان لەو ناوچەیە دوور دەکاتەوە کە لەلایەن عەلی پاشای، وەزیری بەغداد وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە دیاریکرابوو. وەزیری بەغداد ئەم هەواڵە دەبیستێت و بیست هەزار لەسوارەکانی عەشیرە عەرەبەکان بۆ سەرکوت کردنی سلێمان پاشای بەبە ڕەوانە دەکات.

ئەمین پاشای موسڵ و عەبدوڵڵە پاشای زەهاو و سوپاکەیان لەخزمەتی وەزیردا بوون و کاتێك دەگەنە کفری، سلێمان پاشا ئاگادار دەبێتەوە و لەگەڵ دوو هەزار سواری ئەردەڵان و بابان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان ئەسپ غار دەدات. دوای بڵێسە سەندنی ئاگری جەنگ، سوارەکانی ئەردەڵان و بابان توانای خۆڕاگرییان نامێنێت و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر و عەلی پاشا دووبارە ئەحمەد پاشای برای سلێمان پاشا وەك فەرمانڕەوای شارەزوور دەستنیشان و خۆی دەگەڕێتەوە. دوای ماوەیەکی کەم دووبارە سلێمان پاشا لەگەڵ سوپای ئەردەڵان هێرش دەکات سەر شارەزوور و ئەحمەد پاشا بەهەڵاتن ناچار دەکات و خۆی فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیە دەگرێتە دەست. ئەو بنەماڵانەی بەهۆی ڕووداوەکانی ڕۆژگار بۆ شارەزوور کۆچیان کردبوو و دەستەیەکیان بەفەرمانی سەلیم پاشا ڕوویان لەو ناوچانە

کردبوو، بۆ کوردستانی ئەردەلآن دەگەڕێنێتەوە و عەلی خانی کوڕی لەگەڵ خێزانەکەی بۆ فارس دەنێرێت تا لەخزمەتی پاشا دابێت. سلێمان پاشا هەندێ کات لەشارەزوور و هەندێ کات لەسنە ژیانی بەسەر بردووە. لەساڵی ١١٧٨ کەسێك بەناوی ئیبراهیم لەتۆڵەی ئەوەی گوایە سلێمان پاشا پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەیدا بووە، نیوە شەو هێرش دەکاتە سەر جێگەخەوی سلێمان پاشا و بەزەربی شمشێر گیانی دەگرێت.

دوای مردنی ئەو بەفەرمانی کەریم خانی وەکیل، محەممەد پاشای برای لەشارەزوور و عەلی خانی کوڕی لەکوردستانی ئەردەلآن، وەك فەرمانڕەوا دیاریدەکرێن. دوای نزیکەی دوو ساڵ لەم ڕووداوە، محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل و میرزا عەبدوللەی وەزیر و میرزا محەممەد سادقی مستەوفی سکالاَ بۆ دەرباری کەریم خان بەرز دەکەنەوە و بەمشێوەیە عەلی خان لەسەر کار لادەبرێت و لەساڵی١١٧٩، دووبارە خوسرەوخانی ئەردەلآن، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت

### حکومەتی خوسرەوخانی ئەردەلان، جاری دووەم

دوای ئەوەی عەلی خانی بابان لەسەر کار لادەبرێت، لەساڵی ١١٧٩ کۆچی، خوسرەوخانی ئەردەلآن دووبارە بەپێی فەرمانی کەریم خانی زەند، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و لەساڵی ١١٨٠ دەڕواتە ناو شاری سنەدژ و دەست بەئاوەدان کردنەوە و نۆژەن کردنەوەی وڵآت و ناوەندی دەسەلآتەکەی دەکات. لەشوێنی سوپای ئێستا کەپێشتر لەدەرەوەی دار الایە بووە، تالارێکی ڕازاوە و مەزن بەرەو ڕۆژهەلآت و لەبەردەم تالارەکە حەوزێکی گەورە و چەندین پەیکەری بەردین کە لەدەمی هەموو پەیکەرەکانەوە ئاو دەهاتەدەر، دروست دەکات. ئەم تالارە بەتالاری خوسرەوییە بەناوبانگ بووە و تا ساڵی ١٣٣٨ یانی زەمانی حکومەتی عەلی محەممەد خانی شەریف ئەلدەولە ماوەتەوە. لەبەر ئەوەی خراپ و وێران بووە، شەریف ئەدەولە لەگەڵ نۆژەن کردنەوەی بینا و بەشەکانی دیکەی ناوەندی دەسەلآتەکەی، شێوەکەی بۆ شێوەی ئەمڕۆیی گۆڕیوە و لەئێستادا ژێرەکەی ئەنبارە و قاتی سەرەوەی چەندین ژووری هەیە بەرەو ڕۆژهەلآت، باکور و ڕۆژئاوا. گەرماو و مزگەوتی دارالایە و باخی بەناوبانگ بەناوی باخی چوارباغ کەلەژێر چاودێری ئەندازیاری تایبەت دروستکراوە، لەیادگارییەکانی ڕۆژگاری ئەوە و لەساڵی ١١٨٤، پردی قشلآقی بەتەواوی چاککردۆتەوە و ئەم دێرە نیشاندەری ساڵی تەواو بوونیەتی : (چ نیکوتر

شد از کهنه پلی نو)

لەساڵی ١١٩١، وەزیری بەغداد بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی وێرانی بەسرە، کەپێشتر سوپاکەی کەریم خان وێران و کاولی کردبوو، بەپێی فەرمانی دەوڵەتی عوسمانی، لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەڕێگەی زەهاو و عەبدوڵڵە پاشای فەرمانڕەوای موسڵ و کەرکوك، لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەڕێگەی قەڵاچوالانەوە کە لەپێنج فەرسەنگی قزڵجەیە، هێرش دەکەنە سەر سنوری ئێران. محەممەد پاشای فەرمانڕەوای بابانییەکان کە بەنوێنەرایەتی کەریم خانی زەند فەرمانڕەوایەتی شارەزووری کردووە، پەیوەستی سوپاکەی وەزیری بەغداد دەبێت و بەڵێنی گرتنی کوردستانی ئەردەڵان دەدات. وەزیر لەسوپا دوانزە هەزار کەسییەکەی ژێر فەرمانی، هەشت هەزار سواریان پەیوەستی سوپاکەی محەممەد پاشا دەکات و ئەو، بەرەو مەریوان بەڕێدەکەوێت. کاتێك ئەم هەواڵە بەخوسرەوخان دەگات، بەخێرایی کەریم خان ئاگادار دەکاتەوە و خۆی لەگەڵ دوو هەزار سواری ئەردەڵان بۆ بەرگری کردن بەرەو مەریوان بەڕێدەکەوێت. لەنیوەی ڕێگەدا نزیکەی حەوتسەد سوار لەمەراغە و گەڕوس پەیوەستی سوپاکەی خوسرەخان دەبێت. لەکەنار دەریاچەی زرێباری مەریوان، دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە. سەرەتا سوپای مەراغە و گەڕووس شکست دەخۆن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. دواتر سوپای ئەردەڵان، دوای ئەوەی سی کەسیان لێ دەکوژرێت و سەد و حەفتا کەسیان لێ ئەسیر دەکرێت، شکست دەخوات و بەرەو سنەدژ پاشەکشێ دەکەن. لەناو کوژراوەکانی ئەردەڵان، میرزا عەلی و میرزا مەهدی کوڕەکانی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر، نەسروڵڵە بەگ کوڕی یوسف بەگ، محەممەد ڕەزا بەگی ئەردەڵان و عەبدوڵڵە بەگی سکرتێر و کەسانی دیکە دەبینران. لەناو ئەسیرەکانیش کەسانی وەك میرزا ئەحمەد کوڕە گەورەی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر لەگەڵ دەستەیەك لەپیاوماقووڵانی سنە.

محەممەد پاشا لەترسی کەریم خان توانای پێشرەوی نەبووە و لەترسی وەزیریش توانای پاشەکشێی کردنی لەخۆیدا نەبینیوە و لەمەریوان خێوەت هەڵدەدات. لەملاوە خوسرەوخان چۆنیەتی ڕووداوەکە بۆ دەرباری کەریم خان دەنێرێت. کەریم خان تووڕە دەبێت و سادق خانی برای لەگەڵ سوپایەك بەرەو بەسرە و نەزەر عەلی خانی زەند لەگەڵ سوپایەك لەڕێگەی مەندەلیجەوە بەرەو بەغداد و کەلب عەلی خان و عەلی موراد خانی زەند لەگەڵ سوپایەك لەڕێگەی کوردستانەوە بەمەبەستی گرتنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ڕەوانە

دەکات. سادق خان لەماوەیەکی کەمدا دەست بەسەر بەسرەدا دەگرێت و نەزەر عەلی خانیش بەغداد تا سێ فەرسەخی دارئەلسەلام دەگرێت و تالانی دەکات. کەلب عەلی خان و موراد خانیش دەڕۆنە ناو شاری سنە. هەرچەند محەممەد پاشا لەکارەکەی خۆی پەشیمان و ئالای ئاشتی بەرز کردبوویەوە، بەلام گرنگییان پێ نەداوە و سوپای زەندییە لەگەڵ خوسرەوخان و سوپای ئەردەلان لەڕەجەبی ١١٩١ بەرەو مەریوان بەڕێکەوتووە و محەممەد پاشا بێ جەنگ و بەرگری کردن، ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. سوپای زەند و ئەردەلان بێ ئەوەی ڕووبەڕووی بەرگری و خۆڕاگری ببنەوە، تا قزڵەجە پێشڕەوی دەکەن کە لەپێنج فەرسەخی قەلاچوالانە. لوتف عەلی خانی کوڕی سوبحان وێردی خانی ئەردەلان، مامی خوسرەوخان لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکانی ئەردەلان، شوێنپێی محەممەد پاشای بابان و سوپا هەڵاتووەکەی هەڵدەگرن و تا ناوچەکانی قەرەداغ دەڕۆن و ئەو ناوچانە تالان و وێران و بیناکان لەگەڵ خاك یەکسان دەکەن. لەم کاتەدا گورگ عەلی بەگ پێشەنگی پاشا، بەفەرمانی کەریم خانەوە دەگات: نوێنەرەکانی دەوڵەتی عوسمانی هاتوونەتە دەرباری پاشای ئێران تا کێشەکە بەئاشتی لەنێوان ئەو دوو وڵاتە چارەسەر بکرێت، دوای گەیشتنی ئەم فەرمانە دەست لەگرتنی ناوچەکان هەڵگرن و لەسەر سنووری ئێران بمێننەوە و هیچ چالاکییەك ئەنجام مەدەن تا فەرمانی دووبارەمان بەدەستی ئێوە دەگات.

دوای خوێندنەوەی فەرمانەکە، بەخێرایی عەلی موراد خان بۆ کرماشان و خوسرەوخان و کەلب عەلی خان بۆ گوندی زاغەی کوردستان پاشەکشێ دەکەن و دوو مانگێك چاوەڕوان دەبن. دووبارە پەیك دێت کەکێشەی نێوان دوو دەوڵەتەکە بەئاشتی چارەسەر نەکرا. بەخێرایی هێرش بکەنە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی و تا ئەو جێگەی دەتوانن ناوچەکان تالان و وێران بکەن. بەپێی فەرمان، دووبارە کەلب عەلی خان و عەلی موراد خان و خوسرەوخان، ڕوودەکەنە ناوچەکانی شارەزوور. خوسرەوخان دەبێتە پێشەنگی سوپاکە. زولفەقار خان هاوکات لەگەڵ بەڕێکەوتنی ئەوان لەگەڵ سوپاکەی خۆی دەگات و هەموان ڕێگەی قەلاچوالان دەگرنەبەر. محەممەد پاشا کە لەقەلاچوالان بووە، دووبارە ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، حەسەن پاشای وەزیر، وەزیری بەغداد کەهیا و سوپایەکی گەورە، بۆ هاوکاری محەممەد پاشا و پاراستنی سنوور بەرەو شارەزوور بەڕێدەکەون. لەنێوان ڕێگە بەمحەممەد پاشا دەگەن و دەیگەڕێننەوە. کاتی ڕووبەڕوو

بوونـەوەی دوو سـوپا کـەریز بەسـتن و سـەنگەر هەڵکەنـدن و کـارە سـەرەتاییەکان ئـەنجام دەدرێت، ئەحمەد پاشای برای محەممەد پاشا پشت دەکاتە سوپای عوسمانی و پەیوەستی سوپای ئێران دەبێت. هەردوو سوپا شەوان لەناو سەنگەر و شوێنەکانی خۆیان ئارام دەگرن بۆ ئەوەی بەیانی و لەگەڵ هەڵاتنی خۆر جەنگ دەستپێبکەن. سوپای ئێران لەگەڵ هەڵاتنی خۆر رووودەکەنە گۆڕەپانی جەنگ، هێرش دەکەنە سەر هەر شوێنێك دەبینن، هیچ کەسی لێ نییە و کەس لەسوپای عوسمانییەکان نەماوەتەوە.. ئاشکرا دەبێت لەبەر ئەوەی توانای بەرگری کردنیان لەخۆیاندا نەبینیوە، شەوانە هەڵاتوون. سوپای زەنـد و قـەزەڵباش و ئەردەڵان، بەئاسوودەی دەست بەپێشڕەوی و تاڵان کردن و وێران کردن و سووتاندنی گوند و ئاوەدانییەکان و ئەسیر کردنی ژنان و کچان دەکەن و دەست بـۆ چـەندین کـردەوەی نامرۆڤانە و وەحشیانە درێژ دەکەن، خوسرەوخان کاتێك دەبینێت ئەمە چیدی جەنگ نییە و دەسـتدرێژی کردنـە سـەر ناموسـی کوردانـە، ئەسـیرەکان لەسـوپای زەنـد و قـەزەڵباش وەردەگرێتـەوە و تەسـلیم بەکـەس و کارەکانیـانی دەکاتـەوە و دەسـتەیەك لەبنەماڵـەکانیش ڕەوانەی شاری سنەدژ دەکات. خوسرەوخان، ئەحمەد پاشا وەك فەرمانڕەوای شارەزوور دەستنیشان و ڕەزا قولی خانی برای لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاکەی بۆ بەهێزکردنی ئەحمەد پاشا لەو ناوچەیە بەجێدێڵێت. دوای ئەم ڕووداوانە، محەممەد پاشا ڕوودەکاتە دەرباری کـەریم خـانی زەنـد و ملکەچی و گوێڕایـەڵی خـۆی نیـشان دەدات و بـەدانی پێشکەشی و خەڵاتی زۆر، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بابان و شارەزوور بۆ خۆی وەردەگرێت و ئەحمەد پاشا لەسەر کار لادەبرێت. وەزیری بەغداد لەم ڕووداوە نیگەران و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەحمەد پاشای بابان دەنێرێت. محەممەد پاشا، دەرباری کەریم خان لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە و داوای هاوکاری دەکات. بەخێرایی عەلی موراد خان لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ هاوکاری کردنی محەممەد پاشا ڕادەسپێردرێت و لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاتنی سوپای عەلی موراد خان، ئەحمەد پاشا ڕێگەی بەغداد دەگرێتەبەر و عەلی موراد خانیش بەرەو شیراز دەگەڕێتەوە. ئەم جارە ئەحمەد پاشا لەگەڵ سوپایەکی بەهێز و گەورە، هێرش دەکاتە سەر شارەزوور. دووبارە عەلی موراد خان بۆ هاوکاری کردنی محەممەد پاشا بەڕێدەکەوێت و دوای ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو سوپا و بڵێسە سەندنی ئاگری جەنگ، عەلی موراد خان قۆڵبەست و سوپای زەند و بابان شکست دەخۆن. ئەحمەد پاشا، عەلی موراد

خان ڕەوانەی بەغداد دەکات. وەزیری بەغداد تا ئەو جێگەی دەتوانێت ڕێزی دەگرێت و مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدەدات. دوای گەڕانەوەی بۆ شیراز، کەریم خانی زەند، لەم پێشهاتە خەمبار و نیگەران دەبێت و محەممەد شەفیع خانی زەند لەگەڵ دوانزە هەزار کەس بۆ هاوکاری محەممەد پاشای بابان دەنێرێت. شەفیع خان لەناوەڕاستی زستان و لەگەرمەی بەفر بارین و سەرما دەگاتە کوردستان و دوای دوو مانگ وەستان، لەگەڵ خوسرەوخان، ڕێگەی شارەزوور دەگرنەبەر. ئەحمەد پاشا دووبارە بێ جەنگ، ناوچەکە بەجێدێڵێت و محەممەد پاشا، جڵەوی کاروبارەکان دەگرێتەدەست. خوسرەوخان و محەممەد شەفیع خان بۆ ماوەی حەوت مانگ لەو ناوچەیە دەمێننەوە و دوای دڵنیابوون لەجێگیر بوونی پاشایەتی محەممەد پاشا، بەرەو ناوچەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە.

لەسێشەممەی ١٣ سەفەری ساڵی ١١٩٣، کەریم خانی زەند دەمرێت و (ئەی هاوار کەریم خان مرد)، ساڵی مردنی ئەوە. سەرۆك عەشیرەکان و سەرانی تایەفەکان، سەر بەرز دەکەنەوە و پشێوی و نائارامی باڵ بەسەر ئێراندا دەکێشێت. لەلایەك عەلی موراد خانی زەند، خۆی بەجێگری کەریم خان دەزانێت. لەلایەکی دیکە زولفەقار خانی ئەفشار قووت دەبێتەوە و خۆی بەمیرات هەڵگری پاشایەتی نادری ئەفشار لەقەڵەم دەدات. جیاواز لەوە عەلی موراد خان لەئیسفەهانەوە هێرش دەکاتە سەر ئەفشار. ئەحمەد خانی کوڕی خوسرەوخان کە بۆ ماوەی چواردەساڵ لەئیسفەهان دەستبەسەر بووە، لەم سەفەرەدا هاوڕێیەتی دەکات. لەڕێگەی، سوپای عێراق و محەممەد خانی لوڕ و ئەحمەد ئاغای باش ئاغا و کەسانی دیکە پەیوەستی دەبن. لەمانگی ڕەمەزان، لەسنوری عەلی شەکەر (ئیسفەند ئاوا) جەنگ لەنێوان دوو سوپا ڕوودەدات و دوای کوشت کوشتاری فراوان، سوپای ئەفشار ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. زولفەقار خان و دوو سێ کەسی نزیکی خۆیان بەتارم و خەڵخان دەگەیێنن. فەرمانڕەوای ئەو ناوچە قۆڵبەست و ڕەوانەی بارەگای عەلی موراد خانیان دەکات. لەگەڵ گەیشتنیان سەریان لەلاشە جیا دەکەنەوە. دوای ئەم سەرکەوتنە، بەو پەڕی ڕێزەوە، ئەحمەد خانی کوڕی خوسرەوخان ئازاد دەکات و خۆی ڕێگەی تاران دەگرێتەبەر و داوای بینینی خوسرەوخان دەکات. خوسرەوخان لەناوەڕاستی ڕەمەزانی ١١٩٣ لەگەڵ دەستەیەك لەزاناکان و گەورەپیاوانی سنە و خان و سەرکردەکانی ئەردەڵان و هەزار و پێنسەد سوار بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. عەلی موراد خان لەگەڵ سەرکردە بەناوبانگەکانی خۆی، تا دوو فەرسەخی

شاری تاران بەرەو پیری دێن و خوسرەوخان دەبەنە ناو شارەکە. خوسرەوخان لەدووەم دانیشتن داوای بەخشین و ئازاد کردنی الله قولی خان، فەرمانڕەوای کرماشان دەکات. عەلی موراد خان بەخێرایی ئەو لەزیندان دەهێنێتەدەر و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی دووبارەی کرماشانی بۆ دەنووسێت.

دواتر لەتارانەوە ڕوودەکاتە قەزوێن و دواتر بۆ ئیسفەهان دەگەڕێتەوە و خوسرەخان و خانەکانی کوردستان لەم سەفەرەدا هاوڕێیەتی دەکەن. لەئیسفەهان، محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل، بەنوێنەرایەتی دانیشتووان،، سکالاَ و گازندە لەخوسرەوخان دەکات. عەلی موراد خان کە لەناخەوە لەدەسەلاَتەکانی خوسرەوخان ترساوە، ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانێت و خوسرەوخان لەسەر کار لادەبات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ کەهزاد خانی کوڕی سوبحان وێردی خان دەنووسێت و لەگەڵ محەممەد ڕەشید بەگ وئەردەلاَنییەکان، ڕەوانەی کوردستانیان دەکات. هاوکات لەگەڵ ئەم پێشهاتە، هەواڵ دەگات کەکوڕەکانی سادق خانی زەند، دەستەیەکیان لەدەوری خۆیان کۆکردۆتەوە و مەبەستی شۆڕشیان لەسەردایە. عەلی موراد خان سوپایەك بەسەرکردایەکی سەرکردە زەندییەکان بۆ سەرکوت کردنی ئەوان دەنێرێت. هەروەها محەممەد رەشید بەگی وەکیلیش لەگەڵ سێسەد سواری ئەردەلاَن هاوڕێیەتی ئەوان دەکەن. لەیەکەم ڕووبەڕووبوونەوەدا، سەرکردەکانی سادق خان، شکست بەسەرداران و سوارەکانی زەند و ئەردەلاَن دەهێنن و سوپاکەی عەلی موراد خان بەتەواوی لەناو دەچێت. محەممەد ڕەشید بەگ و هاوڕێکانی چیتر بۆ ئیسفەهان ناگەڕێنەوە و لەوێوە ڕێگەی کوردستان دەگرنەبەر تا فەرمانڕەوایەتی کەهزاد خان بەهێز بکەن. خوسرەوخان کاتێك لەشکست و لەناوچوونی سوپاکەی عەلی موراد خان ئاگادار دەبێتەوە، لەگەڵ ڕەزا قولی خانی برای و لوتف عەلی خانی مامی، ڕێگەی کوردستان دەگرنەبەر. کاتێك دەگەنە ناوچەی ئیسفەندئاوا، محەممەد ڕەشید بەگ ئاگادار دەبێتەوە. بەناچاری محەممەد ڕەشید بەگ و کەهزاد خان و میرزا یوسق و میرزا ئەحمەد، کوڕەکانی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر و دەست و پێوەندەکانیان، بەخێرایی بەرەو پایگولاَن بەڕێدەکەون. لەگەڵ هەلاَتنی ئەوان، خوسرەخان دێتە ناو شارەکە و پێش ئەوەی هیلاکی ڕێگە لەجەستەی دەربکات، لەگەڵ کۆمەڵێك سوار، شوێنپێیان هەڵدەگرێت. لەگەردەنەی عاشقان دەگاتە کاروانی بارەکانی ئەوان و هەموو ئەو کەل و پەلە دەوڵەتییانەی لەگەڵ خۆیان بردبوویان، وەری دەگرێتەوە و

ئەو دەستەیە بێ ئەوەی بتوانن هیچ لەگەڵ خۆیان ببەن، ڕێگەی شارەزوور دەگرنەبەر و پەنا بۆ محەممەد پاشای بەبە دەبەن. خوسرەوخان لەگەڵ تالآنییەکان دەگەڕێتەوە. دواتر هەڵاتووانی ویلایەتەکەی کۆدەکاتەوە و نەزم و ئارامی بۆ وڵات دەگێڕێتەوە. لەم کاتەدا محەممەد پاشا و عومەر بەگ، براکانی مەحمود پاشا، پشت دەکەنە براکەی خۆیان و پەنا بۆ خوسرەو خان دەبەن. بەدوای ئەوان، مەحمود پاشا بۆ خوسرەوخان دەنووسێت: ئەگەر ئەو، محەممەد پاشا و عومەر بەگ بۆ من ڕەوانە بکاتەوە، منیش کەهەزاد خانی بۆ دەنێرمەوە، تا بەمشێوەیە پەیوەندی نێوان هەردووکمان بەهێز ببێت. خوسرەو خان بەمە ڕازی دەبێت و بەهۆی محەممەد ئاغای بروجێردی، محەممەد پاشا و عومەر بەگ دەگەڕێنێتەوە. مەحمود پاشایش بەدەستی بابەکرئاغا، کەهزاد خان ڕەوانەی سنە دەکاتەوە. لەڕێگە بابەکر ئاغا و محەممەد ئاغا بەیەك دەگەن و دیلەکانی خۆیان دەگۆڕنەوە و هەرکام بۆ شوێنی خۆیان دەگەڕێتەوە.

بابەکر ئاغا کاتێك محەممەد پاشا و عومەر بەگ تەسلیمی مەحمود پاشا دەکاتەوە، دەستبەجێ فەرمانی کوشتنی هەردووکیان دەردەکات. محەممەد ئاغایش کاتێك کەهزاد خان تەسلیمی خوسرەخان دەکات، بەپێچەوانەی مەحمود پاشا، دەستی دەکاتەوە و ڕێزی دەگرێت. محەممەد ڕەشید بەگ و هاوڕێکانی بۆ زەهاو کۆچ دەکەن و نەزەر عەلی بەگی کوڕە مامی و کوڕەکانی لەوێ بەجێدێڵێت و خۆی پەنا بۆ وەزیری بەغداد دەبات. وەزیر چوار گوند لەسنوری زەهاو بەوان دەبەخشێت و ئەو بۆ لای کەسوکار و بنەماڵەکەی دەنێرێت. بۆ ماوەی چوار ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە بەڵام لەگەڵ عەشیرەکانی کوردستان کەگەرمێن و کوێستانیان کردووە، بەشێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوت دەکات. هاوڕێکانی بەم کارانەی ڕازی نابن و بەناچاری دڵ بەچاکەکاری خوسرەوخان خۆش دەکەن و بۆ کوردستانی ئەردەڵان دەگەڕێنەوە و لەلایەن خوسەروخانەوە ئەمانیان پێدەبەخشرێت. محەممەد ڕەشید بەگیش لەمانەوە لەزەهاو بێزار دەبێت و بەناچاری پەنا بۆ دەرباری عەلی موراد خانی زەند دەبات. عەلی موراد خان بۆ خوسەروخان دەنووسێت کەچاوپۆشی لەکار و کردەوەکانی محەممەد ڕەشید بەگ بپۆشێت و ناوچەکانی پڵنگان و جوانڕۆ لەکوردستان جیابکاتەوە و بەمحەممەد ڕەشید بەگی بسپێرێت. خوسرەوخان ئەو فەرمانەی ئەنجامداوە و ڕێزێکی زۆری لەبنەماڵەی محەممەد ڕەشید بەگ گرتووە.

کەهزاد خان و لوتف عەلی خان، لەناخەوە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ محەممەد ڕەشید بەگ پاراستبوو. محەممەد ڕەشید بەگ وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، نەزەر عەلی بەگی کوڕە مامی و کوڕەکانی نەزەر عەلی بەگی لەزەهاو دانابوو، خۆی دەڕواتە ئیسفەهان و پەنا بۆ عەلی موراد خان دەبات. کارگوزاری زەهاو بەخێرایی وەزیری بەغداد لەم کارەی محەممەد ڕەشید بەگ ئاگادار دەکاتەوە. وەزیر کاغەزێکی مێهرەبانانە بۆ محەممەد ڕەشید بەگ دەنووسێت و بانگێشتی بەغدادی دەکات. پەیك کاغەزەکە دەباتە لای نەزەر عەلی بەگ و دەکەوێتە دەستی کەهزاد خان. کەهزادخان بۆ ئەوەی خۆی لەخوسرەوخان نزیك بکاتەوە، دەستبەجێ کاغەزەکە تەسلیم بەخوسرەخان دەکات. خوسرەوخانیش کاغزەکە بۆ موراد عەلی خان دەنێرێت و ئاگاداری دەکاتەوە کە: بەپێی فەرمانی بەڕێزتان دوو بەشی کوردستانم جیاکردەوە و خستمە ژێر دەسەڵاتی محەممەد ڕەشید بەگ، جیاواز لەوە چاکەی زۆرم لەگەڵ کرد و تا توانیم ڕێزی خۆی و بنەماڵەکەیم گرت بەڵام بەپێچەوانەوە دەست لەدوژمنایەتی ئێمە و بەندایەتی دوژمنی ئێران هەڵناگرێت وهێشتا لەگەڵ وەزیری بەغداد پەیوەندی هەیە و سەرکردە و کەسەکانیشی لەزەهاون.

لەگەڵ گەیشتنی کاغزەکە بەدەستی عەلی موراد خان فەرمان بەگرتن و تاڵان کردنی سامانی محەممەد ڕەشید بەگ دەدات و ئەوەی سامانی محەممەد ڕەشید بەگە لەئیسفەهان دەکەوێتە دەستی داروەستەی عەلی موراد خان. حسەین خانی غولام ڕادەسپێرێت تا پێنج هەزار تمەن وەك جەریمە لەمحەممەد ڕەشید بەگ وەربگرێت. محەممەد ڕەشید بەگ ماوەیەك لەزینداندا دەمێنێتەوە و دواتر ئازاد دەکرێت. دوای ئازاد بوونی دووبارە تۆمەت هەڵبەستن بۆ خوسرەوخان لای عەلی موراد خان دەستپێدەکاتەوە و لەفراوان بوونی دەسەڵاتەکانی ئاگاداری دەکاتەوە عەلی موراد خانیش لەبەر ئەوەی هێشتا دەسەڵاتی بەتەواوی جێگیر و سەقامگیر نەبوو، بەردەوام لەفراوان بوونی دەسەڵات و هێزی کەسانی وەك خوسرەوخان دەترسا و لەبەر ئەمە وتەکانی محەممەد ڕەشید بەگ کاریگەری خۆی دادەنێت و لەساڵی ١١٩٦ کۆچی، خوسرەوخان بۆ ئیسفەهان بانگ دەکات. خوسرەوخان لەبەر کار و کردەوەکانی پێشووی داوای لێبوردن دەکات. عەلی موراد خانیش بەپشت بەستن بەوتەکانی محەممەد ڕەشید بەگ بەخێرایی فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بۆ ڕەزا قولی خانی برای خوسرەوخان دەنێرێت و جەعفەر خانی برای خۆی لەگەڵ پێنج هەزار سوار

ڕادەسپێرێت تا خوسرەوخان قۆڵبەست و ڕەوانەی ئیسفەهانی بکات. خوسرەوخان لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە لەگەڵ دەستەیەك لەکەسەکانی خۆی لەڕێگەی خوانسار دەڕواتە ناو ئیسفەهان. خان ئەحمەدی کوڕیشی کەجێگری بووە، لەگەڵ کەس و کار و دەستوپێوەندەکانی لەترسی هاتنی جەعفەر خان، بەرەو هەورامان و شارەزوور بەڕێدەکەوێت. ڕەزا قولی خانیش لەگەڵ ئەوەی فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بەناوی ئەو دەرچووە، حاشا لەبرایەتی خۆی لەگەڵ خوسرەوخان ناکات و لەگەڵ بنەماڵەکەی پەیوەستی خان ئەحمەد خان دەبێت. سێ ڕۆژ دوای ڕۆشتنی ئەوان، جەعفەر خان و سوپاکەی دەگەنە شارەکە و کوشت و کوشتار و تالآن کردن دەستپێدەکەن. ئەحمەد خان لەشارەزوور دەمێنێتەوە بەلآم ڕەزا قولی خان ڕێگەی ورمێ دەگرێتەبەر. و پەنا بۆ ئیمام قولی خان دەبات کە لەوکاتەدا لەبەرابەر عەلی موراد خان، دەیویست پاشایەتی ئێران بگرێتەدەست. جەعفەر خان دوای کردەوە وەحشیانەکانی، شێخ عەبدولمۆئمینی دووەم، پێشنوێژ و وتار خوێن و گەورە باوەگەورێی نووسەر بۆ شارەزوور دەنێرێت تا مۆجیاری ڕەزا قولی خان و ئەحمەد خان بکات و ئەوان بۆ سنە بگەڕێنێتەوە. شێخ ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانێت و ڕێگەی شارەزوور دەگرێتەبەر و لەوێ دەمێنێتەوە. ئیمام قولی خانیش ڕێز لەڕەزا قولی خان دەگرێت و بەناوی هاوکاری لەگەڵ شەش هەزار سوار، لەگەڵ ڕەزا قولی خان ڕێگەی کوردستان دەگرێتەبەر. جەعفەر خان لەگەڵ نزیك بوونەوەی ئەم سوپایە لەسنە، شەوانە ڕێگەی هەلآتن دەگرێتەبەر و ئیمام قولی خان بێ ئەوەی ڕووبەڕووی بەرگری ببێتەوە، دەڕواتە ناو شارەکە و ڕەزا قولی خان وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکات و خۆی ڕێگەی ئیسفەهان دەگرێتەبەر. لەڕێگەدا سەرکردە و سالارەکانی گرنگی بەبۆچوونەکانی نادەن و بەرەو ورمێ دەگەڕێنەوە. ڕەزا قولی خان دوای حەڤدە ڕۆژ لەفەرمانڕەوایەتی خۆی بەهاندان و هەڵخراندنی محەممەد ڕەشید بەگ، کەهزاد خان و لوتف عەلی خان، هێرش دەکاتە سەر کرماشان. بەڕێکەوت ڕەزا قولی خان بەهۆی ڕمی نەزەر عەلی خان بریندار دەبێت و بەرەو گەڕوس هەڵدێت و لەوێ دەمرێت. خوسرەوخانیش کەدەڕواتە ئیسفەهان، لەلایەن عەلی موراد خانەوە پشتگوێ دەخرێت و بۆ ماوەی شەش مانگ لەوپەڕی بەدبەختی و ڕیسواییدا ژیان بەسەر دەبات تا ئەوەی هەواڵی هێرشی کەهزاد خان و مردنی ڕەزا قولی خان بەعەلی موراد خان دەگات. دوای بیستنی ئەم هەواڵە، خوسرەوخان بانگ دەکات و

ڕێزی دەگرێت خەلات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەحمەد خانی کوڕی دەنووسێت و ڕەوانەی شارەزووری دەکات. ئەحمد خان بەپێی فەرمان لەگەڵ شێخ عەبدولمۆئمینی دووەم بەرەو سنەدژ دەگەڕێتەوە و کەهزاد خان و لوتف عەلی خان پێشوازیان لێدەکەن و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان نیشان دەدەن. دوای ماوەیەک عەلی موراد خان لەساڵی١١٩٨ بەهۆی زێدەڕۆیی کردن لەخواردنەوەی مەشروبات، گرفتاری نەخۆشی دەبێت و دەمرێت. سەرکردە و سەرۆکەکان لەهەموو ناوچەکانەوە بانگەشەی پاشایەتی بەرز دەکەنەوە و نیزامی پاشایەتی تیرەکان جارێکی دیکە باڵ بەسەر ئێراندا دەکێشێت. خوسرەوخان بەناچاری بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە و سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئاوارە و هەڵاتووەکان و ئاوەدان کردن و تۆکمە کردنی قەڵا و سەنگەرەکان دەبێت. لەو کاتەدا الله قولی خانی زەنگەنە، مەبەستی گرتنە دەستی دەسەڵاتی پاشایەتی دەکات و لەتایەفەکانی زەنگەنە، کەلهوڕ و عەشیرەکانی سەرسنور و سەرپولی زەهاو و خاکی عوسمانی و هتد... نزیک بیست هەزار سوار کۆدەکاتەوە و بەهۆی هاندان و هەڵخڕاندنی محەممەد ڕەشید بەگ کەپێشتر لەگەڵ کەسەکانی خۆی ڕۆشتبووە کرماشان، گرتنی کوردستان وەک سەرەتایەک بۆ گەیشتن بەمەبەست و ئاواتەکەی خۆی دەزانێت و لەگەڵ تۆپخانە و تەشریفاتی سەڵتەنەتی لەڕێگەی کەنگاوەر بەرەو کوردستان دێت. لەهەموو شوێنێک محەممەد ڕەشید بەگ و کەسەکانی پێشەنگ و پێشڕەوی و ڕێنیشاندەری بوون.

کاتێک خوسرەوخان لەشۆڕشی الله قولی خان ئاگادار دەبێتەوە، لەرەبیع الاوەلی ١١٩ کۆچی، لەگەڵ حەوتسەد سواری خاوەن ئەزمون لەپیاوماقووڵان و نەجیبزادەکانی کوردستان، بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوە، شارەکە بەجێدێڵن. لەگەڕدەنەی باخان کە لەسێ فەرسەنگی شارەکەیە، سوارەکان لەنێوان کوڕەکانی خۆی دابەش دەکات. هەریەک لەکوڕەکانی دەکاتە فەرماندەی سەد سوار و پەنجا سوار لەژێر سەرکردایەتی خۆیدا دەمێنێتەوە. ئەحمەد خانی کوڕە گەورەی لەگەڵ میرزا یوسفی وەزیر کوڕی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر لەپێشەوەی سوپاکەی جێگیر دەکات. دوای نیو کاتژمێر لەشەو، پێشەنگەکانی دوو سوپا لەدەشتی ئەمیرئاوا ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە. پاڵەوانەکانی هەردوو سوپا، بوێرانە دەجەنگن و ئازایەتی خۆیان نیشان دەدەن. سەرئەنجام پێشەنگەکانی زەنگەنە کەکوڕەکانی محەممەد ڕەشید بەگ لەناو ئەواندا بینراون، پاشەکشێ دەکەن. بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی خۆر،

ئەحمەد خان و میرزا یوسف لەگەڵ ئەسیر و تالآنییەکان بۆ لای خوسرەوخان دەگەڕێنەوە.
کاتێك هەتاو لەئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە سەر دەردێنێت، سوپای ئەردەڵان شێر ئاسا هێرش دەبات و لەناوچەی سەنقوڕ، بوێران و دلێران لەباڵی چەپ و ڕاست ڕیز دەبەستن و خودی فەرمانڕەوا لەدواوەی سوپاکەی جێگیر دەبێت. الله قولی خانیش پێشڕەوی کرد و لەبەرابەر سوپای ئەردەڵان کەگرنگی زۆری پێنەدەدان، سوپاکەی بۆ چەندین باڵ دابەش کردووە و تۆپخانەکانی لەهەر دوو باڵی سوپاکەی داناوە و لەڕاست و چەپەوە هێرش دەستپێدەکەن.
ئەحمەد خان کەدووبارە پێشەنگی سوپای ئەردەڵان بووە، لەبەرابەر پێشەنگەکانی زەنگەنە کەم کەم پاشەکشێ دەکات تا ئەوان سەرکەوتن بەدەست بێنن و لەنیشانەی تۆپەکان دوور بکەونەوە. کاتێك بەمەبەستەکەی خۆیان دەگەن، ئەحمەد خان لەناوەڕاست، ئەمیر ئەسلأن خان و محەممەد خان لەچەپ و ڕاست، هەر سێ برا لەگەڵ سوارەکانی سوپای ئەردەڵان هێرش دەکەنە سەر سوپای زەنگەنە کەمحەممەد ڕەشید بەگیان هاوڕێیەتی کردوون و لەیەکەم هێرش، زەرەر و زیانێکی زۆریان لێدەدەن و بەپاشەکشێ ناچاریان دەکەن. سوپای الله قولی خان کاتێك ئەم بوێرییەی سوپای ئەردەڵان دەبینن، وره و توانای خۆڕاگریی لەدەست دەدەن و کوێرانە هێرش دەستپێدەکەن. سوپای ئەردەڵان لەم کاتەدا دەرفەتیان پێنادەن و لەچەپ و ڕاستەوە هێرشیان دەکەنەسەر. ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکوژن و ژمارەیەکیان بریندار دەکەن.
لەم بگره و بێنەدا، ڕەزا بەگی پێشەنگی خوسرەوخان، دەگاتە الله قولی خان و لەئەسپەکەی دەیهێنێتە خوار و سەری لەجەستەی جیا دەکاتەوە و دەیباتە لای خوسرەوخان. سوپای زەنگەنە دوای کوژرانی الله قولی خان ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر.. سوپای ئەردەڵان دەبێتە دوو دەستە: دەستەیەکیان شوێن هەڵاتووان دەکەون و بەکوشتن و ئەسیر کردنیان سەرقاڵ دەبن، دەستەیەکی دیکەیان سەرقاڵی کۆکردنەوەی تالآنییەکان دەبن. هەموو تۆپخانە و سیلاحە گرنگەکانی سوپای زەنگەنە و الله قولی خان دەکەوێتە دەستی ئەردەڵانییەکان.
خوسرەوخان دەڕواتە ناو خێوەتی الله قولی خان. محەممەد ئاغا، باوەگەورێی میرزا عەلی ئەکبەری سادق لەگەڵیدا دەڕواتە ناو خێوەتەکە و ڕاستەوخۆ دەڕۆنە لای سنوقی خەزێنەکەی الله قولی خان. لەوێ شتی زۆری سەڵتەنەتی دەبینن. محەممەد ئاغا سنووقێکی بچووك سەرنجی ڕادەکێشێت، هەڵیدەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوسرەوخان.

خوسرەوخان کە لەتاو شەکەتی پاڵی داوەتەوە، بەمحەممەد ئاغا دەڵێت: بۆ نەڕۆشتیت و لەتالآنییەکان شتێك بۆ خۆت کۆبکەیتەوە. محەممەد ئاغا دەڵێت: من بۆ خزمەت کردنی مەلیك هاتووم، بۆ کۆکردنەوەی تالآنی نەهاتووم. دواتر باسی سنووقەکە و سنووقەکانی بۆ دەکات. خوسرەوخان لەشوێنەکەی بەرز دەبێتەوە و داوای سنووقەکە دەکات، دەبینێت قوفڵێکی بچووکی پێوەیە. محەممەد ئاغا دەیەوێت قوفڵەکە بشکێنێت. خوسرەوخان دەڵێت: مەیشکێنە، من کلیلێکی بچووکم پێیە، بزانم دەیکاتەوە یا نە. کلیلەکە دەردەهێنێت و دەیکاتە ناو قوفڵەکە. دەیکاتەوە. خوسرەوخان دەڵێت: ئەمڕۆ دەرکەوت سەرکەوتن بەهەموو شێوەیەك لەگەڵ ئێمەیە. تەنانەت کلیلی ئێمە قوفڵی زەنگەنە دەکاتەوە. سنووقەکە دەکەنەوە و دەبینین لێوانلێوە لەزێڕ و زیوی جۆراوجۆر. خوسرەوخان لەناو زێڕ و زیوەکان ئەنگوستیلەیەکی فیروزەیی لەقامك دەکات و پاشماوەکەی بەمحەممەد ئاغا دەبەخشێت کەبەهاکەی زیاتر لەچەند هەزار تمەن بووە. لەم ناوەدا دەستەیەك لەسوارەکان دەگەڕێنەوە، محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل و نەسیر خانی کەلیایی و دەستەیەکی دیکە بەئەسیری دەهێنن. خوسرەوخان بەخێرایی فەرمان دەدات دەستی محەممەد ڕەشید بەگ بکەنەوە و هەموو سامانەکانی لەسوپاییەکان دەستێنێتەوە و بۆی دەگەڕێنێتەوە و ڕێزی لێدەگرێت و دەڵێت: وەکیل، جیاواز لەهەموو شتێك، هاوڕێیەتی لەهەموو شتێك گرنگترە. دڵنیابە چرایەك خواوەند دایگرسێنێت، ئەگەر نەزان فووی لێ بکات، ڕیشی دەسووتێت. وەستان و مانەوە لەمە زیاتر شیاو نییە. شێلم و برۆێشی کوردستانی خۆمان لەخواردنە جۆراوجۆرەکانی ئیسفەهان و نیعمەتەکانی کرماشان باشتر و خۆشترە.

خوسرەوخان دوای ئەم سەرکەوتنە گەورە، لەهەمان ئوردووگا، حاجی عەلی خانی مامی الله قولی خان وەك فەرمانڕەوای کرماشان دەستنیشان و خەلآت و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ دەنێرێت. حاجی عەلی خانیش هەموو خەزێنە و مەڕومالآت و هەموو سامانەکانی الله قولی خان کەبەهاکەی زیاتر لەسەد هەزار تمەن بووە، تەسلیم بەنوێنەرەکەی خوسرەوخان دەکات. خوسرەوخان هەموو ئەو تالآنی و سامانە لەناو سوپاکەی دابەش دەکات و جگە لەئەسپێك و خێوەت و بارەگای الله قولی خان، هیچی دیکە بۆ خۆی هەڵناگرێت و سەربڵند وسەرکەتوو دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ١٢٠٠ کۆچی، جەعفەر خانی زەند، زڕبرای دایکی عەلی موراد خان کە لەئیسفەهان

ئالآی سەڵتەنەتی بەرز کردبوویەوە، لەگەڵ سوپاکەی ڕوودەکاتە هەمەدان و لەوێوە خوسرەوخان بانگێشت دەکات. چوونکە لەو کاتەدا هێز و دەسەلآتی خوسرەوخان زۆر زیاتر لەجەعفەر خان بووە، بەبانگێشتەکەی ڕازی نابێت و گۆڕەپانی جەنگ بۆ ئەو کارە هەڵدەبژێرێت. دوو ڕۆژ دواتر خوسرەوخان لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو هەمەدان بەرێدەکەوێت. لەگەڵ ئەوەیشدا محەممەد حسەین خانی قەراگوزلو و محەممەد ئەمین خانی گەڕووسی بۆ ئەم جەنگە هان دەدات. ئەم سەرکردانە لەگەڵ پێنج هەزار سوار لەنزیك گوندی سالح ئاوا، پەیوەستی سوپاکەی خوسرەوخان دەبن. بەیانی ئەوڕۆژە کەپێنجشەممەی ٢٤ شەعبانی ساڵی ١٢٠٠ کۆچی بووە، سوپای خوسرەوخان دەڕواتە ناو بەهاری هەمەدان و لەوێ ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت.

ڕۆژی یەکەم هیچ کام لەسوپاکان نەیانتوانیوە سەرکەوتن بەدەست بێنن و بێ بەدەست هێنانی سەرکەوتن یا شکست بۆ شوێنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. ڕۆژی دووەم دەمەو نیوەڕۆ، سوپاکەی عەلی خانی خەمسە و محەممەد حسەین خانی قەراگوزلو، شکست دەخۆن و بلآوەی لێدەکەن. خوسرەوخان لەهەلآتنی سەردارەکان سەریسوڕدەمێنێت و هەزار لەسوارە خاوەن ئەزموونەکانی بەفەرماندەیی سێ کوڕەکەی دەنێرێتە گۆڕەپانی جەنگ و لەیەکەم هێرش گۆڕیان لەزیندوو چۆڵ و لەکوژراو لێوانلێوی دەکەن. جەعفەر خان کەپیاوێکی قەڵەو و چوارشانە بووە، توانای هەلآتنی نابێت، لەناو سەنگەری تۆپخانەی سوپاکەی سەنگەر دەگرێت. سوارەکانی ئەردەلآن دەوروبەری سەنگەرەکەی گەمارۆ دەدەن و کێشك دەگرن. هەموو کەرەستە سەڵتەنەتییەکانی جەعفەر خان دەکەوێتە دەستی سوپاکەی ئەردەلآن. لەم جەنگەدا نزیکەی هەزار و سێسەد کەس لەزەندییەکان و سوپاکەی جەعفەر خان دەکوژرێت و هەشتسەد کەسیان ئەسیر دەکرێت. سوپای ئەردەلآن و خەمسە و گەڕووس سەد و چل و پێنج کوژراو و برینداریان دەبێت.

سەرئەنجام دوای پێنج کاژێر لەشەو، جەعفەر خان هەموو زێڕ و زیوەکانی سەڵتەنتی و قورئانێك وەك تکا بۆ لای خوسرەوخان دەنێرێت تا ڕێگەی بۆ بکەنەوە و ڕێگەی لێ نەگرن بۆ ئەوەی بۆ کوێ دەخوازێت، بڕوات. خوسرەخان بۆ سەرۆکی تۆپخانەی جەعفەر خان دەنووسێت: جەعفەرخان و سیان لەخزمەکانی ئازاد و خۆتان و تۆپخانەکە تەسلیم بکەن. جەعفەر خان لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکەی خوسرەوخان، لەو شەوەدا لەگەڵ سیان

لەخزمەکانی بەرەو ئیسفەهان دەڕوات و تۆپخانەکە دەکەوێتە دەست سوپای ئەردەڵان.
خوسرەوخان دوای کۆتایی هێنان بەم جەنگە، سەرقاڵی گرتنی مەلایر و ڕیگەرد و تویسرکان وکەزاز و فەراهان و گوڵپایەگان دەبێت. لەماوەی چەند ڕۆژدا دەست بەسەر هەموو ئەو ناوچانەدا دەگرێت و دەڕواتە ناو گوڵپایەگان. دوو سێ ڕۆژ بۆ حەوانەوەی سوپاکەی لەو ناوچەیە دەمێنێتەوە تا دواتر بەرەو ئیسفەهان بەڕێکەوێت. شەوی چوارەم، میرزا ئەحمەدی وەزیر لەناو کۆڕی دانیشتن بەئامادەبوونی سەرکردەکانی سوپا و میرەکانی ئەردەڵان بەخوسرەوخان دەڵێت: ئەمڕۆ چیتر لەسنووری ئێران هیچ لەمپەرێك بۆ بانگەشەی پاشایەتی نەماوەتەوە، ئاقا محەممەد خانی قاجاریش توانای ئەوەی نییە، لەبەرابەر دەسەڵاتەکانی ئەمڕۆی ئێوەدا هیچ کارێك ئەنجام بدات. باشترە ئاڵای سەڵتەنەت بەرز بکەنەوە و بەناوی خۆتان سکە لێدەن. جەعفەر بەگی تەرخان لەناو کۆڕەکەدا دەبێت و لەوەڵامی وەزیردا دەڵێت: هەوا و هەوەس کۆتایی نییە، هەرکەس تەسلیمی هەوا و هەوەس بێت، هیچ کات ئارامی و ئاسایش بەخۆیەوە نابینێت. دنیا بێ ئارامی و ئاسایش هیچ بەهایەکی نییە. شێلم و بروێشی کوردستان، نەك لەسەڵتەنەتی ئێران بەڵکو لەپاشایەتی هەموو جیهان خۆشتر و باشترە. بیر لەم خەیاڵانە مەکەنەوە و لێرەوە بگەڕێنەوە. ئەم وتانە کاریگەری لەسەر خوسرەوخان بەجێدێڵێت و بەیانی ئەو ڕۆژە هەموو ئەسیرەکانی زەندییە و تۆپخانە و زێڕ و زیوەکانی سەڵتەنەتی لەگەڵ نامەیەکی بەندە ئاسایانە بۆ ئاقا محەممەد خانی قاجار دەنووسێت و ئەو ویلایەتانەی دەستی بەسەردا گرتووە، پێشکەشی دەکات و خۆی ڕێگەی کوردستان دەگرێتەبەر. ئاقا محەممەد خان لەگەڵ هاتنی نوێنەرەکەی خوسرەوخان و بینینی نامە و دیاری و پێشکەشییەکان، لەشادیدا لەپێستەکەی جێگەی نابێتەوە و ئەمە وەك نیشانەی بەختی بەرزی خۆی لەقەڵەم دەدات. بەخێرایی نوێنەرەکەی خوسرەوخان بەڕێزی تەواوە دەگەڕێنێتەوە و لەبری ئەم خزمەتە، حکومەتی سەنقور و کەلیایی و ئەسپە تایبەتەکەی خۆی و زینی گەوهەر نیشان و خەنجەرێکی دەسك ئەڵماس و دەستەیەك جل و بەرگی شایانە بۆ خوسرەوخانی ئەردەڵان دەنێرێت. دوای ئەوە لەڕەمەزانی ١٢٠١ کۆچی، ئیسماعیل خانی زەند دەردەکەوێت و هێرش دەکاتە سەر کرماشان و حاجی عەلی خانی فەرمانڕەوای ئەو شارە کەدەستنیشاندەی خوسرەوخان بووە، گەمارۆ دەدات. حاجی عەلی خان، ئاقا محەممەد خانی قاجار لەم بارودۆخە ئاگادار دەکاتەوە و لەم لاوە،

داوای هاوکاری لەخوسرەوخان دەکات. خوسرەوخان چاوەڕوانی فەرمانی ئاقا محەممەد خان نابێت و لەگەڵ هەزار جەنگاوەر بۆ هاوکاری حاجی عەلی خان بەرەو کرماشان بەڕێدەکەوێت. کاتێك لەکرماشان نزیك دەبێتەوە، ئیسماعیل ئاگادار دەبێتەوە و بۆ چیای بێستون هەڵدێت. دوای گەیشتنی خوسرەوخان بەکرماشان، فەرمانی هاوکاری کردنی حاج عەلی خان بەخوسرەوخان دەگات تا هاوکاری حاجی عەلی خان بکات و بەڵای ئیسماعیل خان لەو ناوچەیە نەهێڵێت. ئاقا محەممەد خانیش دوای ئەم فەرمانە لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرەو ناوچەکە بەڕێدەکەوێت. خوسرەوخان لەگەڵ سوپای ئەردەڵان و سوپای کرماشان شوێن ئیسماعیل خان دەکەوێت تا ئەوەی لەسەربەندی سیلاخوڕ پێی دەگاتەوە. لەوێ جەنگێکی قورس و دژوار ڕوودەدات و ئسماعیل خان شکست دەخوات و تاڵانییەکی زۆر دەست سوپای ئەردەڵان دەکەوێت و لەوێوە بەناوی ئاقا محەممەد خانی قاجار، میرزا فەتحوللە کوڕی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر وەك فەرمانڕەوای تویسرکان دیاری دەکات و دەگەڕێتەوە و ڕووداوەکە بۆ پاشا دەنووسێت. ئاقا محەممەد فەرمانی ڕێزگرتن و دەسخۆشی کردن بۆ خوسرەو دەنێرێت و لەگەڵ ئەوەدا داوا دەکات لەهەمەدان چاوی بەخوسرەوخان بکەوێت. خوسرەوخان بۆ نەڕۆشتن چەندین بیانوو دەهێنێتەوە و لەجیاتی خۆی، لوتف عەلی خان کوڕی سوبحان وێردی خان لەگەڵ دیاری و پێشکەشی فراوان ڕەوانە دەکات. ئاقا محەممەد خان بەبیانووەکانی ڕازی دەبێت و بۆ تاران دەگەڕێتەوە. بۆ ماوەی دوو ساڵ لوتف عەلی خان لەدەرباری پاشا ڕێزی لێدەگیرێت و دوای ئەو ماوەیە، لەگەڵ چەندین خەڵاتی شایی، مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدەدات و دووبارە داوای بینینی خودی خوسرەوخان دەکات. خوسرەوخان بە لەبەرچاو گرتنی پێشینەی خزمەتەکانی بۆ محەممەد حەسەن خانی قاجار و خزمەتەکانی بەخودی ئاقا محەممەد خان، لەشەعبانی ١٢٠٤، ئەحمەد خان وەك جێگری خۆی لەکوردستان دادەنێت و بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. لەم سەفەرەدا حەسەن عەلی خانی کوڕی مستەفا خان و میرزا ئەحمەدی وەزیر لەگەڵ خۆی دەبات. لەیەك فەرسەخی تاران هەموو وەزیر و پیاو ماقوڵانی دەربار، بۆ پێشوازی کردنی خوسرەوخان دێن و خوسرەوخان لەگەڵ ڕێزی زۆردا دەبەنە ناو شارەکە و چاوی بەپاشا دەکەوێت و بەپێی گومان لەلایەن پاشاوە ڕێزێکی زۆری لێدەگیرێت. ئەم ڕێز گرتنە بۆ ماوەی شەش مانگ بەردەوام و زیاتر دەبێت تا ئەوەی لەبەزمێکی مەی خواردنەوە، ساقی بەفەرمانی پاشا، دەرمان دەکاتە

خواردنەوەکەی خوسرەوخان و گرفتاری نەخۆشی شێتی دەکات. نازانم چییان کردە پیاڵەکەی کە بەپیاڵەیەك شێتیان کرد.

هەواڵی شێت بوونی خوسرەوخان دەگاتە کوردستان و عەشیرەکانی هەموو ناوچەکان یاخی دەبن. بۆ نموونە تایەفەی موکری و بەڵباس چیتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەحمەدخان نابن و دەست بەتاڵان کردنی ناوچەکان دەکەن. ئەحمەد خان لەگەڵ هەزار سوار بەمەبەستی سەرکوت کردنی ئەوان بەڕێدەکەوێت و لەناوچەی ساراڵ و هوباتوو ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. جەنگ بڵێسە دەسێنێت ولەچیاکەوە بەرەو دەشت و دۆڵ ڕاویان دەنێت و شکستیان پێدێنێت. لەکاتی شوێنکەوتنی هەڵاتووان کەئەحمەد خان بەو کارەوە سەرقاڵ بووە، اللە وێردی خان کوڕی نەزەر عەلی خان کەنەوەی سوبحان وێردی خان بووە، لەناکاو هێرش دەکاتە سەر ئەحمەد خان و دەیکوژێت.

دوای کوژرانی ئەحمەد خان، محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل لەگەڵ ئەمیر ئەرسەلانی کوڕی ڕەزا قولی خان، کۆتایی بەجەنگ دێنێت و تا ناوچەکانی سەقز و سیاکێو شوێنیان دەکەوێت. لەکاتی شوێنکەوتنەکە، میرزا لوتف اللە کوڕی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر، پیاوەتی و دادپەروەری لەخۆی نیشان دەدات. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، جەنازەی ئەحمەد خان هەڵدەگرن و لەگەڵ تاڵانییە فراوانەکان بۆ سنە دەگەڕێنەوە و چۆنیەتی ڕووداوەکە بۆ دەرباری پاشا دەنووسن. بەخێرایی لەدەرباری پاشاوە، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەناوی لوتف عەلی خان کوڕی سوبحان وێردی خان دەردەکرێت و خوسرەوخان لەساڵی ١٢٠٦ کۆچی دوایی دەکات.

### حکومەتی لوتف عەلی خان

دوای کوژرانی ئەحمەد خان لەساڵی ١٢٠٥، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان لەلایەن ئاقا محەممەد خانەوە بەناوی لوتف عەلی خان، مامی خوسرەوخان ڕەوانە دەکرێت و کاروباری فەرمانڕەوایەتی دەگرێتەدەست و حەسەن عەلی خانی کوڕی لەگەڵ دیاری و پێشکەشی فراوان بۆ دەرباری پاشا ڕەوانە دەکات. لەساڵی ١٢٠٦، خوسرەوخان بەهۆی هەمان نەخۆشی (شێتی) لەتاران کۆچی دوایی کرد. ئەمیر ئەسلان خان، جەنازەی ئەو بەگالیسکە بۆ کوردستان دەگەڕێنێتەوە و لەوێ بەخاکی دەسپێرن.

لەهەمان ساڵ (١٢٠٦) دانیشتووانی خوزستان ئاڵای شۆڕش بەرز دەکەنەوە و تاڵان کردنی

ناوچەکان دەستپێدەکەن. فەرمانی پاشا بۆ لوتف عەلی خان دەردەکرێت تا بۆ گەڕاندنەوەی نەزم و ئارامی و سەرکوت کردنی یاخییەکانی ئەو دەڤەرە، لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بەرێکەوێت وسوپای کرماشان و لوڕستانیش لەگەڵ خۆی ببات. لوتف عەلی خان لەسەرەتاکانی زستان لەگەڵ پێنج هەزار سواری ئەردەڵان و کرماشان و لوڕستان بەرەو ناوچەکانی خوزستان ئەسپ غاردەدات و یاخی و ئاژاوەچییەکان قۆڵبەست و ئارامی و ئاسایش بۆ ناوچەکە دەگێڕێتەوە و شۆڕشییەکان لەگەڵ ماڵیات و پێشکەشی و تاڵانی فراوان، ڕەوانەی دەرباری پاشا دەکات و زستان لەخوزستان دەمێنێتەوە و سەرەتاکانی بەهار بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە.

لەسەرەتای زستانی ١٢٠٧ کۆچی، ئەحمەد سوڵتان، فەرمانڕەوای بانە و دەستەیەك لەبەگزادەکانی هەورامان یەکدەگرن و پەیمان لەگەڵ عەبدولڕەحمان پاشای بابان دەبەستن و چیتر گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی لوتف عەلی خان نابن و دەست بەسەر ناوچەکانی دەوروبەردا دەگرن. لوتف عەلی خان لەگەڵ ئەوەی هەوا سارد و بەفرێکی زۆر باریبوو، لەگەڵ سێ هەزار سواری ئەردەڵان بەمەبەستی سەرکوت کردنیان بەرێدەکەوێت و دوای گەیشتنی فەرمانڕەوا بەمەریوان، ئەحمەد سوڵتان بەرەو بەڵباس هەڵدێت.

لوتف عەلی خان، فەرمانڕەوایەتی بانە بەفەتح عەلی سوڵتان کوڕە مامی ئەحمەد سوڵتان دەسپێرێت و فەرمان دەدات ماڵی ئاژاوەچییەکان بسووتێنێت و گوندەکانی سەرسنوری کەعەبدولڕەحمان پاشای بابان دەستی بەسەردا گرتبوو، وەربگرێتەوە. مەڕوماڵاتی شارەزوور کەساڵانە لەوەرزی بەهار و هاوین لەیەیلاقەکانی کوردستان لەوەڕاون، ئەو ساڵە ڕێگەیان لێدەگیرێت و ڕێگەنادەن بێنە ناو خاکی ئێران. لەئەنجامی ئەم کارە، مەڕوماڵاتی شارەزوور لەو ساڵەدا لەناو دەچن یا بەناوچەکانی دیکەدا بڵاو دەبنەوە.

لەساڵی ١٢٠٨، فەرمانڕەوای هەوەیزە، ئاڵای شۆڕش بەرز دەکاتەوە. حەسەن عەلی خان کوڕی لوتف عەلی خان کە لەدەرباری پاشا بووە، بەپێی فەرمانی پاشا، بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە و لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بەرەو هەوەیزە بەرێدەکەوێت. دوای گەیشتنی بۆ ناوچەکە، بەبێ جەنگ، فەرمانڕەوا ناچار بەملکەچی و گوێڕایەڵی دەکات و ئارامی و ئاسایش بۆ ناوچەکە دەگەڕێنێتەوە و فەرمانڕەوای هەوەیزە و شێخەکانی ئەو دەڤەرە لەگەڵ خۆی بۆ دەرباری پاشا دەبات. لەشەوالی ١٢٠٩ کۆچی، لوتف عەلی خان، بەهۆی زێدەڕۆیی

کردن لەخواردنەوەی مەشروبات، کۆچی دوایی دەکات. هەواڵی مەرگی ئەو بەپاشای قاجار دەگات و بۆ قەرەبوو کردنەوەی خزمەتەکانی حەسەن عەلی خان، خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەناوی حەسەن عەلی خان دەنووسێت و ڕەوانەی کوردستانی دەکات.

## حکومەتی حەسەن عەلی خانی ئەردەلان

دوای مردنی لوتف عەلی خان، لەساڵی ١٢٠٩ کۆچی، حەسەن عەلی خانی کوڕی، بەفەرمانی ئاقا محەممەد خانی قاجار لەگەڵ فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە و لەجێگەی باوکی، جڵەوی کاروباری کوردستان دەگرێتەدەست. بەلام زیاتر خوازیاری خواپەرەستی و گۆشەگیری بووە و زۆربەی کاتەکانی بەڕاو کردن بەسەر بردووە و بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەتی بەمحەممەد ڕەشید بەگ سپاردووە. ماوەی دوو ساڵ بەمشێوەیە تێپەڕیوە. لەساڵی ١٢١١ کۆچی، سوپای پاشا بەرەو ئازەربایەجان و قەرەباغ و قەڵای پەناه ئاوا، کە بەقەڵای شوشی یا شیشە بەناوبانگ بووە، بەڕێکەوتووە. حەسەن عەلی خانیش بەپێی فەرمانی پاشا، لەگەڵ پێنسەد سوار پەیوەستی سوپای پاشا بووە. دوای گرتنی قەڵای شیشە کەیەکێك لەقەڵا تۆکمەکانی ئەو سەردەمە بووە، ئاقا محەممەد خان لەگەڵ چەند کەسێك لەپیاوانی دەوڵەت، دەڕواتە ناو قەڵاکە و سوپاییەکان و کەسانی دیکە لەدەرەوەی قەڵاکە خێوەت و بارەگا هەڵدەدەن. سێ لەخزمەتگوزارەکان لەبەر خواردنی کاڵەك کەڕۆژی پێشتر شا وتبووی بۆی هەڵبگرن بەلام ئەوان خواردبوویان، هەڕەشەیان لێدەکرێت. چوونکە خزمەتگوزارەکان دڵنیان لەوەی هەڕەشەکەی مەترسیدارە و فەرمانی کوشتنیان دەردەچێت، بەناچاری لەنیوەی شەودا، دەرفەتێك بەدەست دێنن و پاشا دەکوژن.

بەیانی ئەو شەوە کاتێك سوپای ئێران لەڕووداوەکە ئاگادار دەبنەوە، زۆربەیان بلاوەی لێدەکەن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. حەسەن عەلی خان ناڕوات و لەگەڵ عەلی قولی خان برای پاشا، لەشارەکە دەڕواتەدەر. دانیشتووانی شارەکە کاتێك هەڵاتنی سوپاییەکان دەبینن، سەر بەرز دەکەنەوە و تەقە کردن دەستپێدەکەن. بەڕێکەوت گوللەیەك بەر قاچی حەسەن عەلی خان دەکەوێت و بریندار دەبێت بەلام بەو حاڵەیش برای پاشا لەدەستی دوژمنەکانی دەرباز دەکات و مۆڵەتی پشوو وەردەگرێت بەلام پێش ئەو ئەمان الله خان کوڕی خوسرەوخان و سوبحان وێردی خان کوڕی محەممەد مۆمنین خان کەزاوای ئەمان الله

خـان بـووە و هـەردووك لـەکورە مامـەکانی حەسـەن عـەلی خـان بـوون، لەگـەڵ دەسـتەیەك لەسـەرۆکەکانی کوردسـتانی نـاو سـوپا، پـەیمان دەبەسـتن و بەمەبەسـتی تـاڵان کردنـی کوردستان، هەشت ڕۆژ پێش گەڕانەوەی حەسەن عەلی خان بۆ سنە، دەڕۆنە ناو شارەکە. محەممەد ڕەشید بەگی وەکیل کەنەخۆش بووە، ڕەزامەندی بەو کارە نیشان نادات. کاتێك حەسـەن عـەلی خـان لەسنە نزیـك دەبێتـەوە، سوبحان وێـردی خـان و ئـەمان اللـه خـان، بۆ مەریوان و لەوێوە بەرەو سەقز هەڵدێن. حەسەن عەلی خان دوای ئەوان دێتە ناوشارەکە و سەرقاڵی تیمار کردنی برینەکەی دەبێت. ئەمان الله خان و سوبحان وێردی خان پەنا بۆ عەبدولرەحمان پاشای بابان دەبەن. عەبدولڕەحمان پاشا سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی براکەی، سەلیم بەگ کە بەسەلیم سێ تەنگ ناسراوە (ئەسپەکەی هەمیشە سێ تەنگی بووە چوونکە توانای هەڵگرتنی ئەوی نەبووە) بۆ هاوکاری ئەوان دەنێرێت. ئەم سوپایە لەگەڵ سوپای سەقز و بانە و بابان دەڕواتە ناو مەریوان. حەسەن عەلی خان و محەممەد ڕەشید بەگ لەگەڵ کەس و کار و بنەماڵەی خۆیان دەڕۆنە دەربەندی ماهی دەشت. لەوێوە پەیکێك بۆ لای وەزیری بەغداد دەنێرن و لەچۆنیەتی هێرشەکەی پاشای بابان ئاگاداری دەکەنەوە. مەلا شـەریفی قازیش بـۆ لای سـەلیم بـەگ دەنێـرن تـا لەمـەریوان بمێنێتـەوە ئەگـەر لەلایـەن فەرمانڕەوای بەغدادەوە فەرمان هات کوردستانی ئەردەڵان بەشێك بێت لەدەوڵەتی عوسمانی، ئێمەیش ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆمان نیشان دەدەین، ئەگەر پێچەوانە بوو، ئەوسا خۆی دەتوانێـت هەڵبـژێرێت یـا گوێڕایـەڵی فـەرمانی فـەرمانڕەوای بەغـداد بێـت یـا سەرپێـچی فەرمانەکەی بکات.

لەگـەڵ گەیـشتنی پـەیکی حەسـەن عـەلی خـان بـۆ بەغـداد، فـەرمانڕەوای بەغـداد، فـەرمانی گەڕانـەوەی سـوپای بابـان دەردەکـات و ڕێگـەی دەسـتدرێژی کـردن و سـنور بەزانـدنیان لێدەگرێت. دوای گەڕانەوەی سوپای بابان، حەسەن عەلی خان و محەممەد ڕەشید بەگ بۆ سنە دەگەڕێنـەوە و لـە زی ئەلحەججـەی ساڵی ١٢١٢ کۆچی، ئـەمان الله خـان بـەرەو تـاران بەڕێدەکەوێت. سوبحان وێردی خان و هاوڕێکانی، دوای چەند ڕۆژێك و دوای بەخشینیان لەلایـەن حەسـەن عـەلی خانـەوە بـۆ سـنە دەگەڕێنـەوە. هاوکـات لەگـەڵ ئـەم ڕووداوانـە، لەزیحەججەی ١٢١٢ کۆچی، فـەتح عـەلی شـا لەجێگـەی مـامی، زیـاتر لەسـێ مانگـە لەسـەر تـەختی پاشـایەتی ئێـران دانیـشتووە. محەممـەد ڕەشـید بـەگی وەکیلـیش نەخۆشـییەکەی

تەشەنەی سەندووە و بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت تا چارەسەری نەخۆشییەکەی بکات و ڕێگە لەجموجۆڵ و چالاکییەکانی ئەمان اللە خان بگرێت و دووبارە فەرمانڕەوایی حەسەن عەلی خان جێگر و سەقامگیر بکات. بەڕێکەوت و دوای گەیشتنی بۆ تاران دوای هەشت ڕۆژ دەمرێت. کەسوکارەکەی جەنازەکەی بۆ کوردستان دەگێڕنەوە و حەسەن عەلی خان بۆ ڕێز گرتن لەخزمەتەکانی، پێگەی وەکالەت بەمحەممەد زەمان بەگ کوڕە بچووکی محەممەد ڕەشید بەگ کەزاوا و هاوسەری خوشکی حەسەن عەلی خان بووە، دەسپێرێت (وەکالەت بەمانای یاریدەدەرە کە بەئامادە بوونی فەرمانڕەوا، یاریدەدەر و لەنەبوونی فەرمانڕەوا، بەڕێوبەری کاروباری حکومەت بووە.)

فەتح عەلی بەگ، کوڕە گەورەی محەممەد ڕەشید بەگ و دووان لەبراکانی دیکەی، ئەحمەد بەگ و نەسروللە بەگ، لەهەڵبژاردنی محەممەد زەمان بەگ، بۆ ئەو پێگەیە خەمبار و لەگەڵ دەستەیەك لەمیر و بەگزادەکان پەیمان دەبەستن و لەموحەڕەمی ١٢١٣ کۆچی، دژی حەسەن عەلی خان ڕێگەی تاران دەگرنەبەر و لەوێ پەیوەستی ئەمان اللە خان دەبن و هەموویان پێکەوە سکاڵا و گازندەکانیان لەحکومەتەکەی حەسەن عەلی خان بەرز دەکەنەوە. لەو کاتەدا حاجی میرزا ئەحمەدی وەزیر کە لەدەرباری پاشا خزمەتی کردووە و هەروەها ئەحمەد بەگ کەزاوای ئەو بووە، بەهەموو شێوەیەك هاوکاری ئەو دەستەیە دەکەن و حاجی میرزا ئیبراهیم خان سەدری ئەعزەمی شیرازی بۆ هاوکاری کردنی ئەوان هان دەدەن تا ئەوەی سەرئەنجام فەرمانی بانگ کردنی حەسەن عەلی خان دەردەچێت. دوای چەند ڕۆژ حەسەن عەلی خان دەگاتە تاران و محەممەد زەمان بەگیشی لەگەڵ خۆیدا بووە. دوای گەیشتنی حەسەن عەلی خان، لەبەر ئەوەی سوپای پاشا بەمەبەستی گرتنی خوراسان بەڕێکەوتووە، ئەنجامی ئەم فەرمانە بۆ دوای گەڕانەوەی سوپا دوادەخەن. هەمووان چاوەڕوان بوون تا سوپای پاشا لەخوراسان بگەڕێتەوە و لێکۆڵینەوە لەڕاستی کاروبارەکان بکرێت. دوای سەلماندنی نەشیاوی حەسەن عەلی خان لەسەفەری ١٢١٤، فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بەناوی ئەمان اللە خان دەردەکرێت و حەسەن عەلی خان و محەممەد زەمان بەگ لەسەر کار لادەبرێن و محەممەد ڕەحیم بەگ نەوەی مێهر عەلی سوڵتان و نەزەر عەلی بەگ، لەماڵی بیگلەر بەگ کەهەمان حاجی میرزا ئیبراهیم خانی سەدرئەعزەمە، دەستبەسەر دەکرێن و پێگەی وەکالەت بەفەتح عەلی بەگی کوڕە گەورەی محەممەد ڕەشید بەگ دەسپێردرێت.

### حکومەتی ئەمان الله خانی فەرمانڕەوای ئەردەلان

دوای لابردنی حەسەن عەلی خان لەسەفەری ١٢١٤ کۆچی، ئەمان الله خانی ئەردەلان لەلایەن فەتح عەلی شای قاجارەوە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان و لەمانگی ڕەجەبی ئەو ساڵەدا، هاتۆتە ناو کوردستانی ئەردەلان. ئەم ئەمان الله خانە کە بەئەمان الله خانی گەورە ناسراوە، کەسێکی بەبڕشت و خاوەن ئیرادە و ڕێزدار و پایەبەرز بووە. بۆ بەخشندەیی بەناوبانگ و لەبوێری و دلێریدا سەرناسی کەسانی دوور و نزیك بووە. (ئافرێنەری جیهان، تا جیهانی ئافراند، کەسێکی ناوداری وەك ئەو نەهاتە بوون). زۆربەی کاتەکانی خۆی بۆ ئامادە کردن و بەهێز کردنی سوپاکەی و ئاوەدان کردنەوە و فراوان کردنی سنووری دەسەڵاتەکەی تەرخان کردووە. بیناکانی ناو قەڵای حکومەتی، حەوشی گوڵستان، تالاری دڵگوشا، مزگەوتی دارئەلئیحسان، چیمەنی کانی شەفا، باخ و کۆشکی حەسەن ئاوا، قەڵا، بینا، گەرماو و بازاڕی قسلان، باخ و کۆشکەکەی خوسرەوئاوا، بینای پشت مزگەوتی دارئەلئیسحان، بینای سەرهەنگ خان، گۆڕەپانی بەردەم دەروازەی حکومەتی، زۆربەی بینا ناودارەکانی شاری سنە، مزگەوتەکان، گەرماو و بازاڕەکان لەیادگارییە بەجێماوەکانی ئەم فەرمانڕەوایە. کوردستان لەڕۆژگاری ئەودا بەتەواوی ئاوەدان و گەشەی کردووە.

دوای دوو ساڵ لەفەرمانڕەوایەتی ئەو، حەسەن عەلی خان لەساڵی ١٢١٦ لەتاران هەڵدێت و پەنا بۆ تایەفەی بەڵباس دەبات. لەوێ دەستەیەك لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و بەمەبەستی جەنگ دژی ئەمان الله خان هێرش دەکاتە سەر سنە. ئەمان الله خان لەگەڵ سوپاکەی بەرگری لەشارەکە دەکات و لەدەشتی مەریوان کەبەردەوام جەنگەکان لەوێ ڕوویانداوە، دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە. دوای کوشت و کوشتاری فراوان، حەسەن عەلی خان بریندار و ئەسیر دەکرێت و سوپاکەی بڵاوەی لێدەکەن. ئەمان الله خان چۆنیەتی ئەم ڕوداوە بۆ دەربار دەنووسێت. فەرمانی ڕەوانە کردنی حەسەن عەلی خان دەردەکرێت. ئەمان الله خان حەسەن عەلی خان ڕەوانەی تاران دەکات و لەوێ دەمرێت.

پێشتر ئامانژەمان پێدا، پێگەی وەکالەتی ئەردەلان بەپێی فەرمانی فەتح عەلی شا بەکوڕە گەورەی محەممەد ڕەشید بەگ سپێردرا. بنەماڵەی وەکیل لەزەمانی حکومەتی حەسەن خانی ئەردەلان بەتەواوی جڵەوی کاروباری حکومەتی کوردستانیان گرتبووە دەست و هەموو

شتێك و هەموو کارێك لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوو. خەڵكان بەگشتیش ئارەزوومەند و خوازیاری فەرمانڕەوایەتی ئەوان بوون. لەرۆژگاری فەرمانڕەوایەتی ئەمان الله خان، ئەو بنەماڵەیە ویستوویانە بەپشت بەستن بەکۆمەڵگا، وەك هەمیشە جڵەوی کاروبارەکانیان لەدەستا بێت. ئەمان الله خان بەپێچەوانەی حەسەن عەلی خان، توانایییەکی سروشتی هەبووە و نەیویستووە و فەرمانڕەوایەتی خۆی بۆ حکومەت بگۆڕێت. لەبەر ئەمە بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان زۆر گرنگی بەبیروبۆچوونی ئەوان نەداوە و زیاتر بەپێی خواست و بڕیارەکانی خۆی جووڵاوەتەوە و پێگەی وەکالەت تەنیا ناوەکەی ماوەتەوە. لەنێوان ئەم زێدەڕۆیی و گوێپێنەدانە، بۆ ئەوەی، نەشیش بسووتێت نەکەباب، فەتح عەلی بەگ و بنەماڵەی وەکالەت، چەندین پەیمانی نهێنی دەبەستن و بەگشتی سوێند دەخۆن تا ئەو کاتەی ئەمان الله خان چاکسازی لەدەسەڵاتەکانی خۆی نەکات، کەس ڕاوێژ و هاتوچۆی نەکات. تەنانەت بازارییەکان و بازرگانەکانیش لەگەڵ بنەماڵەی فەرمانڕەوا بازرگانی و ئاڵوگۆڕ نەکەن. لەئەنجامی ئەم شۆڕشە، بەشێوەیەك بارودۆخ لەفەرمانڕەوا دژوار دەبێت کەگوڵئەندام خانمی دایکی کە بەگوڵە هەورامی ناسراوە، قورئان بەدەست بۆماڵی شێخ مەحمودی شێخولئیسلام دەنێرێت و بەڵێن دەدات هیچ کارێك بێ پرس و ڕاوێژ کردن بەبنەماڵەی وەکیل ئەنجام نەدات. لەبەر ئەوەی شۆڕشەکە کاری خۆی کرد و خەڵكان بەگشتی لەسەر داواکەی خۆیان سوور بوون، کەس بەتکاکەی گوڵئەندام خانم ڕازی نەبووە و بەڕاشکاوی دەڵێن لەبەر ئەوەی کار گەشتۆتە شوێنێکی هەستیار و چیتر هیچ لایەك باوەڕی بەوی دیکە نەماوە، دەبێت یەکێك لەم دوو کارە هەڵبژێرێت، یا ئەو بڕوات یا ئێمە دەڕۆین. بۆ جەخت لێکردنەوەی ئەم وتانە، تۆمارێکی چڕوپڕ کەواژۆی خەڵکانی لەسەر بووە و لەخۆگری بێزاری خەڵك لەحکومەت و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ئەمان اللەخان بووە، بۆ دەربار ڕەوانە دەکرێت. سەرەتا فەتح عەلی شا نوێنەرەکان بانگ دەکات دەخوازێت بەهەڕەشە کردن و ترساندنی ئەوان، بەگوێڕایەڵی کردن و فەرمانبەری کردنی ئەمان الله خان ناچاریان بکات بەڵام چوونکە نوێنەرەکان بەوتە و پەیمانی دانیشتووان، پشتگەرم بوون، گرنگی بەهەڕەشە و تۆقاندنەکانی پاشا نادەن و دەڵێن: گەڕانەوە بەبوونی ئەمان الله خان نەگەری نییە و ئەگەر لەبەزەیییەکانی پاشا بێ هیوا ببین، ناچارین پەنا بۆ خاکی دەوڵەتانی دیکە ببەین و خەڵكانیش ڕێگەی وڵاتی دووەم دەگرنەبەر. پاشا کاتێك بەبڕشتی و سووربوونی نوێنەرەکان

دەبینێت، ناچار ڕێگەی دادپەروەری دەگرێتەبەر و هەردوولای کێشەکە بۆ تاران بانگ دەکات. لەگەڵ گەیشتنی فەرمانی بانگێشت کردنەکە، هەردوولا خۆیان ئامادە دەکەن و ڕێگەی تاران دەگرنەبەر. سەرەتا هاوپەیمانەکان لەشار دەڕۆنەدەر. فەرمانڕەوا شوێنکەوتە و کەسەکانی خۆی لەحەوشی قەڵای حکومەتی کۆدەکاتەوە. کاتێك فەرمانڕەوا دێتەدەر، دەبینێت چیای و سارای چوارباغ و پیرمحەممەد، لەبەر زۆری خەڵکان و ستەملێکراوان ڕەش بووە و شوێنکەوتەکانی خۆی ناگەنە پەنجا کەس. لەخەمی ئەم پێشهاتە نێرگەلەیەك بانگ دەکات و نوقمی دەریای بیرکردنەوە دەبێت.

دوای ماوەیەك ئەندێشە و خەیاڵ، لەئازاری خەم و بێ هیوایی، ئەم چوارینە دەنووسێت:

از جوشش و کثرت سیاهی

تن گشته نحیف و چهره کاهی

از خلق امید قطع گشته

مانده به عطوفت الهی

واتاکەی: لەتاو زۆری و ڕەشی خەڵکان، جەستەم لاواز و ڕوخسارم زەرد بووە، چیتر هیوام بەخەڵك نەماوە و تەنیا چاوەڕوانی بەزەیی خواوەندیم.

لەکۆتایی چوارینەکە، فرمێسك لەچاوی دەرژێت، قەترە فرمێسکێك دەکەوێتە سەر وشەی (سیاهی) و دەیکوژێنێتەوە. فەرمانڕەوا ئەم پێشهاتە بەشێوەیەکی باش لێکدانەوەی بۆ دەکات و بێ درەنگ سوار دەبێت.

دوای ئەوەی هەردوولا دەگەنە ناو شار، ئەمان الله خان ڕێزی شایانەی لێدەگیرێت، ئەوانی دیکە هەرچی دەکەن، هیچیان بۆ ناکرێت. سەرئەنجام حاجی میرزا ئەحمەدی مستەوفی، دەبێتە نێوبژیوان و خەڵکانی بێ هیوا دەباتە ماڵی ئەمان الله خان و بەشێوەیەکی کاتی نێوانیان باش دەکات و دووبارە فەرمانی وەکالەت بۆ فەتح عەلی بەگ دەنووسێت. محەممەد زەمان بەگ و محەممەد ڕەحیم بەگ و نەزەر عەلی بەگ کەپێشتر وتمان لەگەڵ حەسەن عەلی خان دەستبەسەر کرابوون، ئازاد دەکرێن وهەموویان بۆ کوردستان دەگەڕێنەوە. ئەمان لله خان چۆنیەتی کارو کردەوەکانی بنەماڵەی وەکیل و دەستەبەندی و پشتگوێ خستنی خۆی و گەمارۆ خستنە سەر حکومەت و یاساغ کردنی مامەڵە لەگەڵ کەسانی فەرمانڕەوا و هەموو شتەکان موو بەموو بۆ پاشا دەنووسێت و داوای مۆڵەتی لێدەکات لەکاتی گەڕانەوە، ئەگەر

پێداگری لەسەر ئەم کارانەیان بکەن، بتوانێت، سزایان بدات. ڕکەبەرەکانی ئەمان الله خان بێ هیوا گەڕاونەتەوە و بەو پەیمانە ناچارییە ڕازی بوون کەسەرکەوتنی ئەمان الله خانی لێکەوتەوە، ئەمە بووە هۆی زیاد بوونی ڕق و کینە و دوای گەڕانەوە، پەیوەندییەکانی نێوانیان ڕۆژ بەڕۆژ ساردتر و ئاڵۆزتر بوو. فەرمانڕەوا کەچاوەڕوانی دەسکەوتنی دەرفەتێکی گونجاو بوو، گرنگی بەم ڕووداوانە نادات و هەرچەند ئەوان زیاتر فەرمانڕەوا پشتگوێ دەخەن، ئەم زیاتر ڕێزیان دەگرێت تا ئەوەی لەشەعبانی ١٢١٧، فەرمانڕەوا، فەتح عەلی بەگی وەکیل و سێ براکەی بۆ دانیشتنێك بەمەبەستی یاری کردن بانگێشت دەکات. لەگەڵ گەیشتنی چوار براکە، پەلاماریان دەدەن و دەیانگرن و لەژووری بەردەم دەروازەی ناوەوەی قەڵای حکومەتی زیندانیان دەکەن. فەرمانڕەوا هەمان شەو کەسەکانی دەنێرێت تا هەموو شوێنکەوتە و هاوپەیمانەکانی ئەوان بگرن و بیانهێنن.. دوای ئەمە، فەتح عەلی بەگی وەکیل و دوو براکەی، ئەحمەد بەگ و نەسروڵڵە بەگ دەکوژن و محەممەد زەمان بەگ کەکورە بچووك و گەنجێکی قۆز بووە، دوو ساڵ لەزیندانـدا دەهێڵێتەوە. دواتـر ئەویش دەکوژن و بەشێوەیەکی نهێنی بەخاکی دەسپێرن کەتا ئێستایش کەس نازانێت گۆڕەکەی لەکوێیە. میر ئەمان الله خان دوای ئەم کارە پێگەی وەکالەت بەمحەممەد ڕەحیم بەگ کوری مێهر عەلی سوڵتان کەزاوای محەممەد ڕەشید بەگ بووە، دەسپێرێت. هاوپەیمانەکانی دیکەی بنەماڵەی وەکیل، یەك لەدوای یەك سزا دەدرێن و دوای ڕوودان و کۆتایی هاتنی ئەم پێشهاتانە، حکومەتی ئەمان الله خان جێگیر و سەقامگیر دەبێت و دانیشتووان دەترسن و ملکەچی خۆیان نیشان دەدەن و کەس بوێری دەنگ بەرز کردنەوەی نامێنێت. ئەمان الله خان بۆتە تاقە فەرمانڕەوای ویلایەتەکە و دەستی بەکۆکردنەوەی زەوی و دەست بەسەردا گرتنی گوندەکان کردووە و لەماوەیەکی کەمدا زۆربەی ناوچە گرنگەکانی کوردستانی بەناوی خۆیەوە کردووە و لەزۆربەی ئەو زەوییانە، بینای حکومەتی و قەڵا و مزگەوت و گەرماو و باخ و دارستانی دروستکردووە. بەمشێوەیە سامانێکی زۆری پێکەوە ناوە.

لەساڵی ١٢١٩ کۆچی، عەبدولڕەحمان پاشای بابان، لەحکومەتی شارەزوور لەسەر کار لابراوە و لەبەر ئەمە پشتی کردە دەوڵەتی عوسمانی و پەنای بۆ دەوڵەتی ئێران بردووە و لەگەڵ بنەماڵە و حەوتسەد سواری سوپاکەی و کەسەکانی بەرەو کوردستانی ئەردەڵان کۆچ دەکات و میری ئەردەڵان دەکاتە ناوبژیوانی خۆی. میری ئەردەڵان سوپای و خێزانەکەی

لەسەر سنور نیشتەجێ دەکات و لەناوەندی حکومەتەکەی ڕێز لەخودی عەبدولڕەحمان پاشای بابان دەگرێت و چۆنیەتی ڕووداوەکە بۆ دەرباری پاشا ڕەوانە دەکات. لەلایەن وەزیری بەغدادەوە، سلێمان پاشای ناسراو بەفەخری زادە، سەبارەت بەتەسلیم کردنەوەی عەبدولڕەحمان پاشای بابان ڕوو دەکاتە دەرباری ئێران.

دوای گەیشتنی نامەی میری ئەردەڵان بەدەستی پاشا، بەپێی فەرمانی دەرباری، ناوچەی سەقز بۆ دابین کردنی بژێوی بەبابانییەکان دەدرێت و خودی عەبدولڕەحمان پاشا لەگەڵ میری ئەردەڵان بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت و ڕێزی شایانەی لێدەگیرێت. دوای دانیشتنێکی ڕاوێژکردن، فەتح عەلی شا، سەلیم پاشای نوێنەری وەزیری بەغداد دەگەڕێنێتەوە و داوا دەکات دووبارە فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی لەلایەن بنەماڵەی عوسمانی و وەزیری بەغداد بۆ عەبدولڕەحمان پاشای بابان ڕەوانە بکرێت بۆ ئەوەی بۆ ناوچەکانی خۆی بگەڕێتەوە.میری ئەردەڵان و عەبدولڕەحمان پاشا بۆ کوردستان دەگەڕێنەوە. عەبدولڕەحمان پاشا دەڕواتە مەریوان و لەناو کەس و کارەکەی خۆی چاوەڕوانی وەڵامی وەزیری بەغداد دەبێت. دوای گەڕانەوەی سەلیم پاشا بۆ بەغداد و گێڕانەوەی ڕووداوەکان، ڕەزامەندی لەسەر داواکەی دەوڵەتی ئێران نیشان نادرێت و چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە بەجەنگی نێوان دوو دەوڵەتەکە کۆتایی دێت. لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی بیست هەزار سوار لەعەشیرە عەرەبەکان و سوپای موسڵ و کەرکوك و هتد.... لەگەڵ سوپای دەوڵەتی تەیار بەتۆپخانە و چەکی قورس لەبەغدادەوە بەڕێدەکەون و دەڕۆنە ناو قەسری شیرین و سنورەکانی زەهاو. لەم کاتەدا پاشای ئێران لەچەمەنی سوڵتانییە بووە و هەواڵی هاتنی هێزەکانی عوسمانی پێدەگات. شا، بەخێرایی لەوێوە شازادە محەممەد عەلی میرزا کەخاوەنی دەسەڵاتی سێ سەرزەمینەکە (کرماشان، خوزستان و لوڕستان) بووە، لەگەڵ تۆپخانە و سوپا بۆ بەرگری کردن ڕەوانەی کرماشان دەکات. لەلایەکی دیکە، فەرەج الله خانی نەسق چی باشی بەسەرداری سێ هەزار سوار لەکوردستانەوە لەگەڵ میری ئەردەڵان و سوپاکەی ڕادەسپێرێت تا لەڕێگەی مەریوانەوە هێرش بکەنە سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی. لەکۆتایی جومادی ئەلثانی ١٢٢١، میری ئەردەڵان نزیکەی دەهەزار سوار کۆدەکاتەوە و لەگەڵ فەرەج الله خان بەڕێدەکەوێت و لەشێخ عەتار بۆ یەکەم جار بارەگا هەڵدەدەن. کاتێك هەواڵی ئەم ڕووداوانە بەوەزیری بەغداد دەگات، بەخێرایی خالید پاشای حاکمی بابان لەگەڵ سلێمان پاشای

کەهیا و پاشاکانی کۆیە و حەریر، لەگەڵ سوپایەکی سی هەزار کەسی لەسوار و پیادە، بۆ ڕێگرتن لەئاژاوە و هێرشی سوپای ئێران و عەبدولرەحمان پاشای بابان ڕادەسپێرێت. کاتێك سوپای کەهیا دەگاتە سلێمانی، عەبدولڕەحمان پاشا کە لەوکاتەدا لەمەریوان بووە، کەسێك بۆ شێخ عەتار دەنێرێت و میری ئەردەڵان و فەرەج الله خان ئاگادار دەکاتەوە. میری ئەردەڵان و فەرەج الله خان لەگەڵ سوپاکەیان بەڕێدەکەون. لەولایش خالید پاشا و کەهیا پێشڕەوی دەکەن. ئەم دوو سوپا گەورە لەکەنار دەریاچەی زرێباری مەریوان ڕووبەڕووی یەکدەبنەوە، دەنگی تۆپ و بەریەککەوتنی شمشێرەکان ئاسمان دەلەرزێنێت، پاڵەوانەکانی هەردوو سوپا بوێری و ئازایەتی لەخۆیان نیشان دەدەن. ئەسپ بێ سوار و سوار بێ ئەسپ، سەر بێ لاشە و لاشە بێ سەر لەودەشتەدا دەکەوێت. سەرئەنجام ئالای ئێرانییەکان بەرز دەبێتەوە و سەرکەوتن بەدەست دێنن. سوپایی عوسمانی زیان و زەرەرێکی زۆری لێدەکەوێت و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سلێمان پاشای کەهیا و دەستەیەکی دیکە ئەسیر دەکرێن. سەلیم بەگی برای عەبدولڕەحمان پاشا (سەلیم سێ تەنگ) لەم جەنگەدا بوێری و ئازایەتی لەڕادەبەری لەخۆی نیشانداوە، هەرچەند لەکاتی گرتنی تۆپخانەکەی عوسمانی، برینـدار و دوای دوو ڕۆژ دەمرێت. دوای ئەم سەرکەوتنە مێژووییە، عەبدولڕەحمان پاشا بۆ شوێنەکەی دەگەڕێتەوە و میری ئەردەڵان و فەرەج الله خانیش دەگەڕێنەوە. ئەمان الله خان، کەهیای بەغداد لەگەڵ دووسەد کەس لەئەسیرەکان بەمحەممەد ئاغا (باوەگەورێی مەستورەی ئەردەڵانی) بۆ دەرباری قاجار ڕەوانە دەکات. ئێرانییەکان لەزەهاویش سەرکەوتن بەدەست دێنن. شازادەی ئێران، محەممەد عەلی میرزا تا سنوورەکانی بەغداد پاشەکشێ بەسوپای عوسمانی دەکات و ئەو ناوچانە تالآن دەکەن و دەگەڕێنەوە.

لەسەرەتاکانی زیحەججەی ١٢٢٢ کۆچی ئەمنا الله خان لەگەڵ دیاری و پێشکەشی فراوان بەرەو دەرباری شا بەڕێدەکەوێت و فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بۆ محەممەد حەسەن خانی کوڕە گەورەی وەردەگرێت و لەموحەرەمی ١٢٢٣ دەگەڕێتەوە. لەم ساڵەدا خان ئەحمەد خان کوڕی ڕەزا قولی خان و محەممەد قولی خان کوڕی خان ئەحمەد خان، برای ئەمان الله خان و محەممەد ڕەحیم بەگی وەکیل و نەزەر عەلی بەگ و ئیمام وێردی بەگ لەگەڵ کەسان و بنەماڵەکەی خۆیان پەیمان دەبەستن تا ئەمان الله خان لەدانیشتنێکی گشتیدا بکوژن و خۆیان فەرمانڕەوایەتی وڵات بگرنەدەست.

میرزا لوتف الله کوڕی میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر کەیەکێك لەو کەسانە بووە بەشداری ئەم پەیمانەی کردووە، بەهۆی میرزا عەبدولکەریمی نۆکەری ئەمان الله خان، میر لەم پیلانە ئاگادار دەکاتەوە. میر، بێ لەدەستدانی کات، هەموویان بانگێشت دەکات و دەیانگرێت و زیندانییان دەکات و دواتر پاشای ئێران لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە. پاشایش بێ لەبەر چاو گرتنی هیچ شتێك، فەرمانی سزادانی ئەوان دەردەکات. ئەمان الله خان دەستبەجێ محەممەد رەحیم بەگ و محەممەد عەلی بەگی برای و نەزەر عەلی بەگ و ئیمام وێردی بەگ دەکوژێت و سامانەکەیان تالان دەکات و خان ئەحمەد خان و محەممەد قولی خان و کەسانی دیکە ئازاد دەکات بەڵام برە پارەیەکی زۆریان لێ دەستێنێت و پێشکەش بەدەرباری دەکات.

دوو سێ ساڵ دوای حکومەتی عەبدولڕەحمان پاشای بابان، دووبارە مەبەستی سەربەخۆیی دەکات و وەك پێشتر ئامازەمان پێدا، نافەرمانی و دژایەتی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران دەکات و لەمانگی شەعبانی ١٢٢٥ لەگەڵ رەئیس ئەفەندی بەمەبەستی لابردنی وەزیری بەغداد لەڕێگەی قەرەتەپپەوە بەڕێدەکەوێت. لەلایەن هەردوو دەوڵەتەکەوە فەرمانی سەرکوت کردنی عەبدولڕەحمان پاشا دەردە چێت. ئەمان اللە خان و سوپای ئەردەڵان لەڕێگەی مەریوان و سلێمان پاشای وەزیری بەغداد لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەڕێگەی دار ئەلسەلامەوە بەڕێدەکەون. لەڕەمەزانی ١٢٢٥ جەنگ لەدەرەوەی دارئەلسەلام ڕوویداوە و سوپای وەزیری بەغداد شکست دەخوات و وەزیر بۆ ناو عەرەبەکان هەڵدێت و بەپێی فەرمانی دەوڵەت، دەکوژرێت. دوای ئەم پێشهاتە، لەلایەن دەرباری ئێرانەوە، فەرمانی گەڕانەوەی میری ئەردەڵان دەردەکرێت. ئەمان الله خان گوندەکانی شارەزوور تالان دەکات و دەگەڕێتەوە. عەبدولڕەحمان پاشا دوای شکستدانی سلێمان پاشا، جڵەوی ئەسپەکەی بەرەو ئێران دەسووڕێنێت و بەمەبەستی گرتنی کوردوستانی ئەردەڵان، ئەسپەکەی غار دەدات.

لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، شازادە محەممەد عەلی میرزا بۆ سەرکوت کردنی هێرشەکەی عەبدولڕەحمان پاشا ڕادەسپێرێت. فەرمان بەمیری ئەردەڵان دەگات لەگەڵ سوپای ئەردەڵان، پەیوەستی سوپاکەی شازادە بێت. لەڕەجبی ١٢٢٦ میر و سوپای ئەردەڵان بەڕێدەکەون و لەدەوروبەری کرماشان، پەیوەستی سوپای شازادە دەبن و ڕێگەی زەهاو دەگرنەبەر. عەبدولڕەحمان پاشا لەپێشڕەوی شازادە ئاگادار دەبێتەوە و لەسلێمانییەوە بەرەو قەڵای کۆیە هەڵدێت و لەوێ سەنگەر دەگرێت. شازادە و سوپاکەی قەڵای کۆیە گەمارۆ دەدەن و

دوای دوو سێ ڕۆژ کەبارودۆخ لەعەبدولڕەحمان پاشای بابان دژوار دەبێت، سەرئەنجام تەسلیم دەبێت و دوو لەکوڕەکانی خۆی بۆ ناو سوپاکەی شازادە دەنێرێت. شازادە دوای بەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنە بۆ کرماشان دەگەڕێتەوە و میری ئەردەڵانیش بۆ سنە.

عەبدوڵڵە پاشای وەزیری بەغداد، لەگوێرایەڵی و ملکەچی عەبدولڕەحمان پاشای بابان بۆ دەوڵەتی ئێران ئاگادار دەبێتەوە و لەگەڵ سوپایەکی تەیار بەتۆپخانە و چەکی قورس، بەمەبەستی گرتنی سەرزەمینی بابان بەڕێدەکەوێت. عەبدولڕەحمان پاشا لەگەڵ سوپای بابان ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و دوای ڕووبەڕووبوونەوەی دوو سوپا وشەڕێکی قورس، سەرئەنجام سوپای بابان شکست دەخوات و عەبدولڕەحمان پاشا بەرەو کرماشان هەڵدێت.

شازادە محەممەد عەلی میرزا، دووبارە دەربار لەم ڕووداوانە ئاگادار دەکاتەوە. لەلایەن دەربارەوە چەند کەس لەخانەکانی قاجار رادەسپێردرێن تا لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەردەڵان پەیوەستی سوپاکەی شازادە ببن و دەست بەسەر بەغدادا بگرن و عەبدوڵڵە پاشا سەرکوت بکەن. سوپای شازادە تاو ناوچەکانی دارئەلسەلام وێران و تالآن دەکات و هێرش دەکەنە سەر بەغداد. عەبدوڵڵە پاشا توانای بەرگری کردنی شارەکەی نامێنێت و لەدارئەلسەلام سەنگەر دەگرێت و شێخ جەعفەری شێخی نەجەف لەگەڵ دەستەیەك لەسەیید و شێخەکانی ئەو دیارە بەمەبەستی وەرگرتنی ئەمان بۆ لای شازادە دەنێرێت و ملکەچی خۆی رادەگەیێنێت. شازادە لەوێوە پاشا لەم پێشهاتە ئاگادار دەکاتەوە کە لەو کاتەدا لەچەمەنی سوڵتانییە بووە. سەرئەنجام بەداواکەی عەبدوڵڵە پاشا ڕازی و دووبارە فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی بۆ عەبدولڕەحمان پاشای بابان دەنێردرێت و سوپای شازادە لەسەرەتاکانی شەوالی ١٢٢٧ دەگەڕێتەوە و میری ئەردەڵانیش بۆ ناوەندی دەسەڵاتەکەی یانی شاری سنە دەگەڕێتەوە و سەرقاڵی ئاوەدان کردنەوەی وڵات و نۆژەن کردنەوەی مزگەوت و بازاڕەکان و هتد... دەبێت.

مزگەوتی دارئەلئیحسان وەك ئاماژەمان پێدا لەم ساڵەدا دروستکراوە و لەساڵی ١٢٢٨ کۆتایی پێهاتووە و شێخ جەمال ئەلدینی دووەمی (باوەگەورێی نووسەر) وەك پێشنوێژ و حاجی شێخ محەممەد سەعیدی نەوەی حاجی شێخ مستەفای تەختەی وەك مامۆستای ئەو مزگەوتە دیاریکردووە.

لەساڵی ١٢٣٠ محەممەد زەمان بەگ و کوڕەکەی یوسف بەگ، لەگەڵ کەسان و بنەماڵەکەی خۆی بەهاوڕێیەتی سەیید مەحموودی شێخولئیسلام و سەیید زەکی کوڕی و ئیسماعیل

بەگ و میرزا رەحیم کورەکانی میرزا یوسف، ئاژاوە و فیتنە دەنێنەوە و دەستەیەك لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوە و بەمەبەستی گازندە و سکالآ لەمیری ئەردەلآن، بەرەو دەرباری شای قاجار بەرێدەکەون.

ئەمان الله خانیش، محەممەد ئاغای نازر لەگەڵ برە پارەیەکی زۆر و نامەیەك کەنیشاندەری ئاژاوە و فیتنەی ئەو کەسانەیە، رەوانەی دەربار دەکات. لەو کاتەدا شا و دەربارەکەی لەفیروزکوە دەبن، نوێنەری میری ئەردەلآن بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێدەکەوێت تا زووتر نامەکەی میری ئەردەلآن تەسلیم بەپاشا بکات. کەسانی دیکەیش بەناچاری بەرێدەکەون. هەردوولا لەیەك کاتدا دەگەنە مالّی میرزا شەفیع کەراوێژکاری ئەوسای ئێران بووە و میرزا شەفیع، فەتح عەلی شا لەم کێشەیە ئاگادار دەکاتەوە. ئاشکرایە داوای سکالآکەران لەلایەن پاشاوە گرنگی پێنەدراوە و لەکاتی بانگکردنیان رووبەرووی سزا دەبنەوە و سەرئەنجام پاشا فەرمانی خۆی دەردەکات و سکالآکەران بەمحەممەد ئاغادا بۆ کوردستان دەگەرێنێتەوە. محەممەد زەمان بەگ لەگەڵ سەییدەکان دێتە کوردستان و کورەکانی یانی رەزا قولی بەگ و یوسف بەگ و دووان لەئامۆزاکانیان بەرەو ناوەندی پاشایەتی ئێران بەرێدەکەون و خزمەتی شازادە محەممەد عەلی میرزا دەکەن. دوای ئەوەی حەوت مانگ لەوێ دەبن، بەنهێنی برێك پارە بەشازادە دەدەن تا ئیعدامیان بکات (ئەگەری هەیە میری ئەردەلآن ئەو پارەی ناردبێت). شازادە بەئیعدامی ئەوان رازی نابێت و هەر چوار کەسەکە رەوانەی کوردستان دەکاتەوە. بەلآم دوای ئەم سەرکەوتنە، ئەوانی دیکەیش دەگرێت و سامانەکانیان زەوت دەکات و بەنهێنی هەموویان دەخنکێنێت و سەیید مەحمودی شێخولئیسلام و سەیید زەکی کوری رەوانەی قسلآن و کەرەفتو دەکات. سەیید مەحمود لەقسلآن و سەیید زەکی لەکەرفتو لەدار دەدەن. دواتر کەسەکانیان بەدژواری مۆڵەت وەردەگرن و جەنازەکانی ئەوان دەگوێزنەوە. سەیید مەحمود لەگوندی دەورە قەلآ و سەیید زەکی لەسەقز بەخاك دەسپێرن. ئێستا گۆرەکانیان بۆ زیارەتگای سەردانکەران. لەکۆتایی ئەم رووداوانە و زاڵبوونی میری ئەردەلآن لەکوردستان، لەهەمان ساڵ ١٢٣٠ کۆچی، لەگەڵ چەندین دیاری گرانبایی بەرەو دەرباری شای ئێران دەروات و دوای رێزی شایانە داوا دەکات، شای شاکانی قاجار، خوسرەوخانی کوری میر وەك خزمەتکاری خۆی قبوڵ بکات و حوسن جیهانی کچی لێ مارە بکات. شا لەبەرابەر خواست و خزمەتەکانی میری ئەردەلآن بەم داوایە رازی دەبێت بەلآم

سەرەتا بۆ ئەوەی ئامادەکارییەکان بۆ ئەم هاوسەرگیرییە ئەنجام بدرێت، پێشنیار دەکەن ئەمان الله خان سەرەتا سەروناز خانم، کەنیزی شایی کەیەکێك لەژنەکانی حەرەمسەرای پاشا بووە، وەك هاوسەر دیاری بکات و دواتر هاوسەرگیری کوڕ و کچەکە ئەنجام بدرێت. بەمپێیە، شای شاکانی قاجار، سەرونازی کەنیزی خۆی لەگەڵ دەهەزار تمەن و مارەیی و جیازی بەئەمان الله خان دەبەخشێت و ئەمان الله خان ناوەکەی بۆ قوبازەر خانم دەگۆڕێت و دەیکاتە یەکێك لەپەردەنشینەکانی حەرەمەکەی. دوو مانگ دوای ئەم پێشەکییە، شای شاکانی قاجار، تاقە کچەکەی خۆی لەخوسرەوخانی کوڕی ئەمان الله خان مارە دەکات و نازناوی والیە خانمی پێدەبەخشێت. دوای پێشەکییە سەرەتاییەکان، ئەمان الله خان داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەکات و بۆ ماوەی یەکساڵ سەرقاڵی ئامادە کردنی بەزم و ڕەزمی زەماوەند دەبێت. لەساڵی ١٢٣٢ بۆ ڕۆشتن ئامادە و لەگەڵ دەستەیەك لەزانا و خانزادەکان و گەورەپیاوان و خاتون جان خانمی خوشکی و دەستەیەك لەژنە میرەکان بەرەو تاران بەڕێدەکەون. بۆ ماوەی یەك مانگ سەرقاڵی ئاهەنگ و خۆشی دەبن، هەموو حەوش و تالارە سەڵتەنتییەکان و ئەرك دەڕازێنرێنەوە و شتی سەیر و سەمەرە نیشانی خەڵکان دەدرێت. زۆربەی زاناکان و شازادەکان و میرەکانی دەربار و باڵوێزی وڵاتانی دراوسێ و وەزیر و پایەبەرزەکانی وڵات و پیاوماقووڵانی تاران، لەم بەزمە و ڕەزمەدا ئامادە دەبن و سەرقاڵی رابواردن و خۆشگوزەرانی دەبن کەباسی کردنی چۆنیەتییەکەی لەتوانای ئەم کتێبە بەدەرە. دوای مانگێك ئاهەنگ و خۆشی، لەکاتی خۆیدا، بووکەخان بەوپەڕی ڕێزەوە هەڵدەگرن وبۆ کوردستان دەگەڕێننەوە.

محەممەد حەسەن خان کوڕە گەورەی ئەمان الله خان لەم زەماوەندە لەبەر ئەوەی کوڕە بچووکیان هەڵبژارد و گرنگییان بەکوڕە گەورە نەدا، لەباوکی دڵسارد و پشتی تێدەکات. دەستەیەك لەگەنج و خانزادەکان لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و بەرەو زەهاو و گەرمەسێر هەڵدێن. لەوێ خێڵەکانی کوردستان لەگەرمەسێر پەیوەستی خۆیان دەکەن و سوپایەك پێکەوە دەنێت و دەست بەهێرش و پەلامار بۆ سەر سنووری عەرەبستان و لوڕستان دەکات و ڕووبەڕووی یەکێك لەشێخە عەرەبەکان دەبێتەوە و لەگۆڕەپانی جەنگدا دەیکوژێت و میرەکانی دەستگیر و سامانەکانیان زەوت دەکات. میری ئەردەڵان چەندین جار کەسانی نزیکی خۆی بۆ دڵنەوایی کردن و گەڕاندنەوەی ناردووە بەڵام سوودی نابێت. هەواڵی

شۆڕش و ئاژاوەگێڕی ئەو بەدەرباری پاشا دەگات. نەواب والا عەباس میرزای جێگری پاشا، بەخەت و نووسینی خۆی، تۆمارێك بۆ ئاگادار کردنەوە و مۆجیاری کردنی محەممەد حەسەن خان دەنێرێت بەڵام سوودی نابێت.

دواتر لەلای شای شاکانی قاجارەوە، فەتح عەلی شا، بابا عەلی خانی شاترباشی وەك ناوبژیوان ڕەوانە دەبێت بەڵام دووبارە بێ ئەنجام دەبێت. ناچار ئەمان الله خان لەساڵی ١٢٣٥ فەرمانی کۆبوونەوە و کۆکردنەوەی سوپا دەدات و بۆ جەنگی کورەکەی بەڕێدەکەوێت و شاترباشی شەهریاری و مەلا عەباسی شێخولئیسلام کەمامۆستای والی زادە بووە، لەگەڵ خۆی دەبات. لەگوندی ناراوی کەیەکێك لەگوندەکانی ڕەوانسەری کوردستانە، سوپای باوك و کوڕ لەبەرابەر یەك ریز دەبەستن. چەندین جار بابا عەلی خانی شاترباشی و مەلا عەباسی شێخولئیسلام قورئان بەدەست بۆ لای کوڕ دەنێرێت بەڵام هیچ ئەنجامێکیان دەستناکەوێت.

سەرئەنجام کار بەجەنگ و کوشت و کوشتار کۆتایی دێت. هەڵبەتە خوێنەران پشتڕاستی دەکەنەوە کەئەم جەنگە جەنگێکی مێژوویی و سەرنجڕاکێشە چوونکە جیاواز لەوەی سەرکردەکانی ئەم دوو سوپا باوك و کوڕ بوون، شەڕکەران و جەنگاوەرانی هەردوو سوپا، هاوڕێی باوك و کوڕ، یا برا و برا یا مام و ئامۆزا و سەرئەنجام خزم و کەس و کاری یەکبوون و لەئەنجامی هەوەسڕانی ئەم باوك و کوڕە، دژی یەك دەستیان بۆ شمشێر برد و یەکتریان کوشتار دەکرد.

سەرئەنجام، سەردارانی هەردوو سوپا سوار ئەسپ دەبن و وسوارەکان کەوتوونەتە جموجۆڵ، شمشێرەکان لەکالآن دەرهاتوون، ڕمەکان بۆ هەوا بەرز کراونەتەوە، تیرەکان دڵی ئاسمانیان بڕیوە، بەجارێك دوو سوپا پەلاماری یەکیانداوە و لەو ناوەدا کوڕی میری ئەردەڵآن هاوشێوەی شێر، هێرشی بردووە و کوژراوەکانی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشتووە و سوپاکەی بۆ جەنگ هانداوە. تیر هاوشێوەی باران و تەرزە باریوە، لەبروسکەی شمشێرەکان، شێرەکان سەریان کردۆتە ناو کونەکانی خۆیان و هەتاو، لەبوێری جەنگاوەرانی ئەم شەڕە، سەری سوڕماوە و زەمین و زەمان دەسخۆشییان لەبوێری و ئازایەتی میری ئەردەڵآن کردووە.

دەستەیەك وەك میرزا عەبدوڵڵەی وەزیر و محەممەد عەلی سوڵتانی ئەردەڵآن و ئاغا حسەین، برای محەممەد بەگی داروغە (محەممەد بەگی داروغە هەمان دامەزرێنەری مزگەوتی ناسراو

بەمزگەوتی دارۆغەیە کە لەساڵی ١٢٣٧ بنیاتنا) و میرزا باقر کوڕی میرزا لوتف الله و کەسانی دیکە کەلەناو سوپای میری ئەردەڵاندا بوون، کوژران. دەستەیەکی دیکە وەك عەبدولکەریمی موعتەمید و ئیسماعیل بەگی برای و میرزا عەبدولڕەحمان کوڕی و میرزا فەرەج الله ی وەزیر کوڕی میرزا ئەحمەد و میرزا لوتف الله کوڕی میرزا عەبدوللەی وەزیر و میرزا فەزڵ الله کوڕی میرزا عەلی لەگۆڕەپانی جەنگ بریندار دەبن. لەسوپای کوڕی میری ئەردەڵانیش دەستەیەکیش دەکوژرێن و بریندار دەبن. ملی میرزا عەبدولکەریمی موعتەمید بەشمشێری محەممەد بەگی کوری حاجی حسەینی قولی بەگی سەنقوری، بریندار کرا. دوای چاکبوونەوەیش ملی خوار بووە و تاکاتی مردن بەو شێوەیە ماوەتەوە. سەرئەنجام میرزا لوتف الله کوڕە مامی میرزا فەرەج الله کەخۆی شاردبوویەوە، بەتیرێکی لەناکاو کوڕی میری ئەردەڵان لەپێ دەخات و لەئەسپەکەی دەیهێنێتەخوار و ئەسیری دەکات. محەممەد سادق خان کوڕی عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولکیش کەکوڕی ئەمان الله خان بووە، لەو بگرە و بێنەدا بریندار دەبێت. سوپای محەممەد حەسەن خان، دوای ئەوەی سەردارەکەیان بریندار و ئەسیر دەکرێت، شکست دێنن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سەد و دەکەسیان ئەسیر دەکرێت و ئەمان الله خان هەموویان دەکوژێت. لەناو کوژراوەکان عەباس میرزا بەگ کوڕی مەنوچێهر بەگی سەقزی و سوبحان وێردی بەگ کوڕی محەممەد حەسەن بەگ بینراون. لەهەر دوو سوپا لەگۆڕەپانی جەنگ، جگە لەو سەد و دەکەسە، چوارسەد کەسی دیکە لەمیر و گەورەکانی کوردستان دەکوژرێن و دەبنە قوربانی هەوەسەکانی باوك و کوڕ. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، دوو کوڕە میری بریندار لەسەر تەخت بەرەو سنە دەبەن. دوای یەك مانگ، محەممەد حەسەن خان لەتەمەنی ٢٢ ساڵی دەمرێت و جەنازەکەی ڕەوانەی نەجەف دەکەن و محەممەد سادق خان باش دەبێتەوە. دوای ئەم ڕووداوە ئەمان الله خان لەتاو خەمی کوڕەکەی، هەستەوەرەکانی لەدەست دەدات و لەسەرەتای زستانی ١٢٤٠ کۆچی، دەمرێت. ئەو بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ فەرمانڕەوایەتی کوردستانی ئەردەڵانی کردووە. لەساڵی ١٢٢٠ تا ساڵی ١٢٣٠، هەموو ئەو شوێنانەی دەبوا، نۆژەن بکرێنەوە، نۆژەن کردەوە.

### حکومەتی خوسرەوخانی ئەردەڵان ناسراو بەناکام

خوسرەوخانی ناکام کوڕی ئەمان الله خانی فەرمانڕەوا، لەکاتی تێکچوونی باری دەروونی باوکی، پێگەی جێگری حکومەتی بووە و دوای مردنی باوکی لەبەهاری ١٢٤٠ کۆچی، وەك

فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە.

خوسرەوخان کەسێکی قسەخۆش و شیرین وتار بووە، توانای نووسینی شێعری بووە، خەتی نەستەعلیقی بەجوانترین شێوە نووسیوە. بۆ بەخشندەیی کەسێکی بەناوبانگە وپەندی زۆری زانیوە.

ڕەزالەی سەقزی (ڕەزا عەلی) دەلاڵی ئەو بووە. زۆربەی شەوەکانی لەماڵی ڕەزالە بەسەر بردووە. لەساڵی ۱۲٤۱ حەیدەر سوڵتان ئەورامی و محەممەد سوڵتان ئەورامی، بەلەبەر چاو گرتنی ڕێگەی دژوار و بەردەڵانی هەورامان، ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە و ملکەچی فەرمانەکان نەبوون. خوسرەوخان بۆ سەرکوت کردنی ئەوان، محەممەد خانی سەرهەنگی برای، لەگەڵ سوارە و پیادەی ئەردەڵان ڕەوانەی هەورامان دەکات. دوای گەیشتن بەناوچەکە، ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت و ئاغا جەعفەر خانی ئەردەڵان دەکوژرێت. کوشتنی ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی سوپای ئەردەڵان خوێنیان بێتە کوڵ و هێرشێکی سەراسەری دەکەنە سەر چیا و سەنگەری شۆڕشییەکان و لەیەکەم سەنگەر گەمارۆ دەخەنە سەر حەیدەر سوڵتان. حەیدەر سوڵتان بەناچاری خۆی هەڵدەداتە ناو ڕووبار و بەهۆی مەلە خۆی دەرباز دەکات. سوپاییەکان تیربارانی دەکەن و لەناو ئاوەکە دەیکوژن. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی ئەسیر و دەستەیەکی دیکەیان دەکوژرێن. جەعفەر سوڵتانی ئاجودان باشی لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان هێرش دەکاتە سەر سەنگەرەکەی محەممەد سوڵتان و لەسەنگەرەکەی دەردەپەڕێنن. محەممەد سوڵتان و سوپاکەی ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر و بەرەو شارەزوور دەڕۆن. محەممەد خانی سەرهەنگ چەند ڕۆژێك دوای ئەم سەرکەوتنە، لەو ناوچەیەدا ماوەتەوە و دواتر لەگەڵ تالآنییە فراوانەکان بۆ شاری سنە دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ۱۲٤۳ وشکەساڵی و قاتوقڕی دەستیپێکردووە، نان بۆتە هاوتای گیان. هەژارەکان لەکۆڵآن و گەرەکەکان کەڵەکە بوون و لەبرسانا مردوون. خوسرەوخان بڕی پەنجا هەزار تەغار گەنمی لەهەنبارەکاندا بووە و بەشێوەیەکی یەکسان لەناو دانیشتووان دابەشی کردووە و بەڵگەی لێسەندوون تا دوای نەمانی وشکەساڵی و قاتوقڕی بۆ خەزێنەی دەوڵەتی بگێڕنەوە. بەهۆی ئەم کارەوە، دانیشتووانی کوردستان لەو بەڵایە ڕزگاریان دەبێت. دوای ڕزگار کردنی خەڵکان لەو بەڵا ماڵوێرانەکەرە و گەڕانەوەی ئاسایش و ئەرزانی، میرزا فەرەج الله ی وەزیر، بەڵگەکان دەباتە لای خوسرەوخان و داوای لێدەکات، قەرزەکانی لەخەڵك وەربگرێتەوە.

خوسرەوخان بەڵگەکان وەردەگرێت و دەیخاتە ناو ئاگر و دەیانسووتێنێت و بەمشێوەیە ڕەزامەندی و خۆشحاڵی دانیشتووان بەدەست دێنێت. بڕی ئەو پارەی کەدەبوا بۆ خەزێنەی حکومەت بگەڕێتەوە، زیاتر لەدووسەد هەزار تمەن بووە.

خوسرەوخان بەشێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵ براکانی کردووە و سەرئەنجام هەموویانی لەناو بردووە و ڕیسوا و بەدبەختی کردوون. لەساڵی ١٢٤٤، محەممەد بەگ و مستەفا بەگ کوڕەکانی فەتح عەلی بەگی وەکیل کەئەمان الله خان ئەوانی بۆ سمنان و دامەغان دوورخستبوویەوە، دوای ٢٧ ساڵ ئاوارەیی و سەرگەردانی، بەپێی فەرمانی میری کوردستان، دەگەڕێنەوە. عەلی محەممەد بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ کەخاڵۆزای خوسرەوخان بووە، ڕێزی زۆری لێ گیراوە. لەو کاتەدا سوپای دەوڵەتی رووسیا هێرشی کردۆتە سەر خاکی ئێران و چەندین ویلایەتی سەر سنووری وەك ئازەربایەجان دەخەنە ژێر دەسەلاَتی خۆیانەوە و شۆڕش و ئاژاوەیەکی سەیر لەئێران بەتایبەت لەئازەربایەجان دەستپێدەکات. ئەکبەر بەگ کوڕی محەممەد زەمان بەگ لەگەڵ چەند کەس لەخزم و کەس و کاری خۆی کە لەچۆنیەتی حکومەتی خوسرەوخان نارازی بوون، دەیانەوێت کەڵك لەو دەرفەتە وەربگرن و پەیوەستی سوپای رووسیا ببن و دەخوازن حسەین قولی خانی کوڕی میر کەلەو دواییانەدا لەحکومەتی ئیسفەند ئاوا لەسەر کار لابرابوو، پەیوەستی خۆیان بکەن. لەبەر ئەمە بەشێوەیەکی نهێنی دەیبینن و بابەتەکەی لا باس دەکەن. ئەویش ئەم بابەتە بۆ میر دەگێڕێتەوە و ئەبولەحەسەنی بەگی باوکی مەستورەی ئەردەلاَن وەك پیلانگێری سەرەکی ئەم پیلانە دەناسێنێت. بۆ پشتڕاستکردنەوەی وتەکەی خۆی دەڵێت: سبەی شەو لەماڵی ئەکبەر بەگ کۆدەبنەوە، ئەگەر میر جلوبەرگەکانی بگۆڕێت و لەسەر بانی ماڵی ئەکبەر بەگ گوێ لەوتەکان بگرێت، ڕاستییەکەی بۆ دەردەکەوێت. میر گوێ لەقسەکانی حسەین قولی خان دەگرێت و ئەوەی دەبێت بیبیستێت بەگوێی خۆی دەیبیستێت و لەپلانەکەی ئەوان ئاگادار دەبێتەوە. ئاگری ڕق و کینەی کۆن کەبۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر خۆڵەمێشدا بوو، دەژیێتەوە. میر خوسرەوخان بۆ بەیانی ئەو شەوە فەرمانی گرتنی کوڕەکانی فەتح عەلی بەگ و سوڵتان نەزەر بەگ و ئەبولحەسەن بەگ (باوکی مەستورە) و هەموو کەسان و کوڕە مامەکانیان دەردەکرێت و زیندانی و زنجیر دەکرێن. ئەکبەر بەگیش لەماڵی محەممەد بەگی سلێمانی زیندانی دەکرێت. دوای چەند ڕۆژ کوڕەکانی فەتح عەلی بەگ لەگەڵ کوڕەکانی

فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە.

خوسرەوخان کەسێکی قسەخۆش و شیرین وتار بووە، توانای نووسینی شێعری بووە، خەتی نەستعەلیقی بەجوانترین شێوە نووسیوە. بۆ بەخشندەیی کەسێکی بەناوبانگە وپەندی زۆری زانیوە.

ڕەزالەی سەقزی (ڕەزا عەلی) دەلاّلی ئەو بووە. زۆربەی شەوەکانی لەماڵی ڕەزالە بەسەر بردووە. لەساڵی ١٢٤١ حەیدەر سوڵتان ئەورامی و محەممەد سوڵتان ئەورامی، بەلەبەر چاو گرتنی ڕێگەی دژوار و بەردەلاّنی هەورامان، ئالاّی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە و ملکەچی فەرمانەکان نەبوون. خوسرەوخان بۆ سەرکوت کردنی ئەوان، محەممەد خانی سەرهەنگی برای، لەگەڵ سوارە و پیادەی ئەردەلاّن ڕەوانەی هەورامان دەکات. دوای گەیشتن بەناوچەکە، ئاگری جەنگ بڵێسە دەسێنێت و ئاغا جەعفەر خانی ئەردەلاّن دەکوژرێت. کوشتنی ئەو دەبێتە هۆی ئەوەی سوپای ئەردەلاّن خوێنیان بێتە کوڵ و هێرشێکی سەراسەری دەکەنە سەر چیا و سەنگەری شۆڕشییەکان و لەیەکەم سەنگەر گەمارۆ دەخەنە سەر حەیدەر سوڵتان. حەیدەر سوڵتان بەناچاری خۆی هەڵدەداتە ناو ڕووبار و بەهۆی مەلە خۆی دەرباز دەکات. سوپاییەکان تیربارانی دەکەن و لەناو ئاوەکە دەیکوژن. دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی ئەسیر و دەستەیەکی دیکەیان دەکوژرێن. جەعفەر سوڵتانی ئاجودان باشی لەگەڵ دەستەیەك لەسوپاییەکان هێرش دەکاتە سەر سەنگەرەکەی محەممەد سوڵتان و لەسەنگەرەکەی دەردەپەڕێنن. محەممەد سوڵتان و سوپاکەی ڕێگەی هەلاّتن دەگرنەبەر و بەرەو شارەزوور دەڕۆن. محەممەد خانی سەرهەنگ چەند ڕۆژێك دوای ئەم سەرکەوتنە، لەو ناوچەیەدا ماوەتەوە و دواتر لەگەڵ تالاّنییە فراوانەکان بۆ شاری سنە دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ١٢٤٣ وشکەساڵی و قاتوقڕی دەستیپێکردووە، نان بۆتە هاوتای گیان. هەژارەکان لەکۆلاّن و گەرەکەکان کەڵەکە بوون و لەبرسانا مردوون. خوسرەوخان بڕی پەنجا هەزار تەغار گەنمی لەهەنبارەکاندا بووە و بەشێوەیەکی یەکسان لەناو دانیشتووان دابەشی کردووە و بەڵگەی لێسەندوون تا دوای نەمانی وشکەساڵی و قاتوقڕی بۆ خەزێنەی دەوڵەتی بگێڕنەوە. بەهۆی ئەم کارەوە، دانیشتووانی کوردستان لەو بەلاّیە ڕزگاریان دەبێت. دوای ڕزگار کردنی خەڵکان لەو بەلاّ ماڵوێرانەکەرە و گەڕانەوەی ئاسایش و ئەرزانی، میرزا فەرەج الله ی وەزیر، بەڵگەکان دەباتە لای خوسرەوخان و داوای لێدەکات، قەرزەکانی لەخەڵك وەربگرێتەوە.

خوسرەوخان بەڵگەکان وەردەگرێت و دەیخاتە ناو ئاگر و دەیانسووتێنێت و بەمشێوەیە ڕەزامەندی و خۆشحاڵی دانیشتووان بەدەست دێنێت. بڕی ئەو پارەی کەدەبوا بۆ خەزێنەی حکومەت بگەڕێتەوە، زیاتر لەدووسەد هەزار تمەن بووە.

خوسرەوخان بەشێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵ براکانی کردووە و سەرئەنجام هەموویانی لەناو بردووە و ڕیسوا و بەدبەختی کردوون. لەساڵی ١٢٤٤، محەممەد بەگ و مستەفا بەگ کوڕەکانی فەتح عەلی بەگی وەکیل کەئەمان الله خان ئەوانی بۆ سمنان و دامەغان دوورخستبوویەوە، دوای ٢٧ ساڵ ئاوارەیی و سەرگەردانی، بەپێی فەرمانی میری کوردستان، دەگەڕێنەوە. عەلی محەممەد بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ کەخاڵۆزای خوسرەوخان بووە، ڕێزی زۆری لێ گیراوە. لەو کاتەدا سوپای دەوڵەتی رووسیا هێرشی کردۆتە سەر خاکی ئێران و چەندین ویلایەتی سەر سنووری وەك ئازەربایەجان دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە و شۆڕش و ئاژاوەیەکی سەیر لەئێران بەتایبەت لەئازەربایەجان دەستپێدەکات. ئەکبەر بەگ کوڕی محەممەد زەمان بەگ لەگەڵ چەند کەس لەخزم و کەس و کاری خۆی کە لەچۆنیەتی حکومەتی خوسرەوخان ناڕازی بوون، دەیانەوێت کەڵك لەو دەرفەتە وەربگرن و پەیوەستی سوپای رووسیا ببن و دەخوازن حسەین قولی خانی کوڕی میر کەلەو دواییانەدا لەحکومەتی ئیسفەند ئاوا لەسەر کار لابرابوو، پەیوەستی خۆیان بکەن. لەبەر ئەمە بەشێوەیەکی نهێنی دەیبینن و بابەتەکەی لا باس دەکەن. ئەویش ئەم بابەتە بۆ میر دەگێڕێتەوە و ئەبولەحەسەنی بەگی باوکی مەستورەی ئەردەلآن وەك پیلانگێری سەرەکی ئەم پیلانە دەناسێنێت. بۆ پشتڕاستکردنەوەی وتەکەی خۆی دەڵێت: سبەی شەو لەماڵی ئەکبەر بەگ کۆدەبنەوە، ئەگەر میر جلوبەرگەکانی بگۆڕێت و لەسەر بانی ماڵی ئەکبەر بەگ گوێ لەوتەکان بگرێت، ڕاستییەکەی بۆ دەردەکەوێت. میر گوێ لەقسەکانی حسەین قولی خان دەگرێت و ئەوەی دەبێت بیبیستێت بەگوێی خۆی دەیبیستێت و لەپلانەکەی ئەوان ئاگادار دەبێتەوە. ئاگری ڕق و کینەی کۆن کەبۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر خۆڵەمێشدا بوو، دەژێتەوە. میر خوسرەوخان بۆ بەیانی ئەو شەوە فەرمانی گرتنی کوڕەکانی فەتح عەلی بەگ و سوڵتان نەزەر بەگ و ئەبولحەسەن بەگ (باوکی مەستورە) و هەموو کەسان و کوڕە مامەکانیان دەردەکرێت و زیندانی و زنجیر دەکرێن. ئەکبەر بەگیش لەماڵی محەممەد بەگی سلێمانی زیندانی دەکرێت. دوای چەند ڕۆژ کوڕەکانی فەتح عەلی بەگ لەگەڵ کوڕەکانی

نەزەر عەلی بەگ دەکوژێت. ئەکبەر بەگ و ئەبولحەسەن بەگ و ئیسماعیل بەگی برای و کەسەکانیان لەبەرابەر وەرگرتنی برە پارەیەك ئازاد دەکات و بۆ ئەم مەبەستە، خوازبێنی مەستوری شاعیر دەکات ودەیکاتە هاوسەری خۆی.

دوای کوژرانی کورەکانی فەتح عەلی بەگ و محەممەد بەگی کوری ئەحمەد بەگ، بنەماڵەی وەکالەت پەرێشان بووە، ئەمان الله بەگی کورە بچووکی فەتح عەلی بەگ و عەلی محەممەد بەگ کوری ئەحمەد بەگ، لەگەڵ دە کەس لەخزمەکانیان، شەوانە هەڵدێن و بەرەو دەباری پاشای قاجار بەرێدەکەون. خوسرەوخانیش، میرزا فەرەج اللهی وەزیری خاڵی، بەدوای ئەواندا رەوانەی تاران دەکات. زنجیرەی وەکالەت، پەنایان بۆ شازادە سەیف ئەلدەولە بردووە و بەخزمەت کردنی ئەو هەڵدەستن و سکالاّ و گازندەکانی خۆیان بەهۆی تاج ئەلدەولە خانم، دەگەیێننە دەربار. بەمپێیە قسە و وتەکانی میرزا فەرەج اللەی وەزیر لەدەرباری پاشا کاریگەری نابێت و سکالاّکەران تەسلیم بەسەیف ئەلدەولە و رەوانەی ئیسفەهانیان دەکات.

لەساڵی ١٢٤٥ کەشای شاکان بەرەو هەمەدان بەرێدەکەوێت، خوسرەوخانی فەرمانرەوای ئەردەڵان بەمەبەستی بینینی شا، بەرەو هەمەدان بەرێدەکەوێت. عەلی محەممەد بەگ و ئەکبەر بەگ و ئیسماعیل بەگیش لەگەڵ دەستەیەك لەئامۆزاکانی خۆیان، بەدوای میری ئەردەڵان، دەگەنە هەمەدان و سکالاّ و گازندەکانی خۆیان بەرز دەکەنەوە. میری ئەردەڵان بەنهێنی پێنج هەزار تمەن بەئابدارچی شا پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی کارێك بکات پاشا سکالاّکەران تەسلیم بەمیر بکاتەوە. فەتح عەلی شا لەگەڵ ئەوەی خاتوونی حەرەمسەراکەی خۆی، تاج ئەلدەولە (دایکی سەیف ئەلدەولە) پشتیوانی لێکردوون و هەروەها عەبدوڵلە خانی ئەمین پشتی ئەوانی گرتووە، یاساکانی دادپەروەری و شەرافەت لەدەست دەدات و ئەو کەسانە تەسلیم بەخوسرەوخان دەکاتەوە. خوسرەوخان ئەوان بۆ سنە دەگەرێنێتەوە و ئەو برە پارە و برێکی دیکەیان لێ وەردەگرێت و دواتر هەموویان ریسوا و خانەنشین دەکات بەجۆرێك ئەکبەر بەگ، پاشماوەی ژیانی لەبەدبەختی وهەژاریدا بەسەر دەبات. کەسانی دیکەش گۆشەگیر دەکرێن. دوای ماوەیەك بەپێی تکای میرزا فەرەج اللەی وەزیر و میرزا هیدایەت اللەی ئەمین، عەلی محەممەد بەگ ئازاد دەکرێت و دەرواتە گوندی بەڵبان. لەوێوە نامە بۆ کەس و کاری خۆی لەئیسفەهان دەنووسێت و ژمارەیەکیان لەو گوندە کۆدەبنەوە و شەوانە هێرش دەکەنە سەر گوندەکە و عەلی محەممەد بەگ بۆ ئیسفەهان دەبەن. میرزا

جەعفەر کوڕی میرزا هیدایەت الله کە لەو نزیکانەدا بووە، هەرچەند تەمەنی کەم بووە بەڵام لەگەڵ دەستەیەك لەسوار و پیادەکان شوێنیان دەکەوێت و لەنیوەی ڕێگەدا پێیان دەگاتەوە. دوای کەمێك شەڕ وپێکدادان، بەشمشێر عەلی محەممەد بەگ بریندار دەکات و هەموویان دەگەڕێنێتەوە. چەند کەسێکی ناسراو و نەناسراویش کە لەئیسفەهانەوە هاتبوون، ئەسیر دەکات و بۆ لای میری ئەردەلانی دەنێرێت. میری ئەردەلان دووان لەوان بەناوەکانی لوتف عەلی بەگی کوڕی محەممەد ڕەحیم بەگ و ئەوی دیکەیان حسەین قولی خانی کوڕی میر بووە، ڕیسوا و بەدبەخت دەکات. حسەین قولی خان لەو کاتەدا پشتی کردبووە باوکی و ڕۆشتبووە ئیسفەهان و پەیوەستی بنەماڵەی وەکالەت ببوو.

لەساڵی ١٢٤٦، شا موراد بەگی کورد، ناسراو بەمیری ڕەواندز، لەناوچەکانی کۆیە و حەریر و ڕەواندز ئاڵای شۆڕش بەرز دەکاتەوە و هێرشەکانی بۆ سەر ناوچەکانی دەوروبەر دەستپێدەکات وسەردەشت و موکری و سابلاخ و لاهیجان پەیوەستی سنووری فەرمانڕەوایەتییەکەی دەکات. بەپێی فەرمانی فەتح عەلی شای قاجار، خوسرەوخانی میری ئەردەلان بۆ جەنگی ئەو بەڕێدەکەوێت و شکست بەسوپاکەی میری ڕەواندز دێنێت و تا کەنارەکانی کۆیە و حەریر شوێنی دەکەوێت و سەرئەنجام سی هەزار تمەن وەك قەرەبووی جەنگ لەمیری ڕەواندز دەستێنێت و ئەمان نامەی پێدەدات و دەگەڕێتەوە و لەلایەن پاشاوە، ڕێز لەم خزمەتەی دەگرێت.

لەساڵی ١٢٤٧ کۆچی، مەحمود پاشای بابان، پشت دەکاتە سلێمان پاشای بابان و پەنا بۆ دەوڵەتی ئێران دەبات. بەپێی فەرمانی دەرباری، خوسرەوخان لەگەڵ سوپای ئەردەلان، ئەو دەگەڕێننەوە بۆ سلێمانی و سەربەخۆیی پێدەدەن و سلێمان پاشا بۆ دارئەلسەلامی بەغداد ڕادەکات و خوسرەوخان سەرکەوتووانە دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ١٢٤٨، حاجی شێخ جەمال ئەلدینی پێشنوێژ و وتارخوێن (باوەگەوڕێی نووسەر) لەسەر مینبەر دەڵێت: وتنی ((انی انا الله یا انا الحق یا الله فی جبتی)) و وشە و ڕستەی هاوشێوەی ڕێگەپێنەدراو کەبێژەرەکەی بەهەر مەبەستێك بیهێنێتە سەرزمان، کفرە و هۆکارێکە بۆ لەدەستدانی دین و دیانەت چوونکە هیچ کام لەپێغەمبەران یا زاناکانی مەزهەبەکان بەمە ڕازی نەبوون. دەستەیەك لەزانا و شێخەکان پێکەوە دژی دەوەستنەوە و دژی ئەو شۆڕشێکی گشتی دەستپێدەکەن، خەڵکان فریو دەدەن و دەڵێن پێشنوێژ کافر

بووە، چیتر نوێژ خوێندن لەپشت سەری ئەو ڕێگە پێدراو نییە و کوشتنی ئەو یەکسانە بەحەجێکی گەورە. ئەم هەواڵە بەمیری ئەردەڵان دەگات و بەخێرایی کەسێك بۆ لای پێشنوێژ دەنێرێت کەدەبێت بەیانی بڕوات بۆ مزگەوت. ئەگەر پێشتر خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو، سبەی کەس لەگەڵ خۆی نەبات و بەتەنیا بڕواتە ناو مزگەوتەکە. دوای ئەم پەیامە، چوار تۆپ دەباتە سەرەوەی قەڵای حکومەتی و تۆپەکان پڕ دەکات و مزگەوت و شار دەکاتە نیشانە تا ئەگەر دەنگەدەنگ لەشار دروست بوو، تۆپبارانی بکات. جیاواز لەوە دەستەیەك تفەنگچی لەدەوروبەری مزگەوتەکە جێگیر دەکات تا ئەگەر کەسێك مەبەستی ئاژاوە یا دەستدرێژی کرد، سەرکوتی بکەن. دوای ئەم ئامادەکارییانە کاتێك دانیشتووان لەمەبەستەکەی ئاگادار دەبنەوە، بەبێدەنگی دەڕۆنە ناو مزگەوتەکە و نوێژی خۆیان دەخوێنن جگە لەدەستەیەك ڕووداوخواز کە لەترسی میر ئەو ڕۆژە نوێژی هەینی ناخوێنن. دوای خوێندنی نوێژ و گەڕانەوەی حاجی شێخ جەمال بۆ ماڵەکەی، بەخێرایی میر کەسێك دەنێرێت و ئەو کەسە ڕووداوخوازانە دەستگیر دەکات. دەستەیەکیان تەمێ و چەند کەسێکیان دوور دەخاتەوە و ئەوانی دیکە ناچار دەکات بڕۆنە ماڵی حاجی شێخ جەمال بۆ ئەوەی داوای بەخشین و لێبوردنی لێ بکەن.

لەساڵی ١٢٥٠ نەخۆشی تاعون دەگاتە شاری سنە و دانیشتووان بڵاوەی لێدەکەن. خوسرەوخانیش شارەکە بەجێدێڵێت و لەهەزار هەنگاوی شارەکە، خێوەت وبارەگا هەڵدەدات. سەرئەنجام گرفتاری ئەو نەخۆشییە دەبێت و لەدووەمی ڕەبیع الاوەلی ئەو ساڵە، لەتەمەنی ٢٩ ساڵی ناکام، دەمرێت. نزیکەی هەشت هەزار کەسیش لەدانیشتووانی شارەکە بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە دەمرن. کەسانی وەك الله وێردی خان، کوڕی نەزەر عەلی خان و عەلی موراد سوڵتانی کوڕی و چەند کەسێکی دیکە لەگەورە پیاوانی سنە کە بەهەمان نەخۆشی دەمرن.

## حکومەتی ڕەزا قولی خانی ئەردەلان

دوای مردنی خوسرەوخانی ناکام، ڕەزا قولی خانی کوڕە گەورەی کە لەحوسن جیهانی کچی فەتح عەلی شای قاجار، چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو، لەساڵی ١٢٥٠ لەتەمەنی دەساڵی لەسەر کوری فەرمانڕەوایەتی کوردستان دادەنیشێت. فەرمانی فەرمانڕەوایەتی لەلایەن شازادە فەتح الله میرزا، برای دایکی و تاج بەیگم خانمی خوشکی ڕەوانە کراوە. شازادەکان چەند

ڕۆژێك بۆ گێرانی پرسە و ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردن و ئاگادار كردنەوەی دانیشتووان لەفەرمانی حكومەتی چاوەڕوان دەبن و دواتر دەگەڕێنەوە، بەڵام خودی والیەی دایکی ڕەزا قولی خان لەگەڵ میرزا فەرەج اللەی وەزیر، جڵەوی كاروباری حكومەتی لەدەست دەگرێت. لەم كاتەدا شازادە ئەردەشێر میرزای ڕوكن ئەلدەولە كەفەرمانڕەوای گەڕووس بووە، بیر لەگرتنی كوردستان دەكاتەوە و لەگەڵ سوپایەكی تەیار بەرەو كوردستان بەڕێدەكەوێت. والیە خاتوون لەم هەواڵە سەریسوڕدەمێنێت و فەرمان بەكۆكردنەوەی سوپای ئەردەڵان دەدات و خۆی لەگەڵ ئەوەی هێشتا تۆزی مردنی هاوسەرەكەی بەروخسارییەوە بووە، خۆی دادەپۆشێت و سەرداری سوپاكەی دەگرێتەدەست و لەناوچەی زاغە و ئابلاق، خێوەت و بارەگای شەڕ هەڵدەدات. ئەردەشێر میرزا كاتێك دەبینێت ڕكەبەرەكەی ژنێكە و لەسەركەوتن و شكست جگە لەناوزڕان هیچی بۆ نامێنێتەوە، بەناچاری ڕێگەی ئاشتی دەگرێتەبەر و خوازبێنی كچی والیە دەكات و دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ١٢٥١ كەفەتح عەلی شای قاجار دەمرێت و تەختی پاشایەتی بەنەبیرەی ئەو، محەممەد شا غازی دەبرێت، هێشتا كە لەئازەربایجانەوە بەڕێنەكەوتووە، میرزا هیدایەت اللەی ئەمین بەنوێنەرایەتی میری ئەردەڵان وەك باڵوێز دەڕواتە لای و لەگەڵ ئەودا بەرەو تاران بەڕێدەكەوێت. دوای دانیشتن لەسەر تەختی پاشایەتی، میرزا هیدایەت اللەی ئەمین لەگەڵ خەڵات و فەرمان دەگەڕێنێتەوە و فەرمانی دەربارەی دەردەكرێت كەمیری ئەردەڵان و سوپاكەی پەیوەستی سوپای بەهرام میرزای برای محەممەد شا ببێت، محەممەد حسەین میرزا، نەوەی محەممەد عەلی میرزا كە فەرمانڕەوای كرماشان و لوڕستان و خوزستان و عەرەبستان بووە، دوور بخەنەوە و بەهرام میرزا جێگەی بگرێتەوە. ڕەزا قولی خانی میری ئەردەڵان لەگەرمەی زستان لەگەڵ هەشت هەزار سواری ئەردەڵان و دەستەیەك پیادە بەڕێكەوتووە و لەكاروان سەرای ماهیدەشت پەیوەستی سوپاكەی بەهرام میرزا دەبێت. محەممەد حسەین میرزا كەلەم ڕووداوانە ئاگادار دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی دڵنیایە ناتوانێت بەرگری لەخۆی بكات، لەگەڵ كەسەكانی بەرەو ناوەندی خەلافەت بەڕێدەكەوێت. دوای چەند ڕۆژ لەگەڵ شازادەكان ڕێگەی ئەردەبیل دەگرێتەبەر و لەوێ زیندانی دەكرێن. لەولایش شازادە بەهرام میرزا لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بێ ئەوەی ڕووبەڕووی بەرگری ببنەوە، دەڕواتە ناو كرماشان و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشێت و میری ئەردەڵان بۆ كوردستان

دەگەڕێتەوە. دواتر لەم ساڵە و بەپێی فەرمانی دەربار، نەجەف قولی خان کوڕی محەممەد حەسەن خانی ئەردەڵان، ئەوەی ئەمان الله خان، لەگەڵ سێسەد سوار بۆ گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش ڕەوانەی گورگان و خوراسان دەبێت و لەوێ بەکارەکانی هەڵدەستێت و بەوەرگرتنی خەڵات و ئیمتیاز لەدەرباری پاشایەتی دەگەڕێتەوە. لەهەمان ساڵ (١٢٥١ کۆچی) حوسن جیهان خانمی والیە، لەدەرباری پاشا، نەواب توبا خانم خوشکی ئەو پاشایە بۆ ڕەزا قولی خان خوازبێنی دەکات. لەساڵی ١٢٥٢، والیە لەگەڵ دەستەیەك لەخانزادە و میرزادەکانی کوردستان لەکوردستانەوە بەرەو تاران بەرێدەکەوێت و بەرێوڕەسمێکی شایانە، بووك لەتارانەوە بۆ کوردستان دێنن.

دواتر لەساڵی ١٢٥٤ سوپای پاشا بەمەبەستی گرتنی هەرات و سەرزەمینەکانی تورکستان بەرێدەکەوێت و ژمارەیەك لەسوپای ئەردەڵانیش بانگێشت دەکرێن. دووبارە نەجف قولی خانی ئامازە پێدراو لەگەڵ پێنسەد سواری خاوەن ئەزمون، پەیوەستی سوپای پاشا دەبێت و لەگەڵ محەممەد پاشا بۆ گرتنی قەڵای هەرات بەرێدەکەون. لەم کاتەدا محەممەد سادق خانی ئەردەڵان کە لەحکومەتی ڕەزا قولی خان ناڕازی بووە و پەنای بۆ مەنوچێهر خانی موعتەمید ئەلدەولەی فەرمانڕەوای کرماشان بردووە، ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و لەگەڵ دوسەد کەس لەسوارەکانی خۆی بەمەبەستی گرتنی کوردستان بەرێدەکەوێت. لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، میری ئەردەڵان و میرزا فەرەج اللەی وەزیر و دەستەیەك لەسوپاییەکان بۆ بەرگری کردن لەهێرشەکەی لەشارەکە دێنەدەر و شەو لەگوندی نەران بەسەر دەبەن. محەممەد سادق خان، لەپێشڕەوی میری ئەردەڵان بەرەو نەران ئاگادار دەبێتەوە و بێ درەنگ لەرێگەی یەمینان و گەزرەوە، بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەبات و نیوەشەو دەڕواتە ناو شارەکە. کەسوکاری میرزا فەرەج اللەی وەزیر و میرزا هیدایەت اللەی ئەمین و مەلا عەباسی شێخولئیسلام و دەستەیەکی دیکە هەمان شەو کۆچ دەکەن و بۆ بەیانی پەیوەستی خێڵی جاف لەسەر سنوور دەبن. دوای ئەوەی میری ئەردەڵان و میرزا فەرەج الله لەم ڕووداوە ئاگادار دەبنەوە، لەگەڵ سوپاکەیان بەرێدەکەون و لەگەڵ هەڵاتنی خۆر، دەگەنە شارەکە. محەممەد سادق خان لەناو شارەکە گەمارۆ دەدرێت. سوپای محەممەد سادق خان لەسەر بانەکان و گۆڕەپانی بەردەم دەروازەی حکومەتی، تا نزیك نیوەڕۆ دەجەنگن بەڵام هیچیان بۆ ناکرێت. ناچار ئەمان الله بەگی وەکیل و قوباد بەگی فەڕاش باشی، لەگەڵ چەند کەس

لەبەگزادەکان و تفەنگچییەکانی هەورامی و بانە، بەتەناف خۆیان دەگەیێنە سەر بانەکان و بارودۆخیان لێ دژوار دەکەن. لەملایش سەرئەنجام بەزەبری تیر و تەشوێ، دەروازەکە دەشکێنن و دەڕۆنە ناو قەلاکە و جەنگ هەڵدەگیرسێت و محەممەد سادق و و شوێنکەوتەکانی شکست دەخۆن و دەستگیر دەکرێن. دوای تێپەڕینی یەکسالێ، لەساڵی ۱۲۵۵، پەیوەندی نێوان میرزا فەرەج اللەی وەزیر و میرزا هیدایەت اللەی ئەمین دەشێوێت و دانیشتووانی ویلایەت بۆ پشتیوانی کردن لەوان دەبنە دوو دەستە و والیە خانم خوازیاری پشتیوانی کردن لەمیرزا هیدایەت اللەی ئەمینە. حاجی میرزا ئاقاسی وەزیری گەورەی شای شاکان، لەسەر داوا و خواستی میری ئەردەڵان، خوازیاری پشتیوانی کردن لەوەزیر بووە و سەرئەنجام ئەم کێشانە گەشتۆتە دەرباری پاشای ئێران. پاشای ئێران لەکاتی ڕۆشتنی کەژاوەی شایی بۆ یەیلاقی ئەلوەند، ڕەزا قولی خانی میری ئەردەڵان و والیە خانم و میرزا فەرەج اللە و دەستەیەك لەزاناکان و پیاو ماقوڵان بۆ هەمەدان بانگێشت دەکات و پەیوەندییەکانی نێوان میرزا فەرەج اللەی وەزیر و میرزا هیدایەت اللەی ئەمین باش دەکات و مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدەدات. لەکاتی گەڕانەوە بۆ کوردستان، دووبارە والیە خانم گرنگی بەوەزیر نادات و کاروبارەکان بەئەمین دەسپێرێت. ناچار وەزیر دەست لەکارەکەی دەکێشێتەوە و دوای سێ مانگ گۆشەگیری، لەساڵی ۱۲۵٦ کۆچی دوایی دەکات و بەفەرمانی والیە خانم، فەرمانی وەزارەت بەناوی میرزا هیدایەت اللەی ئەمین دەردەچێت.

دواتر لەساڵی ۱۲۵۷ جارێکی دیکە مەحمود پاشای بابان، لەگەڵ هەزار بنەماڵە لەگەورەکان و ناودارەکانی بابان ڕوودەکەنە کوردستانی ئەردەڵان و پەنا بۆ ڕەزا قولی خان دەبەن. ڕەزا قولی خان دوای دوو مانگ میوانداری شایانە، مەحمود پاشا لەگەڵ چەند لەگەورە پیاوانی بابان هەڵدەگرێت و ڕێگەی تاران دەگرێتەبەر و لەلایەن دەرباری پاشاوە ڕێزیان دەگیرێت. دوای پێنج مانگ مانەوە، مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدەدرێت و بەپێی فەرمانی دەرباری، ڕەزا قولی خان سوپای ئەردەڵان کۆدەکاتەوە و مەحمود پاشا لەگەڵ خۆی دەبات تا دووبارە فەرمانڕەوایەتی کوردستانی بابانی پێبسپێرێت. لەوکاتەدا کەئاماژەمان پێدا، پەیوەندی نێوان میری ئەردەڵان و دایکی باش نەبووە و دەستەیەك لەوەزیر و پیاوماقووڵانی کوردستان کەمیرزا هیدایەت اللە سەرۆکیان بووە، بۆ لایەنگری کردن لەدایکی میر، مەبەستی شێواندنی کاروبارەکانیان کردووە. دوای ئەوەی میری ئەردەڵان و سوپاکەی دەگەنە نزیك دەریاچەی

زرێبار، میرزا هیدایەت الله، ناودارانی ئەردەڵان و کوردستان بەسەرکردایەتی ئەمان الله بەگ بۆ هاوکاری کردنی مەحمود پاشا، ڕەوانەی سلێمانی دەکات تا دەسەڵاتی لەو ناوچەیە بۆ بگێڕنەوە. لەهەمان کات نامە بۆ عەبدوڵڵە پاشای برای ئەحمەد پاشا دەنێرێت و دەڵێت هەموو بوێر و جەنگاوەرە ناودارەکانم لەسوپای ئەردەڵان دوور خستۆتەوە، تا دەرفەتتان لەبەردەستایە، ڕووبەڕووی ئەو سوپایە ببنەوە چونکە هۆکارەکانی شکستیم ئامادە کردووە و لەگەڵ بیستنی دەنگی شەیپوری ئێوە، پێشەنگەکان پاشەکشێ دەکەن و سوپاکە بلاوەی لێدەکات. عەبدوڵڵە پاشا لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، لەگەڵ دەستەیەك سەرباز و دوو هەزار سوار و چوار تۆپ، لەڕۆژی چوارشەممەی دەی ڕەبیع الاوەلی ساڵی ١٢٥٧، دوای تێپەڕینی دوو کاتژمێر لەبەیانی، خۆی دەگەیێنێتە شوێنی پێشەنگەکان. میرزا هیدایەت الله پێشتر فەرمانی بەپێشەنگەکان دابوو کەکاتێك شەیپوری عەبدوڵڵە پاشا لێدرا، گۆڕەپان بەجێبێڵن و ڕێگەی هەڵاتن بگرنەبەر. بەڕێکەوت میرزا فەزڵ اللەی مۆهردار و میرزا ئەبولفەتح و محەممەد ڕەزا بەگی ڕەمشتی نەوەی محەممەد عەلی بەگ و شێخ عەلی بەگی کوڕی نەزەر بەگ و میرزا ڕەحیم کوڕی میرزا یوسف و مستەفا خانی کوڕی ئەمیر ئەرسەڵان خان و نەجەف قولی خانی کوڕی و محەممەد قولی خانی کوڕی نەزەر عەلی خان و میرزا محەممەد ڕەفیعی نازر، بێ ئیجازە و مۆڵەتی وەزیر، دەڕۆنە لای پێشەنگەکان و لەناکاو شەیپوری جەنگ لەلایەن سوپای عەبدوڵڵە پاشا لێدەدرێت. پێشەنگەکان بەفەرمانی وەزیر بەخێرایی ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر و بۆلای سوپاکە پاشەکشێ دەکەن. بەڵام ئەو کەسانەی ئاماژەمان پێدا، لەپیلانەکەی وەزیر بێ ئاگا بوون و پێیان شەرم بووە گۆڕەپانی جەنگ بەجێبێڵن و نۆ کەسی لەبەرابەر سوپای بابانەکان بەرگری دەکەن. میری ئەردەڵان کاتێك لەهاتنی سوپای بابان ئاگادار دەبێتەوە، بەخێرایی عەبدولحەمیدی فەرمانڕەوای بانە لەگەڵ هەزار تفەنگچی بانە و سەقز بۆ هاوکاری پێشەنگە تازەکان ڕەوانە دەکات و خۆیشی بەڕێدەکەوێت تا هاوکاریان بکات. وەزیر دووبارە ئەم دەرفەتە لەدەست نادات و بەشێوەیەکی نهێنی بەعەبدولحەمید سوڵتان دەڵێت خۆی لەجەنگەکە دوور بخاتەوە و لەسوچێکدا بمێنێتەوە. سوپای عەبدوڵڵە پاشا، گەمارۆی ئەو نۆ کەسە دەدەن و دەیانکوژن و هێرش دەکەنە سەر سوپای میری ئەردەڵان. میرزا هیدایەت بەمیر دەڵێت پێشەنگەکان و عەبدولحەمید کوژراون و هەنووکە سوپای دوژمن دەگات و چیتر مانەوە ڕەوا نییە. میر بەناچاری هەڵدێت و سوپای بابان بەبەجێماوەکانی سوپای ئەردەڵان

دەگاتەوە و کوشتاریان دەکەن. لەولا ئەمان اللە بەگی وەکیل و مەحمود پاشا دەگەنە یەك فەرسەخی سلێمانی. کاتێك ئەم بەسەرهاتە دەبیستن، بەخێرایی دەگەڕێنەوە و پەیوەستی میر دەبن. والیە خان کە لەم پێشهاتە شادومان بووە، بەهاندانی میرزا هیدایەت اللەی وەزیر، ڕووداوەکەی بەمیرزا هیدایەت بۆ دەربار ناردووە و هۆکاری شکستەکەی بۆ گەنجی و کەم ئەزموونی میر و خۆسەری میرزا عەبدولمەجید، ئەوەی میرزا شوکراللە کوڕە مامی میرزا هیدایەت اللەی وەزیر گەڕاندۆتەوە. میریش لەهەمان کات، میرزا عەبدولمەجید بۆ دەربار دەنێرێت تا دەربار لەچۆنیەتی ڕووداوەکە ئاگادار بکاتەوە و داوای هاوکاری و یارمەتی بکات. کاتێك میرزا عەبدولمەجید دەگاتە دەرباری شای شاکانی ئێران، لەئەنجامی کاریگەری نامەکەی میرزا هیدایەت اللە، بەخێرایی فەرمانی کوشتنی ئەو بێ تاوانە دەردەکرێت و میر و دەستەیەك لەدەستوپێوەندەکانی بۆ تاران بانگێشت دەکرێن. موساخانی وەسافیش ئەرکی تەمێ کردن و گرتنی ئەو کەسانەی پێدەدرێت کەبوونەتە هۆکاری شکستەکە. لەگەڵ گەیشتنی بۆ کوردستان، باباخان ئاغای برازای ئەحمەدخانی بیگلەر بەگی مەراغەیی کەمیرئاخوڕی میر بووە و عەلی خانی مامی کە لەسیلسیلەی منالەکانی ئەردەلانی نیشتەجێی تویسرکان بووە و لەو کاتەدا بۆتە پێشکار و هەمەکارەی میر و ئیسماعیل بەگی داروغە و قوباد بەگی فەراش باشی، ڕەوانەی تاران دەکات و هەشت هەزار تمەن وەك قەرەبووی زیانەکان لەو کەسانە وەردەگرێت. میر لەگەڵ گەیشتنی بۆ تاران سەرکۆنە دەکرێت و لەفەرمانڕەوایەتی لادەبرێت و میرزا هیدایەتی وەزیر ئەرکی دەسەڵاتەکانی کوردستان و کۆکردنەوەیماڵیاتی دیوانی پێدەسپێردرێت. میرزا هیدایەت اللە لەگەیشتنی بۆ کوردستان، عەباس قولی خانی مامی ڕەزا قولی خان وەك جێگری حکومەت دیاریدەکات و فەرمانە دەرکراوەکان بەهۆی مۆرێك کەمۆری ئەو میرە بووە، مۆر دەکات. دوای سێ مانگ، عەباس قولی خان لەپێگەی جێگری دوور دەخاتەوە و محەممەد سادق خان، برا گەورەی عەباس قولی خان وەك جێگری حکومەت دەستنیشان دەکات. بۆ ماوەی هەژدە مانگ بەمشێوەیە کوردستان بەڕێوە دەبات و لەو ماوەدا ڕەزا قولی خانی میر و سەییدەکان و زاناکان و پیاوماقووڵانی کوردستان کە لەگەڵ ئەودا ڕۆشتبوون، لەتاران سەرگەردان و نەیاندەزانی چییان بەسەر دێت تا ئەوەی شازادە توبا خانم، هاوسەری ڕەزا قولی خان کەخوشکی محەممەد شا بووە، دەڕواتە تاران. لەسەر تکا و داوای ئەو، دووبارە ڕەزا قولی خان وەك

میری کوردستان دیاریدەکرێت. ڕەزا قولی خان، توبا خانم و ئەمان اللە بەگی وەکیل و کوردستانییەکانی دیکە کەنزیکەی هەزار کەس بوون، دەگەڕێنێتەوە و خۆی دوای چوار مانگ، لەگەڵ فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی، ڕێگەی کوردستان دەگرێتەبەر. کاتێك دەگاتە گوندی جامەشۆران، والیەی دایکی، بەلەبەرچاو گرتنی ڕق و کینەی کۆن، لەڕێگەی گەرووسەوە بەرەو تاران دەڕوات. ڕەزا قولی خان لەم بارودۆخە خەمبار دەبێت و براکەی خۆی بەناوی ئەمان اللە خانی دووەم کەنازناوەکەی غولام شا بووە، بۆ داوای لێبوردن و بەخشین ڕەوانەی تاران دەکات تا بەهەر شێوەیەك بووە، دایکی بگەڕێنێتەوە. ئەمان اللە خان لەنیوەی ڕێگە بەوالیە خانم دەگاتەوە. والیە، ئەمان اللە خان پەیوەستی خۆی دەکات و پێکەوە دەڕۆنە ناو تاران و چالاکییەکانیان دەستپێدەکەن.

سەرەئەنجام لەدوای هەوڵ و کۆششی زۆر کێشەکە بەوە کۆتایی دێت کەناوچەی ئیسفەند ئاوا لەکوردستان دابڕێت و والیە خانم و ئەمان اللە خان لەوێ نیشتەجێ بن و قەنبەر عەلی خانی سەعدئەلدەولە، بەپێی فەرمانی شاهانە رابسپێردرێت تا میرزا هیدایەت اللەی وەزیر و هەموو دەستوپێوەندەکانی والیەخانم وەك محەممەد سادق خان و حسەین قولی خان و عەباس قولی خان و ئەبوئەلفەتح و مەلا مەهدی قازی و عەلی محەممەد بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ و کەسانی دیکە، لەسنەوە بۆ ئیسفەندئاوا ببات. ماوەی دوو ساڵ ڕەزا قولی خان وەك میرێکی بەهێز، فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە و لەبەر ئەوەی والیە خان بەردەوام هەوڵی شێواندنی بارودۆخی ئەوی لەدەرباری ئێران داوە، لەساڵی ١٢٦١، ڕەزا قولی خان دووبارە لەفەرمانڕەوایەتی دوور دەخرێتەوە و بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت و ئەمان اللە خانی برا گەورەی، وەك میری کوردستان دیاریدەکرێت و بەرەو سنە بەڕێدەکەوێت. لەڕێگەدا، میرزا هیدایەت اللە دەمرێت و ئارەزووەکانی لەگەڵ خۆی بۆ ژێر خاك دەبات.

## حکومەتی غولام شا خانی ئەردەڵان

ئەمان اللە خانی کوڕی خوسرەوخانی ناکام، لەبەر ئەوەی لەحەرەم سەرای فەتح عەلی شا چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، ئەو شایە ئاڵقەی غولامی (کۆیلەی) کردۆتە گوێچکەی و نازناوی غولام شا خانی پێدەبەخشێت و بەم نازناوە ناو دەردەکات. غولام شا خان، لەساڵی ١٢٦٢ کۆچی، بەفەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی دێتە کوردستان و لەگەڵ کارگوزار ڕ کەسە دانراوەکانی ڕەزا قولی خان بەشێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوت دەکات بەشێوەیەك خەوی

راحەت لەچاویان ناکەوێت. ناچار ئەمان اللە بەگی وەکیل، کەهەمەکارەی ڕەزا قولی خان بووە، لەگەڵ تایەفە و کەسوکاری خۆی بەرەو هەورامان کۆچ دەکات و لەهۆش بەدرانی خێوەت لێدەدات و مەلا عەباسی شێخولئیسلامیش لەگەڵ دەستەیەك بەرەو ئەفشار هەڵدێن. شازادە توبا خانم، هاوسەری ڕەزا قولی خان لەناوەندی دەسەڵات ماوەتەوە و چاوەڕوان بووە، ناوچەیەك لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ کەسەکانی ڕەزا قولی خان دیاری بکرێت. لەبەر ئەوەی ناسازگاری هاوسەری ئەمان اللە خان کەئەویش لەناوەندی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بووە، تەشەنە دەسێنێت، چارەسەر کردنی کێشەکە لەلایەن دەوڵەتەوە، دوا دەکەوێت. ناچار توبا خانم بۆ ئەمان اللە بەگی وەکیل دەنووسێت: بارودۆخ گەیشتۆتە شوێنێك کەمانەوە لەدۆزەخ بۆ من خۆشترە لەمانەوە لێرە. ئەگەر بەزووترین کات کارێك بۆ ڕزگار کردنی من نەکەن، بەشێوەیەك خۆم دەکوژم. وەکیلیش دەقی نامەکەی توبا خانم بەحەسەن سوڵتان و ئەحمەد سوڵتانی هەورامی نیشان دەدات. هەورامییەکان سوێند بۆ وەکیل دەخۆن کەبەهەموو هێزییانەوە بۆ ڕزگار کردنی ئەو خاتوونە ئامادەن و تا دوا دڵۆپی خوێن، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی وەکیل دەبن بەو مەرجەی توبا خانم لەشارەکە بێتەدەر و خۆی بگەیێنێتە گوندی حەسەن ئاوا. ئەمان اللە بەگی وەکیل لەساڵی ١٢٦٢ و لە٢١ جومادی الثانی، سوپای هەورامان بەڕێدەخات و دەڕۆنە حەسەن ئاوا و لەوێوە پەیام بۆ توبا خانم دەنێرێت تا بەرەو گوندەکە بەڕێکەوێت. ئەمان اللە خان لەم ڕووداوە ئاگادار دەبێتەوە و بەهاوکاری عەلی محەممەد بەگ و میرزا جەعفەری کوڕی میرزا هیدایەت اللەی وەزیر، توبا خانم لەڕۆشتن پەشیمان دەکەنەوە و لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ جەنگی هەورامییەکان بەرەو حەسەن ئاوا بەڕێدەکەون. هەورامییەکان دوای ئەوەی دەبینن توبا خانمی خوشکی پاشا دیار نییە و ئەمان اللە خان بەمەبەستی جەنگ بەڕێکەوتووە، پشتی ئەمان اللە بەگی وەکیل چۆڵ دەکەن. دووسەد سواری تایەفەی لەك کەهاوڕێیەتی ئەمان اللە خانیان کردووە، لێی جیادەبنەوە و پەیوەستی سوپاکەی میری ئەردەڵان دەبن. ناچار ئەمان اللە بەگ کە نەتوانای گەڕانەوەی بووە و نەتوانای مانەوە، لەگەڵ چەند کەس لەکەسە نزیکەکانی، لەقەڵای حەسەن ئاوا سەنگەر دەگرێت و شەڕ ڕوودەدات. لەهاوڕێیانی وەکیل، شاکەرەم سوڵتانی سوڕسوری لەیەکەم هێرش دەکوژرێت. هەورامییەکان لەچیاکە دێنەخوار و پەیوەستی سوپاکەی میر دەبن. وەکیل تەنیا دەمێنێتەوە و لەگەڵ ئەسعد اللە بەگی کوڕی و فەتح عەلی بەگی برازای و

چەند کەسێکی دیکە لەخزمەکانی، تا کۆتاییەکانی نیوەڕۆ، سەرقاڵی سەنگەر لێدان و بەرگری کردن دەبن. میر بۆ ڕازی کردنی چەند کەس لەشێخ و سەییدەکان و کەسانی دیکە لەگەڵ حسەین قولی خان و عەلی محەممەد بەگی کوڕە مامی وەکیل بۆ لای ئەمان اللە خانی وەکیل دەنێرێت و سوێند دەخوات، جگە لەڕێز و خۆشەویستی هیچی دیکە بەرابەر بەو ئەنجام نادات. وەکیل لەبەر دڵنیا بوون لەسوێندەکە لەقەڵاکە دێتەدەر و دەڕواتە بەردەم میر. میر ماچی دەکات و لای خۆی دایدەنیشێنێت و دوای نیو کاتژمێر ڕێگەی شار دەگرنەبەر. لەڕێگە، میرزا فەتاح کوڕی میرزا فەرەج اللەی وەزیر، میری ئەردەڵان ناچار دەکات ئەمان اللە بەگ بەڕێزەوە نەباتە ناو شارەکە. میر بەئەنقەست لەڕۆشتن بۆ ناو شارەکە خۆی دواخستووە و دوای تێپەڕینیی دوو کاتژمێر لەشەو دەڕواتە ناو شارەکە. ئەمان اللە بەگ لەیەکێك لەماڵەکان زیندانی دەکەن. دوای هەژدە ڕۆژ، بەهۆی پیلانی نەیارەکان، ئەمان اللە بەگی وەکیل دەکوژێت و دواتر کوڕ و برازاکەی و کەسەکانی تەسلیم بەعەلی محەممەد بەگ دەکات. ژنی خوالێخۆشبوو میرزا فەرەج اللە، بەزەیی بەحاڵی ناسازگار و بەدبەختی ئەواندا دێتەوە و لای میر تکایان بۆ دەکات و ئازادیان دەکات. لەکۆتایی ئەم روداوانە لە ٢٦ شەعبانی ١٢٦٢، میرزا رەحیم خان، پێشخزمەتی شایی، رادەسپێردرێت تا توبا خانم بۆ ئیسفەند ئاوا ببات. لە ٨ رەمەزانی ئەم ساڵە، توبا خانم بەرەو گوندی قسلان بەڕێکەتووە و نامە بۆ کەس و خزمەکانی خۆی دەنووسێت کە بەناوچەکاندا بڵاو بوونەتەوە. هەموو کەسەکانی رووەدەکەنە قسلان و لەگوندەکانی ئیسفەند ئاوا نیشتەجێیان دەکات.

دوای ئەوە توبا خانم نامەیەك بۆ حاجی میرزا ئاقاسی ڕاوێژکار دەنووسێت کەناوەرۆکەکەی ئەمەیە: مەگەر تۆ ئەو کەسە نەبوویت چەندین جار دەتوت: خزمەتەکانی من بۆ بنەماڵەی خوالێخۆشبوی جێگری پاشایەتی، لەترۆپکدایە، چی روویداوە بێ سەرەوژێر بوون، لەپلەو پێگە بەرزەوە کەوتنە خوار و کەوتنە ئەم بارودۆخەوە.

کاتێك ئەم نامەیە بەدەستی حاجی میرزا ئاقاسی دەگات، لەهاوکارییەکانی بۆ میرزا هیدایەت اللە و والیە خانم پەشیمان دەبێتەوە و بەمشێوەیە وەڵامی دەداتەوە: ئەوەی نووسیبووتان، ڕاستە و ڕەوایە، ئەگەر لەسەر داوای کەسانی دیکە کەموکوڕی لەخزمەتەکانی منی بێ ناو و نیشان ڕوویداوە، بەگەورەیی خۆتان بمبوورن: باشترین کار بۆ بەندەکان ئەوەیە دوای تاوانەکەی خۆیان پەنا بۆ بارەگای خواوەند ببەن. بەخواستی خوا، بەزووترین کات

کەموکوڕی و کەمتەرخەمییەکان قەرەبوو دەکرێتەوە. بەنهێنی پێتان دەڵێم کەمێك تەریاك بکێشن و لەسێبەری داری بی بحەوێنەوە کەهیوادارم بەزووترین کات ڕەزا قولی خانی فەرمانڕەوا، لای ئێوە بێت.

زۆری پێناچێت حاجی میرزا ئاقاسی، بەڵێنەکەی خۆی دەباتەسەر. ئەمان الله خان (غولام شا خان) لەسەر کار لادەبات و ڕەزا قولی خان دوای پێنج مانگ لە١٥ شەوالی ١٢٦٢، دووبارە وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی پێدەبەخشرێت. لەهەشتی زەیقەعدە فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ئەو دەگاتە کوردستان. ڕەزا قولی خان فەرمان دەدات شوێنکەوتە و دەستوپێوەندەکانی ئەمان الله خان قۆڵبەست و زیندانی بکەن. دەستەیەکی وەك میرزا جەعفەر و ئیسماعیلی بەگی دارۆغە و میرزا محەممەد ڕەزای موعتەمید، کوڕی میرزا عەبدولکەریم و هتد... زیندانی دەکرێن و کەسانی دیکە وەك حسەین قولی خانی ئەردەڵان و نەجەف قولی خان کوڕی محەممەد حەسەن خان و میرزا فەتاح کوڕی میرزا فەرەج اللەی وەزیر و هتد... بەرەو شارەزوور هەڵدێن. میر لە١١ زیقەعدەی ١٢٦٢ بۆ جاری سێیەم دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان. لەگەڵ گەیشتنی، ئەو کەسانەی بەشداری کوشتنی ئەمان الله بەگی وەکیلیان کردبوو، سزا دەدات بۆ نمونە کەسێکی وەك جەعفەر قولی خانی ئەردەڵان خوشکەزای ئەمان الله خانی گەورە و میرزا ئیسماعیلی دارۆغە و میرزا ئیبراهیمی مونشی کوڕی حاجی مستەفا و ئەلقاس ناوێك و محەممەد ناوێك کوڕی سەبزی لەك کەهەرکام بەشێوەیەك سزا دەدرێت. میر، دووبارە پرسە بۆ ئەمان الله خان دەگێرێت و خۆی وەك نیشانەی خێڵایەتی، قوڕ لەسەر دەگرێت و ڕەش دەپۆشێت و بەپێی فەرمانی ئەو، هەموو دانیشتووان ڕەشپۆش دەبن. دوای کۆتایی هێنان بەپرسە، پێگەی وەکالەت بەئەسەد الله بەگی کوڕی دەبەخشێت و لەجێگەی باوکی دایدەنێت.

دوای دووساڵ فەرمانڕەوایەتی، نەیارەکان لەدەرباری پاشایەتی، ڕەزا قولی خان بەهاوڕێیەتی لەگەڵ بەهمەن میرزای برای محەممەد شا تاوانبار دەکەن کەلەو کاتەدا فەرمانڕەوای ئازەربایەجان بووە. لەلایەن دەوڵەتەوە، خوسرەوخانی گورجی بۆ گرتنی بەهمەن میرزا و ڕەزا قولی خان بەڕێدەکەوێت. بەهمەن میرزا لەڕووداوەکە ئاگادار دەبێتەوە و بەخێرایی ڕێگەی دەربار دەگرێتەبەر. خوسرەوخان ڕێگەی لەئازەربایەجانەوە بەرەو کوردستان دەگۆڕێت و بەڕەزا قولی خان دەڵێت لەلایەن دەوڵەتەوە ئەرکێکم لەم ناوچەیە

پێسپێردراوە، پێویستە چاوم بەنێوە بکەوێت. ڕەزا قولی خان بێ ئاگا لەهەموو شتێك، دەڕواتە ناو سوپاکەی خوسرەوخان و لەکاتی نانی نیوەڕۆ دەگاتە لای خوسرەوخانی گورجی. دوای خواردنی نان، بەپێی فەرمانێك کەخوسرەوخان پێشتر بەپیاوەکانی داوە، دەستەیەك پەلاماری ڕەزا قولی خان دەدەن و دەیگرن و هەموو هاوڕێی و نۆکەرەکانی ڕووت دەکەنەوە. خوسرەوخان، میری ئەردەڵان بە عەباس قولی خانی گەڕووسی بۆ تاران ڕەوانە دەکات و لەوێ لەتۆپخانەی دەوڵەتی زیندانی دەکرێت. خوسرەوخان ڕێگەی سنە دەگرێتەبەر و فەرمانڕەوایەتی دەگرێتەدەست.

## حکومەتی خوسرەوخانی گورجی

خوسرەوخانی گورجی کەبەخوسرەوخانی خواجە بەناوبانگە، لەساڵی ١٢٦٤ کۆچی دەڕواتە ناو شاری سنە. دوای گەیشتنی ئەو بۆ ناو شارەکە، دەستەیەك لەپیاوماقووڵانی سنە، بۆ لایەنگری و پشتیوانی کردن لەڕەزا قولی خان ڕێگەی تاران دەگرنەبەر و لەمزگەوتی شا، کۆدەبنەوە و مان دەگرن. حاجی میرزای ئاقاسی، کاتێك شۆڕش و کۆبوونەوەی کوردستانییان دەبینێت، لەناخەوە لەکارەکەی خۆی پەشیمان دەبێتەوە بەڵام بۆ ئەوەی لەشکۆ و مەزنی دەوڵەت کەم نەبێتەوە، دەستەیەك سەرباز و چوار تۆپ بەفەرماندەیی عەلی خان قەراگوزلو بۆ بەهێز کردنی فەرمانڕەوایەتی خوسرەوخان، ڕەوانەی کوردستان دەکات و هەرچەند لەتارانیش گوشار دەخەنە سەر کوردستانییەکان بۆ ئەوەی دەستبەرداری داواکەیان ببەن و بگەڕێنەوە، بەڵام کاریگەری نابێت. تەنانەت عەلی محەممەد بەگی وەکیل کەسەرۆکی مانگرتووەکان بووە، بەلێدانی پێنج هەزار دار سزا دەدرێت بەڵام ئامادە نابێت بۆ کوردستان بگەڕێتەوە و لەسەر داواکەی خۆی بۆ گەڕانەوەی ڕەزا قولی خان پێداگری دەکات تا ئەوەی لەشەوی ٦ شەوالی ١٢٦٤، فەرمانڕەوای عەجەمی کوردستان دەمرێت. لەم کاتەدا دانیشتووانی کوردستان کە لەچۆنیەتی هەڵسوکەوتی نادادپەروەرانەی حاجی میرزای ئاقاسی و کردەوەکانی خوسرەوخانی گورجی بێزار ببوون و میری ئەردەڵانیش لەگوندی تەجریش کەشوێنی تۆپخانەی دەوڵەتی بووە، زیندانی بووە، ئەم دەرفەتە دەقۆزنەوە و لەگەڵ گەروسییەکان پەیمان دەبەستن و بێ ئەوەی ڕەزاقولی خان ئاگادار بکەنەوە، هێرش دەکەنە سەر گوندی تەجریش و ڕەزا قولی خان لەتۆپخانە دەهێننەدەر و بەرەو کوردستان بەڕێدەکەون. لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە بەجێگری خوسرەوخان، بەخێرایی لەگەڵ دوو تۆپ

و دەستەیەك سەرباز، لەڕێگەی گەڕووسەوە بەرەو زەنگان (زەنجان) هەڵدێت. لەملایش ڕەزا قولی خان و گەڕووسییەکان، دێنە ناو سنە و چاوی دانیشتووان بەبینی میرەکەیان شادومان دەبێتەوە. میر، ڕێزێکی زۆر لەسەرکردەکانی گەڕووس دەگرێت و هاوشێوەی کەسانی ڕێزدار، مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدەدات.

## حکومەتی ڕەزا قولی خانی ئەردەلان بۆ جاری چوارەم

ڕەزا قولی خان لەساڵی ١٢٦٤، بەوشێوەی ئاماژەمان پێدا، بۆ شاری سنە دەگەڕێتەوە و دەست بەدابەش کردنی سوپا و ئامادە کردنی سوپاکەی دەکات و ئاسایش و ئارامی بۆ کوردستان دەگەڕێنێتەوە. کاتێك ناسرئەلدین شا، لەشوێنی ویلایەتەکەی لەئازەربایەجانەوە، بەرەو ناوەندی تاج و تەخت، تاران بەڕێدەکەوێت، غولام شا خان بۆ پێشواوی کەژاوەی شایی دەڕوات و لەسوڵتانییە دەگاتە خزمەتی پاشا و سەرنجی پاشا رادەکێشێت. ڕەزاقولی خانیش بەنوێنەرایەتی خۆی، محەممەد عەلی خانی سەقزی و میرزا الله قولی دارۆغە لەگەڵ دیاری و پێشکەشی فراوان بۆ دەرباری پاشا ڕەوانە دەکات. غولام شا خان، لەکاتی گەیشتنی بۆ تاران، لەدیوان خانەی میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیر، نیشتەجێ دەبێت و بۆ بەدەست هێنانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان، هەوڵەکانی دەخاتەگەڕ تا ئەوەی دوای شەش مانگ، خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەناوی غولام شا خان دەردەچێت و ڕەزا قولی خان لەسەر کار لادەبرێت وئەمە دوایین جاری فەرمانڕەوایەتی ئەوە کە لەئەنجامی ڕووداوەکەی تەجریش، پێگەی لای دەربارییەکان لەدەست دەدات. ڕەزا قولی خان لەتاران دەمێنێتەوە تا لەسەفەری گورگان دەبێت یەکێك لەخزمەتکارەکانی میرزا محەممەد خانی سوپاسالار.

ڕەزا قولی خان، کەسێکی بوێر و دلێر بووە، بۆ هێزی دەست بەناوبانگ بووە، سینی مسینی لوولە کردووە و لەکاتی هێرش کردن، نیوەی بەهێی لەدار کردۆتەوە و نیوەکەی دیکەی بەدارەکەوە ماوەتەوە و کاری لەمشێوە کەسەکانی دیکە لەئەنجامدانی ناتەوان بوون. کەسێکی بەخشندە و پایەبەرز بووە و زۆر ئارەزوومەندی کۆکردنەوەی سامان و دارایی دنیا نەبووە و ئەوەی بەدەستی هێناوە، بەخەڵکانی بەخشیوە. لەتوبا خانمی خوشکی محەممەد شا، سێ کوڕی بۆ هاتۆتە دنیا: ١. میر خوسرەوخان، ئیفیتخار الوەلات. ٢. حاجی محەممەد عەلی خان، سەرۆکی سوپای کوردستان، ٣. حاجی ئەبوئەلحەسەن خانی فەخروئەلمولك

کەساڵەکانی تەمەنی لەدەرباری ناسری بەسەر بردووە.

## حکومەتی غولام شا خان بۆ جاری دووەم

ئەمان الله خان ناسراو بەشا غولام خان، بەپێی فەرمانی ناسرئەلدین شا، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە و لەڕۆژی سێشەممە ١٤ رەبیع الثانی ١٢٦٥ کۆچی، هاتۆتە ناو سنە و فەرمانڕەوایەتی دەستپێکردووە و میرزا الله قولی وەك وەزیر و محەممەد عەلی خانی سەقزی وەك جێگری خۆی دیاریکردووە. دوای سێ مانگ، ئافتاب (هەتاو) سوڵتان خانم، کچی خوالێخۆشبوو حسەین قولی خان وەك هاوسەری خۆی دیاریکردووە و لەسێی شەعبان مارەی دەکات.

لەسەرەتای ١٢٦٦ بەپێی داوای دەوڵەتی عوسمانی، لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە، میری ئەردەڵان بۆ سەرکوت کردن و لەناو بردنی بابانییەکان رادەسپێردرێت. میر لەگەڵ سوپای ئەردەڵان بەرەو سلێمانی بەڕێدەکەوێت و لەلایەن دەوڵەتی رۆمەوە تۆپخانە بەرەو سەرزەمینی بابان دێت و هەموو پاشا و پاشازادەکانی بابان لەلایەن ئەم دوو دەوڵەتەوە گەمارۆ دەدرێن و سەرئەنجام قۆڵبەست و ڕەوانەی دەوڵەتی رۆم دەکرێن جگە لەعەزیز بەگی بابان کە لەگەڵ کەس و سوپاکەی خۆی بەرەو زەهاو هەڵاتووە و لەوێوە پەلامارەکانی بۆ سەر ناوچەکانی دیکە دەستپێدەکات. میری ئەردەڵان شوێنی دەکەوێت و ناچاری دەکات بۆ ناو تایەفە عەرەبەکان هەڵبێت و لەسنوورەکان دووری دەخاتەوە و سەرکەوتووانە بۆ ناوەندی دەسەڵاتەکەی خۆی دەگەڕێتەوە. لەسەرەتاکانی ١٢٦٧، پێگەی وەزارەت بە میرزا محەممەد ڕەزای موعتەمید کوڕی میرزا عەبدولکەریمی موعتەمید دەسپێرێت و بەپێی فەرمانی میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیر، دەستەیەك سەربازی هەزار کەسی لەگەڵ سەرهەنگ و باوەڕ و سوڵتان و کەسانی دیکە، لەدێهات و شارەکانی کوردستان کۆدەکاتەوەو و فەرماندەیی ئەو دەستەیە بەخان ئەحمەد خانی برا بچووکی دەسپێرێت. لەکۆتایی ئەم ساڵە، کەژاوەی پاشای ئێران بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت. میرزا تەقی خانی کەبیر، میری کوردستان و ئەم دەستە سەربازە هەزار کەسییە و سوپای سوارەی کوردستان بانگ دەکات. میر، سوپاکەی بەشێوەیەکی زۆر ڕێکوپێك بەڕێدەخات و لەچەمەنی عەلی ئاباد، بەکەژاوەی پاشا دەگاتەوە. میری ئەردەڵان لەم سەفەرەدا دەبێتە هاوڕێی میرزا ئاقاخانی ڕاوێژکار. میرزا ئاقا خان هاوکاری زۆری میری ئەردەڵان دەکات.

لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٢٦٨ کۆچی، حەسەن سوڵتان هەورامی، ئاڵای شۆڕش بەرز دەکاتەوە و یاخیگەری و تاڵان کردنی گوند و ناوچەکانی دەوروبەر دەستپێدەکات. میری ئەردەڵان بەپێی فەرمانی دەوڵەت، لەگەڵ دەستەیەك سەرباز و چوار تۆپ و دوو هەزار پێشمەرگە، بەرەو هەورامانی تەخت بەڕێدەکەوێت و نەجەف قولی خان، نەوەی محەممەد حەسەن خانی کوڕە مانی لەگەڵ ئەبولقاسم بەگ و پێنج دەستە سەرباز و ژمارەیەك سوار لەڕێگەی جوانڕۆ و پاوە بۆ سەرکوت کردنی محەممەد سەعید سوڵتان، ڕەوانەی لهۆن دەکات. لەبەشی هەورامانی تەخت، خان ئەحمەد خانی سەرکردە، برای میری ئەردەڵان، پێشەنگی جەنگەکە بووە و لەڕێگەی دەربەندی دزڵییەوە فەرمانی هێرشکردن دەدات. دەستەیەك تفەنگچی کە لەلایەن حەسەن سوڵتانەوە پارێزگارییان لەدەربەندەکە کردووە، ڕووبەڕووی پێشەنگەکانی سوپای ئەردەڵان دەبنەوە بەڵام دوای شەڕێکی کەم، ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سوپای ئەردەڵان دەست بەسەر سەنگەرەکاندا دەگرێت و میریش لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی لەدەربەندەکە گوزەر دەکات. خان ئەحمەد خان بێ لەدەستدانی کات، لەدزڵییەوە بەرەو حەوشی بەدرانی کەشوێن و ناوەندی حەسەن سوڵتان و سوپای هەورامان بووە، پێشڕەوی دەکات. هەورامییەکان کە لەهاتنی خان ئەحمەد خان ئاگادار دەبنەوە، هێرشێکی سەراسەری دەکەن و خان ئەحمەد خان ناچار بەپاشەکشێ و سەنگەر گرتن دەکەن. لەم هێرشەدا لەهەورامییەکان ٢٤ کەس دەکوژرێن و ٤٣٧ کەس بریندار و ئەسیر دەبن و لەئەردەڵانییەکانیش ٦ کەس دەکوژرێت و ١٤ کەس بریندار دەبێت.

دوای ئەم هێرشە، میر و سوپاکەی هاوڕێی، لەڕێگەوە دەگەن و هەورامییەکان ناچار بەپاشەکشێ دەکەن. شەو، جیایی لەنێوان دوو سوپاکە دروست دەکات. حەسەن سوڵتان نیوەی شەو لەگەڵ تایەفە و کەسەکانی خۆی بەرەو شارەزوور هەڵدێن. بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو، سوپای میر ئەردەڵان هێرش دەکاتە سەر سەنگەر و شوێنی هەڵاتووان و ئەوەی لەوان بەجێمابێت، تاڵانی دەکەن و دەیسووتێنن. نەجەف قولی خان لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەئاوی سیروان دەپەڕێتەوە و هێرش دەکاتە سەر گوندی نەوسود کەشوێن و بارەگای محەممەد سەعیدی سوڵتانی هەورامی بووە. نەوسودییەکان شکست دەخۆن و نەجەف قولی خان دەست بەسەر ناوچەکەدا دەگرێت و محەممەد سەعید سوڵتان و کەسەکانی ڕێگەی شارەزوور دەگرنەبەر و پەیوەستی حەسەن سوڵتان دەبن.

دوو سێ ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوانە، هەواڵ دەگات کەناسر ئەلدین شا بەدەستی کەسێك بریندار بووە. ئاژاوەگێڕەکانی سەرسنور بەبیستنی ئەم هەواڵە چالاکییەکانیان دەستپێدەکەن و دووبارە هێرش دەکەنە سەر سوپاکەی نەجەف قولی خان.

سوپای نەجەف قولی خان ئەو شەوە پیاوانە خۆڕاگری دەکەن. بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی خۆر تا ئێواریێ، جەنگ بەردەوام دەبێت. لەسەربازەکانی دەوڵەت ٧٠ کەس و لەتفەنگچییەکان لەو شەڕەدا ٢٦ کەس دەکوژرێت. تاریکی شەو، دوو سوپاکە لەجموجۆڵ دەخات. لەلایەن میرەوە هاوکاری ناگات. ناچار نەجەف قولی خان، لەگەڵ پاشماوەی سوپاکەی نەوسود چۆڵ و بەرەو جوانڕۆ پاشەکشێ دەکات.

میر، دوای گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش بۆ هەورامان، بەرەو قەڵای مەریوان دەڕوات و لەوێ لەگەڵ پاشای سلێمانیی و سنورداڕانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ گەڕاندنەوەی هەڵاتووان، ڕاوێژ و گفتوگۆ دەکات.

عەزیز ئاغای موتەسەریف و نەقیب ئەلئەشراف، لەلایەن پاشای سلێمانی بۆ تکا کردن بۆ حەسەن سوڵتان و محەممەد سەعید سوڵتان دێنە لای میری ئەردەڵان. سێ هەزار تمەن پێشکە بەمیر دەکەن و میر مۆڵەتی گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیانیان پێدەدات. لەم کاتەدا پەیکی تایبەت لەناوەندی دەسەڵاتەوە و دێت و مژدەی باشبوونەوەی پاشا دەهێنێت. میری ئەردەڵان لەخۆشی ئەم هەواڵە، ئاهەنگێك ڕێکدەخات و سەد و دە گوللە تۆپ بەسلامەتی چاکبوونەوەی پاشا دەتەقێنن. بەیانی ئەو شەوە سوپا بەرەو سنە دەگەڕێنێتەوە و دوای گەیشتنی بەشارەکە فەرمان دەدات هەموو بازاڕ و دووکانەکان بڕازیننەوە. چوار شەو و ڕۆژ خەڵکی سنە سەرقاڵی خۆشی و ئاهەنگ گێڕانن.

لەبەهاری ساڵی ١٢٦٨ کۆچی، تایەفەی جاف کەکێشەیان بۆ هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی دروستکردووە، یاخی دەبن و ئازار و ئەزیەت کردنی خەڵکان لەشاری سنە دەستپێدەکەن. میری ئەردەڵان دەربارەی لەکار و کردەوەکانی ئەوان ئاگادار کردۆتەوە و بەمۆڵەت وەرگرتن لەدەوڵەت زیاتر لەشەش هەزار سوار و پیادەی کۆکردۆتەوە و دەستەی گەڕوسیش لەگەڵ تۆپخانەی پێویست هەڵگدەگرێت و بەرەو توڕێزخاتوون بەڕێدەکەوێت. لەوێ، خان ئەحمەد خان و ئیسماعیل خان و نەجەف قولی خان لەگەڵ چەند دەستە سەرباز و سوارەی مەندەمی و سورسوڕ و گەشکی و جوانڕۆ و هتد... بەرەو مەریوان دەنێرێت تا

لەوێوە هێرش دەستپێبکەن. میر خۆی لەگەڵ سوپای ئەردەلان و گەڕووس لەسارالەوە هێرشی بردووە و شوێنپێی تایەفەی جاف دەکەوێت کەزیاتر لەدە هەزار بنەماڵە بوون. جافەکان نەیانتوانیوە بەرگری بکەن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. خان ئەحمەد خان لەمەریوانەوە هێرشیان دەکاتەسەر و نزیکەی سی کەس لەپیاوماقووڵەکانی جاف دەگرێت و ژمارەیەکیان دەکوژێت و زیاتر لەسی هەزار سەر لەمەڕومالاتەکەیان تالان دەکات و لەسنوری ئێران دووریان دەکاتەوە و سەرکەوتووانە دەگەڕێتەوە.

لەساڵی ١٢٧١ کۆچی، میرزا عەبدولسەمەد ناوێک، لەدانیشتووانی هەمەدان، کەبانگەشەکەری مەزهەبی شێخی بووە، بەنوێنەرایەتی حاج کەریم خانی کرمانی دێتە کوردستان و میر هان دەدات و مەزهەبەکەی دەگۆڕێت و هەروەها بەڵێن بەمیر دەدات حاجی کەریم خان خۆی بێتە کوردستان و مزگەوتی دارئەلئەمان وەك شوێنی ڕێنوێنی کردنی خەڵکان دیاریبکات تا بەهاوکاری میر، مەزهەبی شێخی لەکوردستان بڵاو ببێتەوە. زاناکانی کوردستان کەزۆربەیان سوونی و شافعی مەزهەبن، لەمکارە سەریان سوڕدەمێنێت و هەرچەند هەوڵ دەدەن لەڕێگەی مۆجیاری کردن میر لەبڕیارەکەی پەشیمان بکەنەوە، سوودی نابێت. بەناچاری دانیشتووان، شێخ سەراج ئەلدینی تەوێڵە (عوسمان) لەم بارودۆخە ئاگادار دەکەنەوە. ئەویش لەلایەن خۆیەوە بەمەبەستی خێرخوازی و چاکەخوازی، شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی و مەلا عەبدولڕەحیمی مەولەوی بۆ لای میری ئەردەلان دەنێرێت و ڕێگەی ئەو کارەی لێدەگرێت، بەڵام وتەکانی شێخیش کاریگەری نابێت. لەبەر ئەمە ڕۆژی چوارشەممەی ١٦ رەبیع الاوەل ١٢٧١ ، هەموو زاناکان، میرزادەکان، بەگزادەکان، پیاوماقوڵان و بازرگانان لەگۆڕستانی شێخان کە لەڕۆژئاوای شارەکەیە، کۆدەبنەوە و پەیام بۆ میر دەنێرن کەئەگەر ئەو نوێنەری دەوڵەتە، مافی خۆتێهەڵقورتاندن لەمەزهەبی ئێمەی نییە و دەبێت میرزا عەبدولسەمەدی شێخی لەم شارە دەربکات و ئەگەر بانگەشەکەری حاجی کەریم خانە، ئێمە نامانەوێت. یا دەبێت ئەو بڕوات، یا ئێمە وڵات بەجێدێڵین و کۆچ دەکەین. میر لەم پەیامە توڕە دەبێت و زیدەڕۆیی دەکاتە پیشە و ئامادە نییە داوای بەخشین لەدانیشتووان بکات. دەستەیەك لەدەورێشەکانی قادری ئەم هەلە دەقۆزنەوە و بێ وەرگرتنی ئیجازە و مۆڵەت لەزاناکان، هێرش دەکەنە سەر کاروانسەرا و بازاڕەکان و دووکانی هەموو بازرگانە شیعەکان تالان و هەموو شیعە مەزهەبەکان دەکوژن. دواتر تالان وبڕەو، دووکانی سوونی

مەزهەبەکانیش دەگرێتەوە و هەموو کاروانسەرا و بازاڕەکان تالان دەکەن. خاوەن دووکانەکان لەشیعە و سوونی بۆ باخی فیردەوس هەڵدێن و هاواری دادخوازی بەرز دەکەنەوە. میر لەم دەرەفەتە کەڵك وەردەگرێت و دوو تۆپ دەباتە سەر قەڵای حکومەتی کە بەسەر بازاڕ و کاروانسەرەکان دەڕوانێت و تەقە لەئاژاوەچی و شۆڕشگێڕەکان دەکات. ئاژاوەچی و تالانچییەکان لەترسی تۆپەکان، دەست لەتالانی هەڵدەگرن و هەڵدێن. پیاوانی حکومەت، نزیکەی چل کەسیان لێدەگرن کەکەلوپەل و قوماشی دووکانەکانیان تالان کردبوو و بەفەرمانی والی، گوێ و لوتیان دەبڕن و لەقەڵاکەوە فڕیاندەدەنە خوار. شێخ عەبدولقادری مەعروف، خاوەنی (تهذیب الکلام) کەیەکێك لەزانا بەناوبانگەکانی کوردستانە و سەرسیلسیلەی شێخەکانی مەردۆخە، دوای بینینی ئەم بارودۆخە لەگەڵ هەموو کەس و کار و تایەفەکەی، هەمان ڕۆژ بەرەو خاکی دەوڵەتی عوسمانی کۆچ دەکەن. میری ئەردەڵان دوای ڕۆشتنی ئەم شێخە، گرتنی خەڵکان دەستپێدەکات و زۆربەی کەسەکان سزا دەدات. کەسانی وەك مستەفا ئاغای کوڕی حاجی شەعبان کەسەرۆکی بازرگانەکان بووە، بەدەمی تۆپەوە دەبەستێت. چاوی شێخ وەسیم، ناسراو بەشێخ وەسیمی بازاڕی هەڵدەکۆڵێت و بۆ ماوەی سێ ساڵ، ساڵی هەشتاهەزار تمەن وەك ماڵیات لەدانیشتووانی شارەکە وەردەگرێت. ئەم شۆڕشە بەشۆڕشی کاروانسەرا ناسراوە. لەم جەنگەدا دەستەیەك سامانێکی زۆریان کۆکردەوە و دەستەیەك ڕیسوا و نەدار بوون.

دوای گەیشتنی شێخ عەبدولقادر بۆ سلێمانی، کارگوزاری ئەو شارە، هەواڵی گەیشتنی ئەو بەسوڵتان عەبدولحەمید خانی غازی دەدات. سوڵتان ئەم نامەی خوارەوە بۆ شێخ دەنووسێت: دوای سڵاو، لەبەرهەمەکانی ئێوەی بەڕێز، ئاستی زانین و زانایی ئێوە ئاشکرایە. هاتنتان بۆ سلێمانی بەشێوەیەکی باش لێکدەدەینەوە کەهاوکات بوو لەگەڵ سەرکەوتنی سیوئیستاپول و سوپای مەنسور، ڕۆشتە ناو ئەو قەڵایە. لەئێستادا وەك هاوکاری بژێوی، مانگانەیەك بەناوی ئێوەی بەڕێز دیاریکرا، ئەگەر بەسەندەی نەکرد، دووای کۆتایی هاتنی جەنگ، بیرمانی بخەنەوە تا بەئەندازەی پێویست، هۆکارەکانی ئاسوودەی ئێوە دابین بکرێت. لەدۆعای خێری خۆتان بێ بەشمان مەکەن.

شێخ لەساڵی ١٢١١ چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لەساڵی ١٣٠٥ لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

لەرەبیع الاوەلی ساڵی ۱۲۷۳، دەنگۆیەك لەناو خەڵکان بڵاوبوویەوە کەدەوڵەتی ئینگلیس گوشاری خستۆتە سەر ئێران بۆ ئەوەی ببێتە دەوڵەتێکی یاسایی. لەمانگی جومادی الاوەل، ئەم فەرمانەی خوارەوە دەگات و نوسخەی ئەو فەرمانە بۆ هەموو ناوچەکان ڕەوانە دەکرێت. لەوەڵامی نامەکە، تۆمارێکی چڕوپڕ بەمۆری هەموو زاناکانی شار و گوندەکان ڕەوانەی تاران دەکرێت کەتیایدا هاتووە: لەبەر ئەوەی مەسیحییەکان یاسای ئاسمانیان نییە، ناچاران یاسایەك بۆ وڵاتەکەی خۆیان دابرێژن بەڵام ئیسلامییەکان، خۆیان یاسایەکی ئاسمانیان هەیە و پێویستیان بەیاسای فەرەنگییەکان نییە و تا گیان لەجەستەیاندا بێت، بەهیچ جۆرێك بەیاسای فەرنگی ڕازی نابن و هەموان بۆ جیهاد ئامادەن.

لەساڵی ۱۲۷۵ کۆچی، ناسرئەلدین شا بەمەبەستی گەڕان لەڕێگەی هەمەدانەوە ڕوودەکاتە کوردستان. تا کاتێك کەژاوە و سوپای پاشا ناگاتە خاکی کوردستان، کەس ئاگادار نابێتەوە. دوای ئاگادار بوونەوە، میری ئەردەڵان و دەستەیەك بۆ پێشوازی کردنی دەڕۆن و لەناوچەی ئیسفەند ئاوا، چاویان بەپاشا دەکەوێت و شان بەشانی، بەرەو سنە بەڕێدەکەون. لەزیقەعدەی ۱۲۷٥، خێوەت و بارەگای سەڵتەنەتی لەباخی خوسرەوئاباد، هەڵدەدرێت و کەسانی هاوڕێی پاشایش لەدەوری باخەکە، خێوەت هەڵدەدەن. ئەو وتارەی خوالێخۆشبوو، باوکی شێخ عەبدولمۆئمین، پێشنوێژ و وتارخوێن لەکاتی هاتنی پاشا خوێندیەوە، هێشتا ماوە و لەدیوانی وتارەکانی ئەودا پارێزراوە. بەزمانێکی زۆر پاراو و شیرین کەسەرنجی پاشای ڕاکێشاوە و لەئەنجامدا سەد ئەشرەفی و شاڵێکی تورمەیی کشمیری وەك دیاری و خەڵات و سپاردنی گوندی هیند یەمەنی پێدەبەخشن. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە بەمەبەستی گەڕان سەردانی قەڵای حکومەتی و مزگەوتی دارئەلئیحسان دەکەن و ساڵانە پێنسەد تمەن بەمەبەستی نۆژەن کردنەوە و ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە دیاری دەکات. میرەکان هەموو ساڵێك ئەو بڕە پارەیان وەرگرتووە بەڵام بۆ نۆژەن کردنەوەی قەڵای حکومەتی بەکاریان نەبردووە و سەرئەنجام ئەو شوێنە وێران و کاول بوو. لەڕۆژی سێیەمی هاتنی بۆ سنە، پاشا سەردانی ئەمانیەی کردووە و بەمەبەستی کات بەسەر بردن، زۆرانبازی لەنێوان شەعبانە ڕەشی پاڵەوانی تایبەتی پاشا و نادر پاڵەوانی کوردستان، سازداوە. شەعبانە ڕەش دێوێکی ترسناك و گەورە بووە. نادر کاتێك شەعبان بەرز دەکاتەوە و دەیخاتە سەر سەری، شەعبان هاواری لێ بەرز دەبێت و دەڵێت: گەورەم، مەهێڵە. پاشا بەخێرایی هاوار دەکات: کوردە

مەکە، کوردە مەکە. نادر بەرێزەوە شەعبان لەبەردەم پاشا دێنێتەخوار و سەری کوڕنوش دادەنەوێنێت. شا خەلاتێکی زۆر پێشکەش بەنادر دەکات. دوای سێ ڕۆژ مانەوە، کەژاوەی پاشا لەرێگەی گەڕووسەوە بەرەو ئازەربایەجان بەرێدەکەوێت. لەکوردستان بەهۆی ئاگادار نەبوونی دانیشتووان لەهاتنی کەژاوەی پاشا، کەسانی دەوروبەری پاشا نەیانتوانیوە کاتێکی خۆش بەسەر ببەن. میر لەجیاتی گەنم و جۆ، زێڕی سور و قرانی سپی بەکەژاوەکەی پاشا داوە، بەلام وەریاننەگرتووە. (ملك الشعرا) کە لەگەڵ پاشادا بووە، ئەم هۆنراوەی بۆ سەرکۆنە کردنی میی ئەردەلان هێناوەتە سەرزمان:

در شهر سنه، سلطان سه روز اقامت کرد

والی سنه، سینه آماج ملامت کرد

چون طبل میان خالی، بانگ است همه والی

عرضه که نبودش هیچ، عرض قد و قامت کرد

از بند بلا جستیم، از قحط و غلا رستیم

القصه سخن کوتاه، زن قحبه قیامت کرد))

واتاکەی: پاشا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەشاری سنە مایەوە، میر، خۆی کردە ئامانجی سەرکۆنە و توانج، هیچ کەلێهاتوویی و کارامەیی نەبوو، خۆیشی دەنواند و بەشان و باڵی خۆیدا هەڵدەدا، ، لەبەلا ڕزگارمان بوو، لەوشکەساڵی و قاتوقڕی ڕزگارمان بوو، بەکورتی، ئەو ژن قەحبەیە، هیچی بۆ نەکردین.

ناسرئەلدین شا، لەسەرەتاکانی سەڵتەنەتی خۆی، زیاد لەرادە تامەزرۆی گەشەپێدان و پێشخستنی ئێران بووە و دەیخواست لەهەموو ڕەهەندەکانەوە هۆکارەکانی گەشەکردنی وڵاتەکەی ئامادە بکات و سوپایەکی تەیار و ڕێکوپێك، دابمەزرێنێت و ئامێرەکانی دروست کردنی تۆپ و تفەنگ و دروستکردنی فیشەك و چنین و ڕێگەی ئاسان بنیات بنێت. بەلام بەداخەوە ڕووبەڕووی کۆسپ و تەگەرەی ناوەکی و دەرەکی بۆتەوە، لەهەستی خەڵکانیش بێ هیوا بووە و بەناچاری چاوی لەمەبەستەکانی خۆی پۆشیوە و کاتەکانی بەخۆشگوزەرانی بردۆتەسەر و کاروباری وڵاتی بەوەزیرەکانی سپاردووە و لەقووڵایی دڵەوە وتوویەتی: ئەم میلەتە، شیاوی ڕیسوایی و بەدبەختییە نەك ڕێز و شەرەف. هاوکات لەگەڵ ئەوەی پاشا لەکوردستانەوە بۆ ناوەند دەگەڕێتەوە، عومەر پاشای سەرداری ئەکرەم،

بەنوێنەرایەتی دەوڵەتی عوسمانی، ڕۆشتۆتە سەر سنووری کوردستان، میری بەمۆڵەت وەرگرتن لەپاشای ئێران، بەئامادەکاری تەواو، بەرەو مەریوان ڕۆشتووە. ئەم دوو سەردارە لەسنوور چاویان بەیەکدەکەوێت و دوای گۆڕینەوەی پەیمام و ئەنجامی کارە گرنگەکان، هەرکام بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕێتەوە.

لەناوەڕاستی مانگی شەعبانی ١٢٧٦ کۆچی، میرزا ئەبولقاسمی مستەوفی تەفرەشی وەك وەزیری کوردستان دیاریدەکرێت و دێتە ناو سنە و میرزا محەممەد ڕەزا لەو پێگەیە دوور دەخرێتەوە و بانگێشتی تاران دەکرێت. دوای یەك مانگ، میریش لەسەر کار لادەبرێت و نەجەف قولی خانی ئامۆزای کەفەرمانڕەوای جوانرۆ بووە، وەك جێگری حکومەت دەستنیشان دەکرێت. میر دوای ئەوەی لەسەر کار دوور دەخرێتەوە، لەگەڵ هەموو کەس و کار و خێزانەکەی بەرەو تاران دەڕوات. لەملاوە، نەجەف قولی خان دێتە ناو شارەکە و خان ئەحمەد خانیش لەسەرکردایەتی سوپا دوور دەخرێتەوە و محەممەد عەلی خانی سەقزی جێگەی دەگرێتەوە. دوای دوو مانگ، خەڵات و فەرمانی حکومەتی کوردستان، بۆ نەجەف قولی خان دەردەکرێت. نەجەف قولی خان، هەرچەندە گوێچکەی گران بووە، بەڵام زیاد لەرادە زیرەك و وشیار و بۆ چەندین ساڵی بەردەوام، ئارەزوومەندی فەرمانڕەوایی کوردستان بووە. ماوەی یەك ساڵ فەرمانڕەوایەتی کردووە. ئەوەی لەجوانرۆ کۆی کردبوویەوە، لەکاتی فەرمانڕەوایی، بەسەر خەڵکانی شاری سنەدا دابەشی دەکات. کۆتایی ساڵ لە١٥ ڕەمەزانی ١٢٧٧ کۆچی، لەسەر کار لادەبرێت و بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. لەوێ وەك سەرۆکی کێشکچییەکانی موزەفەرئەلدین میرزای جێگری پاشا، دەستنیشان دەکرێت و دەڕواتە ئازەربایەجان. دوای ئەوەی ساڵێك لەوێ دەبێت، دەمرێت.

غولام شا خان، دوای لەسەر کار لابرانی نەجەف قولی خان، دووبارە وەك میری کوردستان دیاریدەکرێتەوە و لە ٢٣ ڕەمەزان، هەواڵی فەرمانڕەوایی ئەو بەکوردستان دەگات. لەپێنجی شەوال، حسەین قولی خان، کوڕەکەی کە بەخانی خانان بانگیان کردووە، بەپێی فەرمانی دەرباری، وەك جێگری میری کوردستان، لەگەڵ دەستەیەك کوردستانی ڕەوانەی کوردستان دەکات و خۆی لەسەرەتاکانی زیقەعدە لەتارانەوە بەڕێدەکەوێت و لەناوەڕاستی هەمان مانگ دەگاتە سنە و دووبارە میرزا محەممەد ڕەزا وەك وەزیر دەستنیشان دەکتەوە و ماوەی سێ ساڵ، وەك میرێکی بەهێز، فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات.

لەساڵی ۱۲۸۰ کۆچی، مەلا فەتح اللەی قازی و مەلا محەممەد ئەمین ئەلئیسلام و مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام و مەلا محەممەدی ساڵح فەخر ئەلعولەما و دەستەیەکی دیکە لەزانا و پیاوە ناودارەکانی کوردستان، لەفەرمانڕەوایەتی میر و وەزارەتی میرزا محەممەد ڕەزا ناڕازی و بەمەبەستی سکاڵا کردن ڕێگەی تاران دەگرنەبەر. لەلایەن دەوڵەتەوە بەمەبەستی ئارامی و ئاسایشی دانیشتووان،ماڵیاتی گوندەکان، لەدیوانی دەوڵەتی دیاریدەکرێت و بۆ هەر گوندێك فەرمانێکی تایبەت دەردەکرێت. میرزا زەکی مستەوفی دیوانیش، بەپێی فەرمانی پاشا، وەك ڕاوێژکاری غولام شا خان و لێکۆڵینەوە لەچاکسازی کردن لەماڵیات، ڕەوانەی کوردستان دەبێت.

لەساڵی ۱۲۸۱ کۆچی، جارێکی دیکە بەهاندانی دانیشتووانی شار، سوڵتانەکانی هەورامان، ئاڵای یاخیبوون بەرز دەکەنەوە و پەلامارەکانی بۆ سەر ناوچەکانی دیکە دەستپێدەکەن. میرزا زەکی ئەم بارودۆخەی پێ پەسەند ناکرێت و دەربار لەهەموو ڕوداوەکان ئاگادار دەکاتەوە. لەلایەن دەوڵەتەوە، غولام شا خانی میر، لەگەڵ دەستەی زەفەری کوردستان و چوار تۆپ و سێ هەزار تفەنگچی، بۆ سەرکوت کردن و لەناوبردنی ئەوان دیاریدەکرێت. میر لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەڕێگەی جوانڕۆ بەرەو لهۆن بەڕێدەکەوێت و کاتێك دەگاتە گوندی پاوە، عەلی ئەکبەر خانی شەرفە ئەلمولك، لەگەڵ چەند دەستە سەرباز و تفەنگچی، وەك پێشەنگ دەستنیشان دەکات. شەرف ئەلمولەك لەگەڵ سوپاکەی ژێردەستی، بۆ کەنارەکانی سیروان ئەسپ غاردەدەن، لەهیرەوی ڕووبەڕووی پێشەنگەکانی هەورامان دەبێتەوە. دوای جەنگ و پێکدادانێکی کەم، هەورامییەکان توانای خۆڕاگرییان نامێنێت و شەرف ئەلمولك بەئاسوودەی لەسیروان دەپەڕێتەوە و میر لەم سەرکەوتنەی ئاگادار دەکاتەوە. میر بێ درەنگ لەگەڵ تۆپخانە و سوپاکەی پەیوەستی دەبێت. محەممەد سەعید سوڵتان کاتێك هەواڵی پەڕینەوەی سوپاکە لەسیروان دەبیستێت، بەخێرایی نەوسود بەجێدێڵێت و لەگەڵ کەسەکانی خۆی بەرەو شارەزوور بەڕێدەکەوێت و پەنا بۆ شێخ عەلی ئەبا عوبەیدە (عەبا عەبیلێ) دەبات. ماوەی سێ مانگ ئاڵای شێر و خورشید لەنەوسود بەرز کراوەتەوە و دواتر محەممەد سەعید سوڵتان لەگەڵ شێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شێخ عوسمان کەپیری سیلسیلەی نەقشبەندییەیە، لەگەڵ محەممەد پاشا سەرۆك عەشیرەتی جاف، پەنا بۆ میر دەبات. لەسەر تکا و داواکاری شێخ عەبدولڕەحمان و محەممەد پاشا و دانی سێ هەزار تمەن

جەریمــە و قــەرەبوو، محەممــەد ســەعید ســوڵتان دەبەخــشرێت وەك جــاران، دەبێتــەوە فەرمانڕەوای هەورامان و لهۆن و میر و سوپاکەی بۆ سنە دەگەڕێنەوە و دەربار لەم بارودۆخە ئاگادار دەکەنەوە. لەئەنجامدا دەکەوێتە بەر بەخششەکانی دەربار و نازناوی زیائەلمولکی پێدەبەخشرێت.

لەسـاڵی ١٢٨٢ کۆچـی، لەلایـەن دەوڵەتـەوە، ئەنـدازیارێك بـۆ دروسـت کردنـی قەڵایـەك لـە ناوچەی مەریوان دیاریـدەکرێت. لـەماوەی شـەش مـانگ قەڵایـەکی تۆکمـە و بەهێز دروست دەکات بەناوی قەڵای شا ئاباد. لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٢٨٣، غولام شا خـان و میرزا زەکـی وەزیر هەردووك بۆ تاران بانگدەکرێن و دوای مانگێك میر، گرفتاری نەخۆشییەکی کوشندە دەبێت. پزیشك تولوزان، پزیشکی پاشا، هەوڵەکانی بۆ چارەسەر کردنی دەخاتە گەڕ و چاك دەبێتـەوە. لـەم مـاوەدا کـەژاوەی پاشا بـەرەو خوراسان بەڕێدەکـەوێت و مـیر و مـیرزا زەکـی، مۆڵــەتی گەڕانــەوەیان پێــدەدرێت. دوای یــەك مــانگ دووبــارە نەخۆشــییەکی مــیر سـەرهەڵدەداتەوە. لـەنیوەڕۆی سێـشەممەی نـۆی جومـادی الثـانی ١٢٨٤، مـیری ئـەردەڵان دەمرێـت. غـولام شـا خـان کەسـێکی وشـیار و بیرتیـژ بـووە. لەشـەرم و حـەیا و زانـستیش بەناوبانگە. بیست ساڵی تەواو، فەرمانڕەوایەتی کوردستانی کردووە. ئەو کەسانەی ئەمڕۆ خـاوەن پلـە و پێگـەن، بـەهۆی کـار و کردەوەکـانی ئـەوە. مزگـەوتی دارئەلئـەمان ناسـراو بەمزگـەوتی میر، لـەبیناکانی ئـەوە بـەڵام لەبەر ئـەوەی بـەناوی حـاجی کـەریم خـانی شـێخی کۆتایی پێهێنا، یەك کەسیش نوێژی تیا نەخوێندووە. دانیشتووانی بازاڕیش کەنیوەڕۆیان یا ئێواران ڕۆشتوونەتە مزگەوتەکە، لەسەر کاشییەکان و لـەدەرەوە نوێژیان خوێندووە. بەم دوواییانـە حوجرەکانیـان کردۆتـە ئـەنباری دووکانـدارەکان و کەلوپەلـەکانیان لەوێـدا ئـەنبار دەکەن و مانگانە کرێیەك دەدەن. فراوان کردن و نۆژەن کردنەوەی ئیمام زادە پیر عومەر و نـۆژەن کردنـەوەی ئـەم دواییـەی ئەمانیـە و بـاخی حەسـەن ئـاوا، لەیادگارییـەکانی ئـەوە. ئارەزوویـەکی زۆری بـۆ کۆکردنـەوەی کتێـب و بەدەسـت هێنـانی زەوی و زار بـووە. دوای مردنی ئەو، زیاتر لەدوو هەزار کتێب لەکتێبخانەکەیدا بووە. خاوەنی زیاتر لەپەنجا پارچەی زەوی گرنگـی کوردستانیـشە بـەڵام لەبەرابـەردا هەشـتا هـەزار تمـەن قـەرزار بـووە. مـیر ئـەبو تالیبی ئیسفەهانی دووای مەرگی میر، بەماوەی شەش ساڵ، قەرزەکانی بۆ داوەتەوە. دوای مردنی میر، تا هاتنی موعتەمید ئەلدەولە، کاروباری حکومەت بەمیرزا زەکی وەزیر بووە.

## حکومەتی شازادە موعتەمید ئەلدەولە فەرهاد میرزا

دوای مردنی غولام شا خان، بەماوەی سێ مانگ، شازادە حاجی میرزای موعتەمید ئەلدەولە، مامی ناسرئەلدین شا، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا. میرزا زەکی و خانی خانان لەرێگەی گەڕوس بەرەو تاران بەرێدەکەون. موعتەمیدئەلدەولە، لەتاران، محەممەد عەلی خانی کوڕی ڕەزا قولی خانی میر کەخوشکەزای بووە، وەك فەرمانـدەی سوپای زەفەری کوردستان هەڵدەبژێرێت و لەتارانەوە بەرێدەکەوێت و لەڕۆژی هەینی، چواری زیقەعدەی ١٢٨٤ کۆچی، دەگاتە ناو سنە. لەڕۆژی گەیشتنی بۆ شارەکە، کەزۆربەی زاناکان و پیاوماقووڵانی شارەکە ئامادە بوون، لەناو وتەکانی خۆیدا دەڵێت: تا من لەکوردستاندا بم، درۆ لەگەڵ کەس ناکەم و چاوەڕوانم دانیشتووانی کوردستانیش درۆم لەگەڵ نەکەن. ئەگەری درۆی کەسێك لای من ئاشکرا ببێت، لای من وەك کەسێکی دوورخراوە و بۆ هەمیشە بەدرۆزنی ناودەبەم. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر دڵی دانیشتووان دادەنێت و بەڕاستیش تا ئەوکاتەی فەرمانڕەوای کوردستان بوو، ڕاستی و دروستی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە. دوای سێ مانگ فەرمانڕەوایی، شازادە موعتەمیدئەلدەولە، لەگەڵ ژمارەیەکی کەم، بەمەبەستی سەردانی مەریوان و بینینی قەڵای شائاباد، بەرەو ئەو سنورە بەرێدەکەوێت. حەسەن سوڵتانی هەورامی کەچەندین ساڵی بەردەوام دژی میرەکانی کوردستان شۆڕشی دەکرد، لەگەڵ بەهرام بەگ و مستەفا بەگی برای و هەزار تفەنگچی، دەڕۆنە لای فەرمانڕەوا. فەرمانڕەوا لەقەرەباڵغی و زۆری ژمارەی تفەنگچییەکانی حەسەن سوڵتان و کردەوەکانی ئەوان، لەناخەوە ڕەنجاوە. دەمەوئێوارێ، دەڕۆنە گوندی بیلەگ کەیەکێك لەگوندە سنوورییەکانی مەریوانە. مزگەوتی گوندەکە دەکەنە ماڵی شازادە. شەو لەمزگەوتەکەدا بەسەر دەبات. بەیانی بەزەین ئەلعابدینی خزمەتکاری فەرمان دەدات، پێنج شەش خزمەتکار و جەلاد لەچایخانەکەی مزگەوتەکەدا ئامادە بکات. کاتێك حەسەن سوڵتان وبراکانی بۆ خواردنەوەی چایی دێن، هەر سێکیان دەگرێت و حەسەن سوڵتان بەتەناف دەبەستێتەوە. زەین ئەلعابدین فەرمانەکانی شازادە جێبەجێ دەکات. نزیکەی هەزار تفەنگچی هەورامی لەبیست هەنگاوی مزگەوتەکە ریزیان بەستووە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی حەسەن سوڵتان دەکەن. لەناکاو خزمەتکارەکان جەنازەی حەسەن سوڵتانی بەڕاکێشان فڕدەداتە بەردەم تفەنگچییەکان. ئەو هەزار تفەنگچییە بەبینینی جەنازەی حەسەن سوڵتان بڵاوەی لێدەکەن و

هەرکام بەرەو شوێنێك هەڵدێت. شازادە دوای ئەم سەرکەوتنە، براکانی حەسەن سوڵتان دەبەستێتەوە و بەرەو سنە دەگەڕێتەوە. شازادە بۆ ئەم ڕووداوە هۆنراوەیەکی هەیە کەتیایدا باس لەدژواری ڕووداوەکە دەکات و خواوەند کارەکانی بۆ ئاسان کردووە.
ئەم ڕووداوە، کاریگەری لەسەر تایەفەکان و سنوورنشینەکان دادەنێت و هەموویان دەترسن و ملکەچ دەبەن. هەورامییەکانیش بەو هیوایەی دوو براکەی حەسەن سوڵتان ئازاد بکرێن، ملکەچی خۆیان نیشان دەدەن و ماوەی یەکسالْ بۆ ئازاد کردنی ئەوان تێدەکۆشن، پێشکەشی دەنێرن، خەڵکان و زاناکان دەکەنە دەستەبەر بەڵام بەداواکەیان ڕازی نابن و دوای بێ هیوایی لەڕزگاری دوو براکە، یاخیگەری و شۆڕشەکەی خۆیان دەستپێدەکەنەوە.
لەزستانی هەمان سالْ کە قەڵای شائابادی مەریوان بەهۆی چاودێری نەکردن، خراپ دەبێت، فەرمانی نۆژەن کردنەوەی لەلایەن دەوڵەتەوە دەگات. حاجی موعتەمیدئەلدەولە باقرخان، ئەوەی محەممەد حسەین خانی سەدری ئیسفەهانی، وەك فەرمانڕەوای مەریوان و نۆژەنکردنەوەی قەڵاکە دیاریدەکرێت. دوای گەیشتنی بۆ ناوچەکە هەورامییەکان بیر لەگرتنی دەکەنەوە تا بەهۆی ئەوەوە بتوانن براکانی حەسەن سوڵتان ئازاد بکەن. محەممەد باقرخان لەمەبەستەکەی ئەوان ئاگادار دەبێتەوە و پارێزگاری لەخۆی دەکات و شازادە لەپیلانەکەی ئەوان ئاگادار دەکاتەوە. شازادە بێ درکاندنی بابەتەکە، ڕۆژی هەینی ٢٣موحەرەمی ١٢٨٦ کۆچی، لەگەلْ ژمارەیەکی کەم لەکوردستانیەکان و سەد سەرباز، لەڕێگەی سورکولەوە بەرەو مەریوان بەڕێدەکەوێت. شەوی دووشەممەی ٢٦ ئەم مانگە، لەساری ناسراو بەساری شێخ سلێمان، لەنزیك گوندی ئەنجومەنە، خێوەت و بارەگا لێدەدات. هەورامییەکان بەگومانی ئەوەی نێچیرەکە کەوتۆتە تەڵەوە، نزیکەی هەزار تفەنگچی شەوانە خۆیان دەگەیێنە تەپۆڵکەیەکی نزیك شوێنەکەی شازادە و چاوەڕوانی هەڵاتنی خۆر دەکەن. ئەم هەواڵە (بێ ئەوەی لێی دڵنیابن) بەعەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك و میرزا ڕەزاعەلی دیوانی بەیگی و کوردستانییەکانی هاوڕێی شازادە دەگات و بەخێرایی شازادەی لێ ئاگادار دەکەنەوە. شازادە لەبەر غرورو و لەخۆباییبوون، باوەڕی نەکردووە. هەرچەندە کوردستانییەکان پێداگری دەکەن، ئەو زیاتر حاشا دەکات. سەرئەنجام بەهەرشێوەیەك بێت، شەو دەکەنە ڕۆژ. لەبەرەبەیاندا شازادە بانگیان دەکات و دەڵێت: بەخواستی خوا، هەتاو هەڵات و هیچ شوێنەوارێك لەدرۆکانی دوێشەو، نابینرێت. هێشتا وتەکانی کۆتایی

پێنەهاتووە کەدەنگی تەقەی هەورامییەکان بەرز دەبێتەوە و گوللە هاوشێوەی تەرزە دەبارێت. شازادە فەرمانی کۆبوونەوەی سوار و پیادە دەدات. سوار و پیادە لەهەر شوێنێکەوە سەردەردێنن،، دەبنە نیشانەی تیر و گوللەکان و دەکوژرێن. چەندین گوللە بەر خێوەتەکەی شازادە دەکەوێت و یەکێك لەخزمەتکارەکانی لەناو خێوەتەکەیدا پێوە دەبێت. گوللەیەك بەر شەرەف ئەلمولك دەکەوێت و بریندار دەبێت. لەگەڵ ئەمەیشدا شازادە ناخوازێت بەرێکەوێت. شەرف ئەلمولك دەزانێت، ترس لەریسوایی هەلاتن، رێگرە لەوەی شازادە هەڵبێت و گرنگی بەکوژرانی خۆی نادات، ناچار بەزۆر شازادە دەهێنێتەدەر و بەهەلاتن ناچاری دەکات. دوای کوژرانی دەستەیەك، شەرف ئەلمولك و شازادە و دەستەیەکی دیکە، سوار ئەسپەکانیان دەبن و رێگەی هەلاتن دەگرنەبەر. لەرێگەدا شازادە بۆ دڵنەوایی کردنی خۆی، ئەم هۆنراوەیە دێنێتە سەرزمان:

فليس الفرار اليوم عارا على الفتى

اذا عرفت منه الشجاعه بالامس

لەپشت سەری شازادە، سەربازە کوردستانییەکان بۆ ماوەی کاتژمێرێك بەرگری دەکەن. تا ئەوەی عەباس میرزا سوڵتانی رەمشتی و محەممەد بەگی جێگر و چەند کەسێکی دیکە لەسەربازەکان دەکوژرێن و دەستەیەك ئەسیر دەکرێن. دووان لەخزمەتکارەکانی شازادە کە لەناو خێوەتەکەدا بوون، لەکاتی هێرش کردنە سەر خێوەتی شازادە بەدەستی هەورامییەکان دەکوژرێن. بەگشتی لەهاوەلان و سوپاکەی شازادە ٣٦ کەس دەکوژرێت و ١٨ کەس ئەسیر دەکرێت. هەموو سامان و کەلوپەلی شازادە و خێوەتەکان دەکەوێتە دەست هەورامییەکان. سۆهرابە کەچەڵی هەورامی، عاباکەی شازادە لەبەر دەکات و سوار ئەسپەکەی شازادە دەبێت و چەند کەس پێش خۆی دەخات و بەمەبەستی لاسایی کردنەوەی شازادە بەکەسەکانی بەردەم خۆی دەڵێت (برۆن، برۆن، بێستن، لاچۆ، بۆ پێشەوە..) شازادە و هاوەلانی لەماوەی شەو و رۆژێکدا دەگەنە شاری سنە. شازادە بەهۆی ئەم رووداوە وەك شێری برینداری لێدێت و شەو و رۆژ لەخۆی دەناڵێت و دەرباری پاشا بەتەواوی لەرووداوەکە ئاگادار دەکاتەوە. پاشا لەم رووداوە توورە دەبێت و فەرمان دەدات سوپای هەمەدان و دوو دەستەی دیکە و هەزار سوار، بەفەرماندەیی موستەفا قولی خانی ئیعتیماد ئەلسەڵتەنە، بەرەو کوردستان بەرێکەوێت. سەرداری ئەم سوپایە کە پێکهاتووە لەسوپای هەمەدان و دوو دەستەی دیکە و

هەزار سوار، بەحاجی قەنبەر عەلی خانی سەعدئەلدەولە دەسپێرێت. شازادە پێش گەیشتنی سوپای ئامارژە پێدراو، محەممەد عەلی خانی سەرهەنگ، لەناوەراستی مانگی سەفەر لەگەڵ سوپای کوردستان و تفەنگچییەکانی بانە و سەقز و مەریوان و سێ تۆپ، بۆ دەشتی شامیان و دەربەندی کەڵوێی ڕەوانە دەکات. محەممەد عەلی خان، لەبەردەم دەربەندی کەڵوێ خێوەت هەڵدەدات. لەکۆتایی مانگی سەفەر، قەنبەر عەلی خانی سەعدئەلدەولە، لەگەڵ سەرکردەکان و سوپای دەوڵەتی دەگەنە شاری سنە. شازادە، بەپێی پێویست سوپاکە دەکاتە دوو دەستە، دەستەیەکیان بەفەرماندەیی حاجی قەنبەر عەلی خان بەرەو شامیان و هەورامان ڕەوانە دەکات تا پەیوەستی سوپاکەی محەممەد عەلی خانی زەفەر ئەلمولك ببن. دەستەیکی دیکەیش کەبریتی بووە لەسوپای هەمەدان و ئەفشار و تفەنگچییەکانی جوانرۆ، بەفەرماندەیی مستەفا قولی خان بۆ ئەوسود و سەرکوت کردنی محەممەد سەعید سوڵتان ڕەوانە دەکات. شازادە بەسوپاییەکان دەڵێت هەرکەس سۆهرابە کەچەڵ (زیندوو یا مردوو) بۆ من بێنێت، سەد تمەن و شاڵێکی کشمیری و خەڵات وەردەگرێت. لەبەرەبەیانێکدا، لەدەربەندی کەڵوێوە، هەورامییەکان لەناکاو هێرش دەکەن و محەممەد عەلی خانی زەفەر ئەلمولك بەهۆی ئاگری تۆپخانە و تەقەی تفەنگەکان، پاشەکشێیان پێدەکات و چەندین کەس لەهەورامییەکان دەکوژێت. لەسەربازەکانی سوپای زەفەری کوردستان، هەڵۆخانی سوڵتانی مناڵەکانی ئەردەڵان و جێگرێك و بیست کەسی دیکە دەکوژرێن و بریندار دەبن. ئەو ڕۆژە لەبەیانییەوە تا ئێواری، سوپای دەوڵەتی سەرقاڵی جەنگ و بەرگری کردن بووە و سەرئەنجام تاریکی شەو، هەردوو دەستەکە بەگەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان ناچار دەکات. لەلای جوانڕۆوە، محەممەد سەعید سوڵتان، پرد لەسەر ئاوەکە هەڵدەبەستێت و نزیکەی چوارسەد تفەنگچی بۆ کەنارەکانی سیروان دەنێرێت تا ڕێگرین لەپێشرەوی سوپای دەوڵەتی. سوپای دەوڵەتی کاتێك لەڕووباری سیروان نزیك دەبنەوە، لەبەر ئەوەی سەنگەری هەورامییەکان بەئاسانی دەیڕوانییە سەر سیروان، دەست بەتەقە کردن دەکەن. و ڕێگە نادەن سوپاکە لەڕووبارکە بپەڕنەوە. تینویەتی تەنگ بەسوپای دەوڵەتی هەڵدەچنێت و بەهەوڵ و بەدبەختی زۆر، دەست بەسەر کانییەکی نزیك ڕووبارەکەدا دەگرن. سەردارانی سوپا کاتێك دەبینن سوپاکەیان بەهیچ جۆرێك ناتوانێت بەڕۆژ لەڕووبارەکە بپەڕێتەوە، بەناچاری شەوی ٢١ ڕەبیع الثانی، ئیعتیماد ئەلسەلتەنە، لەتاریکی شەو کەڵك وەردەگرێت و بێ ئاگادار

کردنەوەی کەسانی دیکە، خۆی دەگەیێنێتە لێواری ڕووبارەکە و لەپشت سەنگەرە سروشتی و دەسکردەکان، بۆسە دادەنێت و چاوەڕوانی هەلاتنی هەتاو دەبێت. لەگەڵ هەلاتنی هەتاو کاتێك سوپای ئەفشار لەکارەکەی ئیعتیماد ئەلسەڵتەنە ئاگادار دەبنەوە، خوێنیان دێتە کوڵ و لەپشت بەرد و سەنگەرەکان دێنەدەر و بروسکە ئاسا خۆیان دەگەیێنە لێواری ڕووبارەکە و لەیەك ریزدا سەنگەر دەگرن. هەورامییەکان لەپشت تاشەبەردەکان دەمێننەوە و لەبەر ئاگری تۆپخانەی سوپای دەوڵەتی ناتوانن سەر بەرز بکەنەوە و لەبەر ئەمە ئاگایان لەنزیکبوونەوەی سوپاییەکان بۆ کەنار ڕووبارەکە نابێت. سوپاییەکانی هەمەدان کەمەلە کردنیان زانیوە، خۆیان لەڕووبارەکە داوە و پەڕیونەتەوە و هاوشێوەی کەو بەبەرد وسەنگەرەکاندا هەڵگەڕاون و ئاگری جەنگیان خۆشکردووە. گوللەی تۆپ و تفەنگی سوپاییەکان هاوشێوەی تەرزە بەسەر سەنگەری هەورامییەکاندا باریوە. بەکربەگی هەورامی، بەر گوللە تۆپێك دەکەوێت و هەپرون هەپرون دەبێت. ڕۆژی ٢٢ رەبیع الثانی، تفەنگچییەکانی هەورامان لەبەرەی جوانڕۆ کۆدەبنەوە و هێرشێکی سەراسەری دەکەنە سەر سوپای دەوڵەتی. ئەو بەشەی سوپا کە لەئاو پەڕیبویەوە، لەسەنگەرەکان و لووتکەی چیاکان جێگیر ببوون و دەستەکەی دیکە، لەو بەری ڕووبار مابوونەوە و سەرقاڵی دروستکردنی پردێك بوون تا بتوانن لەئاوەکە بپەڕنەوە. لەهەموو بەرەکان بەرپرچی هێرشی هەورامییەکان دەدەنەوە و ناچار بەپاشەکشێیان دەکەن. ڕۆژی ٢٣، سوپا بەگشتی لەئاو دەپەڕێتەوە و لەوبەرەوەی ڕووبارەکە بڵاو دەبنەوە و دەست بەسەر هەموو سەنگەرەکاندا دەگرن و شەو بەئاسوودەی بەسەر دەبەن. ڕۆژی ٢٤، شەپپوری بەڕێکەوتن لێدەدەن و بەموزیك و باڵەبان بەرەو نەوسود بەڕێدەکەون. لەڕێگە، رەحمان بەگ و عوسمان بەگ، کوڕەکانی محەممەد سەعید سوڵتان خۆیان نیشان دەدەن و دوای کاتژمێرێك جەنگ و پێکدادان، ئەوانیش ناچار بەپاشەکشێ و هەلاتن دەبن و سوپای دەوڵەتی سەرکەوتووانە، دەگاتە گوندی نەوسود کەپایتەختی لهۆنە و ئالای شێر و خورشید لەسەربانی ماڵی محەممەد سەعید سوڵتان بەرز دەکەنەوە. عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك، لەگەڵ تفەنگچییەکانی جوانڕۆ، لەم جەنگەدا، بوێری و ئازایەتی بەرچاوی لەخۆی نیشانداوە و تا گەیشتن بەنەوسود، پێشەنگ و پێشڕەو بووە و هۆکارەکانی پێشڕەوی سوپای دەوڵەتی ئامادە کردووە.

دوای گەیشتن بەنەوسود، شەرەف ئەلمولك، بۆ قەنبەر عەلی خان سەعد ئەلدەولە

دەنووسێت: ئێمە سێ کەس، کاری خۆمان کرد، ئێستا سەرەی تۆیە، ڕیشی خۆت بخورێنە. مەبەست لەسێ کەس خودی شەرەف ئەلمولك و ئیعتیماد ئەلسەڵتەنە و ئیقبال ئەلدەولەیە. لەگەڵ گەیشتنی نامەکەی شەرەف ئەلمولك بەدەستی قەنبەر عەلی خان کەبەهۆی دژواری هەردوو دەربەندی کەڵوێ و دزڵی، نەیتوانیبوو یەك هەنگاو بڕواتە پێش، خوێنی دێتەکوڵ و فەرمان دەدەت سوپای کوردستان و تفەنگچییەکانی سەقز و بانە و سوپاکەی دیکە، شەوانە هێرش بکەنە سەر هەورامانی تەخت. لەو کاتەدا خالید بەگ و عەبدولڕەحمان بەگی هەورامی، لەگەڵ چەند کەس لەپیاوەکانی خۆیان، کەپێشینەیەکی خراپ و دژایەتیان لەگەڵ تایەفەی حەسەن سوڵتاندا بووە، دەڕۆنە لای محەممەد عەلی خان و بەڵێن دەدەن سوپای دەوڵەتی لەو ڕێگەی خۆیان شارەزان، ببەنە ناو دزڵی. شەوی ٢٨ ڕەبیع الثانی، پێنج هەزار سوار و پیادە لەگەڵ سەران و سەرکردەکانی سوپا، بەڕێنوێنی خالید بەگ و ڕەحمان بەگ، بەڕێدەکەون و لەڕێگەی ویە، کەڕێگەیەکی باریك و نائاسایی بووە، هەڵۆ ئاسا، لەتاریکی شەودا بەبەرد و چیاکەدا هەڵگەڕاون و لەسەر لووتکەی چیاکانەوە هاوشێوەی بەڵای ئاسمانی بەسەر دزڵیدا باریون. دەمەوبەیان، بەدەنگی شەیپوری سوپای دەوڵەتی، خەڵکان لەخەو هەڵدەستن و بەچاوی خەواڵو و ترساو دەردەپەڕن. کاتێك ورددەبنەوە، دەبینن هەموو پشت تاشەبەرد و سەنگەرەکان و بەرزاییەکانی باکوری دزڵی، بەدەست هێزەکانی دەوڵەتەوەیە و هیچ ئومێد بۆ بەرنگاری نەماوەتەوە. بەناچار دانیشتووانی دزڵی دەبنە دوو دەستە، دەسەیەکیان لەگوندەکەدا دەمێننەوە و دەستەیەك ڕوودەکەنە گرد و تەپۆڵکەکانی باشوری دزڵی و بەرگری کردن دەستپێدەکەن. هەموو تفەنگچییەکانی هەورامانی تەخت کەبەرەو لهۆن ڕۆشتبوون و لەوێ لەسوپای دەوڵەتی شکستیان خواردبوو، لەگەڵ تفەنگچییەکانی لهۆن، بەدەم هەڵاتن و پاشەکشێ کردنەوە ڕوویان دەکردە هەورامانی تەخت تا لانی کەم بتوانن پارێزگاری لەدزڵی بکەن. کاتێك لەگرتنی دزڵی ئاگادار دەبنەوە، بەگشتی هێرش دەکەنە سەر دزڵی و ئاگری جەنگ بەتەواوی بڵێسە دەسەنێت و هەورامییەکان بوێرانە، گۆڕەپانی جەنگ دەکەنە شوێنی بەزم و ڕەزم. لەسەر هەر بەردێك و لەسەر هەر بەرزاییەك، دەهۆڵ لێدەدەن و فوو بەکەڕەنادا دەکەن. شێخ کەدو، پێستی کەدوێك دادەماڵێت و فووی پیادەکات. دەستەیەك لەهەورامییەکان لەدەوری کۆدەبنەوە و خەڵك بۆ جەنگ و بەرگری کردن هان دەدەن. لەناکاو گوللەیەك بەر شێخ دەکەوێت و دەکوژرێت. شێخ کەدوو

ئەو کەسەیەی لەڕۆژی ٢٦ موحەرەم، کاتی گەمارۆ خستنە سەر شازادە، ئالأیەکی بەدەستەوە گرتبوو و بەئاهەنگێکی تایبەت ئەم هۆنراوە کوردییەی بۆ شازادە خوێندبوویەوە:

(ئاهیر مەوارو، وەیت لادەر لەشەڕ، نە سەوزەمە مانو، نە وشك و نە تەڕ): واتاکەی: ئاگر دەبارێت، خۆت لادە لەشەڕ، نەسەوزی دەمێنێتەوە، نەوشك و نەتەڕ.

لەپشت سەری شێخ کەدو، بەهرام میرزا بەگ، کوڕی محەممەد بەگی هەورامی، کەبکوژی حاجی شێخ عەبدولکەریم بووە، هاتوهاوار دەستپێدەکات و پەیوەستی شێخ کەدو دەبێت. سەرئەنجام زەفەر ئەلمولك لەدەنگی دەهۆڵ و کەرەنای هەورامییەکان تووڕە دەبێت و لەگەڵ سوپای زەفەر و تفەنگچییەکانی بانە و سەقز، وەحشیانە بەمەبەستی کوشتن و کوژران، هێرش دەبات. لەم هێرشەدا، دانیشتووانی هەورامان ناچار بەبەجێهێشتنی سەنگەرەکانیان دەکات و بەرەو هۆش بەدرانی پاشەکشێیان پێدەکات و دەست بەسەر ئەو ناوچەیەشدا دەگرێت و بەتەواوی شکستیان پێدێنێت و زۆربەیان بەرەو شارەزوور هەڵدێن. سەری بەهرام بەگ و شێخ کەدو و چەندین سەری دیکە و ئەسیرەکان، وەك مژدەی سەرکەوتن بۆ شازادە دەنێرێت. شازادە، دەربار لەم سەرکەوتنە ئاگادار دەکاتەوە و بۆ سەرکردەکان و گیانبەخشەکان و سوپاییەکان، داوای هاوکاری و بەرز کردنەوەی پلەوپایە دەکات. بۆ هەموویان نیشان و مانگانەی زیاتر دیاریدەکرێت و پلە و پێگەیان بەرز دەکرێتەوە و مۆڵەتیان پێدەدرێت بۆ ناوچەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. شێخ عەبدلڕەحمان، مامی نووسەر، چۆنیەتی ئەم جەنگ و سەرکەوتنەی تۆمار کردووە.

دوای ئەم سەرکەوتنە، شازادە بڕیار دەدات، بەردەوام چوار دەستە سەرباز لەهۆش بەدرانی بمێننەوە. ماوەی یەکساڵ هەورامییەکان بەهیوای گۆڕانی باروذۆخ لەشارەزوور دەمێننەوە و سەرئەنجام پەنا بۆ تکا و تکاکاری دەبەن. یەکەم کەس ئەحمەد سوڵتان، برای محەممەد سەعید سوڵتان، هاوسەری کافیە خانم، بەجلوبەرگی گۆڕا و ڕوخسارێکی نەناسراو، دەڕواتە ماڵی شێخولئیسلام و ئەو دەکاتە تکاکاری خۆی. شازادە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کەسانی دیکە، بەتکای شێخولئیسلام ڕازی دەبێت. هەورامییەکان کاتێك ئەم هەواڵە دەبیستن، دڵگەرم و هیوادار دەبن. محەممەد سەعید سوڵتانیش، پیرۆزخانمی هاوسەری کەژنێکی جوان و قەشەنگ بووە، بەهۆی شەرەف ئەلمولکەوە ڕەوانەی دەرباری شازادە دەکات. شازادە بەتکای

پیرۆزخانم و شەرەف ئەلمولك ڕازی دەبێت و ئەمانیان پێدەبەخشێت بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە.
دوای چەند ڕۆژ محەممەد سەعید سوڵتان پەنا بۆ ئاخورەکەی شازادە دەبات و لەلایەن شازادەوە دەبەخشرێت. لەگەڵ گەڕانەوەی ئەو، بەهرام بەگ، باوکی مەحمود خانی دزڵی برای حەسەن سوڵتان کە لەگەڵ مستەفا بەگی برای باوکی عەباس قولی سوڵتان، لەزیندان مابوونەوە، دەمرێت. میرزا ڕەزا عەلی دیوان بەگی، لەم هەلە کەڵك وەردەگرێت و تکا بۆ مستەفابەگی برای دەکات و کەسێك دەنێرێت تا کەس و کارەکەی بۆ شار بێنن. شازادە بەتکای دیوان بەگی ڕازی دەبێت و مستەفا بەگ تەسلیم بەدیوان بەگی دەکات. لەلایەن دەوڵەتیشەوە حەوتسەد تمەن بۆ ئەو و کەسەکانی دیاریدەکرێت تا لەشار بۆ بژێوی خۆیان خەرجی بکەن.
لەم ناوەدا سۆهرابە کەچەڵ، بەبیانوی ئەوە بابەتێکی گرنگی بۆ وتن هەیە و دەبێت خۆی شازادەی لێ ئاگادار بکاتەوە، دەڕواتە لای شازادە و دەڵێت: بیستوومە فەرمانتان داوە هەرکەس سۆهرابە کەچەڵ بەزیندووی یا مردووی بۆ من بێنێت، سەد تمەن و شاڵێکی کشمیری و خەڵاتی دیکەی پێدەبەخشیت. شازادە دەڵێت: بەڵێ من وتوومە. سۆهرابە دەڵێت: ڕۆژی هاتنتان بۆ کوردستان وتتان تا لەکوردستان بیت، درۆ ناکەیت. دەڵێت: بەڵێ، ئەو بەڵێنەم داوە. سۆهراب دەڵێت: من سۆهرابە کەچەڵم و هەنووکە بەزیندووی هاتوومەتە لای تۆ. شازادە لەم کارەی ئەو خۆشحاڵ دەبێت و فەرمان دەدات سەد تمەن و شاڵێکی کشمیری پێبدەن و ئەو دەکاتە یەکێك لەخزمەتکارە تایبەتییەکانی خۆی.
دوای ماوەیەك عەلی ئەکبەر خان شەرەف ئەلمولك بۆ فەرمانڕەوایی جوانڕۆ دەستنیشان دەکرێت. شازادە بەنهێنی پێی دەڵێت محەممەد سەعید سوڵتان بۆ فەرمانڕەوایی لهۆن لەگەڵ خۆی ببات و بەڵای ئەو دوور بخاتەوە. شەرەف ئەلمولك، فەرمانەکەی شازادە جێبەجێ دەکات و محەممەد سەعید سوڵتان لەگەڵ خۆی دەبات. محەممەد سەعید سوڵتان کەکەسێکی دورئەندێش و وشیار بوو، لەم پێشهاتە کەبێ داخوازی ئەو بیری لێکراوەتەوە، گومان لا دروست دەبێت. لەبەر ئەمە لەناو ڕێگە بەردەوام چەندین کردەوەی لەخۆی نیشانداوە بۆ ئەوەی ڕاستییەکانی بۆ ئاشکرا ببێت، هەندێ کات فەرسەخێك پێشکەوتووە و هەندێ کات فەرسەخێك دواکەوتووە تا بزانێت شەرەف ئەلمولك بەدوایدا دەگەڕێت یا نە. شەرەف ئەلمولکیش کەسێکی خاوەن ئەزمون بووە و لەم کردەوانەی ئەو، نەشڵەژاوە و نیگەرانی

بەرابەر پێشکەوتن یا دواکەوتنی ئەو، نیشاننەداوە تا ئەوەی سەرئەنجام دەگەنە جوانڕۆ. لەوێ، ڕێزی زۆری دەگرێت. بۆ ئەوەی عەبدولڕەحمان بەگی کوڕی کەفەرمانڕەوای ئەوسود بووە، بخاتە تەڵەوە، بەنهێنی بەمحەممەد سەعید سوڵتان دەڵێت: نامە بۆ عەبدولڕەحمان بنێرە تا بێت و لای من بمێنێتەوە و تۆیش بەخەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی لهۆن، بڕۆیتە ئەوسود. محەممەد سەعید سوڵتان دوای ئەوەی لەڕێگە دڵنیا دەبێت، ئەم کارە بەشتێکی سادە لەقەڵەم دەدات و فەرمان بۆ کوڕ و کەسەکانی دەنێرێت لەماوەی دوو ڕۆژدا لەجوانڕۆ بن. مەلا ئەحمەدی نەودشی لەگەڵ ئەوان بۆ بینینی شەرەف ئەلمولك دێت. دوای هاتنیان، شەرەف ئەلمولك، پیاوەکەی خۆی، سەیفور بەگ، کەهەموو نهێنییەکانی خۆی دەدرکێنێت، بانگ دەکات و بەشێوەیەکی نهێنی پێی دەڵێت: دەستەیەك لەنۆکەرەکان ئامادە بکە، کاتێك محەممەد سەعید سوڵتان و کوڕەکانی دێنە لای من، نۆکەرەکان ببنە دوو دەستە و لەنێوان خۆیاندا شەڕ بکەن و هەردوو دەستەکە بەمەبەستی سکاڵا کردن بێنە لای من. من بەمەبەستی تەمێ کردنی ئەوان لەژوورەکە دەڕۆمەدەر. دواتر نۆکەرەکان محەممەد سەعید سوڵتان و کەسەکانی قۆلبەست و زنجیر بکەن.

سەیفور بەگ، فەرمانەکەی ئەنجام دەدات. دوای گرتنیان، یەك یەك لەگۆڕەپانی بەردەم تەلاری حکومەتی، تیرباران دەکرێن. شەرەف ئەلمولك، شازادە لەم پێشهاتە ئاگادار دەکاتەوە. شازادە بۆ ئەم خزمەتەی، نازناوی شەرف ئەلمولك و سەرتیپی و نیشانی لەدەوڵەت بۆ وەرگرتووە و بۆی دەنێرێت. دوای کوشتنی محەممەد سەعید سوڵتان و بنەماڵەکەی، ئارامی و ئاسایش بۆ هەورامان دەگەڕێتەوە.

لەکاتی گرتن و بردنەدەرەوەی محەممەد سەعید سوڵتان، مەلا ئەحمەدی نەودشی و مەلا عەزیزی هەورامی کە لەدانیشتنەکەدا ئامادە بوون، دوای چەند کاتژمێرێك لەچەند و چۆنی ڕووداو و پیلانەکە ئاگادار دەبنەوە و دەڕۆنە لای شەرەف ئەلمولك و پرسیاری لێدەکەن. شەرەف ئەلمولك بروسکەی دەوڵەتییان نیشان دەدات کەبەپێی فەرمانی دەوڵەتی ئەو کارەی ئەنجامداوە و لەهەمان شوێن فەرمان بەمەلا عەزیز دەدات، جەنازەکان بشوات و کفن و دفنیان بکات.

ئەگەر هەموو وردەکارییەکانی چالاکییەکانی شازادە موعتەمیدئەلدەولە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بنووسین، چەندین لاپەڕەی دیکە لەم کتێبە داگیر دەکات بۆیە

بەکورتی ئامارژە بەچەندین کار و کردەوەی دیاری ئەو دەدەین:
یەکێك لەچالاکییە گرنگەکانی وەك ئاماژەمان پێدا، گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش بۆ هەورامان و لەناو بردنی سوڵتانەکانی بوو کە لەسلێمانی تا شاری سنە لەژێر دەسەڵات و کاریگەری ئەواندا بوو، تەنانەت لێپرسراوانی ئێرانی و عوسمانی، لەسنوری دەسەڵاتی ئەواندا نەیاندەتوانی بەئاسانی کارەکانیان ڕاپەڕێنن. فەرمانڕەوا دەوڵەتییەکانیش لەبەر ئەوەی پابەندی ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی دەوڵەت نەبوون و گرنگییان بەئارامی و ئاسایشی ناوچەکە نەدەداوە، بۆ شاردنەوەی ناکارامەیی و بێ دەسەڵاتی خۆیان، ئەم کێشەیان شاردۆتەوە و دەوڵەتەکانیان لێ ئاگادار نەدەکردەوە. شازادە بەپێچەوانەی هەموو فەرمانڕەواکانی دیکە، بەم ڕیسواییە ڕازی نەبووە و بەوشێوەی ئاماژەمان پێدا، هۆکارەکانی لەناوبردن و سەرکوت کردنی ئەوانی ئامادە و دەوڵەتی ئێران و عوسمانی لەبەڵای هەورامییەکان ڕزگار کرد.
یەکێکی دیکە لەکارەکانی ئەوە بوو دانیشتووانی کوردستان بەردەوام لەدەستدرێژی و ستەمی خراپەکارانی ویلایەتەکان لەئازاردابوون و لەلایەن ئەوانەوە ستەمیان لێدەکرا. شازادە بەچارەئەندێشی و کردەوەیەکی بوێرانە، کوردستان و کوردستانییانی لەبەڵا و شەڕی دراوسێکانی ئاسوودە کرد و ئارامی و ئاسایشی بەتەواوی بۆ ئەم سەرزەمینە گەڕاندەوە. بۆ نمونە بۆ بچووکترین سەرپێچی کەخانەکانی کەلیایی ئەنجامیاندابوو، پیاوماقوولەکانی ئەوانی قۆڵبەست و زیندانی کرد. بەمشێوەیە خانەکانی ئەفشار و کرماشان و گەڕوس، دەستیان لەستەم و دەستدرێژییەکانی خۆیان هەڵگرت. یەکێکی دیکە لەکارەکانی بۆ کوردستان ئەمەیە: دانیشتووانی کوردستان لەدەست عەشیرەکانی جاف کەزیاتر لەدوانزە هەزار بنەماڵە بوون، بێزار ببوون و لەکاتی گەرمین کاتێك جافەکان دەهاتنە خاکی کوردستان، دانیشتووانی شار و گوندەکانی سارالْ و هوباتو و خوڕخوڕە و تیلەکۆ و سەقز و مەریوان، لەستەم و دەستدرێژییەکانی ئەوان ئاسوودە نەبوون چوونکە ئەم تایەفە لەدزی و خراپەکاری ناسراو و بۆ دڕینی پەردەی ناموس و کوشتاری خەڵکان و لەناو بردنی ئاوەدانییەکان و تاڵان کردن، کەمتەرخەمییان نەدەکرد. چەندین ساڵ ئەم تایەفە بەهاوبەشی لەنێوان دەوڵەتی ئێران و عوسمانیدا دەژیان. بەپێی پەیماننامەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە، ئەم تایەفە لەکاتی مانەوە لەخاکی ئێران، وەك دانیشتووی ئێران لەقەڵەم دەدران و لەکاتی

مانەوە لەخاکی عوسمانی وەك دانیشتووی ئەو وڵاتە. هەروەها لەپەیماننامەکەدا هاتووە ئەم تایەفە سەربەستن لەوەی لەکام وڵاتە بمێننەوە و دەتوانن یەکیان هەڵبژێرن. هەرکات هەموویان یا دەستەیەکیان بخوازێت، ببێتە هاووڵاتی ئەو وڵاتە، دەوڵەتەکەی دیکە هیچ مافێکی نامێنێت. ئەم تایەفە چەندین ساڵ بەپێی ئەو پەیماننانە، سیاسەتی وشترمرییان بەرابەر بەو دوو دەوڵەتە نیشاندەدا، کاتێك لەسنوری دەوڵەتی عوسمانیدا بوون خۆیان بەهاووڵاتی ئێران و کاتێك لەئێران بوون، خۆیان بەهاووڵاتی عوسمانی نیشاندەدا. لەپاییز و زستان کەکاتی کوێستان کردنی ئەوانە، دێنە چیاکانی کوردستان و خێوەت هەڵدەدەن و لەو ماوەدا، برە پارەیەکیان لەبری بەکاربردنی لەوەڕگا، بەفەرمانڕەوای کوردستان دەدا بەڵام ئەم برە پارە لەڕاستیدا خوێنبایی ڕەخنە و ناموسی مسێکنەکانی کوردستان و مۆڵەتی هێرش و پەلامارەکانی عەشیرەی جاف بووە کەچیتر کەس لەبەرابەر ئەوان خاوەن گیان و سامان نەبووە و مسکێنە هەژارەکان لەترسی ئەوان، بەردەوام سەرگەردان و ئاوارە بوون. ئەو هەژارانە سکاڵایان بۆ هەر شوێن و کەسێك بەرز دەکردەوە، کەس گرنگی پێنەدەدان و دادی وەرنەدەگرتن.

شازادە، ئەم بارودۆخەی بۆ دەربار نووسی و بەپێی فەرمانی دەوڵەت، بەشێوەیەکی ڕەسمی بەسەرۆکەکانی تایەفەی جاف دەڵێت دەبێت ببنە هاووڵاتی ئێران و هاوشێوەی هەموو تایەفەکانی دیکە، لەناو خاکی ئێراندا نیشتەجێ بن یا ئەوەی جارێکی دیکە روو لەسنوورەکانی ئێران نەکەن. سەرۆکەکانی جاف، دوای ئەم ئاگادار کردنەوە، پەرێشان دەبن و بەدانی برە پارەیەك ئەو ساڵە بەسەر دەبەن تا بۆ ساڵی داهاتوو خۆیان یەکلایی بکەنەوە. بەهاری ساڵی داهاتوو، شازادە سوپایەك ئامادە دەکات و ڕەوانەی ئەو دوو ناوچەی دەکات کەجافەکان لێوەی دەهاتنە ناو خاکی ئێران تا ڕێگە نەدەن جافەکان لەسنورەکانی ئێران نزیك ببنەوە. دەستەیەکیان بەرەو ناوخان و دەستەیەکیان بەرەو مەریوان و ڕۆژهەڵات و ئەمیر ئاوا دەڕۆن. کاتێك جافەکان دەگەنە سەر سنور، لەهەموو ناوچەکانەوە ڕێگەیان لێ دەبەستن. سەرئەنجام بەپاڕانەوە، تۆمارێك بۆ شازادە دەنێرن و بەڵێن دەدەن زەرەر و زیان لەکەس نەدەن و ساڵانە دوانزە هەزار تمەن وەك حەقی لەوەڕگا پێشکەش بکەن. شازادە بەداواکەیان ڕازی نابێت جافەکان دوای ئەوەی دەبینن بەزێڕ و پارە ناتوانن هیچ بکەن، دەیانەوێت هێز بەکار ببەن. شەڕ و ئاژاوە دەستپێدەکات و ئاگری جەنگ لەنێوان جافەکان و

هێزەکانی سەر سنور بڵێسە دەسێنێت. دوای جەنگ و پێکدادانێکی کەم، جافەکان شکست دەخۆن و بۆ ناوچەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. مسێکنەکان و گوندنشینەکان لەو ساڵە لەدەست جافەکان ڕزگاریان دەبێت. لەو ساڵە بەدواوە، سوپای دەوڵەتی بۆ ڕێگرتن لەهاتنی جافەکان بۆ ناو خاکی ئێران، ڕەوانەی ئەو دوو ناوچە دەکران. گوندنشینەکان دەستیان بەنۆژەن کردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان کرد و گوندێك وەك پاداشتی خزمەتەکانی شازادە، ناودەنێن فەرهادئاوا. لەناوچەی ڕۆژهەلآت و ئەمیر ئاوا بەپێی فەرمانی شازادە، بۆ سوپای دەوڵەتی قەلآیەك بنیات دەنێن و ناوی دەنێن لەشکرئاوا.

مێژووی گرتنی هەورامان و مێژووی دروستکردنی قەلآکە، خوالێخۆشبوو میرزا عەلی ئەکبەری مێژوونووس، ناسراو بەسادق ئەلمولك، نووسەری (حدیقەی ناصری) تۆماری کردووە و بۆ هەرکام، قەسیدەیەکی جیاوازی نووسیوە. دێری کۆتایی هەرکام لەوان ئەمەیە:

گرتنی هەورامان

(گفت از شهر ربیع الثانی، ارصد کم کنی

هفت بفزایی، شود تاریخ فتح ات آشکار)

واتاکەی: لەمانگی رەبیع ئەلثانی ئەگەر سەد کەم بکەیتەوە و حەوتی پێ زیاد بکەیت، مێژووی گرتنی هەورامان ئاشکرا دەبێت.

دروستکردنی قەلآی لەشکرئاوا

(نوشت خامەی افسر بە سال تاریخ اش

بە سعی معتمدالدوله قلعه شد آباد)

واتاکەی: پێنوسی ئەفسەرێك لەو ساڵەدا نووسی بەهەوڵی موعتەمید ئەلدەولە قەلآی لەشکرئاوا، ئاوەدان بوویەوە.

یەکێکی دیکە لەکارەکانی موعتەمیدئەلدەولە: لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٢٨٧ کۆچی ئەخۆشی کۆلێرا لەکوردستان دەردەکەوێت، سێ مانگ درێژە دەکێشێت و گیانی ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووان دەگرێت. لەسەرەتاکانی ساڵی ١٢٨٨ کۆچی، وشکەساڵی و قاتوقڕی دەستپێکردووە و جگە لەهەژارەکان و مسکێنەکانی شار و گوندەکان، لەناوچەی خەمسە و میهرەبان، نزیکەی چوارهەزار بنەماڵە، هێرش دەکەنە سەر خاکی کوردستان و ترس و دڵەڕاوکێ لای دانیشتووان دروستدەکات. ئەوانەی گەنمیان پاشەکەوت کردووە، ئەم هەلە

دەقۆزنەوە و نرخەکەی بەرز دەکەنەوە و لەناکاو، لەخەرواری دوو تمەنەوە بۆ دوانزە تمەن بەرز دەبێتەوە و ژیان لەهەژار و نەدارەکان دژوارتر دەبێت. شازادە سەرەتا، دەستەیەك لەهەژارە کۆچبەرەکان بەسەر دەوڵەمەندەکان و بەتواناکان دابەش دەکات و خۆیشی ئەرکی بەخێوکردن و دابین کردنی بژێوی دەستەیەکی گرتۆتە ئەستۆ و لەبەر ئەوەی هەوا سارد بووە، گەرماوێکی بەمەبەستی نیشتەجێ کردنی ئەوان بەکرێ گرتووە و شەو وڕۆژیان لەوێ بەسەر بردووە. لەگەڵ ئەم کارانەی شازادە، بۆچوونی بازرگانەکان و خاوەن مڵکەکان نەگۆڕاوە و نرخەکان دانابەزێت. ناچار شازادە شوێنێکی تایبەت بەخواردەمەنی دروست دەکات و ڕەوانە کردنی دەهەزار تەغار گەنم دەخاتە سەر شانی خاوەن مڵکەکان تا لەبری وەرگرتنی یەك تمەن، تەسلیمی دەوڵەتی بکەن. خاوەن گەنمەکان لەم بڕیارەی شازادە پەشۆکاو و پەرێشان بوون و هەرچەند هەوڵیانداوە لەڕێگەی جۆاوجۆر بڕیارەکەی شازادە بگۆڕن، شازادە ڕازی نەبووە. سەرئەنجام لەماوەیەکی کەمدا، خاوەن گەنمەکان ناچار دەبن هەموو گەنمە داواکراوەکە ڕەوانە بکەن. ئەم گەنمە ڕۆژانە بەسەر نانەواکاندا دابەش کراوە و بەمشێوەیە نرخی نان لەیەك من دوو هەزار بۆ دوو عەباسی دابەزیوە کەدەستیش نەدەکەوت و بەفراوانی دەستکەوتووە. هەرچەند پێش گەیشتنی گەنمەکە، زیاتر لەسێ هەزار کەس لەهەژارەکان و پەناهێنەران لەئەنجانی قاتوقڕی و ساردی هەوا و نەخۆشی کوڵێرا، لەناوچوون بەڵام دوای گەیشتنی گەنمەکە، هەموو هەژارەکان ئاسوودە و گیانیان بەسلامەتی دەرباز کردووە. شازادە هەموو خەرجییەکانی کفن و دفنی مردووەکانی گرتۆتە ئەستۆ.

یەکێکی دیکە ئەوەی لەکۆنەوە نەریتی خانوو بژاردن کەدەرماڵانەیان پێوتووە، لەسنە باو بووە. بەو واتایە کەساڵانە خانووەکانی شاریان بژاردووە و لەهەرماڵێك بەئەندازەی توانایی ماڵەکە، بڕە پارەیەکیان وەرگرتووە و بەمپێیە ساڵانە زیاتر لەپانزە هەزار تمەن کۆکراوەتەوە. شازادە ئەم بڕە پارەی لەسەر داوای حاجی مەلا محەممەدی ئەییری کەیەکێك لەزاناکان و خۆپارێزەکانی کوردستان بووە، لەمزگەوتی دارئەلئیسحان بۆ کاری پێویست، تەرخان کردووە.

یەکێکی دیکەی ئەوەی جیاوازی کێشەکان لەکوردستان بۆتە هۆی ئاژاوە و کێشە لەئاڵوگۆڕەکاندا. شازادە موعتەمید ئەلدەولە، بۆ نەهێشتنی ئەم کێشە و جیاوازییە، نزیکەی هەزار مەنی هاوتای نۆسەد مسقاڵ لەئاسن دروستکردووە و لەشار و گوندەکانی دەوروبەر

بڵاوی کردۆتەوە و هەنووکەیش ئەو کێشە و وەزنە لەکوردستان باوە و کاری پێدەکرێت.
یەکێتر ئەوەی لەبەردەم قەڵای حکومەتی، بۆ سوپای پیادە، سەربازخانەیەکی دروستکردووە کەتوانای جێبوونەوەی دەستەیەك سەربازی هەیە. نەقارەخانە کە لەرۆژئاوای ئەم سەربازخانە جێگیرە، لەبیناکانی ئەمان اللە خانی گەورەیە و هەموو ڕۆژێك لەکاتی ئاوابوونی هەتاو لەوێ، نەقارە و کەرەنای نادرییان لێداوە.
لەبەهاری ساڵی ١٢٨٩ کەناسرەئەلدین شا سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردووە، شازادە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی و وەرگرتنی پێگەی جێگری سەڵتەنەت بۆ تاران بانگدەکاتەوە. میرزاحەسەن خانی سەدرئەعزەم بۆی دەنووسێت: گەورەم، هەرچەند دەزانم دوژمنی تۆم لەدڵدا چاندووە، میوانێکی خانەخوێ کوژم لەماڵەکەی خۆمدا جێکردۆتەوە.
شازادە لەنەبوونی خۆی جێگری حکومەتی کوردستانی بەکوڕەکەی خۆی، شازادە عەبدولعەلی میرزای ئیحیشام ئەلمولك سپاردووە و پێگەی وەزارەتیش بەحاجی میرزا ئیسماعیل خانی عەلی ئابادی دەسپێرێت و خۆی ڕێگەی تاران دەگرێتەبەر. لەم ساڵەدا ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووانی کوردستان گرفتاری نەخۆشی بەلەفیرە و سکچوون دەبن و دەمرن. کەسانی وەك مەلا ئەحمەدی شێخولئیسلام و ئیسماعیل خان کوڕی خوسرەوخانی ناکام و میرزا نادری مستەوفی باشی و ئەسەد اللە خانی وەکیل و ئاغا لوتف اللەی دیوان بەگی و دەستەیەکی دیکە لەپیاوماقووڵان و ئەشراف زادەکان بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە مردوون.
دوای گەڕانەوەی پاشا لەسەفەری دەرەوەی وڵات بۆ ناوەندی دەسەڵات و لەکاتی لەسەر کار لابردنی حسەین خانی سەدری ئەعزەم کەوردەکارییەکانی لەمێژووی ئێراندا ئاماژەی پێدراوە، شازادە بۆ کوردستان دەگەڕێتەوە و دوای شەش مانگ مانەوە، لەمانگی سەفەری ساڵی ١٢٩١ کۆچی، لەحکومەتی کوردستان دوور دەخرێتەوە و لەڕۆژی چوارشەممەی ٢٨ سەفەر بەڕێدەکەوێت و شازادە تەهماسبی میرزای مۆئەیید ئەلدەولە لەجێگەی ئەو وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە. خوالێخۆشبوو سادق ئەلمولکی مێژوونووس ئەم هۆنراوەی خوارەوە سەبارەت بەڕۆشتن و هاتن، ڕۆشتنی فەرهاد میرزای موعتەمید ئەلدەولە و هاتنی تەهماسب میرزای مۆئەیید ئەلدەولە نووسیوە:
(از تخت جلال رفت فرهاد

تهماسب به جای او مکان یافت)

واتاکەی: فەرهاد تەختی فەرمانڕەوایەتی بەجێهێشت و تەهماسب جێگەی ئەوی گرتەوە.

لەتــەختی فەرمانڕەوایــەتی (جــلال) کــە١٤٦٤، فــەرهاد کــە ٢٩٠ه، دەربکرێــت، ١١٠٤ دەمێنێتــەوە. حکومــەتی شــازادە موعتەمیـد ئەلدەولـە، مێـژووی لەناوچـوونی میرنـشینی ئەردەڵانــە چــوونکە لــەم مێـژووە بـەدواوە چـیتر کـەس لەئەردەڵانییـەکان لەسـەر کورسـی فەرمانڕەوایەتی دانانیشێت.

### حکومەتی شازادە تەهماسبی میرزای مۆئەیید ئەلدەولە

شازادە تەهماسبی میرزای مۆئەیید ئەلدەولە، لەکرماشان فەرمانڕەوا بووە و لەساڵی ١٢٩١ بەپێی فـەرمانی دەربـاری، کوردسـتان پەیوەسـتی کرماشـان کـراوە و بەنوێنەرایـەتی شـازادە تەهماسب، شازادە محەممەد شەریف بۆ ڕاگەیاندنی ئەم هەواڵە ڕەوانەی کوردستان دەکرێت و خۆی بەدوای ئەودا ڕێگەی کوردستان دەگرێتەبەر. لەدەیـەی کۆتـایی ڕەبیع الاوەلی ١٢٩١ دەگاتـە نـاو سـنە. ئـەم شـازادە خـاوەن زانسـت و کەسـێکی بەخـشندە و چاکەخواز بـووە و لەگەورەیی و ڕێزداریدا پێش کەسانی هاوڕۆژگاری خۆی کەوتۆتـەوە. لەهـەموو کێشەکانی ویلایەتەکەی ژێر دەسەڵاتی و کێشەکانی خەڵك، ڕاوێژی بەمیرزا ئەرەستوی وەزیـری کـردووە و محەممـەد مەهـدی مـیرزای کـوڕی لەهەمەدانـەوە گەڕاندۆتـەوە وەك جێگـری فـەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشانی کردووە. بەڕەزامەندی میرزا ئەرەستو، قەواڵەی ماڵیاتی و شتەکانی دیکـەی لەعـەلی ئەکبـەر خـانی شـەرەف ئـەلمولك وەرگرتـووە و وەزارەت و پێگـەی ڕاوێژکاری میرزا محەممـەد مەهـدی پێـسپاردووە و خـۆی بەمەبەسـتی بینـینی قـەڵای شـائاباد ڕەوانـەی مـەریوان دەبێـت. چـەند ڕۆژێـك لـەوێ دەمێنێتـەوە و بـۆ شـاری سـنە دەگەڕێتـەوە و لـەوێوە روودەکاتە کرماشان. لەهاتن بۆ کوردستان تا گەڕانەوەی بۆ کرماشان، نزیکەی دوانزە هـەزار تمـەن دەبەخـشێت. محەممـەد مەهـدی مـیرزا بـەئامادە نـەبوونی بـاوکی، لـەژێر چـاودێری و وەزارەتی شـەرەف ئـەلمولك، فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکات. ئەم کەسە چوونکە پێشتر لەقوتابخانـە سـەرقاڵی خوێنـدن بـووە و لەڕاپەڕانـدنی کاروبـاری دەوڵـەتی شـارەزا نـەبووە، ڕشـتەی کاروبارەکـان لێـك دەپـچڕێت و شـیرازەی کارەکـان دەشـێوێت. سنورنـشینەکان و سەرۆکی تایەفەکان بەهاندانی خەڵکانی شار، ئاڵای شۆرش بەرز دەکەنەوە و لەدانیشتووانی شـاریش، ئەوانـەی نـەیاری شـەرەف ئـەلمولك بـوون، ئـاگری ئاژاوەکـەیان خۆشـتر کـردووە و

کرێکارەکان و کەسانی بازاڕیان بۆ شۆڕش و ئاژاوە نانەوە و قەربالغی هانداوە و چەند بابەتێکیان کردۆتە بیانوو و هێرشیان کردۆتە سەر بینای حکومەتی. تایەفەی چاردۆلی کە لەو کاتەدا ئامادەی خزمەت کردن بوون و نۆکەری شازادەیان دەکرد، بەرگرییان کردووە و لەبەرابەر قەرەبالغی خەڵکان دەوەستنەوە. بازنەی شەڕ و پێکدادان گەورەتر دەبێت و چەندین کەس لەتایەفەی چاردۆلی و دانیشتووانی شار دەکوژرێن و دەستەیەکیش بریندار دەبن تا ئەوەی سەرئەنجام زاناکان و پیاوماقوولانی کەخۆیان هەڵگیرسێنەری ئاگری ئاژاوەکە بوون، نێوەنجیگەری دەکەن و بلاوە بەدانیشتووان و دەرباری پاشا لەم ڕووداوانە ئاگادار دەکەنەوە. لەئەنجامی ئەم گەمەیە، شازادە مۆئەیید ئەلدەولە لەحکومەتی کرماشان و کوردستان دووردەخرێتەوە و شازادە ئیمام قولی میرزای عیمادئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای کرماشان و کوردستان دەستنیشان دەکرێت.

## حکومەتی شازادە ئیمام قولی میرزای عیماد ئەلدەولە

شازادە ئیمام قولی میرزای عیماد ئەلدەولە لەساڵی ١٢٩٢ کۆچی، وەك فەرمانڕەوای کوردستان و کرماشان دیاریدەکرێت و لەکاتی بەڕێکەوتن لەتارانەوە، گەورەکان و پیاوماقوولانی کوردستان بۆ هەمەدان بانگ دەکات. عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك و میرزا محەممەد ڕەزای وەزیر و چەند کەسێکی دیکە لەگەورە پیاوانی کوردستان بەرەو هەمەدان بەڕێدەکەون و چاویان بەشازادە دەکەوێت. لەدانیشتنی دووەم قەواڵەی مالیات و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کوردستان لەشەرەف ئەلمولك و میرزا محەممەد ڕەزا کەسەرچاوەی ئاژاوە و دووبەرەکی بووە، وەردەگرێت و شازادە حیشمەت ئەلسەڵتەنەی کوڕی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکات. کوردستانییەکان لەگەڵ کەژاوەی حیشمەت ئەلسەڵتەنە بۆ کوردستان دەگەڕێنەوە و عیماد ئەلدەولە خۆی بەرەو کرماشان بەڕێدەکەوێت.

شازادە مۆئەیید ئەلدەولە لەکاتی گەڕانەوە بۆ تاران، نزیکەی زیاتر لەحەڤدە هەزار تمەنی زیاتر لەمالیاتی ڕەسمی کوردستان لەقەڵەمداوە. ناسرئەلدین شا دە هەزار تمەنی بەمەبەستی کەمکردنەوەی قورسایی لەسەر شانی دانیشتووان لەبەرچاو نەگرتووە و حەوت هەزار تمەنەکە پەیوەستی مالیاتی کوردستان دەکات و بۆ حیشمەت ئەلدەولە فەرمانی دەرباری دەردەچێت کەمالیات بەشێوەیەکی یەکسان دابەش بکات. دوای سێ چوار مانگ، عیماد ئەلدەولە لەکرماشان گرفتاری نەخۆشییەکی کوشندە دەبێت و حیشمەت ئەلدەولە بۆ

لای خۆی بانگ دەکات. حیشمەت ئەلدەولە، شەرەف ئەلمولك وەك جێگری خۆی لەکوردستان دیاریدەکات و خۆی ڕێگەی کرماشان دەگرێتەبەر. زۆری پێناچێت عیمادئەلدەولە دەمرێت و فەرمان و خەڵاتی فەرمانڕەوایی کوردستان و کرماشان لەلایەن دەربارەوە بۆ حیشمەت ئەلدەولە، ڕەوانە دەکرێت. لەم ساڵەدا بەڵای کوللە لەکوردستان دەردەکەوێت، دانیشتووان پەرێشان و دەشڵەژێنێت و شیرازەی بارودۆخی کوردستان دەپچڕێت. میرزا محەممەد ڕەزای وەزیر، ئەم هەلە دەقۆزێتەوە و تۆمارێکی نهێنی کە لەخۆگری سکاڵا و گازندەی دانیشتووان لەچۆنیەتی حکومەتی شەرەف ئەلمولکە، بەزانا و پیاوماقووڵان مۆر و ڕەوانەی دەرباری ئێرانی دەکات. بەدوای ئەم تۆمارە، دەستەیەك لەزاناکان وەك مەلا محەممەد مەهدی ئەمین ئەلئیسلام و مەلا محەممەد ئەمین و کەسانیتر، ڕێگەی تاران دەگرنەبەر.

لە ٦ سەفەری ١٢٩٣ کۆچی، غولام ڕەزا خانی شەهاب ئەلمولك، نەوەی میرزا حسەین خانی نیزام ئەلدەولەی شاهسەوەند، بۆ خەڵات و فەرمانڕەوایەتی کوردستان دیاریدەکرێت. ڕۆژی گەیشتنی زاناکان بۆ تاران، شەهاب ئەلمولك لەتارانەوە بەرەو کوردستان بەڕێدەکەوێت. دوای گەیشتنی بەشاری سنە، شەرەف ئەلمولك ترسی لێدەنیشێت و دوای یەك حەفتە بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت و لەئارامگای عەبدولعەزیم نیشتەجێ دەبێت. زاناکانی کوردستان دوای بینینی پاشا، مەلا محەممەد مەهدی ئەمین ئەلئیسلام بەنازناوی شێخولئیسلامی و مەلا محەممەد ئەمینی مامی، نازناوی ئەمین ئەلئیسلامی پێدەبەخشرێت. هەرکام لەزاناکانیش خەڵات و نازناوێکی دیکەیان پێدەبەخشرێت و بەرەو کوردستان دەگەڕێنەوە.

### حکومەتی غولام ڕەزا خانی شەهاب ئەلمولک

غولام ڕەزا خانی شەهاب ئەلمولك لەسەفەری ١٢٩٣ فەرمانڕەوای کوردستانی پێدەبەخشرێت و لەرەبیع الاوەل دەگاتە شاری سنە و لەباخی خوسرەوئاباد کە لەدووسەد هەنگاوی باشوری ڕۆژئاوای شارەکە جێگیرە، نیشتەجێ دەبێت. دوای یەك حەفتە دەڕواتە تەلاری حکومەتی. میرزا ڕەسولی قەزوێنی مستەوفی دیوان کەیەکێك لەخزمەتکارەکانی بووە، پێگەی وەزارەتی پێدەبەخشرێت و کاروباری ماڵیاتی و ویلایەتی بەو دەسپێردرێت. میرزا ڕەسولْ بەهۆی زیرەکی و دوورئەندێشی، لەماوەیەکی کەمدا ئاشنای بارودۆخی ناوچەکە و سیاسەت دەبێت. شەهاب ئەلمولك دیوان خانەی لەکوردستان دامەزراندووە تا کاروباری

ویلایەتی لەوێ چارەسەریان بۆ بکرێت. بۆ سنوورەکانی ناوچەکەیش کارگوزاری دیاریکردووە و ئەوانی لەگەڵ خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی ڕەوانە کردووە. لەو کاتەدا کە حاجی حەیدەربەگی وەکیلی مەریوان، باوەگەورێی مەحمودخانی کانی سانان، مەبەستی ئاژاوە و یاخیبوونی لەسەردا بووە، محەممەد تەقی خانی ئەردەڵانی وەك فەرمانڕەوای مەریوان دیاریکردووە تا قۆڵبەست و ڕەوانەی سنەی بکات. ئەم کارە ئاسایشی سنوورەکانی زیادکردووە و ڕێگەکان ئەمن بووە. زاناکانی کوردستان کە لەتاران بوون، گەڕاونەتەوە و لەبەخششەکانی ئەو کەڵکیان وەرگرتووە. شەهاب ئەلمولك هاوشێوەی سەرۆك خێڵ و عەشیرەت لەگەڵ دانیشتووانی کوردستان مامڵەی کردووە و ڕێزی لەزانا و سەییدەکانیان گرتووە. لەهەموو ژەمەکانی نیوەڕۆ و شەو، سفرەیەکی گەورەی ڕاخستووە و ژمارەیەکی زۆر لەسەر خوانەکەی ئامادە بوون. شاعیر و ئەدیبەکانی خۆشویستووە و هانیداون. لەبەخشیندا هیچ سنوورێکی نەناسیوە. شەرەف ئەلمولك وەك ئامارژەمان پێدا، لەترسی شەهاب ئەلمولك هەڵات و لەشازادە عەبدولعەزیم نیشتەجێ دەبێت. لەدەرئەنجامی چەندین هۆکارە ئەو شوێنە بەجێدێڵێت و لەلایەن دەربارەوە ڕێزی لێدەگیرێت و لەتاران دەمێنێتەوە. ناوەڕاستەکانی ساڵ، دەستەیەك لەبەزاز و بازارییەکانی کوردستان بەهاندان و هەڵخراندنی دەستەیەك لەگەورەپیاوان، چاو لەچاکییەکانی شەهاب ئەلمولك دەپۆشن و ئاژاوەیەك دەنێنەوە و لەئیمام زادە پیر عومەر کۆدەبنەوە. هاندەرانی ئەم ئاژاوە، ئۆباڵەکەی دەخەنە ئەستۆی شەرەف ئەلمولك و شەهاب ئەلمولك ناچار دەکەن نامەیەك بەم ناوەڕۆکە بۆ دەربارە بەرز بکاتەوە. شەرەف ئەلمولك بەهیچ جۆرێك ئاگاداری ئەم ڕووداوە نەبووە، کاتێك پاشا و کەژاوەکەی لەیەیلاقەکانی لار و شەهرستانەك بووە، نامەکەی شەهاب ئەلمولکی بەدەست دەگات. پاشا بەخێرایی چەند کۆیلەیەك دەنێرێت تا شەرەف ئەلمولك لەتاران قۆڵبەست و زیندانی بکەن. کەسێك لەئاشناکانی کە لەناو کەژاوەکەی پاشادا بووە، بەخێرایی دەگەڕێتەوە و شەرەف ئەلمولك لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە. ئەویش بەناچاری بۆ ئارامگای شازادە عەبدولعەزیم دەگەڕێتەوە و گۆشەگیر دەبێت. شەهاب ئەلمولك، ئاژاوەگێڕان بێدەنگ و دڵنیایان پێدەبەخشێت و بەمشێوەیە لەئیمامزادەکە دێنەدەر.

شەرەف ئەلمولك کەسێکی سادە، دڵپاك و واقیع بین بووە. لەگەمە سیاسییەکاندا تەنیا بەسەرکەوتنی ڕووکەش و سەنگەرگرتن قەناعەتی کردووە و هیچ کات بیری لەپاراستنی

سەنگەر نەکردۆتەوە بۆیە هەمیشە لەگەڵ ئەوەی توانای زاڵبوون و سەرکەوتنی بووە، شکستی خواردووە و بەزاوە. بەپێچەوانەوە میرزا محەممەد ڕەزا بەردەوام لەئەندێشەی بەدەستهێنانی سەرکەوتندا بووە و لەکۆتا پلەکانی ڕیسوایی و نزمی، ڕێزداری و پێگەی بەدەستهێناوە لەبەر ئەمە شەرەف ئەلمولك هەمیشە لەبەرابەر ئیرادە و خواستی ئەو، وەك با بووە و ڕێگەی نەداوە لەهیچ شوێنێکی ئێران بۆ یەك ساتیش ئاسوودە بێت. وەك ئاماژەمان پێدا شەرەف ئەلمولك کەڕۆحیشی ئاگای لەو کێشە و ئاژاوەیە نەبوو، لەتاران هاوشێوەی کەسێکی ڕیسوا و زەلیل ژیانی بەسەر دەبرد. تەنانەت جارێك دەبینێت میرزا محەممەد ڕەزا خۆی ئاژاوە و هەرا دژی حکومەت دەنێتەوە و تۆمەتەکەی دەخاتە پاڵ شەرەف ئەلمولك و ئەو لەتاران بەگۆشەگیری ناچار دەکات و خۆیشی بۆتە تکاکاری ئاژاوەچییەکان و ئەمانیان بۆ وەردەگرێت. لەسەرەتاکانی زستانی ئەمساڵە، حکومەتی کوردستان و کرماشان بەشازادە سوڵتان موراد میرزای حیسام ئەلسەڵتەنە دەسپێردرێت.

## حکومەتی شازادە سولتان موراد میرزای حسام ئەلسەلتەنە

دوای ئەوەی حکومەتی کوردستان و کرماشان لەکۆتاییەکانی ساڵی ۱۲۹۳ بەنەوابی والا، شازادە سوڵتان موراد میرزای حیسام ئەلسەڵتەنە دەسپێردرێت، بەپێی فەرمانی دەوڵەت، شەهاب ئەلمولك وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەمێنێتەوە و ئاگادار دەکرێتەوە لەژێر دەسەڵات و وەك جێبەجێکاری فەرمانەکانی حیسام ئەلسەڵتەنە، فەرمانڕەوای کوردستان بکات. کاتێك شازادە لەتارانەوە بەڕێدەکەوێت، خوسرەوخانی کوڕی ڕەزا قولی خان و شەرەف ئەلمولك لەگەڵ خۆی دەگەڕێنێتەوە و لەکاتی گەیشتنی بۆ کرماشان، بەپێی فەرمانی دەوڵەت، خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی بۆ شەهاب ئەلمولك ڕەوانە دەکات. شەهاب ئەلمولك سوپاس و پێزانینی پێویست بۆ خەڵات و فەرمانەکەی شازادە دەرنابڕێت. شازادە لێی دڵگران و بیر لەدوورخستنەوەی ئەو دەکات و سەرئەنجام شەهاب ئەلمولك دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لە فەرمانڕەوایەتی کوردستان بەدەربار رادەگەیەنێت و لەدەیەی دووەمی ڕەبیع الاوەلی ۱۲۹٤ بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. شەهاب ئەلمولك لەحکومەتی کوردستان، هاوشێوەی کەسێکی داوێنپاك و دڵسۆز هەڵسوکەوتی کردووە و بەشێکی زۆری سامانەکەی بەخشیوە. خێوەتێکی گەورەی بۆ حسەینییەی کوردستان (پرسەخانە) بەبەهای هەشتسەد تمەن دروست کردووە. لەبەردەم دەروازەی حکومەتی و سەرتەپۆڵە، قەراوڵخانەی

بنیاتنـاوە و مەبەسـتی ئـەوەی کـردووە لەهـەموو ناوچـەکانی شـار، قەروالْخانەیـەك دروست بکات بەلاّم قەزا و قەدەر، لەگەلْ ئەودا سازگار نەبووە چوونکە شازادە حیسام ئەلسەلْتەنە لەرۆشتنی شەهاب ئەلمولك ئاگادار دەبێتەوە و هەموو زانا و پیاوماقولاّنی کوردستان بەپێی پێشنیاری شـەرەف ئـەلمولك بانگێـشتی کرماشـان دەکـات. لـەم کاتـەدا مـەلا لوتـف اللـەی شێخولئیسلام و مەلا عەلی قازی و چەند کەسێکی دیکە لەزاناکانی کوردستان بەمەبەستی پـشتیوانی کردنـی شـەرەف ئـەلمولك لەکرماشـان بـوون تـا وەك فـەرمانڕەوای کوردسـتان دیاریبکـەن و بەگشتی کاروبـاری فەرمانڕەوایـەتی ئـەو ئامـادە کـراوە بـەلاّم خـودی شـەرەف ئەلمولك وەك پێشتر ئامارژەمان پێدا، لەبەر نییەت پاکی، ویستوویەتی ئاژاوە و دووبەرەکی کوردستان لەسەر دەستی شازادە لەناو بچێت و هیچ کێشە و لەمپـەرێك بۆ فەرمانڕەوایەتی ئـەو نـەمێنێت. بەپێـچەوانەی چـاوەڕوانی ئـەو، مـیرزا محەممـەد ڕەزای وەزیـر و مـیرزا عەبدولغەفاری موعتەمیدی برای کەپێشینەی دوژمنایـەتی لەگـەلْ شـەرەف ئەلمولکدا بووە، زۆربەی زانا و کەسە دیارەکانی شارەکەیان پەیوەستی خۆیان کردووە و پێکەوە و یەکدەنگ دژایەتی خۆیان لەگەلْ شەرەف ئەلمولك و مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام دەردەبڕن و شەش ڕۆژ پێش دەسپێکردنی جەژنی سەلْتەنەتی، بەرەو کرماشان بەڕێدەکەون. خەرجی ڕێگە و خواردنی زاناکان لەلایەن میرزا محەممەد ڕەزا و میرزا عەبدولغەفارەوە دابین دەکرێت. شێخ محەممـەدی فەخرولعولـەما کـە لەنووسین و داڕشتن، کەسێکی بـێ هاوتـای ڕۆژگـاری خـۆی بـووە، وەك سـەرۆکی شـێخەکانی مـەردۆخ دیـاریکراوە و شـێخ عەبـدولمۆئمینی پێـشنوێژ (باوکی نووسەر) و شێخ عەبدولڕەحمانی برای کەهـەردووك کەسانێکی زمان پاراو و خاوەن عـەقلْ بـوون، لەگـەلْ فەخرولعولـەما هـاوڕا و هـاودەنگ بـوون. مـەلا محەممـەد مەهـدی شێخولئیسلام وەك سەرۆکی ئەوان لەگەلْ هەموو زاناکـان بەڕێکەتوون. کاتێك لەکرماشان نزیك دەبنـەوە و شـازادە لـەهاتنی ئـەوان ئاگـادار دەبێتـەوە، مۆئەییـد ئەلدەولـەی کـوڕی بـۆ پێـشوازی ئـەوان دەنێرێـت. لەبـەر ئـەوەی مـالْی شـازادە لەعەمادییـە بـووە، بـۆ زاناکـانی کوردسـتان نزیکـەی پـەنجا خێـوەت لەعەمادییـە هەلْدەدەن. کـاتی گەیـشتنیان بەعەمادییـە، هـەموویان پێکـەوە چـاویان بەشـازادە دەکـەوێت. شـێخ محەممـەدی فەخرولعولـەما وتارێـك پێشکەش دەکات و شازادە شەیدا و شێتی وتـەکانی دەبێـت. دواتر یـەك یـەك هاوڕێکـانی خـۆی دەناسـێنێت. هـەموویان لەلایـەن شـازادەوە ڕێزیـان لێـدەگیرێت و پێکـەوە مۆلْـەتی

ڕۆشتنیان پێدەدرێت و دەڕۆنە ناو ئەو خێوەتانەی بۆ حەوانەوەی ئەوان ئامادە کراوە. ڕۆژی بیستەمی مانگی رەبیع الثانی ١٢٩٤ کەڕۆژی نەورۆزی سوڵتانی بووە، شازادە بەڕێزەوە دادەنیشێت و کوردستانییەکان لەچەپ و ڕاستی خۆی دادەنیشێنێت. دەستەی شێخ محەممەدی فەخرولعولەما لای ڕاست و دەستەی مەلا لوتف الله لای چەپ دادەنیشن و بەرابەرەکەیان زوهەیر ئەلمولکی کرماشانی بووە. لەکاتی ئەم سلاوەدا شەش هەزار کوردستانی و کرماشانی و سەرکردەکانی سوپا ئامادە بوون و دوای کۆتایی هاتنی ڕێوڕەسمەکە، میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلمولك کە لەناو دەستەی میرزا محەممەد ڕەزا بووە، قەسیدەیەك دەخوێنێتەوە و لەلایەن شازادەوە دەسخۆشی لێدەکرێت و شاڵێکی کشمیری وەك خەڵات پێدەدات. لەکۆتایی ڕێوڕەسمەکە، شێخ محەممەدی فەخرولعولەما، بەڕاشکاوی بەنوێنەرایەتی دانیشتووانی کوردستان، ناڕەزایەتی خۆی لەحکومەتی شەرەف ئەلمولك دەردەبڕێت و دواتر مۆڵەتی ڕۆشتنیان پێدەدرێت. چیتر دەرفەتی بەرگری کردن و بەرپەرچدانەوە بەمەلا لوتف الله نادرێت و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، لەخێوەتەکە دێتەدەر. شازادە دوای ئەوەی دەبینێت گەورە پیاوان و زاناکانی کوردستان بەگشتی بەفەرمانڕەوایی شەرەف ئەلمولك ناڕازین، ئەبولفەتح میرزای مۆئەیید ئەلدەولەی کوڕی خۆی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکات و میرزا ڕەزای مونشی باشی خۆی وەك وەزیر و لەگەڵ کوردستانییەکان، بەرەو کوردستان ڕەوانەیان دەکات. دوای گەیشتنیان بەکوردستان لەلایەن شازادەوە فەرمان دەگات تا شەرەف ئەلمولك وەك فەرمانڕەوای جوانڕۆ دەستنیشان و ڕەوانەی ئەو ناوچە بکرێت. هەرچەند بۆ نەڕۆشتن پێداگری دەکات ئەنجامی نابێت و بەناچاری ملی ڕێگە دەگرێتەبەر. خوسرەوخان لەلایەن شازادەوە وەك فەرمانڕەوای سەقز دیاریدەکرێت. ئەبولفەتح میرزا بۆ شار و ناوچەکانی سەرسنور کارگوزار دەستنیشان و ڕەوانەیان دەکات. کاروباری ویلایەتیش لەسەر دەستی میرزا ڕەزای مونشی باشی و میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلمولك، بەڕێوەبرێت. ماوەی دوو ساڵ بەمشێوەیە کاروباری حکومەتی بەڕێوەدەبرێت تا ئەوەی میرزا یوسفی مستەوفی باشی بیر لەپێگەی وەزارەت دەکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستە، لەگەڵ کەس و کارەکەی خۆی ڕێگەی کرماشان دەگرێتەبەر. شازادە پێگە و پلەی وەزیری پێدەبەخشێت و میرزا ڕەزای وەزیر بۆ ناوەندی حکومەت بانگ دەکرێت. سادق ئەلمولك بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. میرزا یوسف بەئاسوودەیی کاروباری

وەزارەت رادەپەڕێنێت. کاتێک ئەم هەواڵە بەشەرەف ئەلمولک دەگات، چیتر ناتوانێت خۆڕاگری بکات و بەرەسمی داوای بینینی حیسام ئەلسەڵتەنە دەکات. دوای وەرگرتنی مۆڵەت دەڕواتە کرماشان و هەرچەند هەوڵ بۆ لابردنی میرزا یوسف دەدات، بەڵام هیچ ئەنجامێکی دەستناکەوێت. ناچار نامەنووسین بۆ سادق ئەلمولک دەستپێدەکات و تا کاتی دوورخرانەوەی حیسام ئەلسەڵتەنە، شەرەف ئەلمولک، هەموو نیگەرانی و دەردە دڵەکانی خۆی بۆ سادق ئەلمولک دەنووسێت و داوا دەکات بەهەر شێوەیەک بووە، ئەو بانگێشتی تاران بکەنەوە. دوای دەرکردنی مۆڵەت، بێدرەنگ بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت و لەرەبات کەریم بەهۆی ئەم هۆنراوەوە، لەرێگەی بێتەلەوە، داوای سادق ئەلمولک دەکات: زۆر چاوەڕوان بووم، ئەی یار ئەگەر تۆ دەتوانیت خۆڕاگر بیت، من تاقەتم نەماوە. چاوەڕوانم لەزووترین کات خۆتان بەرەبات کەریم بگەیێنن. سادق ئەلمولک بەخێرایی بەڕێدەکەوێت و لەرەبات کەریم دەگاتە لای شەرەف ئەلمولک. دوای گۆڕینەوەی بیرورا و هەواڵەکان، بڕیار دەدەن بۆ سەلامەت بوون لەبەڵای حیسام ئەلسەڵتەنە، هەردووکیان لەماڵی میرزا حسەین خانی سوپا سالاری گەورە، دادەبەزن. دوای دڵنیابوون لەئەنجامی گفتوگۆ و ڕاوێژەکەیان، هەردووکیان بەرەو تاران بەڕێدەکەون و ڕاستەوخۆ لەماڵی میرزا حسەین خان دادەبەزن. میرزا حسەین خان بەڵێنیان پێدەدات و دواتر شەرەف ئەلمولک بۆ لای میرزا یوسف خانی مستەوفی ئەلمەمالیک دەنێرێت. ئەویش شەرەف ئەلمولک بۆ لای حیسام ئەلسەڵتەنە دەنێرێت، حیسام ئەلسەڵتەنە، لەماڵەکەی خۆی پێشوازی لەشەرەف ئەلمولک دەکات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، چاکە و میهرەبانییەکانی لەگەڵ ئەو زیاد دەکات. دوای حەفتەیەک، نەیارەکان، دڵی حیسام ئەلسەڵتەنە لەشەرەف ئەلمولک پیس و ڕەش دەکەن و بیر لەگرفتار کردنی ئەو دەکاتەوە و بەنهێنی بەدەستی میرزا عەلی خانی ڕاوێژکاری خۆی، پاشا لەم بابەتە ئاگادار دەکاتەوە کە لەو کاتەدا لەئێیلاقی مازەندەران بووە. میرزا عەلی خان دوای حەفتەیەک، فەرمانی گرتنی شەرەف ئەلمولک وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە. بەڕێکەوت میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلمولک، شەوانە لەشوێنێکەوە گوزەر دەکات کەمیرزا عەلی خان لەگەڵ میرزا عەلی نەقی ئاسفی برای سەبارەت بەگرفتار کردنی شەرەف ئەلدەولە بەشێوەیەکی نهێنی گفتوگۆ دەکەن. لەبەر ئەوەی سادق ئەلمولک لەتاریکدا بووە، نەیانبینیوە. میرزا عەلی نەقی هەوڵ دەدات هەمان شەو شەرەف ئەلمولک دەستگیر بکرێت بەڵام میرزا عەلی خان بەباشی دەزانێت ئەو کارە بۆ

ڕۆژی دواتر، دوا بخرێت. سادق ئەلمولك بەخێرایی دەگەڕێتەوە و شەرەف ئەلمولك لەو وتووێژە ئاگادار دەکاتەوە. لەگەڵ هەڵاتنی خۆر، شەرەف ئەلمولك و سادق ئەلمولك بەرەو ئارامگای عەبدولعەزیم هەڵدێن و لەوێ دەمێننەوە و لەوێوە بەردەوام دەرباری پاشا، لەو زوڵم و ستەمانەی لێیان کراوە، ئاگادار دەکەنەوە.

لەلایەن بەندەکانی پاشاوە، بەهۆی میرزا عەباس خانی قەوام ئەلدەولە، فەرمانێکی ڕاشکاو بۆ میرزا یوسف خانی سەدری ئەعزەم دەردەچێت کەکەس نەبێتە ئەرك بۆ شەرەف ئەلمولك.

لەکاتی گۆشەگیری ئەو لەگەڵ سادق ئەلمولك لەشا عەبدولعەزیم، مەلا محەممەد باقری فەخرولئیسلام کوڕی مەلا ئەحمەدی شێخولئیسلام کە لەتاران بووە، بەهاندانی میرزا عەلی نەقی ئاسف، دەڕواتە ماڵی سادق ئەلمولك. هەموو نامەکانی شەرەف ئەلمولك کە بۆ سادق خانی ناردووە، دەدزێت و بۆ میرزا عەلی نەقی دەبات و لەبەرابەر ئەم کارەی پانزە هەزار تمەن وەردەگرێت. میرزا عەلی نەقیش نامەکان تەسلیم بەحیسام ئەلسەڵتەنە دەکات. کاتێك قەوام ئەلدەولە، شەرەف ئەلمولك لەشا عەبدولعەزیم دێنێتەدەر، دەیباتە لای سەدری ئەعزەم. سەدری ئەعزەم ئەو لەگەڵ قەوام ئەلدەولە بۆ لای حیسام ئەلسەڵتەنە دەنێرێت تا چارەسەری کێشەی نێوانیان بکرێت. شازادە حیسام ئەلسەڵتەنە، نامەکان وەك بەڵگەیەك نیشانی شەرەف ئەلدەولە دەدات تا بیخوێنێتەوە. شەرەف ئەلمولك کاتێك نامەکانی خۆی دەبینێت، هیچ چارەیەکی نامێنێت و بەتوندی دەڵێت: ئێوە کەدەتانەویست من لەناو ببەن، منیش دەبێت زیاتر لەمانە بڵێم و بنووسم. ئەم وەڵام و پرسیارە دوایین گفتوگۆی نێوان ئەو دووانە بووە و چیتر چاویان بەیەك نەکەوتۆتەوە. شەرەف ئەلمولك گومان دەکات سادق ئەلمولك نامەکانی بۆ حیسام ئەلسەڵتەنە بردووە. هەرچەند ئەو داماوە حاشای لێدەکات بەڵام سودی نابێت و پەیوەندی نێوانیان بۆ هەمیشە دەپچڕێت.

لەبەرواری زیقەعدەی ١٢٩٧ کۆچی، شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدالله لەکوردستان دەستپێدەکات وکەم کەم ئاگری شۆڕشەکە ئازەربایەجانیش دەگرێتەوە. ناسرئەلدین شا ترسی شۆڕشەکەی لێ دەنیشێت و شازادە حیشمەت ئەلدەولە لەگەڵ سوپایەکی گەورە بۆ لەناو بردنی شۆڕشەکە ڕادەسپێرێت. لەکاتی بەڕێکەوتنی حیشمەت ئەلدەولە، شەرەف ئەلمولەکی لەگەڵدا بووە. شا بەشەرەف ئەلمولك دەڵێت: ئێوە کەخەڵکی کوردستانن، چ زانیارییەکتان لەسەر شێخ هەیە؟ چ کارەیە؟ پیشەی چییە؟ شەرەف ئەلمولك کەهەمیشە

چاوەڕوانی ئەو دەرەفەتە بووە، دەڵێت: کەسێکی دەروێشە و تووشی خەیاڵی پڕوپوچ بووە و شیاوی گرنگی پێدان نییە. هەرکات فەرمان بدەن، منی نۆکەر ئامادەم لەگەڵ سوپای کوردستان بڕۆم و بڵاوە بەداروودەستەکەی بکەم بێ ئەوەی زیان بەدەوڵەت بگات و خودی شێخ زیندوو یا مردوو تەسلیم بەدەوڵەت دەکەم. کەمتیار ناتوانێت دەست بەسەر دارستانەکانی مازەندەراندا بگرێت مەگەر سەگی مازەندەرانی. شا لەم وتانە دڵخۆش دەبێت و بەخێرایی فەرمان بەمیرزا یوسف خانی سەدری ئەعزەم دەدات، شەرەف ئەلمولك لەگەڵ خۆی ببات و چی پێویستە، بیخاتە بەردەستی. خەلات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستانی بۆ بنووسێت و لەماوەی دوو ڕۆژدا ڕەوانەی بکات. سەدری ئەعزەم لەگەڵ شەرەف ئەلمولك لەدەربار گەڕاوەتەوە، سەرەتا بروسکەیەك بۆ ئەبولفەتح میرزای مۆئەیید ئەلدەولە دەنێرێت و بانگێشتی دەکات و لەفەرمانی فەرمانڕەوایەتی شەرەف ئەلمولك ئاگاداری دەکاتەوە، دواتر فەرمان بەمیرزا حەسەن خانی مونشی باشی دەدات فەرمانی حکومەت و فەرماندەیی دەستەی زەفەری کوردستان بەناوی شەرەف ئەلمولك بنووسێت و تا نیوەڕۆ تەواو و تەسلیمی بکات.

شەرەف ئەلمولك دوای ئەم پێشهاتە چاوەڕوان نەکراوە، لەبەر خۆشحاڵی و شادومانی، خۆی دەدۆڕێنێت و بەمەبەستی دڵنەوایی کردنی نەیارەکانی دەڕوات و برووسکە دەنێرێت. نزیکەی هەشتا بروسکە بۆ زاناکان و پیاو ماقووڵانی کوردستان دەنێرێت و بەتایبەت لەبروسکەکەی میرزا یوسفی موشیر دیوان دەنووسێت: چیتر سەرەی ئاشتی و ئارمییە بەو مەرجەی باسی رابردوو نەکەین. کاتێك بروسکەکەی سەدری ئەعزەم بەمۆئەیید ئەلدەولە و هەروەها بروسکەکانی شەرەف ئەلدەولە بەدانیشتووانی و میرزا یوسف دەگات، میرزا یوسف، مەرگ بەچاوی خۆی دەبینێت و دەکەوێتە جموجۆڵ و لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا هەموو دانیشتووانی شار لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و دەیانبات بۆ ئەوەی بروسکە بنێرن و ناڕەزایی خۆیان لەفەرمانڕەوایەتی شەرەف ئەلدەولە نیشان بدەن. مۆئەیید ئەلدەولە کە بەپێی فەرمانی دەوڵەتی دەبێت بەرەو تاران بەڕێکەوێت، سەرقاڵی ئامادە کردنی کەرەستەکانی سەفەرەکەی دەبێت، هەموو کەلوپەلە زیادەکان و ترشیات و مرەباکانی خۆی کۆدەکاتەوە و دەخوازێت بەمەبەستی فرۆش بۆ بازاڕی بنێرێت. میرزا یوسف ئەم هەواڵە دەبیستێت و پەیامی بۆ دەنێرێت کەئەم کارەی بەتەواوی ورەی دانیشتووانی شارەکە

دەرووخێنێت و بەهیچ جۆرێك نابێت شتەکانی بەمەبەستی فرۆش بۆ بازاڕ بنێرێت. ئێمە ئێستا سەرقاڵی بروسکە ناردنین، ئەگەر توانیمان ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو درێژ بکەینەوە و ڕێگە نەدەین شەرەف ئەلمولك بەئاواتەکەی بگات، ئەو شتانەی پێویست دەبێت. ئەگەر نەمانتوانی، بەدوو بەرابەری بەهاکەی لێی دەکڕینەوە.

دوای ناردنی بروسکەی دانیشتووان، خودی میرزا یوسف خانی سەدری ئەعزەم دێتە بروسکە خانە. سەرەتا هەرەشە لەکەسانی ناو بروسکە خانە دەکات و دەڵێت دەوڵەت لەم کاتەدا شەرەف ئەلمولکی بۆ سەرکوت کردنی شێخ عوبەیداللە و شوێنکەوتەکانی ناردووە و کۆبوونەوەی ئێوە لێرە بێ ئەنجامە و دەبێتە هۆی توڕە بوونی پاشا، لەزووترین کات بڵاوەی لێبکەن و بۆ ماڵەکانی خۆتان بگەڕێنەوە، خوێندنەوەی ئەم بروسکە خانە، لەگەڵ فرۆشتنی کەلوپلی حکومەت، دەبنە هۆی ئەوەی دانیشتووان لەهاتنی شەرەف ئەلمولك دڵنیابن و نەیارەکان پەرێشان و دەخوازن بڵاوەی لێبکەن. میرزا یوسف بەخێرایی وەڵامی بروسکەی سەدری ئەعزەم دەداتەوە و دەڵێت: یەکەم: دەوڵەت چۆن دەتوانێت دڵنیابێت لەوەی شەرەف ئەلمولك پەیوەستی سوپاکەی شێخ نابێت و ئاگری ئەم شۆڕشە خۆشتر ناکات، دووەم ئەگەر مەبەستی دەوڵەت سەرکوت کردنی شۆڕشەکەی شێخ بێت بروسکەی مانەوەی حکومەتی مۆئەیید ئەلدەولە دەربکات، من خۆم بەڵێنم دەدەم گیان و ماڵ و ژیانی منداڵەکانم وەك بارمتە دادەنێم کەشێخ و سوپاکەی نەتوانن یەك هەنگاو بێنە ناو خاکی کوردستان و کوردستان لەشەڕی ئەو پارێزراو بێت. میرزا عەبدولغەفاری موعتەمید، حاشا لەم بەڵێنە دەکات. میرزا یوسف دەڵێت: مامە تۆ موو دەبینی و من لوول بوونی موو. تۆ برۆ دەبینی و من ئیشارەی برۆ، ئەگەر ئەم بەڵێنە نەدەم، بەو پێشینەی لەگەڵ شەرەف ئەلمولك هەمانە، چۆن دڵنیا بین لەوەی لەگەڵ هاتنی بۆ کوردستان ئێمە بەسەرچاوەی ئەم ئاژاوە لەقەڵەم نەدات و ژیان و سامان و پێگەی ئێمە نەخاتە ژێر پرسیارەوە. من ئەمڕۆ بەهۆی ئەم بروسکەوە، لەشەڕی شەرەف ئەلمولك خۆمان ڕزگار دەکەم، بەیانی ئەگەر شێخ عوبەیداللە دەسەڵاتی فراوان و دەستی بەسەر کوردستاندا گرت، دەوڵەتی ئێران چیتر دەستی بەمن ناگات و ئەگەر ئاژاوەکە کوژایەوە، دەڵێم بەهۆی چالاکییەکانی منەوە بوو. میرزا عەبدولغەفار لەبەرابەر ئەم بەڵگەهێنانەوە بێدەنگ دەبێت و بروسکەکە دەنێردرێت. سەدری ئەعزەم بەخێرایی بروسکەکەی میرزا یوسف بۆ دەرباری پاشا دەبات. میرزا عەبدولوەهاب خانی ئاسیف

ئەلدەولە کەلەویٚ ئامادە بووە، بۆ پشتیوانی کردنی مۆئەیید ئەلدەولە و نەبوونی حیسام ئەلسەڵتەنە کە لەسەفەری حیجاز بووە، دەڵێت: بەم بەڵێنەی میرزا یوسف، چیتر ڕەوانە کردنی شەرەف ئەلمولك لەبەرژەوەندیدا نییە و بگرە مەترسی هەیە. لەم کاتەدا شەرەف ئەلمولك بۆ دەربار بانگێشت دەکرێت تا خەڵاتی حکومەتی بپۆشێت و بەڕێکەوێت. دوای گفتوگۆکان، شا بەقەوام ئەلدەولە دەڵێت شەرەف ئەلمولك ئاگادار بکەرەوە کەڕۆشتنی ئەو لەم کاتەدا بەم بارودۆخە کەدانیشتووانی کوردستان ڕژاونەتە بروسکەخانە و لەفەرمانڕەوایەتی ئەو سکاڵا دەکەن، لەبەرژەوەندیدا نییە. فەرمان دەدەم پۆست و پێگەیەکی دیکەی پیٚ بسپێرن. قەوام ئەلدەولە کاتێك لەدەربار دێتەدەر، لەبەردەم دەروازەی ئەڵماسییە، بەشەرەف ئەلمولك دەگات و لەفەرمانی پاشا ئاگاداری دەکاتەوە. شەرەف ئەلمولك لەشوێنەکەی خۆی وشك دەبێت و خەمبار و مەلول بۆماڵەکەی دەگەڕێتەوە.

دوای بیست ڕۆژ لەم ڕووداوە، لەسەر داوای شازادە مۆئەیید ئەلدەولە، فەرمانی دەرباری دەردەکرێت تا شەرەف ئەلمولك و کەسەکانی تاران بەجێبێڵن و بڕۆنە خوراسان و لەویٚ نیشتەجیٚ بن. شەرەف ئەلمولك بەناچاری پەنا بۆ قاوەخانەی نەواب عەلیە ئەنیس ئەلدەولەی حەرەمی پاشا دەبات. سادق ئەلمولك لەم کارەدا هاوکاری دەکات. دوای بیست و حەوت ڕۆژ، ئەنیس ئەلدەولە، فەرمانی پاشا بۆ مانەوەی شەرەف ئەلمولك لەتاران وەردەگرێت بیٚ ئەوەی کەس کێشەی بۆ دروست بکات. دوای چوار مانگ لەم ڕووداوە، محەممەد ڕەحیم خان عەلا ئەلدەولە لەمانگی ڕەبیع الثانی ١٢٩٨ بۆ فەرمانڕەوایەتی ئازەربایەجان دەستنیشان دەکرێت و نازناوی ئەمیری نیزامی پێدەبەخشرێت. ئەم کەسە بەهۆی ئاشنایی، شەرەف ئەلمولکیش لەگەڵ خۆی دەبات. دوای گەیشتن بەئازەربایەجان، شەرەف ئەلمولك وەك فەرمانڕەوای ئەردەبیل دیاریدەکات. هاوکات لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە، بەپێی فەرمانی شا، کوردستان پەیوەستی سنوری فەرمانڕەوایەتی مەسعود میرزای زەڵ ئەلسوڵتان کراوە و میرزا مۆئەیید ئەلدەولە لەسەر کار لابراوە و حکومەتی کوردستان و کرماشان لەلایەن زەڵ ئەلسوڵتانەوە بەمەحمود خان ناسر ئەلمولکی قەراگوزلویی دەسپێردرێت.

## حکومەتی مەحمودخان ناسر ئەلمولکی هەمەدانی

دوای لابردنی شازادە مۆئەیید ئەلدەولە، مەحمود خان ناسر ئەلمولك کە لەخانەکانی

تایەفەی قەرەگوزلوی هەمەدانە، لەلایەن شازادە زەلّ ئەلسولّتان وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت و لەشەعبانی ١٢٩٩ دێتە ناو کوردستان. دوای گەیشتنی، چەند ڕۆژێك بەبیانوی حەوانەوە، چاوەڕوان دەبێت تا لەگەلّ دانیشتووان و بارودۆخی ناوچەکە ئاشنا ببێت. دوای چەند ڕۆژ قەوالّەکانی مالّیات و بەلّگەنامەکانی دیکە لەمیرزا یوسف وەردەگرێت و ئەو دەکاتە وەزیر و جێگری حکومەتەکەی خۆی و بێ خۆهەلّقورتاندن لەکاروباری حکومەتی کوردستان، بەرەو کرماشان دەڕوات میرزا یوسف بۆ ماوەی هەشت مانگ وەك کەسێکی دادپەروەر و میهرەبان، فەرمانڕەوایەتی کردووە و دواتر لەبەر ئەوەی هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك لەسەر ڕێگەی خۆی نابینێت و دلّنیایە لەوەی شەرەف ئەلمولك لەناوچەکە دوور و ئاوارەی ئەردەبیل بووە، هێرش و دەستدرێژیی و ستەمەکانی بۆ سەر خەلّکان زیاد دەکات و سامانێکی زۆر کۆدەکاتەوە بێ گرنگیدان بەهیچ شتێك و هیچ کەسێك. دانیشتووانیش بەکار و کردەوەکانی ڕازی نەبوون و لەمانگی رەبیع الاوەلی ١٣٠٠ کۆچی، زاناکان و پیاوماقوولانی کوردستان بەسەرۆکایەتی شێخ محەممەدی جەسیمی سەدری ئەلعولەما و مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام دەڕژێنە بروسکە خانە و لەکار و کردەوەکانی میرزا یوسف، سکالاّ بۆ بارەگای زەلّ ئەلسولّتان بەرز دەکەنەوە و بڕی حەفتا هەزار پارەی دەخەنە پالّ کەبۆ خۆی کۆکردۆتەوە. میرزا یوسف بەخێرایی پیاوێك ڕەوانەی کرماشان دەکات و هۆکاری دروستبوونی ئەم گرژی و ئالۆزیە دەخاتە ئەستۆی مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام کە بەمەبەستی تۆلّەسەندنەوەی شەرەف ئەلمولك دەستەیەك لەکەسە هیچ و پوچەکانی لەبروسکە خانە کۆکردۆتەوە و بۆتە هۆکاری دروستبوونی ئەم بارگرژییە. لەپیاوماقوولاّن و زاناکانی شار، کەسیان لەگەلّدا نییە. ئەوانە هەموو بەکرێ گیراون. ناسر ئەلمولك نامەکەی میرزا یوسف بۆ دەربار دەنێرێت. ماوەی شەش ڕۆژ لەمانگرتنی زاناکان لەبروسکە خانە تێدەپەڕێت و هەموو ڕۆژێك سکالاّکانیان بەرز دەکەنەوە بەلاّم لەلایەن شازادەوە وەلاّمیان نادرێتەوە. ڕۆژی حەوتەم بروسکەیەك دەگاتە بروسکەخانە و پرسیار دەکرێت ئەو کەسانەی کۆبوونەتەوە و مانیان گرتووە، کێن؟ چ کارەن؟ لەخراپەکارانن یا لەزاناکان؟ پێویستە ئەوان بناسێنن. لەگەلّ گەیشتنی بروسکەکە، شێخ محەممەدی جەسیم تورە دەبێت و ئەم بروسکە بۆ زەلّ ئەلسولّتان دەنێرێت: بۆ بەڕێز شاهەنشازادەی گەورە، وەك ئاشکرایە نەیارەکان تۆمەتی کەسانی هیچ و پوچیان خستۆتە پالّ کەسانێك کەئەم پیرە پیاوە حەفتا سالّە

کەزۆربەی تەمەنی لەرێگەی خواپەرەستی و خۆپارێزیدا بەسەر بردووە، هاودەم و هاونشینی ئەوانم. ئەگەر ئێوەی بەرێز بەباشی من ناناسن، باوکی بەرێزتان بەباشی دەمناسن کە لەریزی کەسانی خراپ و سەرسەریدا نیم بەلاّم ئێستا دەبینم بوومەتە هاودەمی ئەوان، گەورەم ئەگەر لەم رۆژگارەدا کەسێکی وەك من کافر بێت، لە هەموو رۆژگارەکان کەس موسوڵمان نەبووە، بەهەرحالّ چ کەسێکی خراپەکار بم، چ زانا و خۆپارێز، ئێمە چیتر ناتوانین بەحکومەتەکەی میرزا یوسف رازی ببین و خوازیاری گۆرینی ئەوین. وەگەرنە ئەم دەستە خراپەکارە، درێژە بەدەربرینی نارەزایی خۆمان دەدەین و پەردە لەسەر هەڵە گەورەکان وراستیە شاراوەکان لادەبەین. محەممەد جەسیمی سەدرولعولەما.

هەروەها بروسکەیەکی دیکە بۆ دەرباری پاشا دەنێرێت: بۆ شاهەنشا گەورە، ناسرئەلدین شا: چالاکی و کاروکردەوە نەشیاوەکانی میرزا یوسف، دانیشتووانی کوردستانی بێزار کردووە و هەمووان لەبروسکە خانە کۆبوونەتەوە و مانمان گرتووە و سکالاّ و گازندەکانی خۆمان بۆ شازادە بەرز کردۆتەوە. ماوەی حەوت رۆژە و هێشتا هیچ وەلاّمێکمان دەستنەکەوتووە. وەك ئاشکرایە لای شازادە ئێمە کەسانێکی سەرسەری و بیّ بەهاین. بەناچار پەنامان بۆ دەرباری تاقە پاشای دادپەروەر هێناوە و لەزمانی ئەم کەسە خراپانەوە دەڵێم: ئەی پاشا، بەرەوای مەبینە ئەم ستەمەی لەئێمە دەکرێت، ئەو کەسەی خوازیارە دەوڵەتەکەت هەمیشە پایەندە بێت، محەممەد جەسیمی سەدرولعولەما.

رۆژی هەشتەم هەم لەدەرباری پاشا و هەم لەدەرباری شازادەوە بروسکە دەگات کەمیرزا یوسف لەپێگەکەی دوور بخرێتەوە و مستەفا قولی خانی فەراش باشی بۆ لێکۆڵینەوە لەسکالاّ و گازندەی دانیشتووان رەوانە کرا. دوای گەیشتنی مستەفا قولی خان، تا رادەیەك گەرمی شۆرشەکە و شۆرشگێرەکان دامرکایەوە بەلاّم لەناخەوە دووبەرەکی و دژایەتی کردن لەناونەچوو تا ئەوەی بەفەرمانی زەلّ ئەلسوڵتان، مەلا لوتف اللە و میرزا یوسف کەسەردەستەی دوو دەستە نەیارەکە بوون، بۆ ئیسفەهان بانگ کران و میرزا محەممەد خان ئیقبالّ ئەلمولك وەك فەرمانرەوای کوردستان رەوانە کرا. ئیقبالّ ئەلمولك کاتێك دەگاتە هەمەدان، ژمارەیەك لەهەر دوو دەستەکە بۆ پێشوازی کردنی دەرۆن و داوا دەکەن رێگە لەرۆشتنی مەلا لوتف اللە و میرزا یوسف بگرێت. ئیقبالّ ئەلمولك ئەم داوایە بۆ زەلّ ئەلسوڵتان بەرز دەکاتەوە و ئەویش، رەزامەندی خۆی نیشان دەدات و بەمشێوەیە

هەردووکیان لەدوو فەرسەخییەوە بۆ شارەکە دەگەڕێنەوە. لەم شۆڕشەدا، میرزا یوسفی موشیری دیوان، پانزە هەزار تمەن و مەلا لوتف الله شێخولئیسلام حەوت هەزار تمەن زەرەر دەکەن. شێخ محەممەدی فەخرولعولەما لەکۆتاییەکانی رەبیع الاوەلی ئەم ساڵە نەخۆش دەکەوێت و لەسەرەتای رەبیع الثانی دەمرێت.

## حکومەتی میرزا محەممەد خانی ئیقبالٌ ئەلمولک

میرزا محەممەد خانی ئیقباڵ ئەلمولك کوڕی میرزا بابای حەکیم وەك ئاماژەمان پێدا، لەلایەن زەڵ ئەلسوڵتان وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە و لە ٥ رەجەبی ١٣٠٠ لەتارانەوە بەڕێکەوتووە و ڕۆژی ٢٨ ڕەجەب دەگاتە ناو سنە. لەم کاتەدا عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك لەفەرمانڕەوای ئەردەبیل دەستی لەکار کێشابوویەوە و گەڕابوویەوە بۆ تاران. ئیقباڵ ئەلمولك دوای گەیشتنی بەکوردستان، لەسەر داوای مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام لەزەڵ ئەلسوڵتان داوا دەکات شەرەف ئەلمولك وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاری بکات. زەڵ ئەلسوڵتان، شەرەف ئەلمولك ڕەوانەی کوردستان دەکات. ئیقباڵ ئەلمولك تا گەیشتنی شەرەف ئەلمولك، هەموو بەڵگەنامە و قەواڵەکانیماڵیات لەسلێمان خانی کوڕی شەرەف ئەلمولك، بەدەستەبەری مەلا لوتف اللە شێخولئیسلام وەردەگرێت و ئەو وەك جێگری شەرەف ئەلمولك و وەزیری کوردستان دیاریدەکات. شەرەف ئەلمولك دوای گەیشتنی بۆ کوردستان، بەڕەسمی خەڵاتی وەزارەت لەبەر دەکات و بۆ ماوەی یەکساڵ کاروبارەکان رادەپەڕێنێت. لەم ماوەدا هەرچەند پێگەی وەزارەت و پێشکاری حکومەت بەناوی شەرەف ئەلمولك و سلێمان خانی کوڕی بووە بەڵام لەڕاستیدا هەموو کاروبارەکان بەڕاوێژ کردن بەمەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام ئەنجامدراوە. مەلا لوتف اللە لەم پێشهاتە، خراپ کەڵك وەردەگرێت و بەشێوەیەکی خراپ هەڵسوکەوت لەگەڵ شێخەکانی مەردۆخ دەکات و دەخوازێت پێگەی لەوان بەرزتر ببێتەوە. شێخەکانی مەردۆخ بەمە ڕازی نابن و پەیوەستی میرزا یوسفی موشیر دیوان دەبن و حکومەت ناچار بەگۆڕینی بارودۆخ دەکەن. حکومەت دوای ئەوەی دەبینێت تەنیا مەلا لوتف اللە لەپشت شەرف ئەلمولکەوەیە و دانیشتووانی شار بەگشتی پشتیوانی لەمیرزا یوسف دەکەن، لەسەرەتای ساڵی ١٣٠١ کۆچی، قەواڵەکانی ماڵیات تەسلیم بەمیرزا یوسفی موشیر دیوان دەکات و ئەو وەك وەزیر و پێشکار دەستنیشان

دەکات.

لەم ساڵەدا شا محەممەد ناوێك، کوڕی کوێخا یارئەحمەدی تیلەکۆیی لەسارا کچی کوێخا حەسەنی گوڵباغی دەبینێت و پەردەی کچێنی هەڵدەگرێت. کچ دوای گەڕانەوە بۆ ماڵ، ڕووداوەکە بۆ باوکی باس دەکات. کوێخا حەسەن نزیکەی دوو هەزار سوار لەخزم و کەس و کارەکەی کۆدەکاتەوە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەکەنە سەر تیلەکۆ و تاڵانیان دەکەن و چەند کەس لەژنەکانیان دەگرن و پەردەی ناموسیان دەدرێنن و کوێخا عوسمانی تیلەکۆیی و فەیز اللەی کوڕی و پانزە کەسی دیکە دەکوژن. چەند کەسێکیش لەم جەنگەدا بریندار دەبن. کوێخا حەسەن و داورودەستەکەی هەموو مەروماڵاتی تیلەکۆییەکان تاڵان دەکەن و دەگەڕێنەوە. تایەفەی تیلەکۆیی دوای ئەم کوشتار و تاڵان کردنە، بەهۆی ئەوەی دایکی سەیف ئەلدین خان نەوەی عەزیز خانی سەردار، برازای کوێخا عوسمانی کوژراو بووە، دەڕۆنە موکری و پەنا بۆ سەیف ئەلدین خان دەبەن کە لەو کاتەدا فەرمانڕەوای موکری و سابلاغ بووە. سەیف ئەلدین خان، دەرباری دەوڵەت لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە. لەلایەن دەوڵەتەوە، فەرمانێك بۆ ئیقباڵ ئەلمولکی فەرمانڕەوای کوردستان ڕەوانە دەکرێت تا تۆڵەی تیلەکۆییەکان لەگوڵباغییەکان بکاتەوە. میرزا عەلی ئەکبەری سادق ئەلمولك لەو کاتەدا سکرتێری سەیف ئەلدین خان بووە. ئەم کەسە بەنوێنەرایەتی لەلایەن سەیف ئەلدین خانەوە لەگەڵ چەند کەس لەسەرۆکەکانی تایەفەی تیلەکۆ، لەزیقەعدەی ١٣٠١ کۆچی دێنە شاری سنە و دوای چەندین سوڵحی عەشایری، خوێنبەست رادەگەیێنن و دیەی کوژراوەکان و بریندارەکان لەبەرابەر هەزار و شەشسەد تمەن و هەروەها لەسەر دوو کچی کوێخاکانی گوڵباغی سوڵح دەکەن و چوار هەزار تمەن وەك قەرەبووی دەوڵەت لەگوڵباغی وەردەگرن.

لەسەرەتاکانی ڕەجەبی ١٣٠٢، زڵ ئەلسوڵتان، ئیقباڵ ئەلمولك و میرزا یوسفی بۆ ئیسفەهان بانگکردووە و لەوێ ئیقباڵ ئەلمولك لەسەر کار لادەبات و جێگەکەی بەشازادە ئیحتیشام ئەلدەولە پڕ دەکرێتەوە. شازادە ئیحتیشام لەگەڵ میرزا یوسف بەرەو کوردستان بەڕێدەکەوێت.

## حکومەتی شازادە ئیبراهیم میرزای ئیحتیشام ئەلدەولە

دوای لەسەر کار لابردنی ئیقباڵ ئەلمولك، ئیبراهیم میرزای ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە، لەڕەجەبی ساڵی ١٣٠٢ کۆچی بەلایەن زەڵ ئەلسوڵتان، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان و

لەمانگی شەعبان هاورێ لەگەڵ میرزا یوسفی موشیر دیوان دەگاتە شاری سنە. شازادە ئیحتیشام، کەسێکی کەمتەرخەم و بێ خەم بووە، لەماوەیەکی کەمدا شیرازەی کاروباری حکومەتی شێواوە. خێڵی جاف کاتێك ناوبانگی ناکارامەیی ئەو دەبیستن، هێرش دەکەنە سەر کوردستان و زیاتر لەسەد هەزار تمەن لەسامانی دانیشتووانی کوردستان تالآن دەکەن و لەکوشتن و درینی پەردەی ناموسی هاوولآتیان خۆیان بەدوور ناگرن. تایەفەی تیلەکۆیی بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوەی ڕووداوەکەی ساڵی پێشوو، لەم دەرفەتە کەڵك وەردەگرن، ژمارەیەك کۆدەکەنەوە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەکەنە سەر گوڵباغییەکان. جەواد ناوێك، کوری کوێخا حەسەنی گوڵباغی، دەکوژرێت و چەند کەسێکی دیکەیش دەکوژرێن و بریندار دەبن و هەموو مەرومالآتەکانیان تالآن دەکەن. ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە، زەڵ ئەلسوڵتان لەم روداوە ئاگادار دەکاتەوە. بەفەرمانی زەڵ سوڵتان فەرمانی سەرکوت کردنی تایەفەی تیلەکۆیی دەردەکرێت. شازادە ئیحتیشام و میرزا یوسف نامەیەك بۆ میرزا عەبدولغەفاری موعتەمیدی فەرمانڕەوای مەریوان دەنووسن تا سوپاکەی هەورامان، سەقز و بانە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت و تایەفەی تیلەکۆیی سەرکوت بکات. هەروەها فەرمان بۆ سوپاکەی سەقز و بانە دەنێرن تا پەیوەستی میرزا عەبدولغەفار بن. میرزا عەبدولغەفار نزیکەی هەزار تفەنگچی مەریوانی هەڵدەگرێت و کارگوزارەکانی سەقز و بانەیش ئاگادار دەکاتەوە تا هەردووکیان لەشەوی چوارشەممەی ١٢ زیئەلحەججە لەگەڵ هێزەکانی خۆیان لای ڕووباری خوڕخوڕە ئامادە بن. ئەم ناوچەیە یەك فەرسەخ لەتیلەکۆ دوورە. لەو شوێنەدا میرزا عەبدولغەفار پەیوەستیان دەبێت و پێکەوە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەکەنە سەر تیلەکۆ و ئەوەی دەتوانن لەکوشتن و درینی پەردەی ناموس و تالآن کردن، ئەنجامی دەدەن. دەستەیەك لەوان بەرەو سابلاغ هەڵدێن و پەنا بۆ سەیف ئەلدین خانی میرپەنجە دەبەن. لەلایەن دەوڵەتەوە فەرمان دەردەکرێت تا ئەوان قۆڵبەست و ڕەوانەی کوردستان بکەن. سەیف ئەلدین خان، بەپێی فەرمانی دەوڵەت، ئەوان بەمحەممەد بەگ، بۆ کوردستان ڕەوانە دەکات. بەکورتی حکومەتی ئیحتیشام ئەلەدولە بووە هۆی فراوان بوونی کێشە و ئاڵۆزییەکانی زەڵ ئەلسوڵتان و پیاوانی دەربار. سەرئەنجام لەجومادی الاخری ١٣٠٢، شازادە ئیحتیشام لەسەر کار لادەبرێت و دووبارە ئیقباڵ ئەلمولك وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان دەکرێتەوە و ڕەوانەی کوردستان دەبێت. حاجی مەلا ئەحمەدی نەودشی، لەموحەڕەمی ئەم ساڵە دەمرێت

و مەلا مەهدی شێخولئیسلام ناسراو بەئاغە، لەرەبیع الثانی و مەلا محەممەد ئەمینی ئەمین ئەلئیسلام لەجومادی الاوەل کۆچی دوایی دەکەن.

## حکومەتی ئیقبال ئەلمولک، بۆ جاری دووەم

میرزا محەممەد خانی ئیقبالۆ ئەلمولك، نەوەی میرزا بابا حەکیم، بۆ جاری دووەم لەلایەن زەلۆ ئەلسوڵتانەوە لەجومادی الاخری ۱۳۰۳ کۆچی، بۆ حکومەتی کوردستان دەستنیشان و لەرەجەبی ئەم ساڵە دەگاتە ناو شاری سنە. دووای گەیشتنی بۆ شارەکە، هەموو قەواڵەکانی ماڵیات تەسلیم بەعەلی ئەکبەری شەرەف ئەلمولك دەکات و ئەو وەك وەزیر و پێشکاری خۆی دیاریدەکات. حەبیب الله بەگی باباخانی کەسەرۆکی ئەو تایەفە بووە، دەکاتە فەرمانڕەوای جوانڕۆ. مەجید خانی کارگوزاری سەقز و یونس خانی کارگوزاری بانە بۆ سنە بانگێشت دەکات. سەرەتا یونس خان کەلایەنگری میرزا یوسف بووە، دەستگیر و مەجیدخان بۆ فەرمانڕەوایەتی کردنی سەقز دەگەڕێنێتەوە. دوای ماوەیەك، بڕێك پارەوە وەك جەریمە لەیونس خان دەستێنێت و بەدەستەبەری چەند بازرگانێکی بڕواپێکراوی کوردستانی، قەواڵەکانی ماڵیاتی بانەی تەسلیم دەکاتەوە و فەرمانڕەوایەتی شارەکەی پێدەبەخشێت.

لەم ساڵەدا لەلایەن زەلۆ ئەلسوڵتانەوە، دەستەیەك سەرباز لەگەڵ سێسەد سوارەی فەتحی و سێ تۆپ و پەنجا کەسی دیکە، بۆ ڕێگرتن لەهاتنە ناوەی جافەکان بۆ کوردستان، ڕەوانەی سنور دەکرێن و لەشوێنی پێشووی مانەوەی سوپای دەوڵەتی، نیشتەجێ دەبن. خەرجییەکانی ئەم سوپایە و ئالیك و تەقەمەنییەکانی ئەم سوپایە پێشتر پاشەکەوت کرابوو. لەکۆتایی ئەم ساڵە میرزا یوسف بیر لەوە دەکاتەوە پێگەی وەزارەت بۆ ساڵی داهاتوو لەئیقبالۆ ئەلمولك وەربگرێت بەڵام سەرکەوتوو نابێت. دوای بێ هیوایی، لەگەڵ شێخەکانی مەردۆخ پەیمان دەبەستێت و لەچلەی زستان ۲۲ سەفەری ١٣٠٤ کۆچی، شێخ محەممەد جەسیمی سەدرولعولەما و شێخ عەبدولمۆئمینی پێشنوێژ (باوکی نوسەر) و مەلا عەبدولڕەزاقی ئەمین ئەلئیسلام و شێخ محەممەد ڕەزای ئەمین ئەلشەرع و شێخ عەبدولڕەحمان (مامی نووسەر) و دەستەیەکی دیکە لەشێخەکان و سەییدەکان، بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەون. لەگەڵ گەیشتنیان بۆ ئیسفەهان، شازادە زەلۆ ئەلسوڵتان ڕێزێکی زۆریان لێدەگرێت و لەماڵی موشیر ئەلمولك میواندارییان دەکات و هەموو کەرەستە پێویستەکان و نانی ئێواری و شەو و.... لەخەزێنەی زەلۆ ئەلسوڵتان دابین کراوە.

ئـەم بەڕێزانـە دوای حەوانـەوە، لەدانیـشتنی دووەم لەحکومـەتی ئیقبـاڵ ئـەلمولك و شێخولئیسلام مەلا لوتف الله و وەزارەتی شەرەف ئەلمولك، سکالاّ دەکەن. شازادە دەڵێت: ئێوە تازە هاتوون و هێشتا بەتەواوی هیلاکی و شەکەتی ڕێگە لەجەستەتان دەرنەچووە، ئەم زستانە پێکەوە بەسەر دەبەین تا بەهار دێت. ئەوسا لێکۆڵینەوە لەم کێشەیە دەکەین. دوای بەڕێکەوتنی ئەم دەستەیە، مەلا لوتف الله بەئیقبالْ ئەلمولك دەڵێت: مەلا باقری برای مەلا عەبـدولڕەزاقی ئـەمین ئەلئیـسلام، سـەرقاڵی سـیخوڕی کـردن و کۆکردنـەوەی هـەواڵ و زانیارییەکانـە و بەهـەر پۆستێکدا بـارودۆخی کوردسـتان بـۆ ئیسفەهان دەنێرێـت. ئیقبـاڵ ئەلمولك بەخێرایی مـەلا بـاقر قۆڵبەسـت و زینـدانی دەکـات. کەسـەکانی مـەلا بـاقر پـەنا بـۆ موشیری دیوان دەبن. موشیر دیوان لەترسا بەباشی نازانێت لەم کێشەیە خۆی هەڵقورتێنێت بـەلاّم فـەرمان دەدات ئێـستا کـەپیاوەکان لەشـارەکەدا نـین و هـەموویان روویـان کردۆتـە ئیسفەهان، ژن و خاتوونەکان بڕۆنە بروسکە خانە و سکالاّکانی خۆیـان بۆ شازادە بنێرن. بـەپێی ئـەم فەرمانـە، هـەموو ئـەو ژنانـەی پیاوەکانیـان لەئیسفەهان بوون، دەرژێنـە بروسکە خانـە. ژمارەیـان زیـاتر لەپێنـسەد کـەس بـووە. بـەپێی فەرمانـە نهێنییـەکانی میرزا یوسـفی موشیر دیوان، خاتوونەکان دەست بەناردنی بروسکەکانی سکالاّ کردن دەکەن (نووسەر لەو کاتەدا شەش ساڵە بووم و منیشیان لەگەڵ دایکم بۆ بروسکە خانە برد). دوو شەو و ڕۆژ ئەم خاتوونانە لەبروسکە خانە مانەوە. ڕۆژی سێیەم ئیقبالْ ئەلمولك، بەفەرمانی شازادە، مەلا باقر تەسلیم بەژنەکان دەکاتەوە و هەموویان بروسکە خانە بەجێدێڵن. هەموو خەرجییەکانی خواردن و بروسکە خانە لەلایەن موشیر دیوانەوە دابین کراوە. زستانی ئەم ساڵە مێژوویی بوو. بەفر بەئەندازەیەك باریبوو کەهەموو کۆڵانەکانی گرتبوو و لەسەر بانەکانەوە هاتوچۆ دەکرا و لەزۆربەی شوێنەکان هاوشێوەی تونێل لـەژێر بەفرەکە، ڕێگەیان دروست کردبوو و ناو بەناو بەمەبەستی رووناکی و هـەوا، کونیان لەبەفرەکە کردبوو. هـەموو عارەقی نـەعنا و گولاّو و ترشیاتەکانی نـاو ماڵـەکان، سـەرما بـردی. خـەڵوزیان بەسـینی دەگێـرا و مـەنێکیان بەدوو تمەن دەفرۆشت لەگەڵ ئەمەیشدا بەئاسانی دەستنەدەکەوت. ئەمـە سـاڵی پیچی ئیل بوو، هەرچەند ساڵی پیچی ئیل لەکوردستان سارد و بەفر زۆر دەبارێت، بەلاّم ئەم ساڵە لەناو پیچی ئیلەکان زۆر سارد بوو و لەبەر ئەمە بەساڵی ئیقبالْ ئەلمولکی بەناوبانگە. دوای چوار مانگ، دووبارە دەستەیەك لەزاناکانی کوردستان بەرەو ئیسفەهان بەڕێکەوتن و لەشاری قوم

بەهۆی بروسکەوە خوازیاری بینینی زەلّ ئەلسولّتان دەبن. سەرۆکی ئەم دەستەیە مەلا محەممەد سالّحی فەخرولعولەما و سەرۆکی هەموویان ئەمان الله خانی وەکیل بووە. شازادە، مۆلّەتی سەردان بەو بەڕێزانە دەدات و دلّنیایان دەکاتەوە کەئیقبالّ ئەلمولك لەسەر کار لادەبات وشەرەف ئەلمولك بۆ ئیسفهان بانگێشت دەکات. بەبروسکەیش بەفەخرولعولەما و وەکیا کە لەقوم چاوەڕوانی مۆلّەتی شازادە بوون، مۆلّەتی ڕۆشتن بۆ ئیسفەهانیان پێدەدات. شێخ محەممەد جەسیمی سەدریلعولەما نازناوی حوجەت ئەلئیسلامی پێدەبەخشرێت و شێخ عەبدوللّەی کوڕی دەبێتە سەدرلعولەما. کەسانی دیکەیش هەموویان نازناو و خەلاّتیان پێدەبەخشرێت. نزیکەی هەشتسەد تمەن وەك دیاری و دوانزە خەلاّت و هەشت نازناو بەشێخەکان دەبەخشرێت. لەکاتی بەڕێکەوتنی حوجەتئەلئیسلام و کەسانی دیکە لەئیسفەهان، مەلا محەممەد سالّحی فەخرولعولەما و ئەمان الله خانی وەکیل و هاوڕێکانی دەگەنە ئیسفەهان و ڕێزیان لێدەگیرێت. مەلا عەبدولڕەزاقی ئەمین ئەلئیسلام کە بۆ وەرگرتنی نازناوی شێخولئیسلامی لەگەلّ حوجەت ئەلئیسلام ڕۆشتبووە ئیسفەهان، بەمۆلّەت وەرگرتن لەزەلّ ئەلسولّتان لەو شارە دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی مەلا لوتف الله و شەرەف ئەلمولك و ئیقبالّ ئەلمولك، بانگێشتی ئیسفەهان دەکرێن. لەشەوی چوارشەممەی ٦ شەوال، مەلا حسەینی قازی لەئیسفەهان دەمرێت. دوای سێ مانگ لەگەڕانەوەی حوجەت ئەلئیسلام، مەلا لوتف الله بۆ ئیسفەهان بانگ دەکرێت و لەچواردەی زیقەعدەی ١٣٠٤ لەڕێگەی عێراقەوە بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت. دوای گەیشتنی ئەو بۆ ئیسفەهان، عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولکیش بانگێشت دەکرێت. لەسەرەتاکانی رەبیع الاوەلی ١٣٠٥ ئەویش بەرەو ئیسفەهان بەڕێدەکەوێت. لەگەلّ گەیشتنی حوجەت ئەلئیسلام و کەسانی دیکە بۆ کوردستان، ئیقبالّ ئەلمولك، میرزا یوسف وەك وەزیر و پێشکاری حکومەتەکەی دەستنیشان دەکات و لە شەوی حەڤدەی رەبیع الاوەلی ١٣٠٥ بروسکەی لەسەر کار لابردنی ئیقبالّ ئەلمولك دەگاتە کوردستان و کوردستان پەیوەستی کرماشان دەبێت و فەرمانڕەوایەتییەکەی بەحیسام ئەلمولکی ئەمیر تومان دەسپێردرێت. بەیانی ئەو ڕۆژە کەجەژنی لەدایك بوونی پێغەمبەرە، ئیقبالّ ئەلمولك هەوالّی لەسەر کار لابرانی خۆی شاردۆتەوە و بەو پەڕی شانازییەوە بۆ پیرۆزبایی جەژن دادەنیشێت و هەموو ئامادەکارییەکانی ڕێوڕەسمەکە ئەنجام دەدات و لەکۆتاییەکانی ڕۆژ، بابەتەکە بۆ خەلّکان

ئاشکرا دەکات.

حیسام ئەلمولکی ئەمیر تومان، بەبروسکە، میرزا یوسفی موشیر دیوان لەحکومەتەکەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە و ویلایەتەکە تا گەیشتنی خۆی بەو دەسپێرێت. ئیقبالٌ ئەلمولك لەکۆتاییەکانی رەبیع الثانی بەرەو تاران بەڕێدەکەوێت. زەلٌ ئەلسولٌتان لەکۆتایی بەسەر بردنی بەڵێنەکانی خۆی، مۆڵەتی گەڕانەوە بەمەلا محەممەد سالٌحی فەخرولعولەما و ئەمان الله خانی وەکیل دەدات. حیسام ئەلمولکی ئەمیر، لەڕێگەی کەلیایی بەرەو کوردستان دێت. موشیر دیوان، میرزا محەممەد عەلی، یەکێك لەپیاوەکانی خۆی، کەفەرمانڕەوای ئیسفەندئاوا و لەیلاق بووە، بۆ میوانداری کردن بەرەو پیری دەنێرێت. کاتێك دەگاتە بەردەم ئەمیر، سەرخۆش بووە و بەهۆی پرسیار و وەڵامەکانەوە، ئەمیر هەست بەسەرخۆشی ئەو دەکات. بەخێرایی ئەمیر فەرمانی تەمیٚ کردنی دەردەکات و پێنسەد دار لەبەرە پێی دەدەن و دواتر زیندانی دەکرێت. لەگەلٌ گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆ شار، شکۆی ئەمیر زیاد دەبێت و ترس لەدڵی دانیشتووانی شارەکە دەنیشێت.

## حکومەتی محەممەد حسەین خان حیسام ئەلمولکی ئەمیر

دوای لەسەر کار لابردنی ئیقبالٌ ئەلمولك، محەممەد حسەین خان حیسام ئەلمولکی ئەمیر تومان کە لەخانەکانی قەراگوزلوی هەمەدان بووە، لەلایەن زەلٌ ئەلسولٌتانەوە بۆ فەرمانڕەوایەتی کردنی کرماشان و کوردستان دیاریدەکرێت و لەڕۆژ ١٤ رەبیع الثانی ١٣٠٥ دێتە ناو کوردستان.. لەگەلٌ گەیشتنی ڕاگەیاندنێك لەناو خەڵکان بلاٌو دەکاتەوە و بەدەرگا و دیواری شوێنە گشتییەکانەوە هەڵیدەواسێت و بۆ گوند و ناوچەکانی دیکەیشی دەنێرێت بەم نووسراوە: هەرکەس سکالاٌ یا گازندەیەکی هەیە، بیٚ ترس و دڵەڕاوکیٚ بێت و لەکێشەکەی خۆی ئاگادارمان بکاتەوە. دوای بلاٌو کردنەوەی ئەم راگەیاندراوە، دەستە دەستە و پۆل پۆل، سکالاٌکەران ڕوو لەبارەگاکەی دەکەن و حیسام ئەلمولك خۆی لێکۆڵینەوەی لەکێشەکان کردووە و دادی بۆ خەڵکان گەڕاندۆتەوە. دوای حەفتەیەك، بڕێك پارەی وەك پێشکەشی لەمیرزا یوسفی موشیر دیوان وەرگرتووە و پێگەی وەزارەتی پێدەسپێرێت. دووبارە دوای سیٚ ڕۆژ جارێکی دیکە راگەیاندراوێکی دیکە بەدەرگای مزگەوت و شوێنە گشتییەکاندا هەڵدەواسن کەهیچ کەس مافی لێکۆڵینەوە لەکاروباری ویلایەتەکەی نییە و هەرکەس هەر کێشە یا بابەتێکی هەیە، دەبێت تەنیا حکومەتی لیٚ

ئاگادار بکاتـەوە. لـەم راگەیـنـدراوە خـەڵك تێدەگـەن کەسەرچاوەی هـەموو دادپەروەرییـەك حکومەتـە و پێشکار یـا هـەر کەسێکی دیکـە مـافی خۆتێهەڵقورتانـدنی نییـە. بۆ ناوچـەکانی سەرسـنووریش کـاگوزاری پێویـست ڕەوانـە دەکـات. فـەرمانڕەواکانی سـەقز و بانـە بـانگ دەکات. چەند کەسێکی دز لـەناو ئەواندا دەگرێت و بەخێرایی دەست و پێیان دەبڕێتـەوە و سزایان دەدات. مـەلا لوتـف الله شێخولئیسلام بـەپێی مۆڵـەتی زەلّ ئەلسوڵتان لەئیسفەهان گەڕاوەتـەوە و دەگاتـە کوردسـتان. ئـەمیر گرنگـی زۆری پێنـادات. مـاوەی دوو مـانگ بـەپێی ئیرادە و خواستـی خـۆی فەرمانڕەوایـەتی کوردسـتان دەکـات، لـەمانگی سـێیەم، جومـادی ئالاخری ١٣٠٥، بـەپێی فـەرمانی دەربـاری، هـەموو ئـەو ویلایـەتانـەی لـەژێر دەسـەڵاتی زەلّ ئەلـسوڵتاندا بـووە، لێـی دەسـەندرێتەوە و هـەموو کـارگوزار فـەرمانڕەواکانی لەسـەر کـار لادەبرێن. بەمشێوەیە حیسام ئەلمولکی ئەمیر لەفەرمانڕەوایـەتی کوردستان دووردەخرێتـەوە و لەلایـەن دەربـاری پاشـاوە، تـەنیا بـۆ فەرمانڕەوایـەتی کردنـی کرماشـان دیاریـدەکرێت و لەلایەن دەربارەوە نیزام ئەلدەولەی نوری وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان دەکرێت. لـەم کاتـەدا و بـەپێی فـەرمانی دەربار، عـەلی ئەکبـەر خـانی شـەرەف ئـەلمولك بەبروسکە، بۆ تاران بانگ دەکرێت و دەچێتە ریـزی بەندەکانی پاشـا و بەنازناوی ئـەمیر تومـانی وخـەڵات و شمشێرێکی گەوهەرنیشانی پێدەبەخشرێت و دەگەڕێتەوە.

### حکومەتی میرزا ئیبراهیم خانی نیزام ئەلدەولەی نوری

دوای لابردنـی حیـسام ئـەلمولك لەحکومـەتی کوردسـتان، بـەپێی فـەرمانی دەربـار، میـرزا ئیبراهیم خان نیزام ئەلدەولەی ئەمیر تومان نوری، لەدەیەی کۆتـایی جومـادی الاخری ١٣٠٥ کۆچی بۆ حکومەتی کوردستان دەستنیشان و لەدوانزەی ڕەجەب دەگاتە شاری سنە. لەگەڵ زاناکـــان و خـــەڵکان بەگـــشتی دادپەروەرانـــە هەڵـــسوکەوت دەکـــات و دانیـــشتووان لەچاکەکارییەکانی ئـەو خۆشـحاڵ و شـادومان دەبـن. دوای حەفتەیـەك، پێگـەی وەزارەتـی کوردسـتان بـەمیرزا یوسـفی موشـیر دیـوان دەسـپێرێت و بۆ سـنوورەکانیش کارگوزارەکـانی خۆی ڕەوانە دەکات و خۆی بەخەیاڵێکی ئاسوودە، سەرقاڵی فـەرمانڕەوای کوردستان و بلاو کردنەوەی زانست دەبێت. عەشیرەکان و تایەفەکانی سەر سنوری، لەچاکەکاری ئەم ئەمیرە، خـراپ کـەڵك وەردەگـرن و چـەندین کـردەوەی نەشـیاو و دژە حکومـەت ئـەنجام دەدەن. حکومـەت، چـەند کەسـێك لـەو ئاژاوەچـییانە دەگرێـت و بـەپێی تاوانەکـەیان، دەسـت و

گوێچکەیان دەبڕێت و سزایان دەدات. سێ دز و کەسێکی کەلیایی، کەبەخراپەکاری و دزی بەناوبانگ بوون، لای گوڵشەن، سەرەوخوار هەڵدەواسن و دواتر بەزیندووی دەیانخەنە ژێر گڵ. کەسێکی دیکە بەناوی ئیبراهیم کوڕی سول جور ئاوا کە بەخراپەکاری بەناوبانگ بووە و لەباوەشی ژنێکدا قۆڵبەست دەکرێت، دەخەنە ناو چاڵ و چاڵەکە بەگەچ پڕ دەکەنەوە. ئیبراهیم تا ئێواریٚ زیندوو دەبێت، دواتر جەلاد سەری بەبەرد پان دەکاتەوە. بەهۆی ئەم سیاسەتەوە، ئارامی و ئاسایش باڵ بەسەر هەموو ویلایەتەکەدا دەکێشێت. چۆنیەتی حکومەتی نیزام ئەلدەولە بەتەواوی پێچەوانەی فەرمانڕەوکانی پێش خۆی بووە، لەقەرەباڵغی و خۆ نواندان و زۆری خزمەتکارەکان بێزار بووە. زۆربەی کاتەکان تەنیا و بەشێوەیەکی نەناسراو، ڕۆشتۆتە ناو بازاڕ، لەنانەوا و قەساب شتی کڕیوە و لەدوکانێکی دیکە کێشاویەتی، ئەگەر کێشەکەی تەواو بووبێت، لەکاتی گەڕانەوەی بۆ شوێنەکەی خۆی، بەسەر هەژاراندا دابەشی کردووە و ئەگەر کێشەکەی ناتەواو بووبێت، کەسی ناردووە و خاوەنی دووکانەکەی بانگکردووە و سزای داوە. لەئەنجامی ئەم سیاسەتە، بازاڕییەکان لەکەم فرۆشی خۆیان بەدوور گرتووە. شەوانە بەشێوەی نەناسراو بەناو شاردا گەڕاوە و لەگەڵ بارودۆخی خەڵکان ئاشنا بووە. کێشە گەورەکانی زۆر بەسادەیی چارەسەر کردووە و لەبەرتیل و ریشوە بیزار و خۆی لێکۆڵینەوەی لەهەموو سکاڵاکانی خەڵکان کردووە. لەماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی نەبینراوە، بەرتیل لەکەس وەربگرێت. لەساڵی دووەمی فەرمانڕەوایەتیکەیدا، تالارەکانی بینای حکومەتی نۆژەن کردۆتەوە. نیزام ئەلدەولە کاتێك هاتۆتە کوردستان، نازناوەکەی سەهام ئەلدەولە بووە و دواتر نازناوی نیزام ئەلدەوی پێبەخشراوە. بۆ محەممەد عەلی خانی زەفەر ئەلمولك پێگەی میر پەنجەیی وبۆ شەرەف ئەلمولك و موشیر دیوان خیتاب جەنابی و بۆ میرزا حەسەن خان کوڕی موشیر دیوان پێگەی سەرتیپی لەدەوڵەت داوا کردووە و خەڵات و فەرمانی بۆ دەرکردوون. دوای دوو ساڵ و نۆ مانگ لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دوور دەخرێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ تاران. شێخ محەممەدی جەسیم حوجەت ئەلئیسلام لەزینەلحەججەی ١٣٠٥ کۆچی دوایی دەکات و میرزا عەبدولغەفاری موعتەمید، لەجومادی الثانی ١٣٠٦ مردووە.

## حکومەتی ئیقبال ئەلمولک بۆ جاری سێیەم

دوای لابردنی نیزام ئەلدەولە، میرزا محەممەد خانی ئیقبالٌ ئەلمولك، بۆ جاری سێیەم لە ١٤

ڕەبیع الاوەلی ١٣٠٨ بۆ حکومەتی کوردستان هەڵدەبژێردرێت و لە ٢٨ ڕەبیع الثانی دێتە ناو سنە. ئەم جارە مەبەستی ئەوەی کردووە بەشێوەیەکی شیاو و گونجاو هەڵسوکەوت لەگەڵ دانیشتووانی ویلایەتەکە بکات. نزیکەی هەزار و پێنسەد تمەنی بۆ زاناکان دیاریکردووە، بۆ نمونە سەد تمەنی بەمانگانەی شێخ عەبدولمۆئمینی پێشنوێژ زیاد کردووە و تاقەیەك شاڵی کشمیری بۆ ناردووە. لەکاتی هاتنی خێڵی جاف بۆ کوردستان، سوپای بۆ ڕێگرتن لەوان ڕەوانە کردووە، جافەکان هەشت هەزار تمەن پێشکەشییەکان داوە و مۆڵەتی هاتنە ناو کوردستانی پێداون. ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو، ساڵێك و چەند مانگێك درێژەی کێشاوە. لەپێنجی جومادی الاوەل ١٣٠٩ کۆچی بۆ تاران بانگ دەکرێت.

## حکومەتی حەسەن عەلی خانی ئەمیر نیزامی گەڕوسی

دوای لابردنی ئیقباڵ ئەلمولك، حەسەن عەلی خان ئەمیر نیزامی گەڕوسی لەپێنجی جومادی الاوەلی ١٣٠٩ بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان و کرماشان و گەڕوس و ئەفشار و ساین قەڵا و سنورپارێزی ڕۆژئاوای ئێران دیاریکرا. لەڕۆژی ١٢ هەمان مانگ لەتارانەوە بەمەبەستی هاتن بۆ ناوچەی دەسەڵاتەکەی، لەڕێگەی گەڕووسەوە بەڕێدەکەوێت. لەکاتی بەڕێکەوتن، شازادە زیائەلدەولە، کوڕی خوالێخۆشبوو بەهمەن میرزا وەك جێگری خۆی بۆ فەرمانڕەوایەتی کردنی کرماشان و محەممەد عەلی خانی زەفەر ئەلمولك وەك جێگری حکومەتی کوردستان دیاریدەکات و خۆی لەڕۆژ ٢٣ جومادی الاوەل دەگاتە گەڕوس. چەند ڕۆژێك بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی لەگەڕووس دەمێنێتەوە. میرزا یوسفی موشیر دیوان لەناخەوە بەجێگری زەفەر ئەلمولك ڕازی نەبووە بەڵام لەترسی ئەمیر نیزام، خۆڕاگری دەکاتە پیشە و چاوەڕوانی دەرفەتی گونجاو دەبێت. هەموو ڕۆژێك دەڕواتە ماڵی زەفەر ئەلمولك و ڕێزی لێدەگرێت، بەپێچەوانەوە زەفەر ئەلمولك گرنگی زۆری پێنادات و لەهیچ کارێکدا ڕاوێژی پێناکات و بۆچوونی ناپرسێت. دوای دوو سێ ڕۆژ، زەفەر ئەلمولك دەخوازێت محەممەد کازم خانی نەسیر دیوان بەنوێنەرایەتی خۆی لەگەڵ دیاری و پێشکەشی پیرۆزبایی بۆ گەڕوس بنێرێت. موشیر دیوان ئەم دەرفەتە بەگونجاو دەزانێت و دەڵێت: منیش دەمویست دەروێش خانی مەنسوری دیوان بنێرم، ئێستا کەوایە، با هەردووکیان پێکەوە بڕۆن. زەفەر ئەلمولك لەم کارەی موشیر دیوان کەچاوەڕوانی نەکردووە، بەتەواوی دەگۆڕێت و دەست و پێی خۆی کۆدەکاتەوە چوونکە لەسەرەتاوە گومانی کردبوو بەگرنگی پێنەدان و پشتگوێخستن،

بەتەواوی موشیر دیوانی ترساندووە و تۆقاندووە و چیتر توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نەماوە، بەڵام بەناردنی مەنسوری دیوان تێدەگات کەبەپێچەوانەی گومانەکەی خۆیەتی و موشیر دیوان گرنگی بەپشتگوێخستنی خۆی نەداوە، بەمپێیە، سیاسەتی لەبەرابەر موشیر دیوان دەگۆڕێت و ڕێگەی سازان دەگرێتەبەر و هەردوو کەسەکە پێکەوە ڕەوانەی گەڕووس دەکەن. لەکاتی گەیشتنیان بۆ گەڕوس، نەسیر دیوان کەنوێنەری ڕەسمی بووە، گرنگی پێدەدرێت و لەگەڵ مەنسور دیوان بەشێوەیەکی ناڕەسمی هەڵسوکەوت دەکرێت. لەڕۆژی ١٢ ڕەجەبی ١٣٠٩، نوێنەرەکان مۆڵەتی گەڕانەوەیان خواستووە، ئەمیر نیزام لەڕێگەی خوسرەوئاوای گەڕوس بەرەو کوردستان بەڕێدەکەوێت و لەڕۆژی چوارشەممەی ١٨ ڕەجەب دەگاتە شاری سنە.

لەساڵەکانی پێشوو، بۆ پێشوازی کردن لەفەرمانڕەوکان، ئەم ڕێورەسمانەیان ئەنجامداوە:

١. چەندین ئەسپ و ماینیان بەسەر کەسە ناودارەکاندا دابەش دەکرد و ڕەوانەی هەمەدانیان دەکردن بۆ ئەوەی پیاوانی حکومەتی کە لەتارانەوە تا هەمەدان بەگاری دەهاتن، لەوێوە سوار ئەسپ ببن و بەسواری ئەسپ بێنە ناو شاری سنە.

٢. لەسەرسنوری کوردستان تا گەیشتن بەشارەکە، حکومەت لەهەموو گوندەکانی سەر ڕێگە بۆ دابین کردنی خەرجییەکانی خۆی، ڕەوانە کردنی خواردەمەنی و کا وگەنم و جۆ و برنج و ڕۆنی و مریشك و شەکر و چایی خستۆتە سەر شانی هەژاران و نەداران، هەندێ لەشتەکانیان وەرگرتووە و ئەوەی دیکەیان بەنەقدی وەرگرتووە.

٣. پیاوماقوڵان و ئەشراف زادەکان تا سەڵوات ئاوا بۆ پێشوازی کردن ڕۆشتوون و لەوێ چاویان بەفەرمانڕەواکان کەوتووە و هەموویان شان بەشانی ئەو بەرەو شارەکە بەڕێکەوتوون.

٤. لەبەردەم پردی قشلاق، دەستەیەك سۆزانی[1] بەتەپڵ و نەی و شمشاڵ و چەقەنە لێدان هاتوونەدەر و لەبەردەم ئەوان سەمایان کردووە و شادومانی خۆیان دەربڕیوە.

٥. ژناکان تا لێوار ڕووبارەکە بۆ پێشوازی کردن ڕۆشتوون و لەوێ خێوەتیان هەڵداوە، تا پیاوانی حکومەتی هاتوون و لەوێ چایی و شەربەتیان خواردووە ودواتر بەڕێکەوتوون.

---

[1] – هەرچەندە وشەی سۆزانی بۆ ئەو کەسانە گونجاو نییە، بەڵام چوونکە نوسەر بەو ناوە ناوی بردوون، منیش ئەو وشەیەم بەکار برد

زاناکانیش لەپشت سەری ئەوان بەسواری یا پیادە، ڕێگەی شارەکەیان گرتۆتەبەر.

٦. چینە بازرگانەکان، کەلیمی و مەسیحییەکان، هەرکام تا گەردەنەی پیر محەممەد هاتوون. لەناو پیشەوەران، وتاری بەخێرهاتنیان بەزمانی عەرەبی خوێندۆتەوە، خەلیفەی کەلیمییەکانیش، وتارەکەی بەزمانی عیبری خوێندۆتەوە و دواتر مەسیحی و کلدانییەکانیش بەشێوازی خۆیان شادومانی خۆیان دەربڕیوە و هەرکام ئاژەڵێکیان لەبەردەم پێی پیاوانی حکومەت کردۆتە قوربانی.

٧. لەسەر پردەکەوە تا بینای حکومەتی، کرێکارەکانی نەقارەخانە و لۆتی و دەروێشەکان و پاڵەوانەکان، بەدەم لێدانی تەپڵ وکەڕەنا و زوڕنا و هتد.. لەگەڵ تەناف بازی و سەما کردن و گەمە کردن و هتد... ئەرکەکانی خۆیان ئەنجامداوە، چەرەس فرۆش و چایی فرۆش و هتد بەدەنگی بەرز هاواریان بۆ ناساندنی شتەکانی خۆیان کردووە و لەپیش و دوای پیاوانی حکومەت ڕێگەیان بڕیوە.

٨. دوو سێ تۆپ لەگەڵ تۆپچی و پیادە نیزام تا پشت گوڵشەن پێشوازییان لەپیاوانی حکومەتی کردووە و تا گەیشتنی ئەوان بۆ قەڵای حکومەتی، تۆپیان تەقاندووە و سڵاوی نیزامیان داوە و لەپێشەوەی پیاوانی حکومەت ریزیان بەستووە و چەندین دەستە لەچەپ و ڕاستی پیاوانی حکومەت ڕێگەیان بڕیوە.

٩. خزمەتکارەکانی پیاوانی حکومەت لەدەرەوەی شار تا گەیشتن بەقەڵای حکومەتی بەدەنگی (دوور کەوەرەوە، کوێر بی، بڕۆنە پێش، بێستن، خۆتان لادەن) خەڵکیان ئازارداوە.

١٠. ژنەکانی شار خۆیان ڕازاندۆتەوە و تا گەیشتن بەقەڵای حکومەتی لەسەر بانەکان وەستاون و پیاوانی حکومەت لەناو خۆشحاڵی ئەوان بەرەو قەڵای حکومەتی ڕۆشتوون.

١١. دوای گەیشتن بەناوەندی فەرمانڕەوایی شارەکە، دەبوا بۆ ماوەی یەک حەفتە نانی نیوەڕۆ و شەوی پیاوانی حکومەت لەماڵی وەزیر یا پێشکار دابین بکرێت و لەسەر سینی تایبەت ڕەوانەی شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەوان بکرێت.

١٢. دانیشتووانی شار بەزانا و خەڵکانی ئاسایی، هەرکەس بەگوێرەی توانا و دەسەڵاتی خۆی، لەئەسپی باش، قاڵیچەی گرانبایی یا سادە یا پارەی نەقد یا شتی دیکەیان بەناوی پیرۆزبایی بۆ پیاوانی حکومەتی ناردووە و لەمکارەدا، دانیشتووان بۆ خۆ نواندن و پێشکەوتن لەکەسانی دیکە، کێبڕکێیان کردووە. زۆربەی کاتەکان بەهای ئەم دیارییانە زیاتر

لەپانزە هەزار تمەن بووە.

ئەمیر نیزام لەبەر ئەوەی کەسێکی دوورئەندێش و لەئەورووپا ژیابوو، ڕێگە لەهەموو ئەم ڕێورەسمانە دەگرێت و ئەم دوانزە خاڵە بۆ پێشوازی کردن لەفەرمانڕەواکان بەتەواوی هەڵدەوەشێنێتەوە. تەنیا فەرمانیدابوو چەند کەسێك لەزاناکان لەناوەندی فەرمانڕەوایەتی شارەکە ئامادەبن. ئەمیر نیزام ڕۆشتۆتە لایان و بەزمانێکی پاراو ڕێزی لێگرتوون. دوای ڕۆشتنی زاناکان، پیاوماقوڵان و ئەشراف زادەکانی بانگکردووە و هاوشێوەی خێلایەتی، لەراست و چەپی خۆی دانیشاندوون و ڕێزی لەهەموویان گرتووە و بەزمانێکی شیرین وتوویەتی: ماوەیەکە حکومەتی کوردستان، لەدەست کوردستانییەکاندا نەماوە و کەسانی بێگانە فەرمانڕەوایەتی ئێوەیان دەکرد، ئەم جارە من بۆ زیندوو کردنەوەی کوردستان و کوردستانی هاتووم و جارێکی دیکە نانی کوردستان دەخەمە داوێنی کوردستانییەکان..

ئێوەیش هاوشێوەی ئەژدادی خۆتان بن و خۆتان نانی کوردستان بخۆن، دووبەرەکی مەکەنە پیشە، دووبارە پێگەی فەرمانڕەوایەتی خۆتان تەسلیم بەبیانییەکان مەکەن. ئەمڕۆ من فەرمانڕەوام، بەیانی کەدەرۆم، خۆتان فەرمانڕەوایەتی بگرنەدەست. (خۆمان دڵ بۆ خۆمان بسووتێنین، بێگانە دڵمان بۆ نەسووتێنێت) لەکۆتایی وتەکانی، روودەکاتە زەفەر ئەلمولك و موشیر دیوان و دەڵێت: چ کێشەیەك دەبێت ئەگەر ئێوە ئەمان الله خانی فەرمانڕەوا بن و موشیر دیوان، میرزا عەبدولکەریمی وەزیر. لەم دانیشتنەدا خەڵاتی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بە محەممەد عەلی خانی زەفەر ئەلمولك دەدات و فەرمانی دەرباری تەسلیم دەکات. فەرمانی سەرتیپی و سەرهەنگی کوڕەکانیشی دەدات. بەیانی ئەو ڕۆژە پێگەی پێشکاری و وەزارەتی دارایی (مالیە) بەموشیر دیوان دەسپێرێت و دابین کردنی ئارامی و ئاسایشی شارەکە و سەرپەرەستی جوولەکە و مەسیحییەکان دەخاتە ژێر سەرەپەرەستی ئەمان الله خانی وەکیل. هەمووان بەگشتی لەم ڕێزگرتنە و کارانەی کەهەستی خێلایەتی نیشانداوە، شادومان دەبن و سەرقاڵی کارەکانی خۆیان دەبن. عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك کە بۆ گەڕاندنەوەی ئاسایش و ئارامی بانە، لەچوار مانگ پێشەوە ڕۆشتبووە ئەو شارە، دوای گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایشی شارەکە و ئەنجامدانی فەرمانە دەوڵەتییەکان، داوای مۆڵەتی گەڕانەوە دەکات و بەفەرمانی ئەمیر نیزام دەگەڕێتەوە. محەممەد خانی کوڕی یونس خان کە بۆ تەبریز هەڵاتبوو، لەسەر داوای ئەمیر نیزام، بۆ کوردستان دەگەڕێننەوە.

حەسەن عەلی خانی ئەمیر نیزام کە لەخانەکانی گەرووسە، کوڕی محەممەد سادق خان کوڕی نەجەف قولی خان کوڕی محەممەد ئەمین خان کوڕی حەسەن عەلی سوڵتان ئیشەك ئاقاسی باشی نادرشا و کوڕی لوتف عەلی خانی گەڕووسییە کە لەکوردەکانی ئەو ناوچەن. باوباپیرانی ئەو لەڕۆژگاری سوڵتانەکانی تەیمورییە و سەفەوییە و ئەفشارییە و زەندییە و قاجارییە، بەردەوام سەرچاوەی خزمەتە شایانەکان و سەرچاوەی کارە گەورەکان بوون. فەرمانڕەوایەتی گەڕوس بەدەستی ئەوان بووە. حەسەن عەلی خان لەساڵی ١٢٣٦ لەگوندی بیجاری گەڕوس چاوی بەدنیا هەڵهێناوە و لە ٥ رەمەزانی ١٣١٧ لەکرمان کۆچی دوایی کردووە. پێشکەوتنەکانی ئەمیر نیزام پلە پلە و لەسەر خۆ بووە، هەموو پێگەکانی سوپایی و حکومەتی بەهەوڵ و وزەحمەتی فراوان بەدەست هێناوە. یەکێك لەو چوارکەسەی لەئێران هەڵگری نیشانەی (قودس)ن، یەکیان ئەمیر نیزامە. نیشانەی قودس یەکێکە لەنیشانە گرنگەکانی ئێران.

## حکومەتی فەرمان فەرما، سالاری لەشکر

دوای لابردنی ئەمیر نیزام لەشەعبانی ١٣١١، حکومەتی کوردستان بەنەواب والا شازادە عەبدولحوسەین میرزای فەرمان فەرما (سالاری لەشکر- سوپا) سپێردرا و لەم مانگەدا، میرزا عەلی خان بێهجەت ئەلمولك وەك جێگری فەرمانڕەوا، بەنوێنەرایەتی ئەو دێتە کوردستان. بێهجەت ئەلمولك کەسێکی دوورنەندێش و بەتوانا بووە. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆی، بەشێوەیەکی گونجاو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکان کردووە و دانیشتووان لەکاروکردەوەکانی ڕازی بوون. عەلی ئەکبەر خانی شەرەف ئەلمولك لە٥ شەوال مردووە، مەلا محەممەد ساڵحی فەخرولعولەما و شێخ حسەینی کانی مشکانی لەجومادی الثانی ئەم ساڵە کۆچی دواییان کردووە. لەسەرەتاکانی رەبیع الثانی١٣١٢، شێخ عەبدولڕەحمان (مامی نووسەر) گرفتاری نەخۆشییەکی کوشندە دەبێت و لەجێگەدا دەکەوێت. لەکۆتایی ئەم مانگەدا شێخ عەبدولمۆئمینی پێشنوێژ و وتارخوێن، گرفتاری نەخۆشی دەبێت. ڕۆژی هەینی ٢ جومادی الاوەل، من (نوسەر) کە١٤ ساڵم بوو، بەهۆی نەخۆشی باوکم و مامم، ڕۆشتمە مزگەوتی گەورە و پێشنوێژیم بۆ خەڵکان کرد. شەوی دووشەممەی دەی ڕەجەب، شێخ عەبدولڕەحمانی مامم، مرد. ڕۆژی ١٢ ڕەجەب، فەرمان فەرما هاتە کوردستان. دەستەیەك لەگەورە پیاوان و شازادەکان، بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشتن. لەگەردنەی پیر محەممەد (کەڵە

کلۆڵە) پێی گەیشتن. بەهۆی بەفر بارین و سەرمای زۆر، ڕێوڕەسمی پێشوازی کردن ئەنجام نادرێت و بەخێرایی بەرەو شارەکە بەڕێدەکەون. دوای دوو ڕۆژ میرزا عەلی نەقی ئاسفی دیوان وەك وەزیر هەڵدەبژێرێت و لە ٢٦ ڕەمەزان لەسەر کار لادەبرێت و بۆ تاران دەگەڕێتەوە.

## حکومەتی زەین ئەلعابدین خانی حیسام ئەلمولک

دوای لەسەر کار لابردنی فەرمان فەرما، زەین ئەلعابدین خانی حیسان ئەلمولکی قەراگوزلی هەمەدان، ئەمیری ئەفخەم، لەزیقەعدەی ١٣١٢ کۆچی، وەك فەرمانڕەوای کوردستان، دێتە شاری سنە. قەمەر ئەلسەڵتەنە کچی موزەفەر ئەلدین میرزای جێگری پاشا، هاوسەری ئیحتیشام ئەلدەولەی کوڕی بووە. ئەوی لەگەڵ ئیحتیشام ئەلدەولە لەگەڵ خۆی هێناوەتە کوردستان. سەرۆکی دیوانخانەکەی، ئیفتیخار دیوان بوو کەبەم دوواییانە بوو بەموعتەمیدی دیوان. مونشی باشی ئەو موعین دیوان بوو. ئاوازخوێنێکی بەناوی جەناب خیتاب لەگەڵدا بوو. حیسام ئەلمولك کەسێکی خۆشگوزەران و خۆش ڕابوێر بوو. لەحکومەتی کوردستان زیاتر لەبیست هەزار تمەن، خەڵات و دیاری و مانگانەی پێشکەش بەخەڵکان کرد. شیعەیەکی دەمارگیر بوو. دووجار لە کاتی عاشورا لەکوردستان ڕێوڕەسمی لەخۆدان و پرسەگێری ئەنجامدا و هەرجارە و زیاتر لەسێ هەزار تمەنی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان دەکرد. لەژووری دلگوشا، حەوت شەو نانی بەخەڵکان دەدا. شەوی یەکەم، بەگشتی زاناکان وحافزەکانی قورئانی بانگێشت دەکرد، شەوی دووەم خانەکان و خانزادەکانی شارەکە، شەوی سێیەم، بازارییەکان و بازرگانەکان، شەوی چوارەم، سەربازەکانی سوپای زەفەری کوردستان لەگەڵ سەردارەکان و سەربازەکانی تۆپخانە، شەوی پێنجەم و شەشەم هەژارە و نەدارەکانی شار و دوای نانی شەو، بەهەرکام ئەشرەفییەکی پێنج هەزاری دەبەخشی و شەوی حەوتەم، ژنەکانی شار و خاتوونە ڕێزدارەکانی بانگدەکرد. خودی حیسام ئەلمولك و ئیحتیشام ئەلدەولەی کوڕی، لەهەموو شەو و ڕۆژەکانی عاشورا، بەجل و بەرگی ڕەش و پێپەتی و سینەی کراوە، وەك پێشخزمەت کاریان دەکرد و بۆ خەڵکان، چایی، ئاو و قاوە و نێرگەلەیان دەبرد و تا کاتی نان خواردن، بەسەرپێیەوە بەخزمەت کردن سەرقاڵ دەبوون. لەکاتی نان خواردن، لەخوارەوەی سفرەکە کەچوار زەرع لەچوارده زەرع درێژی و پانییەکی بوو، دادەنیشتن و نانیان دەخوارد.

شێخ محەممەد تەقی موجتەهیدی هەمەدانی کە لەکوردستان نیشتەجێ بوو، لەڕوانگەی ئایینەوە زیاد لەڕادە ڕێزی لێدەگرت و لەکۆبوونەوە ڕەسمییەکان لەسەرەوەی زاناکانی کوردستان دایدەنیشاند لەکاتێکدا ئەم ماف و لەپێشییەی نەبوو و سەرئەنجام ئەم ڕێزگرتن و خۆشەویستییە ئەوی بەکوشتندا. دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

لەڕەبیع الاوەلی ١٣١٣ لەسەر داوای قەمەر ئەلسەلتەنە، کەژاوەیەك دەڕازێنێتەوە و بەمەبەستی سەردانی ویلایەت بەرەو ئازەربایەجان بەڕێدەکەوێت و دوای چەند ڕۆژ دەگەڕێتەوە و بۆ دەستەیەك لەزاناکان و پیاوماقووڵانی شار، خەڵات و ئازناویان بەدیاری هێنا. بۆ نموونە بۆ من (نووسەر) ئازناوی عەنبەرین شیم و تاقەیەك شاڵی کشمیری هێنابوو. بۆ ماوەی یەك مانگ دانیشتنی شەربەت خواردن لەماڵی زاناکان و پیاوماقووڵان بەردەوام بوو.

ڕۆژی هەینی ١٧ زیقەعدەی ١٣١٣، میرزا ڕەزای کرمانی، لەگۆڕەپانی شا عەبدولعەزیم، دڵی ناسرئەلدین شا دەکاتە ئامانجی گوللەیەك و کۆتایی بەژیانی دێنێت. میرزا عەلی ئەسغەری ئەتابەکی ئەعزەم، بەخێرایی ئەو بۆ دەربار دەگەڕێنێتەوە و بەبەرقەرار کردنی ئارامی و ئاسایش سەرقاڵ دەبێت.

ڕۆژی شەممە ١٨ زیقەعدە، موزەفەرئەلدین میرزای جێگەر کە لەتەبریز بووە، لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت و بەئەندازەی ساڵەکانی پاشایەتی قاجارییەکان، ١١٤ تۆپی تەقاندووە و لەڕۆژی یەکشەممەی ٢٥ زیئەلحەججە، گەشتۆتە تاران. ئەتابەکی مەزن، ڕێوڕەسمی تاج لەسەر کردنی ئامادە کردووە و ئەم هەواڵەی بۆ هەموو ویلایەت و شارەکان ناردووە و بەم بۆنەیەوە هەموو شارەکانیان ڕازاندۆتەوە. حیسام ئەلمولکی ئەمیریش فەرمانیداوە بۆ ماوەی پێنج شەو وڕۆژ شارەکە بڕازیننەوە و هەموو زاناکان و پیاوماقووڵان و بازاڕییەکانی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگێشت کردووە. پێنج شەو ڕۆژ دووکان و بازاڕەکانی ڕازاندۆتەوە. دوای بڵاو بوونەوەی هەواڵی کوژرانی ناسرئەلدین شای قاجار، سەرۆك تایەفەکانی سەرسنور، کەوتونەتە جموجۆڵ و هێرش و پەلامارەکانیان دەستپێکردووە و بارودۆخی پاشاگەردانی هاتۆتە ئاراوە. شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شاعیری بەناوبانگی کورد، ئەم چوارینەی ژێرەوەی سەبارەت بەکوژرانی ناسرئەلدین شا نووسیوە:

ئەهلی عیبرەت بێنە و با سەیری ئەسری شا بکەن

دووله دوو سێ کەم شەهی کرد و کشێکی ڕێ نەهات
هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کەسەد تیپ و سوپا
پاسبانی بوو لەنێویشدا پیادە کردی مات.

ڕۆژی هەینی ١٢ صەفەری ١٣١٤، وەك نەریت لەجێگەی باوکم ڕۆشتمە مزگەوت تا نوێژی هەینی بخوێنین. کاتێك دەمویست بڕۆمە سەر مینبەر و وتار بخوێنمەوە، مەلا عەبدولڕەزاقی ئەمین ئەلسەلام، لەئەنجامی چەندین کار کەشیاوی ئاماژە پێدان نییە، بەرماڵەکەی هەڵگرت و وتی: ئێمە لەپشتسەری منداڵێکی نابالغ نوێژ ناخوێنین. ئەمەی وت و لەگەڵ ژمارەیەك لەکەسەکانی لەمزگەوت ڕۆشتنەدەر. ڕۆشتنی ئەو کاریگەری لەسەر کەسانی دیکە دانەنا و کەس گرنگی ئەوتۆی پێنەدا. کاتێك گەیشتە ناو حەوشی مزگەوتەکە و بینی کەس بەدوایدا نەهاتووە، ئەو چەند کەسەی هاوڕێی بەدەم جوێن و قسەی ناشیرین و چەقۆ بەدەست بۆ ناو مزگەوتەکە گەڕاندەوە تا بڵاوە بەخەڵك بکەن. فەقێ ڕەحیم ناوێك کەلای شێخ شوکرللەی ئامۆزام دەرسی جامی دەخوێند، خەنجەر بەدەست هێرشی کردە سەر من و باوکم بۆ ئەوەی بمانکوژێت. شێخ محەممەد نەسیمی مەردۆخی و دەستەیەك لەئەهلی جەماعەت، بەردەم میحرابەکەیان گرت و ڕێگەیان نەدا دەستی بەئێمە بگات. سەرئەنجام ئەو چەند کەسە، بەزۆر خەڵکیان لەمزگەوتەکە دەرکرد. من و باوکیشم هاتینەدەر بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ماڵ. لەناو حەوشی مزگەوت، خەڵك ڕێگەیان لێگرتین و وتیان پێشنوێژ دەبێت ئێستا نوێژ بخوێنێت و ئێمە لەپشت سەری ئەو ڕیز دەبەستین. بەرماڵیان ڕاخست و باوکمیان ناچار کرد پێشنوێژی بکات. هێشتا کۆتایی بەسورەی فاتیحە نەهێنابوو کەدووبارە ئەو خراپەکارانە بەسەرۆکایەتی مەلا عەلی نەقی سەدر ئەلشەریعە، چەقۆ و خەنجەر بەدەست گەڕانەوە و بڵاوەیان بەخەڵك کرد و دووبارە بەمەبەستی کوشتنی من و باوکم، پەلاماریان داین. دەستەیەك بەرگرییان لێکردین و لەناو هێرش و بەرگری هێرشبەران و بەرگریکاران، ئێمە خۆمان گەیاندە حوجرەی مزگەوتەکە. مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام و دەستەیەك کە لەناو حوجرەکەدا بوون، لەترسی ئەوەی نەکا هێرشبەران پەلاماری حوجرەکە بدەن، بەخێرایی هەستان و هەڵاتن و ئێمەیان بەتەنیا بەجێهێشت. ئێمە لەترسی ئەوان، دەرگای حوجرەکەمان بەست و دوو بەدوو لەناو حوجرەکەداماینەوە. پیاوەکانی ئێمەیش کە لەدەرەوە بوون، هەڵاتن و خۆیان دەرباز کرد و ئاشناکانیان ئاگادار کردبوویەوە. لەناکاو بینیمان خراپەکاران

و نەیارەکانمان هێرشیان هێنایە سەر حوجرەکە. دووبارە دەستەیەك بۆ بەرگری کردن دەرکەوتن و پاشەکشێیان پێکردن. ئەوان کە لەهاتنە ناو حوجرەکە بێ هیوا ببوون، مەبەستی ئەوەیان کرد بەپاچ و خاکەناز حوجرەکەمان بەسەردا بروخێنن. لەناکاو لەکونی حوجرەکەوە بینیمان مستەفابەگی شەهبەندەر و ئاغا نەسروڵڵە و دەستەیەك لەهاووڵاتیانی عوسمانی، سیلاح بەدەست دەرکەوتن. لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەوە دەستیان بەلێدان و فەلاقە کردنی خەڵکان و هێرشبەران کرد. لەماوەی پێنج شەش خولەك هیچکام لەنەیارەکانی ئێمە لەحەوشی مزگەوتەکەدا نەما و ژمارەی هاریکارەکانمان زیادیکرد. مسکێنە ئەمەکدارەکانیش کەنزیکەی سی کەس هاتبوونە شار و لەماڵی محەممەد جەعفەری متەولی باشیدا بوون، بەتفەنگ و تێلاً بەدەست، شان بەشانی مەلا موسای کوڕی متەولی باشی بۆ هاوکاری کردنی ئێمە هاتن. سەیید عەبدولڕەحمان و سەیید عەبدولڕەحیمی نامانی ڕەوانەدزی کە لەمزگەوتی خۆرشید لەقا خانم لەبەردەم ماڵی موشیر دیوان، لای مەلا عەبدولعەزیم دەرسیان دەخوێند، لەگەڵ ژمارەیەك فەقێ، خەنجەر و دەمانچە بەدەست پەیوەستی هاوڕێیانی ئێمە بوون و سەرئەنجام من و باوکم لەناو خۆشحاڵی و شادومانی ئەوان بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە. ئەو ڕۆژە نوێژی هەینی نەخوێندرا. حیسام ئەلمولکی فەرمانڕەوا بەهۆی کوژرانی شا و پشێوی بارودۆخ بوێری خۆهەڵقورتاندن لەم کێشەی نەبوو و بەهۆی بروسکە، دەرباری لەم ڕووداوانە ئاگادار کردبوویەوە. فەرمانی دەرباری لەلایەن میرزا عەلی ئەسغەر خانی ئەتابەکی ئەعزەم، بۆ حکومەتی کورستان ڕەوانە کرا بەم پێیە: ئاگادار بووینەوە مەلا عەبدولڕەزاق ناوێك لەگەڵ دەستەیەك خراپەکار، لەمزگەوتی جامیع، دژی پێشنوێژ و وتار خوێن و کوڕەکەی ئاژاوەیان ناوەتەوە و مەبەستی کوشتنی ئەوانیان کردووە و ئێوە بێدەنگبوون. لەزووترین کات، هاندەران و ئەنجامدەرانی ئەم کردەوەیە سزا دەدەن و خودی مەلا عەبدولڕەزاقیش دەبێت تەمێ بکرێت.

حکومەتی کوردستان لەترسا، توانای ئەنجامی هیچ کارێکی نەبوو. لەوەڵامی بروسکەکە وتبووی لەئێستا لەبەرژەوەندیدا نییە. سەرئەنجام دوای ماوەیەك، فەرمانڕەوا، بەڕواڵەت بەمەبەستی گەڕان، بەڵام لەناخەوە لەترسا، رووی کردە ئەمانیە و لەوێ خێوەتیان بۆ هەڵدا.

شەوێك حەسەن چەقەڵ ناوێك، خۆی دەگەیێنێتە خێوەتەکەی ئیحتیشام ئەلدەولە و میوە و خۆراکی ناو خێوەتەکە بەدەفر و قاپەکانەوە دەدزێت. حیسام ئەلمولك کاتێك لەم ڕووداوە

ئاگادار دەبێتەوە، فەرمانی شاردنەوەی کێشەکە دەدات. حەسەنە چەقەڵ دوو ڕۆژ دواتر بۆ ئەوەی زیرەکی و بەتوانایی خۆی بسەلمێنێت، بابەتەکە بڵاو دەکاتەوە. حیسام ئەلمولك دوای گەڕانەوە بۆ شار، حەسەن چەقەڵ بانگ دەکات و تا دەتوانێت، دارکاری دەکات. مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام ئەم بابەتە دەکاتە بیانوو و دەست بەهاندان و هەڵخراندنی خەڵکان دەکات. هەموو فەقێ و مامۆستاکان لەمزگەوتی دارئەلئیحسان کۆدەبنەوە و لەوێوە پەیام بۆ حیسام ئەلمولك دەنێرن تا دڵنەوایی حەسەنە چەقەڵ بکات و قەرەبووی بکاتەوە. حیسام ئەلمولك بەم داوا نەنگینە ڕازی نابێت. فەقێکانی ناو مزگەوتەکە پێکەوە، بەخەنجەر و داردەست و تێلاً هێرش دەکەنە سەر بینای حکومەتی. محەممەد عەلی وەرشکە و براکانی لەگەڵ محەممەدسادق لله کەریم و کرێکارەکانی فەڕاشخانە، لەبەردەم دەروازەی قەڵاکە، ڕێگە لە فەقێکان دەگرن. فەقێکان هەرچەند هەوڵیانداوە دەروازەکە بکەنەوە، سەرکەوتوو نەبوون. دەستەیەك هێرش دەبەنە سەر ئاخوڕی حکومەتی و هەموو ئەسپ و زین و بەرگەکانی تاڵان دەکەن. فەڕاشەکان کاتێك دەزانن ژمارەی فەقێکان کەم بۆتەوە و بەمەبەستی کۆکردنەوەی تاڵانی بڵاوەیان لێکردووە، دەروازەکە دەکەنەوە. ئەوانەی لەپشت دەروازەکەوە بوون، بەلێشاو دەڕۆنە ژور. محەممەد عەلی وەرشکە و کرێکارەکان، بەخێرایی دەروازەکە دەبەستن و ئەو ژمارەیە لەناو تالارەکان زیندانی دەکەن. چەند کەسێك بریندار و ئەوانی دیکە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. دەستەیەك خۆیان لەقەڵاکە فرێداوەتەوە خوارەوە ودەستەیەك لەڕێگەی فیردەوسیەوە خۆیان دەرباز کردووە. لەناو بریندارەکان مەلا بیلال، فەقێی تالشی بوو کەسەری لەدوانزە شوێنەوە بریندار کرابوو.

دوای بریندار بوونی فەقێکان، دووبارە هەموویان لەماڵی عەبدولڕەزاقی ئەمین ئەلئیسلام کۆدەبنەوە و بەفەرمانی ئەو، بەناوی تۆڵەسەندنەوەی فەقێکان، هێرش دەکەنە سەر ماڵی شێخ محەممەد تەقی هەمدانی، ئەو ئیمامەی پێشتر ئاماژەمان پێدا. ئەو لەماڵەکەی دەهێننەدەر و بەرەو ماڵی موشیر دیوانی دەبەن. موشیر دیوان فەرمانی داخستنی دەرگاکانی دەدات و ڕێگەی چوونە ژوورەوەیان پێنادات. لەوێوە دەیبەنە ماڵی مەلا لوتف اللە شێخولئیسلام، لەبەردەم ماڵی ساعید سوڵتان کوڕی ئاسیف، سەید عەبدولڕەحمان و سەیید عەبدولڕەحیمی ڕەواندزی، بەخەنجەر ورگی هەڵدەدڕن. دوای کوشتنی ئەم شێخە، فەقێ و شوێنکەوتەکانیان دەست بەکوشتنی شیعەکان و تاڵان کردنی ماڵەکانیان دەکەن. ئاژاوە و

پشێوی بەخێرایی لەناو شاری سنە و ناوچەکانی دیکە سەرهەڵدەدات. شەوان لەبەردەنگی گوللەی تفەنگ، کەس نەیدەتوانی بخەوێت.
ڕۆژی سێشەممەی ٢٩ رەبیع الاوەل، دانیشتووان دەڕۆنە بروسکە خانە، حیسام ئەلمولك لەسەر کار لادەبرێت و لەڕۆژی سێشەممەی ٦ رەبیع الثانی، حەسەن عەلی خان ئەمیر نیزامی گەڕوسی بۆ جاری دووەم وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریدەکرێت.

## حکومەتی حەسەن عەلیخان، ئەمیر نیزامی گەڕووسی، جاری دووەم

دوای لابردنی حیسام ئەلمولکی ئەمیر، ڕۆژی سێشەممە ٦ رەبیع الثانی ١٣١٤، حەسەن عەلی خان ئەمیر نیزامی گەڕووسی وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا و ڕۆژی شەممە ١٧ رەبیع الثانی هاتە ناو کوردستان و شاری سنە و شوێن بکوژەکانی شێخ محەممەد تەقی کەوت. خەلیفە بەها ئەلدین و میرزا بابان ناوێك کەهۆکاری کوژرانی ئەو بوون، بەدەستی ئەمیر نیزام خنکێنران لەکاتێکدا بکوژەکەی وەك ئاماژەمان پێدا، سەیید عەبدولڕەحمانی ڕەواندزی بوو. نزیکەی بیست هەزار تمەنی وەك خوێنبایی بەسەر دانیشتووانی شار و گوندەکان سەپاند تا لەلایەن دەوڵەتەوە بەمناڵەکانی شێخە کوژراوەکە بدرێت. مەلا عەبدولڕەزاقی ئەمیر ئەلئیسلام بۆ کۆکردنەوەی ئەو پارەیە و تەسلیم کردنی بەدەوڵەت دەستنیشانکرا کەخۆی یەکێك بوو لەبکوژەکانی شێخ مەلاعەبدولرەزاق بەهاوکاری موشیر دیوان، زیاتر لەسی هەزارتمەنی لەدانیشتووانی شار و گوندەکان کۆکردەوە. بیست هەزار تمەنیان خستە ناو سنووقی حکومەتی و پاشماوەی پارەکە لەنێوان کەسەکانی خۆی و کەسەکانی موشیردیوان، دابەشکرا. دوای ماوەیەك ئەمیر نیزام، بۆ گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایشی ئازەربایەجان دیاریکرا و عەبدولحوسەین خانی سالار ئەلمولکی کورشی وەك جێگری خۆی لەکوردستان دیاریکرد و موشیر دیوانی کردە وەزیر ئەو. ڕۆژی هەینی دەی رەجەبی ١٣١٤، شێخ عەبدولمۆئمینی باوکم کۆچی دووای کرد، ئێوارێی شەممە پانزەی مانگ، سالار ئەلمولکی فەرمانڕەوا، لەگەڵ زۆربەی پیاوماقووڵانی شارەکە هاتنە ماڵی ئێمە و کۆتاییان بەپرسەکە هێنا و دۆعای خەتم خوێنرا. دوای ماوەیەك دوو دەستە سەرباز بەسەرۆکایەتی ئەسعەد سەڵتەنەی زەنجانی هاتە ناوکوردستان، لای باخێك خێوەتیان هەڵدا تا لەگەڵ دەستەی زەفەری کوردستان بۆ سەرکوت کردنی هەورامان و مەریوان بەڕێکەوتن. موشیر دیوان هەوڵەکانی دەستپێکرد و بۆ ئەوەی خزمەتەکانی خۆی بەئەمیر نیزام

بسەلمێنێت، بەهەر هۆکارێك بووە، نادر سوڵتان و ڕەزا قولی بەگ و دەستەیەك لەخانەکانی هەورامانی لەگەڵ شێخ عومەر زیائەدلدین هێنایە شار و ملکەچی و گوێرایەڵی خۆیان نیشاندا و بڕە پارەیەکیان پێشکەش کرد. بەمشێوەیە سوپاکە گەڕایەوە و خانەکانیش بۆ ناوچەکانی خۆیان گەڕانەوە. تەنیا نزیکەی سەد تفەنگچی بەسەرۆکایەتی حسەین خانی کوڕی ڕەزا قولی بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی حکومەت و پارێزگاری کردن لەدەروازەی قەڵای حکومەتی مانەوە. ڕۆژی دووشەممە ١٣ شەوالی ١٣١٥، مەلا لوتف الله شێخولئیسلام مرد. وشەی (غفرلە) ساڵی مردنی ئەوە. لە ٢٢ شەوالی ئەم ساڵە، مەلا عەبدولڕەزاقی ئەمین ئەلئیسلام، نازناوی شێخولئیسلامی پێبەخشرا و مەلا ئیبراهیم نەوەی مەلا لوتف الله کەگەنجێکی وشیاری ١٤ ساڵە بوو، نازناوی ئەمیر ئەلئیسلامی پێبەخشرا. لەجومادی الثانی ١٣١٦، سالار ئەلولك لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دوورخرایەوە و حاجی میرزا مەحمودخان ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە جێگەی گرتەوە.

## حکومەتی حاجی میرزا مەحمود خانی ئیحتیشام ئەلسەلتەنە

دوای لابردنی ئەمیر نیزام و ڕۆشتی سالار ئەلمولکی کوری لەکوردستان، ڕۆژی سێشەممە ٤ شەوالی ١٣١٦، بروسکەی حکومەت بەحاجی میرزا مەحمود خانی ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە ئەمیر تومان، یاریدەدەری وەزیری دەرەوە گەیشت. لە ٢٧ زیقەعدە هاتە کوردستان. کەسێکی وشیار و دوورئەندێش بوو. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەگەڵ خەڵکان هەڵسوکەوتی کرد. یەکێك لەفەرمانەکانی ماوەی فەرمانڕەوایەتی کردنی لەکوردستان ئەوە بوو بەپیلانی نەیاران و ناحەزان، سلێمان خانی شەرەف ئەلمولك و ئەمان الله خانی وەکیل ئەلمولك و محەممەد کازمی نەسیر دیوانی دارکاری کرد و نزیکەی بیست و پێنج هەزار تمەن جەریمەی کردن. دوای خۆی هەستی بەڕاستی بابەتەکە کرد کە نەیارەکانی ئەو کەسانە بۆ ئەو کارە ناچاریان کردووە و دڵنەوایی کردن. لە١٥ ڕەمەزانی ئەم ساڵە مەلا ئەحمەدی نەسیر ئەلئیسلام کەکەسێکی زانا بوو، بەنەخۆشی جەڵتە کۆچی دواییکرد. لەحکومەتی سالار ئەلمولك، زۆربەی دانیشتووانی کوردستان، پێناسی هاووڵاتی بوونی دەوڵەتی عوسمانییان وەرگرت و خراپەکارییان کردبووە پیشە. ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە، بۆ جیاکردنەوەی هاووڵاتیان راسپێردرا. لەئەنجامی هەوڵ و ماندوو بوونی زۆر، ناموسوڵمانەکانی لەموسوڵمانەکانی دەوڵەتی عوسمانی

جیارکردەوە و دانیشتووانی کوردستان تا رادەیەك لەدەست ئەم کارەی دانیشتووانە تازەکەی کوردستان ڕزگاریان بوو. ڕۆژی ۲۳ ڕەمەزانی ۱۳۱۸، بروسکەی لەسەر کار لابرانی ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە و فەرمانڕەوایەتی میرزا ئەبوئەلقاسم خانی ناسر ئەلمولك گەیشت. ڕۆژی ۲۵ ڕەمەزان ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە کوردستانی بەجێهێشت.

## حکومەتی ئەبو ئەلقاسم خانی ناسر ئەلمولك

دوای لابردنی ئیحتیشام ئەلسەڵتەنە، ڕۆژی ۲۳ ڕەمەزانی ۱۳۱۸ حکومەتی کوردستان بەئەبو ئەلقاسم خان ناسر ئەلمولکی هەمەدانی سپێردرا و ڕۆژی هەینی ۱۱ شەوال، بروسکەی ناسر ئەلمولك گەیشت و پێگەی جێگری خۆی بەموشیر دیوان سپارد. ڕۆژی دووشەممە ۲ زیحەججەی ۱۳۱۸ هاتە ناو کوردستان. لەگەڵ گەیشتنی بۆ کوردستان، هەموو کاروبارەکانی شار بەڕەزامەندی میرزا سلێمان خان کەهەمەکارەی ئەو بوو، بەموشیر دیوان سپارد و خۆی سەرقاڵی دروستکردنی بینایەك لەئەمیرییەی کاوەساڵە سەرقاڵ بوو. ئەو شوێنەی کردە شوێنی مانەوەی خۆی و بەناسرییە ناوی دەرکرد. ماوەی چوارساڵ و چوارمانگی لەکوردستان وەك کەسێکی ڕێزدار و وشیار بەسەر برد. هەمیشە خۆی دەیوت: ((من لەکەس پارە وەرناگرم، پارەیش بەکەس نادەم.)) کردەوەکانی لەسەرخۆ و عەقڵانی بوو. بەباشی دەیتوانی بەزمانی ئینگلیسی و فەرەنسی قسە بکات و کەسێکی خوێندەوار بوو. یەکێك لەهاوپۆلەکانی، سەراد واردگەری، وەزیری دەرەوەی ئینگلیس بوو. حەزی بەئازاردانی خەڵك نەدەکرد. هەمووانی بەئاغا بانگ دەکرد.

بەتاوانباری دەوت: ئەم ئاغایە ببەن و بەڕێزەوە دارکاری بکەن. لەتەنیایش کاتێك کەسی لانەبوو، بەئەدەبەوە دادەنیشت. لەو گەردەنەی لەحەسەن ئاواوە دەڕواتە گوندی کێلانە و بە کەل سەیف بەناوبانگە، پیاوێکی مەلەکشانی کوژرابوو، تۆمەتی کوشتنی ئەویان خستبووە پاڵ دوو کەسی هەژار بەناوی ئیبراهیم و عەلی ئەکبەر. ناسرئەلمولك کەسی بۆ لای باوکی ئەوان نارد تا ئەو دووانە ڕەوانەی قەڵای حکومەتی بکات. بەو بیانووەی تەنیا پرسیار و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێت. بەماوەی یەك کاتژمێر هەواڵیان هێنا کەئیبراهیم و عەلی ئەکبەریان زیندانی کردووە. بۆ ئێواریێ خۆم ڕۆشتمە قەڵای حکومەتی و لەهۆکاری زیندانی کردنی ئەوانم پرسی. وتی کەسێکی مەلەکشانی دوێشەو لەکەل سەیف کوژراوە و دەڵێن عەلی ئەکبەر و ئیبراهیم، لەوێوە گوزەریان کردووە. ئەو تفەنگەیشیان پێبوو کەکوژراوەکەی

پێکوژراوە. خۆیشیان دانیان بەوەدا ناوە کەدویٚ شەو لەویٚ بوون و تفەنگیان پێبووە. لەبەر ئەمە فەرمانی گرتنی ئەوانم دەرکرد تا ئێوە لەسزاکەیان ئاگادار بکەمەوە. وتم: ئەگەر تەنیا هەڵگرتنی کەرەستەی کوشتن هۆکاری کوشتن بێت، پیاوەکانی من، کەرەستەی زینایشیان پێبووە، کەواتە دەبێت گومانی زیناکارییان لێبکرێت. لەوەلاٚمدا کەمێك بێدەنگ بوو و دواتر فەرمانی ئازاد کردنی ئەو دوو کەسەی دەرکرد. لەو بەرواره بەدوواوە پەیوەندی نێوان ئێمە گەرم و گوڕتر بوو. ئەم وتەیش لەنێوان ئێمەدا بوو بەپەند کەکەرەستەیەکی دیکەی پێبووە و بۆ هەموو بابەتە هاوشێوەکان بەکاری دەبرد و پێدەکەنین.

لەزیقەعدەی ١٣١٩، هەواڵی مردنی شێخ محەممەدی نەسیم لەگوڵعەنبەری شارەزوور گەیشتە سنە. لەساڵی ١٣٢٠ حاجی شێخ عەلی کوڕی حاجی شێخ شوکراللە کەگەنجێکی وشیار و خۆشنووس بوو، ماڵئاوایی لەجیهان کرد و لەساڵی ١٣٢١، خودی حاجی شێخ شوکرللە مرد و لەساڵی ١٣٢٢ نەخۆشی کۆلێرا لەخوراسانەوە گەیشتە کوردستان و زیانەکان فراوان بوو. ناسرئەلمولك بەخێرایی ڕۆشتە ناسرییە و لەویٚ گۆشەگیر و پەیوەندی لەگەڵ هەمووان پچڕاند. جگە لەچەند کەسێك کەفەرمانی پێدابوون چاودێری تەندروستی خۆیان بکەن، مۆڵەتی بینینی بەکەس نەدەدا. ڕێگەی لەسلاٚوی جەژنی تاجگوزاری گرت. شەوی تاجگوزاری لەتەپۆڵکەی کچکەڕەش یاری ئاگرینیان دەستپێکرد و خۆی بەدووربین لەناسرییەوە سەیری دەکرد. منیش لەگەڵ خێزانەکەم ڕۆشتینە گوندی تەختە و لەویٚ نیشتەجیٚ بووین. کۆتاییەکانی پاییز کەشوێنەواری نەخۆشییەکە نەما، بۆ شار گەراینەوە. لەشەوالی ئەم ساڵە، ١٣٢٢، هەواڵمان پێگەیشت سەیید عەبدوللە بەهبەهانی و سەیید محەممەدی تەباتەبایی و دەستەیەکی فراوان لەدانیشتووانی تاران، ڕۆشتوونەتە شاعەبدولعەزیم و کۆبوونەتەوە و لەشا خوازیاری مەشروتە بوون و پەیمانیان وەرگرتووە بەلاٚم شازادە عەین ئەلدەولە پەیمانەکەی نەبردەسەر. ڕۆژی چوارشەممە ١٢ موحەڕەمی ١٣٢٣، ناسرئەلمولك لەسەر کار لابرا و شازادە سالار ئەلدەولە وەك فەرمانڕەوای کوردستان هەڵبژێردرا.

دوو سیٚ ڕۆژ پێش ڕۆشتن، ڕۆشتمە ناسرییە و موشیر دیوانم لەگەڵ خۆم برد. منی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگێشت کردبوو. دوای نان خواردن، دەستی موشیری گرت و بەڕێگەدا دەڕۆشت. منیش وەستابووم. بەموشیر دیوانی وت: من بەیانی یا دووبەیانی دەڕۆم، لەدوای من

کەسێکی دیکە دێت، لەئاگری ئارەزووەکانی ئەو خۆتان بەدوور بگرن، زۆر نامێنێتەوە.
دوای ئەوە ولآت دەبێتە ولآتێکی مەشروتە. من ئێرەم بۆ حەوانەوەی ئێوە لەو کاتەدا دروستکردووە، لەو ڕۆژەدا بارودۆخی ئێوە لەگەڵ مندا ناگونجێت.، ئەگەر خۆتان بەدوور بگرن، ئاسوودەن و گەرنە دەبنە پارووی مەترسییەکان، بەتایبەت ئەمڕۆ بەئامادەبوونی فلآنە کەس ئەم قسانەتان وەك یادگاری بۆ دەڵێم، ئەگەر گوێرایەڵی وتەکانی من بوون، پێشنیار بەفلآنیش دەکەم لەو کاتەدا هاوڕێی ئێوە بێت و ئێوە بەدەستی میهرەبانییەکانی سروشت دەسپێرم.

## حکومەتی شازادە ئەبو ئەلفەتح میرزا سالار ئەلدەولە

دوای لابردنی ئاسرئولمولك، ڕۆژی هەینی ٢٥ موحەڕەمی ساڵی ١٣٢٣، شازادە ئەبوئەلفەتح میرزای سالار ئەلدەولە، کوڕی موزەفەر ئەلدین شا، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا و ڕۆژی شەممە لەمانگی ڕەبیع الثانی، هاتە ناو کوردستان. پیاوماقووڵان تا سەڵوات ئاوا و بازرگانەکان و بازاڕییان تا داوێنی پیرمحەممەد بەرەو پیری ڕۆشتن. لەکاتی گەیشتنی بۆ ناو بازاڕییەکان، لەناو گالیسکەکەی خۆیەوەوە فەرمانی دەدا: بکەونە سەر خاك، بکەونە سەر خاك. خەڵکی داماویش کەوتنە سەر خاك و زەوییان ماچ کرد و خودی شازادە لەم کارەی ئەوان، پێدەکەنی. کاتێك گەیشتە تۆپخانە، فەرمانیدا مورتەزا خانی شوجاع لەشکری ئەردەڵآن کەسەرۆکی تۆپخانە بوو، لەسەر زەوی درێژ بکەن و دارکاری بکەن بەبیانوی ئەوەی تۆپەکان دەنگی کەم بووە. کاتێك گەیشتە قەڵآی حکومەتی، شێخ محەممەد ڕەزای حوجەت ئەلئیسلام و مەلا عەبدولڕەزاقی شێخولئیسلام و من و مەلا عەلی نەقی سوڵتان ئەلعولەما، تا بەردەم دەروازەی قاپچی بەرەو پیری ڕۆشتین و لەدوای ئەو، ڕۆشتینە ئەو ژوورەی زاناکان دانیشتبوون. شازادە بێ ئەوەی دانیشێت، بەوەستانەوە دەستیکرد بەقسەی زل و تانە و تەشەر لێدان کەمن حاکم نیم، من مالکی ڕقابم. پاشای باوکم، کوردستان و گەڕوسی بەمن بەخشیوە. من خاوەنی ژیان و ماڵی هەموو دانیشتووانی گەڕوس و کوردستانم. هەرکەس بکوژم، یا بەهەر کەس ببەخشم، کەس لەمن ناپرسێتەوە. لەبەر ئەوەی هیلاکم، مۆڵەتتان پێدەدەم بڕۆن.... هەمووومان هاتینەدەر و کاتێك گەشتینە ناو حەوشەکە، شێخ شەیپور کە لەگەڵ شازادە هاتبوو، هات و ماڵئاوایی لێکردین و بەچرپە بەمەلا باقری شێخولئیسلامی وت: شەو وەرنە و چاوتان بەمن بکەوێت.

ئەوکەسانەی لەگەڵ شازادە هاتبوون، بریتی بوون لە: ١. شازادە مەزهەر ئەلدەولە کوڕی روکن ئەلدەولە، ٢. یەمین ئەلسەڵتەنە، ٣. یەمین ئەلدەولە، ٤. نەسیر ئەلمولك شیرازی وەزیر. ٥. میرزا حەبیب الله خانی عەلی ئابادی مونشی باشی، ٦. عاسم ئەلمولکی فەڕاش باشی، ٧. مەلەك ئەلموتەکەلمین، ٨. شێخ شەیپور. ئەم دوو کەسە هاودەم و هاونشینی شازادە بوون. دوای ئەوەی زاناکان و پیاوماقووڵان لەقەڵای حکومەتی هاتنەدەر، بەخێرایی فەرمانیدا سارم نیزامی فەڕاش باشی لەو شوێنەی کەچەندمانگ پێشووتر عەبدوڵڵەی فەڕاشی خۆی بەخەنجەر کوشتبوو، سەر بڕن. لەبڵاو بوونەوەی ئەم هەواڵە، ئاژاوە کەوتە ناو شار، هەموو دانیشتووان ترسیان لێ نیشت. بەرادەیەك ترس لەدڵی دانیشتووان دروست ببوو کەفەڕاش بەدوای وەستادا ڕۆشتبوو تا قادرمەکانی ژوورێکی قەڵای حکومەتی چاکبکاتەوە بەڵام کاتێك فەڕاش بەوەستا دەڵێت، شازادە بەیانی تۆی دەوێت، وەستا بەخێرایی دەکەوێتە سەر زەوی و جەڵتە لێی دەدات. بەیانی ئەو ڕۆ ژە پێنج هەزار تمەن پارەی نەختی لەمەلا باقری فەخرولئیسلام وەرگرت، مەلا عەبدولڕەزاقی برای کەشێخولئیسلام بوو، لەسەر کار لابرد و نازناوی شێخولئیسلامی بەو بەخشی، دوای چەند ڕۆژ موشیر دیوان و موعتەمیدی گرت و وەك قەرەبووی کارەکانیان داوای سەد هەزار تمەنی لێدەکردن. سەرئەنجام بەشەست هەزار تمەن، ڕازی بوو. موشیر دیوان و مەلا عەبدولڕەزاق، هەردووك خانەنشین کران و ڕێگەی نەدا کەس هاتوچۆیان بکات. عەلی خانی بابانی بۆ لای مەحمود پاشای جاف نارد تا کچەکەی بۆ شازادە خوازبێنی بکات و هەروەها بەڵێنی لێ وەربگرێت لەکاتی پێویست بەهەموو هێزی جاف بۆ هاوکاری شازادە بێت تا کوردستان بەتەواوی لەژێردەست و دەسەڵاتی شازادەدا بێت. کاتی گەڕانەوەی عەلی خانی بابان، شێخ عەبدولغەنی مەردۆخی وکەی خوسرەوبەگ کوری مەحمود پاشا هاتنە لای شازادە و لەگەڕوس چاویان بەشازادە کەوت و لەگەڵ شازادە بۆ سنە گەڕانەوە.

لەدەورانی فەرمانڕەوایەتی شازادە، گرتن و زیندانی کردن و لێدان و ئەشکەنجە فراوان بوو، کەس لەژیان و سامانی خۆی دڵنیا نەبوو. لەو پارانەی لەخەڵکی وەردەگرت، چەندین گوند و زەوی کڕی. دوو سێ جار لەدانیشتنە نهێنییەکان، شازادەم لەبارودۆخی خراپی خەڵکان و شار ئاگادار کردەوە. ڕۆژ بەڕۆژ گوشار و نائارامییەکان زیادی دەکرد و ناڕەزامەندی لەفەرمانڕەوایەتی شازادە گەشتبووە ترۆپك. شەوی یانزەی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٣، موشیر

دیوان بەنهێنی داوای بینینی منی کردبوو، دوای کاتژمێر شەشی شەو، بەنهێنی ڕۆشتمە ماڵەکەی. بەکورتی موشیر دیوان داوای دەکرد من لەگەڵ قازی ئیسماعیل بڕۆینە تاران یا کرماشان و دەربار لەم بارودۆخە ئاگادار بکەینەوە تا شەڕی شازادە لەکوردستان نەمێنێت. لەبەر هەندێ هۆکار و لەمپەر نەمتوانی بەڵێنی ڕۆشتن بدەم بەڵام وتم ئەگەر دەتوانن مەلا عەبدولڕەزاق ڕەوانەی کرماشان بکەن و دڵنیان حاجی نەسیر ئەلئیسلامیش لەگەڵی دەڕوات. منیش بۆ ناردنی بروسکە گشتی و نهێنییەکان ئامادەم. دواتر ئەگەر پێویستی کرد خۆم بەرەو تاران بەڕێدەکەوم. موشیر دیوان ئامادە کردنی مەلا عەبدولڕەزاقی خستە ئەستۆی من و قازی ئیسماعیل. دوو شەو دواتر من و قازی لەگەڵ ئەوەی هەوا سارد و بەفر دەباری، لەلارێوە خۆمان گەیاندە ماڵی مەلا عەبدولڕەزاق. دوای گۆڕینەوەی بیروبۆچوونەکان، ئەومان بۆ ڕۆشتن ئامادە کرد. تەنیا چاوەڕوانی خەرجی گەشتەکەی دەکرد. بڕیارماندا موشیر دیوان دووسەد تمەن پارەی نەخت و هەزار تمەن بەراتی کرماشانی بۆ بنێرێت. دوای کۆتایی هێنان بەگفتوگۆ و بەڵێنەکان، هەستاین، ئەملاولای یەکمان ماچ کرد و پێمان وت ئەمە دوا دیداری ئێمەیە چوونکە ئەگەری هەیە چیتر نەتوانین بێینە ئێرە. پازی لەپشت مزگەوتی دارئەلئیسحان و منیش لەڕێگەی ڕووباری مەیابەروانەوە گەڕاینەوە. سەرئەنجام موشیر دیوان هەموو کەرەستەکانی سەفەرەکەی بۆ ئامادە کرد و شەوی ۲۸ ڕەمەزان لەگەڵ ئەوەی نەخۆش بوو، لەگەڵ دوو سێ لەپیاوەکانی خۆی بەڕێکەوت. کاتژمێر سێی شەو کاتێك دەگەنە گوندی گرێزە، لەتاو سەرما و نەخۆشی، شەو لەوێ دەمێننەوە. بەیانی لای نیوەڕۆ هەواڵی ڕۆشتنی شێخولئیسلام بەسالار ئەلدەولە دەگات. بەخێرایی وەکیل ئەلمولك و موجەرەب ئەلدەولە و حاجی مەلا باقری شێخولئیسلام بانگ دەکات و دوای تووڕە بوون و جوێندان بەمەلا عەبدولڕەزاق دەڵێت: بەخێرایی و بەسوار ئەسپ بڕۆن بەدوایدا و لەهەر شوێنێك بینیتان، بیبەستنەوە و بیگەڕێننەوە. وەکیل ئەلمولك دەڵێت: ئەو کەسەی بەشەو ڕۆشتووە، بیری لەمەترسیەکانی گرفتار بوونیش کردۆتەوە، ئێستا بەدڵنیاییەوە یا لەهەمەدانە یا لەکرماشان و ناتوانین پێی بگەینەوە. ئەگەر گەڕانەوەی ئەو پێویستە، بروسکە بۆ هەمەدان یا کرماشان بنێرن تا بیگەڕێننەوە. جیاواز لەوە ڕۆشتنی ئاخوندێك (مەلا) کەی ئەوەندە گرنگە. شارەکە لەژێر دەستی ئێمەدایە و کەس نازانێت ئەو بەرەو تاران ڕۆشتووە یا لەترسا پەنای بۆ کەسێکی دیکەی بردووە تا لای ئێوە، تکای بۆ بکات. ئێستا بێ هۆ، بۆ

بشلەژێن. شازادە بەمشێوەیە بەچاوەڕوانی ڕازی دەبێت و دەست لەشوێنکەوتنی ئەو هەڵدەگرێت. مەلا عەبدولڕەزاق بەیانی ئەو شەوە، دەمەو نیوەڕۆ، لەگرێزەوە بەڕێدەکەوێت و لەماوەی دوو شەو و ڕۆژ دەگاتە کرماشان و لەماڵی ئاغا عەبدولڕەحیمی موجتەهید دادەبەزێت. بەدوای ئەو، مەلا عەلی نەقی سوڵتان ئەلعولەما و دواتر حاجی نەسیر ئەلئیسلام لەلاڕێوە دەڕۆنە کرماشان. لەوێ دانیشتووانی کرماشان و ئەو کوردانەی لەوێ نیشتەجێ بوون، لەم کارەدا بەشداری دەکەن و شازادە عەین ئەلدەولە کەسەدری ئەعزەم و سەرۆك وەزیران بووە و لەسالار ئەلدەولە بێزار بووە، بەخێرایی بروسکەی دادخوازی ڕەوانەی تاران دەکات. ڕۆژی ١٠ شەوال، بروسکەی بانگکردنەوەی شازادە گەیشت. هەرچەند هەوڵیدا بەدانی پارە بۆچوونی دەوڵەت بگۆڕێت، سەرکەوتوو نەبوو. سەرئەنجام ڕۆژی یەکشەممە ٢١ شەوال، ئامادەی ڕۆشتن بوو و زۆربەی زاناکان و پیاوماقووڵانی بانگێشت کرد. منیش یەکێك بووم لەبانگێشتکراوەکان. لەو میوانییەدا بەڕێوەبردنی کاروباری شاری بەمەزهەر ئەلدەولە و یەمین ئەلسەڵتەنە و وەکیل ئەلمولك و کافی ئەلدەولەی گەڕوسی سپارد تا ڕۆژانە لەقەڵای حکومەتی کۆببنەوە و کاروباری ویلایەتەکە بەڕێوە ببەن و خۆی بەڵێنیدا لەماوەی دەڕۆژدا دەگەڕێتەوە. حەبیب الله ئاغا، بازرگانی ناوداری کورد وتی: قوربان، دیاری منی پیرت لەبیر نەچێت. وتی: پیرەپیاو، چیت دەوێت با بۆت بێنم. وتی: خۆتانم دەوێت گەورەم. ئەگەر توانیتان، لەزووترین کات بگەڕێنەوە. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر دڵی شازادە بەجێهێشت. ماڵئاوایی لەهەمووان کرد و سوار بوو. خەڵك بۆ شار گەڕانەوە. ڕۆژی ٧ زیقەعدە، بروسکەی حکومەت بەشازادە جەلال ئەلدەولە گەیشت و ڕۆژی ٢٨ زیقەعدە، مەلا عەبدولڕەزاقی شێخولئیسلام گەڕایەوە و ڕۆژی دووشەممە ١٨ زیحەججە مەلا باقری شێخولئیسلام، لەداخا مرد.

### حکومەتی شازادە جەلال ئەلدەولە

دوای لابردنی سالار ئەلدەولە لە ٧ زیقەعدە ١٣٢٣، حکومەتی کوردستان بەشازادە عەبدولحسەین میرزای جەلال ئەلدەولە کوڕی زەڵ ئەلسوڵتان، سپێردرا. ڕۆژی چوارشەممە ١١ موحەڕەمی ١٣٢٤ هاتە ناو کوردستان. وەزیری ئەو سەهام نیزام بوو. ئەم شازادە تا ڕادەیەك خۆپەسەند و خۆسەر بوو. جگە لەچەند کەسی زانا، مۆڵەتی بینینی بەکەس نەدەدا. پیاوماقووڵان و خاوەن زەوییەکان بۆ ئەوەی شکستی پێبێنن یا بۆچوونەکانی خۆیان بەسەر

شازادە و حکومەت بسەپێنن، نرخی نان و گەنمیان بەرز کردەوە. دەنگی دانیشتووان بەرز بوویەوە و دادخوازی دەستپێکرد. شازادە بەخێرایی خاوەن زەوییەکانی بانگکرد و و فەرمانگەیەکی بۆ خواردەمەنی دروست کرد و بەڵێنی لەهەموویان وەرگرت تا لەسەر خەرمان، مانگی هەزار خەروار گەنم، تەسلیم بەو دامەزراوەیە بکەن و لەمزگەوتی دارئەلئەمان زەخیرە و پاشەکەوتی بکەن. خاوەن زەوییەکان بۆیان دەرکەوت لەم ڕێگەوە ناتوانن شازادە ناچار بەهیچ کارێك بکەن، بەناچاری تۆمەتی هەتیوبازی و مێبازییان خستە پاڵ شازادە و دەستیان بەپڕوپاگەند کرد و دڵی خەڵکانی ساویلکەیان پڕ کرد. من، بەشێوەیەکی نهێنی لەم بارودۆخە ئاگادارم کردەوە و بەمۆجیاریکردن و بەمەبەستی خێرخوازی ویستم لەبارودۆخ ئاگاداری بکەمەوە و بەگۆڕینی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دانیشتووان ناچاری بکەم بەڵام ئەنجامی نەبوو و لەخۆبایی بوون و خۆپەسەندی ڕێگەی میهرەبانی پێنەدەدا. سەرئەنجام ڕۆژی هەینی ٢٢ رەبیع الاوەل، هەموو سەرکردە و گەورەکانی خەڵك، بەپێی بەڵێنێك کەپێشتر دابوویان، لەماڵی موشیر دیوان کۆبوونەوە و لەمزگەوتی جامیعیش خەڵکیان ئاگادار کردەوە تا هەمووان لەمزگەوتی هاجەر خاتوون کۆببنەوە و بروسکەیەك بۆ دەوڵەت بنێرن و بڵێن کوردستان بچووکە و شیاوی شازادەکان نییە. داوا دەکەین کەسێکی ڕاستکردار و داوێن پاك کەشازادە نەبێت، بۆ حکومەتی کوردستان ڕەوانە بکەن و فەرمانڕەوایی ناوچەیەکی دیکە بەشازادە بسپێرن تا شیاوی کاروکردەوەکانی ئەو بێت. ئێوارێی ڕۆژی دووشەممە ٢٦ رەبیع الاوەل، بروسکەی لەسەر کار لابردنی شازادە و حکومەتی وەزیر هومایون گەیشت و شەوی سێشەممە ٢٧ رەبیع الاوەل، شازادە، کۆتاییەکانی شەو، لەلارێوە کوردستانی بەجێهێشت و بەرەو تاران بەڕێکەوت. وەزیر هومایون جێگری حکومەتی بەهۆی بروسکەوە بە حاجی سەرداری موکەرەم و موشیر دیوانی سپارد تا بەهاوبەشی کاروبارەکان ڕاپەڕێنن.

## حکومەتی میرزا مەهدی خانی وەزیری هومایون

دوای لابردنی جەلال ئەلدەولە، ڕۆژی ٢٦ رەبیع الاوەلی ١٣٢٤، حکومەتی کوردستان بە میرزا مەهدی خانی قائیم مەقامی کاشی، کەنازناوەکەی وەزیر هومایونە، سپێردرا و ڕۆژی ٦ جومادی الثانی، هاتە ناو کوردستان. دەبیر خەڵوەت کەگەنجێکی خۆشنووس و بەتوانا لەنووسیندا بوو، سەرۆکی نامەنووسینەکانی ئەو بوو. چوار ڕۆژ دوای هاتنی بۆ کوردستان،

خەلات و فەرمانی وەزیری بەموشیر دیوان بەخشی و سەرۆکایەتی دیوان خانەی بە موعەزەم ئەلمەمالیك سپارد. ڕۆژی هەینی ٥ جومادی الثانی، ڕۆژێك پێش هاتنی وەزیر هومایون، مەلا عەبدولڕەزاقی شێخولئیسلام بۆ وەرگرتنی پێگەی شێخولئیسلامی، بەرەو تاران بەڕێکەوت و دەستەیەك وەك مەلا عەلی نەقی سوڵتان ئەلعولەما و شێخ عەلی سەققەت الله و شێخ عەبدولحەکیمی مەجدولئیسلامی مەردۆخی و شێخ محیٚ ئەلدینی ئەمین ئەلعولەما و قازی عەبدولکەریم و کەسانی دیکەی لەگەڵ خۆیدا بۆ تاران بردبوو. لەسەرەتاکانی شەعبانی ١٣٢٤ بەهۆی وازهێنان لەمەشروب خواردن کەعادەتی هەمیشەیی ئەو بوو، گرفتاری نەخۆشی سکچوونی دەبێت و لە ٢٥ شەعبان دەمرێت. لەرەمەزاندا جەنازەی ئەویان گەڕاندەوە بۆ شارەکە.

لەسەرەتاکانی ئەمساڵە، دووبارە ورتەورتەی مەشروتە لەتاران سەری هەڵدایەوە و خەڵك بەهۆی کۆبوونەوەکان و نامەکانی شەوانە دەستیان بەهاندانی خەڵکان بۆ بەدەستهێنانی مەشروتە کرد. هەرچەند شازادە عەین ئەلدەولە عەبدولمەجید میرزا مەبەستی ئەوەی کرد بەگرتن و هەڕەشە و زیندانی کردن خەڵکان بێدەنگ بکات و ڕێگە لەهەستی دانیشتووان بگرێت، بەپێچەوانەوە ورە و بوێری خەڵکان زیادی کرد و بەشێوەیەکی ئاشکراتر داوای ماف و خواستەکانیان دەکرد و لەسەر خواستی مەشروتە، زیاتر پێداگر بوون.

تێبینی: شاراوە نەبێت ئێرانییەکان بەهەمان ئەندازە کەبوێر و چاونەترسن، بەهەمان ئەندازە وردبینن، خەڵکی ئێران تا ئەو کاتەی پاڵپشتێکی بەهێز لەدەوڵەتی ئێرانیان شك نەدەبرد، بیریان لەو مەبەست و داوایە نەدەکردەوە.

بەرکەوتنی ئەم دوو هێزە بووە هۆی بڵێسەسەندنی ئاگر و ئاژاوە لەنێوان دەوڵەت و میلەت و کوشت و کوشتار، لەخەیاڵەوە بوو بەڕاستی. سەیید عەبدوڵڵە بەهبەهانی و سەیید محەممەد تەباتەبایی و زاناکان و پێشەواکان، لەداهاتووی ئەم پێشهاتە ترسان و بەرەو قوم بەڕێکەوتن و بەشێوەیەکی کاتی لەویٚ نیشتەجیٚ بوون. دانیشتووانی تارانیش نزیکەی شانزە هەزارکەس لەباڵوێزخانەی ئینگلیس کەپەناگەی کۆمەلانی خەڵك بوو، کۆبوونەوە و مانیان گرت. باڵوێزخانە، پاشای لەکردەوەکانی شازادە عەین ئەلدەولە ئاگادار کردەوە. پاشا، عەین ئەلدەولەی لەسەر کار لابرد و میرزا نەسروڵڵە خانی موشیرئەلدەولەی وەك سەدرئەعزەم (ڕاوێژکاری گەورە) دەستنیشان کرد. پاشا و سەدری ئەعزەمی تازە، چارەسەر کردنی ئەم

کێشەیان لەپێدانی مەشروتیەتدا بینی و ڕۆژی ١٤ جومادی الثانی ١٣٢٤، نووسراوێکی دیکە دەرکرا کەئەنجومەنی شۆرای نیشتمانی بکرێتەوە و ئێران ببێتە وڵاتێکی مەشروتە.

گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆ کۆچکردووەکان بۆ قوم (بەهبەهانی و تەباتەبایی) ورەی بۆ ئەوان گەڕاندەوە و ڕێگەی تارانیان گرتەبەر. دانیشتووانی تاران لەناوەڕاستی شەعبانی ١٣٢٤، وەکیلەکانی خۆیان هەڵبژارد. فەرماندرا ئەنجومەن لەبینای بەهارستان کۆبوونەوەکانی گرێبدات. چوونکە شا لەم کاتەدا نەخۆش بوو، جێگرەکەی لەتەبرێزەوە بۆ تاران گەڕاندەوە. لەمانگی شەوالی ١٣٢٤ جێگر گەیشتە تاران. نیزامنامەی ئەساسی(دەستور) کەتەواو کرابوو، لە ١٧ زیقەعدەی ١٣٢٤ لەلایەن پاشاوە مۆر کرا. جێگر و موشیر ئەلدەولەیش مۆریان کرد. ڕۆژی دواتر یانی ١٨ زیقەعدە، شا مرد و ئەم ساڵە، بەساڵی مەشروتیەت ناوی دەرکرد.

چواری زیحەججەی ١٣٢٤، محەممەد عەلی میرزا لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت و تاجی لەسەر نا. دواتر بەهاندان و هەڵخراندنی کەسانی دەوروبەر، شای نوێ، هەوڵەکانی بۆ دژایەتی کردنی مەشروتە خستەگەڕ. مەشروتەخوازانیش لەبەرابەردا، کۆبوونەوەکانی خۆیان فراوانتر و زیاتر کرد و خۆڕاگرییان کردە پیشە. سەرئەنجام موشیر ئەلدەولە دەستی لەکار کێشایەوە. شا، میرزا عەلی ئەسغەر خانی ئەتابەکی لەفەرەنگەوە بانگکردەوە تا بەڕێگەچارەکانی ئەو بتوانێت، مەشروتە لەبنەڕەتەوە، لەناو ببات.

دووشەممە ٢٢ زیقەعدەی ١٣٢٤، وەزیر هومایون لەسەر کار لابرا و حکومەتی کوردستان بە سەققەت ئەلمولك سپێردرا.

## حکومەتی میرزا ئیسماعیل خان سەققەت ئەلمولک

دوای لابردنی وەزیر هومایون، ڕۆژی هەینی ٩ موحەڕەمی١٣٢٥، بروسکەی حکومەت بەدەستی میرزا ئیسماعیل خان گەیشت. ڕۆژی پێنجشەممە ١١ ڕەبیع الاوەل هاتە ناو کوردستان. فوئاد ئەلمولکی کوڕی و میفەتح ئەلمولك، هاوڕێیەتیان دەکرد. دوای ماوەیەك، پێگەوی وەزیری بەموشیر دیوان بەخشی و دیوان خانەی بەمیفەتح ئەلمولك سپارد. میرزا ئیسماعیل بەڕواڵەت بەفەرمانی دەوڵەت فەرمانڕەوایی دەکرد بەڵام لەناخەوە لەلایەن لایەنگرانی مەشروتەوە راسپێردرابوو دانیشتووانی کوردستان لەگەڵ مەشروتە ئاشنا بکات و ئەم ناوچەیە پەیوەست بەریزی هێزە نیشتمانییەکان بکات. لەسەر ئەم بنەمایە کەهەمیشە

لەدانیشتنە نهێنییەکان، بەرژەوەندییەکانی مەشروتە و زیانەکانی دیکتاتۆری بۆ خەڵکان باسدەکرد. موشیر دیوان لەدڵەوە بەوتەکانی ئەو خەمبار دەبوو و چەندین جار ئاگاداری کردبوویەوە ئێمەی لێپرسراوانی دەوڵەت دەبێت ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکان بین نەگوێرایەڵی سەیید و مەلا و بازاڕییەکان. ئیسماعیل خان دوای ئەوەی چاو و گوێی کرایەوە و لەبارودۆخی کەسەکان ئاگادار بوویەوە، ڕۆژێك منی بانگکرد و وتی: من دانیشتووانی ئەم شارە یا بەکارلێکراو دەبینم یا تۆقاو بەدەستی کارلێکراوان کەبەهیچ جۆرێك ناتوانن ڕێگەیەکی دیکە و بارودۆخێکی دیکە بۆخۆیان هەڵبژێرن. ئەو کەسەی کەهەست دەکرێت ئارەزوومەندی ژیانەوە و نوێخوازییە، تەنیا ئێوەن. چ کێشەیەك هەیە ئەگەر ببنە پێشەنگ و پێشوازی و لایەنگری لەهەستی گشتی کۆمەڵانی خەڵکی ئێران بکەن و پێگەیەکی بەرز و ناوێکی هەمیشەیی بۆ خۆتان بهێڵنەوە. لەوەڵامدا وتم: چوونکە دانیشتنەکە خۆمانەیە، ڕاستییەکان ناشارمەوە. دوو حەفتە پێش لەلایەن هاوڕێکانم لەناوەندەوە، شتێکی لەم بابەتەیان بۆ باس کردم تا لەکوردستانیش ئەنجومەنە نیشتمانییەکان دابمەزرێت و دەنگمان بخەینە پاڵ دەنگی ویلایەتەکانی دیکە بەڵام لەبەر ئەوەی هێشتا بەتەواوی ئامادەکاریم بۆ نەکردووە، دەستم پێنەکردووە، ئەگەر مۆڵەت دەدەن لەم دوو سێ ڕۆژەدا دەڕۆمە شارەزوور تا چاوم بەشێخ حیسام ئەلدین بکەوێت. لەوێ لەبارودۆخی تورکیا ئاگادار دەبمەوە و دڵنیا دەبم لەوەی مەشروتە لەتورکیا چی بەسەر هاتووە و لەگەڵ ڕۆشتنم پەناگەیەك لەهەورامان بۆ ڕۆژی مەترسیدار دەدۆزمەوە تا ئەگەر شکستمان خوارد، پەنا بۆ ئەو ناوچەیە ببەین، ئەوسا چالاکییەکانم دەستپێدەکەم. ئیسماعیل خان وتی: درەنگ دەبێت، تا دەڕۆن و دەگەڕێنەوە، بیست ڕۆژ یا مانگێك دەخایەنێت. وتم: درەنگ بجووڵێنەوە و چالاك بین باشترە لەوەی لەخۆوە دەست پێبکەین. بەڵێن دەدەم لەزووترین کاتدا بگەڕێمەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەگەڵ بەڕێزان حاجی شێخ یەحیا و مەلا ئەحمەدی مودەریس و حاجی باقر بەڵێنمانداوە، چەند ئەنجومەنێك لەخەڵکان و بازاڕییان دابمەزرێنین. کاتێك خۆیشم گەڕامەوە، چەند ئەنجومەنێکی دیکە دادەمەزرێنم. دوای کۆتایی هێنان بەگفتوگۆکە، من، لەڕۆژی ٥ ڕەبیع الثانی ١٣٢٥ لەگەڵ شێخ عارف، ئەوەی خوالێخۆشبوو حاجی شێخ شوکرللە بەرەو هەورامان بەڕێکەوتین. لەگوندی تەوێڵە گەشتینە خزمەت شێخ و دوای گفتوگۆ کردن و بەدەستهێنانی زانیارییە بەسوودەکان سەبارەت بەوڵاتی دەوروبەر، شێخ لەکاتی ماڵئاوایی کردن،،

دەستنووسی خەلافەتی بەناوی من نووسی: هەروەها عابایەکی ئەتڵەسی زەرد و عەمامەی شێخایەتی و ئەسپێکی کەموێنەی وەك خەڵات بەمن بەخشی و گەڕاینەوە. (شێخ حیسام ئەلدین لەکوردستان چەندین هەزار موریدی هەیە و باوەڕی تەواویان پێیەتی و وتەکانی ئەو بەوەحی دەزانن و سەرپێچی کردن لەفەرمانەکانی بەگوناحێکی گەورە دەزانن.) من لەساڵی ١٣٣٢ گوێرایەڵی ئەوان بووم. شێخ بەم پێگەی لەکوردستان هەیەتی، لەدەستنووسەکەی خۆیدا ئامارەی بەوەداوە کەفلآنەکەس وەك خودی منە، گوفتاری ئەو گوفتاری من و کرداری ئەو کرداری منە. هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی بکات، سەرپێچی فەرموودەکانی خواوەند و ڕەسوڵی کردووە. ئەو کەسانەی پەیوەندی هەژاران و بازاڕییەکانیان لەگەڵ مندا دەزانی، کاتێك دەستنووسی شێخیان دەخوێندەوە، دەیانوت: بەهەموو شێوەیەك ڕازین و پشتیوانی تۆین. تا گەڕانەوەی من، حاجی شێخ یەحیا لەگەڵ حاجی شێخ بەقای مەزهەر ئەلئیسلام، دەستەیەك لەبازاڕییەکان و بازرگانەکانیان کۆکردبوویەوە و لەژێر ناوی یەکێتی کرێکاران، شەوانە دانیشتنە گەرۆکەکانیان ئەنجامدەدا. منیش لەسەرەتاکانی جومادی الاوەلی ١٣٢٥ گەڕامەوە. بەرێکەوت پەیوەندی موشیردیوان لەگەڵ حاجی میفتەح ئەلمولك و حاجی ئەرفەع، گرژی بەخۆیەوە بینی. شەوی ٢٧ ڕەمەزان ئەوان ڕۆشتنە ماڵی خوالێخۆشبوو حوجەت ئەلئیسلام و ئاگاداریان کردەوە. منیش ڕۆشتم. پێکەوە بڕیاری کۆتاییماندا کەئەنجومەنێك پێکهاتوو لەزاناکان و پیاوماقوولآن و پیاوانی چینی یەکەمی کوردستان بەبێ موشیر و ئاسیف دابمەزرێنین. لەبەیانی ئەو شەوەوە، ئامادەکارییەکانمان ئەنجامدا و دەستەیەکمان لەژێر ناوی ئەنجومەنی (سداقەت) ڕاستی کۆکردەوە و مەبەست و پەیڕەوێکی دیاریکراومان بۆ نووسی. سەرۆکەکانی ئەو ئەنجومەنەمان بەدەنگی نهێنی و زۆرینە هەڵبژارد و لەبەردەم دەروازەی قەڵای حکومەتی، لەبەردەم دەروازەی مەلا جەلال، بینایەکمان بۆ دانیشتنە گشتی و نهێنییەکان بەکرێ گرت. ڕۆژی ٢ زیقەعدەی ١٣٢٥، ئەنجومەن بەسەرۆکایەتی من، کرایەوە و ئەم بەیاننامەیەم بەئامادە بوونی خەڵکان خوێندەوە.

## بەیاننامەی کردنەوەی ئەنجومەنی ڵداقەت

((الاعذار ما الاعذار، بعد هذا الانذار فاعتبروا یا اولی الابصار لعلکم تفلحون فی دار القرار))، ئەی هاووڵآتیان، ئەی موسوڵمانان، ئەی برایان و ئەی گیانبەخشەکان، بیر بێننەوە کەپێغەمبەر لەکاتی کۆچی، بۆ ئێوەی موسوڵمان چ وەسیەتێکی کرد و چ ئەمانەتێکی بەئێوە سپارد کە

کردن. هەرکەس ئەو ڕاستییە بزانێت، موسوڵمانە و هەرکەس نەیزانێت، ناموسوڵمان و هەڵبژاردنی سێیەم لەئارادا نییە. بێ هۆ و بێ بنەما خۆتان سەرگەردان دەکەن. فەرمودەی ڕاشکاوی پێغەمبەرە کەدەفەرمێت: ((ستفترق امتی ثلاثا و سبعین فرقة الناجیة منهم واحده و الباقون هلکی قیل و من الناجیه. قال الذین علی ما انا علیة الیثوم و اصحابی.)) و لەفەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمێت: ((و الباقون فی النار)). ئاشکرایە کەمەبەستی ئەوەیە: دەستەی موسوڵمانان لەناو دەستە جیاوازەکانی ئوممەتی من تەنیا یەك دەستەیە و بەس. ئەوانی دیکە هەموو لەناو دەچن و ناموسوڵمانن و شیاوی دۆزەخ. بەم ڕاشکاوییە لەدیاریکردن، ئیتر چۆن جێگەی جیاکردنەوە و پۆلێن کردن دەمێنێتەوە تا بتوانین بڵێین ئیسلام چەندین چینی هەیە یانی نیوە لەموسوڵمان و نیوەی لەنیوە موسوڵمان پێکدێت. حاشا کەبەهیچ جۆرێك ئەمە لەئیسلامدا ڕێگەپێدراو نییە و لەئادەمەوە تا خاتەم، کەس بەم جیاکردنەوە ڕازی نەبووە. بێ هۆ چاوەڕوانن و خۆتان سەرگەردان دەکەن کەخۆتان ناناسن و بەدوای ڕاستی و ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی خۆتان ناگەڕێن. بێ پەردە و بەڕاشکاوی دەبێت بڵێن ئەگەر موسوڵمان بریتی بێت لەخەلیفەکانی ڕاشدین، بەدڵنیاییەوە ئێمە بەکردەوە ئیسلام کوژرانە و دین شکێنانە، موسوڵمان نین و چەندین فەرسەخ لەئیسلام و ئیسلامەییەت بەدوورین. ئاوێنەی ڕاستی ئیسلامیەتمان بەبەرد شکاندووە، چیتر شیاوی چاکبوونەوە نییە. هەرچی زووتر دەبێت بیر لەڕێگە چارەیەك بۆ ناموسوڵمانی خۆمان بکەینەوە تا دووبارە ببینە موسوڵمان و ئەسڵ و فەرزەکانی موسوڵمانی بەجێبێنین و ئەوەی جیاوازە لەئیسلام، پشتگوێ بخەین. حەکیم و فەیلەسووفەکانی دنیا، بۆ ڕزگار کردن لەگێژاوی بێ دینی، بیریان لەڕێگە چارەیەك کردۆتەوە ئەگەر لایەنگرییان بکەین ئەگەری هەیە دووبارە بەرەو سنوورەکانی ئیسلام و موسوڵمانی ڕێنوێنیمان بکات و کەشتی شکاوی بارودۆخی ئێمە جارێکی دیکە بەکەناری ڕزگاری بگەیەنێت و ئەوەیش ئەمەیە کە بەباشی دەزانن: جڵەوی کاروباری هەر نەتەوە و وڵاتێك لەدەستی سوڵتان یاپاشای ئەو وڵاتەیە و بەئەزمون دەرکەوتووە ئەگەر لەدەستی پاشایەکی باشدابێت، وڵات بەرەو ترۆپکی پێشکەوتن دەبات و ئەگەر خراپ بێت، خەڵك و وڵات بەرەو گێژاوی بەدبەختی و لەناوچوون دەبات. لەبەر ئەمە پێشەواکانی ئیسلام و سەرۆکەنی میللەت، هەمووان چارەی پاراستنی ئیسلام لەوەدا دەبیننەوە کەهەوڵ بدەن پاشای ئیسلام وەك دەورانی خەلیفەکانی ڕاشدین، پاك و موسوڵمان

لەپاراستن و چاودێری کردن تێبکۆشن و ڕێگەنەدەن زیانی بەرکەوێت. دڵنیام بیرتانە کەفەرمووی:

((انی تارك فیکم الثقلین کتاب الله و عترتی)): ئەی موسوڵمانان، ئەی ئەمانەتداران، بەدڵنیاییەوە لەبیرتان نەکردووە کەدوای کۆچی پێغەمبەر، چۆن مافی ئەمانەتداریتان بەجێهێنا. وەسیەتی پێغەمبەرتان جێبەجێ کرد و (عترت)ی ئەوتان لەکەربەلا بەو بەلاّ و بەدبەختییانە گرفتار کرد و کتێبی خواوەند کەبریتییە لەئەحکامی ئەو، شێواند و خستتانە ژێرپێ و ئایەتەکانتان بەپێی ویست و حەزی خۆتان شرۆڤە و تەفسیر کرد کەئەمڕۆ دەبینین لەقورئان جگە لەوشە بێ ماناکان، هیچی دیکە نەماوەتەوە و جیاواز لەخەت و کاغەز هیچ شوێنەوارێکی لێ نابینرێت. چوونکە ئەحکامەکانی بەتەواوی لەبیرکراوە و بەهیچ شێوەیەك جێبەجێ ناکرێت. بەڵکو پەچەکرداری لەناو خەڵکانی ئاساییدایە. هەرکەس مانای قورئان بەخەیاڵ و هزری خۆی دەزانێت و بۆچوونەکانی ناخی خۆی بەئیسلامیەت گومان دەکات. لەکاتێکدا قورئان و هێنەری قورئان، لەخەیاڵ و هزر دووریان کردۆتەوە و لەم دین و ئیسلامەی ئێمە هەمانە، زەمین و ئاسمان شەرمەزارە و لەگەڵ ئەمەیشدا، خۆمان بەموسوڵمان دەزانین. حەزرەتی شێخ حیسام ئەلدین، موسوڵمان و شوێنکەوتەی قورئانە. لا مناقشة فی المثال، چوارشەممەی خوێنکاریش کەهەمووتان دەیناسن خۆی بەموسوڵمان و شوێنکەوتەی قورئان دەزانێت. ئێستا دادپەروەرانە داوا لەهەمووان دەکەم ئەوە پشتڕاست بکەنەوە ئایا شێخ حیسام ئەلدین و چوارشەممە، لەڕوانگەی ئیسلامیەتەوە لەیەك پێگە و جێگەدان یا جیاوازی ئەوان ئاسمان تا زەمینە؟ بەم بەراوەرد کردنە شێخ حیسام ئەلدین بەبەراوەرد کردن لەگەڵ خەلیفەکانی ڕاشدین و ئێوە بەبەراوەرد لەگەڵ چوارشەممە کەئەگەر ئێمە بێت و هەمووی ئەمانە بەموسوڵمان بزانین، ناچار دەبێت ئیسلامییەت و ئیسلامییەکان پۆلێن بکەین: خەلیفەکانی ڕاشدین موسوڵمانی تەواو عەیارن، و کەسانی وەك شێخ حیسام ئەلدین نیوە موسوڵمانن و ئێوە کەبەرزەخی نێوان شێخ حیسام ئەلدین و چوارشەممەن، چارەکە موسوڵمانن و بەمشێوەیە پێنج سیر موسوڵمان و دوو سیر نیو موسوڵمان تا مسقاڵ و زەڕە و نۆك و گەنم، موسوڵمان لەبەرچاو بگرین تا دەگەینە چوارشەممە کەیەك زەڕە ئیسلامەیت لەودا بوونی نییە لەکاتێکدا خۆیشی بەموسوڵمان دەزانێت.

ئەی موسوڵمانان، سوێند بەخواوەند، ئیسلامیەت، ڕاستییەکی تاقانەیە و نەشیاوە بۆ پۆلێن

بێت یا ئەگەر موسوڵمانی پاك دەستنەکەوت، لانیکەم مەرج و شەرت بۆ هەڵسوکەوت و دەسەڵاتەکانی پاشای ناموسوڵمان دابنێن تا خۆسەرانە و هەوسار پچڕاو پەلاماری گیان و سامانی خەڵکان نەدەن و ناموسی کۆمەڵگا نەکەنە پارووی ئاگری ئارەزووەکانی خۆیان. مەبەست لەمەشروتە ئەمەیە وبەس کەهەڵبژێردراوانی مەملەکەت بەشێوەیەکی تایبەت هەڵدەلبژێردرێن و لەشوێنێك کەبەدار ئەلشورای مەملەکەتی ناوی دەبەن، کۆدەبنەوە و چەند مادە و یاسایەك بۆ سنووردار کردنی دەسەڵاتەکانی پاشای نەشیاو یانی ناموسڵمان دەنووسن تا هاوشێوەی پاشایەکی موسوڵمان هەڵسوکەوت لەگەڵ موسوڵمانان بکات. ئەو مادانە بەیاسا و ئەم ڕێکخستنە بەڕێکخستنی مەشروتییەت و ئەم دەوڵەتە بەدەوڵەتی مەشروتە ناو دەبەن. مەبەست و ئامانجی ئێمەی پێشەنگەکانی مەشروتە ئەمەیە تا کەس بێ مۆڵەتی شەرعی یا یاسایی ماڤ خۆتێهەڵقورتاندنی ژیان و سامانی خەڵکی نەبێت و فەرمانڕەواکان و کاربەدەستان ستەمکاری نەکەنە پیشە و زاناکان و قازییەکان لەجادەی شەریعەت لانەدەن. مامڵە بەئەحکامی ئیسلامی نەکەن، فیتوای ناڕەوا نەدەن و مەنسوخ (بەتاڵکراوە) نەنووسن، ماڵی هەتیو و بێ سەرپەرەستان نەخۆن. بۆ خواردنی ماڵی خەڵك پەنا بۆ فێڵە شەرعییەکان نەبەن، جیاوازییەکان وەلا نێن و ڕێگەیەکی ڕاست بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکان دەستنیشان بکەن. زۆربەی دەوڵەتە مەزنەکانی دنیا ئەم ڕێگەیان هەڵبژاردووە. نیزامی دنیا ڕێگە نادات ئێمە ئێرانییەکان لەوان دوابکەوین. لەکۆنیشدا زۆربەی نەتەوەکانی دنیا وەك یەهوود و نەساری و هتد... بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی خۆیان، ئەنجومەنێکی ڕاوێژکارییان بووە. لەتەورات و ئەنجیل و کتێبەکانی عەهدی عەتیق هاتووە کە نەتەوەی یەهوود لەکورسی ویلایەتی ئورشەلیم و زۆربەی شارەکان تا هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەتی یەهوود و دەرکەوتنی قەیسەرەکان، ئەنجومەنی شۆرایان بووە. نەتەوەی مەسیحیش تا دەرکەوتنی هەتاوی محەممەدی، بەزۆری ئەنجومەنی شۆرایان بووە. پۆڵس حەواری مەسیح یەکێك لەئەندامەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی و جێبەجێکاری ئەنجامی کۆتایی ڕاوێژکەران بووە. هەروەها بتپەرستەکانی زەمانی پێغەمبەر لەشوێنێك بەناوی (دارالندوە) ڕاوێژیان کردووە و کەسانێك کەتەمەنییان لەچل ساڵ کەمتر بووبێت، لەو ئەنجومەنەدا ڕێگە نەداوە و لەگەڵ ئەوەیشدا بنەمای مەزهەبی ئیبراهیم و زەردەشتیان لەڕاوێژ کردندا بەکار بردووە و ئەوە سوڵتانەکانی ئەو هەموویان ئەنجومەنی ڕاوێژکارییان

بـووە. دەقـی ئایەتـە قورئانییـەکان و حەدیـسە صـەحیحەکان کەهـەمووتان بینیوتانـە و بیستووتانە، نیشانی دەدەن کەپێغەمبەریش ئەنجومەنی ڕاوێژکاری بووە و لەجەنگی بەدر، ئۆحـۆد، ئـەحزاب و صـوڵحی حودەیبیـە، ئەنجومـەنی دامەزرانـدووە. بەهـەمان شـێوە کـە لەتەفسیری سوری آل عمران، انفال، احزاب، فتح، شیکراوەتەوە و ئایەتەکانی (شاورهم فی الامر) و (امـرهم شـوری بیـنهم) و (لقد کـان لکـم فـی رسـول الله اسـوه حـسنه) و حەدیـسی صحیحی (ما ضل قوم شاوروا) و (لا تجتمع امتی علی الصلاله) و (المشاوره اصل من اصول الدین و هی سنه الله رب العلمین علی کافه الخلاق اجمعین) و چەندین حەدیسی صحیحی دیکە، بەڵگەی ئاشکران بۆ ئەوەی ئەنجومەنی شورای نیشتیمانی و ڕاوێژ کردنی نیشتمانی و ئەنجومەنـە ویلایەتییـەکان لەیاسـاکانی دیـن و لەکەرەسـتەکانی دینـە. ئەگـەر کەسـانێك شەمشەمەکوێرە ئاسا لەتیشکی هەتاوی مەشروتییەت، چاویان کوێر دەبێت و نایانـەوێت دورشم و شوێنەوارە ڕزاوەکـەی خۆیـان لەدەست بـدەن و پیاوانـە و بوێرانـە بێنـە گۆڕەپـانی ئازادی و برایەتی و یەکسانی و مەشروتییەت تا لەتامەکانی دنیای تازە بەهرەمەند بن، زۆر جێگـەی سـەرکۆنە کـردن و تانـە لێـدان نـین چوونکە ماوەیەکـە لـەرووناکی دیکتـاتۆری ژیـان بەسەر دەبەن و دەستیان بەخوێن و ناموسی خەڵکان ئاشنا بووە و ئارەزووی مژینی خـوێنی خـەڵکان و ستەمکردن لـەوان، فەرمانڕەوایـەتی دڵ و مێشکیان دەکـات و بـەبینینی نـووری دنیـای ڕۆشـن و تـامی جیهـانی شارستـانی بێـزار و دەنگـی هاواریـان بـەرز دەبێتـەوە. ئـەوان چێژی زوڵـم و ستەم لەناخیانـدا جێگیر بووە و تـا گیـان لەجەستـەیاندا بێـت، بەئارەزووری خۆیان دەست لەستەمکردن و دڕینی پەردەی ناموسی خـەڵکان هەڵناگرن. دەبێت لەئێستا لەخـەوی کەروێـشکی خۆیـان بـەجێیان بـێڵێن تـا لـەداهاتوودا مـشتی سروشـت و سـزاکانی ڕۆژگار، سزایان بدات. ئەوکەسانەی دەڵێن مەشروتە خراپـە و دەبێتـە هـۆی پشێوی و ئاژاوە و کوشـت و کوشـتار و تێکـچوونی ئاسایـشی وڵات و لـەم ڕێگـەوە دەخـوازن خـەڵکان بـۆ هەڵدێری بەدبـەختی بگەڕێننـەوە، لـەوەڵامی ئەوانـدا بـەزمانێکی پـاراو دەڵـێین ئـەم ئـاژاوە و پشێوییە هیچ نییە جگە لەتەپ و تۆزی رووخانی کۆشکی دیکتاتۆری و پاشایەتی کەچاو و گوێچکەکان ئازار دەدات و هاوشێوەی ئەبولهەول لەبەر چاوی جیهانیان خۆی نیشان دەدات. ئەگەر ئەمە نییە بۆ مەشروتە لەوڵاتە پێشکەوتووەکاندا دەبێتـە هـۆی ئارامی و پێشکەوتن و لـەئێران دەبێتـە هـۆی پـشێوی و بەدبـەختی خـەڵکان. مەگـەر مەشـروتە ڕووبـاری نیلـە بـۆ

سەبتییەکان ئاو بێت و بۆ قیبتییەکان ڕووباری خوێن. یا زیخی بیابانی میسرە کە بۆ ئیسرائیلییەکان (من سلوی) بێت و بۆ فیرعەونەکان فرپۆك و ئەسپێ و یا مەشروتە سارای مەحشەرە کە بۆ موسوڵمانە ڕاستەقینەکان بەهەشتە و بۆ کافرەکان دۆزەخ. هەرچییەك بێت، بەهۆی بەلاّی نەگونجاوی دیکتاتۆرانە کەئەم ئاژاوە و شۆڕشە دێتە ئاراوە و گەرنە هیچ کێشەیەك لەبنەماکانی مەشروتییەتدا نییە. ئەزمون و مێژوو ئەوەمان نیشان دەدات کەبەردەوام لەکاتی دەرکەوتنی نور و تیشکی ڕاستی، لەبەر ئەوەی دڵە خراپەکارەکان ئاڵای حاشاکردن بەرز دەکەنەوە و بەبلاّو کردنەوەی قسەی پڕوپوچ سەرقاڵ دەبن، لەبەرابەر لافاوی بەختەوەری و تۆفانی ڕەحمەت دەخوازن، پەچەکردار نیشان بدەن. ئاشکرایە لەبەر ڕووناکی یاساکانی سروشت، لەبەر یەك کەوتنی دوو هێزی شەڕ و خێر، ئاگری ئاژاوە بڵێسە دەسێنێت و هەموو خراپەکارییەکان بۆ توخمی ڕووناکی دەگۆڕدرێن و سەراسەری سنوری ڕاستی ڕووناك دەکەنەوە. بەهەمان شێوە کە لەکاتی دەرکەوتنی نوح بۆ ئاشکرا کردنی ڕاستی و بەرز کردنەوەی ئاڵای بەختەوەریی دنیایی، نوقمی تۆفان بوو و لەکاتی شۆڕشی زوئەلعەصا، حەزرەتی موسا، چەندین هەزار خەڵك لەناوچوون و میسر و کەنعان وێران و خاپوور بوون و هەروەها نهەنگی شمشێری محەممەد لەدەریای خوێنی هەزاران کەس نوقم بوو. بۆچی؟ بۆ ئەوەی ڕاستی دەیویست دەرکەوێت و ناڕاستی دەبوا لەناو بچێت. لەکۆتاییدا بەدڵێکی پاك وپڕ لەڕاستی، پیرۆزبایی ڕێوڕەسمی کردنەوەی ئەم ئەنجومەنە لەهەموو ئەندامەکانی دەکەم و لەخواوەندی مەزن، سەرکەوتنی خەڵکان بەگشتی خوازیارم. زیندوو بێت فیداکاریانی گۆڕەپانی زیندوو بوونەوە، پایەدار بێت مەشروتییەت و ئازادی.

ئەم ڕاگەیێندراوە یەکەم ڕاگەیێندراو بەیانییە بوو لەکوردستان بۆ پروپاگەندە کردن بۆ مەشروتییەت خوێندرایەوە و یەکەم بۆمب بوو دژی ستەمکاران تەقی. لەبەر ئەمە هەزار نوسخەی لێ گیرایەوە و بەسەر شار و قەزا و ناحییەکان بلاّو کرایەوە و هەزاران نوسخەیش بۆ تاران و ویلایەتەکانی دیکە ڕەوانە کرا. جیاواز لەئەنجومەنی صداقەت و کرێکاران، چەندین ئەنجومەنی دیکە بەناوی جیاواز، وەك (حقیقت) (اخوت) (صلاحت) لەلایەن هاوڕێیان بەهاوکاری حکومەت لەگەڕەکەکانی شار دامەزرا. لەبەر ئەوەی خۆم بتوانم لەدانیشتنی ئەنجومەنەکان بۆ هاندانی خەڵکان ئامادە بم و هەروەها بۆ ئەوەی لەهەموو ڕۆژەکانی حەفتە دانیشتووانی کوردستان سەرقاڵی گفتوگۆ کردن سەبارەت بەمەشروتە

بکەم، دانیشتنەکانی ئەنجومەنم بەمشێوەی خوارەوە بەسەر ڕۆژەکانی حەفتە دابەش کرد.
شەممە: سداقەت، یەکشەممە: سداقەت، دووشەممە: حقیقت، سێشەممە: اخوت، چوارشەممە: صلاحت، پێنجشەممە: سداقەت، هەینی: پشوو.

لەبەر ئەوەی هەڵسوڕێنەری هەموو ئەنجومەنەکانی دیکە، ئەنجومەنی سداقەت بوو و سەرۆکەکەیشی خۆم بووم، بۆ زیاتر تەرخان کردنی کات بۆ ئەم ئەنجومەنە، ڕۆژی یەکشەممە و پێنجشەممەیشمان بۆ ئەنجومەنی سداقەت تەرخان کرد. موشیر دیوان لەم کارانە و دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنانە توڕە و دژایەتی کردنی دەستپێکرد. من لەبەر ڕێزگرتنی ئەو، وەسیەتی ناسر ئەلمولکم (فەرمانڕەوای پێشووتری کوردستان) بیرخستەوە. وەڵامی دابوویەوە: ئەویش مەشروتە خوازێك بوو وەك فلاّنەکەس. تا گیان لەجەستەما بێت، ناچمە ژێر کاریگەری قسەی بەقاڵ و چەقاڵ.

سەرئەنجام پەچەکردارەکان تەشەنەی کرد تا ئەوەی لە ١٨ زیقەعدەی ١٣٢٥، دانیشتنێکی نائاسایی لەئەنجومەنی سداقەت بەسترا و هەموو ئەنجومەنەکانی دیکە بانگێشت کرابوون. حکومەت و موشیر دیوانیشمان بانگێشت کرد. موشیر دیوان سەرەتا ڕازی نەبوو بێت، بەلاّم دواتر حکومەت سەرکۆنەی کرد و ئەوی لەگەڵ خۆی بۆ ئەنجومەنەکە هێنا بەلاّم دەستەیەك لەپیاوە چەکدارەکانی خۆی هێنایە ناو ئەنجومەنەکە. (لەکاتێکدا هێنانی چەك بۆ ناو ئەنجومەنەکە یاساغ بوو). دوای بینینی ئەم کردەوانە، هەستام بەشێوەیەکی توند بۆ بەرگری کردن لەهەژاران و سەرکۆنە کردنی موشیر دیوان، وتارێکم پێشکەش کرد. لەڕەنگ پەڕین و زەرد هەڵگەرانی لێوی دەرکەوت کەخوازیارە چەندین قات لەژێر زەوییەوە بێت بەو مەرجەی گوێی لەوتەکانی من نەبێت. ئەو ڕۆژە هەستی کرد، دەمانچە و خەنجەر لەبەرابەر شمشێری زمان، ناتوانێت بەرگری بکات. چوونکە ئەوەی دەبوا بیڵێین، وتمان و ئەو بەچەکەکانی خۆی، نەیتوانی هیچ کارێك بکات. کاتێك بەسلاّمەتی لەئەنجومەنەکە ڕۆشتەدەر، گومانی دەکرد جارێکی دیکە لەدایك بۆتەوە.

ڕۆژی ١٣ ڕەبیع الاوەلی ١٣٢٥، میرزا عەلی ئەسغەر خانی ئەتابەك کەپاشا ئەوی لەفەرەنگەوە بۆ وڵات گەڕاندبوویەوە، هاتە تاران و چەند کەسێك لەزاناکان کە لەدەوری شا بوون، دەستیان لەگەڵ ئەتابەك تێکەڵ کرد و لەڕێگەی شەرع و مەزهەب دەستیان بەدژایەتی کردنی بنەماکانی مەشروتە کرد. ڕۆژی ٢١ ڕەجەبی ١٣٢٥، کاتێك ئەتابەك لەبەهارستان

دێتەدەر، عەباس ئاغای تورکی تەبرێزی بەدەمانچەی حەوت تیر دەیکوژێت و دەستبەجێ خۆیشی دەکوژێت. لەم کەین و بەینەدا، ڕەشنووسی نیزامنامەی ئەساسی کۆتایی هات و محەممەد عەلی شا واژۆی کرد و لەمانگی شەوالی ١٣٢٥، خۆی ڕۆشتە ئەنجومەن و بەئامادە بوونی حوجەج ئەلئیسلام و وەکیلەکانی ئەنجومەن سوێندی خوارد ڕێز لەبنەماکانی مەشروتە بگرێت. دواتر لەسەرەتاکانی زیقەعدەی ١٣٢٥، دەستەیەك کرێکار و کەسانی نەفس نزم و کرێکاران، لەگۆڕەپانی تۆپخانە کۆبوونەوە و هاوار دەکەن ئێمە مەشروتەمان ناوێت و دەست بەئازاردان و تالأن کردنی سامانی خەڵکان دەکەن. وەکیلەکانی ناو ئەنجومەن بەرگری لەخەڵکان دەکەن و بەهارستان و مزگەوتی سوپاسالار دەکەنە سەنگەر و سەرئەنجام شکست بەهێرشبەران دەهێنن. شا دووبارە بۆ بێدەنگ کردنی خەڵك ڕەزامەندی خۆی نیشان دەدات و دەبێتە لایەنگری مەشروتە. دواتر لەکۆتاییەکانی موحەڕەمی ١٣٢٦، کاتێك شا بەرەو دوشان تەپە دەڕوات، کەسێکی نەناسراو لەنزیك تەختی بەرپەرپییەکان، بۆمبێك لەبەردەم ترۆمبێلی سەڵتەنەتی دەتەقێنێتەوە و چەند کەسێك بریندار دەبن و دەکوژرێن. شا کە لەگالیسکەی دواوە بوو، تەندروست دەمێنێتەوە. ئەم ڕووداوە، دەبێتە هۆی تورە بوونی شا و ڕەشبینی بۆ مەشروتە خوازان زیاد دەکات.

لە ٥ ڕەبیع الاوەلی ١٣٢٦، ئیسماعیل خان لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دووردەخرێتەوە و حکومەتی کوردستان تەسلیم بە شازادە زەفەر ئەلسەڵتەنە دەکرێت.

## حکومەتی شازادە زەفەر ئەلسەلتەنە، جاری یەکەم

دوای لابردنی ئیسماعیل خان، حکومەتی کوردستان بەشازادە عەزیز الله میرزای زەفەر ئەلسەڵتەنە سپێردرا. شێخ محەممەد ڕەزای حوجەت ئەلئیسلام، شەوی هەینی ١٢ ڕەبیع الاوەلی ١٣٢٦ دەمرێت، ڕۆژی ٣ جومادی الاوەلی ١٣٢٦، شا لەگەڵ سێسەد کەس قەزاق و دوو هەزار سەربازی گارد بەمەبەستی گەڕان دەڕواتە باخی شا و دوای چەند ڕۆژ ڕاگەیندراوێکی لەتاران بلأو کردەوە کەچەند کەسێك لەناوەندی ولأت، هۆکار و سەرچاوەی گەندەڵی و خراپەکارین و دەبێت دوور بخرێنەوە. دوای بلأو کردنەوەی ئەم ڕاگەیندراوە، شەش کەس لەئەنجومەنەوە بانگ دەکات. ئەنجومەن لەتەسلیم کردنی ئەوان خۆی بەدوور دەگرێت. شا بەخێرایی دەست بەسەر بروسکەخانەدا دەگرێت و بەمشێوە پەیوەندی نێوان ئەنجومەن و ویلایەتەکان دەپچڕێنێت و حکومەت نیزامی بەسەرۆکایەتی پالکونیك لیاخوف

ڕووسی ڕاگەیەنێت و شەوی ٢٣ جومادی الاوەلی ١٣٢٦، نزیک بانگی بەیانی، هەزار نەفەر قەزاق و چەندین دەستەی دیکە، بەسەرۆکایەتی پالکونیك کەماندان بریکادی قەزاق، لەسێ لاوە، ئەنجومەن تۆپباران دەکەن. نزیکەی هەشت کاتژمێر هێزە نیشتمانییەکان بەرگری دەکەن و سەرئەنجام ئەنجومەنییەکان بەدانی زەرەر و زیانی زۆر شکست دەخۆن. سەیید عەبدوڵڵە بەهبەهانی و سەیید محەممەدی تەباتەبایی و دەستەیەکی دیکە لەوەکیلەکان بۆ پارکی ئەمین ئەلدەولە هەڵدێن. قەزاق دەوری پارکەکە دەگرێت و دوای زەرەر و زیانی زۆر، ئەو دوو کەسە دەگرێت و لەگەڵ ئیهانە کردن، دەیانبەنە باخی شا و لەوێ فەرمانی دوورخستنەوەیان دەردەکەن. حاجی مەلەك ئەلموتەکەلمین و میرزا جەهانگیرخانی دەخو بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (صور اسرافیل) و بەڕێوەبەری (روح القدس) لەباخی شا و ئەنباری دەوڵەت لەناو دەبەن و سەیید جەمال ئەلدین ئەسەد ئابادی کە لەهەمەدان دەستگیر کرابوو، لەبروجێرد دەکوژن. ڕەحیم خانی چەلبیانلو بەئەمیر هاشم، کەسەردەستەی ئەنجومەنی ئیسلامی لەتەبرێز بوو، بۆ تەبرێز ڕەوانە کرا تا بلاوە بەئازادی خوازانی ئەو ناوچەیە بکات. ستارخان و باقرخان لەبەرابەر هێزەکانی چەلیبانلو سینە دەکەنە قەڵغان. موخبیر ئەلسەڵتەنە کەفەرمانڕەوای ئازەربایەجان بووە، جبەخانەی دەوڵەتیان تەسلیم دەکات و خۆی بەمەبەستی هەڵاتن ڕێگەی ئەورووپا دەگرێتەبەر. دەرئەنجام هێزی ڕزگاری، سوپای ڕەحیم خان لەباخی باکور دووردەخەنەوە. ڕۆژی پێنجشەممە ٢٤ جومادی الثانی ١٣٢٦، شازادە زەفەر ئەلسوڵتان دێتە ناو کوردستان. لە ٢٦ جومادی الثانی سوپایەك بەسەرداری سەهام ئەلدەولە بۆ هاوکاری کردنی ڕەحیم خان دەڕوات بەڵام سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. لە١٥ ڕەجەب شازادە عەین ئەلدەولە وەك فەرمانڕەوای ئازەربایەجان دیاریدەکرێت بەڵام دووبارە ناتوانن دەست بەسەر تەبرێزدا بگرن. شازادە زەفەر ئەلسەڵتەنە، سەرەتا لایەنگری مەشروتەخوازان بووە و لەڕووداوەکەی گۆڕەپانی تۆپخانە دەڕواتە سەر مینبەر و دژی دەوڵەت وتارێك پێشکەش دەکات. بەڵام بەم دواییانە شا دڵنەوایی دەکات و دەیکاتە فەرمانڕەوای کوردستان تا ئازادیخوازانی کوردستان سەرکوت بکات. یەکەم کاری ئەوە بوو دووبەرەکی لەناو ئازادیخوازان دروستکرد. هەموو مافەکانی مزگەوتی دارئەلئیحسانی کەتایبەت بوو بەبنەماڵەی حوجەت ئەلئیسلام کەخەزووری من و تازە مردبوو، زەوت کرد و تەسلیم بەمەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلامی کرد. حاجی میفتەح ئەلمولك و حاجی ئەرفەع

ئـەلمولك کەسەردەسـتـەی ئازادیخوازەکـان بـوون و سـەرۆکایەتی دەسـتـەی زەفـەری کوردسـتانیان لەدەستا بوو، دوای ڕووداوی تۆپباران کردنی ئەنجومـەن لـەتاران ترسان و لەئەنجومـەنی سـداقەت کـشانەوە. ئەنجومەنـەکانی دیکـەیش داخـران تـەنیا پەیوەندییـەکی نهـێنی لـەنێوان ئازادیخوازانـدا مابوویـەوە و هـەمووان چـاوەڕوانی ڕووداوەکـانی ئازەربایەجانمان دەکرد. شازادەی فەرمانڕەوایش چاوەڕوان بوو تا ئەگەر تەبرێز شکستی خـوارد، شـازادەیش لێـرە نزیکـی و پەیوەنـدی خـۆی لەگـەڵ شـادا بسەلمێنێت و گەرنـە تـا ئەوکات وەك کەسێکی بێ لایەن بمێنێتەوە. منیش لـەناو ئەم گێژاوەدا سەرگەردان بووم. هەنـدێ کـات دەمویـست بـەرەو فـەرەنگ بـڕۆم بـەلام غیرەت ڕێگـەی لێدەگرتم. هەنـدێ کـات دەموت لەکوردستان بمێنمەوە، بەلام نادیاری داهاتوو ڕێگەی پێنـەدەدام. سـەرئەنجام بەپێی ئەم ڕستەیە (لەناو بەلادا بیت باشترە لـەوەی لەترسی بـەلادا بیت) ڕۆشـتن بۆ تارانم بـەباش زانی و زەوتکردنی مافەکانی مزگەوتی دارئەلئیحسانم لەبنەماڵەی حوجەت ئەلئیسلام کردە بیانو و بۆ نەهێشتنی هـیچ گومـان و دوودڵییـەك، شـێخ نـەجم ئەلـدین و شـێخ محەممـەدی وەسیم و شێخ ئاغابرام بۆ ئـەم سـەفەرە ئامادە کـرد تـا نازنـاوی حوجـەت ئەلئیسلامی بۆ خاوەنـەکانی مزگـەوتی دارئەلئیحسان بۆ شـێخ نـەجم ئەلـدین و نازناوی شێخولمەشـایخی و مانگانـەی پێویـست بـۆ شـێخ ئاغـابرا وەربگـرم و بگەڕێمـەوە. شـەوی ١٦ ڕەمـەزانی ١٣٢٦ بەنهێنی چاوم بەموشیر دیوان کەوت و بەڵێنمان بەست ئەگەر دەوڵـەت سـەرکەوتنی بەدەست هێنـا، ئـەو پارێزگـاری لەئێمـە بکـات و ئەگـەر خـەڵك سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا، ئێمـە پارێزگاری لەو بکەین. نیوەشەو لەکوردستانەوە بەرەو تاران بەڕێکەوتین. سـێ ڕۆژ لەڕێگـەدا بـووین و ڕۆژی چـوارەم گەیـشتینە هەمـەدان. دوو ڕۆژ لـەماڵی میرزامـەحمودخانی لوقمـان ئەلئیسنانی کوردستانی ماینەوە. حاجی شێخ محەممەد باقری موجتەهید و زۆربەی زاناکان و پیاوماقووڵانی هەمەدان بۆ بینینی ئێمە هاتن. ڕۆژی سێیەم بەرەو تاران بەڕێکەوتین.

ئێـوارێی ڕۆژی شەشی شـەوالی ١٣٢٦ گەیـشتینە گونـدی ڕەبـات کـەریمی نزیکـی تـاران. کاتـژمێرێك بـۆ ئێـوارێ، بروسـکەیەکمان بـۆ حـاجی شـێخ فـەزڵ اللـە نـوری کەهەمـەکارەی ئەوسای ئێران بوو و ئێمە نەماندەناسی، نارد:

(بۆ بەڕێز غوث الانام، بەڕێز حاجی شێخ فەزڵ الله نوری، لەگەڵ بەڕێزان حوجەت ئەلئیسلام و شێخولمەشایخی کوردستان، مەبەستی بینینی بـەڕێزتانمان کـردووە و لـەقووڵایی دڵـەوە

دەڵێم:

بەمەبەستی بینینی تۆ گیانم هاتۆتە سەر لێو، بگەڕێمەوە یا بێم، چییە فەرمانی ئێوە (بچوکتان محەممەدی پێشنویژ و وتارخوێن).

دوای چوارکاتژمێر ئەم وەڵامەی خوارەوەمان بەدەست گەیشت:

بۆ بەڕێز ئیمام جومعە و پێشنویژی کوردستان، هاتنتان مایەی شانازیمانە و ئەو شەرەفەمان پێببەخشن. سلام علیکم طبتم فادخلوها خالدین. بەیانی نیوەڕۆ، منالی حاجی میرزا هادی لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەبەڕێزان لەدوو فەرسەخی شار، چاوەڕوانی هاتنی ئێوە دەبن. لەبەر ئەوەی کاتی بینین نزیکە، زیاتر لەمە زەحمەتتان نادەم (شێخ فەزڵ الله نوری).

بەیانی ئەو ڕۆژە کە٧ شەوالی ١٣٢٦ بوو، بەرەو تاران بەڕێکەوتین. لەدوو فەرسەخی تاران گەشتینە خزمەتی حاجی میرزا هادی، کوڕی حاجی شێخ و ئیعتیماد ئەلشەریعە و بەڕێز شێخ ئەحمەدی موحەریر و دەستەیەکی دیکە لەکەسەکانی شێخ کە بەگالیسکە بۆ پێشوازیمان هاتبوون. ئێمەیان سوار گالیسکە کرد و ئەسپەکانیان لەگەڵ پیاوەکانمان لەدواوە هێنا. نیو کاتژمێر بۆ ئێواریێ، ڕۆشتینە ماڵی شێخ کەپێشوەخت دەستەیەك لەزاناکانی تاران وەك ئیمام جومعەی تاران و زەهیر ئەلئیسلام و سوڵتان ئەلعولەما و شێخ عیسا چالە مەیدانی و شێخ جەعفەری گوڵپایەگانی و حاجی عەلی ئەکبەر زاوای شێخ و شێخ ئەحمەدی عەرەب و هتد... بۆ بینینی ئێمە بانگێشت کردبوو. دوای ئەحواڵپرسی و یەکتر ناسین، شەربەتێك خورایەوە و بەڕێزان ڕۆشتن. حاجی شێخ فەرمووی: بەیانی لەباخی شا، دانیشتنێك بەئامادەبوونی باڵوێزەکان و زاناکان و هەموو چینەکانی خەڵکی تاران دەبەسترێت و دەیانەوێت سەبارەت بەمەشروتیەت بڕیارێك بدەن. زۆرینە هەرچی پەسەند کرد، پەسەندی دەکەن. ئەگەر هیلاکی ڕێگە نابێتە لەمپەر، بڵێم وەرقەی بانگێشت کردن بۆ ئێوەیش بێنن چوونکە لەوێ ئەگەری هەیە بتوانن چاوتان بەشا بکەوێت. وتم: هیلاکی ئێمە بەبینینی شێخ ڕەوایەوە. هەتاو بۆ هەر شوێنێك بڕوات، وەك سێبەر لەپشت سەری ئامادەین. شێخ لەگفتوگۆی ئیمە شادومان و تا ئێواریێ لامان مایەوە. هاوڕێکانم دوای نانی ئێواریێ، لەتاو شەکەتی ڕێگە، خەوتن. بەپیاوەکانم وت چای تازەم بۆ دروست بکەن و خۆیان بخەون. تا ئامادە بوونی چای، دەستم کرد بەنووسینی وتارێك بۆ دانیشتنەکەی بەیانی. کاتێك

پێنوسم هەڵگرت، هزرم بۆ دۆزینەوەی پێشەکی، بەهەر لایەکدا دەڕۆشت. نەمدەزانی چی بنووسم. ئەگەر لەوەسفی دیکتاتۆری شتێکم دەنووسی، پێچەوانەی ویژدان و پێچەوانەی وتەکانی ناخم بوو و ئەگەر وەسفی مەشروتیەتم دەکرد، بەپێچەوانەی ئاوز بوو. ئەگەر بێدەنگیم هەڵدەبژارد، ئەم دەرفەتەم لەدەست دەچوو. جیاواز لەوە گومانم دەکرد حکومەت و نەیارەکان ئەگەری هەیە لەناو نووسراوە خێرخوازییەکانی خۆیان، لەپێشینەی من ئاگاداریان کردبێتنەوە کەفلانەکەس لایەنگری مەشروتەیە. هەڵبەتە لەبەرابەر پێشهاتێکی لەمشێوە، بێدەنگی دەبووە هۆی پێشڤەچوونی ئارەزووی نەیاران. سەرئەنجام پێنوسم خستە سەر کاغەز و داوای هاوکاریم لەناخ کرد وئەم وتارەی خوارەوەم نووسی:

کەس ناتوانێت حاشا لەباشییەکانی مەشروتە بکات، چوونکە بنەمای مەشروتە، بنەمای ئاسایشە. بنەمایەکە پەیوەندی لەنێوان دەوڵەت و میللەت دروست دەکات، بنەمایێکە تەپوتۆزی و بێزاری نێوان پاشا و مسکێنەکان بۆ یەکگرتوویی و یەکێتی دەگۆڕێت کەدەوڵەت پشت بەمیللەت دەبەستێت و میللەت بەدەوڵەت هیوادارە تا بەیەکگرتوویی و یەکێتی، ولآت بخەنە سەر شارێگەی بەختەوەری و پێشکەوتن. بەهەمان شێوە کە لەسەر ئەم بنەمایە بوو دەوڵەتی مەزن و خاوەن شکۆی ئێران بەئارەزوومەندی دەستی خستە ناو دەستی خەڵك و مەشروتە و هەموو زاناکان و پێشەواکانی ئەم ولآتە بەباوەشێکی کراوە پێشوازییان لەم پێشهاتە کرد و بوونە لایەنگری مەشروتە. چی روویدا بەیەکجار ئەم یەکگرتوویە و یەکێتییە بۆتە هۆکاری بێزاری و دووبەرەکی و ئەو هاوبەشییە بەدووڕوویی و نەیاری گۆڕاوە. هیچ هۆکارێکی دیکە نییە مەگەر ئەوەی میللەتی نەزانی ئێران بەهای ئەم نیعمەتە نەزانێت و لەسەر بنەمای (ان الانسان لیطغی ان راه استغنی) دەستیان بەخراپەکاری و هەراوهوریای بێ سوود کردووە. ئەوەی نەدەبوا بیڵێن وتیان و ئەوەی نەدەبوا بیکەن، کردیان. لەجیاتی شوکر و سوپاس، دژی دەوڵەت وتاریان نووسی، ڕۆژنامەیان چاپ و بڵاو کردەوە. نامەکانی شەوانەیان بڵاو کردەوە. بۆمبیان لەسەر ڕێگەی شا دانا و سەرئەنجام دەوڵتیان لەمێهرەبانییەکانی پەشیمان کردەوە. زاناکانیش لەبەر نەزانی و جووتە هاویشتنی میللەت، ڕەمیان کرد و لەبۆچوونەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و سەرئەنجام بەتۆپباران کردنی ئەنجومەن کۆتایی هات و دەنگی تەپڵی ناوزڕان و نەزانی و نەشیاوی نەتەوەی ئێران لەجیهان و گوێچکەی جیهانیان دەنگیدایەوە کەنەك تەنیا دانیشتووانی کوردستان بەڵکو

هەموو بیرمەندانی بەویژدان ئێرانیان لەمەشروتە و مەشروتەخوازی پەشیمان کردەوە و ئەم گەنجە شیاوەیان بەبەهایەکی کەم لەدەستدا.

ئەگەر لەنەوەیەك کەسێك کارێکی نەزانانەی کرد.

نەکێو پێگەی دەمێنێتەوە نە مانگ

ئەگەر مانگایەك بکەوێتە لەوەڕگایەك

هەموو مانگاکانی گوندە تووش دەکات.

ئێمە سێ کەس، دوێنێ ئێواری لەلایەن سێسەد هەزار کەسی دانیشتووی کوردستان هاتووینە تاران. تەنیا بۆ ئەوە هاتووین تا بەپیاوانی دەوڵەت و میللەت بڵێین، میللەتی ئێران نەشیاوی خۆیان بەهەموو دنیا سەلماند کەشیاوی مەشروتە نین. دەوڵەتی ئێرانیش زیاتر لەمە ناتوانێت بەکارە نەزانینەکانی نەتەوەیەکی نەزان ڕازی ببێت. بەڕاشکاوی دەڵێم تا نەتەوەی ئێران بەتەواوی لەخەوی نەزانی بەخەبەر نەبێتەوە و بەهۆی زانست و مەعریفە هەست بەمافەکانی خۆیان نەکەن، نەك شیاوی مەشروتیەت نین، بەڵکو ناوی مەشروتە و مەشروتە خوازانی دنیایان زڕاند. ئەو سیاسەتەی ئەمڕۆ شیاوی ئەم میللەتەیە ئەوەیە کەدەڵێت:

ئەگەر سوڵتان سیاسەت نەفەرموێت

هەر ناکەسێك بانگەشەی سیاسەت دەکات

بەلاّ سەرانسەری زەوی دەگرێتەوە

نەدنیا دەمێنێتەوە نە دین.

بەهەمان شێوە کە بەچاو بینیمان و بەئاوز هەستمان پێکرد، دەسەلاّتی ولاّت بەدەستی میللەتی نەزان، هاوشێوەی چەقۆ خستنە دەستی کەسێکی سەرخۆشە. ئێمە نوێنەرانی خەڵکی کوردستان بەدەنگی بەرز و راشکاو کەهەموو باڵوێزەکان و نوێنەرانی دەوڵەتەکانی دراوسێیش بیبیستن، دەڵێین: ئێمە نەتەوەی بێ ئاوز، شیاوی نیعمەتی مەشروتە نین و ولاّتی ئێرانیش هێشتا بۆ ئەم نوشداروە ئامادە نییە. هێشتا پێویستمان بەسەرپەرستە و کاروباری ژیانی ئێمە دەبێت لەژێر سەرپەرەستی دەوڵەت بەڕێوە ببرێت. ئەگەر بۆ پێشکەوتن و بەختەوەری ولاّت مەشروتە پێویست بێت، دەبێت دەوڵەت خۆی جڵەوی بگرێتەدەست و لەولاّتدا بلاّوی بکاتەوە تا زیاتر لەمە لای خۆمان و بیانییەکان سەرشۆڕ وشەرمەزار نەبین.

ئەمە بۆچوونی ئێمەیە و زیاتر لەمە قسەیەکمان نییە بۆ وتن.

دوای ئەوەی وتارەکەم نووسی، پەیوەستی هاوڕێکانم بووم و خەوتم. بەیانی پێکەوە خۆمان شۆرد و تەپ و تۆزی ڕێگەمان لەخۆمان داماڵی تا ئێواریێ لەکاتی دیاریکراو بڕۆینە باخی پاشا. نزیك نیوەڕۆ حاجی میرزا هادی وتی: ئەو دانیشتنە بۆ ڕۆژی دوانزەیەم دواخراوە. ڕۆژی ١٢، کاتژمێری سێی ئێواریێ، هەموو زاناکان هاتنە ماڵی شێخ و لەوێوە پێکەوە بەگالیسکە بەرەو باخی شا بەڕێکەوتین. زیاتر لەپەنجا گالیسکە لەماڵی شێخەوە بەڕێکەوت. لەباخی شا دابەزین. خێوەتێکی گەورەیان هەڵدابوو کەزیاتر لەهەزار کەسی دەگرت. لەو شوێنەی شێخ دانیشت، ئێمەیش لای ئەو دانیشتین. باڵوێزەکان و کەسانێك لەچینە جیاوازەکانی خەڵك هاتبوون. هەر کەسە و هەر چینێك لەشوێنی دیاریکراوی خۆی دانیشتبوو. زۆری نەخایاند شازادە مۆئەیید ئەلدەولە ئەبولفەتح میرزا، لەگەڵ خزمەتکارێك کەکاسەیەکی بلورینی لەسەر سینیەکی زیوین بەدەستەوە بوو، هاتە ناو دانیشتنەکە و دەستی کرد بەکۆکردنەوەی دەنگەکان. حاجی شێخ فەزڵ الله و پێشنوێژی تاران حاجی میرزا ئەبولقاسم، بۆچوونی خۆیان تەسلیم بەمۆئەیید ئەلدەولە کرد و ئەویش خستیە ناو کاسەکە. سەرەی ئێمە گەیشت. من بەمۆئەیید ئەلدەولم وت: بۆچوونی ئێمە بۆچوونی کەسیەتی نییە، بۆچوونێکی گشتییە. ئێمە بەنوێنەرایەتی ویلایەتێك هاتووینەتە ئێرە، دەبێت بۆچوونەکەی خۆمان بەئاشکرا بڵێین تا دانیشتووانی کوردستان گومان نەکەن خیانەتمان لێکردوون. مۆئەیید ئەلدەولە سەیری حاجی شێخی کرد تا بۆچوونی ئەو وەربگرێت. حاجی شێخ وتی: بڕۆن و مۆڵەت وەربگرن. مۆئەیید ئەلدەولە ڕۆشت و گەڕایەوە و بەگوێی حاجی شێخدا چرپاندی. حاجی شێخ وتی: نەخێر، میوانی منن. لەوەڵامەکەی شێخ هەستم بەوە کرد شا لەبۆچوونەکەی ئێمە دوودڵە و نەهێشتنی ئەم دوودڵییەی بەشێخ سپاردووە. دواتر مۆئەیید ئەلدەولە وتی: فەرموون و بۆچوونی خۆتان بڵێن. لەو کاتەی کەهەستام، حاجی شێخ شەیپور دەرکەوت. چوونکە لەکوردستانەوە یەکترمان دەناسی، کاتێك منی بینی، بەرەو ڕووم هات. دوای ئەحواڵپرسی، کاغەزەکەی بەدەستی منەوە بینی، پرسی: دەتەوێت شتێك بخوێنیتەوە. وتم: بەڵێ. وتی: چاوەڕێبە تا کورسیەکت بۆ بێنم. بەخێرای لەچایخانەی شایی کورسییەکی هێنا. ڕۆشتمە سەر کورسییەکە. سەرەتا شێخ شەیپور بەدەنگی بەرز منی بەئامادەبووان ناساند. دواتر دەستم کرد بەخوێندنەوەی

وتارەکەم. لەجوولەکانی مۆئەیید ئەلدەولە هەستم کرد شا لەپشتەوەیە و گوێ دەگرێت. ڕەنگ و روخساری نیشان دەدات لەپێشەکی وتارەکەی من شڵەژاوە و چاوەڕوانە بزانێت بەچی کۆتایی دێت. کاتێک گەیشتمە بەشی دووەمی وتارەکەم، کەمێک ڕەنگ و ڕووی کرایەوە. دوای کۆتایی هێنان بەوتارەکەم هاواری ئەحسەنت، بەرز بوویەوە و مۆئەییەد ئەلدەولە بەرەو لای ئاخوند رۆستەم ئابادی رۆشت تا بۆچوونی وەربگرێت. ئاخوند بەدەنگی بەرز وتی: بۆچوونی من، دەنگی من، مەزهەبی من، ئەوەیە کەپێشنوێژی کوردستان وتی. جگە لەوە هیچ بۆچوونێکی دیکەم نییە. کاتێك لەو تێپەڕی، شێخ گوڵپایەگانیش ئەم وتەی دووبارە کردەوە. کەسانی دوای ئەویش بەهەمان شێوە. سەرئەنجام دەنگ بەرز بوویەوە کەبۆچوونی هەمووان ئەوەیە کەپێشنوێژی کوردستان ئاماژەی پێدا. ئەم نەتەوە شیاوی مەشروتە نییە. دەنگی زیندوو بێت پێشنوێژی کوردستان، لەهەموو شوێنێکەوە بەرز بوویەوە. باڵوێزەکان کەچاوەڕوانی زۆرینە و کەمینە بوون تا ببینن لایەنگرانی مەشروتە زۆرینە بەدەست دێنن یا نە، کاتێك ئەم بارودۆخەیان بینی، بۆچوونی سێیەم هاتە ئاراوە. جێبەجێ کردنی مەشروتە لەژێر سەرپەرەستی دەوڵەت. هەمووان بەدەم بزەوە سەیری یەکیان دەکرد بزوێنەرانی مەشروتە پەرێشان بوون و خەمبار و دڵتەنگ بڵاوەیان لێکرد.

لەکۆتایی دانیشتنەکە، مۆئەیید ئەلدەولە بەحاجی شێخی وت: شا دەفەرمێت حاجی شێخ و میوانەکانی بێنە لای ئێمە. پێکەوە رۆشتینە خزمەتی. حاجی شێخ ویستی من بناسێنێت. کاتێك ناوی منی برد، شا فەرمووی: بەڵێ بەڵێ، پێشنوێژی کوردستان، بەخێر بێن. ئێمە لەپێشەکی وتارەکەی ئێوە گومانمان لا دروست بوو. بەڵام بەشێوەیەکی باش کۆتاییتان پێهێنا. خۆشحاڵم، کەی هاتن، لەکوێن. وتم: منم چاوم بەدیداری شا روون بۆتەوە. سێ رۆژ پێش هاتینە تاران، لەماڵی حەزرەتی شێخین. فەرمووی: راکێشانی ئاخوندی ئێوەی بردۆتە ئەوێ، وەگەرنە لێرەیش ماڵی لێ بوو. وتم: گەدەی ئێمەی هەژار بەخواردنە شاییەکان عادەتی نییە. حەزرەتی شێخ میوانداری ئێمەی گرتە ئەستۆ. فەرمووی: فەرمان بەموشیر ئەلسەڵتەنە دەدەم سبەی ئێواریێ سەردانی ئێوە بکات. ئەگەر داواکاریتان هەیە، پێرستەکەی بنێرن تا فەرمان بدەم لەزووترین کات جێبەجێ بکرێت. بەڕێزانی حوجەت ئەلئیسلام و شێخولمەشایخم بەنازناوەکانیانەوە ناساند و لەکۆتاییدا وتم: هەمووان دۆعاگۆی بارەگای بەڕێزتانین. ئێمەی شافعی مەزهەب بەهۆی مەزهەبەکەمانەوە شا پەرەستین چوونکە پاشا

بەسەروەر و گەورەی خۆمان دەزانین. حاجی شێخ وتی: بەڵێ، سوونی مەزهەبەکان گوێڕایەڵی پاشا بەئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن. ئێمە لێرەدا بۆچوونی ئەوانمان خستە ڕوو (سوونی مەزهەب)، وتارەکەی ئیمایش دەرئەنجامی ئەم بۆچوونەیە. حاجی شێخ مۆڵەتی ڕۆشتنی وەرگرت و ئێمەیش بەهەمان شێوە. فەرمووی تا لەتاران حەز دەکەم بەردەوام بتانبینم.

بەیانی دەمەو ئێوارێ، بەڕێز میرزا ئەحمەدخانی موشیر ئەلسەڵتەنە، لەلایەن پاشاوە هاتنە لامان. ئێمەیش دوای ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی باو، پێرستی داواکارییەکانی خۆمان نووسی و تەسلیمان کرد. دوای ڕۆشتن بۆ ماڵ، بەهۆی پێشخزمەتەکەیەوە بڕی پێنسەد تمەنی خستە ناو پاکەتێك و بۆ ئێمەی بەجێهێشت. حاجی میرزا هادی و دەستەیەك لەخزمەکانی شێخ ئامادە بوون، گومانیان کرد پارەکە وەردەگرین. بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەوان، پارەکەمان خستە ناو پاکەتەکە و ئەم نامەی خوارەوەمان خستە ناو پاکەتێك و بۆمان ناردەوە: بەعەرزی حزووری ئێوەی بەڕێز رادەگەیەنم، ئەو پێنسەد تمەنی وەك خەرجی چایی و خواردن بۆ ئێمەتان ناردبوو، گەشت. زیاتر لەجاران دۆعاگۆین و سپاستان دەکەین. چوونکە ئەم ڕێزگرتنە نیشانی دەدات دەوڵەتی مەزن و خاوەن شکۆ، لەهەموو ڕوویێکەوە خوازیاری ئاسایش دۆعاگۆکانی خۆیەتی، بەڵام لەوێوە کەئێمە هاتووینەتە ماڵی حەزرەتی شێخ و میوانی ئەوین، ئەوان ڕازی نەبوون ئێمە خەرجی خۆمان بکێشین و هەموو خەرجییەکانی ئێمە کەوتۆتە سەرشانی ئەو حەزرەتە. لەبەر ئەمە ڕازیبوون بەو بڕە پارەیە بێ هۆ و زێدەڕۆیی دەبێت. لەگەڵ ڕێزی فراوان پارەکەمان گەڕاندەوە و دەڵێین ئێمە ئابڕوی هەژاری و قەناعەت نابەین. بەپاشا بڵێن ڕۆژی دیاریکراوە. تەنیا ئەگەر داوایەکمان هەبێت، خێرایی لەجێبەجێ کردنی داواکارییەکانە تا زیاتر لەمە نەبینە ئەرك بەسەر شانی حاجی شێخەوە. والسلام و علیکم و رحمه الله و برکاته. (محەممەدی کوردستانی)

کاتێك ئەمەم تەواو کرد، دام بەحاجی میرزا هادی و خوێندییەوە. وتی: مۆڵەت دەدەن حەزرەتی شێخ ئاگادار بکەینەوە. وتم: هیچ کێشەیەك نییە. دەقی وەڵامەکەی بۆ خوێندەوە. حاجی میرزا هادی ڕۆشت و بەخێرایی گەڕایەوە، وتی: حاجی شێخ زۆر خۆشحاڵ بوون و پەسەندیان کرد. پاکەت و پارەکەم تەسلیم بەپێشخزمەتەکە کرد، دە تمەن حەقدەستمان پێدا و بەڕێکەوت. ئەم ڕووداوانە لەتاراندا دەنگی دایەوە. زاناکان و پیاوماقووڵانی کوردستان، چ

لایەنگرانی دەوڵەت و چ لایەنگرانی مەشروتە سەردانیان کردین.

وردەکاری گفتوگۆکان و باسە زانستییەکانی ئێمە لەگەڵ زاناکانی تاران، زۆر و گشتگیرە و لەئاماژەدان پێیان چاو دەپۆشین. ڕۆژی سێیەمی گەیشتنی ئێمە بۆ تاران، بروسکەی خوارەوە لەلایەن حاجی شێخ بۆ دڵنەوایی کردنی پاشماوەکان ڕەوانە کرا.

((بەڕێزان و شەریعەتمەداران، بەڕێز ئەمین ئەلشەرع و موعین ئەلشەرع، سلمهماللە تعالی اللە، سێ ڕۆژە بەڕێزەکان بەسلامەت گەیشتوون، چوونکە خۆیان سەرقاڵی میوانداری سەردانکەرانن، دەرفەتیان نەبووە ئێوە ئاگادار بکەنەوە. لەبەر ئەمە و لەبەر ئاسایشی خەڵکان ئاگادارم کردنەوە. بەخواستی خوا خۆیان ئەگەر دەرفەتیان دەستکەوت، هەموو شتێکیان بۆ بروسکە دەکەن. سوپاسگوزارم کەبەخزمەتیان گەیشتم. خواوەند تەمەنی درێژیان پێببەخشێت. سلاوی تایبەتی بەموشیر دیوان بگەیێنن. خزمەتەکانی ئەوان لای دەوڵەت بەهادار و بێ وەلام نابێت (فەزڵ اللە نوری) شەوی دەی شەوالی ١٣٢٦، میرزا حسەین خانی دیوان بەگی، ئەم بروسکەی بۆ موشیر دیوان نارد:

(( بەڕێز موشیر دیوان، بەڕێزان شەرەفمەندانە گەیشتوونە مەنزڵ، ڕۆژی چوارەم بەپێی فەرمانی دەربار، بەشداری ئەو کۆبوونەوەیان کردووە کە لەباخی شا بەستراوە، هەتاوی شانازی لەولاتی ئێمەوە ئاوا بووە، یانی بەڕێز پێشنوێژی کوردستان، هەستاوەو وتارێکی سەرنجڕاکێشی خوێندۆتەوە، بەڕاستی کە نەتەنیا کوردستان، بەڵکو ڕۆحی هەموو ئێرانی شادومان کردووە. لەهەر شوێنێکەوە دەنگی ئافەرین و ئەحسەنت بەرز بۆتەوە. دوای کۆتایی هێنان بەدانیشتنەکە، بەبینینی پاشای ئیسلام پەنا شادومان بوون و زیاد لەڕادە ڕێزی لەبەڕێزانی کوردستان گرتووە. دووبارە لەبەردەم پاشا، پێشنوێژی کوردستان وتارێکی خوێندۆتەوە. بەکورتی ئێستا باس و وەسف کردنی ئەو، بۆتە داستانی هەر کۆڵان و گەڕەکێکی شارەکە. بەڕاستی تا ئێستا کەس سەفەرێکی لەوشێوەی نەکردووە و نایکات. دەبێت هەموان بەهای ئەم نیعمەتە بزانین و ئەم دەرفەتە بۆ زیندوو کردنەوەی کوردستان بقۆزینەوە.

بەیانی ئەو ڕۆژە هەموو زاناکان و کاربەدەستانی دەوڵەت، لەوەزیر تا دووایین کەس، بۆ پیرۆزبایی کردن هاتنە ماڵی ئێمە. لەزمانی منەوە ئەم بروسکە بۆ کەسوکاری ئەو ڕەوانە دەکرێت و پیرۆزباییان لێدەکەم.(حسەینی دیوان بەگی)))

لەلایەن سوپاسالاری گەورە، بروسکەیەك بۆ موشیردیوان ڕەوانە کرابوو:

((جەنابی جەلال ماب، موشیر دیوانی وەزیری کوردستان، بەڕێز پێشنوێژی کوردستان، لەسەر کۆنگرەی شانازی و شکۆ، ئالآی هەڵکرد. بەتایبەت پاشای گەورە لەوتەکانی بەڕێزیان شادومان بووە. ئەمڕۆ لەسنوری دڵ، دەست دەستی ئەوە. بەڕاستی، پێش هەمووان کەوتووە و حەشر دەکات. تا ئێستا سێ جار شەرەفی بینینی پاشای پێبڕاوە و هەرجارە، ڕێزی شایانەی لێدەگیرێت. لەلایەن منەوە بەڕێزان ئەمین ئەلشەرع و موعین ئەلشەرع دڵنیا بکەنەوە. بەخواستی خواوەند بەم نزیکانە دەگەڕێنەوە. سوپاسالاری گەورە))

شەوی ٢٤ شەوالی ١٣٢٦ بەپێی ئیشارەی دەربار، حاجی شێخ فەزڵ اللە نوری و دەستەیەکی دیکە لەزاناکان، داواکارییەکیان بۆ دەرباری پاشا بەرز کردەوە و خۆیان پێشکەشیان کرد و لەدەربار کۆبوونەوە. بەماوەی دوو کاتژمێر، نووسراوێك بەم ناوەڕۆکەی خوارەوە دەرکرا و بەیانی، لەگەڵ داواکارییەکەی ئەو بەڕێزانە چاپ و لەشاردا بڵاویان کردەوە.

باسمە تبارك و تعالی

بەڕێزان، حوجەت ئەلئیسلام، مەبەستی ئێمە هەموو کات بەهێزکردنی ئیسلام و پشتیوانیکردنی ئۆمەتی محەممەدی بووە. ئێستا کەهەستتان کرد دامەزراندنی ئەنجومەن پێچەوانەی یاسا ئیسلامییەکانە و فەرمانی ڕێزگرتنتان دەرکرد و زاناکانی وڵاتیش، بەنووسراو و بروسکە پشتڕاستیان کردەوە، ئێمەش دەستبەرداری داواکەی خۆمان دەبین و چیتر باسی ئەنجومەن ناکرێت بەڵام بەسەرنجدان بەوتەکانی حەزرەتی ئیمامی زەمان، بۆ بڵاو کردنەوەی دادپەروەری و یەکسانی، فەرمانی پێویستمان داوە و دەیدەین. ئێوەی بەڕێز هەموو چینەکانی خەڵك لەم بڕیارە شایانەی ئێمە بۆ بڵاوکردنەوەی دادپەروەری و ڕێزگرتن لەمافی مسکێنەکان و لەناوبردنی گەندەڵی بەپشت بەستن بەیاساکانی دینی ئیسلام، ئاگادار بکەنەوە. محەممەد عەلی شای قاجار))

بسم الله الرحمن الرحیم

بەبەندەکانی شاهەنشای ئیسلام پەنا ڕادەگەیەنین لە ١٢ شەوالی ١٣٢٦ کە کارگوزارانی دەوڵەت، دەستەیەکی فراوان لەزاناکان و شازادەکان و وەزیرەکان و میرەکان و پیاوماقووڵان و ئەشراف و بازرگانەکان بەپێی فەرمان لەدەربار کۆبوونەوە و ئەو بەیاننامەتان لەمەجلیسی نیشتمانی بڵاو کردەوە کە بەهیچ جۆرێك کۆدەنگی لەسەر نییە. بەهەمان شێوە کەبینیمان و ئێمەی موسوڵمان کە لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامیداین، بەهیچ جۆرێك ڕازی نابین زیان بەدین و ئیسلامی ئێمە بگات. لەبەرابەر فەرمانەکانی ئیسلام، شا و مسکێن یەکسان و بەرابەرن و پاراستنی دین و ئایینی شەریعەتی پێغەمبەر، ئەرکی سەرشانی هەموانە. دوای بروسکەی هەموو ویلایەتەکان و شارەکان کەزیاتر لەدووسەد بروسکە بوو، دەستەیەکیان شرۆڤەکران و دەستەیەکیان تەنیا خوێندرانەوە و دوای ئەوەی حوکمەکانی حوجەج ئەلئیسلام و زاناکانی دیکە بەئامادەبووان ڕاگەینرا و تۆمارە فراوانەکان سەبارەت بەم بەڵا گەورەیە لەچینی زاناکان و زانستخوازان و بازرگانەکان و پیشەوەران کەلەو کۆبوونەوەدا نەبوون، یەك یەك خوێندرانەوە. دوای ئەمە، هەموو ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە لەهەموو چینەکان بەهۆی جەنابی ئەشرەفی سەدری ئەعزەم، تۆمارێکیان بۆ پاشگەزبوونەوە لەم بڕیارە پێشکەش بەدەرباری پاشاکرد و خوازیاری بینینی سەرچاوەی دادپەروەری بوون و دوای بینینی پاشا و بەڵێنی شایانە، مۆڵەتی ڕۆشتنیان پێدرا، تا ئێستا کە ٢٤ ڕۆژە، لەلایەن شاهەنشای هومایونی فەرمانی ئاسایش، دەرنەکراوە کەبەهەموو یاسا و ڕێسایەك، پاراستنی ئیسلام لەهەموو ڕۆژگارەکان لەئەستۆی پاشا و زاناکانە. لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ هەمووان چاوەڕوانین و کات دەگوزەرێنین تا ئەوەی چاوەڕوانی لەڕادە تێپەڕی و تەنیا ڕێگەمان دووبارە بینینەوەی شاهەنشای هومایونییە و چوونکە ئەم داوایە بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی شەرعییە و پێویستمان بەمۆڵەت وەرگرتن لەخاوەنی شەرع نییە. سوێند بەهەموو پیرۆزییەکان، ئێمە بەڵکو هەموو موسوڵمانانی ئەم وڵاتە، بۆ دامەزراندنی مەجلیسی شۆرای گشتی ئامادە نین و ئەنجامەکەی جگە لەپشێوی و ئاژاوە و بەفیڕۆچوونی نامووس و شەرەفی ئیسلامی ئێمە، هیچی دیکە نییە.

لەمکاتەدا حاجی مەلا عەلی نەسیر ئەلئیسلام لەکوردستان بۆ سەرپەرەشتی کردنی مزگەوتی والی دارئەلئەمان هاتە کوردستان و هاتە لای ئێمە. ئێمەیش بەخێرایی ئەومان

برده خزمەتی پاشا و فەرمانیدا فەرمانەکەی بۆ دەربکەن. بەپێی ئەو پێرستەی دابوومان، هەشت فەرمان و دوو گۆچانی گەوهەرنیشان، یەکیان بۆ خۆم و ئەوی دیکەیان بۆ حوجەت ئەلئیسلام و دە ئەنگوستیلەی ئەڵماس و دوو تۆپ عابای تورمەیی و هەژدە دەستنووسی و دوانزە نازناو و حەوتسەدتمەن مانگانە بۆ خۆمان و بنەماڵە و کەسەکانمان دەرکرا و بەهۆی حاجی شەیف ئەلشەریعەی تەبریزی، مامۆستای شا، تەسلیم بەئێمەکرا.

زۆری نەخایاند عەین ئەلدەولە، لەتەبرێزەوە بێ دەسکەوتنی هیچ ئەنجامێك گەڕایەوە و هاتە تاران. دوای چەند ڕۆژ فتوایەك لەلایەن ئاخوند مەلا کازمی خوراسانی بەم ناوەرۆکەی خوارەوە چاپ و بڵاو کرایەوە:

بسم الله الرحمان الرحيم

بەستنی ئەم مەجلیسە پێویست و جێبەجێ کردن و پشتیوانی کردنی ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانانە. (محەممەد کازمی خوراسانی).

بۆ حوجەت ئەلئیسلام ئاخوند مەلا کازم: مەجلیسی شۆرای ئیسلامی کەبنەمای ژیانەوە و دیاریکردنی سنوری دەوڵەت و هۆکاری بەختەوەری و سەروەری میللەت و نەهێشتنی ستەمی دیکتاتۆرانەی دەسەڵاتداران و هۆکاری ئاسوودەی هەموانە، ئایا بوونی لەئێران پێویستە یا حەرام، پاراستنی ئەرکی سەرشانی خەڵکە یا ڕووخاندنی؟ هیوادارم ئەوەی ئێوەی بەڕێز بیری لێدەکەنەوە، لەناو فتواکەتان ئاماژەی پێبدەن تا بەڵگەیەك بێت بۆ هەمووان.

بەدوای ئەم ڕووداوانە لەتاران بڵاوبوویەوە کەدەستەی ئیتیحاد و تەرەقی لەدەوڵەتی عوسمانی پێشکەوتنیان بەدەست هێناوە و سالۆنیکیان کردۆتە بنکەی خۆیان و بڕیاری جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەتیان داوە و سوڵتان عەبدولحەمیدیان ئاگادار کردۆتەوە ئەگەر داواکارییەکانی ئەوان جێبەجێ نەکات، هێرش دەکەنە سەر ئیسلامبۆڵ. ئەنوەر بەگ و حەکەمی بەگ کە لەئەندامە گەورەکانی دەستەی ئیتیحاد و تەرەقین و بەم دواییانە لەبێرلین و ڤیەننا بوون، بەخێرایی بەرەو سالۆنیك گەڕانەوە. سوڵتان عەبدولحەمید دوو سێ ڕۆژ ڕاوێژ دەکات و لەژوورەکەی ناڕواتەدەر و جگە لەتۆفیق پاشا، کەسی دیکەی نەبینیوە و شەو و ڕۆژ، کەژاوەی سوڵتانی و کەژاوەی جەنگی لەبەرابەر

عیمارەتی یەڵدوز ئامادەی حەرەکەت بوون.
دانیشتووانی ئیسلامبۆڵیش هەموو ڕۆژێك لەشارەکە دەڕۆنەدەر و لەگوندی سان ئیستیفانۆ کۆ دەبنەوە و مەبەستی پەیوەست بوون بەئۆردووی سالۆنیکیان دەکرد. بەیانی ڕۆژی ٢٤ ئاوریل، ئوردوی سالۆنیك هێرش دەکاتە سەر بەرزاییەکانی یەڵدوز و گەمارۆی دەخەنە سەر. دوای جەنگێکی قورس و دژوار، ئوردوی ساخلۆی عیمارەتی یەڵدوز تەسلیم دەبێت، شەوکەت پاشا سەرۆکی ئوردوی سالۆنیك دەڕواتە ناو شاری ئیسلامبۆڵ. دوای چەند کاتژمێر جەنگ، هەموو سوپای شارەکە تەسلیم و چەك دادەنێن و باری نائاسایی لەشار ڕادەگەینرێت و سوڵتانی تازەی عوسمانی، سوڵتان محەممەدی پێنجەم، لەسەدا بیستی داهاتەکەی خۆی بەخەزێنەی دەوڵەت دەبەخشێت. بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە کە بەهۆی بروسکەخانەکانی دەرەوە دەگەیشت، ترسێکی گەورەی لەناو دەوڵەت و کاربەدەستانی دەوڵەت دروستکرد و کەوتنە جموجۆڵ. چوونکە ئەزمون کرابوو کەسیاسەتی ئێران هەنگاو لەدوای هەنگاو بەدوای سیاسەتی عوسمانیدا دەڕۆشت و لەپێشکەوتنی مەبەستی دانیشتووانی عوسمانی، ئاشکرا بوو، دانیشتووانی ئێرانیش لەداهاتوویەکی نزیك بەمەبەستەکەی خۆیان دەگەن. لەم ماوەدا، کەریمی دەواتگەر، دوای تێپەڕینی پێنج کاتژمێر لەشەو، لەپشتماڵی عێزەد ئەلموڵك، تەقە لەحاجی شێخ فەزڵ اللە دەکات. گوللەیەك بەرقاچی شێخ دەکەوێت و شێخ بەبریندراری دەبەنە ماڵەکەی خۆی. لەناو ئەم ڕووداوانە، لایەنگرانی سیاسی مەشروتەی ئێران، بەنهێنی چاویان بەشا دەکەوێت و لەلابردنی سوڵتان عەبدولحەمید ئاگاداری دەکەنەوە و بەڕازیبوون بەمەشروتییەت ناچاری دەکەن بەڵام بەڵێنی پێدەدەن بۆ پاراستنی ڕێزی سەڵتەنەت، پێشتر خەڵکان هەستی خۆیان دەربڕن و لەبەرابەردا شا فەرمانی مەشروتییەت دەربکات.
بەپێی ئەم ڕێکەوتنە، چوارشەممە ١٤ ڕەبیع ئەلثانی ١٣٢٧ کەبەیانییەکەی جەژنی لەدایکبوونی پاشایە، هاوشێوەی هەموو ساڵەکانی دیکە جەژنێك لەباغی پاشا سازدرا و باخەکەیان بەتەواوی ڕازاندەوە. دانیشتووانی شاریش بەناوی شاپەرەستی، هەموو شار و بازاڕ و دووکانەکانیان ڕازاندەوە و ڕێز و خۆشەویستی خۆیان نیشانی پاشادا. ڕۆژی جەژن، دوای چوار کاتژمێر، باڵوێزی دەوڵەتەکان و وەزیرەکانی دەرەوە بەجلوبەرگی ڕەسمی لەگەڵ ئەمیر موعەزەم وەزیری تەشریفات و مشار ئەلسەڵتەنە، یاریدەدەری وەزیری دەرەوە، بۆ

پیرۆزبایی کردن دەڕۆنە خزمەتی شا و دوای ڕێوڕەسمی باو، مۆڵەتی ڕۆشتنیان پێدەدرێت بەڵام لەسووچ و قوژبنەکانی باخەکە، بەڕوالەت تەنیا بۆ سەیر کردن پیاسە دەکەن بەڵام لەناخەوە بۆ ئەوەی پاشای وڵات لەدوایین جەژنی سەڵتەنەتی خۆیدا ببینن. دواتر شاهەنشا لەسەر تەخت دادەنیشێت، جێگر و جێگری سەڵتەنەت ئەمیر کەبیر، کامەران میرزا و شازادەکان و وەزیرە پایەبەرزەکان و میرەکان و چینەکان و کاربەدەستان نیزام، دەگەنە خزمەتی پاشا و لەتۆپخانەوە تەقاندنی تۆپ دەستپێکرد و دەستە نیزامییەکان نمایشێکی جوانی سەربازییان نیشاندا. لەکۆتایی جەژنەکە هەواڵ گەیشت موعێزسوڵتان سەردار موحیی و موسیۆ یەپرەم دەستیان بەسەر قەزویندا گرتووە.

ڕۆژی ١٨ مانگ، فەرمانی زیندووکردنەوەی بنەماکانی مەشروتە، وەك لەخوارەوە ئاماژەی پێدەدەین، دەرکرا.

### فەرمانی هومایوونی

لەو ڕۆژەوەی بەپێی فەرمانی خواوەند، پاشایەتی دەوڵەتی ئابادی ئێران، بەئێمە بڕاوە، بەردەوام شاهەنشا بیری لەنەهێشتنی کەموکوڕییەکان و پەرێشانییەکان و کێشەکانی ئەم وڵاتە شەش هەزار ساڵە بووە کەهاوشێوەیماڵی خۆمان و نیشتمانی ئازیزی خۆمانە. جگە لەتێکەڵ کردنی هێزەکانی میللەت و دەوڵەت و سەڵتەنەت هیچ ڕێگە چارەیەك نییە و جگە لەهاوکاری و چارەسەری گشتی دانیشتووانی ئەم خاکە پاکە بۆ پەرستاری کردن و خزمەت کردن بەم دایکە مێهرەبانە هیچ ڕێگەیەکی دیکەمان نییە. شەو و ڕۆژ، بەبەردەوامی، لەئەندێشەی ئەم ڕێگەچارەدا بووین تا ئەوەی خودی میللەتی بوێری ئێران و منداڵە ئازیزەکانی ئێمە، بەنییەتی پاك، هاوکاری ئێمەیان کرد و لەدەرباری پیرۆزی شاهەنشا داوای مەشروتەیان کرد.

بروسکە و تۆمارە نووسراوەکانی ئێمە بۆ شاهەنشای خوالێخۆشبوو لەبروسکەخانە ماوە و هاوخەمی ئێمە لەگەڵ میللەتەکەی خۆمان نیشان دەدات و دوای بەخشینی مەشروتە کاتێك هاتینە تاران، بۆ واژۆ کردنی دەستوور چەندە زەحمەتمان کێشا تا ئەوەی شاهەنشامان بۆ واژۆ کردنی ناچارکرد و کاتێك تاجی سەڵتەنەتی بەخۆمان بڕا، یەك خولەکیش بۆ پێشکەوتن و پێشخستنی کاروباری تایبەت بەمەشروتە کەمتەرخەمیمان نیشاننەداوە و هەموو هێزی خۆمان بۆ فراوان کردن و مەزنکردنی مەجلیسی شۆرای ئیسلامی تەرخانکرد

بەڵام دەستدرێژی نەیاران و خیانەتکاران لەم دواییانە، بەوشێوەی شارەزاکان دەزانن و لێی ئاگادارن، بەتەواوی ئێمەی پەرێشانکرد و بێهیوای کردم. ئەو بارودۆخە ناسازگارەی مەجلیسمان بەچارەسەرکەری گرفتارییە جۆراوجۆرەکانی ئێران و ئەم ئاو و خاکە نەزانی. ماوەیەك بەپێی یاسای گشتی، دانیشتنەکانی مەجلیسمان نەهێشت و لەنۆزدەی شەوالی ١٣٢٦ کاتێك ویستمان مەجلیس بکەینەوە، هەندێ لەکۆسپ و تەگەرەکان ڕێگەی ئەو کارەیان لێگرتین و هەمووان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە، کۆبوونەوەکانی پەرلمان سازدەدرا، جگە لەڕژانی خوێن و لەناوچوونی خەڵکان، هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەدەکەوتەوە. ئەوەبوو دواتر بەدۆزینەوەی ڕێگەچارە، کۆسپ و تەگەرەکان لەسەر ڕێگە لابران و ئەمڕۆ کەکاتێکی گونجاوە و کۆسپ و تەگەرە لەئارادا نییە، ئارەزوومەندانە و لەدڵەوە، ئەم فەرمانە پیرۆزە کەگونجاوە لەگەڵ دەستووری وڵات، بێ کەموکوڕی، فەرمانی سازدانی کۆبوونەوەکانی پەرلمان دەدەین و دیاریمانکرد کەدەستەیەك لەکەسە زانا مەشروتەخوازەکان کەبرواپێکراوی میللەت و دەوڵەت بن، پەیوەستی مەجلیسی شۆرای ئیسلامی وڵات دەبن و یاساکانی هەڵبژاردن ئامادە و بڵاوی دەکەنەوە و لەگەڵ ئەوەی یاسای هەڵبژاردن بڵاوبوویەوە، هەڵبژاردن دەستپێدەکات و کاتێك دوو لەسەر سێی پاڵێوراوەکان هەڵبژێردران، مەجلیسی شۆرای میللی لەبەهارستان دەکرێتەوە. لەبەرواری ١٨ شەهریوەری رەبیع ئەلثانی ١٣٢٧، لەکۆشکی سەڵتەنەتی باغی شا، ساڵی سێیەمی سەڵتەنەتی ئێمە ئەم فەرمانە دەرکرا. (محەممەد عەلی شای قاجار).

لەئەنجامی کاریگەری ئەم ڕووداوانە، موشیر ئەلسەڵتەنە لەوەزارەت دوورخرایەوە و میرزا جەوادخانی سەعدئەلدەولە وەك سەرۆك وەزیر دەستنیشانکرا. دووبارە لە ٢٧ رەبیع ئەلثانی ١٣٢٧ فەرمانێکی دیکە بۆ دامەزراندنی مەشروتیەت بەپێی ماددەی ١٥٨ دەستور، لەگەڵ وتاری خودی سەعدئەلدەولە کە لەخوارەوە ئاماژەی پێدەدرێت، چاپ و بڵاووبویەوە.

دەستنووسی شاهەنشاهی: لەبەر ئەوەی ئاسوودەی گشتی و دڵنەوایی کردنی دڵی ڕۆڵەکانی نیشتمان کەمناڵە ڕۆحانییەکانی ئێمەن، زیاد لەڕادە جێی سەرنج و جەخت لێکردنەوەی هاوپەیمانی نێوان دەوڵەت و میللەت، مەبەستی شاهەنشای ئێرانە و بۆ سەلماندنی جێبەجێ کردنی ئەم نییەتە پاکە و پیرۆزە، ڕوونکردنەوەی هەر بابەتێکی نامۆ و شیکردنەوەی هەر بابەتێکی کورت کەئەگەری هەیە ببێتە هۆی هەڵخراندن و گومانی

خەڵکان، بەپێویست دەزانین، بۆیە بۆ پشتڕاستکردنەوە و جەختلێکردنەوەی فەرمانەکی پێشوو، بەمەبەستی ئاگادار کردنەوەی خەڵکان دەنووسین کەمەشروتییەتی ئێران لەڕووی هەمان ماددەی ١٥٨ دەستوور و بنەمای بەختەوەری ولآتە. ٢٧ رەبیع ئەلثانی ١٣٢٧، (محەممەد عەلی شای قاجار).

## بەیانییەی سەعدئەلدەولەی سەرۆک وەزیر

چوونکە لەڕادە و ئەندازەی بەزەیی شاهانە و باوکانەی هومایونی شاهەنشاهی، ڕۆحمان فیدای بێت، سەبارەت بەخەڵکانی ئێران ئاگادارین و لەنییەت پاکی پیرۆزیان دڵنیایین کەدوای نەهێشتنی لەمپەرەکان، سەقامگیر کردنی بنەماکانی مەشروتییەت کەهۆکاری بەختەوەری و پێشکەوتنی ئەم ولآتەیە، لەلایەن شاهەنشاوە گرنگی و سەرنجی پێدەدرێت.

بۆیە لەم قۆناغە ڕەشەی شۆڕشەکان، لەڕازیبوون و وەرگرتنی ئەرکە دەوڵەتییەکان خۆم بەدوور نەگرتووە و ئارەزوومەند بووم ئەو کاتەی نییەت پاك و پیرۆزەکانی شاهەنشا، شێوەی ڕاستین بەخۆیەوە دەگرێت و هەتاوی مەشروتییەت لەڕۆژهەڵآتی بەزەیی شاهانە بەرەو ئاسۆی هیوای و چاوەڕوانی ئێرانییەکان تیشك دەپرژێنێت، بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستە پیرۆزە، تواناکانی خۆم دەخەمەگەڕ. لەگەڵ ئەوەی دوو فەرمانی هومایوونی کە بەم دواییانە بۆ مۆڵەتدان بەزیندوو کردنەوەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی میللەت و ئامادەکاری بۆ کردنەوەی پارلمان، بلآوکرایەوە، ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە کەهیچ کەموکوڕییەك لەبنەماکانی مەشروتییەت کاریگەری لەسەر دڵی ڕووناکی شاهەنشا دانەناوە و دەستوری گشتی ئێران، پێکهاتوو لەپەنجا و یەك ماددەی کۆن کەشاهەنشا واژۆی کردووە و سەد و حەوت بەند، بەتەواوی دەپارێزرێت و جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانە، جێی سەرنج و گرنگیپێدانی شاهەنشای هومایوونییە. لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ نەهێشتنی گومان و بۆ ئەوەی لای خەڵکان بەشاراوەیی نەمێنێت، شاهەنشا بۆ ئاسوودەی و ئاسایشی نەتەوەی ئێران، کەمتەرخەمی نەکات، بەپێی فەرمانی شاهەنشا، دووبارە سەرنج و بەزەیی شاهانە پەیوەستی دوو فەرمانەکەی پێشوو کرا بەمەبەستی ڕوونکردنەوەیان. ئێستا ئەرکی سەرشانی هەموو ڕۆڵەکانی نیشتمانە بۆ سپاسکردنی ئەم دیارییە گرانبایيە شاهانە، لەگیان و دڵ ئامادە و لەپاداشتی خزمەتێك کە لەم کاتەدا توانیم ئەنجامی بدەم، بۆ پاراستنی نەزم و ئاسایشی ولآت و بەتایبەت لەناو بردنی دووبەرەکی و ئاژاوەگێڕی، کەبەدبەختانە لەماوەیەك پێش

ئێستا لەژێر ناوی مەشروتە خوازی لەناو ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە ڕوویداوە، هەوڵ و کۆشش بدەن و ڕق و کینەی تایبەت و نەخۆشی هەوا و هەوەسپەرەستی لەخۆیان دوور بکەنەوە و یەکدڵ و یەکدەنگ، لەشارێگەی یەکێتی هاوهەنگاو بن تا ڕزگاری هەمیشیی و بەختەوەری جیهانییان دەستکەوێت.

لەدوای ئەم ڕووداوانە، عەلی قولی خان سەردار ئەسعەدی بەختیاری، کە تازە لەفەرەنگ گەڕابووویەوە، لەگەڵ سەمسام ئەلدەولە و زەرغم ئەلسەڵتەنە و هێزەکانی بەختیاری هێرشیان کردبووە سەر تاران و دەستیان بەسەر قومدا گرتبوو. محەممەد وەلی خانی سوپاسالاری ئەعزەمیش لەتەنکابۆنەوە پەیوەستی شەڕکەرانی قەزوێن بوو. شا لەباخی شاوە بەڕێکەوت و ڕۆشتە سەڵتەنەت ئاباد و بەشێك لەسوپای دەوڵەتی بەفەرماندەیی کاپیتان زاپۆلۆسکی لەگەڵ تۆپی ماکزیم بۆ شەڕی خۆبەخشەکان نارد. لەبادامەك، جەنگێکی قورس ڕوویدا. سەرەتا قەزاق سەرکەوتنی بەدەستهێنا. دواتر سەردار ئەسعەد لەقوم بەڕێکەوت و پەیوەستی هێزە خۆبەخشەکان بوو و شکستی بەهێزەکانی قەزاق هێنا. دووبارە لەلایەن دەوڵەتەوە، سوپایەکی دیکە بۆ هاوکاری کردنی قەزاق ڕەوانە کرا. ئەگەری هەیە خوێنەران لێرەدا بپرسن دوای ئەوەی شا فەرمانی مەشروتەی دەرکرد، ئەم شەڕ و جەنگانە لەسەر چی بوو؟ مەبەست لەم هاتوچۆیان چی بوو؟ لەوەڵامدا دەڵێین ئەوانە هەورەکانی هەڵگری وزەی پۆزێتیڤ و نێگەتیڤن کە لەباشور و باکوری ئێران بەرز بوونەوە و دەیانەوێت لەئاسمانی تاران بەریەك کەون تا هەورەبرووسکەی ئاژاوە دەستپێبکات و شا لەوزەی پۆزێتیڤ، ببێتە نێگەتیڤ و بەهاری مەشروتییەت بەشێوەی سروشتی خۆی نیشانبدات.

بەنهێنی ئەمەم بەحاجی شێخ وت کە:بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن بەدانیشتووان دەبێت. باشترە ڕێگەی سازان لەگەڵ ئەوان بگرنەبەر و خۆتان بگەیەننە شوێنی ئەمن و پارێزراو تا لەهەورەبروسکەی ئاژاوە پارێزراو بن. شێخ لەوەڵامدا وتی: منیش دڵنیام ئەوان پێشکەوتن و سەرکەوتن بەدەستدێنن. بەڵام لەسەرەتا منیش لایەنگری مەشروتە بووم، دواتر تێگەیشتم ئەم گۆڕانییە، گۆڕانی بێگانەیە و بەئێمە ئاشنا نییە، بەخێرایی باوەڕی ئایینی ڕێگەی لێگرتم و لەهاوڕێکانم دوورکەوتمەوە و لەماڵەوە گۆشەگیر بوون. دەوڵەتییەکان ڕێگەیان نەدام دانیشم و دەوریان گرتم و خوازراو و نەخوازراو منیان بردە عەبدولعەزیم و منیان تێوەگلاند تا میرزا مستەفای داماویان لەوێ کوشت و بەمشێوەیە پەیوەندی من و

مەشروتەخوازان بۆ هەمیشە شێوا و پەرێشان بوو و بەتەواوی منیان بەلایەنگری شا لەقەڵەمدا. لەناخەوە چوونکە بنەماکانی مەشروتەم بەپێچەوانەی یاساکانی دین دەبینی، ئارەزوومەند بووم، شا سەرکەوتن بەدەست بێنێت تا ئەوەی ئێستا سازان و ئاشتی من لەگەڵ مەشروتەخوازان دژوارە، نەئەوان من وەردەگرن، نەشیاوە ڕۆژێك لایەنگری مەشروتە و ڕۆژێك لایەنگری پاشا بم. کەواتە هەڵبژاردنی دووەم دەمێنێتەوە کەبڕۆمە شوێنێکی ئەمن و پارێزراو. هەرچی بیردەکەمەوە، ئەمەیش ئەگەری نییە، چوونکە ئەگەر بڕۆمە دەرەوەی وڵات، نەیارەکان لەڕێگە هەوڵی لەناوبردنم دەدەن بەهەمان شێوە کەویستیان لەشاردا بمکوژن و برینداریان کردم بەلاّم ئەجەلم هێشتا کۆتایی نەهاتبوو و ئەگەر بمەوێت لەیەکێك لەباڵوێزخانەکان پەنا بگرم، گفتوگۆم لەگەڵ باڵوێزخانەی عوسمانی کردووە. شارژدافر، جێگری باڵوێز بەئاشکرا ڕەدی کردەوە و من وەرناگرێت. لەباڵوێزخانەکانی فەرنگیش، بۆ جیهانی ئیسلامی بەنەنگ دەزانم کە لەمێژووی کفر و ئیسلام بنووسن یەکێك لەزاناکانی ئیسلام دووای حەفتا ساڵ خزمەت بەجیهانی ئیسلامی، لەترسی مەرگ پەنای بۆ باڵوێزخانەی فەرەنگ برد. مەرگ بۆ من لەمە باشترە. وتم: چ کێشەیەك هەیە ئەگەر لەگەڵ من بێیت بۆ کوردستان تا بزانین دەرئەنجامەکانی ئەم ئاژاوە بەکوێ دەگات. وتی: ئەم بیرۆکەیش هیچ ئەنجامێکی نییە چوونکە ئەگەر دەوڵەت سەرکەوێت، بۆ من مانەوە لەتاران باشترە و ئەگەر مەشروتەخوازان سەرکەون، لەهەر شوێنێکی ئێران بم، بەهۆی حکومەتی ویلایەتەکان داوای من دەکەن. وتم: کوردستان سەر سنوورە. ئەگەر نەمانتوانی لەوێ بتانپارێزین، لەوێوە بەئاسانی دەتوانن بۆ دەرەوەی وڵات بڕۆن. وتی: هێزی جەستەی و توانای کۆچ کردن بۆ دەرەوەی وڵاتم نییە. دووایین شت کەبەباشی دەزانم ئەمەیە: غمض العینین، مدالرجیلین، قول الشهادتین، رضینا بقضاء اله و نصبر علی بلاء اله.

لەم ڕستەیە کەچیتر نەمانی هیوا بۆ مرۆڤ بوو، خەمبارییەکی قورس دایگرتم، دوای ماوەیەك بێدەنگی وتم: نا بەمانەوە و نەمانەوەی ئێمە لەتاران چی دەفەرموون؟ وتی: باش بوو خۆتان باستان کرد. سپاس بۆ خوا ئەوەی لەدەوڵەت دەتانویست، بەدەستتان هێنا و کەموکوڕیتان نییە. دەزانم ئەم ماوەی دووایی لەبەر ئەمەکداری خۆتان لێرە ماونەتەوە. لەبەر ئەوەی خوانەکردە گرفتاری مەترسی نەبن، پێم باشترە بگەڕێنەوە. وتم: حاجی فەخروئەلمەلەکی کوردستانی تازە لەحیجاز گەڕاوەتەوە، ئەگەر بەباشی بزانن دەمانەوێت بەناوی مەنزڵ گۆڕین

چەند ڕۆژێك بڕۆینە ماڵی ئەو دواتر لەوێوە ڕێگەی کوردستان دەگرینەبەر. فەرمووی: کێشە نییە بەڵام بەو مەرجەی لەماڵی حاجی فەخرولمەلەك زۆر نەمێننەوە و خێراتر بۆ کوردستان بگەڕێنەوە. دوای کۆتایی هێنان بەگفتوگۆکانمان هاتمەدەر. هاوڕێکانم ئاگادار کردەوە و دوو ڕۆژ دواتر ڕۆشتینە ئەو ماڵەی حاجی لەنزیك ماڵەکەی خۆی بۆ ئێمەی ئامادە کردبوو. بەڵام هەموو شەوێك دەڕۆشتینە ماڵی شێخ. سەرئەنجام شەوی ٢٤ جومادی ئەلثانی ١٣٢٧ سوپاسالاری ئەعزەم و سەردار ئەسعەد لەگەڵ دەستەیەك لەهێزە خۆبەخشەکان و بەختیارییەکان، بەهێواشی کەئاسمانیش هەستیان پێنەکات، لەنێوان ئوردووگای بریگادی قەزاق و هەموو سوپا دەوڵەتییەکان گوزەر دەکەن و خۆیان دەگەیێنە بەردەم دەروازەی مەجلیس و لەکاتی تێپەڕینی لەشەقامەکانی شار، ئەوانەی لەشارەکەدا سەنگەریان گرتبوو، پەیوەستیان دەبن. بەمشێوەیە ژمارەیان لەدوو سێ هەزارکەس تێدەپەڕێت. دوای جەنگ و پێکدادانێکی کەم، دەروازەی مەجلیس دەکرێتەوە و هێرشبەران دەڕۆنە ناو مەجلیس. کۆمیتەی ئیتیفاق و تەرەقی کەبەناوی میرزا جەهانگیرخان لەشارەکە دامەزرابوو، لەگەڵ دەستە نیشتمانییەکان پەیوەستیان دەبن. سێ شەو و ڕۆژ تەقە کردن و جەنگ درێژە دەکێشێت. ڕۆژی هەینی ٢٧ جومادی ئەلثانی ١٣٢٧، محەممەد عەلی شا لەگەڵ چەند کەسێك لەئەندامانی خێزانەکەی دەڕواتە زەرگەندە و پەنا بۆ باڵوێزخانەی ڕووس دەبات. پاڵکۆنێك کە لەقەزاق خانە و گۆڕەپانی جەنگ سەرقاڵی جەنگ و بەرگریکردنە، لەم کارەی شا ئاگادار دەبێتەوە و بەچەندین مەرج خۆی بەدەستەوە دەدات. لەم سێ چوار ڕۆژەی جەنگ و تەقە کردن، بارودۆخی ژیان پەرێشان و خواردەمەنی بەئاسانی دەستنەدەکەوت. کەس بەبێ بەستنی پەڕۆی سور لەسەر بازووری نەیدەتوانی خواردن بەدەست بێنێت. لەلایەن خۆبەخشەکانەوە بڵاوکرابوویەوە لەسەر هەر دەروازەیەك ئەگەر نیشانەی مەشروتییەت و ئاڵای سور نەبینرێت، ئەو شوێنە تاڵان و دانیشتووانەکەی دەکوژرێت.

ئێمەیش لەبەر نەبوونی نیشانەکانی ژیان، نەتوانای هاتنەدەرمان بوو، نەتوانای مانەوە لەماڵ، بۆ ئەوەی خۆمان دەرباز بکەین یا نان بەدەست بێنین. هاوڕێیان لەگەرماوگەرمی ئەم قەیرانە، سەرسوڕماو و سەرگەردان بوون و بەردەوام سەرکۆنەی خۆیان و نفرینی ئاسمان و زەوییان دەکرد کەئەم چ گەشتێك بوو کردمان و ئەم چ بەڵایەك بوو گرفتاری بووین. ئەگەر خۆبەخشەکان بەمەبەستی کوشتنی ئێمە نەیێن، لەبرسا دەمرین. هەمووان لەناو حەوشێکە

بەدەوری یەك دانیشتبووین و سەرقاڵی بیرکردنەوە بووین کەسەرئەنجامی داهاتووی ئێمە بەکوێ دەگات. من کەخۆم لەوان بەبوێرتر و دڵگەرمتر دەبینی و دەزانی، نەمدەزانی چی بکەم و بیر لەچی بکەمەوە. لەناکاو بیرۆکەیەك بەمێشکمدا هات، ئەو بیرۆکەیە منی لەشوێنەکەم هەستاند و ڕۆشتمە ژوورەکەم. هاورێکانم گومانیان دەکرد شێت بووم. کاتێك ڕۆشتمە ژوور، ڕاستەوخۆ ڕۆشتمە سەر مێزی نووسینەکە، چەند بەستەیەك مرەکەبی سەوز و شین و سور و وەنەوشەییم بۆ نووسین ئامادە کردبوو. بەخێرایی بەستەی ڕەنگ سوورەکەم هەڵچڕی و کردمە قاپی بەردەم سەماوەرکە و ئاوم تێکرد. عەمامەکەی حاجی نەسیرم لەبوخچەکەی دەرهێنا، لەتێکم لێکردەوە و کردمە ناو ڕەنگەکە. بەمشێوەیە ڕەنگێکی سووری ئابڕوومەند دروست بوو. کاتێك لەگەڵ ڕەنگەکە هاتمەخوار، هاورێیان سەریانسوڕما کە ئەم ڕەنگەم لەکوێوە هێناوە. پەڕۆکەم خستە بەرهەتاو، هەر کەسە و لەتێکم پێدا و لەبازوویان بەست. لــەتێکی پەڕۆکــەم لەگۆچــانەکەی حوجــەت ئەلئیــسلام بەســت و ئاڵایــەکی ســووری ئابڕوومەندانەم دروست کرد کە لەئاڵای ماڵەکانی دیکە زۆر باشتر و جوانتر بوو. فەرمانمدا لەسەر دەروازەکە هەڵیواسن. لەئەنجامی ئەم چارەسەرە ئاسانە، هەمووان ئاسوودە بوون و شەش دانگ بووینە مەشروتەخواز. ئەوسا پارەم دا بەپیاوەکانم بۆ ئەوەی بڕۆن و ئەگەر دووکان یا بازاڕێکیان دەستکەوت، هەر شتێکیان بۆ خواردن دەستکەوت، وەك نانی وشك، خورما، قەیسی، پەنیر، مریشك و هتد... بیکڕن و بیهێنن. ئەگەر دەستیان نەکەوت، بڕۆنە ماڵی هاورێکانمان و خۆراکی دوو سێ ڕۆژیان لێ وەربگرن.. میرزا عەبدولحەمیدی فەقیر وتی: ئەگەر بەم هێما سوورەیشەوە ناسیانمەوە کەپیاوی ئێوەم و بەو پێشینەی ئێوە لەتاران هەتانە و منیان گرت و پرسیاری ئێوەیان لێکردم، چی بکەم و چیم بەسەر دێت؟ وتم: یەکەم ئەوەی ئەمڕۆ ئەم نیشانەیە کەمیللەت خۆی وەك نیشانەی ئەمان دیاریکردووە، ئەگەر شایش لەبازووی ببەستێت کەسەردەستەی نەیارەکانە، کەس ڕێگەی لێ ناگرێت، دووەم مەگەر من چیم وتووە کەمن بەتاوانبار دەزانی، تا ببێتە هۆی ئەوەی کەسێکی نزیکی من بگرن و لێپێچینەوەی لەگەڵ بکەن؟ وتی: هەمووان بابەتەکەی باخی شایان بیستووە و لەبیریان نەکردووە. وتم: مەگەر ئەو بابەتە لەناو تاراندا بڵاو بۆتەوە، چیم نووسیوە جگە لەوەی نووسیومە: ئەم میللەتە نەزانە تا نەگەنە ئاستی گەشەکردن، شیاوی ئازادی و مەشروتە نین و سەرپەرشتیان پێویست نییە. ئێستا سپاس بۆ خواوەند کەگەشەیان کردووە

و بەزۆری بازوو داوای مافی ڕەوای خۆیان دەکەن، چیتر شیاون بۆ دەوڵەتی مەشروتە. منیش ئەوە پشتڕاست دەکەمەوە کەدەوڵەت دەبێت بێ بەرگری کردن، وڵاتیان تەسلیم بکات. حاجی نەسیر کەهەمیشە وەکیلی غایب و داوکاری حازر بوو، وتی: ئەگەر بڵێن دوێنی چۆن گەشەمان نەکردبوو و شیاوی مەشروتە نەبووین و ئەمڕۆ چی ڕوویدا کەگەشەمان کرد و شیاوین بۆ مەشروتە، چ وەڵامێك دەدەیتەوە؟ وتم: یەکەم ئەوەی هیچ کەس چەندایەتی و چۆنایەتی گەشەکردنی خۆی لەکەسێکی دیکە ناپرسێت. دووەم ئەگەر بەپێی یاساکانی گەشەکردن بیانەوێت هۆکاری گەشە کردنی خەڵکی ئێران لەمن بپرسن، دەڵێم هێزی شەهوانییەتی سەروەری میللەت، دەماری سستی دانیشتووانی تارانی بزواندووە و شۆڕشی لەتاران دروستکرد. لەناکاو بەهۆی بۆمباران و تۆپبارن، ئەم هێز و وزە لەجووڵە کەوت و لەئازەربایەجانەوە سەری بەرز کردەوە و ستارخان و باقرخان دەرکەوتن و موخبیر ئەلسەڵتەنەی ناچار کرد چەك و جبەخانەی دەوڵەتی تەسلیم بەوان بکات. دواتر یەپرەمی ئەرمەنی خستەڕێ کەئێرانییەکان نەیاندەناسی و خۆبەخشەکانی پەیوەستی ئەو کرد و سوپاسالارێکی لەپشتی ئەوان ئامادە کرد و سەردار ئەسعەدی لەفەرەنگ گەڕاندەوە و سەمسام ئەلسەڵتەنەی لەگەڵ هێزەکانی بەختیاری هێنایە جموجۆڵ و لەبەرابەر فتوای زاناکانی تاران، بەخێرایی فتوایان لەئاخوندی خوراسانی وەرگرت و لەبادامەك و کەرەج، یەك دوو جەنگ ڕوویدا و سەرئەنجام هێزی بزوێنەری ئامارەپێدراو، سوپای دەوڵەتی بەزاند و نیوە شەو ڕۆشتنە ناو مەجلیس. میللەتی ئێران لەڕۆشتنە ناو مەجلیس شەیتانی بوون و کاتێك ڕۆژ بوویەوە، بینیان گەشەیان کردووە. حاجی نەسیر ئەلئیسلام کە لەڕستە و دەستەواژەکانی من حاڵی نەدەبوو، سەری ڕاوەشاند و بەمیرزا عەبدولحەمیدی وت: خوات لەگەڵ بێت، بڕۆ بزانە دەتوانێت شتێك بۆ خواردن پەیا بکەیت تا لەبرسا نەمرین. میرزا عەبدولحەمید و مەحمود بەترس و لەرزەوە تا بەردەم دەروازەکە ڕۆشتن، کەمێك وەستان تا چەند کەسێك لەخۆبەخشەکان گوزەر بکەن. خۆبەخشەکان سەیرێکی ئاڵاکەی سەرماڵەکە و پەڕۆ سوورەکانی سەر بازووی ئەوانیان کرد و ڕۆشتن. میرزا لەکاریگەری چارەسەرەکەی من دڵنیا بوو و بەخێرایی و هاوشێوەی کەسێکی ئاسایی کە لەهیچ شتێك ترسی نەبێت، بەڕێکەوت و مەحمودی بەدوای خۆیدا برد. دوای دوو کاتژمێر لەگەڵ حەماڵێك گەڕانەوە، دە من نانی وشك و چوار من سەننەکی (سەنگەکی) و پێنج من خورما و یەك من پەنیر و کەمێك

کاڵەك و ترێ و خواردنی دیکەیان کڕیبوو و هێنابوویان. لەئەنجامی ئەم ڕێگەچارەی من، زیاد لەڕادە خۆشحاڵ بوون بەتایبەت میرزا عەبدولحەمید کەپێدەکەنی و دەیوت دووان لەدانیشتووانی شار دەیانویست ڕێگەمان لێبگرن و دەیانپرسی ئەم هەموو نان و خواردنە بۆ کوێ دەبەن. خۆبەخشەکان هاوکارییان کردین و ئەوانیان دوورخستەوە بەگومانی ئەوەی ئەم شتانە بۆ خۆبەخشەکان دەکڕین. بەکورتی لەئەنجامی ڕێگەچارەکەی من، تا کۆتایی ڕووداوەکان لەخواردن بێ نیاز ببووین بەڵام لەدوای کاتژمێر لەدوای کاتژمێر هەواڵیان دەهێنا کەمەفاخیر ئەلمولکی فەرمانڕەوای تارانیان تیرباران کردووە، سەنعی حەزەرتیان لەداردا، میر هاشمی تەبریزیان کوشت، چییان کرد و چییان برد. تا ئەوەی ڕۆژی سێیەم لەناکاو هەواڵیان هێنا کەحاجی شێخ فەزڵ اللەی نوری لەلایەن شێخ ئیبراهیمی زەنجانی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە و فەرمانی ئیعدامی بۆ نووسیوە و لەداریانداوە. لەبیستنی ئەم هەواڵە، دنیا لەبەر چاوی ئێمە تاریك بوو، خەمێکی قورس تەنگی پێهەڵچنین. سەرەئەنجام دوای ڕۆشتنی شا بۆ باڵوێزخانە، مەجلیسێك پێکهاتوو لەزاناکان و پیاوماقووڵان و وەکیلەکان لەبەهارستان سازدەدرێت و شازادە ئەحمەد میرزای کوڕە گەورەی پاشا کەتەمەنی دوانزە ساڵ بوو، وەك پاشا هەڵدەبژێرن و عێزەد ئەلمولك، سەرۆکی خێڵی قاجاریان بۆ سەرپەرەستی کردنی سەڵتەنەت هەڵبژارد. سوپاسالاری ئەعزەم، سەرۆك وەزیر و وەزیری جەنگ و سەردار ئەسعەد وەك وەزیری ناوخۆ دەستنیشانکران. ڕۆژی ۲۹ جومادی ئەلثاني ۱۳۲۷، جێگری سەڵتەنەت لەشائاباد پیرۆزبایی لەشای تازە دەکات، لەدووی ڕەجەبی ۱۳۲۷ شای تازە، لەگەڵ ڕێزی تەواو و گوڵباران لەناو هەستی خۆشحاڵی خەڵکان، هاتە پایتەخت. بەیانی ڕۆژی ۳ ڕەجەب، سەعدئەلدەولە کەپەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ مندا بوو، لەگەڵ دەستەیەکی دیکە لەهاوڕێیان پەیایمیان نارد کەئێمە فلانیمان بەسوپاسالار و سەردار ئەسعەد و خۆبەخشەکان ناساندووە. ئاسوودە بن. ڕێز و پێگەی خۆی و هاوەڵانی پارێزراوە. بەیانی لەگەڵ هاوڕێیان سەردانێکی سەردار ئەسعەد بکەن و کارەکانی دیکە ئێمە ئەنجامیان دەدەین. ئێوارەیەك حاجی فەخرولمولك لەگەڵ دنیایەك شادومانی و خۆشحاڵی هاتە ماڵی ئێمە، وتی: دوژمن دەبێتە هۆکاری خێر ئەگەر خوا بیەوێت. ئێستا لەماڵی سوپاسالار بووم. بروسکەیەك لەزەفەر ئەلسەڵتەنەی فەرمانڕەوای کوردستان هاتبوو، نووسیبووی: لەکوردستان بڵاوبۆتەوە پێشنوێژی کوردستان و هاوەڵانی لەتاران کوژراون.

لەبلاّو بوونەوەی ئەم هەواڵە لەشار و ناوچە سنووریەکان، بارودۆخ شێواوە و دەیانەوێت هەموو شێعەکانی کوردستان بکوژن بەپیاوانی حکومەتیشەوە و تا ئێستا چەند ماڵێکیان تالاّنکردووە. منیش لەئێستادا گەمارۆ دراوم. سەرئەنجام بەوە هێور بوونەوە کەخۆیان بەهۆی وەزارەتی ناوخۆ، بروسکەیەك بنێرن. ئەگەر وەلاّمیان دەستکەوت کەئەوان تەندروستن، هیچ کارێك ناکەن جیاواز لەوە ئەوەی لەدەستیان بێت، بەرابەر بەشیعەکان ئەنجامی دەدەن. لەبەر ئەمە پێویستە ئەگەر خۆیان لەوێن، بروسکەیەك بۆ کەسەکانی خۆیان بنێرن، جیاواز لەوە بابەتەکە بشارنەوە تا ڕێگەچارەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی ئاگری ئەم ئاژاوە بکوژێنینەوە.

ئێستا سوپاسالار و سەردار ئەسعەد داوایان لەمن کردووە ئەمشەو دوای تێپەڕی کاتژمێرێك لەشەو، هەمووتان بڕۆنە ماڵی زەرغانەلسەڵتەنە کەنزیکە لەخۆتان. سەردار ئەسعەدیش دێتە ئەوێ. لەوێ بروسکەی تەندروستی خۆتان بۆ کەسەکانتان بنێرن. پێرستی ئەو شتانەی بڕیاری لێدراوە و هێشتا ئامادە نەکراوە، بیدەن تا لەزووترین کات ئامادە بکرێن و بەخێرایی، تەندروست ئێوە بگەڕێننەوە. ئێواریّ لەکاتی دیاریکراو ڕۆشتینە ماڵی زەرغام ئەلسەڵتەنە. زۆری نەخایاند سەردار ئەسعەدیش هات. دوای ئەحواڵپرسی، بروسکەی تەندروستی خۆمان لەگەڵ ناونیشانی ڕاست تەسلیم بەوان کرد و بڕیاردرا ئەوانیش بروسکەیەك کەبۆ حکومەتی کوردستانی دەنێرن بەئێمە بدەن کەهەموو فەرمان و پێویستییەکانی فلاّنی و هاوڕێکانی جێبەجێ بکات. بەڵێنی شەرەفی خێلاّیەتیمان وەرگرت کەئەگەر حکومەت لەئەنجامی داواکانی ئێمە، هاوکاری نەکرد، بەخێرایی بانگێشتی تاران بکرێت.

بەیانی سێ کاتژمێر پێش نیوەڕۆ ڕۆشتینە ماڵی سەردار ئەسعەد و بروسکەی ئامادە پێدراومان لێوەرگرت. لەوێوە لەگەڵ نوێنەری سەردار ڕۆشتینە ماڵی سوپاسالاری ئەعزەم. لەویش بەپێی فەرمان، بروسکەی وەزارەتی ناوخۆمان وەرگرت و ئاسوودە گەڕاینەوە. بروسکەکانمان بۆ بروسکەخانە نارد و ڕەوانەیان کرد. خۆیشمان دوای چەند ڕۆژ مۆڵەتی گەڕانەوەمان وەرگرت و بیتاقە و تفەنگەکانی خۆمان وەرگرتەوە و لەڕێگەی بیجارەوە گەڕاینەوە. لەدوو فەرسەنگی شاری زەنجان، ڕووبەڕووی نۆ سوار لەسوارەکانی جەهان شا خان بووینەوە. سەرەتا بەمەبەستی پشکنین هاتنە پێش. دواتر یەکێك لەسوارەکانی

مەحمود، پیاوەکەی ئێمەیان لەئەسپەکەی خستەخوار و تفەنگە سێ تیرەکەی لێوەرگرت و سوارییەکەی بەرەو لا چەپی جادەکە دوورخستەوە. سوارێکی دیکە حوجەت ئەلئیسلامی هێنایەخوار و ئەسپەکەی لێسەند. شێخولمەشایخ کاتێك ئەم دۆخەی بینی، بەهێواشی لەئەسپەکەی هاتەخوار و هەوساری ئەسپەکەی بەردا. مەجید کە لەدواوەوە بوو، ڕێگەی هەڵاتنی گرتەبەر. تەنیا من مامەوە و میرزا عەبدولحەمید، بەناچار منیش هەڵاتم و خۆم گەیاندە تەپۆڵکەیەك کەلای ڕاستی جادەکە بوو. میرزا عەبدولحەمیدیش بەدوای مندا هات. دووان لەسوارەکان ویستیان شوێنمان کەون، من تەقەم دەستپێکرد و بەگەڕانەوە ناچارم کردن. تا گەیشتمە سەر تەپۆڵکەکە. ئەوسا بەتەواوی تەقە کردنم دەستپێکرد. لەلای سوارەکانیشەوە تەقە دەستپێکرا. لەئەنجامی نیوکاتژمێر شەڕ و تەقە کردن، یەکێك لەسوارەکان گوللەی بەرکەوت و ئەسپەکەی بێ سوار مایەوە. سوارێکی دیکەیش بێ ئەسپ مایەوە. حەوت سوارەکەی دیکە ورەیان لێبڕا و سەرقاڵی چارەسەری بریندارەکە بوون. من لەسەرقاڵبوونی ئەوان بەبریندارەکە کەڵکم وەرگرت و بەدەم تەقە کردنەوە هێرشم کردە سەریان. سوارەکان نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن، تفەنگەکانیان هەڵگرت و بریندارەکەیان بەجێهێشت و هەڵاتن. مەودایەك شوێنیان کەوتم. دواتر بەرەو لای چەپ گەڕامەوە و نزیکەی نیو فەرسەنگ بەدوای کەل و پەلەکانماندا ڕۆشتم چونکە هەستی و هەموو ئەنجامی گەشتەکەی ئێمە و دیاری و فەرمانەکان و گۆچانە گەوهەرنیشان و ئەنگوستیلە ئەلماسەکان لەوێدا بوو. بەدەم تەقە کردنەوە، ئەویشم لەسوارەکان وەرگرتەوە. لەم کاتەدا میرزا عەبدولحەمیدیش دەرکەوت. کەلوپەلەکانم تەسلیم بەو کرد و خۆم لەگەڵ سوارە دزەکە، سەرقاڵی جەنگ بووم تا ئەوەی گەیشتمە لای هاوڕێکان کە لەترسا دەمیان وشك و چاوەڕوانی ئەنجامی کارەکەی من بوون. بەخێرایی ئەوانم سوار کرد و ئەسپی دزە بریندارەکەمان هەڵگرت و لەگەڵ خۆمان هێنامان. بەڵام من و میرزا عەبدولحەمید لەدواوە ڕێگەمان دەبڕی بۆ ئەوەی ئاگامان لەدواوە بێت تا ئەوەی گەشتینە زەنجان و ڕاستەوخۆ ڕۆشتینە ماڵی ئاخوند مەلا عەلی قوربان و دوای ئەحواڵپرسی، هەموو شتێکمان بۆ باسکرد. بەخێرایی نامەیەکی توندی بۆ جیهانشا خان نووسی کەسوارەکانی ئێوە پارێزەرانی ئەمنەیتی ڕێگەکانن یا دز و ڕێگر؟ دوێنێ لەدوو فەرسەنگی شار، هێرشیان کردۆتە سەر زاناکانی ئیسلام و ڕووتیان کردوونەتەوە و بەناچاری پێشنوێژی کوردستان بەرگری کردووە

و شکستی بەسوارەکانی ئێوە هێناوە. بەڵام سوارەکانی ئێوە تفەنگێکی سێ تیری پیاوەکەمیان ڕفاندووە. بەخێرایی تفەنگەکە ڕەوانە بکەنەوە. پێویستە سوارەکانتان تەمێ بکەن تا جارێکی دیکە ڕووداوی لەم شێوەیە دووبارە نەکەنەوە بەتایبەت بەرابەر ئەو کەسە بەڕێزانەی کەدراوسێی ئێمەن. ئەسپێکی ئێوەیش لێرەیە، یەکێك لەپیاوەکانتان بنێرن و ئەسپەکە ببەنەوە.

بەیانی لەکاتی نیوەڕۆ ئاخوند گەڕایەوە و تفەنگەکەی هێنا. جیهانشا نامەیەکی لەوەڵامدا نووسیبوو کەیەکەم ئەوەی زیاد لەڕادە شەرمەزاری ئەو بەڕێزانەم بۆ ئەو ڕووداوەی لەنێوان ئەوان و سوارەکانی من دروست بوو، دووەم لەجیاتی ئەوەی من سوارەکانم تەمێ بکەم، خودی پێشنوێژی کوردستان، ئەوانی تەمێ کردووە، ئەسپی یەکێك لەسوارەکان کوژراوە و پێی سەردەستەی سوارەکانیش بریندارە. لەگەڵ ئەوەیشدا تفەنگەکەم لێسەندن و گەڕاندمەوە و هەشت کەسەکەی دیکەیش تەمێ دەکرێن. هیوادارم ئەو بەڕێزانە بۆ ئەم ڕووداوە لێمان خۆش بن کەهۆکاری شەرمەزاری بەندەیە. دە کەلە شەکر و یەك من چایی وەك پیرۆزبایی کردن بۆ ئەو بەڕێزانە ڕەوانە کرا تا بەسلامەتی نۆشی بکەن.

بەیانی ئەو ڕۆژە کە ٢٨ ڕەجەبی ١٣٢٧ بوو، لەزەنجانەوە بەڕێکەوتین. لەلایەن ئاخوندەوە بەڕێزان میر ساڵح و سەیید موحسن تا سنوری خەمسە هاوڕێیەتیان کردین. ڕۆژی سێی شەعبان هاتینە ناو کوردستان و نزیك نیوەڕۆ لەچیمەنی موعتەمید چاومان بەدیاری دۆست و ئاشناکان، ڕوون بوویەوە.

هەمووی ئەو خەڵات و فەرمانانەی بۆ دۆستان و ئاشناکان هێنابوومان، حکومەت واژۆی کرد و تەسلیم بەهاوڕێکانمان کرد. ماوەیەك میوانی و شەربەت خواردن لەماڵەکانی کوردستان بەردەوام بوو. لەشەوالی ١٣٢٧ بەبروسکە هەواڵ هات کەسەیید عەبدوڵڵە بێهبەهانی، بەوپەڕی ڕێزەوە ڕۆشتۆتە تاران. لەزیقەعدەی ١٣٢٧ کە٦٤ کەس لەوەکیلەکانی تاران ئامادە بوون، مەجلیسی شۆرای نیشتمانی بۆ جاری دووەم کرایەوە. ڕۆژی دووەمی زیقەعدە، دەستەیەك بەناوی دەستەی گەشەکردن لەماڵەکانی سەدرئەلکیتاب پێکهاتوو لەدوو هەزار کەس دامەزراند و ئەم وتارەی خوارەوەم خوێندەوە:

بەناوی خواوەندی بەخشندە و میهرەبان، دوای پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی کردنەوەی ئەم دەستەیە و دامەزراندنی دەستەی سولزاسیۆن، ڕایدەگەیەنین: ئێمەی دانیشتووانی

کوردستان بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی وڵات و پاکبوونەوەی ئەخلاقی میللەت ئەم دەستەیەمان بەناوی سیۆیلیزاسیۆن دامەزراند. ئەگەری هەیە سیاسییەکانی تاران لەبەر ئەوەی چاوەڕوان نین لەدەرەوەی تاران کەسانی کارامەو شارەزا دەرکەوێت، لەگەڵ بیستنی ئەم وشەیە لەکوردستانەوە، قاقا پێبکەنن و گاڵتەمان پێبکەن بەوەی دەستەیەك لەکوردەکان کۆبوونەتەوە و سیلۆیلیزاسیۆنیان پێکهێناوە. دەیانەوێت گەشە بەوڵاتی ئێران بدەن و ئەخلاق فێری عەجەم بکەن. بەڵام گومان دەکەم دوای ساتێك بیرکردنەوە، ئەو سیاسییانە ئەو ڕاستییە پشتڕاست دەکەنەوە کەپێکەنین بۆ ئەم کارەی ئێمە، بێ مانا و دوورە لەڕاستی چوونکە هێشتا لەبیر نەکراوە کەدوێنێ بوو قوڕگی ناسکی ئەو سیاسییە ناسك ئەندامانە لەدەستی بێ بەزەییانەی دیکتاتۆری زەختی لێ دەکرا و لەحاڵەتی خنکاندا بوو و بەبزوتنەوەیەکی بوێرانە لوڕ وبەختیارییەکان کەلقێکی کوردەکانن، قوڕگیان لەدەستی دیکتاتۆری هاتەدەر و بۆ حاڵەتی ئاسایی گەڕانەوە. کەواتە بەهەمان شێوە کەلقێکی کوردەکان توانیویانە بەزۆری شمشێر ئێران لەخنکان ڕزگار بکەن، شاهەنشای وڵات لەسەر تەختەکەی بێننە خوار، جێگەی سەرسورمان نییە دەستەیەکی دیکە لەکوردەکان بەهێزی پێنوس و زمان و توانای هزر و ئەندێشە، هۆکارەکانی پێشکەوتنی ئێران و چاکسازی لەوڵات ئامادە لەناو دۆلآبەکانی مێزی سیاسەت بێننەدەر و نیشانی خەڵکانی بدەن و بەهۆی گۆڤار و ڕۆژنامە و نامە و تۆمارەکان ئەخلاقی گەنیو و هزری خەمۆکی ئێرانییەکان بگۆڕن. هاوشێوەی ئەم پێکەنینە، فیردەوسی لەشانامە سەبارەت بەخەڵکانی دوورگەی عەرەب ئاماژەی پێدەدات کەزۆری نەخایاند سەرانسەری ئێران بەهەتاوی شارستانییەتی ئیسلامی ڕووناك بوویەوە و نەتەنیا سوڵتانی ئێران، بەڵکو زۆربەی سوڵتانەکانی دنیا لەبەرابەر یاسا و فێرکارییەکانی عەرەب هاوشێوەی وشتر و مارمێلك سەری کوڕنوشیان دانەواند. کەواتە وەڵامی ئەم ڕەخنانە، بەکردەوە دەدرێتەوە و ئەگەر کردەوەکانمان بەدیهات، شیاوی سپاس و پێزانینین و جیاواز لەوە، ناتەوانی و نەشیاو، خراپترینی سزاکان و تەمێ کردن دەبێت. بەڵێ شەپۆلی پێشەکی ئێمەی لەبەستینی مەبەست دوورخستەوە. ئێمە دانیشتووانی کوردستان، هاودەنگ و هاوپەیمان بووین کە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی گەشەکردن و بەدەستهێنانی میعراجی سەرکەوتن هەموو هەوڵ و توانای خۆمان بخەینەگەڕ، بنەماکانی مەشروتە زیندوو بکەینەوە و تا ئەو جێگەی دەتوانین چاکسازی لەئەخلاقی گشتی بکەین.

پێش هەر شتێك دەبێت بزانین بەناوبردنی حەلوا، دەم شیرین نابێت و بەناو بردنی بەهار، گول ناڕوێت. یانی لەگەڵ وتنی وشەی مەشروتە، ولات مەشروتە نابێت و تا یاساکان و بنەماکانی مەشروتە لەویلایەتەکان جێگیر و سەقامگیر نەبێت، ڕۆحی مەشروتە لەناو دەمارەکانی ئێمەدا نابێتە فەرمانڕەوا. بەوتەیەکی دیکە و بەڕاشکاوی، ئێمە دانیشتووانی ئێران، کاتێك دەتوانین ولاتەکەی خۆمان بەمەشروتە بزانین کەوەکیلە چاکەکارە ولاتپارێزەکانی ئێمە لەمەجلیس سەرقالی نووسینەوەی یاساکان بن و ئەنجومەنەکانی ویلایەتەکان و شارەکان بۆ بەهێزکردنی مەجلیس دامەزرابێتن و بۆ پاراستنی شەرافەت و ئابڕووی دەوڵەت، هێزی پێویستمان لەبەردەستا بێت، بەڕێوبەرایەتی هێزی ئاسایش و ئەمنییە و شارەوانی و تەندروستی و سەرژمێری لەهەموو ویلایەتەکان بەپێی یاساکانی مەشروتە بێت. بەڕێوبەرایەتی ڕێگەوبان بەئامادەکردنی ڕێگەوبان و کەرەستەکانی گواستنەوە و هەر وەزارەتێك سەرقالی ئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆی و نەهێشتنی کۆسپ و تەگەرەکان بێت و بەهەمان شێوە بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی ولات لەگەشەکردندا بێت و هەناردەکانی ئێمە بۆ دەرەوە زیاتر بێت لەهاوردەکانمان. لەهەموو ناحیە و قەزا و ویلایەتەکان، قوتابخانەی زانستی، کشتوکالی و ڕێکخراوە هەرەوەرزییەکان بوونیان هەبێت و بۆ پەرستاری کردنی ناتەوانەکان و هەژاران، بنکەکانی تەندروستی، نەخۆشخانەکان دروست بکرێت و سەرئەنجام ئاسایش و ئارامی باڵ بەسەر هەموو ولاتدا بکێشێت تا دانیشتووان دڵنیابن و بتوانن سامانی خۆیان بخەنەگەڕ و کارگە و کارخانەکان دروستبکەن. هەلی کار بۆ بێکارەکان بدۆزنەوە و کارە خێرخوازییەکان لەهەموو شوێنەکان بەزۆری و فراوانی ببینرێت. ئەوسا دەتوانین دەوڵەتی ئێران بەدەوڵەتێکی مەشروتە بزانین و بەئاسوودەیی و دڵنیایی سەرقالی ژیانکردنی خۆمان بین. جیاواز لەوە، دەوڵەتی بێ سوپا، بێ پارە و بێ بڕوا، دەوڵەتی قەرزار و نیازمەند، دەوڵەتێك کەپشێوی وئاژاوە باڵی بەسەردا کێشابێت، دەوڵەتێك کەدامەزراوە دەوڵەتییەکان لەهیچ شوێنێکیدا نەبینرێت، چۆن دەتوانێت لەکۆمەڵەی گەلان خۆی بەمەشروتە بناسێنێت و چۆن ڕەوایە ئێمە کوێرکوێرانە دانیشین و دەمی خۆمان بەخەیاڵی حەلوا شیرین بکەین و تەنیا بەقسەی زل و پڕوپوچ بەسندە و لەئەنجامدان و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆمان بۆ چاکسازی چاوپۆشی بکەین. کاربەدەستانی ئەمڕۆ، کەدەستی چارەنووس، دەسەلاتی ولاتی پێبەخشیون و جڵەوی

خەڵکانیان گرتۆتە دەست، لەئێستادا نوقمی دەریای شادی و خۆشحاڵین کەپاشایەکیان لەسەر تەخت هێناوەتەخوار و پاشایەکی دیکەیان بەپێی ویست و خواستی خۆیان برۆدتە سەر تەخت. لەبەر ئەمە شەو و ڕۆژ سەرقاڵن تا هیلاکی و شەکەتی ڕابردوو قەرەبوو بکەنەوە و چاڵەوچۆڵەکانی ژیانی خۆیان پڕ بکەن و پێگە و پلەکانیان بەرز بکەنەوە و چیتر لەبیری داهاتوی ولآت و میللەتدا نین. ئێمە کە لەدەرەوەی بازنەی سیاسەت جێگیر بووین، لەسووچ و کەنارەکان چاوەڕوانی سەقامگیر کردنی مەشروتەین، دەبێت بەناڵە و هاوار، بەڕێوەبەرانی ولآت لەخەوی نائاگایی بەئاگا بێنینەوە و سەرنجیان بۆ لای چاکسازی و بنەماکانی مەشروتە ڕابکێشین تا لەزووترین کات ئارامی و ئاسایش لەولآتدا بلاو بکەنەوە، هێز و سوپا ئامادە بکەن، ماڵیات کۆبکەنەوە و بە لەبەرچاو گرتنی ئەو قەرزە زۆرانەی دەوڵەت بەدەوڵەتانی دیکە قەرزارە، ڕێگەچارەیەکی گونجاو بدۆزنەوە و لەکەمی بودجە کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیادبووندایە، ڕێگری بکەن و ئەو کێشە سیاسییانەی ئەمڕۆ ڕووبەڕووی دەوڵەتی ئێران بۆتەوە و پەیوەندی کاربەدەستانی لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکە بەرەو گێژاوی نەمان بردووە، چارەسەر بکەن کەدیارترینی ئەو کێشانە، لەنگەرخستنی سوپای ڕووس و ئینگلیسە لەناوچەکانی ڕەشت و ئازەربایەجان و قەزوێن و ناوچە جیاوازەکانی باکور و باشوری ئێران کەبەئاشکرا هەڕەشە لەئاسایشی ولآت دەکەن و ئاگری ئاژاوە و شەڕی ناوخۆ هەڵدەگیرسێنن. دەبێت کاربەدەستان لەم بابەتانە ئاگادار بکەینەوە و ناچاریان بکەین بیر لەڕێگەچارە بکەنەوە. هەرچەند دەستەیەك گومان دەکەن کێشەکانی ئێران ڕێگەچارەی نییە و ولآت بۆ دوو ناوچەی باشور و باکور دابەشکراوە و هەر هەوڵێك بۆ چارەسەر کردن بێ ئەنجام دەبێت بەڵام دوای سەرنجێکی کەم لەبارودۆخی دەوڵەتان دەبینین ئەم گومانە هەڵە و بێ مانایە و لەنەبوونی زانیاری لەسەر ولآتانی دنیا سەرچاوە دەگرێت. چوونکە لەدنیای ئەمڕۆ، بەکاربردنی زۆر و دەستگرتن بەسەر ولآتەکان باوی نەماوە و کەم و زۆری سەرباز و فراوانی ئاو و خاك و کەمی ژمارەی دانیشتووان کاریگەری ئەوتۆی لەسەر شەرافەت و سەربەخۆیی ولآتدا نییە. ئەمڕۆ هێز و دەسەلآتی هەر دەوڵەتێك پەیوەستە بەدەسەلآتی سیاسی و زانستی ئەو دەوڵەتە. شمشێر و غاردانی ئەسپ بۆ گۆڕەپانی جەنگ، بەتەواوی هەڵوەشاوەتەوە و ڕۆژگاری پاڵەوانبازی بەسەرچووە ئەگەرنا بولغارستان بەو بچووکیە کە یەك پێنجی خاکی ئێران دەبێت، چۆن دەتوانێت لەگۆڕەپانی سیاسی خۆی بنوێنێت و

سەربەخۆیی خۆی بەسەر ڕووسەکاندا بسەپێنێت یا ئەوەی یۆنان کە یەك لەسەر حەوتی ئێرانە، چۆن ئەگەری بوو تەنیا بەپێی حەز و خواستی خۆیان ژیان بەسەر ببەن یا ڕەش و ڕووتەکانی حەبەشە کەڕاخەری ژێریان گەلآی بیابان و ئاسمانە، چۆن دەیانتوانی لەبەرابەر دەوڵـەتێکی بـەهێزی وەك ئیتالیـا خـۆڕاگری بکـەن و ئـەو دەوڵەتـە بـەهێزە نـەیتوانی دەستدرێژییان بکاتەسەر. نەخشەی بارودۆخی ژاپۆن لای هەمووان ڕوون و ئاشکرایە کەتا ماوەیـەك پـێش، زۆر خـراپتر لـەبارودۆخی ئێـستای ئێـران بـوو، لـەماوەی بیـست سـاڵ بەشـێوەیەك خـۆی کـۆکردەوە و پێـشکەوت کـەتوانی لەبەرابـەر دەوڵـەتێکی بـەهێزی وەك ڕووسیا، ئەو نمایشە سەیرە لەخۆی نیشان بدات و بوونی خۆی بەو دەوڵەتە بسەپێنێت. لەم نمونانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەبیرۆکەی دابەشکردنی ئێران، بیرۆکەیەکی هیچ و بێ مانایە. مەملەکەتی کیان و سەرزەمینی سیروس و داریوش بەم ئاسانییە نابێتە پارووی بیانییـەکان و ئێـران، منـاڵی بـوێر و بـەهێزی وەك کـەریم خـان و نادرشـای لـەناو خۆیـدا حەشـارداوە کـە لـەکاتی پێویـست لەگۆڕەپانـە جیاوازەکـان خۆیـان دەنـوێنن. هاووڵآتیـان، شەرەف و ڕیسوایی ئێمە پەیوەستە بەئەندازەی هێز و ئاستی یەکێتی و بڕیاری بەبڕشت و سیاسەتی گونجاو. هەرکات ئەم سێ توخمە لەناو نەتەوەی ئێراندا فەرمانڕەوا بێت، بەهەمان ئەندازە، ئاستی شکۆ و دەسەڵآتی ئێمە بەرەو گەشەکردن دەڕوات و بەپێچەوانەوە، ژیان و شـەرافەتی ئێمـە بـەرەو نـەمان دەڕوات. کەواتـە بـەدەنگی بـەرز کەدۆست و دوژمن بیبیستن، دەڵـێم: هەوڵـەکانی خۆتـان بخەنەگـەڕ چوونکە پیـاوانی ڕۆژگـار، بـەهۆی هـەوڵ و کۆشش، گەشتوونەتە شوێنی گونجاو. لەبەر ئەوەی کات گرانبەهایە، ئەم دانیشتنە زیاتر لەمە درێژە پێنـادەین. بەخواسـتی خـوا لەدانیـشتنەکانی داهـاتوو، بۆچـوون و بیرۆکـەکانی خۆمـان سەبارەت بەچاکسازی وڵآت بەپشت بەستن بەبەڵگە عەقڵآنییەکان دەخەمەڕوو. کەمێك دەردی دڵم لای تۆ باس کرد، ترسام، لێم بڕەنجێیت وەگەرنە قسەی زۆرم پێیە. ڕۆژی ٨ زیحەججە ١٣٢٧ بەبروسـکە زەفـەر ئەلـسەڵتەنە لەفەرمانڕەوایـەتی کردنـی کوردسـتان دوورخرایـەوە و ڕۆژی دەی زیحەججە لەتارانەوە بروسکە گەیشت کەبەڕێزان حوجەج ئەلئیسلام بۆ دەربڕینی بێزاری خۆیـان لەمانـەوەی ڕووسـەکان لـەخاکی ئێـران، ڕێـوڕەسمی جەژن ئـەنجام نـەدەن و هەموو شار و ویلایەتەکانی دیکەش ئاگادار بکرێنەوە کە لەجیاتی جەژن، پرسە بگێرن. لە ١٢ زیحەججە بروسکەیەك لەلایەن دەستەی تەرەقی بەم ناوەرۆکە بۆ تاران ڕەوانە کرا:

تاران: بۆ بەڕێز سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ: بروسکەی گشتی بەڕێز حوجەج ئەلئیسلام بۆ ئەنجامنەدانی ڕێوڕەسمی جەژن خوێندرایەوە. سستی ئیرادەی بەڕێزانی حوجەج ئەلئیسلامی تاران، گیانبەخشانی نیشتمانی بەتەواوی لەڕۆحانیەکان دڵسارد کرد چوونکە پشتگوێ خستنی جەژن ئاسانە، ئەگەر دووسەد بابەتی دیکەی دینی پشتگوێ بخەین، جگە لەخۆشحاڵ کردنی دوژمن، هیچ ئەنجامێکی نابێت. شەریعەتی ئیسلام سەبارەت بە دەستدرێژی هێزی کوفر بۆ خاکی ئیسلام چ فەرمانێکی داوە، پێویستە بەڕێزانی رۆحانی ئەو فەرمانە لەکاتی خۆیدا جێبەجێ بکەن. یانی لەجیاتی پشتگوێ خستنی جەژن، فەرمانی جیهاد بدەن. دەماری ئێمەی ئێرانی هێشتا ئەوەندە لاواز و سست نەبووە کەسوپای نامەحرەم لەحەرەمسەرای خاکی پیرۆزی ئیسلام دەستدرێژی بکات و ئێمەیش زەق زەق هاوشێوەی کەسێکی کەمتەرخەم سەیریان بکەین. ئایا خاوەن شەریعەت یا دایکی نیشتمان، لەم بێدەنگی وکەمتەرخەمییەی ئێمە، بەپشتگوێ خستنی جەژن، لەئێمە ڕازی دەبێت یا بۆ هەمیشە بۆ بێ غیرەتی و بێ هەستیمان نفرینمان دەکات. ئەگەر موسوڵمانی ئەمەیە، هاوار لەوەی ئەگەر لەدوای ئەمڕۆ بەیانی هەبێت. ئێمە ئەندامانی تەرەقی کوردستان، بەنوێنەرایەتی هەموو کوردستانیيان، لەو دوو وەزیرە بەڕێزە خوازیار و داواکارین بەناوی حەسانەوەی بوێرەکانی ئازەربایەجان و دلێرەکانی بەختیاری کە بۆ سەپاندن و سەقامگیر کردنی مەشروتییەت، هەوڵیان دەدا و هیلاك بوون، شانازی پێشەنگی ئەم جیهادە بەئێمەی شافعی مەزهەب بدەن کەهاوشێوەی پەروانە بەدەوری ئاگری دوژمن بسوڕێینەوە و گەورە و بچووك و پیر و گەنجمان لەم ڕێگەدا بکەینە قوربانی. ئێمە کەمەزهەبی خۆمان لەکوشتن و کوژران دەزانین، هیچ لەمپەرێك بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە خێرە نابینین و دەمانەوێت بەهۆی ئەم گیانبازییە، بابەتێکی فراوان بۆ ڕۆژنامەنووسان و مێژوونووسان ئامادە بکەین تا لەگۆڕەپانی ڕۆژنامەکان و مێژووەکان، کردەوە قێزەونەکانی ئەوان لەدەوڵەتی شەش هەزار ساڵەی ئێران تۆمار بکەن. هەروەها لەئێوەی بەڕێز داواکار و خوازیارین لەجیاتی پشتگوێ خستن و ئەنجامنەدانی جەژن، ئەم بڕیارە وڵاتپەرستانەی ئێمە پەسەند بکەن تا مژدەی جیهاد بەهەموو موسوڵمانانی ئێران و دنیا بدەین و ئەم جەژنە کەجەژنی قوربانی ڕاستەقینە یا جەژنی جیهادە، لەیەکتر پیرۆز بکەین. چاوەڕوانی فەرمانی جیهادین. دەستەی بەڕیوەبەرایەتی تەرەقی و چاکسازی ئەخلاقی کوردستان.

وەڵامی ژمارە ٢٢ لەتارانەوە بۆ کوردستان: وەڵامی دەستەی بەڕێوەبەری تەرەقی و چاکسازی ئەخلاقی کوردستان، بروسکەی ئێوەی بەڕێزم بینی، لەکۆبوونەوەی وەزیرەکان باس و گفتوگۆی لەسەرکرا، لێپرسراوان دەربڕینەکان و کردەوەی بوێرانەی ئێوە کە لەم کاتەدا بۆ دەرپەراندنی سوپای رووس لەناو خاکی وڵات ئەنجامتان داوە، ستایش دەکەن، هەمووان هاوخەمی خۆیان لەگەڵ ئێوە نیشان دەدەن و هیوادارن بەسەرنجدان بەکار و بریاری وەزیرەکان، بەزووترین کات ئەوان لەوڵاتەکەمان دوور بخەینەوە و ئاسوودەی بۆ دانیشتووان بگێڕینەوە. حکومەتیش لەماوەی ئەم یەك دوو ڕۆژەدا بەڕێدەکەوێت و دوای هاتنی، هەموو مەبەستە نیشتمانییەکانی ئێوە دێنێتەدی تا هۆکارەکانی ئاسوودەی ئێوە دابین بکرێت. (سوپاسالاری ئەعزەم).

ڕۆژی ١٥ زیحەججە، شازادە زەفەر ئەلسەڵتەنە لەکوردستانەوە بەڕێکەوت. لەسەرەتاکانی رەبیع ئەلثانی ١٣٢٨، حاجی منەزەم ئەلمولك وەك سەرۆکی داد هاتە کوردستان و لەکۆتایی ئەم مانگە، بروسکەی حاجی ئەمیر نیزامی هەمەدانی گەیشت کەفەرمانڕەوایەتی کوردستانی قبوڵ کردووە و بەمزوانە بەڕێدەکەوێت.

## حکومەتی حاجی میرزا عەبدوللە خانی ئەمیر نیزام

دوای لابردنی زەفەر ئەلسەڵتەنە، حاجی میرزا عەبدوڵڵە خانی ئەمیر نیزامی قەراگوزولی هەمەدانی، لەڕۆژی ١١ رەجەبی ١٣٢٨ وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا. میرزا یوسفی موشیری دیوانی وەك وەزیری خۆی دەستنیشان کرد. لەناوەڕاستی ڕەجەب دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کەشەوی ٩ ڕەجەب، چوار کەس چوونەتە ماڵی سەیید عەبدوڵڵە و کوشتوویانە. لەنیوەڕۆی یەکێك لەڕۆژە سەرەتاییەکانی مانگی شەعبان، هێزە دەوڵەتییەکان، ماڵی ستارخان سەرداری میللی و باقرخان سالاری میللییان لەپارکی ئەتابەك گەمارۆداوە و تا کاتژمێر دووی شەو، جەنگێکی قورس لەنێوان هێزە دەوڵەتییەکان و شەڕکەرەکانی بەرەی نیشتمانی لەئارادا بووە و دوای زەرەر و زیانی زۆر، سەرداری میللی و سالاری میللی و شەڕکەرەکانیان قۆڵبەست دەکرێن و گوللەیەك بەر قاچی ستارخان دەکەوێت. حاجی ئەمیر نیزام بۆ گەڕاندنەوەی ئاسایش، داوای ڕەوانە کردنی سوپای هەمەدان و دوو تۆپ بۆ کوردستان دەکات. لەم ناوەدا دەستەیەك لەبازرگانەکان سکاڵا بەرز دەکەنەوە کەچاردۆڵییەکان کاڵا بازرگانییەکانی ئەوانیان دزیوە. حاجی ئەمیر نیزام بروسکەیەك بۆ

فەرماندەی سوپای هەمەدان دەنێرێت و فەرمانی پێدەدات لەکاتی هاتنیان لەهەمەدانەوە بەرەو کوردستان کاتێك لەرێگەی چاردۆلییەکانەوە گوزەر دەکات، سەرکردەکانیان کەبریتین لەقاسم خان، سلێمان خان، باقی خان و عەبدوللە خان، قۆلبەست و لەگەڵ خۆیدا بۆ شاریان بهێنێت تا کەلوپەلە دزراوەکانیان لێ وەربگیرێتەوە. دوای چەند ڕۆژ سوپای هەمەدان هاتە کوردستان و هەموو سەرکردەکانی چاردۆلییان بەقۆڵبەست کراوی لەگەڵ خۆیان هینا کە بەفراندنی کەلوپەلەکان تۆمەتبار کرابوون. ئەم هەواڵە بەدەستەی سەرۆکایەتی جەمعیەتی تەرەقی گەیشت کەئاسف دیوان دەیەوێت بڕە پارەیەك وەك ریشوە بەحکومەت بدات و تاوانبارەکان کەزۆربەیان خزمی ئەو بوون، ئازاد بکات. بەخێرایی لەلایەن دەستەی جەمعیەتی تەرەقی حکومەت ئاگادار کرایەوە کەهەواڵێکی لەو چەشنە لەشاردا بڵاوبۆتەوە و ئەگەر یەکێك لەتۆمەتبارەکان بێ لێپێچینەوە لەدادگایەکی ڕەسمی ئازاد بکرێت، حکومەت بەشەریکە تاوانی ئەوان لەقەڵەم دەدرێت و دەوڵەت لەم روداوە ئاگادار دەکرێتەوە. حکومەت، فەرمانی بەسەرۆکی دادگادا بۆ لێپێچینەوە لەو ڕووداوە، دانیشتنەکانی دەستپێبکات. سەرۆکی دادگا، حاجی مونەزەم ئەلمولك بوو، وەڵامی دایەوە: من بۆ دامەزراندنی دادگا هاتوومەتە کوردستان و لەیاساکانی دادگا تەنیا بەرگی دامەزراندنەکەم پێیە، ناردوومە پاشماوەی یاساکان یەك لەدوای یەك بنێرن، هێشتا نەگەیشتوون، دارتاشەکانم راسپاردووە، مێز و کورسیم بۆ دروست بکەن، هێشتا تەواو نەبووە. جیاواز لەوە هێشتا سەرۆکی سزادان و داواکاری گشتی و شتەکانی دیکە ئامادە نییە. لەبەر ئەم هۆکارانە، ناتوانین دانیشتنەکانی دادگا ببەستین. حکومەت، وەڵامی سەرۆکی دادگای بۆ جەمعیەتی تەرەقی نارد و لەکۆتایی ئەم نامە گۆڕینەوە، خوازیاری بینینی من بوون بۆ چارەسەر کردن و کۆتایی هێنان بەم کێشەیە. منیش بەمۆڵەت وەرگرتن لەو دەستەیە، چاوم بەبەرپرسانی حکومەت کەوت و دوای چەندین گفتوگۆ، وتم: یا دەبێت ئەم تاوانبارانە تا بەستنی دانیشتنی دادگا بەوەرگرتنی دەستەبەری بەئاسف دیوان بسپێرن یا لەفەرمانگەی حکومەتی و لەژێر دەستی خودی فەرمانڕەوا دەستبەسەر بن یا ئەوەی مۆڵەت لەسەرۆکی دادگا وەربگرن. منیش لەماوەی دوو ڕۆژ مەحکەمەی سزا بەمانای وشە ئامادە و دەیخەمە بەردەست سەرۆکی دادگا. حکومەت ئەم دوا پێشنیارەی پەسەند کرد و کەسیان بەدوای سەرۆکی دادگادا نارد. لەگفتوگۆ کردن لەگەڵ سەرۆکی دادگا تێگەیشتن لەبەستنی دانیشتنی دادگا بەتەواوی

ناتەوانە بەهەمانشێوە کە لەوەڵامی حکومەتدا وتی: ئێستا کەفلانە کەس ئەم ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ، باشترە، ئامادەکارییەکانی دیکەیشمان بۆ بکات. وتم: ئەگەر یەك ڕۆژی دیکە مۆڵەتم پێبدەن، ئامادەم. یەك ڕۆژی دیکەیان بەدوو ڕۆژەکە زیادکرد. بۆماڵەوە گەڕامەوە، کەسێکم بۆ لای موزەفەر خانی والیزادە نارد کەوەك سەرۆکی دادگای بازرگانی دیاریکرابوو. هاوڕێ لەگەڵ ئەو، ئەسعەد ئەلمولکمان وەك جێگر دیاریکرد و پێکەوە، هەرسێکمان، شێخ محەممەد ئەمینی شەریعەتمەدار و حاجی شێخ عەبدولحەمیدی مودەڕسمان ئامادە کرد. لەڕۆژی چوارەم ئامادەکارییەکانی دادگامان کە لەقەڵای حکومەتی و ڕووبەڕووی تەپۆڵە بوو، بەمشێوەی خوارەوە ئامادە کرد: دادگای سەرەتایی یاسا بەسەرۆکایەتی ئەسعەد ئەلمولك، دادگای سەرەتایی سزا بەسەرۆکایەتی شەریعەتمەدار، دادگای بازرگانی بەسەرۆکایەتی والیزادە و ژووری سزا بەسەرۆکایەتی سدیقی لەشکر و ژووری داواکاری گشتی بەسەرۆکایەتی حاجی شێخ عەبدولحەمید، مێز و کورسی و هەموو کەرەستە پێویستەکانی دیکەمان ئامادە کرد و بۆ هەر سێ دادگاکە، سکرتێر، دەفتەردار و پاسەوانمان بەئەندازەی پێویست ئامادە کرد و یاساکانی کاتی دادگا کەخۆم بووم، بەخۆڕایی پێشکەش بەسەرۆکی دادگا کرد و بەمشێوەیە بۆ تۆمەتبارەکانی چاردۆڵی، حوکم دەرکرا و ئەمە یەکەم دادگایەکی یاسایی لەکوردستان بوو کە بەمشێوەیە دامەزرا. بەکورتی لەماوەی یەك حەفتەدا دادگامان بۆ سزادانی تاوانبارانی چاردۆڵی دروستکرد و قەرەبووی کەلوپەلەکانمان بۆ بازرگانەکان گەڕاندەوە و تاوانباران بەسزای خۆیان گەیشتن. باقی خان و قاسم خان و عەبدوڵڵە خان کەتاوانێکی ئەوتۆیان نەبوو، ئازاد کران. لە ١٧ ڕەمەزانی ١٣٢٨ هەواڵی مردنی عێزەدئەلمولکی جێگری سەڵتەنەت گەیشت. لە ٥ سەفەری ١٣٢٩ هەواڵ گەیشت کەئێوارێی شەممەی ٤ سەفەر، دوو کەسی گورجی کەناوی یەکیان ئەیوان بووە، سەنیع ئەلدەولەی وەزیری داراییان لەشەقامدا بەگووللە کوشتووە و بالێوزخانەی رووسیا، پەنای بەبکوژەکە داوە و ڕەوانەی روسیای کردووە تا لەوێ سزا بدرێت. ڕۆژی ٨ سەفەر ناسرئەلمولکی ئەبوقاسم خانی قەراگوزلو وەك جێگری سەڵتەنەت دەگاتە تاران، یەك مانگ دواتر سوپای ساخڵوی روس لەقەزوێن دەڕۆنەدەر. لەدووی ڕەبیع الاوەلی ١٣٢٩ ناسرئەلمولك، وەك جێگری سەڵتەنەت سوێندی یاسایی دەخوات و وەکیلەکانی مەجلیس بەپێی داوای ناسرئەلمولك، خۆیان و ڕێبازی خۆیان ئاشکرا کرد. لەم بەروارە بەدواوە، دەستەی

دیمۆکرات و میانڕە و یەکێیەتی و تەرەقی و داشناکسیۆنی ئەرمەنییەکان لەتاران دروستبوو. دامەزرێنەی سەرەکی حزبی دیمۆکرات، حسەین قولی خانی نەواب جێگری وەزیری دەرەوە بوو.
هاوکات لەگەڵ ئەم ڕووداوانە، کاغەزێك لەلایەن شێخ حسام ئەلدینەوە گەیشتە دەستم کەنووسیبووی دوای بەدەست گەیشتنی نامەکە، بێدرەنگ بڕۆمە باغی کۆنە. لەگەڵ ئەوەی هەوا سارد و بەفرێکی زۆر باریبوو، بەپێی فەرمانی شێخ بەڕێکەوتم و لەباخی کۆنە چاوم بەشێخ کەوت. فەرمووی: مەبەست لەهاتنتان بۆ ئێرە لەم زستانەدا بینینی سالار ئەلدەولە بوو کەچەند ڕۆژێك پێشووتر بەجلوبەرگی کوردییەوە هاتبووە ناوچەکە. دەیوت لەوێنە چاوی بەمحەممەد عەلی شا و شوعاع ئەلسەڵتەنە کەوتووە و پەیمانیان بەستووە کە لەدوو لاوە بۆ گەڕاندنەوەی تاج و تەختی پاشایەتی باوك و باپیرانمان هێرش بکەینە سەر خاکی ئێران. سالار ئەلدەولە لەخاکی کوردستان و کرماشان و محەممەد عەلی شا و شوعاع ئەلسەڵتەنە لەگەڵ ئەمیر بەهادور و ئەرشەد ئەلدەولە لەخاکی تورکمانەوە و وەك دیارە دەوڵەتی ڕوسیایش پشتیوانییان دەکات. سەرکردەکانی جافیش بەڵێنی هاوکاری کردنیان بەسالار ئەلدەولە دابوو. چاوەڕوان بوو چاوی بەئێوە بکەوێت بەڵام چوونکە درەنگ گەیشتن و ئەویش پەلەی بوو، ڕۆشت. من بەنوێنەرایەتی ئێوە، بەڵێنی هاوکاری کردنم پێداوە. بڕیارە سەرەتاکانی بەهار ئەو لەگەڵ عەشیرەکانی جاف بەرەو خاکی کوردستان بەڕێکەوێت. ئێوەیش تا هاتنی ئەو، بارودۆخی کوردستان ئامادە بکەن. ئەگەری هەیە ئەم بەدبەختانە دووبارە تاج و تەختی خۆیان بەدەست بێننەوە. ئەو زستانە چیتر بەهۆی بەفر بارینی زۆر نەمتوانی بگەڕێمەوە. کۆتاییەکانی زستان بەدژواری گەڕامەوە بۆ کوردستان. بەشێوەیەکی نهێنی بەئەمیر نیزامم وت: لەو سنورە باس باسی سالارئەلدەولەیە کەدەیەوێت بێتە کوردستان. ئەویش بەنامە وەزارەتی ناوخۆی ئاگادار کردەوە. وەزیری ناوخۆ کەقەوام ئەلسەڵتەنە بوو، بەتەواوی حاشای لەبابەتەکە کرد و وتبووی: ئەم وتانە بێ بنەمایە و ئێمە ئاگادارین سالارئەلدەولە لەئێستادا لەشەقامی شانزەلیزەی فەرەنسا پیاسە دەکات. زۆری نەخایاند ئەم هەواڵە بڵاوبوویەوە کەسالارئەلدەولە گەیشتۆتە خاکی ئازەربایەجان و سەرقاڵی ئامادە کردن و کۆکردنەوەی سوپایە. هاوکات لەگەڵ ئەم دەنگۆیە، هەواڵ گەیشت کەمحەممەد عەلی شا لەئەدساوە بەرەو ئێران بەڕێکەوتووە. دوای ئەوە هەواڵ گەیشتە

کەسوپاسالاری ڕەشتی لەتارانەوە ڕێگەی ڕەشتی گرتۆتەبەر تا پەیوەستی محەممەد عەلی شا بێت. زۆری نەخایاند دانیشتووانی شار بەهاندانی ئاسف دیوان دژی حکومەت ڕاپەڕین و ڕژانە بروسکەخانە و بۆ ماوەی سێ شەو ورۆژ لەوێ مانەوە. سەرئەنجام ڕۆژی ٤ جومادی ئەلثانی ١٣٢٩ بروسکە گەیشتە کەشازادە ئەسەد اللەی میرزای شەهاب ئەلدەولە وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکراوە.

هێرشی سالارئەلدەولە لەکوردستانەوە بۆ خاکی ئێران

لەکۆتاییەکانی جومادی ئەلثانی ١٣٢٩، هەواڵ گەیشت کەسالار ئەلدەولە لەماڵی مەحمود پاشای جاف سەرقاڵی کۆکردنەوەی سوپایە. ئەم هەواڵە کەم کەم بوو بەڕاستی. شەوی ٢ ڕەجەب، ئەحمەد بەگی ریشینی جاف، لەگەڵ پێنج پاکەتی سالارئەلدەولە بۆ ئەم کەسانەی خواراوە گەیشت: موشیر دیوان، ئاسف دیوان، حاجی موعتەمید، وەکیل ئەلمولك، حەبیب اللەی بارزگان کەنووسیبووی لەگەڵ شەش هەزار سواری جاف و موکری و سەردەشت و سابلاخ و هەورامان و هتد... بەرەو کوردستان دێم تا ژیانی مەشروتە و مەشروتە خوازان لەناو ببەم و دووبارە ڕێز و سەروەری بۆ شێخ و سەییدەکانی کوردستان بگێڕمەوە. لێپرسراوانی مەشروتە لەوشارە بگرن و دەستبەسەریان بکەن تا خۆم دەگەم. هەموان ئاگادار بکەنەوە هەرکەس گوێرایەڵە و شا پەرەستە، ڕێزی دەگیرێت و دەبەخشرێت و هەرکەس لایەنگری مەشروتە بێت، سزای خۆی دەبینێت. ئەوسا نەك بۆ مردووەکان بەڵکو دەبێت بۆ زیندووەکان بگرین. ئەحمەد بەگ وتی کاتێك من بەڕێکەوتم، سوپایش بەدوای مندا بەڕێکەوت بەڵام من بەخێرایی هاتم. گومان دەکەم تا دوو ڕۆژی دیکە شازادە بگاتە کوردستان. لەهەمان شەوی گەیشتنی ئەحمەدبەگ، ئاسف و وەکیل ئەلمولك ڕۆشتنە ماڵی موشیر دیوان تا سەبارەت بەم پێشهاتە ڕاوێژ و گفتوگۆ بکەن. بەیانی ئەو شەوە لەدەرئەنجامی گفتوگۆکان، تارانیان لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە. وەڵام گەیشت کە: هەواڵی هاتنی سالارئەلدەولە بۆ ئەو سنورە درۆیە و ئەگەر دانیشتووان دەترسن، بەم نزیکانە شازادە شەهاب ئەلدەولە وەك فەرمانڕەوای کوردستان بەڕێدەکەوێت تا ئارامی و ئاسایش بۆ ئەو ناوچەیە بگێڕێتەوە. کاتژمێرێك بۆ ئێواری، زۆربەی زاناکان، پیاوماقوڵان و بازرگانەکان لەماڵی موشیر دیوانی جێگیر فەرمانڕەوای کوردستان کۆبوونەوە تا سوێند بەقورئان بخۆن لەبەرگری کردن و تەسلیم بوون، هاوپەیمان بن. هێشتا دەرئەنجامێکی ئەوتۆ لەگفتوگۆکان

بەدەست نەهاتبوو کە ژمارەیەکی زۆر لەنۆکەرەکان کە لەناو حەوشێکەدا کۆبوونەوە، پێکەوە بەدەنگی بەرز هاواریان کرد: زەحمەت بەخۆتان مەدەن، ئێمە سوێندمان خواردووە کەهەمووان تەسلیمی شازادە ببین و ئەگەر ئێوە پێچەوانەی ئێمە، بڕیارێکی دیکە بگرن، هیچکەس لەئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی ئێوە نابێت. ئەمە، بارودۆخی دانیشتنەکەی گۆڕی و ڕەنگدانەوەی، شارەکەیشی پەرێشان کرد. هەمان شەو، سەرۆکی سوپای هەمەدان، لەگەڵ سەربازەکان و تۆپخانە ڕێگەی هەڵاتنی گرتەبەر. زۆربەی لێپرسراوانی دەوڵەتی، ئەوانەی توانیان هەڵاتن و هەرکام نەیتوانی، لەماڵی ئاشنا و دۆستەکانیان، خۆیان حەشاردا. بەیانی ئەو شەوە، موشیر دیوان و ئاسف دیوان، چاویان بەیەك دەکەوێت و سوێند بەقورئان دەخۆن و پەیمان دەبەستن تا ئاسف دیوان بڕواتە هەمەدان و لەوێوە داوای هاوکاری لەدەوڵەت بکات. موشیر دیوانیش بۆ پاراستنی مڵك و زەوییەکانیان لەشارەکەدا بمێنێتەوە. ئەگەر دەوڵەت جووڵایەوە و بەرپەرچی هێرشەکەی شازادەیدا، ئاسف موشیر بپارێزێت و ئەگەر شازادە پێشکەوتن و سەرکەوتنی بەدەست هێنا، موشیر، ئاسف بپارێزێت. ڕۆژی هەینی، دەی ڕەجەبی ١٣٢٩ هەواڵ گەیشت کەشازادە لەگەڵ سوپای جاف و عەشیرەکانی سەرسنور گەیشتۆتە گوندی خروسە. لەمزگەوتی گەورەی شار، خەڵك یەکتریان ئاگادار کردەوە. جارچی جاریدا کەبەیانی حاجی شێخ محەممەد باقر بۆ پێشوازی شازادە دەڕوات. هەرکەس دەخوازێت لەگەڵی بەرێکەوێت، خۆی ئامادە بکات. هەمان شەو ئاسف دیوان و ژن و منالەکەی و حەبیب اللەی بازرگان هەڵاتن. حاجی ئیعتیزاد ئەلئیسلام لەیەکێك لەحوجرەکانی هاجەرخاتون خۆی حەشاردا. منیش لەچاوەڕوانی قەزا و قەدەر لەماڵەکەی خۆمدا مامەوە. دەستەیەکی دیکە بەرەو خروسە ڕۆشتن. بۆ بەیانی، حاجی شێخ محەممەد باقر و مەلا عەبدولمەجیدی مودەڕس و شەریعەتمەدار و شێخ عارف و حاجی شێخ عەبدولحەمید و نازم الایە و حاجی سەرداری موکەڕەم، سەرۆکی ئاسایش و دەستەیەکی گەورە لەزاناکان و پیاوماقوڵان بۆ پێشوازی شازادە ڕۆشتن و دەستەیەك لەگوندی خروسە و دەستەیەك لەگوندی ئارنان چاویان بەشازادە کەوت. ئەسپ و کەلوپەلی دەستەیەك لەپێشوازیکەران تالانکرا و شازادە بەڵێنی پێدابوون خۆی لەگەڵ ژمارەیەکی کەم دێتە ناوشارەکە و سوپاکەی و ئەوانی دیکە لەدەرەوەی شارەکە و لای خوسرەوئاباد دەمێننەوە. ئێوارێی شەممە ١١ ڕەجەب، دەستەیەك لەسەرکردەکان و بەشێکی سوپاکە هاتە ناو شارەکە

و ڕاستەوخۆ ڕوویانکردە قەڵای حکومەتی. شەوی یەکشەممەی١٢ ڕەجەبی ١٣٢٩، شازادە و سەد و پەنجا کەس لەسەرکردەکان و فەرماندەکانی سوپا، بەڕێنوێنی مەحمود سوڵتان ئیحتیشام دیوان و سالاری ئەشرەف، دەڕۆنە ناو قەڵای حکومەتی، دوای تێپەڕینیی چوار کاتژمێر لەشەو، کەسی بەدوای مندا نارد. دوای بینینی، قورئانێکی بچووکی لەبن باخەڵی دەرهێنا و وتی: سوێند بەم قورئانە، ئەگەر من سەرکەوتن بەدەست بێنم، ئێوە لەدەسکەوتەکانی من بەشدار و برای من دەبن. ئێوەیش دەبێت سوێند بخۆن و خیانەت لەمن نەکەن و چیتر بیر لەمەشروتە نەکەنەوە. وتم: سوێندی شازادە بۆ من لەگەڵ ئەوەی خاوەن دەسەڵاتە، ڕێز و خۆشەویستی شازادە بۆ من دەسەلمێنێت کەبێ ئیرادە من ناچار بەبەخشینی سامان و گیان دەکات، بەڵام سوێندی من بۆ شازادە لەم نیوەشەودا، کەچەند هەزار کەس لەهێزی چەکدار و سەرکردەکان دەوریان گرتووم، لاوازی من دەسەلمێنێت. کەواتە بێ ئەوەی سوێند بخۆم، لەقووڵایی دڵەوە بەڵێن دەدەم تواناییەکانی خۆم بۆ گەیشتن بەم مەبەستە بخەمەگەڕ بەو مەرجەی شازادە لەکاتی پێویست، گوێ لەپێشنیار و وتەکانی من بگرێت. شازادە بەم بەڵێنە سادە بێ ڕیایە بەسەندەی کرد و چیتر ڕێگەی نەدا ئەو شەوە بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە. ناچار کەسێکم بۆ ماڵەوە نارد تا هاوسەرەکەم نیگەران نەبێت. بەکورتی تا ئەو کاتەی شازادە لەکوردستان بوو، ڕێگەی نەدا شەو و ڕۆژ ئیستراحەت بکەم، سەرەتای دەرکەوتنی هەتاو تا کاتژمێر شەش و حەوتی ئێواریێ لەقەڵای حکومەتیدا بووم و هیچ کارێکی بێ ئامادەبوونی من نەدەکرد. تەنانەت هەموو نووسینی هەموو نامە و بروسکەکان لەئەستۆی مندا بوو. بەیانی ئەو شەوە، پاشماوەی سوپاکە، بەهاوڕێیەتی شێخ عەلائەلدین و شێخ سادق و شێخ مەزهەر، براکانی شێخ حسام ئەلدین و شێخ غەنی مەردۆخی، نوێنەری مەحمود پاشای جاف، هاتنە ناو شارەکە: دوای دوو سێ ڕۆژ هەواڵ گەیشت کەمەحمود وەلی خانی سوپادار، لەڕەشتەوە بۆ تاران گەڕاوەتەوە. هەموو ڕۆژێك لەناوچەکانەوە، سەرۆك عەشیرەکانی کوردستان لەگەڵ سوپاکەیان دەهاتن و ملکەچی خۆیان نیشاندەدا. ڕۆژی ١٦ ڕەجەب، سلێمان خانی شەرەف ئەلمولك لەگەڵ حسەین خانی موزەفەر ئەلسەڵتەنە و عەباس خانی زەفەر ئەلسوڵتان، کوڕی خانی حاکم، هاتنە کوردستان. ڕۆژی ١٧، عەباس خان، زەفەر سوڵتانی بۆ لای والی، داوود خانی کەلهوڕ نارد تا ئەوانیش لەگەڵ سوپاکەی خۆیان بێن و دەست بەسەر کرماشاندا بگرن. ئەو بروسکە و نامەکانی ئەو

ڕۆژانە لەکوردستانەوە بۆ تاران و کرماشان و بروجێرد و هەمەدان و قەزوێن و زەنجان و گەڕوس و سوڵتان ئابادی عێراق و ناوچەکانی دیکە ڕەوانە کرا، خۆی لەخۆیدا دەفتەرێکی گەورەیە کەئامارژەدان پێیان لەتوانای ئەم کتێبە بەدەرە.

ئەمان اللەخان وەکیلی ئەلمولك هەستی کردبوو شازادە دەخوازێت لەکاتی ڕۆشتن لەکوردستان، ئەو لەگەڵ خۆی ببات. بۆ هەڵاتن لەم کێشەیە، لەخزمەت شازادەدا وتی: وەك بیستوومە ئاسف و هاوڕێکانی لەتاران بێ هیوا بوون و چاوەڕوانی کەرەستە و ئامێری گواستنەوەن تا لەلایەن شازادەوە ئەمانیان پێببەخشرێت و بگەڕێنەوە. هەرکات مۆڵەت بدەن، من شەریعەتمەدار ئامادە دەکەم تا پێکەوە بەدەستنووسی پیرۆزی شازادەوە بڕۆین و ئەوان دڵنیا بکەینەوە و بیانگەڕێنینەوە. شازادە لەبەر ساویلکەیی هەستی بەمەبەستەکەی ئەمان الله خان نەکرد و بەخۆشحاڵییەوە مۆڵەتی ڕۆشتنی پێدا. منیش بەهۆی هاوڕێیەتیم لەگەڵ ئەمان الله خان، شازادەم لەنییەت و مەبەستی ئەو ئاگادار نەکردەوە و بێدەنگیم هەڵبژارد. دوای ڕۆشتنی ئەوان هەواڵ گەیشت کەمحەممەد عەلی شا بەهاوڕێیەتی شوعاع ئەلسەڵتەنە و ئەمیر بەهادور، ڕۆژی ٢١ ڕەجەب لەگەڵ شەش هەزار تورکمان ڕۆشتوونەتە ناو کەمش تەپە، لەنزیك سنووری روسیە لەکەنارەکانی دەریای خەزەر و دەیانەوێت بەرەو ئەستەرئاباد بڕۆن. بەدوای ئەوەدا هەواڵ گەیشت کە٢٢ ڕەجەب، شاری تاران شێوەی نیزامی بەخۆیەوە گرتووە و حکومەتی نیزامی بەسەمسام ئەلسەڵتەنەی وەزیری جەنگ، برا گەورەی سەردار ئەسعەد و سەرداری جەنگ و ئەمیر موجاهید سپێردراوە. دووبارە هەواڵ هات کەشەوی ٢٣ ڕەجەب، محەممەد عەلی شا، بروسکەی بۆ سوپاسالار ناردووە تا دەست بەسەر تاراندا بگرێت تا خودی شا دەگات. لەگەڵ ئەم هەواڵە، سالارئەلدەولە بەئەنقەست و بەپێی ئەم ناوەرۆکە، بروسکەیەکی چڕوپڕی بۆ سوپاسالار نارد. بەدوای ئەوەدا هەواڵ گەیشت کەوەکیلەکانی مەجلیس بەزۆرینەی دەنگ لەدانیشتنی ٢٨ ڕەجەب، دەنگیان بۆ دەرکردن و دوورخستنەوەی سوپاسالار و موحتەشیم ئەلسەڵتەنە و معاون ئەلدەولە داوە. عەباس خانی زەفەرسوڵتان، قورئان بەدەست لەگەڵ داوود خانی کەلهوڕ گەرایەوە و لەگەڵ گەیشتنیان لەلایەن شازادەوە، نازناوی سەردار ڕەشیدی و حسەین خانی برای نازناوی سەرداری گشتی پێبەخشرا. دواتر لە ٢٩ ڕەجەب هەواڵ هات کەکابینەی نوێ لەم بەڕێزانەی خوارەوە بۆ بەرگری کردن لەشا و براکانی پێکهاتووە: سەمسام ئەلسەڵتەنە سەرۆك وەزیران و وەزیری

جەنگ، وسوق ئەلدەولە وەزیری دەرەوە، حەکیم ئەلمولك وەزیری دارایی، موشیر ئەلدەولە وەزیری داد، عەلا ئەلسەڵتەنە، وەزیری زانست، قەوام ئەلسەڵتەنە وەزیری ناوخۆ، دەبیر ئەلمولك وەزیری پۆست و تێلگراف.

دواتر هەواڵ گەیشت کەپێشەنگی شا گەیشتۆتە شاهرود. بەدوای ئەوەدا هەواڵ هات کە لەناوەڕاستی ڕەجەب، ڕەشید ئەلمولك، سێسەد کەس لەسەربازەکانی روس لەتەبرێز ئازاد دەکات و پەیوەستی سەمەدخانی شوجاع ئەلدەولە دەبێت. ئەم هەواڵە خەڵکانی ڕازی کرد کەدەوڵەتی روس هاوکاری شا دەکات. ڕۆژی ٢ شەعبانی ١٣٢٩، شازادە لەکوردستانەوە بەڕێکەوت و منی لەگەڵ خۆیدا برد. شەوی یەکەم لەئاساولە بووین. ڕۆژی دووەم لەکامیاران ماینەوە. لەوێ عەباس خانی چناری لەگەڵ ژمارەیەکی پێویست بۆ گرتنی هەمەدان راسپارد. ڕۆژی سێیەم کاتێك گەیشتینە قاخڵستان، لەکاتی نیوەڕۆ، سواری بروسکەخانەی کرماشان گەیشت و پاکەتێکی تەسلیم بەشازادە کرد. بەخوێندنەوەی، ڕەنگ بەروخساری شازادەوە نەما. زۆر بەهێواشی نامەکەی بەمندا و جەختی لەبڵاو نەکردنەوەی کردەوە. نووسرابوو: ئەمرۆ بروسکەی خانەی تاران ئاگاداری کردینەوە کەوەکیلەکانی مەجلیس لەدانیشتنی ڕۆژی ٢ شەعبان، بەپێی پێشنیاری میستەر شوستەری ئەمریکی، خەزێنەداری گشتی ئێران، بۆ ئێعدامکەرەکانی شا و براکانی، خەلاَتیان دیاریکردووە و بلاَویان کردۆتەوە. بەناچاری وەك کەسێکی ئەمەکدار بەپێویستم زانی ئاگادارتان بکەمەوە تا ئاگاداری خۆتان بن. گەیشتنی ئەم هەواڵە، شازادەی بەتەواوی ترساند بەجۆرێك لەسێبەرەکەیشی دەترسا و وەلاَمی دایەوە: ئەگەر ئەم هەواڵە بلاَو ببێتەوە، ئێوە لێپرسراون.

چەند ساڵ پێشتر، کاتێك شازادە یاخی ببوو و حسام ئەلمولکی هەمەدانی زەین ئەلعابدین ئەوی دەستگیر و لەتاران زیندانی کرابوو، مەحمود خانی حیشمەت ئەلمولکی کوردستانی برای نەسیر دیوان، بەشێوەیەکی نهێنی نیشانەیەکی بەحیشمەت ئەلمولکدا بوو کەقەمەی گەوهەرنیشانی ئەو لەنورئەلدەولەی دایکی وەربگرێت و بەبارمتە دایبنێت و پێنسەد تمەنی بۆ بێنێت تا کەرەستەکانی هەلاَتنی خۆی پێ ئامادە بکات. حیشمەت ئەلدەولە قەمەکەی بردووە و چیتر نەگەڕاوەتەوە بۆ لای سالار ئەلدەولە. لەم سەفەرەیشدا حیشمەت ئەلدەولە لەگەڵ سەد سوار، هاوڕێیەتی شازادە دەکات. بەنهێنی شازادە بابەتەکەی بۆ باس کردم و وتی: ئەم نمەك بەحەرامە ئەگەر ئەم هەواڵە ببیستێت، لەترسی خۆی نەکا ئەوەی ئەو بابەتەم

بیر بێتەوە، یەکەم کەس دەبێت دەستدرێژی دەکاتە سەرمن. باشترە فەرمانی گرتنی خۆی و چەك داماڵینی پیاوەکانی بدەم تا لەمەترسییەکانی ئەو ئاسوودە بم. وتم: لەم کێشە هەستیار و مەترسیدارانەدا هیچ بۆچوونێکم نییە، خۆتان خاوەن دەسەلأتن. شازادە بەخێرایی فەتح ئەلسەڵتەنەی میان دەربەند و مەحمودخانی مەریوانی بانگکرد و فەرمانی گرتنی حیشمەت ئەلمولك و چەك داماڵینی سوارەکانی پێدان. ئەوان ڕۆشتن. زۆری نەخایاند دەنگی تەقە کردن بەرز بوویەوە. سوپاییەکان گومانیان دەکرد سوپای دەوڵەتی هاتووە و سەرقاڵی زین کردنی ئەسپ و هەڵاتن بوون. بەناچاری چەند کەسێکمان بۆ سەر بەرزاییەکان نارد و جاڕیاندا: ئەم تەقە کردنە بەفەرمانی شازادە بوو و دەیویست ئێوە تاقی بکاتەوە. ڕێگەی هەلأتن مەگرنەبەر. سوپای دەوڵەت لەئارادا نییە. دوای دە خولەك حیشمەت ئەلمولك زنجیر کرا و هێنایان. سوارەکانی ئەوەی توانی، هەلأت و ئەوانی دیکە چەککران. شازادە ئەو شەوە لەخێوەتەکەی خۆیدا نەمایەوە و هاتە خێوەتەکەی من. فەرمانیدا چراکەمان کوژاندەوە و حەوایەوە. بەیانی زوو لەقاخلَستانەوە بەڕێکەوتین و گەیشتینە دایچی. لەوێ سەیید حەسەنی ئوجاق و دەستەیەك لەخان و پیاوماقوڵانی کرماشان هاتن و گەیشتنە خزمەتی شازادە. نیوەشەو، شازادە بێ ئاگادار کردنەوەی سوپا، لەگەڵ سەد سوار بەرەو کرماشان بەڕێکەوت و فەرمانیدا: ئێوە بەیانی زوو سوپا بەڕێبخەن و ڕێگەی کرماشان بگرنەبەر. بەیانی کەڕۆژی ٧ شەعبانی ١٣٢٩ بوو، فەرمانی شازادەم بەسەرکردەکانی سوپا ڕاگەیاند. هەمووان بەڕێکەوتین و نزیك نیوەڕۆ گەیشتینە کرماشان. ڕۆژی ٩ شەعبان، بروسکەیەك لەئاستارا بۆ سان پێترزبۆرگ، بۆ بەغداد، بۆ کرماشان، لەلایەن شاوە گەیشت:

برای ئازیزم سالار ئەلدەولە، من لەگەڵ شەش هەزار سواری بلباس و تورکمان بۆ تاران هاتووم. بەخێرایی خۆتان بگەیێنە دەروازەی تاران. بەهیچ جۆرێك گرنگی بەسوپای تاران مەدەن. هەموویان پێکهاتووە لەسێ هەزار کەسی بەختیاری و هتد... بەخێرایی خۆتان بگەیێنە چوونکە دواکەوتنی ئێوە ئەگەری هەیە زیانێکی گەورە لەپلانی گەورەی سوپاکەی ئێمە بدات. (محەممەد عەلی شای قاجار)

سالار ئەلدەولە لەوەلأمدا نووسی: لەکرماشانەوە بۆ بەغداد، بۆ سان پێترزبۆرگ، بۆ ئاستارا، بۆ سوپای شاهەنشاهی: بۆ گەورەی گەورەکان و شای شاکان، محەممەد عەلی شای قاجار، ڕۆحمان فیدای بێت، منیش لەگەڵ بیست و پێنج هەزار سواری عەشیرەکانی جاف و

کوردستان و کەلهوڕ و سەنجابی و پشتکوە والی و سوپای کوردستان و کرماشان و گەڕوس لەکرماشان چاوەڕوانم. چاوەڕێی نەزەر عەلی خان و هێزەکانی لوڕستانم. دەستم بەسەر هەمەداندا گرتووە. لەم دوو سێ ڕۆژەدا بەخواستی خواوەند و بەختی شاهەنشاهی، بەرەو تاران بەڕێدەکەوم تا لەوێ بەخۆشحاڵییەوە پێی شاهەنشاهی ئێران ماچ بکەم و لەبەردەم تەختی پاشایەتی، سەری کوڕنوش دانەوێنم. (گیانبەخش سالارئەلدەولە)

ڕۆژی ١٢ شەعبانی ١٣٢٩، بروسکەیەکی دیکە بەم ناوەڕۆکە گەیشت:

برای ئازیزم سالار ئەلدەولە، بروسکەکەتان بەدەستی من گەیشت. لەناوەڕۆکەکەی خۆشحاڵ بووم. هێزی تاران زۆر بچووکتر و کەمتر لەوەیە بیری لێ دەکەنەوە. چوونکە مەبەستی ئێمە گرتنی تارانە. ئێوە دەبێت هەرچی زووتر هێزەکەی خۆتان ڕەوانە بکەن. هێزی تاران لەئیوان کیفە. لەبەر ئەمە بەخێرایی بەڕێکەون. چوونکە دواکەوتنی ئێوە هەموو پلانەکەی ئێمە دەخاتە مەترسییەوە. (محەممەد عەلی شای قاجار)

دووبارە ڕۆژی ١٣ شەعبان بروسکەیەکی دیکە گەیشت:

برای ئازیزم سالارئەلدەولە، سوپاکەی خۆتان بکەنە دوو دەستە. دەستەیەک بۆ دەروازەی هەمەدان و دەستەیەک بۆ دەروازەی شا عەبدولعەزیم بنێرن. خۆتان لەشا عەبدولعەزیم چاوەڕوانی فەرمانەکانی من بن کە لەکۆشکی قەجەرەوە بەدەستتان دەگات. من جیاواز لەشەش هەزار سوارەکەی پێشوو، هەشت هەزار سواری دیکەم لەبەردەستایە. لەسێ قۆڵەوە بۆ دەروازەی قەزوێن و یوسف ئاباد و دەروازەی دۆڵابیان دەنێرم. خۆیشم بەیانی بەڕێدەکەوم. بەخێرایی خۆتان بگەیێنن تا لەشا عەبدولعەزیم، باڵوێزەکانی دەوڵەتانی دراوسێ و دانیشتووانی تاران پێشوازیتان لێ بکەن. (محەممەد عەلی شای قاجار)

دوای ئەم بروسکەیە هەواڵ هات کەئەرشەد ئەلدەولە، سوپای تارانی لەڕۆژی ١٢ شەعبان لەدامەغان شکستداوە و دەستەیەک لەسوپای تاران پەیوەستی سوپاکەی شا بوون. ئەم هەواڵە، شازادەی هێنایە جموجۆڵ، وتی: ئەگەر سوپای شا خێراتر بەتاران بگات، هەموو هەوڵەکانی من بەفیڕۆ دەڕوات. دەبێت هەرچی زووتر خۆمان بەتاران بگەیێنین. شەو کاتێک دانیشتنەکە چۆڵکرا، پێی وتم: ئێوە لەکرماشان بمێننەوە و لەنەبوونی من کرماشان بپارێزن تا بتوانم بەخێرایی بگەمە تاران. وتم: ئەم بابەتە گاڵتە نییە، جەنگی دەوڵەتییە، هیچ کات ناتوانم لەگەڵ شەست سوار، لێپرسراوی کرماشان بگرمە ئەستۆ. ئەگەری هەیە ئێوە بڕۆن و

خوا نەخواستە شکست بخۆن، لەمشێوەدا یەکمجار من لێرە ئابلۆقە دەدرێم و ڕێگەی گەڕانەوە لەئێوە دەگیرێت. ئەگەر دەتانەوێت من لێرە بمێنەوە، سلێمان خانی شەرەف ئەلمولك و سەد سوارەکەی هاوڕێی لای من بهێڵنەوە چوونکە لێیان دڵنیام. بەمشێوەیە ئامادەم لێرە بمێنەوە وەگەرنە کەسێکی دیکە و هێزی پێویست لەم شارە بەجێبێڵن. وتی: ئاخر من کەسم نییە، دوو براکەم شواج ئەلسەڵتەنە و شا لەباکوری ئێرانن. براکەی دیکەم عێزەد ئەلسولڵتان لەعێراقە. نە ئەو دەستی بەمن دەگات ونە من بەو. منیش زیاتر پشت بەهێزەکەی شەرەف ئەلمولك و برازاکانی ئەو دەبەستم. ناتوانم ئەوان لەخۆم جیا بکەمەوە، ئەگەر فەرمانی مانەوەیش بەسەرکردەکانی دیکە بدەم، لەهێزەکانی من کەم دەبێتەوە. نازانم چی بکەم. دوای کەمێك بێدەنگی وتی: ئەگەر کەسێك بەدوای عێزەد ئەلسولڵتانی برام بنێرم، ئێوە لەگەڵ ئەو لێرە دەمێننەوە. وتم: بەو مەرجەی دووسەد سواری برواپێکراوم لەگەڵدا بێت، لێرە دەمێنمەوە. وتی: شازادە لانی کەم سەد سواری هەیە و خۆیشتان شەست سوارتان لەبەردەستایە، ئەم ژمارەیە بەسە. جەعفەر سولڵتانیش لەدواوە دێت. ئەگەر بەپێویستان زانی ئەویش لای خۆتان بهێڵنەوە. وتم: بەم شێوەیە ئامادەم. بەخێرایی کەسی نارد و شەرەف ئەلمولك و داوودخانی کەلهوڕ و نوێنەری نەزەر عەلی خانیان هێنا. پێی وتن: کامتان دەتوانێت لەماوەی یەك حەفتەدا، عێزەدسولڵتانی برام لەعێراق بێنێتە ئێرە. هەموویان وتیان: لەئێستادا هێزەکانی بەختیاری نێوان عێراق و کرماشانیان گرتووە و کەس بێ جەنگ ناتوانێت بگاتە ئەو ولاتە. دوای دوو کاتژمێر گفتوگۆ، سەرئەنجام سەردارەکان وەڵامێکی نائومێدانەیان دایەوە. دوای ڕۆشتنی ئەوان بەشازادەم وت: هەرچەند دواکەوتنی ئێوە لەهێرشکردنە سەرتاران، پلانەکەی شا بەو شێوەی خۆی ئامادەی پێداوە، لەناو دەبات، بەڵام ئەگەر ئێوە شازادە ئەحمەد میرزای تویسرکانی لەگەڵ سالار مۆئەییدی کرماشانی بخەنە ژێر فەرمانی من، گومان دەکەم بتوانم، عێزەد سولڵتان بێنمە ئێرە. وتی: خۆت دەتەوێت بڕۆیت یا ئەوان دەنێریت. وتم: هەرچی دەکەم پەیوەندی بەئێوە نییە. من لەماوەی یەك حەفتەدا شازادە تەسلیمی ئێوە دەکەم. وتی: بەیانی هەردووکیان دەنێرم تا لەژێر فەرمانی تۆدا بن. وتم: ئەو نامەی دەتانەوێت بۆ عێزەدسولڵتانی بنووسن، بەیانی بینێرن. ڕۆژی دواتر ١٤ شەعبانی ١٣٢٩ بوو. شازادە نامەکەی بۆ عێزەد سولڵتان لەگەڵ شازادە ئەحمەد میرزا و سالار مۆئەیید بۆ لای من نارد و بەشێوەیەکی نهێنی سەبارەت

بەمەبەست و شوێنی مەبەست،گفتوگۆی لەگەڵ کردبوون. منیش دە کەس لەسوارە بەئەزمونەکانی خۆم هەڵبژارد. سالار مۆئەیید، ئەلوەزارەی برای و سێ کەسی دیکەی هەڵبژارد. شازادە ئەحمەد میرزایش دوو سوار و کورە شەش ساڵەکەی ئامادە کرد.

دەوروبەری نیوەڕۆ، نانمان خوارد و لەکرماشانەوە بەڕێکەوتین. لەدەرەوەی شار، بەسوارەکانمان راسپارد تا گەیشتن بەعێراق هەرکەسێك پرسی ئەم مەلایە کێیە، بڵێن پێشنوێژ و وتارخوێنی کوردستانە و وەك نوێنەری سالار ئەلدەولە بەرەو عێراق دەڕوات. بڕیارە قەوام ئەلسەڵتەنە و سەرداری جەنگی بەختیارییەکانیش بەرەو عێراق بەڕێکەون و لەوێ بڕیارێکی کۆتایی لەنێوان سالارئەلدەولە و دەوڵەت بدەن بۆ ئەوەی ئەم کێشەیە بەجەنگ و هێرشکردنە سەر یەك کۆتایی نەیێت. جیاواز لەوە فەرمانمان پێدان لەهەر مەنزڵێکەوە کەبەڕێکەوتین، کەمێك جۆ و کەمێك نان و خواردن لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت. بەمشێوەیە شەش شەو و ڕۆژ لەڕێگەدا بووین و هەرکەس دەیپرسی، هەمان وەڵامی دەبیست کەفەرمانمان دابوو. بەمشێوەیە هەموویان خۆشحاڵ دەبوون و دۆعایان دەکرد سەرکەوتن لەم کارە بەدەست بێنین و جەنگ بۆ ئاشتی بگۆڕین. کاتێك گەیشتینە نزیك دەوڵەت ئاباد، ڕێبوارێك ئاگاداری کردینەوە کەنزیکەی پێنسەد سواری ئەمیر موفەخەمی بەختیاری لەوێیە. شازادە ئەحمەد میرزا وتی: چیتر باڵندە ناتوانێت لەوێ گوزەر بکات مەگەر ئەوەی ڕێگەکەمان بگۆڕین. لەم گفتوگۆیەدا بووین کە لەناکاو نزیکەی پەنجا سوار ئێمەیان لەدوورەوە بینی و بەرەو لامان هاتن. کاروانسەرای دەم شاتر نزیك بوو. شازادە وتی: پەنا بۆ کاروانسەراکە دەبەین و لەوێ سەنگەر دەگرین. چیایەیەکی بەرز لەباشوری کاروانسەراکە بوو. وتم: پەنا بۆ چیاکە دەبەین نەکا لەکاروانسەراکەدا گەمارۆمان بدەن. هەموان بەبۆچوونەکەی من ڕازی بوون. سوارەکان کاتێك بینیان پەنا بۆ چیاکە دەبەین، لەدوورەوە دەستیان بەتەقە کردن کرد. ئێمەیش وەڵاممان دانەوە تا گەیشتینە لووتکەی چیاکە. لەوێ بینیمان ئەحمەد میرزا و منداڵەکەی دیار نین. سوارەکان گەیشتنە کاروانسەراکە، چیتر نەیاندەتوانی بەچیاکەدا سەرکەون و لەوێوە تەقەیان لێدەکردین. ئێمەیش وەڵاممان دەدانەوە. نزیکەی کاتژمێرێك تەقە کردن بەردەوام بوو. هەتاو ئاوا دەبوو. گوندەکانی دەوروبەریش کاتێك دەنگی تەقەی ئێمەیان بیست، ترسان و دەستیان بەتەقە کردن کرد. دوای کاتژمێرێك لەشەو، چیتر دەنگی تەقە کردن نەما. سوارەکانمان بینی لەو ڕێگەوەی

هاتبوون، گەڕانەوە. یەکێك لەپیاوەکانمان بەهێواشی ناردەخوارەوە تا هەواڵێکی ئەحمەد میرزامان بۆ بێنێت. زۆری نەخایاند گەڕایەوە و وتی: کاروانسەراکە کەسی تیا نییە و شازادە ئەحمەد میرزا و کوڕەکەی لەوێ چاوەڕێی ئێوەن. بەئاسوودەیی هاتینەخوار و کاتێك گەشتینە لای شازادە و ئەحواڵیمان پرسی، وتی: کاتێك بەچیاکەدا سەرکەوتن، ئەسپەکەی من نەیتوانی سەرکەوێت، ناچار لەباخێکی پشت کاروانسەراکە دابەزیم و ئەسپەکەم بەدارێکەوە بەست و تفەنگ و فیشەکەکانم لەژێر داری مێوێك شاردەوە و لەگەڵ کوڕەکەم لەژێر دارێکدا دانیشتین. کاتێك سوارەکان گەیشتنە ناو کاروانسەراکە، لەوێوە دەستیان بەتەقە کردن کرد. یەکیان هاتە ناو باخەکە و بینی لەگەڵ منداڵەکەم دانیشتووم. پرسی: ئێوە چ کارەن؟ وتم: باخەوانی ئەم باخە. وتی: ئەم سوارانە کێ بوون؟ وتم: سوارەکانی ئەزەرعەلی خان. کاتێك ئێوەیان لەدوورەوە بینی گومانیان کرد سەر بەسوپاکەی سالار ئەلدەولەن، ترسان و پەنایان بۆ چیاکە برد. کاتێك ئەمەم پێوت، ڕۆشت و کەسانی دیکەی ئاگادار کردەوە و بەمشێوەیە دەستیان لەتەقە کردن هەڵگرت و ڕۆشتن. من و کوڕەکەم سوار بووین و لێرەدا چاوەڕوانی ئێوەمان دەکرد.

دوای کۆتایی هێنان بەم باسە، دووبارە ڕاوێژمان کرد کەئایا لەجادەی ڕاستەوخۆی دەوڵەت ئابادەوە بڕۆین یا لەدەشت و لاڕێکانەوە؟ وتم: لەڕێگەی دەوڵەت ئابادەوە باشترە، بەلاَم ئەگەر کەسێکمان بینی، وەك هەمیشە وەلاَمی بدەنەوە. دوای تێپەڕینی شەش کاتژمێر لەشەو، گەیشتینە قەزای دەوڵەت ئابادی مەلایر. لەو جادەی بەناو قەزاکەدا تێدەپەڕی، گوزەرمان کرد. دوو کەسی گەزمە ئێمەیان بینی. بەدەنگی بەرز هاواریان کرد: (سەوار کێم دێر) (سوار کێیت؟) بەخێرایی وتم: خۆمانین. تەنیا بەم وەلاَمە ڕازی بوون و لەقەزاکە تێپەڕینی. ئێوارێی ڕۆژی ١٧ شەعبان، گەیشتینە گوندی ئاستانە کەمەنزڵگەی شازادە بوو. نامەی سالارئەلدەولمان تەسلیم کرد و لەبارودۆخ بەو شێوەی سەرنجی ڕابکێشێت، ئاگادارمان کردەوە. سەرئەنجام هەر چۆنێك بێت، بەپشت بەستن بەهێزی زمان و وشە و هێنانەوەی بەڵگە، هەمان شەو شازادەمان بۆ بەڕێکەوتن ئامادە کرد. تەنیا داوای ئەوە بوو بەیانی بڕواتە عێراق و چاوی بە ئەمیر ئەفخەم حیسام ئەلمولکی هەمەدانی بکەوێت کەفەرمانڕەوای عێراق بوو بۆ ئەوەی ئەمانەتی ماڵەکەی و ژیانی بەو بسپێرێت و بەڕەزامەندی ئەو بەڕێکەوێت. بیرم لەوە کردەوە ئەگەر ڕێگە بدەم بەتەنیایی بڕوات ئەگەری

هەیە ئەمیر ئەفخەم ئەو لەمەبەستەکەی پەشیمان بکاتەوە و ئێمەیش بگرێت. وتم: ئێستا کەوایە، منیش حەز دەکەم چاوم بەئەمیر ئەفخەم بکەوێت. وتی: دەترسم ئەمیر لەبینینی ئێوە شادومان نەبێت و هەست بەلێپرسراویەتی بکات. وتم: شەو بەشێوەیەکی نەناسراو کەکەس هەستی پێنەکات، دەڕۆینە لای. وتی: باشترە بەیانی زوو کەسێك بۆ لای ئەمیر بنێرین و داوای مۆڵەتی لێ بکەین. وتم: کێشە نییە. منیش نامەیەکم کەنیشانەدەری تامەزرۆییم بۆ بینینی ئەمیر بوو، نووسی. بەیانی ئێوارێکەی، سوار گەڕایەوە و وەڵامی ئەمیری هێنا کە لەترسا بەخەتی عەرەبی نووسیبووی: ئەمشەو لەباخی قەنات کە لەدەرەوەی شارە، بۆ شەو، چاوەڕوانی ئێوەم. دوای سێ کاتژمێر لەتێپەڕینیی شەو، ڕۆشتینە باخی قەنات کە بەباخی فەرمان فەرمایش بەناو بانگە. دوای باسکردنی مەزنی و دەسەڵاتەکانی سالارئەلدەولە بەجۆرێك ببێتە هۆی ترساندنی ئەمیر، لەکۆتاییدا وتم: لێرە بێهۆ دانیشتوون. ئەمیر بەقاقایەك کەتایبەت بوو بەخۆی، وتی: سەیرە، وادیارە ئەمشەو میوانی خانەخوێ کوژم لەماڵەکەی خۆمدا جێگە کردۆتەوە. دەتەوێت بەکوشتنم بدەیت؟ مەگەر پێشینەی من لەگەڵ سالارئەلدەولە نازانیت کاتێك یاخی بوو و من قۆڵبەستم کرد و لەتاران زیندانیکرا. ئێستا بێ وەرگرتنی ئەماننامە، چۆن خۆم دەخەمە مەترسییەوە؟ جیاواز لەوە ئاگادارم ڕۆژی ١٤ شەعبان، موعین هومایونی بەختیاری، سوپای ڕەشید سوڵتانی لەفیروزکوە شکستداوە و ڕەشید سوڵتانیش ئەسیر کراوە. وتم. ئەگەر خودی شایش شکست بخوات، هیچ مەترسییەك ڕووبەڕووی سالارئەلدەولە نابێتەوە. بەکورتی، دوای گۆڕینەوەی بیروراکان، نانمان خوارد و چەند کاغەزێك لەو کاغەزانەی بۆ کوشتنی شا و براکانی لای ئەمیر بوو، وەرمان گرت و گەڕاینەوە. بەیانی ئەو شەوە، بێ وەستان بەرەو کرماشان بەڕێکەوتین. شازادە سی سواری لەگەڵدا بوو. هەموویانی لەگەڵ خۆی هێنا و فەرمانی بەهاوسەرەکەیدا سوارەکانی دیکە بەدوای ئەودا بنێرێت دووبارە بەسوارەکانمان وت هەرکەس پرسی، بڵێن: شازادە لەلایەن سەرۆکایەتی وەزیرانەوە راسپێردراوە بڕوات و چاوی بەسالارئەلدەولە بکەوێت بۆ ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بکەن و کێشەکە بێ جەنگ کۆتایی پێبێت. بەکورتی، شەو و ڕۆژ بەخێرایی ڕێگەمان بڕی. شەوی ٢٣ شەعبان دوای تێپەڕینیی دوو کاتژمێر لەشەو، گەشتینە کەنگاوەر و ڕۆشتینە ماڵی ساری ئەسلان خان و بەخێرایی سالارئەلدەولەمان لەگەڕانەوەی خۆمان ئاگادار کردەوە. ساری ئەسلان خان، میوانداری کردین. کاتژمێر چوار، وەڵامی

بروسکەکەمان گەیشت: لەکرماشانەوە بۆ کەنگاوەر، بۆ بەڕێزی شەریعەتمەدار، حوجەت ئەلئیسلامی پێشونوێژ و وتارخوێن، زۆر سوپاسی ئەرکەکانی ئێوە دەکەم. بەخواستی خوا، وادەی دیدار نزیکە. بەیانی بەڕێکەون و تەشریف بێنن تا خولەکێك زووتر براکەم لەئامێز بگرم. (سالارئەلدەولە)

بەیانی ٢٤ شەعبانی ١٣٢٩، چایی و قاوەڵتیمان خوارد و بەڕێکەوتین. شەوی ٢٤ شەعبانی، دوای تێپەڕینی کاتژمێرێك لەشەو، گەیشتینە سەحنە. لەدوورەوە شەقامێکمان لەچرا بینی، کاتێك نزیك بووینەوە، بینیمان عەلی ڕەزا خانی گەڕوسییە و لەگەڵ سوپای گەڕوس بۆ پێشوازی کردنمان هاتوون. لەبەر ئەوەی هەتاو ئاوا ببوو، هەموو سوپاکەی بەدووری هەر چوار کەس، مۆمێکی بەدەستی پێنجەم کەس دابوو و لەدوو لای شەقامەکە ریزیان بەستبوو و چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. دوای ئەوەی لەشەقامەکە گوزەرمان کرد، ڕۆشتینە ناو خێوەتێك و بینیمان سفرەیەکی رازاوە ڕاخراوە، جۆرەکانی شیرینی و میوە کە لەشاردا بەدژواری دەستدەکەوت، لەسەر سفرەکە دانرابوو. دوای خواردنی شەربەت و چایی، کاتی نان خواردن، نانێکی باشیان ئامادە کرد و خواردمان و ئەو شەوە بەئاسوودەیی خەوتین. بەیانی کە ڕۆژی ٢٤ شەعبانی ١٣٢٩ بوو، لەسەحنەوە بەڕێکەوتین. بەردەوام پێشوازیمان لێدەکرا. داوودخانی سەرداری کەلهوڕ لەگەڵ هەموو هێزەکانی خۆی، تا بێستوون بۆ پێشوازی کردنمان هاتبوو. کاتێك لەو گوزەرمان کرد، دەستەی زەفەری کوردستانمان بینی کە بەسەرۆکایەتی حاجی ئەرفەع ئەلمولك محەممەد خانی ئەردەڵان بۆ پێشوازی کردنمان هاتبوون. لەبەر ڕێزی هاوشاری بوون، لەناو خێوەتەکەی حاجی ئەرفەع دابەزین. پیاڵەیەك چاییمان خوارد و سوار بووینەوە. وەك تۆپەڵەی بەفر کەهەرچی زیاتر تل بخوات، گەورەتر دەبێت، ئێمەیش تا دەڕۆشتینە پێش، ژمارەی پێشوازیکەران زیادی دەکرد. قەرەبالغی شەپۆلی دەدا تا گەیشتینە ناوەندی دەسەڵات. لەوێ دابەزین و خودی شازادە سالارئەلدەولە تا بەردەم حەوشەکە بۆ پێشوازی کردنمان هات. دوای ماچ و موچ، ڕۆشتینە ژوور و زۆربەی زاناکان لەو دانیشتنەدا ئامادە بوون.

دوای خواردنی شەربەت، زانا بەڕێزەکان، مۆڵەتی ڕۆشتنیان پێدرا. منیش بۆ ماڵەکەی خۆم کە لەحەوشی ماڵیەدا بوو، گەڕامەوە. حەوشی ڕۆژئاوای پەیوەست بەحەوشی بیدستانی شا. شەو دووبارە دانیشتنێکی سێ قۆڵیمان بەست و دوای باسکردنی سەفەرەکەمان،

شازادەمان لەشکست و گرفتاری ڕەشید سوڵتان ئاگادار کردەوە و یەکێك لەو کاغەزانەی لەئەمیر ئەفخەمم وەرگرتبوو، نیشانی شازادەدا کەنووسرابوو:

٤ شەعبانی ١٣٢٩، بەپێی بڕیاری مەجلیسی پیرۆز: ئەو کەسانەی محەممەد عەلی میرزا دەستگیر یا دەکوژن، سەد هەزار تمەنیان وەك خەڵات پێدەدرێت. ئەو کەسانەی شوجاع ئەلسەڵتەنە ئیعدام یا قۆڵبەست دەکەن، بیست و پێنج هەزار تمەنیان پێدەدرێت و هەروەها ئەوە رادەگەیێنین هەرکەس لەکاتی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە، بکوژرێت، بڕە پارەکە بەکەس و کارەکەی دەدرێت و ئەم پارەیە لەخەزێنەی دەوڵەتایە و دوای ئەنجامدانی خزمەتەکە، بەنەقدی پێیان دەدرێت.

شازادە لەخوێندنەوەی کاغەزەکە توڕە و بەخێرایی بروسکەیەکی بەم ناوەرۆکە بۆ مەجلیس نارد:

تاران: بۆ وەفدی بەڕێزی سەرۆکایەتی مەجلیس. لەکوردستانەوە بروسکەم نارد، وەڵامتان نەدامەوە، لەجیاتی ئەوەی گرنگی بەخاڵەکانی ئەو بروسکەیە بدەن و وردبینانە لەبارودۆخی مەملەکت بڕوانن، بیرێك لەو کێشانە بکەنەوە کەخۆتان سەرچاوەی دروستبوونیانن. بڕیاری کوشتنی من و خەڵات کردنی بکوژەکەی منتان داوە. لەگەڵ ئەوەی من خۆم بەپێی خۆم و بۆ کوژران و گیان بەخشین بەم خاك و ئاوە هاتووم، بەڵام نەتانزانی کەئێرانی ڕاستەقینەی خواناس، هیچ کات پشت ناکاتە نیعمەتەکانی سەد و پەنجا ساڵەی قاجار، بەتایبەت بۆ مناڵەکانی خوالێخۆشبوو، موزەفەرئەلدین شا و هیچکات دەستدرێژیان ناکرێتەسەر. چوونکە ئێرانییەکان وەك برای ئێمە و هەموومان مناڵی پاشاین کەسێبەر و هەڵبژێردراوی خواوەندە. دژایەتی ودوژمنایەتی یەك ناکەین. گومان دەکەم مۆڵەتتان بەشێونکەوتەکانی خۆتانداوە، کێشە نییە. دۆعای خەڵکی ئێران پارێزگاری لەئێمە دەکات، بەڵام کوژرانی من، ئایا چارەسەری کێشەی ئێستای دەوڵەت و میللەتی ئێران دەکات کەئێوەی وەکیل، سەرچاوەی کێشەکانن. ئەرکی خواناسین و پارێزگاری کردن لەمافی ئەو داماوانە کەمافەکانی خۆیان بەئێوە سپاردووە، ئەوەیە ڕق و کینە پشتگوێ بخەن، و چیتر شوێنکەوتەی هەوا و هەوەسی خۆتان نەبن. بیرێك لەبارودۆخی ئێستای وڵات و مسکێنە داماوەکان بکەنەوە بەهەمان شێوە کە لەقۆناغی یەکەم، وەکیلەکانی مەجلیس گرنگییەکان بەداوا و مۆجیارییەکانی محەممەد عەلی شا نەدا. وەکلیەکانی ئەو دەورە، تەنیا بەمەبەستی

پێشخستنی مەبەستە فیرۆکانی خۆیان، لەخۆبایی بوون و بوونە خراپەکارانی ڕۆژگاری خۆیان و ئەوەی کردیان، سەرئەنجام داوێنی خۆیانی گرتەوە. دوو ساڵی تەواو لەسەراسەری ئێران، خوێنەکان دەرژا وماڵەکان وێران دەکرا تا ئەوەی سەرئەنجام دوای دەست لەکارکێشانەوەی پاشا، بەگومانی ئەوەی، باروذۆخ هێور و کێشەکان چارەسەر دەبێت، بەلآم پێچەوانەکەی ڕوویدا. ئەمرۆکە، نەك تەنیا دانیشتووانی ئەورووپا و ئاسیا و ئەمریکا پشتڕاستی دەکەنەوە، بەڵکو وەحشییەکانی ئەفریقایش حاشا لەوە ناکەن کەباروذۆخ سەد هەزار جار زیاتر خراپ بووە. ئێستا بەڕاشکاوی دەینوسین، چەند سوارێکی بەختیاری و چەند کەسێکی سەرسەری تارانی، دەوڵەتی ئێرانیان پێ بەرێوە نابرێت. دوو هەزار سواری بەختیاری سێ مانگە شەو و ڕۆژ هەوڵ دەدەن بەلآم نەیانتوانی چارەسەری تایەفەی ماڵ ئەسەد بکەن کەیەکێك لەتایەفەکانی بیرانوەندە. بەناچاری ڕێگەی هەلآتن بۆ بروجێردیان گرتەبەر. جیاواز لەوە بەختیارییەکان خۆیان دەزانن ئەگەر ئەو کارەی ئەوان لەتاران پێشکەوتن و سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەهۆی ئەو تورەیی و دڵگرانییە بوو کەهەموومان لەپاشا بوومان. جیاواز لەمە چۆن دەتوانین گومانی ئەوە بکەین دانیشتووانی ئێران بەم شتە پڕوپووچانە ڕازی بن. بەڕێزانی وەکیل، سوێند دەخۆم بەو خوایەی گیانی من و هەموو مرۆڤەکانی لەدەستایە، ئێوە بوونەتە هۆی رژانی خوێنی موسوڵمانان و ئێوە دەبن. سەرئەنجام چی دەبێت. محەممەد عەلی شا لەم دوو ڕۆژەدا دەگاتە تاران. منیش دەمەوێت بزانن چ بەڕاستی بزانن یا بەزێدەڕۆیی و فشە کردن، لەگەڵ سی هەزار کەس کەئەگەر زیاتر نەبێت کەمتر نییە، بەیانی بەڕێدەکەوم. بەلآم ئێوە بێ ئاگان و ڕاستییەکانیان بەئێوە نەوتووە. لەدەروازەی کرماشان تا نەوبەران سوپاکە درێژ بۆتەوە و لەرێدایە. لەئازەربایەجان، شاهسوەن و شوجاع ئەلدەولە، لەگەروس زیاتر لەسێ هەزار سوار و بەم ئەندازەیە پیادە کەفەرمانیان پێدراوە لەڕێگەی زەنجانەوە بەرەو تاران بەڕێکەون. گومان بکەن تا گەیشتن بەتاران ئەم سوپایە چی دەکات و چ کاولکارییەك دروست دەبێت. دڵتان بۆ ئەم خەڵکە بسووتێت کەئەوانتان کردۆتە ئامێری دەستی خۆتان چوونکە سوێندتان بەخوا و قورئان و پێغەمبەر خواردووە پارێزگاری لەمافەکانی ئەوان بکەن. گوێ لەقسەی پڕوپووچی دەستەیەك لەنەیارەکان مەگرن. بیر لەڕێگە چارەیەك بکەنەوە تا ئێران لەم وێرانی و کاولکارییە ڕزگاری بێت و مەملەکەت ببێتە خاوەنی یەك پاشا و یەك مەجلیسی نیشتمانی و

یاسایەکی ڕاست. ئەم کردەوانەی ئێوە جگە لەوەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بارودۆخ خراپتر دەکات، هیچ سوودێکی دیکەی نییە. بەڵام تا دە ڕۆژی دیکە ئەگەر بارودۆخ بەمشێوەیە بمێنێتەوە، بەخواستی خواوەند، هەموو گومانەکانی ئێوە بەتاڵ دەبێتەوە. خاوەنی وڵات بەخواستی خواوەند دێتە ناو پایتەخت و کاروباری مەجلیس و دەوڵەت و میللەت ڕێکدەخات. باشترە خزمەتی ئێوە لەخزمەتی خاك و ئاوی ئەم وڵاتەدا بێت. ئەم هێزە کەدە ڕۆژە لەڕێگەدایە، تا ئێستا لەماڵەکانی خۆیاندا بوون. خراپ یا باش تێپەڕی. من وەك ئێوە ماڵیاتی وڵاتێکی وەك ئێران، یا گومرك یا بانکم لەبەردەستا نییە کەبەردەوام پارەیان بۆ خەرج بکەن. ئەم خەرجییانە، خواردنی ئەم سوپایە ئاشکرایە زەرەر و زیانەکەی یەخەی هەژارەکان دەگرێت چۆن ڕازی دەبن ئەم داماوانە لەگەڵ کەمی بەرهەم، بەمشێوەیە مافەکانیان پێشێل بکرێت. بەکورتی هەرکات دەخوازن وەرنە بروسکەخانە، منیش دێم و گفتوگۆی پێویست دەکەین. ئەوسا لەگەڵ دوو هەزار سواری بەئەزمون دێم و دەگەمە خزمەتی شاهەنشا، محەممەد عەلی شا. بەباشی کاروبارەکان رادەپەڕێنم. شای شاکان سوێندی خواردووە هەموو جۆرە چاکەیەك و خێرخوازییکی باوکانە پێشکەش بەئێرانییەکان بکات. دووای تەشریف هێنانی بۆ پایتەخت، بەڵێنەکەی خۆی دەباتەسەر. ئەگەر وەڵام نەدەنەوە و گرنگی بەڕێگە چارە نەدەن، بەگومانی ئەوەی کەفلانەکەس بۆ کوشتنی سالارئەلدەولە یا شوعاع ئەلسەڵتەنە ڕۆشتووە یا فلانە سەردار راسپێردراوە یا فلانەکەس چیکردووە.... جگە لەگاڵتە کردن بەخۆتان و شێواندنی بارودۆخی ئێران هیچی دیکەتان دەستناکەوێت. چوونکە ئێوە دژی خواستی خواوەند دەجەنگن و هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێن. بەو بەڵگانەی لەبەردەستایە، پشت ئەستوورم کەسەرکەوتن بەدەست دێنین. ئەگەر لەرووی دوژمنایەتی و نەیارییەوە نەبێت، هەمووتان وتەکانی من پشتڕاست دەکەنەوە. ئەگەر تا ئێواریَ وەڵام نەگات، بەیانی بەڕێدەکەوم. ئێستا سەربەستێ و مەبەستم ئەوەیە کەهەموو نەتەوەکان لەناو ڕۆژنامەکان ئەم بروسکەیە دەبینن و دەزانن ئێمە نەبووینەتە سەرچاوەی ڕژانی خوێنی خەڵك و وێرانی ماڵەکانیان بەڵکو ئێوە سەرچاوەن. ئەم بروسکەم بۆ هەموو زانا پایەبەرزەکان ڕەوانە کردووە. (سالار ئەلدەولەی قاجار)

ئەماننامەیەکمان بەم ناوەرۆکەی خوارەوە لەشازادە وەرگرت و بۆ ئەمیر ئەفخەممان نارد:

بەڕێزی گەورە، ئەمیری ئەفخەم، کاتێك بەرەو خاکی ئێران بەڕێکەوتین، سەرەتا لەخزمەت

شا، رۆحم فیدای بێت، بەشایەتی دەستەیەك لەسەرکردەکانی میللەت، بەڵێنم لەگەڵ خوای خۆم بەست، هەموو مەبەستە کەسییەکان پشتگوێ بخەم و هەموو هەوڵەکانم بۆ ڕزگار کردنی میللەتی ئێران بخەمەگەڕ و گیانی خۆم لەڕێگەی دینی پیرۆزی ئیسلام و پاراستنی سەربەخۆی دەوڵەتی شەش هەزار ساڵەی ئێران ببەخشم. و سوپاسی خواوەند دەکەم کەتا گەیشتن بەکرماشان، لەهەموو شوێنێك سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە و ئەمەیش جەخت لەوتەکانی من دەکاتەوە. ئەوەی تا ئێستا هیچ بروسکەیەکم بۆ جەنابتان نەناردووە، نەمدەزانی ئێوەیش رێبازی خۆتان گۆڕیوە یانە؟ ئێستا کە نامەکەی ئێوە بەدەستی شەریعەتمەدار، پێشنوێژ و وتارخوێنی کوردستان بەدەستمان گەیشت، خۆشحاڵی منی زیاتر کرد. من نەهاتوومە ئێران شوێن هەوا و هەوەسی خۆم بکەوم یا بەپێچەوانەی بەڵێنەکەم لەگەڵ خواوەند، دوژمنایەتی و دژایەتی کەس بکەم. بەهیچ جۆرێك، من تەنیا کەسێکی خزمەتکاری ئەم وڵاتەم. هیچ مەبەستێکم نییە جگە لەوەی دەمەوێت دەوڵەت و میللەتی مردوو زیندوو بکەمەوە. ڕێگە نەدەم بەندەکانی خوا بەهۆی نەزانییەوە زیاتر لەمە خوێنی یەکتر بڕێژن. بروسکەکەیشم بۆ مەجلیسی نیشتمانی، وتەکانم پشتڕاست دەکاتەوە. دەقی بروسکەکەیش بۆ ئێوە دەنێرم، بەوردی بیخوێننەوە. لەناو سوپای مەراغە و بەقورئانی مەجید سوێندم خوارد کەمن و ئەو بیست و پێنج هەزار کەسە، تا دووایین دڵۆپی خوێنی خۆمان، بۆ نەهێشتنی خراپەکاران و کوژاندنەوەی ئاگری فیتنەی ئاژاوەگێران ئامادە بین. دوای ڕێکخستنی کاروبارەکانی ئەو ناوچە، هاتینە کوردستان. لەهەموو سەرزەمینەکانی کوردستان و گەڕوس سوێندەکەم تازە کردەوە. دووبارە بەئامادە بوونی بەڕێزی پێشنوێژ و وتارخوێنی کوردستان سوێندم خوارد کە لەلایەن منەوە ئاسوودە بن. دڵنیا بن. هەر سوێندێکی دیکە کەئاسوودەی ئێوەی لێبکەوێتەوە، ئامادەم بیخۆم. بەڵام ئەمڕۆ کەدەوڵەت و میللەت پێویستیان بەخزمەت هەیە، ئێوە دەبێت باشتر و زیاتر لەهەمووان بۆ خزمەت کردن ئامادە بن. بیر لەهیچ شتێك مەکەنەوە. پیاوانە بۆ خزمەت کردن ئامادە بن. ئەمڕۆ خزمەت کردن بەمن یا برای تاجدارم نییە، بەڵکو خزمەت کردن بەمیللەت و ئاو و خاکی ئێرانە. ئایا ئێوەی ئێرانی دەزانن نەخۆشییەکەتان تا چەندە کوشەندەیە و چارەی دەردی بێ دەرمانی ئێوە چییە؟ ئەو دەرمانە لەئێستادا دەنکێك جۆی هیممەت و دەنکی نۆکی غیرەتە کەپیاو بن و پیاوانە بجووڵێنەوە. من ئەمڕۆ بەشێوەیەکی کاتی، شوانی ئەم مەڕانەم، چاوەڕوانم بزانم

ئێوە تا چەندە بۆ خزمەت کردن ئامادەن تا بەو شێوەیە ئەرکەکانی ئێوە دیاریبکەم. چاوەڕوانم لەناو سوپاکەم چاوم بەئێوە بکەوێت.

هەستە و وەرە کەئێمە چاوەڕوانی تۆین، بێگانە مەبە کەئاشنای تۆین (سالارئەلدەولە)

ڕۆژی ٢٧ شەعبانی١٣٢٩، سالارئەلدەولە، ئەمانەتی شازادە فەزڵ اللەی میرزای عێزەد ئەلسوڵتانی بەمن سپارد و خۆی لەگەڵ بیست و پێنج هەزار عەشایر و هێزی چەکدار بەرەو تاران بەڕێکەوت. دوای چەند ڕۆژ هەواڵ گەیشت کەڕۆژی٣ ڕەمەزان، ئەرشەد ئەلدەولە، لەگەڵ سوپای تورکمان، لەنزیك ئیوان کیف شکستیان خواردووە. ڕۆژی ٦ ڕەمەزان هەواڵ گەیشت هێزەکانی سالارئەلدەولە، سوپای ئەمیر موفەخەممی بەختیاری لەمەلایر شکستداوە و نزیکەی دووسەد کەس لەبەختیارییەکان کوژراون و بریندار بوون و ژمارەیەکی زۆری تۆپ و فیشەك و تالآنی دەست سوپاکەی سالارئەلدەولە کەوتووە. دواتر هەواڵ گەیشت لەڕۆژی دەی ڕەمەزانی ١٣٢٩، یەپرەمی ئەرمەنی و ماژورهانی موشاقی ئاڵمانی کەهاوڕێی یەپرەم بوو، لەگەڵ سێسەد و پەنجا سوار کەسەد و هەشتا کەسیان خۆبەخشە ئەرمەنییەکان بوون، لەگەڵ سێ تۆپ و پێنسەد سواری بەختیاری بەسەرۆکایەتی بەهادور و سەردار موحتەشەم و دەستە دەوڵەتییەکانی دیکە، بەفەرمانی ئەمیر موجاهید، بەرەو ئیمام زادە جەعفەر لەباشوری ڕۆژهەلآتی تاران بەڕێکەوتن.

یەپرەم کەپێشتر لەکاتی گرتنی تاران ئاماژەمان پیدا، خەڵکی ئەرمەنستانی عوسمانی بوو. چەند ساڵ پێش مەشروتییەتی ئێران هاتە ڕەشت و لەوێ بەبازرگانی کردنەوە سەرقاڵ بوو. خوێندەواری نەبوو بەڵام کەسێکی بوێر و چاونەترس بوو.

دواتر هەواڵ گەیشت ڕۆژی سێشەممەی ١١ ڕەمەزان، هێزەکانی یەپرەم و بەختیاری لەنزیك ئیمامزادە جەعفەر، کاتژمێرێك پێش نیمەڕۆ لەگەڵ هێزەکانی ئەرشەد ئەلدەولە کەدوو هەزار تورکمان و هەزار و چوارسەد سواری دیکە بوون و چوار تۆپیان پێبوو، ڕووبەڕوو بوونەوە و دوای جەنگێکی قورس، کاتژمێری یەکی پاش نیوەڕۆ، ئەرشەد ئەلدەولە شکست دەخوات و شەست و سێ کەس لەتورکەکان کوژراو و سێسەد و پەنجا کەسیان بریندار و ئەسیر و ئەوانەی دیکەیان لەڕێگەی مەشهەدەوە هەلآتوون. پێی ئەرشەد ئەلدەولە گوولەی بەردەکەوێت و ئەسیر دەکرێت. نیوە شەو ئەرشەد ئەلدەولە دەبەنە خێوەتەکەی یەپرەم. بەیانی ئەو ڕۆژە کە١٢ ڕەمەزان بووە، ئەرشەد ئەلدەولە تیرباران و جەنازەکەی دەبەنە تاران.

لەکاتی تیرباران کردن هاواری کردبوو: زیندوو بێت محەممەد عەلی شا. ڕۆژی ١٣ ڕەمەزان، جەنازەی ئەو بۆ بینینی گشتی لەگۆڕەپانی تۆپخانە دادەنێن. من نەمهێشت ئەم هەواڵە نەبە سالارئەلدەولە بگات نە بەعێزەد ئەلسولتان. بەردەوام هەواڵ لەسوپای شازادە دەهات کەدەگەنە هەر گوندێك، تالانی دەکەن و ڕێبواران ڕووت دەکەنەوە. بەم دووابیانە هەواڵ هات کە لە ١٧ ڕەمەزان، موعین هومایونی بەختیاری، توانیویەتی لەسەواد کوە شکست بەسوپای شا بێنێت و شا و شوعاع ئەلسەڵتەنە و ئەمیر بەهادور هەڵاتون. بەنهێنی و بەشێوەی ڕەمز، ئەم هەواڵەم بۆ سالارئەلدەولە نارد کەچیتر گۆڕەپان گۆڕەپانی ئێوەیە. ئەگەر پێشڕەوی بکەن، دەبنە خاوەنی تاج و تەخت بەلام لەدڵەوە دەترسام کەئێستا یەپرەم و بەختیارییەکان چیتر مەترسی شا و شوعاع ئەلسەڵتەنەیان لەسەر نەماوە و ئەگەر هێرش بکەنە سەر سالارئەلدەولە، سوپا تالانچییەکەی سالارئەدولە بەرگری ناکات و گۆڕەپانی جەنگ بەجێدێڵێت. بەڕێکەوت ڕۆژێك من و شازادە عێزەد ئەلسولتان نانی نیمەڕۆمان خوارد و حەواینەوە، لەناکاو بینیمان شازادە ئەبولفەتح میرزای بروسکەچی، ڕەنگ پەڕاو و پەرێشان هاتە ژوور، بێ پێشەکی وتی: سوپا شکستی خوارد و سالار ئەلدەولە هەڵاتووە و سوپاییەکان بلاوەیان لێکردووە. عێزەد ئەلسولتان لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، دەمی وشك و خوێن لەجەستەیدا نەما، پاڵی بەدیوارەکەوەدا و وتی: ئای ئیمام، بینیت چ قوڕێکت کرد بەسەرما، ئێستا بۆ کوێ بڕۆم و چی بکەم؟.

ئاگام لەعێزەد ئەلسولتان نەبوو، ویستم بروسکەچی هەموو شتێکم بەتەواوی بۆ باس بکات. وتی: ڕۆژی ٣ شەوال، سەردار بەهادور و سەردار موحتەشەم و سەرداری جەنگ و یەپرەمی ئەرمەنی لەگەڵ دوو هەزار بەختیاری و خۆبەخش، لەباخی شا و ساوە (نێوان نوبەران و قوم) ڕووبەڕووی سوپای شازادە دەبێتەوە، سەرەتا بەختیارییەکان شکست دەخۆن، دواتر یەپرەم دەگات و دوای جەنگێکی قورس و سەخت، سوپای شازادە شکستی خواردووە. خودی شازادە و شازادە ئیحتیشام ئەلدەولەی بروجێردی بەرەو هەمەدان هەڵاتوون. عەلی ڕەزای خانی گەڕووسی و جەعفەر سوڵتانی هەورامی، کەشوێنەکەیان بەرز بووە، فریای سوپاکە دەکەون و ڕێگەیان نەداوە سوپای بەختیارەکان شوێنپێی سوپا تێکشکاوەکەی شازادە هەڵبگرێت وەگەرنە خودی سالار ئەلدەویش ئەسیر و تەواوی سوپاکە یا دەکوژران یا ئەسیر دەکران. وتم: داوود خان و نەزەرخان و کوردستانییەکان چییان بەسەر هاتووە؟ وتی:

ئەوانی دیکە نازانم، کوردستانییەکان لەگەڵ شازادە بەرەو هەمەدان هەڵاتوون. عەلی ڕەزا خان لەگەڵ تۆپ و سوپاکەی بەرەو کوردستان ڕۆشتووە. شازادە عێزەد ئەلسوڵتان دەیویست نیگەرانی خۆی نیشان بدات. وتم: خەڵکی کرماشان بوێر و بێ شعورن. کاتێك بزانن تا ئەم ڕادەیە لاواز و ترساون، دژی ئێمە ئالآی شۆرش بەرز دەکەنەوە و دەبنە ئەرك بۆمان. کەمێك ئارام ببنەوە. خۆم شەو دەڕۆم و عەبدولکەریم بەگی شەهبەندەری عوسمانی دەبینم. ئەگەر ئەمانی پێدان، خۆمان دەگەیێنیە شەهبەندەرخانە تا لەسالارئەلدەولە ئاگادار دەبینەوە. ئەگەر نە، لێرەوە ڕاستەوخۆ دەڕۆینە کوردستان. وتی: ئەی بۆ ئێستا ناڕۆیت؟ وتم: بەو ئەندازەی ئێوە دەترسن، من ناترسم. پەلە مەکە. شەو باشترە. بەهەر بەدبەختییەك بوو، تا چەند ڕۆژێکی دیکە شازادە عێزەد ئەلسوڵتانمان لەکرماشان هێشتەوە و لەو ماوەدا چاوم بەشەهبەندەر کەوت و ئەمانم لێوەرگرت. هەواڵ گەیشت کەسالار ئەلدەولە لەهەمەدانەوە بەرەو ماڵی والی ڕۆشتووە. لەم چەند ڕۆژەیش هەرچی بروسکە لەتاران و سەردار زەفەرەوە دەگەیشتە هەمەدان بۆ شازادە موحتەشیم ئەلدەولە بوو کەفەرمانی گرتن و قۆڵبەست کردنی دەدا. تا ڕۆژێك نزیك نیوەڕۆ هەواڵمان پێگەیشت کەداوود گەشتۆتە ناو بێستون و دانیشتووانی شار سوێندیان خواردووە، ڕێگەی نەدەن بێتە ناو شارەکە. دەنگی تەقە لەدانیشتووانی شار بەرز بوویەوە. بینیم شازادە چیتر توانای خۆڕاگری نەماوە و دەیەوێت پیادە بەرەو شەهبەندەرخانە هەڵبێت. ناچار هاتمەدەر و فەرمانم بەسوارەکاندا ئەسپ و کەرەستەکان ئامادە و بۆ ڕۆشتن ئامادە بن تا شازادە ئامادە دەبێت. ئەم فەرمانەم دەرکرد و گەڕامەوە بۆ لای شازدە و کەم کەم دەنگی تەقە زیاتر دەبوو. کاتێك لەگەڵ شازادە هاتینەدەر و ویستمان سوار ئەسپ ببین، بینیمان لەسەد سوارەکەی شازادە، دە سوار و لەشەست سوارەکەی من، چوار ماونەتەوە و ئەوانی دیکە هەڵاتوون. لەگەڵ ئەم چواردە کەسە بەرەو شەهبەندەرخانە کە لەدەرەوەی شار و لەنزیك قەڵای حاجی کەریم بوو، بەڕێکەوتین. تا گەیشتن بەشەهبەندەرخانە، بەخێرایی ئەسپمان غاردەدا. دەنگی تەقە لەهەموو ناوچەکانەوە بەرز بوویەوە. دەمەو ئێواریێ بینیمان دەستەیەك سەیید و بازرگان هاتنە ناو شەهبەندەرخانە و فەرش و ڕاخەریان ڕاخست و سەماوەریان هەڵکرد. گومانمان دەکرد ئەوانیش هاودەردی ئێمەن و هاوشێوەی ئێمە هاتوون لەم شوێنەدا سەنگەر بگرن. دواتر لەفەڕاش باشی شەهبەندەرم پرسی: ئەمانە بۆ چی هاتوون؟ وتی: هاتوون بڵێن

شازادە عێزەد ئەلسوڵتان نزیکەی سی هەزار تمەن پارەی لێوەرگرتووین. بەهەمان شێوە کە ئەو لێرە پەنای گرتووە، ئێمەیش لێرە دەمێنینەوە و تا پارەکەمان نەداتەوە، ڕێگە نادەین لەم شوێنە بڕواتەدەر. پرسیم: مەگەر شەهبەندەر لەم ڕووداوە ئاگادارە؟ وتی: بۆ؟ وتم: کەواتە ئەم بەپێچەوانەی ئەو پەیمانەیە کە بەئێمەی داوە. وتی: من ئەمە نازانم، ئەوەی کێشەی خۆتانە لەگەڵ ئەو. پرسیم: شەهبەندەر لەکوێیە؟ وتی: لەژوورەکەی خۆی سەرقاڵی نووسینە. ڕاستەوخۆ ڕۆشتمە ژوورەکەی و بەسەرسوڕمانەوە لەچۆنیەتی ئەو کارەی پرسیارم کرد. وتی: بەڵێنم پێداون ئێوە لەدەستدرێژی سوپای دەوڵەت و بەختیارییەکان بپارێزم. چیتر بەڵێنم نەداوە، قەرز و داوای خەڵك لەشازادە بدەمەوە. ئەمانە بەپێی ئەو بەڵگانەی بەمنیانداوە، شازادە سی هەزار تمەن پارەی لێوەرگرتوون، خۆیشم بۆ بەشێکی زۆری ئەو پارەیە ئاگادارم. دەبێت پارەکە بەتەواوی بداتەوە و ئەم بابەتە قسەی لەسەر نییە. بینیم هیچ ڕێگە چارەیەکمان نییە. سەرم داخست و نوقمی دەریای بیرکردنەوە بووم، دواتر سەرم بەرز کردەوە و وتم: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت، ڕاست بێت، شازادە ئێستا پارەی نەقدی پێ نییە، لەکوێ ئەو بڕە پارە بێنێت؟ وتی: لەعێراق ملك و ماڵی هەیە. بەڵگەم پێبدات، بەسەلامەتی ئەو دەبەمە عێراق و لەوێ قەرزی بازرگانەکان بداتەوە. وتم: ئەمە هەمووی خەیاڵە، هیچ ئەنجامێکی لێ بەدەست نایەت. چارەیەك بدۆزەرەوە تا دڵم شەق نەبات. ڕێگەم بدە شازادە ڕازی بکەم بڕە پارەیەك بەئێوە بدات و بەهەر شێوەیەك بووە لەدەست بازرگانەکان ڕزگاری بکەن تا شەرافەتی شەهبەندەرخانە و بەڵێنی شەهبەندەری خۆتان وەك خۆی بمێنێتەوە. بەپێکەنینەوە وتی: تۆ دەڵێی پارەی نەقدی پێ نییە، ئیتر باس کردن لەو بابەتە چ ئەنجامێکی دەبێت. وتم: نهێنییەك لای ئێوە باس دەکەم. دەزانم شازادە دوانزە هەزار تمەنی لای کەسێك بەئەمانەت داناوە، ڕازی دەکەم پێنج هەزار تمەنی بەئێوە بدات و حەوت هەزار تمەنیشی بۆ خەرجییەکانی خۆی تا دەگاتە شوێنێکی ئەمن. وتی: نە، بازرگانەکان بەمە ڕازی نابن. حەوت هەزار تمەن بۆ شازادە زۆرە، فەرمان بدە دە هەزار تمەنی بەشێوەیەکی نهێنی بۆ من بێنن، دەبێت بەشی بازرگانەکانی لێ بدەم تا بتوانم ئەوان دوور بخەمەوە. شازادەیش دوو هەزار تمەنی بەسە و دەتوانێت بەو پارەیە بۆ هەر شوێنێك دەخوازێت، بڕوات. وتم: ئەگەر بەمشێوەیە کۆتایی بەکێشەکە بێنم، چی بەمن دەدەیت؟ وتی: پێنسەد تمەن بەخۆت دەدەم. وتم: کەواتە جارێك بازرگانەکان دڵخۆش مەکە تا لەئەنجامی

کارەکە ئاگادارت دەکەمەوە. هاتم و بەنهێنی و بەڕەمز و ڕاز هەموو شتێکم بۆ شازادە باسکرد. بینیم دووبارە ورەی خۆی لەدەستداوە. وتم: ئێستا کاتی ئەوە نییە، دەبێت ئەمشەو بەئاسوودەیی بخەون تا بزانین بەیانی خواوەند چی بۆ نووسیوین. لەڕاستیدا، خۆیشم لەچارەسەر کردنی ئەم کێشەیە سەرگەردان بووم. لەبەردەم پەنجێرەکەدا دانیشتم و زەق زەق سەیری بازرگانەکانم دەکرد، بەلام بیرم لەڕێگە چارە دەکردەوە. پیاوەکان کەهەستیان بەڕووداوەکە کردبوو، یەکیەك دەهاتن و لەگفتوگۆی بازرگانەکان ئاگاداریان دەکردمەوە. لەبەر ئەوەی هیچ وەلامێکم پێنەبوو، دەموت: بزانین خوا چی دەوێت.

بەیانی دەمەو ئێواری، فەراشباشی شەهبەندەر کە بۆ شار ڕۆشتبوو، گەڕایەوە، بەئیشارە بانگم کرد. هەواڵی شارەکەم لێپرسی، وتی: هەواڵەکان ئەوەیە کەخۆتان لێی بەئاگان، داوود هاتە ناو شارەکە. وتم: خۆی تەنیا یا لەگەڵ سوپا؟ وتی: هەزار سوارێکی لەگەڵدایە. سوارەکانی دیکەی هەلاتوون، نەیوێراوە بڕواتە ناو شارەکە، ڕاستەوخۆ ڕۆشتۆتە قەلای حاجی کەریم. وتم: لەکوردستانییەکان کەس نەگەڕاوەتەوە؟ وتی: هیچ دەنگێك نییە، دەڵێن هەموویان هەلاتوون. وتم: بڕۆ بزانە شەهبەندەر کاتی هەیە، بڵێ فلانەکەس دەخوازێت چاوی بەتۆ بکەوێت. ڕۆشت و گەڕایەوە و وتی: فەرموون. چاوم بەشەهبەندەر کەوت، پێم وت: لەیانزە هەزار تمەن لەگەڵ شازادە ڕێکەوتم، دە هەزار بۆ بازرگانەکان، هەزاری بۆ خۆت، بەلام لەڕاستیدا دە هەزاری بۆ تۆ، هەزاری بۆ من. بەخێرایی شەهبەندەر وەك گوڵ گەشایەوە و وتی: زۆر باشە، پارەکە ئامادەیە؟ وتم: نا فەرمان بدە یەکێك لەفەڕاشەکان کاتژمێرێکی دیکە لەگەڵ من بێت تا بڕۆم پارەکە بێنم. وتی: بەسەر چاو. بەخێرایی یەکێك لەپێشخزمەتەکانی شەهبەندەرخانە کەفلانە و فیسارە نیشانی بوو، بانگکرد و پێی وت: کاتژمێرێکی دیکە فلانەکەس بۆ هەر شوێنێك دەڕوات، لەگەڵی بڕۆ و ڕێگە مەدە کەس بێ ڕێزی بەرامبەر بنوێنێت. بەچرپە پێم وت: ئەگەر ئەو کەسە ڕازی نەبوو، پارەکە بگەڕێنێتەوە، فەرمانی پێبدە، بیهێنێتە ئێرە. وتی: هەر فەرمانێکی پێدایت ئەنجامی بدە و هەرکەسی ویست، بیهێنە ئێرە. دوای دوو کاتژمێر لەشەو، بێ ئەوەی شازادە عێزەد ئەلسوڵتان ئاگادار بکەمەوە، پێشخزمەتی شەهبەندەرم هەڵگرت و بەرەو قەلای حاجی کەریم بەڕێکەوتم. لەوێ چاوم بەداوود خان کەوت و بابەتەکەم بۆ باس کرد. وتی: ئێستا ڕێگە چارە چییە؟ وتم: چارە ئەوەیە سبەی دەبێت هەموو سوارەکانی خۆت بنێریت تا لەبەردەم شەهبەندەرخانە ڕیز

ببەستن. عەبدوڵڵە خانی فەڕاش باشی لەگەڵ دە چەکدار بێنە ناو حەوشەکە و ئێمە پێش خۆیان بدەن. ئەگەر بازرگانەکان یا کەسانی ناو شەهبەندەرخانە ڕێگەیان گرت، سەرەتا شەهبەندەر دەگرین و دارکاری دەکەین تا کەسانیتر چاوترسێن بکرێن. ئەگەر کەسیش ڕێگەی نەگرت، ئێمە درێژە بەڕێگەی خۆمان دەدەین و دێینە ئێرە. بەمشێوەیە بەڵێنم لێوەرگرت و دوای چوار کاتژمێر لەشەو گەڕامەوە. کاتێک گەیشتمە بەردەم دەروازەی شەهبەندەرخانە، بۆ ئەوەی شەهبەندەر لەڕووداوەکان و ئەوەی بۆ کویێ چووم، ئاگادار نەبێـەوە، بەپێشخزمەتم وت: ئێستا زەحمەتێکی دیکەم بۆتان هەیە و دەبێت هەر ئێستا بڕۆی بۆ شار و بروسکەچی ئاگادار بکەیتەوە، بەیانی بۆ هیچ شوێنێك نەڕوات و بێتە ئێرە بۆ ئەوەی چاوی بەمن و شەهبەندەر بکەوێت. لەبەر ئەوەی شەو درەنگە، چیتر پێویست ناکات بۆ ئێرە بگەڕێیتەوە، شەو لەماڵەکەی خۆت بخەوە و بەیانی بڕۆ و شازادەی بروسکەچی لەگەڵ خۆت هەڵگرە و بیهێنە بۆ ئێرە. شازادەم ڕازی کردووە بەیانی بۆ سپاسی خزمەتەکانت، بیست تمەنت پێ بدات. پێشخزمەت لەبەر ئەوەی شەهبەندەر فەرمانی پێدابوو، فەرمانەکانی من بێ کەموکوڕی ئەنجام بدات و هەرکەس بەپێویستم زانی، لەگەڵ خۆی بیهێنێت و کاتێك دڵنیابوو، بیست تمەن پاداشتی دەستدەکەوێت، بەخێرایی بەڕێکەوت. ڕۆشتمە ناو حەوشی شەهبەندەرخانە، بینیم ژمارەیەك لەبازرگانەکان خەوتوون و ژمارەیەکیان سەرقاڵی گفتوگۆ کردنن. بەهێواشی و ڕاستەوخۆ بەپلیکانەکان سەرکەوتم، ڕۆشتمە سەر و چوومە ژووری شازادە. بینیم بەچاوی پڕفرمێسك و پەرێشان دانیشتووە و گومانی کردووە من هەڵاتووم و بەتەنیا جێم هێشتووە. کاتێك چاوی بەمن کەوت، هەموو خەم و ناڕەحەتییەکانی لەبیر کرد و بینینی منی وەك ژیانێکی تازە بۆ خۆی لەقەڵەمدا. وتی: بۆ کوێ ڕۆشتبوون؟ وتم: ڕۆشتم خۆم و خۆت لەو سیاچاڵەی ناویان ناوە شەهبەندەرخانە، ڕزگار بکەم. هەموو بەسەرهاتەکەم و بینینی داوودخانم بۆ گێڕایەوە. ئەو شەوە بەترس و دڵەراوکێ خەوتین. بەیانی، پێش ئەوەی شەهبەندەر لەخەو هەستێت، دەنگێکی بەرز لەحەوشێکە بەرز بوویەوە: پێشنوێژی کوردستان و شازادە لەکام ژوورەدان؟ بەخێرایی هەستام و لەشووشەی پەنجەرەکەوە سەیرم کرد. بینیم عەبدوڵڵەخان، فەڕاشباشی داوودخانە، لەگەڵ چەند کەسێکی چەکدار و هەموویان سیلاح بەدەست لەپلیکانەکان سەرکەوتون. بازرگانەکان و پیاوەکانی خۆمان گومانیان کرد هاتوون ئێمە ببەن و لەتۆڵەی

کوژراوەکانی خۆیان تیربارانمان بکەن. دوای ئەوەی عەبدوڵڵەخان هاتەسەر، وتی: سوار و پیادە لەبەردەم دەروازە تا قەڵای حاجی کەریم ریزیان بەستووە و سەردار چاوەڕوانی ئێوەیە. شازادە لەخۆشحاڵیدا لەپێستی خۆی جێگەی نەدەبوویەوە. بەخێرایی هاتینە خوار و بەناو بازرگانەکاندا ڕۆشتین. کاتێك گەشتینە بەردەم دەروازەکە، فەڕاشباشی شەهبەندەری گەیشت. پرسی: بۆ کوێ تەشریف دەبەن؟ وتم: لەدەست شەهبەندەری بێ شەرەفی ئێوە هەڵدێین چوونکە شەرافەتی ئیسلامییەت و ئابڕووی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر دەستی ئەم بێ شەرەفە بەفیڕۆ چوو. ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ کوردستان، کتێبێکی گەورە سەبارەت بەبێ شەرەفی ئەو دەنوسم و لەهەموو گۆڤارەکانی دەوڵەتانی دراوسێ بڵاوی دەکەمەوە. فەڕاشباشی سەریشۆڕ کرد. لەدەروازەکە ڕۆشتینەدەر و چووینە ناو ریزی سوپای کەلهوڕ. بەو پەڕی ڕێزەوە ڕۆشتینە ناو قەڵاکە و داوودخان و کوڕەکانی بەو پەڕی ڕێز و ئەدەب، تا بەردەم دەروازەی قەڵاکە بۆ پێشوازی کردنمان هاتن. کاتێك ڕۆشتینە ژوور، عێزەدنەسلوڵتان ڕاکشا و جارێکی دیکە شایەتومانی هێنایە سەرزمان. دوو ڕۆژ لەقەڵای حاجی کەریم ماینەوە. ڕۆژی سێیەم، ڕێنیشاندەرمان لەداوودخان وەرگرت و بەرەو کاروانسەرای ماهیدەشت بەڕێکەوتین. شەوێکمان لەوێ بەبیرکردنەوەی ڕووداوەکانی رابردوو بەسەر برد و بەیانی لەکاتی جیابوونەوە، دوای ماچوموچ و ڕێوڕەسمی ماڵئاوایی کردن، شازادە بەرەو ئیسلامبوڵ و من بەرەو کوردستان بەڕێکەوتین. نیوەڕمان لەماڵی شێرخانی سەنجابی سەمسام ئەلمەمالیك خوارد و بۆ نانی ئێواریێ، گەشتینە ڕەوانسەر. حسین خان سەرداری گشتی و عەباس خان سەرداری ڕەشید، چەند ڕۆژ پێش، گەشتبوونە ڕەوانسەر. حسەین خان دوای گەڕانەوە لەجەنگ، دوای چەند ڕۆژێك خوێن هەڵدێنێتەوە و دەمرێت. کەسەکانی دەیانوت عەباس خان ژەهرخواردی کردووە لەتۆڵەی حەمیدەخانم، کچی شەرەف ئەلمولك کە لەڕاستیدا دەزگیرانی عەباس خان بووە و حسەین خان بەپشت بەستن بەهێز، بەسەریدا زاڵبووە و ئەوی لەخۆی مارە کردووە.

عەباس خان سەرداری ڕەشید، بۆ ماوەی شەش ڕۆژ ئێمەی لەگەرمەخانی هێشتەوە و ڕێگەی نەدا برۆین. دوای شەش ڕۆژ بەڕێکەوتین و کاتێك گەشتینە گەردەنەی خەراجییان، مەجید، پێشەنگی من کوڕی حاجی محەممەد کەریم ئادەمی وەکیل ئەلمولك، کە لەپێشەوە دەڕۆشت، لەبەرچاو ون بوو. کاتێك دەگاتە شیوێك، لەناکاو دە تفەنگچی کەبۆسەیان

نابوویـەوە، ئەسـپ و تفەنگەکـەی دەگـرن. ئێمـەیش هـەمووان لەبەرزاییەکـەوە سـەرەوخوار بووینـەوە و ویستمان بـەرەو شیوەکە بڕۆین. هـەمان دەکـەس هێرشیان کـردە سـەر ئێمـە. جڵەوی ئەسپەکەم سووڕاند و ویستم سەنگەر بگرم. بینیم پێنج کـەس لـەدواوە هێرشیان کرد. بەناچاری لەئەسپەکەم دابەزیم و پەنام بۆ چیاکە برد. لای چەپ، بەردێکی گەورەم بینی و لەپشت بەردەکە سەنگەرم گرت. سێ کەسی دیکە کەدوای من لەئەسپەکانیان دابەزین، هەرکام لەپشت بەردێك سەنگەریان گرت. تەنیا دەمانچەیەکی دەتیرم پێبوو. بەتەقاندنی دە گوللـە، تفەنگـچییەکان تۆقـان و بڵاوەیـان لێکـرد و کەوتنـە پاڕانـەوە. ئەسـپ و تفەنگەکـەی مەجیدیان بەجێهێشت و هاواریان دەکرد: ڕێگەمان بدەن بڕۆین، کارمان بەکاری ئێوە نییە. شێخ وەهاب ئێمەی بۆ ئەم کارە ناچار کرد. پرسیم: ئێوە چ کارەن. وتی: ئێمە پیاوەکانی شێخ وەهاب کوڕە مامی سەیید ئەلدەولە، شێخ قەیداری دەوڵەت ئابادین. لەدوێنێوە ئێمەیان ناردۆتە ئەم گەردەنە و پێیان وتین ئێوە لێرە و سێلاحتان پێیە تا ڕووتتان بکەینەوە و کەلوپەلەکانتان بۆ ئەو ببەین و ئێستا بەمشێوەیە گرفتار بووین. کاتێك وتیان کارمان پێیان نەبێت، ڕێگەمان بۆ کردنەوە تا لەنیشانەی تفەنگەکانی ئێمە دوورکەوتنەوە. من پیادە تا سەرەوەی گەردەکەنە هاتم، پیاوەکانیش ئەسپەکانیان هێنا. سوار بووین و ڕوومان کردە گونـدی لـون. شـەو لـەوێ مانـەوە و بەسـەرهاتەکەمان بـۆ سـەییدەکانی لـون گێڕایـەوە. سـەییدەکان وتیـان: لـەدوێنێ ئێوارێـوە ئـەم تفەنگـچییانە لەگەردەکەنەن و پیاوەکانی ئێمە نەیانوێرا لەوێوە هاتوچۆ بکەن. دوای ئەم ڕووداوە، لەو ناوچەیە بڵاو بوویەوە کە فلانەکەس بەدەمانـچەیەك، دە سواری ڕاونـاوە و شکستی پێهێنـاون. زیـاتر تفەنگـچییەکان خۆیـان ئـەم ڕووداوەیان لەناو خەڵکدا بڵاو کردەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە گەشتینە گوندی تـای، چەند ڕۆژێك لای ئیفتیخار سوڵتان ماینەوە و دواتر ڕۆژی ٦ زیقەعدەی ١٣٢٩، گەشتینە ناو شار. لەبەر ئـەوەی دراوسـێی حـاجی شـێخ محەممـەد بـاقر بـووین و ئـەوانیش لایـەنگری سـالارئەلدەولە بوون، بۆ پاراستن و پارێزگاری کردن لەخۆمان، گەڕەکی قەتارچییەکانمان لەشار جیاکردەوە و سی کەس لەبوێرەکانی شارمان هەڵبژارد کەخۆم باوەڕم پێیان بوو. ئەم سی کەسە شەو و ڕۆژ پارێزگارییان لەگەڕەکەکە دەکرد و سەرۆکەکەیان نائیب فەتحوللە خان بوو. بەنیشان و ڕەمزی شەو ڕازی نەدەبوون و هەر شەوێك بۆ گەڕەکی قەتارچییەکان، ڕەمزێکی شـەوانەی تایبەتمان دیاریدەکرد چوونکە حکومەت لەشارەکەدا نەبوو.

دوای چەند ڕۆژێك تەتەرێك لەکرماشانەوە هات و کاغەزێکی لەگەڵ خۆی هێنا. مۆری پاکەتی سالارئەلدەولە، مارکی پشت پاکەتەکە شێر و خورشید و دواتر ئەم ڕستەی خوارەوە لەژێرەوە نووسرابوو: سالارئەلدەولە شاهەنشای هەموو سەرزەمینەکانی خوزستان و لورستان و عێراقی عەجەم. پاکەتەکەم کردەوە، بینیم خەتی شازادە خۆیەتی و هەموو شتێکی ڕوونکردبوویەوە و نووسیبووی کاتێك لەباخی شا هەواڵی پاشەکشێی شامان پێگەیشت، ئێمەیش بەپێی بەرژەوەندی سیاسی، پاشەکشێمان کرد و بڕیارماندا ئەم زستانە لەکرماشان بمێنینەوە و سەرقاڵی بەڕێوەبردنی خوزستان و لورستان و عێراق بین تا بەخواستی خواوەند لەوەرزی بەهار، دووبارە محەممەد عەلی شا لەباکور و ئێمە لەباشورەوە هێرش بکەینە سەر تاران و کۆتایی بەم کێشەیە بێنین. لەئێستادا من لێرە تەنیام، بەخێرایی بەرێکەون و خۆتان بگەیێنە ئێرە. هەرچەندە دەتوانن سوار کۆبکەنەوە و لەگەڵ خۆتان بیهێنن.

لەبەر ئەوەی پێشتر لەگەڵ شازادە گاڵتەمان دەکرد، لەوەڵامدا بەگاڵتەوە ئەم نامەی خوارەوەم بۆ نووسی: پاکەتی سالارئەلدەولەی شاهەنشاهم بینی، مۆری سەر پاکەتەکە و ناوەڕۆك و دەستنووسەکەم هەڵسەنگاند، سەراسەر وشتر مانگا پڵەنگ بوو. مۆری نازناوی سالارئەلدەولە، لەگەڵ وشەی شاهەنشاهی جیاوازە، بەکار بردنی شێر و خورشید کەهێمای دەوڵەتی ئێرانە، لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی بەشێك لەسەرزەمینی ئێران، یەکناگرێتەوە. بانگێشتکردنی منیش کە لەدانیشتووانی کوردستانم و کوردستان لەناو مۆر و هێماکەدا نییە، بێهۆیە. لەئەنجامدا پێتان دەڵێم لەزووترین کات ئەم هێما و مۆرە بگۆڕن چوونکە دەبێتە هۆکاری پێکەنین و ڕێگەمەدەن بڵاو ببێتەوە. سەبارەت بەگەڕانەوەی خۆیشم بۆ کرماشان، لەبەر ئەوەی تازە گەڕاومەتەوە و هێشتا هیلاکی و شەکەتی ڕێگە لەجەستەمدایە، داوا دەکەم مۆڵەت بدەن ئەم زستانە لەکوردستان بەسەر بەرم. بەخواستی خوا لەوەرزی بەهار، محەممەد عەلی شا لەباکور و لەگەڵ هێزی تورکمان و بەڕێزیشتان لەکرماشان لەگەڵ هێزی کەلهوڕ و لورستان و منیش لەکوردستانەوە لەگەڵ هێزی ڕەشت، بەرەو تاران بەڕێدەکەوم. هەروەها هیوادارم فەرمان بەکابینەی شاهەنشاهی بدەن هەموو حەفتەیەك من لەبارودۆخی شاهەنشاهی بەڕێز و کاروبارەکان ئاگادار بکەنەوە..

زۆری نەخایاند هەواڵ گەیشت کەشەوی ١٩ سەفەری ١٣٣٠، یار محەممەد خانی

کرمانــشانی لەگــەڵ دووســەد و پــەنجا تفەنگــچی، هێرشــی کردۆتــە ســەر کرماشــان و سالارئەلدەولە، سەردار ڕەشید و داوود خان هەڵاتوون. سلێمان خانی شەرەف ئەلمولك لەگەڵ جەواد خانی برازای کەماڵیان لەناو شارەکەدا بووە، حاجی نەعلەبند (ناڵبەند) و چەند کەسێك دەچنە سەریان و لەماڵی مەحمود ئاغا، برای مەهدی ئاغا، هەردووکیان دەکوژن و ماڵەکەیان تالان دەکەن. چەند ڕۆژی دیکە هەواڵ گەیشت کەسەردار ڕەشید دوای بیستنی هەواڵی کوژرانی شەرەف ئەلمولك، دەڕواتە هارون ئاباد و لەوێ چاوی بەشازادە دەکەوێت و لێی دەپارێتەوە لەگەڵ داوود خان بڕۆنە کاروانسەرای ماهیدەشت و لەوێ خێوەت هەڵبدەن. ئەگەر توانی کرماشان لە یار محەممەد خان پاکبکاتەوە، شازادە مۆڵەتی پێبدات ئەعزەم ئەلدەولە لەتۆڵەی شەرەف ئەلمولك بکوژێت، ئەگەر نەیتوانی، ئەوکات شازادە بۆ هەر شوێنێك دەخوازێت، دەتوانێت بڕوات. دوای وەرگرتنی ئەم بەڵێن و پەیمانە، شازادە و داوود دەڕۆنە کاروانسەرای ماهیدەشت و سەردار ڕەشید لەگەڵ هێزەکانی ڕەوانسەر و جوانڕۆ و کەمانگەر و هتد.. هێرش دەکەنە سەر کرماشان و شکست بە یارمحەممەد خان دەهێنن و دەست بەسەر کرماشاندا دەگرن و بەخێرایی شازادە ئاگادار دەکاتەوە لەگەڵ داوود خان بۆ کرماشان بگەڕێتەوە. ئەعزەم ئەلدەولە و فەخیم ئەلسەڵتەنەی کوڕی، بۆ کونی شایانەی خۆیان هەڵدێن. سەردار ڕەشید لەگەڵ ژمارەیەکی کەم دەڕواتە ئەوێ و هەردووکیان دەگرێت و دەیانگەڕێنێتەوە بۆ ناو شارەکە. دواتر هەردووکیان دەکوژێت و ماڵەکەیان تالان دەکات. ئەم کردەوە بوێرانە بۆ شازادەی سەلماند کەعەشیرەکانی کوردستان و کرمانشا نایانەوێت دڵسۆزانە چالاکی بۆ بکەن و ئەوی کردۆتە بووکەڵەی دەستی خۆیان و هەر ڕۆژە و بەمەبەستی تالان کردن، بۆ ناوچەیەکی دەبەن. وەگەرنە شکستدانی یەپرەم و بەختیارییەکان لەباغی شا، لەگەڵ ئەو سوپا گەورەیە، دژوارتر لەڕاونانی یار محەممەد لەکرماشان نەبوو.

لە ٨ ڕەبیع الاوەلی ١٣٣٠، سەردار موجەللەل، پێشخزمەتی محەممەد عەلی شا لەگەڵ دە سوار هات و ڕاستەوخۆ ڕۆشتە بروسکە خانە و لەگەڵ سالارئەلدەولە گفتوگۆی دەستپێکرد و دواتر لەبروسکەخانە هاتەدەر و بەبیانوی ئەوەی لەلایەن شاوە فەرمانی بۆ سالارئەلدەولە پێیە، ڕاستەوخۆ ڕێگەی کرماشانی گرتەبەر. دوای چەند ڕۆژ لەگەڵ سەردار ڕەشید و قاسم خانی سەنجابی و سەییدئەلدەولە گەڕایەوە. شێخ عەلائەلدین لەگەڵ دەستەیەك سۆفی و مەریوانی هات. دوای دوو سێ ڕۆژ، سەردار موجەلەل، مەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلامی

قۆلبەست کرد. کاتێك ئەوی ئازاد کرد، دوای چەند ڕۆژ، وەکیل ئەلمولك و کارگوزاری میرزا عەلی خانی بابان و شوجاعی لەشکر و حاجی ئەرفەع ئەلمولك و دەستەیەکی دیکەی قۆلبەست کرد. لەهەرکام بڕە پارەیەکی وەرگرت و دواتر ئازادی کردن و سوپایەکی پێکهاتوو لەسەنجابی و شێخ ئیسماعیلی و چاردۆلی پێکهێنا و ڕێگەی هەمەدانی گرتەبەر.

ڕۆژی ٢٥ رەبیع الاوەل کەکۆتاییەکانی زستان بوو، دووبارە پاکەتێکی دیکە لەلایەن شازادەوە بەمۆری فەرمانڕەوای سەرزەمینەکانی کرماشان و خوزستان و عێراقی عەجەم گەیشت. جەختی کردبوویەوە من ڕێگەی کرماشان بگرمەبەر. بۆ سەردار موجەلەلی نووسیبوو کەفلانەکەس بۆ ڕۆشتن هان بدەن. ڕۆژی ٨ رەبیع الثانی ١٣٣٠، من بەناچاری لەگەڵ سی سوار بەڕێکەوتم. دوو ڕۆژ لەڕەمشت مامەوە و لەوێ پەنجا سوارم هەڵبژارد. ڕۆژی سێیەم گەیشتمە کامیاران. لەوێ پەنجا سواری گەشکی بەسەرۆکایەتی زەرغام لەشکر سەعید بەگ و عەزیز بەگی فەتح ئەلسوڵتان کوڕەکانی فەرەج الله خان گەشکی پەیوەستی ئێمە بوون. لەسورخە لیزەی کرماشان، شازادەم لەهاتنی خۆم ئاگادار کردەوە. کاتێك گەیشتینە حاجی ئاباد، لەوێ بەڕێزان نەسیر دیوان و حیشمەت ئەلمولکی کوردستانی و دووسەد سوار گەیشتن. کاتێك لەپردی حاجی ئاباد نزیك بووینەوە، سوارێك بەغاردان هات و پاکەتێکی شازادەی هێنا. نووسیبووی: کەمێك لەسەر پردەکە بمێننەوە تا پێشوازیکەران دەگەن. چوونکە فەرمانم بەسوپاییەکان و پیاوماقووڵانی کرماشان داوە، بۆ پێشوازی کردن بێن. تا پاکەتەکەم خوێندەوە، پێشەنگی سوارەکان دەرکەوت. بینیم قەرەباڵغی وەك لافاو دێت و پێش یەکتر دەکەون. بەکورتی لەناو پێشوازیکردنی پێشوازیکەران ڕۆشتینە ناو کرماشان و گەشتینە خزمەتی شازادە. دوای ڕێوڕەسمی یەکتربینین، بۆ ماڵێك لەگەڕەکی فەیز ئاباد لەنزیك فولادی ڕۆشتین کەتایبەت بەحەوانەوەی ئێمە ئامادەیان کردبوو. دووبارە بەپێی فەرمانی شازادە ڕۆشتینە خزمەتی و فەرمووی: من پێویستم بەئێوە بوو بۆ پاراستنی کرماشان تا گەڕانەوەی من لەماڵی والی، ڕێگە نەدەن ئاژاوە لەشارەکەدا دروست ببێت. فەرمانم بەئیلخانی داوە لەخزمەت فەرمانەکانی تۆدابێت بۆ ئەوەی شەو و ڕۆژ ئاگاتان لەبارودۆخەکە بێت. دوای دوو ڕۆژ شازادە بەرەو ماڵی والی بەڕێکەوت و ئێمە لەکرماشان ماینەوە.

لەناوەڕاستی جومادی الاوەلی ١٣٣٠، شازادە گەڕایەوە. دوای دوو سێ ڕۆژ، شێخ

عەلائەلدین و مەلا عەبدوللەی موفتی لەکوردستانەوە هاتن. شەوی ١٨ جومادی الاوەل شازادە وتی: بەپێی هەواڵی بروسکەخانە، فەرمانفەرما و دەستەیەك لەبەختیارییەکان گەشتوونەتە هەمەدان، ئێوە لەگەڵ ئیلخانی برۆنە سەحنە، نەکا لەناکاو هێرش بێنن تا داوود دەگات. بەشازادەم وت: مەلای دۆعانووس و پێشەنگی جەنگ کوجا مەرحەبا. ئێوە لەگەڵ سوپایەکی سی هەزار کەسی نەتانتوانی بەر بەسوپای دەوڵەتی بگرن، ئێستا من و ئیلخانی چۆن دەتوانین ڕووبەڕوویان ببینەوە. ئەگەر داوود دێت، ئەمە کاری خۆیەتی. وتی: تا داوود دەگات، دەبێت سەنگەرەکانی سەحنە لەدەستی ئێمەدا بێت و من جگە لەتۆ کەسی دیکەم لێرە نییە. یا دەبێت ئێوە برۆن یا من. لێرەدا فرمێسك لەچاوی شازادە قەتیس ما، ناچار وتم: ئێمە دەڕۆین، بەڵام ئەگەر داوود نەگات، دەگەڕێمەوە. وتی: داوود نەگات، منیش لێرە نامێنمەوە. سەرئەنجام من و ئیلخانی و فەتح الایە و سالار مۆئەیید لەگەڵ دووسەد و پەنجا سوار بەرەو سەحنە بەڕێکەوتین. دوو ڕۆژ دواتر خانلەرخانی سەگوەند، ناسراو بەخانە لەرە، لەگەڵ سەد سوار گەیشت. چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە. خواردەمەنی و ئالیك کەمی کرد. ناچار کەسمان بۆ لای ساری ئەسلان خان لەکەنگاوەر نارد. ئەو بەنهێنی پێنج بار نان و دوو بار ئارد و دوو بار جۆ و دوو سەر مەڕی بۆ ناردین. شەوی ٥ جومادی الثانی ١٣٣٠، لەخێوەتی ئیلخانی دانیشتبووین و سەرقاڵی گفتوگۆ کردن بووین کەیەکێك لەپیاوەکانی سالارمۆئەیید هات و وتی: کەسێکی کەلیایی هاتووە و دەڵێت سەردار موجەلەل شکستی خواردووە و سوپای دەوڵەتی بەرەو کرماشان دێت. کەسم نارد و ئەو کەسەیان هێنا. دەرکەوت پیاوی باقی خانە و هەڵاتووە. وردەکانی ڕووداوەکەم لێپرسی. وتی: هێرشی یەکەم کەباقی خان و ژمارەیەك لەچاردۆلییەکان و قاسم خان و بەبر ئەلمەمالیك و ژمارەیەك لەسەنجابییەکان پێشەنگی جەنگەکە بوون، شکستیان بەسوپای دەوڵەتی هێناوە و دوو تۆپیان لێ سەندوون و بۆ سەردار موجەلەلیان ناردووە کە لەدزج بووە. ئەویش تۆپەکانی بۆ کوردستان ناردووە. چەند ڕۆژ دواتر کەخودی فەرمانفەرما لەگەڵ بەختیاری و یەپرەم و سوپا و تۆپخانە بەڕێدەکەون، دووبارە باقی خان و سوارەکانی چاردۆلی گۆڕەپانی جەنگ گەرم دەکەن، بەختیارییەکانیش دەکەونە خۆ و ئاگری جەنگ بڵێسە دەستێنێت. باقی خان هاوشێوەی شێر پەلاماریان دەدات و هانی سوپاییەکانی خۆی دەدات. گوللەی تۆپ و تفەنگ وەك تەرزە دەبارێت، لەکاتێکدا باقی خان سوپای بەختیاری

ناچار بەپاشەکشێ دەکات، سوپاکەی سەردار موجەلەل شکست دەخوات و قاسم خانی سەنجابی و ژمارەیەك لەپیاوەکانی ڕێگەی هەلاّتن دەگرنەبەر. باقی خان بێ پشتیوان دەمێنێتەوە، ناچار دەڕواتە سوڵچە و لەوێ سەنگەر دەگرێت. یەپرەم و هێزەکانی دەوری سوڵچە دەگرن. تاریکی شەو، ئاگری شەڕەکە دەکوژێنێتەوە. سەرەتای دەرکەوتنی هەتاو، دووبارە تەقە دەستپێدەکاتەوە. عەبدولباقی خان تا دوا گوللە بەرگری دەکات و چەند کەسێك دەکوژێت و قەڵاّکە تەسلیم ناکات. کاتێك دەبینێت چوار گوولەی پێماوە، هەناسەیەك هەڵدەکێشێت و بێدەنگ دەبێت. یەپرەم کەدەبینێت چیتر لەقەلاّکەوە تەقە ناکرێت، لەقەلاّکە نزیك دەبێتەوە و فەرمانی چوونە ناو قەلاّکە دەردەکات. باقی خان خۆی حەشار دەدات و بەگوللەیەك یەپرەم دەکوژێت. منیش لەناو ئاودەستی قەلاّکە خۆم شاردەوە. تا ماوەیەك نەیانوێرا بێنە ناو قەلاّکە تا ئەوەی فەرمانفەرما هات و فەرمانی هاتنە ناو قەلاّکەی دەرکرد. باقی خانیان گرت و کوشتیان. منیش لەشوێنەکەی خۆم مامەوە تا تاریکی شەو داهات. بەهێواشی لەئاودەستەکە هاتمەدەر و خۆم گەیاندە ئێرە.

هەموو ئەم بەسەرهاتەم بۆ سالارئەلدەولە نووسی و جەختم کردەوە ئەگەر داوود نەگات، مانەوەی ئێمە لێرە بێ ئەنجامە. بەیانی نیمەڕۆ، وەلاّم گەیشت کەهەموو ئەم ڕووداوە درۆیە و فەرمانفەرما شکستی خواردووە و یەپرەم کوژراوە، ئێوە لەشوێنی خۆتان بمێننەوە تا داوود دەگات. خان لوڕخان وتی: ئەگەر فەرمانفەرما شکستی خواردووە و یەپرەم کوژراوە و سوپای دەوڵەتی تالاّنکراوە، ئیتر ئێمە لێرە چی دەکەین، یا دەبێت بڕۆینە پێش و یا بگەڕێینەوە بۆ کرماشان. بەرهەحاڵ من ناتوانم سوارەکانم لەم بەدبەختییەدا بهێڵمەوە. ئەگەر داوود هات، منیش دەگەڕێمەوە، ئەگەرنە، نامەوێت، سوارەکانم لەبرسا بمرن. کاتێك ئەو ڕۆشت، ئیلخانی وتی: منیش دەڕۆم بۆ بێستوون، ئەوێ بەهێزترە، لەوێ دەمێنمەوە تا داوود دەگات. من مامەوە و سوارەکانی ڕەمشتی و گەشکی. بەناچار دوو کاتژمێر دوای ئەوان بەڕێکەوتم، کاتێك گەیشتمە بێستون، بینیم ئیلخانی لەوێ نییە. وتیان: ڕاستەوخۆ درێژەی بەڕێگەداوە و گەڕاوەتەوە بۆ شار. ناچار بەرەو تاق بوستان بەڕێکەوتین تا لەوێ فەرمان لەشازادە وەربگرم. شەوی ٧ جومادی ئەلثانی ١٣٣٠، دوای سێ کاتژمێر لەشەو، گەشتینە تاق بوستان و لەوێ شازادەم لەڕووداوەکان ئاگادار کردەوە، نووسیم: ئەم بارودۆخە بێ سەرەوبەرە، سەرئەنجام نەزۆك دەبێت، ئێوە لەقەلاّی حاجی کەریم بمێننەوە تا

بڕۆم و لەماوەی سێ ڕۆژدا هێزەکانی جوانڕۆ و ڕەوانسەر کۆبکەمەوە. ئەگەر داوود هات، پێشڕەوی دەکەین، جیاواز لەوە، لەئێستادا پارێزگاری لەکرماشان دەکەین تا والی و داوود دەگەن. پاکەتەکەم بەکوێخای تاق بوستان بۆ شار نارد، نانی شەومان خوارد و حەواینەوە. دەمەو هەڵاتنی هەتاو، لەنزیك برنجان، گەشتینە سەردار موجەلەل کە لەگەڵ تۆپێك و سەد سواری تێکشکاو بەرەو کرماشان دەڕۆیشت. دوای یەکتربینین، لەئەسپ هاتینەخوار و چەند هەنگاوێك لەسوارەکان دوور کەوتینەوە. یەکترمان لەبارودۆخ و قەزا و قەدەر و داهاتوو ئاگادار کردەوە، دواتر سوار بووین. ئەو بەرەو کرماشان و من بەرەو ڕەوانسەر بەڕێکەوتن.

ڕۆژی ٧ جومادی ئەلثانی، دوو کاتژمێر ماوە بۆ ئێواریێ، گەشتینە ڕەوانسەر و هەمان شەو لەگەڵ سەردار ڕەشید نامەمان بۆ سەرۆکەکانی جوانڕۆ، قوبادی، وەلدبەیگی و ئیناخی و باباجانی نووسی و هەموویان لەماوەی دوو ڕۆژ لەڕەوانسەر ئامادە بوون. پەیمانیان بەست لەگەڵ سوپاکەی خۆیان هاوکاری شازادە بکەن. پەیماننامەکەمان بەتەتەرێك بۆ شازادە نارد تا چاوەڕوانی ئێمە بێت. تەتەر ڕۆشت و نزیك ئێواریێ لەگەڵ پەیماننامەکە گەڕایەوە، وتی: کاتێك گەیشتمە کەنار شار، ئاگادار بوومەوە داوود لەبێستون ڕووبەڕووی سوپای فەرمانفەرما بۆتەوە، خودی داوود و عەلی ئەکبەر خانی کوڕی، لەهێرشی یەکەم دەکوژرێن و سوپا بێ سەرکردە دەمێنێتەوە و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سالار ئەلدەولە لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، بەخێرایی لەگەڵ سەردار موجەلەل، لەقەڵای حاجی کەریم هەڵدێن. شێخ عەلائەلدین کە لەشارەکەدا بووە، هەڵاتووە. منیش نەڕۆشتمە ناو شارەکە، گەڕامەوە و لەکاتی گەڕانەوە، سوارەکانی بەختیاریم بینی، بەرەو شارەکە ئەسپیان غاردەدا. بەڕێزەکان دەیانویست سەیید ئەلدەولە بنێرن تا شازادە لەهەر شوێنێك بێت، بگەڕێننەوە. من ڕێگەم نەدا، وتم: چیتر سوودی نییە، ئێوە هەرکام بۆ ناوچەکانی خۆتان بگەڕێنەوە و منیش ڕێگەی سنە دەگرمەبەر. کاتێك گەشتین، بینیمان دەنگۆی ئەوە هەیە کە ڕۆژی ٧ جومادی الثانی سەردار موزەفەر خان سەرداری ئینتیسار لەگەڵ شەست حەفتا سوار وەك فەرمانڕەوای کوردستان لەلایەن فەرمانفەرماوە هاتووە، ئاسف دیوان و حاجی ئەرفەع ئەلمولك و کارگوزار و دەستەیەك لەدانیشتووان بۆ پێشوازی کردنی ڕۆشتوون. دوو کاتژمێر بۆ ئێواریێ دەگەنە ناو شار. ئاژاوەگێڕانی ناو شار دژی ئەوان رادەپەڕن، دوانزە کەسیان لێ دەکوژرێت و ئەوانی دیکە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. حەبیب حاجی خودادای هەمەدانی کەکەسێکی

ئازادیخواز بووە، لەم ڕووداوەدا دەکوژرێت. میرزا عەبدولکەریم ئەوەی موشیر دیوان کەمناڵێکی شەش حەوت ساڵە بووە، لەسەربان، گوولەی وێڵی بەردەکەوێت و دەکوژرێت. سەردار موزەفەر، حاجی ئەرفەع لەلاڕێوە دەرباز دەکات و بەتەندروستی دەیگەیێنێتە هەمەدان. دوای چەند ڕۆژ شازادە عەمید ئەلدەولە لەگەڵ ساعید هومایون، برای مەجدئەلدەولە، لەلایەن فەرمانفەرما وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەگاتە ناو شارەکە و ئاسف دیوان وەك جێگری خۆی دەستنیشان دەکات. بەهاندانی ئاسف دیوان، مەحمودخانی ئیحتیشام دیوان قۆلبەست دەکات. دوای ئەوەی بڕە پارەیەکی لێ دەستێنرێت، ئازاد دەکرێت. عەمیدئەلدەولە بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکان کەخودی فەرمانفەرما، فەرمانیدابوو، داوای کۆمەڵێك سوار دەکات.

دوای چەند ڕۆژ سالار مۆئەییدی کرماشانی، لەگەڵ حەفتا سوار دێت و لەقەڵای حکومەتی نیشتەجێ دەبێت. دوای دوو سێ ڕۆژ، ئاسف، سوڵتان عولەما دەگرێت و ڕەوانەی کرماشانی دەکات. شەوێك بەنهێنی موشیر دیوان پەیامی ناردبوو کەفلانی بێ ئاگا نەبێت. مەبەستی سەرەکی لەهاتنی سالار مۆئەیید گرتنی ئەوە. دوو سێ ڕۆژ دواتر سالار مۆئەیید پەیامێکی نارد کەئێمە چەند ڕۆژە هاتوینە ناو کوردستان بەلام فلانەکەس، خۆی نیشان نەداوە. ئێوارێ ئەگەر لەماڵەوە بێت، خوازیارین سەردانی بکەین. لەوەڵامدا وتم: من دوو ڕۆژە لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوومەتەوە، بەهۆی گرفتاری و سەرقاڵ بوون بەکاروبار، دەرفەت نەبووە سەردانیان بکەم، ئەمڕۆیش بەڕێکەوت کاری زۆر گرنگم هەیە، بەخواستی خواوەند، سبەی ئێوارێ، سەردانی دەکەم یا ئاگاداری دەکەمەوە، ئەوان تەشریف بێنن. نێردراو ڕۆشت و گەڕایەوە، وتی: سالار دەڵێت چوونکە بەیانی دەڕۆم، دەخوازم ئەمڕۆ چاومان بەیەکتر بکەوێت، دەمەو ئێوارێ، چاوەڕوانم یا ئەوان تەشریف بێنن یا ئێمە دەچین. ئەم پێداگرتن و سوور بوون و پەیامەکەی موشیر دیوان، دڵنیایی کردم نییەتی پاك نییە، بێ درەنگ وتم: کەواتە پێی بڵێن زووتر تەشریف بێنێت چوونکە هەواڵێکی خۆشم هەیە و دەبێت ئاگاداری بکەمەوە.

پیاوەکەی سالار مۆئەییەد ڕۆیشت، بەمیرزا عەبدولمەجید، پیاوەکەی خۆم وت: خێرا بڕۆ و دەهۆڵ کوتێك بێنە. سێ کاتژمێر بۆ ئێوارێ، با بێت و لەبەردەم دەروازەکە دەهۆڵ بکوتێت بەمەبەستی خۆشحاڵی دەربڕین لەوەی سالارئەلدەولە ڕۆشتۆتە ناو کرماشان و ئەوەی

فەرمانفەرما هەڵاتووە. میرزا عەبدولمەجید لەبەر ئەوەی دەیزانی من لەکاتی تەنگانە کەمتەر بەهەڵەدا دەچم، بێدرەنگ ڕۆشت. پیاوەکانی دیکەم راسپارد سێ کاتژمێر بۆ ئێوارێ، بڕۆنە سەر بانەکان و ئاگایان لەدەروازەکە بێت. ئەگەر مۆنەییەد لەگەڵ دوو سێ کەهات، ڕێگەی لێ نەگرن و ئەگەر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر هات، ڕێگەی پێنەدەن. ئەگەر پێداگرییان کرد، تەقە و بەرگری بکەن. لەگەڵ ئەوەیشدا دڵنیابووم ئەگەر یەکێك لەوان برینـدار ببێت، چیتر دانیشتووانی گەڕەکەکە ڕێگەنادەن ئەوانی دیکە بەسەلامەت ڕزگاریان بێت. هەواڵی سەرکەوتن و مژدانەم بەحاجی شێخ محەممەدی باقردا تا لەکاتی لێدانی دەهۆڵ، بێ ئاگا لەبارودۆخ نەبێت.

سێ کاتژمێر بۆ ئێوارێ، دەهۆڵکوت هات و دەستیکرد بەدەهۆڵ لێدان. دانیشتووانی گەڕەك لەگەورە و بچووك کۆبوونەوە و مژدەیان بەیەکدەدا. لەم کاتەدا هەواڵیان هێنا سالارموئەیید و پیاوەکانی بەرەو گەڕەکی قەتارچیان دێت. کاتێك گەیشتە ناو قەرەباڵغییەکە، لەبینینی قەرەباڵغی ولێدانی دەهۆڵ و تفەنگچییەکان لەسەر بان، پەرێشان و پرسی: چی ڕوویداوە؟ وتیان: بەبۆنەی سەرکەوتنی سالارئەلدەولەیە، ڕۆشتۆتە ناو کرماشان و فەرمانفەرما هەڵاتووە. ئەم هەواڵە بەتەواوی هێزی لێ بڕی، نەدەیتوانی بگەڕێتەوە، نەیدەوێرا بێتەپێش. ناچار دابەزی. ڕۆشتە خانەقا بۆ لای حاجی شێخ محەممەد باقر و پەیامی نارد: ئێمە بەمەبەستی سەردانی فلانەکەس هاتین، بەلام لەبەر تفەنگچییەکان و قەرەباڵغییەکە نەمانویست خۆسەرانە بڕۆینە سەردانی، ئەگەر ڕێگەمان دەدەن، بەخزمەت بگەین، وەگەرنە دەگەڕێینەوە. وتم: بەئارەزووی خۆی، ئەگەر خوازیاری بینینە، چاوەڕوانم، بەلام پێی بڵێین خۆی لەگەڵ یەك پیاو بێت، نەکا خەڵکان بەشێوەیەکی دیکە لێکدانەوە بۆ هاتنی ئەو بکەن و کێشە و ئاژاوە دروست ببێت. زۆری نەخایاند خۆی لەگەڵ یەکێك لەپیاوەکانی هاتە ژوور. دوای ماچوموچ، چۆنیەتی ڕۆشتنی (بەدرۆ) سالارئەلدەولە بۆ کرماشان و هەڵاتنی فەرمانفەرمام بۆ باسکرد. وتی: ئێستا دەرئەنجام چی دەبێت؟. وتم: گرنگ نییە، من لەسەر بەڵێنەکەی خۆم بۆ هاوڕێیەتی ئێوە، پێداگرم. بەڵێن دەدەم هۆکارەکانی ئاسوودەیی و ئارامی ئێوە دابین بکەن. بەشازادە عەمید ئەلدەولە بڵێن نەترسێت، ئاسوودەیی گیانی وماڵی ئێوە دوو کەس لەئەستۆی مندایە. وتی: من کارم بەو نییە و دڵنیام ئەو نەیاری ئێوەیە چوونکە بەنهێنی داوای لەمن کرد کاتێك فلانەکەس بۆ سەردانی ئێوە هاتە قەلای حکومەتی،

قۆڵبەستی بکەن تا ڕەوانەی کرماشانی بکەین. وتم: پێویست بەناردن نەبوو، ئەگەر پێشهاتەکان بەمشێوەیە نەدەبوو، خۆم بەرەو کرماشان دەڕۆشتم بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا چوونکە لەناخەوە کەسێکی پاکە، ڕێگە نادەم هیچ بەڵایەکی بەسەردا بێت. نیو کاتژمێر بۆ ئاوابوونی هەتاو، سالار مۆئەیید ڕۆشت و ئێمەش کۆتاییمان بەدەهۆڵ لێدان هێنا و چاوەڕوان بووین تا هەوا بەتەواوی تاریك بوو. فەرمانمدا کەلوپەکان ئامادە بکەن. دووای دوو کاتژمێر لەشەو، لەگەڵ ماڵ و منداڵ و کەلوپەلی پێویست بەرەو گوندی تەختە بەڕێکەوتین. چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە. هەواڵمان پێگەیشت کەئاسف دیوان و دەستەیەك لەدانیشتووان لەڕێگەی کەلیایی بەرەو کرماشان بەڕێکەوتوون. دواتر هەواڵ هات کەسوپای هەورامان و دزڵی و کوماسی، بۆ گرتنی کەرجۆ بەڕێکەوتوون. دوای پەنابردنی سالارئەلدەولە بۆ عەشیرەکان، چیتر عەشیرەکان ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردبوویەوە و هەموو گوندەکانیان تا کەنار شارەکان تاڵان کردبوو. کوێخا محەممەد سەلیمی کەرجۆیی، یەك دوو بورجی لەکەرجۆ بنیاتنا و سەرپێچی هەورامییەکانی دەکرد. یەك دووجار سەد تفەنگچی و دووسەد تفەنگچییان نارد بەڵام بەهۆی بوونی بورجەکان نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەستبێنن. گوندەکانی دیکەیش کاتێك بینیان، بورج، گوندەکان لەدەستدرێژی کەسانی دیکە دەپارێزێت، لەهەموو گوندەکانی دەوروبەر، دروستکردنی بورج دەستپێنکرد. ئەم کردەوەی کوێخا محەممەد سەلیم، عەباس قولی بەگی هەورامی تووڕە کرد و سوپایەکی پێکهاتوو لەهەورامی و کوماسی و دزڵییەکان بۆ گرتنی کەرجۆ ڕەوانە کرد. کوێخا محەممەد سەلیمیش پیاوی بۆ شار نارد تا هێزی هاوکاری بۆ کۆبکاتەوە یا چەند کەس لەزاناکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نێوانیان ڕەوانە بکەن. کەسی بۆ لای من نارد ئەگەر هاوکاری لەشارەوە گەیشت، فلانەکەس ژمارەیەك لەگوندی تەختەوە بۆ هاوکاری کردنی ڕەوانە بکات. ئەگەر زاناکانیش بۆ بەرقەرار کردنی ئاشتی هاتن، خۆم بڕۆم بەڵکو ئاگری ئەم ئاژاوەیە دامرکێنێتەوە. دوای ئەم پەیامە، هەواڵ هات کەمەلا عەبدولمەجیدی مودەڕیس و شێخ سەلیمی مەردۆخی و حاجی شێخ عەبدولحەمید و دەستەیەك لەپیاوماقووڵانی شار، گەشتوونەتە کەرجۆ. منیش بەڕێکەوتم. کاتێك گەیشتم، ڕەزا قولی بەگ و خانەکانی ڕەزاو لەبەرابەر گوندی کەرجۆ کەپریان دروستکردبوو و ئاسوودە پاڵیان دابوویەوە. سوار و تفەنگچییەکان دەوری گوندەکەیان گرتبوو، دانیشتووانی گوندەکەیش ئەوەی تفەنگی بوو،

ڕۆشتبووە سەر بورجەکان و مەڕومالآت و ژن و منالەکانیش لەتەویلە و مزگەوت حەشاردرابوون. لەگفتوگۆی نێوان بەشیرەلئیسلام و خانەکان لەگەڵ زانان ئایینیەکان، تێگەیشتم پیلانێك لەئارادایە. بەبیانوی دەسنوێژ گرتن، حاجی شێخ عەبدولحەمیدم بردە سوچێك و لەمەبەستی هەورامیەکان ئاگادارم کردەوە و جەختم کردەوە کەبێ دڵنیایی، خۆی هەڵنەقورتێنێت و نەبێتە هۆی کوشت و کوشتاری دانیشتووانی کەرجۆ و تالآنکردنی گوندەکەیان. دوو کاتژمێر بۆ ئێواریێ، ئەو بەڕێزانە، خۆیان دۆڕاند و ڕۆشتنە لای کوێخا سەلیم و مسکێنەکان، دڵنیاییان پێدان بۆ ئەوەی لەبورجەکان بێنەخوار. هەرچەند پێداگرییان کرد، نەڕۆشتم. لەگەڵ ڕۆشتنی ئەوان، سوار بووم و گەڕامەوە. شەو هەواڵ گەیشت ئەو بەڕێزانە دڵنیاییان بەدانیشتووانی گوندەکە داوە و کوێخا سەلیمیان بردۆتە لای خانەکانی هەورامی. دەستبەجێ بەبوونی ئەو زانایانە، سوپای هەورامی و کوماسی دەڕژێنە ناو گوندەکە، ئەسەدالله‌ی موباشر و چەند کەسێکی دیکە دەکوژن و گوندەکە تالآن و دەیسوتێنن. ئەو بەڕێزانە ئەنجامی ساویلکەیی خۆیان دەستکەوت و سەرشۆڕانە بۆ شار گەڕانەوە.

دوای چەند ڕۆژ هەواڵ گەیشت کەفەرمانفەرما و سەرکردە بەختیارییەکان و یار محەممەد خان و کوردستانییەکان لەکرماشانەوە بەرەو کوردستان بەڕێکەوتوون و کاتێك دەگەنە گوندی کامیاران، عەلی ئەکبەر خانی سەنجابی لەگەڵ سوپاکەی مۆڵەت لەفەرمانفەرما وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە. کاتێك دەگەنە گوندی ماراب، حاجی ئاغا و دوو کوڕی و حەوت مسکێن دەکوژن و سامانەکەیان تالآن دەکەن. فەرمانفەرما و هاوەڵانی دەڕۆنە ناو شارەکە.

لەکۆتاییەکانی شەعبانی ۱۳۳۰، نامەی سالارئەلدەولە گەیشت. نووسیبووی: لەهەواربوکم. زەردەواڵە بەچاویەوە داوم، بەخێرایی کەمێك ئامونیاکم بۆ بنێرن و خۆیشتان پێویستە لەزووترین کات لێرەبن چوونکە ئێوە باشتر لەزمانی ئەم کەرانە (مەبەست هەورامییەکانە) تێدەگەن. بەخێرایی کەسێکم نارد و لەشارەوە ئامۆنیاکیان هێنا و بۆم نارد. لەوەڵامدا بۆم نووسی: لەبەر ئەوەی خەدیجە خانمی هاوسەرم تازە مردووە و خەڵك لەهەموو شوێنەکانەوە بۆ پرسە و سەرەخۆشی دێن، ناتوانم لەماڵەوە نەبم. لەبەر ئەمە لەئێستادا ناتوانم بگەمە خزمەتتان بەڵآم سەبارەت بەزمانی کەرەکان، لەو کاتەوەی ئەوان شوێن ئێوە کەوتن، ئێمە جەختمان لەکەریەتی ئەوان کردۆتەوە و باوەڕمان وایە، ئێوە لەتێگەیشتنی زمانی ئەوان،

پیش هەمووان کەوتوون. لەگەڵ ئەوەیشدا دەبێت بڵێین خواوەند بەرەکەت بەکەریەتی ئەوان بدات تا بتوانین درێژە بەیاسای کەرسواری بدەین.

دوای دوو ڕۆژ نامەیەکی دیکە لەشازادە گەیشت، نووسیبووی: پاساو و بیانووەکەت شیاوی ڕازی بوون نییە، چێژی تازە کردنەوەی دیدار، خەمی مەرگی هاوسەرکەت لەناو دەبات، هەندێ بابەتی تازە هاتۆتە پێش، پێویستە بەخێرایی لێرەبن تا بەئاگاداری ئێوە دەستپێبکەین. لەگەڵ گەیشتنی نامەکە هەواڵ گەیشت بەختیارییەکان، موشیر دیوان و نازم الایەیان بەپیلانی ئاسف دیوان گرتووە و لەئەمیرییە زیندانییان کردوون.

ئەم هەواڵە زیاد لەڕادە پەرێشانی کردم، ئاشنا ڕەحمی نەکرد بەلام دڵی بێگانە سووتا. نوقمی دەریای بیرکردنەوە بووم تا بزانم چۆن دەتوانم هۆکارەکانی ئازاد کردنی ئەو پیرەپیاوە ڕاستکردارە ئامادە بکەم. هەندێکات بیرم لەوە دەکردەوە سەد تفەنگچی خۆاوەن ئەزموون هەڵبگرم و لەکاتێکدا سفرەی بەختیارییەکان ڕادەخرێت و دەڕۆنە خەوی مەستی، لەچیای ئاویەر بڕۆینە خوار و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەینە سەر ماڵەکانیان و موشیر دیوان لەدەستی ئەوان ڕزگار بکەین. و هەندێکات بەبیرکردنەوەی ئەوە نەکا لەم چالاکییەدا خودی موشیر دیوان لەدەست بچێت، پەشیمان دەبوومەوە. ناچار بەڕۆشتن بۆ هەورامان ڕازی بووم بەڵکو بەهۆی هێنانی هێزەکانی هەورامان بتوانم بەمەبەستەکەم بگەم.

بەپشتبەستن بەم بڕیارە بەرەو هەواربوك بەڕێکەوتم. بینیم شازادە لەوێ نەماوە، وتیان: دوێنێ لەلایەن یار محەممەد خان کە لەفەرمانفەڕما جیابۆتەوە و لەگوندی کەلاتی لەگەڵ عەبدولکەریم بەگی وەکیل و فەتاح سەعید پەیمانی بەستووە، قورئانێکی واژۆ کراویان بۆ شازادە هێنا و شازادە دەستبەجێ بەرەو گوندی کەلاتی بەڕێکەوت. هەرچەند ڕێگریمان لێکرد، سوودی نەبوو. وتم: ئێستا بابەتەکە شتێکی دیکەیە. بەختیارییەکان موشیر دیوان و نازم الایەیان گرتووە و دەیانەوێت بیانبەن بۆ تاران بۆ ئەوەی لەداریان بدەن. ئەگەر ئەم کارە بکرێت، ئابڕو بۆ کوردستان و کوردستانی نامێنێتەوە. ئەم وتەیە کاریگەری لەسەر دڵی عەباس قولی خانی سوڵتان و کوێخاکان کاریگەری دانا و لەماوەی دوو ڕۆژ هەموو هێزەکانی هەورامانی ڕەزاو، کەزیاتر لەدوو هەزار کەس دەبوون، بەڕێکەوتن. ڕۆژی ٢٧ ڕەمەزانی ١٣٣٠ ڕۆشتینە گوندی تەختە و بەخێرایی پیاومان بۆ شار نارد تا هاوڕێ و هاوەڵەکانمان ئاگادار بکەنەوە کە ئێمە شەوی ٢٩ بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش دەکەین و

لەچیای ئاویەر بەرەو ئەمیرییە سەرەوخوار دەبینەوە. دانیشتووانی شاریش هێرش بکەنە سەر قەڵای حکومەتی. شەوی ٢٨، دوای تێپەڕینیی پێنج کاتژمێر لەشەو، سوارێك هات و نامەیەکی هێنا. بینیم نامەی سەردار ڕەشیدە، نووسیبووی: من لەلایەن شازادەوە لەگەڵ دانیشتووانی ڕەوانسەر و جوانڕۆ و کەمانگەر هاتووم و گەشتووینەتە پتڵیدەری قشلاق تەختە. لێرە بیستمان ئێوە لەگەڵ هێزی هەورامان مەبەستی هێرشکردنە سەر شارتان هەیە، پێویستە چاومان بەیەك بکەوێت تا هەردوولا بەپشت بەستن بەپلانێکی دارێژراو ئەو کارە بکەین. سالارئەلدەولەیش لەدواوە دێت. دوای شەش کاتژمێر لەشەو، سوار بووم و ڕۆشتمە پتڵیدەر. دوای گفتوگۆ و ڕاوێژ، بڕیارماندا شەوی جەژن، هێرش بکەینە سەر شار. ئێمە بەرەو ئەمیرییە و سەردار و دانیشتووانی شار بەرەو قەڵای شار. بەخێرایی کەسێکی دیکەمان بۆ شار نارد تا دانیشتووان لەم نەخشە تازە ئاگادار بکەنەوە.

بەیانی ٢٩ ڕەمەزان، دوو کاتژمێر بۆ بانگی بەیانی، دەنگێکی گەورە هاوشێوەی دەنگی تۆپی ٤٢ سانتیمەتری، لەسەد هەنگاوییەوە بیسترا. گومانمان کرد لەنێوان هێزەکانی سەردار ڕەشید و هێزەکانی فەرمانفەرما جەنگ روویداوە. سەردار ڕەشید گومانی دەکرد ئێمە هێرشمان کردۆتە سەرشار و ئەوە دەنگی تۆپی هێزەکانی فەرمانفەرمایە. کەسمان بۆ لای سەردار نارد. هەواڵیان هێنا لەگەڵ بیستنی دەنگەکە، سەردار و سوپاکەی بەرەو ڕەوانسەر گەڕاونەتەوە. لەشارەوە هەواڵمان بۆ هات فەرمانفەرما دوای بیستنی دەنگی تۆپەکە، گومانی کردووە هێزەکەی سالارئەلدەولە گەیشتۆتە نزیك شار و لەبەر ئەوەی لەدانیشتووانی شارەکە دەترسا، بەرەو کرماشان بەڕێکەوتبوو. ئەوەی ڕستبوومان بوو بەخوری. سەرئەنجام بڕیارماندا نوێژی جەژن لەگوندی تەختە بخوێنین و دوای ڕێوڕەسمی جەژن، سوپای هەورامان بگەڕێتەوە.

ئەو دەنگە دواتر دەرکەوت دەنگی ئاسمان بووە و لەئازەربایەجان و قەزوێن و ڕەواندزیش بەهەمان شێوەیە بیستراوە و هەمووان گومانیان کردووە دەنگی تۆپ بووە (؟؟؟؟؟)

ڕۆژی ٢٩، لای ئێوارێ، سوارێك لەلایەن شازادەوە هات و نامەیەکی هێنا. نووسیبووی: هەنووکە من لەگەڵ یار محەممەد خان و هێزەکانی جوانڕۆ و کرماشان بەرەو کوردستان بەڕێکەوتووم. ئێوەیش لەگەڵ هەموو پیاوەکانتان بەرەو شار بەڕێکەون و هیچ بیانو و پاساوێك مەهێننەوە. (دەرکەوت لەهاتنی هەورامییەکان بۆ گوندی تەختە بێ ئاگایە.

ئێمەیش بەیانی جەژن، دوای نوێژی جەژن بەڕێکەوتین و لەکاتی نیوەڕۆ گەشتینە چەمەنی شەرەف ئەلموڵك. کاتژمێرێك دواتر شازادە و هاوڕێکانی گەیشتن و ڕاستەوخۆ بەرەو ئەمیرییە ڕۆشت و لەوێ کەسی نارد تا خوسرەوئابادی بۆ چۆڵ بکەن. ئاسف دیوان و عەمیدئەلدەولەی فەرمانڕەوا و وەکیل ئەلموڵك و حەبیب اللەی بازرگان و کارگوزار و دەستەیەکی دیکە ڕۆشتنە شەهبەندەرخانە و لەوێ پەنایان گرت. دوو ڕۆژ دواتر سوارێکی شێخ ئیسماعیلی هات. وەکیل ئەلموڵك و کارگوزار بەهۆی حاجی شێخ محەممەد باقر و یار محەممەد خان ئەماننامەیان وەرگرت و لەشەهبەندەرخانە هاتنەدەر. چەند ڕۆژ دواتر شازادە نەسروڵلە خان، مۆئەیید ئەلسەڵتەنەی کرماشانی، مۆئەیید ئەلوەزاری پێشووی بەناوی حکومەت، بۆ قەڵای حکومەتی نارد تا ڕۆژانە لەگەڵ وەکیل ئەلموڵك کاروباری شارەکە بەڕێوە ببەن مەنسور نیزامی وەك فەڕاشباشی دەستنیشان کرد و بڕێك پارەی لەهەموویان وەرگرت. دوای چەند ڕۆژ یار محەممەد خان و عەبدولکەریم بەگ، وەکیلی جوانڕۆی وەك لێپرسراونی کرماشان ڕەوانە کرد. ئەو، شەوانە دەڕواتە کرماشان و شەوانە گەمارۆ دەخەنە سەر قەڵای حکومەتی. ئەوەندەی نامێنێت فەرمانفەرما ئەسیر بکرێت. یار محەممەد خان گوولەی بەردەکەوێت و دەکوژرێت. سوپاییەکانیش ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. کاتێك ئەم هەواڵە بەکوردستان گەیشت، هەورامییەکان شەوانە هەڵاتن. ڕۆژی ٢١ شەوالی ١٣٣٠، شازادە، وەکیل ئەلمولکی بانگکرد و لەگەڵ وەکیل ئەلموڵك و سەیید ئەلدەولە و سوارەی شێخ ئیسماعیلی بەرەو ئیسفەندئاوا بەڕێکەوت. لەخوارەوەی شار، مۆڵەتی گەڕانەوە بەوەکیل ئەلموڵك دەدات، چەند ڕۆژێك لەئیسفەند ئاوا دەمێنێتەوە و مۆڵەتی گەڕانەوە بەسەیید ئەلدەولە و شێخ ئیسماعیلی دەدات و خۆی لەگەڵ چەند سوارێك بەرەو ناوچەکانی ئازەربایەجان بەڕێدەکەوێت. موشیر دیوان لەگەڵ گەیشتن بەتاران، بڕە پارەیەکی زۆر دەدەن و بەخێرایی لەگەڵ نازم الایەی کوڕی بەخێرایی دەگەڕێنەوە. ڕۆژی ٢٠ سەفەری ١٣٣١، نازم الایە دەمرێت، ڕۆژی سێشەممە، ١١ ڕەبیع الاوەلی ١٣٣١، حاجی شێخ محەممەد باقریش مرد.

### حکومەتی شازادە زەفەرئەلسەلتەنە، جاری دووەم

دوای کۆتایی هاتنی کارەکانی سالارئەلدەولە، شازادە عەزیزاللە میرزای زەفەر ئەلسەڵتەنە، لەڕەجەبی ١٣٣١ بۆ جاری دووەم وەك فەرمانڕەوای کوردستان ڕەوانە کرا. پێگەی وەزارەتی

بەئاسف دیوان و سەرۆکایەتی دادی بەوەکیل ئەلمولك سپارد.

ئاسف دیوان بۆ سەرکوتکردنی مەندەمی و گولْباغی، سوپاییەکی پێنج شەش هەزار کەسی بەسەرۆکایەتی سەردار موعەزەمی کوڕی پێکهێنا و مەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلام و مەفخیر ئەلمولك و دەستەیەك لەگەورە پیاوانی لەگەڵ ئەم سوپایەدا ڕەوانە کرد. کاتێك دەگەنە دیواندەرە، هەواڵیان پێدەگات کەسالارئەلدەولە هاتۆتە ناو گولْباغییەکان. لەگەڵ بیستنی ناوی سالارئەلدەولە، سەرکردەکانی سوپا دەترسن و شەوانە ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سەردار موعەزەم و سەردار موعەمەمی شێخولئیسلام بەیانی پێش هەمووان گەیشتنە شار. بەیانی ئەو ڕۆژە خوسرەوخانی ئیفتیخار ئەلوەلات، لەماڵی موشیر دیوان بووە و کەسێك لەسوپاییەکان، ئەم ڕووداوە ئەنگینە بۆ موشیر دیوان باس دەکات. ئیفتیخار ئەلوەلات لەکۆتایی بەسەرهاتەکە دەڵێت: ئاسف گووی کردە تەختی جەم، عاباکەی بەرز کردەوە و گووی کردە هەموو دنیا.

بەدوای ئەم پێشهاتە، محەممەد باقرخان ساری موفەخەم، مەهدی شا ئەسترئابادی، برازای میرفەندرسکی کە لەناوچەکانی تورکمان وەزیری جەنگی سالارئەلدەولە بووە و بەدەم هەڵاتنەوە لەگەڵ سێ سوار دەگاتە گوندی ماقوق، دەبێتە میوانی ئەو. ئەو، بەپێچەوانەی نەریتی کوردان کەڕێزی میوان دەگرن، ئەو داماوە دەگرێت و ڕەوانەی شاری دەکات. زەفەر ئەلسەڵتەنە، بەزەیی پیایدا دێتەوە و سی تمەنی وەك خەرجی پێدەدات و ئازادی دەکات.

باوردۆخی گەنم و نان بەهۆی وشکەساڵی و قاتوقڕی پەرێشان دەبێت، زەفەر ئەلسەڵتەنە دەیەوێت، خۆراکی شار لەخاوەن زەوییەکان وەربگرێت. ئاسف دیوان ڕازی نابێت و بەمشێوەیە پەیوەندی حکومەت و ئاسف دیوان گرژی بەخۆیەوە دەبینێت و زەفەر ئەلسەڵتەنە دەخوازێت پێگەی وەزیری بەموشیر دیوان بسپێرێت. ئاسف دەستەیەك هان دەدات و ڕۆژی هەینی ٢٦ شەوال، دوای نوێژی هەینی، دەڕۆنە ماڵی مەلا ئیبراهیمی شێخولئیسلام و لەوێ کۆدەبنەوە و بروسکە و بروسکە ناردن دەستپێدەکات. تاران درەنگ وەڵام دەداتەوە. شەوانە پارە و گەنم بۆ سەرۆکی سەندیکاکان و بازرگانەکان دەنێرێت و بەیانی، حاجی شێخ عەبدولحەمیدی مودەڕیس و حاجی ڕەشیدی بەننا و چەند کەسێکی دیکە بۆ بازاڕ دەنێرێت، بازاڕ و دووکان دادەخەن و هەموویان ڕوودەکەنە ماڵی مەلا ئیبراهیم. سفرەی نیوەڕۆ و شەو بڵاو دەکەنەوە. هەموو شەو و ڕۆژێك پەنجا سفرەی بچووك لەماڵی

ئاسفەوە دەهاتەماڵی شێخولئیسلام. کاتێك وەڵامی تاران گەیشت، بەڕێکەوت لەبەرژەوەندی ئاسفدا نەبوو. شەوێکی زیحەججە، دەستەیەك لەئاژاوەگێڕان هاندەدات و لەهەر لایەکەوە تەقە لەقەڵای حکومەتی دەکەن. ناچار زەفەر ئەلسەڵتەنە پەنا بۆ شەهبەندەرخانە دەبات و لە ۲ زیحەججە بەهاوکاری شەهبەندەر لەکوردستان هەڵدێت. چەند ڕۆژ دواتر بەهای گەنم لەخەرواری پێنج تمەن بۆ سی و شەش تمەن بەرز بوویەوە و پیلانی وشکەساڵی دەسکرد بەمشێوەیە دارێژرا. دواتر بازارییەکان، یانی ئەو ئاژەڵە بێ شەرەفانە، یا وڵاخە دوو پێکان، کەهەمیشە بۆ دە من گەنم یا پێنج تمەن پارە، خوێنی کوردستانییەکان دەکەنە ناو تەشت و دوو دەستی بەنەیار و ناحەزانی کوردی دەفرۆشن. هەرچەند هاواریان کرد ئێمە ئەوەمان نەکرد کەوای لێبێت، ئاسف گرنگییان پێنادات و دەڵێت: سەگبابانە گومان دەکەن من شلە و سەهۆڵی بەلاشم لەبەهەشتەوە هێناوە کەهەموو شەو و ڕۆژێك پەنجا سفرە نانی نیوەڕۆ و شەویان پێبدەم، یا گەنم و پارە لەئاسمانەوە دەبارێت کەشەوانە بۆیان بنێرم. ئەگەر نرخی گەنم بەرز نەکەمەوە، چۆن دەتوانم قەرەبووی خەرجییەکانی خۆم بکەمەوە. کاتێك بەوردی لەبابەتەکە بڕوانن، دەبینن ئاسف ڕاست دەکات. ئەم خەڵکە نەزانە، شیاوی خراپتر لەمەیە. بەوتەی پیاوەکانی خودی ئاسف کەدەڵێن: تا ئەم خەڵکە کەرن ئاسف، خەڵك کەرە. یانی بەپارە ئەوان دەکرێنەوە کەس ماڤ چەند و چوونی نییە.

داگیرکەرانی کوردستان هەرکات ویستوویانە وشکەساڵی و قاتوقڕی دەسکرد لەکوردستان وەگەڕبخەن، لەدوو ڕێگەوە دەستیان پێکردووە یا پارەیان بەحکومەت داوە و ئەویان کردۆتە هاودەستی خۆیان یا بەو شێوەی ئامارەمان پێدا، سەرۆك و بازارییەکانیان دژی حکومەت هانداوە و دوای ڕۆشتنی حکومەت، وشکەساڵی و قاتوقڕی دەستپێکردووە. ڕۆژی ۱۵ موحەڕەمی ۱۳۳۲، بەهۆی پیلان و دەسیسەی خودی موسیۆ شارڵ کەسەرۆکی گومرك و دارایی کوردستان بوو، بەڕێوبەرایەتی گومرك و دارایی تالآن کرد و مەلا فاتح لەو ئاژاوەیەدا کوژرا.

## حکومەتی ئەبولحسەین خان سەرداری موحیی

دوای هەڵاتنی زەفەرئەلسەڵتەنە، ڕۆژی ۲۱ موحەڕەمی ۱۳۳۲، بروسکەی فەرمانڕەوایەتی ئەبوحسەین خان، سەرداری موحیی گەیشت. لەکاتی بەڕێکەوتن لەتارانەوە، دەستەیەك قەزاقی بەسەرۆکایەتی روودمێستر، رەبا و ڕەزا خانی ماکزیم، لەگەڵ خۆی هێنا و لەقروەوە

بەرەو مەندەمی و گوڵباغی ڕۆشتن. چەند کەس لەگوڵباغییەکان و دەستەیەك مەڕوماڵاتیان لەگەڵ خۆیان بۆ شار هێنا. رودمێستەر لەکەنار خوسرەوئاباد ئوردووی لێدا. ڕەزا خان لای بینـای خوسـرەوئاباد، لـەنێوان خێوەتێـك نیـشتەجێبوو. ئەحواڵپرسـی کـرا. لـەم چاوپێکەوتنەدا، پەیوەندی لەنێوان ئێمەدا دروست بوو و زۆربەی شەوەکان بۆ بینینی من دەهات. کەسانی هەستیاری قیافەناس، لەقسەکانی ئەو، هەستی بەوە دەکرد ئەم پیاوە بۆ پشت ڕەشاش نەئافرێنراوە بەڵکو بۆ مەبەستێکی دیکە هاتۆتە دنیا. بەڕێکەوت شەوێك کەسەرقاڵی گفتوگۆ بووین، هەستی بەوە کرد تەزبێحەکەی دەستی ڕەش کردووە، وتی: ئەم تەسـبێحە بـەزیو ئـاودراوە، هەمیـشە دەسـتم ڕەش دەکـات، ئەگـەر تەسـبێحتان هەیـە، بیگۆڕینەوە. چەند تەسبێحێکی قەزوانم لەگیرفان دەرهێنا و وتم: ئەم تەسبێحە دەست ڕەش ناکـات، تەسـبێحەکەی خۆیـشتان بـۆ خۆتـان. وتـی: نـا، تەسـبێحەکەی ئێـوە لای مـن وەك یادگاری دەمێنێتەوە، ئەم تەسبێحەی منیش وەك یادگاری پێشکەشە بەئێوە. سەرئەنجام تەسبێحەکەمان گۆڕیوە. ئەو کەسانەی لەگەڵ سەردار موحیی هاتبوون، بریتین لە:

موفەق ئەلسەڵتەنە کوڕی یەمین ئەلمەمالیك، جێگری ئەو بوو، موعەزەم ئەلمولك سەرۆکی کابینەکەی و میرزا ئەبولحەسەن خانی مونشی، حاجی زەمان خان بەهادور ئەلسەڵتەنەی بانەیی کەسەرۆکی پاسەوانەکانی بوو. بەیانی دووشەممەی جومادی ئەلثانی ١٣٣٢، مەلا ئیبراهیمـی شێخولئیـسلامی مـرد. مـەلا عەبدولفـەتاحی عێـزەد ئەلئیـسلام لەگـەڵ شێخولئیـسلامیدا بـوو. بەسـەردار موحییـان وتبـوو کەبـەهای شێخولئیـسلامی کوردسـتان حەوت هەزار تمەنە. مەلا عەبدولفەتاح ئامادە نەبوو زیاتر لەسێسەد تمەن بدات کەسی دیکە خوازیاری ئەو پێگەیە نەبو. سەردار موحیی لەهەموو شتێك زیاتر خوازیاری دوو شت بوو، یەکەم پارە، دووەم منداڵی جوان، لەبەر ئەوەی حەوت هەزار تمەنەکە لەمێشکی ئەودا نەخشی بەستبوو، بەهیچ شێوەیەك ئەمەی لەمێشك دەرنەدەهات. ڕۆژێك ئەم بابەتەی بۆ باس کردم. وتم: کاتێك بەهای پێگەی شێخولئیسلامی حەوت هەزار تمەن بوو کەچەندین کەس ئامادە و خوازیاری بەدەست هێنانی ئەو پێگە بوون بەڵام ئەمڕۆ کەس نییە. مەلا عەبدولفەتاحیش لەروانگەی زانست و دین و ڕاستکرداری لەپێشتر لەهەمووانە، لەبەر ئەوەیە ئامادە نییە زیاتر لەسێسەد تمەن پارە بدات. ئەگەر بەدوو هەزار تمەن ڕازی دەبن، مۆڵەتم پێبدە ببینم و کۆتایی بەم کێشەیە بێنم. وتی: مەلا عەبدولفەتاح شیاوی گفتوگۆکردن نییە، کەسێکی دیکە

بدۆزنەوە. وتم: کەسەکە پەیوەندی بەتۆوە نییە، تۆ بیر لەبڕە پارەکە بکەرەوە، هەرکەس ئامادە بێت، لای تۆ جیاوازی نییە. دوای وەرگرتنی مۆڵەت، سەرەتا بەهۆی پەیوەندی هاوڕێیەتیم لەگەڵ مەلا عەبدولفەتاح، گفتوگۆم لەگەڵ ئەودا دەستپێکرد و بەڕاشکاوی پێم وت کەئەم حکومەتە بۆ ئەم پارەیە بۆتە مەشروتەخواز و جگە لەپارە بەهیچ شتێکی دیکە ڕازی نییە و دووایین بڕە پارەیەك کەئەوان پێی ڕازی دەبن، دوو هەزار تمەنە. ئەگەر بەمە ڕازی نەبن، ئەم پیشە کە لەباوك و باپیرانتەوە ماوەتەوە، لەدەستتان دەچێت. دوای گفتوگۆ و قسەکردن، سەرئەنجام وتی: لەبەر داواکەی تۆ، پەنجا تمەن بەسێسەد تمەنەکە زیاد دەکەم و زیاتر لەوە ئامادە نیم. بەبیستنی وشەی پەنجا تمەن، خورپەیەك بەدڵما هات و بێدەنگیم هەڵبژارد. سەرئەنجام لەگەڵ مەلا جەوادی فەخرولعولەما کەهیچ شتێك نەبوو، نەپارەی بوو نەخوێندەواری، گفتوگۆم دەستپێکرد. سەرەتا بابەتەکەی بەگاڵتە لەقەڵەمدا. دوای ئەوەی دڵنیابوو گاڵتە ناکەم، ئامادەیی خۆی نیشاندا و پرسیاری کرد. وتم: نازناوی فەخرولعولەمایی ئێوە بەسێسەد تمەن بەمەلا محەممەدی ئیفتیخارئەلعولەمای برا بچوکت دەفرۆشین، نازناوی ئیفتخار ئەلعولەمای ئەو بەدووسەد تمەن بەمەلا عەلی برابچووکی دەفرۆشین، کۆی پارەکە دەبێتە پێنسەد تمەن. هاوسەری ئێوە کەمێردەکەی دەبێتە پێنسەد تمەن، دەبێت پشکی گەرماوی خۆی لەگرەوی پێنسەد تمەن دابنێت، خۆیشتان ماڵەکەتان لەبری پێنسەد تمەن بخەنە گرەو. ئەمە دەبێتە هەزار و پێنسەد تمەن. دوای ئەوەی بوونە شێخولئیسلام، کەسێك کەقەوام ئەلئیسلامی زاوات دەبێت دیاری دەکەین تا لەداهاتەکەی ئێوە ڕۆژی دوو تمەن بۆ خەرجییەکانی ماڵەکەتان گل بداتەوە و ئەوەی دیکە بەقەرزارەکان بدات تا ئەو کاتەی قەرزەکەتان کۆتایی پێدێت. دوای ئەوەی ئیتر خۆتان دەزانن چی دەکەن. بەپلانەکەی من ڕازی بوو و لەماوەی حەفتەیەك، بەهاوکاری خۆم، پارەکەی کۆکردەوە. ڕۆژی ١٧ ڕەجەبی ١٣٣٢، خەڵات و فەرمانی شێخولئیسلامی و فەخرولعولەمایی و ئیفتیخارئەلعولەمایی بۆ ئەو بەڕێزانە ڕەوانە کرا. محەممەد کازم خانی نەسیر دیوان لەو کاتەدا خوازیاری فەرمانڕەوایەتی ئیسفەندئاوا بوو. حکومەت داوای پێنج هەزار تمەنی لێکرد تا حکومەتی ئیسفەندئاوای پێبسپێرێت. حاجی محەممەد خانی ئەرفەع ئەلمولکیش خوازیاری ئیسفەند ئاوا بوو، هەزار و پێنسەد تمەنیشی لەو وەرگرت و بەڵێنی بەهەردووکیاندا سبەی ئێوارێ لەماڵەوە بن تا خەڵات و فەرمانی فەرمانڕەوایەتییان بۆ ڕەوانە

بکرێت. ئەو دوو کەسە، دۆستان و ئاشناکانی خۆیان کۆکردەوە و شەربەت و چاییان لەخۆشی وەرگرتنی ئەو پێگەیە، دەبەخشییەوە و خۆیان ئامادە کرد. بەیانی دوو کاتژمێر بۆ ئێواریێ، خەڵات و فەرمانی بۆ حاجی ئەرفەع ئەلمولك نارد و نەسیر دیوانی داماوی پشتگوێخست و پارەکەی خوارد. ئەم جۆرە کردارانە لەم سەرداره بەرێزه دەبینرا. ڕۆژی ٢٦ شەعبانی ١٣٣٢ جەنگی جیهانی دەستپێکرد.

شەوێك سەرداری فەرمانڕەوا، حاجی بەهادور ئەلسەڵتەنەی بەدوای ئاسف دیواندا نارد تا بیست هەزار تمەنی لێ وەربگرێت بۆ ئەوەی پێگەی جێگری حکومەتی پێببەخشێت. ئاسف ئامادە نەبوو زیاتر لەپێنج هەزار تمەن بدات. لەم ناوەدا لەناو شار و دەوروبەر چەند ڕووداوێکی دزی ڕوویاندا و تاوانی ئەم کارەیان خستە ئەستۆی سەنجارخانی بەناوبانگ. سەردار، ڕودمێستەری ناچار کرد لەگەڵ دەستەیەك قەزاق بڕوات و سەنجار خان بێنێت. سەنجار خان لەگوندی مەیاوەروران بورج و قەلای بوو. قەزاقەکان شەوانە ڕۆشتن و گەمارۆیان خستە سەر بورجەکە. چەند قەزاقێك کوژرا و نەیانتوانی سەنجارخان بگرن. سەردار بەرودمێستەری وت: ئەم سەنجەرخانە لەکەسەکانی ئاسفە و ئاسف پێشتر، سەنجارخانی لەمەبەستەکەی ئێوە ئاگادار کردۆتەوە، کەواتە هۆکاری کوژرانی قەزاقەکان ئاسفە. سەرئەنجام ڕودمێستەر، ڕەزاخانی ماکزیمی لەگەڵ دەستەیەك قەزاق بۆ ماڵی ئاسف نارد. ئاسفیان گرت و بردیانە قەلای حکومەتی. هەرچەند هەوڵیاندا ئەو بڕە پارە داواکراوە بدات و خۆی ڕزگار بکات، ئاسف ڕازی نەبوو. سەرئەنجام سەردار ئەوی ڕەوانەی تاران کرد. بەمشێوەیە بازاڕی فێڵ و تەڵەکەبازی دەستپێکرد و بوو بەهۆی نەمانی باوەڕ بەمەشروتە و مەشروتەخواز و وشەی مەشروتە لەناو خەڵکان بەمانای کوشت و کوشتار و تاڵانکردن دەهات. هەرکەس هەرکەسی دەکوشت یا شوێنێکی تاڵان دەکرد، دەیانوت: مەشروتە ڕوویدا. بەمەیش قەناعەتیان نەکرد و لەهەر شوێنێك منالێکی جوانیان دەبینی، بەبیانوی جۆراجۆر تەڵەیان بۆ دەنایەوە و دەیانوت مەشروتە کرا.

لەسەرەتاکانی زیحەججەی ١٣٣٢، دەستەیەك لەزاناکان و بازارییەکان لەمزگەوتی هاجەر خاتون کۆبوونەوە تا تاران لەستەمکارییەکانی سەردار ئاگادار بکەنەوە. سەردار بەخێرایی دەستی بەسەر بروسکەخانەدا گرت و تۆپی بردە سەر دیواری قەلاکە و مزگەوتی هاجەرخاتوونی کردە نیشانە و ڕایگەیاند ئەگەر بلاوەی لێنەکەن، مزگەوتەکە تۆپباران

دەکات. سەرئەنجام خوسرەخانی ئیفتیخار ئەلوەلات و موشیردیوان بوونە نێونجیگەر و بڵاوەیان بەکۆبوونەوەکە کرد. ڕۆژی دواتر مەلا عەبدولفەتاح کەیەکێك بوو لەو کەسانەی لەمزگەوتی هاجەرخاتوون کۆببوویەوە، ڕۆشتە گوندی حسەینی و لەوێوە ڕۆژی ٧ زیحەججە بەرەو تاران بەڕێکەوت و پەیوەستی ئاسف بوو. حاجی بەهادور ئەلسەڵتەنە بەسەردار دەڵێت: کۆبوونەوەی مزگەوتی هاجەرخاتون و ڕۆشتنی مەلا عەبدولفەتاح بەهاندانی ئاسف بووە. بیستوومە فلآنەکەس و دەستەیەکی دیکە دەیانەوێت بەرەو تاران بەڕێکەون ئەگەر ڕێگەیان لێ نەگیرێت، داهاتوویەکی باش چاوەڕوانمان ناکات. دوو ڕۆژ دواتر سەردار کەسی بەدوای مندا نارد، وتی: بیستوومە ئێوە بەهاندانی ئاسف دەتانەوێت بەرەو تاران بەڕێکەون. ئەم کارە دەبێتە هۆی پەرێشانی کاروباری وڵات و من بەنوێنەرایەتی دەوڵەت، لێپرسراوی بڵاوکردنەوە و گەڕاندنەوەی ئارامیم بۆ ناوچەکە. بەڕاشکاوی دەڵێم ئەگەر کەسێك بێ مۆڵەتی من بۆ شوێنێك بڕوات، ڕێگری لێ دەکەم. وتم: من بۆ جیهاد دەڕۆم و لەگەڵ دەستەیەکی دیکە دەمانەوێت بەمەبەستی جیهاد بڕۆین. وتی: بۆ جیهادیش دەبێت مۆڵەت لەدەوڵەت وەربگرن. وتم: ئێمەیش تا مۆڵەتی دەوڵەت وەرنەگرین، ناڕۆین. بەیانی، سێ پۆلیس هاتن و لەبەردەم ماڵی ئێمەدا دانیشتن. پیاوەکانم لەهۆکاری هاتنی ئەوانیان پرسی. وتبوویان: ڕاسپێردراوین لێرەدا بین و ڕێگە نەدەین فلآنەکەس بۆ هیچ شوێنێك بڕوات. لەناو شاریش بۆ هەر شوێنێك بڕوات، یەکێك لەئێمەی لەگەڵ دەبێت. منیش گرنگیم پێنەدا و هیچم نەوت. دوو ئەسپم لەناو شارەکەدا هەبوو، لای ئێوارێ، بەبیانوی ئەوەی ڕێگەی سەفەر کردنم لێگیراوە، فەرمانمدا بیانبەنە دەری شار و لەشوێنێکدا ڕایانبگرن. دواتر، دوای شەش کاتژمێر لەشەو، لەڕێگەی تەپولەوە بیانبەنە ماڵی شێخ عارف بێ ئەوەی کەس ئاگادار ببێتەوە. ڕۆژی دواتر ئەمان الله خانی وەکیل ئەم بابەتە دەبیستێت و دەڕوات گفتوگۆ لەگەڵ سەردار دەکات بەڵام هیچ ئەنجامێکی دەستناکەوێت. بەیانی شەوەکەی، شەوی ١٤ سەفەر، دوای پێنج کاتژمێر لەشەو، لەگەڵ میرزا عەبدولحەمید لەڕێگەی ماڵی ئیبراهیم خان، دراوسێی کوڕی ئیفتیخار ئەلوەلات بەرەو خوسرەوئاباد ڕۆشتین. ماوەی چوار شەو و ڕۆژ بێ ئەوەی کەس ئاگادار ببێتەوە، چاوەڕوانی هاوڕێکانمان دەکرد. حکومەت هەموو ڕۆژێك بۆ دۆزینەوەی ئێمە، هەموو ناوچەکان و ڕێگەکان دەگەڕا، بەڵام بەڕێکەوت نەیانتوانی ئێمە بدۆزنەوە. تەنیا دەمانچەیەکم پێبوو، کەسێکم نارد بۆ لای حیشمەت ئەلمولك و چەند

دەمانـچەیەکی دیکـەم وەرگـرت. شـەوی پێنجـەم کـەبڕیاربوو هـەمووان لـەماڵی خۆیانـەوە بەڕێکـەون و لـەپردی قشلاق پەیوەسـتی یـەك ببن، دووای دوو کاتـژمێر لەشـەو، ئیحتیـشام دیـوان یـەکێك لـەپیاوەکانی خـۆی نـارد کەسـەربازەکانی حکومـەت دەوری مـاڵی حیـشمەت ئەلمولکیان گرتووە. منیش زۆر لەسـەر خۆ و لەترسی ئەوەی نەکا، دەوری ماڵەکەی منیش بگرن، لەشار هاتوومەدەر. لەگوندی سیلسیله چاوەڕوانی فلانەکەسم. ئێمەیش نانی شەومان خـوارد کاتـژمێر شەشی شەو، سوار بووین و لەبەردەم ماڵی حاجی بەهادور ئەلسەڵتەنە، سەرۆکی سەربازەکان کە لەماڵەکانی حاجی ئیحتیشام دیوان نیشتەجێبوو، گوزەرمان کرد. لەماڵـەوە و لـە١٨ سـەفەر، تۆمـارێکی گـەورەم سـەبارەت بەهەرەشـە و سـتەمکارییەکانی حکومەت نوسیبوو، لەدەرگاکەوە فرمدایە ژوور و ڕێگەی خوسرەوئابادم گرتەبەر و لەڕێگەی حەسەن ئابادەوە بەڕێکەوتین. هەموو شوێنێك بەفر بوو، جادەکەمان دەبینی. لەهەر شوێنێك بەفرەکـە توابوویـەوە، بـەدژواری جادەکـەمان بـۆ دەدۆزایـەوە تـا ئـەوەی گەشـتینە لێـواری ڕووبارەکـە و ویـستمان لەئاوەکـە بپەڕینـەوە. ئەسـپەکەی میرزاعەبدولحەمیـد کەوتـە نـاو زۆلکاوێك و تفەنگەکـەی کەوتـە نـاو ئاوەکە. میرزا عەبدولحەمید ویستی جلـەکانی دابنێت. بینیم لـەو هـەوا ساردەدا دوور لەویژدانە ڕێگـە بدەم ئەو کارە بکات. وتم: لێرەدا بێستن تا شوێنی تفەنگەکە ون نەبێت تـا دەڕۆمە گوندی قەیسەر و دەگەڕێمەوە. بەخێرایی ڕۆشتمە گوندەکە و دوو کەسم هێنا. یەك لەوان ڕۆشتە ناو ئاوەکە، تفەنگەکەمان دۆزییەوە و ڕوومان کردە ماڵی کوێخا. ئاگریان خۆشکرد. میرزا عەبدولحەمید کەهەموو گیانی تەڕ ببوو، خۆی وشك کردەوە.. منیش تفەنگەکانم پاككردەوە، ئەسپەکانمان حەوانەوە و سێ کاتـژمێر بۆ نوێژی بەیانی، لەقەیسەرییە بەڕێکەوتین. نانی نیوەڕۆمان لەگوندی سەمران خوارد و بۆ شەو گەشتینە ڕەمشت. لەوێ سێ سواری دیکـەمان هـەڵگرت، بورمەکان و گەرگـەڕ و سـەرپمول و ئاگا و لەوێوە ڕۆشتینە کەل سپی ماڵی مەنسور ئەلسوڵتان ئەمیر ئەمجـەدی کـەلیایی. لەوێ سـوارێکمان بـەدوای ئیحتیـشام دیوانـدا نـارد. هاتـە کـەل سـپی. شـەوی دووەم مۆڵـەتی گەڕانەوەمان بەسوارەکانی ڕەمشتیدا. چوار قۆڵی بەرەو هەمەدان بەڕێکەوتین. نزیك بانگی بەیانی، گەشتینە گوندی ئابشنە. دوو شەو لەماڵی زیائەلمولکی هەمەدانیماینەوە. ئەو دوو شەوەمان بەگفتوگۆ کردن لەگەڵ سارم ئەلسەڵتەنە و زیا ئەلمولك و ئیعتیماد ئەلدەولە، کوڕی خوالێخۆشـبوو بەهائـەلمولك بەسـەر بـرد. ڕۆژی سـێیەم لەڕێگـەی عێراقـەوە بـەرەو تـاران

بەڕێکەوتین و یەك لەدوای یەك مەنزڵەکانمان بڕی. شەهوە، ئیبراهیم ئاوا، سەرخاب، راجەرد، سەلفەچکان، کاروانسەرای سەنگی (تەرلاب)، قوم، مەنزەرییە، کۆشکی نوسرەت، قەڵای محەممەد عەلی خان، رووباری شور، حەسەن ئاوا، کەهریزەك، تاران. شەوی یەکەم، ئاسفمان لەگەیشتنی خۆمان ئاگادار کردەوە و لەبەیانییەوە شوێن کاروبارەکانی فەرمانڕەوا کەوتین. لەگەڵ هەرکام لەوەزیر یا وەکیلەکان قسەمان دەکرد، بەترسەوە وەڵامیان دەدایەوە. لەگەڵ بەڕێوبەرانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش گفتوگۆمان کرد تا ستەملێکراوی و دەستدرێژییەکانی فەرمانڕەوا لەناو ڕۆژنامەکانی خۆیاندا بڵاو بکەنەوە. تا ئەوەی یەکێك لەهاوڕێیان بەشێوەیەکی نهێنی پێی وتم: چالاکییەکانی ئێوە دژی سەرداری موحیی نەك بێ ئەنجام بەڵکو مەترسیدارە چوونکە ئەم کەسە لەحزبەکانی دیموکرات، ئیعتیدال (میانڕەو)، ئیتیفاق و تەرقی وهتد... ئەندامە. میرزا کەریم خانی برای وچەند کەسێکی دیکە کۆمیتەیەکی تایبەتن و پەیوەندییان بەکەسێکی بەرزتر هەیە و خوازیاری گۆڕینی دەوڵەتن، ئێستا وەزیر یا وەکیل یا کاربەدەستان چۆن دەوێرن گوێ لەوتە و داواکارییەکانی ئێوە بگرن. ئەگەر دەکرێت ڕێگەی سازان لەگەڵ ئەو بگرنەبەر و کەریم خان ئاگادار بکەنەوە. جیاواز لەوە دەبێت شەو و ڕۆژ ئاگاتان لەخۆتان بێت بۆ ئەوەی گرفتاری بەڵا نەبن. سپاسی ئەم هاوڕێیەم کرد بۆ ئەوەی ڕاستییەکانی بۆ ڕوونکردمەوە. منیش ناچار بەپێی یاسای کردەوە دژی کردەوە، خۆم پەیوەستی یەکێك لەسەرداراە بەڕێزەکان کرد و بەهۆی ئەو کەسەیەوە، بەڕێوبەری گۆڤاری شەهابی ساقیب ئامادە بوو، بابەتەکەم لەگۆڤارەکەیدا بڵاو بکاتەوە. بێ لەدەستدانی کات ئەم ستەمنامەی خوارەوەم کەپێشتر پێشکەشی وەزیرەکان و مەجلیس کردبوو، بەبەڕێوبەری ڕۆژنامەی شەهابی ساقیبدا و ئەویش بڵاوی کردەوە.

## سکاڵا لەفەرمانڕەوایەکی مەشروتەخواز

بۆ بەڕێز، پاشای خۆشەویستی و بەختەوەری ئێران، بۆ هەموو وەکیلە بەڕێزەکانی پارلمان، وەزیرە بەڕێزەکان، هەموو نیشتمان پەرەستەکان و ئازادیخوازانی ئێران، پشتیوانانی دادپەروەری، بەوردی و ئاسوودەیی، ناوەڕۆکی ئەم ستەمنامە کەماوەیەك بەر لەئێستا بۆ وەزیرە بەڕێزەکان، پەرلمانمان نارد، بخوێننەوە چوونکە جادووگەرە مەشروتە ئاساکانی نەتەوەخۆریان بناسن و بۆ فەرمانڕەوایی کردنی هیچ شوێنێك ڕەوانەیان نەکەن و دانیشتووانی وڵاتیش خۆیان لەوان بەدوور بگرن چوونکە لەماوەیەکی کەمدا چەندە بەڵایان

بەسەر ئێوەدا هێنا و چەندە ستەمی گیانبڕیان بەسەر دانیشتووانی کوردستاندا سەپاند کە ئەم تۆمارە دوورودرێژە، تەنیا بەشێکی بچووک لەو هەموو ستەمەیە و ئەم وشە و ڕستانە، توانایی ئاشکراکردنی و نووسینی پێرسیتی ستەم و ستەکارییەکانی ئەوانی نییە کە لەماوەی هەشت مانگ، ئەم حکومەتە ئازادیخوازە زیاتر لەدووسەد هەزار تمەنی بەهەزاران شێوەی نەشیاو بۆ وتن لەدانیشتووانی بەدبەخت و زەحمەتکێشی کوردستان وەرگرتووە.

پێرستی ستەمنامەکە: بەرێزی پاشا، بەرێزی سەرۆك وەزیران و وەزیرە بەرێزەکان، سەرنجڕاکێشە کە بەبوونی ئەو هەموو پیاوماقووڵ و ناودارە لەتاران، کەسێکیان بۆ حکومەتی کوردستان دیاریکردووە کەشارەزای کاروباری بەڕێوەبری وڵات نییە. جگە لەدرهەم و دینار هیچی دیکە ناپەرستێت و جگە لەفێڵ و تەڵەکە، هیچ ئایین و دینێکی نییە. خۆشحاڵی و بەختەوەری خۆی، لەبەدبەختی و هەژاری مسکێنەکان دەبینێتەوە. بەردەوام بۆ بەدەستهێنانی پارە و داهاتی نایاسایی، ئازاری هەژار و نەدارەکان و سەرقاڵی ئەشکەنجەی بەدبەختەکانی ڕۆژگارە. نە لەخواوەند و پێغەمبەر شەرم دەکات و نە لەدەوڵەت و وەزارەتە بەرپرسەکانی خۆی دەپرسێت. ئاشکرایە بەم بارودۆخە کەسانی هەژار لەدەست ستەمەکانی ئەم سەردارە ئازادیخوازە، چی دەکێشن و لەژێر چ گوشار و ئەشکەنجەیەکدان. یەکێك لەستەملێکراوان سەبارەت بەو دەڵێت:

ئەوەی سەردار لەگەڵ ئێمە کردی
شیمری بەنەعلەت کراو شەرمی لێدەکات
ئەو ستەمانەی ئەو لێمانی دەکات
دڵی چەنگیزخانی هەژاند
دەورەی نمرود و دەورەی شەدادی
لەناوبرد و ئەوانی سڕییەوە
ڕۆژی کەربەلامان لەبیر کرد
لەو ستەمەی ئەو لەئێمەی کرد
گرنگی بەداد نادات
وستەم و ستەمکاری کردۆتە پیشە
ڕەگی زوڵم و ستەمی چاندووە

باخی مەشروتەی ئاوەدان کردۆتەوە
هەموو فەرش و ڕاخەرەکانی تالآن کرد
خەڵکانی هەژار و نەدار کرد
لەستەمەکانی ئەو، کوردستانییەکان
هەموویان دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردۆتەوە
ئەوەندە گریایین و شینمان کرد
دەڵێی هەموو ماڵێك پرسەی هەیە
هەرچەند نازناوەکەی موحییە بەڵام
کردەوەکانی هەموو شتێکی لەناو بردووە
ئێستا چوونکە نەقدینە (پارەی نەقد) نەماوە
تەماحیکردۆتە جلوبەرگ و عاباکان
جلوبەرگی کچان و ژنان
دەرفێنێت و تالآنی دەکات
بەکورتی لەباسی کردەوەکانی ئەو
ناتوانین بڵێین کەچی کردووە
ئەوەی وتمان ستەمە دیارەکانن
هاوار لەو ستەمانەی بەنهێنی کردوویەتی
نهێنی چی؟ ئەوەی کردوویەتی بەشەو و ڕۆژ
ڕۆژگار هەمووی ئاشکرا کردووە
تا ئەو کاتەی زمان لەدەمماندا دەسوڕێت
تا ئەو کاتەی خواوەند ژیانی بۆ دیاریکردووین
نفرین لەو کەسە بێت کەیەکەمجار
ئێمەی گرفتاری ئەم بەڵایە کرد.

هەم پێنووس لەباسکردنی کردەوە شەرمێنەرەکانی ناتەوان و هەم زمان لەگێڕانەوەی کردەوەکانی. بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم کەکردەوە بێ بەزەییەکانی ئەم سەردارە ئازادیخوازە، گورزێکی کوشندەی لەشەرافەتی دەوڵەتی ئێران و ئابڕوی نەتەوەی ئێرانداوە و مەشروتە و

مەشروتەخوازی بەدناو کرد. بەتایبەت حزبی ئیتیفاق و تەرەقی کە بەهۆی کردەوەکانی ئەم ناوزڕاوە، ئەوەندەی دیکە ناویان زڕا و بەدناو بوون.

ئەگەر لەخەڵکانێك، کەسێك کارێکی نەشیاوی ئەنجامدا، نەپێگە بۆ کەس دەمێنێتەوە نەجێگە. لەجۆری ئەم کەسە بێ ویژدانانە، تەنیا بۆ پڕکردنی گیرفان و مژینی خوێنی خەڵکە هەندێ کات وەك ئەندامێکی ئیتیفاق یا تەرەقی دەناسێنن و هەندێکات جلوبەرگی میانڕەوی لەبەر دەکەن. هەندێکات شۆڕشگێڕن، هەندێکات دیمۆکرات، هەندێکات شوێنکەوتەی دەوڵەتی ڕووس و هەندێکات شوێنکەوتەی دەوڵەتی ئینگلیس و ڕۆژێکی لەژێر سەرپەرەشتی دەوڵەتێکی دیکەدان و هەرسات سەرقاڵی تاڵانکردن و هەردەم لەجلوبەرگێکدا بەتەمای وێرانکردن و لەناوبردنی خەڵکانن. ئەگەر بەرپرسانی دەوڵەت لەڕاستی ئەم تۆمارە گومانیان هەیە، بەپێی ئەم ئەماننامە لەمەحکەمەی ویژدانی هەموو مرۆڤەکان بەڵێن و پەیمان دەبەستم کەدوای ئامادە کردنی سەرداری موحیی، لەدادگای تاران، بەئامادە بوونی نوێنەری وەزیرە بەڕێزەکان، هەموو ئەو ستەمانەی سەردار لەکوردستانییەکانی کردووە و هەموو ئەو پارانەی وەریگرتووە کەقەرەبوو کردنەوەی بۆ دەوڵەت بەئاسانی ئەگەری نابێت، یەکیەك، بەبەڵگەوە نیشان دەدەم و دەیسلەمێنم. ئەگەر دانیشتووانی کوردستان لەکردەوە ستەمکارانەکان و گوشارە بێ بەزەییانەکانی ئەم سەردارە بەدکردارە و هێرشی گورگئاسای کەمتیارەکانی دەوروبەری، بێزار نەبوون، بۆچی لەهەوای ساردی زستان، دەستەیەکی وەك شێخ عارف و حاجی شێخ ئیبراهیم و حاجی شێخ عەبولحەمید و هتد. کەبەرپرسانی دەوڵەت وەڵامی سکاڵا و گازندەکانیانی ئەوانیان نەدایەوە، و لەدادخوازی دەوڵەت بێ هیوا بوون، بەبیانووی جۆراوجۆر، وڵاتیان بەجێهێشت تا کاریگەرییەکانی ستەمکاری سەردار دەرکەوێت، یا بۆ دەستەیەکی دیکە لەزاناکان و پیاوماقووڵانی کوردستان، کەهیچکات ئامادەی بەجێهێشتنی وڵات و نیشتمانەکەیان نین و دژی دەوڵەت و یاساکانی دەوڵەت نین، بەمەبەستی هاتن بۆ تاران هەشتا فەرسەخیان بڕیوە و لەم تۆفان و باهۆزەدا کەهەوری دەستدرێژی کردن و گومانەکانی دەوڵەتانی دراوسێ و سوڵتانە بێگانەکان، ئاسمانی وڵاتی داپۆشیوە و هەورەبروسکەی هێرش و پەلامارەکانی ئەوان مەترسی لەسەر سەربەخۆیی وڵاتەکەمان دروستکردووە، لەکاتێکی ناکاتی وەك ئەمە خوازیاری بینین و دادخوازی وەزیرە بەڕێزەکان بووین و یا ئەگەر سەرداری خراپەکاری ستەمکار بەهۆی زەخت و ئەشکەنجە بڕە

پارەیەکی زۆری لە هەزارەکانی کوردستان وەرنەدەگرت، ئەم هەموو سامان و ئەسپە گرانبایی و فەرش وڕاخەرە بەهادارانەی لەکوێ دەستدەکەوت یا لەکوێی هێناوە و یا کام گەنجی لەکوردستان دۆزیوەتەوە کەئەم هەموو پارەیە وەك بەرگی خەزان بۆ تاران ڕەوانە دەکات تا گالیسکە و کەلوپولی ناومالی بۆ ئامادە بکەن و جۆرەها شێوەی سەیروسەمەر، بێ شەرمکردن و گرنگیدان بەشعوری خەڵکان، بۆ ئەو دروستکردووە و لەبەرچاوی بەرپرسانی دەولەت ئەو بەکەسێکی ئازادیخواز و مەشروتەخواز نیشان دەدەن و هەموو ڕۆژێك بەبلاوکردنەوەی بابەتی درۆینە و بێ بنەما، بەشان و بالیا هەلدەدەن و بەتۆمەتی ناڕەوا ستەملێکراون دەترسێنن و دەیتۆقێنن و بەمشێوەیە دەیانەوێت دیوارێك بەدەوری خراپەکارییەکانی ئەودا بکێشن. وەزیرە بەڕێزەکان، چ کێشەیەك هەیە سەبارەت بەم وتارە بێ بنەمایانەی هەموو ڕۆژێك بەناوی دانیشتووانی کوردستان چاپ و بلاو دەکرێتەوە و هەمووی بەپێنوس و واژۆی دەستوپێوەندەکانی سەردار موحییە، لێکۆلینەوە بکەن کەئەم حکومەتە دادپەروەرە، ئاسایشی بۆ کام سنورە گەڕاندۆتەوە و ئەمنیەتی بۆ کام ناوچە دابینکردووە و کام عەشیرە سەرکێشە و یاخییەی دەستەمۆ کردووە؟ یا بۆ ڕێگرتن لەتالانکاری و دزیکردن، چ کردەوەیەکی ئەنجامداوە؟ کام شەوەیە دەنگی تەقە و دزی بەرز نابێتەوە؟ کام ڕۆژەیە خراپەکاران لەناو کۆلان و بازاڕ خراپەکاری و ئازاری خەلکان نادەن؟ چ کەسێك کاکە براناوی داماوی لەگەل مال و منالەکەی و لەمالەکەی خۆیدا سەربڕی و دوای دوو شەو و ڕۆژ خەلکان زانیان؟ کێ مالی جوولەکەکانی تالان و جوولەکەکانی کوشتارکرد؟ ئەگەر ئەم حوکمڕانە ئازادیخوازە بەو ئەندازەی خۆی دەلێت کوردستانی کردۆتە گولستان، بۆچی لەڕۆژی ڕووناك، لەناو تەویلەی حکومەتی، ئەسپەکەی خۆیان دزی و یا چۆن کەسە خراپەکانی ناوشار لەبازاڕ پیاوەکەی ئەویان لەئەسپ هێنایەخوار و ئەسپەکەیان لێسەند و یا لەهەمووی کەم بەهاتر، بۆ لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆی نەیتوانی سەنجارخان لەکەنار شارەکە دووربخاتەوە؟ ئەگەر کوردستان ئەمن و سنورەکان ئارامن، بۆ گوندەکان و پەیوەندی خاوەن مولکەکان هێشتا لەدەسەلاتی عەشیرەکانی سەرسنوردایەی و بۆ مالیاتی دەولەت نادەن و سەرۆکی دیوانی دارایی بۆ هاواری بەرز بۆتەوە کەمالیاتی سەرسنور ناگات؟ وشتر مانگا پلنگ یانی ئەمە. کۆسەی ڕیشپانیش ئەمەیە کەدەیبینین و دەیبیستین. چی ڕوودەدات ئەگەر دەولەت بپرسێت، دەرئەنجامی هێزی قەزاق و تۆپخانە کەڕەوانەی کوردستان کرا، چی

بوو؟ و لەئەنجامی ئەو هەموو خەرجییانەی کەوتە سەرشانی دەوڵەت، دەوڵەت چی دەستکەوت؟ جگە لەوەی ئەو هێزە، توانایی خۆیان لەدەستدا و هاوشێوەی مریشکی بەکڕ، لەماڵەوە بەکڕ کەوتوون و هەموو پارەکانی دەوڵەتیش بۆ ڕاوی باڵندە ماڵییەکان تەرخانکرا و بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم زەرەر و زیانە کەوتە گیانی داماوان و هەژاران و بەدبەختی کردن و لەماوەیەکی کەمدا زیاتر لەدووسەد هەزار تمەنی لەخەڵکانی داماو و نەدار وەرگرت!!!.

ئەوەیش بڵێین ئەو هێز و توانایییە لەیەك ڕۆژدا کەڵکی لێوەرگیرا. بەڵام ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێك بوو؟ ئەو ڕۆژەی هەموو زاناکان و پیاوماقووڵانی کوردستان لەمزگەوتی هاجەرخاتوون، خوشکی ئیمام ڕەزا، کۆبوونەوە تا بەبروسکە، دەوڵەت لەو ستەمانەی لێیان دەکرێت ئاگادار بکەنەوە. لەناکاو بینیمان ئەو تۆپەی بۆ لەناوبردن و سەرکوتکردنی دوژمنان ڕەوانەی کوردستان کرابوو، بەفەرمانی سەرداری ئازادیخواز برایە سەر دیواری قەڵاکە و مزگەوتەکەی کردە نیشانە. ئەو ئیمامزادەیەی براکەیان لەخوراسان تۆپباران کرد. (ئاماژەیە بۆ هێرشی رووسەکان بۆ سەر گۆڕی ئمیام ڕەزا.)

هاوار لەحاڵی ئەو کەسانەی کەبەو ڕاخەرانەی تاروپۆکەی ئاه و ناڵەی پیرێژنەکان و نەخش و نیگارەکەی نفرینی چارەڕەشەکانە، نەتەوەیەکی ستەملێکراو دەفرۆشن و بەهەزاران بیانو و پاساو، کاربەدەستان و بەرپرسانی دەوڵەت بەلارێدا دەبەن، بەدبەخت ئەو کەسەی بۆ بەختەوەری دنیا، لەقە لەشەرافەتی مرۆڤایەتی دەدات و پشتیوانی لەخیانەتکاران و نەیارانی وڵات دەکات و پشتیوانی لێدەکەن. وەکیلە بەڕێزەکان، وەزیرە بەڕێزەکان، ئەم حکومەتە ئەگەر دیکتاتۆرییە، ئەم ماف و مانگانەیە چییە کەهەموو سەری مانگێك بەناوی یاسای ماڵیاتی دەوڵەت لەخەڵکی وەردەگرن و ئەگەر حکومەت یاساییە، ئەم هەموو زوڵم و ستەمە لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت و ئەم هەموو سامانە چییە کەپێچەوانەی یاسای لەخەڵکانی وەردەگرن.؟

لە کام سەردەمەدا ئەم هەموو ستەمە لەخەڵکان دەکرێت؟ لەکام دەوڵەتی مەشروتە، بەمکردەوانەی حوکمرانەکان ڕازی دەبن؟ ئەگەر دادپەروەری و مەشروتە ئەمەیە، هەزار ڕەحمەت لەدیکتاتۆری و پاشایەتی.

وەکیلە بەڕێزەکانی پەرلمان، وەزیرە بەرپرسەکانی ئێران، هاوار، ئەی بەڕێوبەرانی نەتەوەیەکی بیٚ چاو و زمان، بیرتان بێتەوە ئەو کاتژمێرەی بەنییەت پاکی، لەپارلمان

لەبەرچاوی خەڵکان وەستان و دەستان خستە سەر قورئان و سوێندتان بەخواوەند خوارد کەقورسایی لێپرسراویەتی خەڵکانتان گرتۆتە ئەستۆ. بەهەمان قورئان و بەویژدانی پاکی مرۆڤایەتی سوێندتان دەدەم، ئایا مەرجی وەکیلی و وەکالەت تەنیا سوێند خواردنێکەوە بەس، بەپێی سوێندەکە، پێویستە ستەملێکراو لەدەستی ستەمکار ڕزگار بکەن؟ ئایا ئەرکی وەزارەت و بەڕێوەبردنی وڵات تەنیا گەیشتن بەپێگەی وەزیری و بەڕێوەبردنی وڵاتە؟ یا دەبێت داد بۆ هەژارەکان بگێڕنەوە؟ ئایا نەتەوەیەکی نەزانی وەك ئێمە، ئێوەی تەنیا بۆ سوێندخوادرن و گرتنی کورسییەکانی پارلمان و وەرگرتنی مانگانە بەبڕی.... دیاریکردووە؟ یا بۆ گرنگیدانە بەبەدبەختییەکانی هەژارەکان و بەزەیی هاتنە بەحاڵی پەرێشانی وڵات؟ سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا شیاوە لەنەورۆزی هیواداری، لەجەژنی تاج لەسەردانانی پاشای گەنجی بەختەوەر، لەجیاتی جەژنانە و دیاری، لەجیاتی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵکان و بڵاوکردنەوەی دادپەروەری، کەسانی بکوژ و بێ بەزەیی وەك سەردار، کەوەکیلەکان و وەزیرەکان ئاگاداری کار وکردەوەکانی ئەوانن، بۆ فەرمانڕەوایەتی وڵاتی ستەملێکراو و بەلادیتو و لەدەستچووی کوردستان، کە لەهەموو ڕەهەندەکانەوە شیاوی بەزەیی و نیازمەندی هاوکارییە، رابسپێرن؟!!!

لەکام یەك لەدەوڵەتە مەشروتەکانی دنیا، ڕێگە پێدراوە کەسانی وەك ئەم سەردارە بۆ پێگە دەوڵەتییەکان دەستنیشان بکەن، یا لەکام ئایین و دینێك شیاوە جڵەوی کاروباری خەڵك و ناموس و شەرەفی نەتەوەیەکی ستەملێکراو بەکەسێکی خوێنڕێژ و تاڵانچی بسپێرن، جیاواز لەوە شمشێری گەوهەرنیشانی بۆ ڕەوانە بکەن!! خواوەند زانای نهێنییەکانە کەبەخشینی ئەم شمشێرە بەو کەسە خراپەکارانە، هاوشێوەی ئەوەیە تیغی بڕەر بدەیتە دەستی کەسێکی سەرخۆش و مەست..... تا بەو شمشێرە ڕەگ و ڕیشەی نەتەوەیەکی ستەملێکراو لەبنەوە دەربێنێت و پەیوەندییەکانی دەوڵەت و میللەت بپچڕێنێت کەئەنجامی زۆر مەترسیداری هەیە و قەرەبوو کردنەوەی بۆ دەوڵەت بەئاسانی ئەگەری نابێت و هیواکان بۆ بێ هیوایی دەگۆڕێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر حکومەت، سیاسەتمەدارێکی خۆش ئەخلاق بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان راسپێرێت، بەرادەیەك هیوابەخش و سەرەنجڕاکێشی خەڵکان دەبێت کەجارێکی دیکە پەیوەندییەکی تۆکمە لەنێوان دەوڵەت و میللەت بەرقەرار دەبێتەوە. ئەگەر لەڕەهەندی فەلسەفییەوە، کەمێك لەدەرئەنجامە مەترسیدارەکانی ئەم هەڵبژاردنە

نەنگینە وردببنەوە، بێگومان ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کەهەڵبژاردنی لەم چەشنەیە وڵات بەرەو وێرانی دەبات و ئەم ستەمانەیە میللەت لەناو دەبات و ئەم کردەوە زێڕپەرستانەیە، مسکێنەکان دەربەدەر و ئاوارە و ناچاریان دەکات پەنا بۆ دەوڵەتانی دراوسێ ببەن. ئۆباڵی هەموو ئەم کارەسات و دەرئەنجامانە لەئەستۆی ئێوەی وەزیر و وەکیلدایە. ئەگەر لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە لەکاروکردەوەکانی فەرمانڕەوکان هەبێت، بۆ نەتەوەی ئێران بەمشێوەیە ڕیسوا و بەدبەخت دەبن، یا ئەگەر دوو کەسی وەك سەردار دادگایی و ئیعدام بکات، ئیتر کام حکومەت و دەسەڵات بوێری ستەمکردن لەخەڵکانی دەبێت و یا کام ستەمکاری لەخوانەترس دەتوانێت یەك دینار بەپێچەوانەی یاسا لەکەسێك وەربگرێت؟

ئەگەر سزادان لەئارادا نەبێت، ترس نییە، ترس نەبێت، پەنا بەخوا، سوێند بەخوا ڕۆژێك دێت، خواوەند و ڕەسولێ، لەسەر ئەم کردەوانە لێکۆڵینەوە لەئێوەی وەزیر دەکات و دەبینن لەو کاترمێرەی نەتەوەی ستەملێکراو لەبارەگای ئیلاهی، داوێنی ئێوەی وەکیل و وەزیر دەگرێت و داوای ماف و دادی خۆیان لەئێوە دەکەن و لێتان وەردەگیرێت، بەڵام ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەئازاب و لێپرسینەوە نەبێت، چیتر قسەمان نییە. ئەگەر خۆتان بەموسوڵمان دەزانن و باوەڕتان بەقورئان و ڕۆژی لێپرسینەوە هەیە، ئەم پێچەوانەی ئیسلام و ئیسلامییەتە کەڕانەمەڕ تەسلیم بەشوان بکەن.

وەزیرە بەڕێزەکان، ئەی شوانەکان، تا گرفتاری ئەو گێژاوە مەترسیدارە و ئەو لێپرسینەوە کارەساتبارە نەبوون، فریای میللەت بکەون و ئەشکەنجە و ئازابەی سەر شانی میللەت مەهێڵن، ڕێگە مەدەن بەهۆی کاروکردەوەکانی خیانەتکاران، نەتەوەکەمان لەناو بچێت. ڕازی مەبن ئەفسانە و قسەی دەڵاڵ و وڵاتفرۆشەکان، وڵات بەرەو ڕووخان ببات و پاشای بێ تاوانی ئێمە خەمبار ببێت. ئێمە نەتەوەی ستەملێکراو هەرکات لەدادخوازی بەرپرسان بێهیوا ببین و خۆمان توانای بەرگریکردنمان نەبێت، یا پاشای خۆشەویستی خۆمان بەجێدەهێڵین و کۆچ دەکەین و یا هاوشێوەی هاوخەمەکانی خۆمان ناچار بەپشت بەڕێگەکانی دیکە دەبەستین. ئاهی دڵی ستەملێکراو هاوشێوەی سۆهانە، ئەگەری خۆی نەتوانیت هیچ ببڕێت، شتی بڕەر تیژ دەکات، بەڵام ئەوکاتە دەوڵەت چی دەکات؟ وەزیرەکان چی دەکەن؟ وڵات چی بەسەر دێت؟ ئەگەر بەزەییتان بەحاڵی ئێمە نایێتەوە و گرنگی بەسوێندەکەی خۆتان نادەن، لانیکەم بیرێك لەخۆتان و دەوڵەتە بێ تاوانەکەتان بکەنەوە. و

ما علینا الاالبلاغ المبین، الامر منکم و الیکم ولدیکم و السلام علیکم. پێشنوێژ و وتارخوێنی کوردستان.

بەبلاوکردنەوەی ئەم سکالآنامە، وەك ئەوەی لەتاران بۆمبێك تەقیبێتەوە، رەنگدانەوە و دەنگدانەوەی سەیروسەمەری لێکەوتەوە، نەیارەکانی سەردار و هاودەست و هاوکارەکانی، بەرگری کردن و هێرشکردنە سەر ئەویان دەستپێکرد بەتایبەت سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، بەڕێوبەری ڕۆژنامەی رەعد و ناسرئیسلامی دەشتی، بەڕێوبەری ڕۆژنامەی ئیستقلال و بەڕێوبەری ڕۆژنامەی تەنبیهی درەخشان و هتد... هێرشیان کردەسەر من و ئەوەی ڕێگەپێدراو و ڕێگەپێدراو نەبوو، لەتۆمەت و درۆ و بوختان بۆمنیان هەڵبەست و کەمتەرخەمییان نەکرد. منیش توندتر لەجاران وەلأمم دانەوە و بابەتێکی دیکەم دژی سەردار و بەڕێوبەری ڕۆژنامەکان تەسلیم بەڕۆژنامەی شەهاب ساقیب کرد کەبلاوی کردەوە. سەردێری ئەم بابەتەی دووەم ئەم هۆنراوەیە کەخواجە دەفەرمێت:

لەرکەبەری دێوکردار، پەنا بۆ خواوەند دەبەم

مەگەر شەهابی ساقیب هاوکاریمان بکات.

ئەدیبەکانی تاران دەیانوت خودی خواجە، شێعرەکەی بەم شێوە گونجاوە بەکار نەبردووە. لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە دووروودرێژ و نوسخەکەی لەهەموو شوێنێکدا هەیە، لەئاماژەدان پێی چاومان پۆشی. بەکورتی دوای چەند جارێك هێرشکردن و بەرگری کردن، سەردارمان لەجێگەکەی هەڵکەند و بروسکەی بانگکردنی ئەو لەلایەن سەرۆکایەتی وەزیرانەوە دەرچوو. لە ۲ جومادی الاوەلی ، سەردار موحیی لەکوردستانەوە بەڕێکەوت و لەگەڵ گەیشتنی بۆ تاران، مەبەستی سازان و ڕێکەوتن لەگەڵ بەرپرسە بەرزەکانی ولآتی کرد بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان بگەڕێتەوە. لەم کاتەدا ئاسف دیوان لەترسی گەڕانەوەی سەردار کەوتە جموجۆڵ، فەرمانی بەخاتوونی گەورە، دایکی هاوسەرەکەیدا دانیشتووانی شار بۆ ڕۆشتن بۆ بروسکەخانە ناچار بکات و ناڕەزایەتی و سکالأی خۆیان لەحکومەتی سەردار موحیی نیشانبدەن. لە ۲۷ جومادی الثانی تا ۱۲ ڕەجەب، دەستەیەك لەزاناکان و بازاڕییەکان لەبروسکەخانە و باخی فیردەوس کۆبوونەوە، خێوەتیان بۆ هەڵدان و بۆ هەر خێوەتێك ڕۆژانە دیاریکرا و خواردنیان بۆ دابین دەکرا و بەردەوام بروسکەی بێزارییان ڕەوانەی تاران دەکرد کە: ئێمە سەردارمان ناوێت، سەردارمان ناوێت، سەردارمان ناوێت.

هاوکات لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە، پەیوەندی سیاسی دەوڵەتەکان بۆ لای ئێران ڕاکێشرا و بەرژەوەندی پێویستی دەکرد ئێران ببێتە دوودەستە: دەستەیەك بەناوی موهاجرین بەسەرۆکایەتی نیزام ئەلسەڵتەنە و لایەنگری دەوڵەتی ئێران و عوسمانی لەدارئەلدەولەی کرماشان، دەوڵەتیان دامەزراند و دەستەیەکی دیکە لەگەڵ شا و مستەوفی ئەلمەمالیك و هتد، لەتاران مانەوە و پشتیان بەڕووسەکان بەست. هەردەستە، دەستەکەی دیکەی بەقاچاخ ناو دەبرد و لەدەرئەنجامی ئەمە، ئێران لەهێرشی وڵاتەکان پارێزراوبوو، بەواتایەکی دیکە ئێران کەڵکی لەم دۆخە وەرگرت. لەئەنجامی ئەم شۆڕشە، پەیوەندی نێوان من و سەردار بەهۆی کاربەدەستان و بەرپرسەکانەوە چاککرا بەو مەرجەی چاوپۆشی لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان بکات. منیش لەکۆتاییەکانی ڕەجەبی ١٣٣٣، لەگەڵ ڕێنوێنی پێویستی کاربەدەستە باڵاکان بۆ کوردستان گەڕامەوە.

## قۆناغی پشێوی یا قۆناغی عەشیرەگەری

دوای ئەوەی گەڕامەوە کوردستان، مامانۆف کەسەرۆکی قەزاقەکانی کوردستان بوو، ئیسماعیل خانی سوڵتانی بۆ لای من نارد کەبەم دوواییانە وەك ئەمیر لەشکری باکور هەڵبژێردرا وتی: لەتارانەوە بەمن ڕاگەیندرا، پێشنوێژی کوردستان بۆ هاوکاری ئاڵمانییەکان و عوسمانییەکان بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە و منیش دەبێت هاوکاریت بکەم. کەواتە پێویستە چاومان بەیەك بکەوێت، هەرجۆرە هاوکارییەك پێویست بێت، من درێغی ناکەم. بەخێرایی هەستم بەپیلان و مەبەستەکەی کرد. بێدرەنگ حاشام لێکرد و هەزاران فەرسەنگ خۆم لەسیاسەت دوورخستەوە. ئیسماعیل خانی سوڵتان، لەحاشا کردنەکەی من ئاگاداری دەکاتەوە بەڵام مامانۆف دڵنیا نابێت. بەهەمانشێوە کە لەکاتی بینین، بەردەوام هەوڵی دەدا لەڕێگەی چاو هەست بەنهێنییەکانی ناخم بکات. بەڵام ڕێگەی ئەو کارەم پێنەدەدا تا ئەوەی کۆتاییەکانی زیحەججە هەواڵ گەیشت چەند کەسێکی ئاڵمانی و ئوتریشی گەشتوونەتە ماهیدەشت.

مامانۆف بەشێکی هێزەکانی بردە کامیاران و میاندەربەند. لەکۆتاییەکانی موحەڕەمی ١٣٣٤، جەنگێکی قورس لەوێ ڕوویدا و مامانۆف پاشەکشێی کرد. دەستەیەکی لەفەقیە سلێمان بەجێهێشت و خۆی بۆ ناو شار گەڕایەوە و هێزەکانی دیکەی برد. شەوی پێنجشەممەی ١٨ موحەڕەم، سەردار ڕەشید و سەنجەرخان و دانیشتووانی گوندەکانی ئەو

ناوچە لەفەقیە سلێمان، گەمارۆیان خستە سەر مامانۆف. بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو، لەهەموو قۆڵەکانەوە هێرشکرایە سەر سوپای قەزاق، لەشارەوە دەستەیەك بۆ هاوکاریکردنیان ڕۆشتن. دوای جەنگێکی قورس کە تا ئێواریێ درێژەی کێشا، سوپای قەزاق، دوای زەرەر وزیانێکی زۆر و ٦ ئەسیر، ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر. ئێوارێی هەینی ١٩ موحەڕەمی موسیۆ شادۆ و کاپیتان ئوت و قونسوڵی ئاڵمان بەناوی موسیۆ نەریمان و موسیۆ ئیستیپانی خەزێنەدار و ئیبراهیم بەگ و میرزا غەفارخانی ڕەشپۆشی زەنوری و کەسانی دیکە هاتنە ناوشار. ڕۆژی دواتر سەردار ڕەشید، لەگەڵ سوپاکەی خۆی ڕۆشتە ناو قەڵای حکومەتی. دواتر محێدین بەگ، کەواندارى عوسمانی هاتە ناو شەهبەندرخانە. منیش ڕۆژنامەی (ندای اتحاد) نێدای ئیتێحادم چاپ و بڵاو کردەوە. لەکۆتاییەکانی ڕەبیع الاوەل شێخ عەلائەلدین و دەستەیەك هەورامی و مەریوانی گەیشتنە ناو شار. دواتر عەلی ئەکبەرخان سەرداری بەتوانای سەنجابی لەگەڵ هەزار و پێنسەد سوار هات. سەردار ڕەشید ڕێگەی نەدا بڕواتە قەڵای حکومەتی. سوپاکەی ئەو لەگەڕەکی قەتارچییەکان و خۆی لەگەڵ سەرکردە سەنجابییەکان لەماڵەکانی ئەعزاز ئەلمولك نیشتەجێ بووکەئێستا شوێنی پۆلیسی شارەکەیە. ڕۆژی سێشەممە ٤ ڕەبیع الثانی، شێخ عەلائەلدین و سوپاکەی بێ ئەوەی هیچ داهاتێکیان دەستکەوێت، گەڕانەوە. سەردار ڕەشید کەڕۆشتبووە گەڕووس، گەڕایەوە و ڕێگەی کرماشانی گرتەبەر. دواتر هەواڵی هاتنی مامانۆف بڵاوبوویەوە. جگە لەسەردار ڕەشید کەس لەشاردا نەمابوویەوە. ئەویش پارەیەکی زۆری لەئاڵمانییەکان وەرگرت و بۆ ڕێگرتن لەمامانۆف بەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە پیر محەممەد، ئاڵمانییەکانی بانگکرد و دوای گفتوگۆیەکی سەرەتایی و دانانی پلانێکی دە خاڵی، بۆ پاراستنی سەربەخۆیی ئێران، ئەوەی نیشانەی ئاڵمانی بوو وەك کڵاوەکەی سەر خۆی و سوارەکانی، فڕیدا و خستیە ژێرپێ و ڕێگەی ئیسفەندئابادی گرتەبەر. دوو سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە و دواتر بۆ ناوچەی سەنجابی گەڕایەوە. کاتێك ئاڵمانییەکان لەپیر محەممەد بۆ شار گەڕانەوە، دەیانوت: خوزگە لیرەکانمانی دەخستە سەر زەوی، باشتر بوو لەوەی کڵاوی ئاڵمانی فڕێبدات. ئێواری پێنجشەممە ٢٧ ڕەبیع ئەلثانی ١٣٣٤ محێدین بەگی کەواندار و مەحمود بەگی شەهبەندەر، کەسیان بۆ لای من نارد کەسوپای ڕووسەکان دێت. و ئێمە بەرەو هەورامان بەڕێدەکەوین، بەپێویستمان زانی ئاگادارت بکەینەوە بۆ ئەوەی بێ ئاگا نەبیت. ئەو شەوە محێدین بەگ و

مەحمود بەگ و حاجی شێخ عەبدولحەمید و محەممەد ئاغا و میرزا فەتح الله و نەسروڵلە ئاغا و حاجی ئەبولحەسەن و دەستەیەکی دیکە لەلایەنگرانی عوسمانی بەرەو هەورامان و مەریوان بەڕێکەوتن.

بەفر بەقورسی دەباری، منیش بۆ شەوی هەینی ٢٨ ڕەبیع الثانی لەگەڵ نیزامزادە و سلێمانزادە و ئەسکەندەرزادە و کەسێك بەناوی محەممەد ئەمینی شاتر بەرەو کەرجۆ بەڕێکەوتین. کاتێك ئێمە لەشار دەڕۆیشتین، سوپای ڕووس بەسەرۆکایەتی مامانۆف دێنە ناو شارەکە و سەرەتا دەڕۆنە ماڵی ئێمە. ماڵەکەم تاڵان و کتێبخانەکەم دەسووتێنن و کەرەستەکانی چاپخانەیش ئەوەی لەدار دروستکرابوو، دەسووتێنن وئەوەی لەسورب دەبێت، دەیتوێننەوە و دەیکەنە ئاو. ئێمەیش دوای چوار کاتژمێر لەشەو گەشتینە کەرجۆ. سالار فاتح و دەستەیەکی دیکە لەوێ بوون. دوای یەك کاتژمێر یەکێك لەپیاوەکانی سالار فاتح لەشارەوە هات و هەواڵی ڕۆشتنە ناوشاری مامانۆف و سوپای ڕووسیدا. لەبەر ئەوەی سالار فاتح پێشینەی هاوڕێیەتی لەگەڵ مامانۆف بوو و پێشتر پلەی سوڵتانی پێبەخشیبوو، لەم هەواڵە شادومان و هەمان شەو نامەی پیرۆزبایی بۆ نووسی. ئێمە بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو پێش ئەوەی وەڵامی نامەکەی سالارفاتح بێتەوە، بەرەو گوندی تەختە بەڕێکەوتین. سالار فاتح وتی: پێویست ناکات لەتەختە دوورتر بڕۆن، کاتێك وەڵامی نامەکەم بگات، دەڕۆمە شار و ئەمانیش بۆ ئێوە وەردەگرم و دەتوانن بۆ شار بگەڕێنەوە. ئێمە ڕۆشتینە گوندی تەختە و لەوێوە ڕۆشتینە گوندی نەییر ملکی سالار فاتح تا هەم لەهەورامان نزیك بین هەم لەسالار فاتح. دوو شەو دواتر، پێنج سوار لەلایەن سالار فاتحەوە هاتنە گوندەکە. وتیان: سالار ئێمەی بەدوای ئەسکەندەرزادەدا ناردووە چوونکە دایك و براکەیان لەشار گرتووە و ئەگەر خۆی بگەڕێتەوە، ئەگەری هەیە ئەوان ئازاد بکەن و گەرنە دەیانکوژن. ئەسکەندەرزادە لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە بەخێرایی تەسلیم بەپیاوەکانی سالار فاتح و بەرەو شار بەڕێکەوت. هەرچەند هەوڵمدا ڕێگەی لێبگرم بەڵام سوودی نەبوو. لەگەڵ گەیشتنی بۆ شار لەماڵەکەی خۆی زیندانی دەکەن تا قەواڵەی سێ دانگی گەرماوەکەی لێدەستێنن و دواتر ئازادی دەکەن. ئێمە بێ ئاگا لەم ڕووداوانە بۆ گوندی تەختە گەڕاینەوە تا هەم هەواڵێك لەئەسکەندەرزادە بەدەستبێنین و هەم بزانین سالار فاتح ئەمان نامەمان بۆ وەردەگرێت یا نە؟ شەوی دووەم دوای ئەوەی شێومان کرد و دەمانویست بخەوین، لەناکاو

بینیمان عەلی ئەکبەر وەلەدبەگ کەیەکێك لەپیاوەکانی سالارفاتح بوو لەگەڵ پێنج تفەنگچی کەرجۆ هات و وتی: سالار ئێمەی ناردووە تا بەپێی فەرمانی مامانۆف ئەوەی سیلاح و ئەسپتان پێیە، وەریبگرین و بیبەینە شار. خۆیشتان لێرە بمێننەوە تا چارەنووستان دیاریدەکرێت. هاوڕێکان لەم پێشهاتە ورەی خۆیان دۆڕاند بەلاّم من گرنگیم پێنەدا. وتم: ئەسپ و سیلاحەکەم بەئێوە نادەم، ئێستا کەوایە خۆم لەگەڵ ئێوە بۆ شار دەگەڕێمەوە، تا ئەسپ و سیلاحەکەم تەسلیم بەو کەسە بکەم کەمامانۆف فەرمانی دەدات. عەلی ئەکبەر لەوتەکانم سەریسوڕما، کەمێك بیرکردەوە و وتی: کەواتە مۆڵەت بدەن، من دەڕۆمە ماڵی کوێخا، تفەنگچییەکان لێرە دەبن بۆ ئەوەی بەیانی پێکەوە بەڕێکەوین. وتم: تفەنگچی ماڧ ئەوەی نییە لای ئێمە بمێنێتەوە، ئەوان با بڕۆنە ماڵی کوێخا و خۆت لێرە بمێنەرەوە تا بەیانی پێکەوە بەڕێکەوین. عەلی ئەکبەر تفەنگچییەکانی ناردە ماڵی کوێخا و خۆی لای ئێمە مایەوە. دوای نیو کاتژمێر چراکانمان کوژاندەوە و خەوتین. عەلی ئەکبەر تفەنگ و قەتاری فیشەکەکانی خستە ژێر سەری و لەخوارەوە و لای دەرگاکە خەوت. زۆری نەخایاند دەنگی پرخەی عەلی ئەکبەر بەرز بوویەوە. بەخێرایی نیزامزادە و سلێمانزادەم لەخەو هەستاند، تاقم و تفەنگیان بەست و بۆ ڕۆشتن ئامادە بووین. کاتێك گەشتینە بەردەم دەرگاکە، بەمەبەستی رابواردن، تفەنگەکەمان لەژێر سەری عەلی ئەکبەر دەرهێنا، کلاّوی جامانەکەیمان هەڵگرت و هاتینەدەر. لەناو حەوشەکە محەممەد ئەمینی شاترمان هەستاند و لەلارێوە، بەڕێکەوتین. لەگەڵ هەلاّتنی هەتاو کاتێك گەشتبووینە گەردەنەی عاشقان، لەناکاو دەنگی تەقەی تفەنگ لەدواوە بەرز بوویەوە. بینیمان عەلی ئەکبەر و تفەنگچییەکانن کەبەهۆی بەفرەوە شوێن شوێنپێکانی ئێمە کەوتبوون. ئێمەیش بەتەقە کردن وەلاّمماندانەوە لەبەر ئەوەی دەیانزانی تیرەکانی من بەفیڕۆ ناڕوات، نەیانـدەوێرا بێنەپێش. بەلاّم لەلابەلای بەردەکانەوە بەردەوام تەقەیان دەکرد بەو هیوایەی لەکەرجۆوە هێزی هاوکارییان بۆ بگات. ئێمەیش بێ ئەوەی گرنگییان پێبدەین، درێژەمان بەڕێگەی خۆماندا، شەو لەئەویهەنگ ماینەوە و بەیانی ئێواری گەشتینە گوندی ڕەزاو. لەوێ بینیمان حاجی شێخ عەبدولحەمید و دەستەیەك لەوێن. دوای دوو ڕۆژ هەواڵ گەیشت کەمامانۆف ڕۆژی ٣ جومادی الثانی ١٣٣٤، لەگەڵ دوانزە سواری قەزاق بەرەو تاران بەڕێکەوتووە. دواتر هەواڵ گەیشت کەڕۆژی ٨ جومادی الثانی، حاجی ئەبولحەسەن خانی فەخرولمولك، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دێتە

شارەکە و ڕۆژی ١١ مەلا عەبدولفەتاحی شێخولئیسلام و ڕۆژ ١٧ ئاسف دیوان کە لەتاران بوون، گەڕانەوە بۆ سنە.

دواتر هەواڵ گەیشت ژەنراڵ باراتۆف سەرۆکی هەموو هێزەکانی ڕووسیا، ئێوارێی چوارشەممەی جومادی الثانی، هاتۆتە ناو شار و دواتر ڕۆشتۆتە گوندی دادانە و لەوێ هەموو عەشیرەکانی ڕەوانسەر و جوانڕۆ و سەنجاب و گۆران و کەمانگەر و هتد... بانگێشتکردووە و مەجلیسی یەکیەتی عەشایری پێکهێناوە. گومانمان کرد ئەم دڵسووتانە لەبەرژەوەندی عەشیرەکانی ئێمەدا نییە بەڵکو بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانە. ئێمەش بەهۆی مەحمودبەگی شەهبەندەر کە لەگوندی دوڕوو بوو، محێدین بەگمان لەپێنجوێن ئاگادار کردەوە. وەڵامی دابووینەوە: من لەگەڵ شێخ مەحمود (مەلیك مەحمودی حەفید) بەرەو مەریوان دێم. ئەویش لەگەڵ هەموو سەرکردەکان و خانەکانی هەورامان بەرەو مەریوان بەڕێبکەوێت. لەوێ هەموو شتێك دیاریدەکەم. من و حاجی شێخ عەبدولحەمید لەگەڵ شەهبەندەر و خانەکانی ڕەزاو بەرەو مەریوان بەڕێکەوتین. محێدین بەگ و شێخ مەحمود هاتنە مەریوان و شێخەکانیشی بانگێشتکرد و لەماڵی مەحمودخانی کانی سانان، بەگشتی پەیمانێکی عەشایریمان بەست. لەوێوە ڕۆشتینە وڵەژێرە و ماڵی کەیخوسرەوخان و پەیمانەکەمان تازە کردەوە. لە١١ ڕەجەبی ١٣٣٤ هەواڵمان بەدەست گەیشت دەستەیەك لەڕووسەکان لەگەڵ دوانزە تۆپ بەرەو مەریوان بەڕێکەوتوون و مەبەستیانە هێرش بکەنە سەر پێنجوێن. ئێمەیش بەپێی ئەو پەیمانەی بەستبوومان، هێزەکانی هەورامان و مەریوان و دزڵیمان بەڕێخست و لەسێپێچەکەی کاکوزەکەریا، ڕێگەمان لێگرتن و لەسێ ڕووبەڕووبوونەوە کە لەهەر سێکیان ڕووسەکان شکستیان خوارد، پاشەکشێمان پێکردن. تاڵانییەکی زۆرمان دەستکەوت و ڕووسەکان بۆ شار گەڕانەوە. دواتر هەواڵ گەیشت دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت لەسێ قۆڵەوە هێرش بکاتە سەر سوپای ڕووس و ئینگلیس.

لەسەرەتاکانی شەعبانی ١٣٣٤، یوسف بەگی کەوانداری تورکیا، شێخە پایەبەرزەکان، شێخ حسام ئەلدین و شێخ نەجم ئەلدین و شێخ عەلائەلدینی بەڕێخست و هاتنە ڕەزاو. لەوێ هێزەکانی مەریوان و دزڵی و هەورامانی تەخت و نەوسود و ڕەزاو و ژاوەرۆ پەیوەست بوون و ڕۆژی ٢٢ شەعبان زیاتر لە چوار هەزار کەس بەرەو شاری سنە بەڕێکەوتین. شەوی دووەم لەسەر خروسە بووین. دوای تێپەڕینی چوار کاتژمێر لەشەو، پیاوی موشیردیوان گەیشت.

بەنهێنی پەیامی بۆ ناردبووین کەڕووسەکان دەیانەوێت بەیانی بڕۆنە گەردەنەی ئارێز و لەوێ ڕووبەڕووتان ببنەوە و ئەگەر توانییان سەرکەوتن بەدەستبێنن تا مەریوان ناوەستنەوە. ئەگەر پێچەوانەکەی ڕوویدا، لەوێوە ڕێگەی هەڵاتن بگرنەبەر. کەواتە تا ڕووسەکان دەستیان بەسەر گەردەنەکەدا نەگرتووە، هەرچۆنێك بووە ئەمشەو دەستبەسەر گەردەنەکەدا بگرن. پیاوەکەی موشیر دیوانمان هێشتەوە تا سوپاکە نانی خوارد. دوای تێپەڕینیی شەش کاتژمێر لەشەو، بەڕێکەوتین. سەرەتای دەرکەوتنی هەتاو، گەشتینە گەردەنەی ئارێز. بینیمان هیچ شوێنەوارێك لەڕووسەکان نییە. شێخەکان لەگەڵ هێزەکانی مەریوان و دزڵی لەسەر گەردەنەکە مانەوە و ئێمە لەگەڵ هێزەکانی نەوسود و ڕەزاو هاتینە خوار. کاتێك گەیشتینە سەرەتای خاکی ئارندان، سوارەکانی کۆماسی ڕووبەڕووی دەستەی پێشەنگی ڕووسەکان ببوونە کەدەیانەویست بەرەو گەردەنەکە بێن. دوای جەنگێکی کەم، ڕووسەکان شکستیان خوارد و تا کەنار شارەکە پاشەکشێیان کرد. هەژدە کەسیان لێکوژرا و ئەسپ و تفەنگەکانیان کەوتە دەست سوارەکانی کۆماسی. ئەم سەرکەوتنە ورەی سوپاکەی بەرز کردەوە و بێ گرنگیدان بەلایەنی ئەمنی و بەدەم هاوار و دەنگ بەرز کردنەوە، تا پشت گوندی کەمیز پێشڕەوییان کرد و دەیانوت: ڕووسی ڕووڕەش لەبەرابەر توانای شێخەکان دەتوانێت چی بکات، تا شار ناوەستینەوە. لەناکاو بینیمان لەتەپۆڵکەی شێخ محەممەد سادق، تەقاندنی تۆپ دەستپێکرد. دەستەیەك سواریش بەرەو ئاشەکانی ئاویەر سەرکەوتن. بەخێرایی بەجەعفەر سوڵتانم وت: ئەگەر ئەو سوارانە بگەنە سەر چیای ئاویەر، شکست دەخۆین و چیتر ناتوانین لێرە بمێنینەوە. جەعفەر سوڵتان وتی: ئێمە شوێنەکانی ئەو ناوچەیە شارەزا نین، ئەفراسیاب بەگ و دووسەد تفەنگچی لەگەڵ خۆتان ببەن و فەرمانی پێویست دەربکەن. من و ئەفراسیاب بەگ هەستاین. خۆم لەگەڵ سوارەکانم لەپشت خزر ئەلیاس سەنگەرمان گرت و ئەفراسیاب و تفەنگچییەکانی دیکەمان بۆ سەر چیای ئاویەر نارد. ڕووسەکان بەهۆی دووربینەوە ئێمەیان بینی و شوێنەکەیان تۆپباران کردین. کاتێك تفەنگچییەکان گەشتنە سەر لوتکەی چیاکە و من لەشکست دڵنیابوومەوە، لەگەڵ سوارەکانی خۆم، هێرشمان کردە سەر تەخت تا لەوێوە بتوانین بڕۆینە ناو شار. هەستم کرد ڕەزاوییەکان شکستیان خواردووە. لەناکاو لەلایەن تفەنگچییەکانی ئەفراسیاب بەگەوە هاواریان کرد کە: سوپاکە شکستی خوارد، بگەڕێنەوە. ئێمەش بەناچاری لەڕێگەی دزڵی

ئەسپان و بەفرەچاڵ گەڕاینەوە. گەشتینە تفەنگچییەکانی هەورامی کەدەیانوت: (شێخوچیشی، تۆپیوەجە هەزار شێخ خاسترە). یانی: شێخی چی و شتی چی، تۆپێك لەهەزار شێخ باشترە. دەرکەوت گوولله تۆپێك لەسەرووی سەنگەری ڕەزاوییەکان تەقاوەتەوە بێ ئەوەی زیان بەکەس بگەیێنێت بەڵام ئەوانی ناچار بەهەڵاتن کردبوو. ڕووسەکان بەدوربین هەست بەهەڵاتنی ڕەزاوییەکان دەکەن و سوارەکان بەشوێن ئەواندا دەنێرن. لەسەرەتای دەربەندی ڕێگەی گەردەنەی ئارێز، سوارەکانی ڕووسی نزیك دەبنەوە تا بەتفەنگچییەکانی ڕەزاو بگەنەوە. سوپاکەی مەحمودخانی دزڵی کە لەسەرەوەی چیاکە بوون و شوێنەکەیان بەرز بووە، تەقە لەسوارە ڕووسییەکان دەکەن. چەند کەسێکیان لێ دەکوژن و ئەوانی دیکە دەگەڕێنەوە و لەئەنجامی ئەمە، ڕەزاوییەکان بەتەندروستی دەگەنە سەرەوەی چیاکە. ئێمەیش کەگەشتینە دۆڵی ڕێگەی نەوەرە، بینیمان دەستەیەك سواری ڕووسی لەڕێگەی نەوەرەوە دەڕۆن. گومانمان کرد دەیانەوێت ڕێگەی هەڵاتنی ئێمە بگرن. لەبەر ئەوەی شوێنەکەمان بەرز و ژمارەی سوارەکانم زیاد بوو، تەقەمان لێکردن و ناچار پاشەکشێیان کرد. کاتێك گەیشتینە سەر ڕێگەی نەوەرە، بینیمان مەلا عەبدوڵڵەی موفتی، بەپیادە لەگەڵ ژمارەیەکی دیکە، تینویەتی و شەکەتی تەنگی پێهەڵچنیون و توانای ڕێگە ڕۆشتنیان نەماوە. ئەو سوارانەیش کەئێمە تەقەمان لێکرد دەرکەوت شوێن ئەمان کەوتبوون کەئەگەر فریا نەدەکەوتین، کەس لەم ژمارە پیادە گیانی دەرباز نەدەکرد. کەرەکەی موفتی کەبەکرێی هێنابووی، خاوەنەکەی سواری ببوو و هەڵاتبوو. یەکێك لەسوارەکانی خۆم دابەزاند و بەبەدبەختی موفتیمان سوار کرد و بەرەو بەرزایی چیاکە بەڕێکەوتین. شێخەکانیش کاتێك دەبیستن ڕەزاوییەکان پاشەکشێیان کردووە، بێدرەنگ کردن سوار ئەسپەکانی خۆیان دەبن و بۆ شوێنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە. ئێمەیش ڕۆژی هەینی ٢٧ شەعبانی ١٣٣٤ گەشتینە ڕەزاو کەڕۆژی پێشتر حاجی شێخ عەبدولحەمید بەنەخۆشییەکی کوشندە لەو شارەدا کۆچی دوایی کردبوو.

ڕۆژی ٢ ڕەمەزان کە لەهەوار بوك بووین، میرزا فەتحوڵڵەی کاتبی شەهبەندەری، لەپێنجوێن گەڕابوویەوە و بەرەو شار دەڕۆشت. ڕۆژی پێنجی ڕەمەزان لەگەڵ چەند لەشوێنکەوتەکانی عوسمانی دەڕۆنە شار. ڕۆژی دەی ڕەمەزان، سەردار ڕەشید و حاجی عارف بەگ لەگەڵ ١٥٠ سەربازی عوسمانی دەڕۆنە ناو شارەکە، ڕووسەکان لەگەڵ حاجی فەخرولمولکی حوکمڕان و

حەبیب اللەی بازرگان و ئیعتیزاد دیوانی کارگوزار و دەستەیەك لەدانیشتووانی شار دەڕۆنەدەر. ڕۆژی ١٣ ڕەمەزان، جیهاد لەشارەکە دەستپێدەکات و شوێن ڕووسەکان دەکەون. ڕۆژی ٢٠ رەمەزان، نورعەسکەری عوسمانی و دوانزە تۆپ و دوو ڕەشاش دەگەنە شارەکە. ئێمەیش کەدووبارە لەگەڵ شێخ عەلائەلدین و سوپای ڕەزاو بەڕێکەوتبووین، ڕۆژی ٢١ رەمەزان گەشتینە شارەکە. دواتر سەیید ئەحمەد بابا ڕەسوڵ و دەستەیەك لەجافەکان هاتن. شەوی دووشەممەی ڕەمەزان، خانەکانی ڕەزاو گەڕانەوە. ڕۆژی جەژن، حاجی شێخ ئیبراهیمی فەقێ، حەبیب و چەند کەسێکی خراپەکاری بەدوای حاجی عارف بەگدا نارد. ماڵی حەبیب اللەی بازرگانیان تاڵان کرد و کەلوپەلەکانی ماڵەکەیان لەناو بازاڕدا هەڕاج کرد. لەم کاتەدا ڕووسەکان لەکەرگ ئاوا بوون.

ڕۆژی هەینی ٤ شەوال، دووبارە هێرشیان کردە سەر شارەکە. دووبارە جیهادی گشتی دەستپێکرد و ژن و پیاو و پیر و گەنج و سوارە و پیادە بەدەم وتنەوەی تەکبیر و الله اکبر، بەدار و تێلاً هاتنەدەر. ژنەکان بەگۆزەی ئاو و سەوزە و خەیار شوێن شەڕکەران کەوتن و ئەوانیان هاندەدا. سەنجەرخان لەو ڕۆژەدا ئازایەتی زۆری لەخۆی نیشاندا. هەرچەند ڕووسەکان تۆپیان دەهاویشت، بەڵام خەڵك هێرشیان دەبرد. تا دەمەو ئێوارێ، جەنگ بەخەستی بەردەوام بوو. یەکێك لەکوژراوەکان محەممەد بەگی کەواندار بوو کە لەنزیك منەوە کوژرا. ئەومان بۆ شار گەڕاندەوە بەڵام دوای چەند ڕۆژێك مرد. ڕووسەکان دوای زەرەر و زیانێکی زۆر پاشەکشێیان کرد. ژمارەیەکی زۆری ئەسپ و تفەنگەکانیان وەك تاڵانی کەوتە دەستی خەڵکان و شەڕکەران. ڕۆژی ٥ شەوال، سەنجەرخان لەمەیاوەروەرانەوە پیاوی نارد و ڕایگەیاند: ڕووسەکان دەوری منیان گرتووە، هێزی هاوکاریم بۆ ڕەوانە بکەن. کەسم بۆ لای حاجی عارف بەگ نارد بەڵام بیانوی هێنایەوە. کەسم بۆ لای سەردار ڕەشید نارد، لاوازی نیشاندا. ناچار خۆم و سی سوار بۆ هاوکاری کردنی ئەو بەڕێکەوتین. تا گەیشتنی من سەنجەرخان برینداز ببوو. گوولەیەك بەر ژێر ناوکی کەتبوو و لەپشتیەوە هاتبووەدەر. ڕووسەکان نەیانتوانیبوو بڕۆنە ناو گوندەکە و بۆ کەرگ ئاوا گەڕابوونەوە. شەو لای سەنجەرخان ماینەوە. بەیانی ڕۆژی ٦ شەوال، یەدوڵڵەخانی سەرداری جەنگ، برای سەنجەرخانم لەگەڵ چل سوارەکەی هەڵگرت و پێکەوە هێرشمان کردە سەر کەرگ ئاوا. بەداخەوە ڕووسەکان کاتژمێرێك پێش گەیشتنی ئێمە ناوچەکەیان بەجێهێشتبوو. برێك

فیشەك و برنج و مریشکی زەردکراو و قاورمەی ڕووسی کە لەناو قوتوو بۆ سوپاکەیان دەهێنا، لەوان بەجێمابوو. یەدوڵڵەخان بۆ ماڵەکەی خۆی و ئێمە بۆ شار گەڕاینەوە. لەسەرەوەی گەردەنەی سەڵوەت ئاوا، ڕووبەڕووی حاجی عارف بەگ و سوارەکانی تورك و شێخ عەلائەلدین و دەستەیەك لەدانیشتووانی شار بووینەوە کەشوێن ڕووسەکان دەکەوتن. بەحاجی عارفمان وت: ڕووسەکان ڕۆشتوون، گومان ناکەم پێیان بگەنەوە. وتی: فەرمانە کەدەبێت تا هەمەدان بڕۆم، ئێوەیش بگەڕێنەوە و لەگەڵمان وەرن. وتم: ئەگەر دوێنێ هێزی هاوکاریتان بۆ سەنجەرخان دەنارد، ئێمەش ئەمڕۆ بۆ هاوکاری کردنی تۆ تا هەمەدان دەهاتین، ئێوە ئەو کارەتان نەکرد، ئێمەش دەزانین بۆ داهاتوو دەبێت چی بکەین. هەرچەندە ویستی بەڵگە و پاساو بێنێتەوە، گرنگیم پێنەدا و ڕێگەی شارەکەم گرتەبەر. شێخ عەلائەلدین و دانیشتووانی شار کاتێك بینیان من نەڕۆشتم، ئەوانیش گەڕانەوە. سەردار ڕەشید لەشار سەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەتی بوو. ڕۆژی دەی زیحەججەی ١٣٣٤ لەهەمەدان و لەلایەن عەلی ئیحسان پاشا فەرمان هات کەسەردار ڕەشید هێرش بکاتە سەر بیجار. حاجی عارف بەگیش لەهەمەدانەوە بەڕێکەوتبووە. ڕۆژی شەممە ١٢ زیحەججە، سەردار ڕەشید لەگەڵ سوپاکەی خۆی و سەیید ئەحمەد بابا ڕەسوڵ لەگەڵ سوارەکانی جاف بەرەو بیجار بەڕێکەوتن. دەستەیەك لەدانیشتووانی شاریش وەکو حاجی شێخ ئیبراهیم و فەخرولعولەما و ئەسعەد سوڵتان و ڕەمەزانزادە و کەسانی دیکەیش لەگەڵ ئەوان ڕۆشتن. من بۆ پاراستنی نەزم و ئاسایش لەشارەکە مامەوە. دوو سێ ڕۆژ دواتر ئیعیزاد دیوان و کارگوزار و دەستەیەك لەدانیشتووانی شار کە لەگەڵ ڕووسەکان هەڵاتبوون و عەلی ئیحسان پاشا ئەمانی پێبەخشیبوون، لەگەڵ سەربازەکانی عوسمانی لەهەمەدان گەڕانەوە. سەرەتا هەواڵ گەیشت کەحاجی عارف بەگ و سەردار ڕەشید شکستیان خواردووە، دواتر ئەمین بەگی قوماندان لەهەمەدان، لەگەڵ سێسەد سەرباز، لەپشتەوە هێرش دەکاتە سەر ڕووسەکان. ڕۆژی ٢ موحەرەمی ١٣٣٥، هەواڵی سەرکەوتنی بیجار و شکستی ڕووسەکان گەیشت و ڕۆژی ٥ موحەڕەم، سەردار و دانیشتووانی شار سەرکەوتووانە گەڕانەوە. کەلوپەلەکان و کتێبخانەی خوالێخۆشبوو حەسەن عەلی خانی ئەمیر نیزام دەست سەیید نەجم ئەلدین ئەمروله و مەسعودخانی ئەسعەد سوڵتان کەوت. ئەسعەد سوڵتان پشکی خۆی هێنایەوە بۆ شارەکە. ڕۆژی ٢٧ موحەڕەم، بروسکەی فەرمانڕەوایەتی موشیر سوڵتان لەلایەن

نیزام ئەلسەڵتەنەوە گەیشت. سەردار ڕەشید لەم پێشهاتە دڵتەنگ و ڕۆشتە هەمەدان بۆ لای عەلی ئیسحان پاشا و سکاڵای لەنیزام ئەلسەڵتەنە کرد و دواتر بۆ ڕەوانسەر گەڕایەوە.
ڕۆژی ٧ سەفەر، موشیر سوڵتان وەك فەرمانڕەوای کوردستان هاتە شارەکە. دوای دوو سێ ڕۆژ، بارودۆخی شارەکەی بۆ دەرکەوت و بینی وشەی نیزام ئەلسەڵتەنە لەئارامی و ئاسایشی شارەکە کاریگەری نییە و خۆیشی سوپای لەگەڵدا نییە. ناچار مەنسور ئەلمولکی یاریدەدەری خۆی بۆ کرماشان ڕەوانە کرد. ڕۆژی ١٦ سەفەر، مەنسور ئەلمولك گەڕایەوە و سەیید عەبدولڕەحمانی نیزام ئەلئیسلام بەتۆمەتی ئەوەی سیخوڕی سالار فاتحە، زینداینکرد. ڕۆژی ٢٤ سەفەر، سێ هەزار سەربازی عوسمانی لەگەڵ دوانزە تۆپ لەمەریوانەوە گەیشتن. هاتنی ئەم ژمارە سەربازە، زیاتر بووە هۆی لاوازی و لەدەستدانی وڕەی موشیر سوڵتان بەتایبەت دوای ئەوەی گرنگییان بەو نەدا. لەبەر ئەوەی بینیم لەبارودۆخی عەشایری بەتایبەت ئەگەر هێرشی بیانییەکانیشی پەیوەست کرابێت، بیر و ئەندێشە ناتوانێت فەرمانڕەوایەتی بکات و تەنیا ژمارە و تفەنگ دەتوانێت دەور و کاریگەری هەبێت، بەمەبەستی باشترکردنی بارودۆخی سەردار ڕەشید و گەڕاندنەوەی ئەو بەرەو کرماشان بەڕێکەوتم. نیزام ئەلسەڵتەنەم لەچەندوچۆنی بارودۆخ ئاگادار کردەوە. حاجی عەزئەلمەمالیك، خەزێنەداری دەوڵەت لەکرماشان کەخزمی سەردار بوو، پێشتر بۆ چاکتر کردنی بارودۆخی سەردار هەوڵەکانی خستبووە گەڕ. سەرەنجام سەردار بۆ کرماشان بانگێشتکرا و لەناوەڕاستی ڕەبیع الاوەل لەگەڵ موزەفەرخانی والیزادە هاتە ناو کرماشان لەناوەڕاستی ڕەبیع الاوەل، فەرمانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بۆ سەردار دەرکرا و موشیر سوڵتان لەسەر کار لابرا. ڕۆژی ٢ ڕەبیع الثانی لەگەڵ بەڕێزان حاجی عەز ئەلمەمالیك و خودی سەردار و موزەفەرخانی والیزادە و تەبیبزادە لەکرماشانەوە بەڕێکەوتین و ڕۆژی چواری مانگ گەشتینە ڕەوانسەر. سەردار ڕێورەسمێکی میوانداری بێوێنەی ئامادە کردبوو. نزیکەی حەفتەیەکی بەڕاوی کەڵەکێوی بەسەر برد و ڕۆژی ١٢ ڕەبیع الثانی پێکەوە گەشتینە ناو شارەکە. موشیر سوڵتان ڕۆشتەماڵی ئاسف دیوان و مەنسور ئەلمولك لەقەڵای حکومەتی مایەوە. سەردار ئەوی وەك پێشکاری خۆی هەڵبژارد و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی بەوسپارد. حاجی عەز ئەلمەمالیکیش چەند ڕۆژێکی بەگەڕان بەناو شارەکەدا بەسەر برد و دواتر گەڕایەوە. لەناوەڕاستی جومادی الاوەل هەواڵی هاتنی ڕووسەکان بڵاوبوویەوە. هەموو

سەربازە عوسمانییەکانی ناوشار، بەرەو کرماشان بەڕێکەوتن. حاجی عارف بەگ لەگەڵ دەستەیەك کەرسوار، بەجێما. لەناوچەکانی سورەدزە ڕووبەڕووی رووسەکان بوویەوە و دواتر بەدوای عوسمانییەکان بەڕێکەوت. سەردار بۆ ڕەوانسەر گەڕایەوە. مەنسور ئەلمولك لەگەڵی ڕۆشت. خۆیشم ویستم بەرەو گوندی تەختە یا ڕەوانسەر بڕۆم، موشیر دیوان ڕێگەی گرتم، وتی: ئەمجارە جیهادی گشتی هەموومانی یەکسان کردووە، خەلیفە یوحەنا بۆ لای سەرکردەکان دەنێرین، ئەگەر ئەمانی گشتییان پێدابن، هەمووان دەمێنینەوە، جیاواز لەوە، شارەکە بەجێدێڵین. لەسەر بۆچوونی خەلیفە، مەلا عەبدولجەواری شێخولئیسلاممان بەئاڵای سپی کەنیشانەی تەسلیم بوونە، بۆ پێشوازی رووسەکان نارد و ئەو دوو کەسە، پێکەوە ڕۆشتن. دوای بینین سەرکردەکان، شێخولئیسلام و خەلیفە بەوەرگرتنی ئەمان گەڕانەوە. ئێواریێ، پێشەنگەکانی ڕووس سەر تەپۆڵکە و بەرزاییەکانی دەوری شاریان گرت و بەیانی، سوپاکە هاتە ناو شار. سەرۆکی هەموو هێزەکان ناوی (ڕەفایلوویچ) بوو و قەڵای حکومەتی وەك شوێنی مانەوەی خۆی هەڵبژارد. کرپاچۆف لەماڵی حەبیب الله دابەزی وسەرکردەکانی دیکە لەماڵەکانیتر نیشتەجێبوون. دوو ڕۆژ دواتر ڕەفایلوویچ، حاجی ئەرفەع ئەلمولکی گرت. من بۆ تکا کردن بۆ حاجی ئەرفەع ئەلمولك، ڕۆشتمە لای ڕەفایلوویچ. دوای بینین و بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی تەشریفات، پرسی: نازانم خراپەی ئێمە چییە کەدانیشتووانی کوردستان دوژمنایەتیمان دەکەن و ئاڵمانییەکان چییان کردووە، کەگیانیان پێشکەش دەکەن. وتم: وەڵامی ڕاست و دروستتان دەوێت یا وەڵامی درۆ؟ وتی: وەڵامی ڕاست. وتم: سیاسەتی ئێوە توند و نەرێنییە و سیاسەتی ئاڵمان، نەرم و سەقامگیر. ئێوە خۆتان وەك هێمای سەری ڕم و ئێمەتان بەمشت ناساندووە لەبەر ئەمە خەڵکان خۆیان لەئێوە بەدوور دەگرن بەڵام ئاڵمانییەکان، خۆیان وەك کەسانێکی مێهرەبان و نەرم و نیان ناساندووە. لەبەر ئەمە خەڵکان پێشوازییان لێدەکەن. بەڵگەیش ئەمە دەوڵەتی ژاپۆن لەئەنجامی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئینگلیس، لەماوەیەکی کەمدا گەیشتە ئەو جێگە و پێگە کەڕووبەرووی ئیمپراتۆرییەکی گەورە بوویەوە لەکاتێکدا ئێستا لەگۆڕەپانی جەنگی نێودەوڵەتی، هاوسەنگی هێز جێگیرە بەڵام بەپێچەوانەوە دەوڵەتی شەش هەزار ساڵەی ئێران، لەئەنجامی دۆستایەتی چەند سەد ساڵە لەگەڵ ئێوە، بەرەو ڕووخان دەڕوات و بۆتە شوێنی چاوتێبڕینی دەوڵەتانی دراوسێ. ڕەفایلوویچ بەپێکەنینەوە کەنیشانەی پشتڕاستکردنەوەی قسەکانم بوو،

ڕووی دەمی کردە کەسێکی بەرپرسی دیکە و بەزمانی ڕووسی قسەی لەگەڵ کرد. هەستم کرد باسی وشیاری تاکی ئێرانی دەکات. سەرئەنجام سەبارەت بەحاجی ئەرفەع ئەلمولك وتم: بۆ نمونە ئێوە لەناو شار خراپە لەگەڵ کەسانی وەك حاجی ئەرفەع ئەلمولك دەکەن و زیندانی دەکەن. عەشایر ئەمە دەبیستن و گومان دەکەن نییەتی ئێوە هاوڕێیانە و دۆستانە نییە. لەبەر ئەمە کاتێك سوپاکەی ئێوە لەشارەکە بڕۆنەدەر، لەهەموو شوێنەکانەوە هێرشیان دەکرێتەسەر و ڕێگەنادەن بەئاسانی و ئاسوودەی بەرەو شوێنی مەبەستی خۆتان بڕۆن بەڵام بەپێچەوانەوە، ئاڵمانییەکان دەڕۆنە هەر شوێنێك بەشێوەیەکی شیاو و گونجاو مامڵە لەگەڵ دانیشتووانەکەی دەکەن، لێرە بڵاو دەکەنەوە. عەشیرەکانیش کاتێك ئەمە دەبیستن بەمەبەستی کۆکردنەوەی لیرە لەدەوریان کۆدەبنەوە و گیانیان پێشکەش دەکەن. دووبارە بزەی گرت و بەو کەسەی وت: ئەم کەسە بەبەڵگەوە پێمان دەڵێت ئێستا کەلیرەمان نییە نابێت کەس لەدانیشتووانی کوردستان زیندانی بکەین، فەرمان بدە حاجی ئەرفەع ئەلمولك ئازاد بکەن. لەئەنجامی ئەم چاوپێکەوتنە پەیوەندییەکیی تۆکمە لەنێوان من و ڕەفایلوویچ دروست بوو.

لەدووری ڕەجەبی ١٣٣٥، میرزا محەممەد خانی دەبیر ئەسرار لەتارانەوە وەك یاریدەدەری حکومەتی کوردستان هاتە سنە. ڕووسەکان ڕێگەیان نەدا بڕواتە قەڵای حکومەتی و بەناچاری لەماڵی خواڵخۆشبوو مەلا ئەحمەدی مەلاباشی نەسیرئەلئیسلام، نیشتەجێ بوو. لەکۆتاییەکانی ئەم مانگە، ئیقباڵ نیزامی سالار ئەشرەف، یاریدەدەری سەرۆکی پۆلیسەکانی شار کە لەگەڵ کرپاچۆف پەیوەندی هاوڕێیەتی دروستکردبوو، فەرمانێکی بۆ فەرەج خانی شەهاب ئەلسەڵتەنە، کوڕی ئیحتیشام دیوان وەرگرت تا بڕواتە گوندەکان و مانگا و گەنم بۆ سوپا کۆبکاتەوە. نیشانی بۆ وەرگرت و ڕەوانەی کرد و هەروەها رایسپارد لەهەر گوندێك بڕێك پارە وەربگرێت تا لەنێوان هەر سێکیان لەنێوان کرپاچۆف و ئیقباڵ نیزام و نودی فەرەج خان دابەش بکرێت. فەرەج خان بۆ ئەوەی خەڵك لێی بترسێت و بتوانێت لەهەر گوندێك پارە کۆبکاتەوە، ڕۆشتە گوندەکەی خۆیان و سەد سواری لەمسکێنەکانی وەڵاڵەی و دەوروبەر کۆکردەوە، تەپڵ و ئاڵای پێشخۆی خست (ئاڵای ڕووسی) و دەستی بەکۆکردنەوەی پارە لەگوندەکان کرد. دەمەونێوارەیەك، لەڕەمشتەوە هەواڵ گەیشت کەفەرەج خان ڕۆشتۆتە ئەوێ و محەممەد جەعفەر بەگی خزمی منی گرتووە

و سەد تمەنی لێسەندووە. رەفایلوویچم لەم ڕووداوە ئاگادار کردەوە. بەسەرسوڕمانێکی سەیرەوە وتی: بەفەرمان و نیشان و ئاڵای ڕووسی ئەم کارەی کردووە؟ وتم: بەڵێ. بەخێرایی کەسی بەدوای کرپاچۆفدا نارد. بەتوندی لێپێچینەوەی لەگەڵکرد. کرپاچۆف بەهەموو شێوەیەك حاشای لەم ڕووداوە کرد. بینیم کێشەکە ئاڵۆز بووە و پێگە و جێگەم لای رەفایلوویچ کەوتۆتە مەترسییەوە. بەناچار وتم: ئەگەری هەیە تەرتەرەکە هەڵەی کردبێت، ڕێگە بدەن لێکۆڵینەوەیەکی دیکە بکەم و دووبارە ئێوە ئاگادار دەکەمەوە. کرپاچۆف ڕۆشت و منیش نوقمی دەریای بیرکردنەوە، بۆ ماڵەوە گەڕامەوە. بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بتوانم ڕاستی وشەکانی خۆم بسەلمێنم. سەرئەنجام لەگەڵ دوو سواری ئامادەی خۆم، بەڕێکەوتین و ئێوارێ گەشتینە قەلاّی سەنجەرخان. بەنهێنی لەم ڕووداوە ئاگادارم کردەوە و پێم ڕاگەیاند سوارەکانی خۆی ئامادە بکات و هەرکات ئاگادارم کردەوە، بەخێرایی بەڕێکەوێت. لەوێوە بەرەو ڕەمشت ئەسپم غاردا، دوای تێپەڕینیی سێ کاتژمێر لەشەو، گەیشتمە ئەو ناوچە. لەوێ بەدوای فەرەج خاندا گەڕام. وتیان: ئێوارێ لەسیاناو، بەدەم تەپڵ لێدان و هەڵکردنی ئاڵای ڕووسەکان و سوپاکەی گەڕاوەتەوە بۆ بەڵبان ئاوا کەماڵەکەی خۆی لەوێ بوو. بێ درەنگ هەشت سواری خاوەن ئەزمون و شیاوی بڕوام لەڕەمشت هەڵگرت و بەرەو گوندی بەڵبان ئاوا ئەسپم غاردا. دوای تێپەڕینیی شەش کاتژمێر لەشەو گەیشتمە ئەو گوندە و لەیەکەم ماڵی سەر ڕێگە، بانگی کەسێکم کرد کەهاتەدەر و ماڵی فەرەج خانی نیشاندام. هەواڵی سوارەکانی فەرەج خانم پرسی، وتی: بەناو گوندەکەدا بلاّو بوونەتەوە، تەنیا پێنج شەش کوێخا و سەرکردەکان لای خۆی ماونەتەوە. کاتێك گەشتینە بەردەم دەروازەکە، بەلوولەی تفەنگ، تایەکی دەروازەکەمان لەبن دەرهێنا، ئەسەد اللە خانی ئەمیر ئابادی و چوار کەسی دیکەم لەگەڵ خۆم بردە ناو حەوشەکە و فەرمانم بەوانی دیکەدا لەبەردەم دەرگای دەرەوە چاوەڕوان بن. لەکونی پەنجەرەکانەوە سەیرمان کرد، بینیمان فەرەج خان لای ئاگرەکە دانیشتووە و سەرقاڵی کێشانی نێرگەلەیە و شەش کەسی دیکە لەکوێخا و سەرکردەکان لەدەوری کۆبوونەتەوە و سەرقاڵی گێڕانەوەی حکایەت و بەسەرهاتەکانی خۆیانن. بەشێوەیەکی لەناکاو دەرگام کردەوە و ڕاستەوخۆ هێرشم کردە سەر فەرەج خان. فەرەج خان لای کورسییەکە هەستا و ڕۆشتە قوژبنێك و لەکاتی هەستانی ئەو چرای لەمپای سەر کورسییەکە کەوت و کوژرایەوە. لەتاریکیدا دەرفەتم پێنەدا بڕوات و دەستم برد و قژیم

گرت. ئەوم گرت و وتم چراکە ڕۆشن بکەن. کوێخا و سەرکردەکان لەتاریکی کەڵکیان وەرگرت و هەڵاتن. فەرەج خانم تەسلیم بەئەسەدالله خان کرد و ئەویش لەگەڵ دوو سواری دیکە بەرەو ڕەمشت بەڕێکەوتن. منیش ئاڵا ونیشانەی ڕووسییەکانم هەڵگرت کە بەسووچێکی کلاّوەکەی خۆیەوە هەڵیواسیبوو، دواتر بینیم فەرمانی سەرداری فەرەج اللە خان هەڵواسراوە. فەرمانەکەی کرپاچۆفیش لای فەرمانی سەرداریەکەی دانرابوو، هەموو ئەو پارانەی لەگوندەکانی کۆکردبوویەوە لەگەڵ سەد تمەنی گوندی ڕەمشت. ئەو شتانەم هەڵگرت و سوار بووم. بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو گەیشتمە گوندی ڕەمشت. چاییم خوارد و نێرگەلەم کێشا، بەڕێکەوتن نزیك نیوەڕۆ فەرەج خانم گەیاندە شار. زۆری نەخایاند ئیقباڵ نیزام ڕووداوەکەی بیست و لەگەڵ نەبی خانی ئەرمەنی کەهەمەکارەی ئەو بوو، هاتە ناو شارەکە. پرسیاری چۆنیەتی ڕووداوەکەی کرد. هەموو شتێکم بێ کەموکوڕی گێڕایەوە. وتی: ئێستا شەهاب ئەلسەڵتەنە لەکوێیە؟ وتم: لەتەویلەدا زیندانییە. بەبیستنی ئەم وتەیە توڕە بوو، وتی: هیچ ڕووینەداوە، ئەم پیاوە ڕاسپێردراوی ڕەسمی کرپاچۆفە و ئیهانە کردن بەلێپرسراوێکی ڕەسمی، ئەنجامێکی باشی نابێت. وتم: باش یا خراپ، کارێکە ئەنجامدراوە. کرپاچۆفیش حاشای لەوە کردووە فەرەج خانی بۆ کارێکی لەوشێوەیە ڕاسپاردبێت، جیاواز لەوە، ئەگەر کرپاچۆفیش حاشا نەکات، لێپرسینەوە لەئێمە لەئەستۆی تۆدا نییە و کاربەدەستێکی گەورەتر دەبێت لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بکات. کاتێك قسەکانی منی بیست، هەستا و ڕۆشت. کاتێك گەیشتە ناو حەوشەکە، وەك بڵێی باوەڕی نەکردبوو شەهاب ئەلسەڵتەنە لەتەویلەکەدا زیندانی بێت، بەپیاوەکەی ئێمەی وت دەرگای تەویلەکە بکاتەوە. پیاوەکەم هات و داوای مۆڵەتی کرد. مۆڵەتمدا و دەرگاکەی بۆ کردەوە. کاتێك لەسووچی تەویلەکەدا چاوی بەفەرەج خان دەکەوێت، تفێکی تێدەکات و دەڵێت: تۆ لەگەڵ سەد سواری چەکدار و لەناو گوندەکەی خۆت کەلانیکەم پێنسەد کەسی تیا دەژی، مەلایەك لەگەڵ دە سوار دێت و بەقۆڵبەستکراوی دەتهێنێتە شار، تەنیا شیاوی مردنی، نەك زیندوو مانەوە. ئەمە دەڵێت و دەڕوات. منیش بێ لەدەستدانی کات، چاوم بەرەفایلوویچ کەوت و هەموو ڕاستییەکانم بۆ باس کرد، وتم: حاشاکردنی بێ شەرمانەی کرپاچۆف منی ناچار بەمکارە کرد تا لای ئێوە بەکەسێکی درۆزن نەناسرێم. وتی: ئێستا شەهاب ئەلسەڵتەنە لەکوێیە؟ وتم: لەتەویلەکەمدا زیندانییە. وتی: ئەو بنێرن بۆ لای من و پارەکانیش بۆ

خاوەنەکانیان بگێڕنەوە. دوای گەڕانەوە بۆ ماڵ، شەهاب ئەلسەڵتەنەم بۆ ڕەفایلوویچ نارد و ئەویش زیندانی کرد. لەو بەرواره بەدواوە پەیوەندییەکانی نێوان من و کرپاچۆف و سالار و ئەشرەف گرژتر و ئاڵۆزتر بوو، هەردووکیان چاوەڕوانی دەرفەتێك بوون تا تۆڵە بستێننەوە. ڕۆژێك لەماڵەوە دانیشتبووم، پۆستچی هات و پاکەتێکی گەورەی دایە دەستم. سەیری مۆری پاکەتەکەم کرد، بەهادورئەلسەڵتەنە بوو. پاکەتەکەم کردەوە، نووسیبووی: کۆمیتەی سزادان لەتاران دامەزراوە و تا ئێستا چەندین چالاکییان ئەنجامداوە. ئاگادارییەك کەبەدەستی من گەیشتووە بەڵگەیە بۆ ئەوەی فاڵی ڕزگاری کوردستان بەناوی ئێوە دەرچووە، منیش ئاگادارییەکەم وەك خۆی ڕەوانە کرد و بێدرەنگ لەیەکەم کات بەرەو تاران بەڕێکەون چوونکە بەختەوەری هەمیشەیی لەمەدایە. بۆ دڵنیایی کردنەوەی بەڕێزتان سێ وەرەقەی بەیاننامەکە کەدەسەڵاتەکانی کۆمیتەکە نیشاندەدا، ڕەوانە کرا (٦ شەوالی ١٣٣٥ ئەی لەناوبەری خیانەتکاران)

## ئاگاداری کۆمیتەی سزادان

بەڕێز حاجی بەهادور ئەلسەڵتەنەی کوردستانی، لەبەر ئەوەی کۆمیتەی سزادانی ناوەند بڕیاریداوە لقەکانی کۆمیتە لەهەموو ناوچەکان و بەسەرپەرەستی کەسانی ولاتپەرەست و باوەڕدار دابمەزرێت و بەڕێز شێخ محەممەد پێشنوێژ و وتاری خوێنی کوردستان بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە، بەشیاو زانراوە، بۆیە بەپێی ئەم ئاگادارییە، ئاگادارتان دەکەینەوە کە لەزووترین کات، پێشنوێژ و وتارخوێن ڕەوانەی تاران بکەن تا کۆمیتەکەمان لەبوونی ئەوان کەڵك وەربگرێت. کۆمیتەی سزادانی ناوەند.

## بەیاننامە ڕەوانە کراوەکان

### ١. سەبارەت بەکوشتنی مەتین ئەلسەڵتەنە

شەوی چوارشەممەی شەعبانی ١٣٣٥. هاوولاتیان! مەتین ئەلسەڵتەنە مرد. لەکاتێکدا بارێکی قورسی لەخیانەت و بێ شەرەفی هەڵگرتبوو. ئێمە ئەم سەردەستەی بێ ناموسی و هۆکاری شەرمی مرۆڤایەتیمان لەکۆمەڵگای مرۆیی سڕییەوە تا شوێنکەوتەکانی دیکەی ئەو ڕێبازە بێ شەرەفانەیە، ڕێبازەکەی خۆیان بگۆڕن. بەڕاستی چەندە شەرمێنەر و نەنگینە کەڕادەی خیانەت و ئەندازەی ولاتفرۆشی گەشتۆتە ئاستێك کەخیانەتکاران لەکردەوەکانی

یەکتر بێزار و دەستەیەکی خراپەکار، لاسایی کردەوەکانی دەستەیەك خراپەکاری دیکە دەکاتەوە. لەشوێنێك لەدەرەوەی ئێران کەنزیکەی سێ ساڵە منالە بوێرەکانی دنیا تەنیا بەناوی وڵات و پارێزگاری کردن لەناموسی وڵات، دەستە دەستە لەگۆڕەپانی جەنگ و گیانبەخشین و پاراستنی سنورەکانی وڵات، گیانی خۆیان دەبەخشن، لەسەرزەمینێکی دیکە بەناوی ئێران، وڵاتفرۆشی هۆکاری پێشکەوتنی کەسەکان و ئەم ڕێبازە بێ شەرەفانەیە کەڕیسواترین تایبەتمەندی مرۆیی و گەورەترین ئەنگی کۆمەڵگای بەشەرییە، بۆتە هۆکاری شانازی کردن.

هاووڵاتیان، خۆشەویستی وڵات سروشتی و تەنانەت ئاژەڵەکانیش، بچووکترین هێلانە و لانەی خۆیان خۆش دەوێت بەڵام بەدبەختانە کاربەدەستانی ئێران بەپێچەوانەی ئەم یاسا سروشتییە و ناموسە سەلمێنراوەی سروشت، ئارەزوومەندی وڵاتەکەی خۆیان نین و هەر کەسێك لەڕێگەی ئایین یا سیاسەت، دەبێتە جڵەودار یا بەڕێوبەری کاروبارەکان وەك بڵێی بۆتە دەلاڵی فرۆشتنی ئەم وڵاتە کارەساتبارە.

هاووڵاتیان! پێوانەی شیاوی و توانایی لەماڵ پیاوی ئێرانی و کەسانێکی دیکە، سەلمێنراوە کە لەخیانەت شارەزاتر و لەدزی کارامەتر لەکەسانی دیکە بێت.

هاووڵاتیان! دیپلۆمات و پاڵەوانی گۆڕەپانی سیاسەتی ئێران، ئەوکەسانەن کەبەرژەوەندی ڕێگە پێنەدراوی بیانییەکان باشتر بەدیبێنن و ڕەزامەندی کەسانی بیانی باشتر بەدەست بێنن.

بەڵێ، بوونی ئەم کەسانە هەوای ئێرانی ژاراوی و پێشکەوتنی ئەوان بەهۆی بێدەنگی و قسەنەکردنی کەسانی دیکەوەیە. دەبێت کۆتایی بەشەرەف کوشتن و ناموس کوشتن بێت و ڕۆحی دایکی وڵات زیاتر لەمە سەرشۆڕ و ڕیسوا نەبێت.

لەبەر ئەمە، کۆمیتەی سزادان لەڕۆژێکی مەترسیدار و لەڕۆژگارێکی پڕ نەیار کەدڵی ستەملێکراوانی هاووڵاتیان لێی خەمبار و لەدەریای بێهیوایی، ئەژنۆی خەمیان لەباوەش گرتبوو، ئاڵای گیانبازی هەڵکرد و بەناوی وڵاتی ئازیزی ئێران و بۆ بەختەوەری ئێرانییەکان، یەکەمین پاڵەوانی ڕێگەی بێ ناموسی، پەیکەری خیانەت و خراپەکاری، ئەوەی دەبێتە هۆی زڕاندنی ناوی مرۆڤایەتی، جەوهەری پەستی و ڕیسوایی،یانی مەتین ئەلسەڵتەنەی بەسزای کردەوەکانی خۆی گەیاند و هەموو هەوەس و ئارەزووە گڵاوەکانی

ئەوی لەدڵی ڕەش و تاریکی ئەودا هێشتەوە و بەدەستی تۆڵەی خواوەند لەناویبرد. ئێستا دوای بێدەنگییەکی کاتی و نەهێشتنی هەندێ لەکۆسپ و تەگەرەکان کە بەهۆی خیانەتی یەکێك لەلقەکانی جێبەجێکردن هاتبووە ئاراوە، چالاکییەکانی خۆی دەستپێکردووە و دووەم بڕیار و چالاکی خۆی، لەکاتی خۆیدا خستە بواری جێبەجێکردنەوە.

کۆمیتەی سزادان سەر بەهیچ دەستەیەك نییە، یەکەم دەستەیەکە بەنییەتێکی پاك و بێگەرد، خیانەتکارانی وڵات لەهەر چینێك بن، لەناو دەبات.

کۆمیتەی سزادان، ڕۆحی پاکی شەهیدانی ئێران یا دەستی تۆڵەسەندنەوەی خواوەندە کە بەبازووی هێز و توانایی، خیانەتکارانی وڵات بەدەستبەردار بوون لەکاروکردەوە خیانەتکارانە و بێ شەرەفانەکانیان ڕێنوێنی دەکات و بەدڵنیاییەوە دەڵێت: پارێزراوی هەر کەسێك پەیوەستە بەدەستبەردار بوونی لەکردەوە بێ شەرەفانەکان.

سەرئەنجام کۆمیتەی سزادان بەدەنگێکی ڕاشکاوی ئاسمانی بەناوی هەموو نەوەکانی ئێران دەڵێت: وڵاتی منداڵەکانی ڕەشیدی ئێران مەکەنە گەمە و بووکەڵەی دەستی خۆتان و ئەگەر بەزەییتان بەدایکی خۆشەویستی خۆتان نایێتەوە، لانیکەم بەزەییتان بەمنداڵەکانی خۆتان بێتەوە کەهەوای سەدەی بیستەم، چیتر خیانەتکار و وڵاتفرۆشەکان پەروەردە ناکات.

## ٢. سەبارەت بەکوشتنی میرزا موحسین، برای سەدرولعولەما

ڕۆژی پێنجشەممە، پێش نیوەڕۆ، ١٦ شەعبانی ١٣٣٥. مانگ هاوشێوەی بووکێکی نازکەر و نازدار، لەئاسۆی ئێرانەوە خۆی نیشاندا و نوورێکی کەمی خۆی بەسەرزەمینێکی کۆن کەهەزاران ڕووداوی جۆراوجۆری بەخۆیەوە بینیوە، بڵاو دەکاتەوە. بەڕاستی ئەم مانگە لەم سەرزەمینە کەلێپرسراویەتی خۆی ئەنجامدەدات، ڕووداو و پێشهاتی سەیروسەمەری بینیوە کەهەرکام بەخەتێکی دیار لەلەوحەی جیهان تۆمارکراوە. بۆ نمونە دەبینن لەم وڵاتە کەهێزەکانی نیزامی ئەو تەنیا لەهێزەکانی باشور پێکدێت، ڕۆژێك بۆ جەنگی یۆنان، چواردە لەشکری گەورەی سوپا کۆدەکاتەوە. یا دەبینن ئەم تەختی پاشایەتییە کەئەمڕۆ بۆتە بووکەڵەی گەمە کردنی ڕووس و ئینگلیس، ساڵانێکی دووروودرێژ، جێگەی سوڵتانەکان و شاهەنشایەك بەناوی سیروس (کوروش) بەوپەڕی هێز و دەسەڵات، فەرمانڕەوایەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دنیایی کردووە. هەروەها دەبینن لەڕۆژگارێکی خۆش کە نەسیمی بەخت و ئیقباڵی ئەم خاکە، لەسنوورە دووردەستەکان، ئاڵای دەوڵەتی ئێرانی لەدەورەی

پاشایەتی داریوشی شەکاندۆتەوە و دراوسێکانی بەکورنوش بردن ناچار کردووە، هەنووکە ئەو ئالأی هێزە هاتۆتەخوار وسەرزەمینی ئێران بۆتە گۆڕەپانی ئەسپ تاردانی هێزە بیانییەکان و سینەی نازپەروەردەکانی ئەم خاکە، لەژێر سمی ئەسپی بیانییەکان، دەشکێت و ژێر پێدەخرێت. جیاواز لەوە بیردێنێتەوە لەنێوان تۆفانی ڕووداوەکان و بەدبەختییە گەورەکان کەئەمامی هیوای هەموو ئێرانییەکانیان لەکێڵگەی بێهیوایی و داماوی وشککردووە، دایکی کۆنی ئێران، منداڵانی بوێری وەك کاوەی ئاسنگەر و نادرشای ئەفشاری لەداوێنی خۆی پەروەردە کردووە و ڕەوانەی گۆڕەپانی دەکات. ئەم گومانانە هاوشێوەی بروسکە بەمێشکی ئێمەدا هات و دواتر بەرەو زەوی هاتە خوار. دواتر لەدڵی ڕۆحی پەیکەری ولأت کە تیشکی بەسەر ئێراندا بلأو دەکردەوە، جێگیر بوو، دواتر لەناو دەستەیەك کە لەشوێنێکی نهێنی و لەبەردەم ڕووناکی مانگ، دانیشتنیان سازدابوو، ڕەنگیدایەوە.

ئەم دەستەیە گومانیان دەکرد هەموو شانازییەکان و هەموو وەرەقە بەهادارە مێژووییەکان، وەرەق بەوەرەق لەدەستی خیانەتکارانەی منداڵە ناشەرعییەکانی ئێران لەت لەت کراوە و لەجیاتی ئەوە، قەوالّە نەنگینەکان و بەڵگە شەرمێنەرەکان، ئامادە کراوە!! ئایا پێویستییەکانی زەمان، هەرا و ئاژاوەی سێ ساڵەی دنیا کەتەنیا وشەی بەرگریکردنی ولأت، لەدەنگی بەریەککەوتنی شمشێری پاڵەوانەکانی جەنگی جیهان بەرز دەبێتەوە، بۆتە هۆی سزادان و وانەیەك بۆ ئەم کەسانە؟ نە، چوونکە مانگ، کەشایەتی هەموو کردەوە و چالاکییە نهێنییەکانی شەوانەی کەسەکانە، بەهێما و ئیشارەیەکی نهێنی، گفتوگۆ و زانیارییەکانی ئەم دەستەی پشتڕاستکردەوە و بەدڵنیاییەوە وتی: بەڵێ، بەمشێوەیە، من دەزانم ئەم کەسە، پەیکەری خیانەت و بێ نامووسی شەوە درێژەکان، پیلانە نەنگین و شەرمێنەرەکانی بۆ لەناو بردنی ئێران ئامادە و لەئێستادا بیر لەچ پیلان و نەخشەیەکی مەترسیدار دەکاتەوە کەپشتی ولأت دەلەرزێنێت و دەشکێنێت. لەمکاتەدا ئیلهامێکی دیکە لەئاسمانەوە بەم دەستەی وت: ئەی بەڕێزان، جیاواز لەخیانەتەکانی ڕابردوو، بەڵگەی بەندایەتی و کۆیلایەتی کەبۆ منداڵەکانی ئێران لەشوێنە جیاوازەکانی شار ئامادە دەکرێت، هەموویان دەڕۆنە ئارشیڤی ئیسلامکوژانەی میرزا موحسین و دوای پشتڕاستکردنەوە و تۆمارکردنیان، بۆ بەرپرسە پێویستەکان ڕەوانە دەکرێت. بۆیە کۆمیتەی سزادان بەکۆی دەنگ، حوکمی ئیعدامی میرزا موحسینی پەسەند کرد و بەهۆی کەسێکی خۆیەوە، سەرۆکی جێبەجێکاری لێ ئاگادار

کردەوە.

**بەیاننامەی سێیەم، لەوەلامی بەیاننامەی دەولەت**

((پێویستە بۆچوونی خۆتان لەپیاوانی دەولەتی ئەمڕۆ و کەسانی دەولەتی دوێنێ، کەمێك دوورتر ببەن، تا ببینین دەولەتی ئێران لەچ بارودۆخێکدا بووە و ئێستا لەچ بارودۆخێکدایە. هەڵبەت بەسەرەنجدان بەدەورەکانی پێشوو، دەبێتە هۆی درێژبوونی بابەتەکە و بەناچاری لەکاتێکەوە دەستپێدەکەین کە ئەم بەیاننامە کورتە، توانای ئامارژەدانی هەبێت. بۆیە دەڵێین دوواپین سوڵتانی سەفەوی و یا یەکەم نەنگی سوڵتانەکانی دنیا، وەك دەزانین، شانازییەکانی ئاباو ئەژداد و ئارەزووی دەولەتی ئێرانی خستە ناو پاکەتێکی ڕیسوایی و ناتەوانی و تەسلیم بەهەژدە هەزار سەربازی ئەفغانی کرد. ڕۆژێکیتر، نەوادری[1] سروشت، ئەو پاشکەوتە گرنگانەی هەمیشە لەپشت پەردەی سروشتەوە هێشتۆتەوە، دەولەتێکی نادری دامەزراند کەبەقامچی توڕەیی و غەزەبی نادری، یاخییانی سەرکوت و ئابڕوی لەدەستچووی، جارێکی دیکە بۆ ئێران گەڕاندەوە. ڕۆژگاری دواتر دەولەتی زەندییە، سەڵتەنەتێك کە بەزۆری شمشێر دەستیان بەسەردا گرتبوو و دامەزرێنەرەکەی لەخۆباییانە، ئەم سەرکەوتنەی بەکردەوەی ئەخلاقی لەخۆی دوورکردەوە و بەناوی وەکالەتی میللەت، لەپێشی و گەورەیی خۆی بەهەموو سوڵتانەکانی ئێران سەلماند. هەرچەند نادر و کەریم خان دوو پاشای گەورە و سەرکەوتنی ئەوان بەهۆی توانایی و لێهاتووی خۆیانەوە بوو بەلام دەبێت بزانین هەمان ئێرانی کەماوەیەك پێش لەسەر دەستی کۆمەڵێك ئەفغانی شکستی خوارد، بەچ هۆکارێك ڕۆژێکی دیکە دەتوانێت دەست بەسەر هیندستاندا بگرێت؟ جێگەی گومان و دوودڵی نییە کەتاکە هۆکاری کاریگەر لەم بارودۆخە، تەنیا و تەنیا بابەتی ترس و هیوا یا هەمان سزا و پاداشە کە سەبارەت بەخزمەتکار و خیانەتکار جێبەجێکراوە بەهەمان شێوە کەمێژوو شایەتی دەدات گرتنی ئازەربایەجان و سەرچاوەی سەرکەوتنەکانی ئاقا محەممەد خان، تەنیا بەهۆی ئەوە بوو کەبۆ ڕەزامەندی شوانێك، منالی یەکەمین سەردار و برازاکەی خۆی لەداوێنی براکەیدا سەر بڕی و سەری ئەوی بەشوانە دڵسووتاوەکە تەسلیم کرد و هەروەها فەتح عەلی شای قاجار لەگەڵ ئەوەی سەڵتەنەتی قاجارییە، بەهۆی هاوڕێیەتی و خزمەتی میرزا ئیبراهیم خانی کەلانتەر سەقامگیر کرابوو، ئەوی لەبەر

---

[1] – نەوادر بەمانای کەسە دەگمەنەکان دێت و لێرەدا مەبەست لێی نادرە.

ناسوپاسی و خیانەت لەگەورەکەی خۆی یانی لوتف عەلی خان، خستە ناو قازانی سزا و کولاندی. تەنانەت دەبیستین لەم دواییانە و لەو ڕۆژگارەی بەدبەختانە دەولەتی ئێران بەرەو ڕووخان دەڕۆشت، باوکی بەهۆی خیانەت، سوار کەرێکی بێ کۆپان دەکات و ڕیسوایانە بەناو تاراندا دەیگێرێت. لەم بەڵگانەوە سەلمێنراوە کەمەزنی و ڕیسوایی هەر دەولەتێك، پەیوەستە بەئاستی توندی و لاوازی سزادان و هەر ئەندازە سەپاندن و جێبەجێ کردنی ئەم هێزە، لەنێوان میللەتێك لاواز ببێت، بەهەمان ئەندازە مەزنی و شکۆی خۆی لەدەستدەدات بەهەمان شێوە کەدوای پەیماننامەی تورکمانچای، یانی لەو ڕۆژە شوومەی کەسولتانەکانی ئێران لەدەریای شەهوەتپەرەستی و نائاگایی، بەهەنگاوی خێرا، ولاتی ئێمەیان بەرەو بەدبەختی دەبرد، جێبەجێکردنی فەرمانی سزادان لاواز بوو تا ئەو ڕۆژەی مەشروتە ڕاگەیندرا. دەڵێی لەهەمان ڕۆژ فەرمانی ئیعدامی سزاکردنیان دەرکرد. خۆزگە سزادان وەك خۆی دەمایەوە و شێوەی دیکەی بەخۆیەوە نەدەگرت یانی ئەم هێزەیان بۆ مەبەستی پێچەوانە بەکار نەدەبرد. بەهەمانشێوە کەدراوسێ میهرەبانەکانی ئێمە بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆیان ئاشکرا کردووین کەخیانەتکارترین کەسەکانی ئەم ولاتە، ڕێزدارترین و ئەمینترین کەسانی ولاتن. بۆنمونە سەمەدخان، بۆ وەك فەرمانڕەوای ڕەهای ئازەربایەجان دەستنیشانکرا؟ چوونکە لەدزی و خیانەت کەموێنە بوو. ثقة ئەلئیسلام و هاوەلانی بۆ لەڕۆژی عاشورا لەداردران؟ چوونکە ولاتپەرەست و لەگەل بەرژەوەندی بیانییەکان نەبوون. دەولەت و قونسولی ئینگلیس بۆ پشتیوانی خۆی لەئەمان الله میرزا درێغ کرد و بێشەرمانە و بێ هیچ پەرچەکردارێك ڕێگەیاندا لەناو قونسولخانە مێشکی خۆی بپرژێنێت؟ چوونکە ڕاسپێردراوێك بوو و دەیویست ئەرکەکەی خۆی ئەنجامبدات و ئامادە نەبوو خیانەت لەنیشتمانەکەی بکات. بارەگای (ثامن الامە)، پەرەستگای چەندین ملیۆن کەسی موسولمان، بێترس و بوێرانە تۆپباران دەکرێت بۆ ئەوەی بلێن دوای بەستنی پەیمانی ۱۹۰۷ چیتر ئێرانی خاوەن مال نییە و هەرکەس بانگەشەی ولاتپەرەستی بکات، دەبێت چاوپۆشی لەژیان و سامانی خۆی بکات.

ئەی خەلکینە و ئەی دانیشتووانی گۆی زەوی، ببیستن و بەکەسانی دیکە بلێن کەسیاسەتی ڕووس و ئینگلیس لەمالەکەی ئێمەدا ئەوە بوو بەزۆری ڕم، سزایان بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپاند کەکەسانێکی خێرخواز بۆ ولاتەکەیان و لەخیانەت و دزیکردن خۆیان بەدوور

دەگرت. سپاس بۆ خوا قازانی غەزەب و تورەیی خوا لەئاهی ستەملێکراوان هاتۆتە کوڵێن و دەستی سەرکوتکەری سروشت لەقۆڵی کراسی داماوەکانی دنیا هاتۆتەدەر و روخساری دەوڵەتە تەماحکارەکانی دنیا شین و مۆر دەکاتەوە و ئەو ڕۆژە دەگات ئالآی دەوڵەتە ستەمکارەکان لەوڵآتانی دیکە بێنێتە خوار. بەهەمان شێوە کەمەبەست لەم جەنگە نێودەوڵەتییە، لەسەرەتاوە، کورتکردنەوەی دەستی ڕکەبەرەکان و خواردنی سامانی دەوڵەتە بچووکەکان بوو کەهەمان بەڕێوەبەری سروشت یەکەم کەسی بۆ دەربڕینی ئەم ڕستە ژەهراوییە ناچار کردووە کەدەڵێن: ئێمە بۆ دەوڵەتە بچووکەکان دەجەنگین. سروشت، دەوڵەتە زلهێزەکانی دنیا کەساڵآنێك بوو خوێنی دەوڵەتە بچوکەکانیان کردبووە شووشە، بەڕازیبوون بەم ڕاستییە تاڵە ناچار دەکات بەڵآم بەداخەوە هێشتا چالاکی پێشووی ئەوان لەوڵآتی بەلآدیتوی ئێمە کەم نەبۆتەوە و ناخوازن بەئاسانی بەم ڕاستییە ڕازی ببن. دەرئەنجامی ستەمی دەوڵەتەکان، فیداکردنی هەزاران گەنجی بوێر و ئازا و بەفیڕۆچوونی هەزاران ملیۆن سامانێك بوو کە بەستەم کەڵەکە وپاشەکەوتیان کردبوو و هەنووکە نوێنەرەکانیان، درێژە بەهەمان ڕێبازی هەڵە دەدەن و هەزاران بەدبەختی دیکە بۆ خۆیان ئامادە دەکەن. بەهەمانشێوە کەدیپلۆماتی ئینگلیس بەهۆی دەستدرێژییەکانی خۆی، کاریگەری چەندین ساڵەی دەوڵەتی ئینگلیسی بەفیڕۆدا و ئەو ئەنجامەی لەهۆی چاکەکاری لەئێران بەدەستیان هێنابوو، بۆ دوژمنایەتی و کینە گۆڕی کەکەسێکی بێ لایەن دەتوانێت بەئاسانی هەست بەدەرهاویشتەکانی بکات. دیپلۆماتی تازەی ڕووسیش ئەگەر فریوی هاوکارەکەی خۆی نەخوات و ئەم خۆشەویستییە کە بەهۆی گۆڕانی ڕژێمی ڕووس لای ئێرانییەکان دروست بووە، بقۆزێتەوە، سەرکەوتنێکی بەدەستهێناوە کە لەڕووسییە، توانایی ئەو، بەڵگە دەبێت بۆ گەورەترینی خزمەتەکان. هەڵبەتە لای ئێمە جیاواز نییە و ئێمە بەپشت بەستن بەهێزی نیشتمانی و هاوکاری خواوەندی کەڕزگاری نەتەوە ستەملێکراوەکانی دنیای دیاریکدرووە، دەتوانین ولآتەکەی خۆمان ڕزگار بکەین. ئەمانە ئەو بابەتانەن لەدڵی خنکێنرا و لەقورگی گوشراوی هەر ئێرانییەك دێتەدەر و هەموو کەسانی خاوەن ویژدانی دنیا ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە و بەدڵنیاییەوە ئەم ڕاستییانە ڕۆژێك لەکۆبوونەوەی نێونەتەوەیی بەگوێی نوێنەری دەوڵەتەکان دەگات کەئێمە، میللەتی بەدبەخت لەدەستی دراوسێ ئازاردەرەکانی خۆمان، ئەم بارودۆخەمان بەسەردا سەپێنرابوو. دوای ئاگادار کردنەوە و

بیرخستنەوەی بابەتەکانی سەرەوە، ئایا کەسانی بێ لایەن، تەنانەت کەسانی خاوەن ویژدانی ئەم دراوسێیانە کەڕاستەوخۆ بەشداری تاوان و ستەمی لێپرسراو و کاربەدەستانی خۆیان نەبوون، بوونی کۆمیتەی سزا پشتڕاست ناکەنەوە؟ ئایا لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا گومان دەکەن کەکۆمیتەی سزادان، دەستەیەکی ئاژاوەچی و بۆ بەرژەوەندی تایبەت دامەزراوە؟ هەر کەسێکی خاوەن ویژدان کەویژدانێکی تەندروستی هەبێت، بوونی کۆمیتەی سزادان بەپێویست و ئەو مافە بەئێمە دەدات کەدەستی خیانەتکارەکان ببڕینەوە.

ئێمە دەبێت ئەو کەسانەی بەهاندان و پشتیوانی بیانییەکان، سەرچاوەی کاروباری خیانەتکارانەن، لەگۆڕەپانی ئێران بسڕینەوە. دەبێت چیتر ڕێگە نەدەین سوڵتانی خۆشەویست و پاشای بێ تاوانی گەمارۆدراوی ئێمە، بەبێزاری و ناچاری دەستنووسی فەرمانی سەرۆك وەزیرانی فلأنە کەسی خیانەتکار واژۆ بکات. ئەمانە ئەو هۆکارانەن بوونەتە هۆی دروستبوونی کۆمیتەی سزادان و تا ئەو ڕۆژەی بیانییەکان دەست لەکاروباری نێوخۆیی وڵاتی ئێمە وەربدەن، ئەم کۆمیتەیە دەمێنێتەوە.

دوای سەلماندنی پێویستی بوونی کۆمیتەی سزادان، گرنگی بەدەوڵەتی ئێستا دەدەین و دەڵێین: ئایا بەبوونی ئەم دەوڵەتەی ئێستا و چالاکییەکانی، دەتوانین بڵێین وڵات، پێویستی بەکۆمیتەی سزادان نییە، نەسوێند بەخوا. چوونکە نووری ڕزگاری بەناوچاوی ئێوەوە نییە. هێشتا تۆقاو و ترساوی دەستی بیانییەکانن و باوەڕتان نییە بەوەی دەستی ڕۆژگار، سەرقاڵی بڕینی دەستی خیانەتکارانە. بیرکردنەوە لەخزمەت جیاوازە لەخزمەت.

ئەگەر بزانن ڕووداوەکانی دنیا لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە گرنگانەی ڕۆژانە هەزاران ڕەنگی جۆراوجۆر لەبارودۆخی دنیا نیشاندەدات، دەرئەنجامی لێپرسراویەتییەکی ڕاستەقینەیە، پشتتان دەلەرزێت وباشتر لەمە دەجووڵێنەوە و چالاکی دەکەن. ئەگەر کەمێك تێڕامێنن، تێدەگەن کەبەردەوام بوونی ئەم هەڵسوکوتە، ڕێبازێکی ئابڕوومەندانە نییە و ئەگەر تا ماوەیەکی دیکە لەپێرستی خیانەتکاران لەقەڵەم نەدرێن، لانی کەم وەك کەسێکی ناکارامە و ناوزڕاو، ناوبانگ دەردەکەن کەکارگوزارانی داهاتووی ئێران، فەرمانی دوورخستنەوەی هەمیشەیی ئێوە لەکاروبارە نیشتمانییەکان دەردەکەن.

بەهەمانشێوە کەپێویستی نەدەکرد، ستەم و دەستدرێژییەکانی فەخرولمولك لەحکومەتی یەزد، کوردستان و ئیستەرئاباد لەتوورەکەی خیانەتکاری ئەو، بشارنەوە و لەبەر هەندێ

هۆکاری تایبەت کەئێمە لێیان ئاگادارین، وەك فەرمانڕەوای حکومەتی تاران دەستنیشانی بکەن. کردەوە و چالاکییەکانی دیکەی ئێوە جێگەی هیوا و ڕەزامەندی نییە. تەنانەت زۆر بەداخین کەدەستەیەك لەوەزیرەکان هێشتا شوێنکەوتەی هەمان ڕێبازی پێشوو و سەرقاڵی وەرگرتنی بەرتیل و ریشوە و هتد....ن.

کۆمیتەی سزادان ڕووبەڕووی ئێوە یا هەر حکومەتێکی دیکە نەبووە، ئارەزوومەندی دەوڵەتێکە بەگیان و دڵ، پارێزەری شەرەف و پاسەوانی تاج و تەختی ئێران بێت. ئەگەر جیاواز لەمە دەبوو، سزادانی فەخرولمولکی پێش مونتەخیب ئەلدەولە دەخست.

دەڵێن دروستکردنی جەنگەڵ دەبێتە هۆی بارانی باران و ئاسایيە بوونی گەرما، سەهۆڵ دەتوێنێتەوە. یانی ئەو کاتژمێرەی کۆمیتەی سزا لەگەڵ چاکسازییەکانی دیکە ببینێت کە بەهۆی کردەوەکانی دەوڵەت، یەکێك لەخیانەتکارەکان بەفەرمانی دەوڵەت بەئیعدام مەحکومکراوە، لەهەمان سات کۆمیتەی سزا هەڵدەوەشێتەوە و هەمان ڕۆژ دەبێتە ڕۆژی بەختەوەری ئێران و گەورەترین هەنگاوێکە کابینەی ئێستا بۆ بەهێزکردنی خۆی هەڵیدەگرێت.

لەکۆتایی بابەتەکە، بەئیهانە کردن و ئیدانە کردنی بەڕێوبەری نەوبەهار بۆ بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی خۆی، دەڵێن: ئەو مەبەست و ئامانجەی ئێوەی ناچار بەم ڕەخنەگرتنە کردووە، چیتر ڕێگە نادات بەچاوی حەقیقەت، هەست بەڕاستی شتەکان بکەن. کۆمیتەی سزادان بەو نییەتە پاکە کەبۆ هاووڵاتییەکانی خۆی هەیەتی، لەئێستادا ئەم ئیدانە کردنە بۆ کەسێکی هاووڵاتی کەتازە زمانی بەسەر ڕاستییەکان بەستووە و بەداخەوە جلوبەرگێکی دیکەی پۆشیوە، بەبەسەندە دەزانێت و هیواداره دوای ئەم ڕاستییانە، بەشێوەیەکی باشتر لێکدانەوە بۆ بابەتەکان بکات. ٢٣ ڕەمەزانی ١٣٣٥.))[1]

دوای بینینی نامەکە و ئاگادارییەکە و بەیاننامەکان، وەڵامی حاجی بەهادورئەلسەڵتەنەم دایەوە: یەکەم کوردستان، پێویستی بەکۆمیتەی سزادان نییە چوونکە خیانەتکاری سیاسی

---

[1] – دواتر دەرکەوت ئەندامانی کۆمیتەی سزادان بریتی بوون لەم کەسانە: مونشیزادە، ئەبولفەتح زادە، حاجی بەهادورئەلسەڵتەنە، عیماد ئەلکیتاب، ڕەشید سوڵتان، ئیسحان الله خان، حسەین الله، کەریمی دەواتگەر. ڕەشید سوڵتان و حسەین الله لەتاران ئیعدام کران. منیش حاجی بەهادورم لەکاتی سەرۆك وەزیرانی وسوق ئەلدەولە لەزیندان ئازاد کرد و بۆ قەزوینم نارد تا لەتاران نەمێنێتەوە.

لەم ناوچەدا بوونی نییە و کۆمیتەکە بێکار دەبێت. دووەم کاتێك لێکدانەوە بۆ کۆمیتەی ناوەند دەکەم، دەبینم توانای لەناوبردنی خیانەتکارانی ناوەندی نییە چوونکە نهێنی بوونی کۆمیتەکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ژمارەی فەرمانبەرانی کۆمیتەکە زۆر کەمتر لەژمارەی خیانەتکارەکانە. جیاواز لەمە خۆیان نەدەشاردەوە و لەشەو و ڕۆژێکدا تووی خیانەتکارانیان لەتاران نەدەهێشت. کەواتە بەپێی بەڵگە و بورهانەکان دڵنیام سیلسیلەی فەرمانبەرانی کۆمیتەکە درەنگ یا زوو کۆتاییان پێدێت و سیلسیلەی خیانەتکاران بەردەوام و ژمارەیان زیاد دەکات. بەمپێیە کۆمیتەی ناوەند، کۆمیتەیەکی شیاو بۆ چاکسازی ئێران نابێت جگە لەوەی دەبێت چاوەڕوان بین دەستێك لەغەیبەوە بێت و چارەسەرێك بۆ ئەم کێشەیە بێنێت.

زۆری نەخایاند کۆلۆنێل زەخارچینکۆ و سۆهرابزادە و شێخ نیسکی و دەستەیەکی دیکە هاتنە کوردستان و لەخوسرەوئاباد دانیشتنێکیان سازکرد و کۆمیتەیەکی دیمۆکراتیان دامەزراند. دوای چەند ڕۆژێك ژمارەیەك ڕووسی کەتازە هاتبوون، هاتنە بەردەم ماڵی ئێمە، سەرۆکەکەیان هاتە ناوحەوشەکە و وتی: ئێرە دەبێت چۆڵ بکرێت، ئێمە دێینە ئێرە. وتم: دەزانی ئێرە ماڵی کێیە؟ وتی: بەڵێ، ماڵی پێشنوێژ و وتارخوێن. هەستمکرد کە ئەمە بەفەرمانی ئیقباڵ نیزام و کرپاچۆف دەکرێت و گەرنە ڕووسیەك کەتازە هاتبێتە کوردستان، ماڵی من نازانێت و جیاواز لەوە بێ وەرگرتنی فەرمان، توانای دەرکردنی منی نییە. بێ ڕووگرژ کردن بەو کەسەم وت دەکرێت یەك دوو کاتژمێر مۆڵەتم پێبدەن تا کەلوپەلەکانم بۆ شوێنێکی دیکە بگوازمەوە. وتی: بۆنا، بەڵام زیاترتان پێنەچێت. بەکورتی لەماوەی ئەو دوو کاتژمێرەدا کەلوپەلەکانمان لەڕێگەی سەربانەوە بۆ ماڵی ڕۆستەمخانی مارنجی دراوسێمان گواستەوە و ماڵەکەمان تەسلیم بەڕووسەکان کرد. حەفتەیەك دواتر کەلوپەلەکانمان بۆ گوندی ڕەمشت نارد و خۆیشمان دوای ماوەیەك ڕۆشتینە ئەو گوندە. لەم ناوەدا، دەبیرنەسرار لەسەر کار لابرا و نیزام ئەلسەڵتەنەی نوری ڕۆژی ٩ زیحەججەی ١٣٣٥ لەڕێگەی گەڕووسەوە هاتە کوردستان و عەبدوڵڵە خان و فەرەج الله خانی مەندەمی کەحیشمەت ئەلمولك قۆڵبەستی کردبوون، لەخوسرەوئاباد بەدەمی تۆپەوە بەست. دواتر دەستیکرد بەبڵاو کردنەوەی ڕێبازی سۆسیال دیمۆکرات. دوای چوار ڕۆژ، کۆمیتەی دیمۆکرات تێکەڵ یانی پێکهاتوو لەڕووسی و کوردستانی، بەهۆی ڕووسەکانەوە، ئەویان

لەسەر کار لابرد. زۆری نەخایاند ئیبراهیم خانی سۆهرابزادە لەگەڵ ڕەمەزانزادەی کوردستانی هاتنە ڕەمشت. سۆهرابزادە لەبارودۆخی عەشیرەکانی کوردستان دڵتەنگی دەربڕی و وتی سوپای ڕووس بڕواتە هەر شوێنێك، عەشیرەکان دەبنە ئەرك بۆیان. وتم: ئەمە یاسایەکی سروشتییە کەپێشەنگی سوپای بێگانە، لەهەر خاك یا سەرزەمینێك ئەگەر لەدانیشتووانی ناوچەکە نەبێت، بەمشێوە دەبێت. وتی: ڕێگەچارە چییە؟ وتم: ئەگەر دەتوانن سەردار ڕەشید وەك فەرمانڕەوای شارەکە دەستنیشان بکەن، ئەوکات سوپا بۆ هەر شوێنێك بڕوات، ژمارەیەك لەکەسەکانی سەردار وەك پێشەنگی سوپاکە دەڕۆن و چیتر کەس نابێتە ئەرك بۆیان. سۆهرابزادە گەنجێکی وشیار بوو، بەخێرایی ئەم بابەتەی پشتڕاستکردەوە و وتی: ئەگەر من زەخارچینکۆ و سەرۆکەکانی سوپا بۆ هێنانی سەردار ڕەشید ئامادە بکەم، ئێوە دەتوانن ئەو بێننە شار؟ وتم: من و تۆ پێکەوە دەڕۆین و دەیهێنین. دوای گەڕانەوەی سۆهرابزادە بۆ شار، زۆری نەخایاند نامەی نووسی کە: من ڕووسەکانم بەفەرمانڕەوایەتی سەردار ڕازیکردووە، پێویستە ئێوەیش بۆ شار بگەڕێنەوە و پێکەوە بڕۆین و سەردار بێنین. دوای دوو سێ ڕۆژ گەڕامەوە بۆ شار و لەگەڵ زەخارچینکۆ و ژەنراڵ قسینکۆ و لاچین ئۆف، گفتوگۆی پێویستمان کرد و ڕۆژی ١٤ موحەرەمی ١٣٣٦، لەگەڵ سۆهرابزادە بەرەو ڕەوانسەر بەڕێکەوتین و سەردارمان لەچەند و چۆنی ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ئەویش باسی مەرجەکانی خۆی کرد کەیەکێك لەوان گرنگینەدان بەبارودۆخی دیمۆکراتبازی حاجی شێخ ئیبراهیم و سالار ئەشرەف بوو. مەرجەکانی ئەومان بۆ سنە نارد. ڕووسەکان ڕازیبوون و بەمشێوەیە لەگەڵ هێزەکانی ڕەوانسەر و جوانڕۆ و لهۆن و سوڕسوڕ کەزیاتر لەپێنج هەزار کەس دەبوون، بەڕێکەوتین.

ڕێگەمان خوار کرد و ڕۆشتینە ڕەزاو تا سوپای هەورامانیش لەگەڵ خۆمان ببەین. ڕەزاوییەکان تا پایگولان هاتن و لەوێوە گەڕانەوە. دەترسان سەردار بەشێوەیەکی خراپ مامڵە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات. ئێمە لەڕێگەی کوێستانەوە ڕۆشتینە هەشە میز بۆ لای سالار فاتح. ڕۆژیی سێشەممە ٤ سەفەر، لەکاتی نانی نیوەڕ ڕۆشتینە حەسەن ئاوا کەڕووسەکان بەهەموو سوپاکەیانەوە، بۆ پێشوازی هاتبوونە ئەو گوندە. لەشارەوە شیرینی و کورسی و هەموو شتێکی میوانداریيان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. ئێوارێی هەمان ڕۆژ گەشتینە خوسرەوئاباد. ئیعتیزاد دیوان، کارگوزاری لەگەڵ سۆفی محەممەدی میرزای خبباز

(نانەوا) گرت. کارگوزار بەتکای وەکیل ئەلمولك لەبەرابەر وەرگرتنی بڕە پارەیەك ئازاد کرا بەڵام سۆفی محەممەد میرزای دوای تێپەڕینیی پێنج کاتژمێر لەشەو، بەیەکێك لەدارەکانی بەردەم بینیاکەی بەستەوە و تیربارانی کرد. دوای ڕێکخستن و گەڕاندنەوەی نەزم بۆ شارەکە، والیزادەی لەماڵەکانی مەلا لوتف اللەی شێخولئیسلام وەك جێگری حکومەت دەستنیشانکرد و داوای سێسەد کەسی لەڕووسەکان کرد و بەسەرۆکایەتی خارونجی فیۆدۆر گرینکۆ و نیکالایویچ کراوچین کوپیوتر لەگەڵ خۆیدا برد. هێرشمان کردە سەر مەندەمی و گوڵباغییەکان کەزۆرترین ئەرکیان بۆ سوپای ڕووسەکان دروستدەکرد. سالارفاتح و سالار ئەشرەفی پێشخۆی خست بەو مەبەستەی دوای سەرکوت کردنی مەندەمی و گوڵباغییەکان تیربارانیان بکات. ڕۆژانە نرخی گەنم و نان بەرز دەبوویەوە و قاتوقڕی و وشکەساڵی زیاتر تەشەنەی دەکرد. ئێمە لەغەیبی سوور بووین. هەواڵ گەیشت کەئەمان اللە خان وەکیل ئەلمولك، شەوی هەینی ٢١ سەفەر، لەماڵی بابالی ئاغا مردووە. بەشێك لەگوڵباغییەکان هاتنە غەیبی سور و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا و سالار فاتحیان بۆ سەرکردایەتی خۆیان برد تا ماڵیاتە دواکەوتووەکە لەگەڵ شەش هەزار تمەن بۆ سەردار ڕەوانە بکەن. دوای دوو سێ ڕۆژ، سوارێك لەشارەوە هات. لاچینکۆ بۆ سەرداری نووسیبوو: لەبەر ئەوەی ئەو سوپایەی لەگەڵ ئێوەدان دەبێت بڕۆن بۆ هەمەدان، لەگەڵ کەسێکی شارەزا ڕەوانەی هەمەدانیان بکەن. دواتر ئەگەر ئێوە پێویستتان بەسوپا بوو، دەستەیەکتان بۆ ڕەوانە دەکرێت. سەردار لەم کارە سەریسوڕما. منیش بەهەمان شێوە سەرگەردان بووم. وتم: ئەم سوپایە ڕەوانە مەکە تا دەڕۆمە شار و لەچۆنیەتی ئەم کارە ئاگادار دەبمەوە، ئەوسا بڕیاری دروست دەگرین. هەمان شەو گەڕامەوە بۆ شار، یەکەم کەس لەوالیزادەم پرسی بەڵام بێ ئاگایی خۆی دەربڕی. ڕۆشتم سەردانی لاچین ئۆفم کرد و بەنهێنی بەشێکی ڕووداوەکەم لێپرسی. ماوەیەك بیری کردەوە و دواتر وتی: ئەمە وەك نهێنییەك لای ئێوە باس دەکەم، بارودۆخی ڕووسیا شڵەژاوە، نەتەوەی ڕووس شۆڕشی کردووە و ئیمپراتۆر و ئەندامانی خێزانەکەیان کوشتووە. ئێستا دەوڵەتی ڕووسیا گرفتاری جەنگێکی نێوخۆیی بۆتەوە و ئێمە دەبێت بەخێرایی بۆ شوێنەکانی خۆمان بگەڕێینەوە. وتم: ڕێگە دەدەن سەردار لەم نهێنییە ئاگادار بکەمەوە؟ وتی: بۆنا، بەو مەرجەی کەسی دیکە بەم نهێنییە نەزانێت. ئێمە بەیانی لەگەڵ ژەنراڵ فسینکۆ بەڕێدەکەوین، ئەو سوپایەی سەردار لەگەڵ کەسێکی شارەزا

ڕەوانە بکەن تا لەهەمەدان پەیوەستی ئێمە بن.

دوای ئاگادار بوونەوە، بەخێرایی بۆ غەیبی سوور گەڕامەوە و سەردارم لەباروودۆخ ئاگادار کردەوە. سەردار خەمبار بوو، سەرەتا بیری لەوە کردەوە ئەو ژمارەیە لەچەك دابماڵێت و بێ چەك ڕەوانەی هەمەدانیان بکات بەڵام من ڕێگەی ئەو کارەم لێگرت و وتم: دەرئەنجامەکانی ئەم باروودۆخە نەزانراو و ڕۆژگارێکی دوورودرێژمان لەبەردەمدایە. پەندێکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: کێو بەکێو ناگات، بەڵام مرۆڤ بەمرۆڤ دەگاتەوە. ئەم بڕیارەی ئێوە بەپێچەوانەی ویژدان و هەموو شتێکە. سەرئەنجام من چوار ڕەمشتیم لەگەڵ ئەوان نارد و تەندروست ئەوانیان گەیاندە هەمەدان. خۆیشمان لەغەیبی سورەوە بەرەو حاجی موسا بەڕێکەوتین تا کاروباری تایبەت بەفارسی ڕەئیس و عیسای خوسرەو و گوڵباغییەکانی دیکە یەکسەرە بکەین و بۆ شار بگەڕێینەوە. دەرکەوت ئاسف دیوان ئەوانی لەڕۆشتنی سوپای ڕووسەکان ئاگادار کردۆتەوە و گرنگییان بەوتەکانی سەردار نەدا. سەردار، عەزیزخانی سوڕسوڕی لەگەڵ ژمارەیەك لەسوڕسوڕییەکان بۆ سەرکوتکردنی ئەوان ڕاسپارد. نزیك نیوەڕۆ، بەسێ کوژراو و هەشت بریندار گەڕایەوە. سەردار فەرمانی بەڕێکەوتنی سوپای دەکرد. فەرمانەکەی سەردار بەهەر بەشێکی سوپاکە گەیشت، بیانوویان هێنایەوە. سەردار لەم باروودۆخە خەمبار و گەڕایەوە. بەفرێکی زۆر باریبوو. کاتێك گەشتینە نزیك باقڵ ئاوا، چوار سواری مەندەمی دەرکەوتن، کەلوپەلەکانی سەرداریان برد. یەکێك لەکەرسوارەکان هاواری کرد. سەردار لەتاو توڕەیی و خەمباری گرنگی پێنەدا. لەناو سوپاییەکانیش کەس بۆ گەڕاندنەوەی کەلوپەلەکە ئارەزوومەندی خۆی نیشاننەدا. هەستمکرد بردنی کەلوپەلەکان لەداهاتوودا دەبێتە هۆی نەنگێکی مێژوویی کەپێنج هەزار کەس توانای شوێنکەوتنی چوار کەسیان نەبوو. بەناچاری من و محەممەد ئەمین بەگ، برازای جەعفەر سوڵتان و دوو سواری دیکە گەڕاینەوە. تا نیو فەرسەخی شوێن مەندەمییەکان کەوتین. کەسێکمان لێ بریندار کرد و کەلوپەلەکانمان وەرگرتووە و گەڕاینەوە. ئەو شەوە لەباقڵ ئاوا ماینەوە و بەیانی ئێواری گەشتینە ناو شار.

چیتر لەباروودۆخی عەشیرەیی و عەشایری بێزار ببووم، بەسەردارم وت: هیچ گومانێکی ڕستگاری لەم خەڵکە و لەم سەرزەمینە ناکرێت. دەمەوێت بڕۆمە تاران. ئێستا کەهێزەکانی ڕووس وڵاتەکەی ئێمە بەجێدێڵێت، بەدڵنیاییەوە هێزەکانی تورکیا و ئاڵمان چیتر هێرشمان

ناکەنەسەر. بەهەمانشێوە کەئەزمونمان کرد، بەشێوەی عەشایەری و بەپشت بەستن بەعەشیرەکان ناتوانین کاروباری وڵاتەکەمان ڕێکبخەین. ئەگەر حەز دەکەن لێرە بمێننەوە، لەگەڵ گەیشتنم بۆ تاران، فەرمانی حکومەتی کوردستانتان لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ دەنێرم و لەجیاتی هێزەکانی عەشایەر، سوپایەکی ڕێکخراو و تەیار، لەتارانەوە ڕەوانەی کوردستان دەکەم تا کۆتایی بەم بارودۆخە بێنن و هەموو دەسەڵاتەکان بگرنەدەست و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایەتی کوردستان دابنیشن. جیاواز لەوە، فەرمانڕەوایەکی بەهێز لەگەڵ خۆم بۆ کوردستان دێنم و دەگەڕێمەوە.

سەردار هەڵبژاردنی یەکەمی پەسەند کرد و لەسەر ئەم بڕیار و پەیمانە، کۆتاییەکانی ڕەبیع الاوەل ١٣٣٦، لەڕێگەی کەلیاییەوە بەرەو تاران بەڕێکەوتم. کاتێك گەیشتمە کەل سپی، ئەمیر ئەمجەد حسەین قولی خان وەك فەرمانڕەوا، ڕۆشتبووە سەنقور. عەلی ئەکبەر خانی کوڕی میوانداری ئێمەی کرد. بەیانی ڕۆشتینە سەنقوڕ و بەکورتی ئەمیر ئەمجەدمان لەبارودۆخ ئاگادار کردەوە. ئەمیر وتی: باش بوو لەڕووداوەکان ئاگادار بوومەوە وگەرنە ئاسفی ئەعزەم، داوای سوار و سوپای لەمن دەکرد تا بتوانێت سەردار ڕەشید بگرێت. منیش فەرمانمداوە بەیانی دووسەد سوار بەرەو کوردستان بەڕێکەون و ملکەچی فەرمانەکانی ئاسف بن کە لەئێستادا لەئیسفەند ئاوایە. ئێستا کەبارودۆخ بەمشێوەیە، دەبێت بەخێرایی کەسێك بنێرم و فەرمان بدەم سوارەکان نەڕۆن. بەخێرایی ئەو شەوە، سوارێکی بۆ لای شێخ ڕەحمەت الله کەسەرکردایەتی سوارەکانی دەکرد، نارد و فەرمانی گەڕانەوەی خۆی و سوارەکانی پێدا. منیش کاتێك لەم پێشهاتە چاوەڕواننەکراوە ئاگادار بوومەوە، بەخێرایی سوارێکم ڕەوانە کرد تا سەردار لەبارودۆخ ئاگادار بکاتەوە تا بێ ئاگا نەبێت. سەردار دوای ئاگادار بوونەوە، دەسپێشخەری دەکات و لەگەڵ ئەوەی مۆڵەتی گەڕانەوەی بەهەموو هێزەکانی خۆی دابوو و تەنیا دوانزە سواری بەدەرەوە بوو، بێ لەدەستدانی کات، دەمەو ئێواریێ ئاسف لەژێر ناوی دابینکردنی نانی شار دەباتە قەڵای حکومەتی و دەستی بەسەردا دەگرێت. پیاوەکانی ئاسف دەترسن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. سەردار فەرمانی داخستنی دەروازەکانی ئەعلاقای دەدات و فەرمان دەدات ڕێگە نەدەن کەس ئەو شەوە بێتە ناو قەڵای حکومەتی. هەرچەند زانا و شێخەکان دەیانەوێت چاویان بەسەردار بکەوێت، بەڵام مۆڵەتی بینین بەکەس نادات. نیوە شەو، ئاسف سوار کەر دەکات و لەگەڵ ئەو ژمارە کەمەی خۆی، ڕەوانەی

ڕەوانسەری دەکات و عەلا ئەلسولّتان وەك جێگری خۆی بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەستنیشان دەکا. من بێ ئاگا لەم ڕووداوانە، لەڕێگەی ئەسەد ئابادەوە بەرەو تاران بەڕێکەوتم.

کاتێك گەیشتمە هەمەدان، بینیم شارەکە لێوانلێوە لەهێزەکانی ڕووس. دەستە دەستە لەبەرەکانی جەنگ دەگێڕنەوە و بەرەو ڕووسیا دەڕۆن. لەبەر ئەمە هاتوچۆ دژوار و کەرەستەکانی گواستنەوە بەئاسانی دەستنەدەکەوت. گەشتیارانیش لەترسی دەستدرێژی و ئازاری ڕووسەکان بوێری هاتوچۆیان نەبوو. وتیان ژەنرالّ باراتۆڤ سەرۆکی هەموو هێزەکان لەشورینە. بەناچاری ڕۆشتمە شورین و چاوم بەژەنرالّ کەوت و ئەوم لەمەبەست و نیازی خۆم ئاگادار کردەوە. ئەو بەڕێزە فەرمانیدا گالیسکەیەك بۆ گەیاندنی من بەتاران دابین بکەن و فەرمانیدا کەس لەڕێگە نەبێتە ئەرك بۆمان. نامەیەکی بۆ پالکۆنیك کلرژە، سەرۆکی قەزاقی شاهەنشاهی نووسی کەفلأنە کەس دێتە تاران، بەخێرایی دووسەد قەزاق و دوو تۆپی بخەنە ژێر دەست تا بەهاوکاری سەردار ڕەشید نەزم و ئارامی بۆ کوردستان بگێڕێتەوە. دوای وەرگرتنی مۆڵەتی گالیسکەکە و نامەکە، بەخێرایی بەڕێکەوتین. لەناو ڕێگە کاتێك سەرکردە و سوپای ڕووسمان دەبینی، بەوپەڕی ڕێزەوە بەڕێیان دەکردین تا گەشتینە تاران و نەجەف قولی خانی سەمسام ئەلسەڵتەنەی بەختیاریمان بینی کەسەرۆك وەزیری وڵات بوو. بەهەر دژوارییەك بوو لەبارودۆخ ئاگادارم کردەوە. بەفەرمانڕەوایەتی سەردار ڕەشید ڕازیبوو بەڵام بۆ پێدانی تۆپ و قەزاق بەباشی زانی خۆم چاوم بەسەرۆکی قەزاق بکەوێت و پەیمانی لەگەڵ ببەستم! تا هەرچەندە قەزاقمان دەوێت، خۆمان خەرجییەکانی دابین بکەین و پاشان دوای کۆکردنەوە ماڵیاتە دواکەوتووەکان، خەرجییەکانی خۆمان هەڵبگرینەوە. چەند ڕۆژ دواتر کاتێك ویستم سەرۆکی قەزاق (پالکۆنیك کلرژە) ببینم، لەڕێگەدا کۆلۆنێل زەخارچینکۆم بینی. لەهۆکاری هاتنم بۆ تاران پرسیاریکرد. بابەتەکەم بۆ ڕوونکردەوە. ئەویش وەرقەیەکی بۆ ناساندنی من بەپاڵکۆنیك نووسی. کاتێك گەیشتمە بەردەم ماڵی پاڵکۆنیك، وەرەقەکەی زەخارچینکۆمدا بەپاسەوانی بەردەم دەرگاکە. بەخێرایی خزمەتکارێك هات و پێشکەوت. بەچەندپلیکانەیەکدا هەڵگەڕاین و ڕۆشتینە ژوور. دوای بینینی پالکۆنیك و خواردنەوەی چایی، نامەکەی باراتۆفم نیشاندا. سەرئەنجام لەهەمان دانیشتن (بێ گەڕانەوە بۆ لای کاربەدەستانی ئێران)، پالکۆنیك پێنسەد کەس قەزاق و دوو تۆپی کوێستانی و دوو

مەترەلیۆزی بۆ ماوەی پێنج مانگ، لەبری وەرگرتنی سی و پێنج هەزار تمەن خستە بەردەستی ئێمە کەپێنج هەزار تمەنی بەنەقدی بدەین و پاشماوەی پارەکە خۆیان لەمالیاتە دواکەوتووەکان کەرەوانە دەکرێت، هەلیبگرن. دوای کۆتایی هێنان بەم پەیماننامە، بڕیارماندا من بەبرووسکە داوای پێنج هەزار تمەن لەسەردار رەشید بکەم. بۆ مالەوە گەڕامەوە تا بروسکە بۆ بروسکەخانە بنێرم. پۆستچی هات. چەند نامەیەکی لەکوردستانەوە هێنابوو. نامەی یەکەم لەلایەن والیزادە موزەفەرخانەوە نووسرابوو. نامەکەم کردەوە، بینیم باسی چۆنیەتی دزینی ئاسف دەکات (بەوشێوەی پێشتر ئاماژەمان پێدا). نامەکانی دیکەیشم کردەوە. بەناچاری سەردارم لەچەندایەتی و چۆنایەتی پەیماننامەکەم ئاگادار کردەوە. دوای حەفتەیەك وەلامی دایەوە کە لەئێستادا چاوپۆشیم لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان کردووە. خۆتان دەزانن. دوای گەیشتنی ئەم بروسکە، پالکۆنیکم ئاگادار کردەوە و بەناچاری بەدوای فەرمانڕەوایەکی دیکەدا گەڕاین.

لەم ڕۆژگارەدا، قاتوقڕی و وشکەسالی لەتاران دەرکەوت، هەژارەکان لەبرسیەتیدا لەناو کوچە و کۆلانەکان لەسەر یەك کەلەکە ببوون و لەئارەزووی بەدەستهێنانی نان، دەمردن. بالیۆزخانەی ئەمریکا، فەرمانیدا بوو لەچەند شوێنێك خواردن ئامادە بکەن و بەسەر هەژارەکاندا بلاوی بکەنەوە. سولتان ئەحمەدشا گەنمی لەئەنبارەکانی پاشەکەوت کردبوو و بەنرخێکی گران بەنانەواخانەکانی دەفرۆشت. لەئەنجامی ئەم کردەوە قێزەونە، دانیشتووانی تاران لێی بێزار بوون و ئەویان بەئەحمەدی عەلاف ناو دەبرد. منیش لەگەڕەکی سەنگلاخ، لەگوزەری تەقیخان نیشتەجێ ببووم. هەموو ڕۆژێك هەژارەکانی گەڕەك دەهاتن و داویان دەکرد کەسێك بنێرم بۆ بالوێزخانەی ئەمریکا تا خواردنیان پێبدات. لەبەر ئەوەی ژمارەی هەژارەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیادیدەکرد، بڕیارماندا پێرستی هەموو هەژارەکانی ئەو گەڕەکە بنووسین. حەوتسەد و هەشتا و شەش کەس بوون. ناوی هەموویانمان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لەدەفتەرێکدا نووسی و بۆ بالوێزخانەی ئەمریکامان نارد. هەموویان یەکی پسوولەیەکیان وەرگرت و بەو پسولەیە هەر کەسەو نیوەڕۆ قاپێك و ئێواریٚ قاپێك خواردنی وەردەگرت و دۆعای خێریان بۆ دەکردن. هەژارەکانی گەڕەکەکانی دیکە، زاناکان و مامۆستاکانی ئایینی خۆیان نفرین دەکرد کەبۆ بەمشێوەیە هەولی چارەسەر کردنیان بۆ نادەن.

لەم ڕۆژگارەدا، حزبێکی تازە لەتاران بەناوی سۆسیال ڕۆلسیۆنێر دامەزرا. منیان وەك ئەندامی سەرۆکایەتی یانی ئەندامی کۆمیتە دیاریکرد. ئەندامانی کۆمیتەکە بریتیبوون لە: مەهام ئەلدەولە، سکرتێری باڵوێزخانەی نەمسا و ئەمیر ئەسەد الله خان کوڕی سەهام ئەلسەڵتەنەی عەرەب و دوکتۆر نەسروڵڵەخان ئەعلەم ئەلسەڵتەنە و میرزا محەممەد حسەین خان ئەمین ئەلحوکەما و سەیید محەممەد کازم خانی سەرکشیکزادە و میرزا ئیبراهیم خانی سۆهرابزادە و شازادە عێزەد ئەلسەڵتەنە کوڕی ناسرئەلدین شا.

ڕۆژێك کەشازادە شێخولرەئیسم مرد، لەبەر ئەوەی یەکێك بوو لەدیمۆکراتەکان و بەم دواییانە ببووە ئەندامی حزبی سۆسیال، ئەندامانی هەر دوو حزبەکە بۆ بەخاکسپاردنی جەنازەکەی ئامادەبوون. زۆربەی شازادەکان و نوێنەرانی دەوڵەتیش هاتبوون. کاتێك گەشتینە بەردەم دەروازەی مەجلیسی نیشتمانی، لەبەر ئەوەی پێشتر یەکێك لەوەکیلەکانی مەجلیس بوو، بەمەبەستی ماڵئاوایی کردن لەمەجلیس، من ڕۆشتمە سەر کورسی و وتارێکی تێروتەسەلم سەبارەت بەچاکییەکان و پێگەی بەرزی ئەدەبی ئەو کەسە بەدەنگی بەرز خوێندەوە کەبووە هۆی سەرسوڕمانی ئامادەبووان. تا کۆتایی وتارەکەم، جەنازەکەی لەسەر شانی شازادەکان بوو. دواتر جەنازەکەیان خستە ناو تابوتی مەجلیس و بردیانە شاعەبدولعەزیم و لەوێ بەخاکیان سپارد.

بەهۆی نامەوە لەکوردستان ئاگادار بوومەوە کەنرخی گەنم بۆ خەرواری دووسەد و سی تمەن بەرز بۆتەوە و دووبارە خاوەن گەنمەکان لەفرۆشتنی خۆیان بەدوور دەگرن و قاتوقڕی بەجۆرێك پەرەی سەندووە کەهەژارەکان بەخوێنی قەسابخانەکان و گۆشتی مردار و شتی لەو چەشنە خۆیان لەدەست مردن دەرباز دەکەن و چەند کەسێکیش منداڵەکانی خۆیان خنکاندووە و گۆشتەکەیان خواردووە، ڕۆژانە ژمارەی مردووەکان زیاد دەکات و دانیشتووان بێزار بوون و لەئەنجامی ئەمە خاوەن گەنمەکانیان بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین بردۆتە ئیمامزادە هاجەرخاتوون و لەوێ دەستبەسەریان کردوون کەیا دەبێت هاوشێوەی هەژارەکان خوێن و گۆشتی مردار بخۆن و یا لەگەنمەکەی خۆیان بەشی هەژارەکان بدەن تا ئەگەر زیندوو مانەوە، هەموویان زیندوو بمێنن و ئەگەرنا، دەوڵەمەندەکان سەرەتا بمرن. بەڵام بەداخەوە دەوڵەمەندەکان فێڵیان لێدەکەن و چەند خەروارێك بەنانەواخانەکان دەدەن و بەنهێنی بڕە پارەیەك بەوڵاتفرۆشەکان دەدەن کەبۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان،

سەرپەرەستی هەژارەکانیان گرتبوو ئەستۆ و بەمشێوەیە خۆیان لەدەست خەڵکان ڕزگار دەکەن. لەئەنجامی ئەم کردارە قێزەونە، ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەیەکی زیاتر لەهەژارەکان دەمرن.

لەکۆتاییەکانی شەعبانی ١٣٣٦، سەمسام ئەلسەڵتەنە بێ ئاگادار کردنەوەی من، فەرمانی حکومەتی کوردستان بەناوی عەلی ئەشرەف خان ئەمیر گەڕووسی دەردەکات و فەرمانی بەڕێکەوتنی پێدەدات. کاتێك لەڕووداوەکە ئاگادار بوومەوە، بەهۆی دەبیرەکەی خۆم، سکاڵام لەسەمسام ئەلسەڵتەنە کرد و رامگەیاند بەبوونی من لەتاران پێویستی نەدەکرد بێ ئاگادار کردنەوەی من حکومەت بۆ کوردستان دیاریبکات. لە٦ ڕەمەزان وەڵامی دابوویەوە کەیەکەم نەمزانیوە فلأنەکەس هێشتا لەتارانە، دووەم لەبەر ئەوەی ئەمیر، پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ ئەمیر موفەخەم و سەردار ئەسعەد هەیە و ئەوان داوای حکومەتی کوردستانیان بۆ کردبوو، بەپێویستم نەدەزانی بەداواکەیان ڕازی نەبم. ئێستا بۆ نەهێشتنی گلەیی و گازندەی فلأنەکەس، فەرمانم بەوەزارەتی داد داوە فەرمانی سەرۆکایەتی دادی کوردستان و گەڕوس بۆ فلأنەکەس دەربکەن تا لەگەڵ حکومەت بەڕێکەوێت. پێشتر بابەتی سەرۆکایەتی داد و مانگانەی دەوڵەتیم، پێراگەیاندبوو.

زۆری نەخایاند ئەندامانی سۆسیال رۆلسیونێر کەمنیش یەکێك لەئەندامەکانی بوون، دژی کابینەی سەمسام ئەلسەڵتەنە شۆڕشیان کرد کەشیاوی پێگەی وەزارەت نییە و توانای بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی نییە. کەسێکی دیکە دەبێت بێتە سەرکار کەبتوانێت بەشێوەیەکی ڕێکوپێك کاروباری وڵات بەڕێوە ببات و خەڵك لەقاتوقڕی ڕزگار بکات.

دەستەیەك لەزاناکان و دانیشتووانی بازاڕ و بەشێك لەدیموکراتەکانیش هاتنە پاڵ حزبی سۆسیال و بازاڕ و دووکانەکانیان داخست و لەمزگەوتی شا کۆبوونەوە. سەمسام ئەلسەڵتەنە لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە، سەفەرخانی سەهام ئەلسوڵتان و بورزوو و دەستەیەك لەبەختیارییەکانی تارانی ڕاسپارد بلأوەیان پێبکەن. ژمارەیەك ژاندارم بۆ پشتیوانی کردن لەو کەسانەی لەمزگەوتەکە کۆببوونەوە، لەناو منارەکانی مزگەوت سەنگەریان گرت و ئامادەی بەرگری کردن بوون. پەنجا کەسێکی خۆبەخشیش پەیوەستیان بوون. سەیید یەعقوب ڕۆشتە سەر مینبەر تا هانی خەڵکان بدات، کاتێك ویستی دەنگ هەڵبڕێت، بورزوو و بەختیارییەکان دەنگی الله و اکبریان بەرز کردەوە و ڕێگەیان پێنەدا وتارەکەی بخوێنێتەوە و بەناچاری لەمینبەرەکە هاتەخوار. سەیید حەسەنی مودەڕیس

سەرۆکی ئاسایشەکانی ئاگادار کردەوە ڕێگە لەبورزوو و هاوەڵانی بگرێت. وتی: بەهەمان شێوە کەناتوانین لەکۆبوونەوە و ڕۆشتنە سەر مینبەری ئێوە ڕێگری بکەین، ناتوانین لەاللە ئەکبەری ئەوانیش ڕێگری بکەین. بەناچاری ئەو کەسانەی کۆببوونەوە، دوای نوێژی شەوان، ڕۆشتنە ماڵی پێشنوێژ و وتارخوێن. لەبەردەم دەروازەکە چەند کەسێکیان دانا تا جگە لەپارێزەرانی نەزم، ڕێگەی هاتن بەکەسی دیکە نەدەن. دوای تێپەڕینیی سێ کاتژمێر لەشەو، شازادە ئەسەد اللەی میرزای شەهاب ئەلدەولە کەوەزیری دەربار بوو، لەلایەن شاوە هات و ڕایگەیاند، شا دەفەرمێت: ئەگەر ئەو بەڕێزانە ستەمیان لێکراوە، بیخەنە سەر کاغەز و ئێمەی لێ ئاگادار بکەنەوە، بەدڵنیاییەوە لێکۆڵینەوە لەداواکەیان دەکرێت. جیاواز لەوە لەبەر ئەوەی ڕاسپێردراوانی بیانی لەناو وڵاتن، ئەرکی سەرشانمان ڕێگەمان پێنادات زیاتر لەوە بەبێدەنگی ڕازی ببین. ئەگەر تا بەیانی و کاتی هەڵاتنی خۆر ببیستن درێژە بەکۆبوونەوەکە دراوە، ناچار فەرمانی بڵاوەکردن دەدەین تا لەئاژاوە و پشێوی ڕێگری بکەین. بەڕێزە ئامادەبووەکان هەرکام بەبیانوویێك لەوەڵامێکی ڕاشکاو خۆیان بەدوور گرت، بەناچاری من لەسەر داوای عەلی ئەکبەر خانی ساعەتچی و مۆڵەت وەرگرتن لەهەمووان، لەوەڵامدا بەشازادەم وت کەمەبەست لەم کۆبوونەوەیە ئاژاوە و شۆڕش نییە و بەپێچەوانەی نەزمی وڵات یا دژی پاشا و سەڵتەنەت، هیچ کردەوەیەك لەم قەرەباڵغییەوە دروست نابێت. بەڵام دوو داوای ڕەوامان لەپاشای خۆشەویستی خۆمان هەیە کەهیوادارین بەمەبەستی ئاسایشی گشتی، بخرێنە قۆناغی جێبەجێکردنەوە: یەکەم ئەوەی لەم بارودۆخە دژوارەی کەبەرۆکی میللەتی ئێرانی گرتووە و خەڵك لەبرسانا لەکۆڵان و شەقامەکان دەمرن و بێگانە بەزەیی پیایاندا دێتەوە، فەرمان بەئەنبارداراتی دەوڵەت بدەن، گەنم پاشەکەوت نەکرێت و بەنرخێکی گونجاو بەنانەواکانی بفرۆشن تا ژمارەی کوژراوەکان لەم ئەندازەیە تێپەڕ نەکات. دووەم ئەوەی لەسەدەی بیستەم کەدەوڵەتەکانی دنیا بەرەو پێشکەوتن هەنگاو دەنێن و کەسانی شارەزا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دەستنیشان دەکەن، ئێمە سوورنین لەسەر ئەوەی سەرۆك وەزیری وڵات دەبێت کەسێکی شارەزا و دیپلۆمات و شارەزای زمانە بیانییەکان بێت، ئێمە دەخوازین سەرۆك وەزیرانی ئەمڕۆی وڵاتەکەمان شیاو نییە توانای قسەکردن بەزمانی فارسیشی نەبێت و نەتوانێت قسە بکات و لەگەڵ خودی و بێگانە بەزمانی لوڕی بپەیڤێت. ئێمە جگە لەم دوو داوا ڕەوایە، داواکاری دیکەمان نییە و تا لەئەنجامەکەی

دڵنیانەبین، بڵاوەی لێناکەین. بەڵام سەبارەت بەو خیارەی کەدەفەرموون ئەگەر بڵاوەی لێنەکەین، ناچار دەبن بڵاوەمان پێبکەن، داوا لەپاشای خۆمان دەکەین جارێکی دیکە ئەم ڕستەیە دووبارە نەکاتەوە چوونکە ناخوازین نەخوازەڵا ڕووداوەکانی ساڵی ١٣٢٧ دووبارە ببێتەوە. لێرەدا دەنگی بژی پێشنوێژی کوردستان، لەهەموو شوێنێك بەرز بوویەوە.

شازادە شەهاب ئەلدەولە بێ ئەوەی هیچی دەستکەوێت، گەڕایەوە. نزیك بانگی بەیانی، هەموومان بەرەو شاعەبدولعەزیم بەڕێکەوتین و لەوێ کۆبووینەوە. من لەگەڵ کوردستانییەکانی تاران وەك حاجی قەوام ئەلتوجار و ئەمین ئەلعولەما و هتد.... لەماڵێکی جیاوازدا نیشتەجێبووین. دوای چەند ڕۆژێك گفتوگۆ لەگەڵ دەربار، سەرئەنجام سەمسام ئەلدەولە لەسەر کار لابرا و بەڕێز وسوق ئەلدەولە هاتە سەرکار. ڕۆژێك کەوسوق ئەلدەولە لەباخی فیردەوسەوە هاتە شار و بەشێوەیەکی ڕەسمی پۆستی سەرۆك وەزیرانی گرتەدەست، ئێمە لەشاعەبدولعەزیمەوە بەرەو شار گەڕاینەوە. بەڕێکەوت هاوکات بوو لەگەڵ مردنی باڵوێزی نەمسا کەهەردووك سەرۆك وەزیرانی کۆن و ئێستا بۆ پرسە و بەخاکسپاردنی ئامادە بوون. ئێمەیش بەپێی بانگێشتێکی ڕەسمی لەوێ بووین. سەمسام ئەلسەڵتەنە بەهێواشی بەکەسانی دەوروبەری خۆی دەوت: من دەستم لەپێگەکەی خۆم هەڵنەگرت، ئەم کابرا قاچاچییە هاتووە.

سەرئەنجام هەموومان لەگەڵ جەنازەی باڵوێز تا کەنیسە ڕۆشتین و دوای ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن، وسوق ئەلدەولە بۆ دەربار و ئێمە بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە. هەڵسوڕێنەری ئەم گەمەیە، شازادە فیروز میرزای نوسرەت ئەلدەولە و شوکراللە خانی قەوام ئەلدەولە بوو. دوایی کۆتایی هاتنی ئەم کێشە و دامەزراندنی کابینەی وسوق ئەلدەولە، حزبی سۆسیال ڕۆلسینونێر بۆ حزبی سۆسیالی ڕیفۆرمیست گۆڕا. عەلی ئەشرەف خان کەدراوسێی ماڵی ئێمە بوو، لەبینینی ئەم بارودۆخە، ڕۆشتە لای میرزا ئیبراهیم خانی سۆهرابزادە و داوایکرد فلانکەس نەیاری حکومەتەکەی من نەکات. من تا ئێستا بڕە پارەیەکی زۆرم زەرەر کردووە، دەزانم خەرجی دیکەیشم دێتەرێ، بۆچوونی فلانەکەس هەرچی بێت، پێی رازی دەبم بەو مەرجەی هاوکاریم بکات. منیش بەهۆی قەوام ئەلدەولە، وسوق ئەلدەولم لەم پەیامە ئاگادار کردەوە. وتبوویان ئەمیر، کەسێکی لاواز و بێ دەسەلاتە، شیاوی فەرمانڕەوایەتی کوردستان نییە. قەوام ئەلدەولە لەوەلامدا دەڵێت: لەڕاستیدا ئێوە حکومەتی کوردستان بەفلانەکەس

دەدەن، ئەو خۆی دەزانێت و هەرکەس بخوازێت لەگەڵ خۆی دەیبات. سەرئەنجام، ئەو بەڕێزە وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا.

## حکومەتی عەلی ئەشرەف خان ئەمیر موعەززی گەڕووسی

دوای کۆتایی هێنان بەپەیمان و بەڵێنەکان لەنێوان من و ئەمیر موعەزز، لەسەرەتاکانی زیقەعدەی ١٣٣٦، دووبارە فەرمانی حکومەتی کوردستان لەلایەن وسوق ئەلدەولە بەناوی ئەمیر موعەزز دەرکرا و هەمان ژمارەی قەزاق و دوو تۆپ و دوو مەترلیۆز کەپێشتر لەگەڵ پالکۆنیك، پەیمانمان لەسەر بەستبوو، بەسەرۆکایەتی رودمێستەر ئیسلیۆتیسکی لەگەڵ ئێمەدا ڕەوانە کرد تا بۆ هەر ماوەیەك پێویست بێت، رۆژ بەرۆژ، مانگانەی تایبەتی ئەوان لەلایەن دەوڵەتەوە بدرێت. سەرۆکی ئاتامازۆری ئەم دەستە قەزاقە، بەڕێز ئیعتیزاد حزووری نادری بوو. کەسێکی ئەخلاق جوان و گەنجێکی وشیار بوو. هاوەڵانی ئەمیر موعەزز بریتیبوون لە وسوق ئەلوسڵتان، سەرۆکی کابینەی حکومەتی و ئەعزاز ئەلسوڵتانی فەڕاشباشی و چەند کەسێکی نۆکەر و پێشخزمەتێکی برسی. فەرمانی سەرۆکایەتی دادی ئیسفەهان کەچەند رۆژ پێشتر بەناوی منەوە دەرکرابوو، لەسەرداوای ئەمیر موعەزز و پەسەند کردنی وسوق ئەلدەولە لەڕۆژی ٢٥ زیقەعدە بۆ سەرۆکایەتی دادی کوردستان و گەڕووس گۆڕا. بەڕێز وسوق ئەلدەولە خۆی بەئەمیر موعەززی فەرموو: هۆکاری پشێوی و نەبوونی نەزم لەکوردستان، میرزا عەلی نەقی ئاسف دیوانە، سەرچاوەی گەندەڵی دیمۆکراتبازیش حاجی شێخ ئیبراهیم و سالار ئەشرەف و مەزهەر ئەلئیسلامی نامانە. لەناو عەشیرەکانی کوردستانیش عەشیرەی مەندەمی و گوڵباخی، زیاد لەڕادە خراپەکاری دەکەن. سەرەتا ئەم دوو تایەفە دەبێت سەرکوت و سەرۆکەکانی تەمێ بکرێن. دواتر دیمۆکراتبازی کوردستانیش بەو شێوەی فەرمان بەفلانەکەس دراوە، دەبێت بەتەواوی لەناو بچێت و نەمێنێت. دواتر ڕێگری لەپیلان و نەخشەکانی ئاسف بگیردرێت و یاساکانی وڵات بەتەواوی و دژی ئەو جێبەجێ بکرێت. لەبەر ئەوەی فلانەکەس دانیشتووی ناوچەکەیە و زانیاری تەواوی لەسەر چاکسازی کردن لەکوردستان هەیە و لەلایەن دەوڵەتەوە کەسێکی بڕواپێکراوە، پێویستە کەڵك لەبۆچوونەکانی وەربگرن. هەر کارێك فلانەکەس بەپێویستی دەزانێت، پێویستە ئەنجامی بدەن و هەر شتێك بەپێویستی نازانێت، خۆتانی لێبەدوور بگرن.

ڕۆژی ١٦ موحەڕەمی ١٣٣٧، لەگەڵ حکومەت و ڕوودمێستەر لەتارانەوە و لەرێگەی ڕەباتکەریم، بەڕێکەوتین. ڕۆژی ٢٥ موحەڕەم گەشتینە هەمەدان. ئاسف دیوان لەدەستی سەردار ڕەشید ڕزگار و هاتبووە هەمەدان. ڕۆژی دووەم هاتە سەردانی پیاوانی حکومەت. منیش بروسکەم بۆ موشیر دیوان نارد تا سەردار ئەعزەمی کوڕی بۆ قورووە بنێرێت. ڕۆژی ٢٨ موحەڕەم گەشتینە قورووە. سەردار ئەعزەم ڕۆژی دواتر گەشتە شارەکە. حاجی مەزهەر ئەلئیسلام کەسەرۆکایەتی دارایی لەدەستابوو، لەگەڵ ڕەمەزانزادە هاتن. دوو ڕۆژ پێشتر، شەش سەر مەڕیان لەسرێش ئاوا دزیبوو. حکومەت فەرمانی دۆزینەوەی دزەکانی دەرکرد. کاتژمێرێك دوای هاتنی حاجی مەزهەر ئەلئیسلام، دزی مەڕەکانیان گرت و هێنایان. فەرمانی تیرباران کردنی ئەوی دەرکرد. کاتێك حاجی مەزهەر ئەلئیسلام هاتە ناو ژووری پیاوانی حکومەت، لەبەر ئەوەی عەمامەی لەسەردا بوو و چاکەت و پانتۆڵ و عابای لەبەردا بوو، حکومەت لەوەڵامی سڵاوەکەیدا وتی: و علیکم ئەلسلام، بەڕێزی مەزهەر ئەلئیسلام. فەرموون دانیشن. دوای دانیشتن و ڕێوڕەسمی تەشریفات، دووبارە حکومەت وتی: عەمامەی ڕۆحانییەت لەگەڵ پیشەی نۆکەری، دژایەتی هەیە. ڕێگە بدەن فەرمان بدەم لەشارەوە دەستێك جلوبەرگی شیاو بۆ ئەم پیشەیە بێنن تا جلوبەرگ لەگەڵ پێگەدا جیاوازی نەبێت. لەم کاتەدا دەنگی تیرباران کردنی دزی مەڕەکان لەحەوشی بەرز بوویەوە. حاجی مەزهەر ئەلئیسلام کەئاگای لەبابەتەکە نەبوو، ڕەنگ بەڕوخسارییەوە نەما. حکومەت دەستبەرداری نەبوو، وتی: بەڕێز مەزهەرئەلئیسلام بۆ دەترسیت. تۆیش بەچارەنووسی خۆت دەگەیت، پەلە مەکە. حاجی مەزهەر ئەلئیسلام لەم ڕستەی کۆتایی بەتەواوی ورەی خۆی لەدەستدا و هێز لەجەستەی بڕا. بینیم حکومەت هێشتا نەگەشتۆتە کەناری ئاو، پانتۆڵەکەی فڕێداوە. (بەپێی فەرمانی سەرۆك وەزیران). بەناچاری وتم: لەبەر ئەوەی حاجی مەزهەرئەلئیسلام تازە هاتووە و شەکەتە، ڕێگە بدەن پێکەوە بڕۆینەوە بۆ ماڵ، ئێواری دووبارە بەخزمەت دەگەین. مەزهەرئەلئیسلامم هەڵگرت و لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ ماڵ و دڵنەواییم کرد تا لەوتەکانی حکومەت دڵگران نەبێت. بەڵام بەجۆرێك ترسابوو، دڵنەوایی کردنی من کاریگەری لەسەر دانەدەنا. کەسێکم بەدوای سەردار ئەعزەمدا نارد. ئەوم ڕاسپارد تا دڵنەوایی بکات. دانیشتووانی قورووە لەدەست خراپەکاری مەحمود خان سەرداری ئیقباڵ و عەزیز خانی برای، کوڕەکانی محەممەد مورادخانی ئیلخانی شێخ ئیسماعیلی، سکاڵایان بۆ حکومەت

بەرز کردەوە. حکومەت کەسی بەدوای ئەواندا نارد بەڵام کەسیان نەهاتن. دەیویست سوارەکان و قەزاق بۆ گرتنی ئەوان ڕەوانە بکات، ڕێگەم لێگرت. نزیکەی سی سوارەی نۆکەر و خزمەکانی خۆم گەشتبوونە قوروە. حیمەشت ئەلمولك و نەسیردیوان لەگەڵ سەد سوار هاتبوون. سەردار ئەعزەمیش پەنجا سواری لەگەڵ بوو. بەیانی خۆم لەگەڵ شەش سواری خاوەن ئەزمون، بەرەو ماڵی مەحمودخان لەدوو فەرسەنگی قوروە بەڕێکەوتم. بەنهێنی سەردار ئەعزەمم ئاگادار کردەوە کەئەگەر تا ئێواریٚ نەگەڕامەوە، ئێوە لەگەڵ سوارەکانی خۆتان و سوارەکانی من و حیشمەت ئەلمولك، دوای تێپەڕینیی کاتژمێرێك لەشەو بەڕێکەون تا دوای تێپەڕینیی سیٚ کاتژمێر لەشەو بگەنە گوندەکەی مەحمودخان و بەناوی ئەوەی فلاًنەکەس لەئەمیر موعەزز نیگەران و ڕەنجاوە و ئێمە بۆ دڵنەوایی کردنی ئەو هاتووین، وەرنە ناو ماڵەکەی مەحمودخان. ئەگەر جەنگ ڕوویدا، من لەژوورەوە کۆتایی بەژیانی مەحمودخان دەهێنم. جیاواز لەوە قۆڵبەستی دەکەم و لەگەڵ خۆم دەیهێنمە قوروە. کاتێك لەگوندەکە نزیك بوومەوە، لەبەر ئەوەی پێشتر مەحمودخانم نەدەناسی، سوارێکم لەپێشەوە نارد تا ئاگاداری بکەنەوە کەفلاًنەکەس و شەش سوار میوانی ئێوەیە. کاتێك سوار گەیشتە ناوەڕاستی گوندەکە، بیٚ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بین، ئێمەیش ڕۆشتین و ڕاستەوخۆ ڕۆشتینە ماڵی مەحمودخان. دوای ئەحواڵپرسی، پێم وت: بڕیار نەبوو ئەمڕۆ بێمە ئێرە، بەڵکو بڕیار بوو سوپایەك بۆ سەرکوت کردنی ئێوە بێت. من ڕێگریم لەو کارە کرد و لەگەڵ شەش سوار بۆ بینینی ئێوە هاتم تا پێتان بڵێم ئەگەر خوازیارن زیندوو بن و پێگەیەکی بەرزتان پێببەخشرێت، تەسلیمی خواستەکانی من ببن و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆتان بۆ حکومەت نیشانبدەن. جیاواز لەوە من دەڕۆم بەڵام ئێوە زیندوو نامێنن و سامانەکەیشتان بەفیڕۆ دەڕوات. مەحمود خان لەوتەکانی من سەریسوڕما، وتی: ئەگەر ئێوە بەڵێنی سەرپەرەستی کردن بەمن بدەن، منیش بەڵێنی نۆکەری دەدەم و لەگەڵ هەموو هێزەکانی خۆم ئامادەی گیانبەخشین دەبم. دوای گفتوگۆ، لەویٚ نانی نیوەڕۆمان خوارد و مەحمود خان و ئەمین خانی برای و سیٚ سواری دیکەمان لەگەڵ خۆمان برد. فەرمانیدا سوپا و سوارەکانی ئامادە بن و هەرکات فەرمانی پێدان، بەرەو قوروە بێن. مەحمودخان و براکەی لەقوروە گەیشتنە خزمەتی حکومەت و سەرنجێکی شیاویان پێدرا. ئەوانم بردە ماڵەکەی خۆم. دووای دوو سیٚ ڕۆژ، سەرداری موعەزەم کوڕی ئاسف هاتە قوروە. لەبەر ئەوەی شێخ

ئیسماعلییەکان پەیوەندی خزمایەتییان لەگەڵ ئاسفدا هەبوو، بەشێوەیەکی نهێنی پەیامی بۆ مەحمودخان ناردبوو کەتەسلیم بوونت بەفلاّنەکەس، دژایەتی لەگەڵ پەیوەندییەکانی ئێمەدا هەیە. ئەگەر خۆی بەکەسی ئێمە دەزانێت، بگەڕێتەوە بۆماڵەکەی خۆی و هەرکات من فەرمانمدا، ئەوکاتە بێت. مەحمودخان بەهۆی هەڕەشەی سەردار، لەهاتنی لەگەڵ من پەشیمان ببوویەوە. ئێواریٚ، یەکێك لەدانیشتووانی قوروە هات و بەنهێنی بەمنی وت: مەحمودخان، ئەمین خانی برای ڕەوانە کردووە تا بەیانی سوارەکانی بێن و لەخوارەوەی ناوچەکە ڕیز ببەستن و مەحمودخانیش بەبیانوی بینینی سوارەکان بڕوات و لەگەڵ ئەوان هەڵبێت. ئەم بابەتەم لای خۆم هێشتەوە و هیچم بەمەحمودخان نەوت بەڵام پیاوەکانی خۆم ڕاسپارد بەشێوەیەك هەستی پێنەکات، چاودێری مەحمودخان بکەن و ڕێگەی هەڵاتنی لێبگرن. بەیانی مەحمودخان هات و وتی: سوارەکانم هاتوون و لەخوارەوەی ئێرەن، ڕێگەم بدە بڕۆم و بیانبینم. زانیم هەواڵەکە ڕاستە. وتم: فەرمان بدە سوارەکان بێن و بحەسێنەوە، ئێواریٚ پێکەوە دەڕۆین و سەردانیان دەکەین. وتی: ئەگەر ئێوەیش ئارەزوومەندن، ئێستا باشترە. پێداگری دەکرد. بەناچاری پەردەم لەسەر پیلانەکەی هەڵماڵی و وتم: لەپەیامەکەی سەردار بۆ ئێوە ئاگادارم، لەڕەوانە کردنی سوار بۆ لای سوارەکانتان ئاگادارم، ئێستایش دەزانم بۆچی دەڕۆن بەڵام بەهەڵەداچوون. ئەگەر بڕۆن لەماوەی دوانزە کاتژمێر بەزیندوویی یا مردوویی دەکەونە دەست پیاوانی حکومەت. کەواتە بەسوارەکان بڵیٚ دابەزن، ئاوا باشترە. مەحمودخان کاتێك بینی زانیارییم لەسەر بابەتەکە هەیە، سەری داخست و هیچی نەوت بەڵام ئامادەیش نەبوو پەیام بۆ سوارەکانی بنێرێت. بەناچاری قۆڵبەست و تەسلیم بەفەڕاشباشی حکومەتم کرد. سوارەکانی کاتێك بیستبوویان مەحمودخان گیراوە، هەڵاتبوون. بێدرەنگ، حیشمەت ئەلمولك و دەستەیەکەم نارد و عەزیزخانی برای لەسەنگوانە گرت و هێنای. بڕیاربوو لەقوروە ڕاستەوخۆ بەمەبەستی سەرکوت کردنی گوڵباغی و مەندەمییەکان بڕۆین و دواتر بڕۆینە ناو سنە. سەرداری موعەزەم کوڕی ئاسف بەحکومەتی وت: چەند ڕۆژێك لەسرێش ئاوا بمێننەوە. سەرۆکەکانی مەندەمی و گوڵباغی بەکوڕەکانی سەیید نەجم ئەلدینی ئەمرولەی پەیامیان ناردووە کەدێن و تەسلیم دەبن. حکومەت فریوی وتەکانی ئەوی خوارد و ڕۆشتینە سرێش ئاوا. شەوی دووەم کاپیتان وارن، قونوسولی ئینگلیس بەتەیارە هات و دوو سیٚ شەو لەویٚ مایەوە و دواتر بەرەو شار بەڕێکەوت. ئێمەش

لەچاوەڕوانی سەرکردەکانی مەندەمی و گوڵباغی چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە بەڵام سەرکردەکانی گوڵباغی و مەندەمی دەرنەکەوتن. هەموو ڕۆژێك حکومەت پیاوەکانی بۆ گوندەکانی دەنارد تا دانەوێڵە بۆ خواردنی سوپاکەی دابین بکەن و بەمشێوەیە گوندەکانیان تاڵان دەکرد. جیاواز لەگەنم و جۆ و ئالیك و مریشك لەهەر گوندێك سەد تمەن و دووسەد تمەن بەناوی چایی و شەکر و برنج و سفرەی حکومەتی وەردەگرت. هەرچەندە هەوڵمدەدا لەم کارانە دووری بخەمەوە، بەڵام سوودی نەبوو. ناچار بەبروسکە سەرۆك وەزیرانم ئاگادار کردەوە. لەم کاتەدا هەواڵمان بەدەست گەیشت کەشامارخان و عەلی بەگ و دەستەیەك لەشێخ ئیسماعیلییەکان لەگوندی جامە شۆڕان کۆبوونەتەوە و مەبەستی شۆڕش و یاخیگەرییان لەسەردایە. حکومەت ویستی سوپای قەزاق بۆ سەرکوتکردنی ئەوان ڕەوانە بکات. وتم: بەکاربردنی هێزی حکومەتی بۆ سەرکوتکردنی ئەم کەسانە کەژمارەیان سەد یا دووسەد کەسە و هەر ڕۆژەو چیایەك دەگرن، کارێکی هەڵەیە. دەبێت بەشێوازی دیکە بەسەر ئەواندا سەرکەوین. سەرئەنجام حیشمەت ئەلمولکمان ڕاسپارد لەگەڵ دەستەیەك سوار لەشەودا هێرش بکاتە سەر جامەشۆڕان. حیشمەت ئەلمولك هێرشی برد و گەمارۆی خستە سەر گوندەکە و شامارخان و عەلی بەگی ئەسیر کرد. دوو ڕۆژ دواتر بروسکەیەك لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە بۆ حکومەت گەیشت. ڕێگەی تاڵانکردنی گوندەکانی لێگرتبوو. حکومەت زانی من سەرۆك وەزیرانم ئاگادار کردۆتەوە، لەناخەوە لەمن ڕەنجا و عەبدوڵڵەخانی چاردۆلی دوای ئەوەی من حاجی باقری بازرگانم نارد و ئەمانمان پێبەخشی و هێنای، گرتی و بەدارەوە بەستی و دارکاری کرد و دوو هەزار تمەنی لێسەند. لەسەر ئەم بابەتە پەیوەندی نێوان من و حکومەت ئاڵۆزی و گرژی بەخۆیەوە بینی. ویستم بۆ تاران بگەڕێمەوە. ڕوودمێستەر داوای کرد تا گەیشتن بەشار بێدەنگ بم و ئەگەر لەشار کردەوەکانی حکومەت گۆڕانی بەسەردا نەهات، داوای کەسێکی دیکە بۆ حکومەتی کوردستان بکەین.

دوای تاڵانکردنی گوندەکانی ئیسفەندئاوا و نەهاتنی مەندەمی و گوڵباغییەکان، سوپا بەرەو ناوچەکانی مەندەمی بەڕێکەوت. لەئەمرولە جەنگێکی قورس ڕوویدا و لەسەرەتای بەیانی تا ئاوا بوونی هەتاو، درێژەی کێشا. حیشمەت ئەلمولك لەباڵی چەپ بوێرانە بەرگری دەکرد و دوای گەیاندی زەرەر و زیانی زۆر بەمەندەمییەکان، بەپاشەکشێکردن ناچاری کردن. لەباڵی ڕاست، دەستەیەکی سەد پەنجا کەسی لەقەزاقەکان هێرشیان کردە سەر گوندی ئەمرولە.

بڕیار بوو ئێمەیش سەنگەرێك بڕۆینە پێش کە لەناکاو ئەسپەکەی ئەمیر موعەزز بەهۆی گوللەی وێڵەوە مرد. ئەمیر ترسا و فەرمانی پاشەکشێی دەرکرد. هەرچەند روودمێستەر هاواری کرد ژمارەیەك لەقەزاقەکان ڕۆشتوونەتە ناو گوندەکە و من دەبێت هاوکارییان بکەم، سوودی نەبوو. ئەمیر لەگەڵ سوارە گەڕووسییەکانی خۆی پاشەکشێی کرد. تا ئێمە و سوپای قەزاق گەشتینە مەنسور بەلاغی، ئەمیر گەشتبووە ماچکە. ئێمەیش لەگەڵ روودمێستەر دوای تێپەڕینیی چوار کاتژمێر لەشەو، گەشتینە ماچکە. بۆ بەیانی روودمێستەر سەبارەت بەسەد و پەنجا قەزاقەکە نامەیەکی بۆ سەرکردەکانی مەندەمی و گوڵباغی نووسی. دەرکەوت ئەو ژمارەیە تا گەیشتنی نامەکەی روودمێستەر تەسلیم نەبوون و لەئاردی ئاشێك نانیان کردووە و خۆیان لەبرسیەتی ڕزگار کردووە. دەمەو ئێواریّ، سوپاکە بەهاوڕێیەتی سەیید شەهاب ئەلدین بێ ئەوەی یەك فیشەکیان لێ سەندرابێت، ئابڕوومەندانە گەڕانەوە.

ڕۆژی ٢ رەبیع الثانی، لەماچکەوە بەرەو شار بەڕێکەوتین. من بەڕێوەبەرایەتی دادم لەنازم الاشەراف، سەرۆکی دادی پێشوو وەرگرت و بەهاوکاری عیزام ئەلمولك، سەرقاڵی کارەکانی خۆم بووم و لەبەرابەر حزبی دیمۆکرات بەپێی ئەو فەرمانەی لەدەوڵەتەوە پێمدرابوو، حزبی سۆسیال ریفۆڕمیستم دامەزراند. دیمۆکراتەکان توڕە بوون و دەستیان کردن بەدروستکردنی کۆسپ و تەگەرە و چەندینجار هێرشیان کردەسەرمان، بەلام نەیانتوانی هیچ بکەن. بەپێچەوانەوە ڕۆژانە ژمارەیەك لەدیمۆکراتەکان دەستیان لەکاردەکێشایەوە و پەیوەستی حزبی سۆسیال دەبوون. لەماوەی دوو حەفتەدا زیاتر لەدوو هەزار دیمۆکرات هاتنە ریزەکانی حزبەکەی ئێمە.

لەمناوەدا، عەتاللە خان کوڕی حاجی فەتح ئەلمولك، لەدادگا بەپێدانی پێنسەد تمەن بەیەکێك لەپیاوەکانی مەحکومکرا. لەسەرداوای سکالاکەر، فەرمانی جێبەجێ کردن دەردەچێت و لێپرسراوی جێبەجێکار دەڕوات تا وەرەقەکەی تەسلیم بکات. عەتا اللە خان، لەلێپرسراوەکە دەدات و وەرەقەکە دەدڕێنێت. منیش لەسەر داوا و سکالای لێپرسراوەکە، بۆ بەڕێوبەری ئاسایشم نووسی: عەتاللە خان قۆڵبەست و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن. کاتێك یەکێك لەلێپرسراوانی ئاسایش، عەتاللەخان دەبات، لێپرسراوی قونسولگەری دەگات و عەتا اللەخان لەگەڵ خۆی بۆ قونسوڵخانە دەبات. لەبەر ئەوەی کاپیتان وارنی قونسول،

پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ مندابوو، هاوڕێیانە ڕۆشتمە لای تا داوای لێبوردن بکەم. لەگەڵ بینین بێ ئەوەی تەوقەم لەگەڵ بکات، بەتوڕەییەوە وتی: ئێوە کەی ماڤ ئەوەتان هەیە سەرۆکی سوارەکانی من تەسلیم بەئاسایش بکەن؟. لەوەڵامدا وتم: یەکەم ئەوەی نەمزانی ئەم کەسە ئێرانییە بۆ قونسولخانە کار دەکات، دووەم ئەوەی من ئەوم نەگرتووە، یاسا ئەو فەرمانەی دەرکردووە. وتی: کام یاسایە؟ وتم: یاساکانی داد. وتی: یاساکانی من ڕێگەنادات، سەرۆکی سوارەکان قۆڵبەست بکرێت. بینیم قونسول دەخوازێت زێدەڕۆیی بکات، بەناچاری وتم: بەڕێز، یەکەم ئەوەی گەورتر و زیاتر لەپێگەکەی خۆتان قسە دەکەن، دووەم دەبێت بزانن ئێرە ئێرانە و یاساکانی ئێران جێبەجێ دەکرێت یاساکانی ئێوە لەلەندن و شارەکانی دیکەی ئینگلیس جێبەجێ دەکرێت. جیاواز لەوە ئەگەر دەتانەوێت ئەو ئێرانییانەی بۆ ئێوە کار دەکەن، لەدەست یاسا پارێزراو بن، ئاگاداریان بکەنەوە سامانی خەڵکان نەخۆن و ماف بۆ خەڵکان بگێڕنەوە تا شەرافەتی ئێوەیش پارێزراو بێت. ئەمەم وت و بێ ئەوەی ماڵئاوایی بکەم، بەجێمهێشت.

دواتر قونسول بێ گرنگیدان بەپەیوەندی هاوڕێیەتی، بابەتەکەی گەورە کردەوە بەڵام لەبەر ئەوەی موسیۆ هاوارت جێگری باڵوێزی تاران منی دەناسی و بەڕێز وسوق ئەلدەولە باوەڕی تەواوی بەمن بوو، لەهەردوولا، فەرمانمان بۆ هات و لەناوەندی حکومەتی، ئاشت بووینەوە.

دوای چەند ڕۆژێک ئەمیر موعەزز لەسەر کار لابرا و غوڵام ڕەزا میرپەنج کە لەگەڵ روودمێستەر هاتبوو، ئەرکی حکومەتی کوردستانی گرتەئەستۆ و حکومەتی نیزامی ڕاگەیاند. ڕۆژی ١١ جومادی ئەلثانی، کلوپی سۆسیالەکان لەماڵەکانی سارم نیزام بەئامادە بوونی حکومەتی نیزامی و سەرکردەی هێزەکان و زاناکان و پیاوماقووڵان و چینە جیاوازەکانی کوردستان، بەشێوەیەکی ڕەسمی کرایەوە. شەوێك لەسەردان کردن دەگەڕامەوە، گەشتمە سەر پردی گەڕەکی قەتارچییەکان، کاتێك گەیشتمە بەردەم مزگەوتی سارم نیزام، لەناکاو لەپشتەوە، سێ گوولەیان بەمەبەستی کوشتنی من تەقاند. تیری یەکەم بەر عاباکەم کەوت و تیری دووەم لەبەردەم پێمدا و تیری سێیەم بەر چراکە کەوت. ئەو دوو کەسەی لەگەڵمدا بوون، یانی ئیمام قولی و محەممەد ڕەزا، هەردووکیان هەڵاتن. گومانم کرد لەحوجرەی سەر دەرگای مزگەوتەکە تەقەم لێکراوە، لەگەڵ ئەوەی تاریك بوو، بەڵام چوونکە سیلاحم پێبوو، ڕوومکردە مزگەوتەکە بەو هیوایەی بتوانم تەقەکەران بگرم. بینیم دەرگای

مزگەوتەکە داخراوە، بەناچاری بۆماڵەوە گەڕامەوە. لەنێوەی ڕێگە ڕووبەڕووی قەرەباڵغی قەتارچییەکان بوومەوە و کاتێك بینیان و دڵنیابوون، تەندروست ڕزگارم بووە، گەڕانەوە.

زۆری نەخایاند سالارئەشرەف کەلێپرسراوی ئەو کارانە بوو، بۆ لێکۆڵینەوە هات. بەپەرێشانییەکی دەسکرد پرسی: سپاس بۆخوا سەلامەتن. وتم: نا، تیری ئێوە بەهەڵەدا چوو، بەلاّم تیری من بەهەڵەدا ناڕوات. بزەیەکی بەمەبەستی گاڵتەپێکردن هێنایە سەر لێو، وتی: دووبارە نامیهرەبانی دەکەن. وتم: نا، ئەم جۆرە وتانە، مامڵەی دۆستانەیە، دەبێت بوترێت، ئەگەر گوللەت بەرووی دوژمندا تەقاند، ئاگادار بە بوویتە نیشانەی گووللەی ئەو. سالار چیتر نەمایەوە، ماڵئاوایی کرد و ڕۆشت. بەدوای ئەو لێپرسراوێکی دیکە لەگەڵ بیست و پێنج قەزاق هات. ئەو کەسە یەکێك لەبەرپرسەکانی حکومەت نیزامی ڕەزاخانی میرپەنج بوو، ئەحواڵی پرسیم و وتی: میرپەنج دەفەرمێت، چ کەسێك تەقەی لەئێوە کردووە، ئەگەر گومانتان لەکەسێك هەیە، فەرمان بدەن تا شوێنپێی هەڵبگرین. ئەمشەو ئەم دەستەیە لەبەردەم ماڵی ئێوەدا کێشك دەگرن تا هۆکاری ئەم تەقە کردنە دەستگیر دەکرێت. ئەم دەستەیە تا هاتنی شەریف ئەلدەولە هەموو شەوێك لەبەردەم ماڵی ئێمەدا بوون و کێشکیان دەگرت. هەر شەوێکیش کەسەردانی شوێنێکم دەکرد، پێنج کەس لەوان هاوڕێیەتیان دەکردم.

## حکومەتی عەلی محەممەد خانی شەریف ئەلدەولە

دوای لابردنی ئەمیر موعەزز، ڕۆژی پێنجشەممە ١٧ جومادی الثانی ١٣٣٧، عەلی محەممەد خانی شەریف ئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان هاتە کوردستان بەلاّم چ هاتنێك و چ حکومەتێك!، کەسێکی بێهێز و بێ دەسەلاّت، هاتە ناوچەیەکی پڕ ئاژاوە و فیتنە. لەلایەك سەرکێشی و یاخیبوونی عەشیرەکان و عەشیرەکانی سەرسنور و لەلایەکی دیکە دەرکەوتنی ژمارەیەك خراپەکاری شاری لەژێر ناوی دیمۆکرات و لەلایەکی دیکە بانگەوازی سەربەخۆیی نەتەوەیی کورد لەلایەن شێخ مەحمودی حەفید، دەستیان دایە دەستی یەك و ئاتەشکەدەیەکی گەورەیان بۆ حکومەت و میللەتی بەدبەختی ئێمە ئامادە کردبوو کەجگە لەدەسەلاّت و دوورئەندێشی خودی وسوق ئەلدەولە، ڕێگەچارەیەك بۆ ڕزگاری لەم بارودۆخە، گومان نەدەکرا. دوای چەند ڕۆژ، پاشماوەی هێزەکانی قەزاقی ناو شارەکە لەگەڵ غولاّمرەزا میرپەنج گەڕانەوە و هیچ هێزێك لەژێر دەستی شەریف ئەلدەولەدا نەمایەوە.

شەوێك شەریف ئەلدەولە لەکۆبوونەوەیەکی نهێنیدا پێی وتم: پێویستە لەگەڵ حاجی شێخ ئیبراهیم رێگەی ئاشتی و گونجان بگرنەبەر. وتم: مەگەر ئێوە سەبارەت بەحاجی شێخ ئیبراهیم و کەسانی دەوروبەری، هیچ فەرمانێکتان لەناوەندەوە پێنەدراوە؟ وتی: بەڵێ، بەلام تا گەیشتنی هێزی ژاندارم دەبێت بێدەنگی بکەینە پیشە بەلام پێویستە بەنهێنی نزیکەی سەد چەکدار لەحزبی سۆسیال بخەنە ژێر فەرمانی دەوڵەت تا شەوانە لەکەنارەکانی شار پارێزەری نەزم و سەقامگیری شارەکە بن تا شیرازەی کاروبارەکان لەیەك نەپچڕێت. منیش بۆ هەردوو بابەتەکە یانی ئاشتی و ئامادە کردنی تفەنگچییەکان ڕەزامەندی خۆم نیشاندا. لەماوەی دوو ڕۆژدا لەجیاتی سەد کەس، سەد و پەنجا تفەنگچی سالار فاتح ئامادە و تەسلیم بەشەریف ئەلدەولە کرد تا شەوانە لەگەڵ سوپای دەوڵەت لەکەنارەکانی شار کێشك بگرن و پارێزەری نەزم و ئاسایشی شارەکە بن. ئەم هێزە ڕۆژانە لەباخەکەی سالار فاتح خۆیان دەشاردەوە. ڕۆژی دواتر دانیشتنێکی ڕەسمیمان بۆ چاکسازی و ئاشتی لەگەڵ حاجی شێخ ئیبراهیم لەقەلای حکومەتی و بەئامادە بوونی شازادە ئەعزەم ئەلدەولە، یاریدەدەری حکومەتی و غیاس ئەلدەولە، فەرمانڕەوای سەقز سازدا و هەردووکمان ئامادە بووین. دوای وتەکانی شەریف ئەلدەولە، سەبارەت بەسوودەکانی ئەم ڕێکەوتنە و زیانەکانی ڕێنەکەوتن و دووبەرەکی ئێمە، پێشنیاری ئاشتی و سازانی بەئێمە دووانە کرد. حاجی شیخ ئیبراهیم وتی: من بەسێ مەرج ئامادەم پەیمان لەگەڵ فلانەکەس ببەستم، یەکەم ئەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ قونسوڵخانەی ئینگلیس بپچڕێنێت و بەڵێن بدات، پێکەوە، لەم شارە دەریان بکەین چوونکە هیچ شوێنکەوتەیەکی لەم ناوچەیەدا نییە، دووەم ئەوەی لەگەڵ پیاوماقوولانی کوردستان پەیوەندی هاوڕێیانە و دۆستانە بەرقەرار نەکات، سێیەم ئەوەی، ئەو دیمۆکراتانەی چوونەتە ڕیزی حزبی سۆسیال، دەریانبکات و لەم بەرواره بەدواوە هیچ ئەندامێکی حزبی دیمۆکرات وەك ئەندامی خۆیان وەرنەگرێت.

وتم: سەبارەت بەنەیاریکردنی قونسوڵخانەی ئینگلیس، لەدەسەلات و توانای ئێمەدا نییە و بەهیچ جۆرێك ناتوانین لەوبارەوە گفتوگۆ بکەین چوونکە نە لەپەیڕەوی هیچ کام لەحزبەکان ئاماژەی پێدراوە و نە لەلایەن دەوڵەتەوە فەرمانێکی لەو شێوەمان پێدراوە. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەگەر حزبی دیمۆکرات، بەرژەوەندی لەدوژمنایەتی کردنی ئینگلیسییەکان دەبینێت، لەبەر ئەوەی حزبی سۆسیال تازە دامەزراوە و لەمبارەوە ئەزمونی ئەوتۆی لەبەردەستا نییە و

توانای ئەنجامی ئەو کارەی نییە، حزبی دیمۆکرات کەحزبێکی کۆن و ئەزمونی هەیە و ڕێگەچارەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوان باشتر دەزانێت، پێویستە هەنگاو بنێتە پێش. ئەگەر سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، باشتر، جیاواز لەوە، با یەکێك لەحزبەکان تووشی شکست ببێت نەك هەردوو حزبەکە. بەڵام سەبارەت بەپیاوماقووڵان و کەسە ناسراوەکانی شار، ئەگەر کارێکی نایاسایی لەوان ببینرێت، ئەرکی سەرشانی ئێمەیە حکومەت ئاگادار بکەینەوە بۆ ئەوەی حکومەت ڕێگەیان لێبگرێت چوونکە حزبەکان ڕاستەوخۆ مافی خۆتێهەڵقورتاندن لەکاروباری حکومەتیان نییە، هەر مەبەستێکیان هەبێت، دەبێت بەهۆی لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە داوای ماف و مەبەستەکانی خۆیان بکەن، بەڵام سەبارەت بەڕێگەنەدان بەدیمۆکراتەکان بۆ ئەندامبوون لەحزبی سۆسیال یا بەپێچەوانەوە، دیمۆکرات یا سۆسیال بزن و مەڕی ئێمە نین کەرێگە نەدەین ڕانێکی ئێمە تیکەڵ بەڕانێکی ئێوە بێت یا ئەگەر تێکەڵ بوو، دەریان بکەین. مرۆڤ بۆ هەڵبژاردنی ڕێگە و ڕێبازەکەی ئازادە، هەرکەس، هەر ڕێبازێك بخوازێت، دەتوانێت هەڵیبژێرێت. شەریف ئەلدەولە لەکۆتایی وتەکانی من، دەرفەتی قسەکردنی بەحاجی ئیبراهیم نەدا و خۆی وەڵامیدایەوە و وتی: من حەز دەکەم ئێوە دووانە بێ هیچ مەرج و بەڵێنێك ببنە هاوڕێی یەك. دواتر سەبارەت بەویست و داوای لایەنەکان، گفتوگۆ دەکەین و هەر شتێك پێویست بێت، ئەنجامی دەدەین. شەریف ئەلدەولە دەستی هەردووکمانی خستە ناو دەستی یەك و بەماچوموچ ناچاری کردین. دواتر وتی: شەربەت بێنن. دوای خواردنی شیرینی و شەربەت، دانیشتنەکە بەردەوام بوو.

چەند ڕۆژ دواتر شەریف ئەلدەولە و قونسوڵی ئینگلیس، بەمەبەستی گەڕان و سەیران دەڕۆنە داوێنی ئاویەر، سالار ئەشرەفیش لەخزمەتی حکومەتدا دەبێت. لەناکاو چەند سوارێکی گوڵباغی دەردەکەون و لەکەنار شارەوە هێرش دەکەنە سەر چیای ئاویەر. ڕانەمەڕ و گایەلی دانیشتووانی شار لەو ناوچەیە بەبەرچاوی حکومەت و قونسوڵخانەی ئینگلیس، تاڵان دەکەن.

لە ١٦ ڕەجەبی ١٣٣٧، لەدەرئەنجامی بروسکەی شەریف ئەلدەولە بۆ دەوڵەت، فەرمانی سەرۆکایەتی مەعاریف و ئەوقافی کوردستان لەلایەن نەسیر ئەلدەولە، وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئایینی، بەژمارەی٥٥٦٩، بۆ من دەردەکرێت و ئەو پۆستەم گرتەدەست. دواتر بەتەیارە بەیانییەیان لەلایەن دەوڵەتەوە بەسەر گوڵباغی و مەندەمییەکاندا بڵاو کردەوە و

مۆڵەتی بیست ڕۆژەیان بۆ دیاریکردن کە ئەگەر لەو ماوەدا گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان نیشاننەدەن، چیتر ڕێگەی تۆبە و پەشیمانییان لێ دادەخرێت. لەم کاتەدا سەردار ڕەشید لەسەر داوای دەوڵەت، هاتە کوردستان و لەپانزەی شەعبانیش تەیارەیەك بۆ قونسوڵی ئینگلیس لەشارەکە نیشتەوە. حزبی سۆسیالیش کەم کەم فراوان و گەورە و حەزبی دیمۆکراتیش بەرەو ڕووخان هەنگاوی دەنا. لەمناوەدا چەند بەڵگەیەکی نووسراو لەناوچەی مەنــدەمی و گوڵبــاغی بەدەســتمان گەیــشت کەبزوێنــەری ئــەوان بــۆ خراپــەکاری و تالآنکارییەکان، کۆمیتەی حزبی دیمۆکرات بوو: حاجی شێخ ئیبراهیم، سالار ئەشرەف، حاجی مەزهەر ئەلئیسلام، ڕەمەزانزادە و هتد..... شەریف ئەلدەولە دوای بەدەستهێنانی ئەو بەڵگانە، بەڕێوبەرایەتی ئاسایش و پاراستنی شارەکەی ناچار کرد سوێند بخۆن چیتر لەمەدوا خیانەت لەدەوڵەت و میللەت نەکەن. حاجی سەرداری موکەڕەم، محەممەد عەلی خان و لێپرسراوانی سوپا و ئەندامانی لێپرسراوی ئاسایشی شارەکە، سوێندیان خوارد. سالار ئەشرەف بەسوێندخواردن ڕازی نەبوو. شەریف ئەلدەولە ئاگاداری کردەوە ئەگەر سوێند نــەخوات، دەبێــت پۆســتەکەی بــەجێبێڵێت و لەماڵەکــەی خــۆی خانەنــشین بکرێــت. سالارئەشرەف بەخێرایی جلوبەرگی ڕەسمی داکەند و بەناوی دەستلەکارکێشانەوە، بەرەو گوندی کمیز ڕۆشت. حاجی شێخ ئیبراهیم لەپێشەکی ئەم بارودۆخە و ڕووخانی حزبی دیمۆکرات و بلاوبوونەوەی بەڵگەکان و خانەنشینی سالارئەشرەف، ترسی لێنیشت و داوای لەشەریف ئەلدەولە کرد مۆڵەتی پێبدات بڕواتە ماڵی شێخ حسام ئەلدین. دوای دوو کاتژمێر لەشەو، شەریف ئەلدەولە، سەرداری موعەزەم کوڕی ئاسف بانگ دەکات و پێی دەڵێت: ئەمڕۆ ئێواریێ، مۆڵەتی ڕۆشتنم بەحاجی شێخ ئیبراهیم داوە تا لەشارەکە بڕواتەدەر. ئاگاداربن لەهەر ڕێگەیەکەوە دەڕوات، کەسێك ڕاسپێرن تا بیکوژێت. ڕۆژی دواتر سەردار ڕەشید بۆ ڕەوانسەر گەڕایەوە تا لەگەڵ هێزەکانی هەورامان و ڕەوانسەر و جوانڕۆ بگەڕێتەوە. سەردار موعەزەمیش بۆ کوشتنی حاجی شێخ ئیبراهیم، سالار ئەلمولکی بۆ ڕێگەی بیجار و محەممەد عەلی ئاغا، کوڕی حاجی ئەحمەدی هەمەدانی و ئیمام قولی خانی بۆ ڕێگەی هەورامان نارد و غولام حسەین کوڕی میرزا یوسفی نازری بۆ چاودێری کردنی ڕێگەی هەمەدان ڕاسپارد. بەڕێکەوت حاجی شێخ ئیبراهیم بەرەو هەمەدان دەڕوات. شەوێك لای سەنجەرخان دەمێنێتەوە و بەیانی بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ تاران بەڕێدەکەوێت. لەناوچەی

ئیسفەندئاوا غولام حسەین ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ماوەیەک بەناوی هاوڕێیەتی لەگەڵی دەڕوات تا ئەوەی لەکەنار گوندی جەعفەرئاوا دەرفەتی دەستدەکەوێت و لەپشتەوە بەگوللەیەک کۆتایی بەژیانی دەهێنێت. ئەسپ و تفەنگەکەی و سی لیرەی حاجی شێخ ئیبراهیم هەڵدەگرێت و دەڕوات. حاجی مەزهەر ئەلئیسلام و ڕەمەزانزادە لەڕێگەی کانی مشکان، شەوانە بەرەو تاران بەڕێدەکەون. لەگەڵ گەیشتنیان بۆ تاران لەسەر داوای شەریف ئەلدەولە، لەوێ زیندانی دەکرێن. سالار ئەشرەف بەپشتبەستن بەعەشیرە و تفەنگچییەکانی گوندەکەی خۆی، لەکەمیز دەمێنێتەوە. یەک دووجار هاتە شار، هاوڕێیانە پێم وت سوێندی یاسایی بخوات و دەست لەکارکێشانەوەی لەحزبی دیمۆکرات ڕابگەیەنێت بەڵام گوێی لەوتەکانم نەدەگرت. سەرئەنجام شەریف ئەلدەولە دەیگرێت و بەبیانوی ئەوەی بۆ تارانی دەنێرێت، لەپشت گەردەنەی کەڵە کوڵە دەیکوژێت، لەو شوێنەی دیمۆکراتەکان، ئەسەد الله خان، پیاوەکەی سەردار ئەعەزەم و میرزا سەراجیان بەفەرمانی سالارئەشرەف کوشتبوو. بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئاسایش بەسالار موفخەمی حەبیبی دەسپێردرێت.

دواتر ماڵەکەی سالارئەشرەفیان پشکنی. چەندین بەڵگەنامەی شەرمێنەر لەناو کەلوپەلەکانی دۆزرایەوە و وێنەی خانەکان کەلای ڕاستی سالار ئەشرەف، دانیشتبوون، کەوتە دەستی شەریف ئەلدەولە. ئێوارەیەک لەماڵەوە دانیشتبووم، پیاوی حاجی شێخ عەبدوڵلە بەخێرایی هات و وتی: میرزا حەبیب اللەی سەمەدزادەیان بردە قەڵای حکومەتی، دەبێت فریای کەویت و ڕێگە نەدەیت ئازاری بدەن. بێ لەدەستدانی کات ڕۆشتمە قەڵای حکومەتی. بینیم دار و تەنافیان ئامادە کردووە و دەیانەوێت لەداری بدەن. کاتێک گەیشتم، ڕێگەم نەدا تەنافەکە بخەنە ملی تا ئەوەی چاوم بەشەریف ئەلدەولە کەوت و تکام بۆ کرد. شەریف ئەلدەولە بزەیەکی گرت و بەسالار موفخەمی وت: ئەو وەرەقەیە بدە بەپێشنوێژ تا بیخوێنێتەوە و بزانێت تکا کردنەکەی سوودی نییە. وەرقەکەم بینی کەسەمەدزادە لەبەرواری شەوی ١٤ جومادی الثانی ١٣٣٧ بۆ حاجی شێخ ئیبراهیم و سالار ئەشرەف نووسیبوو: بینیمان ئەمشەو فلانەکەس سەردانی شوێنێکی کردووە، پێویستمان بەحەوت تیرێک هەیە تا لەکاتی گەڕانەوە بۆ ماڵ، کۆتایی بەژیانی سۆسیال بهێنین.

بەرواری سەر وەرەقەکە ڕێکەوت بوو لەگەڵ ئەو شەوەی لەبەردەم مزگەوتی سارم نیزام لەسەرەوەی پردەکە، تەقەیان لەمن کرد. دوای ئەوەی وەرقەکەم خوێندەوە، شەریف ئەلدەولە

وتی: ئێستا پشتڕاستی ئەوە دەکەیتەوە کەبکوژی ئیمام دەبێت بکوژرێت. وتم: سەرەتا گومانم دەکرد تاوانێکی دیکەی ئەنجامداوە، ئێستا کەئاشکرا بوو مەبەستی کوشتنی منی کردووە، بەشەرع و یاسا، بکوژی من دەبێت لەدەستی خۆمدا بێت و پێویستە ڕادەستی منی بکەنەوە. وتی: ڕادەستی ئێوەی بکەن، چی دەکەیت؟ وتم: دەبێت بەقورسترینی سزاکان، سزا بدرێت. وتی: مەگەر سزایەکی قورستر لەئیعدام هەیە. وتم: بەڵێ، بەخشین و لێبوردن قورستر لەوەیە چوونکە هەرجارێك کەمن دەبینێت، ئارەزووی مەرگی خۆی دەکات. بەمشێوەیە سەمەدزادەم ئازاد کرد و بۆ لای حاجی شێخ عەبدوڵڵەم ناردەوە و وتم: بەحاجی شێخ بڵێن چوونکە سەمەدزادە لەکوشتنی من بەمەبەستی خۆی نەگەیشت، منیش ڕێگەم نەدا، شەریف ئەلدەولە لەکوشتنی ئەو بەمەبەستی خۆی بگات. بەکورتی، تا چەند ڕۆژێك کاری من ببوە پاکانە کردن و تکا کردن بۆ تاوانباران و لەماوەی دوو حەفتەدا، سی و شەش کەسم لەمەرگ و سزادان ڕزگار کرد کەپێنج کەسیان خراپەکارییان لەگەڵ خۆمدا کردبوو. ڕۆژی ٨ ڕەمەزان، سەرداری ڕەشید لەگەڵ هێزەکانی فەرەنسا و جوانرۆ و لهۆن بەمەبەستی سەرکوت کردنی عەشیرەی گوڵباغی ڕۆشتە گرێزە. هەرچەند هاتنی سەردار لەسەر داوای شەریف ئەلدەولە بوو بەڵام مەبەستی سەرەکی ئەو تۆڵەسەندنەوەی ساڵی ١٣٣٦ بوو کەگوڵباغییەکان بەشێوەیەکی خراپ مامڵەیان لەگەڵ کرد. ڕۆژی دواتر سەردار ڕەشید لەگەڵ هەموو هێزەکانی کەزیاتر لەدوو هەزار سوار و هەزار تفەنگچی لهۆن دەبوون، هاوڕێ لەگەڵ شازادە ئەکبەر میرزا، لەگەڵ سێسەد ژاندارم و دوو تۆپ هاتن و بەرەو ناوچەکانی مەندەمی وگوڵباغی بەڕێکەوتن. حیشمەت ئەلمولك لەگەڵ سەد سوار، پەیوەستی سوپای ژاندارم ببوو. لەچیای توریزخاتوون و عەباس بەگ، ڕووبەڕووی هێزی گوڵباغی و مەندەمی دەبێتەوە. سەرەتا سوارەکانی ڕەوانسەر پاشەکشێ دەکەن و سەردار و ئاڵاکەی بەتەنیا جێدەهێڵن تا تفەنگچییەکانی جەعفەر سوڵتان کە لەسەر لووتکەی چیاکە سەنگەریان گرتبوو لەگەڵ سوارەکانی وەلەدبەیگی هێرش دەبەن و ڕیسوایانە شکست بەگوڵباغی و مەندەمییەکان دەهێنن. سوارەکانی وەلەدبەیگی و تفەنگچییەکانی لهۆن لەو ڕۆژەدا بوێرانە جەنگاون بۆ نموونە سۆفی بەگ لەگەڵ ئەوەی لەسێ شوێنەوە بریندار دەبێت، دووبارە بەتەنیا حەوت کەس دەکوژێت و سێ کەسیش ئەسیر دەکات. زۆربەی سەرکردەکانی گوڵباغی و مەندەمی لەو جەنگەدا کوژران و هەموو مەڕومالآت و سامانەکەیان تالآنکرا. لەئەنجامی ئەم

جەنگە، دەستەیەك لەمەندەمییەکان پەنایان بۆ هەورامی ڕەزاو برد و دەستەیەك لەگوڵباغییەکانیش پەنایان بۆ مەحمودخانی مەریوانی برد و پاشماوەکەیان لەشوێنەکانی خۆیان، دووبارە سەرقاڵی خراپەکاری و تاڵانکردن بوونەوە.

لەناوەڕاستەکانی شەوال، من، بەفەرمانی حکومەت، لەگەڵ پەنجا سوار، بەرەو ڕەزاو ڕۆشتم. بەڕێز یوسف خانی عیزام ئەلمولك و سەنجەرخان هاوڕێیەتیان دەکردم. لەخانەکانی ڕەزاو بەڵێننامەی تەسلیمبوون و گوێڕایەڵیم وەرگرت وماڵیاتی هەورامانیان بەتەواوی پێدام. هەروەها ئەمانم بەهەموو ئەو مەندەمییانەدا کەپەنایان بۆ هەورامان بردوو تا بۆ ناوچەکانی خۆیان بگەڕێنەوە. دوای ئەم کارانە خۆیشم بۆ شار گەڕامەوە. دوای چەند ڕۆژێك سەردار موعەزەم کوڕی ئاسف، خوازیاری حکومەتی هەورامان بوو. لەگەڵ سەد و پەنجا ژاندارم و سەد سوارەی خۆی و شازادە ئیقباڵ سوڵتان، سەرۆکی گومرك بەرەو هەورامان بەڕێکەوت. گوندی چەشمیدەری، زادگای خۆی وەك ناوەندی فەرمانڕەوایەتی دیاریکرد. لەم ماوەدا یانزە هەورامی لەگەڵ هەشت کەر لەشارەکەدا گرفتار بوون. ئەم هەواڵە بەڕەزاو گەیشت و بەخێرایی خانەکانی ڕەزاو، شەوانە دەستەیەك ڕەوانە دەنێرن. سەردار موعەزەم و ئیقباڵ سوڵتان و هەموو ئەو کەسانەی هاوڕێیەتی ئەوانیان دەکرد، قۆڵبەست کران و وەك بارمتەی یانزە هەورامییەکە و هەشت کەرەکە، لەگەڵ خۆیان دەیبەنە ڕەزاو و لەچەك دایاندەماڵن. بەخێرایی کاغەزێکیان بۆ من نووسی کەئەم کارە بەپێچەوانەی ڕێکەوتننامەی نێوانمان بوو. ئەگەر حکومەت، هەورامییەکان و کەرەکان ئازاد نەکات، ئێمەش سەردار و هاوڕێیانی ئازاد ناکەین. دوای بینینی شەریف ئەلدەولە، هەورامییەکان و کەرەکانمان ئازاد و تەسلیم بەئاسفمان کرد. ئەویش هەورامییەکانی خەڵات و بەپیاوەکانی خۆی ڕەوانەی ڕەزاوی کردن. هەورامییەکانیش سەردار و هاوڕێکانیان ئازاد و ڕەوانەی شار کرد. شەریف ئەلدەولە بۆ داپۆشینی ئەو کردەوەی بەرابەر بەحکومەتەکەی هەورامان و هاوەڵانی کرابوو، لەرۆژی هاتنی ئەوان بۆ ناو شارەکە، تیپی مۆسیقای تا سەر پردەکە بۆ پێشوازی ئەوان نارد. دەستەیەك لەدانیشتووانی شارەکەی بانگێشتکرد و لەناو حەوشی قەڵای حکومەتی، هەموو ئامادەکارییەکانی بۆ میواندارییی خەڵکان ئامادە کرد. سەردار و ئەسیرەکانی دیکە کاتێك هاتن و ئەم سفرە گەورەیان بینی، لەخۆیان بایی بوون و هاوشێوەی سەرکردەیەك کە لەسەرکەوتنێکی گەورە گەڕابێتەوە، دەستی کرد بەباسکردنی..... موشیردیوان کەلای من

دانیشتبوو، بزەیەکی گرت و وتی: دیمبڵی دیمباوە نەقارە، حاجی باوەخان سوار، ئەم کوڕە زۆر ڕوودارە، پێی عەیب نییە، قسە دەکات.

لەناوەڕاستی زیقەعدەی ۱۳۳۷، دووبارە سەردار ڕەشید بەپێی فەرمانی شەریف ئەلدەولە هاتە کوردستان و ئەوی لەگەڵ شازادە ئەعزەم ئەلدەولە بەهاوبەشی وەك جێگری حکومەتەکەی خۆی دیاریکرد. لەم کاتەدا جەنگێکی قورس لەنێوان بەڕێزان مەلا عەبدولفەتاح و مەلا عەبدولجەواد، سەبارەت بەبەدەستهێنانی نازناوی شێخولئیسلامی هاتە ئاراوە و هەردووکیان بوونە هۆی بێزاربوونی شەریف ئەلدەولە. بەشێوەیەك کەدەیویست ئەو نازناوە بەهەرکامێکیان بدات، کەسەکەی دیکە دەستی بەهاندان و هەڵخڕاندن دەکرد. ناچار شەریف ئەلدەولە بۆ نەهێشتنی ئەم کێشەیە، بڕیاریدا نازناوەکە بەکەسێکی دیکە ببەخشێت و خۆی لەدەست گوشارەکانی ئەو دوو کەسە ڕزگار بکات. سەرەتا بەمن و ئیعتیزاد ئەلدەولەی وت: شەریعەتمەدار بۆ وەرگرتنی ئەم نازناوە ئامادە بکەین. شەریعەتمەدار ئامادە نەبوو. دواتر بەحاجی موعتەمیدی وت کەسێکی بۆ ئامادە بکات. حاجی موعتەمید، سەیید عەبدولعەزیزی نازم ئەلشەریعەی ئامادە کرد (خزمی خۆی بوو). بڕە پارەیەکی دا و نازناوی شێخولئیسلامی دەستکەوت و لەموحەڕەمی ۱۳۳۸، فەرمانی ڕەسمی لەتارانەوە بەدەست گەیشت. سەیید عەبدولعەزیز کوڕی سەیید عەبدولمەجیدی نازم ئەلسادات کوڕی سەیید عەبدولڕەحمان کوڕی سۆفی عەبدولڕەحیمی خوڕخوڕەیە. دەڵێن: سۆفی عەبدولڕەحیم برای سەیید زەکی شێخولئیسلام بووە، کوڕی حاجی سەیید مەحمودی شێخولئیسلام کەپێشتر ئاماژەمان بەڕەچەڵەکی ئەواندا. لەدەیەی کۆتایی زیقەعدە، شەریف ئەلدەولە، شازادە ئەکبەر میرزای لەگەڵ ژاندارمەکان و حیشمەت ئەلمولکی بۆ ئەفراسیاب نارد تا ڕێگە لەخراپەکاری و تاڵانکاری مەندەمی و گوڵباغییەکان بگرێت. خۆیشی لەژێر ناوی گەڕان و سەیران لەگەڵ قونسوڵی ئینگلیس و وەکیل ئەلمولك و سەردار ئەعزەم و سەردار موعەزەم بەرەو سەقز و بیجار بەڕێکەوت. کاتێك دەگاتە قەڵاکۆن، حەبیب الله خانی ئیلبەگی دەگرێت کەبۆ پێشوازی کردنی هاتبوو و لەگەڵ خۆی دەیباتە سەقز و لەوێ لەگەڵ ڕۆستەم خانی بانەیی لەداریان دەدات. مەندەمییەکان لەهێزەکەی ئەفراسیاب دەترسن و لەگەڵ ژن و منداڵ و مەڕوماڵاتەکەیان بەرەو چیای زێڕاوە بەڕێدەکەون. عەزیز و تەکش خان ناوێك سەرقاڵی تاڵانی و خراپەکاری دەبن. شازادە ئەکبەر میرزا، حیشمەت ئەلمولك بۆ سەرکوت کردنی

ئەوان ڕەوانە دەکات. حیشمەت ئەلمولك شەوانە بەچیاکەدا هەڵدەگەڕێت و ڕووبەڕووی عەزیز و تەکش دەبێتەوە کە لەگەڵ دوو برای دیکەیان، ئەبولمحەممەد خان و عەبدولسەمەدخان، هەموویان لەیەك جێگە کۆبوونەتەوە. دوای جەنگێکی قورس، هەر چوار براکە و گوڵ محەممەد خان و چەند کەسێکی دیکە ئەسیر دەکرێن. عەزیز و تەکش لەناو سوپاکەدا تیرباران دەکرێن و ئەبولمحەممەد خان و گوڵ محەممەد خان و عەبدولسەمەدخان و کەسانی دیکە دێننە شار و دوای ماوەیەك لەپشت گۆڕستانی تایلە تیرباران دەکرێن. عەبدولقادری پیاوی حیشمەت ئەلمولك، کەکەسێکی بوێر و زیرەك بووە، لەجەنگی عەزیز و تەکش دەکوژرێت. بوێری حیشمەت ئەلمولك لەم جەنگەدا بەناوبانگە.

شەریف ئەلدەولە چەند ڕۆژێك لەسەقز دەمێنێتەوە و لەوێوە دەڕواتە بیجار، ڕۆژی ٦ زیحەججە بۆ شار دەگەڕێتەوە. شەوی هەینی ٢١ موحەڕەمی ١٣٣٨، شێخ ئەحمەدی ڕەئیس ئەلمەشایخ دەمرێت، سەرکردەکانی مەندەمی کەبریتیبوون لە نور محەممەد خانی ئیلخانی و سەیدی محەممەدخانی سەرهەنگ و فەرەج خانی برای شا و عەبدوڵڵەخانی برای حەبیب خان، دەڕۆنە لای سوپاکەی ئەفراسیاب و لەوێ گرفتار دەبن. ئاغای براخان قیبلەی عالەم کە ڕۆشتووە سەقز بۆ لای غیاس ئەلدەولە، لەو شارە گرفتار دەبێت و هەموویان بەفەرمانی حیشمەت ئەلمولك، ڕەوانەی شار دەکرێن. سەرباز و مۆسیق تا چیمەنی موعتەمید پێشوازییان لێدەکەن و لەناو قەرەباڵغی دانیشتووان دەڕۆنە ناو شارەکە.

موشیر دیوان دەبێتە دەستەبەری مەندەمییەکان و حکومەت ئەوان تەسلیم بەموشیر دیوان دەکات. لەئەنجامی ئەم ڕێگەچارە، هەموو سەرکردەکانی عەشیرەکان کەبریتیبوون لەمەحمود خانی کانی سانان و مەحمودخانی دزڵی و فارس خانی ڕەئیس و محەممەد ساڵح خانی ئەمیر ئەلعەشایر، هەموویان دێنەشار و پەنا بۆ تەویلەی حکومەتی دەبەن. حکومەت مۆڵەتیان پێدەدات و هەمووان لەشاردا نیشتەجێ دەبن و ئازادانە دەسوڕێنەوە. شەوی دووشەممەی ٤ جومادی الاوەل، حاجی محەممەد عەلی خانی سەردار دەمرێت، شەریف ئەلدەولە لەگەڵ هەموو زاناکان و پیاوماقووڵانی شار و سەرکردەکان و سەرۆك عەشیرەکان، لەپێش جەنازەکەوە ڕێگەدەبڕێت و بەوپەڕی ڕێزەوە تا ئیمامزادە پیر عومەر لەگەڵی دەڕۆن. ڕۆژی دووشەممە ١٨ جومادی الاوەل، سەردار ڕەشید کەگەڕابوویەوە بۆ ڕەوانسەر، دووبارە بەفەرمانی شەریف ئەلدەولە لەگەڵ شێخ قەیدار و دەستەیەك دەگەڕێتەوە بەبیانوی ئەوەی

شەریف ئەلدەولە والیگەری کوردستان بەو بسپێرێت و خۆی بۆ تاران بگەڕێتەوە. پێشتر هەرجار دەهاتە کوردستان، یا لەقەلاّی حکومەتی نیشتەجێ دەبوو یا لەماڵی وەکیل ئەلمولك. ئەمجارە لەماڵەکانی ئەعزاز ئەلمولك لای مزگەوتی فاروقیە،ماڵیان بۆ ئامادە کرد. شەوی ٢١ جومادی الاوەل، شمشێری خوالێخۆشبوو حاجی سەردار بەشێوەیەکی نهێنی لەحاجی ئەرفەع ئەلمولك وەردەگرێت و بەو شێوەیە بڵاوی دەکەنەوە کەشمشێرەکە لەتارانەوە بۆ سەردار ڕەوانە کراوە. ڕۆژی ٢٢ جومادی الاوەل، لەقەلاّی حکومەتی، خەڵکان بەگشتی بانگێشت دەکرێن و شەریف ئەلدەولە بەدەستی خۆی، فەرمانی والیگەری کوردستان بەسەردار پێشکەش دەکات و نیشانەی سەرتیپی دەکاتە ملی و شمشێرە گەوهەرنیشانەکە لەکەمەری دەبەستێت. منیش بەدەنگی بەرز فەرمانەکەم خوێندەوە. هەمووان پیرۆزباییان لەسەردار کرد و چوار پاسەوانیان بەمەبەستی ڕێزگرتن بۆ دیاریکرد تا بۆ هەر شوێنێك بڕوات، دووانیان لەپێش و دووانیان لەدواوە ڕێگە بڕۆن.

ڕۆژی ١٠ جومادی الثانی ١٣٣٨ کەهاوکات بوو لەگەڵ یەکی فەروەردین١٢٩٨، جەژنی نەورۆزی سوڵتانی سازدرا و ئەم بابەتەی خوارەوەم بەئامادەبوونی خەڵکان و سەرۆك عەشیرەتەکان خوێندەوە:

### جەژنی نەورۆزی ١٣٣٨

لەم جەژنی سەرکەوتنە، لەم ڕۆژە پیرۆزە مێژووییە، لەکۆبوونەوەی عەشیرە و تایەفەکان، کەساڵانێکی دوورودرێژە دانیشتووانی کوردستان، ئەم ڕۆژانەیان نەبینیوە، بەهەموو سەرۆك و خانەکان و بەگزادەکان خێڵەکان کەهەموویان لەبەردەم پەیکەری شاهەنشاهی ئامادە بوون و سەری کوڕنوش لەخاك دەسوون، بەزمانێکی پاك و پاراو و بەدوور لەهەر شتێك، دەڵێم: وشەی شاهەنشاهی و نیشانی شێر و خۆرشید بۆ ئێمەی ڕووندەکاتەوە کەدەوڵەتی شکۆداری شەش هەزار ساڵەی ئێران، لەبەهێزترین دەوڵەتەکانی دنیا بووە و فەرمانڕەوایەتی هەموو دەوڵەتەکان وئیمپراتۆرییەکانی جیهانی کردووە. ڕۆژێك بۆ جەنگی یۆنانییەکان چواردە سوپای گەورەی تەیار و ئامادە کردووە و شاهەنشاهێك بەناوی کوروش، بەوپەڕی هێز و دەسەلاّت، فەرمانڕەوایەتی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوای دەکرد. لەدەورانی نادرشا، دراوسێکانی ئێمە لەگەڵ ترسێکی فراوان، کوڕنوشیان بۆ ئالاّی دەوڵەتی ئێران نیشاندا. لەدەورانی فەرمانڕەوایەتی کەریم خانی زەند، هەموو سوڵتانەکانی دراوسێ، ملکەچی و

گوێڕایەڵی خۆیان نیشاندا. سەرنجدان بەدەورەکانی پێشوو، هۆکارێکە بۆ دروستبوونی خەم و نیگەرانی. لەم چەند ساڵەدا، جەنگی نێودەوڵەتی، ئەگەر لەڕووی ویژدان و وردبینییەوە، لێکۆڵینەوەی بۆ بکەین، دەبینین زۆربەی دەوڵەتە بچووک و گەورەکانی دنیا، لەگەڵ هەر جۆرە هێزێك و دەسەڵاتێك، لەبەرابەر پێشهات و ڕووداوەکانی ڕۆژگار ناتەوان و ملکەچ بوون. بەپێچەوانەوە دەوڵەتی ئێران، بەپشتبەستن بەهێزی بیر و ئەندێشە، ڕووبەڕووی هەزار جۆرە لەمپەری دەرەکی و نێوخۆیی و کێشەکانی سەرسنوور بۆتەوە و کەشتی شکاوی ژیانی خۆی، گەیاندۆتە بەستێنی ڕزگاری و شەرافەت و سەربەخۆیی خۆی بەهەموو دەوڵەتەکانی جیهان سەلماند. ئەمڕۆ دەبینین هێز و دەسەلآت و شکۆی دەوڵەتی ئێران، بەهۆی کردەوە و بیرۆکە ژیانبەخشەکانی تاکە سەرۆك وەزیری چالاك و بەتوانا، بەڕێز وسوق ئەلدەولە، لەقووڵایی وڵات لەخوراسانەوە تا ئیسفەهان و لوڕستان و جەنگەڵ و شیراز و هتد.... فەرمانەکانی بەخێرایی جێبەجێ دەکرێت. هەڵبەت دەوڵەتێکی لەمشێوە ئەگەر لەو پەڕی لاوازی و ناتەوانیدا بێت، بەخێرایی دەتوانێت کۆتایی بەئاژاوە و پشێوی ویلایەتێکی بچووکی وەك کوردستان بێنێت و باکوری وڵات بۆ ڕۆژهەڵاتی بەختەوەری بگۆڕێت. چی ڕوویدا کە لەم چەند ساڵەدا، ئەم دەوڵەتە بیرمەندە لە بەئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە ناتەوان بووە و ئەگەر هەندێ کات چالاکییەکی لەخۆی نیشانداوە، هیچ بەرهەمێکی لێنەکەوتۆتەوە؟ هۆکاری سەرەکی و لەمپەری گەورە، سەرقاڵی دەوڵەت بەسیاسەتی دەرەکی و ڕێکخستن و توندوتۆڵ کردنی پەیوەندییەکانی بوو لەگەڵ دەوڵەتەکانی دراوسێ کە لەسەدەی ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەتەکان، لەڕۆژگاری مردن و زیندووبوونی دەوڵەتەکان، لەم بارودۆخە نەزانراوەی ڕۆژگار، هیچ زیانێك بەشەرافەتی ئێران نەگات. گرنگی ئەم بابەتە، کەپاراستنی سیاسەتی دەرەکی بوو، پێش بەرقەرار کردنی ئاسایش لەنێوخۆدا کرا و دەرفەتی بۆ خراپەکاران ڕەخساند، لەلایەك خراپەکاری عەشیرەکان و تایەفە وەحشییەکانی بێ ئاگا لەسیاسەت کەسروشتی خۆیان، بۆ هەر خراپەکارییەك هانی دەدان و لەلایەکی دیکە، دەستەیەك دزی ئامادە، دەستەیەك خراپەکاری تالآنچی، هاوڕێیەتی و ڕێنوێنی ئەوانیان دەکرد و ئاگری ئاژاوە و فیتنەیان خۆش دەکرد. لەپشێوی و ئاژاوە و تالآنکاری کەڵکیان وەردەگرت و بەکوشت و کوشتار، خۆشیان نیشاندەدا. لەلایەکی دیکە ئاژاوە و پشێوی جەنگی نێونەتەوەیی و هێرشکردنی دەوڵەتە بیانییەکان، کەسنوورەکانی ئێرانیان

کردە گۆڕەپانی خۆیان، ناوی دەوڵەتی ئێرانی لەدڵ و بیری کورتبینان سڕیبوویەوە. هەموو ئەم هۆکارانەی بەدبەختی و ڕیسوایی، گۆڕەپانێکی بەرینیان بۆ خیانەتکاران ئامادە کرد کەبارودۆخێکی پشێوی و بنەمای پاشایەتی تیرە و عەشیرەکان لەهەموو ناوچەکانی ئێران فەرمانڕەوا بێت. هەر کەسێك بیری لەشتێك دەکردەوە و هەر قورگێك بەدوای شتێکدا دەگەڕا.

بەڕێز شەریف ئەلدەولە فەرمانڕەوای کوردستان و گەڕووس کە لەلایەن دەوڵەتی خاوەنشکۆوە، بەڕەسمی بۆ گەڕاندنەوەی نەزم و ئارامی و ڕێگرتن لەپێشهات و کارەساتە نەویستەکان ڕەوانە کراوە، لەگەڵ گەیشتنی بۆ کوردستان بەدوای سەرچاوەکانی خراپەکاری و ئاژاوەدا گەڕا، ئەوانەی هەموو بەڵگە ئاسمانییەکان، تاوانەکانی ئەوانی پشتڕاست دەکردەوە و بەڵگەی پێویست بۆ سەلماندنی تاوانەکانیان لەدەستابوو، بەسزای کردەوەکانی خۆیان گەیشتن. بۆ گەڕاندنەوەی ئاسایش و ئارامی و زیندوو کردنەوەی ناوی دەوڵەت، باری نائاسایی لەشارەکەدا ڕاگەیاند و دواتر بۆ کۆتایی هێنان بەخراپەکاران و سەرکوتکردنی تایەفەکانی مەندەمی و گوڵباغی و هتد.... سوپایەکی گەورەی پێکهاتوو لەسوار و پیادەکانی عەشیرەکان بەسەرۆکایەتی سەردار ڕەشید و فەرماندەی هەموو هێزە ڕەوانەکراوەکان و هاوکاری ژاندارمەکان نەواب والا شازادە سوڵتان میرزا پێکهێنا. پێش ڕەوانە کردنی سوپا، بەهۆی ئەو بەیاننامانەی بەهۆی فڕۆکەوە بەئاسماندا بڵاو کرایەوە و ماوەیەکیان بۆ تەسلیم بوون و ملکەچبوونی ئەوان دیاریکرد کەئەگەر لەکاتی دیاریکراو، هەرکام لەوان تەسلیمی سوپاکەی سەردار بن، دەبەخشرێن و لەهەموو گوناحەکانیان خۆش دەبین. بەداخەوە لەبەر ئەوەی چارەنووس بۆی دیاریکردبوون دەبێت بەسزای کردەوەکانی خۆیان بگەن، لەخۆباییبوون ڕێگەی لێگرتن و ئەو ماوەیان بەفشە و ئەفسانە لەقەڵەمدا. بەناچاری سوپای سەردار بەڕێکەوت و لەیەکەم هێرش، لەناویبردن و ئەنجامی خیانەت کردن لەدەوڵەت و میللەتیان بەچاوی خۆیان بینی. هەنووکە لەم نەورۆزە پیرۆزەدا، هەموو دانیشتووانی گەڕووس و کوردستان و عەشیرەکانی سەرسنوری یەکخستووە و بەم بۆنەوە ڕێوڕەسمی پیرۆزبایی کردنی ئەم سەرکەوتنە کەهۆکاری بەختەوەری و ئاسایشی هەموو دانیشتووانە، پێشکەش بەدەرباری پاشا و دەوڵەت دەکەم و لەقووڵایی دڵەوە سپاسی هەوڵ و ماندووبوونەکانیان دەکەم.

ڕۆژی ۱۱ جومادی ئەلثانی، سەردار بۆ قەڵای حکومەتی بانگێشتکرا تا سەرقاڵی

فەرمانڕەوایەتی بێت. لەگەڵ گەیشتنی بۆ ژووری چاوەڕوانی، سەوڵەت لەشکر، لەگەڵ ژمارەیەك لەپیاوەکانی خۆی، سەردار قۆڵبەست دەکات و چەك لەپیاوەکانی دەستێنێت. لەگەڵ ئەوەیشدا دەستەیەك ژاندارم دەنێرن و هەموو مەندەمییەکان کەتەسلیم بەموشیر دیوان کرابوونەوە، دەگرن و دەیانگوازنەوە بۆ قەڵای حکومەتی. گوڵباغییەکانیش کە بەزۆری لەناو شاردابوو، قۆڵبەست و زیندانی دەکرێن. مەحمودخانی کانی سانان و مەحمودخانی دزڵیش بەقۆڵبەستکراوی ڕەوانەی بەغداد دەکرێن. شەوی پێنجشەممە ٢٦ جومادی ئەلثانی، سەردار و والی ڕەوانەی تاران کران. شەوی ٢٧ جومادی ئەلثانی، من لەخۆشی ڕزگاربوونی کوردستان لەدەستی عەشیرە نەزانەکان و کۆتایی هاتنی یەکەم ساڵی حکومەتی شەریف ئەلدەولە، جەژنێکم بەناوی جەژنی شەریف لەماڵەکەی خۆمدا سازکرد و هەموو چینەکانی شارم بانگێشتکرد. بۆ هاتنی خودی شەریف ئەلدەولە لەبەر دەرگای ماڵەکەم تا بەر دەرگای قەڵای حکومەتی، هەردوو لای کۆڵانەکەم ڕازاندەوە. کاتی هاتنی شەرەف ئەلدەولە بۆ ناو حەوشی ماڵەکەم، بەناوی دانیشتووانەوە، سپاسی هەموو زەحمەت و ماندووبوونەکانی شەریف ئەلدەولەم کرد بۆ گەڕاندنەوەی نەزم و ئارامی بۆ شارەکە. لەکۆتایی وتەکانی من، مۆسیقا دەستیپێکرد. بڕێکی زۆر بۆ ئامادەکردنی شەربەت و شیرینی خەرجکرا. دوو ڕۆژ دواتر تیرباران کردنی سەرکردەکانی مەندەمی و گوڵباغی و شێخ ئیسماعیلی دەستپێکرد. لەماوەی دوو حەفتەدا، ئەم کەسانەی خوارەوە ئیعدام کران:

ئاغا براخان، قیبلەی عالەم، گوڵباغی

فارس خان، سەرۆکی گوڵباغییەکان

میرزا عەبدوڵڵە، سەیف ئەلعەشایری گوڵباغی

محەممەد خان، ڕەئیسی گوڵباغی

سەردار کوڕی قیتۆڵی، گوڵباغی

نورمحەممەد خانی ئیلخانی، مەندەمی

مستەفا، کوڕی محەممەد بەگ، مەندەمی

سەیدی محەممەدخانی سەرهەنگ، مەندەمی

مەلەك محەممەد خان، مەندەمی

مەحمود بەگ، مەندەمی

عەبدوڵڵە کوڕی شا محەممەد بەگی مەندەمی
فەرەج خان و عەبدوڵڵەخان، براکانی حەبیب الله خانی مەندەمی
مەجیدخان و بەهرام خان، کوڕەکانی سارم لەشکر، شێخ ئیسماعیلی
مەحمودخانی سەردار ئیقباڵ، نەوەی محەممەد مورادخان، شێخ ئیسماعیلی
عەزیز خان، برای مەحمودخان، سەردار ئیقباڵ، شێخ ئیسماعیلی
مستەفاخان، برای محەممەد مورادخانی ئیلخانی، شێخ ئیسماعیلی

سەرۆکەکانیان لەبەردەم دەروازەی حکومەتی بەخاك سپێردران و بەرد وەك كێل لەسەر گۆڕەکەیان دانرا. محەممەد ساڵح خانی ئەمیر ئەلعەشایەری گوڵباغی، کەپەنای بۆ من هێنابوو، لەئیعدام ڕزگاری بوو. عەتاالله کوڕی حاجی فەتحوڵڵە کە لەبەردەم مزگەوتی والی، سوارە کوڕی سەیید ئەحمەدی کوشتبوو، شەریف ئەلدەولە ویستی بیکوژێت، بەڵام ئەویشم ڕزگار کرد. شەوی شەممە ٣ مانگی ڕەمەزانی ١٣٣٨، میرزا یوسفی موشیر دیوان مرد. دواتر شازادە ئەکبەر میرزا لەگەڵ سالار فاتحی حەبیبی و تفەنگچی ژاوەڕۆ، بۆ سەرکوتکردنی پاشماوەی گوڵباغییەکان ڕاسپێردرا بەڵام لە ٢٧ ڕەمەزان شکستیان خوارد. سێ تۆپ و خێوەتێك و بڕێك تەقەمەنیان بەجێهێشت.

دووبارە لەسەرەتاکانی زیقەعدەی ١٣٣٨، ئەکبەر میرزا لەگەڵ سەرداری ئەعزەم و ساعید ئەلمەمالیك و سالار فاتح و حیشمەت ئەلمولك و سەنجەرخان، بۆ سەرکوتکردنی گوڵباغییەکان ڕاسپێردران و لەقەڵای ئاڵبلاغ لەنزیکی هانە گولان، گەمارۆیان خستە سەر گوڵباغییەکان. شەوانە دەستەیەك لەمەندەمییەکان بۆ هاوکاری گوڵباغییەکان دێن و بەکەڵك وەرگرتن لەچرا و ئاگری سوپاکە، تەقەکردن دەستپێدەکەن. ئەکبەر میرزا و سالار فاتح، دووبارە، هەموو کەلوپەل و تەقەمەنییەکان بەجێدێڵن و ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. دەمەوبەیانی ساعید ئەلمەمالیك وسەردار ئەعزەم و حیشمەت ئەلمولك ئاگادار دەبنەوە. ئەوانیش ناچار ڕێگەی هەڵاتن دەگرنەبەر. دەمەو ئاوابوونی هەتاو، سوپا بەشێوەیەکی پرژوبڵاو، گەیشتنە شارەکە.

ڕۆژی ٤ موحەڕەمی ١٣٣٩، ئاسف ئەعزەم میرزا، خەلیل خانی نەڕانی لەگەڵ خۆی دەباتە لای شەریف ئەلدەولە. داوای کرد بەنهێنی گفتوگۆ بکەن. سێ قۆڵی ڕۆشتنە ژوورێك. بەنهێنی بەشەریف ئەلدەولە دەڵێت ئەگەر ئێوە لێپرسراویەتی دەوڵەت بگرنەئەستۆ، میرزا

خەلیل خان ئامادەیە سەنجەرخان و یەدوڵڵەخان، براکانی خۆی بکوژێت. شەریف ئەلدەولە مۆڵەتی پێدەدا. میرزا خەلیل خان، لەژێر ناوی میوانی، شەریعەتمەدار بانگێشت دەکات و سەنجەرخان و یەدوڵڵەخان بۆ میوانداری کردنی شەریعەتمەدار بانگێشتی نەران دەکاتەوە. رۆژی هەینی، بەشێوەیەکی لەناکاو، ئیبراهیم خان و فەرەج اللە خان و ئەسعەد خان بەپێی فەرمانی خەلیل خان، بەئامادەبوونی شەریعەتمەدار، هێرش دەکەنە سەر سەنجەرخان و یەدوڵڵەخان و ئەحمەدخان و هەر سێکیان دەکوژێت. شەریعەتمەدار دەشڵەژێت و سوار ئەسپەکەی دەبێت و دەگەڕێتەوە. هاوکات لەگەڵ ئەم رووداوانە، هەڵبژاردنیش دەستپێکرد. بەڕێوەبردنی ئاسایش بەوەکیل ئەلسوڵتان سپێردرا. حاجی ئەرفەع ئەلمولك کە بەوەرگرتنی ئەماننامەی دەوڵەت گەڕابووییەوە، حاجی ئەرفەع ئەلمولکی ناچار کرد لەکاروباری هەڵبژاردن خۆی هەڵقورتێنێت بۆ ئەوەی هەردووکیان ببنە وەکیل. لەگەڵ ئەوەیشدا داوای هاوکارییان لەمن کرد. منیش شەریف ئەلدەولەم ئاگادار کردەوە و بەمۆڵەت وەرگرتن لەو، بەڵێنی هاوکاریم پێدان. دەستەبەندی و پڕوپاگەندە دەستپێکرد. لەکاتی نزیکبوونەوەی وادەی دەنگدان، ئاسف و موعتەمید و وەکیل ئەلمولك، بەشێوەیەکی نهێنی سەردانی شەریف ئەلدەولە دەکەن و لەبەرابەر پێشکەش کردنی بڕەپارەیەکی بەرچاو، سەرنجی بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن. ئێمەیش بێ ئاگا لەم رووداوانە، مەبەستی سەرخستنی بۆچوون و بڕیارەکەی خۆمانمان بوو. لەم ناوەدا شازادە ئەکبەر میرزا لەسەر کار لابرا. لەجیاتی ئەو سەرهەنگ محەممەد سادق خان سالار نیزامی کۆپاڵ هات. شەریف ئەلدەولە کاتێك بینی، بەڵێن و پەیمانەکەی ئێمە بەهێزە و زۆربەی کەسەکان وەك ئیعتیزاد ئەلدەولە و سەردار ئەعزەم و سالار فاتح و سالار موفەخەم و ئەشرەف نیزام و نەبی خانی ئەردەڵان و مەزهەر ئەلئیسلام و کەسانی دیکە، تەلآقیان خواردووە، مەلا عەبدولفەتاحی شێخولئیسلام و مەلا عەبدولسەمەدی ئەمین ئەلئیسلام و شوجاع لەشکر و حاجی ئەرفەع ئەلمولك و ئەمجەد ئەلئەشراف و کەسانی دیکە بەهۆی مۆجیاری هەڵە پەیمانیان بەست و ڕێگەی گەڕانەوە نەما. نەیدەتوانی چاوپۆشی لەپارەی ئاسفییەکان بکات. ناچار پەنا بۆ سالار نیزام دەبات و پێی دەڵێت من بەپێی فەرمانی دەوڵەت، بەمەبەستی کوشتن شوێن مەزهەر ئەلئیسلام کەوتووم. ئێستا فلآنەکەس و دەستەیەك لەدانیشتووانی شار دەیانەوێت یەکێك لەوەکیلەکانی کوردستان ئەو بێت و ئەمەیش بەپێچەوانەی فەرمانی دەوڵەت و خواستی منە.

چـوونکە مەزهـەر ئەلـسولْتان دوای ئـەوەی ببێتـە وەکیـل، ئەگـەر داوای ڕوونکردنـەوە لەمەجلیس بکات کە: ئەگەر من کەسێکی ناپاك بووم، بۆ دانیشتووانی کوردستان منیان هەڵبژارد و ئەگەر کەسێکی پاك بووم، شەریف ئەلدەولە بەچ هۆکارێك بۆ کوشتنی من هەوڵی دەدا؟ من چ وەلاٌمێك بدەمەوە. بزوێنەری ئەم کەسانە و خەڵکانیش تەنیا فلاٌنەکەسە. ئەگەر ئەو تا کۆتایی هەڵبژاردن لەماڵەکەی خۆی دەستبەسەر بکرێت، هەموو شتێك کۆتایی دێت و ئەوانی دیکە توانای هیچ کارێکیان نییە. سالار نیزامی داماو کە لەهەموو شتێك بێ ئاگایە، فریوی قسەکانی دەخوات. منیش دوای ئەوەی لەم گفتوگۆیـان ئاگادار بوومـەوە، پەیامێکم بۆحاجی ئەرفەع و حاجی مەزهەری والیزادە و کاربەدەستانی دیکە، نارد تا شەو لەماڵی مورتـەزاخانی شـوجاع لەشـکر کۆببنـەوە. خۆیـشم ڕۆشـتم و لەچـەندایەتی و چـۆنایەتی گفتوگۆی حکومـەت و سـەرۆکی نیـزام، ئاگادارم کردنـەوە، وتم: کاتێك یەکەم ڕۆژ ئامادەیی خـۆم نیـشاندا، بەرەزامەنـدی دەوڵـەت بـوو، ئێـستا کەئاسـف و ئاسـفییەکان سـەرنجی حکومـەتیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشاوە، بەباشی نازانم دژی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت هیچ کارێك بکـەم، دەبێت لـەو ڕێگەیـەی کەئاسفییەکان توانیویانە سەرنجی حکومـەت بەدەست بێـنن، کـەڵك وەربگـرین و سـەرنجی بەدەسـت بێـنین، جیـاواز لـەوە دەبێـت چاوپۆشـی لەهەڵبـژاردن بکـەین بـۆ ئـەوەی ڕووبـەڕووی حکومـەت نەبینـەوە. حـاجی ئەرفـەع ئـەلمولك و حـاجی مەزهـەر ئەلئیـسلام وتیـان: شـەریف ئەلدەولـە لەسـەر دەسـتی ئێـوە بـوو بەشـەریف ئەلدەولـە، ئەگـەر هاوکـاری و ڕێنوێنییـەکانی ئێـوە بـۆ شـەریف ئەلدەولـە نـەدەبوو، لەهـەمان حەفتـەی یەکـەمی هـاتنی، ڕێگـەی هـەلاٌتنی دەگرتەبـەر. ئێستا کـەپارەی لەشـوێنکەوتەکانی ئاسف وەرگرتووە، بەهیچ جۆرێك پاڵپشتی لەئێمە ناکات. ئەگەر لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەی خۆمان بمێنینەوە، گرنگی بەدژایەتی یا ڕەزامەندی شەریف ئەلدەولە نادەین و بەو شێوەی دەستمان پێکـردووە، دەڕۆینـە پـێش. سالارنیزامیش لـەڕووداوەکان ئاگـادار دەکەینـەوە تـا بزانێـت شـەریف ئەلدەولـە بـۆ پـارە ئامادەیـە خۆیـشی بکوژێـت و بیر لەبەرژەوەندییـەکانی دەوڵـەت ناکاتـەوە. لەهـەموو شـوێنێکی دانیـشتنەکە دەنـگ بـەرز بوویـەوە و ڕایانگەیانـد کەهەمووان لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەی خۆیان سوورن و پەشیمان نەبوونەتەوە و تا دووایین دڵـۆپی خـوێن بـۆ بـەرگری کـردن لـەخۆیان ئامـادەن. هەرچـەند بەڵگـە و پاسـاوم هێنایـەوە، سوودی نەبوو، لەکۆتایی وتەکانم وتم: دواتر نەڵێن فلاٌنەکەس نەیزانی و تەسلیمی بۆچوون

وبڕیاری ئێمە بوو، ئاگادار بن بۆچوونەکەتان هەڵەیە و ئەم ڕێگەی ئێوە پیایدا دەڕۆن دەگاتە تورکستان و لەمەشەو بەدواوە دەبێت خۆتان بۆ دوورخستنەوە، ئیهانەکران، زیندانی و هەموو شتێکی دیکە جگە لەگەیشتن بەمەبەستەکەتان ئامادە بکەن. لێرەدا کۆتاییم بەدانیشتنەکە هێنا و بۆ ماڵەوە گەڕامەوە. بەیانی ئێوارێکەی کە٢٢ موحەڕەم بووو، لەماڵەوە دانیشتبووم، بینیم سوڵتان حسەین خان (باوك) لەگەڵ دە سەرباز هاتەژوور. سوڵتان دوای ئەحواڵپرسی وتی: شەریف ئەلدەولە و سەرهەنگ دەفەرموون، لەبەر ئەوەی ئەم چەند ڕۆژە چەندین هەواڵمان بەدەست گەیشتووە کەفلانەکەس دژی بەرژەوەندییەکانی حکومەت و هێزە سەربازییەکان لێدوان دەدات و گومانی لای هەمووان دروستکردووە، بۆ نەهێشتنی ئەم گومانە باشترە فلانەکەس چەند ڕۆژێك لەماڵەوە دەرنەچێت و ڕێگە نەدات کەسیش سەردانی بکات. ئەم سەربازانە لێرە دەبن بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەن کەس بێتە لای ئێوە. وتم: بەشەریف ئەلدەولە بڵێ، ئەمڕۆ بۆیە لەماڵەوە مامەوە چوونکە چاوەڕێی ئەمەم دەکرد، بەلام دەوڵەت و میللەت دەزانن، هەروەها خۆیشی سوور دەزانێت چالاکییەکانی من بەهیچ جۆرێك دژ و پێچەوانەی نیزام نەبووە و لەهەموو شوێنێك بۆ گەڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش و هاوکاریکردنی حکومەت گیان و ماڵی خۆم بەخشیوە. ئەگەر لەهەڵبژاردن کێشە هاتۆتە ئاراوە، ڕۆژی یەکەم بەمۆڵەت وەرگرتن لەدەوڵەت، چالاکییەکانم دەستپێکرد و بەڕەزامەندی ئەو، بەڵێنی هاوکاریم بەو بەڕێزانەدا. ئەگەر ئێستا بەڕێزیان لەبەر بەرژەوەندی تایبەت لەبۆچوونەکەی خۆیان پەشیمان بوونەتەوە، کێشەکە لەمنەوە نییە چوونکی منی لەپەشیمان بوونەوەی خۆی ئاگادار نەکردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا من لەماڵەوە دەمێنمەوە تا ئەو کاتەی هەست بەهەڵەکەی خۆی بکات و بێت داوای بەخشین و لێبوردن لەمن بکات. ئێوارێ هەواڵ گەیشت کەڕێگەیان نەداوە عەبدولعەزیزخان ئەشرەف نیزام لەماڵەکەی خۆی بڕواتەدەر، هەروەها بەیانی هەواڵم پێگەیشت کەنەبی خانی ئەردەلانی بردۆتە قەلای حکومەتی و هەڕەشەی لەویش کردووە تا هەوڵ نەدات پەیوەندی بەمنەوە بکات. لەئەنجامی ئەم کارانە، هەڵبژاردن لەبەرژەوەندی ئەوان شکایەوە و هیچکەس لەوانەی پەیمانیان بەستبوو (یانی ئەوانەی تا دووایین دڵۆپی خوێنی خۆیان بۆ هەر جۆرە گیانبازییەك ئامادە بوون)، نەیانوێرا هیچ کارێك بکەن.

چەند ڕۆژێك لەماڵەوە مامەوە، ئێوارێیەك محەممەد ڕەزا (پیاوەکەی خۆم) هات و وتی:

کارگوزار بەشێوەیەکی نهێنی بانگی کردم و وتی برۆ بەفلانەکەس بڵێ وەکیل ئەلسولتان لەلایەن ئاسفەوە پێنج هەزار تمەنی بەشەریف ئەلدەولەداوە کەفلانەکەس ئیعدام بکات. تا ئەمڕۆ قونسولی ئینگلیس ڕازی نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ قونسولیشیان ڕازی کردووە. ئەگەر بۆ ڕزگار کردنی خۆی دەتوانێت، شتێك بکات، باشترە لەزووترین کات ئەنجامی بدات جیاواز لەوە چاوەڕێی هیچ لەئێمە نەکات. کاتێك هەواڵەکەم بیست، بەوردی هەڵسەگاندنم بۆ کرد. دەمەو ئێوارێ، همایون خانی سەییاح کەوەزیری دارایی بوو، بەهۆی موعین دیوانەوە. پەیامێکی لەو شێوەی بۆ ناردم و خەمباری خۆی دەربڕیبوو. موعین خان بەهۆی سەعادەت خاتوونی خوشکی، پەیامەکەی سەییاحی بەمن گەیاند. نیزامییەکانیش پێنج کەسیان لەژووری پێشەوە و لەبەرابەر ژوورەکەی مندا بوون. پێنج کەسی دیکەیان لەدەرەوە بوون. ئەو شەوە فەرمانمدا لەیەك شوێندا نان بەهەموویان بدەن یا لەژووری پێنج کەسەکەی ژوورەوە یا لەدەرەوە. نیزامییەکان وتبوویان لەدەرەوە نان دەخۆین. کاتێك خواردنیان بۆ بردن و سەرقاڵی خواردن بوون، پەڕۆیەکی شینم بەدەوری عەمامەکەی سەرمەوە بەست و دە گوللەم هەڵگرت و بەهێواشی بەرەو دەروازەکە ڕۆشتم، ئەگەر نیزامییەکان نەیانزانی، لەدەروازەکە دەڕۆمەدەر و گیان دەرباز دەکەم و ئەگەر زانیان، لەوێ جەنگ دەستپێدەکەم و هەرچی ڕوودەدات، ڕووبدات. بەڕێکەوت نیزامییەکان لەبەر ئەوەی سەرقاڵی خواردن بوون، تەندروست لەدەروازەکە ڕۆشتمەدەر. دوای تێپەڕینیی پێنج کاتژمێر لەشەو گەیشتمە گوندی زندان. میرزا ئاغاجانی عەزیمی، پیاوی کارگوزار لەوێ بوو. ئەوم لەخەو هەستاند. تا من سەرخەوێکم شکاند، ئەو و شێخ عەزیز و کوێخا محەممەد حسەین، چاییان ئامادە کردبوو. دوای خواردنی چایی، دەمەو بەیانی، کەسێك بەناوی ڕەحیم لەگەڵ خۆم برد و لەڕێگەی ئەلوانەوە بەرەو هەورامان ڕۆشتم. لەوێ مۆڵەتی گەڕانەوەم بەڕەحیمدا و بەهۆی ئەوەوە نامەیەکی توند و توڕەم بۆ شەریف ئەلدەولە نووسی. دوو سێ ڕۆژم لەهەویە بەڕاو و گەڕان بەسەر برد. ڕۆژی چوارەم، چوار سواری هەورامیم هەڵگرت و بەرەو ڕەزاو ڕۆشتم.

ڕۆژی ۲۷ سەفەری ۱۳۳۹ نامەیەکی دیکەم بۆ شەریف ئەلدەولە نووسی:

بۆ سەروەری ناسپاسی خۆم:

زیاد لەڕادە سکاڵا و گلەییم لەتۆ هەیە

بەڵام شکاتت لێ ناکەم.

بۆ نەهێشتنی گومان لای خەڵکان، تۆمەتی ئاژاوە و شۆڕشتان خستە پاڵ من. بۆ نەهێشتنی ئەم گومانە فیرۆیە و سەلماندنی ئەوەی من لەو تۆمەتانە بێ بەریم و هیچ هێزێك لەجیهان جگە لەهێزی ڕێزگرتن و خۆشەویستی ناتوانێت، گوشار بخاتە سەرمن، ئێستا بێ گرنگیدان بەهیچ شتێك، بێ ترس لەهیچ کەس، تاقی تەنیا لەماڵ هاتمەدەر و هاتمە بەردەلآنەکانی هەورامان. ئێستا داوای داد لەخودی ئێوە دەکەم تا بگەڕێنەوە بۆ دادگای ویژدانی خۆتان، ئەگەر کەمێك بیری شۆڕش و ئاژاوە لەمێشکی مندا بەدیدەکرا، بەو هەموو زانیارییانە لەبارودۆخی ناوەند و نهێنییەکانی سیاستەم هەمە و لەگەڵ ئەوەی هۆکارەکانی شۆڕش لەهەموو ناوچەکانی کوردستان ئامادەیە و دڵنیان توانای ئەنجامدانی ئەو کارەم هەیە، لەگەڵ ئەوەی پشتڕاستی دەکەنەوە لەم قۆناغەدا و لەم ناوچەیە کەسەرچاوەی ئاژاوە و شۆڕشە و لەهەموو چیاکانی بەردی فیتنە و ئاژاوە دەبارێت، باشتر و خێراتر دەتوانم ئەو بیرۆکەم (ئەگەر بخوازم) بخەمە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە کەتەنیا بەدەنکە شخارتەیەك، بێ هیچ لەمپەرێك، تەواوی کوردستان دەبێتە دەریای ئاگر و دۆزەخێکی هەمیشەیی. خۆیشتان دڵنیا کەسێسەد ژاندارمی برسی و پێپەتی بێ نان و ئاو، ناتوانن ڕێگری بکەن بەتایبەت ئەگەری خۆشکەری ئەم ئاگرە من بم. کەواتە بەبوونی خیانەتکاران و لەگەڵ ئەوەی هەموو هۆکار و کەرەستەکان لەبەردەستی مندا ئامادەیە، ڕۆژەکان بەڕاو و گەڕان بەسەر دەبەم تا ڕووڕەش بێت هەرکەس بیر لەفێڵ و تەڵەکە دەکاتەوە. غەزەلێك لەو شێعرانەی تایبەتە بەیاری بێ وەفا و ناسپاس، وەك دیاری ڕەوانە دەکەم، بیخوێننەوە و بیری ڕابردوو بکەنەوە.

جەعفەرسوڵتانی لهۆن و مەحمودخانی کانی سانان، کاتێك لەڕووداوەکان ئاگادار دەبنەوە، کەسیان بۆ لای من نارد کەئێمە بەهەموو هێزەکانی خۆمانەوە ئامادەین و چاوەڕوانی فەرمانی تۆین بەو مەرجەی چیتر نەڕۆیتە شار و لەهەورامان بمێنیتەوە. گومانم کرد ئەگەر کارێك بکرێت، کاربەدەستانی دەوڵەت گومان دەکەن، دژی ئەوانە نەك خودی شەریف ئەلدەولە. بۆیە هەموو ڕووداوەکانم لەڕێگەی کرماشانەوە بۆ وسوق ئەلدەولە نووسی. ئەوان ئەنجامدانی ئەو کارەی منیان (دروستکردنی شۆڕش دژی شەریف ئەلدەولە) بەپێویست نەزانی و تەنیا نامەیەکی سەرکۆنە کردنیان بۆ شەریف ئەلدەولە نارد. لە ٩ ڕەبیع الاوەل هەواڵم بەدەست گەیشت کەوەکیلە دەسکرد و درۆینەکان یانی سەردار موعەزەم، وەکیل ئەلمولك و حاجی ئەسەد خان بەرەو تاران بەڕێکەوتوون. پەیوەندی ئەوان لەگەڵ شەریف

ئەلدەولە، پەیوەندییەکی گونجاو و شیاو بوو. ڕۆژی ٢٦ جومادی الاوەل ١٣٣٩، لەڕەزاو بەمەبەستی گەڕانەوە بەڕێکەوتم. شەریف ئەلدەولە، بەڕێزان ئیعتیزاد ئەلدەولە، کارگوزار و سەردار ئەعزەم و سالار موفەخەمی و دەستەیەکی دیکەی تا حەسەن ئاوا بۆ پێشوازی کردنم نارد. لەجومادی ئەلثانی ١٣٣٩، گەیشتمە ناو شار. دوای گەیشتنی ئێمە، حاجی شێخ عەبدوللە ڕۆشتبووە ماڵی شەریف ئەلدەولە. منیش ڕاستەوخۆ ڕۆشتمە قەڵای حکومەتی و بەئامادەبوونی حاجی شێخ عەبدوڵڵە و کارگوزار و سەردار ئەعزەم و سالار موفەخەم و ئەعزەم ئەلدەولە، گفتوگۆمان کرد، وتم: بیر و ئەندێشەم لەهەموو ناوچەکان گەڕا و جگە لەدیداری تۆ، ئامەزرۆیی هیچی دیکە نەبوو. لەپێنجی مانگ هەواڵمان بەدەست گەیشت کەبەیانی ٣ ساڵی ١٣٣٩، لەتاران کودەتا دەستپێکردووە و سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، بەڕێوەبەری گۆڤاری ڕەعد، پێگەی سەرۆك وەزیرانی گرتۆتە دەست و زۆربەی پیاوماقووڵان و شازادەکان و گەورەکانی گرتووە و لەقەزاقخانە دەستبەسەری کردوون. هەروەها فەرمانی زیندانی کردنی زۆربەی فەرمانڕەواکانی لەویلایەتەکانداوە. شەریف ئەلدەولە ترسا و دەستی لەکارکێشایەوە. منیش بەهۆی پەیوەندییەکانم کە بەهۆی سەردار موحیی لەگەڵ سەیید زیائەلیم بووم، لە٢٢ مانگ، بروسکەیەکەم بۆ نارد. لەئێستادا کە چاکسازی و گەڕاندنەوەی نەزم و ئاسایشی کوردستان بەهۆی هەوڵەکانی شەریف ئەلدەولە گەشەی کردووە و دانیشتووان بەئاسوودەیی و لەئاسایشدا ژیان بەسەر دەبەن، داوا دەکەم بەدەست لەکارکێشانەوەی ئەو بەڕێزە ڕازی نەبن و جەخت بکەنەوە، دڵگەرمانە بۆ نەهێشتنی کەموکورییەکان و بەرقەرار کردنی سەقامگیر، سەرقاڵی فەرمانڕەوایەتی کوردستان بێت.

لە ٢٨ مانگ، بروسکەی بەردەوام بوونی شەریف ئەلدەولە گەیشت. وەڵامی منیشی دایەوە: بەڕێز شێخ محەممەدی پێشنوێژ و وتارخوێن، بروسکەی ئێوە بۆ بەردەوام بوونی فەرمانڕەوایەتی شەریف ئەلدەولە بووە هۆکاری شادومانی و خۆشحاڵی ئێمە. فەرمانی بەردەوام بوونی ئەوان دەرکرا و سپاسی خۆم بۆ نییەت پاکی و خێرخوازی ئێوە دەردەبڕم. (سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، سەرۆك وەزیران).

دواتر سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، پەیامی بۆ هەموو خەڵکانی ئێران نووسی و لەگۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بلاوی کردەوە. منیش لەبیستی ڕەجەب، وەڵامی ئەو پەیامەم نووسیوە و لەبەر ئەوەی هەردوو پەیامەکە لەڕۆژنامەکاندا چاپ و بلاو کراونەتەوە و نوسخەی لای هەمووان

دەستدەکەوێت، چیتر لێرەدا ئامارەیان پێنادەم. لەکۆتاییەکانی ڕەجەب، حەمیدەخانمی هاوسەرم کەکچی خوالێخۆشبوو سدیق دیوان بوو، کۆچی دوایی کرد. شەریف ئەلدەولە بۆ قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوو، لەکارگوزاری پرسیبوو: فلانەکەس خوازیاری کێیە تا خوازبێنی بۆ بکەین. کارگوزار وتبووی: گومان دەکەم دەخوازێت کچی حاجی مەلەکی بازرگان بێنێت. ڕۆژی ٦ شەوال، شەریف ئەلدەولە بێپرس کردن بەخۆم، سالار موفەخەم لەگەڵ خۆی دەبات و دەڕواتە ماڵی حاجی مەلەك و لەهەمان دانیشتن، خوازبێنی بەتول خاتوون کچی حاجی مەلەك دەکات و دەستی ماچ دەکات و لەوێوە منی لەڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ڕۆژی ١٠ شەوال، ڕێوڕەسمی مارەبڕین ئەنجامدرا، ڕۆژی هاتنی بووك، خودی شەریف ئەلدەولە، ڕێوڕەسمی بووك گواستنەوەی لەقەڵای حکومەتی ئامادە و شەربەت و شیرینی و خواردنێکی باشی ئامادە کرد. زۆربەی زاناکان و پیاوماقووڵانی بانگێشت کردبوو. دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، دەمەو ئێواریٚ، ڕۆشتینە ماڵی حاجی مەلەك، بووکمان لەسەر تەخت دانیشاند، بەڕێز کۆلۆنێل سالار نیزام لەگەڵ کاربەدەستان و لێپرسراوانی دەوڵەتی و کەسانی دیکە، پیادە لەبەردەم تەختی بووك ڕێگەیان بڕی تا گەشتینە ماڵ. شەریف ئەلدەولە هەموو خەرجییەکانی گرتە ئەستۆ و ڕێگەی نەدا یەك دینار خەرج بکەم. بەیانی شەوی بووکێنی، ئەم نامەی خوارەوەیان بۆ من نووسی:

بۆ بەڕێز شەریعەتمەدار، هاوسەری بەتول خاتوون، پێشنوێژ و وتارخوێنی کوردستان. ئەمڕۆ بەیانی، حەزرەتی والا شازادە ئیقباڵ ئەلسوڵتان، زیاتر لەهەموو کاتێك، شادومان و خۆشحاڵ لەئەیوان خۆی نیشاندا. پرسیم: چ هەواڵێکی تازەتان پێیە. وەڵامیان نەدایەوە. هەواڵی تازە جگە لەسەرکەوتنی ئیمام بۆ لەگرتنی قەڵای شارەکەدا نییە. دەستەیەك بوون، پێکەنیتن. منیش لەم سەرکەوتنەی ئیمام شادومان بوون.

لەبەر ئەوە دەرفەت نەبوو لەوکاتەدا هەستەکانی خۆم دەربڕم، لەئێستادا پێنوس بەدەستەوە دەگرم و بەهۆی ئەم نامەوە، پیرۆزبایی خۆم بۆ ئەو پێشەوا بەتوانایە دەردەبڕم و دڵنیام ئەو تۆخمە چالاکە کەهیچکات بۆ گرتنی قەڵا دژوارەکان ناتەوان نەبوون، بۆ گرتنی جەستەی نازەنینانیش بەتوانا و ڕووسپی دێنەدەر. هیوادارم ئەم کردەوە بویرانەی بەڕێزیان ببێتە هۆی هاتنەدنیای ئیمامزادەیەك بەناوی ئەحمەد و بەخۆشەویستی باوك و دایك گەورە ببێت. ئێستا کاتی ئەوەیە، ڕوو بکەمە هاوسەری ئێوە و بڵێم:

ئافەرین بۆ تۆ ئیمامی دلێر
بەتولت کردە نێچیری خارت
چوونکە زانایت و خاوەن بیروڕا
خۆش بژی لەژیان لەگەڵ دڵدارت
سلاّو لەتۆ بێت ئیمامی زانا
باش داگیرتکرد قەلاّکەی یارت
ئەگەر دەتەوێت لەتۆ ڕازی بم
وەرە باس بکە هەمو ئەسرارت
کەچی بوو لەگەڵ کچی پێغەمبەر
بەزەییت نەهات کار و کردارت
دەبێت تۆ شەیتان بخەیتە سەر چۆك
نەوەك فریشتە نەوەك نازدارت
بەلاّم دەزانم ڕووناکی نیگات
زنجیری کردووە دڵی دڵدارت
شەیتانکوژیت و گەورەی ئەنجومەن
لەگەڵ دڵدارت ئێمە خەمخوارت
هەمیشە لوتفی خودات لەگەڵ بێت
گەورەی ڕەسوڵان، پشت و پەنات بێت.

منیش ئەم هۆنراوەم لەوەلاّمدا نووسی و بۆم نارد:

سلاّویش لەتۆ ئەی خۆشنووس ئەمیر
شەریفی پیرۆز، گەورەی خاوەن بیر
ڕاستە بەتولم بەتیر نێچیر کرد
بەلاّم لەلای تۆ خۆم بوومە ئەسیر
گورزی ئەویندار لەجەستەی مەعشوق
بۆ شادکردنە نەوەك بۆ زویر
گەر ئازار گەشتووە بەکچی پێغەمبەر

تۆ بمانبوورە سەروەری ئەمیر
هێرشی ئیمام زۆر خوێناوییە
ئاگات لەخۆت بێت لێم مەبە دڵگیر
هەرکەس لوتفی تۆ پشتیوانی بێت
قەڵایەك دەگرێت بێدانی ئەسیر
قەڵا کاشییە، نەك دیواری چین
وا بەسانایی بۆم دەکرێت زنجیر
ئەگەر پێشدەکەوت، زۆر بوێرانە
پاشەکشێم دەکرد هەروەکو بەشیر
تا دنیا هەبێت دڵ سەرگەردانە
ئەویش وەك دنیا دڵ دەکات یەخسیر
هەمیشە لوتفی خودات لەگەڵ بێت
گەورەی ڕەسووڵان پشت و پەنات بێت.

ڕۆژی یەکشەممە ١١ زیقەعدەی ١٣٣٩، هاوکات لەگەڵ ٢٦ قرژاڵ، ئاسف ئەعزەم دانیشتووانی شاری کۆکردەوە و دژی شەریف ئەلدەولە شۆڕشی کرد. هەموویان لەمزگەوتی هاجەر خاتوون کۆبوونەوە و بۆ ماوەی دوو حەفتە لەوێ مانەوە. هەموو خەرجییەکانی چایی و خواردن و بروسکە و هتد.. لەئەستۆی خودی ئاسف بوو. دوای لابردنی لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان چەند ڕۆژێك مایەوە و ئێوارێی ڕۆژی پێنجشەممە، ٥ موحەرەمی ١٣٤٠، بەرەو تاران بەڕێکەوت. کاتێك دانیشتووانی شار لەمزگەوتی هاجەر خاتوون بوون، ڕۆژی یەك دوو جار سەردانم دەکردن. شەریف ئەلدەولە پەیامی ناردبوو: فلانەکەس بۆ پەیوەستی کەسانی ناو هاجەر خاتوون بووە، ئێمە فلانە و فیسارە کارمان بۆکرد. وەلامم بۆ نارد: ئەو دەڕوات و من دەمێنمەوە. ئەو ڕۆژانە تێپەڕی، هەرچیمان کرد، ئەم ڕۆژانە دەبێت بیر لەشتێکی دیکە بکەینەوە.

## حکومەتی میرزا یوسف خان قایمقامی تەبریزی

دوای لابردنی شەریف ئەلدەولە، ڕۆژی یەکشەممە ٧ سەفەری ١٣٤٠، میرزا یوسف خانی قایمقامی تەبریزی، وەك فەرمانڕەوا، هاتە کوردستان. ئەمیر مونتەخەب، وەك جێگری

حکومەت و فەرید سوڵتان وەك سەرۆکی کابینەی حکومەتی هاوڕێیەتیان دەکرد. بەیانی ڕۆژی هاتنی فەرمانڕەوا، ئاسفی ئەعزەم ڕۆشتە گوندی گردمیران و لەوێوە بەرەو تاران بەڕێکەوت. دوای لابردنی کۆلۆنێل سالار نیزام، کۆلۆنێل ئەکرەم نیزام، لەکوردستان دیاریکرا. حکومەتی قایمقای گرنگییەکی ئەوتۆی نییە. لەدەورانی حکومەتی ئەو، شتێك کەشیاوی ئاماژەدان بێت، ڕووینەدا. جگە لەشوێنکەوتنی عەلی ئاغای مەنسور نیزام بەلەتە خشت و دارکاری کردنی محەممەد ئەمین بەگی زەرغام لەشکر.

لەسەرەتاکانی ڕەبیع الثانی، یانی ڕۆژی چواردەوی کەوان، بروسکەیەك گەیشت کەڕەزاخان وەك وەزیری جەنگ و فەرماندەیی هەموو هێزە جەنگییەکانی ئێران دەستنیشان کراوە. چەند ڕۆژ دواتر هەواڵ گەیشت کەسەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، سەردار ڕەشیدی ئازاد کردووە و میرزا عەلی محەممەد خان، ئەندامی وەزارەتی ناوخۆی لەگەڵدا ناردووە تا بۆ ڕەوانسەر بگەڕێتەوە. لەگەڵ گەیشتنی بۆ ڕەوانسەر دەستدەکات بەنامە ناردن و دیاری ناردن بۆ سەرۆك عەشیرەکان و خراپە وتن لەڕەزاخانی وەزیری جەنگ. لەماوەیەکی کەمدا هەموو سەرۆك عەشیرەکانی سەر سنور لەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و پایەگا نیزامییەکانی ڕەوانسەر و دەوروبەری دەگرێت و چەکیان دەکات. بەم دووایانە، میستەر کاون، قونسوڵی ئینگلیس لەکرماشان، نیشتەجێی ئەو شارە دەڕواتە لای سەردار ڕەشید. سەردار لەسەر داوای ئەو، سیلاحەکان دەگەڕێنێتەوە.

### حکومەتی شازادە ئەسەدالله، میرزای شەهاب ئەلدەولە

دوای لابردنی قایمقام، شازادە ئەسەد الله میرزای شەهاب ئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا. ڕۆژی چوارشەممە ٢٨ شەعبانی ١٣٤٠ هاتە کوردستان. ئەکرەم نیزام، سەرۆکی هێزەکان، لەکارەکەی دوورخرایەوە و لەجێگەی ئەو سەرهەنگ ئەحمەدخانی مەنسور دەستنیشانکرا. چەند ڕۆژێك تێپەڕی. شازادەی فەرمانڕەوا بەمنی وت: ئەم شێوەی حوکمڕانییە، لای من پەسەند نییە کە من لەشاردا فەرمانڕەوا بم و لەسێ فەرسەنگی من، هەورامییەکان سەرقاڵی تالآنی و ئاژاوەنانەوە و ڕووتاندنی گوندەکان بن. ئەگەر دەکرێت، کارێك بکەن، ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ من نیشان بدەن تا شەرافەتی من لای دەوڵەت و میللەت پارێزراو بێت. لەگەڵ ئەوەی چەندین ساڵ بوو هەورامان لەکوردستان دابڕابوو و حکومەتی سەربەخۆی عەشیرەییان پێکەوەنا بوو کە بەهیچ جۆرێك گرنگییان

بەفەرمانڕەواکانی کوردستان نەدەدا، بەڵام چوونکە شازادە کەسێکی نەجیب و ڕاستکردار بوو، ئارەزووم دەکرد بەئەندازەی توانای خۆم، ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنم. لەبەر ئەمە نامەیەکی تێروتەسەلەم بۆ خانەکانی هەورامان نووسی کەئەم شازادە هاوشێوەی فەرمانڕەوا ستەمکارەکانی پێشوو نییە. پێویستە کەڵك لەبوونی وەربگرن و هەرچی زووتر سەردانی بکەن تا بەهۆیەوە، پەیوەندییەکان و ئازارەکانی ڕابردوو، سارێژ ببێت.

دوای چەند ڕۆژ، هەموو خانەکانی ڕەزاو لەگەڵ سوپا و تفەنگچییەکانی هەورامان بەڕێکەوتن و هاتنە گوندی نەوەرە. لەوێوە بەشیر ئەلئیسلامیان لەگەڵ کەرێك وەك دیاری بۆ حکومەت، ڕەوانەی شارکرد. هەروەها پەیامیان ناردبوو، ئێمە ناوێرین بێینە ناو شار، دەمانەوێت لەدەرەوەی شار چاومان بەفەرمانڕەوا بکەوێت. منیش بەشیر و کەرەکەم بردە لای شازادە. شازادەماڵەکەی لەبەرابەر فیردەوسی دیاریکردبوو. کەرەکەم لەحەوشی تالارەکە بەستەوە و بەشیرم بردە لای شازادە. دوای ئەوەی بەشیر گەشتە خزمەت شازادە و ئەحواڵپرسی کرا، لەناکاو دەنگی زەڕەی کەرەکە بەرز بوویەوە. حکومەت لەپێشخزمەتی پرسی: دەنگی کەرە لەکوێوە دێت؟ وتم: کەر نییە، گوێدرێژە، هاوڕێی بەشیر ئەلئیسلامە. لەهاتنی شەریف ئەلدەولە و بێبەشبوونی خۆی لەدیداری شازادە توڕە بووە و دەنگی بەرز کردۆتەوە و هەستەکانی خۆی دەردەبڕێت. دوای پێکەنینێکی زۆر و هێنانی کەرەکە، بڕیارماندا شازادە خێوەت و دامەزراوەی حکومەتی بۆ ئەمانیە بنێرێت. خانەکانیش لەئەمانیان چاویان بەشازادە کەوت.

بەیانی ئەو ڕۆژە کەهەینی ٩ زیقەعدەی ١٣٤٠ بوو، حکومەت لەگەڵ خێوەت و دامەزراوەی حکومەتی ڕۆشتە ئەمانیە، منیش لەگەڵ بەشیر تا کەمیز بۆ پێشوازی کردنی خانەکان ڕۆشتم و لەوێوە بەرەو ئەمانیە گەڕاینەوە. خانەکان لەئەمانییە چاویان بەشازادە کەوت و دوای خواردنی چایی و شیرینی، ڕۆشتنە خێوەتێکی تایبەت و حەوانەوە. ویستم بۆ نوێژ بگەڕێمەوە بۆ شار و ئێواریێ بگەڕێمەوە. خانەکان ترسان و بەجیددی وتیان: ئەگەر ئێوە بڕۆن، ئێمەیش دەڕۆین. گومانیان دەکرد، پلانێکمان داناوە و بوونی من ڕێگر دەبێت لەجێبەجێ کردنی پیلانەکە. ناچار لەوێ مامەوە تا نانی نیوەڕۆیان هێنا. پێشخزمەت هات و وتی کەس لەخانەکان دەست بۆ خواردنەکە نابات و دەڵێن تا فلانەکەس نەیێت و لەم خواردنە نەخوات، ئێمە لێی ناخۆین. ناچار شازادەم بەجێهێشت و ڕۆشتمە خێوەتی

خانەکان و لەوێ نانمان خوارد. دوای ئەوەی چەند پاروێکم خوارد، خانەکانیش دەستیان بەخواردن کرد.

دوای نان خواردن، دوو وێنە، یەکێك لەخانەکان و ئەوی دیکەیان لەخانەکان و تفەنگچییەکان گیرا و مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدرا. شازادە زیاد لەڕادە لەهاتنی ئەوان شادومان بوو. دوای ماوەیەك هەواڵ گەیشت کەسەردار ڕەشید دەخوازێت بەرەو کوردستان بێت تا منوەرخاتوون کچی ئەعزەم خان کەمارەبڕاوی غولام حسەینی برازایەتی، لەگەڵ خۆی ببات. هەورامییەکانیش هاتبوونە شار تا تەلعەت خاتوون کچی شێخ عارف کەمارەبڕاوی حسەین خانی ڕەشید ئەلمولك بوو، لەگەڵ خۆیان ببەن. منیش بەرەو گوندی تەنگسیر دەڕۆشتم. لەهەمان ڕۆژ کەهەورامییەکان کچی شێخ عارفیان برد، منیش بەرەو تەنگسیر بەڕێکەوتم.

ڕۆژی دواتر سەردار ڕەشید لەگەڵ دوو هەزار سواری جوانڕۆیی و ڕەوانسەری و سەنجابی هاتە شار. سوارەکان بەفەرمانی خۆی، لەدەرەوەی شار، سەرقاڵی تالآنکردن دەبن و تەقە لەشار دەکەن. گووللە بەر دەرگاو دیوار دەکەوێت و دانیشتووانی شارەکە دەتۆقن. ئەو کەسەی خواوەند مەبەستی لەناوبردنی بکات، بۆ ئەنجامدانی کاری خراپە ڕێنوێنی دەکات. ئەم کردەوە لەلاناو عەشایر زیاد لەڕادە ناپەسەندە کەکەسانی بنەماڵەی زاوا لەبەرچاوی بنەماڵەی بووك خۆیان بنوێنن و هەرکات ئەم کردەوە لەبنەماڵەی زاوا ببینرێت، بنەماڵەی بووك پێی ڕازی نابن و شەڕ و ئاژاوە ڕوودەکات و شادی و خۆشی بۆ پرسە و سەرەخۆشی دەگۆڕێت.

سەردار دوای ئەم کارە لەچیمەنی شەرەف ئەلمولك دادەبەزێت و خێوەتی بۆ هەڵدەدەن. سوارەکانی لەزەفەرییە و ماڵەکانی دەوروبەر نیشتەجێ دەبن. شازادە و پیاوماقووڵانی شار بۆ بینینی دەڕۆن بەڵام بێڕێزی بەوانیش دەکات. ڕەزاخانی وەزیری جەنگ کە بەهۆی چەکداماڵینی پایەگا نیزامییەکان و چەندین کردەوەی دیکەی سەردار، بێزار و تووڕە ببوو، عەلی ئەکبەر خانی سەردار لەزیندان ئازاد دەکات و فەرمانی پێدەدات بەزیندوویی یا کوژراوی سەردار ڕەشید بگرێت. ئەم هەواڵە لەچیمەنی شەرەف ئەلمولك بەنهێنی بەسەردار دەگات، دەترسێت و بەخێرایی فەرمان دەدات بووك هەڵبگرن و بڕۆن. شەهاب ئەلدەولەیش وەزارەتی جەنگ لەکردەوەکانی ئەو ئاگادار دەکاتەوە. وەزیری جەنگ فەرمان بۆ ئەمیر

لەشکر ئەحمەد ئاغا خان لەکرماشان دەدات کەکۆتایی بەکردەوە خراپەکانی سەردار بهێنێت. عەلی ئەکبەر خانیش کە بۆناو سەنجابییەکان دەگەڕێتەوە، دەبینێت هەمووان بەتەواوی بوونەتە شوێنکەوتەی سەردار ڕەشید و هیچ جێگەیەك بۆ ئەو نەماوەتەوە، ناچار لەڕێگەی ئاشتییەوە دەستپێدەکات تا بتوانێت لەم ڕێگەوە شتێك بۆ ئەوەی بتوانێت فەرمانەکانی وەزارەتی جەنگ ئەنجام بدات کەهەمیشە ئارەزووی دەکرد. سەرەتا پەیوەندییەکانی نێوان جەعفەر سوڵتان و سەرداری شێواند و ناچاری کرد سوپایەکی پێکهاتوو لەشەش هەزار سوار و پیادە دژی جەعفەر سوڵتان ڕەوانە بکات. سەرداری موقتەدریش لەگەڵ سەنجابییەکان پەیوەستی ئەم سوپایە بوو و لەئەنجامی ئەم کارە، دووبارە دەسەڵاتی بەسەر سەنجابییەکاندا سەپاند. جەعفەر سوڵتانیش لەگەڵ چوار هەزار سوپایی، ڕووبەڕووی ئەم سوپایە بوویەوە. لەدەوروبەری سەریاس و شمشێر، جەنگ لەنێوان ئەم دوو سوپایە ڕوویدا. سوپای ڕەوانسەری سەنجابی دوای زەرەر و زیانێکی زۆر شکستیان خوارد. بەڵام نزیکبوونەوەی سەردار موقتەدر لەسەردار ڕەشید، گومانی لای وەزارەتی جەنگ دروستکرد و سەرئەنجام ئەمیر لەشکر بەفەرمانی وەزارەتی جەنگ، ئەو بۆ کرماشان بانگدەکات و دەیگرێت.

هاوکات لەگەڵ ئەم ڕۆژانە، سەرهەنگ مەحمودخان، فەرماندەی بانە بەمەبەستی بەرژەوەندی خۆی، گوشار دەخاتە سەر فەرەج اللەخانی بانەیی. فەرەج الله خان توانای خۆڕاگری نابێت و ڕێگەی هەڵاتن دەگرێتەبەر. دوای ڕاکردنی فەرەج الله خان، دوو منداڵی بێ تاوان بەناوەکانی قادرخان یانزە ساڵە و عەبدوڵڵەخان، نۆ ساڵە، دەگرێت و ڕەوانەی خوڕەم ئابادیان دەکات. کاتێك ئەم هەواڵەم بەدەست گەیشت، بەخێرایی حکومەتم لێ ئاگادار کردەوە. پێکەوە بروسکەمان بۆ ئیمارەت لەشکر نارد کەئەم کارە لەکوردستان دەنگدانەوەیەکی باشی نابێت. پێویستە بەخێرایی کوڕەکانی فەرەج اللەخان بگەڕێننەوە. ئیمارەت لەشکر هەردوو کوڕەکەی گەڕاندەوە و ڕۆژی ٢ موحەڕەمی ساڵی ١٣٤١ تەسلیم بەمن کران. سەرهەنگ مەحمودخان لەئەنجامی ئەم هەڵەیە لەفەرمانڕەوایەتی بانە دوورخرایەوە. منیش بۆ قەرەبوو کردنەوەی چاکییەکانی ئەمیر لەشکر نامەیەکم بۆ فەرەج خان نووسی و خۆی هاتە سنە و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ حکومەت نیشاندا و دوای چەند ڕۆژ کوڕەکانیمان گەڕاندەوە و بەخۆشحاڵییەوە بۆ بانە گەڕایەوە و سەرئەنجام لەڕێگەی

خزمەت کردن بەدەوڵەت کوژرا.

لەمانگی رەبیع الاوەلی ساڵی ١٣٤١، کەهاوکات بوو لەگەڵ بورجی دووپشك، چەندین بروسکە بەنهێنی لەلایەن ئاغا محەممەد خان، بەحکومەت و سەرۆکایەتی سوپا، بەمن گەیشت کەسەردار رەشید خراپ کەڵکی لەمیهرەبانییەکانی دەوڵەت وەرگرتووە و سەرقاڵی کۆکردنەوەی سوپا و ترساندن و تۆقاندنی هێزەکانی دەوڵەتە. لەبەر ئەمە دەوڵەت بڕیاریداوە لەکردەوە وەحشیانەکانی ئەو ڕێگری بکات.، هەرکات فلأنەکەس بۆ گەیشتن بەم مەبەستە هاوکاری دەوڵەت بکات، جگە لەوەی چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ سوپاییەکاندا کردووە، هەلێکی باشیش بۆ خۆی دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی پێگە بەرزەکانی دیکە بەدەست بێنێت. منیش لەبەر ئارەزوومەندیم بۆ ئاسایش وئارامی کوردستان لەناخەوە حەزم دەکرد هاوکاری دەوڵەت بکەم، جیاواز لەوە لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی سەردار لەگەڵ جەعفەر سوڵتان، لەبەر ئەوەی نامەیەکم بۆ سەرکۆنە کردنی سەردار نووسیبوو، بەمشێوەیە وەڵامی دابوومەوە: سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵات جیاوازە لەئایین و عیرفان، سیاسەت بەپێویستی دەزانی من دێوەکەی لهۆن لەناو ببەم. لەگەڵ ئەوەی ڕۆشت و شکستی خوارد، بەڵام دەمویست بەپێی پێویست ئەو لەدەرئەنجامەکانی کارەکەی ئاگادار بکەمەوە. لەبەر ئەمە لەسەرەتاکانی رەبیع الاوەلی ١٣٤١ کەبەفرێکی زۆر باریبوو، بەمۆڵەت وەرگرتن لەحکومەت و سەرۆکی سوپا، بەڕێکەوتم. سەرەتا ڕۆشتمە گوندی ڕەزاو، لەهەموو خانەکانی ئەوێ، سوێندم وەرگرت کە لەکاتی بەڕێکەوتنی سوپای دەوڵەتی بەرەو ڕەوانسەر، خانەکانی ڕەزاو بەهەموو هێزی خۆیانەوە پەیوەستی سوپای دەوڵەتی ببن. لەوێوە ڕۆشتمە قەڵاگە و لەمحەممەد سالح سوڵتان و عەبدوللەبەگی سەرهەنگیش، سوێندی وەفاداری و هاوکاریم وەرگرت. لەوێوە ڕۆشتمە درڵی و سوێند و پەیمانم لەمەحمودخانیش وەرگرت کەبەهیچ جۆرێك هاوکاری سەردار نەکات و بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەوڵەت ئامادە بێت. لەوێوە ڕۆشتمە خزمەت شێخ حسام ئەلدین. لەگوڵعەنبەر چاوم بەشێخ کەوت و ئەویشم ئامادە کرد. لەوێوە ڕوومکردە نەوسودی پایتەختی لهۆن. جەعفەر سوڵتانیش سوێندی خوارد لەگەڵ هەموو هێزەکانی دژی سەردار بجەنگێت. لەوێوە عینابەت الله بەگی ئیفتخار سوڵتانم وەك نوێنەر بۆ جوانڕۆ و لای عەشیرەی قوبادی و باباجانی و وەلەدبەیگی و ئیناخی و گۆران نارد. هەموویانی یەکخست و سوێند و بەڵێنی لەهەموویان وەرگرت کە لەکاتی

بەڕێکەوتنی سوپای دەوڵەتی، جێبەجێکاری فەرمانی ئەمیر لەشکر، دژی سەردار ڕەشید بجەنگن. دوای ئەنجامی ئەم کەین و بەینە و وەرگرتنی پەیمان و سوێند لەعەشیرەکان وگەمارۆدانی ڕۆحی سەردار ڕەشید، لەناو بەفر و سەرما گەڕامەوە. مەنزڵی یەکەم هاتمە نودشە. ئەحمەد بەگی کوڕی جەعفەر سوڵتان لەوێ بوو. دوای خواردنی چایی و قاوەڵتی بەرەو هەجیج بەڕێکەوتم. کاتێك لەگەردەنەوە بەرەو ئاوایی هەجیج شۆڕبوومەوە، بەفربارین دەستی پێکرد. کاتێك گەیشتمە ناو گوندەکە، ڕوومکردە ماڵی قازی. چۆنیەتی ماڵەکانی هەورامان بەگشتی بەشێوەیەکە سەربانی ئەم ماڵ دەبێتە حەوشی ماڵی سەرووی خۆی. بەفر لەسەر سەربان و بەردەم ماڵی قازی دەنیشت، بەشی باکور کەنزیك چیاکە بوو، سپیپۆش ببوو، بەڵام بەشی ڕووبار کەبەفر بەهۆی هەوالی دۆڵەکە دەبوو بەئاو، ڕەش بوو. لەبینینی ئەو دیمەنە، ئەوەم بیرکەوتەوە کەبووك بەخەسووی خۆی وتبوو: لەکاتێکدا لەلایەکی سەربان کچەکەی لەگەڵ زاواکەی خەتووە و لەلایەکی دیکە، کوڕەکەی لەگەڵ بووکەکەی. نیوە شەو خەسوو دەڕواتە لای کچەکەی و زاواکەی و دەڵێت، جوان باوەش بەیەکدا بکەن بۆ ئەوەی سەرماتان نەبێت. دواتر دێتە لای کوڕەکەی و بووکەکەی و دەڵێت، باوەش بەیەکا مەکەن، با لەگەرمادا نەخنکێن. بووك لەم جیاوازییە توڕە دەبێت و دەڵێت.

دەبم بەقوربانی خوا
یەك بانە بەس دوو هەوا
لەمسەر بم گەرمام دەبێ
لەوسەر بم سەرمام دەبێ

بەدڵنیاییەوە بووك ئەگەر بارودۆخی هەجیبی دەبینی، لەبەرابەر قسەکانی خەسووی هیچی نەدەوت و ڕەخنەی نەدەگرت. بۆ بەیانی لەهەجیج بەڕێکەوتم. نزیکەی بیست کەسی هەجیجی هاتن و کەلوپەلەکانی ئێمەیان لەڕێگەیەکی زۆر دژوار و مەترسیدارەوە برد. دواتر لەئاشی بل نزیك بووینەوە، لەوێ تاشەبەردێکی گەورە بەدرێژی پێنج شەش زەرع تا لێواری ڕووبارەکە لەسەر ڕێگەکەیە و ئەگەر پێی ڕەشەولاغ یا مرۆڤ بخلیسکێت، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ناو ڕووبارەکە کە بەڕووباری سیروان ناسراوە. بەخێرایی هەجیجییەکان ڕۆشتن و لم و زیخی نەرمیان هێنا و لەسەر تاشەبەردەکە بڵاویان کردەوە و بەمشێوەیە توانیمان بەسلامەتی بپەڕینەوە. دواتر بەماوەیەکی کەم گەشتینە پردی مەلا کەدوو شاتیری گەورەیان

بەدرێژی بیست و چوار زەع لەسەر ڕووباری سیروان داناوە و دواتر لەبەینی تیرەکان بەردیان داناوە و دەبێت مرۆڤ و ئاژەڵەکان لەم ڕێگەوە بپەڕنەوە. ئەسپەکان لەبەر ئەوەی عادەتیان گرتووە، بێ ترس دەپەڕنەوە، بەڵام مرۆڤی ناشارەزا بەدژواری لەو ڕێگەیە دەپەڕێتەوە و زۆر جار ڕوویداوە ئاژەڵێك ڕەمی کردووە یا مرۆڤ تووشی سەرگێژە هاتووە و کەوتۆتە خوار و بەرەو دیجلەی عێراق ڕۆشتووە. بەهەزاران ترس و لەرز لەو گێژاوە مەترسیدارەیش گوزەرمان کرد وگەشتینە ئەسپەریز. خانەکانی ئەو ناوچەیە بەئەنقەست ئەم لەمپەرانەیان دروستکردووە چوونکە لەکاتی تەنگانە و جەنگ، یەك تفەنگچی دەتوانێت لەم شوێنەدا بەر بەسوپایەکی گەورە بگرێت.

لەئەسپریز دوبارە بەفرێکی قورس باری. کلۆ بەفرە گەورەکان لەئاسمان دەهاتنەخوار بەڵام چوونکە هەوا ئارام و فێنك بوو کاتێك دەگەیشتنە سەر زەوی، بەشێکی زۆری دەبوو بەئاو. ئەگەر لەهەوای سارد ئەم بەفرە دەباری، لەماوەی کاتژمێرێك زیاتر لەزەرعێك دەباری. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەماوەیەکی کەمدا زەوی سپیپۆش بوو، سەوزە و ڕێحانەی بەمەخمەڵی سپی داپۆشی و جلوبەرگی ڕۆحانییەکانی کردە بەر دارە کۆنە و بەتەمەنەکان. نەمامەکان کفنپۆشن و ڕووەکەکان هەمووان یەك جلوبەرگیان بەبەردا کرا. سەرئەنجام دەشت و چیا سپیپۆش و سەرزەوی لەلایەن سوپای بەفری سپی، دەستی بەسەردا گیرا و هیچ جیاوازییەك لەنێوان باش و خراپ نەمایەوە و جوان و ناشیرین هەمووان لەژێر خێوەتێکی سپی خۆیان شاردەوە.

دارەکانی جەنگەڵ لەکلۆکانی بەفر و دڵۆپی لقەکانی خۆیان، پێشوازییان لەڕێبواران دەکرد و کەو و قومری و چۆلەکەکان، گۆرانی تەندروستی ئێمە کە لەو گێژاوە مەترسیدارە ڕزگارمان ببوو دەخوێند و بەهۆی شۆڕبوونەوەی ئاوی بەفر وباران لەسەر تاشەبەردەکان کەهاوشێوەی دیوار لەچەپ و ڕاستی ڕووبارەکە کەڵەکە ببوون، پارچەکانی خەت خەتی ڕێگە یا حەریری کۆڵکەزێڕینە وەك ڕاخەری ژێر پێی ڕێبواران ڕاخرابوو. چۆلەکە و قەنارییەکان، لەسەر و ژێری بەردەکان و لەسەر گژوگیا، بەخۆشحاڵییەوە دەیانجریواند و قەلەڕەشەکانیش لەسەر دارەکان و چیاکان، قاقا پێدەکەنین ولەم نمایشەی سروشت و لەم دەسەڵاتە کەدەستی خواوەندی ئامادەی کردبوو، سەرسوڕمانی خۆیان نیشاندەدا.

بەکورتی، لەناو شەپۆلی ئەم لەمپەرە سروشتییانە، هێواش هێواش درێژەمان بەڕێگەدا تا

گەشتینە گەرووێکی مەترسیدار بەناوی دەمگا. دوای خوێندنی ئایەت ئەلکورسی و دۆعای حزب البر، ڕۆشتینە ناو گەرووەکە، بەفریش بۆ تەواو کردنی کەموکوڕییەکان بەقورسی هەرچی زیاتر دەباری کەهاوڕێیان لەدووریەکی کەم، یەکتریان بۆ نەدەدۆزرایەوە. سەرئەنجام بەزەحمەتی زۆر، لەو گەروە گوەزەرمان کرد و گەشتینە شوێنێك کەچەند بنەماڵەیەك لەوێ نیشتەجێبوون و گوندێکیان دروستکردبوو بەناوی کۆلێژ. بەناچاری شەو لەکۆلێژ ماینەوە و بەیانی بەڕێکەوتین. ڕۆژی ١٨ جومادی الاوەل گەشتینە شار. لەگەڵ گەیشتنم، هەموو سوێند و پەیماننامەکان کە لەسەرۆك عەشیرەتەکانم وەرگرتبوو، تەسلیم بەحکومەت و سەرۆکی سوپا کرد و بەهۆی بروسکەوە، تاران و خوڕەم ئابادیان لێ ئاگادار کردەوە. لەلایەن سەرۆکایەتی وەزیران و سەرۆکایەتی هەموو هێزەکان، ڕەزاخان، و لەریەن ئیمارەت لەشکری ڕۆژئاوا ئەحمەد ئاغاخان، بروسکەی سپاس و دەسخۆشی کردنم بەدەست گەیشت. لەم مانگەدا، جومادی الاوەل، بەڕێزان محەممەد خانی وەکیل و میرزا فەرەج اللەخان سەرداری موعەزەم و حاجی ئەسەد الله خان وەك وەکیلیەکانی دەورەی پێنجەمی مەجلیس بەرەو تاران بەڕێکەوتن.

ڕۆژی ٢٥ جومادی ئەلثانی، هەواڵی مەرگی مەلا عەبدولجەوادی شێخولئیسلام گەیشتە کوردستان کە بەهۆی پەرێشانییەوە بەرو کرماشان کۆچی کردبوو. لەوێ زەردوییەکان هەموو ئامادەکارییەکانی کفن و دفنیان ئەنجامدابوو و بنەماڵەکەیان بۆ کوردستان گەڕاندەوە. ئەم بابەتە بۆ سەرپەرشتەکانی کوردستان وەك پەڵەیەکی نەنگین مایەوە کە تا ئەو ڕادەیە بێ توانا و بێ غیرەت بوون کەنەیانتوانی بژێوی پێشەوایەکی خۆیان دابین بکەن تا سەرئەنجام ئاوارەی کرماشان بوو و لەغەریبیدا سەری نایەوە.

لەسەرەتای شەوال، هەواڵی گەڕانەوەی میرزا عەلی نەقی خان ئاسفی ئەعزەم لەتارانەوە گەیشتە کوردستان. میرزا عەلی خانی ئیعتیزاد ئەلدەولە داوای کرد ڕێوڕەسمێکی ڕێزگرتن و پێشوازی کردنی بۆ ئامادە بکەین. من حەزم نەدەکرد ئەو کارە بکەم بەڵام چوونکە چەندینجار تاقیکرابوویەوە و بەپێچەوانەی دوو براکەی، کەسێکی لەخۆبایی و خراپەکار بوو و بەردەوام بەختەوەری خۆی لەبەدبەختی کەسانی دیکەدا دەبینی و خوازیاری شێواندنی ئاسایش و ئارامی کۆمەڵگا بوو. لەبەر ئەمە ڕێزگرتن لەکەسێکی لەم چەشنە، دوور لەویژدان و بنەماکانی مرۆڤایەتی.

لەگەڵ ئەمەیشدا چوونکە ئیعتیزاد ئەلدەولە پێداگری کرد، لەبەر داواکەی ئەو، ڕۆژی هەشتی شەوال کاتێك ئاسفی ئەعزەم هاتە سنە،، هەموو زاناکان و پیاوماقووڵان و بازاڕیی و بازرگانەکانم بۆ عەسر بۆ ماڵی ئەو بەڕێزە بانگێشتکرد. پێشوەخت خۆم و کارگوزار ڕۆشتین و هەموو ئامادەکارییەکمان بۆ میوانداری میوانەکان ئامادە کرد. دوای هاتنی، بەجۆرێك هەڵسوکەوتی کرد کەمن هیچ، بەڵکو ئیعتیزاد ئەلدەولەیش لەداواکەی خۆی پەشیمان بوویەوە.

لە١٨ شەوالی ١٣٤١ کەهاوکات لەگەڵ دووەم مانگی بەهار بوو، بەپێی فەرمانی ئیمارەت، لەشکری ڕۆژئاوای کوردستان بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ ئەحمەدخانی مەنسور بەرەو ڕەوانسەر بەڕێکەوت. عەباس خانی ئەمیر لەگەڵ هێزەکانی کەلهوڕ وبەهرام بەگ سەرداری ئەکرەم لەگەڵ هێزەکانی وەلەدبەیگ و وەکیلی جوانڕۆ و سەرۆك عەشیرەکانی سەرسنور، هەرکام لەگەڵ سوپاکەی خۆیان بەڕێکەوتن. ئەمیر لەشکریش لەگەڵ سوپای کرماشان، ڕێگەی ڕەوانسەری گرتەبەر. لەگەڵ گەیشتنی سەردار ئەکرەم و هێزی جوانڕۆ بەڕەوانسەر، دوای جەنگێکی کەم، سەردار ڕەشید ڕەوانسەر بەجێدێڵێت و لەگەڵ خزمەتکارەکان و بنەماڵەکەی بۆ چالاوەی شاهۆ و لەوێوە پەنا بۆ ڕەزاو دەبات. جەعفەر سوڵتان چاوەڕوانی ڕەزاوییەکان دەبێت و دواتر پەیوەستی سوپاکە دەبێت لەبەر ئەمە لەلایەن ئەمیر لەشکرەوە گرنگی پێنادرێت. ئەمیر لەشکر، سەرهەنگ گیگوخان لەڕەوانسەر بەجێدێڵێت و عەلی بەگ و کوڕەکانی دیکەی حاجی ئاغا دەگرێت. کاتێك ئەم هەواڵەم بەدەست گەیشت، نامەیەکم وەك تکا کردن بۆ ئەمیر نووسی. ئەمیر ئەوانی ئازاد کرد و خۆی بۆ کرماشان گەڕایەوە. سەرهەنگ ئەحمەدخان ڕۆژی ٢٦ شەوال بۆ شار گەڕایەوە سەردار ڕەشید ماوەیەك لەڕەزاو دەمێنێتەوە و دواتر بەمەبەستی کۆکردنەوەی هێز دەڕواتە مەریوان و لەوێوە دەڕواتە پیران بۆ لای مەلیك مەحمود. کەس هاوکاری ناکات چوونکە هەمووان بەڵێنیاندابوو هاوکاری نەکەن. ڕۆژی ١١ سەفەری ١٣٤٢، نامەیەکی لەسەردار ڕەشیدم بەدەست گەیشت کەپەشیمانی خۆی لەڕابردوو دەربڕیبوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئاماژەی بەوەدا بوو ئایا بەباشی دەزانم تەسلیم بەدەوڵەت ببێت یا نە؟ وەڵامم دایەوە: گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی دەوڵەت پێویستی بەهیچ شتێك نییە، هەرکەس ڕێگەی هەڵاتن بگرێتەبەر.، دەبێتە باربەری دێوە بیابانییەکان. چەند ڕۆژ دواتر هەواڵ هات کەبەهۆی سەرهەنگ گیگوخان ڕۆشتۆتە هەمەدان بۆ خزمەتی ئەمیر لەشکر و

ئەمیر ئەوی ڕەوانەی تاران کردووە. لەمناوەدا هەواڵ هات کە لەمەجلیس لەنێوان بەڕێزان مۆتەمن ئەلمولك، سەرۆکی مەجلیس و وەزیری جەنگ ڕەزاخان، گرژی هاتۆتە ئاراوە و وەزیری جەنگ بەمەبەستی دەربڕینی نارەزایەتی ڕۆشتۆتە شەمران. لەسەر بنەمای ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ وەزیری جەنگ بووم و دڵنیا بووم لەوەی تەنیا کەسە بتوانێت وڵات لەم بەدبەختییە ڕزگار بکات، ئەم بروسکەم بۆ بەڕێز مۆتەمن ئەلدەولە نارد:

لەکوردستانەوە بۆ تاران، ٢٨ تەرازوو، بۆ بەڕێز ئەشرەف ئاغای مۆتەمن ئەلمولك، سەرۆکی ڕێزداری مەجلیس، ئەگەر ڕێز لەکەسە دیارەکانی ئێران دەگیرا و پیاوە بەتواناو ناودارەکانمان نەدەڕەنجاند، تا ئەم ڕادەیە گرفتاری نەخۆشی کەمی پیاوە بەتواناکان نەدەبووین. لەئێستادا بەڕێز ڕەزاخانی وەزیری جەنگ، قۆڵی لێهەڵکردووە و بوێرانە ئارامی بۆ سەرانسەری وڵات گەڕاندۆتەوە و کۆتایی بەقۆناغی خان خانی و پاشایەتی تیرە و عەشیرەکان هێناوە. شیاو نییە لەجیاتی ڕێزگرتن لەو بەڕێزە، بێهیوا و دڵساردی بکەن. بەهەمان ئەندازە کە بۆ نووسینی یاساکان و نەزمی پارلمان پێویستمان بەکەسانی شیاوە، بۆ جێبەجێ کردنی یاسا و گەڕاندنەوەی نەزم پێویستمان بەکەسانی بوێر و بەتوانایە تا ئاسایش لەسەراسەری ناوچەکانی وڵات سەقامگیر بکات. بەتایبەت ئێمە دانیشتووانی کوردستان و سەر سنور، شیاوی و تواناکانی وەزیری جەنگ باشتر دەزانین چوونکە چەندین ساڵە گرفتاری ئاژاوە و فیتنەین و ماوەیەکە بەهۆی چالاکی و کردەوە بوێرانەکانی ئەو، لەئاسایش و ئەماندایین. بێ قەرارانە چاوەڕوانین هۆکارەکانی ئاشتکردنەوە و دڵگەرم کردنی ئەو بەڕێز دابین بکرێت. بەڕەوای مەزانن دووبارە ئێران گرفتاری ئاژاوە و شۆڕش بێت.
(محەممەدی مەردۆخ)

وەڵام لەتارانەوە بۆ کوردستان، لەبەرواری ٢ دووپشك ١٣٠٢

بەڕێزی شەریعەتمەدار، پێشنوێژ و وتار خوێنی کوردستان، بروسکەی ژمارە ٥٧ ئێوە بۆ نیشاندانی نیگەرانیتان سەبارەت بەهەندێ ماددەی یاسایی و ئەو گفتوگۆیانەی لەئارادا بووە، بەڕوونکردنەوەکانی وەزیری جەنگ، بەخواستی خوا، چیتر لەئارادا نییە و مەجلیس ڕێز لەخزمەتەکانی ئەوان دەگرێت. (سەرۆکی مەجلیسی شۆرای نیشتمانی.( مۆتەمن لەئمولك)

شەوی سێشەممە ٢٦ ڕەبیع الاوەلی ١٣٤٢، مەلاعەبدوڵڵەی دەشتی مرد. ڕۆژی چوارشەممە

٩ جومادی الاوەل، شێخ نەجم ئەلدینی حوجەت ئەلئیسلام مرد. لەناوەڕاستی ڕەجەب، هەواڵمان بەدەست گەیشت کە لەتاران باسی کۆماری هاتۆتە ئاراوە. ڕۆژی ٢٨ ڕەجەب بەپێی فەرمانی بەرپرسە باڵاکان، کۆمیتەی نێهزەتی نیشتمانیم لەم بەڕێزانە پێکهێنا:

١. بەڕێز شوجاع لەشکر، نوێنەری ئەردەڵان، ٢. بەڕێز ئەمجەد ئەلئەشرەف، نوێنەری سەییدەکان، ٣. بەڕێز حاجی ئیعتیزاد ئەلئیسلام، نوێنەری شێخەکان، ٤. بەڕێز حاجی قەوامی توجار، نوێنەری بازارییەکان، ٥. بەڕێز حاجی خان، نوێنەری خاوەن زەوییەکان، ٦. بەڕێز محەممەد شەریفی زەهتاب، نوێنەری سەندیکاکان و مسکێنەکان، ٧. بەڕێز میرزا ئیستێپان، نوێنەری کاتۆلیکەکان، ٨. بەڕێز دوکتۆ ئاغا برا، نوێنەری کەلیمییەکان.

ئەم هەشت کەسە بەسەرۆکایەتی خۆم، دژی سەڵتەنەتی قاجار، پەیمانمان بەست و چالاکی و ناردنی بروسکەمان دەستپێکرد. لەم ناوەدا هەواڵمان پێگەیشت کە لەڕۆژی شۆڕشەکەی تاران، سەردار ڕەشید لەتاران هەڵاتووە و لەماوەی دوو ڕۆژدا خۆی گەیاندۆتە کرماشان و لەوێوە بەرەو ڕەوانسەر بەڕێکەوتووە و دووبارە شوێن ئارەزووەکانی خۆی کەوتووە. لەسەرۆك عەشیرەتەکان جگە لەمحەممەد ڕەشید بەگی کوڕی جەعفەر سوڵتان، کەس بەڵێنی هاوکاری پێنادات.

له ١٩ ڕەمەزانی ١٣٤٢، بروسکەیەك لەئیمارەت لەشکر بەم ناوەڕۆکە گەیشت:

بۆ بەڕێز ئایەت الله، بەمەبەستی بەدواداچوونی هەوڵەکانی ساڵی پار، بەفەرمانی دەربار و پاشا، لەئێستادا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە هەوڵەکانتان دەخەنەگەڕ. هەڵبەت زەحمەتەکانی ئێوە لای کاربەدەستەکان لەبیر ناکرێت. ئەمیر لەشکری ڕۆژئاوا.

فەرمانی بەفەرمانڕەوادا بوو دووبارە من بەرەو هەورامان و لهۆن بڕۆم و بەڵێننامەکەی ساڵی پار دژی سەردار ڕەشید زیندوو بکەمەوە. لەبەر ئەوەی ڕۆشتنی من پێویستی نەدەکرد، نوێنەرێکی تایبەتم نارد. لەماوەی دوانزە ڕۆژ ئەم بەڵێننامە مۆرکراوەی لەهەموو خان و سەرۆکەکانی هەورامان وەرگرت و گەڕایەوە:

### پەیماننامەی عەشایەر

لەبەرواری ٢٤ ڕەمەزانی ساڵی ١٣٤٢، ئێمە کەئەم وەرەقەی خوارەوەمان مۆر و واژۆ کردووە، بەئیمان و شەرافەتی مەزهەبی و هەموو پیرۆزییەکانی جیهان، سوێند بەقورئان دەخۆین و بەڵێن دەدەین وپەیمان دەبەستین تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بین لەگەڵ عەباس خان سەرداری

ڕەشیدی ئەردەڵان پەیوەندی دۆستایەتی بەرقەرار نەکەین و بەهیچ جۆرێك هاوڕێیەتی و هاوکاری نەکەین و ئەگەر لەئەنجامی شوێنکەوتنی سوپای دەوڵەتی پەنا بۆ سنوورەکانی ئێمە بێنێت، قۆڵبەست و تەسلیم بەدەوڵەتی بکەین. بۆ گەمارۆدانی سەردار ئەگەر لەکرماشانەوە هێزی عەشایەری بێت، ئێمەش لەسنوری خۆمان بۆ سەرکوتکردنی ناوبراو ئامادەین بەفەرمانی دەوڵەت کۆتایی بەیاخیگەری و کردەوەکانی دژی دەوڵەت بێنین. جیاواز لەوە تا ئەو کاتەی کاربەدەستانی ئێران بەشێوەیەکی شیاو و گونجاو هەڵسوکەوت لەگەڵ ئێمە دەکەن، ئێمەیش بەهەموو هێزی خۆمان بۆ ئەنجامدانی فەرمانە پیرۆزەکانی دەوڵەت، بەبەخشینی ماڵ و سامان و ژیانمان ئامادەین و ئەگەر خوا نەخواستە ڕۆژێك لەم پەیماننامە پەشیمان بووینەوە، شەرمەزاری خواوەند و ڕەسووڵ و مرۆڤایەتین و لەدین و مەزهەب و شەرافەت بێ بەرین. حسەین ڕەشید ئەلمولك، عەبدولمەجید سەردار ئەجلال، محەممەد سەعید ئەلمولك، محەممەد سالح قەلاگا، مەحمود دزڵی، جەعفەر سەرداری موعتەزید، محەممەد تۆفیق، ئەحمەد بن جەعفەر، عینایەت الله و سارم سوڵتان. نوێنەری سەعید ئەلسەڵتەنە، وەکیلی جوانڕۆ.

ئەم پەیماننامەم تەسلیم بەحکومەت کرد و نوسخەیەکی بۆ وەزارەتی ناوخۆ، بۆ وەزیری جەنگ و نوسخەیەك بۆ ئەمیری لەشکر ڕەوانەکرا. لەناوەڕاستی شەوال ١٣٤٢، سوڵتان کرێش خان لەگەڵ هێزەکانی کرماشان، لەلایەن ئەمیر لەشکر و سەرهەنگ ئەحمەدخانی مەنسور، لەگەڵ هێزەکانی کوردستان، بەفەرمانی ئیمارەتی لەشکری ڕۆژئاوا بەرەو ڕەوانسەر بەڕێکەوتن. سەرهەنگ ئەحمەدخان، وەکیل سوڵتان و ساعید سوڵتان و سالارفاتحی لەگەڵ خۆی برد تا کێشە و گیروگرفت دروست نەکەن. دووای دوو ڕووبەڕووبوونەوە سەردار ڕەشید شکست دەخوات و بەرەو ماڵی شێخ حیسام ئەلدین هەڵدێت. بڕە پارەیەك وەك قەرز لەشێخ وەردەگرێت و دەڕواتە لای مەلیك مەحمود. مەلیکیش بڕە پارەیەکی پێدەدات و ڕێگەی مەحمەرە دەگرێتەبەر. لەوێش شێخ خەزعەل خان بڕە پارەیەکی وەك هاوکاری پێدەدات و ڕەوانەی بەغداد دەبێت. تا ئەو کاتەی شاهەنشاهی پەهلەوی سەردانی نەجەف دەکات و لەوێ لەسەر داوای زاناکان، لێی خۆشدەبن.

لە ٢ شەعبانی ١٣٤٢، لەمزگەوتی دارئەلئیسحان، چینە جیاوازەکانی شار و بازارییەکانمان بانگێشتکرد و بەئامادەبوونی دانیشتووانی شار، کۆبوونەوەیەکمان سازدا. لەم کۆبوونەوەدا

ئەم بروسکەمان نووسی و بەواژۆی ئەندامانی کۆمیتە، ناردمان:
تاران_ مەجلیسی نیشتمانی، نوسخەیەك بۆ سەرۆك وەزیران، ئارەزوومەندی میللەتی سوونی مەزهەبی کوردستان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پاشا، وتەی باوی سەرزاران بوو.
هەنووکە بیستنی کردەوە قێزەونەکان و کارەساتبارەکانی سوڵتان ئەحمەدی قاجار و چالاکییەکانی دژی ئیسلام و شەریعەت لەلایەن ئەو گەنجە نەشیاوە، لەفەرەنگ، بۆتە هۆکارێك کەمیللەتی شاپەرەستی کوردستان حەفتەیەکە شۆڕشیان دەستپێکردووە و بەدەنگی بەرز و ڕاشکاو کەکاریگەری لەسەر گوێچکەی وەکیل و وەزیرەکان دابنێت، بێزاری خۆیان لەسەڵتەنەتی قێزەونی قاجار رادەگەیەنین و هەموو دەسەڵاتەکان بەوەکیلە بەڕێزەکان دەدەین تا ڕژیمی سەڵتەنەت بۆ کۆماری بگۆڕن و سەرۆك کۆمارکی خاوەن دەسەڵات و بەتوانا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات هەڵبژێرن لەو مەرجەی لەوەچەی نەشیاوی قاجارییەکان نەبێت. ئەگەری هەیە لەئەنجامی گۆڕینی ڕژیم، شەرافەت و شەرەفی پێشێلکراوی نەتەوەی ستەملێکراوی ئێران بگەڕێتەوە و لەگۆڕەپانی سیاسەتی نێونەتەوەیی، هاوشانی نەتەوە پێشکەوتووەکانی دنیا، هەنگاو بەرەو پێشەوە بەرین. هەروەها بەتەواوی یاساغمان کرد لەناو مزگەوت و شوێنە گشتییەکان ناوی ئەو خراپەکارە بوترێت، ناویمان لەهەموو شوێنێك سڕییەوە و ناوی سیلسیلەی قاجار، چیتر لەهیچ شوێنێك نایەتە سەرزمان. ئەگەر وەکیلەکانی پەرلمان لەئەنجامدانی ئەم ئەرکە کەمتەرخەمی لەخۆیان نیشانبدەن، ئێمەی ئێرانی توانای خۆڕاگریمان نابێت و ئەوان بەڕەسمی ناناسین، هەموو ویلایەت و قەزا و گوندەکانی بوێری ئێران دەست دەخەنە ناو دەستی یەك و شۆڕشێکی گشتی دەستپێدەکەین و حکومەتی کۆماری ڕادەگەیەنین و سەرۆك کۆماری خۆمان هەڵدەبژێرین و ڕەگ و ڕیشەی سیلسیلەی ناپاکی قاجار لەبنەوە دەردەهێنین. بەنوێنەرایەتی پێنج هەزار دانیشتووی کوردستان: محەممەد ئایەت الله، شوجاع لەشکر، ئەمجەد ئەلئەشرەف، حاجی ئیعتیزاد ئەلئیسلام، حوجەت ئەلئیسلام حاجی قەوام ئەلتوجار، حاجی خان، محەممەد شەریفی زەهتاب، ئیستێپانی مەسیحی، ئاقابرای کەلیمی.
دواتر هەواڵمان بەدەست گەیشت کەمحەممەد حسەین میرزای جێگری سەڵتەنەت، بۆ پاراستنی تاج و تەختی براکەی خۆی، چالاکییەکانی دەستپێکردووە. دووبارە لەماڵەکانی

مەسعودسەڵتەنە کۆبوونەوە و ئەم بروسکەمان نارد:

تاران، بۆ بەڕێز جێگری سەڵتەنەت، بۆ مەجلیسی نیشتمانی، بۆ سەرۆکایەتی هەموو هێزەکان. ستەمە لەبیرنەکراوەکانی باوباپیرانی ئێوە، بەئاشکرا لەگۆڕەپانی ئێراندا بلاّوبۆتەوە و جامی سەبر و خۆڕاگری خەڵکان لێوڕێژ بووە و زۆری نەماوە دەنگی ڕووخانی بنەماڵەی قاجار هاوشێوەی بنەماڵەی تزار بگاتە گوێی فەلەك. تا ڕۆژگار لەوە دژوارتر نەبووە، باشترە کەلوپەلەکانی خۆت کۆبکەتەوە و لەفەرەنگ پەیوەستی براکەت ببیت چوونکە زیاتر لەمە هێز و هەستی ئەم خەڵکە نابێتە گەمەی دەستی ئێوە. خواوەند، ئەم کەشتییە بۆ هەر شوێنێك دەبات کەدەیخوازێت. بەنوێنەرایەتی دانیشتووانی کوردستان، محەممەدی مەردۆخ، حاجی خان، ئەمجەد ئەلئەشرەف.

ئاسف و حاجی موعتەمید لەم بروسکە و کۆبوونەوانە دژی سەڵتەنتی قاجار تووڕە و بەئاشکرا، دژایەتییان دەکرد. لەژێر ناوی ئەوەی کەئێمە شافعی مەزهەبین و شۆڕش دژی دەوڵەت لەمەزهەبی ئێمەدا حەرامە و ئێمە جگە لەسوڵتان ئەحمەدشا بەکەسی دیکە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات ڕازی نابین، بوێرانە خەڵکیان بۆ کۆبوونەوە لەدەوری خۆیان هاندەدا و دڵنیایان دەکردنەوە سەندنەوەی سەڵتەنەت لەبنەماڵەی قاجار ئەگەری نییە و ئەم کارانە بەفەرمانی باڵوێزخانەی ئینگلیس ئەنجام دەدرێت چوونکە دەخوازن شا بەدانی ئیمتیاز لەبەرژەوەندی خۆیان ناچار بکەن.... بڕە پارەیەکیان بەسەیید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلامدا تا خەڵکان بانگێشت و لەڕێگەی مۆجیاری کردنەوە بەخەڵکان بڵێت کەشۆڕش دژی حکومەت حەرامە و هەرکەس خاوەنی ئەم بۆچوونە بێت، خوێنی حەلاّڵە.

ئێمە بەدوور لەوان، هەموو ڕۆژێك کۆبوونەوەکانی خۆمان ئەنجامدەدا. دوای ماوەیەك هەواڵم بەدەست گەیشت کەسەیید شێخولئیسلام، سفرەیەکی گەورەی بۆ نیوەڕۆ ئامادە کردووە و داوای لەهەموو زاناکان و بازاڕییان و پیاوماقووڵان کردووە بڕۆنە ماڵەکەی و گوێ لەوتەکانی بگرن. منیش هاوکات لەگەڵ بانگێشتەکەی سەیید شیخولئیسلام، هەموو زاناکان و بازاڕییان و پیاوماقووڵانم بۆ جەنەت باغی بانگێشتکرد تا گوێ لەوتەکانی من بگرن. لەکاتژمێری دیاریکراو، خەڵکان بەگشتی و لەژێر ئاڵای بزوتنەوەی نیشتمانی، لەجەنەت باغی ئامادە بوون و لەسەر زەوی دانیشتن و گوێیان لەوتەکانی من گرت و نەڕۆشتنە ماڵی شێخولئیسلام بۆ خواردنی نان و چایی و شەربەت. جگە لەچەند کەسێك وەك ئاسف و موعتەمید و چەند

کەسێکی مووچەخۆری ئەوان. بەڵام نەمویست ئەم ڕاستییە لەپشتی پەردەوە بمێنێتەوە. پیاوێکم بۆ ماڵی شێخولئیسلام نارد. بەڕاشکاوی بەوانی ڕاگەیاند ئەگەر ئێوەی بەڕێز لەگەڵ بۆچوونەکانی ئێمەدان، دەبێت بەخێرایی بێنە جەنەت باغی و ڕەزامەندی خۆتان دەربڕن. جیاواز لەوە، لەم بەرواره بەدواوە، ئێمە بەڕەسمی ئەوان وەك نەیارەکانی کۆمەڵگا دەناسێنین. لەگەڵ بیستنی پەیامەکە، هەمووان بەخێرایی هاتنە جەنەت باغی و ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا. ساعید ئەلمەمالیك، حاجی موعتەمیدی لەگەڵ خۆی هێنا. تەنیا شێخولئیسلام لەماڵەکەی خۆی مابوویەوە. ئەو نان و خواردنەی بۆ میوانەکان ئامادەی کردبوو، وەك خۆی مایەوە و تا چەند ڕۆژێك دراوسێکان لەو خواردنەیان دەخوارد.

**وتارەکەی من لەکۆنفرانسی جەنەت باغی بەورار ٢٧ شەعبانی ١٣٤٢**

هاووڵاتیان، زیاتر لەسەد و چل و هەشت ساڵە دەوڵەتی ئێران، بۆتە دەوڵەتی قاجاری. جڵەوی کاروبارەکان لەدەست ئەم سیلسیلەدا بووە کە لەژێر ئاڵای شێر و خۆرشید، بەڕەنگی سەوز و سپی و سور، لەگۆڕەپانی سیاسەتی وڵات، خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك بوون و هەموو پێگە و جێگە دەوڵەتییەکانیان داگیرکردووە و فەرمانڕەوایی هەموو ناوچەکانی وڵاتیان کردووە. ئاشکرایە لەم ماوە دوورودرێژە، ئەگەر ئەم سیلسیلە ئارەزوومەندی ئەم ئاو و خاکە و خوازیاری پێشکەوتنی وڵات دەبوون و گەشەیان بەزانستەکان دەدا، گەشەیان بەپیشەسازی و کشتوکاڵ و دەروازەکانی بەختەوەرییان بەڕووی میللەتدا دەکردەوە و لەمپەرەکانیان لەسەر ڕێگە هەڵدەگرت و سەرئەنجام ئەم بەڕێزانە سەرنجیان بەم وڵات و سەرزەمینە دەدا و ئەمڕۆ ئێران ببووە گوڵستان بەتایبەت چالاکییەکانی سەرداری سوپا، لەم ماوە کەمەدا و پێشکەوتنی کارەکانی ئەو، لەقووڵاییەکانی وڵات ئەوەی سەلماند کەهیچ لەمپەرێك بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی ئێران لەئارادا نەبووە جگە لەناتەوانی و نەشیاوی و سەرنجدان بەبوونی میللەت کەنادادپەروەرانە کاتی خۆیان و میللەت و شەرافەت و شکۆی وڵاتیان بەفیڕۆدا و کۆمەڵگایان مەحکوم بەڕووخانکرد. دەسەڵاتی سەڵتەنەتییان بۆ بەرژەوەندی خۆیان و بەمەبەستی شەهوەتپەرەستی بەکار برد و لەوشەی خاقانی و شاهەنشاهی، قەڵغانێکیان بۆ مەبەستە گڵاو و شەهوەتە ئیسلامکوژرەکانی خۆیان دروستکرد. چاوەکانیان دەرهێنا، سەرەکانیان بڕی، خەڵکانێکی زۆریان ئیعدام کرد، ماڵەکانیان وێران کرد، بنەماڵەکانیان لەناوبرد و سەرئەنجام وڵاتیان گرفتاری ئەم دۆخە

کارەساتبارە و میللەتیان گرفتاری ئەم هەموو بەدبەختییە کرد کەتەنیا هەندێ ناوچە ئاوەدان، دەستەیەك خەندان، مەملەکتێك گریان و هەمووان گرفتاری هەژاری و نەداری و ئێرانییە ئازیزەکان پەرێشان و سەرگەردان بوون. شەپۆلی بەدبەختی سەراسەری ئێرانی گرتووە، ئەندامانی کۆمەڵگا لەگێژاوی مەرگ پەلەقاژە دەکەن و زۆربەیان بەنانی شەو نیازمەند و دەستە دەستە لەتاو برسیەتی دەستی ماڵ و منداڵی خۆیان دەگرن و ئاوارەی وڵاتانی دیکە دەبن. کەس ناپرسێت ئەم بەدبەختانە بۆ کوێ دەڕۆن؟. بۆچی دەڕۆن؟ گرفتارییان چییە؟ لەکۆتایی ئەم بارودۆخە، لەئەنجامی ئەم قاجاربازییە کەوەرەقەکانی مێژوو بەڵگە و شایەتی ئەم ڕاستییەیە، تەنیا سوودی میللەتی ئێران، بازرگانی کۆن و دەستەیەك تاقیکردنەوەی گرنگە کەبەتەواوی ناوەڕۆك و ڕاستی ئەندامانی ئەم سیلسیلەیە بۆ هەموو دنیا ڕووندەکاتەوە و مەحکوم بوونی ئەم سیلسیلەیە بەدوورخرانەوە لەسەڵتەنەت، بۆتە بابەتێکی نەشیاو بۆ دەستلێهەڵگرتن و حاشاکردن. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا هەست دەکرێت وەکیلەکانی خولی پێنجەم، لەئەنجامدانی داوای ڕەوای ئێرانییەکان و وەرگرتنەوەی سەڵتەنەت لەم بنەماڵەیە کەمتەرخەمن! سەیرە کەئێمە بۆ پشتڕاستکردنەوەی وەکالەتی درۆینەی ئەو بەڕێزانە کەمتەرخەمیمان نەکرد بەڵام ئەوان لەئەنجامدانی داوا ڕەواکانی ئێمە، بەئەنقەست، خۆیان گێل دەکەن.

هاووڵاتیان! ناوەڕۆکی بابەتەکە دەبێت لەناو ڕستە و وشەکان بێنینەدەر و بەڕاشکاوی بڵێین وەکیلەکانی خولی پێنجەم، بیر لەبەرژەوەندییەکانی وڵات ناکەنەوە بەڵکو لەگەڵ دوژمنەکانی ئەم نەتەوە ستەملێکراوە، هاودەست و هاوبڕوان، بوونەتە ساتوری و ئامێری کوشتنی جەلادەکانی ئەم کۆمەڵگایە.

هاووڵاتیان! وەکیلەکانی ئێمە ڕازی بەبوونی ئێمە نین، گرنگی بەبەختەوەری و خۆشحاڵی ئێمە نادەن. کەواتە بۆ سەلماندنی بوونی خۆمان پێویستە شۆڕش دەستپێبکرێت. ڕۆژی پسلاَن بێتە ئاراوە. بۆیە بەستنی و داخستنی دووکان و بازاڕەکان بەشێوەیەکی گشتی بۆ لەناوبردنی ئەوان، کارێکی گونجاوە. بزوتنەوەی ئاگرینی چالاکی بێ بەزەییانە بۆتە شتێکی ڕێگەپێدراو کەدەبێت دابخرێت. دەبێت بنەماکانی ئاژاوە و یاساکانی شۆڕش بەڕێکوپێکی بخرێتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. ئەم داخستنی دووکان و بازاڕە، پشێوی نییە، ئەم شۆڕشە ئاژاوە نییە، ئەمە تەنیا هۆکاری سەلماندن و بوونە کەمیللەت بەزۆری بازوو، مافە

ڕەواکانی خۆی لەوەکیلە کەمتەرخەمەکان دەستێنێت و دەیەوێت ژیان و شەرافەتی خۆی لەچنگی هەوەسڕانی بنەماڵەی نەشیاوی قاجار ڕزگار بکات.

هاوولاّتیان! گەنجی بەختەوەری لەبیابانێکدایە کەدەرگاوانەکەی ئەژدیهای شۆڕشە، هیچکەس تا نەڕواتە قوڕگی ئەژدیها، دەستی بەم گەنجە ناگات. بەکورتی شوێنەوار و نیشانەکانی سەڵتەنەتی بنەماڵەی قاجار، بۆ هەموو ئێرانییەکان هەستپێکراو و سەلمێنراوە. بەداخەوە کەدرەنگمان کرد و درەنگ جوولاّینەوە و کاتی گرانبایی خۆمان بەفیڕۆدا. هەموو پەڕە گرنگەکان و لەوحەکانی شانازی مێژووی بنەماڵەی کیان، بەدەستی خیانەتکارانەی قاجار، وەرەق بەوەرەق لەت و پەت کرا و لەجیاتی ئەوە، لاپەڕەکانی سەرشۆڕی و لێوانلێو لەنەنگ جێگەیان گرتەوە.

ئەی هاوولاّتیان، چیای بورکانی خراپەکاری ئەم سیلسیلە، شەپۆلی کردەوە خراپەکانی ئەم بنەماڵەیە، لەهەموو لاکانەوە دەورەیان گرتووین و کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێری نەمان دەبەن. ئێمەیش منالاّنە و بێعەقلاّنە لەلێواری ئەم بورکانە دانیشتووین و تەنیا سەیری دەکەین.

هاوولاّتیان! بێدەنگی و سکوت، دوژمنان بوێر و کۆمەڵگا لەبەختەوەری دوور دەکاتەوە. ئەمڕۆ مەملەکەت پێویستی بەنەشتەرگەری هەیە و ژیان و هەستی کۆمەڵگا، پەیوەستە بەبزوتنەوەیەکی بوێرانە کەدەمارە لاوازەکانمان بجولێنێت و ژیان و هەستی خۆمان بەقاجارییەکان بسەلمێنین.

هاوولاّتیەکان! ڕاستییەکان هەرچەند درەنگیش بێت، دەردەکەون. سروشت هەرچەند درەنگ بەلاّم سەرئەنجام تەمێ دەکات. کۆمەلاّنی خەڵك، ئۆقیانووسێکی بێدەنگن و کاتێك جامی سەبر و خۆڕاگری ئەوان سەرڕێژ ببێت، شەپۆلی مەترسیداری لێدەکەوێتەوە. دەوڵەتی مەترسیداری تزاری، سەڵتەنەتی تۆقێنەری ئیمپراتۆری ڕووسیە، لەگەڵ ئەو هەموو دەسەلاّتە ناکۆتایە، بەگورزێکی سروشت، ڕووخا و هەڵوەشایەوە. دەوڵەت و حکومەتێك بناغەی لەسەر ستەم و هەوەسڕانی و شەهوەتپەرەستی دانرا بێت، هەرچەند بەهێز و تۆکمە بێت، بەکەمترین جووڵە لەناو دەچێت و دەڕووخێت.

هاوولاّتیان! حکومەت و سەڵتەنەت بۆماوەیی نییە. حکومەت و سەڵتەنەت ئەمانەتێکی نیشتمانییە کەکۆمەڵگا بەکەسە شیاوەکانی دەدات. بەوتەیەکی دی، جگە لەمیللەت، کەس مافی فەرمانڕەوایەتی کردن بەسەر خەڵکانی نییە. چارەنووسی کۆمەڵگا دەبێت لەلایەن

کۆمەڵگاوە دیاریبکرێت. کۆمەڵگا هەر دەسەڵاتدارێك هەڵدەبژێرێت، ئەگەر باش بێت، مافی بەردەوام بوونی هەیە و ئەگەر خراپ بێت، دەبێت بڕوات و کەسێکی باشتر جێگەی بگرێتەوە. دەسەڵاتدار دەبێت پشت بەکۆمەڵگا ببەستێت. فەرمانڕەوا دەبێت دڵگەرم بەسیاسەتێکی گونجاو بێت نەك میرات. حکومەتی بۆماوەیی، منداڵانە و کاتییە. حکومەتێك پایەدار دەبێت کە لەسەر شیاوی و بەتوانایی پێکهێنرابێت. ئێمە بتپەرەست نین. ئێمە گرنگی بەکەسەکان نادەین. ئێمە کارمان دەوێت. ڕاستکردارمان دەوێت، ئێمە دەمانەوێت بوونی خۆمان لەناو تایەفە جیاوازەکانی دنیا، لەناو نەتەوەکان و دەوڵەت پێشکەوتووەکان بسەلمێنین. ئێمە دەمانەوێت بەهێزی بازوو، باروودۆخی دیکتاتۆری، ئاغایی، ئەشرافی، پاشایەتی تیرەکان و سەرئەنجام کۆتایی بەبتپەرەستی بهێنین و حکومەتێکی خاوەن دەسەڵاتی ئارەزوومەندی بەرژەوەندییەکانی وڵاتمان هەبێت.

هاووڵاتیان! نەوەی نەشیاوی قاجار، ئەو نەژادە بێ بەزەییەن کەسەردەمانێك، حەوت مەن و نیو چاوی منداڵەکانی کیانیان دەرهێنا. ئەمە ئەو بنەماڵە دوور لەشەرافەتەن لەبەر فەتح عەلی شا و موزەفەرئەلدین شا، نامووس و شەرەفی پاکی سەرزەمینی داریوشیان بەفیڕۆدا و کردەوە نەشیاو و ناڕەواکانیان لەسەرزەمینی کوروش بڵاوکردەوە. بوونی ئەم بنەماڵەیە، هەوای ئێرانی ژاراوی و هەوای سەرزەمینی کیانی بۆگەن کردووە. لەجیاتی کیان بزانە کێ هاتۆتە سەرکار.

هاووڵاتیان! شەرمێنەر و نائومێدکەرە لەسەدەی بیستەم و لەسەدەی ژیانەوە و لەدنیایەکی ئازاد، هێشتا بنەماڵەی قەجەر، لەبەرابەر لافاوی گەشەکردن و پێشکەوتن خۆیان دەنوێنن. هێشتا کۆشکی قەجەرەکان، سەڵتەنەت ئاواکان هاوشێوەی دێوە زەبەلاحەکەکان، بەسەر بەرزایی بانی ئێرانەوە دەردەکەون.

هاووڵاتیان! تەنیا بەکۆبوونەوە و وتاری هەڵخڕێنەر و بابەتی ئاگرین نابێت بەسەندە بکەین. بەئاگر و ئاسن دەبێت هێرش بکەینە سەر دوژمن. زەوی و لاپەڕەکانی مێژووی خۆمان دەبێت لەخوێنی تاوانباران، ڕەنگین بکەین. ئەگەر لەپێشەکی گۆڕینی ڕژێم قوربانی نەدرێت، ئەو ڕژێمە ناپیرۆز و نامووبارەك دەبێت. لاپەڕەکانی شۆڕش، وەرەقەکانی گۆڕینی ڕژێم دەبێت سوورڕەنگ بێت. پەڵەی تاوان تەنیا بەخوێن پاك دەبێتەوە. بۆیە بیری هەموو هاووڵاتیان و ئێرانییان دەخەمەوە، ئەگەر لەم چەند ڕۆژەدا کورسی نشینانی مەجلیس، یانی وەکیلە

بەڕێزەکانی پارلمان، داوای ڕەوای گەل لەکاتی خۆیدا جێبەجێ نەکەن، دەبێت پەیوەندییەکانمان لەگەڵ ناوەند بپچڕێنین و وەکیلەکان لەکورسییەکانیان بێنینە خوار، بازاڕ و دووکانەکان ببەستین و بەدەنگی اللە ئەکبەر، دەنگمان بخەینە پاڵ دەنگی هەموو ویلایەتەکانی دیکە و شۆڕشی خوێنین و ڕەنگینی خۆمان دەستپێبکەین.

هەر بژی حکومەتی نیشتمانی، زیندوو بێت حەزرەتی سەرداری سوپا، بڕووخێت سەڵتەنەتی قاجار، بڕوخێت ئەشراف و ئەشرافییەکان.

دواتر بەڕێزان نیزامزادەی مەردۆخی و قاسمزادەی هەمەدانی هەستان و هەرکام بابەتێکی تێروتەسەلیان خوێندەوە و بروسکەیەکی توندیان بەئامادەبووان واژۆ کرد و بۆ مەجلیسمان نارد. دوای چەند ڕۆژ بروسکەیەکمان بەدەست گەیشت کەزاناکانی نەجەف، دژی کۆماری فتوایان دابوو. ڕۆژی دواتر نیزامزادەی مەردۆخی و قاسمزادەی هەمەدانی، لەگەڵ دەستەیەك لەبازاڕییەکان هاتن و ڕایانگەیاند کەسەرۆکی ئاسایشی شارەکە یانی ساعید ئەلمەمالیك کوڕی ئاسف، هەڕەشەی لێکردووین کەزاناکان فتوایان دژی کۆماری و کافربوونی کۆمارییەکان داوە. تا چەند ڕۆژی دیکە ئەحمەد شا لەفەرەنگ دەگەڕێتەوە و ڕیسەکەی ڕەزاخان دەکاتەوە بەخوری. سەرەتا فلآنەکەس و دواتر ئێوە دەبێت لەسێدارە بدرێن و بەڕاشکاوی پێی وتووین کەدەبێت شارەکە بەجێبێڵین. بەئامادەبوونی ئێمە فەرمانی بەژاندارمەکاندا کە لەدەوروبەری ماڵی ئێوە کێشك بگرن بۆ ئەوەی هەرکەس سەردانی ئێوە بکات، بیگرن و بیبەن. دوای قسەکانی ئەوان وتم یەکەم ئەوەی ئێمە گفتوگۆ لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ولآت ناکەین کەکۆماری بێت یا سەڵتەنەت. گفتوگۆی ئێمە لەسەر ئەو کەسەیە کەولآت بەڕێوە دەبات و دەڵێین: ئەحمەدشا توانایی بەڕێوەبردنی ولآتی نییە و ڕەزاخان باشتر دەتوانێت کاروبارەکان ڕاپەڕێنێت. شێوەی حکومەتی ئێران چ کۆماری بێت چ سەڵتەنەتی، دەبێت ڕەزاخان جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست. سەبارەت بەگەڕانەوەی ئەحمەدشا، ئەگەر بگەڕێتەوە، یەخەی من و کەسانی وەك من دەگرێت و کاری بەئێوە نابێت. ئێوە تا بن داری ئیعدام لەگەڵم وەرن، ئەگەر پەتەکەیان کردە ملم، چەپڵە لێدەن و خۆشی خۆتان نیشان بدەن کەکەسێك لەنەژادی ئێوە لەدار دەدرێت و لەبۆچوونەکەی خۆی پەشیمان نابێتەوە. ئەگەر لەدار نەدرام و هەمووان سەرکەوتوو گەڕاینەوە، بەکوێری چاوی ناحەزان، شادومانی نیشان دەدەین و سەرکۆنەی نەیارەکانمان دەکەین. بۆ پشتگەرم کردنی ئەوان،

پیاوێکی خۆم بۆ بازاڕ نارد تا هەمووان دووکان و بازاڕەکان ببەستن و دەمەوئێوارێ لەتەپەی پیرمحەممەد کۆببنەوە و لەوێ گوێ لەوتارەکەی من بگرن. لەکاتژمێری دیاریکراو، بێ گرنگیدان بەهەڕەشەکانی بەڕێوەبەری شارەکە و ڕێگرتنی ژاندارمەکان، دانیشتووانی شار بەگشتی، بازاڕ و دووکانەکانیان بەست و بێ سەرنجدان بەگەڕانەوەی ئەحمەدشا، لەتەپەی پیرمحەممەد کۆبوونەوە. منیش ئەم وتارەم بەدەنگی بەرز خوێندەوە.

**وتارەکەم لەکۆنفرانسی پیرمحەممەد**

هاوولاّتیان، بێگانە ڕێگە نادات لەماڵەکەی خۆمان ئاسوودە بین. سەرچاوەکانی داد بەڕەوای نازانن لەولاّتەکەی خۆمان هەناسەیەك بەئاسوودەیی هەڵکێشین. ترۆمبێلی گازی خنکێنەری بیانییەکان، بەردەوام بۆ خنکاندنی هەستی پێشکەوتنی ئێمە لەکاردایە و کارگەی کێشەداتاشینی دەوڵەتەکانی دراوسێ، شەو و ڕۆژ بۆ ڕێگرتن لە ڕێڕەوی پێشکەوتنی ئێمە، لەجووڵەدایە و لەجیاتی خەس و خاشاك، چیا و جەنگەڵ دەخەنە سەر ڕێگەی ئێمە و زۆنکاوەکان لەسەر ڕێگەی پێشکەوتنی ئێمە دروست دەکەن.

هاوولاّتیان! ئەورووپاییەکان هەموویان فێڵباز و تەشقەڵەچین و بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی دەوڵەتە لاوازەکان، لەبەکار بردنی نەنگینترین ئامێر و ئامرازەکان خۆیان بەدوور ناگرن. بەهەر جۆرە پلانێکی شەرمێنەر دەیانەوێت ئێمە بکەنە ئالەتێك بۆ گەیشتن بەمەبەست و ئامانجەکانی خۆیان و بەئاشکرا، شەرافەت و سەربەخۆیی ئێمەیان خستۆتە ژێرپێ و بەهۆی مژدەدەران و بانگەشەکەران لەناوەوەی ئێران سەرقاڵی ئامادەکردنی هێزی سیاسین. لەجووڵە و چالاکییەکانی ئەوان لەگۆڕەپانی ئێران بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت کە بەهیچ جۆرێك نایانەوێت بەبوونی ئێمە ڕازیبن و ناخوازن ماف و سنوورەکانی ئێمە پشتڕاست بکەنەوە. ئەگەر هەندێ کاتیش دەستی هێز یا دەستی سروشت، سەردارێکی بۆ گەڕاندنەوەی شەرەف بۆ میللەت و ڕزگار کردنی دەوڵەت، بێنێتە بوون، دەوڵەتەکانی دراوسێ دەکەونەخۆ و دەخوازن بەهۆی ئامێرە سیاسییەکان و پیلانە دیپلۆماسییەکان دەیتۆقێنن و ناچاری دەکەن شوێنکەوتەی ویست و خواستەکانی ئەوان بێت. ئەی ئێرانییەکان، سەرداری سوپادار، بەتەنیا جێمەهێڵن.

هاوولاّتیان! ڕەزاخانی پەهلەوی بێ یار و هاریکار بۆ گۆڕەپانی جەنگ مەنێرن. ئەی نەتەوەی کیان! جگە لەڕەزاخان کەسێکی خۆبەخشی دیکەتان نییە. ڕەزاخانیش جگە

لەنەتەوەی ئێران هیچ پشتێکی دیکەی نییە. بوێرانە هاریکاری ئەم تاقە ڕزگارکەرە بن و بزانن چۆن تاقی تەنیا لەناو ئەو هەموو کێشە و لەمپەرانە، لەناو شەپۆلی هێرشەکان کە لەلایەن دوژمنانی زانا و دۆستانی نەزانەوە دەکرێتەسەری، سەرقاڵی گیانبەخشینە.

هاووڵاتیان! ئێمە نابێت دەست بخەینە سەر دەست و چاوەڕوان بین کەسێك بۆ ئێمە کار بکات. میللەتێك کەخوازیاری ڕزگارییە، میللەتێك کەنامی پێشکەوتن لەناخی ئەودا ڕوابێت، دەبێت هەمووان کار بکەن و بۆ هەمووان کار بکەن. کۆمەڵگا دەبێت هەموو ئەندامەکانی گەشە بکات. خوێنی پێشکەوتن دەبێت لەهەموو دەمارەکانی کۆمەڵگا بخرێتەگەڕ و هەر ئەندامێك لەکاتی خۆیدا، ئەرکەکانی خۆی ئەنجام بدات و درێژە بەژیان و بەختەوەری خۆی بدات.

هاووڵاتیان! پێشکەوتن دەبێت گشتگیر بێت نەك تایبەت بەکەسێك. پێشکەوتنی گشتی، دڵنیابەخشە. بەلام پێشکەوتنی تایبەت بەیەك کەس، هەرچەند بەهێز و تۆکمە بێت، بەگورزێکی سروشت، لەناو دەچێت.

هاووڵاتیان! بێدەنگی یەکسانە بەمەرگ و کردەوە و چالاکی، نیشانەی ژیانە. وەستان، ئەرکی نەزۆکەکانە و جموجوڵ، شێوازی مرۆڤ. مرۆڤ دەبێت فەرمانی ژیان بەخشی (لیس للنسان الاماسعی) هەمیشە لەبیر بێت. ئەگەر بەمەبەستی وانە وەرگرتن سەرنجێك لەچەند ساڵ پێشووتر بدەن، ئەو ڕۆژگار و ڕۆژە ڕەشانە، ئەو تاریکی و نەهامەتییانە بیر بیننەوە کەهەزاران دانیشتووی ئێران لەگۆڕستانی بێ هیوایی بەخاکسپێردران و جگە لەمەرگ، هیچ ڕێگەیەکی دیکەمان بۆ ئازادی خۆمان گومان نەدەکرد. ئەو بارودۆخە لەگەڵ بارودۆخی ئێستا و قۆناغی چوارساڵەی دەسەڵاتی ڕەزاخان بەراوەرد بکەن. دان بەو ڕاستییەدا دەنێن کەئەگەر تاکی ئێرانی ئارەزوومەندی چاکسازی بێت، هەرچەند تەنیا و بێ یار بێت، دەتوانێت بارودۆخ بگۆڕێت و کۆمەڵگا بەرەو ڕێگەی بەختەوەری ڕێنوێنی بکات.

ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە سەد کەسی وەك ڕەزاخانمان دەبوو، سەد بەرابەری ئێستا دەماتوانی کارەکانمان پێشبخەین و لەکۆتایی ساڵ، سەد ساڵ پێشدەکەوتین.

خەڵکی ئێران! لەخەوێکی قووڵداین، ئەی منداڵەکانی کیان، زۆر دواکەوتووین. ئێمە ئەگەر بیرمان لەپێشکەوتن بکردایێتەوە، دەبێت زیاتر لەمە لەخەوی بێ ئاگاییدا نەمێنینەوە. شەوان دەبێت بەخەیاڵی پێشکەوتن سەر بخەینە سەر سەرین. ڕۆژەکان بەمەبەستی

پێشکەوتن دەبێت لەخەو هەستین.

هاوولاتیان! ئەمڕۆ ڕۆژی هەزار ڕۆژە، ڕۆژێکە هەر خولەکێکی بەچەندین سەدە بۆ ئێمە قەرەبوو ناکرێتەوە و هەرچرکەیەکی لەخۆگری یەك دنیا بەختەوەری یا بەدبەختییە. ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە تۆماری بەختەوەری یا بەدبەختی ئێران لێرەوە دەستپێدەکات و چاوی باب و باپیرانی ئێمە لەژێر پەردەی خاك، چاوەڕوانی کردەوە بوێر و بەهێزەکانی ڕەزاخان و هاوکاری و هاریکاری ئێمەیە. ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە هەرکەس دەتوانێت، لاپەڕەکانی مێژووی خۆی ڕوون یا تاریك بکات و ناوی خۆی لەڕیزی کەسە بەناوبانگەکانی دنیا یا لەدەفتەری بێ ناموسەکان تۆمار بکات.

هاوولاتیان! چەندین جار وتوومە و دەیڵێمەوە: ئەمڕۆ نەخشەی بەدبەختی و بەختەوەری ئێران، پەیوەستە بەبزوتنەوەی بوێرانە و دلێرانەی خەڵك. لەئەزمون و تاقیکردنەوەکان ئەوە سەلمێنراوە کەکلیلی بەختەوەری ئێران، ئەمڕۆ لەدەستی بەتوانای ڕەزاخاندایە و بەرژەوەندییەکانی وڵات و سیاسەتی دنیا پێویست دەکات جڵەوی ڕەهای کاروبارەکانی ئێران، لەدەستی ئەم کەڵەسوارەدا بێت. ڕاشکاوانەتر، مەبەستی سەرەکی ئێمەی نەتەوەی ئێران و ئامانجی ڕاستەقینەی ئێمەی پێشکەوتنخواز لەوشەی سەڵتەنەت، کۆماری، کۆبوونەوەکان و هەر شتێکی دیکە، گرتنە دەستی ڕەهای هەموو دەسەڵاتەکانە لەلایەن ڕەزاخانی پەهلەوی. بەوتەی شاعیر: مەبەستی من لەکەعبە و بتخانە تۆیت، تۆ، مەبەست تۆیت، کەعبە و بتخانە بیانوون.

هاوولاتیانی خۆشەویستی ئێران! بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجە و بەدیهێنانی ئەم مەبەستە، ناچارین بەدامەزراندنی حزبی سیاسی و ڕێکخستنی سیاسی نانیزامی کە لەبەرابەر هێزە سیاسییە نانیزامییەکانی بیانییەکان کە لەناو وڵاتی ئێمە سەرقاڵی پڕوپاگەندەن و بۆ پاراستنی شەرافەتی نیشتمانی و ڕێزی دەوڵەت لەبەر چاوی بیانییەکان، دامەزراندنی بزوتنەوەیەك بەناوی بزوتنەوەی پەهلەوی بەپێویست دەزانین کە لەهەموو ویلایەت و شار و قەزاکان و لەهەموو سەرۆك عەشیرە و سەرکردە و کەسانی نیزامی و مەدەنی و چینە جیاوازەکان پێکهاتبێت و خودی ڕەزاخان وەك تاقە سەرۆك و پێشەوا دیاریبکەین و بیکەینە پێشەنگی خۆمان و هەمووان بەبڕیار و ئیرادەیەکی بەبڕشت پشتیوانی و هاوکاری بکەین و لەبەرابەر هێرشی سیاسی بیانییەکان بوێرانە و ئازایانە،

گیان ببەخشین و بۆ ڕووخاندن و لەناو بردنی دەسەڵاتی سیاسی بیانییەکان، چالاکییە ئیسلام پەرستانەکان لەخۆمان نیشان بدەین لەبەیانی من دەست بەڕێکخستنەکان دەکەم و هەموو حەفتەیەك خەڵکان لەئەنجامی چالاکییەکان ئاگادار دەکەمەوە. لەکۆتاییەدا بەدەنگی بەرز دەڵێم بڕووخێت ئەحمەدشا و نەوەی قاجار، زیندوو بێت سەردار سوپا و پێشەوای گەورەی ئێران.

دوای ماوەیەك لەئەنجامی سکاڵای کۆمیتەی بزوتنەوەی نیشتمانی، لەلایەن ئیمارەتی لەشکری ڕۆژئاوا، فەرمان بەسەرهەنگ ئەحمەدخان درا، سەیید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلام سوار کەر بکات و بۆ هەمەدان دووری بخاتەوە. دوای ئەوەی نیزامییەکان دەیبەنە قوروە، شازادەی فەرمانڕەوا لەسەر داوای ئاسف و حاجی موعتەمید، کەتکای بۆ دەکەن، دەیگەڕێنێتەوە. لەم ناوەدا شێخ شوکراللە، تۆمەتی ئەوەی خرایە پاڵ کە لەگەڵ ئاسف و شوێنەکەوتەکانی یەکیگرتووە و بۆتە لایەنگری بنەماڵەی قاجار. دانیشتووانی شار، پەیامیان بۆ نارد ئەگەر ئەو هەڵگری ئەم بۆچوونە بێت، چیتر لەپشت سەری ئەو نوێژی هەینی ناخوێنین. سەرئەنجام بڕیاردرا ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر، ئەم تۆمەتە لەخۆی دووربخاتەوە تا خەڵکان لەپشت سەری نوێژ بخوێنن.

ڕۆژی هەینی ٢٤ شەوال، شێخ شکوراللەی، پێشنوێژ، ڕۆشتە سەر مینبەر و ڕوونکردنەوەیەکی تێروتەسەلی سەبارەت بەکارەساتەکان و خراپەکارییەکانی بنەماڵەی قاجار و چاکی و خێرخوازییەکانی سەردار ڕەزاخان خوێندەوە و لەکۆتاییدا وتی: نەعلەتی خواوەند لەبنەماڵەی قاجار بێت. شازادە وتەکانی بیست و لێی ڕەنجا و تا لەکوردستان بوو، ڕێگەی ڕۆشتن بۆ قەڵای حکومەتی پێنەدا. ڕۆژێك شازادە وەك گلەیی کردن وتی: لەهەر تایەفە و نەتەوەیەك چاك و خراپ هەیە، بۆ پێشنوێژ بێ جیاوازی، نەعلەتی لەهەمووان کرد. وتم: ئەگەر ئەو، لەناو بنەماڵەی قاجار، یەك کەسی بەباش دەبینی، بەدڵنیاییەوە بەگشتی بەنەعلەتی نەدەکردن. لەوەڵامەکەم بێدەنگ بوو. ڕۆژی دووشەممەی ٢ شەوال، شازادە شەهاب ئەلدەولە لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان دوورخرایەوە و موزەفەرخانی سەردار وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا.

### حکومەتی موزەفەرخان سەرداری ئینتیسار

دوای لابردنی شازادە شەهاب ئەلدەولە، موزەفەرخان سەرداری ئینتیسار وەك فەرمانڕەوای

کوردستان دیاریکرا و شەوی یەکشەممە ٨ زیقەعدەی ١٣٤٢، یەکی قرژاڵی ١٣٠٢، هاتە کوردستان. ئەم سەرداره هەمان سەردار موزەفەرە کەپێشتر ئامارەمان پێدا لەڕۆژگاری شۆڕشی سالارئەلدەولە بەناوی حکومەت، لەلایەن فەرمانفەرماوە، هاتە کوردستان و دانیشتووان دژی ئەو ئاڵای شۆڕشیان بەرز کردەوە و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەویان کوشت. و خۆی بەدەستی حاجی ئەرفەع ئەلمولك دەرباز و گەیشتە هەمەدان. ئەم پەیکەری ئەخلاقە، ئەم دەسەڵاتە دینپەروەرە خەڵکویستە، ماوەی حەڤدە مانگ شەرافەتمەندانە و ئابڕوومەندانە، لەکوردستان فەرمانڕەوایەتی کرد و بەسیاسەتێکی گونجاو، دەستی پیاوماقووڵان و خراپەکارانی لەسەر کۆمەڵانی خەڵك کورتکردەوە. سەردار ڕەشید کە لەهەڵاتن و ڕاکردن و دەربەدەری و ڕۆشتن بۆ بەغداد و شوێنەکانی دیکە هیچ ئەنجامێکی دەستنەکەوتبوو، دووبارە پەنای بۆ شێخ حیسام ئەلدین برد تا لای دەوڵەت تکای بۆ بکات. ڕۆژی ١٨ زیحەججە، سەردار ڕەشید بەهاوڕێیەتی شێخ عوسمان کوڕی شێخ حیسام ئەلدین هاتە کوردستان. سەردار ڕەشید لەماڵی ئاسف و شێخ عوسمان لەهاجەرخاتوون نیشتەجێ بوو. زاناکان و بازاڕییان و پیاوماقووڵان سەردانی شێخ عوسمانیان کرد بەڵام سەردار ڕەشید لەبەر ئەوەی لەماڵی ئاسف بوو، کەس سەردانی نەکرد. تەنانەت ئیعتیزاد ئەلدەولە و وەکیل ئەلمولك و وەکیل ئەلسوڵتانیش سەردانیان نەکرد. سەرئەنجام بڕیارماندا سەردار بێتە مزگەوتی گەورە تا لەوێ چاومان پێی بکەوێت. دوای هاتنی ئەو بۆ مزگەوت، ئێمەیش ڕۆشتینە مزگەوت. لەوێ چاومان بەیەك کەوت و بۆ بەیانی، زۆربەی دانیشتووانی شارەکە، سەردانیان کرد. دوای چەند ڕۆژ لەکۆتایی ئاڵوگۆڕ کردنی چەندین بروسکە بۆ تاران، سەرداری فەرمانڕەوا ئەوی ڕەوانەی تاران کرد. شێخ عوسمان بۆ هەورامان گەڕایەوە. بەڕێزێکی زۆرەوە شێخ عوسمانمان بەڕێکرد. مزگەوتی دارئەلئیحسان لەڕووخان نزیك ببوویەوە. سەردار ئینتیسار نۆژەنی کردەوە و منارەکانی ڕووخاند و سەر لەنوێ دروستی کردەوە. ئەو شێعرەی سەبارەت بەمزگەوتەکە نووسیم، مێژووی دروستکردنی مزگەوتەکەیە. لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو، هەڵبژاردنی شارەوانییەکان دەستپێکرد. خەڵکان دەیانویست بەدانی بەرتیل و ریشوە، سەرنجی ئەو بەلای خۆیاندا ڕاکێشن بەڵام بەهیچ جۆرێك شەرافەتی خۆی لەدەستنەدا و بارودۆخی بەشێوەیەك ڕەخساند هەڵبژاردنێکی بێ غەش و یاسایی ئەنجامبدرێت و کەس دەست لەکاروبارەکانی تایبەت بەهەڵبژاردن وەرنەدات. لەئەنجامی

چاودێری کردنی ئەو، ئەو کەسانەی دەیانویست بەرتیلی پێبدەن، شکستێکی ڕیسوایانەیان خوارد و خەڵکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. ئەوان لەم شکستەی خواردیان، لەخەوی بێ ئاگایی هەستان و بۆ هەڵبژاردنی خولی شەشەمی مەجلیس، هەستیان بەوە کرد ئەگەر هاوکارییەکانی دەوڵەت نەبێت، هەمیشە کەمینە دەبن و کەمترینی دەنگەکان بەدەست دێنن. بۆیە ئەو بەرتیلەی پێشکەش بەسەرداریان کرد و پێی ڕازی نەبوو، لەتاران دایان بەدەلاڵانی مەملەکەت فرۆش و ئەویان لەحکومەتی کوردستان دوورخستەوە.

ڕۆژی ۲۷ رەبیع الاوەلی ۱۳٤٤، بروسکەی لەسەر کار لابردنی سەردار و فەرمانڕەوایەتی میرزا سلێمان خان گەیشت. ڕۆژی پێنجشەممەی ٤ رەبیع ئەلثانی، سەردار ئینتیسار شەرافەتمەندانە بەرەو تاران بەڕێکەوت.

دوای ڕۆشتنی ئەوان، باری نائاسایی لەکوردستان ڕاگەیندرا. بروسکەخانە و پۆستخانە کەوتە دەستی نیزامییەکان و ئێمە لەدنیا و ڕووداوەکان بێ ئاگاماینەوە. دوای ماوەیەك باری ئاسایی هەڵگیرا و لافاوی هەواڵەکان چاپ و بڵاوبوونەوە. دەرکەوت ئازەربایەجانییەکانی نیشتەجێی تاران، کۆمسیۆنی بزوتنەوەی نیشتمانییان لەتاران دامەزراند و کوردستانییەکانی نیشتەجێی تاران، دەستەیەکیان بەناوی دەستەی یەکگرتووی کوردستان پێکهێنا و ڕۆژی ۹ رەبیع ئەلثانی، شۆڕشی نیشتمانی لەتاران دەستپێکرد و هەموو چین و دەستەکانی خەڵك لەقوتابخانەی نیزام و دەوڵەتسەرای سەرداری سوپا، کۆبوونەوە و بەهۆی ئەو، داوای ڕووخانی سەڵتەنەتی قاجاریان کرد. سەردار سوپا لەناو هەموو دەستەکان و چینەکانی خەڵك، ڕوودەکاتە دەستەی یەکگرتووی کوردستان و ئەم وتارە دەخوێنێتەوە:

### وتاری سەرۆکی دەوڵەت

من، کەئێرانییەکی وڵاتپەرەست و چاکەخوازی هەموو خەڵکان بووم و هەم، لەهەر بابەتێك بۆ چاکسازی کردنی کاروباری وڵات هەموو هەوڵەکانی خۆم دەخەمەگەڕ و بۆ بەدەستهێنانی ئاسایشی گشتی بۆ ئێرانییەکان، داوای هاوکاری لەخوا دەکەم و لەم شێوەدا هەمووتان لێپرسراون لەوەی هەمیشە چاودێری من بکەن و ئاگاتان لەمن بێت تا بۆ چاکسازی هەر گەندەڵکارییەك، بەتەواوی تێبکۆشم و ئەگەر نائاگا، لەئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانم، کەمتەرخەمی یا بێ ئاگایی بینرا، بوێرانە و خۆڕاگرانە من بۆ ئەنجامدانی ئەرکە

نیشتمانییەکانم ناچار بکەن.

ئەم وتارە کاریگەرییەکی گرنگ لەسەر هەموو چین و دەستەکانی خەڵك دادەنێت. دواتر هەواڵ گەیشت کەکۆمیسیۆنی بزوتنەوەی نیشتمانی ئازەربایەجان، ڕۆژی پێنجشەممە ١١ ڕەبیع ئەلثانی، وەکیلەکانی خۆیان لەقوتابخانەی نیزام دەستبەسەر کردووە. ئێمەیش ڕۆژی هەینی ١٢ ڕەبیع ئەلثانی لەمزگەوتی گەورە، کۆبوونەوەیەکی گەورەمان بۆ لابردنی قاجارییەکان سازدا، دوای ئەوەی لەمزگەوت هاتینەدەر، ڕژاینە بروسکەخانە و بروسکەیەکی تێروتەسەلمان بۆ دەستبەسەر کردنی وەکیلەکانی کوردستان و پچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ ناوەند بۆ سەرۆکایەتی وەزیران ڕەوانە کرد. دواتر بروسکەخانەمان تالان و دەستەمان بەسەر هەموو دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا گرت و سەرۆکی دامەزراوەکانیان هێنایە ناو خەڵك. سەرکردەکان کە لەسیاسەت بێ ئاگا بوون، لەو بارودۆخە چاوەڕواننەکراوە تووڕە بوون و بەشێوەیەکی نهێنی ناڕەزایی خۆیان دەربڕی. گومانیان دەکرد لەلایەن میالەتەوە ئیهانە کراون. ئێمەیش گرنگیمان بەبۆڵەبۆڵەکانی ئەوان نەدا تا ئەوەی لەڕۆژی ١٣ ڕەبیع ئەلثانی هەواڵمان پێگەیشت مەجلیسی شۆرای نیشتمانی، بەپێی ماددەیەکی دانراو، بەڕەسمی کۆتایی بەسەڵتەنەتی قاجار هێناوە و حکومەتی کاتی بەسەرۆکایەتی سەرداری سوپا دامەزراندووە و دووایین بڕیاریان بۆ بڕیاری کۆتایی، بۆ مەجلیسی دامەزرێنەران گەڕاندۆتەوە.

ڕۆژی یەکشەممە ١٤ ڕەبیع ئەلثانی، محەممەد حەسەن میرزای جێگری سەڵتەنەت، لەدەربار دەردەکرێت و بۆ فەرەنگ دووردەخرێتەوە.

ڕۆژی ١٥ ڕەبیع ئەلثانی، جەژنی سەرکەوتن دەستپێدەکات و هەموو بازاڕ و دووکانەکان دەڕازێنرێنەوە. منیش ئەم بروسکەم بەمەبەستی پیرۆزبایی کردن ڕەوانە کرد:

١٥ ڕەبیع ئەلثانی، بۆ پاشای خاوەن دەسەڵات، ژیانێکی بەردەوام و بەختەوەر، پاشا، بەیانی هەتاوی دەوڵەت، تیشك دەپرژێنێت تا ئێواری. ئەوەی دەیبینم نازانم بێدارییە یا خەو. لەکۆتایی ڕۆژگاری ڕەشی قاجار، لەناخەوە پیرۆزبایی ئەم بەیانییە پەهلەوییە دەکەم، سپاس بۆ خوا، ئەوەی داوامان کرد لەخوا، هاتەدی و بەختەوەر بووین. (محەممەد مەردۆخ، سەرۆکی بزوتنەوەی نیشتمانی)

وەڵامی تاران بۆ کوردستان، ژمارەی ١٢٦٩٨، ژمارەی بروسکە ١٢، بەرواری گەیشتن ١٤

ئابانی ١٣٠٤: بەڕێز شێخ محەممەدی مەردۆخ، سەرۆکی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردستان، لەدڵەوە خۆشحاڵی خۆم بەرابەر بەهەستەکانی ئێوە دەردەبڕم. (سەرۆکی حکومەتی کاتی و سەرۆکی هەموو هێزەکان، ڕەزا).

بروسکەیەکیشمان بەناوی دامەزرێنەرای بزوتنەوەی نیشتمانی ڕەوانە کرد و ئەم وەڵامەمان دەستکەوتەوە: لەتارانەوە بۆ کوردستان: ژمارەی ١٢٦٩٩، ژمارەی بروسکە ١٣، دامەزرێنەرانی بەڕێزی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردستان، شادومانی خۆمان لەهەستی ئێوە دەردەبڕین و بەخواستی خواوەند لەئەنجامی چاکسازی لەوڵات، هۆکارەکانی ئاسایشی گشتی ئامادە دەکەین. (سەرۆکی حکومەتی کاتی و سەرۆکی هەموو هێزەکان، ڕەزا)

## حکومەتی میرزا سلێمان خانی مەیکەدە

دوای لابردنی سەردار ئینتیسار لەفەرمانڕەوایەتی کوردستان، شەوی هەینی ١٩ ڕەبیع ئەلثانی ١٣٤٤، ١٤ دووپشکی و ١٥ ئابانی ١٣٠٤، میرزا سلێمان خان وەك فەرمانڕەوا هاتە کوردستان. خەم و پەژارەی دانیشتووان لەڕۆشتنی سەردار ئینتیسار تەنیا بەهاتنی میرزا سلێمان خان هێور دەبوویەوە.

دوای هاتنی سلێمان خان، ئاسف و شوێنکەوتەکانی ئاسف، بەهەستکردن بەوەی ڕۆژەکانی هەڵبژاردنی خولی شەشەم نزیك بۆتەوە، دەوریان گرت و ویستیان ئەو، لەخۆیان نزیك بکەنەوە. بەڵام ئەم فەرمانڕەوایە، پێگەی بێ لایەنی خۆی، کەشیاوی هەر فەرمانڕەوایەکە پاراست و لێیان نزیك نەکەوتەوە. سەبارەت بەبزوتنەوەی نیشتمانی و پێشکەوتنی و بەدیهاتنی مەبەستەکانی، لەبەر ئەوەی بینیان قاجار و شوێنکەوتەکانی قاجار شکستیان خوارد و شۆڕشگێران سەرکەوتنیان بەدەستهێنا و سەردار، پێگەی سەرۆکایەتی بەدەستهێناوە و سەرقاڵی بەدەستهێنانی تاج و تەختە، بۆ سڕینەوەی رابردووی خۆیان، بەنهێنی بڕە پارەیەك بەسەرهەنگ ئەحمەد خان، سەرۆکی سوپا و سەرۆکی بروسکەخانە دەدەن و مۆڵەت وەردەگرن و بێ ئەوەی بڕواپێکراو بێت، کۆمیتەیەك لەم کەسانەی خوارەوە پێکدێنن:

سەیید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلام، شێخ شوکراللەی پێشنوێژ، شێخ ئەحمەدی غیاسی، وەکیل ئەلسوڵتان، ساعید ئەلسوڵتان، میرزا ئیسماعیل خانی موعتەمیدی و ئیعتیزاد

ئەلدەولەی کارگوزار.

هەروەها مۆرێك بەناوی کۆمیتەی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردستان دروستدەکەن و بەو مۆرە، بێ ئاگادار کردنەوەی من و خەڵکان بەگشتی، لە٢٢ رەبیع ئەلثانی بروسکەیەك و لە ٢٣ مانگ، بروسکەیەکی دیکە ڕەوانە دەکەن. لە٩ جومادی الاوەل، لەتارانەوە هەواڵی ئەم پیلان و دزییەم پێگەیشت. ڕۆژی ٦ ئازەر، دوو نامەی توندم یەکیان بۆ بەڕێوبەرایەتی ئاسایش و ئەوی دیکە بۆ بروسکەخانە نووسی و ئەم سکاڵانامەی خوارەوە بۆ خودی ڕەزاخان بەمۆری کۆمسیۆنی بزوتنەوەی نیشتمانی و واژۆ کردنی دامەزرێنەرانی ڕەوانە کرد و نوسخەیەکمان بۆ ئەمیری لەشکر سەرتیپ خوزاعی لەکرماشان نارد:

## دزینی کۆمسیۆنی ڕاستەقینە، یا دەرکەوتنی کۆمیتەیەکی درۆینە

شای شاکان، دوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن و کۆتایی بزوتنەوەکە، سێ بروسکەی درۆینە بەمۆری کۆمیتەی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردستان بۆ ئاوەند و کرماشان ڕەوانە کراوە، بەپێویستم زانی لەزووترین کات ئێوەی لێ ئاگادار بکەمەوە. لەسەرەتای بزوتنەوەکە لە ١٥ ئابان، بزوتنەوەی نیشتمانی لەکوردستان لەم هەشت کەسەی خوارەوە کەدامەزرێنەرانی بزوتنەوەکەن بەسەرۆکایەتی خۆم، دامەزرا و هەرکام بەپێی بڕوانامەیەکی ڕەسمی، لەچینە جیاوازەکانی شار و نەتەوە جیاوازەکان، هەڵبژێردران:

بەڕێز شوجاع لەشکر، نوێنەری تایەفەی ئەردەڵان

بەڕێز ئەمجەد ئەلئەشراف، نوێنەری ئەشراف و سەییدەکان

بەڕێز حاجی ئیعتیزاد ئەلئیسلام، نوێنەری شێخەکان

بەڕێز حاجی قەوام ئەلتوجار، نوێنەری بازرگان و بازاڕییەکان

بەڕێز حاجی خان، نوێنەری خاوەن زەوییەکان

بەڕێز محەممەد شەریفی زەهتاب، نوێنەری مسکێنەکان وسەندیکاکان

بەڕێز میرزا ئێستێپان، نوێنەری کاتۆلیکەکان

بەڕێز دوکتۆر ئاقابرا، نوێنەری کەلیمییەکان

پاشای خۆشەویست، ئەم کۆمسیۆنە تا پانزەی ئابان، بەڕێکوپێکی کاروبارەکانی خۆی ئەنجامداوە و هەموو زیان و زەرەرەکانی لەئەستۆ گرتووە و بروسکە و نامەی بۆ هەموو شوێنێك ناردووە و چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی ڕەسمی گرێداوە و لەبەرابەر نەیاران و

ناحەزان، هەموو جۆرە چالاکییەکی بوێرانەی لەخۆی نیشانداوە. لەڕۆژی هەینی ٨ ئابان، ڕۆشتینە مزگەوتی گەورەی شار و کۆبوونەوەیەکی گشتیمان گرێدا و بەشێوەیەکی ڕەسمی ناوی پاشامان (ڕەزاخان) لەوتارەکەماندا خوێندەوە و دوای نوێژی هەینی، ڕۆشتینە بروسکەخانە و دەستمان بەسەر دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا گرت و پەیوەندییمان لەگەڵ ناوەند پچڕاند و ڕۆژی ٩ ئابان کاتێك مژدەی سەرکەوتنی میللەت و ڕووخانی قاجار گەیشتە کوردستان، جەژنی سەرکەوتنمان گێڕا و ڕۆژی ١١ ئابان، دووکان و بازاڕەکانمان ڕازاندەوە و ڕۆژی ١٥ مانگ، کۆمسیۆنمان هەڵوەشاندەوە و بروسکە ناردن بۆ ولایەتەکان و ناوەند، وەستێنرا. دواتر دەرکەوت چەند بروسکەیەك بێ ئاگاداری کۆمسیۆن و دامەزرێنەران، بەناوی کۆمیتەی بزوتنەوەی نیشتمانی بۆ ناوەند و کرماشان ڕەوانە کراوە.

پاشای خۆشەویست! داوا دەکەم بپرسن دوای کۆتایی کارەکان و بەدەستهێنانی سەرکەوتن و هەڵوەشاندنەوەی بزوتنەوە، کۆمیتەی بزوتنەوە بۆ چ مەبەستێك دروستکراوە و مۆری کۆمیتە بۆ چ مەبەستێك هەڵکەنراوە؟ ئەندامانی کۆمیتەکە کێن و لەکام چینانە پێکهاتوون؟ بڕوانامەی ئەوان لەکوێیە؟ و سەرئەنجام ئەو کۆمیتەیە بۆچی لەکاتی بزوتنەوەکە و گیانبەخشینی ئێمە خۆیان شاردبوویەوە و ئێستا دەرکەوتوون؟

پاشای بەڕێز! ئەندامانی ئەم کۆمیتە درۆینە، لەکاتی بزوتنەوەکە، دژی بزوتنەوەکە و ئەندامەکانی بوون و جگە لەوان کەس دژایەتی ئێمەی نەدەکرد و بەتەواوی لایەنگری قاجار و نەیاری وشەی پەهلەوی بوون. ئێستا چی ڕوویداوە لەبۆچوونەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە و ئاشنایی خۆیان لەگەڵ وشەی پەهلەوی نیشان دەدەن؟

پاشا! یەکەمجار بروسکەخانە بەناردنی ئەم بروسکەیە ڕازی نابێت، دواتر چی ڕوویدا و لەکوێوە فەرمان بەبروسکەخانە درا کەناچار بروسکەکەی ناردووە و دەرکردنی ئەم فەرمانە لەپێناوی چی و لەبەرابەر وەرگرتنی چ بڕە پارەیەك بووە؟

داوا دەکەین لێپێچینەوەی پێویست بکەن تا لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکان، زنجیرەیەك ڕاستی گرنگ و ڕووداوی مێژوویی بۆ بەڕێزتان ئاشکرا ببێت و بتوانن خزمەتکار و نەیارەکانی خۆتان بناسن.

پاشای خۆشەویست! ئەم کۆمیتەی دزییە، بۆ ناساندن و سەلماندنی بێ شەرەفی و بێ شەرمی ناحەزانی کوردستان بەسە و پێویست بەبەڵگەی دیکە ناکات چوونکە لەهیچ

شوێنێکی دنیا، تەنانەت لەبەرپەرستان، کردەوەی وەحشیانەی لەمشێوەیە نەبیستراوە و نەبینراوە کەلەم خراپەکارانەوە سەرچاوە دەگرێت.
پاشای بەڕێز! من و هاوەڵانم تەنیا پشت بەوشەکان نابەستین و لایەنگری کردارین. لەبەر ئەمە زۆر ئارەزوومەند و خوازیاری ناوی کۆمسیۆن بزوتنەوە یا کۆمیتەی بزوتنەوە نین. مەبەستی ئێمە تەنیا و تەنیا گرتنە دەستی دەسەلأت لەلایەن ئێوەوە بوو کەسپاس بۆ خواوەند هاتەدی. چیتر هەرکەس بیەوێت بۆ قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوو و سڕینەوەی هەڵە و تاوانەکانی خۆی، بەپێچەوانەی ڕاستی هەر وشەیەك بدزێت، ئێمە نیگەران ناکات. نیگەرانی ئێمە بۆ زەحمەت و هەوڵەکانی چوارساڵەمانە کەکەسە بێشەرم و بیٚ حەیاکان وەك ناوی کۆمیتەکە، نەیخەنە پاڵ خۆیان و سەری ئێمە بیٚ کڵاو بمێنێتەوە.
پاشای بەڕێز! من و هاوەڵانم بەپێی ویژدان و لەڕووی بۆچوون و باوەڕ، بەم بارودۆخە گەنیوە، بۆ پێشکەوتنی نییەت و بۆچوونە ئێرانخوازانەکانی ئەو تاقانە کوڕە بوێرەی وڵات، هەموو جۆرە فیداکارییەکمان کرد و لەئەنجامدانی هیچ کارێك کەمتەرخەمیمان نەنواند. ئێستا دەستەیەك لەکەسانی بیٚ شەرم و تەشقەڵەچی کەسەردەمانێك هەموو جۆرە لەمپەرێکیان لەسەر ڕێگە دروست دەکرد، دەیانەوێت بەفێڵ و تەڵەکە پێشکەون و خۆیان بەمەحرەم و ئێمە بەنامەحرەم بناسێن.
کەسانی فێڵباز، لەبەکار بردنی نەنگینترین کەرەستەکان خۆیان بەدوور ناگرن دەخوزان بەهەموو جۆرە کاسەلێسی و ڕیاکارییەك، بەرپرسەکان فریوبدەن و بیانکەنە ئامێرێك بۆ پێشخستنی مەبەستە گڵاوەکانی خۆیان بەڵام بەپێچەوانەوە کەسانی نییەت پاك، کەلەمپەرە ئەخلاقییەکان ڕێگەی درۆ و فێڵکردنیان لێدەگرێت، چاوەڕوانن لێپرسراوانی کاروبار لەکاروکردەوەکانیان وردببنەوە و بەمشێوەیە خزمەتکاران و خیانەتکارانی وڵات جیابکەنەوە.
پاشای خۆشەویست! ئەزمون ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کەهەر شۆڕش و گۆڕانێك لەئێران بێتە ئاراوە، بەخێرایی دەستەیەك جادووگەری فێڵباز، دەستەیەك خیانەتکار، کە بەهەموو شێوەیەك ماڵئاواییان لەشەرم و حەیا و ئەخلاق کردووە، هاوشێوەی خەس و خاشاك دێنەبەر و کەسانی خاوەن شەرەف و ڕاستکردار دادەپۆشن و بەمشێوەیە هەستەکانیان هاوشێوەی گەوهەرێکی گرانبایی لەقووڵایی دەریای شەرم و حەیا ون دەبێت و

لەناودەچێت.

پاشای خۆشەویست! کەڵەکبازان کە دەستی سروشت یا بازووی هێز، ئەمڕۆ مەحکوم بەشکستی کردووم و لەترسا هاوشێوەی ئەسپێ دەخزێنە بن باخەڵ، ئەگەر خواینەکردە، بارودۆخ بەشێوەیەکی دیکە دەبوو، هەرکام لەوان بۆ ئێمە دەبوونە ئەژدهیا و حەفیایەکی حەوسەر.

خیانەتکارانی ئێران بەگشتی و هەوسپەرستەکانی کوردستان بەتایبەتی، ڕازی بون چەندین قات لەژێر زەوییەوە بن بەو مەرجەی وشەی پەهلەوی نەبیستن.

لەکۆڕ و کۆبوونەوەکان، هەرجار کەئەندامان و لایەنگرانی بزوتنەوەکە دەنگی ((زیندوو بێت پاشای پەهلەوی))یان بەرز دەکردەوە، هاوشێوەی خەنجەر لەدڵی ئەوان دەچەقی و بەئاشکرا، تاروپۆی دڵیان لەیەك دەپچڕا.

خیانەتکاران دوای ئەوەی بینیان بەتەواوی هەموو شتێکیان لەدەستداوە و بەرەو هەڵدێری نەمان دەڕۆن، بێ ئامادەکردنی پێشەکی، بەنهێنی ڕۆشتنە لای سەرۆکی هێزەکان و دەستەمۆیان کرد. دواتر بێشەرمانە، وشەی بزوتنەوەی نیشتمانییان دزی تا لەمڕێگەوە قەڵغانێك بۆخۆیان دروست بکەن.

پاشا! سپاس بۆخواوەند کەهەموو شتێك بەخێر و خۆشی کۆتایی هات. وەگەرنە لەبەرابەر نەیاری کردنی و کۆسپ و تەگەرەکانی خیانەتکاران و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوان بەتایبەت ئەگەر سەرۆکی هێزەکانیشیان لەگەڵ بێت، کارێکی سادە و سانا نەبوو. تەنیا ئێمە بووین، بەهێزی خۆڕاگری و سەبر، توانیمان بەبەستێنی ڕزگاری بگەین.

سەرۆکی هێزەکانی کوردستان، لەسەرەتاکانی هاتنی، پەرێشان و شیاوی بەزەیی بوو، شەو وڕۆژەکان چاوەڕوانی کۆتایی مانگ بوو هاوشێوەی کەسێکی نیزامی کەئەرکەکانی خۆی بەباشی دەزانێت بەڵام ئێستا کە لەهەموو ڕەهەندێکەوە بێ نیاز بووە، دەخوازێت لەئەرکەکەی دوور بخرێتەوە چوونکە چەند گوندێکی کڕیوە و دەیەوێت پاشماوەی تەمەنی بەئاسوودەی بەسەر ببات.

پاشا! خوازیارم هەمیشە لەنهێنی و چالاکی لێپرسراوانی دەوڵەت بەدوور بم و بێدەنگی هەڵبژێرم بەڵام چی بکەم ویژدان و هەستەکانم ئەو ڕێگەم پێنادەن.

لەبەرابەر خزمەت، بێدەنگ بوون و چاوپۆشی کردن لەخیانەت، خیانەتکار بوێر و

خزمەتکار بێ هیوا دەکات.

پاشا! کاتێك وسوق ئەلدەولە، لەپۆستی سەرۆك وەزیران دوورخرایەوە، بەهاوەڵانی خۆی وت: هەرچەند بیر دەکەمەوە، لەسیاسەتدا هیچ جۆرە هەڵە و تاوانێکم شك نابەم جگە لەوەی لەکاتی فەرمانڕەوایەتی، تەنیا گرنگیم بەڕاکێشانی سەرەنجی دوژمناندا و هاوڕێکانم لێم ڕەنجان. دوژمنانیش ئەم دەرەفەتەیان قۆستەوە و دەوڵەتەکەی منیان ڕووخاند.

پاشا! من گرنگی بەهەوڵ و زەحمەتەکانی خۆم وکەسانی وەك خۆم نادەم، بەڵام بەداخم لەوەی کەسێکی خودی یا بێگانە گومان بکات، لەقۆناغی پەهلەوی، ڕاستییەکان دەشاردرێتەوە و لای ئێوەیش خزمەتکار و خیانەتکار، هاوشێوەی یەك گرنگییان پێبدرێت.

پاشا ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کەئەمڕۆ بارێکی گران و قورس کەوتۆتە سەرشانیان. نەتەوەی ئێران بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پاشای پەهلەوی، لەهیچ هەوڵ و کۆششێك درێغیان نەکرد و درێغ ناکەن. ئێستا کاتی ئەوەیە پاشا بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەوان و پاراستنیان لەمەبەست و خیاڵە مەترسیدارەکانی خیانەتکاران و دوژمنان، لەهیچ هەوڵ و کۆششێ درێغ نەکەن.

پاشای خۆشەویست! لەکۆتایی نامەکە و هەستەکانم، هیوادارم ڕێز لەم هەستە هاوڕێیانە بگرن و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر سەرەنجی کۆمەڵگا بەلای خۆتانا ڕابکێشن.

بەئەزموون دەرکەوتووە دەسەڵات و پشتیوانی هەر پاشایەك، تەنیا و تەنیا هەستی کۆمەڵگاکەیەتی. هاوڕێیەتی و هاوکاری دەرەوەی کۆمەڵگا، کاتی و بۆ بەرژەوەندی تایبەتە.

ئەمڕۆ ڕۆژێکە لەمە بەدوا کۆمەڵگای ئێران، چاوەڕوانی وەڵامدانەوە لەپاشای ئێران دەکەن. ئەمڕۆ ڕۆژێکە بەهاوپەیمانی دەوڵەت و میللەت، بەختەوەری و شکۆ و مەزنی ئێران دەبێت دەستپێبکات.

لەنەخشەی سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵات، تەنیا ڕووخانی دەوڵەتی قاجار بەس نییە بەڵکو گرنگترین مەرج و فەرمانی سەرەکی، کۆتایی هێنان بەژیان و هەستی بەکرێگیراوەکان و شوێنکەوتەکانی ئەوانە. ئاشکرایە تا ڕەگ و ڕیشەی داری کۆنی ڕزیو، بەتەواوی لەناو نەبرێت، گوڵە ناسك و قەشەنگەکان و نەمامەکانی گوڵستانی وڵات چرۆ ناکەن.

پاشا! هیچ پلە و ئەندازەیەك بۆ بەدبەختی و هەژاری کوردستانییەکان بوونی نییە. ئەگەر بەخێرایی ڕێگەچارەیەکی گونجاو نەگرنەبەر، ئەوەی ماوەتەوە، سەر دەخاتە سەر سەرینی

مەرگ و نەمان و پەیوەستی کەسانی پێش خۆی دەبێت.

نەتەوەی شیاوی بەزەیی کوردستان، گرفتاری دەستی کەسانێك بوو کەخۆشبەختانە یا بەدبەختانە، ژمارەیان لەسێ کەمتر نییە و لەچواریش تێناپەڕێت. بەوتەیەکی دیکە هەموو کەرەستەکانی بەدبەختی و گەندەڵی کۆمەڵایەتی کوردستانییەکان، تەنیا و تەنیا لەچوار قیافەی ناحەز سەرچاوە دەگرێت کەئەگەر لەهەر کەس بپرسی، بێدرەنگ ناوی ئەوانت پێدەڵێت.

دەستدرێژی ئەم قیافە ناحەزانە، لەم سەدەی ژیانەوە، لەسەدەی پەهلەوی، دەبێتە هۆکاری سەرسوڕمانی پێشکەوتنخوازان چوونکە ڕووخسار و قیافەی ئەوان، لەنمایشگای پەهلەوی، نەك جیاواز، بەڵکو ناحەز و نەویستە.

ئێمە حاشا لەوە ناکەین کە بەمەبەستی چاکسازی و گۆڕانکارییە پێویستەکان، کاری گەورەتر و گرنگترتان لەبەردەمدایە کە ئەم بابەتانە کەم بەهاتر دێنەبەرچاو، بەڵام لەیاسای ئەندازیاری، تا لەت و پەت و وردە و پردە بەکار نەبرێت، تاشەبەردە گەورەکان جێگەی خۆیان ناگرن.

ئەم دەستە ستەمکارە بێویژدانە، بەردەوام هاوشێوەی کەسانی خاوەن ماف، خوێنی میللەتیان مژیوە و بیریان لەئامانج و مەبەستەکانی خۆیان کردۆتەوە.

خەڵکان هاوشێوەی ڕانەمەڕێکن و پاشا هاوشێوەی شوانی ئەوان و خیانەتکاران هاوشێوەی گورگ پڵەنگ. ئەگەر شوان لەئەرکی شوانی خۆی بێ ئاگا و کەمتەرخەمی بەخەرج بدات، لەماوەیەکی کەمدا ڕانەمەڕەکەی لەدەستدەدات. بەزەیی هاتنەوە بەپڵنگ، ستەمکارییە لەمەڕ.

پاشای بەڕێز! ڕاشکاوانە پێتان دەڵێم، ئەمڕۆ ژیان و هەستی کوردستان پەیوەستە بەفەرمانێکی شایانە و دەستورێکی میللەت پەروەرانەی تاکە سەرچاوەی دەسەڵات. یا زیندوومان کەنەوە، یا کۆتایی بەهیوا و ئاواتەکانمان بێنن.

ماوەی چوار ساڵە ئێمە بەهیوا و ئارەزووی سادە وساکار، بەدەوری زاتی پیرۆزی تۆدا دەسوڕێینەوە، چی دەبێت ئەگەر زاتی بەڕێزتان چوار خولەکی کاتی گرانبایی خۆتان بۆ چاکسازییەکانی ئەم وڵاتە کاولە تەرخان بکەن. خوا تۆڵەدەستێنێت لەو کەسانەی دەیانتوانی چارەی دڵی ئێمە بەنازێك بکەن و نەیانکرد.

پاشا! ناتوانم ئەم خاڵەیش لەبیر بکەم کەکەسانی شارەزا لەگەمەی سیاسەت، ناتوانن تەنیا

بەوەڵامێکی گونجاو، لەئەنجامدانی مەبەست، چاوپۆشن، بەڵکو بەهەموو هەستەکانی، چاوەڕوانی بەدیهاتنی بەرهەمی فەرمانەکەی دەبێت. لەکۆتاییدا، هیوادارم پاشا گرنگی بەچاکسازی ویلایەتی کوردستان بدات. والسلام علیکم و رحمةالله و برکاته (محەممەد مەردۆخ)

کاتێك نامەکەی بۆ پاشا دەخوێندرێتەوە، لەوەڵامدا دەڵێت: لەهەستەکانی فلانی شادومانم، دڵنیایی بکەنەوە کەپێشنیارەکانی بەتەواوی هاوشێوەی بۆچوونەکانی خۆمە و هەموویان لەکاتی خۆیدا جێبەجێ دەکرێن.

بۆ ئەندامبوونی مەجلیسی دامەزرێنەران لەکوردستانەوە، بەڕێزان مەلا عەبدولفەتاحی شێخولئیسلام و ئەسەد الله خانی کوردستانی و عەبدولحەمیدخانی سنەیی و دوکتۆر هیدایەت الله خان، زاوای سەرۆکی هێزەکانی کوردستان، هەڵبژێردران. ڕۆژی یەکشەممە ١٩ جومادی الاوەلی ١٣٣٤، ١٥ ئازەری ١٣٠٤، مەجلیسی دامەزرێنەران لەتاران کرایەوە و ڕۆژی یەکشەممە ٢٦ جومادی الاوەل، پێنجەم دانیشتنی ئەو مەجلیسە سازدرا و ماددەکانی ٣٦و٣٧و٣٨ دەستور هەڵوەشایەوە و ئەم ماددانەی خوارەوە پەسەند کرا:

ماددەی ٣٦: سەڵتەنەتی مەشروتەی ئێران لەلایەن میللەت، بەهۆی مەجلیسی دامەزرێنەران، بەشاهەنشا ڕەزاشای پەهلەوی دەسپێردرێت و بۆ منداڵە نێرینەکانی ئەو، وەچە دوای وەچە بەردەوام دەبێت.

ماددەی ٣٧: جێگر، گەورەترین کوڕی پاشا دەبێت بەو مەرجەی دایکی ئێرانی بێت.

ئەگەر پاشا منداڵی نێرینەی نەبێت، دیاریکردنی جێگر بەپێی پێشنیاری پاشا و قبووڵکردنی لەلایەن مەجلیسی نیشتمانییەوە دەبێت. بەڵام هەرکات پاشا کوڕێکی بۆ بێتە دنیا، دەبێتە جێگر.

ماددەی ٣٨: لەکاتی گواستنەوەی سەڵتەنەت، جێگر کاتێك دەتوانێت، خۆی جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست کەبیست ساڵی تەواوی کردبێت، ئەگەر هێشتا نەگەشتبێتە تەمەنی بیست ساڵی، بەپەسەند کردنی مەجلیسی نیشتمانی، جێگرێك بۆ ئەو دیاری دەکرێت (نابێت لەبنەماڵەی قاجار بێت).

دووای گۆڕینی ماددەکانی سەرەوە، لەهەمان ڕۆژ یانی ٢٦ جومادی الاوەل، لەلایەن مەجلیسی دامەزرێنەرانەوە، فەرمانی سپاردنی سەڵتەنەت بەڕەزاشا دەردەکرێت و ڕۆژی

سێشەممە ٢٨ جومادی الاوەل، ڕێوڕەسمێکی تایبەت بەم بۆنەیە، لەمەجلیسی نیشتمانی ئەنجام دەدرێت. ڕۆژی چوارشەممە ٢٩جومادی الاوەل، پاشا لەسەر تەختی پاشایەتی دادەنیشێت.

ئەوەی دەبوا لەجومادی الاوەل ١٢٧٣ ڕوویدات و ڕووینەدا، لەجومادی الاوەلی ١٣٤٤ ڕوویدا. سێ شەو و ڕۆژ لەهەموو ویلایەتەکان وشارەکان، بازاڕ و دووکانەکانیان ڕازاندەوە و خەڵکان بەخۆشحاڵییەوە، پیرۆزباییان لەیەکتر دەکرد. لەبیستی ڕەجەب، ڕەزاپور وەك جێگری سەڵتەنەت دیاریکرا و ڕۆژی پێنجشەممەی ٥ شەعبان، فەرمانی هەڵبژاردنی خولی شەشەمی مەجلیس دەرکرا. لەنیوەی کۆتایی ڕەمەزان، سەرهەنگ ئەحمەدخان، سەرۆکی هێزەکانی ئاسایشی کوردستان لەسەر کار لابرا و سەرهەنگ ئاقاخان جێگەی گرتەوە.

دواتر سەرتیپ محەممەد خانی شابەختی، ئەمیر لەشکر، هاتە کوردستان. ئەم ئەمیر لەشکرە، بەڕاستی شەکر، ڕۆحێك بوو لەمرۆڤایەتی و جوامێری کەس پێشی نەدەکەوت. ئەگەر لەترسی درێژدادڕی نەدەبوو، هەزاران ڕستەم بۆ وەسف کردنی دەنووسی. محەممەد خانی وەکیل ئەلمولك، لەم ڕۆژگارەدا لەتاران گەڕایەوە. ڕۆژی هەینی ٣ شەوالی ١٣٤٤، پڕوپاگەندەی هەڵبژاردنی خولی شەشەم دەستیپێکرد. نرخی گەنم لەخەرواری شەش تمەن بۆ ٣٢ تمەن بەرز بوویەوە.

سەبارەت بەهەڵبژاردنەکان لەنێوان ئاسف و دەستەکەی ئێمە، جیاوازی و دژایەتی هاتە ئاراوە، ئاسف لەم ناوەدا زیاتر لەپەنجا هەزار تمەن زەرەری کرد. ڕۆژی چوارشەممە ٢٢ شەوالی ١٣٤٤، جەژنی تاجگوزاری شاهەنشای پەهلەوی و شەوی پێنجشەممە، یارییە ئاگرینەکان و ڕازاندنەوەی شارەکان دەستیپێکرد. شەوی یەکەمی ڕازاندەوەی شار، میرزا حەبیب الله نەوبەری، کوڕی حاجی ئەبومحەممەد، بەنوێنەرایەتی خەڵکان و ئامادەبوونی لێپرسراوانی حکومی، وتارێکی بۆ پیرۆزبایی کردنی ئەم ڕۆژە پیرۆز و سکاڵاکردن لەئاسف و شوێنکەوتەکانی خوێندەوە و تاوانەکانی ئەم بنەماڵەی یەك لەدوای یەك بەئامادەبوونی کەسەکان هێنایە سەرزمان. جگە لەخودی ئاسف، هەموو ئەندامانی بنەماڵەی وەزیر و وەکیل، زەرد هەڵگەڕان و لەەو کاتژمێرەدا ئارەزووی مەرگیان دەکرد بۆ ئەوەی ئەو وشە و ڕستانە نەبیستن. دواتر حاجی محەممەد خانی سەردار هەستا و وتارێکی هاوشێوەی خوێندەوە. لە ٢٩ شەوالی ١٣٤٤، میرزا سلێمان خان لەسەر کار لابرا و نەسروالله خانی

ئیعتیلا ئەلمولك، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دەستنیشان کرا.

## حکومەتی نەسروالله خان ئیعتیلا ئەلمولک

دوای لابردنی میرزا سلێمان خان، نەسروالله خان خەلعەتبەری، وەك فەرمانڕەوای کوردستان دیاریکرا و ڕۆژ ی یەکشەممە، دەی زیقەعدەی ١٣٤٤ هاتە کوردستان. هەڵبژاردنی خولی شەشەم، سەرئەنجام بەهۆی کێشەی نێوان ئاسف و دەستەکەی دیکە، وەستێنرا و لەکوردستانەوە، وەکیل نەڕۆشتە مەجلیس.

ڕۆژی ١٥ ڕەمەزانی ١٣٤٥، شاهەنشای پەهلەوی، بۆ یەکەم جار هاتە کوردستان و لەخوسرەوئاباد شوێنی حەسانەوەی بۆ ئامادەکرا. دواتر بەپێی ئیرادەی شایانە، لەماڵی ئاسف نیشتەجێبوون. لەزاناکان حەوت کەس ڕۆشتنە خزمەتی: شێخ ئەحمەدی حوجەت ئەلعولەما، سەیید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلام، شێخ محەممەد جەعفەری حوجەت ئەلئیسلام، سەیید محەممەدی زەهیر ئەلئیسلام، سەیید میر فەتاح، مەلا محەممەدی نەودشی. ئەم حەوت کەسە وتاری پیرۆزبایی منیان خوێندەوە و دواتر هەرکام بەکورتی پیرۆزبایی و دۆعایان بۆ کرد. دواتر شاهەنشا لەوەڵامی مندا فەرمووی: من زیاد لەڕادە کوردستان و کوردستانیانم خۆش دەوێت و لەهەستی شاپەرەستی ئەوان شادومان و ڕازیم. ئەگەر ئەنجامدانی چاکسازی لەکوردستان تا ئێستا دواکەوتووە، بەهۆی گرنگیدان بەناوچە گرنگەکانی دیکە بووە. لەداهاتوویەکی نزیك، کوردستانیش لەهەموو ڕەهەندێکەوە پێشکەوتن بەخۆی دەبینێت. بڕیارمداوە ساڵی یەکجار بێمە کوردستان و چاوم بەئێوە بکەوێت. ئەگەر من کاتم نەبوو، ڕێگەی ئێوە کراوەیە و وەرنە تاران بۆ ئەوەی چاوتان بەمن بکەوێت.

دوای دوو ڕۆژ کەژاوەی شا بەرەو تاران بەڕێکەوت و لەکاتی ڕۆشتن، تەسبێحێکی سپیم وەك یادگاری پێشکەش کرد و وتم: ئەم تەسبێحە سپییە، دەست ڕەش ناکات. مەبەستی من بیرهێنانەوەی ئەو گفتوگۆیە بوو کە لەکاتی هاتنی بۆ کوردستان لەگەڵ سەردار موحیی، لەنێوان ئێمەدا کرا. چوونکە کەسێکی وشیار بوو، بەخێرایی بیری کەوتەوە و فەرمووی: بەڵێ تەسبێحەکەی ئێوە پیرۆزە. تەسبێحەکەی وەرگرت و فەرمووی: بۆ نایێتە تاران، جێگەی ئێوە لەوێیە. وتم: جارێ سەرەی کەسانی دیکەیە. هەرکات کاتی منیش هات، بەخزمەت دەگەم. ئەوانەی هاوڕێیەتیان دەکرد بریتیبوون لە: ئەمیر ئەعلەم، حاجی ئاغا ڕەزای

ڕەفیع قایم مقام ئەلمولك، ئەمیر نیزامی هەمەدانی، شکوە ئەلمولك، سەرۆکی کابینە و هتد..
حاجی ڕەزای ڕەفیع کوڕی حاجی مەلا مەهدی شەریعەتمەدار کوڕی حاجی مەلا ڕەفیعی شەریعەتمەداری ڕەشی لەساڵی ١٣٠٤ لەتاران چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، گەنجێکی وشیار و بلیمەت بوو. جیاواز لەزانستەکان، بەباشی بەزمانی ئینگلیسی قسەی دەکرد. لەسوسیتەیەکی نهێنیی لەگەڵ سەیید زیائەلدینی تەباتەبایی، کێشە لەنێوانیاندا دروست دەبێت و لەساڵی ١٣٦٦، بەفەرمانی سەیید زیا لەخیابانی شائاباد لەناو گالیسکەوە تەقەی لێدەکرێت. بەڕێکەوت گوولەکە بەر قۆڵی دەکەوێت و دوای ماوەیەك باش دەبێتەوە. سەرئەنجام سەیید زیا دوای وەرگرتنی پێگەی سەرۆك وەزیران، لەسوسیتە دەردەکرێت و ئاوارەی فەرەنگ دەبێت و قایم مقام ئەلمولك بوو بە جبرەئیلی وەحی. ڕۆژی بیست ڕەبیع الثانی ١٣٤٦، جەژنی پاچی پەهلەوی لەشارەوانی بەئامادە بوونی ئیعتیلا ئەلمولکی فەرمانڕەوا سازدرا و خەلیلی فەخری بەنوێنەرایەتی سالار موفەخەم، وتاری پیرۆزبایی خوێندەوە و هەموو چینەکانی خەڵك، شادومانی خۆیان دەربڕی. لەم ڕۆژەدا شاهەنشاهی پەهلەوی یەکەم پاچی ئیستاسیۆن (ڕێگەی ئاسن) شەمەندۆفێری لەزەویدا.

دواتر لە ١٨ شەعبانی ١٣٤٦، عەبدوڵڵەخانی ئەمیر تەهماسب هاتە کوردستان. یەکەم شەوی هاتنی بەهۆی سەرهەنگ حەسەن ئاقاخان، سەبارەت بەهەندێ کاروباری سەرسنوور چاوی بەمن کەوت و دوای دوو سێ ڕۆژ ڕێگەی سەقزی گرتەبەر.

شەوی دووشەممە بیستی شەعبانی ١٣٤٦، میرزا ئیبراهیم خانی سەردار بەنەخۆشی جەڵتە کۆچی دوایی کرد. لەم ڕۆژانەدا بەڕێزان سەرتیپ مورتەزاخان و سەرتیپ فەرەج الله خان هاتنە کوردستان. دوای ئەوەی ئەمیر تەهماسب لەسەقز گەڕایەوە، لەگەڵ شێخ عارف ڕۆشتە گوندی ئەویهەنگ و لەوێ چاویکەوت بەخانەکانی ڕەزاو و مەحمودخانی دزڵی و مەحمودخانی مەریوانی و بۆ شار گەڕایەوە. دواتر ڕۆشتە مەریوان و دزڵی و لهۆن و بەهەموو ناوچەکاندا گەڕا و لەگەڵ سەرۆکەکانی سەرسنور بەشێوەیەکی شیاو و گونجاو هەڵسوکەوتی کرد و دووربین و تفەنگی پێشکەش بەهەموویان کرد.

دوای ماوەیەك دووبارە سەرتیپ محەممەد خانی شابەختی، ئەمیر لەشکر هات و سوپای کوردستانی بەفەرماندەیی سەرهەنگ ئەسەد الله خان کەدوای سەرهەنگ حەسەن ئاقا خان هاتبوو، لەڕێگەی سورکوڵ بەرەو ڕەزاو ڕەوانە کرد و سالار موفەخەمی لەگەڵ

تفەنگچییەکانی ژاوەڕۆ بۆ هاوکاری کردنی سوپای دەوڵەتی نارد. جەعفەر سوڵتان لەگەڵ هێزەکانی خۆی هاتنە گوندی دەگادەگا. لەشەڕ و پێکدادانێکی کەم، ڕەزاو دەستی بەسەردا گیرا و خانەکان تەسلیم بوون. ئەگەر جەعفەر سوڵتان بۆ هاوکاری هێزەکانی دەوڵەت نەدەهات، بەم ئاسانییە هەورامانی ڕەزاو دەستی بەسەردا نەدەگیرا.

ڕۆژی ٢٥ شەوالی ١٣٤٦، سەیید عەبدولعەزیزی شێخولئیسلام و غولام حسەینی موشیردیوان و شێخ محێدینی ئەمین ئەلعولەما، لەڕێگەی ڕووسیاوە بەرەو حیجاز بەڕێکەوتن.

هەڵبژاردنی وەکیلەکانی خولی حەوتەم کەدەستیپێکردبوو، لەئەنجامی کێشەی نێوان ئاسف و شوێنکەوتەکانی و دانیشتووانی شار، بڕیاردرا لەبنەماڵەی ئاسف یەك کەس وەك وەکیل هەڵبژێردرێت و دوو کەس لەلایەن دانیشتووانەوە.

لەزیحەججەی ١٣٤٦، فەرەج الله خان سەرداری موعەزەم و محەممەد خان سالاری فاتح و میرزا ئیسماعیلی ڕەحیمزادە هەڵبژێردران و لە ٢١ زیحەججە، سەرهەنگ ئەسەدالله خان لەسەر کار لابرا و سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمینی جێگەی گرتەوە. مەحمودخان کەسێکی خوێندەوارە و کارامە بوو. ڕۆژی ١٦ ڕەبیع الاوەلی ١٣٤٧، حاجی شێخولئیسلام و حاجی موشیر و کەسانی دیکە گەڕانەوە و ڕۆژی سێشەممە ٣ ڕەبیع ئەلثانی، ئیعتیلا ئەلمولك لەسەر کار لابرا. هەواڵی مردنی شێخ عارف کە بەمەبەستی چارەسەر ڕۆشتبووە هەمەدان، ڕۆژی ٣ مانگ گەیشتە کوردستان.

## حکومەتی میرزا ئەحمەدخانی مەفخەم ئەلمولک

دوای لابردنی ئیعتیلائەلمولك، ڕۆژی ٤ جومادی الاوەلی ١٣٤٧، میرزا ئەحمەدخان نیکپەی وەك فەرمانڕەوا هاتە کوردستان. هاوکات لەگەڵ هاتنی ئەو، مەریوان بەفەرماندەیی ئەمیر تەهماسب دەستی بەسەرداگیرا. لەکۆتاییەکانی جومادی الثانی ١٣٤٧ میرزا سادق موجتەهیدی تەبریزی و میرزا ئەبولحەسەن و چەند کەسێکی دیکە لەزاناکان و سەییدەکانی ئازەربایەجان بۆ کوردستان دوورخرانەوە. لێرە هەموو ئامادەکارییەکانی میوانداری ئەو بەڕێزانەمان ئامادە کرد و بروسکەی بەخشینی ئەوانمان بۆ تاران نارد. ڕۆژی پێنجشەممە ١٤ ڕەجەب فەرمان هات ئەو بەڕێزانە ڕەوانەی تاران بکرێت و لەوێ لەگوناح و تاوانەکەیان خۆشبوون. ڕۆژی شەممە ١٦ ڕەجەب، کۆمیتەی نیزامی ئیجباری لەبەڕێزان شێخ

شوکروالله‌ی پێشنویژ و میرزا عەبدوڵڵەخانی موعتەمیدی و ساعید سوڵتان و موعتەمید ئەلئەشراف دامەزرا.

ڕۆژی یەکشەممە ۸ شەعبان، مەلا عەبدولعەزیزی موفتی، نوێنەری سەقز لەڕێگەی کرماشانەوە بۆ کێشەکانی سەردەشت کەسەبارەت بەجلوبەرگی یەکدەست و یەکرەنگ، مانیانگرتبوو، هاتە کوردستان و بەدژواری زۆر و لەناو بەفر و سەرما بەرەو سەقز بەڕێکەوت.

ڕۆژی ۲٦ شەوالی ۱۳٤۷، هەواڵمان بەدەست گەیشت کەئەمیری لەشکر ئەحمەد ئاقاخان، پێگەی سوپاسالاری پێبەخشراوە و ئەم بروسکەیەم بۆ خورەم ئاباد ڕەوانە کرد:

بۆ بەڕێز سوپاسالار، بەلوتفی شا و تواناییەکانی خۆتان، پێگەی سوپاسالاریت پێبەخشرا، لەگەڵ دنیایەك شادومانی، پیرۆزبایی ئەو پێگە بەرزت لێدەکەم و لەکۆتاییدا دەڵێم: ئەو بەڵێنانەی داوتە، لەبیر نەکەیت. (محەممەدی مەرۆدخ.)

ڕۆژی ٤ زیقەعدە، شازادە نوسرەت ئەلدەولە، وەزیری دارایی لەکرماشانەوە هاتە کوردستان و ڕۆژی ۲٦ فەروەردین گەڕایەوە.

لەبیستی زیقەعدە، سەرهەنگ موختار ئەلەسەڵتەنەی موفەتیشی ڕۆژئاوا هاتە کوردستان.

لەموحەڕەمی ۱۳٤۸ هەواڵ هات کەشازادە نوسرەت ئەلدەولە، بەتۆمەتی دزی لەوەزارەتەکەی گرفتار بووە و بەپێی فەرمانی دادگا، لەهەموو مافێکی مەدەنی و نیشتمانی بێبەشکرا.

ئەم ڕووداوە بەیەکێك لەڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی پەهلەوی هەژمار دەکرێت. لەمانگی جومادی الاوەل ۱۳٤۸ هەواڵمان پێگەیشت کەشاهەنشا لەڕێگەی هارون ئابادەوە تەشریفی دێنێتە کوردستان. موفەخەم ئەلمولکی حوکمران لەماڵەکەی خۆی، یانی قەڵای حکومەتی، دەرگایەکی بۆ ماڵی سالار فاتح دروست و پەیوەستی ماڵەکەی خۆی کرد. لەگەڵ ئەوەیشدا دەیویست بەهۆی ئەم کارە، برە پارەیەك لەسالار فاتح وەربگرێت چوونکە پاشا دەڕۆشتە ناو ماڵەکەی. سالار فاتح فریوی خوارد و هەموو کەرەستەکانی میوانداری ئامادە کرد. سەرهەنگ مەحمودخان لەم بابەتە توڕە بوو. لەگەڵ بنەماڵەکەی ڕێگەی هەمەدانی گرتەبەر بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم کێشەیە بکات یا ئەوەی دەست لەکارەکەی بکێشێتەوە. لەوێ بەئەمیری لەشکر دەڵێت: چیتر شەرافەت بۆ هێزەکانی سوپا نەماوەتەوە کە بەپیلانی کەسێکی ئیسفەهانی، (مەبەست فەرمانڕەوای کوردستانە) شاهەنشا دەبێت بڕواتە ماڵی

کووتاڵفرۆشێك.

سەرئەنجام ئەمیر بەهۆی بروسکە شاهەنشا ئاگادار دەکاتەوە و فەرمان دەردەکرێت کەهەمان ماڵی پێشوو، ماڵەکەی ئاسف، بۆ تەشریف فەرمایی شاهەنشا ئامادە بکەن. سەرهەنگ مەحمودخان سەرکەوتوو گەڕایەوە.

ئێوارێی دووشەممە ١٠ جومادی الاوەل، کەژاوەی شاهەنشا لەماڵی ئاسف دابەزی. دوکتۆر ئەمیر ئەعلەم و شکوە ئەلمولك، سەرۆکی دەفتەری شاهەنشاهی، لەماڵی ئاسف، بەڕێزان سەردار ئەسعەد وەزیری جەنگ و قایم مقام ئەلمولك و ئەمیر نیزامی هەمەدانی لەماڵی سدیق دیوان نیشتەجێ بوون. دوو شەو لەکوردستان مانەوە. بەیانی چوارشەممە ١٢ جومادی الاوەل، بەرەو سەقز بەڕێکەوتن. لەکاتی بەڕێکردن لەدەرەوەی شار، مەفخەم ئەلمولکی فەرمانڕەوای کوردستان، لەسەر داوای نهێنی حاجی شێخولئیسلام دەگاتە بەرپێی شاهەنشا و داوای ویلایەتی عامە بۆ حاجی شێخولئیسلام دەکەن. شاهەنشا لەبەر ئەوەی لەکێشەی ویلایەتی عامە زانیاری پێشتووتری نەبووە و جیاواز لەو کاتەدا جێگەی ئەو قسانە نەبووە، تووڕە دەبێت و بەتووڕەیی دەڵێت: چی دەڵێی؟ مەفخەم ئەلمولك زمانی دەگیرێت و توانای وەڵامدانەوەی نابێت. منیش ئەم هەلەم قۆستەوە و بۆ ئارامکردنەوەی شاهەنشا و بۆ تەمێ کردنی حکومەت وتم: هەندێ ژنی بێ سەرپەرەشت لەکوردستان دەژین کەسەرپەرەشتێکی دیاریکراویان نییە. مۆڵەتی مارەکردنی ئەوان بەپێی مەزهەبی ئێمە، شافعی مەزهەبان، لەئەستۆی پاشادایە کەسەرپەرشتی خەڵکانە. مەبەستی مەفخەم ئەلمولك ئەوەیە بۆ ئاسانکاری بۆ بەشوودانی ئەم ژنانە، مۆڵەت بەزاناکان بدەن بتوانن ئەم ژنانە مارە بڕن. شاهەنشا هێور بوویەوە، فەرمووی: هەمووتان مۆڵەتتان هەیە، هەمووتان مۆڵەتتان هەیە، مۆڵەتتان بووە و هەتانە.

لەکۆتایی وتەکانم وتم: تەسبێحەکەی پار لەدەستی موبارەکتان نابینم. وادیار فەوتاوە. تەسبێحێکی نایابم ئامادە کردبوو، پێشکەشم کرد. تەسبێحەکەی وەرگرت و ماڵئاوایی کرد و سوار ترۆمبێلەکەیان بوون. لەنیوەی ڕێگە بەشکوەئەلمولك دەفەرمێت: ئەم پیاوە کەرە شیاوی فەرمانڕەوایەتی کردنی کوردستان نییە. کاتێك گەشتینە سەقز، بروسکە بۆ وەزارەت بنێرن تا دووری بخەنەوە.

ڕۆژی ١٥ جومادی الاوەل، مەفخەم ئەلملك لەحکومەتی کوردستان دوورخرایەوە و حسەین

سێ ڕۆژ، ئەمیر بەرەو سەقز و سەردەشت و دزلّی بەڕێکەوت و لەرەبیع الاوەلی ١٣٥٠ گەڕایەوە. لەگەلّ گەڕانەوەی ئەو، سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمینی لەسەر کار لابرا، سەرتیپ عەلی خانی ڕەحیمی جێگەی گرتەوە. سەرتیپ عەلی خان سەربازێکی ئەرکناس و ڕاستکردار بوو کەجگە لەپێشکەوتنی نیزام و مەبەستەکانی دەولّەت، بیری لەهیچی دیکە نەدەکردەوە. بەیانی لەمالّەکەی خۆی دەڕۆشتە شوێنی کارەکەی و شەو دەگەڕایەوە. جگە لەسەردانی ڕەسمی، تێکەلّ بەکەس نەدەبوو. کەسێکی بێڕیا بوو. ڕۆژی ١٥ ڕەبیع ئەلثانی، نیزام ئەلدین خانی مشار ئەلدەولە، وەك فەرمانڕەوای کوردستان، هاتە سنە.

## حکومەتی نیزام ئەلدین خانی مشار ئەلدەولەی حیکمەت

دوای لابردنی ئەحمەدخانی مەفخەم ئەلمولك و ٢٢ مانگ حکومەتی حسەین عەلی خان بەکەفالەت، ڕۆژی ١٥ ڕەبیع ئەلثانی ١٣٥٠، نیزام ئەلدین خانی مشارئەلدەولەی حیکمەت، وەك فەرمانڕەوای کوردستان هاتە ناو شارەکە. کەسێکی زانا و مێژوونووسێکی ڕاستکردار بوو. دوای چەند ڕۆژ لەهاتنی ئەو بۆ کوردستان، هەوالّمان پێگەیشت کەشاهەنشا بەرەو کوردستان دێت. مەلا عەبدولعەزیزی موفتی، کەچەند ڕۆژ پێشتر هاتبووە کوردستان، بەمەبەستی پێشوازی کردنی کەژاوەی شاهەنشاهی بەرەو سەقز بەڕێکەوت. دووبارە مالّی ئاسفیان بۆ میوانداری کردنی پاشا ئامادە کرد و لەدەرەوەی دەروازە تا کۆتایی تالارەکە ڕازێنەرایەوە. لەبەردەم دەرگای مالّەکە، لەسەرەوەی تالار ئایەی (فالله خیر حافظا) بەخەتی گەورە نووسرابوو و دوو شێر و شمشێر لەچەپ و ڕاست نەقاشی کرابوو. هەموو کەرەستەکانی میوانداری کردن لەهەمەدانەوە هات، گەرماویان گەرم و پاککردەوە. ئاسف، هەرچەند نەخۆش بوو بەلاّم بۆ پێشوازی کردن تا سەقز ڕۆشت. لەلایەن دانیشتووانی شار، بەو کەسانەی لەشاهەنشا نزیك بوون، شاهەنشا ئاگادار دەکەنەوە کەئاسف لەوەی مالّەکەی بۆ میوانداری کردنی شاهەنشا ئامادە دەکرێت، بەشێوەیەکی خراپ کەلّك وەردەگرێت و بەردەوام لەدامەزراوە دەولّەتییەکان ئاژاوە دەنێتەوە و خەرجی میوانداریيەکان دەخاتە سەر شانی خەلّکان بەگشتی. جیاواز لەوە دانیشتووانی شار لەم ڕێزگرتنەی شاهەنشا کەئاسف بەهاکەی نازانێت، خەمبار ودلّساردن. کەسێکی گەنمفرۆش کەخەلّکان بەگشتی لێی بێزارن، شایوی ئەم هەموو سەرنج و ڕێزە نییە.

سەرتیپ عەلی خان کەتا سەقز بۆ پێشوازی کردنی شاهەنشا ڕۆشتبوو، لەکاتی بینینی

عەلی خانی ئیعتیماد ئەلمولك مالك، بەشێوەیەکی کاتی جێگەی ئەوی گرتەوە.
لەڕەمەزانی ١٣٤٨ هەواڵمان پێگەیشت کەئەحمەدشا لەفەرەنگ مردووە.. شەوی هەینی ٢٢ موحەڕەمی ١٣٤٩، میرزا عەلی خان بابای ئیعتیزاد ئەلدەولەی کارگوزار، مرد. لەمانگی شەعبان سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمینی، بەمەبەستی بینینی مەحمودخانی هەورامی ڕۆشتە دزلی و عەبوللە بەگی کوڕی مەحمودخانی لەگەڵ خۆی بۆ شار هێنا. ڕۆژی ٨ شەعبان ئەوی لەگەڵ محەممەد ئەمین بەگ، کوڕی جەعفەر سوڵتان و حەسەن بەگ کوڕی حسەین خانی ڕەزاوی، لەگەڵ خۆی بردە تاران تا خەڵات و پێگەیان بۆ وەربگرێت. ڕۆژی ٢٣ شەعبان، سەرهەنگ مەحمودخان، لەگەڵ بەگزادەکان گەرایەوە. لەگەڵ هاتنی بۆ شار، عەبدوڵلەبەگی لەسەربازخانە زیندانی کرد، کەریم بەگ کوڕی جەعفەر سوڵتان و عەبدولکەریم بەگ، وەکیلی جوانرۆ دەستگیر کران کە بۆکاروباری خۆیان هاتبوونە شارەکە. ڕۆژی ٢٤ شەعبان، مەحمودخانی مەریوانی و حەسەن خانی ڕەزاو لەگەڵ خۆی دەبات و لەگەڵ سوپای کوردستان و ڕەزاو و مەریوان کەزیاتر لەشەش هەزارکەس دەبوون، لەدەربەندی دزلی و دەربەنی گەلوی، هێرشیان کردەسەر دزلی. تا تێپەڕینیی سوپاکە لەدەربەندەکان، مەحمودخانی دزلی ئاگادار نابێتەوە. کاتێك ئاگادار دەبێتەوە، کار لەکارترازاوە وهەموو سەنگەر و دەربەند و شوێنە بەرزەکان کەوتۆتە دەست سوپای دەوڵەت و تەنیا ڕێگەی مڵەخورت بۆ هەڵاتنی ئەو ماوەتەوە. ناچار هەموو شتێك بەجێدێڵێت و لەگەڵ بنەماڵەکەی و خزمەتکار وکەسانی نزیکی، بەجەنگ و هەڵاتن، لەگەردەنەی مڵەخورت سەردەکەون و خۆیان دەگەیێنە ئیلانپەی. دزلی دەکەوێتە ژێر دەستی سوپای دەوڵەت. ئەگەر بەم فێڵە نەدەبوو، قەڵای تۆکمە و بەهێزی دزلی کەدیوارێکی سروشتی چیا بەرزەکان دەوریان گرتووە و تەنیا ڕێگەی دەربەندەکەی دەمێنێتەوە، بەئاسانی دەستی بەسەردا نەدەگیرا. شەقامی ناوەڕاستی شار لەباکور بۆ باشور، تالاری گەورەی هێزەکانی سوپا، دانانی بۆری ئاوی بینای سوپا، لەیادگارییەکانی سەرهەنگ ئەمینییە.

دوای گرتنی دزلی و گەڕانەوەی سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمینی، سەرتیپ محەممەد خانی شابەختی جارێکی دیکە هاتە کوردستان. ڕۆژی ١٣ فەروەردین، کەسیانزە بەدەری بەناوبانگە و لەم ڕۆژەدا پشوی گشتییە، سەرهەنگ مەحمودخان، ئەمیر و منی بۆ قەرادییان بانگێشتکرد و تا ئێوارێ، میواندارییەکی شایانەی لەئێمە و نیزامییەکان کرد. دوای دوو

شاهەنشا، ئەم بابەتە پشتڕاست دەکاتەوە. لەوێوە بەفەرمانی شاهەنشا بروسکەیەك ڕەوانە دەکرێت تا ماڵی سەرۆکی هێزەکانی سوپا بۆ میوانداری کردنی شاهەنشا ئامادە بکرێت: بەخێرایی سەرهەنگ مستەفاخانی مەنسور، ترۆمبێل بۆ کرماشان دەنێرێت و لەماوەی ٢٤ کاتژمێر هەموو کەرەستەکانی میوانداری کردن لەو شارەوە دەهێننە کوردستان و ماڵەکە دەڕازێننەوە.

ئێوارێی یەکشەممە ٧ جومادی الاوەلی ١٣٥٠، کەژاوەی شاهەنشا دەگاتە بەردەم ماڵی سەرۆکی هێزەکان کە لەتەلاری حاجی سەرداری موکەڕەم بوو. وەزیری جەنگ و هاوڕێیانی دیکەی شاهەنشا لەماڵی حاجی خان مەنزڵ دەکەن. بەیانی ڕۆژی هاتنی شاهەنشا، زاناکان و پیاوماقووڵان دەگەنە خزمەتی. هەموویان لەناو تالارەکە ڕیز دەبەستن. شاهەنشا لەڕێگەیەکی دیکەوە دێتە ناو تالارەکە. بەهۆی بەرزی باڵای شاهەنشا و نزمی سەر دەرگاکە، سەرشانی کەمێك لەدیوارەکە دەدرێت. مەلا عەبدولعەزیمی مودەڕس کەپیاوێکی پیر و ڕیشسپییە، بەدەنگی بەرز وتی: السلام علیك یا امیر المونین، السلام علیك یا خلیفه اله. شاهەنشا بەخوێنساردی کەنیشانەی لەخۆباییبوونی شاهانە بوو، پشت دەکاتە زاناکان و ئەم وتارە دەخوێنێتەوە:

### وتاری شاهەنشا

دوو سێ جار کەسەردانی کوردستانم کردووە، وادەردەکەوێت دەستەیەك گومانیان کردووە بۆ دڵنەوایی کردنی ئەوان هاتووم. من بۆ دڵنەوایی کردنی کەس نەڕۆشتوومەتە هیچ شوێنێك. من بۆ گەڕان بەویلایەتەکان و لێکۆڵینەوە لەباروذۆخی ناوخۆی وڵاتەکەم، سەردانی هەموو ناوچەکان دەکەم تا بزانم چ ناوچەیەك پێشکەوتووە و چ ناوچەیەك دواکەوتووە. ئاگاداری ڕابردووی کوردستانم. ئەو فەڕشانەی لەکوردستان دەچنرێن، لەدنیادا بەناوبانگن. ئەم فەڕشەی لێرە لەژێر پێی من ڕاخراوە، بەدڵنیاییەوە لەباشترین فەڕشەکانی کوردستانە لەکاتێکدا بەهیچ جۆرێك هاوشێوەی فەڕشەکانی کۆنی کوردستان نییە و زیاتر لەڕاخەرێك دەچێت. یا ئەم بینانەی کەوەك شوێنێك بۆ حەوانەوەی من دابینکراوە، بەدڵنیاییەوە یەکێکە لەباشترین بیناکانی ئەمڕۆی کوردستان بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەندازیاری ئەمڕۆییدا یەکناگرێتەوە. ئەمڕۆ دوو سێ جار هاتمە ناو ئەم تالارە، هەموو جارێك سەرم بەر دیوارەکە کەوت. هەروەها چەندین بابەتی دیکە کەنیشان دەدات کوردستان دواکەوتووە و هەمووی

بەهۆی تاوان و هەڵەی ئەم چینەیە (ئامارژە بۆ ئاسف و پیاوماقووڵان) تا ئەم چینە لەکوردستاندا بن، چاکسازی لەکوردستان ئەگەری نییە. چینەکانی دیکە یا زاناکان دەبێت چی بکەن؟ دەتوانن چی بکەن. جگە لەدۆعا کردن هیچ ئەرکێکی دیکەیان نییە. لێپرسراوان دەبێت چاکسازی لەوڵاتدا بکەن. بەپێچەوانەوە لێپرسراوانی ئێوە تەنیا دەزانن پارە کۆبکەنەوە و لەژێر زەوی بیشارنەوە. نەخۆیان کەڵکی لێ دەبەن نەکەسانی دیکە. جارێکی دیکەی نایەمە کوردستان تا چاکسازی بەتەواوەتی لەکوردستان ئەنجام بدرێت.

لەناکاو حاجی شێخولئیسلام و مەلا عەبدولعەزیم پێکەوە وتیان: نا ان شاالله، نا، ان شا الله.

لەکۆتایی وتاری شاهەنشا، من کە لەسەرەوەی زاناکان و لەپێشی پێشەوە بووم، لەوەڵامدا وتم: بەختەوەر ئەو ڕانەمەڕەی شوانەکەی وشیار و بەئاگا بێت. دانیشتووانی شاپەرەستی کوردستان، ئەگەر سەبارەت بەچاکسازی، کەمتەرخەمی کراوە، بەهۆی دڵنیابوون لەوشیاری شاهەنشای وڵاتە کە لەسەرەتای دەسەڵاتەوە تا ئەمرۆ، بەهۆی کردەوە شاهانەکان و گەڕانی بەهەموو ناوچەکانی وڵات، وانەی سەڵتەنەت و بەڕێوەبردنی وڵات، فێری هەموو سوڵتانەکانی دنیا دەکات و بەبوونی ئەم شوانە وشیارە، ڕان بۆ خۆی دەخەوێت و دەحەسێتەوە. تاکە ئارەزووی ئێمە بەردەوام بوونی ژیانی پاشا و سەڵتەنەتی شاهەنشایە تا لەسێبەری بوونی ئەو ڕێزدار، بەئاسوودەیی و ئارامی ژیان بەسەر ببەین. بەردەوام بێت ژیانی تۆ.

شاهەنشا بەدەم بزەیەکەوە کەنیشانەی بەزەیی پیاهاتنەوە بوو، دووبارە فەرمووی: شوان لەئەرکەکانی خۆی بێ ئاگا نییە، بەڵام ڕانەمەڕیش دەبێت جموجۆڵێك لەخۆی نیشان بدات بۆ ئەوەی بلەوەڕێت. ئەمەی فەرموو و ڕۆشتە ناو ژوورەکەی. ئیمەیش مۆڵەتی گەڕانەوەمان پێدرا. بەڵام ئاسف ولایەنگرانی ئاسف بەتەواوی ترسابوون و زیاتر بیریان لەدواهاتی فەرمانەکانی پاشا دەکردەوە بۆ ئەوەی بزانن چارەنووس بەرەو کوێیان دەبات.

بەیانی ڕۆژی دووەم، کەژاوەی شاهەنشا لەکوردستانەوە بەرەو کرماشان و شائاباد بەڕێکەوت و لەویوێوە بۆ تاران گەڕانەوە. لەمکاتەدا بڕیاربوو ئاسف و حاجی موعتەمید و وەکیل سوڵتان بەرەو تاران بەڕێکەون بەڵام ڕووداوەکانی نەوسود ڕوویاندا و سەرتیپ عەلی خۆان سەرقاڵی خۆئامادە کردن بوو. بەهۆی منەوە گفتوگۆی لەگەڵ جەعفەر سوڵتان دەستپێکرد. هەرچەند نامەی مۆجیاریم بۆ جەعفەر سوڵتان نووسی، بەڵام سوودی نەبوو.

سەرەئەنجام لەسەرەتاکانی ڕەجەبی ١٣٥٠، لەکرماشان و کوردستانەوە هێز بەمەبەستی ئەنجامدانی چالاکی نیزامی ڕەوانەکرا و ڕۆژی ٧ ڕەجەب، سەرهەنگ حاجی عەلی خان لەکوردستانەوە بەڕێکەوت. ڕۆژی ٨ ڕەجەب هەواڵ گەیشت کەسەرهەنگ حاجی عەلی خان لەگەڵ سوپای کرماشان هێرشی کردۆتە سەر پاوە. محەممەد ڕەشید بەگی کوڕی جەعفەر سوڵتان لەوێ شکست دەخوات و سەرهەنگ دەست بەسەر شارەکەدا دەگرێت. ئێوارێی ڕۆژی ٨ شەعبان سوپاسالار ئەمیر ئەحمەدی هاتە کوردستان. بەیانی ڕۆژی ٩ شەعبان لەڕێگەی ڕەزاو، بەرەو لهۆن بەڕێکەوت. ئێوارێی ڕۆژی ١٤ شەعبان، بەتەلەفۆن هەواڵی گرتنی نەوسودم پێگەیشت کەهێزەکانی جەعفەر سوڵتان نەیانتوانیوە لەبەرابەر سوپای دەوڵەتی خۆڕاگری بکەن و شکستیان خواردووە و جەعفەر سوڵتان و ئەندامانی خێزانەکەی بۆ خاکی عێراق هەڵاتوون. بەیانی ڕۆژی ١٥ شەعبان، لەدامەزراوەی حکومەتی، جەژنی بەرات و لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) بوو. منیش وتارێکی پیرۆزباییم خوێندەوە.

ڕۆژی ٢٢ ڕەمەزانی ١٣٥٠، سەرهەنگ سەیید ئەحمەدخانی زاویە، وەك سەرۆکی سوپای کوردستان هاتە سنە و سەرتیپ ڕەحیمی بۆ تاران گەڕایەوە.

شەوی یەکشەممە ٨ شەوال، سەرهەنگ مستەفاخانی مەنسور، لەنەبوونی سەرهەنگ زاویە، بەپێی فەرمانی شاهەنشا، بەڕێزان ئاسفی ئەعزەم و حاجی موعتەمید و وەکیل سوڵتان و حاجی سەرداری موکەڕەم بەهۆی هێزە نیزامییەکان بردە ماڵی سەرهەنگ و لەوێ ترۆمبێلەکانیان ئامادە کرد و سواریان کردن و لەناو بەفر و بۆران ڕەوانەی تاران کران. سەرۆك عەشیرەکانی سەرسنور، هەرکام بۆ ویلایەتێك دوورخرانەوە. دەستەیەکیان زیندانی و دەستەیەکیان دەستبەسەر کران و لەئەنجامی ئەم کارانە، وڵات ئارام و ئاسایش بۆ سنورەکان گەڕایەوە.

لەموحەڕەمی ١٣٥١، حوکمڕانی کوردستان، بەناوی پشو، بەرەو تاران بەڕێکەوت. شەوی دووشەممە ٨ سەفەری ١٣٥١، سوپاسالار ئەمیر ئەحمەدی جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ کوردستان. بەهۆی پەیوەندییەکانی کۆن، بەدوو وشە بەخێرهاتنم کرد و داوام کرد چاومان بەیەك بکەوێت. لەوەڵامدا ئەم نامەی بۆ ناردم کەبۆ نیشاندانی پێگەی ئەخلاقی ئەو بەخوێنەران، وەك خۆی لێرەدا ئاماژەی پێدەدەم:

بۆ بەڕێز شەریعەتمەدار، ئایەت الله، ١١/٣/١٣، ئاگادارتان دەکەمەوە: نامەی بەڕێزتان

کەنیشاندەری هەستی جوانی ئێوە بوو، بووە هۆی شادومانی دڵ و ڕۆح. فەرمووبووتان بۆ چاوپێکەوتن کاتێك دیاریبکرێت. ئەو تامەزرۆییەی دڵم بۆ دیداری تۆ هەیەتی، دڵی من دەزانێت و من دەزانم و دڵی من. لەزیارەتی ئێوەی بەڕێز زیاد لەڕادە شادومان دەبم. هەڵبەت دڵم شایەتی دەدات کەتامەزرۆیی من بۆ بینینی ئێوە زیاترە. بەڵام چوونکە لەم کاتژمێرەدا هەوا گەرمە، دەترسم زیان بەجەستەی بەڕێزی ئێوە بگات. ئێوارێی ئەمڕۆ کاتژمێر چوار دوای نیوەڕۆ، چاوەڕوانی تەشریف هێنانی ئێوەی بەڕێز بۆ سوودبردن لەوتەکانی ئێوە دەبم. لەتورانەوە بۆ ئێران لەئێرانەوە بۆ توران، بەعەشقی دیداری تۆ بڕیوومە ڕێگەی دوور.

لەکاتی دیاریکراو، چاومان بەیەککەوت. حاجی خانیش ئامادە بوو. سوپاسالار فەرمووی: من سەربازێکم، ئەرکی سەرباز، ڕاستگۆییە لەگوتار و کرداری سەربازی، چوونکە لەسەربازی جگە لەڕاستی گومانی هیچی دیکە ناکرێت. ڕاست تفەنگ هەڵدەگرێت، ڕاست دەڕواتە گۆڕەپانی جەنگ. ڕاست گوولـلە دەتەقێنێت. ڕاست دەکوژێت، ڕاست دەکوژرێت. لەسەر ئەم بنەمایە، بەڕاشکاوی دەڵێم، من ڕێزێکی تایبەت بۆ بەڕێزتان دادەنێم و لەقووڵایی دڵەوە خۆم بەخزمەتکاری ئێوە دەزانم و هیچکات چاکییەکانی ئێوە لەبیرناکەم. ئەگەر تا ئێستا لەوەڵامدانەوەی چاکییەکانی ئێوە، کەمتەرخەمی کراوە، بەهۆی سەرقاڵبوون بەکاروبارەکانەوە بووە. ئەمڕۆ دەسەڵاتی دەوڵەت بەتەواوی لەم ناوچەیە (کوردستان) سەپێنراو و سەلمێنراوە و هیچ لەمپەر و کۆسپێك لەئارادا نییە. بەڵێنتان پێدەدەم پێگە و جێگەی ئێوەی بەڕێز لای دەوڵەت پارێزراوە و بۆ هەموو جۆرە هاوکارییەك و قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوو ئامادەم.

وەڵامم دایەوە کە: هەوڵ و کۆششەکانی من بۆ پێشکەوتنی مەبەست و ئامانجەکانی دەوڵەت، تەنیا بەهۆی باوەڕ و ویژدانی خۆم بووە بێ هیچ چاوەڕوانییەك و تەنیا ئارەزووی من، شکۆ و مەزنی دەوڵەتی ئێران و تەندروستی شاهەنشا و پێشکەوتنی کاروبارەکان و ڕەزامەندی کاربەدەستان و لێپرسراوانە و جگە لەمە هیچ ئارەزوو و داوایەکی دیکەم نییە.

لەماوەی ٢٤ کاتژمێر بەمەبەستی سەردانکردن هاتەماڵەکەی من و لەناو حەوشەکە، لەلێواری حەوزەکە دانیشتین، فەرمووی: ئەوەی کەسێك بتوانێت لەوتارێك یا لە نامەیەك بینووسێت، شاعیرەکان و عاریفەکان لەیەك شێعردا نووسیویانە: مەبەستی من لەکەعبە و بتخانە تۆیی تۆ، مەبەست تۆی، کەعبە و بتخانە بیانوون. مەبەستی سەرەکی من لەهاتن بۆ

کوردستان، بینینی ئێوەی بەڕێز و کەڵك وەرگرتن لەپەند و مۆجیارییەکانە وبابەتەکانی دیکە لاوەکین.

دوای سەردانی ماڵەکەی من، سەردانی ماڵی زاناکانی دیکەی کرد و دوو ڕۆژ دواتر بەڕێکەوتن. شەقامی درێژی کوردستان لەڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەلأت و ئامێری کارەبا بەفەرمانی ئەوان ئامادەکرا و بەهاوکاری مشارئەلدەولە ئەنجامدرا. بینای هێزەکانی سوپا لەزەوییەکانی کەمین، یادگاری سەرهەنگ زاویەیە. ڕۆژی ۲۲ جومادی ئەلثانی، شێخ محەممەد جەعفەری حوجەت ئەلئیسلام مرد. ڕۆژی ۸ ڕەجەبی، وەفدی تەفتیشییە کەبریتیبوو لەم بەڕێزانەی خوارەوە، هاتنە کوردستان:

سەرهەنگ عەبدولعەلی خان ئیعتیماد موقەدەم، نوێنەری سوپا

مەسعودخانی وەداد، نوێنەری وەزارەتی ناوخۆ

سەعیدخانی شەهشەهانی، نوێنەری وەزارەتی داد

محەممەدخانی سەرداری، نوێنەری وەزارەتی دارایی

ئیسفەندیاری نوێنەری دامەزراوەی ئاسایشی گشتی

سوڵتان سەیید محەممەد عەلی خانی گولڕیز، نوێنەری دامەزراوەی ئەمنی

شەوی یەکشەممە ۱۳ ڕەجەب، ۲۲ دووپشك، ئیعتیماد ئەلدەولە، وەك وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئاینی کوردستان دەستنیشانکرا. بەیانی دووشەممەی ۱٤ ڕەجەب، بەرەو کرماشان بەڕێکەوتن.

شێخ شوکروڵلەی پێشنوێژ، شەوی سێشەممە۲۱ شەعبان کۆچی دوایی کرد. شەوی شەممە ۱۷ ڕەمەزان، شێخ ئەحمەدی حوجەت ئەلعولەما مرد وشێخ عەبدوڵڵەی هەزار کانیان لە٦ شەوال لەمزگەوتی شەریعەتمەدار ماڵئاوایی لەدنیا کرد. لە ۱۸ شەوال، کەسانی جەعفەر سوڵتان لەبەین ئەلنەهرەینەوە لەگەڵ دەستەیەك نەوڕۆڵی هێرشیان کردە سەر هاندگرمڵە. ئەفراسیاب بەگ دوو شەو دەستی بەسەر ئەو شوێنەدا گرت، دواتر شکستی خوارد و هەڵات. لەمانگی زیقەعدە، سەیید یوسف خانی سالار ئەجەلال، سەرۆکی ئاسایش لەسەر کار لادەبرێت و سوڵتان جەهانسوزی بەوەکالەت و سەرهەنگ سوهەیلی وەك سەرۆکی ئەو دامەزراوە هاتنە کوردستان. لەکۆتاییەکانی زیحەججە، سەرهەنگ ئەحمەدخانی زاویە، کە بەنەخۆشی لەنەوسود گەڕابوویەوە، لەسەر کار لابرا و سەرهەنگ عەباس خان جێگەی

گرتەوە و دوای چەند ڕۆژ بەرەو نەوسود بەڕێکەوت. زۆری نەخایاند کوڕەکانی جەعفەر سوڵتان، لەچەند قۆڵەوە، هەرکام لەگەڵ بیست سی تفەنگچی، وەك چەتە دەرکەوتن و تا دوو فەرسەخی شارەکە هاتن و لەگوندەکان پارە و کەلوپەلیان وەردەگرت. ئێوارێی شەممەی ٧ رەبیع الاوەلی ١٣٥٢، سەرتیپ محەممەد سادق خانی کۆپاڵ سالار نیزام هاتە کوردستان و ڕۆژی دواتر بەرەو نەوسود بەڕێکەوتن. شەوی چوارشەممە ١١ رەبیع الاوەلی، سەرهەنگ ئەحمەدخان زاویە بەخێرایی لەئازەربایەجانەوە هاتە سنە و بەیانی لەگەڵ هەڵاتنی هەتاو، بەرەو نەوسود بەڕێکەوت. بەداخەوە هەواڵمان پێگەیشت کە لەهیرەوی، یەك کاتژمێر بۆ ئێوارێی ١٢ رەبیع الاوەل، ئاغە بەگی ئیناخی، ناسراو بەئاغە شەڕ، بەگوولەیەك کۆتایی بەژیانی دەهێنێت. دانیشتووان بۆ مردنی ئەم گەنجە خۆش ئەخلاقە، پرسەیان گێڕا. ئێوارێی شەممە ١٤ رەبیع الاوەل، سەرتیپ زەرعامی ئەمیر لەشکر و سەرۆکی هەموو هێزە ئەمنییەکانی وڵات هاتنە کوردستان و دوو ڕۆژ دواتر بەرەو نەوسود بەڕێکەوتن. دواتر سەرهەنگ سیاپۆش وەك فەرماندەی تیپی کوردستان هاتە سنە و بەخێرایی بەرەو نەوسود بەڕێکەوت. لەماوەیەکی کەمدا کۆتاییان بەبارودۆخی عەشایەری و چەتەگەری هێنا و ئارامی و ئاسایشیان بۆ ناوچەی هەورامان گەڕاندەوە. ئێوارێی چوارشەممە ٢٧ جومادی ئەلثانی، کەژاوەی شاهەنشا لەڕێگەی ئازەربایەجانەوە هاتە کوردستان و لەماڵەکانی حاجی یەعقوبی کەلیمی دابەزین. ئێوارێی پێنجشەممە، دوو کاتژمێر بۆ ئاوابوونی هەتاو، زاناکان و سەرۆکی دامەزراوەکان و خانەکان و بازرگانان، بانگێشتکران. منیش ئەم وتارەم بەنوێنەرایەتی خەڵکان خوێندەوە:

### وتاری پیرۆزبایی

شاهەنشای بەڕێز! لەقووڵایی دڵەوە بەخێرهاتنتان دەکەین و ئێمەی شافعی مەزهەبی شاپەرەست، بینینی روخساری پیرۆزی شاهەنشاهی بەنیشانەی بەختەوەری خۆمان دەزانین. زۆر دەمێك بوو، ئێمەی ئێرانی لەهەموو پێشکەوتن و بەختەوەرییەکان و نیعمەتەکانی دنیا بێبەش بووین، ناوچەکانی عەشایەری هاوشێوەی پاشای تیرەکان، سەراسەری وڵاتی گرتبوویەوە. لەهەموو لایەك، شەپۆلی بەدبەختی و پشێوی پاشایەتی تیرەکان، دەوریان دابووین. لەو ڕۆژەوەی هەتاوی بەختەوەری و خۆشبەختی، تیشك

دەپرژێنێتە سەر وڵاتی ئێران و ئێمەی ئێرانی خۆشبەختانە، بووینە خاوەنی شاهەنشاهێکی خاوەن دەسەڵات، دەبینین بەهێزی بیر و هێزی شمشێر و چالاکی سەرنجڕاکێش، باروذۆخی ئێران گۆڕانی بەسەرهاتووە و لەهەموو ناوچە عەشایەرییەکان و ناوچە سنوورییەکان، ئاڵای شکۆمەندی شێروخورشید دەشەکێتەوە و ئاسایش و ئارامی باڵی بەسەر هەموو ناوچەکانی وڵاتدا کێشاوە. هەموو ویلایەتەکان و شارەکان بەهۆی سەرنجدانی تاقە سەرپەرەشتی تاجدار، بەرەو پێشکەوتن هەنگاو دەنێن کەخودی و بێگانە، شکۆ و پێشکەوتنەکانی ئێرانی ئەمڕۆ، پشتڕاست دەکەنەوە. چوار جار کەکەژاوەی شاهەنشا هاتۆتە کوردستان، بەچاوی خۆمان بینیومانە کەهەرجارەوە بەشێك لەخراپەکاری و گەندەڵییەکانی ئێمە لەناوچووە و هۆکارەکانی بەختەوەری و خۆشبەختی بۆ ئێمە دابینکراوە. بەداخەوە کوردستان لەبەر ئەوەی دوورە و گۆشەگیر و چاکسازییەکانی ئەم ناوچەیە درەنگتر دەستی پێکردووە، لەبەر ئەمە بەباشی دەزانم ئەوە بڵێم کوردستان بەبەراوەرد بەویلایەتەکانی دیکە کەمێك دواکەوتووە. داوای ئێمەی کوردستانییان، لەخاکی پێی پیرۆزتان ئەوەیە تا ئەو کاتەی نەخشەی چاکسازی کوردستان تەواو دەکرێت، ساڵانە لەگەڵ سەردان کردنی ویلایەتەکانی دیکە، تەشریفتان بێتە کوردستان. دوای ئەوەی ئێمە بەتەواوی ئاسوودە و ڕاحەت بووین، ئەوسا بۆ سپاس کردن ئێمە بەخزمەت دەگەین. لەقووڵایی دڵەوە بەختەوەری و کامڕەوایی شاهەنشای ئێران خوازیارین و هیوادارین ساڵانێکی دوورودرێژ، بەهۆی سەرنج و چاکییەکانی شاهەنشای گەورە، نیعمەتی بینینی شاهەنشای پیرۆز و موبارەك تازە بکەینەوە.

### وڵامی شاهەنشا

بەبزەیەك کەنیشانەی خۆشەویستی و ڕێز بوو، فەرمووی: ئێمە لەم بەشەی کۆتایی کەمتەرخەمییمان نەکردووە، ساڵی جارێك، دوو ساڵ جارێك، هاتووینەتە کوردستان. ئێوە نەهاتوون. ئێوەیش وەرن تا لەبوونی ئێوە کەڵك وەربگرین.

### ناساندنی نووسەر بەشێوەیەکی کورت

شێخ محەممەدی مەرۆدخ، ناسراو بەجەمال ئەلدین، نازناو (ئایەت الله) ژمارەی پێناسی

باری شارستانی ٦٠ سنە، ئەوەی خوالێخۆشبوو شێخ عەبدولمۆئمین (پێشنوێژ) لەدایکبوونی شەوی ٢٧ ڕەجەبی ١٢٩٧ کۆچی، ١٢٥٦ هەتاوی، لەتەمەنی حەوت سالّی ڕۆشتۆتە قوتابخانە، ئالفابێت فێر بووە، قورئانی تا سورەی (تبارك) لای مامۆستا خوێندووە، سورەکانی دیکەی بەهێزی بیر و وشیاری خۆی خوێندووە. لەمنالّی، نیشانەکانی زیرەکی لێ بینراوە، لەکاتی فێربوونی ئالفابێت لەمامۆستاکەی پرسیوە: بۆ (لام الف) دەجار لە ئالفابێت دووبارە بۆتەوە؟ مامۆستا دەلّێت: بەشێوەیەکی سروشتی وایە. دەپرسێت: بۆ وایە؟. مامۆستا تێرادەمێنێت. لەدایکی دەپرسێت: بۆ کاتێك فوو لەئاگر دەکەیت هەلّدەبێت، بەلاّم فوو لەچرا دەکەیت، دەکوژێتەوە؟ دایکی دەلّێت: خواوەند وای دەوێت. دەلّێت: چۆنە وایە؟ دایکی دەلّێت: خواوەند خۆی دەزانێت. زانستی صرف لای مامۆستا تا (معتل) و نحو تا (مرفوعات) خوێندووە. باوکی مردووە و خۆی سەرپەرشتی بنەمالّەکەی گرتۆتە ئەستۆ. بەپشت بەستن بەزیرەکی خۆی، زانستەکانی دیکە فێر بووە و لەنامەی (جان نما) نووسیویەتی:

((کشیدم منت استاد در نحو

که تا زنگ جهالت را کند محو

زباقی علم ها هر چیز خوانی

ز دیگر رسم ها هر چیز دانی

همه بی منت استاد بوده

ز خود تحصیل آن ها رانموده))

واتاکەی: مەمنونی مامۆستا بووم تا زانستی نەحوم فێر بکات بۆ ئەوەی لەجیهانی نەزانی ڕزگارم بێت، بەلاّم بێ پشت بەستن بەمامۆستا، خۆم فێری زانستەکانی دیکە بووم.

لەتەمەنی ١٢ سالّی، ئەرکی پێشنوێژی گرتۆتە ئەستۆ و مەحزەری هەبووە. دوای ئەوە هاتۆتە گۆڕەپانی سیاسەت و تا تەمەنی حەفتا سالّی لەو گۆڕەپانەدا ماوەتەوە و بەشێك لەهەولّ و کارەکانی ئەو لەڕێگەی ئازادی و خزمەت کردن بەدەولّەتی ئێران، لەم کتێبەدا ئاماژەی پێدراوە. زیاتر لەسەد کتێبی لەبوارە جۆرواجۆرەکاندا هەیە کە ٤٨ کتێبیان تا ئێستا چاپ و بلاّو کراونەتەوە و ئەوانی دیکە هێشتا چاپ نەکراون.

نووسەر، خاوەن بۆچوونێکی سەربەخۆ بووە، شوێنکەوتەی هیچ کام لەزاناکان و

حەکیمەکان نەبووە و بەزۆری بۆچوونەکانی ئەوانی ڕەد کردۆتەوە. بەشێوەیەکی سروشتی لایەنگری ئازادی و یەکگرتووی ئیسلامی و ئاشتی گشتی بووە بەشێوەیەك جیاوازییەکان نەمێنێت و مرۆڤەکان بەئاشتی و ئاسایش ژیان بەسەر ببەن.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١. فەرهەنگی مەردۆخ (٢ بەرگ)
٢. مێژووی مەرۆدخ (٢ بەرگ)
٣. فقه محمدی
٤. اصول فقه
٥. صرف.
٦. نحو
٧. منطق
٨. ندای اتحاد
٩. نداء الاتحاد
١٠. جان نما
١١. جان و جین
١٢. کورتەیەکی مێژوویی شیعەگەری
١٣.پاسخ به یزدی
١٤. پاسخ به پاسخ (وەڵام بەوەڵام)
١٥. چوارده پرسیار
١٦. پرسیارەکان (پرسش ها)
١٧. عدل و تعقیب
١٨. حل اختلاف (چارەسەری کێشەکان)

١٩. توضيح شيعه (ڕوونکردنەوەی شيعه)

٢٠. صقوط تحليل

٢١. توضيح صقوط

٢٢. شفا العليل

٢٣. جواب معترضين

٢٤. چارەی بدبختی

٢٥. نسيم رستگاری

٢٦. امين رستگاری

٢٧. آيين رستگاری

٢٨. رموز آفرينش

٢٩. خلاصه الاحکام

٣٠. منتخب الخواص

٣١. طب جديد

٣٢. گفتارها

٣٣. حساب.

٣٤. هندسه

٣٥. جبر و مقابله

٣٦. سرمايه هدايت

٣٧. رهنمای سعادت

٣٨. مائده

٣٩. نالەی ئيسلام

٤٠. عقيدەی ئيسلامی

٤١. هدف نما

٤٢. تثليث طلاق

٤٣. رهبر بشر
٤٤. دانش و دین
٤٥. رد بابی و بهایی
٤٦. اصلاح مصطلحات
٤٧. رخصت ربا
٤٨. برجستگان جهان
٤٩. پیرامون مادەی ٨ حمایت خانواده

# پێڕست




چوونکە مەبەستی سەرەکی من
دۆزینەوەی ڕاستییەکانی مێژووی کوردە،
ئەگەر خوێنەران چ کورد و چ نەتەوەکانی
دیکە، هەندێ بابەت بخوێننەوە
کەخوازیاری بیستنی نەبن، نابێت دڵگیر
ببن چوونکە منیش دەمەوێت مێژوو
بنووسم نەك ئەوەی دڵنەوایی و وەسفی
کەسەکان یا هۆزەکان بکەم- ئەگەر مێژوو
لەسەر بنەمای بۆچوون و گریمانە بێت،
شیاوی خوێندنەوە نییە، بەواتایەکی دی،
مێژوو بەڕادەیەك دەبێت سەرنجراکێش و
بەهێز بێت کەهەموو نەتەوەکان دەبێت
لێی بترسن و دەبێت هیوایان بۆ دروست
بکات. تا لەترسی مێژوو کارە خراپەکان
ئەنجام نەدەن و بەهیوای مێژوو، بۆ
هێشتنەوەی ناوی چاکە لەخۆیان، هەموو
جۆرە هەوڵ و کۆششێك بدەن.

تأريخ
كرد
و
كردستان



لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ناوێر ژمارە (٥٦)

چاپخانەی ڕۆژهەڵات - هەولێر

